

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: شاری مۆسیقارە سپییەکان
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: ڕۆمان
نۆبەتی چاپ: سێیەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٢٠٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٢٢٢٥)ـی ساڵی (٢٠١٣)ـی پێدراوە.

ISBN: 978-1-63068-980-3



ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی–شەقامی مەولەوی–تەلاری سیروانی نوێ–نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

ئێمە هەمیشە دەژین، ئەوەی دەمرێت و بەسەر دەچێت
زەمان خۆیەتی.

(ئیریش ماریا ڕیمارک)

# دواهەمین دەرکەوتنی شاروخی شاروخ

سـەرەتای ئـەم چیرۆکەمـان لـە فرۆکەخانـەی سـخێپهۆڵەوە لـە نزیـک ئەمستەردامەوە دەست پێدەکات، ساڵی ١٩٩٨ کە بۆ دووەمجار دەمویست بگەڕێمەوە بۆ کوردستان. ئەوکات لە ناو گەلێک کێشە و گرفتی گەورەی ژیانـدا نوقمبوویـووم، ڕۆژگارێـک دەژیـام بەسـەختی لـە دڵـەوە پێکرابـووم و باوەڕم بە شتێک نەمابوو، هەر لەو هەفتەیەدا ژنەکەم بێهۆ تەڵاقنامەیەکی لـە دادگاوە بـۆ نـاردم و نێـوان مـن و ئـەو بـۆ هەتاهەتایـە کۆتاییهـات. بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەو کێشـەیە و سەرپەرشـتیکردنی منداڵەکانـم، دەبایـە لـە ڕێگای شامەوە بگەڕێمەوە بۆ وڵات. لە بەردەم نوسینگەکانی هێڵی ئاسمانی سوریدا، سێ ڕیز خەڵک جانتاکانیان باردەکرد، من لە ڕیزی دەستە ڕاستدا وەستابووم کە دەنگێک هاواری لێکردم: مامۆستا... مامۆستا، بەڕێز، بەڵێ لەگەڵ تۆمە، ئا بەڵێ جەنابت، بەڵێ، تۆ کوردیت؟ مامۆستا گیان من دەتناسم، نا بە هەڵەدا نەچووم... وانییە، تۆ مامۆستای نوسەر عەلی شەرەفیاریت، وا نییە.. تۆ ئەو نیت؟

کوڕێکی گەنج بوو، سەرتاپای جلی سپی بوو، تی شێرتێکی سپی «لەوانەی یاریزانەکانی گۆلف لەبەریدەکەن»، پانتۆڵێکی سپی، جووتێک پێڵاوی بریقەداری سپیشی لە پێدابوو. ڕیزێک خەڵک لە نێوانماندا بوو، ئەو لە بەردەم کچەکەدا بوو کە جانتاکان دەکێشێت، پێدەچوو شتێکی زیادی هەبێت و خانمی هێڵە هەواییەکە بواری نەدات دەرچێت، من هیچی

ئەوتۆم لەگەڵ خۆمدا نەهێنابوو، جانتایەکی چکۆلانە نەبێت، جلی خەوتن و دەرمانی دان و کەلوپەلی ڕیشتاشینەکەمی تێدابوو. من گووتم: بەڵێ من ئەوم، عەلی شەرەفیارم فەرموو دەتوانم چیت بۆبکەم؟. شتەکان کەمێک ئاڵۆزکاو و ناڕێک هاتنە بەرچاوم، من کەیفم بەوە نەدەهات لەسەفەردا خەڵکی ناسیاوم لەگەڵدابێت، لە منداڵییەوە حەزم لەسەفەرە بە تەنیا، پاشان زۆربەی ئەوانەی لەسەفەردا تووشیان دەهاتم هێندەی کێشەیان بۆ دروستدەکردم یارمەتیان نەدەدام. کوڕێکی گەنج بوو، چوار خاڵی سووری چکۆلانە، وەک ئەوەی پاشماوەی چوار دڵۆپ خوێنی زۆر دێرین و کاڵەوەبووبێت لەسەر لاملی بوون، کوڕێکی چاوشینی جوان بوو، نەمزانی ئاخۆ شتەکانی خۆی لە شوێنی بارکردنەکەوە ڕەوانەکرد یاخود نا، پێدەچوو بینینی من کەمێک شپرزەیکردبێت، ئاگادار بووم لە ڕیزەکە هاتەدەرێ و گووتی: مامۆستا تۆ دەگەڕێیتەوە بۆ کوردستان؟ وا نییە تۆ دەگەڕێیتەوە بۆ ئەوێ؟. من گووتم: بەڵێ عەزیزم، بەڵێ، من دەگەڕێمەوە بۆ کوردستان.

زەرفێکی سپی دامێ و گووتی: ئەگەر دەتوانیت، ئەگەر بە ئەرک نابێت، ئەم زەرفەم بۆ بەریتەوە بۆ ئەوێ، چونکە من دەچم بۆ شارێکی تر، شارێکی زۆر دوورتر لەوێ، هێند دوور کە کەس دەستی ناگاتێ، دەبێت یەکێک هەبێت ئەم زەرفەم بۆ بگەێنێتەوە کوردستان و بیدلتە دەست کچێک بە ناوی ڕەوشەنی مستەفا سەقزییەوە. ناونیشانەکەی لەسەرە، ژمارە تەلەفوونەکەشی لەسەرە.

بەوەدا کورد دەرمان و شامپۆ و پێڵاو و کرێمی دەموچاویان لە هەر شت زیاتر لە ئەورووپاوە دەناردەوە بە بێزارییەوە گووتم: دەرمانی فشاری خوێنە؟ زەیتی قژە؟ شامپۆی پانتینە یاخود چی؟.

سەری بادا و گووتی: نا مامۆستا، نا... ئەمە شتێکی ترە، ئەمە مۆسیقایە، ڕەوشەنی مستەفای سەقزی مۆسیقارە، قوتابی پەیمانگایە، من

لـە هەمـوو قۆناغـەکان نمونـەم بـۆ نـاردووە، لـە هەمـوو قۆناغـەکان.

کۆمەڵێـک دەفتـەری نۆتـە و سـی دی بـوون، هەموویانـی لـە زەرفەکـە دەرهێنـاو گووتـی تەماشابکە، لـە هەمـوو قۆناغەکانـی مێـژووی مۆسیقا نمونەم بـۆ هەڵبـژاردووە، لـە ڕینیسـانس «ئەمیلیـۆ دی کاڤالیێـری» م بـۆ هەڵبـژاردووە لەگـەڵ «گیۆڤانـی پیرلۆگـی دە پالاسـترینا». لـە قۆناغـی «بـارۆک» دەزانـم حـەزی لـە «ئەنتۆنیـۆ ڤیڤالدیـی» ــە، نمونەیەکـی تریشـم بۆ نـاردووە «هێنری پۆرسـێلی» لـە کلاسـیکەکان «هایـدن» و «مـۆزارت» م بـۆ نـاردووە، لـە ڕۆمانتیکـەکان «گیۆشـینۆ ڕۆزینـی»، ئـا ڕۆزینـی مـەزن، کـە خـۆم زۆر حـەزم لێیەتـی لەگـەڵ «میندلسـۆن» و «جـۆن شـتاینەر» دا، هەتـا لـە نوسـەرە مۆسیقییە مۆدێرنەکانیـش شـتم بـۆ نـاردووە «بنیامیـن بریتـن»م بـۆ نـاردووە، «نۆناتـۆس هـاوس»م بـۆ نـاردووە، «مارکـۆس شتۆک هـاوزن»م بـۆ نـاردووە. مامۆسـتا شـەرەفیار لـە تۆ باشـترم دەسـتناکەوێت، ئـەم شـتانەی پیابنێرمەوە، لـە تـۆ باشـترم دەسـتناکەوێت.

مـن گووتـم: ئەگـەر ژمـارەی تەلەفونەکەی لەسـەر بێت، بەچـاوان، گرنگترین شـت ژمارەی تەلەفونەکەیە.

ئـەو گووتـی: نـا گرنگتریـن شـت ئەوەیـە بیدەیتـە دەسـت خـۆی، سـەد دەر سـەد دڵنیابیـت کـە ئـەوە ڕەوشـەنی مستەفای سـەقزییە، گـەر دڵنیانەبوویـت نەیدەیتـێ، چونکـە ئـەو شتانەی ئـەو بـە تـۆی دەڵێـت زۆر گرنگـن، زۆر زۆر. مەسـەلەکە هـەر ئـەوە نییـە تـۆ کتێبـی نۆتـەو سـی دی مۆسـیقاکانی بدەیتـێ، بەڵکـو شـتێکی تریشـە کـە ئـەو پێـت دەڵێـت.

مـن بـە سەرسـامییەوە پرسـیم: مەبەسـتت ڕاسپاردەیەکی تایبەتییـە، مـن بـۆ تـۆی بهێنمـەوە یاخـود چـی؟ بـەڵام گـەر ئـەو ڕاسـپاردەیەکی بـۆ تـۆ هەبوو، چـۆن بیهێنمـەوە؟ چـۆن پێتبڵێـم؟ ئایا مـن بەڕێزتـان دەبینمـەوە؟؟

گووتـی: نـا، نـا، هەرگیـز، مـن و تـۆ یەکتـری نابینینـەوە، مـن دەچـم بـۆ شـارێکی تـر، ئەمـە دواهەمیـن چاوپێکەوتنـی مـن و تۆیـە. لێرە بـە دواوە تـۆ

تـا هەتاهەتایـە مـن نابینیـت.

بـە كەمێـك پەشـۆكان و نـا حاڵیبوونـەوە، لێـم پرسـی: بـەڵام بڵێـم كـێ ئەم شـتانەی بـۆ ناردوویت؟

گووتـی: بڵـێ شـاروخی شـاروخ، شـاروخ مەهـدی شـاروخ... دڵشـكاوترین نەیژەنـی دونیـا تـا ڕۆژی قیامـەت.

مـن ویسـتم هەندێـك پرسـیاری لێبكـەم، دەسـتی گرتـم و گووتی: ئەفسـوس كـە كاتـم نییـە. دەبێـت بـڕۆم، دەبێـت بـڕۆم، تـۆ نازانیـت، مامۆسـتا چەنـد گرنـگ بـوو تـۆ ببینـم، نازانیـت چەنـد ماوەیەكـی كورتـم هەبـوو، زۆر شـتی گرنـگ لەسـەر ئـەم دیدارەی مـن و تـۆ وەسـتاوە، تـا دەگەیتـەوە كوردسـتان بیـری لێمەكـەرەوە، تێگەیشـتنی ئاسـان نییـە، بـەڵام جەلادەتـی كۆتـر هەمـوو شـتێكت بـۆ ڕووندەكاتـەوە، چـی پرسـیارێكت هەیـە، دەتوانیـت لـە جەلادەتـی كۆتـری بكەیـت، مـن هیـچ نیـم، مـن كـە ڕۆیشـتم ئیدی نامبینیتـەوە.

بـە بێسـەبرییەوە پرسـیم: تـۆ دەڵێیـت چـی؟ جەلادەتـی كۆتـر كێیـە؟ مـن كـەس ناناسـم بـەو نـاوەوە.

بـە خەندەیەكـی پـڕ نهێنییـەوە گووتـی: جەلادەتـی كۆتـر، ئـەو كوڕەیـە كـە لـە شـاری مۆسـیقاره سـپییەكانەوە هاتۆتـەوە.

گووتم: شاری چی؟

بە ئارامییەوە دووبارەیكردەوە: شاری مۆسیقاره سپییەكان.

لـەو كاتـەدا مـن گەیشـتبوومە بـەر دەمـی ئـەو جێگایـەی جانتـا چكۆلەكەمی لێباردەكـەم. زەرفـی سـپی، ئـەو سپیپۆشـە نەناسـە هـەر بەدەسـتمەوە بـوو، خانمێـك سـەیری پاسـپۆرت و بلیتەكـەی كـردم و جانتاكـەی كێشـاو لەسـەر باندێكـی لاسـتیكی درێـژ، ڕەوانـەی جێگایەكـی نادیـاری كـرد. كـە بۆردیـن كارتەكـەم وەرگـرت، ئاوڕمدایـەوە ویسـتم قسـەكانم لەگـەڵ ئاغـای شـاروخی شـاروخدا تەواویكـەم، كـە وەك شـێت و شـەوێر هاتـە بەرچـاوم، بـەڵام نەمابـوو. ئـەو مـاوە كەمـەی تـا فڕینـی فڕۆكەكـە لـە بەردەممـدا مابـوو، بـەر لـەوەی بچمە

ترانزێتـەوە، هەمـووی لـە لـوبـی ئـەو كـوڕە سپیپۆشـە گـەڕام و نەمدۆزییـەوە. بەردەمـی هەمـوو هێڵـە ئاسـمانییەكان گـەڕام، چەنـد كافیتریـا و وردە بازاڕێكـی نـاو فڕۆكەخانەكـە گـەڕام، لـە هیـچ جێگایـەك بەرچـاوم نەكەوتـەوە. بـەر لەوەی بچمـە شـوێنی چێكـی پاسـپۆرتەكان و دوا جێـگای پشـكنین، دووبـارە هەمـوو ئـەو زەرفـەم دەرهێنایـەوە و تەماشـامكردەوە، هیـچ شـتێكی تیانەبـوو جێـگای گومـان بێـت، شـتەكانم پێچایـەوە و ژمـارەی تەلەفونەكـەم بـە جیا لـە دەفتـەری ژمارەكانـدا نوسـی و لـە تەنیشـتییەوە نوسـیم: ڕەوشـەن مسـتەفا. بـە گشـتی پێموابـوو ئاغـای شـاروخ یەكێكـە لـەو كـوردە بەدبەختانـەی سـەفەری درێـژو نەبوونـی پەناهەندەگـی و فشـاری غوربـەت شـێتیانكردوە. مـن خـۆم دەردی گـەورەم هەبـوو، بێئـەوەی چیتـر بیریكەمـەوە لـە سـخێپوڵەوە بـەرەو دیمەشـق سـواربووم. ئـەوە سـەرەتای ئـەم ڕۆمانەبـوو كـە دواجـار لـە جێگایـەی دیكـەدا دوور لـە زەوی و زەمانـی ئاسـایی دواییدێـت.

* * *

مـن دوای گەڕانـەوەم بـە هەفتەیـەك، لـە دوكانـی دۆسـتێكەوە تەلەفونـم بـۆ ئـەو ژمارەیـە كـرد كـە لەسـەر زەرفـە سـپییەكە بـوو، كچێكـی ئێجـگار دەنـگ ناسـك و هێمـن هەڵیگـرت، وەك ئـەوەی لـە سـەرزەمینێكی تـرەوە قسـەبكات، وەك ئـەوەی لـە خەونێكـی قووڵـدا بێـت، وەك ئەوەی مۆسـیقایەكی تەلیسـماوی لـە دەنگیـدا بێـت و بیەوێـت بـەو مۆسـیقایە فریوتبـدات وەڵامیدامـەوە. مـن پێمگـووت: بەڕێـز، مـن نـاوم عەلـی شـەرەفیارە، لـە ئەڵمانیـا دەژیـم. ڕاسـپاردەیەكی تایبەتیـم بـۆ خانـم ڕەوشـەن مسـتەفا هەیـە، دەمەوێـت بـە شەخسـی لەگـەڵ ئـەو خانمـەدا قسـەبكەم، ئەگـەر گونجاوبێـت.

خانمـە دەنـگ ناسـكەكە گووتـی: بەڵـێ مامۆسـتا شـەرەفیار، مـن چاوەڕێمدەكریـت... هەمووومـان چاوەڕێـی تـۆ دەكەیـن؟

بەسەرسامییەوە گوتم: ببوورە نەمدەزانی هێند پەلەتانە، باوەڕکە نەمدەزانی، من کێشەو گێچەڵێکی زۆر لە ژیانمدایە، بەهەرحاڵ گەر ئێستا ئامادەبن، من هەر ئێستا دەتوانم شتەکان بگەیێنمە دەستتان. گەر ناونیشانی خۆتم بدەیتێ، ئێستا تاکسییەک دەگرم و دێم.

خانمەکە گوتی: نا مامۆستا، ئێمە چاوەڕێی خۆت دەکەین، ئێمە چاوەڕێی بەڕێزتان دەکەین، بە تایبەت جەلادەتی کۆتر.

جارێکی تر بەسەرسامییەوە پرسیم: ئاە خوای گەورە، جەلادەتی کۆتر کێیە؟ من هەمەو نیمە زەرفێکم بۆ تۆ هێناوەتەوە، کاتێکی زۆر کەمم هەیە، شەو و ڕۆژ بە ڕێگای دادگاو تاپۆو ئەمسەرەوسەرەوەم، دەمبوریت خانم... دەمبوریت... بەڵام خانم پێمبڵێ ئاغای جەلادەتی کۆتر چی لە من دەوێت؟

دەنگەکە بە هەمان هێمنی و ناسکی خۆیەوە، بێ پەشۆکان گوتی: دەزانین هەموو دەزانین کە تۆ چەند سەرقاڵیت، بەڵام شتێکی ئێجگار گرنگە، حیکایەتەکە شتێکی پڕ نهێنییە، تێدەگەیت مامۆستا، ئێمە هەموومان پێشتر کتێبەکانی تۆمان خوێندۆتەوە، هەموومان، ئەوە بڕیارێکی بە کۆمەڵ بوو، تۆ تەنیا کەسێکی دەتوانیت بینوسیت... تەنیا کەسێکیت.

من پیاوێکی بێسەبریووم، خەڵکانێکی زۆر منیان بە باشترین نوسەری ئەو زەمانە دەزانی، بەڵام دەبێت بڵێم کە ئەوکات لە حاڵێکدا نەبووم بیر لە نوسین بکەمەوە، نوسین مایەی هەموو دەرد و بەڵا گەورەکانی ژیانی من بوو، ئاە... بوەستن زۆر نوسەری تریش هەن وایان گوتووە، بەڵام کەس بە ئەندازەی من دەردی لە نوسین نەبینیوە، پتر لە شەش مانگ بوو هیچم نەنوسیبوو، هێندەی قەڵەمم دەگرت بەدەستمەوە، کارەساتێک لە ژیانمدا ڕوویدەدا، هێندەی کتێبێکم تەواودەکرد شتێکی ترلژیدی ڕۆحمی هەڵدەتەکاند. نا باکم بەو جنێو و درۆیانە نەبوو کە لەوسەردەمەدا ڕۆژنامەکان لەسەر من بڵاویاندەکردەوە، پێموابوو هەموو تێکستێکی گەورە

هەمیشە کۆمەڵێک دوژمنی کەمژەی هەیە، منیش ڕۆژێک لە ڕۆژان لەو نوسەرانە نەبووم خەڵکی کەمژە بمترسێنن، بە پێچەوانەوە هێزی خۆم لەوەدا دەبینی کە توانایەکی سەرسوڕهێنەرم تێدایە بە پیاوانی بێدەماغ پێبکەنم و لەسەر ئیشکردنی خۆم بەردەوام بم. بەڵام هێدی هێدی نوسینم وەک ڕێگایەک دەبینی بەرەو مەرگ.

بە کەمێک کەمتەرخەمی و گاڵتەجارییەوە گووتم: ئەها خانم، دەترسێم تۆش لەوانە بیت، کە ژیانی خۆیانم بۆ دەخەنە سەر دووپەڕە و پێمدەڵێن، ئاغای شەرەفیار بمانکە بە ڕۆمان، بمانکە بە چیرۆکێکی خۆت، عەزیزم گەر مەسەلەکە بەوجۆرەیە لە بیریکە، چونکە من وازم لە نوسین هێناوە، چاکتر وایە چیرۆکنوسێکی تر بدۆزیتەوە. تێناگەم ئەو دەردە چییە بڵاوبۆتەوە، چما چی بووە وا هەموو خەڵک لە ناکاو دەیانەوێت ببن بە پاڵەوانی چیرۆک؟

کچەکە بەسەبرێکەوە پێکەنی و گووتی: مامۆستا دەبێت بە هێمنی قسەبکەین، هەموو دەزانین ئاسان نییە مرۆڤێک ڕازیبکەیت کتێبێک بنوسێت، هەموو دەزانین. بەڵام...

من زۆر ئارەزووی قسەکردنم نەبوو، هەناسەیەکم هەڵکێشاو کەمێک خۆم ئارامکردەوەو گووتم: خانم، بە هەرحاڵ کە شتەکانم بۆ هێنایت، دەتوانین زیاتر قسەبکەین... دەتوانیت هەموو شتێکم بۆ ڕوونبکەیتەوە، مەترسە، من گوێگرێکی باشم. هەمیشەش بەمجۆرە بێسەبر نیم.

دوای دوو ڕۆژ لەو پەیوەندییە بۆ یەکەمجار جەلادەتی کۆترم بینی. سیارە هێشتا زۆرزووە چیرۆکی چاوپێکەوتنی خۆم و جەلادەتی کۆترتان بۆ باسبکەم، کە بە جۆرێک لە جۆرەکان دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەم ڕۆمانەوە، بەڵام وەک سەرەتا دەبێت بڵێم کە ئەم ڕۆمانەی ئەمڕۆ ئێوە دەیخوێننەوە، بەرهەمی ئەو چاوپێکەوتنە خەیاڵی و سەیرەبوو کە چەند ساڵێک لەمەوبەر لە نێوان من و ئەو کوڕەدا ڕوویدا، کە ئەو سەردەمانە

لە نێوان کۆمەڵێک جیهانی جیاواز جیاوازدا لە گەرمەی هاتوچۆدا بوو. من لەگەڵ هەموو بێکاتی و دەردەسەرییە گەورەکانی ژیانمدا، نواجار دەبایە کتێبێکی تر بنوسم، ئەوە یەکەمجاریوو قەبووڵیبکەم کتێبێک بنوسم پاڵەوانە ڕاستەقینەکەی بناسم و بینیبێتم، قەبووڵیبکەم ڕۆڵی خۆم وەک نوسەر کورتبکەمەوە و دەسەڵاتێکی زۆر بدەم بە یەکێک لە پاڵەوانەکان. تەنیا شتێک ئێستا پێویستە بیزانن ئەو ڕێکەوتنە سەیرەیە کە لەسەرەتاوە لەگەڵ جەلادەتی کۆتردا بەستم، ئەوەی من مافی ئەوەم هەبێت، بەشێکی حیکایەتەکە بگێڕمەوە، مافی ئەوەم هەبێت لەو بەشانەدا کە ئەو دەیگێڕێتەوە دەسکاری داڕشتن و شێوازی حیکایەت و سروشتی زمان بکەم. مافی ئەوەم هەبێت لە کوێدا ویستم من ببم بە حیکایەتخوان، تەواو وەک شانۆگەرییەک کە دەرهێنەرەکەی خۆی لە نێو شانۆگەرییەکەدا دەبێتە ئەکتەر و حیکاتخوان. نواجار من و ئەو بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەم کتێبەمان بەشکرد.. ئێستا دڵنیام هەمووتان دەپرسن، جەلادەتی کۆتر کێیە؟ چ جۆرە مرۆڤێکە؟ چ جۆرە ژیانێک ژیاوە شایستەبێت مرۆڤ بیکاتە ڕۆمان؟ چاکتر وایە لەسەرەتاوە خۆم هەموو شتێکتان بۆ بگێڕمەوە.

# ونبوون لە شارێکی خەیاڵیدا لە باشوور

لـە ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٧٠ دا، دوای شـەش مانـگ لـە لەدایکبوونـی جەلادەتـی کۆتـر، خاتـوو «مەریـەم فەیـزی» بـە نەخۆشـییەکی نەزانـراو کۆچی دوایکـرد. پێدەچێـت بەشـێک لـە هـۆی مردنەکـەی بگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو دەرد و مەراقـە زۆرەی دوای جیابوونـەوەی لـە هـەردوو کوڕەکـەی تووشـی هاتـووە. بـە سـۆنگەی هـەر شـتێک بێـت، باوکـی جەلادەتـی کۆتـر، دوای شـەڕێکی درێـژ و بێحاسـڵ لەگـەڵ خزمانـی خۆیـدا، سـوێندێکی گـەورە دەخـوات کـە تامـردن نەهێڵێـت مەریـەم چـاوی بـە دوو کوڕەکـەی بکەوێـت. سـوێندێکی بێڕەحمانـە کـە دەبێتـە مایـەی مردنـی خانمێکـی ناسـک کـە شایسـتەی جـۆرە مەرگێکـی لـەو چەشـنە نییـە. کـە مەریـەم دەمرێـت، لـە گوندێکـی دووری سـەر سـنووردا دەخرێتـە ژێـر خـاک و پـاش ماوەیەکـی زۆر کـورت لـە بیـر دونیـا دەچێتـەوە. بەوجـۆرە جەلادەتـی کۆتـر هەرگیـز دایکـی خـۆی نابینێـت، ژنێـک کـە سـەفەرێکی کـورت بەسـەر زەویـدا دەکات و دەمرێـت، بێئـەوەی وێنەیەکـی چکۆلانـەش دوای خـۆی جێبهێڵێـت. بـەڵام پێدەچێـت ئـەو ژنـە کـە ژیانێکـی وا کـورت و ناچیـز ژیـاوە، ئیرادەیەکـی قووڵـی لـە منداڵـە چکۆلەکـەی خۆیـدا جێهێشـتبێت، ئیرادەیەکـی ئاسـنین بـۆ پەڕینـەوە لـە مـردن و ڕزگاربوون لـە فێـڵ و تەڵـە و مەکـرە کوشـندەکانی. ئیرادەیـەک هێـدی هێـدی لـە نـاو ڕەوتـی ئـەم ڕۆمانـەدا زیاتـر و زیاتـر ئاشـکرادەبێت، بـە جۆرێـک مـرۆڤ لـە کۆتاییـدا وەسوەسـە و خەیاڵـی ئـەوەی لادروسـت دەبێـت کـە لـە نێـوان مردنـی

بێدەنگ و تراژیدی خانمی مەریەمی فەیزی و توانای جەلادەتدا لەسەر بڕینی سنوورەکانی مەرگ و گەڕانەوە جۆرە پەیوەندییەک هەبێت، کە نهێنییەکەی لەدەرەوەی دەسەڵات و توانای ناچیزی ئێمەیە لەسەر تەفسیر.

دەبێت بڵێم جەلادەت کە نزیکی دە ساڵ لە براکەی منداڵترە، لەگەڵ مردنی دایکیشیدا منداڵییەکی ناخۆش نەژیا، لە ژێر چاوەدێری باوکی و برا گەورەکەیدا، کە لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا ژنی هێناو کەوتە بەڕێوەبردنی دوکانێکی گەورەی ئاردفرۆشی، تا ئەندازەیەک منداڵییەکی بێگەرد و کەم غەمی هەبوو، بە جۆرێک مرۆڤ دەتوانێت بڵێت ساڵانی سەرەتای ژیانی بەراورد بەو تراژیدییە سەیر و گەورانەی دواتر هاتنە ڕێگای خۆشترین و باشترین ڕۆژەکانی ژیانی بوون. تا تەمەنیشی بوو بە دە ساڵ جگە لە ڕوداوێکی سەیر و ترسناکی ئوتومبێل شتێکی تراژیدی زۆر گەورە لە ژیانیدا ڕوینەدا. بەڵام دوای مردنی باوکی گەلەک غەریزەی شەیتانی و شەڕانی لە سوهەیلەی براژنیدا دەرکەوت، کە تا ئەو کات شاردراوە و نەبینراوبوون. هەموو کێشەکە پەیوەندی بەو فلووتە چکۆلەیەوە هەبوو کە جەلادەت لە تەمەنی هەشت ساڵیدا لە هەلومەرجێکی سەیردا لە مردوویەک بۆی مایەوە. فلووتێکی سپی بوو، لە مامۆستا «سەرمەد تاهیر» بەجێما، ئەو پیاوەی دراوسێ ماڵیان بوو، پیاوێکی باریکی ڕیش درێژ، کە بەردەوام لە حەوشەکەی خۆیاندا لە ژێر درەختێکدا دادەنیشت و فلووتی لێدەدا. یەک دارتووی گەورەبوو، زۆر گەورەبوو. مامۆستا سەرمەد بەردەوام لە ژێر ئەو درەختەدا دادەنیشت و مەستانە مۆسیقای لێدەدا. جەلادەت لە شەش ساڵییەوە بەردەوام دەچووە سەر پەیژەیەک و لەسەر دیواری نێوان هەردوو حەوشەکەیان دادەنیشت و گوێی لە مۆسیقا دەگرت. مامۆستا سەرمەد هەرکاتێک فلووتەکەی دابنایە، زەردەخەنەیەکی بچوکی بۆ جەلادەت دەگرت و پاڵیدەدایەوە بە کورسییەکەیەوە و چاوی لێکدەنا. کەس بیری نایەت مامۆستا سەرمەد جارێک قسەی لەگەڵ جەلادەتی منداڵدا

کردبێت، پەیوەندی ئەو دووانە هەرگیز لە سنووری ئەو زەردەخەنەیە تێنەپەڕیوە، کەسیش بیری نایەت ئەو پیاوە جگە لە پورێکی پەککەوتە کەسی تری هەبووبێت. بەیانییەک خەڵکانێک لەسەر هات و هاواری پورە پەککەوتەکەی بەئاگاهاتنەوە کە وەک شێت پەڕیبووە ناوەڕاستی کۆڵانەکە و لە خۆیدەدا، ئەو بەیانییە دراوسێکان مامۆستا سەرمەدیان بە خنکاوی لەدەستێک بیجامەی سپیدا «سپی وەک سپێتی کفن» بە دار تووەکەوە دۆزییەوە. پەتێکی ئەستووری هەڵواسیبوو، بە بڕوا و قەناعەتێکی بە هێزەوە، بە ئیمانێکی نەپساوەوە بە مەرگ، بێ هیچ ترس و دوودڵییەک خۆی کوشتبوو. تاکە شتێک لە دوای بە جێمابێت ئەو فلووتە سپییە بوو، کە بەر لە مردنی لە زەرفێکی تایبەتیدا پێچابوویەوە و بەدەستوخەتێکی جوان لەسەری نوسیبوو «ئازیزان، تکایە هەر کەسێک لاشەکەی منی داگرت، ئەم فلووتە بدات بە جەلادەتی بچکۆلە، کوڕە چکۆلەکەی کاک «ئیسماعیلی کۆتر» ی دراوسێمان». سەیربوو مرۆڤێک بە جۆرە وەسێتێکی وەها کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێت. بەڵام لەوە سەیرتر ئەوەبوو کە بۆ یەکەمجار فلووتەکەیان دایە دەست جەلادەتی بچکۆلە ڕاستەوخۆ دەیتوانی ئاوازی قەشەنگ دەربهێنێت، هێندەی لێوی دەنا بەو ئامێرەوە مۆسیقایەکی جوانی لێدەهاتەدەرێ کە هەر لەو کاتەوە خەڵکانی سەرسامدەکرد. توانای منداڵەکە ئەوکات بە تەواوەتی دەرکەوت کە دوای مردنی مامۆستا سەرمەد تاهیر بەردەوام لەسەر دیوارەکە ئەو ئاوازانەی عەزفدەکردەوە کە بەر لە مەرگ مامۆستا سەرمەد ژەنیبوونی. بەهرەی مۆسیقی منداڵەکە بەجۆرێک سەرسوڕهێنەر بوو، باوکی هەر زوو خستییە کۆرسێکی تایبەتی مۆسیقاوە، کە لەو سەردەمەدا یەکەمجاربوو جۆرە کۆرسێکی لەو چەشنە لەو شارەی ئێمەدا دەکرایەوە. لەو کۆرسەوە ناوبانگی جەلادەتی کۆتر وەک منداڵێکی بە توانا بڵاوبووەوە، کاتێک لەگەڵ تیپێکی مۆسیقاشدا تووشی کارەساتێکی گەورەبوون، ئەو وەک تەنیا منداڵی زیندوو لە تراژیدیایەکی

گـەوره شـوێنی موحیبـەت و سـۆزی خەڵـک بـوو، کـە ماوەیەکـی کـورت بێیەهانـە وەک پاڵەوانێکـی نەتەوەیـی تەماشـایاندەکرد، ئـەو کات تیپێکـی مۆسیقای منداڵانـی کوردی بیتوانیبایـە لـە مێترۆپۆلـی داگیرکەرەکانـدا بچێتـە پێشبرکێوە، وەک فەتحێکـی نیشـتیمانی سـەیردەکرا. مردنی هەمـوو هاوڕێکانی ناوبانگێکـی زیاتـری بـۆ جەلادەتـی منـداڵ دروسـتکردبوو کـە تاکـە کەسـێک بوو لەسـەر زەمینـی مـردن گەڕابـووەوە. بـەڵام دوای ئـەو ڕووداوە، پلـەی تەنهایـی و غوربەتـی ئـەو منداڵـە گەیشـتە ئاسـتێکی ترسـناک. لـەو کاتەشـەوە بـە جۆرێکـی سـەیرتر ژیانـی بـۆ مۆسـیقا تەرخانکـرد، زۆربـەی ئامێـرەکان فێربـوو، شـەو و ڕۆژ لـە تۆمارێکـی بچوکـەوە گوێـی لـە سـۆناتاو سـەمفۆنیاکانی دونیـا دەگـرت، بـە بیسـتن دەیتوانـی پەنجـەی عازیفـەکان لـە یەکتـر جیابکاتـەوە، دەیتوانـی هەمـوو مۆسـیقارە گەورەکانـی دونیـا و ئاوازەکانیـان لـە دوورەوە بناسـێتەوە. بـەڵام ژیانـی جـەلادەت لـە منداڵییـەوە خاڵـی نەبـوو لـە هەنـدێ شـتی سـەیر. سـەیرترین شـتێک سـەرەتای هاودەمـی و هاوڕێتـی بـوو لەگـەڵ گەنجێکـی دیکـەدا بـە نـاوی «سـەرهەنگ قاسـم». ڕۆژێـک لـە ڕۆژان لـە تەمەنی سـیازدە سـاڵیدا کاتێـک جەلادەتـی کۆتـر لـە دوکانـی ئـارد فرۆشـییەکەی باوکی لـە بـەر دەرگا لەسـەر تەنەکەیـەک دانیشـتبوو و شـیعرێکی کـوردی لەبەردەکرد، بـە جۆرێـک لـە نـاو جیهانـی قەسـیدەکەدا نوقمبووبـوو، لـە نـاکاو تـەواوی ئـەو دونیایـەی دەوروبـەری فەرامۆشـکرد و هەمـوو جەنجاڵـی بـازاڕ لـە سـەریدا وەک کوژانـەوەی مۆمێـک و کپبوونـی لـە نـاکاوی بڵندگۆیـەک خامـۆش بـوو، لـەو بێدەنگییـە گەورەیـەدا جـەلادەت گوێـی لـە مۆسـیقایەک بـوو، گوێـی لـە دەنگـی فلووتێکـی دووربـوو. ئـەو ڕۆژە وەک یەکێک لە شـوێنێکی نادیـارەوە بانگیبکات، ئـەو فلووتـە دوورە بانگیکـرد، کتێبەکـەی داخسـت و وەک بـە دەم خـەوەوە بـڕوات، دوای دەنگـی ئـەو مۆسـیقایە کـەوت، شـەقام بـە شـەقام و کوچـە بـە کوچـە ڕۆی، هەندێـک گەڕەکـی شـاری بـڕی کـە پێشـتر نەیبینیبـوون، هەندێـک کۆڵانـی باریکـی تەیکـرد و بـە نـاو هەندێـک کوچـەی بـێ زێرابـدا تێپـەڕی و

دواجار لە بەردەم کەلاوەیەکدا وەستا، لە نزیک ئەو کەلاوەیەوە یەکێک لە سەربانێکی بەرز فلووتی لێدەدا، یەکێک تەنیا سەری دیاربوو، کوڕێکی قژ زەردی چکۆلانەبوو، پێدەچوو کەمێک لە جەلادەتی کۆتر مندالْتر بێت. تا مانگ هەلْهات، جەلادەت لەو کەلاوەیەدا وەستاو گوێی لە مۆسیقای ئەو مندالْە دەگرت کە مەستانە و بێپشوو ئاواز لە دوای ئاواز دلْی دەخرۆشاند.
ئەو ڕۆژە جەلادەت هیچی نەگووت، بەلاْم بۆ ڕۆژیی دوایی بە خۆی و فلووتەکەیەوە گەڕایەوە بۆ ئەو کەلاوەیە و لەگەلْ دەست پێکردنی مندالْە قژ زەردەکەدا جەلادەتیش هەمان شێوە و بە هەمان ئاواز دەستی پێکرد. کوڕە قژ زەردەکە پاش ماوەیەک وەستاو لە حەشارگەکەی خۆیەوە سەری دەرهێنا و بە زەردەخەنەوە گووتی: برادەر، تۆ فلووتێکی جوان دەژەنیت، من ناوم سەرهەنگ قاسمە... تۆ چۆنی برادەر؟ بۆ نایەیتە سەرێ پێکەوە مۆسیقا لێبدەین؟.
جەلادەتی کۆتر، پێیگووت: من ناوم جەلادەتی کۆترە، گەر تۆ حەزبکەیت، پێمخۆشە پێکەوە مۆسیقا لێبدەین.
ئەوە سەرەتای هاوڕێتی دوو مێردمندالْە کە مۆسیقا تا هەتاهەتایە پێکیانەوە گرێدەدات. لەسالْی داهاتوودا جەلادەتی کۆتر خۆی دەگوازێتەوە بۆ هەمان ئەو قوتابخانەیەی سەرهەنگ قاسمی لێیە. پێکەوە لە ئاهەنگەکانی قوتابخانەدا چەپلْەو ئافرەینی خەلْکانێک دەبەنەوە کە لە ڕاستیدا هیچ لە مۆسیقا نازانن، پێکەوە بە ڕێگادا دەڕۆن و مۆسیقا لێدەدەن، لە ڕێگای مۆسیقاوە قسە لەگەلْ یەکدا دەکەن، بە شەقامەکانی شاردا دەڕۆن و پێکەوە فلووت لێدەدەن، لە ژێر باراندا دەڕۆن و فلووت لێدەدەن، شەو هەر یەکەیان لە سەربانی خۆیانەوە لەمسەرەوسەری شاردا دەوەستن و لە ڕێگای مۆسیقاوە لەگەلْ یەکتر و لەگەلْ بالْندەکان و ئەستێرەکاندا قسەدەکەن. لەو ڕۆژانەدا باوکی دەمرێت و سوهەیلەی براژنی چڕنوکەکانی خۆی دەردەخات و لەو شەوە پڕ مەترسی و کوشندانەی شاردا چەندین

جار جەلادەت دەکاتە دەرێ. لەو شەوانەدا کە هێزە تایبەتییەکانی دەوڵەت بەردەوام لە شاردا هاتوچۆدەکەن و تەقە لە هەموو ڕۆحلەبەرێک دەکەن، هەندێجار جەلادەت شەوان تابەیانی بە کوچەکاندا دەسوڕێتەوە و فلووت لێدەدات. هەندێک شەو دایک و باوکی سەرهەنگ قاسم دەرگای بۆدەکەنەوەو لای سەرهەنگ دەخەوێت. بابی سەرهەنگ پیاوێکی سەرڕووتاوەی چکۆلەیە کە لە خەستەخانە ئیشدەکات، دایکی ژنێکی گەنجتر و جوانترە کە نیگایەکی پڕ سۆزی هەیە، بەڵام چاوانی هەمیشە ترسێکی تێدایە کە مرۆڤ تێناگات لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە. دوو ڕۆحلەبەرن بۆ مۆسیقا دروستبوون، هەردووکیان بە جۆرێکی سەیر لە وانەکانی قوتابخانەدا دەدەنە دواوە بە تایبەت جەلادەت کە دەبێتە قوتابییەکی نەزان و بێبەهرە، بەڵام هەردووکیان شارەزاییەکی بێوێنە لە هەموو ئامێرەکاندا پەیدادەکەن، هەردووکیان شێتانە حەز لە مۆزارت دەکەن. کە پێکەوە بە شەقامەکاندا دەڕۆن و چاو لێکدەنێن و بەدەم ڕۆیشتنەوە ئاوازەکانی لێدەدەن. سەرسامی مامۆستا پیرەکانی مۆسیقا و گەنجانی دیکەی مۆسیقار بۆ خۆیان دەبەنەوە کە وەک دوو دیاردەی بێوێنە لێیاندەڕوانن. پتر لە دوو شێت دەچن نەک لە دوو مۆسیقار، ماوەیەک وایان لێدێت لە جل و بەرگی دڕاودا دەسوڕێنەوە، کەمخۆراکی لاوازیاندەکات. دایک و باوکی سەرهەنگ کە ترسێکی گەورەیان لەسەر ژیان و پاشەڕۆژی کوڕەکەیان تیادروستدەبێت، هەوڵدەدەن بە هەر شێوەیەک بووە کۆتایی بە هاوڕێتییەک بهێنن کە پێیان وابوو کوڕەکەیان بەرەو کارەسات و دارمان دەبات نەوەک بەرەو نێوبانگ و بەختەوەریی. تەنیا کەسێک کە کۆمەکیاندەکات ئەو مامۆستا قەڵەوەپیرەیە کە بەردەوام کلیلی هۆڵی چالاکی قوتابخانەکانیان دەداتێ تا لە کاتی پێویستدا لێی بخەون. ئێواران هەموو ئامێرەکانیان دەخاتە بەردەست و دەڵێت: کوڕم مەشقبکەن، مەترسن و عەزفبکەن، چاو بنوقێنن و عەزفبکەن و هەقی هیچتان نەبێت. شەوان پێکەوە تا بەیانی عەزفدەکەن، گوێ لە مۆسیقا

دەگرن، هەمیشـەش وا قسـەدەکەن وەک چاوەڕوانـی کەسێک بن لـە دونیایەکی تـرەوە بێـت و فێـری مۆسـیقایان بـکات. بـەڵام ڕۆژێـک ئـەو پیـاوە مۆسـیقارە قەڵـەو و دڵباشـە لەسـەر چاکەکانـی خـۆی سـزادەدرێت و دەیگوێزنـەوە بـۆ شـارۆچکەیەکی دوورو پیاوێکـی باریکـی گـورگ ڕوخسـار دادەنێـن کـە یەکـەم ئیشـی ئەوەیـە جـەلادەت و سـەرهەنگ بکاتـە دەرێ. کـە لـەوێ دەردەکرێـن، جـەلادەت شـوێنێکی ئەمیـن و بەردەوامـی نامێنێـت ڕووی تێبـکات، جەودەتـی بـرای هەندێـک شـەو جێگایدەکاتـەوەو هەندێـک شـەو دەریدەکات. لـە قوتابخانە سـاڵ دوای سـاڵ جگـە لـە عەرەبـی و ئینگلیـزی و کـوردی لـە هەمـوو وانەکانـی تـردا دەکەوێـت، مامۆسـتاکان وەک هەرزەکارێکـی ناتـەواو تەماشـایدەکەن کـە ئاڕاسـتەی ژیانـی خـۆی دۆڕانـدوە. هەندێـک شـەو بـە خـۆی و فلووتەکەیـەوە دەچێتـە نـاو دارسـتانەکانی قـەراغ شـارو لـە ژێـر درەختەکانـدا عەزفـدەکات و دەخەوێـت. دیـارە هەمووتـان دەزانـن لـەو زەمانـی جەنگـەدا کـە لەسـەرێکەوە وڵاتـی ئێمـە دەسـووتاو لەسەرێکیشـەوە لەسـەر سنوورەکانی ئێـران جەنـگ بـە خوێناویتریـن شـێوە بەردەوامـە، خەوتنـی گەنجێـک لـە نێـو کۆمەڵێـک داری ڕووتەنـی قـەراغ شـاردا چەنـد ترسـناکە. هەندێجـار لـەو بینایانـەدا کـە تـازە دروسـتدەکرێن پاسـەوانەکان جێگایدەکەنـەوەو لـە نـاو دارو پـەردووی خانـووە ناتەواوەکانـدا دەژی. ئـەو ماوەیـە سـەرهەنگ قاسـم بـە ناچـاری دەگەڕێتـەوە بـۆ ماڵـەوەو بـە نهێنـی درێـژە بـە هاوڕێتـی خـۆی لەگـەڵ جەلادەتـدا دەدات. دۆخـی هاوڕێکـەی ناڕەحەتیـدەکات، زۆر ڕۆژ ئـەو نانـی لـە ماڵـەوە بـۆ دەدزێـت، هەندێجاریـش هەندێـک مۆسـیقاری دیکـە یارمەتیـدەدەن کـە پێیـان خەسـار و حەسـرەتە مۆسـیقارێکی وا منـداڵ دەبینـن مۆسـیقا بـە دەردگەلێکـی وەهـا سـەختی دەبـات. بێئـاگای خـۆی نـاوی وەک بلیمەتێکـی شـێت بڵاودەبێتـەوە. تـا ئـەو ئێوارەیـەی ئیسـحاقی لێوزێڕینیش دەردەکەوێـت هیوایـەک لـە ژیانیـدا نییـە. بـەڵام ئـەو ڕۆژەی ئیسـحاق دەرکـەوت هەمـوو شـتەکان گـۆڕدرا.

ئـەو ئێوارەیـەی کـە ئیسـحاق دەرکـەوت، لـەو ئێـوارە دەگمەنانـە بـوو کـە

جەلادەت بێ هیچ غەم و ترسێک لە چاوانیدا، دەستی خستبووە گیرفانی و لە قەیسەرییەکاندا پیاسەیدەکرد، دوو ناسیاوی لەگەڵدا بوو کە هەر سێکیان پێکڕا باسی سەرمای زستانیان دەکرد، هەڵبەت هیچ کەس لە جەلادەتیش باشتر نەبوو بۆ وەسفکردنی سەرمای زستان کە لەو دوو ساڵەی دواییدا وەک هاوڕێیەکی بەوەفا چووبووە ئێسک و خوێنیەوە. دوو دۆستەکەی پەیتاپەیتا دەیانویست بابەتەکە بگۆڕن و باسی مۆسیقا بکەن، بەردەوام باسی ئاوازی نوێیان لە جەلادەت دەپرسی، باسی گۆرانیبێژە کۆن و تازەکان، جەلادەتیش بەردەوام باسی زستانی دەکرد، ئەو کات زستان ترسناکترین بابەتی ژیانی جەلادەت بوو، کە پێیوابوو لەگەڵ نزیکبوونەوەی تەواوەتی بەهاریشدا، هێشتا مەترسی مردن لە سەرمادا هەر بەهێزە. لە بەردەم عەترفرۆشێکدا کە ڕۆژانە جەلادەت بە پێشدەمیدا دەڕۆی، ئیسحاقی لێوزێڕین لێی نزیکبووەوەو خۆی وەک مامۆستایەکی پیری مۆسیقا پێناساند. ئیسحاق دوور بە دوور ناوی جەلادەتی بیستبوو، خەڵکانێک وەک بلیمەتێکی منداڵ و خەڵکانێکی تریش وەک شێتێکی تازە بۆیان باسکردبوو، کە ئێستا جەلادەتی دەبینی ئێجگار لەوە جوانتربوو کە چاوەڕوانیدەکرد، لەوەش هێمنتربوو کە بیستبووی، هەندێک لە شێتییەکانیشی بەدیدی ئەو هیچ نەبوو جگە لە کاریگەریی لاوەکی بلیمەتییەکەی. ئیسحاقی لێوزێڕین «بەقسەی خۆی» لەسەر سنوورەوە هاتبوو تا بەدوای دوو قوتابی مۆسیقادا بگەڕێت، بەڵکو بتوانێت مۆسیقاو حیکمەتی خۆییان فێربکات «من ئێستا لە ڕاست و دروستی ئەو حیکایەتەش بە گومانم». دوو مۆسیقار ئامادەبن هەموو شتێک توڕبدەن و تەنیا بۆ مۆسیقا بژین. هەندێک شار گەڕابوو، بەڵام لە هیچ جێگایەک جۆرە مۆسیقارێکی وەهای نەدیبوو. یەکبینینی ئیسحاقی لێوزێڕین و جەلادەت بە پیاسەیەکی دوورو درێژ کۆتاییهات، پیاسەیەک بە درێژایی شەوو بەیانی ڕۆژی داهاتووش هەر بەردەوامبوو، بە درێژایی ئەو پیاسەیە ئیسحاق باسی مۆسیقای

دەکرد و جەلادەت وەک لە ژێر کاریگەری سیحرێکدا بێت، دەڕۆیشت و گوێیدەگرت. وشەکانی ئیسحاق لای جەلادەت قووڵترو کاریگەرتربوون لە هەر مۆسیقایەک، پیاوێک بوو لەوانەی لە ڕێگای ڕستەکانییەوە دەیتوانی وات لێبکات وەک گەڕیدەیەکی نەسرەوت وڵات بە دوای وڵات دوایبکەویت. ئەو ڕۆژە جەلادەت بڕیاردەدات بە دوای تێگەیشتنێکی تازەو فێربوونێکی قووڵتردا بۆ مۆسیقا دوای ئیسحاقی لێوزێڕین بکەوێت. دیارە لەسەرەتاوە وەرگرتنی سەرهەنگ قاسم لە تیپەکەدا ئاسان نەبوو، سەرهەنگ تاکە منداڵی دایک و باوکێکی سەختگیربوو. خۆی قوتابییەکی زیرەکتربوو لە جەلادەت و دوو ساڵ لە پێشتربوو، بەڵام شەیدایی بۆ مۆسیقا و بەهرەی گومانی لەسەر نەبوو. دەبێت بڵێم کە جەلادەت لەسەرەتاوە دژی ئەوەبوو سەرهەنگ لە ماڵ و قوتابخانە ڕابکات و خۆی بخاتە دەست سەرکێشییەکی وەهاوە کە ئەنجامەکەی دیارنەبوو، ئەو پێیوابوو هەلومەرجی ژیانی ئەوان بە جۆرێک جیاوازە دەبێت لەو جێگایەدا خوداحافیزیبکەن و هەر یەکەیان ڕێگای خۆی بگرێت. خودایە نەدەچووە عەقڵەوە کە قوتابییەکی بەویقاری وەک سەرهەنگ لە قوتابخانە هەڵبێت و دوای مامۆستایەکی مۆسیقا بکەوێت، بەڵام سەرهەنگ لەو چەند ساڵەدا سەرسەختییەکی زۆری نیشاندابوو، سەرپێچی بەردەوامی لە دایک و باوکی وایکردبوو پتر لە هەر کەسێکی دی زەجر بکێشێت، ئەوەی باوکی ئامێرەکانی بۆ دەشکاند، نەیدەهێشت بڕواتە دەرەوە، هەندێجار بە چەندین سەعات لە ژوورێکدا دەرگای لێدادەخست، لێی حەرام بوو جەلادەتی کۆتر ببینێت، لێی حەرام بوو بچێتە سەربان و مۆسیقا عەزفبکات، نەبا ئاوازەکانی وەسوەسە و خەیاڵی خراپ لەسەری کچە دراوسێکاندا دروستبکەن. هەموو هۆکاری گەورەن وایان لە سەرهەنگ قاسم کرد، ئەگەرچی یەک ساڵی مابوو بگاتە زانکۆ، واز لە ماڵ و قوتابخانە بهێنێت و خۆی بداتە دەست گەشتێک بەرەو نادیار... ئەو ئێوارەیە کە تەواوی چیرۆکی سەفەرەکەی جەلادەتی گوێ لێبوو، کە گوێی بۆ ڕستە

سیحراوی و پڕ حیکمەتەکانی ئیسحاقی لێوزێڕین شلکرد، گرنگترین بڕیاری خۆیدا. هەر ئەو شەوە خۆی ئامادەکرد و بەیانی کتێبەکانی قوتابخانەی لە ژێر مێزی تەلەفزیۆنەکەدا جێهێشت و بێئەوەی کەس بیبینێت لە جلە کوردییەکانیدا هاتەدەرەوە و ئیدی هەرگیز نەگەڕایەوە بۆ ماڵ و نەچووەوە بۆ قوتابخانە. لەگەڵ هاتنەدەرەوەی سەرهەنگ قاسمدا، لەگەڵ ئەو ساتەدا کە دەرگاکەی ماڵەوە دادەخات و یەکەم هەنگاو دەنێت بەرەو دونیایەک کە بە دونیای شتە نەمرەکانی دەزانێت، چیرۆکەکەی ئێمە بە تەواوەتی دەست پێدەکات. چیرۆکی دوو گەنج کە واز لە هەموو شتێک دەهێنن و دوای مامۆستایەکی پیری مۆسیقا دەکەون. ئەوە سەرەتای ڕاستەقینەی چیرۆکەکەی ئێمەیە. کە ئەگەر سەبرتان هەبێت و لەگەڵمدا بەردەوامبن، بە ڕێگایەکی درێژدا دەتانبەم، کە لە ڕاستیدا ڕێگای مۆسیقارێکە لەسەردەمی مردن و قڕانکردنی مرۆڤدا بیر لە نەمری دەکاتەوە. بە هەرحاڵ پێویست ناکات لە ئێستاوە سەری خۆتان بە هەموو ئەو ناوانەوە بێشێنن کە لەم پێشەکییە زۆر خێرایەدا بەرگوێتان کەوت، بۆ نمونە جەودەتی کۆتر و سوهەیلەی ژنی، دوو کاراکتەرن دەتوانن تەواو لە بیریانبکەن، چونکە هەرگیز شوێنێکی گرنگیان لەم ڕۆمانەی ئێمەدا نییە، من هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نەبووم ئەمجۆرە مرۆڤە خراپانە شوێنێکی باشیان لە ڕۆماندا هەبێت، لە بیرتان نەچێت کە ئەوان لە شەوانی سەرماو تەقەو پڕ مەترسیدا جەلادەتیان لە ماڵ کردۆتەدەرەوە، بەبرسێتی دەریانکردوە، لە بەشە تایبەتییەکەی خۆی لە دوکانی ئاردفرۆشییەکە مەحرومیانکردوە. ئەوانە هەموو بەهانەن مرۆڤ بەوە تۆڵەیان لێبکاتەوە کە لەم کتێبە تایبەتەدا لەسەر ژیانی جەلادەتی کۆتر شوێنێکیان پێ نەبەخشێت. بەڵام کێشەکە هەر ئەوە نییە، مرۆڤ هەندێجار هەندێک کاراکتەری باشیشی هەیە کەچی لە ناو جەنجاڵی و هەراوهوریای ژیاندا بەجۆرێک وندەبن مرۆڤ نایاندۆزێتەوە، وەک ئەو مۆسیقارە قەڵەوە دڵباشە، ئەو مۆسیقارەی

کلیلـی هۆڵـی چالاکـی قوتابخانەکانـی دەدا بـە جـەلادەت و سـەرهەنگ لێـی بخـەون کـە ئەویـش وندەبێـت و نایدۆزینـەوە، یاخـود ئـەو پاسـەوانە پیرانـەی ڕێـگای جەلادەتیـان دەدا شـەوان لـە بینـا تازەکانـدا بنوێـت و مۆسـیقا لێبـدات. بە هەرحـاڵ پێموایـە لـە ڕەوتـی ئـەم چیرۆکـەدا هێنـدە کاراکتـەرو خەڵکانـی سـەیر دێنەڕێگامـان ئەوانتـان لـە بیـر دەبەنـەوە. ئێسـتا وەک سـەرەتا دەبێـت چاومـان لـەوە بێـت کـە جەلادەتـی کۆتـر و سـەرهەنگ قاسـم لەگـەڵ ئیسـحاقی لێوزێڕینـدا بـە ڕێـگاوەن بـۆ جێگایـەک لـەوێ ژیانـی خۆیـان بـۆ فێربوونـی مۆسیقا تەرخانبکـەن. ئێسـتا گرنگتریـن شـت ئەوەیـە بزانیـن ئـەو دوو گەنجـە بـەرەو کـوێ دەڕۆن؟

* * *

دوای چەنـد سـەعاتێک ڕۆیشـتن، جەلادەتـی کۆتـر و سـەرهەنگ قاسـم لەگـەڵ «ئیسـحاقی لێوزێڕیـن»دا گەیشـتنە ماڵێکـی قەشـەنگ، خانوویـەک لـە نـاو کوچەیەکـدا سـەرتاپای سـێبەری درەخـت، سـپی وەک بـەردی سـەر ئەسـتێرەیەکی دوور. ماڵێـک لـە نـاو باغێکـی گـەورەو هێمنییەکـی سیحراوییدا، پـڕ لـە بۆنـی سروشـتێکی دڕنـدە، پـڕ لـە ویقـاری هەنـدێ درەختـی پیـر. ئیسحاقی لێوزێڕیـن هـەر لەسـەرەتاوە هەنـدێ یاسـای گرنگـی بـۆ بەیانکـردن. دەبایـە بەیانـی هـەر سـێکیان لەسـەر یـەک سفرە نانییـان بخواردبایـە، ڕۆژانـە هـەر سـێکییان بـە ئـاوی سـارد خۆیـان بشـۆردایە، هەمیشـە ئامـادەی فەرمـان و داواکانـی ئیسـحاق بـن. ماڵەکـە خانوویەکـی گـەورە و نـوێ بـوو، هەمـوو ژوورەکانـی بـە بۆیەیەکـی سـپی بۆیـە کرابـوون، ئەساسـێکی کەمـی تیابـوو، بـەڵام پەنجـەرەکان و ئاگردانەکانیشـی گـەورە بـوون، بەشـی خەڵوەتـی چەنـد سـاڵێک خواردنـی تیـا گەنجینەکرابـوو، دەرگایەکـی چکۆلانـەی سپیشـی لـە پشـتەوە هەبـوو دەچـووەوە سـەر باغێکـی مـەزن. باغێـک مەڵبەنـدی هەمـوو

جۆرەکانـی درەخـت و باڵنـده بـوو.

چەنـد ڕۆژی یەکـەم ئیسـحاقی زێڕیـن هیچـی نەکـرد، لەبـەر خۆرەتـاوی کۆتایـی ئـازاردا، یـان لەبـەردەم ڕەهێڵەکانـی بەهـاردا دەوەسـتا و دەیگـووت لێگەڕێـن هەتـاو بچێتـە ڕۆحتانـەوە یاخـود دەیگـووت لێگەڕێـن بـاران ناوەوەتـان تەربـکات، دەیگـووت کێشـەی هـەرە گـەورەی جەسـتە و ڕۆحمـان تاریکـی و وشـکییە، هیـچ شـتێک وەک تاریکـی و وشـکی ڕۆح دوژمنـی مۆسـیقا نیـن.

دەبایـە ئـەو دوو کـوڕە گەنجـە بەسـەعات لەبـەردەم بارانـدا بوەسـتن و دڵـۆپ دڵـۆپ هەسـت بـە بـاران بکـەن، دەیانەویسـت تیشـک بـە تیشـک هەمـوو ڕوناکـی دونیـا بچێتـە ناویانـەوە. ئەزموونێکـی سـەیربوو، سـەرهەنگ قاسـم و جـەلادەت هـەر لەیەکـەم ڕۆژەوە هەسـتیاندەکرد خـۆر و بـاران لای ئیسـحاق مانایەکـی تریـان هەیـە، تەماشـایدەکردن و دەیگـووت «هێشـتا زۆر زووە بـۆ باسـکردنی مۆسـیقا، مۆسـیقا درەنـگ دێـت... لـە دوای دوای هەمـوو شـتەکان بـاس لـە مۆسـیقا دەکەیـن، گـەر لـە مانـای هەمـوو شـتەکانی تـر تێنەگـەن، مۆسـیقا چییـە؟» شـەوی یەکـەم لـە سـەر سـفرەکە پێیگووتـن مۆسـیقا بـە شـێکە لە سـەفەرێکی قووڵتر، بەشـێکە لەسـەفەرێکی خودایی بەرەو ئەوسـەری ئەوسـەری شـتەکان، بـەرەو ڕووە جاویدانەکـەی دونیـا. گووتـی کـە ئینسـان لـە بەردەم سـێ سـەفەری گەورەدایە سـەفەرێکیان بۆ ناو سروشـت و سـەفەرێکیان بـۆ ئاسـمان و سـەفەرێکیان بـۆ نـاو خـۆی. ئینسـان بـۆ ئـەوەی ببێتـە ئینسـان دەبێـت لایەنـی کـەم یەکێـک لـەو ڕێگایانـە بگرێـت، ئیسـحاق دەیگـووت «لـەم سـەفەرانەدا مـرۆڤ تەنیایـە، هیـچ کەسـێک ناتوانێـت کۆمەکێکـی گرنگـی ئـەوی تـر بـکات، کـە مـرۆڤ دەچێتـە وە نـاو خـۆی، کـە دەڕوات بـەرەو سروشـت، کـە دەڕوات بـەرەو خـودا، بـە تەنیایـە. ئـەوە تەنیـا چـاوی خۆمانـە فێرمانـدەکات ئـەو مرۆڤـە ببینیـن کـە لـە ناوماندایـە، بـە تەنیـا دەبێـت تەبیعـەت بهێنینـە زمـان و گوێـی لێبگریـن، بـە تەنیـا دەبێـت خـودا بدۆزینـەوە، خـودای دینـدارو وشـکە سـۆفییەکان نـا، خـودای ئێمـە... خودایـەک دواتـر دەبێـت خۆتـان

ببیبنن و بیناسن، خودایەکی مۆسیقار، ئەمە ئەگەر هاتوو سەرکەوتن و بینیتان و ناسیتان» . شەوان ئیسحاقی لێوزێرین بێدەنگتررو کەمدووتر دەبوو. هەندێجار کە مانگەشەو دیاربایە دوو قوتابییەکەی بانگدەکردو دەیگووت «تەماشای مانگ بکەن» . ئێجگار سەرسام بوو بە فێنکی شەوانی بەهار، بە چاکەتێکی تەنکەوە دەچووە بەردەم مانگەشەو، هەوای هەڵدەمژی، دەرفەتی بە سیحری زەردەخەنەیەک دەدا لە سەر سیمای دەربکەوێت و دەیگووت «سەیری مانگ بکەن و زەردەخەنەبگرن» . ڕۆژانی یەکەم گەلەک سەیرو گەلەکیش گران بوون، وانەکانیان پتر خۆدانە بەر سروشت بوو، ڕاوەستان بوو لە بەردەم باراندا. ئیسحاق دەیگووت هەموو دەنکێک باران مۆسیقایەکی تایبەتی خۆی هەیە، هەر ترپەیەو بە شێوەیەک بەر لەشمان دەکەوێت، یەکەمین مۆسیقا دۆزینەوەی ئاوازی ئەو ترپانەیە، دەبێت گوێیەکتان بۆ دروست بێت بتوانێت دەنگی باران لە هەموو جێگایەکدا جیابکاتەوە، ئیقاعی دڵۆپەکان جیابکاتەوە، ئیقاعی ئەو دڵۆپانەی بەر سینەتان دەکەون جیاوازە لە ئیقاعی دڵۆپەکانی سەر دەستتان یان سەر شانتان، یان سەر گۆناتان، دەبێت جیاوازی ترپەکان ببیستن و تامی جیاوازییەکان بکەن. مۆسیقا تامکردنی جیاوازییەکانە» .

بەیانییان ئیسحاق لەهەرکات گەشترو جوانتر دەینواند، هەمیشە بەیانییان لە ئێوارێ و شەو گەنجتربوو، تا ڕۆژ پتر هەڵبکشایە، ئەو پیرتر دەینواند، تاوای لێدەهات بەر لەخەوتن ڕوخساری پیرێکی کەفتەکاری دەگرت. بەیانییان گەلەک زوو هەڵدەستا، هەر کاتێک جەلادەتی کۆتر و سەرهەنگ قاسم لە خەو هەڵدەستان ئەو لە دەرەوە دەهاتەوە، زۆر ڕۆژ بەیانییان زوو دەچوو بۆ شارۆچکەیەکی نزیک و لەگەڵ خۆرئاوابووندا دەهاتەوە، هەندێ بەیانی هەواڵی کوچەو بازاڕەکانی بۆ قوتابییەکانی دەهێنایەوە کە هەمیشە لەسەر سفرەیەکی شەرمن بە دیار چەند کلۆ قەندێکی زەردو کەمێک ماستەوە دادەنیشتن و چاوەڕوانی مامۆستاکەیان دەکرد. سەرهەنگ قاسم

و جەلادەتــی کۆتــر دادەنیشــتن و گوێیــان لــە هەواڵەکانــی جەنــگ دەگــرت، کــە لــە هەمــوو شــوێنێکەوە گــڕی ســەندبوو. ئیســحاقی لێوزێڕیــن بــەردەوام بــە ئارامییــەوە دەیگــووت ئێمــە دووریــن لــە جەنــگ. بــەڵام پێویســتمان بــە هەواڵــەکان هەیــە تــا لــە شــتەکان خەبــەردار دەبینــەوە، دەبێت بــەردەوام بزانین شــەڕکەرەکان لــە کوێــدان و ئێمــە لــە کوێدایــن، بــەڵام دواجــار ئێمــە جگــە لــە ڕۆحــی خۆمــان کارمــان بــە هیــچ شــتێکی تــرەوە نییــە، مۆســیقا زمانێکــە ناخرێتــە ســەر زمانەکانــی تــر. ئەگــەر ڕاســتتان دەوێــت مۆســیقارەکان نابێــت مەحکومبــن بــە ژیــان لــە نــاو ڕوداو و زەمــان و مێــژوو و ئــەم شــتانەدا، مۆســیقا دوورە لــە هەمــوو شــتە ڕاگــوزەر و کــەم تەمەنــەکان، بــە پێچەوانــەوە ئــەو تەنیــا پەیوەنــدی لەگــەڵ ئەبەدییەتــدا هەیــە.

زۆر جــار ســەرهەنگ قاســم و جــەلادەت بەشــەرمەوە داوایاندەکــرد مامۆســتاکەیان بــە زمانێکــی ســادەتر قســەبکات، هەمیشــە دونیایــەک وشــە هەبــوو ئــەوان تێینەدەگەیشتن، لــە پشــت هەمــوو ڕســتەیەکەوە هەســتییان بــە ســێبەری بیرکردنــەوەی تــر دەکــرد. لــە کۆتایــی هەفتــەی یەکەمــدا جــەلادەت بە شــەرمەوە دەیگــووت «مامۆســتامان هــەر قســەیەک تــۆ دەیکەیــت، لای ئێمــە پێویســتی بــە قســەی تــر هەیــە، هــەر شــتێک تــۆ باســیدەکەیت پێویســتی بــە ڕونکردنــەوەی تــر هەیــە، زۆرجــار ئێمــە لــە شــتەکان تێناگەیــن».

ئیســحاق بــە ئارامــی تەماشــای قوتابییەکانــی دەکــردو دەیگووت «مــن ئاوم، ڕۆژێــک لــە ڕۆژان ئێــوەش دەبنــە ئــاو، ئــاو جگــە لــە خــوڕەی خــۆی ناتوانێت بە زمانێکــی تــر قســەبکات، مــن بــام ئێــوەش ڕۆژێــک لــە ڕۆژان دەبنــە بــا، «با»ش ناتوانێــت لــە دەنگــی خــۆی ئاســانتر بدوێــت، ئێــوە لێــرەن بــۆ ئــەوەی دەنگــی بــاو دەنگــی شــەو و دەنگــی بــەرد و دەنگــی مێــرووە بچووکــەکان فێرببــن، هیــچ مێروویــەک، هیــچ بولبولێــک ئاســانتر لــە دەنگــی خــۆی قســەناکات. دەبێــت ســووک و قورســی بخەنــە لاوە، دەبێــت هــەر دەنــگ و هــەر ئــاوازو هــەر قســەیە

وەک خۆی وەرگرن، چۆن مۆسیقای ئەو شتانە فێردەبن کە مانایان نییە، دەبێت مۆسیقای ماناش فێربن، هەر شتێک کە مانای هەیە، مۆسیقای خۆی هەیە، هەر شتێکیش کە مانای نییە، مۆسیقای خۆی هەیە... تێگەیشتن ئەوە نییە شتەکان بە ئاوازی ئێوە بخوێنن، وەک چۆن هیچ بولبولێک بۆ تام و چێژی ئێمە گەروی خۆی ناگۆڕێت، هیچ عەقڵێکیش بۆ ئێوە حیکمەتی خۆی ناگۆڕێت، ئەوەی بیەوێت ببێتە مۆسیقار، دەبێت لە زمانی دونیا تێبگات، مۆسیقا تێگەیشتنە، بەڵام تەنیا تێگەیشتنی ئەو شتانە نییە کە دەدوێن و هاواردەکەن و دەنگی خۆیانمان دەدەنێ، مۆسیقا بیستنی ئەو شتانەیە کە دەنگیان نییە، سەفەرێکە لەودیوی دەنگەوە، سەفەرە بە بێدەنگییدا».

ڕۆژانە، دوای بەرچایی دەچوونە باغەکەوە، دوای کەمێک وچان و ئارامی ئیسحاقی لێوزێڕین سەیری دونیای دەکرد و پاش کەمێک بیرکردنەوە بڕیاریدەدا چی بکەن، گەر هەتاو بایە بڕیاریدەدا بە هێمنی چاو لێکنێن و کەمەکەمە ئەو هەتاوەی لە دەرەوەیە لەسەر جەستەیانەوە بیگوازنەوە بۆ ڕۆحییان. سەرەتا دوو منداڵەکە لە هیچ تێنەدەگەیشتن، چاویان لێکدەناو وەک دوو جەستەی نامۆو تەنیا لەویادا دەوەستان. ئیسحاق پێیدەگووتن «قوتابییە ئازیزەکانم، هەزاران چاوی نهێنی و شاردراوە لە ناخی مرۆڤدایە، ناوەوەی ئینسان پڕە لە چاوی تر، بەڵام ئەو چاوانەمان خەوتوون، دەبێت هەوڵبدەین بگەینە ئەو چاوانە و لەخەویان هەستێنین، هەر یەکێک لەو چاوانە دونیایەک دەبینێت کە بە چاوانی ئاسایی نابینرێن... دەبێت ڕۆحتان ڕوناکبکەنەوە، شەوو ڕۆژی ڕۆح وەک شەووڕۆژی جەستە نییە. هەندێجار ڕۆح دەچێتە خەوێکی قووڵەوە و هەڵناستێت، دەچێتە شەوێکی درێژەوەو نایەتەدەرێ. هەندێجار مرۆڤ لەدایکدەبێت و دەمرێت بێئەوەی ڕۆحی لە دایکبووبێت یان مردبێت. بۆ ئەوەی ڕۆحیش لەخەو هەستێنین، ئەو چاوانە هەستێنین کە لە تاریکییەکاندا خەوتوون، ئەو گوێچکانە

ڕاپەڕێنین کە لە مێژە هیچییان نەبیستووە، دەبێت لە سروشتەوە دەست پێبکەینەوە، لەو کتێبە پیرینەناس و مەرگنەناسەوە دەست پێبکەین کە لەبەردەمماندایە و بەڵام چاومان نییە حەرفەکانی ببینین، گوێچکەمان نییە دەنگەکانی ببیستین... دەبێت پێش هەموو شتێک پەیوەندیمان لەگەڵ باو باران و هەتاودا گرێبدەینەوە، لەشمان جۆگەیەکە شتەکانی پیا تێدەپەڕێت، بای پیادەڕوات، هەتاوی پیادەڕوات، گەر سەبربکەن، گەر واز لە شتەکانی تربهێنن و خۆتان بکەنەوە. ڕۆژ دوای ڕۆژ هەتاو تۆزێک قووڵتر بە ناوتاندا دەچێتە خوار، ڕۆژ دوای ڕۆژ باران کەمێک زیاتر پێستەکانتان دەبڕێت و لە ناوەوە قسەتان لەگەڵدا دەکات. با زیاتر دەڕواتە ناوەوەو دەرگای ترتان تیادەکاتەوە... ئازیزەکانم با بەمۆسیقا ڕوناک ببینەوە، زمانێکی تر قسە بکەین، دەرگای تر بکەینەوە.. گەر ئینسان نەتوانێت ئەو دەرگایانەی ناوخۆی بکاتەوە، چۆن دەتوانێت دەرگاکانی دەرەوە بکاتەوە، گەر گوێی لە دەنگی خۆی نەبێت چۆن دەتوانێت گوێی لە دەنگەکانی تر بێت.»

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەوەستان، گەر «با» بایە خۆیان بۆ «با» دەکردەوە، گەر شەو بایە خۆیان بۆ تریفە دەکردەوە، گەر باران بایە دڵۆپ دڵۆپ لەشییان بۆ باران ڕادەخست. هەردووکییان لەسەر دوو سەکۆی بچوک دەوەستان و چاویان لێکدەناو کەمکەم فێردەبوون ڕوناکی و تریفە و دەنگە دوورەکان بۆ خۆیان ڕاکێشن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئارامتر دەبوون، پتر تێدەگەیشتن هەتاو مانای چی، باران چۆن قسەدەکات، شەو چۆن دەردەکەوێت و هەور لە کوێوە دێت و دەڕوات. سەرەتا هەردوو گەنجەکە گەلەک لە خۆیان بەگومان بوون، هەستیاندەکرد ئەو دونیایەی ئیسحاق باسیدەکات گەلەک بۆ ئەوان دوور دەست و نەگەییوە. سەرهەنگ ناسکتر و دوودڵتر و پەشێوتربوو، ڕۆژانی سەرەتا زۆر دەگریا، هەمیشە ئیسحاق دەموچاوی بۆ دەشت و دەستی دەگرت و دەیبردە ژوورەکەی خۆی و دەیگووت «بخەوە». ئەو سەعاتە دووردرێژانەی بەر باران و

باو هەتاو، ئەو گوێگرتنە بێپشووە لە سروشت ماندوویدەکردن. بەڵام کەمە کەمە هەستیان بەو شتانە دەکرد کە پێشتر هەستیان پێنەکردوە، ئەو شتانەیان دەبینی کە نەیانبینیوە، ڕوناکییەکی سەیر لە قووڵاییاندا دەردەکەوت، تیشکێک بێسەرچاوە و بێکانگا هەڵدەقوڵی، ڕوناکییەکی خۆکرد لە ناوەوە دەهات. جەستەیان شێوەیەکی تری وەردەگرت، زیاتر ناسک و وریادەبووەوە، دەیانتوانی بە جیا هەست بە هەموو دڵۆپە بارانێک بکەن، دەیانتوانی هەست بە دەنگی هەموو کزەبایەک بکەن کە هەردەم لە شوێنێکی نادیارو قووڵی جەستەیاندا دەنگیدەدایەوە. پاش ماوەیەک لە بەر باراندا دەوەستان و هەستیان بەسەرما نەدەکرد، بەڵکو هەموو هەست و نەستییان لای دەنگەکان بوو، هەستیان لای ئەو تێکەڵاوبوونە سەیرەی خۆیان بوو بە سروشت، خەیاڵییان لای ئەو یەکبوونە بوو کە وەک بەیەکداچوونی دوو شەپۆلی ڕوناک تێکەڵی یەکدی دەبوون. کە دواتر ئارامدەبوونەوەو بۆ پشوویەکی درێژ دەچوونە ژوورێ، تەواو لە هەموو شتەکان تێنەدەگەیشتن. سەرهەنگ قاسم تادەهات ئارامتر دەبووەوە، دوای تێپەڕینی چەند هەفتەیەک ئاسەواری ماندوێتی بە دەموچاوییەوە نەبوو، زووتر لە جاران هەڵدەستا، زووتر دەچووە دەرەوە بۆ ناو باغەکان، خێراترو چالاکتر لە مامۆستا هەموو شتەکانی ئامادەدەکرد. جەلادەتی کۆتر هەر لەسەرەتاوە هەموو شتەکان جوان و سیحراوی بوون لەلای. پێشتر خەونی بە جۆرە ژیانی ئاوەهاوە نەبینیبوو. هەستیدەکرد، هەموو ئەو مامۆستایانەی بە درێژایی ژیانی بینیبوونی لەبەردەم ئەم مامۆستایەدا جگە لە کۆمەڵێک بوکەشوشەی نەفام هیچی تر نین. یەکەمجاربوو لەزەتی لە گوێگرتن و فێربوون دەبینی، کەمەکەمە باوەڕێکی سەیری بەو ڕستە سەیرو ئاڵۆزەی ئیسحاقی لێوزێڕین دەهێنا کە دەیگووت «دروستکردنی مۆسیقار، گرنگترە لە دروستکردنی مۆسیقا». پیاوێک بوو لە سەردەستی سۆفی و فەیلەسوفان و سروشتدا پەروەردەبووبوو، بەڵام سادەو ساکاری

جوتیارێکی تیابوو. جەلادەتی کۆتر پتر لە سەرهەنگ لێی نزیکدەبووەوە، پتر پرسیاری لێدەکرد، کەمتر دەرفەتی بێدەنگی و تەنیایی پێدەدا. ئیسحاق کە لە قووڵاییدا پیاوێکی کەمدووبوو، لەبەردەم جەلادەتدا کە سیمای فریشتەیەکی تیا دەبینی زیاتر دەکرایەوە، زیاتر ئەو هەستەی تیا دروستدەبوو کە لەگەڵ مەخلوقێکی بەهەشتیدا قسەدەکات. زۆربەی ئێواران کە دونیا دەگەیشتە ئارامترین و هێورترین ساتەکانی خۆی، ئیسحاق و جەلادەتی کۆتر لە نێوان دارەکاندا، لەسەر سەکۆیەکی چکۆلانەی داپۆشراو بە سێبەری درەخت و گوڵ قسەیاندەکرد، سەرهەنگیش خۆی بە ئامادەکردنی خواردن و گۆرانی گووتنەوە سەرقاڵدەکرد، زۆربەی ئێواران لە ڕادیۆکەیانەوە شەیدایانە گوێیان لە مۆسیقا دەگرت. ماڵەکە ماڵێکی گەورەبوو، ئاسەواری جۆرە ژیانێکی دیکەش بە هەموو شتەکانەوە دیاربوو، ئاشکرابوو ڕۆژێک لە ڕۆژان لەم ماڵەدا کەیبانوویەکی چاپوک سالار و سەروەر بووە. جێگاکان، ڕەنگی پەردەکان، ڕێکخستنی ژوورەکان، بۆنی هەندێ سوچ و کەلێنی تایبەتی، هەموو هاڵاوی جەستەی بزر و نادیاری ئافرەتی لێدەهات. دەیانزانی ئیسحاق لەوان زیاتر ئەو تارمایی و بۆن و هاڵاوانە دەبینێت و هەڵیاندەمژێت. شەوێک کە هەر سێکیان بە دیار قۆرییەکی گەورەی چاوە دانیشتبوون، ئیسحاق بە ئەسپایی و نەرمییەوە گووتی «ڕۆژێک لە ڕۆژان لەم ماڵەی مندا ژن و کچێک دەژیان، ژنێکی خیانەتکارو کچێکی بێوەفا، کچێک حەزی لە مۆسیقا نەبوو، حەزی لە باغ نەبوو، حەزی لە هێمنی نەبوو. ژن و کچێک تەواو دوورو جیاواز لە من. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە من نیم کە دەستبەرداریان بووم، من ساڵەهای ساڵ تەحەمولی ئەو ژنەم کرد، تەحەمولی جوانی وئازارەکانیم دەکرد. دەبوایە بەرگەی جوانییەکەشی بگرم و بەرگەی ئازارەکانیشی بگرم، هەندێجار تەحەمولی جوانی لە تەحەمولی ئازار سەختترە. ساڵەهای ساڵ چاوەڕوانمدەکرد، دەمویست کچەکەم گەورەبێت و ببێتە مۆسیقار، بەڵام

شتەکان بە جۆرێکی تر چوونەپێشێ... من هەرگیز هێزو توانای ئەو ژنەم نەبوو، ڕۆژێکیان هەردووکییان بەجێیانهێشتم، لەگەڵ سیاسەتمەدارێک و کوڕەکەیدا، پیاوێک کە من نەدەرەقەتی دێم و نەدەتوانم شەڕیشی لەگەڵدا بکەم. کە کچەکەمم دۆڕاند، ئیتر هەموو شتەکان تەواوبوون... لەو ڕۆژەوە من هەموو شەوێک بیر لە مردن دەکەمەوە. لەو کاتەوە بڕیارمدا کە بگەڕێم تا دوو قوتابی بدۆزمەوە، دووان کە فێری هەموو ئەو نهێنیانەیان بکەم کە دەیزانم، ئەوەی لە ڕۆحمدا شاردومەتەوە بیدەم بەوان»

هەردووکیان دەیانزانی لە ژێر فشاری مردندا دەژی، بەڵام نەیدەهێشت ئەو فشارە تایبەتییەی خۆی، ئەو ترسە قووڵە لە ژیانیدا دەرکەوێتەوە. بە دەگمەن باسی مەرگی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەردووکیان ئەو سامە قووڵەیان لە مردن تیا دەخوێندەوە. بە تایبەت لە کاتی نوێژەکانی بەیانییدا بێئاگا دەلەرزی و وەک یەکێک لە ژێر فشاری شەیتانێکدا بێت عارەقەی دەکرد و لەسەر بەرماڵەکەی دەکەوت و بێهۆشانە قسەی لەگەڵ مردندا دەکرد. کاتێک جەلادەت یەکەمجار بەو حاڵەوە بینی، ویستی دەستی بگرێت و لەسەر بەرماڵەکەی خۆی هەڵیگرێت، بەڵام بە هێمنی لە خۆی دوورخستەوەو کەوتەوە ناو دونیای سکاڵاو باڵۆرەکانی خۆی. دەنگێکی لێدەهات پتر لە مۆسیقای نەیەکی ئەفسوناوی دەچوو، دەنگێکی سەیر و هێمن، بە ئەندازەیەک نزم بوو گەر لە نزیکەوە نەبایە گوێت لێنەبوو، بەڵام شتێک بوو تێکەڵ لە گریان و ترس، ئاوازێک پێشتر جەلادەت نەیبیستبوو. زۆربەی بەیانییان ئیسحاقی لێوزێڕین لەسەر بەرماڵەکەی تووشی ئەو هەڵچوونە دەبوو کە دوایی بەو ئاوازە سەیرە کۆتاییدەهات. لەوێوە جەلادەت باوەڕیهێنا کە ئیسحاق ئامێرێکی مۆسیقایە، باوەڕیهێنا ئەم پیاوە نەیەکی کون کونە، ئەو خۆی فلووتێک بوو بۆنی زەمان و تاریکی و ترس و نائومێدییەکانی لێدەهات، بەڵام هەمیشە باسی جوانی و ژیان و ئاسوودەیی بۆ ئەو دوو کوڕە دەکرد... ئێوارەیەکیان سەرهەنگ قاسم

لێی پرسی «مامۆستام، بۆ غەمگین دیاریت و گەشبین قسەدەکەیت؟».
بە هێمنی گووتی «لەبەر ئەوەی من ناچارم چاوم لە دوو ڕێگابێت، دەبێت دڵێکم لەسەر مردنم بێت و دڵێکم لەسەر ژیانم بێت، لە کاتێکدا ئێوە تەنیا دەبێت دڵتان لەسەر ژیان بێت، گەر دەتانەوێت ببنە مۆسیقار دەبێت حیسابی ئەوە بکەن کە نامرن، نەمری بەشێکە لە سیفەتەکانی هەموو مۆسیقاژەنێک... بەڵام من ناچارم بیر لە مەرگ بکەمەوە. من بیر لە مەرگ دەکەمەوە چونکە هەستدەکەم مۆسیقای من لەو دیو مەرگەوە دەستپێدەکات» بێئەوەی تێبگەن دەبایە بیربکەنەوەو بێدەنگ بن، ئەو خۆی گووتبووی ئەوەی کە ئەمڕۆ تێیناگەن هەڵیگرن، لە ڕۆژێکی ترو لە زەمانێکی تردا تێیدەگەن.

دوای سێ هەفتە بۆ یەکەمجار چوونەدەرەوە بۆ ناو ئەو شارۆچکەیە، دەبایە سەعاتێک بەپێ بڕۆشتبانایە، هەندێ باغ و باغاتیان تەیکردایە، بە قەدپاڵی هەندێ بەرزایی و بەلاپاڵی هەندێ نشێویدا گوزەریانبکردایە، ئەوسا دەگەیشتنە شارۆچکەکە. کە گەیشتن بەیانییەکی زووبوو، شەقامەکان بۆنی ئەو ماستفرۆشانەیان لێدەهات کە بە مەنجەڵەکانییانەوە لەسەر شۆستەکان چاوەڕوانی کڕیاریان دەکرد، زۆربەی میوانەکانی شارۆچکەکە ئەو سەربازانەبوون کە یان لە شەڕ دەگەڕانەوە یان دەچوون بۆ شەڕ. لەو بەیانی زووەوە سەرەتای جەنجاڵییەکی بێسنوور دیاربوو، پیرەمێردێک لەسەر عەرەبانایەکی کۆن کەلاکی حەیوانێکی سەربڕداوی دەگوازتەوەو دەیگووت «ئەم شارە بووە بە بەحر». سەرهەنگ قاسم و جەلادەتی کۆتر، جگە لەوەی دەیانزانی جەنگێکی کوشندە لە گۆڕێیە خەبەرییان لە هیچی دیکە نەبوو. ئێستا دیمەنی ئەو هەموو چایخانە چکۆلە و چێشتخانە سەفەرییە خێرایانەی نانییان بۆ میوان و هەڵهاتووان دروستدەکرد بۆنێکی تری دابوو بەو شارۆچکەیە، جەلادەت پێشتر شارۆچکەی لەو شێوەیەی نەبینی بوو، بەڵام دڵنیابوو کە ئەم شارۆچکەیە وانەبووە... سیماکان و جل

و بەرگەکان هەموو نامۆبوون، ئیسحاقی لیۆزنێرین بە هێمنی خۆی لە پێش دوو قوتابییەکەیەوە دەڕۆیشت، خۆی لە چاوی ئەوانە دەدزییەوە کە وەک پیاوێکی نامۆ تەماشایاندەکرد. دڵنیابوو لە دوای هەڵهاتنی ژن و کچەکەیەوە جارێکی تر لەو دونیایەدا جێگای نابێتەوە. ژیاننامەیەکی سەیری هەبوو، مۆسیقای لە هەموو پەیمانگا بەرزەکانی خۆرهەڵاتدا خوێندبوو، ئەوەی لە قوتابخانە بەرزەکان فێرنەبووبوو، بە هەوڵی خۆی لەسەردەستی مامۆستا ناودارەکانی ئەو زەمانەدا فێربووبوو، ئێران و تورانی لە دووی مۆسیقارە گەورەکان تەیکردبوو. بەڵام هەرگیز نەیتوانی بوو زانستەکانی خۆی بە جۆرێکی باش بەکاربهێنێت، نەیتوانی بوو هونەری خۆی بخاتە بەردەمی خەڵک. نەبوونی تیپی باش، نەبوونی گوێگری ڕاستەقینەی مۆسیقا، دەردیسەرییەکانی زیندەگی، خەرجکردنی بۆ تەواوی سەروەتی جێماوی باوکی بە شێتانە لە گەنجیدا، وایانکردبوو لە نزیکی سی ساڵیدا دوای گەشتێکی درێژ لە دووی مۆسیقا بگەڕێتەوە ماڵی خۆیان و لە ناو باغ و باغاتێکی گەورەدا لە نزیک شارۆچکەیەکی بچوک، ژیانێکی تر دەست پێبکات. ماوەیەکی درێژی ژیانی لەویادا بردبووە سەر، بووبوو بە بازرگانی قوماش، بووبوو بە جەڵەبچی ودواتریش بە بەڵێندەری دروستکردنی بینا. سامانی گەورەی پێکەوەنابوو، تا سامانیشی زیاتربایە بیمارتر و نەخۆشترو نائاسودەتر دەبوو. لەگەڵ هەموو مەترێکی قوماشدا کە فرۆشتبووی، لەگەڵ هەموو حەیوانێکدا کە ئاودیوی سنووری کردبوو، لەگەڵ هەموو بەردێکدا کە خستبوویە سەر یەک هەستیکردبوو درۆ لەگەڵ خۆیدا دەکات، بەڵام هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەبوو کچەکەی گەورەبێت و خۆش بژی. هەموو ڕەنج و قوربانییەکانی بۆ ئەوە بوو دواجار گەورەبێت و بیکاتە مۆسیقار.. کە هێدی هێدی بۆی دەرکەوت کچەکەی لە یارانی مۆسیقا نییە، ژیانی بوو بە جەهەنەم... هەر کاتێک بە کوچەکانی ئەو شارەدا دەڕۆیشت بە کوچەی عومری بەباچووی خۆیدا تێدەپەڕی. ڕقی لەو شارەدەبووەوە، هەموو

کۆڵان و سەر سیلەو دیوارەکانی بۆنی ئەو ڕۆژە تاریکانەیان لێدەهات کە خاڵیبوون لە جوانی و مۆسیقا، ئەو شارۆچکەیە شوێنێک بوو تەواو جیاواز لەو مەملەکەتەی ئەو خەونی پێوە بینیبوو... بە قوتابییەکانی دەگووت «ئێرە دوژمنی مۆسیقایە، هیچ شارێک لە دونیادا وەک ئەم شارە دوژمنی مۆسیقا نییە...». کە دەچووە کوچەکانی ئەو شارەوە هەموو ئاوازەکانی ناوەوەی دەکوژانەوەو ئەو درندە درێوو نەناسەی ناوی لەخەو هەڵدەستا کە ساڵەهای ساڵ بە بازارەکان و بە نێو قەیسەریی و بە پێشدەم دوکانەکاندا گێڕابووی. درندەیەک ساڵانێکی زۆر مۆسیقای لە ناودا کوژاندبووە و لەبری ئیسحاقی لێوزێڕین پیاوێکی تری دروستکردبوو کە لە دونیای پیاوانی بازاڕ و بازرگانیدا نوقمبوو. کە ڕۆژێکییان زانی ژنەکەی خیانەتی لێدەکات، لەبری ئەوەی وەک پیاوانی تر پەلاماری چەقۆ و تفەنگ بدات، پەلاماری فلووتە کۆنەکەی دایەوە. ساڵەهای ساڵ بوو ئامێرە مۆسیقییەکانی خۆی شاردبووەوە، سەردەمانێکی زۆر تەنیا بە خەیاڵ ژیانی مۆسیقارێک ژیابوو، ژنێکی خۆشویستبوو، عەشق و چاوەڕوانی ئەو وای لێکردبوو ئەو مۆسیقارەی ناو خۆی بکاتە قوربانی، دواجار ویستبووی ئەوەی کە لە خۆیدا کوشتوێتی لە کچەکەیدا بیچێنێت، بەڵام نەیتوانی بوو. ئەو شەوەی لە خیانەتی ژنەکەی تێگەیشت، هەموو ئەو ڕێگا هەڵەو دژوارەشی بینی کە عومری خۆی تیا ونکردبوو، هەستیکرد لە قووڵاییدا ئەو مەخلوقێکی تر بووە. تێنەدەگەیشت بۆ ساڵەهای ساڵ حەقیقەتی خۆی نەبینیوە، خیانەت و بێوەفایی کچ و ژنەکەی پتر چاویان لەسەر بینینی خۆی دەکردەوە. هەستیدەکرد لە ناویدا یەکێکی تر لەخەوهەڵدەستێت کە ژیان لەسەروو ئەو شتانەوە دەبینێت. ئیدی بەردەوام بە مۆسیقا ئەو پیاوە ون و شاردراوەیەی لە ناو خۆیدا دەهێنایە دەرێ، ئەو ئیسحاقەی دەدۆزییەوە کە بووبوو بە ژێر عەشقێکی درۆوە. هەستیدەکرد ساڵەهای ساڵ جوانی ئافرەت لە جوانییەکانی تر دووریان خستۆتەوە. ئیسحاق هەستیدەکرد

ئافرەت مەترسییەکی گەورەبووە لە ژیانییدا، بەڵام هەموو شتێکی دەکرد تائەو ترسەی خۆی لەو دوو هەرزەکارەدا نەڕوێنێت، کە بە کینەوە سەیری ئەو ژنەیان دەکرد کە ڕۆحی ئەو پیاوە مەزنەی نەبینیبوو. ئەو ڕۆژە کە لە کوچەو کۆڵانەکانی ئەو شارۆچکەیەدا دەگەڕان، لەسەر هەر سیلەیەک خانمێکی جوانی بدیایە، بە ئارامی پیشانی قوتابییەکانی دەداو دەیگووت تەماشاییبکەن. قسەکانی قسەی پیاوێک نەبوون قوتابییەکانی بەرەو شوێنی خراپ ڕاکێشێت. بە پێچەوانەوە لەو کاتانەشدا کە دەیگووت تەماشای ئەو ئافرەتانە بکەن، دەیویست جوانییان پیشانبدات نەوەکو ئافرەت. ئیسحاق دەیگووت «پردێکی گەورە هەیە هەموو جوانییەکانی دونیا بە موسیقاوە گرێدەدات، بەڵام جیاوازی جوانی لە دیدی مۆسیقارەوە شتێکی ترە، هەمووان جوانی دەبینن، هەتا ئەوانەش کە ناوی هونەرییان نەبیستووە دەتوانن جوانی ببینن، بەڵام جیاوازی ئەو جوانییانەی کە ئێوە دەبێت ببینن لەگەڵ ئەو جوانییەی پیاوێکی دیکە دەیبینێت ئێجگار گەورەیە. مۆسیقارەکان، هونەرمەندەکان دەبێت جوانی خالیس ببینن، جوانییەک پاڵاوتە لە هەموو شتێک کە جوانی نییە، هەموو شتە جوانەکانی ئەم دونیایە بە هەزاران جەمسەرەوە بە شتەکانی ترەوە گرێدراون، جوانی لەهەزار ڕێگاوە بە ناشیرینی و دزێوی و پیری و دەردەوە گرێدراوە، لە هەزار ڕێگاوە بە شەهوەت و ئارەزوو شەڕەوە گرێدراوە. هەندێجار ئەو تێکەڵبوونە وادەکات جوانی نەبینین، یاخود لە داوی سیحری شتێکدا بین و پێمان وایە لە داوی جوانی داین، لە داوی شەهوەتدابین و پێمانوابێت لە داوی جوانی داین، یان لە داوی شەڕدابین و پێمان وابێت لە داوی جوانیداین... هونەرمەند ئەو کەسەیە ئەمجۆرە فریوانە ناخوات، ئەو جوانییەی دەبێت ئێوە عەوداڵی بن پەتییە، جوانییەکی پاک لە فیتنەو شەڕی شتەکانی تر. ئێوە دەبێت جوانی خالیس بدۆزنەوە، جوانی خالیس بژین و جوانی خالیس ببینن. ئەو درەختانەی دەیبینن، ئەو باڵدارانەی لە دوور دەفڕن،

ئەو ئاوانەی لە تەنیشتتانەوە خورەی دێت... هەموو شتەکانی ئەم دونیایە دەبێت وەک جوانی ببینن، درەخت بۆ ئێوە درەخت نییە، مۆسیقایەکە ڕوخسارێکی تایبەتی وەرگرتووە، خوێندنی باڵندە بۆ ئێوە دەنگ نییە، بەڵکو مۆسیقایەکە لە مەخلوقێکی تردا بەرجەستەبووە، ئافرەت بۆ ئێوە ئافرەت نییە، بەڵکو جوانییەکە پاڵێوراو لە هەر ئارەزوو و شەهوەتێک، ئافرەت مۆسیقایە، وەک مۆسیقاش گوێیان لێبگرن و سەیریانبکەن»

سەرهەنگ قاسم و جەلادەتی کۆتر وەک دوو غوڵام کە سەری ملکەچی و شەرم بۆ سەروەرەکەیان دادەنەوێنن، سەریان بۆ ئیسحاق و ڕستە سەیرەکانی دادەنەواند.

لەو ڕۆژەدا تەواو هەستیان بە بێکەسی و نامۆیی ئەو پیاوە کرد.

گەرچی ساڵانێکی درێژ لەو شارەدا ژیابوو، کەچی کەسێک نەبوو سڵاوێکی لێبکات، ئیسحاق لەمسەری شارەوە دەچوو بۆ ئەوسەرو دەهاتەوە، بێئەوەی یەکێک لە حاڵی بپرسێت.

هەردوو قوتابییەکەی تێدەگەیشتن کە ئەم پیاوە چەند نامۆیە. ئیسحاق مەخلوقێک بوو نامۆ بە زەمین، ئەو بە قوتابییەکانی دەگووت «زۆرجار شارەکان دەمانکەنە بێگانە، شارەکان و شوێنەکان بێئەوەی هیچ بدرکێنن دەرماندەکەنە دەرەوە، زۆر بێدەنگی هەیە، بێدەنگی قەبووڵنەکردنە، دەبێت بتوانین گوێ لە بێدەنگی بگرین، ئاوازی ناو بێدەنگی ببیستین، دەبێت بێدەنگی ئەم شارە لە بێدەنگی گۆم و درەخت و ئاسمان جیابکەینەوە... بێدەنگی ڕەنگی هەیە، ڕەنگ... بێدەنگی هەیە تاریک وەک شەوەزەنگ، بێدەنگیش هەیە ڕوناک وەک خۆر»

ئیسحاق هەر کات بە کوچەکاندا دەڕۆیشت، تارمایی بێدەنگی و کشوماتییەکی قووڵ دونیای دەچنی، پیاوێک بوو لە زەمینە تاریکەکانی مۆسیقاوە هاتبوو، یەکێک بوو کە دەڕۆیشت شتەکان دەنگێکی دیکەیان لێدەهات، جەلادەت و هاوڕێکەی پێیان وابوو کە دەڕوات هەوای دەوروبەریان

مەنگییەکی قـووڵ دایدەگرێـت. لـە نـاو قەرەباڵغتریـن و جەنجاڵتریـن جێـگای بـازاڕدا ئـەو هێمن، خودایـی و پـڕ تەلیسـم دەینواند. خەڵکانێکی زۆر سـەیریان لێدەهات ئیسـحاق لەگـەڵ دوو گەنجدا ببینـن کە پتر بە دوو فریشتە دەچوون، لەنـاو هـەرای سـەوزە فرۆشـەکاندا، لـە کوچـەی پـڕ لـە بۆنـی مریشـک وقـازو باڵنـدەدا، وەک هەمیشـە بـە دەرونـی مامۆسـتایەک کـە دەزانێـت قسـەکانی دەتوانێـت جـۆرە عەترێـک بڵاوبکاتـەوە، کـە هەمـوو بۆنـە ناخۆشـەکانی دونیـا دادەپۆشـێت، قسـەی بۆدەکـردن. جـەلادەت بـە درێژایـی ڕێگاکـە سـەیری لـەوە دەهـات خەڵکـی چـۆن ئـەو هەمـوو جوانییـەی ئـەو لـە ئیسـحاقدا دەیبینێـت نابینـن. سـەیری لـەوە دەهـات کـە بەهـەر کوچەیەکدا دەڕۆن، خەڵکی هێندەی تەماشـای جوانـی ئـەو دەکـەن، لـە جوانـی مامۆسـتاکەی وردنابنـەوە. ئـەو وێنەیەکـی خودایـی لـە ئیسـحاقدا دەبینـی، وەک مرۆڤێکـی باڵاتـرو نائاسـایی تەماشـایدەکرد، سەرسـامبوو بـەوەی ڕۆژێـک لـە ڕۆژان ژیانێکـی ئاسـایی ژیـاوە، پێـی قەبووڵنەدەکـرا لـەوە تێبـگات چـۆن ڕۆژێـک لـە ڕۆژان کاریکـردوە، ژنـی هێنـاوەو منداڵـی بەخێوکـردوە، کـە قسـەیدەکرد پێدەچـوو لـە دونیایەکـی دیکـەوە قسـە بـکات، شـتێکی گەورەتـرو سـەیرتر لـە خـۆی لە ناویدا نیشـتەجێ بووبێـت. هەمـوو ئـەو شـتانە جەلادەتیـان شـەیدا دەکـرد.

کاتێـک دەگەڕانـەوە بـۆ مـاڵ و مامۆسـتاکەیان لـە سـەر بەردێـک بەرامبـەر خـۆر دادەنیشـت، داوای لـە قوتابییەکانـی دەکـرد پشـوویەک بـە خۆیـان بـدەن، بـەڵام جـەلادەت بـە چپـەوە بـە سـەرهەنگ قاسـمی دەگـووت. «کـەس ناتوانێت وەک ئێمـە ببینێـت، کـەس ناتوانێـت ئـەو هەمـوو جوانییـەی ببینێـت، تێناگەم چـۆن ناتوانـن ببینـن، کـەس ناتوانێـت ببینێـت مـن و تـۆ نەبێـت، وانییـە؟» سـەرهەنگ قاسـم، دەسـتی جەلادەتـی کۆتـری دەگـرت و دەیبـردە کونجێکـی بێدەنگـی ئـەو ماڵـەوەو دەیگـووت «ئـەو خـۆی نیشـانی کـەس نـادات، خـۆی بە منـی گـووت، ئامـادە نییـە خـۆی نیشـانی هەمـوو کەسـێک بـدات». جـەلادەت وەک یەکێـک شـەیدابیەک ماندوویبـکات، ڕاسـتییەک ماندوویبـکات کـە تەنیـا

خـۆی دەیزانێـت، بـە هێمنییـەوە دەیگـووت «بـەڵام مـن دەیبینـم، تـۆش دەیبینیـت... شـتێکی تیایـە وادەکات لـە خەڵکی ئـەم دنیایـە نەچێت».

تـا شـەوان زیاتـر تێبپەڕایـەو پتـر لـە مۆسـیقا نزیکببوینایەتـەوە، ئیسحاق سـەیرترو ئاڵۆزتـر دەبوو. کـە یەکەمجـار فلووتی گـرت بەدەسـتییەوە وەک ئەوە وابوو چەمکی ئاگرینـی ڕەشـەبایەکی گرتبێـت، یـان بروسـکەیەکی دۆزیبێتەوە، یـان ڕوناکییەکـی لـە نـاکاو سـەرتاپای هێنابێتـە هـەژان، شـەوێکی تاریـک بـوو، ڕەشـەباکانی بەهـار لـەدەرەوە یارییـان بـە دونیـا دەکـرد. هیـچ شـتێک هێمـن و لەسـەرەخۆ نەیدەنوانـد، کپـی پـڕ ئەفسـونی شـەو هیـچ نەبـوو جگـە لـە سـەرەتای شـێتێتییەکی ڕەش، کـە دەسـتیکرد بـە یەکـەم وانـەی فلـووت، دەیگـووت «دەبێـت گـەردون کورتبکەینـەوە، شـتێک بژەنیـن نـە ئاسـمان، نـە ئـاو پێـش ئێمـە نەیانبیسـتبێت، دەبێـت خـودا والێبکەیـن بـە ئاوازێـک لـە هەمـوو گوناهەکانمـان خۆشـبێت، تەنیـا گوناهەکانـی خۆمـان نـا، گوناهـی هەمـوو ئادەمیـزادەکان، گوناهـی بـەرد و درەخـت و ئەسـتێرەکان... دەبێـت خـودا ڕازیبکەیـن بـە ئـاوازێ هەمـوو دەرگاکانمـان بـۆ بکاتـەوە، گوێبگـرن، هیـچ شـتێک وەک مۆسـیقا دەرگاکان ناکاتـەوە... مۆسـیقا کلیلـە... کلیلـە... کێشـەکە ئەوەیـە نازانیـن چ دەرگایەکمـان لێدەخاتـە سـەر پشـت... بـەڵام دوایکـەون، مۆسـیقا بـۆ کوێـی بـردن دوایکـەون، مەوەسـتن، گـەر بـۆ نـاو ئاگـر بێـت یـان نـاو ئـاو، بـۆ نـاو ڕۆشـنایی یـان تـەم، بـۆ نـاو خنـکان یـان هەناسـەدان، کـە پێیگووتـن بوەسـتن بوەسـتن، کـە پێیگووتـن بمـرن بمـرن، مۆسـیقا دەنگـی خـودا خۆیەتـی، دەنگـی ئـەوە لـە سـافترین هەناسـەیدا».

کـە یەکـەم ئـاوازی دەژەن، ڕوخسـاری شـەو دەگـۆڕا. وەک ئـەوەی دونیـا سـەرتاپا سـەر لـە نـوێ لـە ئاوێکـی هێمنـەوە بێتـەدەرێ، وەک ئـەوەی شتەکان بچنـە دۆخـی بارینـەوە، وەک ئـەوەی ڕۆح بـە شـەرابێکی پـڕ ئەفسـون تەڕبێـت، یـان دڵ لـە دوای ئەفسوسـێکی مـەزن هەسـتێتەوە، ئارامییەکـی فێنـک فاسـیلەی نێـوان جەلادەتـی کۆتـر و سـەرهەنگ قاسـمی لەگـەڵ دونیـادا

تەڕدەکرد. جەلادەت هەستیدەکرد لە نێوان ئەو و دونیادا پردێکی ئاویی هەیە، پردێک بە تاڤگەیەکی لەسەرەخۆ دەچێت کە بە مۆسیقای خۆی هاژە دەکات. ئیسحاق مۆسیقای دەژەن و جەلادەت چاوی دەنووقاندو گەردونی لە سافترین وێنەیدا دەبینی، منداڵی خۆی و گەورەبوونی... دەنگی ئەو ئاوازانە، بێقەرار بەرەو جێگای ئەوتۆی دەبرد کە لەدەرەوەی ژیان و زەمان و ئەو جێگایانە بوو کە دەیناسین، بۆ یەکەمجار هەستی بە پەیوەندی نێوان مۆسیقاو فڕین دەکرد... جەلادەت دەفڕی، جەلادەت چاوانی لێکدەناو هەستیدەکرد لە ئاسمانە. بۆ یەکەمجار قاچی لەسەر زەمین بەرزدەبووەوە، بۆ یەکەمجار دەیبینی درزێکی مەزن دەکەوێتە نێوان جەستە و ڕۆحییەوە... هەستیدەکرد لەشی تەواو سووک و ئاسان خۆی ئامادەدەکات بۆ فەرامۆشییەکی قووڵ.

* * *

سەرهەنگ قاسم کە گوێی لەیەکەم ئاوازی ئیسحاقی لێوزێڕین بوو، نەخۆشکەوت. پێشتر خەیاڵی ئەوەی نەبوو جۆرە مۆسیقایەکی وا لەسەر زەویدا هەبێت. دوای یەکەم ئاوازی ئیسحاق، تایەکی گەرمی لێهات، بە درێژایی ئەو شەوە وڕێنەیدەکرد. ئەوشەوە ئیسحاق وەک ئەوەی چاوەڕوانی جۆرە نەخۆشییەکی لەوجۆرە بکات، یەک لەسەر یەک پەڕۆی ساردی دەخستە سەر ناوچاوانی سەرهەنگ قاسم و دەیگووت «مۆسیقا سەر بە شوێنە قووڵەکانی ڕۆحە، کێشەی گەورەی جەستەمان ئەوەیە کە لەو جێگا تاریک و قووڵانەوە هیچی نەبیستووە، جەستەمان فێرنەبووە گوێ لە ڕۆحمان بگرێت... هەندێ کات کە دەنگێک لە ناکاو لە ناوەوەمان دێتەدەرێ، وەک ئەوەیە کۆمەڵێک دیوار بڕوخێنێت.. هەندێ زنجیر بشکێنێت... مۆسیقا ڕۆحمان دەهێنێتە قسە، ڕۆح چییە، ئێوە وادەزانن

ڕۆح چییە؟ ڕۆح لاڵە، شتێکە بێزمان... عەردێکی بێدەنگە، عەردێکە هیچ شتێک تیا ناخوێنێت، وەک دارستانێک وایە پڕە لە باڵدارو جانەوەری خەوتوو، پڕە لە ئامێری موسیقی کپ و بێدەنگ، ژوورێکە مرۆڤ پڕیکردوە لە هاوار و دایخستووە...هەندێجار دەنگێک لە دوور دێت و هەموو ئەو شتە خەوتووانە بە ئاگادێنێتەوە، ڕەشەبایەک دێت و هەموو ئەو شتانەی تۆزی بێدەنگی و خنکان و فەرامۆشی لەسەریان نیشتووە خاوێندەکاتەوە، ئەوکات هەموو ژیانمان دەگۆڕێت، ئیتر یان دەبێت تامەرگ هەوڵی داخستنی ئەو دەرگایە بدەین، یان هەموو شتێک فەرامۆشبکەین و ماڵمان بەرینە ئەوێ».

نەخۆشییەکەی سەرهەنگ قاسم، تاوناتاو و پچڕپچڕبوو... ماوەیەک هوشیار و ماوەیەک بێهۆش، دەمانێکیش کە هۆشیدەهاتەوە بە بێدەنگ دەگەڕایەوە ناو دونیای مۆسیقا... تا دەردەکانی سەختتربایەو بێهۆشییەکانی قووڵترو بێتروسکەتربانایە، کاتێک بە ئاگادەهاتەوە مۆسیقای سیحراویتری دەژەن. قووڵی بێهۆشییەکانی و قووڵی مۆسیقاکانی یەکشت بوون. لەو ماوەیەدا ئیسحاقی لێوزێڕین وەک ئەوەی لە مردن یان لە تێکچوونێکی کوتوپڕی ژیان بترسێت، قوتابییەکانی خستە ژێر فشارێکی گەورەوە. جەلادەتی کۆتر کە دواتر ساڵەهای ساڵ بە خەیاڵی ئەو ڕۆژە سەیرانە دەژیا، لای وابوو هەموو ئەو کاتانە لەدەرەوەی دونیا بووە.

لەو ڕۆژانەدا فێربوون دەیەها پارچە فلووتی سەیر بژەنن. لەو شەو و ڕۆژە بێکۆتاییانەی ئاوازدا، ئیسحاق فێریدەکردن هەموو شتێک بکەنە مۆسیقا، لە ساتەکانی مەستیدا کە هەر سێکییان وەک سێ باڵندەی تەڕ لە حەسرەت هەڵچوون و داچونەکانی ڕۆحیان عارەقەیان دەردەدا، مەستدەبوون و خوێنیان لە ناو ئاوازەکاندا دەتوایەوە، پەیوەندییان بە هیچ شتێکەوە نەدەما جگە لەو نورەی وەک لافاو لەگەڵ خۆیدا دەیبردن. ئیسحاق لەو ساتانەدا کە ژیانی خۆی دەگوشی و ئاوازی لێدروستدەکرد، لەو ساتانەدا کە هەستیدەکرد مۆسیقا بڵندیکردۆتەوە بۆ ئاستی خوداوەندەکان، دەیگووت

«گەردون هیچ نییە جگە لە مۆسیقایەکی بێدەنگ. هەموو شتێک لەگەڵ لەدایکبوونی خۆیدا ئاوازی خۆی هەڵگرتووە، هەموو زیندوویەک پارچە مۆسیقایەکی تایبەتە، هەموو مردوویەک ئاوازێکە بۆ خۆی. هیچ گەڵایەک نییە، مۆسیقای خۆی لەگەڵ خۆیدا نەهێنێت، فڕینی هیچ باڵدارێک نییە، ئاوازێک لە ئاسماندا دروستنەکات. دونیا سەرتاپای مۆسیقایە... شەو سەرتاپای مۆسیقایە، باران سەرتاپای مۆسیقایە...». لەو ڕۆژانەدا وێنەی هەموو دونیا لە بەر دیدەی جەلادەتی کۆتر و سەرهەنگ قاسمدا گۆڕا، لە هەندێ شەودا ئیسحاقی لێوزێڕین دەیهێنانە دەرێ و بە ناو شەودا دەیبردن، دەڕۆیشتن و چاویان دەنووقاند و مۆسیقایان لێدەدا، بە ناو درەخت و باغ و چەمەنزارەکانی بە هاردا دەڕۆیشتن و فلووتیان دەژەند، کپی شەوو دەنگی ئەستێرە و خەوتنی پاساری و خەیاڵی گوڵەکانیان دەکرد بە مۆسیقا. بایان دەکردە مۆسیقا، جریوەی چۆلەکە برسییەکان، سروەی فێنکی سەر گۆمە مەنگەکان. ئاگری دووری شارۆچکەکان، نیشتنەوەی پڕ لە ترسی کۆترێک لە کاتی پێکاندا، فڕینی تیتروا‌سکێک بە زامداری لە ناو پەڵەیەک گەنمدا، ڕاکردنی ژیژکێک لە ناو بروسکەکان، خەونی سمۆرەیەک لە ژێر باراندا، دەنگی پێی بولبولێک لە ناو هێمنی قەفەزێکی ئەزەلیدا، دەنگی هەناسەی چۆلەکەیەک لە کاتی تەماشاکردنی ئەستێرەیەکدا... دەڕۆیشتن و هەموو وێنە خەیاڵییەکانی سەری خۆیان دەکرد بە مۆسیقا، بە درێژایی شەو مۆسیقایان لێدەدا، هەندێجار دەربەند بە دەربەند، گەلی بە گەلی ئەو هەرێمانەی دەوروبەر دەگەڕان، بەڵام بێئاگا و بێخەیاڵ، بڕوایەکی قووڵیان هەبوو کە مۆسیقا ونیان ناکات. بەسەر بەردو دارو دڕک و تاوێر و گاشەبەردو کەندەڵاندا دەڕۆیشتن، بە هەوادا دەپەڕینەوە، بەسەر گۆمەکاندا بە پێی دەڕۆیشتن... هەرگیز بۆ ساتێکیش چییە چاویاننەدەکردەوە، هەندێجار ڕۆژ هەڵدەهات و ئەوان هەر مۆسیقایان دەژەند، شەو دەهات و ئەوان هەر مۆسیقایان دەژەند، باران بایە یان بەفر ئەوان لەسەر زەوی

نەبوون. هەندێ شەو کە بەدەم مۆسیقاوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە، لە ناو جێگاکەدا هەستیان بەو بارانە دەکرد کە تاسەر ئێسقان تەڕیکردبوون. شەوێک بەسەر ئاوی گۆمیچکەیەکدا ڕۆیشتن، وەک چۆن بەسەر زەویدا دەڕۆن، هەنگاویان بەسەر وردە شەپۆلەکانی گۆمێکدا نا، لەوسەر جەلادەت وەک لە خەو ڕابچڵەکێت، هۆشیهاتەوە بەر خۆی و گووتی «خودایە ئێمە بەسەر ئاوەکاندا ڕۆیشتین... وەک ئەوەی بەسەر ڕێگایەکدا بڕۆین بەسەر ئاودا ڕۆیشتین... وەک ئەوەی لەسەر زەوی بین بەسەر ئەو ئاوانەدا ڕۆیشتین و نەخنکاین». سەرهەنگ قاسم ڕادەچڵەکی و وەک جەلادەت لەو دەریاچە چکۆلەیەی دەڕوانی کە بەسەریدا ڕۆیشتوون. بێئەوەی هیچ بڵێت دەستیدەخستە سەر زاری جەلادەت و دەیگووت «بێدەنگبە و بڕۆ... بێدەنگبەو فلووت بژەنە». هەردووکیان چاویان پڕدەبوو لە ئاوو باوەشیان بەیەکدادەکرد... موعجیزەبوو، ئیلهام و سیحرێ بوو لە ئاسمانەوە هاتبوو. دەستیاندەخستە سەر دەمی یەکتر و وەک لە هەوادا ونبن، وەک ئەوەی هەریەکەیان سووکی و بێکێشی جەستەی ئەوی دیکەیان هەڵگرێ. دەستیان لەیەک دەدا... دوو مرۆڤ نەبوون بەڵکو دوو تارمایی بوون، لە جەستەی خۆیان چووبوونەدەرەوە و بووبوون بە ڕۆح.

ئەو ڕۆژانە جەنگ بەردەوام نزیکتر و نزیکتر دەبووەوە، چەندەها جۆری جەنگ لەو سەر زەمینەدا تێکەڵاوی یەکتر بووبوون، جەنگی وڵاتەکان و نەتەوەکان، جەنگی دینەکان و حیزبەکان. شەوێک لەو شەوانە جەنگ گەیشتە نزیکی ئەو شارۆچکەیە، بە درێژایی چەندین کاتژمێر گوێیان لە تەقەو تەقینەوە بوو، بەیانی ڕێبوارێک هەواڵی هێنا کە خەڵکی ئەو دەڤەرە هەموو چۆڵیدەکەن و دەگوازنەوە بۆ گوندەکانی دەوروبەر. بە درێژایی شەو بۆردومانی بەردەوام سەدەها قوربانی جێهێشتبوو، ئیسحاق بەبێ قوتابییەکانی گەشتێکی کورتی کرد وکە گەڕایەوە نیگایەک لە چاویدا بوو پڕبوو لە سێبەری کارەسات. مەرگ لە هەموو جێگایەک بوو،

سوپایەکی بێشوماری دەوڵەت لە باشوورەوە دەڕژانە کوچەو کۆڵانەکانی ئەو شارەوە، هەزارەها سەرباز کە زۆربەیان لە ژێر خودە ئاسنینەکانیاندا لە مشکی ترساو دەچوون، هەزارەها چەکداری کورد کە دەوڵەت بۆ ئەمجۆرە شەڕانە پڕ چەکی کردبوون، بە خۆیان و سمێڵە ئەستوورو گەمژەکانیانەوە، بە هەنگاوی پان و جامانەی قووتی سەرۆکە گەلحۆکانیانەوە لە کوچەکاندا دەسوڕانەوە. شەو دوای چاوەڕوانییەکی درێژ ئیسحاق وەک بەرامبەر ئەو هەموو مەرگە بۆ تین و تاوی ژیان بگەڕێت، بە قوتابییەکانی گووت فلووتەکانتان دەربهێنن و بابڕۆین، بێئەوەی گوێ بە ترسی ئەو دوو گەنجە بدات بەرەو جێگایەکی عاسی پێش قوتابییەکانی کەوت. کە چوونە ئەو دیو باغچەکەوە پێیگووتن «ئێوە هیچ شتێک مەکەن، تەنیا گوێبگرن». ئەو شەوە بە ناو سروشتێکی سەختدا بەرەو ترۆپکێکی مەزن سەرکەوتن، بە درێژایی ڕێگا ئەو ئاوازانەی دەژەن کە هەست و نەستەکانی دەگۆڕی، ئەو نەغمە سەیرانەی دەووژاند کە بە جۆرێکی دی سەرتاپای دونیای نیگاردەکێشایەوە. شەوبوو منداڵەکان وایاندەزانی ڕۆژە. تاریکی بوو منداڵەکان پێیانوابوو لە دەریایەکی نورو تیشکدا مەلەدەکەن، بەسەر سەختترین عەردا سەردەکەوتن پێیانوابوو لەسەر فەرشێکی گیا دەڕۆن. دونیا ساردبوو ئەوان هەستیان بە فێنکییەکی سەیر دەکرد. بەربەیان دەگەیشتنە سەر لوتکەیەکی خورافیانە، لەوێوە سەیری ئەو سەری ئەوسەری گەردونیان دەکرد، لەسەر بەردێک دادەنیشتن و کزەبای بەیان یاری بە قژو جل و هەناسەکانیان دەکرد. هەستیاندەکرد ئەو بەرزبوونەوە بێمەودا و سەیرە، ئەو شەوە درێژە لە فلووت، موچرکە ترسناکەکانی دوێنێی لە دڵدا سڕیونەتەوە. ئەوەی لە یادیانمابوو کۆمەڵێک وێنەی تاریک بوو، ئیسحاق لەو کەشکەشانی ئاسمانەوە دەیگووت «مۆسیقا حەشیشێکی ڕەشە... تلیاکێکی شیرینە». لەسەر بەردێکی بەرز دەوەستاو باوەشی بۆ بای بەیان دەکردەوەو دەیگووت «کاتێک هەست بە ترس دەکەن،

هەست بە نزیکی مەرگ و کۆتاییدەکەن، مۆسیقا بژەنن، مۆسیقا دەتوانێت کارەساتەکان هێورکاتەوە... دەتوانێت مردن ئاسانتریکات» سەرهەنگ قاسم بە دەنگێکی لەرزۆکی منداڵانەوە دەیپرسی «بەڵام مۆسیقا لەم جەنگەدا دەتوانێت چی بۆ ئێمە بکات، چی بۆ ئەو مردووانە بکات؟» ئیسحاق هەڵدەستایە سەرپێ... هیچی لەو پیاوە تێکشکاوەی دوێنێ نەدەچوو، وەک ئەوەبوو سەفەری شەو هێزێکی ئەفسوناوی تیا زیندوو کردبێتەوە. بای دەمەویەیان گەمەی بە دەنگ و هەناسەی دەکرد، دەستیدەبرد و لە زەوییەکە هەندێ گیای هەڵدەگرت و دەیدانە بەر با. سیحری بەیانی بەهار ژیانی تیادەبزواند. بەدەنگی پیاوێکی بەهێز، دەنگێک نەغەمی تیابوو نە وەڕزی دەیگووت «سوودی مۆسیقا بۆ مرۆڤ وەک سوودی مرۆڤ خۆی وایە لەسەر ئەم ئەستێرەیە...دواجار هیچ کەس نازانێت غایەت لە مرۆڤ چییە، کە غایەت لە مرۆڤ خۆی ئاشکرا نەبوو، بۆ لە غایەتی مۆسیقا بپرسین؟ تۆ دەڵێیت مۆسیقا دەتوانێت چی بکات؟ دەڵێیت بۆ ئێمە لەم جەنگەدا فێری مۆسیقا بین؟ دەڵێیت ئێمە سێ فلووت ژەنی بچوک چیین و بەرابەر ئەو هەموو هێزانە چیمان پێدەکرێت؟ مامۆستایەکم هەبوو باوەڕی وابوو مۆسیقا دەتوانێت مردووەکان زیندوویکاتەوە، پێیوابوو دەنگی مۆسیقا تاکە دەنگە لەمدیوی ژیانەوە دەگاتە ئەودیوی، دەیگووت تاکە دەنگێک مردووەکان دەتوانن بیبیستن مۆسیقایە. کوڕێکی مردووی هەبوو، هەموو ڕۆژێک دەچووە سەر گۆڕەکەی و مۆسیقای بۆدەژەن، هەموو شەوێک کوڕە مردووەکەی دەهاتە خەونی و داوای مۆسیقای لێدەکرد... باوەڕی وابوو کوڕەکەی گوێی لێیەتی. شەوێکییان لێم پرسی «مامۆستام تۆ دەزانی هەندێجار زیندووەکانیش لە مۆسیقای تۆ تێناگەن، بۆ ئێستا پێتوایە مردووەکان تێیدەگەن؟» ئەو گووتی «مۆسیقا بۆ هیچ کەس ناگەڕێت... ئەو ڕێگای نییە... ئاڕاستەی نییە... نە هیچ زارێک دەناسێت و نە هیچ گوێچکەیەک... ئەوە ئێمەین دەبێت بۆی بگەڕێین، ئەوەی ئێمە بەزار

دەیژەنین بەر لە ئێمە لێرەبووە، بە جۆرێک لە جۆرەکان و بە شاردراوەیی لێرەبووە... کێ گوێ لە مۆسیقا بگرێت ئەوە دەیدۆزێتەوە، مۆسیقا پەیوەندی بە زیندووو مردوو و گیانداروو بێگیانەوە نییە... هەموو شتێک دەتوانێت مۆسیقار بێت و گوێگری مۆسیقا بێت» ئینجا تەماشایکردم و بە هێمنی گووتی «مردووەکان باشتر دەتوانن گوێبگرن، تۆ ئەگەر تەنیا بۆ زیندووەکان مۆسیقا دەژەنیت فلووتەکەت فڕێدەو بگەڕێوە ماڵێ... زۆربەی زیندووەکان نازانن مۆسیقا چییە... مۆسیقا بۆ هەموو زەمانەکان لێبدە، بۆ دوێنێ کە ڕۆیشت و بۆ سبەی کە دێت... بۆ ئەوانەی تێپەڕیوون و ئەوانەی کە دێن، گوێگری ڕاستەقینە ڕەنگە باڵدارێک بێت، کوللەیەکی چکۆلە بێت، پەپولەیەک بێت... لەوانەیە گوڵێک بێت کە خۆت پێی پیادەنێیت». ئیسحاقی لێوزێڕین تەماشایەکی ئاسمانی دەکرد و دەیگووت «من گەلەک جار ئەو پرسیارەم لە خۆم کردوە. ئایا لە جۆرە ژیانێکی وادا لە جۆرە عەردێکی وەکو ئەوەی ئێمەدا، لە زەوییەکدا کە هەمیشە جەنگە، مۆسیقا چ کارەیە؟ مۆسیقا و جەنگ دوو شتی دوورن لەیەک، وەک دووری دەریا لەم ترۆپکانە، بەڵام هیچ کات دەنگی ناوەوەی خۆتان بێدەنگ مەکەن. هەمیشە وابووەو وا دەمێنێتەوە. جەنگ هەیەو مۆسیقاش هەیە، مردن هەیەو مۆسیقاش هەیە، دڵڕەقی هەیەو مۆسیقاش هەیە... زۆرجار بە تەنیشت یەکدا دەڕۆن و تەماشای نێوچاوی یەک دەکەن و لەیەکدی ناگەن و دووردەکەونەوە، مۆسیقا هەمیشە شتێکی جیاوازە لە جەنگ وەک ئەوەیە سەر بە دونیایەکی دیکەبێت، وەک ئەوەی لە ئەستێرەیەکی دیکەوە هاتبێت. بەڵام وەزیفەیەتی لەناو خوێن و ئاگر و ترسیشدا بەشداربیکات... جارێک فلووتم بۆ هەندێ پێشمەرگە لێدا، یەکێکیان لێم نزیکبووەوەو گووتی «تۆ واتکرد من ژیانم خۆشبوێت... ژیانی خۆم نا، ژیانی ئەوانی تر، ژیانی دوژمنەکانم». ڕۆیشت و لەوسەر گەڕایەوەو گووتی «ئیسحاقی لێوزێڕین مژدەم بەرێ، مژدە... کەسم نەکوشت».

بای بەیان ساردو پڕ لە موچڕکی تەنیایی بوو. هێدی هێدی ڕوی سپی خوێساری شەو لەسەر گەڵا نزیکەکان دەردەکەوت... ئیسحاق لەو جێگا بەرزەوە دەیگووت «مۆسیقا جاویدانە، هەمیشەییە، بەڵام هەندێجار لەبەرابەر مردنی ئینساندا بێباک و کەم غەمە». دەوەستاو دەیگووت «بەڵام لەوانەیە بمانباتە سەر سەرچاوەکانی نەمردن، بمانباتە سەر کانییەک لێی بخۆینەوەو نەمرین...». دوو قوتابییەکەی وەک هەمیشە لە مانای قووڵی قسەکانی ئیسحاق تێنەدەگەیشتن، بەڵام سەدای وشەکان لە ڕۆحیاندا دەنگیدەدایەوە.

ڕۆژانی دواتر ترسناک و تاریکبوون، جەنگ بە خێراییەکی سەیر لەو ماڵە تاراوگە و گۆشەگیرەی ناو باغەکان نزیکبووەوە. ئیدی ئیسحاق و قوتابییەکانی ناچاربوون نیشتەجێ و باغی خۆیان جێبهێڵن و لەگەڵ هەزاران هەڵهاتووی دیکەدا بەرەو شوێنێکی عاسیتر لە باکوور بڕۆن. جێهێشتنی خانوو و باغچەکان حەسرەتێکی قووڵی لە دڵی ئیسحاق و مێردمنداڵەکاندا جێهێشت، لە سەفەرێکی نهێنیدا کە کەس دوا ئامانجی نەدەزانی بە خۆیان و فلووتەکانیانەوە بەرەو باکوور کەوتنەڕێ. لەو سەفەرەدا ئیسحاق فێریکردن چۆن ئەو شتانەی دەکەونە ئەودیو سنووری دەنگەوە وەریگێڕنە سەر زمانی مۆسیقا، کە دەگەیشتنە سەر ئاوەکان پێیدەگووتن «گرنگ نییە دەنگی ئاو بکەنە مۆسیقا، بەڵکو گرنگ ئەوەیە ڕەنگی ئاو بگۆڕن بۆ ئاواز». کە دەگەیشتنە بەردەم ڕەشەباکان دەیگووت «گرنگ نییە دەنگی ڕەشەباکان بکەنە مۆسیقا، گرنگ ئەوەیە هێزو تین و گوڕی ڕەشەباکان بکەنە مۆسیقا» کە دەگەیشتنە گیاکان دەیگووت «گرنگ نییە سەوزیی گیا بکەنە ئاواز، گرنگ ئەوەیە خەوتن و هەستانی، منداڵی و پیربوونی بکەنە مۆسیقا» کە دەگەیشتنە بەردەمی بروسکەکان دەیگووت «گرنگ نییە ناڵەی بروسکەکان بکەنە سروود، گرنگ ئەوەیە ڕوناکییەکەی بەرجەستەکەن».

بەهەر جێگایەکدا دەڕۆیشتن و سەفەریاندەکرد، چەندین گەڕیدە و ڕێبوار دوای دەنگی فلووتەکانیان دەکەوتن. شەوێک مۆسیقایان بۆ ژنێک لێدا کە بەسەر ژانەوە بوو، مۆسیقاکەیان کاریگەرییەکی ئەفسوناویی لەسەر کارئاسانی هەبوو بۆ ژانەکانی، شەوێکیان مۆسیقایان بۆ بریندارێک لێدا کە بەردەوام خوێنی لەبەر دەڕۆی، پاش کەمێک خوێنپژانی وەستاو هەستایە سەرپێ. شەوێکی دیکە مۆسیقایان بۆ پیاوێکی شەل لێدا کە دەمێ ساڵ بوو نەیدەتوانی بڕوات. لە کاتی پارچە ئاوازێکی مەستدا هەڵدەستایە سەرپێ و لەسەر قاچە ئیفلیجەکانی سەمایدەکرد.

مۆسیقارەکان بێئەوەی بوەستن بەردەوام بەرەو باکوور دەڕۆیشتن، لە ڕێگا، گیای تەڕی ژێر تاوە بارانەکانیان دەخوارد، شیری مێگەلە بەهارییە ئاسودەکانیان دەخواردەوە. نەیاندەزانی بەرەو کوێ دەچن، هەر کەسێک لێیدەپرسین بۆ کوێ دەڕۆن؟ دەیانگووت دەچین بۆ باکوور. لە ڕێگا بەناو چەندین هەرێمی جەنگزەدەدا ڕابوردن، گەشتێکی درێژیان بەرەو چیاکانی باکوور کرد، لەوێ وەک سێ غەریب گوند بە گوند دەگەڕان، موعجیزەیان بە مۆسیقا دروستدەکرد، لە هەتاو بارانیان دەباراند، لە باران خۆریان دروستدەکرد، شەویان دەکردە بەیانی و بەیانیان دەکردە شەو، تامی گیاو شیرو هەنگوینیان خۆشتردەکرد، بە هەر شوێنێکدا دەڕۆیشتن بەر لە مرۆڤەکان، درەخت و ئەستێرەو باو هەتاو پێشوازیاندەکردن. هەندێ شەو بە یارمەتی مۆسیقا لە مبەری چیاوە دەفرین بەرەو ئەوبەر، زۆرجار کە بە ئاگادەهاتنەوە خۆیان لە شوێنی سەیرو عاسیدا دەبینی، لەسەر درەختەکان، لەسەر ترۆپکی هەڵەمووتەکان، یان لەڕەوەزێکی سیحراوییدا. بەسەر سەنگەری پێشمەرگەکاندا دەڕۆیشتن و لە شەوە ساردەکانی چاوەڕوانیدا ڕوناکی و ژیان و شادییان نیشانی ئەو مرۆڤە بێهیوایانە دەدا، کە هێدی هێدی خەریک بوو دەکەوتنە گومانەوە لە هەموو شتێک. هێزێک لە مۆسیقاکەیاندا بوو هەمووانی تووشی نەشئەیەکی قووڵ دەکرد. بەردەوام

لە ژێـر درەختێکـدا، لـە ژێرکەپـری جووتیارێکـدا، لـە ژێر کۆڵەکـەی مزگەوتێکدا پشوویاندەدا. کاتێـک پشوویاندەدا، ئیسـحاق بـە ترسـێکی بێئەندازەوە قسـەی لـە مـەرگ دەکـرد وەک جۆرێـک لـە ئاگـری هێمـن، ئاگرێـک کـە لـە شـارێکی گـەورە بەردەبێـت، بـەڵام لەسـەرەتادا لـە درەختێکـەوە، لـە ماڵێکـەوە یـان لـە قەیسـەری و بازارێکـی چکۆلـەوە دەسـتپێدەکات... سـەرەتا تەنیـا دوکەڵێکـی ڕەش و باریکـە، هێورهێـور گەورەدەبێـت، هێـور هێـور دەبێتـە سـووتانێکی گـەورە، هێـور هێـور خامـۆش دەبێـت.

قوتابییەکانـی هەسـتیاندەکرد تـا غەمگیـن و پەشـۆکاوتربێت، کەمتـر ڕووی موعجیزەئاسـای خـۆی دەبینێـت، کەمتـر سـیحری ناو مۆسـیقاکەی دەبیسـتێت، زیاتـرو زیاتـر بـەدوای موعجیـزەدا دەگەڕێـت، موعجیزەیـەک خـۆی ناتوانێـت ڕوونیبکاتـەوە، ناتوانێـت نـاوی بنێـت، بێهـودە بەدوایـدا دونیـا تەیـدەکات... موعجیزەیـەک کـە ناوێکـی سـەیرو پـڕ نهێنـی و ئاڵـۆزی هەیـە «نەمـری».

* * *

هەنـدێ کۆڵەپشـتی کەمیـان پێبـوو، تـا زیاتـر بـەرەو باکـوور بڕۆشـتبانایە، سـەرهەنگ قاسـم سـپیتر و غەمگینتـر و قووڵتـر دەینوانـد. بەیانیـان گـەر لـە نزیـک گوندێـک بانایـە، یـان لـە نزیـک شـوانکارەیەک، ئیسـحاقی مامۆسـتا چـی بۆ بەرچایـی بشـیایە دەیهێنـاو لـە نـاو هـەوای پـاک و لـە سـەر ئاورنگـی بەیانی دەیانخـوارد. لـە گەشـتیاندا بـەرەو باکـوور، بـەرەو ئـەو ترۆپکـە پڕتـەم و پـڕ ئەفسـونانە، سـەرهەنگ هێـدی هێـدی شـێوەی ڕۆحێکـی سـپی وەردەگـرت، شـێوەی تارماییەکـی دەگـرت کـە شـوێن پێکانـی ئاسـەوارێک لەسـەر گیـای پێدەشـتەکان جێناهێڵێـن. هەندێجـار بەزەحمـەت لـە نـاو تـەم و هاڵاوایـی سـپی سـوبحدا دەبینـرا، بەتەنیـا جیادەبـووەوە و فلووتـی بـۆ گوڵێچکـە چکۆلـەو وردو غەمگینەکانـی سـەر ڕێـگا لێـدەدا، دڵنیابـوو گوڵـەکان گوێیـان لێیـە، تـا

زیاتـر لـە ئاوەدانـی دووربکەوتنایەتـەوە ئـەو کاڵتـرو کاڵتـر دەبـووەوە، ئـەو هەسـتیدەکرد چ بـە جەسـتەو چ بـە ڕۆح پتـر تێکـەڵاوی سروشـت دەبێـت، هەسـتیدەکرد بـە ڕێگاوەیـە بـەرەو جێگایەکـی دیکـە لـەدەرەوەی شـوێن و زەمانـی ئاسـایی. جەلادەتـی کۆتـر تـا پتـر فێـری مۆسـیقا دەبـوو، شـتێکی قـورس و غەمگینتـر لـە ڕۆحیدا سـەریهەڵدەدا، تـا پتـر دەیتوانی بـە فلووتەکەی ئاسـمان و ڕوویـارو گیـاو تریفـە بکاتـە مۆسـیقا، پتـر غەمگیـن دەبـوو، تـا زیاتـر هەسـتی بـە شـادی داهێنـان و فێربـوون بکردبایـە، غەمێکـی دیکـەی تاریـک و تاڵاوێکـی دیکـەی پـڕ تەلیسـم لـە دڵیـدا بـە نهێنـی گەورەدەبـوو، تـا زیاتـر لـە کەمـاڵ نزیکبیایەتـەوە هەسـتیدەکرد شـتێکی ونکـردوە. ئـەو پتـر سـەرنجی سـەرهەنگ قاسـمی دەدا، تـا زیاتـر ڕووەو باکـوور سـەرکەوتبان، سـەرهەنگ بێدەنگتـرو کەمدووتـر دەبـوو. بـە فلووتەکەشـی هێنـدەی قسـەی لەگـەڵ بـاو تاریکـی و کـزەی ساردی بەربەیانـدا دەکـرد قسـەی لەگـەڵ ئـەودا نەدەکـرد. شـەوێکیان شـێتانە مۆسـیقایان لێـدەدا، هەرگیـز هیـچ کاتێکـی دی بـەو جـۆرە مۆسـیقایان لـێ نەدابـوو، مانـگ وەک دڕندەیەکـی مەسـت بەسـەر سـەریانەوە وەسـتابوو، ڕووناکییـەک کـە پێدەچـوو لـە پەیمانێکـی کۆنـدا بێـت لەگـەڵ ئـەو هەمـوو زوڵمەتـەی گەردونـدا بەدوایانـەوە بـوو، وەک کەوتبێتنـە زەوییەکـەوە نەسـەر بـە ڕۆژ بێـت نـە بـە شـەو، خاکێـک گوڵـە ئەسـتوور و مەزنەکانـی بـە بەرتەقـای گوڵـی نـاو ئەفسـانەکان بـوو، دەنگـی ئاوەکانـی وەک هـاواری فریشـتە وەهابـوو لـە نێـوان جۆگـەو جۆبارەکانـی بەهەشـتدا، خاکێـک وەک ئـەوەی بـە مۆسـیقا دۆزیبێتیانـەوە، وەک ئـەوەی نرکـەی زامـی نێچیرەکانیشـی هـەر ئاوازبێـت. وەک ئـەوەی مەخلوقێـک بـەر لـەوان ڕێـگای نەکەوتبێتـە سـەر ئـەم زەمینـە، شـتێک سەرسـامانە لـە نێـوان هیولاییەتـی دەنـگ و نەگیرانـی مۆسـیقاو دووردەسـتێتی ئـاوازدا، لەگـەڵ ڕەقـی سروشـت و بێڕەحمـی شـەو و درۆی تیشـکدا دروسـتبووبێت. شـتێک وەک ئـەوەی لـە نێـوان مۆسـیقاو چرکـەی مردنیـدا، لـە نێـوان لەدایکبوونـی گـوڵ و حاشـای

تەبیعەتدا ڕوابێت. درەختەکانی ئەو زەمینە، شتێک بوون لە تێکەڵبوونی خولیاکانی ئەو سێ مۆسیقاره بەو فەنتازیا ڕەشانەی لەو سەفەرەدا هاتبووە ڕێگایان، زەوییەک بوو نەتدەزانی ئایا هاڵاوی دروستبوونێکی لەناکاوی لێهەڵدەستێ یان دوکەڵی خاپووربوونێکی کۆن، غوباری گەیشتنی یەکەم مەخلوقی لێبەرزدەبێتەوە یان تەمی ئاوابوونی دواهەمین ئینسان، گوڵەکانی بۆنێکیان هەبوو تێکەڵ لە بۆنی باروت و بۆنی لەدایکبوون... گیاکان لە ژێر قاچیاندا دەترسان، بەڵام نە جەلادەتی کۆتر و نە ئیسحاق و نە سەرهەنگ، نەیاندەزانی ئەو ترسە ترسێکی دێرینەیە لە ئینسان یان ترسی سەوزاییەکە پێشتر مرۆڤی نەبینیوە. ئەستێرەکان لە هەندێ شوێندا بەر تەوێڵیان دەکەوت و لەهەندێ جێگای دیکەشدا بە چەند گوولەیەک دەچوون خێرا ڕووەو ناو زوڵومات بڕۆن. ئیسحاقی لێوزێڕین وەک قوتابییەکانی سەرسام تەماشای ئەو دیمەنانەی دەکرد، دڵنیابوو مۆسیقا هێناونی بۆ ئەم زەمینە، خاکێکە پێشتر کەسی دی پێی تێنەخستووە، زەمینێکە تەنیا مۆسیقارەکان دەتوانن بیگەنێ. ئەو یەکەم کەس بوو ئەو دەریاچە چکۆلانەیە ببینێت، دەریاچەیەک وەک شەپۆلگاهێک لە ئاواز شنەیدەکرد، دەریاچەیەک وەک ئەوەی هەموو تیشکی شەو بە ماتی بەرەو ڕووی بێت، وەک ئەوەی هەزاران گورزی تریفە لەیەک ساتدا بە ئەندازەیەکی ئاڵۆز بەر ڕوکاری بکەوێت و سەرکەوێتەوە. ئیسحاق گووتی «ئێمە ئێستا لە زەمینێکداین بەر لە ئێمە کەسانی ئاسایی ڕێیان تێنەکەوتووە، ئەوانەی بە ڕۆح مۆسیقا دروستدەکەن، دیوێکی تری دونیا دەژین، ئاستێکی دی بوون تاقیدەکەنەوە کە هەمیشە لەوانە عاسییە کە ناتوانن بە مۆسیقا ڕۆحی خۆیان و ڕۆحی دونیا ببینن». چەند هەنگاوێک بە ناو ئەو مەستی و سەرسامییەدا ڕۆیشتن، ئیسحاق دەیگووت «ئەم زەمینەی ژێر پێمان زەمینێکە تەنیا بۆ ئێمە دروستبووە، لێرەدا مۆسیقا لەوە دەردەچێت دەنگێک بێت لە ئامێرێکی چکۆلانەوە بێتە دەرێ، مۆسیقا وەک هەر سیحرو

وزەو ئەفسونبازێکی دی شێوەو ڕوخساری خۆی دەگۆڕێت، وەک چۆن ڕۆح دەتوێتەوەو دەبێتە جوانی، دەبێتە ڕەنگ، دەبێتە شێوە، ئاوەهاش مۆسیقا لە بێڕەنگی و بێڕوخساری خۆی دەچێتە دەرێ و دەبێتە شوێن، دەبێتە زەمین، دەبێتە باغ. ئەو دونیایەی مۆسیقا فەرمانڕەوایە تیایدا نەخشەیەکی تری هەیە جیاواز لە دونیاکانی دی... زەوی و گیاو شەوگارەکانی شتێکی دیکەن، مۆسیقارەکانی هێزێکی تریان هەیە جیاواز لە هێزی مرۆڤەکانی تر».
زەوییەک بوو دڵنیانەبوون لەوەی ئایا مەستی خۆیان دروستیکردوە یاخود بەشێکە لە نەخشەکانی خودا، بەرهەمی ئەو ماندووبوونە توندو بێدەروازەو زیندانئاسایەی ناو ئاوازەکانە یاخود شوێنێکی شەیتانییە کە فریوی مۆسیقا دروستیکردوە. ئیسحاق لەگەڵ هەموو سەرسامییەکیدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ماوەیەکی درێژ وەک خەلفە چکۆلەکانی بە مەبهوری لە ناو گیاو تریفەو درەوشانەوەی ئەفسونگیری گەڵاکاندا وەستابوو، بەڵام وەک هەمیشە لە قووڵایی ڕوانینەکانیدا تێگەیشتن و ڕوونی و تەفسیرێک هەبوو. تەفسیرێک تێکەڵ بە جوانی کۆی شتەکانی دیکە دەبوو. جەلادەتی کۆترو سەرهەنگ قاسم ڕاهاتبوون لە هەموو ساتەکانی سەرسامیدا، دەنگی مامۆستاکەیان، دیمەنەکانیان بۆ وەربگێڕێتە سەر زمانێکی تر. سەرەتا هەر سێکیان لە ناو گیاکاندا دانیشتن، ئیسحاق هەستیدەکرد مانگ لە ژوور سەریانەوە دەیەوێت شتێکیان پێبڵێت، بەرلەوەی سەرنجی سنوورە نادیارەکانی ئەو دەریاچەیە بدا، کە بە تەمێکی درەوشەدارو زیوین داپۆشرابوو، سەیری مانگی کرد کە پێدەچوو بە هێمنی بنیشێتە سەر زەوی. ئیسحاق گووتی «هەموو مۆسیقارێک ڕۆژێک لە ڕۆژان دەگاتە سەر زەمینی مۆسیقا، سەر زەمینێک کە سەر زەمینی خۆیەتی، وەک چۆن درەخت و مانگ و هەوا مۆسیقای خۆیان هەیە، مۆسیقاش درەخت و مانگ و هەوای خۆی هەیە، وەک چۆن دەریاچەکان مۆسیقای خۆیان هەیە، مۆسیقاش دەریای خۆی هەیە، ئەوە تەنیا شتەکان نین کە ئاوازیان هەیە، بەڵکو ئاوازیش دواجار لە جێگایەکدا

سنووره نەبینراوەکانی خۆی دەبڕێت و لە شێوەی گیاو باڵندەو تریفەدا دەردەکەوێتەوە. ئەو سنوورەی کە ئەفسونی مۆسیقا لە ئەفسونی گوڵێک جیادەکاتەوە، وەک ئەو سنووره وایە کە ئاوێک لە غوبار جیادەکاتەوە».

جەلادەت سەرسام گوێیدەگرت و چاوی لەسەر ئەو شەپۆلە زیوینانە بوو کە نەرمەبایەکی باکوور لەسەرەوەڕا بە ئارامی دەیبزواندن. شتێکی سەیر بەرەو ناو ئەو ئاوەی ڕادەکێشا، وەک ئەوەی مانگ، درەختەکان، شنەی تەلیسماویی با بەرەو ئەو دەریاچەیە پاڵی پێوەبنێن. هێزێک لە هێزی مۆسیقا بەهێزتر، هێزێک لە توانایدا نەبوو پێشی لێبگرێت، ڕوەو ئەو دەریاچەیەی دەبرد. ئیسحاق قسەیدەکرد، بەڵام جەلادەت هەستیدەکرد لە ناو ئەو تەلیسمەدا گوێگرتن لە دەنگێکی ئادەمی مانای نییە، پێنەدەچوو مۆسیقا خۆی بانگیبکات، بەڵکو شتێک لەو دیو مۆسیقاوە، قووڵتر لە هێزی هەر ئاوازێک، توندتر لە فریوی هەر دەنگێک بەرەو ناو ئەو ئاوەی دەبرد، ئاگای لە هاوڕێکانی نەدەما، بۆ ساتێک ئەو جوانییە لەوانی دادەبڕی، بۆ ساتێک لەوە لاوازتر بوو بتوانێت جگە لەو سیحرەی دەوروبەری دوای هیچی دی بکەوێت. ساتێکی سەیربوو، لە هەمان ئێستی ئەفسووندا، وەک ئەوەی توانای خۆی لەسەر جەنگێکی مەزن تاقیبکاتەوە، وەک ئەوەی لەگەڵ دیوە موتڵەقەکانی خۆی و دیوە کورتبڕو ئێستیلەییەکانیدا بجەنگێت. خۆی دەخستە ناو ئاوی دەریاچەکەوە. تێکەڵبوونی بە ئاوەکان هەموو دونیای دەوروبەری ڕوناکدەکردەوە، هێندەی ئەو تێکەڵ دەبوو مانگی ناو دەریاچەکە دەبوو بە هەزاران مانگ، هەر یەک لە ئەستێره بچوکەکان دەبوون بە هەزاران ئەستێره. سەرجەمی دەریاچەکە دەبووە گۆمێک لە تیشک. کاتێک بەرەو قووڵایی دووردەکەوتەوە، لە ماسییەکی گەوره دەچوو کە هەموو شتەکانی تری خستبێتە سەما. جەلادەت لەناو ئاوەکەدا دوو هەرێمی گەوره و جیاوازی دەبینی، یەکێکیان لە ڕووکەشی دەریاچەکەداو ئەوی دیان لە ناوەوە، یەکەمیان سەرتاپا نوور و ئەوی تریان سەرتاپای

زوڵمەت. یەکێکیان تەماسی لەگەڵ ئاسمان و ئەستێرەو هەوادا هەبوو، ئەوی تریان تەماسی لەگەڵ تاریکی و کپی و بێدەنگیدا هەبوو. نەیدەزانی لە کوێدا بوەستێت، لە کوێدا مەلەبکات، لە سەرەوە کە دونیا تێکەڵبوونێکی زەخرەفیانەی نێوان تیشک و ئاو بوو، یان لە خوارەوە کە زوڵمەت تۆڕێکی گەورەبوو چنراو لە هەزاران ڕێوێڵکە. لەناکاو وەک تاریکی و تیشک، وەک ئاو و بێدەنگی، وەک شەو و ئەستێرە وەڵامیبدەنەوە دەکەوتە مەلەکردنێکی سەفائاسا لە نێوان ڕوناکی و تاریکیدا، لە نێوان سەری دەریاچەو زوڵمەتە بێقەرارەکانی ناوەوەیدا، لە نێوان ڕۆشنی و سافی هەوادا لەسەرەوەو تەلیسم و نهێنی ئاودا لە خوارەوە.

ئیسحاق بۆ ئێستێک بێدەنگدەبوو، وەک ئەوەی ئارەزووی قسەی نەبێت، ئەو ئاووهەوا و چرپە شەرمنانەی شەو دۆخێکی دیکەیان لە ئیسحاقدا دروستدەکرد، لە مێژبوو مەلەی نەکردبوو، ئەو سەماکردنە سەیرەی جەلادەت لە نێوان کەناری دەریاچەو بنکی بێقەراریدا، دەیوەستان... بە هێمنی ئاوڕی لەو دوکەڵە درێژە دەدایەوە کە لە پشتەوەڕا بەسەری ئەوسەری تاریکییەوە دەبیەستەوە. خۆی ڕووتدەکردەوەو دادەبەزییە ناو دەریاچەکە، لەوێ لە بنکی بێقەراری ئەو دەریاچەیەدا، جەلادەتی دەبینی بە چاوی کراوەوە تەماشای گەمەی ئەو ماسییانە دەکات کە لەدەوری سەمادەکەن. هەردووکیان بەرەو قووڵایی هەرە تاریکی ئاوەکان ڕۆدەچوون، لە ناو زوڵمەتی بێئەندازەی ژێر ئاودا هەستیاندەکرد شەپۆل و شەو و هەناسەی گەرمی ئەو جانەوەرانەی هەزاران ساڵە لەویادا دەمرن شتێکیان بۆ دەهێنن نەناسراو و ئەزموون نەکراو. دروست لەو شەوانە دەچوو کە ئیسحاق منداڵ بوو و لەگەڵ کۆمەڵێک گەنجدا لە قەراغ ئاوێکی زیویندا فێری مەلەدەبوو. ئەو شەوە لەو قووڵاییە بێئەندازەو بێسنوورەدا، لە جێگایەکدا نە دەیانتوانی دەست بۆ یەکدی درێژبکەن، ئیسحاق هەستیدەکرد لەو قووڵاییە بێبنەشدا بوونی دوو ئینسان مۆسیقایەکی تایبەتی هەیە بەرزترە لە هەر مۆسیقایەکی

دی. هەستیدەکرد ئەو جەستە کپ و بچوک و ناسکەی ئەو گەنجە دەنگێکی لێدێت گەورەتر و بەسەداترە لە دەنگی هەموو مەخلوقاتەکانی دیکەی ناو ئاو، ئیسحاق دەیبیست جەستەی جەلادەت قسەدەکات، گوێی لێبوو بە ئاوازێکی سەیر لەگەڵ شەودا دەدوێت، هەناسەکانی گڕەیەکیان تیابوو پڕ لە وشەی ئاگرین، یارییەکانی دونیایان دادەگیرسان. ئیسحاق دەیبینی هەموو سەنگ و سیحرو هوشیاریی ناو ئەو ئاوەش لەدەوری جەلادەت کۆدەبێتەوە، دەیزانی هەموو گیاو ماسی و سەدەف و ڕووەکە نەناسراوەکان ڕوو لە جەلادەت دەکەن... جەستەی قسەیدەکرد، قسەیەک بەدەر لە لۆژیکی زمان، جەستەیەک بوو ئەو دەریاچەیەی دەکرد بە پارچەیەک عەشق، کڵۆیەکی گەورەبوو لە ئەڤین و کەوتبووە ئاوێکی مەزنەوە، ئیسحاق لەو زنجیرە ناسکانەی دەوری مەچەکی خۆیەوە هەستی بە ئارامی و عەشقی ئاو دەکرد... لە دڵەوە هاواریدەکرد «ئیلاهی...ئیلاهی ئەم منداڵە، هەموو ئەم بەحرەی کردوە بە عەشق». ئیسحاق لەو ژێر ئاوەدا بەخیلی بەو هەموو ژیانەدەبرد کە لەو گەنجەدایە، بەخیلی بەو هەموو درەوشانەوەو زیندوێتییە دەبرد کە بەحرێکی ئاوەدانکردۆتەوە، لە دڵی خۆیدا دەیگووت «خودایە ئەمە چییە، ئەم منداڵەی سەرتاپای ئەم بەحرەی پڕکردوە لە ژیان». ئیسحاق وەک بەرگەی ئەو هەموو وزەو سەرسامییە نەگرێت کە ئەو دەریاچەیەی هێنابووە جۆش، لەویادا بەراوردی جەستەی ماندوو و کەنەفتی خۆی بە جەستەی منداڵ و شێتی ئەو دەکرد، بەراوردی گڕی مردنی دەکرد لە ناو خۆیدا لەگەڵ گڕی ژیان لە ناو ئەودا، بەپەلە دەهاتەدەرێ و سەرسام و کاس دەوەستا، تک تک ئاو لە سەرتاپای دەتکا، بێئەوەی کزەی شەو بیترسێنێت، وەک ئەوەی لەو قووڵاییەدا جانەوەرێکی خورافی دیبێت، بە سەرەنگ قاسمی دەگووت. «شتێکی سەیر لە ناو ئەو هاوڕێیەتدایە... هاوارێک لە هەموو هاوارێک گەورەتر، بەڵام بێدەنگییەکیش لە هەموو بێدەنگییەک قووڵتر... سەیری ئەو دەریاچەیە بکە، چ نورێکی سەیرو

کوتوپڕو ئاسمانی تێکەوتووە... ئیلاهی ئەم منداڵە چ جۆرە مەخلوقێکە... وازی لێبهێنە... ئێمەی ئینسان لە تێکەڵاوبوونی سێ مەعدەن خولقاوین. مەعدەنی ئینسان کە بەشی هەرە گەورەی ڕۆحمانی پێکهێناوە، لەتەک مەعدەنی شەیتان کە بەشێکی تری بوونمانە، لەگەڵ مەعدەنێکی جاوید، کە بەشێکی بچوکە لە پێکهاتەمان، ئەو بەشەیە کە ئیلهامی جوانی و مۆسیقای لێوەردەگرین، بەڵام ئەم هاوڕێیەی تۆ لە کانزایەکی نەمر دروستبووە. سەیرکە هەموو ئەو بەحرە یەک پارچە جوانییە، هەموو ئەو بەحرە یەک پارچە ژیانە...».

جەلادەتی کۆتر وەک ئەوە بوو ناو بەرەو ئەوسەری دونیایەکی تری بەرێت، هەستی نەدەکرد لە دەریاچەیەکی نوردا سەمادەکات، ئەو لە ناو مۆسیقادا سەمایدەکرد.

شەوێک بوو لە جوانیدا کوشندە، تاکە شەوێک بوو پەیوەندی جەلادەت بە دونیاوە خاڵی بوو لە هەر ئاسەوارێکی جاران، خاڵی بوو لە ڕۆشنایی ئەو ڕۆژە ساردانەی دڵی جەلادەت لە ژێر کاریگەری ڕەشی دونیادا، لە ژێر کاریگەری دوکەڵ و ترس و برسێتیدا دەژیا. لە ناو ئەو ئاوەدا کە شەپۆلەکانی وەک نەغمەیەک، وەک سەما لەسەر ئیقاعی فڕینی شاعیریانەی باڵندەیەک دەجولایەوە، ئێستا هەستێکی دی دەژیا. ئەو هەستە خرۆشاوەی جەلادەت هەست نەبوو بە بەختەوەری، هەست نەبوو بە شادیی، بەڵکو هەستبوو بە کرانەوەی ڕۆح و جەستەی بەسەر دونیایەکدا کە تا ئەوکات هەستی پێنەکردبوو. ئەو لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا کە لەگەڵ ئیسحاقی لێوزێڕین و سەرهەنگ قاسمدا وەک دوو قەلەندەر زەمینی تەیکردبوو، هەموو ئەو موعجیزە سەیرانە ژیابوو کە مۆسیقا لە ناوەوەڕا مرۆڤی پێ گومڕادەکات. دڵنیانەبوو ئەو ڕۆژ سەیرو مەستانەی سەر ڕێگاکان بەرەو باکوور تەنیا مەستبوون بووە بە ئەفیونێک کە خەیاڵی بەرەو ئەوسەری ئەفسانە فڕاندووە، یاخود خودی مۆسیقا دونیایەک دروستدەکات، لەوێدا

ئەستەمە مرۆڤ مەستی و هوشیاری لە یەکدی جیابکاتەوە. ئەو دونیایەی کە ئیسحاق بە دونیای مۆسیقاران ناویدەنا، ئەو جەنگەڵانەی ئەو بە جەنگەڵێکی دادەنا تەنیا مۆسیقاران دەتوانن پێی تێبنێن، لەویادا دەبووە دونیایەک قووڵی و جوانی و پاکییەکەی جەلادەتیان دەترسان. تا تیشک زیاتر لەدەوری سەمای بکردایە، تا پاکی زیاتر ئابلۆقەی بدایە، زیاتر ئارامییەک دایدەگرت کە پڕبوو لە خۆشییەکی بێسنوور و ترسێکی تەماوی. ترس لەوەی ئایا ئەو تەنیا مرۆڤێکی سادەیە کە تا ئەندازەی شێتی حەزی لە مۆسیقایە یان دەتوانێت ببێتە شتێک لە دەرەوەی شێوە ئینسانییەکەی خۆی. وەک ئەوەی ئەو ئاوە دووڕیانێک لە بەردەم جەلادەتدا بکاتەوە، وەک ئەوەی پێشنیاری پاکییەکی ئاسمانی بۆ بکات، وەک ئەوەی هەڵیبژێرێت تا جیاواز لە هەموو ئینسانەکانی تر بیکاتە پەیامهێنێکی مەزن. کە لە ناو دەریاچەکەدا مەلەیدەکرد، وەک ئەوە بوو لە وجودیدا شەڕێک دەستی پێکردبێت، وەک ئەوەی ئەو ئاوە بۆ سروشتێک بانگیبکات دوور لە سروشتی خۆی. جەلادەت پێشتر بیری لە ماهییەتی بوونی خۆی نەکردبووەوە، بیری لەوە نەکردبووەوە، ئەو چییە؟ ئەو مرۆیەکە باش یان چەوت؟ لە ناو ئەو ئاوەدا یەکەمجار جەلادەت ئەو پرسیارە گرنگەی لا دروستدەبوو «ئایا ئەوە مۆسیقایە ئەمجۆرە سیحرە دروستدەکات، یان ئێمەین دروستیدەکەین، ئەوە مۆسیقایە بەرەو زەمینێکی وا دولبەر و پڕ تەفرەمان دەبات یان ئێمەین دەکەوینە ژێر کاریگەری فریوەکانی خۆمانەوە، ئێمەین دونیایەکی پڕ درۆ سازدەدەین و لێمان دەبێتە حەقیقەت؟ یاخود هەر بەڕاست سەر زەمینێکی ڕاستەقینە هەیە کە سەر زەمینی مۆسیقایە، سەر زەمینی جوانییە؟ ئەوە ئێمەین کە دەمانەوێت لە ناو شارو شوێن و دوورگەکاندا جوگرافیایەک دروستبکەین، کە تەواوکەرێکی خەیاڵی جوگرافیا ڕاستەقینەو غەمگینەکانە، یاخود لە ڕاستیدا جوانی و مۆسیقاو نەمری هەرێمێکن نزیک لێمانەوە، جوگرافیایەکن لە ناو جوگرافیای شتەکانی تردا

شاردراونەتەوە، لە شارێکدان نزیک نزیک لێمانەوە، هێندە هەیە دەبێت ببینین و دەست بۆ میوەکان و درەختەکانی درێژبکەین؟». ئەو شەوە جەلادەت بێئەوەی بیر لە وەڵامەکان بکاتەوە، بێترس خۆی دەدایە دەست شەپۆلەکان. خۆی فڕێدەدایە ناو قووڵترین جێگای تێکەڵاوبوونی تریفە بە ئاو، جێگایەک تیایدا دەستی لە دەرگا دوورەکانی مەلەکووت دەدا، جێگایەک پتر لەوەی مەلەی تیابکات، تیا دەفڕی. بە چەشنێک لە ساتێک لە ساتەکاندا جەلادەت هەستی ئەوەی هەبوو کە دەفڕێت، هەستی ئەوەی هەبوو لە بری باسک باڵی هەیە، لە بری ئەوەی بەر ئاو بکەوێت بەر مانگ دەکەوێت. لە قووڵایی دەریاچەکەدا خۆی هەڵدەگێڕایەوەو لە ژێرەوە، لە جێگایەکدا بارستەی ئاو لە هەر شوێنێکی تر چڕتر و سەنگینتر بوو، ئاڵەویادا چاویدەکردەوەو مانگی دەبینی. لە ناکاو وەک لەسەرەوەڕا تەماشای زەمینبکات، وەک لە سەروو هەورەکانەوە وەستابێت، تەکانی بەرەو سەرەوە دەدا، وەک ئەوەی هەزاران نارنجۆکی تیشک لەو دەریاچەیەدا بتەقێن، پریشکی ڕوناکی لە ناوەوەڕا زامداری دەکرد، نور تا قووڵایی دەیبڕی.

ئیسحاق لەسەر ڕۆخی دەریاچەکە وەک شێت دەهات و دەچوو، هەردوو قوتابییەکەی لەوێدا لە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی سەختدا بوون. لەم گەردونە گەورەیەدا هیچ کەسی لێدیار نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیتوانی زۆر شت ببینێت. لە ساڵانی دوورو درێژی فێربوونی مۆسیقادا، لەو ساڵانەدا کە لە بەر دەستی مۆسیقارە بە ناوبانگەکاندا مەشقیکردبوو، لەگەڵ ئەو ئوستادانەدا ژیابوو کە لە خەڵوەتە دوورەکاندا، لە ناو پێدەشت و چیاو وەردە دوورەکاندا، فێری مۆسیقایان کردبوو، دەستی لە موعجیزە شاردراوەکانی ئاواز دابوو، بەڵام نەگەیشتبووە خاکێک وەها پەشێوی بکات، دڵنیانەبێت لە سەر زەمینە یان فیردەوس، دڵنیا نەبێت سنووری جوگرافیا مادییەکانی دونیا لە کوێدا دواییدێت، تا سنووری مۆسیقا دەست پێبکات. لە ژێر بارستایی زۆری تریفەدا، لە ژێر کاریگەری زۆری ئەو

هەستە سەیرانەدا کە لە ناو ئەو دەریاچەیەدا تیاژیابوو، دڵنیابوو ئێستا ئەو شاگردە چکۆلانانەی دەکەونە جەنگێکەوە گەورەترە لە توانای ئەوان. گومانی لە دەسەڵاتی ڕەهاو سنووربەزێنی مۆسیقا نەبوو، گومانی لەوە نەبوو کە مۆسیقا هێزێکی گەورە دەدات بە مرۆڤ، بەڵام گومانی لەوە بوو ئایا مرۆڤ دەتوانێت لە ناوەوەڕا بەرگەی ئەو هێزە بگرێت؟ ئایا مرۆڤ دەتوانێت ببێتە هەڵگری ئەوجۆرە پاکێتییە؟ ئایا دەرونی ئینسان، جەستەی دەتوانن ببنە کەمانچە؟. ئایا ئینسان شتێکی تیا نییە لەوە تاریکترە مۆسیقا ڕوناکیبکاتەوە؟ شتێکی تیانییە لەوە ئاڵۆزترو شەڕانی ترە و هەرچۆنێک مرۆڤ دڵسۆزی ئاواز بێت، هێشتا ئەو ڕوکارە تاریکانەی لەگەڵ سافی و ڕوونی مۆسیقادا دەکەونە جەنگەوە؟. لەو ساتەدا کە ئیسحاقی لێوزێڕین مەلەی ئەو دوو گەنجەی دەبینی تێدەگەیشت قوتابییەکانی گەر بگەنە ئەوسەری ئیعجاز هەمیشە شتێکی دونیاییان تیادەمێنێتەوە، وەک ئەوەبوو قووڵ چووبنە ناو شەپۆلە سەرسامەکانی ئەو ئاوەوە تا تێبگەن کە مۆسیقا شتێکی ئەستەمیان لێداوادەکات، تێبگەن یان دەبێت ڕێگای ئەم جوانی و پاکییە بگرن کە بەرەوە شێتی دەیانبات یان بگەڕێنە دواوە.

جەلادەت کە لە نێوان فڕین و مەلەکردندا سەرسامانە دەجوڵایەوە، بۆساتێک سەرهەنگی نەدەدی، کە وەک جەستەیەکی تەنیا تریفە دەیبرد. سەرهەنگ قاسم مەلەکردنی لەو دەریاچەیەدا وەک قەدەر تەماشادەکرد، مۆسیقا بۆئەو دەریایەک بوو دەبایە تیا بخنکێت. لە کاتێکدا جەلادەت وەک باڵندەیەکی خۆشنوود بوو، سەرهەنگ بە جۆرێکی دی تەلیسمی ئەو دەریاچەیە دەژیا، سەرهەنگ بە شێوەیەک خۆی بۆ دەسەڵاتی ئەو ئاوە شلدەکرد، لە پەرێک دەچوو لە بەرزاییەکی گەورەوە بکەوێتە خوارێ، پەرێک بە هەندێک بازنەی خەیاڵی دەسوڕایەوەو بەرەو قووڵایی دەڕۆی، سەرهەنگ وەک بۆ مردن بەرەو ناو ئەو تیشکستانە بڕوات، بەهێمنی بەرەو خوارەوە دەهات، ژێر ئەو دەریاچەیە لای ئەو مەڵبەندی ئارامییەک بوو

لە سەرزەمینی مردن دەچوو. مردن بۆ ئەو شتێک بوو وەک مۆسیقا، لەکاتێکدا لەگەڵ ئەو ئاوەدا تێکەڵدەبوو، نەیدەپرسی ئایا بەرگەی ئەم هەموو جوانییە دەگرێت یاخود نا؟ ئایا بەرگەی ئەم هەموو ڕوناکییە دەگرێت یاخود نا؟ بەڵکو دڵنیابوو، لای ئەو پەیوەستێک مردن و مۆسیقای پێکەوەگرێداوە... پەیوەستێک بە ئاوازێک دەچێت لەو دیو وجودەوە بێت و لەگەڵ تاقمێک فریشتەدا ئەو بەرەو مەلەکووت هەڵگرێت.

سەرهەنگ قاسم کە دەگەیشتە بنی ئەو دەریاچەیە، وەک لە تیشکئابادێکدا ونببێت. دەگەیشتە ئاوێنە خاکێک لەویادا وێنە دووبارەکانی خۆی دەیانویست دەستی بگرن و بەرەو شوێنێکی دیکەی نەزانراو بیبەن، لەویادا دەترسا، هەستی بە سامێک دەکرد لە عەشقی مۆسیقا گەورەتر. خۆی بەرزدەکردەوەو بە هێزێکی گەورەوە ڕووەو سەرەوە دەگەڕایەوە، بەڵام هاوارێک لە قووڵایی ڕۆحییەوە پێیدەگووت، گەر ڕۆژێک مردی وەرەوە بۆ ئێرە، وەرەوە بۆ ئەم دەریاچەیە، ئێرە دەروازەی زەمینێکە تێیدا ئاوازێک دەست پێدەکات و تا ناکۆتا خامۆش نابێت، ئێرە دەرگای شارێکە سەرنشینەکانی بەبێ مۆسیقا دەخنکێن.

* * *

دوای سەعاتێک هەمووان پێکڕا لەسەر کەناری ئەو دەریاچەیە دانیشتبوون، سێ ڕۆحلەبەری تەڕ کە لە تیشکێکی نادیارو پڕ نهێنیدا نوقم بووبوون، هێشتا کەسیان تەواو لە مانای ئەو شەوە تێنەدەگەیشتن، کەسیان تەواو نەیاندەزانی چییان بینیوە؟ نەیاندەزانی ئەو هەست و نەستە لە ناکاوەی ناو ئەو ئاوە چ پەیوەندییەکی قووڵی بە داهاتوویانەوە هەیە. هەر سێکیان وەک یەک دەنگ لە ناوەوەڕا بانگیانبکات بە ڕووتی، بە نمەی ئاوی دەریاچەوە، بە خورپەیەکی لە ناکاوی ناو دڵەوە پەلاماری

جلەکانیان دا، خۆیان گۆڕی، فلووتەکانیان خستە ناو کۆڵەپشتەکەیان و ڕۆیشتن. دوای شەوێکی وەها جورئەتی ئەوەیان نەدەکرد مۆسیقا لێبدەن، دوای شەوێکی وەها نەیاندەزانی لە کوێن و بەرەو کوێ دەڕۆن. سێ قەلەندەربوون ملی ڕێگایان دەگرت و دەڕۆیشتن، چ ڕێگایەک؟ نەیاندەزانی. بەرەو کوێ؟ نەیاندەزانی.

ئاسان نەبوو لەو خاکی تەلیسمە بچنەدەرێ، ئاسان نەبوو لەو ڕۆشناییەوە بگەڕێنەوە ژێر زوڵمەتی ئاسایی ئاسمان. بێئەوەی ئاڕاستەیەکیان هەبێت دەڕۆیشتن، دەڕۆیشتن و هەڵدەلەرزین، وەک ئەوەی شتێک لە ناویاندا شکابێت، یان بە پێچەوانەوە شتێک لەناکاو لە ناویاندا سەوزبووبێت. بەربەیان دەگەیشتنە دامێنی چیاو جەنگەڵستانێک کە پتر لە جێگاکانی دی بۆنی باروتی لێدەهات.

لەوێ پشوویەکی کورتیان دەداو سەرلەنوێ بەرەو ئەو هەورازو شاخ و دارستانە بەردینانە دەستیان پێدەکردەوە.

دەبایە چەند جارێک ڕێگا و ئاڕاستەی خۆیان بگۆڕن، ئیسحاق و قوتابییەکانی تادەهات پتر بەناو سروشتێکی تاریک و زەمینێکی ترسناکدا ڕۆدەچوون، تا بەرەو باکوور برۆشتبانایە، زیاتر لە مەترسی نزیک دەکەوتنەوە. هەندێ ڕۆژ دەکەوتنە ناو دوورگەی گەورە گەورەوە لە دوکەڵ، بەهەر لایەکدا دەڕۆیشتن دەچووەوە سەر بەرەیەک لە بەرەکانی جەنگ. ئەوکات هەموو ئەم کوردستانەی ئێمە بەرەیەکی گەورەو بەرینی شەڕێکی خەیاڵی بوو، ئیدی بەرەو هەر جێگایەک پاشەکشێیاندەکرد دەکەوتنەوە ناو بۆسەی دارستانی سووتاو و زەمینی جەنگزەدەو هەرێمی خوێناوی. هەندێجار بە هەفتە بە ناو بۆنی درەختی سووتاو و مێرگی ڕەش و گوندی کاولەدا تێدەپەڕین. لە هەندێ شوێن بۆ ئەوەی درەخت و گیاندارەکان ئارامبکەنەوە مۆسیقایان دەژەن، مۆسیقایەک بتوانێت باڵندەو جەنگەڵ و نزارەکان لەگەڵ مرۆڤدا ئاشتبکاتەوە، مۆسیقایەک کەمێک خراپەی ئینسان

داپۆشـیێت و بڕێـک لـە جوانـی بگێڕێتـەوە بـۆ وێنـەی ئـەو مەخلوقـەی لـەو زەمینانـەدا ئاشـووب و کارەساتی نابووەوە. بـەڵام دەبایـە ئاگاداربـن، چونکـە ئیسـحاق دەیزانـی جـۆرە مرۆڤێـک هەیـە هیـچ مۆسـیقایەک ئـەو دڕندەیـەی نـاوی بێدەنـگ نـاکات. هەندێجـار دەبایـە مۆسـیقا نەژەنـن، نەبـا کەسـێک لـە تاریکیـدا شـوێنیان دیاریبـکات. وەک ئەوەبوو ئیسـحاق بزانێـت کەوتوونەتـە نـاو چ تۆڕێکـی سـامناکەوە. هەندێجـار بـۆ مـاوەی درێـژ بێدەنـگ دەبـوو، لەسـەر بـەردەکان دادەنیشـت و گوێـی لـە دەنگـی تـۆپ و فڕۆکـەکان دەگـرت کـە لـە دوورەوە گرمەیـان دەهـات. ئێوارەیـەک لەسـەر بەردێکـی گـەورە کـە بەسـەر مێرگوزارێکـی مەزنـدا دەیڕوانـی دانیشـتن، قوتابییـەکان بە ئیسـحاقیان دەگووت «مامۆسـتامان، ئێمـە وەک تەیرێکـی برینـدار بـە دەوری بازنەیەکـی گـەورەدا دەسـووڕێینەوە، ئێمـە وەک ئـەوەی لەنـاو دیوارەکانـی زەمانێکـی بێـدەروازەو بـواردا گیرمـان خواردبێـت، نەدەتوانیـن بـە مۆسـیقا لـەم گەمارۆیـە دەرچیـن، نەدەتوانیـن بگەڕێینـەوە بـۆ شـارە ئاسـوودەو هێمنـەکان، ئێسـتا دەتوانیـن جوانتریـن مۆسـیقا بژەنیـن، بـەڵام لـە خەراباتێکی وادا مۆسـیقا بۆ کـێ بژەنین؟ ئێسـتا هەقمانـە بپرسـین، بـۆ مـرۆڤ لەسـەرەتاوە فێـری مۆسـیقا دەبێـت؟ بـۆ ئێمـە لەسـەرەتاوە شـتێک فێردەبیـن کـە سـوودێکی نییـە؟ ئـەم گەشـتە بـەرەو کوێمـان دەبـات، سـەرزەمینی مۆسـیقا لـە کوێیـە؟ گەنجینـەی نۆتـە جاویـدەکان لـە کوێیـە؟ فلووتـی زیندەگـی لـە چ درەختێـک دروسـتدەکرێت؟ ئـاوازی ئاسـوودەگی کـە هەمـوو ئادەمییـەکان لەسـەر سـفرەیەک کۆدەکاتـەوە لـە کوێیـە؟».

ئیسـحاق دەیگـووت «مۆسـیقارەکان لـە ڕۆژگاری جەنگـدا، دەبێـت وەک مۆسـیقار بمێننـەوە، ئـەوەی بـۆ ئاوازێکـی مـەزن دەگەڕێـت نابێـت ماندووببێـت، جەنـگ و مـردن و ئـازارەکان هەمیشـە هـەن و بەردەوامـن، ئـەو مۆسـیقارەی نـاو ڕۆحیشـمان دەبێـت بەردەوامبێـت، ئـەو بـە جـودا لـەم گەردونـە ئیشـناکات، ئەو لـە نـاو ئـەم جەنگەدایـە، ئـەو خەزێنەیـەی ئـەو بـۆی دەگەڕێـت، لـە پێچێکـی

تاریکـی ئـەم وجودەدایـە. مۆسـیقا ناتوانێـت لـەم دوکـەڵ و خەرابسـتانە دەرمانبهێنێـت، مۆسـیقا لێرەدایـە لـە نـاو ئـەم خەرابسـتانەدایە، دەبێـت بێـرەدا تێپەڕێـت، هیـچ چارەیـەک نییـە، مۆسـیقار دەبێـت لـە جەهەنەمیشـدا بـژی. مـن ساڵەهای سـاڵ دوای ئـەوە کەوتـم، مۆسـیقا هەڵگـرم و دوور لـە دونیـا، دوور لە خەرابـات و وێرانەیـی و شـەڕ بیپارێـزم، نەهێڵـم ئـاوازی دووکـەڵ بێتـە گـەرووی ئـەم فلووتـەوە، نەهێڵـم ئـەم زەمینلـەرزە گەورانـە دەسـتم بلەرزێنێـت، بـەڵام ناکرێـت، کـە هـەوای پـاک لەسـەر زەویـدا نەمـا، مۆسـیقار دەبێـت قەبووڵـی بێـت ژەهریـش بکاتـە مۆسـیقا».

چەنـد ڕۆژێـک بـوو دەیانویسـت لـە دەربەندێـک بپەڕنـەوەو نەیاندەتوانـی، ئیسحاق لـە دوورەوە هەندێ چیـای دووری نیشـاندەدان و دەیگـووت «ئێمـەی مۆسـیقار بێئامانـج بـە زەویـدا دەسـوڕێینەوە، کـە لـە ماڵـی خۆمـان دێینـە دەرێ، لـە مۆسـیقا بـەو لاوە هیـچ شـتێک دەلیلمـان نییـە، وەک ئـەوەی جەسـتەمان بـە نەسرەوتی و بێئارامـی خـۆی، بـە سـوڕانەوەی وێـڵ و بێڕێـگای خـۆی، نەسـرەوتی و بێئارامـی ڕۆحمـان نیشـانبداتەوە، وەک ئـەوەی ڕۆحمـان پێویسـتی بـە جەسـتەیەکی وێڵبێـت تـا ببینێـت خـۆی چ قەلەندەرێکـە». بەڵام قوتابییەکانـی دەیانزانـی ئـەوان ڕۆژ دوای ڕۆژ بـەرەو شـوێنی ترسـناکتر دەڕۆن، شـەو دوای شـەو زیاتـر تێدەگەیشـتن کـە کەوتوونەتـە زەوییەکـەوە دەرگاکانـی داخـراوە، زەوییـەک بونبەسـت و تاریـک. زۆر شـەو دەبایـە بێدەنگبـن، بەئارامـی بڕۆیشـتنایە و هیچیـان نەگوتبایـە، چەندەهـا ڕۆژ بـوو دەڕۆیشـتن و ئاوەدانییەکیـان نەدەبینـی، لـە گونـدی ڕوخـاو بـەولاوە ڕێکەوتی هیچـی دیکەیان نەدەکـرد، هەندێجـار لەنـاو دارو بـەردی گونـدە خاپوورەکانـدا خواردنـی کۆنیـان دەدۆزییـەوەو دەیانخـوارد، وەک شـێت دەڕۆیشـتن وەک شـێتیش پشـووی درێـژ درێژیـان دەدا، ئێـواران هەمیشـە شـوێنێکی دوورو بێتـرس و خاڵییـان دەدۆزییـەوە بـۆ فلـووت لێـدان. هێـدی هێـدی هەردووکیـان دەبوونـە دوو فلووتژەنـی موعجیـزەکار، هەرکاتێـک فلووتیـان دەژەنـد بۆنـی زەمیـن دەگۆڕدرا.

ئیسحاق بەسەرسامییەوە تەماشایدەکردن و دەیزانی لە ناو بازنەیەکی ئاگردا گیریانخواردووە کە ئاسان ناتوانن لێی دەرچن. ئەو ساڵە دوورو درێژانەی وەک بازرگانی مەڕومالآت سنوور بە سنوور جەڵەبی گەورەی پێش خۆی دابوو، هاتوچۆی ناو چیاو هەردەکاندا کردبوویانە کەسێکی شارەزا، بەلآم ئێستا جگە لە مۆسیقا خەیاڵی لای هیچی دی نەبوو. دەترسا ئەو دونیایەی کە بۆ ماوەیەکی درێژ ئەوی لە مۆسیقا دوورخستۆتەوە، شاگردەکانیشی بەهەمان دەردببات، دەیزانی سوڕانەوەیان لەم زەمینەدا چەند ترسناکە، دەشیزانی گەر لەناو ئەم تەنهایی و سەختی و جوانییە گەورەی سروشتدا نەبێت، هیچ کەس نابێت بە مۆسیقارێکی گەورە. مۆسیقا لای ئەو تێڕامان بوو لە نهێنی دونیا، لە نهێنی مەخلوقاتەکانی سروشت، لە نهێنی گەلآکان و تەلیسمی شەونمەکان.

لەو ڕۆژەوەی قوتابییەکانی لە شار هێنابووە دەرێ، دڵنیابوو فەسادی شارەکان بەهرەو توانایان دەکوژێت، دڵنیابوو لە ناو گەردەلوول و باراندا نەبێت نابن بە مۆسیقار. مۆسیقا لای ئەو ڕامان بوو لە مەزنی گەردون، لە تێکەڵکردنی هەناسەی ئینسان بە هەناسەی شتەکانی تر. بەلآم لە ولآتێکدا سەرتاپای جەنگ بوو، بەهەرلایەکدا دەڕۆیشتیت مەرگ چاوەڕوانیدەکردی، لە زەمینێکدا تادەهات ترسناکتر دەبوو، ئیسحاق بێچارە دەوەستاو ڕادەما، کێشەی هەرە گەورەی ئەوەبوو، نەیدەتوانی بە ئاسانی قەبووڵی ئەو ڕاستییە بکات کە لە ڕێگای مۆسیقاوە ناتوانێت ترس و مەترسی بسڕێتەوە، نەیدەتوانی باوەڕ بهێنێت خراپەی هەندێک مرۆڤ دەتوانێت سروشتیش بگۆڕێتە سەر مەیدانێکی تاریک و پڕسام. گەر شارەکان بەکەڵکی ژیانی مۆسیقار نەیەت و سروشتیش بەکەڵک نەیەت، ئەی مۆسیقارەکان بۆکوێ بچن؟ ئەو تا دەیتوانی سەرنجی شاگردەکانی بۆلای ڕووە ڕوناکەکانی دونیا ڕادەکێشا، بەلآم لە قووڵایی ڕۆحیدا دەیزانی مۆسیقا تەنیا وەلآمی بانگەوازی سروشت و جوانییەکانی نییە، بەڵکو وەلآمی مەرگیشە.

هەر رۆژێک لە نێوان بۆسەو پایگاو بنکەکانی سوپادا گیریان بخواردایە، مۆسیقاکەیان پڕدەبوو لە ترس و دوودڵی. هەندێجار چەند رۆژێک لە ناو دوکەڵی جەنگ و بۆردومانی فڕۆکەو تێکەڵبوونی شەڕکەراندا گیریاندەخوارد، هەندێ رۆژ فلووتەکانیان دەشاردەوەو بەناو جەنگاوەران و تەرمی کوژراوو ناڵەی برینداره جێماوەکاندا دەڕۆیشتن، لەسەره رێگای خۆیاندا بە شاری خاپووروو وێرانکراودا تێدەپەڕین، هەندێجار رێیاندەکەوتە ناو مەفرەزەی بچوکی ئەو پێشمەرگە غەمگینانەی بە کۆمەڵێک کۆڵەپشتی زۆرەوە، بە خۆیان و بریندارەکانیانەوە بە هەورازە سەختەکاندا سەردەکەوتن. جارناجار کۆمەکی ئەوانیان لەهەڵگرتنی بریندارەکانیاندا دەکرد، مۆسیقایان بۆ دەژەنن، بەڵام ئاوازەکانیان لەو ئاوازانە نەبوو ئارەزووی شەڕکردن لە مرۆڤدا بەهێزبکات، زامدارەکان لەهەر کەس پتر خۆشییان لەو نەغمانەدەهات کە وەک تۆفانێکی بەهێز بەرەو ژیان رایدەکێشانەوە. جارێکیان بە مۆسیقا خوێنی بەریووی بریندارێکیان وەستتان کە قوڵپ قوڵپ خوێن لە سینەیەوە دەهاتە دەرێ. جارێکی دی لەیەکێک لە ئەشکەوتەکاندا کە دکتۆرێکی لاوازو چکۆلانە بە خۆی و چاویلکەو جامانەیکی چڵکنەوە دەبایە بێبەنج نەشتەرکاری بۆ بریندارێک بکات کە گوللەیەک لە گەرویدا وەستابوو، ئەوان چەندەها سەعات لە بری بەنج مۆسیقایان بۆ بیمارەکە لێدا، کە سیحری مۆسیقاکە زۆر لە ژانی نەشتەرو زامەکانی هێوردەکردەوە. لە رێگای خۆیاندا شەوانێک ژیان پڕبوون لە رێگای لەناکاو، لە زەمینی بەئادەمیزاد نامۆ، گەیشتن بە دەریاچەی دیکە کە بەشێک بوون لە خاکێکی دیکە. زەوی لە لۆچە نهێنییەکانی خۆیدا گەلەک ئاوەدانی خەیاڵی نیشاندان کە دەرگاکانیان تەنیا بە مۆسیقا دەکرایەوە. شەوێکیان دوای ئەوەی هەر سێ مۆسیقارەکە لە قەیاغێکی کۆندا لە زێیەکی گەورە پەڕینەوە، هێشتا دەنگی ئەو نەرمە شەپۆلانەی ئاو لەسەریاندا بوو، شتێک کۆتاییەکی کوتوپڕو سەیری بۆ ئەو گەشتە دانا کە هیچ یەک لەو مۆسیقارانە نەیاندەزانی چۆن کۆتایی پێبهێنن.

# له یادچوونەوەی مۆسیقا

## بەشی یەکەم

بەرێکەوت لە زێ پەڕیینەوە، من بەئەسپایی گووتم با لە زێ نەپەڕینەوە. من دڵنیانەبووم، چونکە من بۆنی باڵندەم دەکرد، لە زمانیان تێدەگەیشتم، من بە ئیسحاقم گووت «ئەو باڵندانەی دەترسن بۆ و بەرامەیەکی تریان هەیە، دەنگیان جۆرە مۆسیقایەکی تری تیایە، گوێبگرە تەیرەکانی ئەوبەر ئاو نائارام و شپرزەن، شتێکی نائاسایی دەبینن، گوێبگرە ئەوان بەو شپرزەیی و پەشۆکانە خەبەرێک بە ئێمە دەدەن، لە شتێک ئاگادارماندەکەنەوە» کە من وامدەگووت پۆلێک لە باڵدارە شپرزەکان لەوبەری ئاوەوە دەفڕین، بە جۆرێک شپرزەبوون هیچیان لە باڵندەی شەوێکی ئارام نەدەچوو. ئەو بە ئەسپایی گووتی «دەزانم» و هیچی دیکەی نەگووت. بە هێمنی سەیری ئەوبەری ئاوی دەکرد، بە ئەسپایی سەیری شەوی دەکرد. من بە یەقینی منداڵێکەوە کە گەلەک لە قسەکانی خۆی دڵنیایە تا ئەندازەی گریان، تا ئەندازەی ئەوەی گەرووی پڕبێت لە تۆفانی فرمێسک، دەمگووت «من دەڵێم با لە زێ نەپەڕینەوە، با لە زێ نەپەڕینەوە»، سەرهەنگ قاسم دەستی دەخستە سەرشانم و دەیگووت «دان بە خۆتدا بگرە». بەڵام ڕێگای دییمان لەبەردەمدا نەبوو، دەبایە لە زێ بپەڕینەوە. هەر سێکمان سێ فلووتمان پێ بوو، تەمێکی شەوانە کە تریفەیەکی وەک ئاگر ڕوناکیدەکردەوە،

هەوایەک لەگەڵ سەرماو زوقمیشیدا هێشتا لە ئاگر دەچوو، بەری زێی گرتبوو. وەک یەکێک بەپێی خۆی بەرەو مەرگی خۆی بڕوات، یەکەم کەس پێمخستە سەر قەیاغەکە. باڵندەکان شێت و شپرزە بەسەرسەرماندا دەفڕین و دەیانقیراند، لەو دەمەوە کە لە ماڵ هاتبوومەدەرێ، لەو کاتەوە زۆر چەشنی مەل و گەلەک جۆر فڕندەی عاجباتیم بینیبوو، بەڵام هەرگیز باڵدارەکان وەها تووڕەو شپرزەنەبوون. ئیسحاق وەک یەکێک لە وەجدابێت، شتێک ئیشراقێکی ترسناک لە ڕۆحیدا دروستبکات، ڕوناکییەکی کوشندە پێشچاوی ڕوناکدەکردەوە. وەک ئەوەی لەم ڕێگایە زیاتر شوێنی تر شکنەبات، خۆمان و قەیاغەکەی بەرەو ئەوبەر سەوڵدەدا. دڵنیابوو لەوبەر شتێک چاوەڕوانماندەکات، منیش دڵنیابووم، بەڵام سەرهەنگ قاسم، وەک بێباک بێت بەرابەر هەموو شتێک، وەک ئازایەتییەکی کوشندە و لە ناکاو بەرەو کارەساتی بەرێت، لە پێشی ئەو قەیاغەدا وەستابوو، لەو ساتەدا شتێکی تیابوو کە هەرگیز لە یادی ناکەم، وەستانی لە ناو قەیاغەکەدا، یاریکردنی با بە قژی، جۆری گرتنی فلووتەکەی، ئەو تەنیاییە قووڵەی لە چاویدابوو، هەموو شتێکی ئەو لەو ساتەدا سەیر و نامۆ هاتە بەرچاوی من. لەو ساتەدا هێندەی لە یەکێک دەچوو بە بەلەم دەیگوازنەوە بۆ مردن لە موسافیرێکی ئاسایی نەدەچوو. هەردووکمان غەریب بووین بە ئاو، بەڵێ لەوساتەدا هەموومان غەریب بووین بە ئاو، خەیاڵمان تەنیا لای ئەو گومانە قووڵەبوو کە لە دونیا هەمان بوو. دەبێت بڵێم لەو چەند ڕۆژەدا بێئەندازە گومانم لە غایەتی خۆمان پەیداکردبوو، سێ مۆسیقار دەبایە بگەڕێین و نەوەستین تا شوێنەکان ڕۆحمان و دڵمان نەشێوێنن، دەبایە لە هیچ جێگایەک لەنگەر نەگرین. مۆسیقا بێهۆشیدەکردین و ئێمەش دونیامان بێهۆشدەکرد، مۆسیقا لەوکاتەوە بۆ من تاکە زمانێکی ئینسان بوو لەگەڵ سروشتدا، من لەو گەشتەدا تێگەیشتم هیچ هونەرێک مرۆڤ بە سروشتەوە گرێناداتەوە مۆسیقا نەبێت، من شەوێک بە ئیسحاقم گووت «ئیسحاق،

سەیرکە گوڵ و درەخت و باڵندە ناتوانن لە شیعر تێبگەن، ناتوانن تەماشای تابلۆیەک بکەن، ناتوانن کتێب بخوێننەوە، بەڵام ئێمە لە ناو جەرگەی ئەم سروشتەدا وەستاوین و مۆسیقا تێکەڵماندەکات، من ناپرسم ئایا منم لە ناو تەبیعەتدا دەتوێمەوە یان تەبیعەتە لە مندا دەتوێتەوە، بەڵام هەستدەکەم گوێیەکی مەزن هەیە دەمانبیستێت، من ئێستا لە بیستنی گوڵ و تێگەیشتنی ئاوی ئەم پێدەشتانە دەترسم، هەندێ شەو تۆ ئاگات لێ نییە کە مۆسیقا لێدەدەم ئەژنۆکانم دەلەرزێت، چونکە دەزانم با و درەخت و ئەستێرە گوێم لێدەگرن، لە دڵی خۆمدا هاواردەکەم «گەر ئەوان حەز لەم مۆسیقایە نەکەن من دەمرم». من وام بە ئیسحاق دەگووت، کە دڵنیابوو مانەوەی ئێمە لە ناو سروشتدا، مانەوەمان بەم گەڕۆکییە چ ترسناکە، بەڵام ئێمە لەو موسافیرانە بووین هێند دەستدەکەن بەسەفەر چیدی ناتوانن بوەستن. ئاە، ئێوە وا حیسابمان بۆ بکەن کە ئێمە لەو ڕێبوارانەین کە خۆیان بە ئەنقەست نایانەوێت بگەنە دوا هەوار، چونکە دواجار بێئامانج بە ناو دونیاو چیاو دەربەند و زەمینە شاخستانە سەختەکاندا دەڕۆیشتین و نەشمانەویست بزانین بۆ کوێ دەچین. بە درێژایی ئەو ماوەیە ڕێنەکەوت هیچ یەک لە من یان سەرهەنگ قاسم لە ئوستادەکەمان بپرسین ئێمە بەرەو کوێ دەڕۆین. غایەتمان ئەوەبوو وامان لێبێت بیئەوەی هەست بە مەوداو ڕووبەرەکان بکەین مۆسیقا بمانبات، ڕۆیشتن بەشێک بوو لەو بێهۆشییەی تووشی دەهاتین. خۆشحاڵ بووین بەوەی نازانین لە کۆیدا دەگیرسێینەوە، نازانین لە کوێوە هاتووین و بۆ کوێ دەچین. خۆونکردن لە ناو سروشتێکی بێناو و بێئاراستەدا بەشێک بوو لە خۆونکردنمان لە مۆسیقادا.

ئەو شەوەی لە زێ پەڕینەوە، ئەو شەوە لە هەرکات زیاتر پرسیار لە مانای ئەم گەشتە لە مندا دروستبووبوو، ئەوکات ئیسحاقیش دەیزانی کە گەشتی ئێمە ناتوانێت گەشتێک بێت بە زەمینێکی بێترسدا، ئەو دونیا سووتاوەی ڕۆژانە پیادەڕۆیشتین، ئەو زەمینە سووتاوانەی دەمانبینی، ئەو

بریندارانـەی هەڵماندەگرتنـەوە بووبوون بـە بەشـێك لـەو گەشـتەمان. ئێمـە دەمانەویست سووک و ئاسـان بەنـاو ئـەو جەنگـەدا بڕۆین، بڕۆین و نەهێڵین کار لـە مۆسیقاو ژیانمـان بکات. ئیسـحاق دەیزانـی ناتوانین وابکەیـن، دەیزانـی بـەڵام هەرکاتێـک مۆسـیقا مەسـتیدەدکرد، وا ڕەفتـاری دەکـرد کـە زەمیـن سـەرتاپای بەهەشـتێکە ئێمـە دەبێت بیکەینـە کانگای ئیلهـام. بـەڵام ئیسـحاق پیاوێکی گەمژە نەبوو، ئەو هەتا سووتان و تاعوون و دەردیشی دەکرد بە مۆسیقا، دیارە حەزیدەکرد ئێمـە تەنیا بە نـاو سروشتێکی تازەو ئەفسـانەییدا سـەفەربکەین، شـوێنمان تەنیـا نـاو دارو درەخـت بێت، بـەڵام سروشـت لای ئـەو شـوێنێکی گەورەتـر بـوو، جگـە لـە جوانـی دیـوی دیکەشـی هەبـوو، بـە جۆرێک دەتوانـم بڵێم مـردن لـەو گەشـتەدا بۆئەو بەشێک بوو لە مۆسـیقا، ئەو مەخلوقێک بـوو بـێ هیـچ ئامێرێک دەیتوانـی ئـاوازی ئەفسوناوی بژەنێت. ئەو دەیتوانـی نەهێڵێت لـە زێ بپەڕینـەوە، بـەڵام کاتێک هـەر سێکمان لەنـاو تەمـی ئاگرڕەنگـی ئـەو شـەوەدا سـوار ئـەو قەیاغەبوویـن مـن تێگەیشـتم ئیسـحاق ئـەو ترسـەش وەک مۆسـیقا تەماشـادەکات. کـە سـەراسـیمە سـەیریدەکردین لـە نـاوەوەڕا گومانـی لـەوە نەبـوو کـە مۆسـیقا هەڵهاتـن نییـە لـە چارەنـوس، بەڵکـو ڕاوەسـتانە بەرابـەر چارەنـوس. کـە لـەزێ پەڕینـەوە وەک هەمـوو کاتێکی دی بـەرەو مۆسیقا دەپەڕینەوە، مـن بەرلـەوەی بگەینە ئەوبەر بەسـەر ترسـەکانمدا سـەرکەوتبووم، لـەو ساتەوە سـەفەری مـن بەنـاو کارەسـاتدا بـوو بەسـەفەریش بەنـاو مۆسـیقادا.

قەیاغەکە ئێمـەی دەبرد، ئـاو لەرەیەکـی غەمگینی هەبوو، بەڵام باڵندەکان تـوڕەو بێـزار دەیاننوانـد. لـە شـوێنێکدا باڵندەیـەک وەک بیەوێت بمخاتـە نـاو ئاوەکـەوە خـۆی کێشـا بـە سـینەما، مـن بـە دەنگـی بـەرز گووتـم «باڵندەکان وازم لێبهێنن، باڵندەکان بڕۆن».زۆرمـان نەمابـوو بگەینـە ئەوبـەر ئـاو، گەلـەک لـە ڕۆخـی زێ نزیکبوویـن کـە مـن بـۆ یەکـەم جـار تارمایـی شـتێکم لەنـاو درەختەکانـدا بینـی، ڕوناکـی تریفـەکان وەهـا سـەیر لەسـەر ڕووی ئاوەکـە

پەرچەبوونـەوە، دونیایـان چەشـنێک ڕوناکدەکردەوە وەک ئـەوەی ئاگرێـک لەنـاو درەختەکانـدا بەرپابێت. مـن شـتەکانم ڕوون و ئاشکرا دەبینی، هەمـوو شتێکم لەوبـەر زێ دەبینی، جوڵـەی درەختـەکان، جوڵـەی هەنـدێ مەخلوقاتـی گومـان لێکراو، شنەی با کـە تەمـی شـەوی لەگـەڵ خۆیدا لوولـدەدا. ئێمـە هـەر سێکمان ڕۆژانێـک بەبێ بەلـەم بەسـەر ئاوەکانـدا ڕۆیشـتبووین، ئـەوکات کـە مۆسیقا سـاف دەیکردین بـە ڕۆح و جەسـتەمان حوکمـی نەدەمـا دەمانتوانـی بەسـەر ئاوەکانـدا بڕۆیـن، بـەڵام ئـەو درەنـگ شـامە، ئـەو سـەرەتا تازەیـە جەستەمان هێند سـەنگین بوو، هەستمدەکرد قەیاغەکە لـە قورسـی ئێمـە بن ئاو دەکەوێت، ئـەوەی سـەیربوو ئـەو سـەنگینییە لـە نـاکاوەی لـەش بـوو، وەک ئـەوەی لەنـاکاو جەسـتەمان بـە هەمـوو جەبـرە ترسـناکەکانی خۆیـەوە هاتبێتـەوە. ڕاسـتە، بەڵـێ ڕاسـتە مـرۆڤ دەتوانێـت ترسـیش بـە مۆسـیقاوە گرێبدات، بـەڵام مـن لـەو قەیاغـەدا کـە خەریکـی دوورخسـتنەوەی باڵندەکان و تێرامـان بـووم هەسـتم بـە قورسـی خـۆم دەکـرد، سـەیری جوڵـەی ئـەو مەخلوقاتـە گومـان لێکراوانـەم دەکـردو لەشـم پتـر قـورس دەبـوو، هێندەمـان نەمابـوو بگەینـە ئەوبـەر زێ کـە تێگەیشـتم ئـەوان شـەیتانی گـوێ ئـاو و جنۆکـەی نێو پەڵە چناران نین، بەڵکو سـەربازن. لـە چاوتروکانێکدا لـە تـەم و تومانـی تێکـەڵ لـە جەنگـی تاریکـی و تریفـەدا تـەواو ڕوخسـارو شـێوەی یەکێکیانـم بـۆ جیاکرایـەوە بـە خـۆی و خـودەو سـەرەنێزەی باریکـی تفەنگەکەیـەوە کە تـەم و با پێکەوە سێبەرەکەیان دەشکاندەوەو چین چین لە هـەوادا هەڵیاندەگـرت و دەیانبـرد. مـن دەمتوانـی بقیژێنـم، دەمتوانـی بڵێـم بـرادەران لەوبـەر بۆسـەیەکی سـەربازی هەیـە، بـەڵام نەمقیژانـد، چونکـە دڵنیابـووم ئیسـحاق ناگەڕێتـەوە، ئـەو لەسـەرەتاوە لـە یـەک جێگادا لەنـاو ئـەو قەیاغـەدا وەستابوو، وەک ئـەوەی بێزاربێت لـەو خۆپاراسـتنە دوورو درێژەی خۆی و ئێمە، وەک ئەوەی چیتر بەلایەوە گرنگ نەبێت چی چاوەڕوانماندەکات، وەک ئەوەی خۆدانە دەست مۆسیقا و خۆدانە دەست قەدەری تێکەڵاوکردبێت،

دەیڕوانی و سەوڵەکانی لە ئاو دەدا و وەک بەرەو قیامەت بمانپەڕێنێتەوە لەسەر یەک ئیقاع دەیبردین. چەند مەترێک بەر لە کەنار یەکەم دەسرێژیان بەسەردا تەقاندین، ئیسحاقی لیوزێڕین لەسەر هەمان ئیقاعی خۆی بەردەوامبوو، وەک ئەوەی هەرسێکمان بزانین بەرەو کوێ دەڕۆین و چی چاوەڕوانماندەکات، ئەو دەسرێژە شپرزەی نەکردین. سێ مۆسیقاربووین لە قەیاغێکدا بەرەو دوژمن دەپەڕینەوە. کەلەوەبەر دابەزین، هاتوهاواری سەربازە عەرەبەکان لەبەردەمماندابوو، ئەوان لەناو دارو دەوەنەکانی دەوری ئاوەکەدا خۆیان حەشاردابوو، لەوساتەدا کە دەبایە ئێمە لەوان بترسین، پێدەچوو ئەوان لە ئێمە بترسن. ئێمە دابەزین قەیاغەکەمان لەوبەرئاو بۆ ساحێبی بەستەوە، دابەزین و بەفلووتەکانمانەوە بەرەو ڕوویان ڕۆیشتین، ئەوان هەندێ دەسرێژی دیکەیان بەسەردا تەقاندین، دواجار ئێمە لە فاسیلەیەکدا بەرابەریان وەستاین، نەماندەتوانی بڕۆین. لەوەوبەر ڕێکەوتی کردبوو کە بە دەم مۆسیقاوە بەناو کۆمەڵە خەڵکدا گوزەرمانکردوەو نەیانبینیوین، بەڵام ئەوان لە ناو دارەکاندا ئێمەیان دەبینی، ئێستێک لەویادا وەستاین تا یەکێکیان بە کوردییەکی خراپ گووتی «کاکات، وەرن پێش». دوای ئەوە هەرچییەکیان گووت بە عەرەبی بوو. من بۆئەوەی لەزەتی گێڕانەوەو تێگەیشتن لە ئێوە تێکنەدەم، هەموو عەرەبییەکانی ئەوانتان بۆدەکەمەوە کوردی، دیارە دەبێت لێم تێبگەن، من بەدرێژایی ئەم کتێبە هەموو ئەو دیالۆگ و قسانەی بە عەرەبی دەکرێن بۆتان دەکەمەوە کوردی، نا لە بەرئەوەی کە کوردی بە زمانێکی باشتر دەزانم، بەڵکو لەبەرئەوەی عەرەبی لە یادەوەری مندا زمانی جەلادەکانە، لە یادەوری مندا وەک زمانێکی ترسناک وەهایە کە ئەوانە قسەی پێدەکەن کە دەستیان بە خوێنی ئێمە سووربووە. یەکەمجار منداڵترین و چکۆلانەترین سەربازی خۆیان نارد، سوپا ترسنۆکترین دەزگای سەرزەمینە، لەویادا هەمیشە بچوک و بندەستەکان سەرەتا تیادەچن. سەربازێکی چکۆلانەبوو کە هەموو

گیانی دەلەرزی، دوای ئەوەی ئێمەی پشکنی بە ترسەوە هاواری لە ئەفسەرەکە کرد «هیچیان پێ نییە». لەدوامانەوە بە چەکەکەی ئێمەی بەرەو پێش باژوودا، هەرسێکمان وەک لە تەم هەڵکشابین هەڵمێکی ڕەشمان لێهەڵدەستا، هێدی هێدی لەناو دەوەن و سەوزاییەوە سەروسەکووتی ئەوانی دیش دەرکەوت، کۆمەڵێک مەخلوقاتی تاریک تریفە ڕوخسارییانی ڕوناکدەکردەوە، پێدەچوو لە نزیک بیرێکی نەوتەوە کاریان کردبێت، ڕوخساریان شتێکی وەک زەیتی لەسەربوو وایدەکرد هەموویان لە ژێر مانگدا بدرەوشێنەوە. ئەفسەرەکەیان یەکێکی بالابەرزبوو، سیمایەکی ترسناکی هەبوو، سمێڵە فاشستییە درێژەکەی ڕوخسارێکی دابووین جیاواز لە ڕوخساری سەربازەکان. ئەو یەکەم کەس بوو هاوارمان بەسەردابکات، قیڕانی «زووکەن، وەرنەپێش، وەرنەپێش». بەجۆرێک دەیقیڕاند لەگەڵ ئارامی ئەو زێ مەزنەدا نەدەگونجا، شتێک لە دەنگیدابوو نەدەبوو بە مۆسیقا، شتێک دژی مۆسیقابوو. من تا سەعاتێکیش لەو باوەڕەدا نەبووم کە گیرابم، شتەکان وەک خەوێکی پڕ تەم دەهاتنە بەرچاوم، خەوێک دەمویست لێی بەئاگابێم، بەڵام تائەبەد بەئاگانەهاتم. کە گەیشتینە بەردەم ئەفسەرەکە یەکەم شت پرسیاری لە فلووتەکانمان کرد، ئیسحاق کە لە هەمووومان زیاتر عەرەبی دەزانی پێیگووت «ئێمە سێ فلووتژەنی گەڕۆکین، ئازادانە بەزەویدا دەگەڕێین، نە هاودەمی کەسین و نە دوژمنی کەس، وەک چۆن تەیر ئازاد بە سروشتدا دەفڕێت، ئێمەش ئازاد بەسەر زەویدا دەڕۆین و ناشزانین بۆ کوێ دەچین». زەحمەتبوو بۆ ئەفسەرێک لەو وەلامە تێبگات، ئەو کاری ئەوەبوو کەس بە ئازادی لەوسەر زەوییە نەگەڕێت. من لەو باوەڕەدام گەر بمانگووتبایە ئێمە سێ ڕاوکەرین، سێ جەڵەبچیین، سێ دانەوێڵەکڕین نەدەگیرایین. بەلام هەرگیز بەبیری ئیسحاقدا نەدەهات لەبەردەمی ئێمەدا درۆبکات. سێ مۆسیقار لەناو ئەو خاکی خوێن و خەرابەدا چ کارەبوون؟ کابرا چلۆن دەبایە بڕوابکات؟ ئەو جگە لە شەڕی

کوشـنده هیچـی دی نەدیبـوو، ئێسـتا نەدەکرا بـاوەڕ بـەوە بهێنێت کـە لـەو دوکەڵـی جەنگـەدا سـێ کـەس هـەن بـە سـێ فلووتـەوە لـە ئـاو دێنـەدەرێ و دەیانەوێـت بێغایـەت بـە نـاو شـەڕو ئاشـتی، ئاوەدانـی و خەرابـدا بـڕۆن. قسـەکانمان مایـەی پێکەنین بـوو بۆئـەو. ئەفسـەرەکە چەند جارێک قسـەکانی بـە ئیسـحاق دووبارەکردەوە، هەمـوو جارێکیش ئـەو پێکەنینـە فاشسـتیانەی خـۆی پێدەکەنـی، پێکەنینێک وەک ئەوەبوو درەختەکانیش لەگەڵیدا پێبکەنن. نزیکـی پـازدە سـەربازبوون، هـەر پازدەیان لەیەکدەچوون، بەڵکو دەتوانم بڵێم تـەواو وەکـو یـەک بـوون، هەمـوو یـەک قەوارەبوون، هەمـوو یـەک شێوەی سـەیرکردن و ڕەفتاریـان هەبـوو، هـەر پازدەیـان بەیەکـەوە دەجوڵانـەوە، بەیەکەوە هەڵدەسـتان و دادەنیشـتن، هەموویان هەمـان جۆرە جلی بەڵەکیان لەبەردابـوو، بەیـەک شێوە قەیتانـی پێڵاوەکانیان گرێدابوو. کە دڵنیابوون ئێمە لـە سـێ کەسـی بێچـەک زیاتـر هیچـی تـر نیـن ترسـیان نەمـا. وەک هەمـوو ترسـنۆکەکان لـەدوای نەمانـی تـرس گەلـەک ئازابـوون. دوای سـەعاتێک پرسـیاری سـەیر سـەیر کە ئێمـە نەماندەتوانـی وەڵامـی هیچیـان بدەینـەوە، ئەو نالـە ترسـناکە هـات، نالـەی خومپارەیەکـی نزیـک کـە هـات و هـاواری سـەربازەکانی بـە دوادا بەرزبـووەوە. تەنیا هاوەنێکـی چکۆلانـە نەبـوو بتەقێت و تـەواو، بەڵکو جۆرە داگرتنەوەیەکی ترسـناک بـوو بۆ هەمـوو ئـەو بێشـەو کەنـارە کـە سـەربازەکان تیـا مۆڵگەیـان کردبـوو. تـا ئەوکاتـەی هـاوەن بـاران دەسـتی پێنەکردبوو کەمێک ئاسـایی و بە حورمـەت بـوون لەگەڵمـان، لەسـاتی ئاهەنگـە قرمزییەکەشـدا، لەپـەڕوو لـە جێگای خۆیـان بەزەویدا نووسـابوون و هـاواری خـوداو دایکیـان دەکـرد. ئێمـە هەرسـێکمان نەترسـاین، ئیسـحاق کـە لەتەنیشـتی منـەوە دانیشـتبوو، گووتـی «مەترسـن، بەڵکو بـە وردی گوێبگرن، شـەڕ ئاسـەوارێکی گـەورە لەسـەر خەیـاڵ جێدەهێڵێت، ئەوانـەی جارێک جەنگ دەبینـن دواتـر مۆسـیقاکەیان پڕدەبێت لـە ئیقاعاتـی بەهێز. میلۆدییەکانی شـەڕ، گیـان هەژێنتـرن لـە میلۆدی ئـەو دەرویشـانەی تەنیا لە دارسـتانە سـەوزەکاندا

دەگەڕێن». ئەو وای دەگووت و خومپارەیەک لە نزیکمانەوە ناڵەیدەکرد، زیخ و چەوی کەنار دەیدا بە گیانماندا. یەکێک لەسەربازەکان هاواریدەکرد «ئەم کوڕی قەحبانە، ڕەسەدی هاوەنی دوژمنن». من تا ئەوکاتە نەمدەزانی ڕەسەد چییەو هاوەن چییە دواتر گێڕانەوەی سەربوردی ئەو شەوە، بوو بەیەکێک لە حیکایەتەکانی ژیانم، من لە یادم نییە چەند جار لە ژیانمدا چیرۆکی ئەوشەوەم گێڕاوەتەوە، بەڵام پێموایە بۆ هەموو ئەوانەم گێڕاوەتەوە کە دۆستی نزیکم بوون. کە هاوەنەکان بێدەنگبوون بۆ ماوەیەک هیچ شتێک لە شوێنی خۆی نەدەجولایەوە، تا چارەکێک خامۆشییەکی کوشندە باڵی بەسەر زێ و زەمیندا دەگرت. خامۆشییەکی قورس، بێدەنگییەک کە پێش ساتە سەختەکان دەکەوێت، تا کات زیاتر دەڕۆیشت سەربازەکان پتر لە پەناگاکانی خۆیاندا دەجولان و سەریاندەهێنایە دەرێ. شتێکی بەد لە خەیاڵیاندا وایدەکرد ئێمە بە گوناهبار بزانن، یەکەمجار ئەفسەرەکە هاتە بەردەممان و گووتی «سێ کوردی حیز... سێ کوردی دایک حیز». یەکەم شەقی توندی لە ورگی سەرهەنگ قاسم هەڵدا، کە ناڵانی و بەلادا کەوت. دواتر دوو سەربازی دیکەیان بە خۆیان و خودە تۆزاوییەکانیانەوە هاتن بۆ کۆمەک، دواتر هەندێکی دیکەیان وەک ئەوەی شادییەکی مەزن لە ئازاری ئێمەدا ببینن لەدەورمان کۆبوونەوە، دواجاریش هەر پازدە سەربازەکە لێیاندایین. من یەکەمجار خوێنی لووتم پڕژا، یەکێکیان بە بنی پۆستاڵەکەی دای بە دەموچاومدا، هەموومان خوێناوی بووین، هێندەی برینی یەکترمان دەبینی خۆمانمان نەدەبینی، ئیسحاق لە کاتی ئەو ئازارەدا و دواتریش وەک یەکێک ئازارەکان وەجدێکی تیا دروستبکەن، وەک دەروێشێک لەساتی مردندا سەیری ئاوێکی بێکەنار بکات، ئاوەها بێدەنگ سەیری ئەستێرەی دەکرد، سەیری غوباری زێڕینی سەر زێ کە بەرەو ئێمە دەهات، سەیری ئەو باڵندانەی لەسەر سەرمان هەراوزەنایەکی سامناکیان دروستدەکرد. ئەوان لە ئێمەیان دەدا و ئیسحاق بە هێمنی

دەیگووت «بۆئەوەی ئەم ساتە بکەینە مۆسیقا دەبێت زۆر بیر لە جەستەمان نەکەینەوە» وایدەگووت و ئەوان شتێکیان دەکێشا بە دەمیدا. ئەو بەردەوام دەیگووت «کە لێتاندەدەن ئێوە لە خەیاڵی خۆتاندا مۆسیقا بژەنن، ئاگاتان لە نوقمبوونی خۆتان بێت لە بەحرێکدا هەمووی ئاوازبێت، مۆسیقا وادەکات لەشمان بەرگەی دەردی زۆرتر بگرێت». وایدەگووت و شتی دیکەیان دەکێشا بەزاریدا، من لە ژێرەوە تەماشای ئەو خوێنەم دەکرد کە لە لێوی زێڕینی ئەو دەهاتە خوارێ، لەو ساتەدا خەیاڵم لای هەموو ئەو مۆسیقا ڕژاوەبوو کە دەشێت لە خوێنی ئیسحاقدا بێت.

باڵندەکان هەمیشە لەوێ بوون، کە شتەکان تۆزێک هێوربوونەوە، هەر سێکمان وەک سێ سەگی زامدار لەسەر زەوی بەدەستی بەستراوەوە کەوتبووین. لە ساتێکدا وا تێگەیشتم دەیانەوێت هەر سێکمان بکوژن. چەند جارێک چاویان بەستینەوەو هەڵیانستانین، کەچی هەمیشە پاش تۆزێک چاویان دەکردنەوەو دایان دەنیشاندینەوە، پێدەچوو ئەو شەوە کۆتایی نەیەت. نیوەشەو لە جێگایەکی نزیکەوە جەنگێکی قورس دەستی پێکرد، بۆنی سووتانی زەوی، گڕی ئاگرگرتنی هەزاران درەخت لە پشت بەرزاییەکی نزیکەوە زەمینی ڕۆشنکردبووەوە. هەر سێکمان لەو گەشتەدا بەناو گەلەک دارستان و گوندی سووتاودا ڕۆیشتبووین، بەڵام ئاگری ئەو شەوە سەرنجی ئێمەی بۆ ڕۆشناییەکی غەمگین ڕادەکێشا کە لەکاتی مەستیدا بە مۆسیقا نەماندەبینی، هەندێک لەسەربازەکان وەک ئێمە بێچارە لە دوورەوە سەیری ئاگرەکەیان دەکردو سەرسامبوون، یەکێکیان بە ترسەوە دەیپرسی «کێ دەچێتە پێشێ و کێ پاشەکشێ دەکات؟». سەربازێکی دی دەیگووت «ئەبو شەباب، سوپا هێزێکی تایبەتی هەیە، کە عەمید کەمال تەها دەیبات بەڕێوە، ئیشیان سووتاندنی دارستانەکانە بە جۆرێکی ئەندازەیی، بە جۆرێکی تەواو ئەندازەیی». هەر ئەو سەربازە ئەوانی دڵنیادەکردەوە کە دوژمن دوورە، بەڵکو ئەوە هێزەکانی دەوڵەتن بە بۆمبی فسفۆری نزارو

بێشـەکان بـۆ پەلامـاری بەیانـی دەسـووتێنن. دوو سـەعات بەوجـۆرە بـوو، دوو سـەعات هەمـووان سـەیری ئـەو درەوشـانەوە سـەیرەیان دەکـرد کـە لـە دوورەوە لـە بریسکەی چاوی هـەزاران پشـیلە دەچوو لەسـەر درەختەکانـەوە تەماشـامانبکەن.

شـەوێک بـوو، وەک ڕێگایەکـی دوور بـەرەو جێگایەکـی بێناونیشـان، باڵنـدەکان هەمیشـە بەسـەرمانەوە بـوون. مـن سـات دوای سـات لاوازتـر دەبـووم، فلووتەکـەم لـە بـەر پشـتێنەکەمدابوو، ئـارەزووی ئـەوەم هەبـوو، ئـەو لاوازی و ترسـەی خـۆم بکەمـە ئـاواز، بـەڵام نەمدەتوانـی دەسـت بـۆ مۆسـیقاکەم بـەرم، بـە ئارامـی سـەرم دەخسـتە سـەر لمەکـەو تەماشـای ئیسـحاقم دەکـرد، کـە جارجـار وەک لەگـەڵ باڵندەکانـدا قسـەبکات، سـەیری ئاسـمانی دەکـردو دەمـی دەجولانـد. هەسـتمدەکرد سـەرهەنگ قاسـم لـە بـەر ئازارێکـی گـەورە لـە جەسـتەیدا بـە بێدەنـگ دەگـری. هەندێـک لـە سـەربازەکان کـە بەلاماندا ڕەتدەبوون بـە پۆسـتاڵەکانیان دەیاندا بەسـەرمانداو دەیانگووت «کاکات، هەموویـان کـوڕی قەحبـەن، وەلاهـی هەموویـان خوشـک حیـزن. شـەریفیان تیـا نییـە». هەندێکیـان دەهاتنـە بەردەمـی ئێمـە و زنجیـری پانتۆڵەکانیـان دەکـردەوەو میزیاندەکـردە بەردەممـان، یەکێکیـان نیتاقەکـەی کـردەوەو پانتۆڵەکـەی داماڵـی و بەرابەرمـان دانیشـت و پیسـاییەکی گـەورەی کـرد، کـە پیسـترین بۆنـی هەبـوو تا ئـەوکات بۆنمکردبێت، پیسـاییەک تەشـتێکی گـەورەی جلشـتنی پڕدەکـرد. ڕەنگێکـی سـەوزی کاڵـی هەبـوو کـە زوڵمـەت و تاریکـی نەیاندەتوانـی تۆخیبکەنـەوە، دەموچـاوی لـە بـەر تیشـکی دارسـتانە سـووتاوەکاندا دیاربـوو کـە هەنجەتـی لـە پاشـەڵی خـۆی دەکـرد، تـەواو لەوانـی دی دەچـوو، هێنـدە هەبـوو گوێیەکـی بێئەنـدازە درێژتربـوو لـەوی دیکەیـان، کـە تەواوبـوو ئاسـوودە پانتۆڵەکـەی هەڵبڕی و گووتـی «گـەر غەڵەتبکەن سـەرتان دەخەمـە ئـەو گـووەوە». ئیسـحاق وەک ئـەوەی لەگەڵمانـدا نەبێـت، بـەردەوام سـەیری باڵندەکانـی دەکـردو بـە ئامـاژەو هێمایەکـی ئاڵـۆز لـە نیگایـدا قسـەی

لەگەڵدا دەکردن. بەڵام سەرهەنگ قاسم سەری دەخستە ناو لمەکەوەو دەیگووت «وەک مەلەکردن لە تیشکدا، وەک مەلەکردن لە ڕوناکیدا». نەمدەزانی مەبەستی چییە، بەڵام هەستمکرد هەردووکیان دەتوانن لە شوێنی تربن، هەستمکرد لەگەڵ سەختی ئەو ساتەدا ئەوان دەتوانن ڕۆحیان و جەستەیان لە یەکدی جودا بکەنەوە، وابکەن لەو شوێنەدا کە ئازارو عەزاب هەیە گیانیان لە جێگایەکی دیکەبێت، ئەو حەقیقەتە هێندەی دیکە شەوی منی دەشێواند. وەک ئەوەی من سوودم لەو ماوە درێژەی مۆسیقا نەبینیبێت، وەک ئەوەی من تاکە کەسێک بم لە نێوانیاندا کە ناتوانێت ڕۆح و جەستەی لەیەک جیابکاتەوە. من شتێک وایدەکرد نەتوانم ئەو سەربازانە فەرامۆشبکەم، نەتوانم دەنگی ئەو خومپارە سامناکانە لە سەرمدا هێوربکەمەوە، نەتوانم بۆنی ئەو پیسابییە سەوزە کە لەبەردەممماندا هالاوی لێهەڵدەستا فەرامۆشبکەم، من بەردەوام سەیری ئەو گووەم دەکرد لە پێشدەممدا، بەڵام سەرهەنگ قاسم وەک گەڕابێتەوە بۆ دەریای ڕۆح، بۆ جێگایەک لەدەرەوەی ئێرەو ئێستا لە ئیشراقێکەوە کە بە ئازارەکانی جەستەی تێکەڵ دەبوو دەیگووت «ئاخ ئەی سپێتی، ئاخ ئەی ڕۆشنایی».

دەمەوبەیان ئەفسەرەکە لە دەزگایەکی کۆڵەپشتەوە بە سەرۆکەکانی دەگووت «سێ گێرەشێوێنمان گرتووە، لە جلی سێ مۆسیقاردا خۆیان گۆڕیوە». بەر لەوەی خۆرهەڵبێت لە ڕێگایەکی دوورەوە زیلێکی داخراوی گەورە دەهات کە کۆمەڵێک پلەداری گوردانی ڕێکخستن و ڕاگرتنی سەربازی تیابوو، چاوی هەر سێکمانیان دەبەستەوەو سوار ئەو زیلەیان کردین کە ئێمەی برد بۆ چەهەنەم.

ئەو زیلە وەک گیانەوەرێکی ترسناک بێپشوو بە ڕێگایەکی درێژدا دەڕۆی، ئێمە لەو دیو دەرگا ئاسنینەکەیەوە، وەک ڕۆحلەبەری قوتو لە ناو چەندەها دەبەی بانزین و جلیکانەی گەورەدا، لە نێوان قوتووی گریس و

ویلی ژەنگاوی و پارچە گوێنی دڕاودا دەکەوتین، ئەوە دواهەمین ساتەکانی پێکەوەبوونمان بوو، بەرلەوەی هەریەکەمان دووبارە بۆ حیکایەتی تایبەتی خۆی جیاببێتەوە. ئیسحاق وەک لە چارەنوسمان دڵنیابێت، لە ناو زیلەکەدا ئەو پلانە سەیرەی بۆ داناین کە دوای ئازادی چۆن یەکدی بدۆزینەوە، ئیسحاق ناونیشانی گۆڕستانێکی داینێ، لەو گۆڕستانەشدا ناونیشانی گۆڕی شاعیرێکی نەناسراو، کە دوو کێلی هەیە یەکێکیان ڕەش و یەکێکیان سپی، شاعیرێک هەموو ژیانی بە نهێنی شیعری هۆنیوەتەوە، دۆستێکی نهێنی و نەناسی ئیسحاق کە پێدەچێت سەردەمانێک لە نێوان فلووتی ئەوو شیعری ئەمدا شتێکی نادیار هەبووبێت. گووتی «بۆئەوەی یەکتر بدۆزینەوە، هەرکەسێکمان زووتر لەوانی دی بەربوو، ناونیشانی خۆی لەسەر تەختەیەک هەڵکۆڵێت و لە تەنیشت کێلی سپییەوە بینێژێت». لای ئیسحاق دونیا لەوە گەورەتربوو بتوانین بە ئاسانی یەکتر بدۆزینەوە. ئەوەی لەو چەند سەعاتەدا ئیسحاقی سەرقاڵ دەکرد چۆنێتی یەکگرتنەوەمان بوو. جگە لەو پلانە، کۆمەڵێک پلانی دیکەشی بۆ داناین، ناوی هەندێک چیاو ئەشکەوتی پێگووتین کە دەشێت ئەو وەک قەلەندەرێک ڕوویان تێبکات، ناوی هەندێک جەڵەبچی سەر مەرزی داینێ کە دەشێت لە کاتی نەبوونی شوێن و مەئوادا ڕوویان تێبکەین، ناوی خەیاتێکی داینێ لە ژێرزەمینی کوچەیەکی ناسراودا کە گەر ناوی ئیسحاقمان چپاند بە گوێیدا دەرگای ماڵی خۆیمان بۆدەخاتە سەر پشت. دواجار سەیری منی کرد و گووتی: گەر لەوێش یەکدیمان نەبینییەوە، سوێند بێت جەلادەت لە شارێکی تردا یەکتر دەبینینەوە، سوێندبێت یەکتر دەبینینەوە. ئەو چەند سەعاتە ئیسحاق باسی مۆسیقای نەکرد، باسی ڕۆحی نەکرد، بەڵکو بووەوە بەو پیاوە دونیاناسەی کە لە هەموو جێگایەکدا دەستێکی هەیە، ئەو چەند سەعاتەی ئیسحاق تیا گۆڕا، نیشانەو سەرەتایەکی ترسناک بوو بۆ من. من لەو ساتەوە بۆنی ژیانێکی ترم دەکرد، بۆنی دوورییەکی ناکۆتاو کوشندەم دەکرد، هەستم بە

ڕەشەبایەکی زەرد دەکرد لە پێشچاوم دێت و دەچێت، هەندێک لەو ماسییە خورافیانەم بینی، کە دواتر بەڕاستی لە هەوای شارێکی دووردا بینیمن مەلەیاندەکرد. دوو ئەسپی سپیم لە تاریکیدا دەبینی، دوو ئەسپی سپی کە ڕۆژگارێکی تر، لە تەپوتۆزی جەنگێکی دیکەدا هاتنەوە ڕێگام.

## بەشی دووەم

ئێستا دەبێت لە جێگایەکی ترەوە دەست پێبکەم، زۆر دوور لەو سەرەتایەی یەکەمجار. دەبێت لە نەقیب سامیری بابلییەوە دەست پێبکەم. ئەو پیاوەی چەند ساڵێک دواتر من بە دیلی بەرەو شارەکەی خۆم، شاری ئومێدە بەباچووەکان خستمە پێش خۆم. ئێستا نازانم چۆن سەیریبکەم، دوای ئەو هەموو ساڵە گەر لێم بپرسی ئەو ئەفسەرە غەمگینەی لە زۆر لە سەفەرەکاندا، لە ڕۆژە تەماویی و تاریکەکاندا، لە ژوورێکی قاتی شەشی ئوتێلێکی سووتاو، وەک تارماییەکی بێدەنگ لەگەڵتدا بوو چ جۆرە پیاوێک بوو؟ نازانم چیت وەڵامبدەمەوە. بەڕاستی نازانم... من لەیەک شت دڵنیام، لەیەک شت ئەویش ئەوەیە کە ئەو هەمیشە ئەفسەر بوو، هەتا لە یاخیبوونیشیدا شتێک لە سروشت و تێڕوانین و ڕەفتاری ئەفسەرەکانی تێدابوو. ئەو پیاوەی دەیگووت بەردەوام کۆمەڵێک ئەسپ لە خەیاڵیدا غاردەدەن. ئەو ئەسپە سەیرو سپی و تەنهایانەی من لە چاوانیدا دەمبینی، چونکە تەنیا من بۆم هەبوو تەماشای چاوانی بکەم و لە ڕۆحی بڕوانم. ئەو دەیزانی چاو هیچ نییە جگە لەدەروازەیەکی بچوک و نهێنی و باریک بۆ ناو ڕۆح، دەرگایەک وەک ئەوەی لە پشتی سەردابێکی چکۆلانەدا بێت، بەڵام دەرگایەک لەوێوە دوای سەرکەوتن و دابەزینێکی زۆر، دوای تەیکردنی چەندین ڕیواق و ڕێگای باریک ئەوسا دەگەینە حەوشێکی سەیرو پڕ ئاژاوە کە ناوی ڕۆحە.

بەڵام مەرج نییە هەموو چاوێک دەروازە بێت بۆ ناو ڕۆح، ئێمەی مرۆڤ هەمیشە ئەو دەرگا چکۆلانەیە بە جۆرێک کلیلدەدەین کەس نەتوانێت بە تەماشاکردنی نیگاکانمان زەفەر بە نهێنییە قووڵەکانمان بەرێت.... نهێنی؟ بەڵام کێ دەڵێت ڕۆحی ئێمە هیچ نهێنییەکی تێدایە؟ کێ دەڵێت ڕۆحی ئێمە جگە لە پاشماوەو پاشەڕۆی ژیانمان هیچی تری تێدایە؟. هەڵەی هەرە گەورەی مرۆڤ ئەوەیە کە پێیوایە شتێکی گرنگی لەوێدا هەڵگرتووە، پێیوایە خەزنەیەک لە نهێنی هەیەو ئەو نهێنیانەش لە گەنجینەیەکی تاریکدان لە بنی سەردابێکی دووردا کە نابێت کەس دەستی بیگاتێ. بەڵام سامیری بابلی وەها نەبوو، ئەو ڕۆژێک ڕۆحی خۆی نیشاندام، ڕۆژێک وەک بەرەو گەشتێکی سیحراویم بەرێت، منی بەرەو ناو ڕۆحی خۆی برد. بەڵام ئێستا کاتی ئەوە نییە باس لەو گەشتە سەیرەی خۆم بکەم، ئەوە جێدەهێڵم بۆ کاتی خۆی، بۆ ساتێ ئێوەش لەسەر حیکایەتەکەی ئێمە شتێک دەزانن. بەڵام واتیمەگەن ئەوەی بە ڕۆحی یەکێکی تردا سەفەریکرد دەتوانێت هەموو شتێک لەسەر ئەو بزانێت، ڕۆح شتێکی سەیرە کە گەلێ جاری تر من لە دەفتەرەکانی خۆمدا باسیدەکەم، من لە هەر کوێیەک بگیرسێمەوە، ئەو پرسیارە سەیرە دەکەم «ڕۆح چییە؟» بە هەر کەسێک بگەم لێیدەپرسم ڕۆح چییە؟ من ئەو پرسیارەم لە هەموو کەس و شتێکی دونیا کردوە، لەو درەختە تەنهاو غەمگینانەوە بیگرە، تا دەگاتە ئەو باڵدارە تەنهاو ترساوانەی کە دەمەو ئێواران بە خێراییەکی نائاسایی بەرەو جێگایەکی نادیار دەفڕن، لەو پەرییە غەمگینانەم پرسیوە کە ژیانی دالیا سیراجەدینیان گەمارۆدابوو، لەو پەپولە هێمنانەی ئێواران بەبەردەم بالکۆنە فێنکەکەماندا لە تیاتری «پرتەقاڵی سپی» دەفڕین. لەو ڕێگا دوورو درێژانەم پرسیوە کە بەرەو قیامەت دەمبڕی و دەگەڕامەوە، لەو بەلەمانەی لە ناویدا نامەکانی ئەو دیو دونیام دەهێنایەوە، لەو ئەسپە وێڵانەی لە قەراغ جادە خەیاڵییەکاندا بە زینکراوی وەک ئەوەی خودا بۆ منی بەستبێتنەوە دەوەستان. پرسیارێک

هیچ شتێک، هیچ گوڵێک و هیچ بایەک و هیچ ئاوێک وەڵامی نەداومەتەوە، پرسیارێک هەتا کچێکی خوێندەواری وەک دالیا سیراجەدینیش نەیتوانی وەڵاممبداتەوە. سامیری بابلی تەنیا کەسێک بوو منی بەرەو ناو ڕۆحی خۆی برد، لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا نازانم چۆن باسیبکەم، ئایا ئەو باش بوو یان خراپ؟

دالیا سیراجەدین هەموو شتێکی دەربارەی «شازادەی بابلی» دەزانی. هەر ئەو ناوی نابوو شازادەی بابلی، بەڵام ئەو لە کۆتایی ژیانیدا حەزی نەدەکرد کەس وەک شازادەو شتی وا مامەڵەیبکات. ئەو کات کە من ناسیم هەموو خەیاڵی لای ئەو ئەسپە سپیانەبوو کە شەو و ڕۆژ لە خەیاڵیدا غاریاندەدا، حەزیدەکرد بە بێدەنگ تەماشای غارغارێنی هەمیشەیی ئەو ئەسپانە بکات کە لە خەیاڵی ئەودا بەرەو جێگایەکی نادیار دەچوون. ئەو ئەسپانەی جارێکی دی لە جێگایەکی تری ئەم چیرۆکەدا دەگەڕێنەوەو دەردەکەونەوە، ئەو ئەسپانەی دواجار نازانم ئەسپی من بوون و لە خەیاڵی ئەودا غاریان دەدا، یاخود ئەسپی ئەوبوون و من بەرەو سەرزەمینە سەیرەکان غارمدان.

بەر لەوەی باس لە هاتنی سامیری بابلی بکەم دەبێت باس لە ژیانی دوورو درێژی خۆم لە تیاتری «پرتەقاڵی سپی»دا بکەم. من دەزانم کە ئاسان نییە تەنیا لە ڕێگای وشەوە بۆتان ڕوونبکەمەوە کە من چۆن و بە چ ڕێگایەک کەوتمە دونیای «پرتەقاڵی سپی» ـەوە، ئەو ماڵە چکۆلانەیەی کەیف و ئەو خانە کراوەیەی سەماو سەفا کە پیاوە غەمبارەکانی ڕۆژگاری جەنگ، بە تایبەت سەربازو ئەفسەرەکان ڕوویان تێدەکرد. من ئێستاش بە دروستی نازانم ئەو تیاترە دەکەوتە کوێوە، نازانم لە چ شارێک و لە چ هەرێمێکی ئەم وڵاتەدا بوو، شارێک بوو ناوی نەبوو. من لەیەکەم شەوەوە، لەیەکەم ساتەوە لە خەڵکی ئەو خانە غەمگینەم پرسی، ناوی ئەم شارەم

پێیلێن، بەلام هیچ کەس وەلامی نەدامەوە. شارێک بوو وەک وێنەیەک بێت لە وێنە ئاوێنەییەکانی شارێکی تر، بەلام وەک ئەوەی شارەکەی دیش وێنەی ئاوێنەیی شارێکی تربێت، ئەوی دیش هەروەها وێنەی ئاوێنەیی شارێکی تر، ئەوی دیش وێنەی ئاوێنەیی شارێکی تر... بەوجۆرە تا ناکۆتا، تا ئەوسەری نغرۆبوون لە سەرابدا، تا جێگایەک وێنەکان و حەقیقەت دەبن بەیەک، هەر هەولێکیش بۆ گەڕانەوە بەرەو یەکەمین شار، وەک هەولێکی پێکەنیناوی و بێمانای لێدێت، وەک هەولی گەڕانەوەی باران بۆ ئاسمان، یان گەردەلوول بەرەو دوا. شەوێک دالیا سیراجەدین ویستی بۆ منی بسەلمێنێت کە ئێمە لە ناو کۆمەلێک شاری ئاوێنەییدا ونبووین. تەنیا ئەو دەیتوانی ئەو جۆرە شتانە بسەلمێنێت. ئەو شەوە من پێمگووت: دالیا سیراجەدین، ئەی جوانترین کچی ئەم زەمینە، نابێت ئەم شارە ناوی نەبێت، ناکرێت ئێمە لە ئاوێنەیەکی خەیالیدا ونبووبین. تۆ بۆ ناوی ئەم جێگایە لە من دەشاریتەوە؟ بۆ پێم نالێیت من لە کوێ نیشتوومەتەوە؟ بۆ پێم نالێیت ئەم شارۆچکە سەیرو بێدەنگە ناوی چییە؟

ئەو شەوە دەستی گرتم و سوار تاکسییەکی چکۆلانەی کردم، تاکسییەک بەردەوام لە بەردەم بالە خانەکەی تیاتری پرتەقالی سپیدا دەوەستا، ئیشی ئەوەبوو شەو درەنگ یاخود بەیانیان زوو هەندێ لە میوانەکان بباتەوە بۆ شارێکی دوور. شۆفێرێکی پیری بێدەنگی هەبوو کە پێدەچوو لە ئەزەلەوە لە نێو ئەو تاکسییەدا دانیشتبێت و تا قیامەتیش دانەبەزێت، نازانم بۆ لەساتێکدا وەک مەخلوقێکی ئەفسانەیی هاتەبەرچاوم کە زیاد لە دەستێکی هەبێت، وەک ئەوەی بە زیاد لە دە دەست ئەو سوکانە سوورەی گرتبێت و بیگێڕێت، شۆفێرێک هەرگیز تەماشای میوانەکانی نەدەکرد، وەک بتێکی ئادەمی ئەو تاکسییە نوێ و بریقەدارەی لێدەخوڕی. هەندێجار دەستە ڕاستەقینەو خەیالییەکانی خۆی بەردەداو وەک ئەوەی تەنیا بە چاو ئەو ماشێنە چکۆلانەیە ئاڕاستەبکات، وەک ئەوەی بە خەیال بیجولێنێت،

پاڵیدەدایەو لێیدەخوڕی. ئەو شەوە کە دالیا سیراجەدین منی برد ڕێگاکان چۆڵ و هۆڵ بوون، هیچ ئوتومبیلێک، هیچ بوونەوەرێکی ترمان نەبینی. وەک ئەوەی ئەم ڕێگایە بە ناو ئەستێرەیەکی دوورو خاڵیدا لە ئاسەواری ئینسان بڕوات، بەڵام دالیا زوو زوو شۆفێرەکەی دەوەستان، لە دوورەوە گڵۆپ و چراخانی شاری دیکەی نیشاندەدام و دەیگووت ئەوانەش شاری تری ئاوێنەیین، ڕۆشنایی خەیاڵین کە ناچنە سەر هیچی دیکەو ناچنە سەر شوێنەواری تر. ئەو شەوە تەنیا چراخانی دوور هەبوو، چراخانی دوورو هیچی تر. لە جێگایەکدا گەیشتینە سەر هەزارڕایەکی گەورە، پێتێک هەزاران شەقامی لێدەبووەوە، هەزاران جادەی سەیرو ناکۆتاو درێژ. دالیا سیراجەدین بە منی گووت «کۆتر، تۆ چ ڕێگایەکت دەوێت هەڵیبژێرە، حەزدەکەیت بە چ شەقامێکدا بڕۆین، تۆ هەڵیبژێرە...گرنگ نییە چ شەقامێک هەڵدەبژێریت، گرنگ نییە بە چ ئاڕاستەیەکدا بڕۆیت، هەمیشە دەگەینەوە هەمان شار، هەمان جێگا، هەمان کوچەو شەقام، چونکە هەموو ئەم شارە جیاوازانە هیچ نین جگە لە وێنەی ئاوێنەیی شارێکی تر، شارێک کە لە هەر جێگایەکەوە بچیتە ناوی، چوویتەوە ناو هەمان وێنە، هەر شارێکیان هەڵبژێریت، دواجار دەتباتەوە سەر هەمان جێگا، هەمان ماڵ و هەمان کوچە کە تۆ دەتەوێت، ئەو کۆڵانەی لە شارێکیاندا هەیە لە هەموو شارەکانی تریشدا هەیە، ئەو تیاترۆخانە چکۆلانەیەی لە شەقامێکیاندا هەیە، لە هەموو شارەکانی تردا لەسەر هەمان شەقام دووبارەدەبێتەوە، ئەو جەلادەتی کۆترو دالیا سیراجەدینەی لە کوچەیەکدا دەڕۆن لە هەمان کاتدا لە هەموو شارەکانی تریشدا لە هەمان کوچەدا دەڕۆن». بێئەوەی بیر لە هیچ بکەمەوە، ڕێگایەکم هەڵبژارد کە لە ڕێگاکانی تر دەچوو، دواجار من هەر ڕێگایەکی دیکەشم هەڵبژاردایە هەر لە هەمان ڕێگا دەچوو، ڕێگایەک ئێمەی بردەوە بۆ ناو شارێک لە هەمان ئەو شارە بێناوە دەچوو کە لێوەی دەستمان پێکرد، لەوێ گەڕاینەوە بۆ هەمان شار، هەمان شەقام،

هەمان کۆلان و هەمان تیاترۆخانە کە لەسەر لەوحێکی ڕەش بەخەتێکی پێچاوپێچ نوسرابوو «البرتقاله البیضاء». هەموو شتێک ئاڵۆزو تەلیسماوی بوو، دالیا سیراجەدین شتەکانی پتر لا ئاڵۆزکردم و گووتی «هەزاران ڕێگا لە هەزاران شاری ترەوە دێنە سەر ئەم شارە، لێرەشەوە هەزاران ڕێگا جیادەبێتەوەو دەچێتەوە سەر هەزاران شاری تر، بە هەر یەکێک لەو ڕێگایانەدا دەگەیتە سەر هەزارڕێیەکی گەورە، هەزارڕێیەک وەک ئەوەی کە خۆت بینیت، لەوێشدا بە هەر ڕێگایەکدا بڕۆیت دەتباتەوە سەر هەمان ئەم شارەی کە من و تۆ تێیدا قسەدەکەین، دەتباتەوە سەر هەمان کوچەو هەمان کۆلان، هەمان ماڵ و هەمان دەرگا».

شەوێکی ترسناک بوو، من توند دەستی دالیام گرت و لێم پرسی «خانم ئەمە مانای چی، تێمبگەێنە، ئەمەی تۆ دەیڵێیت قسە نییە؟ ئەمە مانای ئەوە من هەرگیز لەم شوێنە ناچمەدەرێ، مانای ئەوەی بە هەر ڕێگایەکدا بڕۆم دەگەڕێمەوە ئەم شارە، خانم ئەمە یەعنی من ناتوانم جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ شاری خۆم.. وانییە، یەعنی من لە تۆڕێکی گەورەدا ونبووم کە لەم ڕێگایەوە دەمباتە سەر ئەو ڕێگای تر، هەمووشیان دەمبەنەوە سەر هەمان شار». دالیا سیراجەدین بە ساردییەوە تەماشایکردم و گووتی «دڵەکەم جەلادەتی کۆتر، ڕاستدەکەیت، بەقوربان تۆ لە تۆڕێکی گەورەی پڕ لە شاری ئاوێنەییدا ونبوویت». بە ترسێکی گەورەوە پرسیم «ئەی ناتوانم بچمەدەرێ؟». دەستی گرتم و بە ئەسپایی، بە جۆرێک هەستم بە ترسێکی گەورەدەکرد لە دەنگیدا چرپاندی بە گوێمدا «ئێستا نا، جەلادەتی کۆتر، ئێستا نا... هێشتا زۆر زووە.. ئێستانا... بە هیچ جۆرێک باسی مەکە، بە هیچ جۆرێک».

ئەو شەوە ترسێکی گەورە دایگرتم، هێشتا لە زۆر شت تێنەگەیشتبووم، هێشتا نەمدەزانی دالیا سیراجەدین کێیە.

هاتنی من و نهێنی گەیشتنم بە شاری ئەو کچە خراپانە هێشتا نهێنییەکی

قووڵ بوو، شتەکانم لە جێگایەکەوە لە بیربوو کە سوودێکی گەورەی بۆ تێگەیشتن لە تەواوی تەلیسمەکان نەبوو. واتە ئەوەی یادەوەریم تۆماریکردبوو کۆمەڵێک وێنەی تاریک و ئاڵۆزبوو، نەمدەتوانی بەیەکەوە گرێیانبدەم. من شەوێک لەوێ بە ئاگا هاتمەوە، هێندەی هوشیاربوومەوە گوێم لە دەنگی گۆرانی بێژێکی کچ بوو گۆرانییەکی لادێی عەرەبی دەگووت، تەپڵێکی عەرەبی شێت، ڕەبابەیەکی غەمگین، ئامێرێکی دیکە لە دوور دەنگیان دەهات. من وەک ئەوەی لە بێهۆشییەکی زۆر دوورو درێژ وریاببمەوە، دەنگەکان لە مەودایەکی ئێجگار دوورو غەمگینەوە دەمگەیشتێ، هێندە دوور نەمدەتوانی ئەو مەودایە پێوانەبکەم کە لە نێوان من و ئاهەنگەکەدا هەیە. وەک ئەوەی هێشتا مردن لە نێوانماندا بێت، دەنگی سەفایەکی زۆربوو، من نەمدەزانی تەواو لە کوێدام، جگە لە تاریکییەکی سەنگین و قورس کە هەستم بە بارستاییەکەی دەکرد هیچی دیم لەدەور نەبوو، پەیوەندی نێوان هۆش و جەستەم پەیوەندییەکی لاوازو بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی لەشم لەلام نەبێت، وەک ئەوەی تەنیا خەیاڵێک بم و بەخەبەرهاتبم، هوشیارییەک بم و لە زوڵمەتێکی دووردا نیشتبێتمەوە، شتێکی ئەوتۆم دەربارەی دونیای پێشووتر لە بیر نەمابوو. بۆ ساتێک وێنەکانی ئیسحاقی لێوزێڕین و سەرهەنگ قاسم بەبەردەممدا گوزەریانکرد، بەڵام وەک دوو بوونەوەری غەریب. هەستمدەکرد من هێشتا مەودایەکی بەرچاو لە دونیا دوورم، وەک یەکێک لە ڕیواقێکدا گیری خواردبێت و بیەوێت بیبڕێت و نەتوانێ، وەک ئەوەی بەزەحمەت خۆت لە گەردەکانی ئەو تاریکییە بۆ جیابکرێتەوە کە بە جۆرێک تێکەڵتبوون دواجار جیاکردنەوەو ڕاپسکاندنی خۆت لە زوڵمەت، وەک جیاکردنەوەو هەڵکەندنی ئەندامێک لە ئێسک و پروسک و دەماری خۆی دەتکوژێت. من هەستمدەکرد بە تاریکییەوە نوساوم و گەر خۆم لە زوڵمەت ڕاپسکێنم بەشێکم هەمیشە لەوێ دەمێنێتەوە. وەک ئەوەی چزوویەکم هەبێت و لەوێکانە لە ڕۆحی زوڵمەت گیربووبێت، گەر بمەوێت

دەریبهێنمەوە بەشێک لە هەناوم لەگەڵیدا بڕوات. نوسانی من بە زوڵمەتەوە وەک نوسانی وێنەیەک نەبوو بە دیوارێکەوە، بەپێچەوانەوە، وەک توانەوەی بەشێکی بوونم بوو لە تاریکیدا، بە جۆرێک وام بە خەیاڵدا دەهات گەر هەستم نیوەم لە هەوادا دەڕوات، نیوەم لەوێدا با لەگەڵ خۆیدا دەیبات و نایگرمەوە. لەساتی یەکەمەوە هەستمکرد دەبایە لە جێگایەکی تربم... هەستمکرد من بە هەڵە لێرەدام و بە هەڵە گوێم لە دەنگی ئەو کیژە ناسکانەیە کە لە دوور گۆرانییە کۆنەکانی ناو بیابانیان دەگووتەوە.

تا زیاتر هۆشم دەهاتەوە، زیاتر هەستم بە مەودا ئەندازەییەکانی ئەو جێگایە دەکرد، ئاڕاستەی دەنگ و سروشتی ئەو تاریکییەی دەورم پێیدەگووتم کە من لە ژێر زەمینێکدام. غەریزەی جیاکردنەوەی شەو ڕۆژ هێشتا لە ناومدا زیندووبوو، دڵنیابووم شەوە. لە بیرم نییە چەند سەعات لەوێ بووم، بەڵام هەستم بە جۆرە ئازارێکی سەیر دەکرد، ئازارێک وەک ئەوەی لە دوورەوە بێت و هێدی هێدی لێم نزیک ببێتەوە. وەک نوزەی شەمەندەفەرێک کە لەسەرەتادا بە دەنگێکی کز دەست پێدەکات، بە لورەیەکی دوورو خنکاو، بەڵام تا نزیک دەبێتەوە پتر هەست بە خێراییەکەی دەکەیت، پتر وەک ڕەشەبایەک دەیبینێت کە شێتانە دێت و بە هەموو قورسایی خۆیەوە بەسەر ئێسکەکانتدا تێدەپەڕێت.

ئازارێک بوو وەک ئەوەی ڕۆحێکی تر و جەستەیەکی تر بیچێژێت، بەڵام سێبەرو سەداکەی لە ناو هەناوو زیندەگی مندا دەنگبداتەوە.

نەمدەزانی کە بریندارم، بیرم لای هیچ زامێک نەبوو. یادەوەریم ئیشی نەدەکرد، نا تووشی بیرچوونەوەو شتی وا نەبووبووم، بەڵام جگە لە پەیوەندی خۆم بە تاریکییەوە بیرم لە هیچی تر نەدەکردەوە. لەو کاتەدا بۆنی ئاوێکی دوور کاسیدەکردم، دڵنیابووم لەو ژوورەدا بۆنی زەریاچەیەکی دوورو گەورە من گەمارۆدەدات، وام هەستدەکرد ئەو ژێر زەمینەی من

تیاخەوتووم نزیکە لە کۆمەڵێک گۆمی گەورەوە، من چاوم لێکدەناو باڵندەی گەورەم دەبینی، هەزاران مراوی ڕەنگاوڕەنگ.

هەندێ لەو خولیایانە سالآنی دواتریش و لە شوێنی سەیرترو لە شەوە خۆش و ناخۆشەکانی زیندەگیمدا زیندووبوونەوە، بەلآم ئەو شەوە سروشتێکی دیکەیان هەبوو، وەک سەرەتای دەستپێکردنی جیهانێکی دی بوو، وەک لە دایکبوونی قەقنەسێکی تازە لە باڵدارێکی کۆن، زیندووبوونەوەی غونچەیەک لە خۆڵەمێشی گوڵێک.

ماوەیەک لە دوای بێدەنگبوونی مۆسیقاکە، وەک پەرییەک لە ئاسمان دابەزێت، کچێک لە جلی فریشتەکاندا لە سەقفی ژوورەکەوە بە پەیژەیەکی ئاسنیندا دابەزی. ئەوە دالیا سیراجەدین بوو کە چرایەکی کزی بەدەستەوە بوو، بەر لەوەی ڕووبکاتە سەر جێگاکەی من گلۆپێکی بچوکی داگیرساند، بەلآم خودایە... ڕۆشنایی گلۆپەکە زۆر لە ڕۆشنایی ئەو چرا چکۆلانەیەی دەستی ئەو کزتربوو... خانمێک بوو لەوانەی دەبێت هەناسەی قووڵیان بۆ هەڵکێشیت، لەو جوانییە سەیرو ئەفسانەییانەی گەر لەگەڵیشیاندا بخەویت هێشتا هەستناکەیت توانیوتە بیانگریت و پێیانبگەیت. جوانییەک هەمیشە عاسی و ئەفسوناویی دەمێنێتەوە. جوانییەک دواجار دەیتوانی هەندێک کەس تا ناو مردن بە دوای خۆیدا ڕاکێشێت. من ویستم خۆم وا نیشاننەدەم کە جوانی ئەو منی ڕاچڵەکاندووە، من بەر لەوەی ببم بەو درۆزنە گەورەیەی پرتەقاڵی سپی لەو گەنجانەبووم کە نەمدەویست ئافرەتان تێبگەن من چۆن بیریان لێدەکەمەوە. نەمدەویست وادەرکەوم کە جوانی ڕامدەچڵەکێنێت. ئەو کات ئەزموونێکی قووڵم لەگەڵ کچاندا نەبوو، بەلآم هێزی ئەوەم تیابوو لە بەردەم جوانیدا ویقاری خۆم نەدۆڕێنم. لەگەڵ هاتنی دالیادا بۆنێکی تایبەت هاتە ناو ئەو ژێر زەمینەوە کە دواتر زانیم ئەوە بۆنی هەموو ئافرەتانی ئەو شاری خەیاڵەیە.

وەک ئەوەی بە وریابوونەوەی من زۆر خۆشحاڵ بێت، یاخود چاوەڕوانی ئەوەی نەکردبێت، سەرسامانە دەستی لێدام و گووتی: ئاە تۆ چەند دەردت دامی... چەند دەردت دامی.

بێئەوەی پرسم پێبکات، وەک یەکێک خۆشەویستێکی خۆی ماچبکات، لێوی هێناو ماچیکردم. من سەرسامبووم بەوەی کە بە کوردییەکی وەها ساف قسەم لەگەڵدا دەکات. لێم پرسی: خانمم، من لە کوێم، من چیمە، من بۆ لێرەم؟. بە پێکەنینێکی عەیارەوە، پێکەنینی ژنێک هەموو جۆرەکانی پێکەنین دەزانێت، گووتی: تۆ لێرە بەدواوە لە چنگی مندایت، تۆ وەک چۆلەکەیەک کەوتیتە داوی منەوە.

ئێستا کە بیر لە قسەکانی ئەوسای دەکەمەوە هەستدەکەم بە جۆرێک لە جۆرەکان ڕاستیدەکرد من لەو ساتەوە تا ئێستا گیرۆدەی ئەو دونیایەم کە دالیا سیراجەدین دەرگاکانی بۆکردمەوە. دونیایەک گەر دالیا سیراجەدین نەبووایە من زووتر جێمدەهێشت... زۆر زووتر.

ئەوشەوە دالیا بە ئارامی لەسەر لێواری قەرەوێلەکەم دانیشت، جلێکی نیمچە ڕووتی لە بەردابوو، کە زانی من سەیریدەکەم بە ئەسپایی گووتی: ببورە من لە ئیشەوە هاتووم، دەبایە وابم، کاتم نەبوو بۆ خۆگۆڕین، دەمزانی ئەمڕۆ دێیتەوە هۆش خۆت، دڵم خەبەریدابوو دوای ئەو هەموو لە هۆش خۆچوون و بێهۆشییە، ئا درۆت لەگەڵدا ناکەم، دەمزانی ئەمڕۆ چاودەکەیتەوە و دێیتەوە زمان.

تا ئەو کاتە لەبەر سەیرکردنی جوانی ئەو خانمە دەرفەتێکم نەبوو تەماشای ئەو ژێر زەمینە بکەم، بە ئارامی گوێم لە قسەکانی دەگرت و ژانێکی قووڵ و دوور لە ناوەوە ئیفلیجیدەکردم. لە ژێر قەرەوێلەکەوە کارتۆنێکی چکۆلانەی دەرهێنا، پڕبوو لە دەرمان و مەرهەم و دەرزی. چاویلکەیەکی چکۆلانەی چێوە زێڕینی لە چاوکردو لەسەر ڕۆشنایی چراکەدا چەندین جار ناونیشانی دەرمانەکانی خوێندەوە، وەک ئەوەی لە هەڵەیەک

بترسێت، چەندین جار ناوی دەرمانەکان و وەسڵەکان و پسوڵەی زانیاریی ناو قوتوی داڕوەکانی بەراوردکرد. پسوڵەکان بە ئینگلیزی نوسرابوون، بەڵام ئەو بە هێمنی و جیدییەتێکی زۆرەوە دەیخوێندنەوە، وەک ئەوەی هیچ کێشەیەکی لە تێگەیشتنی ناوەڕۆکەکەیدا نەبێت. شتێکی سەیربوو بۆ من، کچێک لە جلی سەماکەرێکی عەرەبدا بە کوردی قسەبکات و بە ئینگلیزی بخوێنێتەوە، بەڵام دالیا سیراجەدین وابوو. تا دەستی لەسەر سنگم نەدا، ڕاستەوخۆ هەستم بە ئازار نەکرد... تا ئەو کاتە نەمدەزانی چ جۆرە جلێکم لەبەردایە، کاتێک تەماشای ئەو کراسە ڕەشەم کرد کە ئەو قۆپچەکانی دەترازاند، کۆمەڵێک لەفافی خوێناویم لەسەر سنگی خۆم بینی. هیچ شتێکم لە یاد نەمابوو، نەمدەزانی بۆ بریندارم، بۆ کەوتوومەتە ئەم ژێر زەمینەوە. بەدەنگێکی گریاوەوە لە دالیا سیراجەدینم پرسی: کێ وای لێکردوم، خانم تۆ پێمبڵێ کێ وای لێکردوم؟ بێئەوەی تەماشامبکات، لەفافەکانی گۆڕی، بە کەمێک بێباکییەوە گووتی: حەزدەکەم بزانم تۆ ناوت چییە؟. وەک یەکێک دان بە گوناهێکدا بنێت، گووتم: ناوم جەلادەتی کۆترە.

دالیا کەمێک وەستاو بەسەرسامییەوە پرسی : جەلادەتی کۆتر؟ تۆ خەڵکی چ شارێکیت؟. من ئارەزووم نەبوو وەڵامیبدەمەوە. بە دەنگێکی گرژ گووتم: نازانم. دەیزانی درۆدەکەم، بێئەوەی پرسیارەکەی دووبارەبکاتەوە گووتی: تۆ نابێت بجوڵێیت، چەند ڕۆژێکی ترت دەوێت، برینەکانت سەخت بوون، زۆر زۆر، بەڵام تۆ کوڕێکی بەتوانایت، گرنگ ئەوەیە تۆ ئێستا دەتوانیت قسەبکەیت، سبەینێ دکتۆرەکەمان دێتەوە بۆ ئێرە، سبەینێ دەگەڕێتەوە، لەوانەیە دەرمانەکانت بۆ بگۆڕێت.

دواجار هەستاو کەمێک کراسەکەی چاککرد. بە دەنگێک سێبەری مەکرو فریوێکی کچانەی تێدابوو، پرسی: دەتوانیت بە عەرەبی قسەبکەیت؟. من دەستیم گرت و گووتم: دەتوانم، زۆر زۆر باش نا، بەڵام دەتوانم. ئەی تۆ چی دەکەیت، ئەی تۆ کێیت؟ دەڕۆیت یان لێرە دەمێنیتەوە؟.

بۆیەکەمجار لە نزیکەوە تەماشایکردم، چاوانی شتێک لە بەزەیی و غەمی تیابوو، وەک ئەوەی دوودڵ بێت، یان وەک ئەوەی داوای شتێکی حەرامم لێکردبێت و نەیەوێت بمداتێ، گووتی: من ناوم تریفەی زستانە. لە شەوێکی پڕ تریفەی زستاندا لەدایکبووم، دوای بەفرێکی گەورە، لەبەرئەوە ناوم تریفەی زستانە. بێئەوەی شەرمبکەم، گووتم: درۆدەکەیت، تۆ ناوت تریفەی زستان نییە، بەلام بە من دەڵێیت ناوم تریفەی زستانە تا ناوی خۆتم پێ نەڵێیت. تۆ درۆدەکەیت... وانییە؟.

چراکەی لە جێگایەکدا داناو کەمێک دەستی بە قژیدا هێناو گووتی: خەتای من نییە، تۆ لەو کوڕانەی هەموو کچێک حەزدەکات درۆت لەگەڵدا بکات. من بە ناڕەحەتییەوە گووتم: یان تۆ لەو کچانەیت، حەزدەکەیت درۆ لەگەڵ هەموو کوڕێکدا بکەیت؟. وەک منداڵێک بیەوێت دیق بە هاوڕێکەی بکات، یارییەکی چکۆلانەی بە قژی کردو گووتی: وایە، من حەزدەکەم درۆ لەگەڵ هەموو کوڕێکدا بکەم. من کە خەریک بوو ڕقم لێیدەبوو، گووتم: دوا ئەوە تۆ من ناناسیت، وا نییە تۆ هێشتا نازانی من کێم؟.

بە ئەسپایی چراکەی لەسەر مێزێکی چکۆلانە داناو گووتی: پێویست ناکات بتناسم تا بزانم تۆ کێیت؟.

بۆئەوەی زیاتر ماندوو نەبم چاوم لێکناو نەمویست بیبینم، نەمویست بزانم چی دەکات و چی ناکات، توند چاوم نوقاندو خۆم لە تاریکییەکی قووڵدا ونکرد. کاتێک چاوم کردەوە ئەو لەوێ نەمابوو، تەنیا شتێک بەجێیهێشتبوو ئەو بۆنە ئەفسوناوییە سەیرەبوو، کە بۆنی کچانی ئەو شاری خراپەیە بوو.

ئەوە یەکەمین یەکتر بینینمان بوو لەگەڵ دالیا سیراجەدیندا کە سەیرترین بوونەوەرێک بوو من دیبێتم. دڵنیام دالیا سیراجەدین لە تێکەڵاوبوونی زیاد لە مرۆڤێک دروستبووبوو، بەلام ئەو شەوە من دەمویست بیرنەکەمەوە، دەمزانی شتێک لە مندا مردووە. شتێکە هێشتا تەواو جێینەهێشتووم، بەلام

فاسیلەیەكی ئەوتۆی لە من وەرگرتووە گێڕانەوەشی بۆ ناو من كارێكی نەكردەو زەحمەتە. بەڵام ئەو شتە چییە؟ نەمدەزانی.

لە دوای ئەو شەوەوە تا هەفتەیەك دواتر دالیا سیراجەدینم نەبینییەوە. ڕۆژی دواتر پیرەمێردێكی سەر ڕووتاوەی چكۆلانە هاتەلام، ئەو كەمە مووانەی كە بە لاجانەكانییەوە مابوون تەواو سپی بوون، بڕۆكان و برژانگەكانیشی سپی، كراسێكی چلكنی لەبەردابوو، هێلەكێكی كۆنی قۆپچەدارو چاكەتێك لەو چاكەتانەی ناتوانیت بزانیت مۆدێلی چ دەورو زەمانێكە. وەك ئەوەی دوای گریسكردنی مەكینەیەكی كۆن دەستی بۆ سەر خوانێكی گەورە پاكبكاتەوە، بە دەسرێكی سپی دەستی سڕی و بە دەنگێكی پیر بەڵام پڕ ئومێدو دڵنیایی گووتی: ئەمڕۆ بەیانی دالیا سیراجەدین تەلەفونی بۆكردم و پێیگووتم، كە تۆ هۆشت هاتۆتەوەو بەرەو باشبوون دەڕۆیت، خەبەرێكی خۆشە... ئێجگار خەبەرێكی خۆشە، لە مێژە لەم شارەدا مرۆڤ خەبەری خۆش نابیستێت....

ئەوە یەكەمین جار بوو من ناوی دالیا سیراجەدین ببیستم. سەد دەر سەد دڵنیا نەبووم كە ئایا دالیا سیراجەدین هەمان ئەو كچەیە كە شەوێ لەفافەكانی بۆ گۆڕیم یاخود یەكێكی دیكەیە. من لە بەیانی زووەوە گوێم لە دەنگی كچگەلێكی زۆر بوو، دەهاتن و دەچوون، دەیانزریكاند و پێدەكەنین. هەندێجار بانگی تریفەی زستانم دەكرد، دەمگووت: هێی كەس گوێی لە منە، بەڵام كەس وەڵامی نەدەدامەوە، وەك ئەوەی دەنگەدەنگ و ژاوەژاوی سەرەوە لەوە زیاتر بێت ئەو نوزە باریكەی من بتوانێت بیبڕێت. بەڵام هەستی ئەوەم نەبوو لە شوێنێكی خراپدا گیرم خواردبێت. دڵنیابووم كەسێك هەیە منی بیرناچێتەوە. من لەو پیاوە پیرەم پرسی: دالیا سیراجەدین ئەو كچەیە كە شەوێ لەفافەكانی بۆ گۆڕیم، وانییە؟. دەستێكی بەسەرە ڕووتاوەكەیدا هێناو گووتی: خۆیەتی، ئەو كچە باڵابەرزە قژ درێژەیە، دڵنیام ناوی ڕاستەقینەی خۆی بە تۆ نەگووتووە، هەمیشە

کۆمەڵێک ناوی سەیرو سەمەرەی بۆ خۆی هەیە، دڵنیام پێیگووتوویت ناوم «خۆری پاییز» یان «کوێستانی سیا» «تەواری زەنوێران» «گوڵی سوڵتان». یاخود هەر شتێکی تر لەو بابەتە.

بە پێکەنینێکی قووڵەوە سەری باداو گووتی: ئیتر ئەوە دالیا سیراجەدینە، ئەوە تەبیعەتی ئەو کچەیە، تەنیا من و ئەو کچە لەم شارەدا کوردی قسەدەکەین، بۆ ئەوەی زمانەکەمان بیرنەچێتەوە هەفتەی چەند جارێک تەلەفون بۆیەک دەکەین... بەڵام تۆ ئەوە بخەرە ئەولاوە، پێمبڵێ تۆ ئێستا چۆنیت؟

دەستی دامێ و پێکەوە تەوقەیەکی درێژمان کرد، وەک ئەوەی لە مێژە هاوڕێ بین و یەکدی بناسین، دەستی وەک دەستی منداڵێکی ساوا نەرم و ناسک بوو. من لێم پرسی: تۆ دکتۆریت؟ سەرێکی لەقاندو گووتی: من دکتۆرم؟ بیست و پێنج ساڵە لەم شارەدا ئیشدەکەم. کە یەکەمجار هاتم بۆ ئێرە چۆڵەوانی بوو، جگە لە کۆمەڵە دەوارێک هیچی تری لێ نەبوو.

دەستی خستە سەر ناوچاوانم و گووتی: ئێستا هەستدەکەم هەموو ئەم شارە هی منە.

لە دوا ڕستەدا خەیاڵی لە جێگایەکی تر بوو. خەیاڵی لای لێدانی دڵی من، گەرمایی جەستەو ڕەنگی بیلبیلەکانم بوو. بەوردی تەماشای هەموو گیانی کردم، برینێکی دیکەشی لە خوار ناوکەمەوە نیشاندام. گووتی: مەترسە، چیتر نامریت، بەشێکت هەمیشە دەژی، تا ئەو ڕۆژەی خۆت تاقەتت نامێنێت، تا ئەو کاتەی ژیان خۆی خاودەبێتەوەو مرۆڤ چیتر ئارەزووی نامێنێ درێژەی پێبدات. زۆر باشە، برینەکانت خێرا بەرەو باشی دەڕۆن، ها هەڵبەت لەشی گەنج خێراتر چاکدەبێتەوە.

تەماشایکردم و گووتی: برسیتە، دڵنیام برسیتە، چەندین ڕۆژە بەو دەرمان و خواردنە گیراوانە دەژیت کە لە ڕێگای دەرزییەوە وەریدەگریت. من سبەی خواردنێکی سووکت بۆ ئامادەدەکەم، تا کاتێک وات لێدێت بتوانیت

بەئاسانی بجولێیت زۆر مەخۆ. سبەی دیمەوە بۆ لات سبەی هەڵتدەستێنم و کەمێک لەم ژێر زەمینەدا پیاسەت پێدەکەم، دەبێت تۆزێک بجولێیت... بە هەرحاڵ تۆ لەشێکی بەهێزت هەیە، گەنجێکی بە توانایت. بەلام دەبێت بێدەنگ بیت، زۆر ڕەنگە دەنگ نەکەیت، سەرنجی کەس ڕانەکێشیت تۆ بە نهێنی لێرەیت. تێدەگەیت... ئێرە ژێرزەمینێکی چەپەکە، تێدەگەیت، نابێت کەس بزانێت تۆ لێرەیت.

وەک ئەوەی بیر لە زەمانێکی ئێجگار دووربکەمەوە هەناسەیەکم هەڵکێشاو گووتم: هێندەم لە بیرە لەگەڵ دوو هاوڕێی دیکەدا گیراین... لە بیرمە لە زیلێکدا بەرەو باشوور ئێمەیان گواستەوە. ئیدی لەوە زیاتر شتێکم لە یاد نییە. من بۆ لێرەم؟ دکتۆر من چی دەکەم لێرە؟

بە کەمێک سەرسامی و دەستەپاچەییەوە گووتی: بمبورە، من ناچمە بنج وبناوانی ژیانی نەخۆشەکانمەوە، لەسەرمە تیمارتبکەم... نامەوێت بزانم نەخۆشەکانم چ جۆرە کەسێکن... من تەماشای شەیتان و فریشتەکانی ناو ئینسان ناکەم، سەیری ئازارەکان و برینەکانیان دەکەم. ڕەنگە من زۆر نهێنی بزانم، بەلام وەک دەریا وەهام... من دەریام... شتەکان دێن و لە ناومدا وندەبن. هەندێجار بۆئەوەی شتێک بدۆزمەوە، دەبێت بنی ئەو زەریایە هەمووی بگەڕێم. ئاسان نییە هەموو شتێک لێرەدا لە سەرمدا هەڵگرم، ئاسان نییە... لەبەرئەوە هەموویان فڕێدەدەمە ناو دەریایەکی گەورە... ئۆقیانوسێکی بەرین.

پێکەنینێکی سەیر پێکەنی و گووتی: هەر کاتێک پێویستم بە دەرهێنانەوەی نهێنییەک بوو، خۆم فڕێدەدەمە ئەو بەحرە قووڵەوەو لەوێ دەریدەهێنم.

پیرێکی شادومان بوو، هەمیشە کەمێک چاوی دەنوقاند و ئەوسا دەستیدەکردە قسەکردن. تەنیا ئەو پرسیارانەی وەڵامدەدایەوە کە پەیوەندی بە برینەکان و باری تەندروستیمەوە هەیە، وەک ئەوەی یەکێک ئاگاداریکردبێتەوە هیچ زانیارییەکی زیاتر نەدرکێنێت. هەر کاتێک پرسیاری

ئەو شارەم لێدەکرد زیرەکانە دەستی بە سەرە ڕووتاوەکەیدا دەهێناو دەیگووت: دواتر خۆت هەموو شتێ بە چاوی خۆت دەبینیت، فێردەبیت و بە هەموو شتێک ڕادێیت.

شتێکی تێدابوو، هێمای بۆ کۆنی و بەسەرچوون و یادچوونەوەی زەمان دەکرد، شتێک بە تەنیا پەیوەندی بە چۆنێتی داخستنی قۆپچەکان، کورتی سەر قۆلی چاکەتەکەی و ڕەنگی بۆینباخەکەیەوە نەبوو، بەڵکو پەیوەندی بە جوڵەو نیگاکردن و جوڵاندنەوەی سەریشییەوە هەبوو. هەستمدەکرد پیاوێکە لە تەرزێکی زۆر کۆنی زیندەگیدا نوقمبووە، بۆنی سەردەمێکی تری لێدەهات. پێموابوو دەتوانم لە ڕێگای هەڵسەنگاندنی دیمەنی خۆی و جلەکانییەوە هەموو ژیانی ببینم، ژوورەکەی، پێخەفەکەی، جلی خەوتنەکەی. لەو دکتۆرانە نەبوو کە لە ڕێگای زانست و زانیارییەکانیانەوە دەتوانن موعجیزە دروستبکەن، بەڵکو لە ڕێگای گرێدانەوەی مرۆڤەوە بە ڕیشە دێرینەکانی ژیانەوە مرۆڤی زیندوودەکردەوە. پیرێتییەکەی لە بری ئەوەی مردنت بە یادا بهێنێتەوە جاویدانەگی ژیانی بیردەخستیتەوە. کە لە ژوورەکەدا بوو هەستم بە دڵنیاییەکی قووڵ دەکرد وەک ئەوەی بە ئەبەدییەتەوە گرێیدابم.

ئەوە سەرەتای پەیوەندییەکی درێژ بوو بە دکتۆر موسای بابەکەوە، خۆشحاڵبووم کە پەیمانی پێدام ڕۆژانە سەرمبدات. کاتێک ڕۆیشت وەک ئەوەی لە دوای خۆی کۆمەڵێک تیشکی جێهێشتبێت، دەمتوانی شتەکانی ناو ژێرزەمینەکە وردترو ڕوناکتر ببینم. ژوورێک بوو نە زۆر تاریک و نە زۆر ڕۆشن، بەرزەخێک بوو لە نێوان ڕوناکی و زوڵمەتدا، هەموو شتەکان خۆڵەمێشی دەیاننواند، پێدەچوو بەر لە هاتنی من، وەک گەنجینەیەک بۆ کەلوپەلی فەرامۆشکراو بەکارهاتبێت، فەرشی کۆن، دۆلابی بێکەڵک، بەرمیلی

كون، سۆندە، پەتی باركردن، كورسی شكاو، نوێنی بێخاوەن، چوپی دڕاو، پێڵاوی ژنانەی كۆن، شوشەی خاڵی عەتر، تەنەكەی بەتاڵی ڕۆن، سەبەتە خورمای ڕزیو، مشاری ژەنگاوی، تۆڕێكی دڕاوی ماسی و چەندەها شتی سەیری دیكەش كە هەرگیز تێنەگەیشتم بۆ لەوێدا كەڵەكەكراون و كێ خاوەنیانەو بەدەردی چ كارێك دەخۆن؟ یەكێك وەك ئەوەی لە مەترسییەك بمپارێزێت قەرەوێڵەكەی منی لە تاریكترین و دوورترین سوچی ژێرزەمینەكەدا دانابوو، من چەند جارێك ویستم هەستم بۆئەوەی ڕوونتر دیمەنی ژێرزەمینەكە ببینم، بەڵام نەمتوانی. لەیادم نییە چەند جار بەدەم ئازارو خەیاڵەوە بەئاگاهاتووم و خەوتووم، بەڵام دڵنیابووم شتی سەیر لە ناومدا ڕوودەدەن، وەك ئەوەی كۆمەڵێك باڵندە لە گەرومدا بخوێنن و من گوێم لە دەنگیان نەبێت، یاخود دەستێكی نادیار شتێك لە هەناومدا داگیرسێنێت... من دەخەوتم و لەناكاو شتێك ئاگاداریدەكردمەوە، چاوم لێكدەناو ڕادەچڵەكیم، خەوتن و وریابوونەوەی بەردەوامیش مرۆڤ تێكدەشكێنێت. دوای هەموو ڕاچڵەكانێك من ماندووتر بە ئاگا دەهاتمەوە، لە نێوان هەموو وچانێكی خەوو وریابوونەوەدا هەستمدەكرد لاوازترو گێژتر دەبم. بەردەوام دەنگی كچگەلێكی زۆر لەسەرەوە دەبیسترا، قیژەقیژێكی سەیر كە بێدەنگی قووڵ و دووردرێژی بەدوادا دەهات. وەك ئەوە وابوو من لە بنی گۆمێكدابم و ئەوان لەسەرەوە لەقەراغی ئاوەكەدا دانیشتبن. هەندێجار وام هەستدەكرد من ماسییەكم لە حەوزێكداو ئەوان لەسەرەوە تەماشامدەكەن، وەك ئەوەی تەنیا توێژێكی ئاو لە نێوانماندا بێت، ئەوان بتوانن سەر بە ماڵی مندا شۆڕبكەنەوە و من نەتوانم سەر بەرزبكەمەوەو ئەوان ببینم.

* * *

من ناوی دەنێم شاری ڕێبوارە غەمگینەکان، شاری تەپوتۆزی هەمیشەیی، شاری ئەو مراوییانەی خواستێکی قووڵی هەڵهاتن لە زۆنگاوەکانی باشوور بەرەو ئەوێی دەهێنان. شاری ئەو سۆزانییە جوانانەی لە هەموو لایەکی ئەو وڵاتەوە دەهاتن و لەو شارەدا ژوورێکیان دروستدەکرد، شاری ئەو کچانەی لە تخوبێکی نادیاردا لە نێوان بیابان و زۆنگاو و ڕووبارەکاندا جێگایەکی سەیریان بۆ خۆیان دروستکردبوو. شارێک نە لەسەر نەخشەو نە لە تۆماری دەوڵەت و نە لە جوگرافیای ئیداری ئەو وڵاتەدا نەبوو، بەڵکو زەوییەکی نوێ بوو، لە زەمانێکی تایبەتیدا، لە دەرەنجامی تێکشکانێکی گەورەی شوێنکاتە جیاوازەکان لەویادا دروستبووبوو. شارێک بوو لە تێکشکانی شارەکانی تر، لە پاشماوەی ژیان لە جێگاکانی دیکەدا دروستبووبوو.

هەمیشە سووکە بایەکی سەنگین بە تەپوتۆزی بیابان لە کوچەکانیدا دەگەڕا، من لەیەکەم گەشتمەوە بەو شارەدا تا دواهەمین گەشت هەستم بەو بایەکرد، هەستم بەو تۆزە وشکەی بیابان کرد کە هەمیشە لەسەر ڕوخساری ئەو ڕێبوارانە دەنیشت کە لەمسەرەو سەری ئەو وڵاتەوە بۆ چەند سەعاتێک ڕوویاندەکردە ئەوێ. یەکەمین کەس منی بەو شارەدا گێڕا دکتۆر موسای بابەک بوو. هێشتا برینەکانم سارێژنەبووبوون، هێشتا داڵیا سیراجەدین لە سەفەر نەگەڕابووەوە، هێشتا بە دونیای «پرتەقاڵی سپی» ئاشنانەبووم. ئێوارەیەک هاتە لام و گووتی: داڵیا سیراجەدین تەلەفونی بۆکردوم و پێیگووتووم کەمێک بە شاردا بتگێڕم و دواتریش بتبەمە لای خۆم. دەزانم هێشتا زووە، بەڵام بەر لەگەڕانەوەی داڵیا سیراجەدین دەبێت ئەم شارە ببینیت.

من لە دکتۆر موسای بابەک نائومێد بووم، چاوەڕوانی ئەوە نەبووم هیچ نهێنییەکم بۆ ئاشکرابکات، بە درێژایی ئەو چەند ڕۆژە بە شێوەیەکی زیرەکانە لە پرسیارەکانم ڕایدەکرد، شتێکی دروستم لەسەر خۆم و داڵیا

سیراجەدین و برینەکانم لێ نەبیست. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێکەنینە پیرەکەی شادمانی تیا دروستدەکردم، سەرلەقاندن و نیگا شیرینەکانی پڕبوون لە حیکمەت. هێندەی بە زەردەخەنەکانی منی چاکدەکردەوە بە دەرمانەکانی منی تیمار نەدەکرد. من دە ڕۆژ بوو بە تەنها لەو ژێر زەمینە تاریکەدا بووم، شەوان درەنگ یاخود بەیانیان زوو دکتۆر موسا خۆی خواردنی بۆ دەهێنام، تیماریدەکردم و جێیدەهێشتم، بەردەوامیش دەنگی ئەو کچانە لە گوێمدا دەزرینگایەوە کە بە شەو گۆرانیان دەگووت و بە ڕۆژ پێدەکەنین و دەیانزریکاند. هێشتا نەمدەزانی لە کوێم، ئێرە چ جیهانێکەو ئەوێ چ شارێکە.

ئەو ڕۆژە بەناو ئەو تەپوتۆزەدا منی برد، پێشتر ئاگاداریکردمەوە کە قسە لەگەڵ کەسدا نەکەم، کارێک نەکەم کەس هەست بە برینەکانم بکات. ئەو ڕۆژە من و ئەو کوچە بە کوچە بەو شارەدا گەڕاین، لە یەکەم کوچەدا وەک نهێنییەکی گەورەم بۆ ئاشکرابکات، توند دەستی گوشیم و گووتی «ئەم شارە ناوی نییە، هەموو کەس لێرە خۆی بە ڕێبوار دەزانێت، هەموو سەرنشینانی ئەم شارە خۆیان بە ڕێبوار دەزانن، ئەم شارە شاری کەس نییەو نابێتە شاری کەسیش». من لە چەند کوچەوکۆڵانێکی درێژ بەولاوە هیچی ترم نەدەبینی، کوچەو کۆڵانی تۆزاویی کە بایەکی سەیر تارمایی چەندەها مەخلوقی خەیاڵی لە ناودا دەفڕاند. ئێوارەیەکی ساردبوو، تەمێکی زەرد هەموو دونیای داپۆشیبوو، جارجارە هەندێک ڕێبواری غەمگین بە خۆیان و جانتا قورسەکانیانەوە بەلاماندا دەڕۆیشتن. هەموو ئەو شارە بە خانووە چکۆلەو دەوارە ڕەش و ماڵە تەنەکەکانییەوە لە خۆڵێکی زەرددا نوقمبووبوو، وەک ئەوەی لەسەر زەوییەک لە بەهارات دروستبووبێت، ڕێگایەکی درێژ و ترسناک وەک قەدەر، لەنادیارەوە تا نادیار بە ناوەڕاستیدا گوزەریدەکرد. موسای بابەک ئەو ڕاستە هێڵە ئەبەدییەی نیشاندەدام و دەیگووت «ئەمجۆرە شارانە بەشێکن لە خەون، دروستدەبن و لە ناکاویش دەتوێنەوە یان وا هەستدەکەین کە دەتوێنەوە، وەک یارییەک

منداڵێک لە لم دروستیبکات، بێئەوەی کەس بزانێت چۆن و بە کاریگەریی چی، لەناکاو نامێنن و لە جێگایەکی دیکەوە سەرهەڵدەدەنەوە. بە دیوێکدا تەماشابکەیت، ئێرە خۆشترین شاری ئەم وڵاتەیە، شاری سەفایە، شاری ئەو کچە جوانانەیە کە بە پارەیەکی کەم لەگەڵ هەموو پیاوێکدا دەخەون، ئەو کچانەی هونەرەکانی عەشق و سەماکردن دەزانن... سەیرکە جەلادەتی ئازیز، ئێرە وڵاتی خەیاڵە، لەناو هەزاران شاری پڕ گومەزو منارەدا، لەم چۆڵەوانییەدا مێرگێکت هەیە ئەو کچانە ڕووی تێدەکەن کە لە هیچ جێگایەکی دنیادا شوێنیان نابێتەوە، ئەو پیاوانە ڕووی تێدەکەن کە لە هیچ شوێنێک ئامێزانبوونیان دەست ناکەوێت و دێن و لێرە بە پارە دەیکڕن، بەڵام بە دیوە ڕاستەقینەکەشیدا بڕوانیت ئێرە هیچ نییە جگە لە سەرابێکی زەرد کە مەخلوقاتی بێپاشەڕۆژ تیا ونبوون». من کە پێشتر حیکایەتی ئەو جۆرە شارانەم بیستبوو، بەدەنگێکی سەرسام دەمپرسی «بەڕێز دکتۆر موسا، وەک لە قسەکەی بەڕێزت تێبگەم، هەرچی ئافرەتی ئەم شارە هەیە هەموویان سۆزانین، لەش فرۆشن؟ هەموویان... هەر هەموویان، هەتا دالیا سیراجەدینیش؟». دکتۆر بە ئەسپایی سەری لەقاندو گووتی «هەموویان... هەموویان هەتا دالیا سیراجەدینیش». ئێستێکی کردو کەمێک یەخەی چاکەتەکەی چاککردو چاوی کەمێک نوقاندو دەستیکردەوە بەقسەکردن «پێویست ناکات شتەکان وا سەخت وەرگریت، لە ڕاستیدا ئێرە شارێکی تەواوەتی نییە، ئێمە لێرەدا هەموومان ڕێبوارین، ڕێبواری هەمیشەیی. هەتا من کە بیست و پێنج ساڵە لەم جێگایەدا نەخۆشەکان تیماردەکەم ڕێبوارم، ئێمە دێین و دەڕۆین، جەلادەتی کۆتری برادەرم، خزمە چکۆلەکەی خۆم، ژنانیش وەک ئێمە دێن و دەڕۆن، بەڵام ئەوان یاساو ڕێساکانی ئەم جێگایە دەستنیشاندەکەن». دکتۆر موسا توند دەستی گوشیم و بە جووتێ چاوی کراوەوە، بە جیدییەتێکی قووڵەوە گووتی «خزمی خۆم، دەمەوێت پێتبڵێم، ئەو ڕۆژەی سەرتاپای ئەم شارە نغرۆدەبێت زۆر نزیکە، هەستم

وام پێدەڵێت، دڵم وام پێدەڵێت، هەموو شەوێک مۆتەکەیەک ڕامدەچڵەکێنێت، هەستێک وەک شێت هەڵمدەگرێت و وەک دێوانە لە ژوورەکەی خۆم دەمهێنێتە دەرێ، من لەوەو پێش هەستی وام نەبووە، بەلام بەر لە هاتنی تۆ بە ماوەیەکی کورت ئەو هەستەم هەیە».

نەمویست بەو دەستووره ئەخلاقیانەی لە منداڵییەوە فێریانبووم قسەبکەم، دواجار من پیاوێکی نەخۆش بووم لە چنگی دکتۆرێکی پیردا کە لە چاکەی خۆیدا بە ناو شارێکی سەرابدا دەیگێڕام. من تا پتر سەیری کوچەو کۆلانە سەیرەکانی ئەو شارەم دەکرد، زیاتر دەمویست بپرسم... شتێک لە ناخەوە دەیترساندم، هەستمدەکرد ئەو چۆڵەوانییە سەیره کە تێپەڕینی ڕێبوارێک، یاخود دەرکەوتنی ئافرەتێک لە جلکە ئاڵووالاکانیدا دەیشێواند هێدی هێدی قووتمدەدات.

دەمویست لەو شارە بڕۆم و بگەڕێمەوە بۆ ئەو جێگایەی لێوەی هاتووم، بەلام نەمدەتوانی ئەو ئارەزووە جڵەوبکەم کە قووڵ بەرەو ئەو سەراب و خەیاڵەش ڕایدەکێشام. دکتۆر موسای بابەک بە قەد هەنگاوەکانی من دەڕۆیشت، منیش دەستم بە زامەکانمەوەبوو، نیگام وەک شێت ئەو هەوایەی دەپشکنی کە پڕبوو لە پریشکی خەونی شکاو. دکتۆر موسا بێئەوەی چاوەڕوانی پرسیارەکانی من بکات، وەک یەکێک دەستی کوێرێکی گرتبێت و بیەوێت بەڕێگایەکی پڕ دڕکدا بیبات، گووتی «ئەم شارە هیچ نییە، کوچەکانی، ماڵەکانی هیچ نین، وێرانەیەکی گەورەیە، شارێکە بێ بازاڕ، بێ منداڵ، بێ مزگەوت، بێ قوتابخانە و خەستەخانە... هیچ نییە، بەشێوەیەک دروستبووە بتوانێت هەموو کاتێک بەجێیبهێڵێت».

لەناکاو وەستاو وەک ئەوەی زەردی ئەو ئاسۆ کراوانەی بەرابەرمان سنووری نێوان مردن و زیندەگی یادبخاتەوە، وەک یەکێک یەکەمجاری بێت ئەو هەستە بژی، سەیری ئاسمانی کردو بەدەنگێکی بەرز گووتی «بەلام ئاسانیش نییە، جێهێشتنی ئەم شارە ئاسان نییە، بەتایبەت بۆ من و تۆ.

ئەوانەی کە لە شارەکانی تر ڕادەکەن... شتێک لەم شارەدا هەیە تەیری وەک من و تۆ زوو دەستەمۆدەکات».

پێکەنینە جوانەکەی خۆی پێکەنی، دەموچاوی وەک هەمیشە پڕبوو لە ئومێدی چرچ و گووتی «ئێرە جوانترین شارە بۆ ئەوانەی وەک من و تۆ خەڵکی هیچ شارێک نین». دەستی بەردام و بەچەند هەنگاوێک پێشمکەوت، دەستی چەپی لە گیرفانی چاکەتەکەیدا بوو. زۆر ئەو دەستەی دەخستە گیرفانی چاکەتەکەیەوەو پشتی کوڕدەکردو دەڕۆی. هێند ورد سەیری زەوییەکەی دەکرد، لەوەدەچوو لە کێڵگەیەکی نەناسراودا بۆ جۆرە ڕوەکێکی نوێ و نەدۆزراوە بگەڕێت، من بەهەنگاوی خاوترو سووکتر دوای دەکەوتم و گوێم لێدەگرت کە دەیگووت «وامەزانە ئێرە شارێکی بێنرخە، ئێرە بەشێکی نەبینراوی هەموو شارەکانی دونیایە، ئەو شارەیە کە بە نهێنی لە هەموو شارەکانی تردا هەیە و ئێمە نایبینین».

لەڕاستیدا من هیچ شارێکم نەدەبینی، تەنیا کۆڵانی پەرش و بڵاوو نارێکم دەبینی کە ئافرەتانی خراپ و کچانی سۆزانی ئاوەدانیان کردبووەوە. شار نەبوو، هێندەی کۆمەڵێک خانووی سەرەتایی قوڕ بوو کە لە تەپوتۆزێکی ئەزەلیدا نوقمبووبوون، هەندێجار بینایەکی چیمەنتۆشی تێدەکەوت، جارجارەش باڵەخانەی دووسێ قات. لە هەندێ جێگاشدا ماڵی حەسیرو خانووی تەنەکەو دەواری عەرەبیت دەبینی. من دواتر تێگەیشتم کە زەحمەتە مرۆڤ ئەندازەکانیشی بپێوێت، لەبەرئەوەی هەمیشە لە گۆڕاندا بوو، هەندێک ڕۆژ شارێکی گەورەبوو کە ئاسان نەبوو تخوبەکانی ببینیت، پڕ لە کوچەو ئاوەدانی، هەندێجاریش بچوکدەبووەوە بۆ گوندێکی چکۆلانە. هەندێجار لەگەڵ هەندێک شاری دیکەدا تێکەڵاودەبوو و هەندێجاریش خۆی دەبوو بە دەیان پارچەوە. دکتۆر موسای بابەک هەوڵیدەدا لەیەک ڕۆژەوە ئەو کیمیا نهێنییە لە من تێبگەیێنێت، کیمیایەک مرۆڤ تەنیا کاتێک تێیدەگات کە خۆی لەناویدا بژی. دکتۆر موسا تەماشای هێمنی ئەو ئێوارەیەی

دەکرد و دەیگووت «جگە لەو کاتانەی کە ئاهەنگ دەکەن، ئێرە شوێنێکی هێمنە، ئەو شۆفێرانەی میوانەکان دەهێنن، لە دەرەوەی شار دەوەستن، بەدەگمەن ماشینێک دێتە ناوەوە، گەر ڕەشەبا یان عەجاج نەبێت، تەپوتۆزی ئێرە هیچ نییە جگە لە تۆزی ئەو ڕێبوارانەی لەملاولای دونیاوە ڕووی تێدەکەن، ئەو ڕێبوارانەی تەنیا پارەو زێڕ و تەلا ناهێنن لەگەڵ خۆیاندا، بەڵکو تەپوتۆزیش دەهێنن، غەم دەهێنن، غەم کە ناڕوات، من پێتدەڵێم خزمی خۆم، ڕێبوارەکان دێن و دەڕۆن، بەلام زۆر شت دەهێنن کە ناڕوات، سووزەنەک و گەڕیی دەهێنن، گوولی و سیل لەگەڵ خۆیاندا دەگێڕن، هەندێکیان بە بۆنی مەیدانەکانی جەنگەوە دێن، بەڵێ بە بۆنی باروت کە لە هەناسەیان هەڵدەستێت... من دکتۆرم لە من پرسە، لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە هەر کەسێک دێت و دەڕوات حەسرەت جێدەهێڵێت، کوڕی خۆم حەسرەتی زۆر بەجێدەهێڵن».

دەستێکی بەسەرە ڕووتاوەکەی خۆیدا دەهێنا، کەمێک یەخەی سپی کراسەکەی و سەردەستە کورتەکانی دەتەکاند، کەمێک ڕیشی هاتبوو، ڕیشێکی تەواو سپی وەک قژی و برۆی، تا زیاتر دەڕۆیشتین پتر ئەو خۆڵە زەردە لەسەر سمێڵ و لاجان و برژانگەکانی دەنیشت، بەلام وەک هێمنی ئەو ئاسمانە زەردباوە بەجۆرێک تێکەلاوی بووبێت نەتوانێت لێی جیابێتەوە، تا دەهات قووڵترو دوورتر منی بەرەو ناوەوە دەبرد. لەم کوچەوە بۆ ئەو کوچەو لەویشەوە بۆیەکێکی دی. من بەلامەوە گرنگ نەبوو بەرەو کوێ دەچووین، کۆڵانەکان ناویان نەبوو، لە بنەڕەتدا پێویستیشیان بە ناو نەبوو. موسای بابەک وەک ئەوەی منی بیرچووبێتەوە، پێشدەکەوت و لەبەر خۆیەوە قسەیدەکرد. بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە من ناتوانم بە خێرایی بڕۆم، بە چەند هەنگاوێکی خێرا دووردەکەوتەوە، بەلام لە ناکاو ئاوڕیدەدایەوەو دەیبینی من دەستم بەبرینەکەی سنگمەوە گرتووەو لە

دوورەوە تەماشـایدەکەم، پڕ بـە هێمنی ئـەو ئێوارەیـە پێدەکەنـی و دەیگووت «جەلادەتـی کۆتـر، بمبـوورە مـن وام، ئەمـە دەردی پیـری نییـە، خـۆم هـەر وابووم، هەمیشـە لـە ناوەڕاسـتدا بیرمدەچێتـەوە چـی دەکـەم، بۆچـی هاتـووم لەگـەڵ کێـم...». بـە هێمنـی دەگەڕایـەوە بـۆ لام، دەسـتی دەخسـتەوە سـەر دەسـتم و دەیگووت «بمبـورە، بمبـورە... بەڵام ئەهـا شـتێکم لـە یادبـوو، ئـاه، دەمویسـت شـتێکت بـۆ باسبکەم. خودایە، چـی بـوو؟. ئـەم کوچانـە مـن خـۆم نـاوم لێنـاون، نـاوی تایبەتـی خـۆم، کـە هیـچ کـەس نازانێت، بیـرت نەچێت مـن پیرترین دانیشـتووی ئـەم شـارەم، لـە هەرچـی مەخلوقاتـی ئـەم شـارە کۆنتـرم. تاکـە پیرێکم لێرەدا جێگام دەبێتـەوە، باپێتبڵێم هیـچ سـۆزانییەکی پیر ناتوانێت لێرە بژی، کچـەکان لـە تەمەنێکدا وازدەهێنـن و دەڕۆن، یـان خودکوژیدەکـەن، هەندێکیـان ڕێبوارێـک هەڵیاندەگرێـت و دەیانبـات، یاخـود کەسـێکی نزیکیـان دەردەکەوێـت و دەیانکوژێـت، لەبەرئـەوە مـن تەنیـا کەسـم کـە دەمێنمـەوە، مۆسـیقارەکانیش بـە پیـری لێـرەدا تەحەمـول ناکـەن... کـەس لێـرە بـە پیـری تەحەمول نـاکات مـن نەبێت، ئـەم شـوێنە قانونـی خـۆی هەیـە، قانونـی ئەوتـۆ کـە لەشـوێنی تـردا نییـە».

من بە هێمنی پرسیم «قانونی وەکو چی؟».

بـەر لـەوەی وەڵاممبداتـەوە کیژێـک کـە بـە شـێوەیەکی فیتنـە بازانـە سنگی ڕووتکردبـوو، لەگـەڵ دوو خانمـی زۆر بـەرزو زەبەلاحـی دیکـەدا بانگـی دکتۆریـان کـرد و شـتێکی چکۆلانەیـان چپاند بـە گوێیدا، دکتۆر موسـای بابەک بـە زەردەخەنەکـەی خۆیـەوە سـەری لەقانـد و گووتـی: هێـی کۆتـری بەڕێـز، خزمـە، لێرەدا بوەسـتە مـن هـەر ئێسـتا دێمـەوە، هـەر ئێسـتا». دکتـۆر لەگـەڵ سـێ ژنەکـەدا بـۆ ئێسـتێک ونبـوو، دوای ماوەیەکـی کـورت بـە پێکەنینـەوە گەڕایـەوە بـۆ لام و گووتـی «مـن لێـرە دکتـۆری هەمـوو شـتێکم، دەبێـت تەحەمولـم بکەیـت، ئەمشـارە لەسـەر مـن دەژی، دەبێـت نـازی هەمـوو ئـەم ئافرەتانـە هەڵگـرم، ئازارەکانیـان کەمتر بکەمەوە، کە گریان دەست بەسـەریاندا

بێنم، کە پرسیاریان هەبوو وەڵامیانبدەمەوە، کە نامەیان هەبوو بینوسم... خزمی خۆم من شەورۆژ لەم شارەدا بە ڕێگاوەم، شەوو ڕۆژ، هەندێجار بە ڕێگاوە دەخەوم، هەندێک شەو ناگەمەوە ماڵ ئیدی لە جێگایەک لادەدەم، لای یەکێک لادەدەم و دەخەوم، هەندێجاریش لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا پاڵدەکەوم و سەیری ئەستێرە دەکەم... ئاە ئەمڕۆ بەختەوەرم کە جانتاکەم پێ نییە... گەر لێرە مایتەوە دەمبینیت چۆن دەژیم... دەمبینت؟. زۆرجار بە خۆم دەڵێم : من دکتۆرێکم ویقاری خۆم ونکردوە، بەڵام ویقارم بۆچییە... ئێرە شارێکە مرۆڤ تیایدا پێویستی بە ویقار نییە».

دەستی گرتم و گووتی «ئێرە پێویستی بە سەبر هەیە، سەبر...».

هەستمدەکرد تا زیاتر بەو شارەدا بچینە خوار، تا پتر کوچەکان ببینم دیمەنەکان ئاڵۆزتر دەبن... هەموو شتەکان کۆمەڵێک مەتەڵ و پرسیاری نەکراوەبوون. هەتا دکتۆر موسای بابەک خۆی تەلیسمێک بوو لە تەلیسمەکان، شتێکی تێدابوو لەدەرەوەی تەفسیرو تێگەیشتن، شارەکەش بەسەریەکەوە نهێنییەکی گەورە بوو. لەوساتەوە هەستمدەکرد بەجۆرێک لە جۆرەکان بەو جێگایەوە نوساوم، شتێکی بەد بەڵام فریودەرو پڕگینگڵ، دزێو بەڵام دڵڕفێن و هۆش مەستکەر، منی بەرەو ئەو جێگایە ڕادەکێشا. ئەو شتەچی بوو؟... بۆنی ئەو کچە خراپە کارانە بوو کە هەموویان یەک عەتریان لە خۆیاندەدا؟... دیمەنی ئەو ئاسمان و زەمینە زەردەبوو کە وەک ئەوەی یەکدەست هەردووکیانی پێکەوە ڕەنگکردبێت، لێک جیا نەدەکرانەوە؟.... کۆبوونەوەی ئەو هەموو سۆزانییە قەشەنگەبوو کە لەمسەرەو سەری زەمینەوە هاتبوون؟... نازانم.

دکتۆر موسای بابەک ئەو ئێوارەیە زۆر کوچەی گێڕام، ئەو لەوحانەی نیشاندام کە لەبەردەم هەندێ ماڵ یاخود باڵەخانەدا هەڵواسرابوون. وەک چۆن لە شارەکانی دیکەدا پزیشک و پارێزەر و مافناس و بازرگانەکان بۆردی تایبەت بۆ ناونیشانی خۆیان هەڵدەواسن، ئەو شارە پڕبوو لە

ناونیشانی سەیر سەیر کە هەندێکیان بە لەوحی ئەلەکتریکی زۆر مۆدێرن دروستکرابوون. ناونیشانی سۆزانییە بەناوبانگەکان، تیپەکانی سەما، بانگەشەکردن بۆ جوانترین خانمان کە بە جوانترین شێوە خزمەتدەکەن. تا ژمارەی ئەو لەوحانە زیاتر بووایە پتر بەرەو ناو شوێنە گران و تایبەتییەکانی ئەو شارە ڕۆدەچووین. ئەو شوێنانەی کە میوانی تایبەتیتر و پارەدارتر ڕوویان تێدەکرد. لە هەندێ جێگادا لەوحی ئەلەکتریکی زۆر گەورە هەبوون کە مرۆڤ تەنیا لە شارە گەورەکاندا دەیانبینێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو شوێنە سەیرانە لەسەر ئەو خۆڵە ڕووتە دروستبووبوون، ئەو خۆڵە زەردەی لە شەویشدا هەموو ئەو شارەی بە غەمێکی شاردراوە ڕەنگکردبوو. لە هەموو ئەو جێگایەنەدا کچان خۆیان خزمەتیان دەکرد، هەموو ئەو شارە چێشتخانەیەک یاخود چایخانەیەکی تیا نەبوو، چونکە لە نێو ماڵەکاندا چێشتخانەو باڕو چایخانەش هەبوو، ئەو ڕێبوارە برسییانەی لە دوور دەهاتن دەیانتوانی ڕووبکەنە ماڵێک و لەوێ مەستبن و بخۆن و شتەکانی دیکەش بکەن. من بە کوچەکاندا دەڕۆیشتم و ناونیشانی ئەو لەوحانەم دەخوێندەوە... «ماڵی سوهیلە مەحمود و کیژە چاو خومارەکانی» «تیاترۆخانەی ئاسکی سپی» «تیپی سەمای خۆرهەڵاتی ڕەنا» «میوانخانەی ترێی ڕەش» «دیوانسەرای پاشا» «کۆشکی لەزەت» «خانەی سەربازی دلاوەر» «مێرگی تام و سەما» «تیاتری ورچی ئەرخەوانی» «تیپی سەمای فتحیە جوال بۆ سەمای بەدەوی» «سوها یەعقوب و دەستە خوشکەکانی» «سالۆنی تیک تاک بۆ دانسی خۆرئاوایی» «پشوگەی ئەفسەری زێڕین»... و دەیەها ناونیشانی دیکەی سەیر کە لەگەڵ ئەو خانووە داڕوخاوو ماڵە کەم ڕەونەقانەدا نەدەگونجان.

دکتۆر موسا بەو دەنگە گڕو ئارامەی خۆی ژیانی ئەو شارەی بۆ باسدەکردم. باسی ئەو قانونە سەیرانەی بۆ دەکردم کە لەم شارەدا ئیشدەکات، هەندێ لە ماڵەکانی نیشاندام کە گرانترین سەنتەرەکانی ئەو

شارەبوون، هەندێ جێگای نیشاندام کە پیاوانی زۆر بەرزو ناسراوی دەوڵەت هاتوچۆیدەکەن. باسی هەژاری و دەوڵەمەندی ناو سۆزانییەکانی بۆ کردم. لەسەر بەستێکی چکۆلانە بەرابەر تیاترێک دانیشتین و دکتۆر موسا پێیگووتم «جگە لە مۆسیقارەکان هیچ پیاوێکی دی بۆی نییە لێرە بژی». باسی دروستبوونی ئەو شارەی بۆکردم، شارێک کە لە دێر زەمانەوە ڕیشەی هەبووە، بەڵام لە هیچ سەردەم و ڕۆژگارێکدا وەک ئەمڕۆ گەورە نەبووە، بە درێژیی لەسەر ئەو سێ خوشکە قسەیکرد کە بناغەی ئەو شارەیان داناوە، سێ خوشک کە لە خێڵە کۆچەرییەکانی ناو بیابان جیادەبنەوەو لەویادا دوو دەوار هەڵدەدەن و لەگەڵ ئەو سەربازو فەرمانبەرانەدا دەخەون کە لە باکوورەوە دەچن بۆ باشوور، لەگەڵ شۆفێری ئەو لۆریانەدا دەخەون کە لە بەندەرێکی سەر کەنداوەوە بار بەرەو پایتەخت و شارەکانی ناوەڕاست دەگوێزنەوە، لەگەڵ میوانە داوێن پیسەکانی حەسەن و حوسەیندا دەخەون، پێشوازی ئەو گەشتیارانە دەکەن کە لە شوێنە دوورەکانی دونیاوە بۆ پشکنین لە دووی زێڕو تەلا نەدۆزراوەکانی بابل دەگەڕان. سێ خوشک کە هێدی هێدی کێژانی تەنیاو تەرە لە خێڵ و خێزان لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێدەکەن، ئەو کچە بە دەوییە چاوڕەشانەی کە باوک و براکانیان دەیانهێنن کاربکەن، ئەو ژنە وێڵانەی لە مێردەکانیان هەڵدێن، ئەو کچانەی بە زگی پڕەوە دۆستێکی بێوەفا خیانەتیان لێدەکات و تەنیا جێدەمێنن، ئەو بێوەژنە جوانانەی دوای مێردەکانیان لە زەویدا جێگایان نابێتەوە. بەڵام دەوڵەت کە خۆی بە پارێزەری شەرەف و کەرامەت دەزانێت، جار دوای جار ئەفسەرو سەربازەکانی دەنێرێت بۆ تێکدانی ئەو شارۆچکەیەو گرتنی سۆزانییەکان. وەلێ هەر ئەفسەرێک پێدەخاتە ئەو زەوییەوە، چاوی بەو سەرنشینە خەیاڵیانە دەکەوێت، لەگەڵ جوانەکانیاندا دەخەوێت، جەستەو خەندەیان تاقیدەکاتەوە، ناتوانێت فەرمانەکان تەواوەتی جێبەجێبکات. جار دوای جار ئەفسەرە جیاوازەکان پلان و چارەی جیاواز بۆ ئەو شارۆچکەیە

دەدۆزنـەوە، هەندێکیـان کەمێـک قووڵتـر بـەرەو نـاو بیابـان دەیجوڵێنـن، هەندێکیـان بـەرەو زۆنگاوەکان پاڵی پێوە دەنێن، هەندێکیـان بەقـەراغ ڕووبارە گەورەکاندا دەیخزێنـن، هەندێکیـان دەیکـەن بە ناو قامیشـەڵانەکانی باشـووردا، چەنـد ئەفسـەرێک دەیکـەن بـە چەنـد پارچەیەکـی جیـاوازەوە کـە لـە هـەر پارچەیەیـان شـارێکی خەیاڵی تر دروسـتدەبێت، هەندێکیـان تێکەڵ بە کۆمەڵێک شـارۆچکەی دیکـەی دەکـەن. موسـای بابـەک ئـەو ئێوارەیـە دەیگـووت «هـەر لەسـەرەتاوە ئـەم شـارە وەک مەخلوقێـک لەدایکبـوو کە بـەردەوام دەجوڵێت، لە جێگایەکـەوە دەچـوو بۆ جێگایەکـی دی، بێئـەوەی هەسـتبکەین کـە دەڕۆین». موسـای بابـەک خـۆی یەکێـک بـوو لەوانەی لـەزووەوە لەگەڵ ئەو شـارەدا بوو، پزیشـکێک بـوو وەک سـوکایەتی و سـزا فڕێیاندابـووە ئـەو شـوێنەوە، هێدی هێدی لەگـەڵ تێپەڕینی کاتدا بووبوو بـە بەشـێکی ئۆرگانی ئەو دونیایە. وەک خـۆی دەیگـووت، لـە قۆناغێکدا واز لـەوەش دەهێنێت چاوەڕوانی ئـەو موچەیە بـکات کـە لـە پایتەختـەوە بـە پۆسـت پێیـدەگات، واز لـەوە دەهێنێـت لەسـەر خەزنـەی دەوڵـەت بژی، بەڵکو تەنیا بـەو سـامان و پارەیـە دەیگوزەرێنێت کـە لـە ڕێبـواران و سـەرنشـینانی ئـەو شـارە دەسـتیدەکەوێت. خـۆی داڕوو دەرمان دەکڕێـت و دەیفرۆشـێتەوە، سـاڵ دوای سـاڵ سـامان و سـەروەتی ڕوو لـە زیادبـوون دەکـەن، سـاڵ دوای سـاڵیش لەگەڵیـدا دەژی، لەگەڵیـدا دەگەڕێـت، لەگەڵیدا پیردەبێت.

مـن برینەکانـم هێـدی هێـدی ئازاریـان دەدام، توانـام نەبـوو دوای ئـەو ماوەیـەی کە بە پێ ڕۆیشـتین، بگەڕێمـەوە بـۆ پرتەقاڵی سپی. ئـەو شـتانەی بەسـەریەکەوە بیسـتبووم بـەس بـوو بۆئـەوەی ماندووبیم. هەسـتمدەکرد بـە شـارێکدا سـەفەردەکەم لـەدەرەوەی زەمینـە، پێویسـتیم بـە خـەوێکی قـووڵ و پشـوویەکی درێژ هەبـوو تا شـتەکان پێکەوە گرێبدەم. موسـای بابـەک دەیزانی تەپوتـۆزی ئـەو شـارە مـرۆڤ ماندوودەکات، ئاگاداربـوو بینینـی ئـەو تارماییـە زەردانـە، تەماشـاکردنی ئـەو سـۆزانیانە مـرۆڤ نەخۆشـدەخات. دەسـتی

دەخستە سەر دەموچاوم، گەرمای دەپێوام، لێدانی دڵی حیساب دەکردم و لە بەردەرکی میوانخانەیەکدا لەسەر بەستێک دایدەنام و ئاوی دەدامێ و دەیگووت «کەمێکی تر دەگەینە ماڵێ، دەتوانیت لەوێ پشووبدەیت». من دوای ماندوویێتییەکی زۆر، لە ئێوارەیەکی درەنگدا، لە ڕۆژێکدا کە ئێستاش هیچ شتێکی تەواو دەربارەی ساڵ و زەمانی نازانم، چووم بۆ ماڵی دکتۆر موسای بابەک.

ماڵی دکتۆر لە کۆڵانێکدا بوو وەک هەموو کۆڵانەکانی دیکەی ئەو شارە، بە خەتیکی نارێک کە لە دەستوخەتی دکتۆرەکان خۆیان دەچوو، لەسەری نوسرابوو «الطبیب الاخصائی ـ موسی سلیم بابک» و هیچی دیکە. ماڵەکەی دکتۆر بابەک نیشانەیەکی تایبەتی ئەوتۆی نەبوو لە ماڵەکانی دەوروبەریی جیابکاتەوە، بەڵام لە ناوەوە دونیایەکی تایبەتی بوو. سەرەتا هیچ کەس نەیدەتوانی بزانێت ئەو ماڵە چەندە گەورەیە، یەکەمین سەرنجم ئەوەبوو کە ئەم ماڵە دونیای یەکێکە لە سەردەمێکی دێریندا دەژی. لێتان ناشارمەوە کە سەرەتا من شتەکانم بەوجۆرە بینی کە خۆم چاوەڕوانمدەکرد، قەرەوێڵەیەکی کۆن، دۆڵابێکی تەختەی کاڵەوەبوو، کە چەند چاکەتێکی قۆڵ کورت و چەند بۆینباخێکی دێرینی پیا هەڵواسرابوو، قەنەفەیەکی سەوز کە کۆمەڵێک خاولی لەسەر کەڵەکە بووبوو. ژوورەکە بۆنی شتییەکی لێدەهات، وەک ئەوەی ئێستا یەکێک خۆی شتبێت و بە هالاوی حەمامەوە لەوێوە تێپەڕیبێت، بەڵام بێدەنگییەکی قورس و دێرینیش لەوێ بوو، بێدەنگییەک وەک ئەوەی مێژوویەکی درێژی هەبێت. لە ژوورەکەی تەنیشتیدا کتێبخانەیەکی گەورەم بینی، کە ڕەفی پڕ کتێب بەشی هەرە زۆری دیوارەکانی گرتبوو، ئەوەی لە کتێبخانەکە مابووەوە بە وێنەی زەمانێکی بەباچووی تر پڕکرابوون، وێنەیەکی گەورەی هند ڕۆستەم لە فلیمی باب الحدید، پلاکاتی فلیمی غرام و انتقام ی ئەسمەهان و ئەنوەر وەجدی، عومەر شەریف و پلاکاتی فلیمی فی بیتنا رجل لەگەڵ

زوبیدە سەروەتدا، لەولاتریشەوە هەر عومەر شەریف لە فلیمی دکتۆر ژیڤاکۆدا لەگەڵ جولیا کریستیدا. وێنەی یاریکەرە کۆنەکان، بیلییەو پێکەنینە ئەسمەرەکەی، بۆشکاش لە یارییەکدا دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی زێڕینی ڕیال مەدرید، ئۆزیبۆ خاولییەکی دابوو بە شانیداو دەگریا، بۆبی شارڵتۆن و سەرە کەچەڵەکەی، بۆبی مۆر لە فانیلەیەکی سوورو دەرپێیەکی سپیدا کاتێک کاسی جیهانی ساڵی ١٩٦٦ بەرزدەکاتەوە، وێنەیەکی غەمگینی جیمس دین لە سوچێکی بەرزی ژوورەکەدا، وێنەیەکی فەیروز لە فلیمی بیاع الخواتم دا، چەند وێنەیەکی پزیشکی، ئێسکە پەیکەرێکی بۆر، پلاکاتێکی زۆر کۆنی ڕاگەیاندن بۆ کوتانی منداڵان. ژوورەکە نمونەی نارێکی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا جۆرە سیستمێکی تیابوو کە چاوی ئەو کاتی من نەیدەبینی، پێدەچوو دکتۆر موسا هەموو ژیانی خۆی لەوێدا شاردبێتەوە. کە چووینە ماڵەکەوە ڕاستەوخۆ منی لەسەر ئەو قەنەفە سەوزە داناو هەندێک دەرمانی تایبەتی بۆ گرتمەوە، من تا دەهات ئازاروو بێتاقەتییەکەم زیادیدەکرد. چاوم لێکدەناو بیرم لە دەموچاوی ئەو کچە عەرەبانە دەکردەوە کە بینیومن، بیرم لەو کۆلانە سەیرو پلاکاتە ڕەنگاوڕەنگانە دەکردەوە کە تۆز داپۆشیبوون. حەزمدەکرد بۆ جارێک بچوومایەتە ماڵێک لەو ماڵانەوە، حەزمدەکرد بزانم چی لەو دیو دیوارەکانەوە ڕوودەدات. چاوم لێکدەناو بە دکتۆرم دەگووت: دکتۆر من دەمەوێت بمبەیت بۆ یەکێک لەو ماڵانە.

بێئەوەی سەیری دکتۆر بکەم، هەر بە چاوی نوقاوەوەو چاوەڕوانی وەلامەکەیم دەکرد، ئەو بە پێکەنینەوە دەیگووت: ناتوانم، ناتوانم بتبەم بۆ هیچ یەکێک لەو ماڵانە، تێبگە، بەم هەموو برینەوە، نا شتی وا ناکرێت... کوڕم. ئێستا ژیان لێرە وەک جاران نەماوە، لێرەش دەبێت بترسیت... گوێت لێمە، لێرەش دەبێت بترسیت.

موسای بابەک دەستی دەخستە سەر شانم، من لەسەری پەنجەکانییەوە هەستم بەهەناسەکانی دەکرد. بە هێمنی چاوم دەکردەوەو ئەو لەشە

تۆزاوییەی دکتۆرم دەبینی. بەو سەرەکەچەڵ و لەشە چکۆلانەیەوە لە بەردەممدا وەستابوو، لە پەیکەرێکی لم دەچوو، یەکێک لە قەراغ ئاوێک دروستیکردبێت و جێیهێشتبێت، پەیکەرێک با هەندێ بەشی بردبێت و نیوەیەکی سەیری لەویادا جێهێشتبێت. چاکەتەکەی دادەکەن و لە منی دەپرسی: ئاغای کۆتر، پێمبڵێ، هەرگیز خەوت بەم شارەوە بینیوە. من کەمێک بیرمدەکردەوەو دەمگووت: دکتۆر من خەوم بە هەموو شتێکەوە بینیوە. کەمێک دەوەستاو وەک بۆ حیکمەتێکی قووڵ بگەڕێ دەیگووت: ئەم شارە بەشێکی تاریکی ڕۆحی هەموومانە.

ئەو کات ئەگەرچی مێردمنداڵ بووم، پڕبووم لە خەون، بەڵام ئەو ڕۆژە کە لەسەر ئەو قەنەفەیە دانیشتبووم، هیچ خەونێکم نەبوو... هیچ شتێکم نەدەویست. دەمویست کەمێک ڕابکشێم و بیربکەمەوە، تۆزێک خۆم کۆبکەمەوەو تێبگەم لە کوێدا دەژیم. دکتۆر موسا هەموو جلەکانی دادەکەندو بە دەرپێکورتێکی کەمێک درێژەوە بەرابەرم دەوەستا و بە پێکەنینە شیرینەکەی خۆیەوە دەیگووت: سەیرکە ئاغای کۆتر، سەیری دڵی خۆتبکە. دەستی گرمۆڵەدەکردو دەیخستە سەر دڵی خۆی، چاوی دەنوقاندو دەیگووت: زۆر جار هەستدەکەم ئەم شارە خەونێکە لە خەونەکانی من. کوڕە بریندارەکەم، چی پیاوێک هاتۆتە ئەم ژوورە لێم پرسیوە: تۆ خەونت بەم شارەوە بینیوە؟ هەموویان گووتوویانە: بەڵێ.

سەرێکی بادەداو بە غەمەوە دەیگووت: ئەم شارە لە خەوی تێکشکاوی ئێمە دروستبووە. من بە دەنگێکی خەواڵوو، وەک یەکێک ئێستا ببوریتەوە دەمپرسی: بۆ بەم خراپەخانە گەورەیە دەڵێیت شار؟ من شار نابینم، هیچ شتێک نابینم جگە لە ماڵە سۆزانی کە لە پاڵ یەکدا ڕیزبوون. سەرە کەچەڵەکەی بەرابەرم بادەدا و دەیگووت «بەر لەوەی بچم خۆم بشۆم، حەزدەکەم پێتبڵێم، کە ئێرە جاران شار نەبوو، شوێنێکی چکۆلانە بوو،

بەڵام جەنگ، کوڕی بریندارم جەنگ هەموو ئەم شارانەی دروستکرد. ئەو سەربازانەی لە بەرەکانی شەڕەوە دەهاتنەوە، ئەو تیپ و گوردان و هێزانەی کە لە ڕێگایاندا بۆ مردن دەیاندا بەسەر ئەم ماڵانەدا، ئەوان ڕەواجی ئەم شارەیان بەرزکردەوە، پیاو بەرلەوەی بمرێت حەزدەکات لەگەڵ کۆمەڵێک ئافرەتدا بخەوێت... هەموو پیاوێک وایە».

دەوەستاو سەر لە نوێ چاوی دەنوقاندەوە و بەرەو ڕووم دەهات. باسی ئەو گوردانانەی دەکرد کە تانک و زرێ پۆشەکانیان لەدەرەوە دەوەستان و وەک فەتحکردنی داگیرکەرێک بۆ قەلایەکی دوژمن، دەیاندا بەسەر ماڵەکاندا، وەک شێت باوەشیان بە ژنەکاندا دەکرد، کچەکانیان دەهێنایە دەرێ و لە ژێر مانگە شەودا لەگەڵیاندا دەخەوتن، بە ڕووتی خۆیان لە خۆڵی ئەو شارەدا دەگەوزاند. دەیانخواردەوەو مەستدەبوون، لە ناوەڕاستی کوچەکاندا دەخەوتن... موسای بابەک دەیگووت «ئەو سەرباز و ئەفسەرانە هیچ هیوایەکیان بە ژیان نەبوو، دەیانزانی دەمرن، دەهاتن دواجار لەوێدا دواشەوی خۆشی ژیانیان بژین. بەڵام کە شەڕ درێژەی خایاند و گەرم بوو، کە دەیەها شار وێرانبوون، کە هەرێمی گەورە گەورە خاڵیکرانەوە لە ئادەمیزاد، کە وای لێهات «با» بۆنی لاشەی سەربازەکان لە بەرەکانی جەنگەوە بە هەموو نیشتیماندا بهێنێت، کە سەدان هەزار بێوەژن لە شەوگارە تاریک و درێژەکاندا تەنها کەوتن... ئیدی ئەم شارە گەورە بوو، هەموو ڕۆژێک کوچەیەک زیادی دەکرد، شەو دەخەوتیت و بەیانی چاوت دەکردەوە شوێنی تازەو ماڵی تازەو ئافرەتی نوێت لە سەر شەقامەکان دەبینی. تا وای لێهات واتدەزانی ئەم شارە هەموو ئەم دونیایە دەخوات، هەموو شارەکانی تر قووتدەدات».

موسای بابەک بیریدەکردەوەو دەیگووت: لەگەڵ هاتنی ئەو ژمارە زۆرەدا لە ئافرەتان ئێرە بوو بە شوێنێکی ترسناک، دەوڵەت چاوساغەکانی خۆشی نارد بۆ ئێرە. لە نێو کچەکاندا خانمی وا دەرکەوت کە کاری تەنیا

نوسینی ڕاپۆرت و ئاگادارکردنـەوەی ئاسـایش بـوو. ئێره ئـەو شـوێنه نییـه مـرۆڤ تیا نەترسێت.

دەهاتـه بەردەمـم و چەناگـەی پێهەڵدەبڕیـم و سـەری بەرزدەكردمـەوەو بـه ئەسـپایی دەیگـووت «دەبێـت لێرەش بترسـیت، ئێرەش مەترسـی خـۆی هەیـه».

دكتـۆر بـه هەناسـەی پیاوێكـی مانـدووەوه قسـەی لەسـەر مێـژووی ئـەو شـاره دەكرد، باسـی ئـەو سـۆزانییه بـه ناوبانگانـەی دەكرد كـه دواتـر بـوون بـه ژنـی وەزیرو دۆسـتی سـەركرده گەورەكانـی سـوپا. بـه دەرپـێ كورتەكـەو پشـته كۆماوەكەیـەوه، بـەو مـووه سـپییانەوه كـه ڕەنـگ و ڕووی تارماییەكیـان دابوویـێ بـه ژوورەكـەدا دەهـات و دەچـوو، بـۆ سـاتێك چییـه لـه قسـەكردن نەدەوەسـتا. دەچـووه بـەر دەرگاكـەو جارێكـی دی دەگەڕایـەوه، خاولییەكـەی هەڵدەگـرت و دایدەنایـەوه. تێكەڵەیـەك بـوو لـه پیرێكـی ڕوخـۆش كـه پێكەنینـی بـه هەمـوو شـتێك دێـت، لەگـەڵ پیاوێكـی بێئۆقره كـه لەگـەڵ هەمـوو شـتێكدا تـا ئەوسـەر دەژی. بەرلـەوەی ژوورەكـه جێبهێڵێـت سـەیرێكی منـی كـردو گووتـی «ئێره شـارێكه مردووەكانیـش سـەری لێدەدەن. بیـرت نەچێـت مردووەكانیـش سـەری لێدەدەن».

كـه ئـەو دەچـوو بـۆ خۆشـتن، مـن خـۆم بـه ماڵەكەدا كێشـدەكرد، دەمویسـت قەرەوێڵەیـەك بدۆزمـەوه و لەسـەری بخـەوم. برینەكانـم بـه جۆرێـك لاوازیـان كردبـووم، چیتـر ئـەو كـوڕه بـه توانایـه نەبـووم بتوانـم زۆر بـڕۆم و زۆر گوێبگـرم. هەسـتمكرد لـه پشـت ژووری كتێبخانەكـەوه چەنـد ژوورێكـی تـر هەیـه، بـه ڕاڕەوێكـی بچوكـدا ڕۆیشـتم. ژوورێكـی چكۆلانـەم بینـی بـه دەسـتوخەتێكی جوان لەسـەری نوسـرابوو «دەرمانخانـه». ژوورێـك بـوو پڕ لـه ڕەف و پاكـەت و بۆنـی دەرمـان، دوو دەرگای تـری لەسـەر بـوو، لـه پشـت

ڕەف و دۆلابی تایبەتی دەرمانەکانەوە لەسوچێکی ژوورەکەدا کەمانێک دانرابوو، کۆمەڵێک وێنەی ڕەش و سپی گەورە هەڵواسرابوون کە پێدەچوو دیمەنی هەندێک ئۆپرای ئەوروپی بەناوبانگ بن. من بێئەوەی تەماشایانبکەم بەلایاندا تێپەڕیم و دەرگای ژوورەکەی ترم کردەوە کە پڕبوو لە تیشک. وەک تاریکی ناو ژووری دەرمانخانەکە ترساندبێتمی، بە خێراییەکی سەیر دەرگاکەم داخست و بەرەو ناو ئەو ڕوناکییە چووم. لە ژوورەکەی دیکەدا چوار قەرەوێڵە هەبوو، چوار قەرەوێڵەی خاڵی و ئامادە، بە چەرچەفی پاک و سەرینی خاوێن و بەتانی نوێوە کە پێدەچوو بۆ کۆمەڵێک میوان ئامادەکرابێتن. من خەیاڵم بۆ ئەوەچوو کە دکتۆر وەک قاوشێکی تایبەت و هەمیشە بەردەست بۆ دۆخی لێقەومان، نەخۆشی سەخت و ڕوداوی ناوەخت بەکاریانبهێنێت.

بە ئارامی لەسەر یەکێک لە تەختەکان ڕاکشام، لەسەرسامی و ترسیش بەولاوە هەستم بە هیچی تر نەدەکرد. لە ناو ئەو بێدەنگییە کوشندەیەدا لە هەموو شتێکی ئەو شارە دەترسام، لە کوچەکانی، لەو هەوا زەردەی، لە سۆزانییەکانی. وەک منداڵێکی بچوک خۆم گرمۆڵەکرد و دەستمگرت بە سنگمەوەو لە نێوان ترس و نائارامیدا وەک یەکێک لە هۆش خۆی بچێت خەوتم.

کە لەخەو هەستام شەوێکی تاریک بوو، دکتۆر موسای بابەک لێگەڕابوو ماوەیەکی درێژ بخەوم. بەلام وەک ئەوەی یەکێک لە خەومدا هەندێک شتم بۆ بەیانبکات، کە هەستام هەندێک شت لە بەرچاوم ڕوونتربوون. دەمتوانی شتەکان ساف و سادەتر ببینم. دڵنیابووم ئەو ڕۆژەی لەگەڵ ئیسحاقی لێوزێڕین و سەرهەنگ قاسمدا گیراین، ئێمەیان لە زیلێکدا بەرەو باشوور هێنا... دڵنیابووم لەگەڵ کۆمەڵێک زیندانی تردا کۆیانکردینەوە... بەدروستی و ڕێکی لەبەرچاوم بوو چۆن جارێکی تر سوار زیلێکی سەربازیی تر بووینەوە، چۆن لە زیلەکەدا دەنگێک پێیگووتم «مۆسیقامان

بۆ لێده، مۆسیقا». لە بیرمە من فلووتم لێدا... لە بیرمە هەموویان بە جۆرێکی ترسناک و مەرگهێن بێدەنگ بوون. من بە هۆی ئەو مۆسیقایەوە هەموو شتێکم لێتێکچوو، نەمدەزانی بەرەو کوێ دەڕۆین و چەند سەعاتە بەڕێگاوەین. لە نیوە شەوێکی تاریکدا ئێمەیان دابەزاند، تارمایی کۆمەڵێک پیاوم لە یادە بە چەکەکانیانەوە بەرەو ڕوومان هاتن، جگە لە ڕوناکی گڵۆپی پێشەوەی زیلەکان هیچ ڕوناکییەکی ترم بیر نییە، هەندێ دەنگ و دەموچاوم لە یادە کە نازانم کێن، نازانم چۆن پێکەوە گرێیانبدەمەوە، دەنگی تەقەکانم لەبیرە، ئێستا ئەو گوژمە ترسناکەم لە یادە کە بەرەو دوا پاڵی پێوەنام، ئەو گورزەم لە بیرە وەک دەنگی هاواری جانەوەرێکی گەورە لەسەرمدا دەنگدەداتەوە، دەنگێک دێت و شتێک لە ناختدا هەڵدەکەنێت و دەیبات، وەک ئەوەی ڕەشەبایەکی قایم بەیەک گڤە هەزاران گەڵا لە درەختێک بکاتەوەو بە خێرایی بیانبات، یان بۆمبێکی بچوک بەیەک تەقینەوە، هەزاران ماسی بەرەو سەرەوە بەرزبکاتەوەو بە جۆرێکی کەوانەیی فڕێیان بداتەوە ناو دەریا، شتێک بوو لەو جۆرە. دەزانم ئەو کاتەی گوللەکانم بەرکەوت بیرم لە ڕەشەبا دەکردەوە... بۆ بیرم لە ڕەشەبا دەکردەوە نازانم، بەلام شتێکی تایبەت کە لە بۆنی گەردەلوول دەچوو لە هەوای ئەو شەوەدا بوو. ئەو ساتەی گوللەکانم بەرکەوت وەک ئەوساتە وابوو یەکێک لە ناکاو بکەوێتە ناو ئاوێکەوە، وەک ئەوەی تۆ بە ڕاستە شەقامێکدا بڕۆیت و کتوپڕ خۆت لە ناوەڕاستی زەریادا ببینیتەوە، هەستدەکەیت گورزێکی قایمەو تۆی پێکاوە، بەلام هێند خێرایە بواری ئەوەت پێنادات بیری لێبکەیتەوە. شتێک لە لەشتدا دەدرەوشێتەوە، وەک تێپەڕینی دڵۆپێک ئاوی زۆر سارد بەسەر دڵتدا، یان بۆنکردنی ژەهرێک کە لە نیوەیدا دەتەوێت بیوەستێنی و چیتر هەناسە نەدەیت و هەڵینەمژیت... من ئەو گورزەم لە بیرە، ئەو گوللانەم لە بیرە، دەتوانم ئێستا بیانبینم کە بە ئارامی بەرەو ڕووم دێن، ئەوەم لە بیرە کە دەکەوم، ئەوەم لە یادە سەرم بەر شتێک دەکەوێت، ئەوەم لە یادە

وەک ئـەوەی لـە خەرەندێکـەوە بـەرەو بنـی بێقـەراری تاریکییەکی کوشـندە بەربیمـەوە و وەک دابەزینێکـی سـەیر بـە پەڕەشـووتێکی خودایـی شـتەکان خـاو ببنـەوەو ئیدی هیچـم بیـر نەمێنێت. ئێسـتاکێ لـە بیرمـە لـە چ سـاتێکدا هوشـیاریم وەک خامۆشـبوونی تریفەیـەک خامـۆش بـوو، وەک ماسـییەک چۆن لـە سـاتی مردنیدا دەریـای لـە بیـر نامێنێت، وەک مۆمێک چۆن دوای کوژانـەوە ڕوناکـی لـە بیردەچێتـەوە. ئاوهـا ئیـدی هیچـم بیرنەمـا.

ئێستا دڵنیابووم یەکێک هەڵیگرتووم، یەکێک دەستی هێناوەو لەو ساتەدا کـە بـەرەو بنـی ئـەو خەرەندە بەردەبوومـەوە گرتوومـی و دەریهێناومەتـەوە، بـەڵام ئـەو کەسـە کێ بـوو؟ نازانـم.

* * *

بەیانی لەسـەر دەنگی داڵیا سیراجەدین و دکتۆر بابەک بە ئاگا هاتمەوە. مـن لـەو شـەوەوە بـەردەوام دەنگـی ئـەو لـە گوێمـدا دەزرینگایـەوە، لەگـەڵ یەکـەم چرپـەی داڵیـا سـیراجەدیندا توانیـم بیناسـمەوە، هەردووکیـان لـە ژووری دەرمانخانەکـەدا پێکـەوە قسـەیاندەکرد. داڵیـا سـیراجەدین دەگریـا، باسـی لـە یەکێک دەکرد کـە خەڵەتاندویەتـی، پیاوێکی بێڕەحـم هەمـوو شـتێکی لەگەڵـدا کـردوە، هەفتەیـەک لـە گرانتریـن ئوتێلـی پایتەخـت لەگەڵیـدا ژیـاوە، بـەڵام درۆی لەگەڵـدا کـردوە. حیکایەتەکـە پەیوەنـدی بـە یەکێـک لـە خەونـە دێرینەکانی داڵیـا سیراجەدینەوە هەبوو کـە بتوانێ خۆشەویسـتێکی خـۆی لـە زینـدان ئازادبـکات و دواتریـش دواهەمیـن سـاڵی کۆلێـژی ئەدەبـی ئینگلیـزی تەواوبکات. شـەوێک داڵیا سـیراجەدین وەک هەمـوو ئافرەتـە خراپەکانـی ئـەو شـارە لەگـەڵ میوانێکدا دەخەوێـت کـە پێیدەڵێت گوایـە ئـەو فەرمانبەرێکـی بـەرزی وەزارەتـی خوێندنـی باڵایـە، کابرایەکـی دەموچـاو کونـج کونجـی بـاڵا

بەرزە، تەنها یەک ئارەزووی هەیە، ئەویش ئەوەیە لەگەڵ گەورەترین ژمارە لە سۆزانییەکانی دونیادا بخەوێت. بە ویقارو هەیبەتێکی گەورەوە دالیا سیراجەدین ڕووتدەکاتەوەو لە کاتێکدا وەک کڕیارێکی شارەزا تەماشای ئەو جوانییە نهێنیی و ئەفسوناوییەی دالیا دەکات، دەڵێت «خانم، تۆ ژنی ژمارە دووهەزارو دووسەدو بیست و دووی منی، بەر لە تۆ من لەگەڵ ئەوەندە ژندا جیماعم کردوە، بڕیاریشمداوە هەموو ئەو خانمانەی ڕێکەوتی جۆرە ژمارەیەکی وەها ڕێکدەکەن کە تیایدا چوار ژمارەی وەک یەک دووبارە دەبێتەوە، شتێکی ناوازەو گرنگیان بۆ بکەم. ئەوەی کە سەیرە ئەوەیە هەمان ئەو ڕێکی و جوانییەی لەو ژمارەیەدا هەیە لە لەشی تۆشدا هەیە، خانمم تۆ خۆشبەختیت، لەبەرئەوە داوای شتێکی گرانبەهاو قورس بکە بۆت جێبەجێبکەم... من پیاوێکم دەوڵەمەندم، دەتوانیت بڵێیت دەست ڕۆیشتوشم، داوایەک بکە لە سنووری دەسەلاتی ئادەمییەکدا بێت بۆتی بهێنمەدی». دالیا سیراجەدین کە ژانێکی گەورەو ترسناک لە دڵیایەتی دەڵێت «من تەنیا دوو ئارەزووم هەیە، دوو ئارەزوو هیچی تر، یەکەمیان : باسم وەلید ئەلجەزائیریم لە زیندان بۆ بدۆزەرەوە تا بزانم ماوە یاخود مردووە. ئەوی دیش بتوانم جارێکی دی بگەڕێمەوە بۆ زانکۆ و دواهەمین ساڵی کۆلیژی ئاداب بەشی ئینگلیزی تەواوبکەم». کابرای سۆزانیباز پەیمان بە دالیا سیراجەدین دەدات کە هەردوو داواکەی بۆ جێبەجێبکات، بەلام پێشوەخت دەبێت هەفتەیەک لە پایتەخت لەگەڵیدا بمێنێتەوە، لەو هەفتەیەدا پێکەوە دەخەون و تەواوی کاروبارەکانیش جێبەجێدەکەن.

حیکایەتی باسم جەزائیری گرێی هەرە سەختی ژیانی دالیابوو. یەکەمین عەشق و گەورەترین عەشقی ژیانی بوو، هەموو ئەو شتانەی کچێک لە خۆشەویستیدا دەیبینێتەوە دالیا لەو کوڕەدا دەیبینییەوە. یەکدی دەناسن، یەکدیان خۆشدەوێت، پێکەوە دەگەڕێن، پێکەوە دەخەون، پێکەوە نان دەخۆن، بە شێوەیەک دەبن بە دوو بەناوبانگترین عاشقی

نێو زانکۆ، دوو ڕۆح کە لە یەکدی جیانابنەوە. دالیا دەزانێت حیسابی ئەو عەشقەی چەند قورسە، ئەو دوو برای هەیە کە لە ناو بازاڕەکانی شارێکی ڕاستەقینەی کوردستاندا گەورەبوون. لای ئەوان عەرەب هیچ نیین جگە لە دوژمنێکی خوێنمژ، دوژمنێکی بێڕەحم و کوشندە کە شایستەی بەزەیی نین. براکانی کە دەماودەم چیرۆکی خۆشەویستی خوشکەکەیان لەگەڵ عەرەبێکی باشووریدا دەبیستن، بە نهێنی دێن بۆ پایتەخت و لە نزیکەوە لە هەموو حیکایەتەکە دڵنیادەبن. بێئەوەی قسەبکەن بە هێمنی دەگەڕێنەوە بۆ کوردستان و چاوەڕێدەکەن تا دالیا لە پشووی نیوەی ساڵدا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵێ. براکان بڕیاردەدەن دالیا بە ئارامی بکوژن، بە جۆرێک کەس نەزانێت و خۆشی درێژترین عەزاب بچێژێت، عەزابێک شایستەی ئەو هەموو نائومێدی و ئابڕووچوون و دەردە بێت کە ئەوان چەشتوویانە، بۆیە لە شەوێکدا بە ئارامی بێهۆشیدەکەن، دەیخەنە پشتی پیکابێکەوەو دەیبەن بۆ چیایەکی دوور، بۆ شاخستانێکی سەخت، لەوێ کۆنە بیرێکی فەرامۆشکراو هەیە کە پاشماوەی یەکێکە لەو گوندانەی لە مێژە خاپووربووە، دەیخەنە ناو بیرەکەوەو خۆیان «چاو بە فرمێسک» دەگەڕێنەوە. دالیا چەند ڕۆژێک لە بنی بیرەکەدا دەمێنێتەوە، دواجار کاروانێکی قاچاغچیان کە لە بەفردا ڕێگا هەڵەدەکەن ڕێیان دەکەوێتە سەر ئەو بیرە و بە زەحمەتێکی زۆر دەریدەهێننەوە. ڕێکەوتێکی ئیلاهی، ئەفسونێک زۆر جار خودا لەگەڵ مرۆڤدا دەیکات، بەوەی تاسەر لێواری مردن دەیبات، دەیخاتە سەر خەرەندەکە لەوێوە پاڵێکی هێمنی پێوە دەنێت بۆ خوارەوە، بەڵام هەر خۆی لەوێوە دەستێک دەنێرێت و بەر لەوەی بەرەو بنی بنەوە بڕوات دەریدەهێنێتەوە. کاروانچییەکان بەو جۆرە دالیا ڕزگاردەکەن، چوار کاسبکار کە جامانەکانیان وەک لەچک لەسەروو گوێیان ئالاندووە، لە نانی خۆیانی دەدەنێ، لەبەر ئاگری خۆیان گەرمیدەکەنەوە، پاڵتۆی خۆیانی دەدەن بە شاندا، لە پوزەوانەو گۆرەوی خۆیانی لە پێدەکەن،

دەموچاوی بۆ هەڵدەبەستن، جلی ژنانەی گونجاوی لە بارە قاچاغەکانی خۆیان بۆ دەردێنن و پارەی دەدەنێ، بێئەوەی لێبپرسن تۆ کێیت، چییت، بۆ لەبنی بیرێکی وەها تەراکەوتەو تاریکدا بوویت؟ دەیخەنەوە سەر ڕاستە جادەو ماڵاوایی لێدەکەن.

دالیا سیراجەدین تێدەگات ئەو جارێکی دی ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کوردستان. دڵنیایە براکانی جارێکی دیش دەیکوژنەوە. چەند ڕۆژێک بەر لە کۆتایی پشووی نیوەساڵ دەگاتەوە پایتەخت، تەلەفوون بۆ باسم جەزائیری دەکات، ئەو کوڕەی کە خەریکی ئامادەکردنی نامەیەکی ماستەرە لەسەر «بەراورد لە ڕەگەزە کۆمیدییەکانی گێڕانەوەی چیرۆکدا لەنێوان مارک توین و چارلز دیکنز» دا، لە «نیوەندی کولتووری ئیسپانی» یەک دەبینن کە شوێنێکی چەپەک و کەم میوانە، لە کافیتریاکە پێکەوە دادەنیشن و دالیا هەموو شتێکی بۆ دەگێڕێتەوە. باسم کە دالیا بە نیوەی ڕۆحی خۆی دەزانێت، ڕۆژێک لە ڕۆژان کوردستانی نەبینیوە، کوڕی خێزانێکی دەوڵەمەندە، لە گرانبەهاترین گەڕەکی شاردا دەژی، گرانبەهاترین ئوتومۆبێلی ئەو سەردەمە لێدەخوڕێت، یاریکەرێکی ناسراوی بلیاردە، شارەزایەکی بێوێنەی ئەدەبی ئینگلیزی دێرینە، عاشقێکی بێهاوتای کریستۆفەر مارلۆیە، بەردەوام ڕۆمانی «بەرزاییەکانی ودزەرینگ» ی ئەمیلی برۆنتی پێیە «ئەو کتێبەی لە هەموو چاپەکان و بەرگەکاندا هەیەتی». کوڕێکە لە پیاسەکانیدا قەسیدەی قوبلای خانی سامۆیل تایلەر کۆلێردج، عەشق و مردنی لۆرد بایرۆن یان چوارشەممەی خۆڵەمێشی ئالیوتی لەبەر دەگووتەوە. بەڵام لە هەر شت زیاتر حەزی لە قەسیدەی «ئەنابێل لی»ی ئەدگار ئالان پۆیە کە لە کەنار دیجلە بە دەنگی بەرزو بە ئینگلیزییەکی ساف بۆ دالیا سیراجەدینی دەخوێندەوە. پێکەوە حەزیان لە فلیمی «هیرۆشیما مۆنامۆر» بوو، کە حەزیاندەکرد لەبەردەم هاوڕێکانیاندا ناوەکەی بە فەرەنسی بڵێنەوە، چەندین جار لەگەڵ یەکتردا تەماشایانکردبوو لە دونیادا لە هەر شت شیرینتر لە

لایان ئەو دوو عاشقەبوو، دالیا حەزیدەکرد لە «مانوئیلا ڕیڤییە» بچێت، ئەگەرچی دالیا چەندین جار لەو خانمە فەرەنسییە جوانتربوو، شتێکیش لە باسمدا هەبوو، بەتایبەت قژو نیگاکانی «ئیجی ئۆکادا»ی بەیادا دەهێنایەوە، پێکەوە زۆربەی شتەکانی دیکەی مارکرێت دۆرایان پەیداکرد، پێکەوە ڕۆمانی دڵداریان خوێندەوە. بەڵام ئەو ڕۆژە کە لە نێوەندی کولتووری ئیسپانی یەکیان بینی، دالیا دڵنیایکردەوە کە ئەو چیتر ناتوانێت بێت بۆ زانکۆ، ئەو چیدی لەلای خێزانەکەی مردووەو ئاشکرابوونی جارێکی تر ژیانی دەخاتە مەترسییەکی گەورەوە. باسم جەزائیری کە سەرسام و ناحاڵی گوێ لە حیکایەتە سەیرەکەی دالیا دەگرێت، هیچ ڕێگایەکی لە بەردەمدا نییە جگە لەوەی ڕازی بێت و کۆمەکیبکات، تابتوانێت ژیانی خۆی لە دەرەوەی زانکۆ بە جۆرێکی تر بژی و بە ڕێگایەکی تردا ئاڕاستەیبکات، دالیا زانکۆ جێدەهێڵێت و بە کۆمەکی کچێکی هاوڕێی لە «هێڵی ئاسمانی فلیپینی» ساڵێک کاردەکات، خانوویەکی چکۆلە لە گەڕەکەکانی باشووری شار دەگرێت و ئارام و بەختەوەر لە چاوەڕوانی داهاتوودا دەژی. باسم خۆی کۆدەکاتەوە بۆ تەواوکردنی نامەی ماستەرەکەی، لە کاتێکدا خەریکی ئامادەکردنی فەسڵێکی بەراوردە لە نێوان تۆم سوێر و دافید کۆپەرفیلدا، شەوێک ماشێنێکی ڕەشی دەوڵەت دەیبات و ئیدی ناگەڕێتەوە.

ونبوونی باسم جەزائیری وێرانبوونی تەواوەتی ژیانی دالیا سیراجەدینی بەدواوەیە کە هەمیشە لە بەردەم هاوڕێکانیدا دەیگووت بێئەو کوڕە ناتوانێت هەوای سەر زەمین هەڵمژێت. هەموو زیندانە ئاساییەکانی بۆ دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە. هەموو دەزانن ئەوانەی وندەبن دەچن بۆ کوێ، دەزانن دۆزینەوەی ڕێگایەک بەرەو جیهانی نادیارو نەدۆزراوەی مرۆڤە ونەکان چەند سەختە، بەڵام دالیا سیراجەدین کۆڵنادات، بەو ڕێگایەدا دەڕوات کە تەنیا ڕێگاو دواهەمین ڕێگایە بشێت بیگرێتە بەر، ڕێگای خۆ نزیککردنەوە لە پیاوانی دەوڵەت، خەوتن لەگەڵیاندا. بە ڕێگایەکی زنجیرەیی ئاڵۆزدا

دەڕوات کە تیایدا هەر بەرپرسێک دەیکات بە دیاری بۆ ئەوی دی، هەر یەکەیان دەینێرێت بۆ لای یەکێکی لە خۆی بالاتر، هەر یەکێکیان دەیخاتە خەیاڵییەوە کە ئەوی دی کلیلی نهێنی و هەڵگری شیفرەکانی ڕزگارییە، لە پێخەفی پاسەوانەکانەوە دەگاتە پێخەفی ئەفسەرەکانی ئاسایش، لەوێشەوە دەگاتە ناو جێگای بەڕێوەبەرەکانی زیندان، لە دەستی دەلالەکانی حیزبەوە دەگاتە ژووری خەوتنی وەزیرەکان، پاسەوانەکانی سەرۆک تاقیدەکاتەوە، لەگەڵ ڕاوێژکارەکانی ئەنجومەنی شۆڕشدا دەخەوێت. لە ڕۆژنامەنوسەکانەوە دەگاتە ژێر زەمینی لابووره گەورەکانی تاقیکردنەوە لەسەر مرۆڤ، لە هەموو جێگایەکدا بەدوای باسم جەزائیریدا دەگەڕێت، لەگەڵ هەر کەسێکدا دەخەوێت مەرجی ئەوەی لەگەڵدا دەبەستێت بەیەکێکی گەورەتری بناسێنێت کە بتوانێت یارمەتییدات. هەندێجار دەگاتە ناو زیندانە تاریکەکان، لەویادا ئەو زیندانیانە دەبینێت کە چەندەها ساڵ ڕوناکیان نەبینیوە، ئەوانەی بە منداڵی هاتوون و بەگەورەیی لەوێدا دەمرن، بەلام لە هیچ جێگایەکدا ئاماژەیەک یان ئاسەوارێکی بچوک کە بچێتەوە سەر باسم وەلید جەزائیری نادۆزێتەوە، ڕۆژێک هەستدەکات ئەو هێندە دوور لەگەڵ ئەو یارییەدا ڕۆیشتووە بە ئاسانی ناتوانێت بێتەوە دەرێ. لە بری ئەوەی وەک کچێک تەماشابکرێت کە شەرەفی خۆی قوربانی خۆشەویستی دەکات، بە پێچەوانەوە وەک سۆزانییەکی هەرزانی بندەستی پیاوانی دەوڵەت نیگادەکرێت. ئەو هەستە ترسناکەی کە ئەو بێهودە لەگەڵ بکوژانی باسمدا دەخەوێت نائومێدیدەکات، بەلام جگە لەو ڕێگایە ڕێگایەکی دی شک نابات. لە ڕۆژێکی بێکەسی و بێچارەیی و نائومێدیدا خانمێک بە ناوی سەمەر سالحەوە لەگەڵ هاوڕێیەکیدا دەینێرێت بۆ ئەو شارەو لەوێ بۆیەکەمجار دکتۆر موسای بابەک دەبینێت کە لە بەردەم پرتەقاڵی سپیدا قسە لەگەڵ پەتاتە فرۆشێکدا دەکات کە لە پیکابەکەیدا جگە لە پەتاتە ڕۆژنامەو گۆڤاری کۆنیش دەفرۆشێت.

چیرۆکی دالیا سیراجەدین چیرۆکێکی غەمگین بوو، من هەموو بەشەکانیم بەسەریەکەوە نەبیست، بەڵکو لە کاتی جیاوازداو بە شێوەیەکی پارچە پارچە بیستبووم، دواتر خۆم ڕستە لە دوای ڕستەو ڕاستی لە دوای ڕاستی پێکەوە گرێمدان، ڕۆژ دوای ڕۆژیش بەشەکانی لەبەرچاوم ڕوونتربوونەوەو ئاشکراتربوون، زۆربەی چیرۆکەکەشم لە چەند هەلومەرجێکی سەیردا لە دەمی دالیا سیراجەدین خۆیەوە بیست کە دواتر دەگەڕێمەوە سەری.

دالیا سیراجەدین هەندێجار زۆر غەمگین، هەندێجار زۆر ڕوخۆش بوو، هەندێجار زۆر پڕدوو، هەندێجار هیچ قسەی نەدەکرد، هەندێجار زۆر نەرم و نیان هەندێجاریش بێڕەحم بوو. ئەوڕۆژە بە زمانێک کە ڕاستی و خەیاڵ تیا تێکەڵاوبووبوون قسەی لەو یەکەمین ڕۆژە دەکرد کە هات بۆ شاری بێناونیشانی سۆزانییە گەڕۆکەکان. ئەو دەیگووت «ئەوەی منی وا لێکرد بمێنمەوە، ئەو فریشتە بچکۆلانانەبوو کە پێشوازیان لێکردم، کە من هاتم کۆمەڵێک فریشتەی زۆر لە هەوادا لە دەورم کەوتنە سەماکردن، فریشتەی هەمە ڕەنگ، کە هەر یەکەیان بە ئەندازەی نوقڵێکی چکۆلانە بوون، لەو جۆرە فریشتانەی لە فلیمی منداڵاندا هەن... ئەوان هاتن، لەسەرەتادا یەک فریشتەی چاوشین بوو، دواتر بوون بە دووان، دووهەمیان چاوی ڕەنگێکی تربوو کە بیرم نییە، دواتر زۆربوون، ئێجگار زۆر، هەموو هەواو ئاسمانی ئەو شارەیان پڕکرد، هەموو هەموو ئەو شارە، هیچ جێگایەک نەمایەوە فریشتەکانی منی تیانەبێت، ئا... بۆ وا سەیرمدەکەیت، فریشتەکانی من... پێویست ناکات وا سەیرم بکەیت و بحەپەسێیت، چونکە ئەوانە بەڕاستی ڕاستی فریشتەی من بوون... ئینجا بە جۆرێکی زۆر سەیر لە دەورم کۆبوونەوە لەسەر سەرم وسنگم و شانم نیشتنەوە، بەسەدان خۆیان بە کراسەکەمدا هەڵواسی، فریشتەی ڕوخۆش کە هەموو بە بێدەنگ پێدەکەنین... تا ئەوان لێرەبن من دەبێت لێرە بمێنمەوە... ئەی چۆن گوڵی خۆم، تا ئەوان پێم نەڵێن من لێرە ناڕۆم، شتەکە ئاوهایە. تەنیا من دەیانبینم، چونکە

فریشتەی منن... هی منن و بەتەنیا هی کەسی تر نین. من و ئەوان بە ئیشارەت قسەدەکەین. چونکە ئەوان زمانی ئێمە نازانن، بەڵام دەتوانین لەیەکتر تێبگەین، زۆرباش نا، بەڵام لەیەکتر تێدەگەین».

یەکەمین جار کە چیرۆکی فریشتەکانی دالیا سیراجەدینم بیست هەمان ئەو ڕۆژەبوو کە لە دەرمانخانەکەی دکتۆر موسای بابەکدا دەگریا، ئەو ڕۆژەی لەسەفەرێکی نائومێد گەڕابووەوە و بەر لەوەی بگەڕێتەوە بۆ پرتەقاڵی سپی هاتبوو بۆ لای دکتۆر تا هەواڵی من بزانێت. ئەو ماوەیەی کە لە پایتەخت بوو، هەموو ڕۆژێک تەلەفونی کردبوو، هەموو ڕۆژێک هەواڵی منی پرسیبوو، لەسەر تەلەفونەکان گریا بوو، کە دەشگریا بە شێوەیەکی شێتانە دەگریا، بەدەست دەیکێشا بە دیوارەکاندا، سەرەتای دەست پێکردنی خۆشەویستی من بۆ ئەو، لەسەرسامی منەوە بەو گریانە توندو کوتوپڕانەی دەستپێکرد. ئەو گریانەی لە ڕۆحێکەوە دەهاتەدەرێ کە درۆ نازانێت، ئەوە وایکرد تا هەتا هەتایە خۆشمبوێت و تا مردن گریانەکانی ئەو لەگوێمدا بزرینگێنەوە. من هەرگیز گریانەکانی دالیا سیراجەدینم بیرنەچووەوە، وەک پێکەنینەکانی، وەک گاڵتەکردنەکانی، وەک چاوانی لە کاتی ترسدا، وەک خەندەی لە کاتی مەکردا، وەک ئەو پەنجە باریک و ناسکەی کە دەیخستە سەر ناوچاوانم و دەیگووت «چی لەم مێشکە پووتەی تۆدایە، تۆ بۆوا گەمژەیت؟».

ئەو ڕۆژە کە دالیا دەگریا من هەستام و بە ئەسپایی دەرگاکەم کردەوەو گووتم. دالیا سراجەدین بۆ دەگری؟. ئەو لەگەڵ دکتۆردا لە ژووری دەرمانخانەکە لەسەر کورسییەک دانیشتبوو و سەری خستبووە کۆشییەوە، کە منی بینی، هەستاو ماچیکردم و گووتی. «بەقوربان چەند غەمت دامێ، من هەر غەمی تۆم بوو، تەنها غەمی تۆم بوو... چەند خۆشحاڵم ئاوها تەندروست و زیندوو دەتبینم، ئاە دکتۆر، خودایە من پێم نەگووتی کوڕێکی ئێجگار ناسکە، شایەنی ئەوەیە مرۆڤ خۆی بکات بە قوربانی». دالیا

ئەمڕۆ لەو کچە نەدەچوو کە لەو شەوە تاریکەدا لە ژێر زەمینەکەدا بینیم، زیندووترو ڕوناکتر دەهاتە بەرچاوم. من دەستی دالیام گرت و گووتم «باش بوو گەڕایتەوە، باش بوو، من قەرزاری تۆم، دەزانم تۆ شتت زۆر بۆ کردوم، من زۆر سوپاسی تۆ دەکەم، دکتۆر موسا پێیگووتم کە تۆ چیت بۆ من کردوە، بەڵام دالیا سیراجەدین تۆ کێیت؟ بۆ بە منت گووت ناوم تریفەی زستانە، تۆ چی منیت، بۆ من گەیشتمە ئەم شارە؟»

دالیا لە تەنیشت خۆیەوە دایدەنام، دەستێکی دەخستمە نێو هەردوو دەستی خۆیەوە و دەیگووت «ئاه، جەلادەتی ئازیز، بە قوربان تۆ شایستەی هەموو شتێکی، سەیری چاوت دەکەم، دەست بە قژتدا دەهێنم و دەزانم تۆ شایستەی هەموو شتێکیت، جەلادەتی کۆتر، وانییە؟ ناوەکەتم بەڕاستی گووت؟ ئاه زۆر باشە، جەلادەتی ئازیز، من پێتدەڵێم کە تۆ چۆن هاتی بۆ ئێرە، بەڵام دەبێت باوەڕم پێبکەیت، تێدەگەیت دەبێت باوەڕم پێبکەیت، چونکە گەر باوەڕم پێنەکەیت من لەوە زیاتر ناتوانم هیچت پێبڵێم، گەر باوەڕم پێنەکەیت سوێند دەخۆم بە خوداو بە پێغەمبەرو بە هەر شتێکی تر کە ئینسان لەم دونیایەدا سوێندی پێدەخوات ناتوانم هیچی ترت پێبڵێم... ناتوانم قسەت لەگەڵدا بکەم. جەلادەتی کۆتر، فریشتەکان تۆیان هێنا... تێدەگەیت، فریشتەکان... دەبێت باوەڕم پێبکەیت، پێم نەڵێیت کە من خورافات و شتت بۆ باسدەکەم، دەبێت سوێندم بۆ بخۆیت کە بە یەکێکم نەزانیت کە سیحر و شت دەکات. من باوەڕم بە غەیب هەیە، بەڵام باوەڕم بە سیحر نییە، پێشم ناخۆشە یەکێک پێمبڵێت سیحرباز، قەتیش لەو کچانە نەبووم کە حەزدەکەن یەکێک پێیان بڵێ سیحرباز، قەتیش سیحرم نەکردوە. بەڵام ئەو ڕۆژەی کە تۆم بینی، لە بەردەست فریشتەکاندا بوویت، من لە بەیانییەوە دەمزانی شتێک ڕوودەدات. شتەکان وانەبوون وەک ئەوەی دڵم خەبەری دابێت یان نازانم چی، باوەڕیشم بەو کەسانە نییە کە دەڵێین دڵمان خەبەری دابووینێ و نازانم چی، ئەگەرچی من خۆشم زۆرجار دەڵێم دڵم خەبەری

داومەتێ، بەڵام چۆنت بۆ دەگێڕمەوە ئاوهایە. لە بەیانییەوە فریشتەکان بە جۆرێکی تر دەفڕین، یەعنی زەحمەتە ڕوونیبکەمەوە بڵێم چۆن، وەک ئەوەی لە هەوادا کۆمەڵێک سێگۆشە دروستبکەن، باپێتبڵێم من ئەوەندەی لە زمانی ئەو فریشتانە تێگەیشتبووم، سێ گۆشە ڕەمزبوو، یەعنی چی تێناگەیت؟ ئا ڕەمزبوو، ڕەمز بۆ سوڕێکی ئەبەدی و بێکۆتایی ژیان، مردن، زیندووبوونەوە، یەعنی یەکێک دەمرێت و دەژی و زیندوودەبێتەوە، وەک لە سوڕێکی هەمیشەیی و داخراودا».

دالیا سیراجەدین کە قسەیدەکرد تەماشایدەکردیت و هەر خۆشی لەگەڵ نیگاکانتدا دەکەوتە گفتوگۆ، زۆرجار بێئەوەی بواری تۆ بدات بەڕاستی قسەی خۆت بکەیت، لە شێوەی نیگاکردنتدا پرسیاری دروستدەکردو خۆشی وەڵامیدەدایەوە. پێموایە لەو ڕۆژەوە قسەو گفتوگۆکردنی من و دالیا سیراجەدین شێوازێکی تایبەتی وەرگرت و تا ماوەیەک درێژیش گۆڕانکارییەکی گەورەی بەسەردا نەهات. ئەو ڕۆژە من تەماشای دالیام کردو تەماشایەکی موسای بابەکیشم کرد کە خۆی بە چاککردنی دەرمانخانەکەیەوە سەرقاڵکردبوو، هەندێک گوڵی ئاودەدا، شتەکانی پاکدەکردەوە، بەردەوامیش مێشێکی لە خۆی دەکرد کە من لە بەر تاریکی ژوورەکە مێشەکەم نەدەبینی. لەبەرئەوە دیمەنێکی سەیری هەبوو، دیمەنی یەکێک هەر لە خۆیەوە دەست بجوڵێنێت، یان لە هەوادا شتێکی خەیاڵی ڕاوبکات. من سەیری دەستی خۆمم کردو گووتم «دالیا سیراجەدین، من باوەڕت پێدەکەم، بەڵام ئەو فریشتانە کوان، لە کوێن؟»،

دالیا هەناسەیەکی هەڵکێشاو وەک ئەوەی گوێی لە پرسیارەکەی من نەبووبێت، لەسەر چیرۆکی خۆی بەردەوامبوو «ئینجا فریشتەکان شتی سەیرتریان دەکرد، وەک ئەوەی زۆر نزم لە سەر زەوی دەفڕین و لە پڕێکدا بەرزدەبوونەوە بۆ سەرەوە... ها بۆ سەری سەرەوە، من لە خۆمم پرسی خوایە ئەوە دەبێت مانای چی بێت؟ ئەگەرچی زۆر ئاسان بوو،

کەچی یەکەمجار تێینەگەیشتم... تۆ خۆت بیری لێبکەرەوە، شتێک بوو پەیوەندی بە مردن و زیندووبوونەوەوە هەبوو. وەک نزمبوونەوەی ڕۆح تا بنی بنەوەی مردن و دواتر بەرزبوونەوەی بۆ سەری سەرەوە. بەڵام سەیرترین شت لە ئێوارەدا ڕوویدا، ئەو کاتەی کە من دەمویست جلەکانم بگۆڕم بۆ خزمەتکردنی میوانەکان، ها، جا پێتبڵێم، زۆر ترسناک بوو. ئەو ڕۆژە وەک بۆنیان کردبێت وەک ئەوەی پیاوانی دەوڵەتیش کۆمەڵێک فریشتەی خراپی خۆیان هەبێت، سالۆنەکەی پڕتەقاڵی سپی پڕبوو لە جاسوس، پڕبوو لەو عەرەبە شەرگاوییە سمێڵ زلانەی بە دیسداشەی درێژەوە دێن و جار جار لەگەڵ کچێکدا دەخەون و بە چاویاندا دیارە بۆ شتێک دەگەڕێن، وەک ئەوەی لە هەوادا بۆنی میوانەکان و بۆنی نیازی دەرونیان بکەن... جمەی دەهات. زۆر زۆربوون... بەقوربان بۆ وا تەماشام دەکەیت، کچەکانی پڕتەقاڵی سپیش هەموویان دەزانن، حەزدەکەیت لەوان بپرسە... بەڵام فریشتە بچکۆلەکان وازیان لێنەدەهێنام، بەیەکجار هەزار فریشتە لەسەر سەرو سنگم و کراسەکەم نیشتنەوە، بەیەکجار وەک ئەوەی پێکەوە هەڵمگرن منیان ڕاکێشا، بە کچەکانم گووت «سەیرکەن ئەمانە وازم لێناهێنن». بەڵام خۆت دەزانیت لە بەرئەوەی ئەوانە تەنیا فریشتەی منن، من و بەس، کەسی تر نایانبینێت، یەعنی داوای لێبوردندەکەم ناتوانم فریشتەکانت نیشانبدەم... وای زۆر عەیب بوو، زۆر عەیب بوو، من نەمزانی بۆ کوێم دەبەن، وەک عادەتی هەمیشەیی خۆم بە زەردەخەنەی جوان میوانەکانم والێکرد خەیاڵیان بۆ شتی خراپ نەچێت، گووتم «بزانم ئەمانە چییان دەوێت». لەدەرەوە دنیا خەریک بوو تاریکدەبوو، من لەگەڵیاندا ڕۆیشتم، بەدەوری خانووەکەدا پێچێکیان پێکردمەوە، منیان بردە ژووری زەخیرەکەوە، لەوێ ڕایانکێشامە ژێر زەمینەکەوە. لەوێوە شتێک هەیە کە بۆتی ناگێڕمەوە، یان ئەمڕۆ بۆت ناگێڕمەوە، لەوانەیە جارێکی ترو لە کاتێکی تردا بۆت بگێڕمەوە، بەڵام سوێندت دەدەم بە چاوی دایکت، بە

هەرچی شتێک کە حەزت لێیەتی و خۆشتدەوێت ئێستا داوام لێمەکە ئەو نهێنییەت بۆ ئاشکرابکەم، لە بەرئەوەی ناتوانم بۆتی ئاشکرابکەم... هەر چییەکم بدەیتێ پێت ناڵێم. نا... نا، خۆت هیلاک مەکە. لەو ژێر زەمینەدا بۆ یەکەمجار تۆم بینی، سەرتاپای گیانت خوێن بوو، بەڵام شەبەنگێکی ڕوناک لە دەورت بوو، وەک مەشایەخ و قەدیسەکان، لەسەر قەرەوێڵەیەکی کۆنی فەرامۆشکراو دانرابوویت... وای چەند جوان بوویت، چەند بەزەیم پیاتا هاتەوە. لە حیکایەتەکاندا بیستبووم کە ئەمیرەیەکی خەوتوو بە ماچ وریا دەبێتەوە، یان ئەمیرێکی بریندار ماچ زیندوویدەکاتەوە، تۆم ماچکرد، بەڵام زیندوو نەبوویتەوە. دەستم لەدەستتدا مردبوویت... سەهۆڵی سارد چۆنە ئاوابوویت. نەمدەزانی چی بکەم، لە پەشۆکان و سەر لێشێواندا دکتۆر موسای بابەکم بیر نەبوو. ئا من بیرم خراپە، بەتایبەت کە شتێکی ئاوەها گەورە ببینم، ئیتر هیچم لە بیرنامێنێت، مەپرسە وا سەرم لێدەشێوێت دەست و قاچی خۆمم بۆ جیاناکرێتەوە، کە ئەم پیرەمێردە ڕۆح سووکەم کەوتەوەیاد. وەک با هەڵمبگرێت، وەک شەپۆلێکی سیحری بمخاتە سەر دەستی خۆی ئاوەها فڕیم، نازانم بە چەند گەیشتمە ئێرە. نا.. نەدەکرا تەلەفونی بۆ بکەم... ئاه، تەلەفونەکە لە پرتەقاڵی سپی لە جێگایەکدایە کەس ناتوانێت دوو قسەی لێوەبکات، یەعنی تێمدەگەیت، گەر تەلەفونم بکردایە هەموویان دەیانزانی، هەموو دەیان پرسی «دکتۆرت بۆچییە؟ کوێت دێشێ؟ بابت شێلم؟ وەختی عادەکەتە یان نا؟». ئاه ڕەب لعالمین، بەڵام ئێستاش بیرم نییە چ سیحرێک منی وەها خێرا گەیاندە ماڵی موسای بابەک، کە وەک عادەتە بەدەکەی خۆی، بە دەرپێیەکی کورتەوە دانیشتبوو، هەروەک ئێستا مێشی لە خۆی دەردەکرد، کتێبێک، دەستنوسێکی بەدەستەوەبوو... ها وا سەیرممەکە، منیش زۆر دەخوێنمەوە، زۆر لە دکتۆر بابەک زیاتریش، یەعنی دەڵێیت لە خوێندەوارو شتی وا ناچم، ها بەڵام من لەگەڵ خوێندنەوەدا ناگریم، دواجار لەگەڵ کتێبدا گریابێتم لە کۆتایی ڕۆمانی «پان»ی کنۆت

هامبسن بوو... ها ئێستا وازبێنە، من لە کوێدا بووم.. لە کوێدا؟»
پارچەیەک بوو لە ناسکی، پارچەیەک بوو لە جوڵە، کە بێدەنگدەبوو هەموو گیانی بێدەنگ دەبوو، کە دەکەوتە قسە هەموو گیانی قسەیدەکرد. من هێند سەرسامانە گوێمدەگرت بیرم چووبووەوە کە ئەو حیکایەتی من دەگێڕێتەوە. بەڵام من لەو تەمەنەدا لەو کوڕانەبووم کە ناهێڵن سەرسامی و شەیداییان دەرکەوێت، هەڵبەت دواتر لە پرتەقاڵی سپی شتەکان تەواو پێچەوانە دەبێتەوەو دەبم بە یەکێک لە زمان درێژەکان لە بواری وەسف و دەرخستنی سەرسامیدا. ئەو کات من تەمەنم هەڤدەساڵ بوو، دالیا سیراجەدین لە سەرەتای بیست و پێنج ساڵیدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەمێک لە تەمەنی خۆی گەورەتر دیاربوو، من بۆئەوەی پەستیبکەم، گووتم «من نازانم تۆ باسی چیدەکەیت، تا بزانم لە کوێدا بوویت». موسای بابەک کە بە وریایەوە گوێیدەگرت گووتی «لەوەدا بوویت کە هاتیت بۆ لای پیرەمێردێک کە لە هەیوانی ماڵە کاول بووەکەی خۆیدا بەدەرپێیەکی کورتەوە، کتێبی دەخوێندەوە». دالیا دەستێکی بە قژیا هێناو گووتی «ڕاستدەکەیت دکتۆر، تۆ زۆر ڕاستدەکەیت. من لەویادا بووم کە تۆم پەلکێشکرد بۆ سەر ئەم داماوە... ها بەڵام دکتۆر سەیرکە خودایە ئێستا چۆن تەماشاماندەکات، وەک ئەوەی ئێمە خراپەمان دەرهەق کردبێت، بەڵام قەیناکا، ئێستا گرنگ ئەوەیە تۆ دەژیت، من دەمگووت لە هەزار ڕۆح یەکێکیان دەرنابات، وایە ئاخر تۆ خۆت نازانیت، برینەکانی خۆتت نەبینیوە. گوێبگرە، من تا ئەو شەوەش باوەڕم بەم دکتۆر موسای بابەکە نەبوو، کە ئێستا هەستدەکەم هەردووکتان لە پشتەوە فێڵم لێدەکەن... وانییە، هەردووکتان فێڵم لێناکەن؟ بەڵام قەیناکا، من هەمیشە باش بووم. جەلادەت ئەو ڕۆژە کە دکتۆر تۆی بینی، نەترسا، تا ئەو شەوەش من بە پیاوێکی گرینۆکی ترسنۆکم دەزانی کە لە ترسی دونیا ڕایکردۆتە ئەم شوێنە چەپەکەوە، باوەڕیشم وابوو لە حەبی مەنعی زگ پڕبوون و دەرمانی ئەنفلۆنزا زیاتر هیچی دی نازانێت. من ئەو

شەوە بەرنامەم هەبوو، دەبایە بڕۆیشتمایە، بۆئەوەی کەس شک لە هیچ شتێک نەکات، نەدەبوو لەوێ بمابایەتەوە، دوای ئەوە، نەمدەتوانی سەیری تۆ بکەم دەمریت، کە درەنگ وەختێک گەڕامەوە دکتۆر چاوەڕوانیدەکردم و گووتی: دەژی، ژیانی وەکو خەڵکی تر نابێت، بەڵام دەژی، هەمیشە شتێک لە مەرگ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە ژیانی زیندووەکانەوەو شتێکیش لە ژیان دەبات بۆلای مردووەکان. ئەو وایگووت... دکتۆر بابەک کە خۆی ئەوەتا لە بەردەمماندایە، ئەو وایگووت. من و ئەو ڕێکەوتین کە هیچ کەس نەزانێت تۆ لێرەیت، تۆ ڕێکەوتێکی سەیر، بێگومان ڕێکەوت، ڕێکەوت و هیچی تر ڕزگاریکردیت، نازانم لەوانەیە ڕێکەوتیش نەبێت، خودا دەزانێت یان نهێنییەکی تر، یاخود شتێکی تر کە من هیچی لەسەر ناڵێم... گوێم لێبگرەو هیچ قسەیەکی زیاد مەکە، نابێت لەمشارە بچیتە دەرێ، نابێت کەس بە برینەکانت بزانێت، تێدەگەیت من ئێستا دەزانم چی دەڵێم و چۆن وادەکەم بتوانیت لێرە بژیت، تێبگە، من ئەو هەفتەیە لە پایتەخت تەنیا بیرم لە تۆ دەکردەوە، بەیانیان کە لە ئوتێلەکەدا بە تەنیا بەرچاییم دەخوارد بیرم لای ئەوە بوو چی بۆ تۆ بکەم، چۆن وابکەم بژیت. ئاه، دکتۆر بابەک، پیاوە مەزنەکە، پیاوە عاقڵە شیرینەکە، دەمبوریت، دەمبوریت، من ئاوەها نەخۆشێکی سەختم بەسەرتا جێهێشت، بەڵام تۆ بە دڵی گەورەی خۆت، هەموو شتێکت جێبەجێکرد، زیاتر لەوەی کە پێویستە... خودایە من بەس لەوە دەترسام یەکێک پێویستییەکی بەو شتە شکاوانەی ژێر زەمینەکە بێت و لەوێ بۆی بگەڕێت. ئێستا سوپاس بۆ خودا، سوپاس بۆ ئەو فریشتە چکۆلانانە، هەموو شتێک باش دەڕوات... ئاه، چەند غەمت دامێ، چەند غەمت دامێ».

هەستاو دەستێکی بە کراسەکەیدا هێناو گووتی «دەبێت هەموو وابزانن کە تۆ کوڕی پوری منیت، تۆ لەمڕۆوە کوڕی پوری منیت، کە هیچ کەست نییە بە خێوتبکات، ئاه، گوێبگرە، گوێبگرە تۆ هیچ قسەناکەیت، تێدەگەیت،

تۆ هیچ قسەناکەیت، من هەموو حیکایەتەکە دەگێڕمەوە، تۆ وەک گەمژە زەردەخەنەیەکی گێلانە دەگریت و هەموو شتێک بۆ من جێدەهێڵیت. ئەی چۆن من زمانی ئەمانە دەزانم، ئێستا نازانی چەند خۆشحاڵم کە کچانی پرتەقاڵی سپی نەیانزانی تۆ لەوێ کەوتوویت، ئاه ئەو مەخزەنە چەندە باشە، چەندە باشە... دکتۆر بابەک، دووبارە سەر ئێشەیەکی زۆرم هەیە. دووبارە بە ئاسانی خەوم لێ ناکەوێت، بیرت نەچێت کە تۆ کوڕی پوری منیت، لێرەیت بۆ ئەوەی ببیت بە مۆسیقار، ئەی دکتۆر بابەک حەبەکانم، کەمێک حەبی سەر ئێشەی ترم دەوێت، ڕۆژێکی تەواو بەم دەردو ئێشەوە دێم و دەچم، گێژدەخۆم، ئەمسەرەو سەر دەکەم، بەڵام بیرم نییە حەبەکانم بخۆم. من خراپترین نەخۆشی دونیام لەبەردەست خراپترین دکتۆری دونیادا، هەروادەبێت... ئێمە لە خراپترین ڕۆژگاری دونیادا لە خراپترین مەملەکەتی دونیادا دەژین، دەتەوێت چۆن دەرچین، ها... چۆن؟. دڵی من بیرت نەچێت کە ئاگات لە خۆت بێت. زۆر ئاگات لە خۆت بێت، خەفەتی ترم نەدەیتێ، تۆ نازانیت چەندە خەفەتت دامێ».

لەبەردەرگای ژوورەکەدا وەستاو و بە جۆرە دەنگێکی تر گووتی «تۆ شاهیدیت، تۆ تەنیا شاهیدی زیندوویت، لەهەر جێگایەک بتبینن دەتکوژن».

وای گووت و لە دەرگای ژوورەکە چووەدەرێ و بێماڵاوایی ڕۆی، ئەو کچێک بوو هەرگیز ماڵاوایی نەدەکرد، هەڵدەستاو دەڕۆی. من هەرگیز نەمبینی بۆ جارێکیش چییە خودا حافیزیبکات، کە لێمدەپرسی بۆ خوداحافیزی ناکەیت، بە پەنجە ناسکەکانی چەناگەی دەگرتم و دەیگووت «بۆ خوداحافیزی بکەم، گوڵی گوڵ، بۆ هەر کوێ بچم هەر دێمەوە بۆلات».

ئەو ڕۆژە من و دکتۆر بابەک بە تەنیا لە ژوورەکەدا ماینەوە. دکتۆر بابەک تەماشای منی کردو گووتی: «کوڕە بریندارەکەم، ئەمەیە دالیا سیراجەدین، ئەمەیە. من ناتوانم وەسفیبکەم هیچ قەڵەمێکیش ناتوانێت وەسفیبکات. هەندێجار لە شێتێک دەچێت ئێستا لە شێتخانە ڕایکردبێت،

هەندێجاریش لە فەیلەسوفێک دەچێت شەووڕۆژ نوقمی بیرکردنەوە بێت».
دکتۆر بابەک دەبوایە جارێکی تر ئەو شتانەم بۆ کۆبکاتەوە کە دالیا بەو جۆرە باسیکرد. یەکێک منی بەرەو ئەو ژێر زەمینە بردبوو، کێ؟ نازانم. ئاخۆ فریشتەکانی دالیا بوون یاخود دەستێکی نەناسراوی تر؟ ئەویش نازانم. بە هەرحاڵ لە عەسرێکی درەنگدا من بە زامدارییەکی سەختەوە لەو ژێر زەمینەدا بووم. من تاکە زیندوویەک بووم لە قەسابخانەیەکی گەورە دەرچووبووم، تاکە زیندوویەک بووم لە ناو دەیان هەزار قوربانیدا ڕزگارم بووبوو. دکتۆر دەیزانی چی ڕوودەدات و من نەمدەزانی، دالیا سیراجەدین دەیزانی چی لە بیابانەکان و دەڤەری چۆڵی ئەو هەرێمەدا ڕوودەدات و من نەمدەزانی، من قوربانییەکی بچوک و نەفام بووم کە نەیدەزانی لە کوێداو بۆچی و لەگەڵ کێدا دەمرێت. دواجار لە ژێر زەمینێکی فەرامۆشکراودا، دوای چەندین ڕۆژ بێهۆشی وریادەبوومەوە، دکتۆرێکی دەربەدەر و تەنیا لە خۆڵی زەردی شارێکی ئەفسانەییدا منی ڕزگاردەکرد، ئێستاش دەبایە ببم بە کوڕی پوری دالیا سیراجەدین کەئەویش بێکەسێکی تری ئەم سەرزەمینەبوو. ئەوەی ئەو کات تێینەگەیشتم ئەوەبوو چۆن دالیا سیراجەدین دەزانێت من دەتوانم مۆسیقا لێبدەم؟

ئەو ڕۆژە دکتۆر موسا دەستی خستە سەر دەستم و گووتی. بۆ ئەوەی نەترسیت، بۆئەوەی دڵنیابیت کە من هاوڕێی تۆم، نهێنییەکت پێدەڵێم کە هیچ کەسی تر نایزانێت، تەنیا تۆ و دالیا سیراجەدین دەیزانن. وایگووت و دەستی گرتم و بەرەو ژوورێکی دیکەی بردم کە یەکەم جارم بوو پێی تێبخەم.

## بەشی سێهەم

ئەو جیهانەی موسای بابەک نیشانیدام، هەمیشە لە خەیاڵمدایە، ساڵەهای ساڵ نهێنییەکەیم پاراست و لەگەڵ خۆمدا گێڕام، بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەو جیهانە بوو بە بەشێک لە من و من بووم بە بەشێک لەو جیهانە. موسای بابەک بیست و پێنج ساڵ بەر لە هاتنی من لەوێ دەژیا، وەک ئەوەی لە ئاسمانەوە ناردبێتیان کۆمەک بە دروستبوون و گەورەبوونی ئەو ئاوەدانییە بکات. بوونی ئەو لەوێدا وێنەی جێگایەکی ڕاستەقینەی دابوو بە شوێنێک هیچ کەس ئامادە نەبوو وەک شوێن تەماشاییبکات. زەمانێک کە دکتۆر بابەک دەگاتە ئەوێ، کوڕێکی گەنجە تازە لە «پەیمانگای شاهانەی بەریتانی» پزیشکی خوێندووەو گەڕاوەتەوە بۆ نیشتیمان. پیاوێکە نیوە کۆمۆنیست، نیوە بۆرژوا، نیوە ئیماندار، واتە شتێک لە هەستی سۆسیالیستی، شتێک لە شانازی و غروری بۆرژوایانەو شتێکیش لە دڵەڕاوکێی دینی تێدایە. کە دەگاتە ئەو دەڤەرە جگە لە جانتایەکی چکۆلانە زیاتر هیچی تری پێ نییە، لە بنکەیەکی تەندروستی بچوک و خاڵیدا نیشتەجێ دەبێت، ئیشی ئەوەیە نەخۆشەکانی ئەو دەوروبەرە تیماربکات، ڕۆشنبیرییەکی گشتیش دەرهەق بەو نەخۆشیانە بڵاوبکاتەوە کە بە هۆی گەرماو ئاوی پیس و جووتبوونی جنسییەوە بڵاودەبنەوە. کوڕی ملیۆنێرێکی کوردە کە هەمیشە لە پایتەخت ژیاوە و لە ژێر دەسەڵات و ڕەحمەتی باوکیدا گەورەبووە، تا دەگاتە زانکۆ بە کوردییەکی تێکشکاو قسەدەکات، لە منداڵییەوە فێربووە بەو کوردییە شکاوە لەگەڵ خۆیدا بدوێت، چونکە باوکی نەبێت هیچ مەخلوقێکی دیکەی نەبینیوە ئەو زمانەی ئەو بدوێت، سەردەمانێک پێیوایە کە کوردی زمانێکە باوکی دایهێناوە بۆئەوەی کەس لەو جنێوانە تێنەگات کە دەیخاتە نێو ڕستە عەرەبییەکانییەوە. لە لەندەن بۆ یەکەمجار

یەکێک لە هاوڕێکانی دوو کچی جوان بەڵام دەموچاودرێژی نیشاندەدات و پێیدەڵێت ئەوانە کوردن. کە دەگەڕێتەوە، ئەو خەیاڵە لەسەریایەتی کە کورد نەتەوەیەکە دەموچاویان بە جۆرێکی نائاسایی وەک سەری فیگەری هەندێ لە تابلۆکانی مۆدلیانی درێژە، ئەو وێنەیە لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت و بەرەو باکوور سەفەردەکات، کوردستان لە خەیاڵیدا زەوییەکە مەخلوقگەلێکی لە بابەت وێنەکانی مۆدلیانی ئاوەدانیانکردۆتەوە. هێندەی بەدوای ئەو جوانییە شاردراوەیەدا بەرەو باکوور دەکەوێتە ڕێ بە دوای کورددا ناگەڕێت. ڕۆژی یەکەم لە سەفەرەکەیدا تووشی نائومێدییەکی کوشندە دەبێت. لە جیاتی ئەوەی کۆمەڵێک بوونەوەر ببینێت کە لە فیگەرەکانی مۆدلیانی دەچن، خەڵکێک دەبینێت پتر لە مەخلوقاتە برسییەکانی برۆگل و پەتاتەخۆرەکانی ڤان گۆخ دەچن. بۆ ئەوەی ئەو وێنەیەی لا نەشێوێت، کۆمەڵێک کتێبی کوردی دەکڕێت و بەپەلە دەگەڕێتەوە بۆ پایتەخت. لەوێ لە خەستەخانەیەکدا دەبێتە پزیشک، بەردەوام لە ناو پزیشک و برینپێچ و سستەرەکاندا باس لە ڕۆڵی هونەر دەکات لەسەر پاشەڕۆژی مرۆڤ، لە قسەکانیدا بە جۆرێکی سەیر گەورەیی کۆمۆنیزم و گەورەیی خودا تێکەڵاودەکات، بەڵام وەک کۆمۆنیست یان زاهید ناژی، بەڵکو پتر وەک بۆرژوایەک دەژی کە لە ئاهەنگ و گەلەریی و ئێوارە شیعرییەکاندا بە ملێکی باریک و بۆینباخێکی درێژو قژێکی کورتەوە کە هێدی هێدی بەرەو ڕووتانەوە دەڕوات دەردەکەوێت. سامانێکی مەزنی لە بندەستدایە تەنیا لە یەک شتدا سەرفیدەکات، کڕینی تابلۆی سەیر سەیر کە کۆیاندەکاتەوە تا ڕۆژێک مۆزەخانەیەکی هونەریی تایبەت دابمەزرێنێت بە ناوی مۆزەخانەی بابەکەوە. ئارەزووی هەرە گەورەی کۆکردنەوەی پەیکەری چکۆلەو تابلۆی نوێ و ئیشی دەستە. پەیوەندییەکی هێمن و دۆستانەی لەگەڵ هونەرمەندە شێوەکارەکاندا دروستدەکات، لەگەڵ هەر یەکێکیاندا جۆرە پەیوەندییەکی هەیە کە کەسی دیکە لە وردەکارییەکانی نازانێت. کە کودیتای شوبات

ڕوودەدات، لە دوای یازدە سەعات لە کوشتنی «قاسم» پاسەوانە ناسیونالیستەکان کە میلیشیایەکی دڕندەی کودیتاچییەکانن، دەدەن بە سەر ماڵەکەیدا، تابلۆکانی دەسوتێنن، پەیکەرەکانی دەشکێنن، خۆشی ڕەوانەی زیندانێکی گەورەدەکەن کە پڕە لە شاعیرو شێوەکارو مۆسیقار. هەموویان بە تۆمەتی کۆمۆنیزم گیراون و هەموویان چی دەستنوس و تابلۆو ئامێریان هەیە سووتێنراوە، دکتۆر بابەک لە ناویاندا هەندێک لە هاوڕێکانی خۆی دەناسێتەوە. میلیشیا فاشیستەکان کە بڕیاریانداوە پایتەخت لە کۆمۆنیزم پاکبکەنەوە شەوی یەکەم لە هەمان ئەو قاوشەدا کە ئەو تیا دیلە سی و سێ کەس تیربارانەکەن، هەندێکیان هاوڕێی ئەو دکتۆرە کورتەبنە مل باریکەن کە لە زیندانیش کراسێکی سپی و بۆینباخێکی زۆر درێژی لە ملدایە، دکتۆر بابەک لە لیستی دووهەمدایە کە دەبێت دەمەو بەیان تیربارانبکرێت. بەڵام موعجیزەیەک کە عادەتەن تووشی دکتۆرەکان دێت و لە ژیانی زۆر لە پزیشکەکاندا دووبارەدەبێتەوە، موسای بابەک لە مردن ڕزگاردەکات. ئەویش بریندار‌بوونی منداڵی یەکێک لە پاسەوانەکانە لە پێکدادانێکی لابەلایی سەرشەقامەکانی پایتەختدا، منداڵێک ناوی «عەواد ڕیکابییە» کوڕی یەکێک لە سەرکردە خوێنڕێژەکانی کودێتایە. تەمەنی یازدەساڵەو باوکی بردویێتی تا لە منداڵییەوە فێری ڕاوکردنی کۆمۆنیستەکانی بکات، لە پێکدادانەکاندا گوللەیەک بەر قاچی دەکەوێت و گوللەیەکی دی لە شانییەوە بەرەو شوێنێکی نادیار لە سینەیدا دەیبڕێت. باوکی دەیەوێت ڕزگاریبکات، بەڵام خەستەخانەکان زۆری داخراون، ئەوانەشی کە کراونەتەوە بێ دکتۆرن. باوکی کە دەبینێت منداڵەکەی دەمرێت، هیچ چارەیەکی نییە جگە لەوەی لە نێو زیندانەکاندا دکتۆرێک بدۆزێتەوە، کوڕەکەی بۆ زیندووبکاتەوە. دوو سەعات بەر لە تیربارانکردنی دەستەی دووەم، پاسەوانەکان دکتۆر بابەک بانگدەکەن و لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن، سەرەتا دکتۆر پێیوایە بۆ کوشتنی دەبەن، چەند جارێک شایەتومان

دەهێنێت و داوای لێبوردن لە گوناهەکانی خۆی لە خودا دەکات، بەلام کە سوار ماشێنێکی دەکەن و بە خێراییەکی شێتانە بە شەقامە خالی و تاریک و پێچاوپێچەکانی پایتەختدا، کە نە کارەباو نەڕوناکی خودا تیایاندا نادرەوشێتەوە دەیفڕێنن، تێدەگات بۆ سەر برینداریکی دەبەن کە ژیان و مردنی ئەم بە ژیان و مردنی ئەوەوە گرێدراوە. دکتۆر بابەک کە منداڵەکە لە مردن ڕزگاردەکات، خەلاتی ئەوەیە بە دوو پاسەوانی فاشی دەیگەیێننەوە ماڵەوەو پێیدەڵێن : پیرۆز، ئەمجارە نامریت. لە پشتەوە دەرگاکەی لەسەر دادەخەن و پێیدەڵێن: دکتۆر باش بخەوە، مەیەرە دەرێ، ئەگەرچی کۆمۆنیستەکان هەموو کوڕی قەحبەن، بەلام تۆ ئاگات لە خۆت بێت، لەوانەیە هەر ئەمشەو پێویستمان پێت بێتەوە. دکتۆر دەبینێت ماڵەکەی وێرانکراوە، چی تابلۆو پەیکەرێک لەو ماوەیەدا کۆیکردۆتەوە هەموویان شکاون، ئەرشیفە تایبەتییەکەی خۆی سووتێنراوە، کەمانچەو چەلۆو ئۆکۆردیۆنەکەی شکاون، دەیەها کاری هونەری قەشەنگ میزیان بەسەردا کراوە، قوونی بۆگەنیان بە جانفازی تابلۆکان پاکردۆتەوە. دکتۆر دەزانێت، ئەوە یەکەمجار و دواهەمین جار نابێت بەعسییەکان گوو بەسەر هونەردا دەکەن. ئەوشەوە دکتۆر ناخەوێت، بەسەر یادگارە شیرین و جوانەکانیدا دەگری، بەسەر یادی ئەو هاوڕێیانەدا کە لە ژوورەکەدا لەگەڵیدا بوون و ئێستا لە ژێر خاکدان، دەزانێت ئەو ولاتە ئافەتێکی ترسناک ڕووی تێکردوە، ئافەتێک ڕیشەکان و مێژووی لەو شەوە کۆنترە، داهاتووو پاشەڕۆژیشی لەو شەوە درێژترە. دکتۆر موسا هەر ئەوشەوە بڕیاردەدات کە مەنفایەکی دوور بۆ خۆی هەڵبژێرێت، دوور لە هەموو ئەو جیهانە ترسناکە، دوور لە دڕندەیی فاشییەکان و ترسنۆکی کۆمۆنیستەکان، بەلام نازانێت بچێت بۆ کوێ. نایەوێت بگەڕێتەوە بۆ لەندەن، نایەوێت جارێکی تر ئەم ولاتە جێبهێڵێت، بەلام لەو شەوە بەدواوە ناشیەوێت تیا بژی. سەرەتا دەیەوێت بڕوات بۆ باکوور، بیر لەوەدەکاتەوە پەیوەندیبکات بە شۆڕشگێڕە

کوردەکانەوە لە چیاکان، بەڵام نازانێت ئەوان چۆن پێشوازی لە دکتۆرێک دەکەن کە هیچ شتێک لە خەیاڵیدا نییە ئەوە نەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان مۆزەخانەیەکی هەبێت خەڵکی لەمسەرەو سەری دونیاوە ڕووی تێبکەن. بەڵام دکتۆر دەزانێت لەو تێکچوونە ترسناک و شپرزەیەدا ماوەیەکی زۆری دەوێت تا یەکێکی باوەڕپێکراو دەدۆزێتەوە لە ڕێگایەوە نامە بۆ شۆڕش بنێرێت. خەیاڵی وابوو نامەکەی ڕێگایەکی درێژ دەبڕێت، بە چەندەها چیای بەرزو دەشتی کاکی بە کاکیدا دەڕوات، لەسەدان گوندی سەر ڕێگادا دەوەستێت، قاسید لە دوای قاسید دەیدەنە دەست یەک تا دەگاتە دەست سەرانی هەرە گەورەی شۆڕش، لەوانەیە لە دوورترین و عاسیترین جێگای ناو شاخەکانیشدا بگاتە دەست ئەو پیاوە ئەفسانەییەی کە پێیدەڵێن بەرزانی. ئەو هەفتانەی دوای کودێتا، دکتۆر موسا لە ماڵ نایەتە دەرێ، بە جەهەنەمێکی ڕۆحی و دەرونیدا تێدەپەڕێت، شێوەی نیگاو ڕەفتاری دەگۆڕێت، دوای سێ هەفتە کە بە ڕیشێکی درێژ و سەرێکی تەواو ڕووتاوەو جووتێ چاوی ماندووەوە دێتەدەرێ کەس نایناسێتەوە. دکتۆر موسا بەردەوام لە خەیاڵیدایە نامەیەک بۆ شۆڕش بنوسێت، بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ دوایدەخات، تا دواجار هەرگیز ئەو نامەیە نانێرێت، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەر وەزیفەکەی خۆی، لە یەکێک لە گرنگترین خەستەخانەکانی پایتەختدا نوسراوێکی ڕەسمی چاوەڕوانیدەکات، کە فەرمانی گواستنەوەیەتی بۆ جێگایەک لەوبەری فورات، قووڵ لە باشووری دووردا، بۆ جێگایەک ناوی «بنکەی سەرپەرشتی و پاراستنی تەندروستییە بۆ خۆرئاوای فورات». بنکەیەکە لە ناو ئاوەدانییەکی تۆزاوی ناو بیابانِدا خەوتووە، بایەکی ساردی زستانە تێیئالاوە، بایەکە دکتۆر موسا لە شەوە هەرە ساردەکانی لەندەنیشدا هەستی پێنەکردوە... لەوێ فەرمانبەرێکی ڕەشی گەورە، بە دەنگی سەرۆک خێڵێکی عەرەبی ناو بیابانەوە، لە ژوورێکی داڕوخاودا پێشوازی لێدەکات و پێیدەڵێت «غەم مەخۆ هاوڕێم، تۆ یەکەم

دکتۆر نیت لە پایتەخت دووریان خستبێتەوە. فەرمانەکە وایە بتدەم بە مستەوسەفێکی تازە، کە دەبێت خۆت دایبمەزرێنیت، لە جێگایەکی بێناودایە، لە شوێنێکدایە بە ئوتومبیل چەند سەعاتێک لێرەوە دوورە، هێندەی شۆفێرەکەمان هاتەوە دەتنێرم، ئەو لە هەر کەس باشتر دەزانێ دەکەوێتە کوێوە... ڕاستت دەوێت، جێگایەکە لەسەر نەخشە نییە، شوێنێکە هەندێ دەڵە بەدەویی و سەماچی قەرەج و ژنانی نێرخۆری سەحرا دروستیانکردوە. شوێن نییە، عەزیزم شوێن نییە، بە هەرحاڵ دکتۆر هیوادارم خۆش لە جەنابتان بگوزەرێت، ئەگەر ئارەزووتان لە کەیف بێت شوێنێکی خراپ نییە، تۆ کۆمۆنیستی وانییە؟ هاوڕێم لە بەینی خۆماندا بێت، کۆمۆنیستەکانی ئەم وڵاتە کوشتەی ژنن، ئەها دەردێکە پێدەچێت لەگەڵ کتێبەکانی لینیندا چووبێتە خوێنیانەوە، من جێگاکە بۆ دکتۆرێکی کۆمۆنیست بە شوێنێکی خراپ نازانم. بمبورە ئاوا بەرەو ڕوو قسەدەکەم، یەعنی چاوم لە چاوتدایەو هەموو شتێک دەڵێم، بەڵام من خۆم لە حیزبدا بووم ئاگاداربووم شتەکان چۆن دەڕوات. کێ هەیە لە حیزبدا نەبووبێت؟ بەڵام بەڕێز لەوەگەڕێ، ئیشی ئێوە ئەوەیە جگە لە دەرمان و پشکنین و تیمارکردنی ئاسایی کەمێک فێری خۆپاراستنیشیان بکەن. دکتۆر دەزانیت خۆپاراستن چەند گرنگە؟». دکتۆر موسا کە لەوە ماندووترە ئارەزووی هیچ گفتوگۆو قسەیەکی هەبێت، بێئەوەی وەڵامی ئەو پیاوە بداتەوە داوای لێدەکات بواریبدات تا شۆفێرەکە دێتەوە، لەبەر دەگای ژوورەکە لە ساڵۆنەکەداو لە بەر یەکێک لە پەنجەرەکاندا چاوەڕوانبکات. دکتۆر بە خۆی و جانتایەکی چکۆلانەوە لەسەر کورسییەکی ڕەق دادەنیشێت و چەندین سەعات لە پەنجەرەکەوە سەیری ئەو ئاسمانە سوورە دەکات کە یەکێک لە تابلۆکانی ئێدوارد مۆنشی بەیادا دەهێنێتەوە کە ڕۆژێک لە یەکێک لە پێشانگا گەڕۆکەکاندا بینیبووی. بۆنێکی سەیریش کە بۆنی ئالودەبوونی فوراتە بە گڵ و خۆڵ و بەردی دەیەها چیای دوور، لە جەستەی هەموو ئەو نەخۆش و فەرمانبەرانە دێت

کە بەردەوام خۆیان دەکەن بە ژووردا و دەڕۆنە دەرێ. دکتۆر موسا ئەو ڕۆژە لە بەر ئەو پەنجەرەیەدا بۆیەکەمجار لە هەموو ژیانیدا هەست بە تەنهاییەکی قووڵ و بێبن دەکات، هەستدەکات هیچ شتێکی نییە بۆی بژی. هیچ یەک لە کەسوکاری خۆی ناناسێت، هەستناکات هیچ یەک لە هاوڕێ کچەکانیشی بەقووڵی و ڕاستی خۆشیانویستووە. کەسێکی نەبوو لە دوای بگری، کەسێکیش نەبوو ئەم حەسرەتی بۆ بخوات. پێشی وابوو تا ئەمڕۆ چی ژیانێک لەو شارە گەورانەدا ژیاوە هەمووی بە هەدەر ڕۆیشتووە. ئەو دیمەنە تاڵ و غەمگینەی ئاسمان وەک ئاوێنەیەکی چکۆلە بۆ ژیان و تەنهایی خۆی دەبینێت. ئێستاش ئەوەتا چاوەڕوانی ماشێنێک دەکات هەڵیگرێت و بیبات بەرەو شوێنێکی نادیار لەوبەری فورات.

ئەو پیاوێکی بێچارە نەبوو، سامانێکی هێند زۆری هەبوو بەشی ئەوەی دەکرد بێئەوەی کاربکات هەموو ژیانی شادومان بژی. بەڵام دواجار دەیویست لەو کۆدیتاچییە درندانە ڕابکات کە وڵاتیان کۆڕیبووە حەوزێکی گەورەی خوێن، لە دەست ئەو بێمانابییە گەورەیەی ژیانیش هەڵبێت کە تائەوکاتە قووڵ لە گێژەنەکانیدا ونبووبوو.

کە دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتە ئەو دەڤەرە، لە کۆمەڵە دەوارێکی کۆچەریی و چەند خانووییەکی داڕوخاو بەولاوە هیچی تری نەبینی. ماڵەکان هەموو تاریک و ڕووت و چکۆلانەبوون، کچێکی منداڵ بە لایتێکەوە پێشوازیکردو بەرەو ماڵی خۆیان پێشیکەوت. هیچ شتێک لەو گوندەدا نەبوو، نە درەخت، نە شەقام، نە ڕوناکی، بەڵام لە یەکەم شەوەوە هەستیکرد لەوێ دوو شت زۆر باو و بەر بڵاون، نەخۆشی و تەنهایی. دکتۆر موساش سەروکارێکی درێژی لەگەڵ هەردووکیاندا هەبوو. هەر لەیەکەم شەوەوە هەستیکرد ئەوێ ئەو زەمینە دێرین و ونەیە کە ئەو لە منداڵییەوە بۆی دەگەڕێت. پێدەچێت زۆر زوو ئەو بڕیارەی دابێت لەوێ بژی، لە ماوەیەکی کورتدا خانوویەکی چکۆلانە بۆ خۆی دروستدەکات، کە

ساڵ دوای ساڵ نەخشـەکەی و ڕووبەرەکەی دەگۆڕێت، بەڵام هەر لە بناغەی یەکەمجارییـەوە، بیر لـەو پـڕۆژە خەیاڵییـە دەکاتـەوە کـە دەیەوێت زیندەگی خۆی بۆ تەرخانبکات. لـە یەکـەم پاچی بناغەکەیـەوە بیری لای ئەوەیـە چۆن بیکاتـە مۆزەخانەیەکی نـاوازەو گـەورە، بـەڵام مۆزەخانەیەکی نهێنی، تـا هـەر کارێکی هونـەری کـە لەسـەر زەوی جێگایەکی ئەمین و سـەلامەت نادۆزێتەوە لـەوێ لـەو مۆزەخانـە سـەیرەی ئـەودا جێگای ببێتـەوە. دکتـۆر موسـا لەگـەڵ بناغـەی خانووەکەدا، دەرگای سـەردابێکی نهێنی دادەمەزرێنێت کـە جگـە لـە خۆی هیچ کەسێکی دی دەروازەکەی نازانێت، لەوسەریشـەوە ئەو دەرگایە لە نـاو زنجیرەیـەک ژووری بـە نێو یەکچوودا بـە جۆرێک وندەکات دۆزینـەوەی ئەسـتەم بێـت. کـە بڕیـاردەدات لـەو دەڤـەرە دوورەدا بمێنێتـەوە، سـوێندیش دەخوات تۆڕێکی گـەورە و نهێنـی دروسـتبکات کـە لـە مسـەرەو سـەری وڵاتدا تابلـۆ، پەیکـەرو کاری هونـەری بـۆ کۆبکەنـەوە. لـە شـەش مانگـی یەکەمـی ئیشـکردنیدا تەنیـا بیـر لـە هەندەسـەی ئاڵـۆزی ئـەو ماڵـە دەکاتـەوە، دەیەوێت پتـر لـە عیادەی دکتۆرێکی غەمگیـن بچێت کـە قـەدەر فڕێیداوەتـە باشـووری خۆرئـاوای فوراتـەوە. چەنـد ژوورێـک بـۆ کتێبخانەیەکی گـەورە جێدەهێڵێت، کـە پڕیاندەکات لـە کتێبی بایۆلـۆژی و پزیشـکی. هەفتانـە سـەفەری پایتەخـت دەکات، سـەفەری بەنـدەرە بچوکەکانـی باشـوور دەکات، هەندێجـار دەپەڕێتەوە بـۆ کوێـت و میرنشـینەکانی لـم و مرواری لـە ڕۆخـی کەنداودا. سـەرەتا تەنیا جیهانـی سـەرەوەی ماڵەکـەی دروسـتدەکات، تەنیـا ژوورەکان، ڕاڕەوەکان، ژووری پشـکنین، ژووری خـەوتنی نەخـۆش، کـە لەسـەفەرەکانی دەگەڕێتـەوە هەمـوو جارێک ژمارەیەکی گـەورە کتێبی هەمەڕەنگی ئینگلیزی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. لـە ڕێگای ئـەو ناسـیاوانەوە کـە لـە پایتەخـت دەیانبینـی، خەتێکی چکۆلانـەش دروسـتدەکات لەوێـوە کتێـب و بڵاوکـراوەی کـوردی بـۆ دێـت، کـە لـە بـەر هـەر هۆیـەک بێـت، دکتـۆر حـەزدەکات ئـەو زمانـە بـە جۆرێـک فێربێـت، بتوانێـت تێکسـتە نهێنییەکانـی خـۆی پـێ بنوسـێت. لـەو زەمانـەدا

کە کتێبی کوردی کالآیەکی دەگمەنە، دکتۆر موسای بابەک لەو سەحرا دوورەدا سەدان کتێبی ناوازەو دەگمەن کۆدەکاتەوە کە دواتر دەزانێت ئەو تاکە کەسێکە توانیوێتی بیانپارێزێت. دەبێت بڵێم کتێب ئارەزووی هەرە گەورەی دکتۆر بابەک نییە، ئەو هێندەی شێتی کاری شێوەکارو گوێگرتنە لە مۆسیقا شەیدای کتێب نییە، کە پێیوایە هەندێجار بۆ ماوەیەکی درێژ مرۆڤ سەرقاڵدەکات و کەم جاریش سوودێکی ڕاستەقینەی هەیە. لە هەر شت گرنگتر لە دونیادا لەلای کتێبی پزیشکی و بایۆلۆژی بوو، کە لە هەموو شتێکی تر قووڵتر هەندەسەی ئەم بوونەوەرە تەنهایە شیدەکەنەوە کە دەتوانێت لەیەککاتدا لە بیابان و سەرشاخ و بنی زەریاشدا هەڵبکات. یەکەمجار دالیا سیراجەدین ڕۆمانێکی ڕۆدیارد کیپلینگی پێشکەشدەکات و لەوێوە حەز لە خوێندنەوەی ڕۆمان دەکات، پێشتر ئارەزوویەکی ئەوتۆی نییە ئینگلیزییەکەی خۆی لە خوێندنەوەی تێکستی ئەدەبیدا خەساربکات، دواتریش هەر ڕای وایە، تاکە ڕۆمانی ڕاستەقینە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا «ئەسڵی ژانرەکان» ی داروینە. بەڵام دکتۆر ڕایەکی تەواو جیاوازی لەسەر هونەری شێوەکار هەبوو. تابلۆ شتێکی دیکەیە، یەکەیەکی تەواوەتییە، مرۆڤ بەر لەوەی بە عەقڵ چێژیبکات دەبێت بە هەستەوەرەکانی دیکەی هەڵیبسەنگێنێت. وەک تێکستیش نییە هێدی هێدی و پارچە پارچە مرۆڤ لە ماناکەی نزیکببێتەوە، بەڵکو هەمووی بەیەکجار لە پێشدەمتدایە، جیهانێکە هەموو دوورییە ڕاستەقینەو مەجازییەکانی پێکەوە لەبەردەم مرۆڤدایە. هەناسەیەکی هونەرمەندەکەیە، شتێکە بە جێ پەنجەو جێ ڕۆحی ئەوەوە ڕاستەوخۆ دێتە بەردەممان، هەموو تابلۆیەک شتێکی ناوازەو یەک دانەیە، هیچ کۆپییەک شوێنی تابلۆ ڕاستەقینەکە ناگرێتەوە، مرۆڤ دەتوانێت شیعرێک لە یادەوەریدا هەڵگرێت، چیرۆکێک دەماو دەم بگوازێتەوە، بەڵام تابلۆیەک جگە لە خۆی هیچ جێگایەکی تری نییە بۆ ژیان، کە فەوتا ئیدی دروست نابێتەوە. تابلۆ تاکە شتێکی هونەرییە کە لە تەنهایی و ناوازەییدا

وەک تەنهایی و ناوازەیی مرۆڤ وایە. پاراستنی تابلۆیەک وەک پاراستنی مرۆڤێک وەهایە لە کارەسات، ڕزگارکردنی پەیکەرێک وەک ڕزگارکردنی ژیانێک وایە لە مردن.

دکتۆر موسای بابەک دوای تەواوکردنی خانووەکەی، دوای دروستکردنی بۆ پێچاوپێچێکی ئاڵۆز لە ژوورو کتێبخانە، لە قاوشی نەخۆش و لابووری پشکنین، لە شوێنی حەوانەوەو شوێنی تایبەتی خۆی، لە یەکێک لە ژوورەکاندا، لە بن یەکێک لە قەرەوێڵەکانەوە دەرگایەکی تایبەتی دەکاتەوە، دەرگایەک بەرەو مۆزەخانەی خەونەکانی ئەو دەچێت.

ئەو ڕۆژە کە دەستی منی گرت و بەرەو ژوورێکی تازەو نەناسراو بردمی، هێشتا شتێکی ئەوتۆم لە ئەندازەی ئاڵۆزو پێچاوپێچی ئەو ماڵە نەدەزانی، ژوورەکانی دی، لە ماڵێکی خاڵی دەچوون کە خاوەنەکەی دوای پاکردنەوەو ڕێکخستنێکی وردو بە سەلیقە جێیهێشتبن، تابلێی خاوێن و بریقەداربوون، بێدەنگ و ڕوناک. ئەگەرچی زۆربەی پەنجەرەکان بە پەردەی سپی ئەستوور داپۆشرابوون، بەڵام تیشکێکی نهێنی لە هەموو جێگایەک بوو. پێدەچوو ئەو ژوورانە لە دەرەوەی زەمەن بن، هیچ جۆرە دەنگێک لە دەرەوە نە دەگەیشتنە ئەوێ... هێمنییەکی سەرسوڕهێنەر، بێدەنگییەکی قووڵتر لە بێدەنگی شەو لەوێ بوو. هەموو شتێک لەو ژوورانەدا سپی بوو، لە هەندێ جێگادا دەیان قەرەوێڵەی ئامادەم دەبینی، وەک ئەوەی بۆ شەڕێکی نادیار ئامادەکرابن، بۆ کارەساتێک کە دکتۆر چاوەڕوانیدەکرد، ژوور لە دوای ژوور، قاوشی خاڵی لە دوای قاوشی خاڵی. وەک ئەوەبوو ئەو پیاوە ساڵەهای ساڵ خۆی بۆ کارەساتێک ئامادەبکات و بیەوێت لەوێوە لەو قاوشانەوە دوا کۆمەک بە مرۆڤەکانی تر بکات.

ئەو ڕۆژە بەر لەوەی بمباتە ئەو ژێر زەمینەوە، لەسەر کورسییەک دایناو و خۆشی بەرابەرم دانیشت و پێیگووتم «جەلادەتی کۆتر، گوێبگرە، ئەوەی ئێستا بۆ تۆی دەگێڕمەوە، شتێکی کەم نییە، یارییەک نییە پیاوێکی

پیر لەگەڵ ژیاندا بیکات، ئەوەی دەیبینیت گەورەترین نهێنی ژیانی منە. من تەنها لە بەر وەڕزی و تیمارکردنی ئەم ئافرەتە بەستەزمانانە لەم زۆنگاو و سەحرایەدا خۆم وننەکردوە، بەڵکو لە بەرئەوەی ئەم جێگایە تەنیا جێگایەکە دەتوانم ئەم خەونەی تیا بهێنمەدی. گوێبگرە کوڕی بریندارم، من هەمیشە حەزم لە وێنەو نیگار کردوە، هەمیشە.... بەڵام شتێک کە وای لێکردم ئەم جیهانە دروستبکەم، ترس بوو لە مردن، ترس بوو لەو هێزە ڕەشەی دیکتاتۆرەکان لە مرۆڤدا زیندوویدەکەنەوە، ئەو هێزەی هەموو شتێک لە ناوماندا دەکوژێت، لە هەستکردن بە خۆمانەوە تا هەستکردن بە ئادەمیزادەکانی تر. خۆم ئەوەم هەڵبژارد لێرە بژیم، هەر ساتێک بمویستایە دەمتوانی بڕۆم، بەڵام خۆم ئەم جێگا چەپەک و دوورەم هەڵبژارد. ویستم لێرەوە، لەم کونجەی دونیاوە ڕوداوەکان ببینم. لە ساتێکدا هستمکرد ئیشی من تەنیا ئەوە نییە ژیانی ئینسانەکان ڕزگاربکەم، ئیشی من تەنیا ئەوە نییە نەهێڵم بمرن، بەڵکو ئیشی من ئەوەیە نەهێڵم شتێک هەیە بکوژرێت. جەلادەت گەرداوێکی تاریک هەیە ژیان و جوانیمان لەگەڵ خۆیدا دەبات، یادگارییەکانمان، ئەرشیفە نهێنییەکانی خۆشەویستیمان، ئەلبومە بچوکەکانمان، سندوقی تاریکی یادەوریمان، ئەوەی دەست و ئەوەی ڕۆحمان دروستیدەکات. جەلادەتی بریندارم، من لێرەوە، لەم ماڵی جاڵجاڵۆکەیەی خۆمەوە، لەم شوێنەدا دەبایە وەک پیاوێک کە لە گەردەلولدا دەوەستێت و هەوڵدەدات هەندێک شت بگرێتەوە کە با دەیانبات، وەک مەلەوانێک کە لە لافاوێکی پڕ لە زێڕدا دەستدەبات هەندێ خشڵ ڕزگاربکات، ئاوەها بوەستامایەو هەندێ شتم ڕزگاربکردایە. هەموو خەڵک تەنیا لە خەیاڵی ڕزگارکردنی خۆیاندا بوون. من دکتۆرەکانم بینی، تەماشای ژیان دەکەن با دەیبات و هیچ ناڵێن. ئەندازیارەکانم بینی، کۆشکەکانیان دەڕوخێن و با پاشماوەکانیان دەبات و هیچ ناڵێن، هەموو لە خەیاڵی ڕزگارکردنی خۆیاندا بوون. جەلادەتی کوڕی من، ئەو ڕەشەبایە خەڵکی فێردەکات تەنیا بیر

لـه خۆیـان بکەنـەوه، تەنیـا فریـای ئـەوه بکـەون ژیانـی خۆیـان ڕزگاربکـەن، کاتێکیان نەبێت دەستبەرن و هاوڕێکانیان له ئاگر دەربهێنین، ئیشه جوانەکانی خۆیـان ڕزگاربکـەن. مـن نوسـەرەکانم بینـی، کتێبەکانیـان بـا دەیبـات و بێبـاک تەماشـایاندەکرد. نیگارکێشـەکانم بینـی، تابلـۆو ڕەنـگ و فڵچەکانیـان بـا دەیبـات و دەوەسـتن لـه بـادا تەماشـایدەکەن. کـەس نەیدەتوانـی جگـه لـه ژیانـی خـۆی هیچـی تـر ڕزگاربـکات، مـن هاتمـه ئـەم جێگا دووره، هاتمـه ئـەم کونجـه کـه هەستدەکەم کەمتر لـه هـەر جێگایـەک گـەرداو دەیگرێتەوه، لێرەدا له ڕەشـەبادا وەسـتام، سـەیرمکه، وەک پیرەمێردێکـی پەککەوتـه و دکتۆرێکـی خـەرەفـاو تەماشـاممەکه، مـن بیسـت و پێـنج سـاڵه بـەم بـاڵا کـورت و چـاوه ماندووانـەی خۆمـەوه وەسـتاوم و شـت دەگرمـەوه، هەناسـەی بـا بـردووی مرۆڤـەکان، خەیاڵـی لەدەسـتچووی ئادەمیـزاد... جـەلادەت مـن لێـرەدا وەک ڕاوکەرێـک، وەک تۆڕەوانێک کـه لـه بـادا تـۆڕی خـۆی هەڵـدەدات، تـۆڕی خـۆم هەڵـدەدەم و شـت دەگرمـەوه، وەک خودایەکـی چکۆلانـەی گریکـی، دەسـتەکانم بـه بـادا درێـژ دەکـەم و نیـگاری بابـردوو، مێژووی کـوژراو دەگرمـەوه، ئـەوه تەنیـا ڕێگاو شـێوەی شـەڕی منـه لەگـەڵ ژیانـدا، وەک یەکێـک لـه پشـتی بەرەیەکـی دوورو درێـژی جەنگـەوه وەسـتابێت و ئـەو شـتانه لـه هـەوادا بگرێتـەوه کـه لـه جەنگاوەران دەربازدەبێت. ئا، جەلادەتی کۆتـر مـن پیرەمێردێکـی ئـاوا شـێتم.. جەلادەتی کۆتـر، مـن گەورەترین شـێتی ئـەم مەملەکەتـەم، بیسـت و پێنج سـاڵ لـه مەوبـەر، هێشـتا تـۆ لـه دایـک نەبووبوویـت، دوای کۆدێتـای شـوبات، مـن شـتێکی ترسـناکم بەسـەرهات... شـتێکی ترسـناک، ئەوه وای لێکردم بڕیاربدەم ژیانـی خـۆم بـۆ شـتێک تەرخانبکـەم کـه کەسـی دی بیـری لـێ نەکردۆتـەوه، ئـەوه منـی کـرد بـەم شـێتەی ئەمـڕۆ».

دکتـۆر موسـای بابـەک هەمـوو ئـەو چیرۆکەی بۆ گێڕامەوه، له چرکەسـاتی گرتنییـەوه تـا هاتنـی بـەرەو باشـووری خۆرئـاوای فـورات. باسـی ئـەو قۆناغـه جیاوازانـەی بـۆ کـردم کـه ئـەم خانـووەی تیـا دروسـتکردوه. لەگـەرمـەی

قسـەکردندا، هەسـتاو قەرەویڵەیەکـی جولانـدو سـەری دەرگایەکـی نهێنـی هەڵدایـەوەو گووتـی «جەلادەتـی کۆتـر، جگـە لـە مـن و دالیـا تـا ئێسـتا هیـچ مەخلوقێکی دی، نەچۆتـە ئەودیـو ئـەو دەرگایـەوە، هیـچ مەخلوقێکی تـر... تـۆ تەنها کەسـێکی دوای ئێمـە پێدەخاتـە ئـەم مۆزەخانەیـەوە، بـاش گوێـم لێبگـرە، ئـەو ڕۆژانـەی تیمارمدەکردیـت، منیـش ئـەو شـەبەنگەم لـە دەورت بینـی، ئـەو شـەبەنگەی کـە دالیـا سـیراجەدین باسـیدەکات. شـەبەنگێک لـە دەوری پێغەمبـەران و پەیامهێنەکانـە. تـۆ ڕۆحێکی بۆئـەوە دروسـتبوویت شـتی گەورە بکەیـت. کاتێـک ئـەو شـەوە دالیـا سـیراجەدین جێیهێشـتین و مـن و تـۆ ماینـەوە، مـن و تـۆ بـە تەنیـا، تـۆ مردبوویـت... مردبوویـت، بـەڵام ڕۆحـت لـەوێ بـوو، شـتێک لـە تـۆ لـە هـەوادا بـوو، شـتێک ئـەو گەردەلوولـە تاریکـە دەیویسـت بیبـات و مـن نەمدەهێشـت، شـتێک ڕەشـەبایەکی ترسـناک لەگـەڵ خۆیدا لرفـی دەدا و مـن بـەم دەسـتە پیرانـەم وەک سـیحربازێک شـەڕم لەگەڵدا دەکرد. مـن تونـد بـە ژیانتـەوە نوسـام، دەمزانـی نابێـت بمریـت. مـن لـە مێـژە بـۆ یەکێـک دەگەڕێـم کلیلـی ئـەم زەمینـەی بدەمـێ. مـن پیـرم، وا سـەیرمەکە، هـەر کاتێـک بمـرم دەمـرم، دەمەوێـت یەکێـک هەبێـت لـەدوای مـن کلیلـی ئـەم زەمینـەی لـە لا بێـت... کلیلـی ئـەم سـەردابەی کـە خەزنـەی نهێنـی ئـەم مەملەکەتەیـە، لێرەدا بەشـێکی گـەورەی ئـەم وڵاتـە خەوتـووە... لێرەدا شـتێک خەوتـووە کـە ڕۆژێـک دەبێـت بێتـەدەرێ... تـا ئەمـڕۆ کەسـێکم نەبینیـوە بتوانـم بیکـەم بـە پاسـەوانی ئـەم نهێنییـە، کـە ئەوشـەوە تـۆم بـەو خوێنـەوە بینـی، تێگەیشـتم ئـەوەی کـە دەتوانێـت نهێنـی ئـەم مۆزەخانەیـە بپارێزێـت، دەبێـت یەکێـک بێـت خـۆی مردنـی بینیبێـت و لـە تاریکسـتانی مەرگـەوە گەڕابێتـەوە، تەنیـا ئـەو کەسـانە دەتوانـن ببـن بـە پاسـەوانی ژیـان کـە مردنیـان بینیـوە».

مـن تـا ئەوکاتـە بـە دروسـتی نەمدەزانـی دەشـێت چـی لـەو سـەردابەدا بێـت، دەشـێت ئـەو پیـرە چ نهێنییەکـی هەڵگرتبێـت، کـە دەرگاکـەی کردەوە مـن

سەردابێکی درێژ و ناکۆتام بینی، سەردابێک یەکەمجار وا دەهاتە بەر چاوم بنی نییە، سەد مەتری یەکەمی جێگایەکی تاریک بوو، شەوەزەنگێکی هێند ترسناک کە دەشێت هەموو کەسێکی نەشارەزا و هیچ نەدیدە بە جۆرێک بتۆقێنێت ڕاستەوخۆ بگەڕێتەوەو بیر لەوە نەکاتەوە بەردەوامبێت. بەلام ئەو دەروازە تاریک و خنکاوە هیچ نەبوو جگە لە دەرگایەکی تر بۆ ترساندن و سەرلێتێکدان، کە دواجار دوای زیاد لەسەد مەتر دەرگایەکی ئاسن هاتە بەردەممان و ئێمەی بردە ناو گەورەترین گالێری ئەم مەملەکەتەوە... لەوێدا من پێمخستە ئەو مۆزەخانە سەیرەوە کە دکتۆر موسای بابەک بیست و پێنج ساڵ بە تەنیا کاری تیاکردبوو.

گەلەرییەکی گەورەبوو، لە هەزاران وێنەو تابلۆ دروست بوو بوو، لە سەدان پەیکەری چکۆلەو نەخش و هەلکۆلین و زەخرەفەی سەر تەختە. لەسەدان کاری مینیتۆر و کۆلاج و گرافیک. سامانێکی بێشومار مەزنی کاری هونەریی کە دکتۆر لە ماوەی بیست و پێنج ساڵدا کۆیکردبوونەوە. کاتێک چووینە ناو ڕاڕاوەکانەوە دکتۆر بە سەرە کەچەڵەکەیەوە تەماشایکردم، کەمێک نائومێدی و غەم لە چاویدا بوو، بەلام بەشی ئەوە نەبوو، ئەو شادی و بەختەوەرییە نهێنی و قووڵەی ناو نیگای داپۆشێت. بە دەنگی پیاوێکی دوو دڵ گووتی: گوێبگرە کوڕم، ئەمە تەنیا دیاری منە، کە دەمرم ئەمە تەنیا شتێکە لە دوام جێدەمێنێت. هەزاران هەزار تابلۆ، کاری ئەو هونەرمەندانەیە کە کەس نایانناسێت، سەیرکە ئەمانە بەهەر هۆیەک بێت نەیانتوانیوە کارەکانیان لە هیچ پێشانگایەکی ئەم دونیایەدا نیشانبدەن، کاری ئەو هونەرمەندانەیە کە کوژراون و دەبوو دوای خۆیان کارەکانیان توڕبدرێت و بفەوتێت، کاری ئەوانەیە جێگایەکیان نەبووە تابلۆکانی خۆیانی تیا بپارێزن. لە هەر جێگایەک تابلۆیەک لە مەترسیدا بوو بێت من لەوێ بووم. من خۆم نا... نا کوڕم، من خۆم نا، من بە تەنیا نەمدەتوانی ئەم هەموو ژیانە ڕزگاربکەم... بەڵێ ژیان... من هەمیشە ناوم ناوە ژیان،

هەموو تابلۆیەک شتێکی زیندووە، لە پشت هەموو نیگارێکەوە ڕۆحێکی زیندوو وەستاوە، یەکێک هەناسەدەدات، من گوێم لە هەناسەکانیانە، سەیرکە جەلادەت، من سێبەری پەنچە غەمگینەکانیان دەبینم کە تا ئێستا لەسەر ئەو وێنانە سەمادەکات. من خۆم نا، من بە تەنیا چیم پێدەکرا، بە تەنیا نەدەگەیشتمە ئەم هەموو قوربانییە، جەلادەت هیچ کەس نییە بتوانێت بە فریای هەموو قوربانییەکان بکەوێت، هیچ کەس نییە. بەلام من هەمیشە لە پشت هەموو ڕیزەکانەوە، وەک مایسترۆیەک، وەک ئەندازیارێکی نهێنی کە لە پشت دانانی هەموو خشتێکەوەیە لەوێ بووم. من ئەو پیاوەبووم کە بە تەنیا دەمزانی چی دەکەم، چی ڕزگاردەکەم.

چاوی دەنوقاند و دەیگووت: من نەمدەتوانی هەموو شتێک ڕزگاربکەم، نەمدەتوانی، دەمویست، بەلام نەمدەتوانی... وەکو ئەوەیە وایە مەلەوانێک خۆی بکات بە ناو گۆمێکی گەورەی خوێندا کە سەرتاپای پڕە لە جەستەی مرۆڤی بریندار، پڕە لە هەزاران دەست کە هەموویان هاواری بۆ دەبەن، بەلام ئەو تەنیا دوو دەستی هەیە، تەنیا دەتوانیت یەک کەس هەلگرێت و ڕزگاریبکات. بەلام من ڕۆچوومە ناو ئەو گۆمی خوێنەوە، من بیست و پێنج ساڵە بە نهێنی دەچمە ناو ئەو گۆمەوەو شتێک ڕزگاردەکەم و دیمەدەرێ، بەلام لەنێوان چوونی من و گەڕانەوەمدا سەدان شت نوقمدەبن و دەڕۆن، سەدان دەموچاو، سەدان ڕۆح، سەدان هاوار، خوێناو قووتیاندەداو کەس نایانبینێتەوە. من هەموجارێک دەمکێشا بە خۆمدا، دەمکێشا بەسەری خۆمداو دەمگووت: ئەی یادەوەریی مەلعون، شتێک لە خۆتدا هەلگرە، شتێک هەلگرە... بەلام چی؟ کوڕی بریندارم... چی؟ یادەوەریی دەتوانێت چی هەلگرێت؟ نا وامەزانە، من هێزێکی ئەفسانەییم هەیە، من لە ڕەشەبادا وەستاوم و شتەکان بەسەر سەرمدا دەفڕن، دوور لە دەستم بەرەو دونیای ڕەشی یادچوونەوە دەڕۆن.

دکتۆر دەستی دەگرتم و بەسەر هەندێ لە تابلۆکاندا دەیگێڕام و

دەیگووت: «من ئەم جەشارگایەم دروستکرد، دوور لە دونیا، دوور لە هەر شتێک بۆ ئەوەی ئەو نیگارانە ڕزگاربکەم کە دەفەوتان، بەس خودا خۆی دەزانێت ئیشی وا چەندە سەختە، دەبوو لە هەموو شارێکدا تۆڕێکی چکۆلانەو نهێنی دروستبکەم کە ئیشیان ئەوەبوو هونەرمەندەون و نادیارەکانم بۆ بدۆزنەوە، ئەوانەی بێ هیچ دەنگە دەنگ و هەراو هوریایەک، ڕۆحی خۆیان لە ڕەنگدا دەتوێننەوە، ئەوانەی ناوی گەورە نین، بەلکو بە بێدەنگی ئیشدەکەن و دەڕۆن. ژیان دەیانبات، بەلام ئەو چرکە ساتەی تیایدا نیگاردەکێشن وەک زەمەنێکی نەمر دەوەستێت و دەبێتە هاوڕێی ئەبەدییەت. بمبورە جەلادەتی کوتر، من قسەکەرێکی باش نیم، لە بیرت نەچێت کوڕم، دواجار من دکتۆرم، ئیشی من ئەوەیە ژیان ڕزگاربکەم، ژیان خۆی وەک ئەوەی هەیە، بێئەوەی مانای تەواوەتی خۆی وەرگرتبێت. ئەوەی لای من گرنگە نەمردنی ئەو چرکەساتانەیە... عومرمان دەڕوات... من بیست و پێنج ساڵە لێرەدام، زۆر سەفەرمکردوە، بەلام هیچ کات نەمتوانیوە لە هەفتەیەک زیاتر ئەم شارە جێبهێڵم. لەوانەیە... لەوانەیە تەعبیرم تەواو نەبێت، بەلام دەتوانم گوێ شلبکەم و ئەو هاوارە ببیستم کە لە پشت پەنجەی ئەم مرۆڤانەوە بووە. ئەو چرکەیە ببینم کە نایەوێت بڕوات، ئەو هەستە ببیستم کە پێ دادەکوتێت و دەیەوێت ببینین و تا ئەبەد بژی. من دکتۆرم... ئەو هەستەم لە لەشی مرۆڤیشدا تاقیکردۆتەوە، وەک ڕۆحێک کە دەمرێت، بەلام سەرسەختانە نایەوێت بڕوات، سەرسەختانە خۆی بە جەستەوە دەنوسێنێت و ناڕوات، وەک مردووییەک کە هیچ ئەندامێکی ئیشناکات، بەلام هێشتا هەر دەژی، هێزێک هەیە لە ناویدا خۆی بە هەواو ئاسمان و زەوییەوە دەنوسێنێت، شتێک هەیە کە ناڕوات، شتێک هەیە زیندووەو ناڕوات. ئەم تابلۆیانەش هیچ نین جگە لە ئاوێنەی ئەو شتە، ئاوێنەی ئەو ساتانەی مرۆڤ بە ئەبەدییەتەوە دەبەستنەوە، مرۆڤ دەیەوێت زەمەن ڕابگرێت و نەهێڵێت بڕوات، چرکەیەکی قووڵ و بێسنووری

ڕۆحلەبەرێک، چرکەیەک لەوانەیە هەموو هاواری کۆبووەوەی ناو ڕۆحمانی تیابێت، هەموو توڕەبوونی کەڵەکەبووی ژیانمان، یاخود هەموو هەستمان بە جوانی، هەموو قووڵبوونەوەمان لە وجوددا. لەوانەیە کارێکی بەرز نەبێت، بەڵام سێبەرێکی تێدایە کە سێبەری ئەو هەوڵەی مرۆڤە کە لێرەدا بمێنێتەوەو بژی».

هەزاران تابلۆ بوون، زۆریان بێناو بوون، لە قۆناغی زەمەنی جیاواز جیاوازدا هاتبوونە ئەو ژێرزەمینە نهێنییە. هەندێکیان چیرۆکی تابلۆکان و هونەرمەندەکانی لەگەڵدابوو، هەندێکیشیان بێناوو زانیاری لەوێ هەڵواسرابوون. هەندێک لە تابلۆکان کاری هونەرمەندی ناسراوبوون، هەندێکیشیان بە فلچەو دەست و پەنجەی هەندێ کەسی نەناس کێشرابوون. بە گشتی هونەری کەسانێک بوون لە ژێرەوە مێژووی نهێنی ئەم مەملەکەتەیان نوسیبووەوە. تابلۆی کەسانێک لە زیندانەکاندا مردبوون، کەسانێک یەکجار شتێکی قەشەنگیان نیگارکردبوو و ئیدی نەگەڕابوونەوە سەر ڕەسم، چەندەها تابلۆ کە وێنەی غەمگینی ئەو نیگارکێشانە بوو کە هەوڵیاندابوو ژیانی خۆیان و مێژووی وڵاتەکەیان لە پۆرترێتێکدا کورتبکەنەوە. تابلۆی کەسانێک لە مسەری خۆرهەڵاتەوە بۆ ئەوسەری خۆرهەڵات گەڕابوون و هەموو شتێکیان تۆمارکردبوو، نیگاری مەیدانەکانی کار، نیگاری دەستگێڕەکانی بازاڕ، خانمی پۆشتەو پەرداخی ناو باڵەخانە بەرزەکان، ژنانی سەر کانی و ئاو، هەژارانی سەر شۆستەکان. لە شوێنێکدا سەدان تابلۆم بینی کە لە بەرەکانی جەنگدا کێشرابوون، نیگارسازەکانیان لە هێرش و پەلامارەکاندا کوژرابوون و تابلۆکان بە تەپوتۆزی جەنگەوە مابوونەوە. هەندێکیان هێڵکاری ئەوانە بوو کە لە ژووری خنکان و سێدارەدا خەونەکانی خۆیان نیگارکردبوو، ڕەنگی ئەوساتانەیان نیگارکردبوو کە دەکەونە نێوان مانەوەو مردنەوە. هەندێک لە تابلۆکان لە سەردابە تاریکەکانی ئەشکەنجەوە هاتبوون بە دەست و پەنجەی خوێناوی، بە

ترسی مردنەوە دروستکرابوون، پڕبوون لە شفرەی نهێنی کە تەنیا جەستەی ئەوانە تێیاندەگات کە بە هەمان کوچەدا گوزەریانکردوە. لە سوچێکدا هەندێک نیگاری ئەفسەرێکی غەمگینم بینی لە خوێنی سەربازانی کوژراوی گوردانەکەی خۆی دروستیکردبوون، لە خوێنی هەر سەربازەو نیگارێکی کێشابوو، لە خواریشەوە ناوی خۆی و سەربازەکەی نوسیبوو. لە جێگایەکی دیکەدا تابلۆکانی جەلادێکم بینی لە خوێنی قوربانییەکانی وێنەی مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەی گەورە گەورەی دروستکردبوو، وێنەی گوڵی گەورە گەورەی سوور. تابلۆی درەختم بینی کە سەدان ئەهریمەنی چکۆلانە لەسەری هێلانەیان کردوە، مانگ بە برینداری لەسەر باڵی کۆترێک، ئەستێرە لە سینەی خنکاوی منداڵێکدا کە لەسەر فەرشێکی سپی پاڵکەوتووە، حۆری کوژراو لە سەر کەشتییەکی کۆن، فریشتەی هەڵواسراو بە عەمودی ئەلەکتریکی شاری سەیرو پڕ تەپوتۆزدا، ڕەشەبا کە هەزاران گوڵی زێڕین لەگەڵ خۆیدا دەبات، شەپۆل کە دەریاوانەکانی خستۆتە سەر دەستی خۆی و بەرەو مەلەکووت هەڵیاندەدات، کۆمەڵێک دەستی بڕدراوو بێساحێب بە خوێنەوە لە سەر مێزێک کتێبێک هەڵدەدەنەوە، باڵدار کە ناو زگیان پڕە لە موستیلە، پۆرتریتی خانمێکی ئێجگار جوان بە ناوی «لەیلای نیلۆفەر» ـەوە کە لە پشتییەوە جێگایەک وەک کەمپی پەناهەندان بێت دیاربوو، کەروێشکی سەربڕدراو و دانراو لە ناو کۆمەڵێک کتێبدا، دوو مرۆڤی باڵدار لە هەوادا سیمرغێک سەردەبڕن، مۆمیایەک لە ناو کۆمەڵێک ژنی سپیپۆشدا وەستاوە و تەماشای بولبولێک دەکات، باغچەیەک پڕە لە پڵنگی شوشە... هەزاران تابلۆ بوو، نەدەکرا هەمووی تەماشابکەیت، بەڵام وەک مەستێک بە شەقامی شارێکی خەیاڵیدا بڕوات بێئاگای خۆم تابلۆکانم سەیردەکرد. سەیری نیگارەکانی کچێکم کرد کە دوای ئازادبوونی لە زیندان وێنەی ئەو پیاوانەی کێشابوو کە لاقەیانکردبوو، زنجیرە ڕەسمی منداڵێک کە لە منداڵییەکی زووەوە تەنیا هەوری ڕەسمکردوەو هیچی تر، هەورو

هیچی تر.

گەلەرییەکی نهێنی و سەیربوو، پڕبوو لە سوچ و پێچ، هەرگیز تێنەدەگەیشتی کەی و لە کوێدا تەواودەبێت. هەموو نیگارێک دەیوەستانی، لە هەندێ جێگادا موسای بابەک توند دەستی دەگوشیم بۆئەوەی بتوانم خۆم بگرم و بەردەوامبم، لە بەردەم زۆربەی تابلۆکاندا دەمویست دەستبکەم بە گریان. بەڵام تابلۆکان لەوە زۆرتربوون مرۆڤ بتوانێت لە ڕۆژێک یان لە هەفتەیەکدا تەماشایانبکات، دواجار موسای بابەک دەیبردمە بەردەم تابلۆی مۆسیقارێک، کە لەسەر بەستێکی سەوز وەستاوەو لە پشتەوە شارێکی سپی دیارە، شارێک هەموو شتێکی سپییە، شارێکی گەورە کە ڕوخساری بەهەشتێکی هێمنی هەیە، مۆسیقارەکەش جلێکی سپی لە بەردایە سەری بە جۆرێکی نائاسایی بەلای ڕاستدا لارکردۆتەوەو بە هێمنی کەمانچەیەکی خۆڵەمێشی لێدەدات، لەسەریشییەوە کۆمەڵێک باڵندەی سپی دەفڕن. لە پشتیشەوە ئاسۆیەکی ئەرخەوانی هەیە، کە پتر لە ڕەنگی کۆتایی دونیا دەچێت. موسای بابەک دەیگووت: ئەم تابلۆیە، جوانترین تابلۆیەکە من لە ژیانمدا دیبێتم. جوانترین کارێکە من دیبێتم، ئەفسونێکی تێدایە، جەلادەت من لە هیچ تابلۆیەکی تری دونیادا نەمبینیوە. هاوارێکی تێدایە بانگمدەکات... جەلادەتی کۆتر، گوێم لێیە بانگمدەکات، شەو ڕۆژ.. شەوو ڕۆژ... زۆرجار دێم و کەمانچەکەم دەهێنم و بەرابەری دادەنیشم و مۆسیقا لێدەدەم، سەیرمکە جەلادەتی کۆتر، هەستدەکەم بانگمدەکات، بەڵام بەرەو کوێ نازانم. هەستدەکەم کە کەمانچە لێدەدەم، ئەویش لەگەڵمدا مۆسیقا لێدەدات، هەموو ژێر زەمینەکە پڕدەبێت لە ئاواز، پڕدەبێت لە دەنگی مۆسیقایەکی ئاسمانی.

ئەوە یەکەمجاربوو ببیستم کە دکتۆر بابەک دەتوانێت مۆسیقاش لێبدات، من دەستم خستە سەرشانی و گووتم: تابلۆیەکی جوانە، گەر شێوەکاربوومایە عومری خۆمم دەدا، بە مەرجێک ببمە خاوەنی تابلۆیەکی

ئاوهـا. بەسـە مـرۆڤ نیگارێکـی وابـکات و بمرێـت.

هـەردوو دەسـتی خسـتبووە پشـتییەوە، چـاوی کزکردبـووو خـۆی کەمەکێـک بـۆ پێشـەوە چەماندبـووەوە و تەماشـای وێنەکـەی دەکـرد و دەیگـووت: جەلادەتـی کوتـر، مـن چیرۆکێکـی درێـژم لەگـەڵ ئـەم تابلۆیـەدا هەیە. هەندێجـار وا هەستدەکەم ئـەم وێنەیـە نهێنـی هـەرە گـەورەی ژیانمـە. لـە ژنێکم کڕی مێردەکـەی بـازاڕی تابلـۆو گوڵـی هەبـوو، کابـرا لـە ڕێکەوتێکـی ئوتۆمبێلدا مردبوو، ژنەکـەی هیچـی لـە سـەر تابلـۆکان نەدەزانـی هیـچ، بـەلام مـن سـالانێکی زۆر دوای نهێنـی ئـەم تابلۆیـە کەوتـم، کچـی ئـەو پیـاوەم لـە شـارێکدا دۆزییـەوە لـە باکـوور، شـووی بـە ئەفسـەرێکی گاردی کۆماریـی کردبـوو، بـە نهێنـی دووجـار بینیـم، لـە ترسـی مێردەکـەی نەیدەوێـرا زۆر خەڵکی غەریـب ببینێت، بـەلام مـن دووجـار بینیـم، دووجـار... هەمـوو تابلۆکانم نیشـاندا. زۆر شـتی لەسـەر نیگارەکان دەزانـی، کە ئـەو وێنەیـەی بینـی، داوای لێکردم بیدەمـەوە، هەسـتمکرد ئەویش پەیوەندییەکی ڕۆحـی سـەیری لەگـەڵ ئـەو تابلۆیـەدا هەبـووە، مـن هـەر ئـەوکات لـە خۆمم پرسـی، دەبێت چ سـیحرێک لـەم تابلۆیـەدا بێـت کـە خانمێکـی واش سەرسـامدەکات؟. ئەویـش تـەواو نەیدەزانـی کـێ خاوەنـی ئـەو تابلۆیەیـە، دەیگـووت لـە نـاو ژمارەیەکـی زۆر تابلـۆدا بـووە کـە باوکـی لـە بازرگانێکـی ئێرانـی کڕیوەتـەوە، بـەلام زۆربـەی تابلـۆکان بێنـاو بـوون. ئـەوکات نەیدەتوانـی زۆر یارمەتیم بدات، بەلام مـن تکام لێکـرد ناونیشـانی ئـەو بازرگانـە ئێرانییـەم بـۆ بنێرێـت، دوای سـاڵێک کچێـک ئێوارەیەکـی درەنـگ لـە دەرگایـدام، خانمێکـی ڕەشپۆشـی لەچـک بەسـەربوو، وەک ئـەوەی بـە کارێکـی زۆر گرنـگ و نهێنـی هاتبێـت، لەدەرگاکەوە بە خێرایی نامەیەکـی دامـێ و ڕۆیشـت، مـن دوای کەوتـم بـەلام نەمگـرت، وەک ئـەوەی تاریکـی قووتیبـدات، یاخـود لـە هـەوادا بتوێتـەوە. نامەیەکـی چکۆلانـە بـوو، بـە دەستوخەتێکی جوان نوسـرابوو، لەودیو خەتەکانییەوە هەسـتم بە حەسـرەتی زەمانێکـی بەباچـوو دەکـرد، ناونیشـانی بازرگانێکـی فـەرش و شـتی ئەنتیـک و

تابلۆی بۆ نوسیبووم بە ناوی «کیومەرسی یەزدانی خورەم» دانیشتوی ئەسفەهان. دیارە گەیشتن بە ئەسفەهان ئاسان نەبوو، بەلام بەوەدا من تۆڕێکی گەورەی هاوڕێ و ناسیاوم هەیە، کە لەمسەرەو سەری زەوییەوە پەیوەندییان پێوەدەکەم، هەر هەمان شەو نامەیەکم نوسی و بە ڕێگای ئەورووپادا ڕەوانەی ئێرانم کرد، هەڵبەت نامەکەم لە لەلەندەنەوە گەڕایەوە و گەیشت بە ئەسفەهان. کیومەرسی یەزدانی خوڕەم بازرگانی تابلۆی گران و بۆماوەی کۆن بوو، دەیان تابلۆی جیهانی گرنگ بە ژێر دەستیدا ڕۆیشتبوون. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە هاوڕێ ئێرانییەکانم دوایی پێیان گووتم کە کیومەرس لەسەرەتاکانی سەدەی بیستدا و لە قۆناغی جەنگی جیهانی دووەم کە لە فەرەنگستان دێتەوە دەستدەداتە ئەو کارەو کۆمەڵێک شاکاری گەورە لە ئاگری جەنگی جیهانی ڕزگاردەکات و دواتر لە زەمانی موسەدەقدا دەکوژرێت. وەک بیستم ئەو بەشێک بووە لە تۆڕێکی جیهانی گەورە کە لە نێوان ئەورووپاو ئوسترالیادا ئەو جۆرە کارانەیان دەکرد. بەلام ئەوەی عەجیبە و هەرگیز تێیناگەم ئەوەیە دوای پتر لە ساڵێک، بە چیاکاندا، لە ڕێگای قاچاغچییەکەوە کە بە شاخ و ڕووبارەکاندا بارەکانی خۆی دەگەیاندە هەموو شوێنێکی خۆرهەلات، ئەو پیاوە کوژراوە نامەیەکی بۆناردم، باس لەوە دەکات ئەوە جوانترین تابلۆ بووە لە هەموو ژیانیدا بینیبێتی، ناونیشانی شەقامێکی کۆن و کوچەیەکی دامێ لە پایتەخت، کە گوایە ئەو دەساڵ لە مەوبەر ئەو تابلۆیەی لە کچێکی نیگارکێش کڕیوەتەوە کە ناوی «سەلوا طحان» ـە. خودایە، من کە ئەو ناوەم بینی شێتبووم. جەلادەتی کۆتر، من ئەو کچەم دەناسی، ئەو کچە هاوڕێم بوو، بەرلەوەی کۆدێتاچییەکانی شوبات ئەتکیبکەن و بیکوژن، هاوڕێی من بوو، دەبوو ببین بە دوو دۆستی نزیک، لەو ساتەوەی بینیبووم خۆشمدەویست، ئەویش لەگەڵ مندا خۆشحاڵ دیاربوو، دەمزانی ڕەسمدەکات، بەلام هیچ ئیشێکیم نەبینیبوو... کە کوژرا لە سەرەتای دۆستایەتییەکدابووین کە دەشیا بە

عەشقێکی گەورە و ئاسمانی دواییبهاتبایە، تا نەدەکرا ئەو کچە خاوەنی ئەو تابلۆیە بێت، ئەو کچە چەندین ساڵ لەوەوبەر مردبوو، سەلوا طحان کە لە سەر هەمان شەقام، لە هەمان کوچە، لە هەمان ماڵدا دەژیا نەدەشیا دوای دەساڵ لە مردنی لە هەمان ماڵدا، لە هەمان کوچەدا کیومەرسی یەزدانی خورەمی ببینێت. من ئەو ڕۆژەی نامەکەی کیومەرسی یەزدانی خورەمم پێگەیشت، هەر هەمان ڕۆژ گەڕامەوە بۆ کوچەکانی ئەو شارە، جەلادەتی کۆتر لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ دونیا تەلیسمێکی گەورەیە لە بەرچاوم. لە هەمان ڕۆژدا چوومەوە هەمان کوچەو سەر هەمان ماڵ، هیچ کەس هەواڵی «سەلوا طحان» ی نەدەزانی. پیرەکان ئەوەیان لە یادبوو، ڕۆژێک لە ڕۆژان کچێک لەو کوچەیەدا بووە کە کودیتاچییەکانی ساڵی شەست و سێ کوشتوویانە. ئەو زەمانەی کیومەرسی یەزدانی خورەم باسیدەکات، ناکرێت سەلوا طحان لەوێ بووبێت، چونکە ئەوکات ئەو ماڵە خێزانی ڕۆژنامەفرۆشێکی تیا دەژیا. ئەستەم بوو... بەلام گەر واش نییە، کیومەرسی یەزدانی خورەم چۆن سەلوا طحان دەناسێت؟ چۆن ژمارەی شەقام و کوچەکەیان دەزانێت کە پتر لە بیست ساڵ لە مەوبەر تیا ژیاوە... چۆن؟ ئەوە شتەکانی دەیانجار لای من قورسترو تەلیسماویتر کرد. لەو کاتەوە ئیدی من لە بازنەیەکی خامۆش و تەلیسماوی و ئاڵۆزدا دەسوڕێمەوە، دەپرسم؛ ئایا دەشێت ئەو تابلۆیە، شفرەیەک یاخود نامەیەک بێت کە لە ئەبەدییەتەوە بۆ من هاتبێت؟ دەپرسم، ئەو خانمە کێ بوو ئێوارەیەکی درەنگ ئەو ناونیشانەی بۆ هێنام؟ بۆ دەموچاوی خۆی پێچابوو؟ بۆ لە تاریکییدا ونبوو؟ ئەسفەهان کوێیە؟ ئاخۆ ئەوە ناونیشانی شارێکی خەیاڵی تر نییە، دەشێت جێگایەکی نهێنی تر نەبێت کە شارەکان و مرۆڤەکان تیایدا بەیەکدەگەن؟ دەشێت شارێکی تر نەبێت کە ڕابوردووی هەموو شارەکانی دونیا پێکەوە کۆدەکاتەوە؟ دەشێت ئەم تابلۆیە لە بنەڕەتدا ئاماژەنەبێت بۆ سوڕێکی سەیری هونەر کە هەموومان لەدەرەوەی شوێن و کاتە

ئاساییەکان پێکەوە گرێدەداتەوە؟ من گەڕامەوە بەر قاپی ئەو ژنەش کە خێزانی ئەفسەرێکی گاردی کۆماریی بوو، ئەو ئاگاداری هیچ نەبوو، ئەو یەکجار ناوو ناونیشانی ئەو بازرگانە ئێرانییەی ونکردبوو. کەواتە کێ ناونیشانی کیومەرسی بۆ من نارد؟ کێیە دەیەوێت من بە خەتێکدا ببات کە من و سەلواو ئەم تابلۆیە پێکەوە کۆدەکاتەوە؟.بەڵام جەلادەت سەیرترین شت ناوی تابلۆکەیە، سەیرترین شت ناوەکەیەتی... تۆ کەمێک بوەستە، کەمێک بوەستە.

دکتۆر موسا تابلۆکەی داگرت و پشتەکەی نیشاندام، بە خەتێکی سپی ئێجگار جوان نوسرابوو «شاری مۆسیقارە سپییەکان».

ئەوە یەکەمین جار بوو من ئەو ناوە ببیستم. هەر لەگەڵ بیستنی ناوەکەیدا هەستمکرد، شتێک هەیە توند بەرەو لای ئەو تابلۆیە ڕامدەکێشێت، شتێک وەک موچڕکێکی نهێنی بەگیانمدا تێدەپەڕێت و وەک دەستێکی نادیار من بەرەو ناو ئەو نیگارە دەبات.

* * *

ئارەزووەی جێهێشتنی ئەو شارە لە مندا لە هەر شت بەهێزتربوو، ئەو شەوەش کە لەو مۆزەخانە سیحراوییە هاتمەدەرێ، هێشتا خولیای ڕاکردن و گەڕانەوە بۆ کوردستان لەناومدا بە جۆرێک بەهێزبوو، دەمتوانی هەمان شەو ئەو سنوورانە بشکێنم و بێپشوو خۆم بگەێنمەوە باکوور، تەنیا شتێک دەیترساندم ئەو برینانەم بوو کە سەرسەختانە نەیاندەویست ساڕێژبن. لە ڕۆژانی دواتردا پەیوەندییەکی هاوڕێیانەترم لەگەڵ دکتۆر موسادا بەست. زۆربەی کات نەدەبایە خۆم زۆر دەربخەم، لە ژوورێکی پشتەوەدا خەریکی ئەو دیوانە شیعرانەبووم کە موسای بابەک دەیدامێ

بیانخوێنمەوە. ئەو بەیانیان دەچوو بۆ گەشتە ڕۆژانەکانی خۆی، منیش لە کتێبخانەکەی ئەودا دادەنیشتم و دەمخوێندەوە. لەو ماوەیەدا دالیا سیراجەدین دووجار بە کورتی سەردانی کردم، من هەردوو جارەکە پێمگووت «دەمەوێت بڕۆم، دەمەوێت لەم شارە دەرچم». دالیا دواجار حیکایەتی ئەو شارە ئاوێنەییانەی بۆ دروستکردم کە ئێمە تیا ونبووین. ئەو ڕای وابوو کە تەنیا یەک ڕێگا هەیە بۆ دەرچوون لەو شارە، یەک ڕاستە جادە هەیە کە لەمسەری دونیاوە دێت و تا ئەوسەری دەڕوات، ئەوە تاکە ڕێگایەکە مرۆڤ بتوانێت پیا بڕوات. لەوە بەدەر مرۆڤ تووشی تۆڕێکی ترسناک لە شاری ئاوێنەیی دەبێت، کە هەرگیز لێی دەرناچێت، شار کە سەرابی شارە. بە ڕێگا پێچاوپێچەکانیدا دەڕۆیت و هەمیشە دێیتەوە هەمان شوێن، بە ناو دەیان بازنەی داخراودا دەڕۆیت، کە دواجار دەتهێننەوە سەر هەمان پنت، دالیا دەیگێڕایەوە و دەیگووت: کە دەڕۆیت ڕووبەڕووی ڕۆشنایی دەیەها شاری خەیاڵی دەبیتەوە، دەیەها شار کە پێتوایە شاری دیکەن، بەڵام هەر کاتێک دوای ڕۆشناییان کەوتیت بۆت دەردەکەوێت کە تۆ دووبارە گەڕاویتەوە هەمان شارو هەمان جێگا کە تیابوویت، چونکە ئەم شارە لە ڕاستیدا هیچ نییە جگە لە زەوییەکی خەیاڵی، زەوییەک لە هیچ جێگایەکی دیکەی دونیا ناچێت. ئەم شارە هیچ نییە جگە لە خەونی شارەکانی تر، لە فەنتازیای جێگاکانی تر. شارێکە لە نەستی زەمین و نائاگای جێگاکانی تر دروستبووە، سروشتی قەڵایەکی هەیە کە هیچ کەس ناتوانیت بەبێ پاسەوان بچێتە ناوی و بەبێ پاسەوان لێی بێتەدەرێ، وەک چۆن هیچ خەونێک ناتوانێت بەبێچاوەدێری و کۆنترۆڵ بێتە دەرێ، هیچ کەسێکیش ناتوانێت بێگۆڕان و کۆنترۆڵێکی توند بێتە ژوورێ و بڕواتە دەرێ. بەڵام لە ناوەوە ئەم قەڵایە پڕە لە وێنەی خەیاڵی، جۆرە یاسایەکی تر حوکمیدەکات، ئاوێنەی ئارەزوویەکی گەورەیە کە بە جۆرێکی زنجیرەیی سێبەری خۆی دروستدەکات، ڕیزێک دووبارەبوونەوەی ناکۆتا لە ناو یەکدا

دروستدەکات. جێگایەک ئەم ڕاستە شەقامە نەبێت کە لەو سەری جیهانەوە دێت و بەرەو ئەوسەری جیهان دەڕوات، بۆ پەیوەندی لەگەڵ جێگاکانی تردا ڕێگایەکی دیکەی نییە، لە بەرئەوە مەودایەکی خەیاڵی و دوورییەکی ئاوێنەیی و قووڵاییەکی وەهمی بۆ خۆی دروستکردوە، بەوەی تا ناکۆتا لە ناو خۆیدا دووبارەدەبێتەوە. گەر مرۆڤ دەیەوێت بێتە ئێرە یاخود بڕوات تەنیا دەتوانێت دوای کۆنترۆڵێکی توندو نائاسایی دەربازیبێت. وەک چۆن هیچ شتێک لە نائاگاوە بێ پرسی هەست نایەتە دەرێ، هەست تەنیا ڕێگاو دواهەمین ڕێگایە کە بواری ئەو دەربازبوونە دەدات، هیچ شتێکیش لەم شارە بەبێ تێپەڕین لەو خاڵە زۆرو زەبەندانەی پشکنین لەسەر ڕێگا نایەتە ژوورێ، ئەو خاڵانەی لە هەموو چەند سەد مەترێکدا جارێک دووبارەدەبنەوەو هیچ مەخلوقێکی گومان لێکراو ناتوانێت بیانبڕێت... هەموو شوناسنامەکانت لێداوادەکەن، جەستەت دەپشکنن، زمانت تاقیدەکەنەوە، لێتدەپرسن بۆ لە سوپا نیت، بەچ بڕیارێک لە خزمەت چوویتە دەرێ، لە چ وەحدەیەک بوویت، ئامێرەکەتان کێ بوو، لە کوێ هاتوویت، دەچیت بۆ کوێ، کێ دەناسیت، لای کێ بوویت؟. جەلادەتی کۆتر تۆ لە هیچ یەک لەو تاقیکردنەوانەدا دەرناچیت، تۆ وەک غەریبەیەک کە شارەزای ئەم خاک و سەحراو زەمینە نیت، زمانی ئەم ناوچانە نازانیت، هیچ شوناسنامەیەکت پێ نییە، لە خەڵکی ئەم دەڤەرە ناچیت، ناتوانیت بە ڕاستی وەڵامی پاسەوانەکان بدەیتەوە. ئەمە لە کاتێکدا ئەوان هەموو گومان لێکراوێک گلدەدەنەوە، بەدوای ئەوانەدا دەچن، کە پێیاندەڵێن: خێوەکانی سەحرا. ئەوان بەدوای ئەوانەدا دەگەڕێن کە بەشێوەیەک لە شێوەکان دەرگایەکیان بۆ دەکرێتەوەو لە گۆڕەکانی خۆیان هەڵدێن، دەتوانن ئەو لمەی سەر سنگی خۆیان لابەن و هەستنەوەو بەزەویدا ئاوارەبن. چەندین ساڵە شەو لە دوای شەو لەو بیابان و زۆنگاوانەی پشت ئەم زەمینەوە ئەوان خەڵک لە باشوور و باکوورەوە دەهێنن و لەو خاکانەدا دەینێژن، گۆڕی گەورە گەورەیان بۆ دروستدەکەن،

ئۆقیانوسی مەزن و بێکەنار لە ئێسک و پروسک، هەندێجار بە زیندوویی و هەندێجار بە مردوویی دەیانکەن بە ژێر لمەوە. ئەو بەدەویی و خێڵەکییە ونبووانەی ڕێیان دەکەوێتە سەر ئەو گۆڕانە گوێیان لە هاواری مردووەکان بووە لە ژێر زەوییەوە دەنرکێنن، هەندێ لەو سەربازانەی دێنە ئەم شارە، چیرۆکی ئەو تارماییە بریندارانە دەگێڕنەوە کە وێڵ بە شەقام و ڕێگاو لێواری هۆڕو کەناری ڕووبارەکاندا دەسوڕێنەوەو بە خوێنەوە هاواردەکەن، هەندێک لە تارماییەکان دەگەنە شارە گەورەکان، هەندێکیان خۆیان بە ماشێن و شەمەندەفەرەکاندا هەڵدەواسن، هەندێکیان لە دوورەوە دەوەستن و لە قەراغ شەقامە گەورەکاندا دەست بۆ ئەو شۆفێرانە بەرزدەکەنەوە کە لە باشوورەوە میوە دەبەن بۆ باکوور. بەلام ڕۆژێک حیکایەتی ئەو خێوانە دەگاتەوە دەمی سەرۆک، ئەو بەفەرمانی خۆی بڕیاردەدات هەموو ڕێگایەک لەو سێبەرانە بگیرێت، هەموو کونج و کەلێنێکی زەوییان لێ قەدەغەبکرێت، هەر شتێکیش بۆنی ئەوەی لێبێت لە مردن گەڕابێتەوە، جار دوای جار بە زەبری هێز بنێردرێتەوە بۆ مردن. ئەو ڕۆژانە بۆ یەکەمجار پیاوانی دەوڵەتی ئەم زەوییەشیان کۆنترۆڵکرد، ماڵ بە ماڵ بۆ خێوەکان دەگەڕان، بۆ ئەوانەی لە گۆڕە دەستەجەمعییەکانی بیابان هەڵدەهاتن، تیپێکی گەورە بوون، جگە لە تفەنگچی و جەلاد، مەلاو سیحربازیشیان لەگەڵدابوو، هەتا مردووخۆرەکان و ڕاوکەرانی تایبەتی خێوەکانیش کۆمەکیاندەکردن، ئەوانەی چۆن گیاندارێکی کێوی ڕاودەکەن و لە بنەی خۆی هەڵیدەستێنن ئاوەها تارماییەکان ڕاودەکەن و لە شوێنی خۆیان دەریاندەهێنن. لە یەکێک لە ماڵەکاندا تارماییەکیان هەستان، تیپەکانی ڕاوکردن کۆلانەو کۆلان بەو شارەدا دووی کەوتن، تارماییەکی درێژی بەستەزمان بوو، بە دەموچاوێکی سوورەوە وەک ئەوەی دۆزەخ سووتاندبێتی، بە ڕیشێکی درێژی ڕەنگ ئاگرینەوە، هەموو بینیمان بە دەوری خۆیدا دەسوڕایەوەو ئاڕاستەکانی نەدەزانی، نەیدەزانی چ ڕێگایەک سەلامەتترە، سیحربازو مەلاکان بە تەهلیلەو

دۆعا کوچەو کوچە دوای کەوتبوون، دواجار کۆمەڵێک مردووخۆر گرتیان، بەڵام بەر لەوەی بیخۆن خانمێک فریایکەوت، خودایە، ئەوە نە تارمایی بوو و نە هیچ، تەنیا موشتەرییەکی کۆنی یەکێک لە سۆزانییەکان بوو، لە بەر هەر هۆیەک بێت لە ترسدا ڕایکردبوو. خانمەکەی هاوڕێی هاواری لە سەربازەکان دەکرد: وازی لێبێنن، کوڕی قەحبانە، ئەویش موشتەرییەکە وەک ئێوە، ئەگەر ناتەنەوێت لەگەڵ ئێمەدا بخەوێت، بیبەن سوار دایکتانی بکەن.

دالیا سیراجەدین ئەو حیکایەتانەی دەگێڕایەوەو پێدەکەنی، منیش دوای ماوەیەکی درێژ لە دڵەوە پێدەکەنیم.

تا ئەو شەوەی من و دالیا لەو تاکسییەدا جوگرافیای ئەو هەرێمەمان تاقیکردەوە، باوەڕم بە حیکایەتی ئەو شارە ئاوێنەییانە نەکرد. ئەو شەوە دالیا زیاتر شتەکانی بۆ ڕوونکردمەوە. ئەم شارە بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەو بەشەبوو لە شوێنەکان و شارەکان کە حاشای لێدەکرێت، لە جەرگەی هەموو جێگاکاندابوو، لەدەرەوەی هەموو جێگاکانیش، لە قووڵایی هەموو شارەکاندابوو، دووریش بوو لە هەموو شارەکان، بەشی کوژراوی ناو جەستەی هەموو ئاوەدانییەکانی ئەم وڵاتە بوو. هەندێجار وا هەستدەکەیت وەک ئەوەی هەموو شارەکانی لە خۆیدا قووتدابێت، هەندێجاریش وا هەستدەکەیت لەدەرەوەی هەموو تێگەیشتنێکی ئێمەبێت لە شوێن و کات. هەندێجار بێشەرمانە لە ناوەڕاستی شارەکاندا دەردەکەوت، بە هەمان خەتی خۆیەوە، بە شەقامە سەیرو ڕاستەڕێکەی خۆیەوە کە لەو سەری زەمینەوە بەرەو ئەو سەری دەڕۆیشت. هەندێجاریش وەک کەشتییەکی تەنیا لە دەریایەک تەپوتۆزی زەرددا مەلەیدەکرد. دالیا سیراجەدین باسی ڕۆژێکی بۆدەکردم کە بتوانم بڕۆم، ڕۆژێک گمۆکەو هەزارلۆ و وەهمە دووبارەکانی ئەم شارە دەشکێن، بنکەکانی پشکنین هەڵدەگیرێن، جادەکان لە بەردەم هەموو موسافیرەکانی دونیادا دەکرێنەوە، ئەم شارە وەک

کڵۆیەک شەکر لە ناو شوێنگە ئاسایییەکانی دونیادا وندەبێت و دەتوێتەوە. دالیا سیراجەدین ڕای وابوو ئەو ڕۆژە یان دوای کارەساتێکی گەورە یاخود دوای سەرکەوتنێکی لە ناکاوی فریشتەکان بەسەر خراپەو پیسیدا دێتەدی. دەستی دەخستە سەر دەستم و ناوچاوانی ماچدەکردم و دەیگووت «تا ئەو ڕۆژە دێت، من لەگەڵتدا دەبم، منیش بڕۆم خەیاڵم لەلات دەبێت، یەعنی چی، قەت لەبیرتناکەم، هەستدەکەم، یەعنی وەکو ئەوەی شتێک لە ئاسمانەوە تۆی بە من سپاردبێت، وەک مریەم، وەک خانمی مەجدەلییە، ئا، دەزانم تەشبیهێکی خراپە، تۆش وادەڵێیت، ها، ناتەوێت بە دەنگی بەرز بیڵێیت، بەلام دەتەوێت وا بڵێیت، بەلام شتێک لە ئاسمانەوە، دەنگێک کە هەر من گوێم لێیە، تۆی بە من سپاردووە. تۆ تەنیا منت هەیە، منت هەیە، دەبێت بڕوام پێبکەیت، نامەوێت خەفەتت بەدەستەوە بخۆم... تێدەگەیت، من خەفەتم زۆر خوارد، زۆر شتم لە دەست چوو، هەموو دونیا، هەر شتێک بۆنی ئینسانی لێبێت، هەمووی ڕۆی، خودایە بۆ باوەڕم پێناکەیت، تۆ شتێکی لە بری هەموو شتێک هاتوویت، سەیرکە من چەند لە تۆ گەورەترم، من بۆئەوە باشم ببم بە دایکت، بتەوێت و نەتەوێت، شتێک لە بای ئێواران و نەسیمی سوبحگاهاندا وام پێدەڵێت، ئاخ، جەلادەتی کۆتر تۆ دەڵێیت چی، دەتەوێت گاڵتە بەم شارە بکەیت؟ بڵێیت، نەسیمی سوبحگاهانی لێ نییە، شنەی شەماڵی لێ نییە... تۆ بێئەوەی هیچ بڵێیت من دەکوژیت، هیچ ناڵێیت و من دەکوژیت، بەو سەیرکردنانەت دەمکوژیت، کەس ئاوەها سەیری نەکردوم، تێدەگەیت، تۆ وەک فریشتە چکۆلانەکان سەیرمدەکەیت... باری تەعالا، نەسیمی مەلەکوت، تۆ فریشتەیەکی چکۆلانەیت و گەورە بوویت... زۆر گەورەبوویت، وەک یەکێک دیارییەکی گەورەی پێشکەش بە من کردبێت، بە دالیا سیراجەدینی بەدبەخت...ها وامەڵێ، مەڵێ من دەمەوێت لێرە زیندانتبکەم، لەبەر ئەوەی حەزدەکەم لەگەڵمدا بیت، گەر وا بیر بکەیتەوە دەمرم، جەلادەت، تۆ تەنیا شاهیدیت، من دەزانم کەس بە

زیندوویی لەو گۆڕستانانە دەرنەچووە، تۆ تەنیا کەسیت، وەرە دڵی من، وەرە دەستت لێبدەم، تۆ تارمایی نیت، تۆ خەیاڵی من نیت، شتێک نیت ئەو لم و سەحرایە دروستیکردبێت، تۆ ئەمانەتی خودایت لە ملی مندا، ڕاسپاردەی شیرینی مەلەکوتی لای خەتاکارێکی وەک من، من پێتدەڵێم تۆ دەبێت بژی، نەوەک تەنیا بۆئەوەی حیکایەتەکە بۆ دونیا بگێڕیتەوە، بەڵکو ئەوەتا سەیری چاوت دەکەم و دەبینم تۆ دەتوانیت شتبکەیت کە من ناتوانم، ئاە، بۆ هەستدەکەم تۆ مێشکێکی کەمێک پوتت هەیە، لە چاو ئەو قەدەرە پیرۆزەی کە لە نێوچاوانت نوسراوە، لە چاو ئەو شەبەنگە موبارەکەی لە دەورتە مێشکێکی پوتت هەیە، هەستدەکەم ئیشەکانی خالق ئاوهایە، زۆر فەرمانی مەزن دەدات بەسەر جۆرە بەشەرێکدا کە لە هیچ تێناگەن، ئا عاجزمەبە، تۆ تێناگەیت، بەڵام هەستدەکەم سەرێکی بەتاڵت هەیە، ئەوەش دەمکوژێت... ئەوە لە هەر شت زیاتر خەفەتم دەداتێ، ئای خودایە من چەندە بەدبەختم، چەندە بەدبەختم، چەندە بەدبەختم، ئاە چی دەبوو خودایە ئەم کوڕە ئاوها سەیری منی نەکردبایە».

دالیا سیراجەدین لە ناکاو دەگریا، لە ناکاو دەکەوت بەسەر دەستمدا و دەگریا، بەجۆرێک نەمدەتوانی ئارامیبکەمەوە، دەستی دەکێشا بە دیوارەکاندا، خۆی دەدا بە زەوییەکەدا و نینۆکی لە فەرشەکە گیردەکرد، من هەڵمدەستانەوە، بەڵام ئەو هەر دەگریا، هەر دەگریا، کە تووشی ئەو حاڵەتانە دەبوو دەبایە یەکێک بیگرێت و ڕایوەشێنێت، یەکێک بەسەریدا هاواربکات «دالیا سیراجەدین بەسە»، گەر وانەبوایە ئارام نەدەبووەوە. ئەو ڕۆژە بێڕەحمانە من زللەیەکم لێدا. کە زەللەکەی پێکەوت، سەرسامانە بە چاوی پڕ فرمێسکەوە سەیریکردم و باوەشی پیاکردم... هیچی نەگووت، هیچ شتێک سەیریکردم و بە گریانەوە ڕۆی.

من لەو ساتەوە بۆ هەتا هەتایە دالیا سیراجەدینم خۆشویست.

* * *

دالیا سیراجەدین تەنیا کچێک نەبوو کە کۆمەڵێک فریشتەی چکۆلانەی هەبوو... لە ناکاو دەستیدەکرد بە گریان... کتوپڕ دیارنەدەماو بێ خوداحافیزی دەڕۆیشت... لە ناکاو زۆر لێت نزیکدەبووەوە، لە ناکاو زۆر دووردەکەوتەوە. ماوەیەک گەرم دەیدوانیت، ماوەیەکیش وەک بێهۆشێک بە سەر زەمیندا تێدەپەڕی و کەسی نەدەبینی. بە هەفتە سەفەریدەکردو بەغەمگینی دەگەڕایەوە. جگە لە هەموو ئەمانەش ئەو خانمێکی تابلێی وردەکارو وریا بوو، ئەندازیارێکی زیرەکی ژیان بوو.

گوزارەی «ئەندازیاری ژیان»م، جارێک لە زاری خۆیەوە بیست. پلانی نیشتەجێبوون و ژیانی من لەو شارەدا لە نەخشەی «ئەندازیار دالیا سیراجەدین» بوو. ئەو هەموو شتێکی ڕێکخست، من نزیکی سێ هەفتە لای دکتۆر موسای بابەک بە نهێنی مامەوە، درەنگ یان زوو دەبایە ڕۆژێک لەوێ دەرچووماية و بکەوتمایەتە سەر ڕەوتی سروشتی ژیان، دەبایە شتێک بکەم بژێوی و زیندەگی خۆم لەو شارەدا دابینبکەم. ئێوارەیەک کە دکتۆر بابەک لە ماڵ نەبوو، دالیا سیراجەدین بە جانتایەکەوە کە بە تایبەت بۆ ئەو ئێوارەیەی ئامادەکردبوو، خۆی کرد بە ماڵی دکتۆر موسادا، زەرفێکی نایلۆنی گەورە لە دەستەکەی دیکەیدا بوو، کە قاتێک جلی ڕەش و کراسێکی سپی و جووتێ گۆرەویی سوور و بۆینباخێکی ساتانی تێدابوو. لە دوای ئەو ڕۆژەوە کە ئازارمدا نەمدیبوو، کراسێکی سپی درێژیی لەبەرکردبوو، وەک هەموو ژنانی دیکەی ئەو دەڤەرە سوراوێکی زەق و سەرڕوومەتێکی زەقتری خستبووە سەر دەموچاوی، دڵنیابووم خۆی دەزانێت ئەو شێوە مەکیاجکردنە ناشیرینیدەکات، بەلام دەیویست لەوانی دیکە بچێت. ئەو ئێوارەیە خۆی منی گۆڕی، جلە تازەکانی لەبەرکردم، قژی بە شێوەیەک بۆ داهێنام ڕوخسارو ڕەنگێکی تری دامێ. ئاگاداریکردمەوە کە هیچ کەس

نابێت بزانێت مـن برینداربـووم. ئیـدی مـن کـوڕی پـوری ئەوبـووم کـە بـە ڕێکەوت لـە پایتەخت یەکدیمـان دۆزیوەتـەوە، هاتووم دەمەوێت لەگـەڵ تیپی مۆسیقای پرتەقاڵی سپییدا کاربکەم. دەبێت لەگـەڵ هەمووانـدا بەئسـووڵ بـم، زۆر قسـەنەکەم، توڕەنەبـم، زۆریـش بێدەنـگ نەبـم، چونکـە هەموویـان پێکڕا خراپن، وەک چـۆن قسـەی زۆر مـرۆڤ دەخاتـە هەڵـەوە، بێدەنگـی زۆریـش شـوێنی گومانـە. مـن بـە نابەدڵـی هەمـوو شـتەکانم قبوولکـرد، بـەلام پێمبـاش بـوو ئـەو کچـی پـورم نەبێـت. پێمگـووت «ئەمـە چ شـەرەفێکە خانـم، تـۆ بـە منـی دەبەخشـیت، کـێ قەبوولـی دەکات، کچـی پورەکـەی ئیشـێکی وەهـا جوانـی هەبێـت وەک ئیشـەکەی جەنابتـان، تـۆ ژیانـم ڕزگاردەکەیـت بـەلام شـەرم و شـوورەییم بەسـەردا دەهێنیـت، دڵنیـام ئـەم شـارە هیـچ مۆسـیقارێکی تیـا نییـە کچـی پـوری خـۆی هەڵپەڕێنێـت، چاکتـر وایـە بڵێـم تـۆ کچـی دراوسـێمان بوویـت، یـان عەشـیقەم بوویـت و دواتـر بـۆ پیاوێکـی تـر منـت فرۆشـتووە، یاخـود ژنـی هاوڕێیەکـم بوویـت کـە مـن لـە ژێـرەوە لەگەڵتـدا خەریکـی شـتی خـراپ بـووم، یاخـود تـۆ ماوەیـەک مامۆسـتای ئینگلیزیـم بوویـت و ئیتـر لەبەرئـەوەی زۆر حـەزت لـەم ئیشـە بـووە وازت لێهێنـاوە... یـان هـەر حیکایەتێکـی بێمانـای تـر، ئـەم چیرۆکـی کچـی پـورە ناچێـت بـە عەقڵمـدا».

دەوەسـتاو سـەیریدەکردم و دەیگـووت «چەنـد شـەریفیت، خودایـە، تەماشـا، مـن بـۆ کـێ ئـەم هەمـوو ڕەنجـە دەکێشـم؟»، دەوەسـتاو کەمێـک دەسـتی بـە قژی خۆیـدا دەهێنـا و دەچـووە بـەر ئاوێنەیەکـی گـەورە کـە لـە ژووری دانیشـتنەکەی موسـای بابەکـدا بـوو، خـۆی کەمێـک ڕێکدەکـردو دەیگـووت «بـەلام وازبهێنـە هیـچ چیرۆکێکـی تـر وەک چیرۆکـی کچـی پـور ناچێتـە عەقڵـی خەڵکـەوە، تـۆ لـەوە گەمژەتـری تێبگەیـت، لـەم وڵاتـەی ئێمـەدا کچـان بـەردەوام دۆسـتەکانی خۆیـان بـە نـاوی کـوڕی پـورەوە پێشـکەش بـە خەڵکـی غەریبـە دەکـەن، ئـەوە لـە هـەر حیکایەتێکـی تـر باشـتر دەچێتـە عەقڵـەوە، لێـت دەپرسـن ئـەو کـوڕە کێیـە؟ دەڵێیـت کـوڕی پورمـەو تـەواو، سـاڵەهای سـاڵە ئـەم درۆیـە وەک گـوڵ دەڕوات

و کەس کێشەی نەبووە لەگەڵیدا، دواتر دەبێت من بەهانەیەکم هەبێت کە مشوورت بخۆم، گەر بەهانەکەم بەهێز نەبێت، یەعنی شتێک نەبێت ڕێی تێبچێت، دواتر هەموو شتێ خراپ دەڕوات، لە کاتێکدا من دەمەوێت هەموو شتێک باش بڕوات، پێشت بڵێم، من لەوە گەورەترم بمکەیتە مەعشوقەی خۆت و بابەتی قسەی پڕوپووچی خۆت، تێدەگەیت، من لەوە گەورەترم، چاکتر وایە بڵێم من پورتم یان هەر شتێکی تر، بەڵام دەبێت هەموو بزانن من بۆ بەتەنگی تۆوە دێم». من بۆئەوەی زیاتر ئازارییبدەم گووتم «پێم باشە بمرم و تۆ نەکەم بە کچی پوری خۆم». بە توڕەییەوە سەیریکردم و گووتی «درۆدەکەیت، تۆ ئێستا حەزناکەیت بمریت». بەورکێکی کەمێک مندالانەوە گووتم «حەزدەکەم بژیم، بەڵام حەزناکەم تۆ کچی پورم بیت». بێئەوەی گوێ بگرێت، بێباکانە سەیریکردم و گووتی «شەو دادێت و ئێمە هەر خەریکی قسەین، ئەستێرە هەڵدێت و ئێمە هەر لێرەین، جەلادەتی کۆتر، ئەمشەو تۆ یەکەم شەوتە، تەنیا سەیردەکەیت و تێدەگەیت». ئینجا دەستی بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوەو گووتی «خودای گەورە، فریشتە پاکەکانی مەلەکوت، ڕۆحی ئارام و خۆشبەختی ساڵحان، کۆمەکیبکەن تێبگات و ئاگای لە خۆی بێت». بە مەکرێکەوە سەیریدەکردم و بە نیگایەک کە خاڵی نەبوو لە عەیارییەکی کچانە، خاڵی نەبوو لە نیگای کچێک کە تێدەگات هێدی هێدی خەریکە دڵی پیاوێک داگیردەکات دەیگووت «چونکە من ناتوانم هەموو وەختێک ئاگام لێبێت، کوڕێکی لەوە خراپترە کەس بتوانێت چاوەدێریبکات، بەڵام لەوەش باشترە مرۆڤ جێیبهێڵێت، لەوە خراپترە بەزەیم پێیدا بێتەوە، لەوەش باشترە جێیبهێڵم بێکەسکوژی بکەن، لەوە خراپترە دڵی خۆش بکەم لەوەش باشترە خەفەتی لێ نەخۆم».

ئەو ڕۆژە بە قاتێکی ڕەش و کراسێکی سپییەوە، بە بۆینباخێکی خۆڵەمێشی ساتانەوە، بە قژێکەوە کە بۆ یەکەمجار لە ناوەڕاستەوە بەرەو سەرەوە

هەڵمدابووەوە، چووم بۆ پرتەقاڵی سپی، جلە ڕەشەکانی من و جلە سپییەکەی ئەو لە جلی زاواو بووک دەچوون. من بۆئەوەی تورەیبکەم بە چەشنی زاواکان دەستمکردبوو بە قۆڵیدا و هەر وەک ئەوان خۆم قیتکردبووەوەو دەڕۆیشتم. بۆیەکەمجار هەستمکرد کە دەتوانم بیخەمە پێکەنین، ئەوە ئامۆژگارییەکی موسای بابەک بوو، گووتی بۆئەوەی بتوانیت ئافرەتێک وا لێبکەیت تۆی خۆشبوێت، دەبێت دوو سیفەتت تێدابێت، یەکەم بتوانیت تورەیبکەیت، دووهەم بتوانیت بیخەیتە پێکەنین. من ئەو کات هەستمدەکرد دەتوانم دالیا سیراجەدین تورەشبکەم و بشیخەمە پێکەنین. دەبووایە خۆم وا نیشاندەم کە لە ڕێگایەکی دوورەوە هاتووم. پرتەقاڵی سپی ماڵێکی دوو نهۆم بوو، هەڵبەت جگە لە ژێر زەمینە گەورەکەی و گەنجینەیەکی گەورە کە دەکەوتە پشتەوە شانۆیەکی گەورەش لە تەنیشت ماڵەکەوە بوو، ساڵۆنێکی گەورەبوو، پڕبوو لە مێزو کورسی، لە بۆفێتێکی گەورە، لە سەحنێکی بازنەیی لە ناوەڕاستدا، لە بەستێکی کەوانەیی کە لای ڕاستی دەرگاکەوە دەستی پێدەکردو تا بەری ئەوبەر بۆ شوێنی پێشکەشکردنی شەراب و خواردنەوە درێژدەبووەوە کە بەردەوام لە پشت بەستێکی تەختی بەرزەوە کوڕێکی میسریی بێدەنگ ڕادەوەستا ناوی «شحاتە رضوان» بوو. ئەو بەستە کەوانەییە شوێنی مۆسیقارەکان بوو، جێگای بڵندگۆو ئەمپریفایەر و دەزگاکانی دیکەی ڕێکخستنی دەنگ بوو، یەکێک لە مۆسیقارەکان ناوی «غازی هولەیل»بوو بەرپرسی ئەو شتانە بوو، پتر لە دە چلچرای گەورە بە سەقفەکەوە بوو، من لە ژیانمدا هێندە چلچرای زۆرم نەبینیبوو. بە گشتی گەر ئەو چلچرایانە یاخود پرۆجێتەرەکان پێ نەبوونایە، شوێنێکی تاریک بوو. بەلام جێگایەک بوو من لە هەر شوێنێکی دیکە زیاتر کەیفم پێدەهات. کە تاریک دەبوو وەک گۆڕێکی گەورەی لێدەهات، جۆرە زوڵمەتێکی هێند بێترسکەو داخراوی هەبوو، زوڵمەتی پێش لەدایکبوونی بە یادی مرۆڤدا دەهێنایەوە. کچانی پرتەقاڵی سپی بەو جێگایەیان دەگووت

«سالۆنی تەرەب»، بەڵام دالیا سیراجەدین ناوی نابوو «شانۆی ڕەشی ژیانی من». لە ژوورەکانی پرتەقاڵی سپییەوە دوو دەرگای ساجی گەورە دەهاتنەوە سەر سالۆنەکە، یەکێکیان لە پشت بەستی مۆسیقارەکانەوە کە تایبەت بوو بە مۆسیقارو کچەکان، دەرگایەکی تریش لە سالۆنەکەوە کە دەچووە بەردەمی پلیکانەیەکی بەرز لەوێوە میوانەکانی پرتەقاڵی سپی هەر کچێکیان بویستبایە لەگەڵیدا سەردەکەوتن بۆ ناو ژوورەکان. نهۆمی خوارەوەی پرتەقاڵی سپی ژووری دانیشتن، مەتبەخ، سالۆنی تەلەفزیۆن، نوسینگەی حیسابات، شوێنی خۆگۆڕین، مەخزەنی جل و بەرگی کچەکان و حەمام و توالێتەکانی لێبوو. قاتی سەرەوەش بێئەندازە گەورەبوو، لەلای چەپەوە درێژبووبووەوە بۆ سەر سالۆنەکەو لە لای ڕاستیشەوە بە هەندێک پایەی بەرز بەرەو پێشەوە کێشابوو، قاتی سەرەوە دوو دەستەی لە یەکتری جودابوون، دەستەیەکیان ژووری کچەکان بوو، کە لەوێدا لەگەڵ موشتەرییەکاندا دەخەوتن، دەستەیەکی بچوکتریش ژووری مۆسیقارەکان بوو، تاکە شتێکی باش لە ژووری مۆسیقارەکاندا ئەوەبوو هەموو ژوورەکان باڵکۆنیان هەبوو. لە نێوەندی هەردوو دەستەکەدا ژوورێکی گەورەو ڕازاوە هەبوو شوێنی تایبەتی خاتوون «سەمەر سالح» بوو، خاوەنی ڕاستەقینەی پرتەقاڵی سپی و چەند تیاترێکی بچوکتری دیکەش لەو شارەدا. ژنێکی باریکی کەڵەگەت بوو، بێئەندازە لاوازبوو، هەمیشە لەچکێکی سووری بەسەرەوە بوو، بەردەوامیش چاکەت و تەنوورەیەکی شەرابی لە بەردابوو. بە جۆرێک باریک بوو، هەندێجار وامدەزانی دەزوویەکەو بە هەوادا دەڕوات. مێردێکی لە خۆی درێژترو باریکتری هەبوو، هەندێ شەو پێکەوە لەسەر سەحنەکە سەمایاندەکرد، لە دوو شریت دەچوون با بیانهێنێ و بیانبات، من هەموو جارێک دەمچپاند بەگوێی کچەکاندا «ئاگاداریان بن نەئاڵۆزکێن، دواتر بۆمان جیاناکرێنەوە». ئەوەی لای من زۆر سەیربوو ئەوەبوو بەردەوام بە لەچکە سوورەکەیەوە سەمایدەکرد، وەک باسیاندەکرد بە

دڵسۆزییەکی بێوێنەوە هەموو فەرمانە دینییەکانی جێبەجێدەکرد. ژنێکی زۆر بێدەنگ بوو، زۆربەی کاروباری پرتەقاڵی سپی بەسەر دالیا سیراجەدیندا جێدەهێشت، مانگی دوو سێ جار دەهات، دەیانگووت لە پایتەخت کۆمەڵێک کۆشک و بازاڕ و تاکسی تایبەتی هەیە. یەکەم ئێوارێ کە چوومە پرتەقاڵی سپییەوە، پێدەچوو هەمووان چاوەڕێمبکەن، هەموو کچەکان لە سالۆنەکەدا کۆبووبوونەوە، پێشوازییەکی گەرمیان کردم. دالیا سیراجەدین منی وەک کوڕی پوری خۆی پێناساندن، وەک فلووتژەنێکی لێهاتوو کە دەتوانێت خزمەت بە پرتەقاڵی سپی بکات. من هەمیشە لە قەرەباڵغیدا شەرمدەکرد، جانتاکەم داناو سڵاوم لە هەموویان کرد، دەبایە هەوڵبدەم زۆر نەجیب و بە نەزاکەت دەرکەوم نەبا کەس گومانی خراپم لێبکات. دالیا کاتێکی زۆر باشی بۆ گەیشتنی من هەڵبژاردبوو، تەنیا چارەکێک پێش کردنەوەی دەرگای سالۆنی سەماکە، کاتێک هیچ یەک لە ئیشکەرانی پرتەقاڵی سپی هێندەیان کات نییە، زۆر پرسیار لە من بکەن، هەر یەکەی خەریکی شتێکن، بەردەم ئاوێنەکان بەرناکەوێت، سەر پلیکانەکان پڕە لە جوڵەجوڵ و ڕاکە ڕاک، ناو سالۆنەکە پڕە لە خشەی کراس و زریکەی کچان، سەرشارە بە بۆنی مەکیاج، هەناسەی بۆدراویی و عەتری مرۆڤکوژ. لەوساتانەدا دەموچاوەکان پتر لە دەموچاوی لیبۆکی سێرک دەچن، دەنگەکان شپرزەو خنکاون، نیگاکان ڕووکەشبین و خێران. لەڕاستیدا کەس کاتێکی نەبوو زۆر لەگەڵ مندا بکۆڵێتەوە، دالیا سیراجەدین پێشمکەوت و بە عەرەبییەکی ساف گووتی «کوڕی پوری ئەزیزم، تۆ ماندوویت، نا مەڵێ ماندوونیم، خۆ هەموومان ناخۆشی ئەو ڕێگایە دەزانین، هەموومان پیا ڕۆیشتووین، من دەتبەمە ژوورەکەی خۆت... ئەی چۆن؟ تۆ لێرە بە دوا ژووری خۆتت هەیە، یەکێکی لە ئێمە، هەر کەس لە پرتەقاڵی سپی کاربکات ژووری خۆی هەیە». بەجۆرێک قسەیدەکرد هەموو ئەوانی تر گوێیان لێبێت، منیش دەمگووت «سوپاس، کچی پوری ئەزیزم، چەندم پێخۆشە دوای

ئەو هەموو ساڵە دەتدۆزمەوە، وەک دۆزینەوەی مرواریییەک لە بەحرێک سەدەفی چروکدا، وەک دەرهێنانەوەی گوڵێک لە گەروی بورکانێدا». من بە کوردی قسەمدەکرد، دالیا بە زەردەخەنەیەکی ئارامەوە پێشمدەکەوت و بە کچەکانی دەگووت «خۆتان لادەن، ئاه کورەکە ماندووە، خودا دەزانێت چەند سەعاتە بە ڕێگاوەیە، تۆش بیت پێویستت بە پشوو هەیە، ئەمشەو تێر دڵی خۆت بخەوە... ئاه، تۆ مریەم چ سەماچییەکی عەجیبی، ئەگەر ئەو ڕانە سپی و سۆڵانەت نەدەبوون، بە هۆی ئەم شپرزەیی و ناڕێکییەتەوە لە هیچ جێگایەک نانت دەستنەدەکەوت... شوکور بۆ خودا بەس نییە سەر ئەم پلەکانە بەردەوام وا شپرزە نییە».

دەستی خستە سەرشانی من و بە کوردی گووتی: «شوکور بۆ خودا کە ئەمانەش لە هەموو قسەیەکی من و تۆ تێناگەن، لەوانەیە ژوورەکەت زۆر خۆش نەبێت، من هەمیشە گووتوومە ژووری مۆسیقارەکان خۆش نییە، لە ژووری ئوتێلێکی هەرزان دەچێت، بەڵام ڕازی بە کە دواجار شوێنێکی وەهات چنگ کەوتووە، گوڵی من، بیرت نەچێت تۆ لە مردن گەڕاویتەوە».

ژوورەکەم ژوورێکی چکۆلانەبوو، قەرەوێڵەیەکی تازەو مێزێکی سپی کۆنی تێدابوو، چەرچەفەکان پەمەیی و سەرینەکان زەردێکی سپیباوبوون. پێدەچوو ئەو بەیانییە یەکێک لەوێ بووبێت، تا ئەوکات فڵچەیەکی دان و سابوونێکی کۆنی ڕیشتاشین لەسەر دەستشۆرەکە جێمابوو. بۆنی ڕۆحێکی غەریب لەوێ بوو، کە پێدەچوو نابەدڵ ئەو ژوورەی چۆڵکردبێت. دالیا سیراجەدین جانتاکەی بۆ خستمە پشت دەرگاکەو گووتی «بای بای گوڵی من، تا دوایی، من بەرنامەم هەیە، بخەوەو خەوی خۆش ببینە».

ئەستەم بوو بتوانم بخەوم، من دواجار تورەبووم، دواجار کە چوومە ژوورێ بە هەموو توانای خۆم شەقێکم لە مێزەکە هەڵدا، نەمدەزانی چیبکەم، ڕۆژێک چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد ژیانم وەک مۆسیقارێک لە خراپخانەیەکدا تەواوبکەم، لە کوێش لەوسەری دونیا، لە خۆرئاوای باشووری فوراتدا.

لێتان ناشارمەوە گەرچی من دکتۆر موسای بابەک و دالیا سیراجەدینم بە دوو ڕۆحلەبەری زۆر جوان دەزانی، بەلام تا سەر ئێسقان ڕۆحێکی برینداربووم، هەستمدەکرد ژیانم لەم شوێنەدا وادەکات هەموو ڕێزێکم بۆ خۆم بدۆڕێنم، لەو ساتەوە بوونەوەرێک بووم بریندار، بوونەوەرێک تا سەر ئێسقان ڕقێکی کوشندەم لە خۆم هەبوو. تاکە دڵنەواییم بیرکردنەوەم بوو لەوەی ڕۆژێک دەبم بە خاوەنی مۆزەخانەیەکی پڕ لە تابلۆی خەیاڵی، یان وەک دالیا سیراجەدین دەیگووت دەبایە خۆم بۆ ڕۆژێک هەڵگرم هەموو چیرۆکەکە بگێڕمەوە، ڕاستییەکان ئاشکرابکەم، جیهان ئاگاداربکەمەوە لەو شتانەی کە بینیوومن. من تاکە شاهیدی زیندووی کارەساتێکی گەورەبووم. بەلام لە شارێکدا لەمسەر بۆ ئەوسەری تیاتر و هۆڵی سەماو ژنانی قەحبە بوو، دەمتوانی چیبکەم؟ ئەو ماوەیە چەندین جار بۆ ئیسحاقی لێوزێڕین و سەرهەنگ قاسم گریابووم، بەلام ئێستا دەمویست هێدی هێدی هەموو ڕابوردوو لە بیر خۆم بەرمەوە.

تیاتری پرتەقاڵی سپی یەکێک بوو لە چوار گەورەترین تیاترەکانی ئەو شارە. دەستەیەک لە جوانترین کچان لەوێ خزمەتیان دەکرد، قیبلەگایەکی سەرەکی میوانە شارەزاکان بوو. دەبێت بڵێم میوانەکانی شاری سۆزانییەکان دوو دەستەبوون، دەستەی هەرە گەورەیان ئەو ڕێبوارە نەشارەزاو کەم پارانەبوون کە بۆ چەند سەعاتێک لایاندەدا، ئێوارەیەک یاخود شەوێک دەمانەوە، شتێکی ئەوتۆیان لەسەر شوێنەکان و شانۆکان و ماڵەکان نەدەزانی، زۆربەی کات کەمێک بێئامانج بە کوچەکاندا وەک ئەوەی با گەمەیان پێبکات دەسوڕانەوەو دواتر لە هەر ماڵێک بایە لە ماڵەکان، یاخود لە هەرزانترین ویستگەدا لایەندەدا. زۆربەی زۆری سۆزانییە بێبەهرەو بەدبەختەکان لەسەر ئەوجۆرە ڕێبوارانە دەژیان، بەلام جۆری دووەم ئەو میوانانە بوون کە مێژوویەکی درێژیان لەگەڵ ئەو شارەدا هەبوو، هەندێکیان

بیست و پێنج ساڵ بوو میوانی بەردەوامبوون، هەموو جێگایەکیان دەناسی، هەمووماڵێکیان تاقیکردبووەوە، پیاوانی پارەدارو شارەزابوون لە شارە دوورەکانەوە دەهاتن، لەگەڵ میوانە بێگانەکاندا دەهاتن، بە پارەی زۆری نەوتەوە لە وڵاتانی کەنداوەوە ڕوویان لەو شارە زەردە دەکرد، بەرپرسی زۆر گەورەی حیزب بوون، سەرکردەکانی سوپابوون، دەوڵەمەندە هەرە ناودارەکانی باکوورو باشوور بوون کە بە هۆی جەنگەوە نەیاندەتوانی سەفەربکەن و دەهاتن سامانی خۆیان لەوێکانەدا دەدا بە هەدەر. ئەمانە مامۆستای کەیف بوون، شەو بە پارەی زۆرەوە دەهاتن، تا درەنگ شەراب و مەییان دەخواردەوە، درەنگ هەر یەکەیان جوانترین کچانی ئەو شارەیان هەڵدەگرت و تا بەیانی لەگەڵیاندا دەخەوتن.

ئەو ڕۆژەی بۆ یەکەمجار مۆسیقام لێدا، هەموو شتێ لە ژیانمدا ئاڵۆزترو غەمگینتر بوو. ئەوکات نەمدەزانی کێ نهێنی منی لای دالیا سیراجەدین ئاشکراکردوە، نەمدەویست کەس بزانێت کە من مۆسیقا دەزانم، پێمباش بوو ساڵەهای ساڵ لە پشت بارێکەوە بوەستم و شەراب بفرۆشم، مەی بگێڕم، زەوی پاکبکەمەوە، بەڵام لەوێ مۆسیقا لێنەدەم. ئارەزووییەکی ڕاستەقینەم بۆ مۆسیقا نەمابوو، وەک ئەوەی گوللەکان لەگەڵ خۆیاندا حەزو ئارەزووی منیان بۆ مۆسیقا کوشتبێت، نەمدەزانی کێ بە دالیا سیراجەدینی گووتووە کە من مۆسیقارم. بەرلەوەی بۆ یەکەمجار سەرکەومە سەر سەحنەو بۆ تاقیکردنەوە لە بەردەم تیپی مۆسیقاکەدا عەزفبکەم، بە دالیام گووت: گەر پێم نەڵێیت، تۆ چۆن دەزانیت من مۆسیقارم، هیچ شتێک ناکەم هیچ شتێک، هەتا فوویەکی بچوکیش بەو فلووتەدا ناکەم. ئیتر کەیفی خۆتە بامبکوژن.

دالیا کە لە ساتەکانی میحنەت و کێشەدا هەمیشە چارەسەرێکی هەبوو، بە عادەتی خۆی دەستی گرتم و خستییە نێو هەردوو دەستی خۆیەوەو گووتی: خودایە، ئێستا من چی بە تۆ بڵێم؟ بۆ دەبێت یەکێکی تر پێمبڵێ کە تۆ مۆسیقاریت؟ عەزیزم، ئەو شەوەی بە برینەکانتەوە لە

ژێر زەمینەکەدا کەوتبوویت، من گوێم لە جۆرە مۆسیقایەک بوو پێشتر هەرگیز گوێم لێ نەبووە، هەوای ژێر زەمینەکە، فەزای پرتەقاڵی سپی، لەشی خۆت، هەموو پێکڕا مۆسیقا بوون، مۆسیقایەکی نادیار کە مرۆڤ تەنیا بە هەست دەتوانێت بیبیستێت، واتە شتێک نەبوو تەنیا پەیوەندی بە بیستنەوە هەبێت... یەعنی بڵێم چۆن؟ وەک ئەوەی مرۆڤ بە پێست، یان بە پەنجەکانی لە هەوادا دەستی لێبدات، وەک لە ڕۆحتدا ئاوازێکی نهێنی شاردراوەبێت. سەرم لێتێکمەدە، هەموومان شتێکی شاردراوە لە ڕۆحماندا هەیە، بەڵێ وایە، شتێک لە ساتی مردندا نایەوێت لەگەڵتدا بمرێت. من بەڕاستمە، وەک تێکستێکی جوان، شیعرێک کە لە دڵتدایەو دەیەوێت لە دایک بێت، نیگارێک کە سالەهای ساڵ چاوەڕوانی تۆی کردوە دروستیبکەیت و نەتکردوە، ئاە خودایە تۆ باوەڕت بە هیچ نییە، بەچی وابکەم باوەڕبکەیت؟ هەر یەکێک لە ئێمە شتێکی زۆرجوان لە ڕۆحماندایە کە نەمان کردوە، هێزێکمان هەیە بە کارمان نەهێناوە، شاکارێک لە دەست و پەنجەماندا خەوتووە کە لە ساتی مردندا دێتەدەرێ و دەڕوات... من هەمیشە ڕام وابووە، تۆ... تۆ کەیفی خۆتە... ئاە، تۆ هەر وامەڵێ، بەلام ئێمە دەڕۆین و شتە جوانەکانی ناومان نائومێدانە جێماندەهێڵن و دەڕۆن بۆ یەکێکی تر دەگەڕێن، بۆ ساحێبێکی باشتر، ئێمە دەمرین، بەلام ئەوان تا لە دایک نەبن، تا ڕۆحێکی شێت نەدۆزنەوە بیانکاتە هونەر ئارامناگرن. خودایە ئەم کوڕە کەی جارێک باوەڕ بە من دەکات. ئەو ڕۆژە وەک ئەوەبوو تۆ بەحرێکی گەورەبیت لە مۆسیقا، وشەی بەحر وەک مەجازو شتی وا بەکارناهێنم، وەک زەریاچەیەکی لێوان لێو لە مۆسیقا، کە هاتمە ژێر زەمینەکەوە، کە فریشتە بچکۆلە ناسکەکانم تۆیان نیشاندام، کە ماچمکردیت، هەموو ئەو شتانەم لە دەریایەک مۆسیقادا ئەنجامدا کە دەنگی نایەکی سیحراویی لە پشتەوە درێژ بە ناو ئاوازەکەدا هەڵیدەکرد، وەک دەزوویەکی شین لە سایەقە لە ناو گەرداوێکدا، بوەستە، وامەکە وەک ئەوەی گاڵتەت بە هەموو

قسەیەکم بێت. چۆنت پێدەڵێم وایە، وەک فلیم، ئازیز، چۆن بەردەوام هەموو شتەکان لە ناو مۆسیقادا ڕوودەدەن، وەک ئەوەی یەکێک پاڵەوانەکانی خستبێتە ناو دەریایەکی مۆسیقاوە. ئاوەها تۆ مردوویەک بوویت لە ناو حەوزێک مۆسیقادا مەلەتدەکرد... خودایە چەند گەمژەیت، دیارە شتێکی تریش هەیە، نهێنییەکی تریش هەیە، کە جارێکی تر سوێندت دەدەم بە هەرچییەک کە باوەڕت پێیەتی داوام لێمەکە پێتبڵێم، چونکە ناتوانم، ئێستا هەستە، هەستە، من دەزانم کە تۆ دەتوانیت جوان مۆسیقا لێبدەیت، گوێبگرە، وامەزانە من زۆر شت لەسەر تۆ دەزانم، من هیچ لەسەر تۆ نازانم، بەڵام دوو شت زۆر باش دەزانم، بەڵێ دوو شت زۆر زۆر باش دەزانم یەکەمیان ئەوەیە کە تۆ گەمژەیت، دووەمیان ئەوەی باش دەزانیت مۆسیقا لێبدەیت.

دالیا سیراجەدین گاڵتەی نەدەکرد، من لەبەرچاوی ئەو گەمژەیەکی گەورەبووم، ئەو لە دڵەوە باوەڕی وابوو کە هیچ پیاوێکی تری لە ژیانیدا نەبینیوە بە ئەندازەی من گەمژەبێت. خەساری لەوە دەهات، خودا منی بۆ گەیاندنی پەیامێکی وەها گەورە دیاریکردوە. من هەمیشە دواجار ملم بۆ ئارەزووەکانی دەدا، وەک چۆن ئەو ڕۆژەش ملم بۆ داواکەی داو دوای ماوەیەکی درێژ بۆیەکەمجار فلووتێکم گرتەوە دەست. لە دڵیشەوە تەنیا یەک ئارەزووم هەبوو کە ئەو ڕازیبکەم.

هەموو مۆسیقارەکان و کچەکان لە ساڵۆنەکەدا دانیشتبوون، هەندێ مۆسیقاری تیپەکانی دیش لەوێ بوون، وەک ئەوەی بۆنەیەکی گەورەبێت و مرۆڤ نابێت لەدەستی بچێت، موسای بابەکیش بە ناوی شتێکەوە هاتبوو. من پێشتر لە قوتابخانە چەند جارێک چووبوومە سەر سەحنە، بەڵام هەموو وەخت بە شانازییەوە ئەوەم کردبوو، بەڵام ئەوڕۆژە بە شەرم و زەلیلییەوە چوومە سەر بەستی مۆسیقارەکان و فلووتەکەم هەڵگرت، بەڵام وەک ئەوەی ئاسمان هێزێکی ون و نادیارم پێببەخشێت، وەک ئەوەی شتێک

لە زەوییەوە بێت و وەک تەزووییەکی نهێنی بە لەشمدا سەرکەوێت، وەک پەنچەکانم لەدەرگای بایەکی سیحراوی بدەن، یان لە ناکاو پەنچەرەیەکی نادیار بکرێتەوەو لەوێوە، لە زەریایەکی دوورەوە ئیلهامم بۆبێت، ئاوەها مۆسیقام لێدا. پارچە مۆسیقایەک بوو، بۆ ساتێک هەمووانی لە ئیقاعی ژیانی خۆیان دەرهێنا، شتێک لە مەستی و شەیدایی خستە سەر ڕوخساریان. من لە کاتی فلووت لێداندا چاوم لێکنابوو، بەسەر دەریایەکی دووردا دەفڕیم کە پڕبوو لە باڵندەی سپی، بەسەر چیاکاندا دەفڕیم، هەستمدەکرد شتێک لە ناو مندا دەیەوێت لەگەڵ مۆسیقاکەدا بڕوات، شتێک قووڵ بە دڵمەوە گرێدراوە، بەو دەمارانەوە گرێدراوە کە ژیان و مەرگی منی پێوەیە، بەڵام مۆسیقاکە دەیبات، لە سنوورێکم نزیکدەکاتەوە کە من نە ئاشنام پێی و نە نامۆشم، نە ناسم تیایدا و نە نەناس، نە دۆستم لەوێ و نە نەیار. بەڵام هەستمدەکرد وەک چۆن دەستێکی درێژ لە هەوایەکی ساردا بۆ ڕەحمەتێکی دوور دەکشێت، ئاوەها شتێک لە مندا بەرەو جێگایەکی تەماوی دەکشێت و لە ناکاو وەک هوشیاربێتەوە، وەک یەکێک بە هەموو توانای خۆی بەرەو دواوە ڕایبکێشێت دەگەڕێتەوە بۆ خانەی خۆی. کە چاوم کردەوە هەموو سەراسیمە تەماشایاندەکردم. تەنیا سەرسامی نەبوو بەڵکو شتێک لە بەزەیی و خۆشەویستیشی تێدابوو، پێدەچوو هەرگیز مۆسیقای وایان نەبیستبێت، مۆسیقارەکان لەوانی دیکە زیاتر سەرسامبوون. یەکەم کەسیان کە لێم نزیکبووەوە «عیزەت وەردان»بوو، کە بە «ابو ورود» بانگیاندەکرد، کەمانچەژەنی سەرەکی تیپەکەبوو، دەستی خستە سەرشانم و گووتی «ئیعجازبوو کوڕی باوکم، شتێکمان بیست پێشتر نەمان بیستوە، تۆ ئەم ئاوازە لە کوێ فێربوویت». بە غەمگینی سەیرمکردو گووتم «لای مامۆستایەکی مۆسیقا کە ناوی ئیسحاقی لێوزێڕین بوو». دالیا دەیزانی خەریکم گەمژەییەکی دی بنوێنم، بەدەنگی بەرز هەموویانی لێتەکاندمەوەو گووتی «من پێمگووتن، کوڕی پورەکەم مۆسیقارێکی باشە، پێمگووتن،

باوەڕتان پێنەکردم، ئێستا خۆتان گوێتان لێبوو، بەلام من دەیناسم زۆر ستایشی مەکەن با لە خۆی نەگۆڕێت... دەستخۆش دەستخۆش». لەوساتەدا هەموو دەیانویست بمدوێنن، دەستم لێبدەن، قسەم لەگەڵدابکەن، دالیا دەستی لەسەر دڵی بوو. گوێم لە عیزەت وەردان بوو گووتی من ناوی ئیسحاقی لیوزێڕینم نەبیستووە، زۆربەی مۆسیقارەکانی ولات دەناسم و ناوی وام نەبیستووە. مۆسیقارەکانی دی تەوقەیان لەگەڵداکردم، هەندێکیشیان بە گەرمی ئامێزانم بوون، هەندێ لە کچەکان بە ناسکی ماچیانکردم و گووتیان «بە پشتیوانی خودا دەبیت بە باشترین مۆسیقاری دونیا». هودا تەواب، کە بەردەوام بە هودهود بانگیاندەکرد، لە هەموو کچەکانی دی منداڵترو بەنیگاتربوو، گەرمتر لەهەرکەسێک باوەشی پیاکردم، بە دالیای گووت «دالیا، چ کوڕە پوڕێکی شیرین و خۆشەویستت هەیە، ئاگات لێبێ من لە ئێستاوە حەزم لێیکردوە. ئەمە کوڕی پورە یان چکلێتە تۆ هەتە؟»

دالیا بەردەوام دەیویست بمفڕێنێت و بمگێڕێتەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، من بە هێمنی سوپاسی هەموویانم کردو گەڕامەوە دواوە، دالیا لەگەڵمدا سەرکەوتەوە بۆ ناو ژوورەکەی خۆم، بە توندی دەرگاکەی لەسەر داخستم، بە جۆرێک تووڕەبوو کە چاوانی سووربووبوون و هەناسەی بۆ نەدەدرا، من تێنەدەگەیشتم لە چی تووڕەیە، هەموو شتەکانم بەدڵی ئەو کردبوو، هەتا مۆسیقاکەشم عەیبی نەبوو. هێندەی دەرگاکەی داخست گووتی «تۆ گەمژەیت، گەمژەی تەواویت، باوەڕناکەم لەم سەر ئەستێرەیە بێمێشکی وەکو تۆ هەبێت، ها، تۆ وادەزانی لە کوێ مۆسیقا لێدەدەیت، لە کوێ؟ لە ئۆرکسترای پاریس، بێعەقل تۆ لە تیاترۆخانەیەکی سەحرادا مۆسیقا لێدەدەیت، گەمژە ڕێک و ڕاست پێتبڵێم تۆ لە قەحبەخانەیەکدا مۆسیقا لێدەدەیت، ئاە، خوای ئەرزو ئاسمان، تۆ دەتەوێت بەم مۆسیقایە بڵێیت چی، دەتەوێت بڵێیت چی؟ دەتەوێت هەموو پێت سەرسامبن، بەلام

بیرناکەیتەوە دەرەنجامەکەی چییە؟ عاقیبەتەکەی چییە؟ خودای گەور چیبکەم، تۆ تێناگەیت، تۆ بیرت چۆتەوە تۆ کێیت، چۆن کەوتوویتە ئێرەوە، دەبێت چی بکەیت بۆئەوەی نەتدۆزنەوەو وەکو سەگ نەتکوژن؟ ئاه تۆ چەند خەفەتم دەدەیتی، تکات تیادەکەم بەوجۆرە سەیرمکە وەک ئەوەی گایەکی باڵدار لەسەر سەرم ببینی، وەک ئەوەی شاخ و گوێی تر لە سەرم ڕوابێت، یان سەرم بووبێت بەسەری فیل. من دەزانم دەڵێم چی... گەر لێرە ئەمجۆرە مۆسیقایە لێدەیت، دەتدۆزنەوەو دەتکوژن، وادەزانی کە سەرسامبوون پێت ماچتدەکەن و دەڕۆن، ئێرە تیاترۆخانەیە، شەوان پڕدەبێت لە ئەفسەرو بەرپرسی ئاسایش، پڕدەبێت لە پاسەوانەکانی کۆشک، لە پۆلیسی نهێنی، لە جەندرمەی هەیئەتی تایبەتی، لە برادەری کوڕەکانی سەرۆک، لە پاسەوانە تایبەتییەکان، لە پسپۆڕەکانی پیشەسازیی سەربازیی، لەو جەلادانەی خەڵک بە قووندا هەڵدەواسن، خودایە، تۆ بێمێشکیت یان بە ئەنقەست وادەکەیت؟. هەر مەخلوقێک سەرنجیان ڕابکێشێت دەچنە بنج و بناوانی، تۆڕێکی بێسەروبنی کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیارییان هەیە کە دەتوانن ڕەچەڵەکی بچوکترین مێشوولە بدۆزنەوە. هەموو دەزانن هەندێک لەوانەی لە قەسابخانەو گۆڕە دەستەجەمعییەکان ڕادەکەن، ڕوودەکەنە ئەم شارە بەدبەخت و پەرتەوازانەی ناو سەحرا. تۆ دەبێت شتێک بکەیت سەرنجی هیچ کەسێک ڕانەکێشیت. چونکە ئەوان بە جوڵاندنەوەی پەنچەیەک دەتوانن داوا لە سەمەر ساڵح بکەن تۆیان بداتێ، واتە لێرە بتبەنە دەرێ، بەناوی ژنهێنانی هاوڕێیەکیانەوە، بەناوی جەژنی لەدایکبوونی کچێکیانەوە، بەناوی ئاهەنگێکی تایبەتی خۆیانەوە، کە تۆشیان بردە دەرێ وا حیساب بکە مردوویت، چونکە هەر لە یەکەم خاڵی پشکنینی سەر ڕێگاوە دەزانن چ بەدبەختێکی، هێندەی کراسەکەیان داکەنیت دەزانن لە چی ڕاتکردووەو تۆ کێیت. تۆ دەبێت وەعدم بدەیتێ، جارێکی تر مۆسیقای وا لێنەدەیت، خودایە تۆ دەبێت مۆسیقایەکی وەها لێنەدەیت سەرنجی کەس ڕابکێشێت، نابێت

کەس بپرسێت ئەم مۆسیقاره لەناکاو لە ناو ئەم سەحرایەدا لە کوێوە هەڵتۆقی؟ دەبێت مۆسیقایەک لێبدەیت مۆسیقای تیاترۆخانەیەکی پڕوپووچ بێت، ئێره قەحبەخانەیەکی پڕوپووچی ئەوپەڕی دونیایە، من دەزانم تۆ مۆسیقارێکی باشی، دەزانم. لەبەرئەوە دەتکوژن، نابێت بزانن تۆ چ جۆره مۆسیقارێکی.

من بە غەمگینییەوە سەیرمکرد و گووتم: من نازانم خراپ مۆسیقا لێبدەم، باوەڕم پێبکە دالیا سیراجەدین ناتوانم خراپ مۆسیقا لێبدەم. تۆش جارێک باوەڕ بە من بکە.

کەمێک بەبەزەیی و حەسرەتەوە سەیریکردم و گووتی: بەقوربان دەبێت فێربیت، ئێره شوێنێک نییە مرۆڤ بتوانێت مۆسیقای مەزنی تیا لێبدات، خوای گەوره من دەزانم تۆ چەند مۆسیقارێکی باشیت، ئەو ڕۆژەی کە لە ژێر زەمینەکەدا کەوتبوویت و نوقمی ئەو ئاوازانەبوویت، زانیم تۆ چەند مۆسیقارێکی نایابیت، گوێبگره تۆ دەبێت وەک شەڕکەرێک ڕەفتاربکەیت کە هەندێجار ناچاره بۆماوەیەک لە بەرگی پیاوێکی ترسنۆکدا خۆی بشارێتەوە، دەبێت تواناکانت بشاریتەوە، من بەڕاستیمە، ئەمە مەسەلەی ژیان و مردنە، گەر لەمە تێنەگەیت، یەعنی هیچ، یەعنی منیش و تۆش و دکتۆر بابەکیش تیادەچین. دەبێت بە ئەندازەی ئەوە مۆسیقا لێبدەیت کە کچەکان بتوانن سەمای لەسەربکەن، ئێره شوێنی مۆسیقای ڕاستەقینە نییە، درەنگ یان زوو هەموو مۆسیقارێکی ڕاستەقینە گەر نەیکوژن دەبێت خۆی خۆی بکوژێت.

دەستەوەستان بەرابەری وەستام و گووتم: بەڵام چۆن، دەتەوێت چیبکەم؟؟

هەستمکرد هێدی هێدی ئارامتر دەبێتەوە، سەیری دەستیم کرد هێشتا هەر دەلەرزی، بەڵام هەناسەدانی کەمێک لەسەرەخۆتربوو، گووتی: دەبێت لە بەیانییەوە فێرببیت، ئەو مۆسیقایە لێبدەیت کە ئەوانی تر لێیدەدەن،

دەبێت ئەوە فێربیت.

هەستمکرد دالیا سیراجەدین ڕاستدەکات، دواجار مۆسیقای ڕاستەقینە لەو جێگایەدا کوشندەبوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا من وا فێربووبووم مۆسیقا پەیوەندی بە جاویدان، بە کاملی، بە بالگرتنی ڕۆحەوە هەیە، لە کاتێکدا ئەو شاری تەپوتۆزە، شاری ئەو بارەشەی لمەی لەوسەری دونیاوە دەهات، لە دیدی ئەوسای مندا شارێکی تێپەڕبوو، هەموو شتەکان تیایدا کاتی و ڕاگوزەربوون. هیچ شتێکی جاوید و ناکۆتا لەوێ خۆی نەدەگرت، تاکە شتێکی ئەبەدی، ئەو غوبارە زەردەبوو کە بەر لە ئێمە لەوێ و دوای ئێمەش هەر لەوێ دەمێنێتەوە.

هیچ شتێک لەوە بەدتر نییە مرۆڤ مۆسیقارێکی باش بێت، بەلام لە تیپێکی مۆسیقای خراپدا کاربکات. مردن لەوە ئاسانترە تۆ پڕبیت لە مۆسیقا و لەگەڵ کەسانێکدا مۆسیقا لێبدەیت کە پڕن لە دەنگەدەنگ و نۆتەی شکاو، خۆکوشتن لەوە ساناترە تۆ قسە لە مۆسیقایەکی ئاسمانی بکەیت و لەگەڵ کەسانێکدا مۆسیقا لێبدەیت کە پڕن لەتۆن و ڕیتمی پێکەوە نەگونجاو.

من لەو ڕۆژەوە دۆزەخێکی گەورە ژیام، سەفەرێکی ترسناکم دەستپێکرد، سەفەری بیرچوونەوەی مۆسیقا، دەبایە هەموو ئەو مۆسیقایەم بیربچێتەوە کە فێریبووم، بۆ ئەوەی بژیم دەبایە هەرچییەک ئیسحاقی لێوزێڕین فێریکردوم لە یادیبکەم. لە ڕاستیدا دەبێت بلێم بیرچوونەوە کارێکی ئاسانتر نییە لە فێربوون، لایەنیکەم مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو گەلەک تەکنیکی گرنگی بۆ فێربوون گەشەپێداوە، بەلام مرۆڤ زانستێکی تایبەتی بۆ بیرچوونەوە دانەمەزراندووە، توانای ئینسان لەسەر بیرچوونەوە دەیانجار لە توانای لەسەر فێربوون لاوازترە. دیارە من تێدەگەم بۆ، هەلبەت هەموو مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی جۆرە دۆخێکی وا نەبۆتەوە کە ناچاربێت ئەو شتانەی بیربچێتەوە کە فێریانبووە. کەس ئەزموونی کوردێک نەژیاوە، بپەڕێتە بیابانێکەوە، لەوێش بکەوێتە شارێکی زەردەوە کە پڕبێت

لە پیاوانی ئاسایش کە دێن بۆ سواربوونی کۆمەڵێک کچی منداڵ و بەدبەخت کە جگە لە لەشی خۆیان هیچی تریان نییە پێیبژین. پیاوانێک بە جۆرێک لە خراپەدا نوقمبوون، توانایەکی سیحراویان تیا دروستبووە بتوانن مۆسیقاکەی خۆیان، لە هەر مۆسیقایەکی بڵندو مەزن جیابکەنەوە، بە جۆرێک گەر یەکێکی غەریب ڕێگای کەوتە ئەو زەوییەوە، مۆسیقایەکی دیکەی لێدا، ئەو مۆسیقا مەلعونە بیخاتە بەردەم مەترسییەک کە دەشێت بە مردن تەواوبێت.

من دەبایە لە ڕۆژی یەکەمەوە هەوڵبدەم ئەو مۆسیقایەی ئەوان فێرببم، ئەو ئەزموونە ڕاستییەکی زۆری بۆ سەلماندم، لە هەموو هونەرێکدا دوو دێوی تەواو جیاواز هەیە، دوو دێو هەرگیز بەیەکتر ناگەن، هیچ هونەرێک نییە لە ناوەوە ئەهریمەنێکی تێدا نەبێت، واتە چۆن هێزێک هەیە جوانی دروستدەکات، ئەهریمەنێکیش هەیە بەهەمان ئەو ڕەگەزانەی کە جوانی پێ دروستدەکرێت دزێوی دروستدەکات، ئەهریمەنێکە تەنیا هونەرمەندە قووڵ و وردبینەکان دەتوانن ببینن، هەمان سیماو ڕوخساری هونەرمەندانی هەیە، هەمان ئامێرو کەرەستە بەکاردەهێنێت، زۆر جار هەمان ئەو بابەت و بیرۆکەو خەیاڵ و وشانەش بەکاردەهێنێت کە هەر هونەرمەندێکی ڕاستەقینە ئیشی پێدەکات، بەڵام ئیشی ئەم ئەهریمەنە ئەوەیە تەونێکی ترسناک بچنێت، تەونێکی گەورە، دیوارێکی پێچاو پێچ لە زەخرەفەو تۆڕو داوی ڕەنگاوڕەنگ کە دواجار جیهانێک و فەزایەک دروستدەکەن تێیدا جیاکردنەوەی هونەرو ئەو شتانەی لە هونەر دەچن ئەستەم بێت. بۆئەوەی مۆسیقام بیربچێتەوە، پێویستیم بە کۆمەکی ئەهریمەنێکی وەهابوو، ئەهریمەنێک ئیشی ئەوەیە سەلیقەمان بە شێوەیەک سڕو تاریک بکات هونەری بێ زەمان و زەمینمان لە هونەرێک بۆ جیانەکرێتەوە کە نەمرەو لە ناکۆتاشدا سەوزدەبێت، واتە جاویدە. جاوید ئەو وشە سەیرەی

ئیسحاقی لێو زێڕین فێریکردم و لەم کتێبەدا شای هەموو وشەکانی دییە. من ئێستا دوای سەفەرێکی درێژ بە شاری بێسنووری نووردا قسە بۆ ئێوەدەکەم، دڵنیام سەفەری من هێدی هێدی بەرەو تەواوبوون دەڕوات، ئەوە هێزی ئەوەم دەداتێ پتر لەسەر ئەم وشەیە قسەبکەم، ئەو ئەهریمەنەی من باسیدەکەم دەتوانێت تەنیا ئەو کارانە دروستبکات کە جگە لە چەند کورتە ساتێک ناژی، بەڵام توانایەکی گەورەی لەسەر کۆکردنەوەو کەڵەکردن و دووبارەکردنەوەی ئەو چرکەساتانە هەیە، کە پێکڕا دیوارێکی فریودەرو خەڵەتێن دروستدەکەن، دیوارێکە لەسەر دووبارەکردنەوە و چنینی هەمان نەخشی سادە دروستبووە. ئەو ئەهریمەنەی من باسیدەکەم دەتوانێت زیاتر بەرهەمبهێنێت، ژمارەی زۆرتر لە بکەرو خزمەتچی هەبێت، دەتوانێت شارەکان و کوچەکان و گوزەرەکانی دونیا پڕبکات لە هونەرمەندەکانی خۆی. بەجۆرێک گەر لەناو لەشکری پڕ قەوامی ئەوەوە هونەرمەندێکی ڕاستەقینە لە دایکبوو، ئومێدێکی نەبێت. خزمەتچییەکانی ئەم ئەهریمەنە دەتوانن خۆشحاڵ بن، دەتوانن بە ئارامی خۆیان بە گەورە بزانن، دەتوانن دەرکەون، بناسرێن، بەڵام ناتوانن یەک شت بکەن، ئەویش ئەوەیە لە مردن نزیکببنەوە، مردن بۆئەوان کۆتایی هەموو کۆتاییەکانە، مردن دیوارێکە بۆیان نابڕدرێت، لەگەڵ مردندا توانای کارکردنیان لەسەر زەمین و زەمان دەمرێت. نا وامەزانن من باسی مردن بەو مانایە دەکەم کە ئێوە هەمووتان لەسەری ڕێکەوتوون، وەک زەمینێکی بێدەرو سەرگیراو و یەک ئاراستە، وەک گومەزێکی ڕەش کە ئادەمیزادەکان دەچنە بنی و لەوێدا وندەبن و ئیدی تا هەتاهەتایە نایەنەوە. من دڵنیاتاندەکەم جاویدان ئەوە نییە کە لەدوای مردنیش ئێمە لە یادی شتێکدابین و بیرمان نەچێتەوەو هەمیشە بگەڕێینەوە سەری، جاویدان شتێکی ترە، جاویدان شوێنە، شارێکی گەورەیە، هەرێمێکە لە هەرێمە نەدۆزراوەو نادیارەکانی وجود، خاکێکە وەک هەر خاکێکی تر کە دەشێت سەفەری بۆ بکەین، بچینە ناوی و بێینە دەرەوە. جاویدان شارێکی

نزیکە لە خۆمانەوە، لەگەڵماندایە، هەندێجار هێندەمان پێویستە چاو لێک بنێین و ببینین. ئەهریمەن ئیشی ئەوەیە کە ئێمە لە ناو ساتەوەختەکاندا، لە ناو جێگا بچوکەکاندا وەها دیلبکات، توانای ئەو گەشتەمان نەبێت بەرەو ئەوبەری دونیا، بەرەو ئەوبەری ئەم شوێن و کاتانە.

من دەبایە ئەو ئەهریمەنەی ناو خۆم لە خەو هەستێنم، دەبایە مۆسیقا لە یاد خۆم ببەمەوەو سەرلەنوێ بە جۆرێکی دی فێرببمەوە، بەجۆرێک لەگەڵ دۆخی مندا وەک تەراکەوتەیەک لە زەمینێکی ترسناکدا بگونجێت، هێندەش مرۆڤ هەوڵیدا مۆسیقاکەی شتێک بێت لەگەڵ شوێن و کاتدا بگونجێت، ئیدی درزێکی ترسناک کەوتۆتە نێوان ئەوو ئەو خاکە دوورو نادیارەی دەکەوێتە ئەو دیو ژیان، ئەو جێگایەی خەلیقەت بوونەوەرە پاک و بێگوناهەکانی خۆی تیا هەڵدەگرێت. جاوید، تەنیا شوێنی ئەوانە نییە کە هونەرێک دروستدەکەن لەو دیو تەونی ئەهریمەن و سەرپۆشی ئەوەوە هێشتا هەر دەبینرێت، بەڵکو شوێنی هەموو ئەوانەشە کە چۆنێتی مردنیان مافێکی بێکۆتاییان دەداتێ بەردەوام پەیوەندییان بە ژیانەوە هەبێت، لەزەمینی جاویددا هەموو ئەو کەسانە دەژین کە هێشتا لەوێوە قسەیەکیان لەگەڵ ژیاندا ماوە، قسەیەکیان ماوە کە بەربەستەکانی کات و شوێن دەبڕێت و دەمانگاتێ، هەموو ئەوانەن کە نامەیەکیان هەیە بۆ دۆست و هاوڕێ و ئەزیزەکانیان، چیرۆکێکیان هەیە کە دەشێت قووڵ مانای ژیان دەستکارییکات.

دالیا سیراجەدین دەیزانی چ داوایەکی قورسی لە من هەیە... بەیانی دواتر، من لە جێگاکەی خۆمدا هێشتا گینگڵمدەدا، دەستێک بە ئارامی لەدەرگای دام، کە دەرگاکەم والاکرد، دالیام لەگەڵ پیاوێکی چکۆلانەی سەیردا بینی، پیاوێکی بێئەندازە سەرزل، کە تەواو سەری خۆی سفرکردبوو. جووتێک چاوی ڕەشی بێئەندازە گەورەی هەبوو، لووتێکی بێئەندازە بچوک و سمێڵێکی تاشراو و دوو لچی عەرەبی ئەستوور. دیاربوو

خۆی بەدەستی خۆی برۆکانی باریککردۆتەوە، برۆ دریژ و ڕیکەکانی سیمایەکی ترسناکیان پێبەخشی بوو، لەشی بەخۆوە بوو، بەڵام بەراورد بە گەورەیی سەری هیشتا بچوک دەینواند. وەک مراوییەکی شەل بە ڕێگادا دەڕۆی، هیندەی هاتە ژووری پێکەنینێکی بەرز پێکەنی، وامدەزانی لەگەڵیدا ئاوێنەو پەنجەرەکان دەشکێن، بەڵام جگە لەو پێکەنینە بەرزو ناوەختانەی پیاوێکی ئارام بوو ناوی «فهمی البصری» بوو. کە بە «استاذ فهمی» بانگیاندەکرد. چاکەتێکی لەبەردابوو، پڕبوو لە چوارگۆشەی سەوزو بێجی، چاکەتێکی گەورەتر لەلەشی خۆی و قۆڵەکانیشی دریژتر لە دەستی خۆی. کە چاکەتەکەی داکەن هەر دوو دەستی سووتابوون، هیچ نینۆکێک بە پەنجەکانییەوە نەمابوو، ئەوە وایکردبوو دەستی لە بۆقێک بچێت لەوەرزی زاوزێدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە ئاسانی دەیتوانی هەموو پەنجەکانی بجولێنێت. دالیا وەک مامۆستای مۆسیقا بە منی ناساند، خۆی لەوسەری شاری تەپۆتۆزە زەردەکان لە تیاترێکی تر کاریدەکرد، دالیا بەو بەیانی زووە لە جێگای خۆی خەبەریکردبووەوە، جلی لەبەرکردبوو، بەدوای خۆیدا کێشیکردبوو و هێنابووی بۆ ئێرە تا ئیشێکی گەورەم بۆ ئەنجامبدات، مۆسیقام لە بیربەرێتەوە.

فەهمی بەسری، کە لەبەرئەوەی من پیتی «ذ»ی عەرەبیم باش بۆ نەدەهات، هەمیشە بە «ئوستاز» بانگمدەکرد، حیکایەتێکی هەبوو نزیک لە حیکایەتی من. سەردەمانێ ئەندامی تیپی سەمفۆنی وڵات دەبێت، دواتر بە گومانی ئۆپۆزیسیۆن دەیگرن، نینۆکەکانی دەردێنن، دەستی لە شانەوە تا سەر پەنجەکانی بە جۆرە شلەیەکی سووتێنەر بۆ دەسووتێنن و دەینێرن بۆ ژووری خنکاندن، هەفتەیەک بەر لە جێبەجێکردنی حوکمەکە بەر لێبوردنێکی تایبەتی دەکەوێت کە لە کۆشکی کۆمارییەوە بە بۆنەی جەژنی لەدایکبوونی سەرۆکەوە دەردەچێت. فەهمی بەسری تا ئەو شەوەش کە لە زیندان ئازادیدەکەن، بەردەوام لەسەریدا ئاوازەکانی مۆزارت، بیتهۆڤن،

باخ و چایکۆفسکی لێدەدات. ئەو مۆسیقایەی لە هەر شتێک زیاتر ئیرادەی دەداتێ بەرگەی ئەو هەموو ئەشکەنجەیە بگرێت، سۆناتەکانی بیتهۆڤنە. کە دەیبەن بۆ ئەشکەنجە، ئەو لە خەیاڵی خۆیدا بتهۆڤن لێدەدات، سەمفۆنیای نۆ لێدەدات کە ئیقاعاتەکانی پتر لەگەڵ تەوژمی ئازاردا دەگونجێن، زۆرجار پەنادەباتە بەر ڤاگنەر. دوای چەندین مانگ ئەشکەنجەی کوشندەو زۆر، مۆسیقا یاریدەیدەدات نەمرێت، لە ژووری ئیعدامیشدا شەوو ڕۆژ وەک سەماکەرێکی بالییە بە دەستە زامدارەکانییەوە سەمادەکات و بە مۆسیقا ئەو کوونەپەپوە تاریکانەی مردن دەردەکات کە لەسەر پەنجەرەکەی دەنیشنەوە و لە کونەکانەوە تەماشایدەکەن. کە ئوستاز لە زیندان دێتەدەرێ، دەزانێت ناتوانێت جارێکی تر بەو دەست و پەنجەیەوە بگەڕێتەوە بۆ کاری ئۆکسترالی، دەزانێت ئیدی لە پایتەخت جێگای نابێتەوەو ناتوانێت تێکەڵاوی مۆسیقارە ناسراوەکانی ئەو ناوەندە ببێت. بڕیاردەدات بگەڕێتەوە بۆ شارە دێرینەکەی خۆی لە باشوور. لەوێ هەوڵدەدات ببێتە مامۆستای مۆسیقا، بەڵام لە شارێکدا خەڵکی تێر زگی خۆیان نان ناخۆن، کێ دەتوانێت بیر لە مۆسیقا بکاتەوە؟ لە ماوەی ساڵێکدا تەنیا سێ قوتابی چنگدەکەوێت کە بتوانێت فێری مۆسیقایان بکات، وای لێدێت فەرشی ماڵەکەی، گڵۆپەکان، دەرگاکان و شوشەی پەنجەرەکان دەفرۆشێت بۆئەوەی بژی... لەدەمی ڕێبوارو میوان و هاوڕێکانییەوە دەبیستێت، کە تاکە جێگایەک لەو وڵاتەدا مرۆڤ تێیدا بتوانێت بە مۆسیقا بژی، ئاوەدانییەکی گەڕۆکە کە سۆزانییەکان لە نێوان ئاوو سەحرادا دروستیانکردوە، مرۆڤ تەنیا لەوێدا دەتوانێت بە مۆسیقا بژی. ئوستاز کە بە خۆی و کەمان و چەلۆو ئۆکۆردیۆنەکەیەوە بەرەو ئەو شارە دەکەوێتە ڕێ هێشتا نازانێت مەوال و بوزییە چیین. پڕە لە ئاوازی ڤاگنەریی، لە شنەی هایدنی، دەڕوات و سەری پڕە لە نەغمەی شۆپانی، بە پێچەوانەی زۆر لە مۆسیقارەکانی ترەوە بێئەندازە عاشقی ڤیڤالدییە. بە دەستە بۆقیلەییە چکۆلەو بێنینۆکەکانییەوە بە ڕێگادا دەڕوات

و وەک مایسترۆیەکی شێت بە خەیاڵ مۆسیقا لێدەدات. یەکەم کەس لەو شارە زەردەدا پێشوازی لێدەکات تەپڵ ژەنێکە لەوانەی کە هەموو ژیانی تەنیا لە ژێر دەواری بەدەوییەکاندا تەپڵی ژەنیوە، کە گوێی لە مۆسیقاکەی ئوستاز دەبێت، هێندە شتێکی بێتام و بێمانا دەبێت لەبەرگوێی وەخت دەبێت تەپڵەکەی خۆی لەسەردا بشکێنێت، ئەوەی فریای ئوستاز دەکەوێت، مۆسیقارێکی پیرە کە ساڵانێک لەوەوبەر بە هەمان ئەزموونی ئەودا ڕۆیشتووە... مۆسیقارە پیرەکە بۆ چەند هەفتەیەک ئوستاز لای خۆی گلدەداتەوە، ئەو بە ئارامی فێریدەکات، گەر دەیەوێت بە مۆسیقا بژی و خۆی تووشی کێشەی گەورە نەکات و ئاسوودە بێت، دەبێت هەموو ئەو مۆسیقایەی بیربچێتەوە کە تا ئێستا فێریبووە.

ئوستاز لە ماوەی ساڵگەلێکی درێژدا تەکنیکی بیرچوونەوەو سڕینەوەی بنەما تەکنیکییەکانی مۆسیقا بە جۆرێک پەرەپێدەدات، وای لێدێت بتوانێت لە بری ئەوەی ببێت بە مامۆستای مۆسیقا، ببێت بە مامۆستای بیرچوونەوەی مۆسیقا کە پێیوایە ئەوە ئیشێکی ناوازو دەگمەنەو لەسەر ئەم ئەستێرە بەدبەختەدا ئەو تەنیا کەسێکە دەتوانێت لەو بوارەدا ببێتە کاسبێکی دەست ڕەنگین. ئەو بەیانییە کە من بینیم، بە ئارامییەوە دانیشت و گووتی: غەمت نەبێت، وەها مۆسیقات لە یاددەبەمەوە، لە هێزی هیچ مەخلوقێکی زیندوودا نەبێت بیرتبخاتەوە. منیش سەیری دالیا سیراجەدینم کردو بێئەوەی بزانم مرۆڤ لەمجۆرە حاڵەتانەدا دەبێت بڵێ چی، لەبەرخۆمەوە گووتم: سوپاستدەکەم.

من لەو بەیانییەوە هەموو ڕۆژێک هەشت تا دە سەعات، لە چەند شوێنێکی تایبەتیدا وانەی بیرچوونەوەی مۆسیقام دەخوێند، وانەکان ڕۆژانە پێنج تا شەش مادەی تایبەتی بوون کە یەک لە دوای یەک دەمانخوێند، سەرەتای سەرەتای هەموو ئیشەکان، گوێگرتن بوو لە هەندێ سەمفۆنیاو پارچە مۆسیقا کە بەدەست و پەنجەی مۆسیقارو گرووپی زۆر نەشارەزا

لێدرابوون، بە جۆرێک هەر لەیەکەم گوێگرتنەوە نەشازی دەنگەکان ئەزییەتی گوێچکەی دەدایت، دەبایە پتر لەسەد جار گوێ لەو ئاوازە سەقەت و نەشازانە بگرمەوە تا لە یادەوەریمدا شوێنی مۆسیقا ڕاستەقینەکان بگرنەوە، هێند ئەو ئاوازە خراپانەمان لێدەدا بتوانن بەجۆرێک پاڵ بە مۆسیقا پاکەکەی ناومانەوە بنێن، دواتر نەتوانم تێبگەم کامەیان «کۆپییە ئۆرجیناڵەکەیە». ئەو فێری زاراوەی «کۆپی ئۆرجیناڵ» ی کردم، خراپترین شت ئەوەبوو کە ئاسەواری کۆپییە ئەسڵییەکان لە مندا بدۆزێتەوە. وانەکانی دی لەوە خراپتربوون، وانەیەکیان وانەی «تێکەڵاوکردن»ی پێدەگووت، وەک ئەوەی من مۆسیقام لێدەدا و لەپاڵ مندا تەسجیلێک بەدەنگێکی بێئەندازە بەرز کاریدەکرد، کاسێتێکی چەپڵەو هەلهەلەو هۆسەی لەسەربوو، لەگەڵ بەرزبوونەوەی زیاترو زیاتری دەنگی هۆسەو هەلهەلەدا دەبایە من پتر خۆم بگونجێنم و ئیقاعم لەگەڵ ئیقاعی هۆسەو هاوارو چەپڵەکاندا ڕێکبخەم.

وانەیەکی دی کە بۆ من زۆر کوشندەبوو، وانەی «دووبارەکردنەوە» بوو، بەوەی دەبایە من گوێ لە کۆمەڵێک گۆرانی عەرەبی و تورکی و فارسی ئێجگار ناخۆش بگرم، لەبەریانبکەم و بیشیانڵێمەوە، ئەوە سەختترین وانەبوو کە پێموایە منی گەیاندە ئاستی ڕقبوونەوەی تەواو لە مۆسیقا. ئەوەی کە منی دەکوشت ئەوەبوو، نەدەبایە هیچ کات خۆشم وانیشانبدەم کە مۆسیقار نیم، دەبایە وادەرکەوم کە من لە قووڵایی دڵەوە حەزم لەو مۆسیقاو گۆرانیانەیە، دەبوو گۆرانییەکان بڵێمەوەو لەسەریشیان سەمابکەم. فەهمی بەسری دەیگووت «مۆسیقاش حاڵی وەک حاڵی شیعرو ئەدەب وایە، ئەوانەی کە نایزانن لە هەر کەس زیاتر خۆیان وا پیشاندەدەن کە ئوستاز و ڕەخنەگرو بەهرەوەرن تێیدا».

وانەیەکی کوشندەی تر، وانەی «لیاقە» بوو، من و ئەو پێکەوە ڕاماندەکردو مۆسیقارێکی بەدەویی بە تەپڵەوە ڕاویدەنایین، دەبایە من جارێک ئیقاعی ڕاکردنەکەم لەگەڵ ئیقاعی تەپڵەکەدا بگونجێنم و جارێکی

دی تێکیبدەم، بیگونجێنم و تێکیبدەم، بیگونجێنم و تێکیبدەم، تا وام لێدەهات بە دەمدا دەکەوتم. بەڵام هێشتا ئەو وانەیە باشتر بوو لەوانەیەکی دی کە پێیدەگووت وانەی «تەئەمول»، ئەم وانەیەمان لە ژوورێکی تایبەتیدا دەخوێند ناوی «ژووری دیسکۆ» بوو، ئوستاز ئەم ناوەی لە زیندانەوە هێنابوو. هەندێجار لە کاتی ئەشکەنجەدا بۆئەوەی بیانەوێت ئازاریبدەن، بردبوویانە ژوورێکی تایبەتییەوە کە پڕبوو لە ژاوەژاو، دەنگەدەنگ، وژەوژ، زیکەزیک و جیرەجیر، بە جۆرێک «ئوستاز» دوای ئازادبوونیشی ئەو دەنگانە هەر لە گوێیدابوون. دواتر ئوستاز بۆ وانەکانی خۆی ژوورێکی لەو جۆرەی دروستکردبوو، سەقفی ژوورەکە سەرتاپا قوتووە تەنەکەی ژەنگاوی بوو، لە ناوەڕاستدا بەتانییەک داخرابوو، من لەوێ بە نیازی تەئەمول ڕادەکشام و چاوم لێکدەنا، هێندەی خەریک دەبوو بچمە قووڵایی تێڕامان و ئارامییەوە تەنەکەکان دەستیاندەکرد بە تەقەتەق، لەگەڵ تێپەڕینی کاتیشدا تا دەهات دەنگی تەنەکەکان بەرزدەبووەوە، لە ناکاو پڕدەبوو لە دەنگی تەقینەوەی دەمەرقاچان، کەوتنەخوارەوەی مەنجەڵی گەورە، دەنگی تلبوونەوەی سینی، خوێندنی قەلەموون، تەقینی میزەڵدان، قڵپبوونەوەی شەربە، خلبوونەوەی بەرمیل، بۆڕەی مانگا، شکانی بوتڵ، جیرەی تەباشیر، قوقەی کەڵەشێر.

کە لەو ژوورە دەهاتمە دەرێ، زۆرجار تا چارەکێک نەمدەتوانی گوێم لە هیچ دەنگێکی دیکە بێت، بەڵام ئوستاز بۆئەوەی ئاراممبکاتەوە، هەمیشە سووکترین وانەی دەخستە دوا سەعاتی وانە بەنرخەکانییەوە. وانەی «کونترۆڵکردنی ئیقاع»، لەو وانەیەدا کچێک دەهات، بەجلێکی سێکسییەوە، بە جووتێک پێڵاوی بەرزەوە، منیش ترۆمپێتێکی شکاوم هەڵدەگرت و دەبایە لەگەڵ ئیقاعی جوڵاندنەوەی قاچ و دەست و سمتیدا ترۆمپێت لێبدەم. ئوستاز بۆ هەریەک لە جوڵەکان جۆرە دەنگێکی تایبەتی دەویست، بۆ نمونە کە کچەکە قاچی تەواو دەکردەوە، دەبایە دەنگێکی درێژ دەربکەم، کە

دایدەخست، دەنگێکی باریکی غەمگین، کە بەرزیدەکردەوە دەنگێکی خۆش، کە کراسەکەی بەرزدەکردەوە دەنگێکی سەرسامی، کە سمتی دەجولاند، ئیقاعێکی خێراو بەرزونزم بە جۆرێک لەگەڵ جوڵەی عەورەت و کەفەڵیدا بگونجێت. کە مەمکی دەلەراندەوە دەنگی لەرین و هەڵتەکان.

کە من لەو کۆرسە هاتمەدەرێ، چیتر نەمدەتوانی مۆسیقایەکی جوان لێبدەم، ئوستاز فەهمی بە ماوەیەکی کەم ئەو مۆسیقارەی ناومی کوشت و ژیانمی لە مردنێکی سەد دەر سەد ڕزگارکرد.

سەیرترین شت کە دوای مردنی مۆسیقارەکەی ناوت تووشت دەبێت، ئەوەیە کە دەتوانێت هەموو چەشنە مۆسیقایەکی دی لێبدەیت، بەسە ناوی گۆرانییەکت پێبڵێن و تۆ بێ سێ و دوو دەست پێبکەیت. ئێجگار سەیرە، کابرای سەرەک تیپ دەستێک بەرزدەکاتەوەو تۆ وەک ئامێرێکی قورمیشکراو بەدوایدا دەستدەکەیتە زرموکوت، هیچ شتێکت لا زەحمەت نابێت. کە مۆسیقارەکەی ناوت دەمرێت، ئیدی مۆسیقاربوون دەبێتە ئاسانترین کاری دونیا. ئیدی وات لێدێت بەرابەر دەنگەکان بێباک دەبیت، گرنگ نییە ئامێرەکان چی دەکەن و چی دەڵێن، گرنگ نییە هاوڕێکەی تەنیشتت چی دەژەنێت و چۆن دەیژەنێت... هەموو شتێک ئاسایی دەبێت.

لە بیرچوونەوەی مۆسیقا کارئاسانییەکی زۆری بۆکردم لەگەڵ تەواوی ئەو جیهانەدا بگونجێم. ژیان و شێوەی خواردن و زەوق و جلوبەرگم بەشێوەیەکی تراژیدی گۆڕا، هێندە خێرا گۆڕان، دالیا سیراجەدین نەیدەناسیمەوە. لە ماوەیەکی کورتدا بووم بە مرۆڤێکی تر کە بە دەگمەن ڕوخساری ڕاستەقینەی جەلادەتی کۆتری تیابوو، بە ئەستەم سێبەری ئەو مرۆڤەت تیا دەبینییەوە کە حەزی لە مۆسیقا و بڵندگەرایی و فرین و یاریکردن بوو لەگەڵ جاویددا، زۆریشی ویست تا دووبارە ئەو مرۆڤە ڕاستەقینەیەی ناو ناخی خۆم دۆزییەوە.

من بە شێوەیەک گۆڕدرام دالیاشم بۆ ماوەیەک لە خۆم تەرەکرد،

شەویکیان کە بەزەوقەوە فلووتم بۆ بەدرییە ڕەحمان لێدەدا کە سەماکەریکی قەڵەوی سپیکەلە بوو، من لەبەردەمیدا چووبوومە سەر چۆک و ئەویش دەمی فلووتەکەی خستبووە نێو مەمکییەوە و یاری پێدەکرد، من لە خۆشترین حاڵەتێکدا بووم کە پیاو خەیاڵی بۆی بچێت، لەو کاتەدا دالیا سیراجەدین بە بیانووی شتێکەوە سەرکەوتە سەر سەحنەکەو بە ئەسپایی چپاندی بە گوێمداو پێیگووتم «بێشەرەف، حەربای پیسوپۆخڵ، هەی سەخیف». دالیا سیراجەدین دەیویست لە جێگایەکدا بموەستێنێ، بەڵام من نەدەوەستام. کە پێیگووتم حەربای پیسوپۆخڵ من خۆشحاڵتربووم، خراپتر دەستمکرد بە سەما، فلووتەکەم دەبردە شوێنی خراپترەوە. بەدرییە ڕەحمان کە لەگەڵ دالیادا زۆر خۆشیان لە یەک نەدەهات، هەموو یارییە چەپەڵەکانی لەگەڵدا دەکردم، وەک بڵێ تەماشاکە لەگەڵ کوڕی پورە جوانەکەتدا چی دەکەم، چیم بکردایە، ئەو لەگەڵمدا دەیکرد. من دوای دوو مانگ بووبووم بە هاوولاتییەکی دەستەمۆو باشی شاری زەردی سۆزانییەکان. لەو ماوەیەدا ئێواران ڕیشم دەتاشی و دادەبەزیمە سالۆنەکە، پەڕۆیەکی سپی بریقەدارم دەبەست بە ملمەوە، جگەرەیەکم بە ناسکی دەگرت بە دەستمەوەو بە ناسکییەکی دەستکردو زەردەخەنەیەکی پانەوە بە کچەکانم دەگووت «ئێوارەتان باش، گەورەشازنانی سەحراو دەریا». لە سالۆنەکەدا کورسییەکم دەگرت، وەک پیاوێک باوەڕێکی زۆری بە خۆی ببێت، قاچم دەخستە سەر قاچم و لەگەڵ مۆسیقارەکانی تردا باسی سیاسەتم دەکرد، فووم لە سووتوی جگەرەکە دەکردو وەک ئەوان دەمگووت «ئەگەر ئەو ئێرانییە باوک سەگانە، شەڕ نەوەستێنن، خراپتریان بەسەر دێت، واللە العظیم ئەمریکا تەخت و بەختیان ناهێڵێت، سەید الرئیس خۆ کەم نییە، هەموو دنیا لە پشتێتی، ئاخ بەڵام گەر ئەو ئێرانیانە نەدەبوون، کوڕی قەحبەن، وەلقران العظیم، کوڕی قەحبەن، ئەگەر ئەوان نەدەبوون، ئێستا سوپای ئێمە لە قودس بوو، والرسول الکریم لەولا قودسیشەوە بوو.

یەعنی لەولا بەحرەکەشەوە».

ئەوجۆره قسانەم دەکرد، دەستم دەخستە ژێر چەناگەم، کە کچەکان بەلامدا دەڕۆیشتن، دەمگووت «هێی ئەم هەموو جوانییە چییە. هێی ئەم هەموو لەنجەولارەت لە کوێ کڕیوە، هێی تۆ دوێنێش وەهابوویت یان من ئەمڕۆ چاووم ڕوونبۆتەوەو دەتبینم، هێی کەی قوومێک ئاو دەدەیت بەم تینوە داماوەی بەردەمت، ئاه هەمبایە، هەر نیگایەک و کیلۆیەک زێڕم دەدایتێ... کچی خودا بۆ وات لە خۆت کردوە کوێتییەکان دەتفڕێنن، ئاه، کە شیرینی، ڕۆژێک لە ڕۆژان لەمناوە جەبهەیەکی تر لەسەر تۆ دەکرێتەوە، ئاخ مەعقول نییە، خانم تۆ دڵی ئێمە بە ئاسن تێدەگەیت یان چی، بەم هەموو حوسن و دەلالەوە دەڕۆیت و سەیرماننناکەیت. هێی ئەرێ ئەم شەڕەی فاو لە سەر ئەو چاوانەی تۆ نییە خانم؟ دە توخودا پێمبڵێ تا ئێستا چەند کەس لەسەر ئەو لێوانەت کوژراون؟».

بەگشتی هەمووان خۆشیاندەویستم، توانایەکی سەیریشم تێدابوو لەگەڵ کوڕە مۆسیقارەکاندا خۆم بگونجێنم، کە وەسفی بەهرەو داهێنانیانم لە مۆسیقادا دەکرد، بێئەندازە درۆی گەورەم بۆ دەکردن، بە کەمانچەژەنەکەم دەگووت «توانای وەک تۆ دەگمەنە، ساڵی داهات بڕۆ داوایەک بنوسە بۆ تیپی ڕادیۆو تەلەفزیۆن، دەستیشت ماچدەکەن، هەموو وڵات دوو مۆسیقاری تری وەک تۆی تیانییە، یەعنی تۆ وەرنەگرن کێ وەردەگرن؟». یەکێکمان لەگەڵدا بوو عودی لێدەدا، ناخۆشترین عودێک لەسەر ئەم ئەستێرەیە بیسترابێت، بەڵام من دەمگووت «گوێبگرە، من بیستوومە لە ئەندەنوسیاو مالیزیا و باشووری تایلاندیش پێویستیان بە مامۆستای عودە، تێدەگەیت؟ عود ئامێری ئێمەیە، هیچ کەس وەک ئێمە نازانێت عود لێبدات، ئەوە قسەی تیانییە، تۆ خۆت بگەێنیتە ئەوێ دەبیت بە ملیونێر، تۆ ماڵ کاوول بەهرەیەکت هەیە وڵاتێک ئاوەداندەکاتەوە، بەڵام تۆ قیمەتی خۆت نازانیت، بڕۆ بەقسەم بکە، بچۆ بۆ سەفارەتی مالیزی، یان هەر وڵاتێکی تر، لەوێ داوابکە سەفیر

بە شەخسی ببینیت، ئیشێکی قورسە بەڵام موستەحیلیش نییە، عودەکەت لەگەڵ خۆتدا بەرە، دڵنیام سەفیر گوێی لەم عەزفەی تۆ بێت دەستبەردارت نابێت، برام تۆ ڕووبکەیتە هەر وڵاتێک تۆ قازانج ناکەیت ئەو وڵاتە قازانج دەکات». کە بە کۆمەڵ دادەنیشتین، من دەمگووت «ماوەیەکی تر شەڕ دەوەستێت، ئەو ئێرانیانە لە فاو بشکێن تا تاران ناوەستنەوە، ئەو کات دڵنیابن، ئێمە وەک تیپ دەتوانین سەفەری ئەوروپا بکەین، ئەوروپییەکان یەکجار گوێیان لە عەزفی ئێمە بێت وازمان لێ ناهێنن، لەوانەیە شارێک یان وڵاتێک بمانکڕێت، لەوێ خەڵکی لێیە مۆسیقا دەناسێت، ئەگەر بەس ئەو ئێرانیانە لە فاو بشکێن پاشەڕۆژی ئێمە لە ڕۆژ ڕوناکترە، هاوینان سەفەری ئەوروپا دەکەین و زستان دێینەوە بۆ ئێرە، یان بە پێچەوانەوە، ها هادی خضر تۆ حەزدەکەیت بە هاوین ئیشبکەیت و بە زستان سەفەر بکەیت یان بەعەکسەوە؟».

کە ئەم قسانەم دەکرد هەموو لەدەورم کۆدەبوونەوە، من ئەو درۆ بێتامانەم دەکردو کەچی کاریگەرییەکی ئێجگار قووڵی لەسەر بڕواو دەروونی ئەو مرۆڤە تێکشکاوانە هەبوو. ساڵانێک دواتر کە ڕۆمانی «یاقووبی درۆزنم» خوێندەوە، تێگەیشتم لە کاتی ترس و جەنگدا هەموو میللەتێک، هەموو شارێک پێویستیان بە جۆرە درۆزنێک هەیە ئاسوودەیانبکات. من ئەو ڕۆژانە بە شێوەیەک لە شێوەکان بەردەوام درۆمدەکرد، مرۆڤ کە مۆسیقای لێ نەدا، دەتوانێت بە ئاسانی درۆبکات.

* * *

تا لە مۆسیقارەکان و کچانی پرتەقاڵی سپی زیاتر نزیکببوومایەتەوە، زیاتر لە دالیا دووردەکەوتمەوە. ئەو ماوەیە دالیا بە هەندێک دۆخی سەیردا تێدەپەڕی، زوو زوو سەفەریدەکرد، کەم دەردەکەوت، کەم لەگەڵ مندا

دەدوا، بەڵام دڵنیاش بووم دوور بە دوور بەردەوام ئاگاداری من دەکات، ئەوەی لە دوورەوە خەمم بۆ دەخوات و دڵی بۆم دەسووتێت، دەیکوشتم. کە شەوانە دەچوومە سەر جێگاکە بیرم لە چاوانی دەکردەوە، دەچوومە باڵکۆنەکەو بیرم لەو دەکردەوە، چام دەخواردەوە بیرم لەو دەکردەوە، خۆم دەشت بیرم لەو دەکردەوە، خەوم دەبینی بیرم لەو دەکردەوە، کە سەفەری دەکرد تا دەگەڕایەوە من شێت دەبووم، ئەو شەوانەی کە لەگەڵ میوانێکدا سەردەکەوت من خەوم لێ نەدەکەوت، ئەو شەوانە حەزمدەکرد فلووتەکەم بەرم و لە ژێر پەنجەرەی ژوورەکەدا وەک جاران مۆسیقا لێبدەم، بەڵام دەمزانی چیدی ناتوانم شتی وابکەم، چیدی ناتوانم مۆسیقای وا لێبدەم. ئەو کاتانەی مۆسیقام لێدەداو ئەو لە سالۆنەکەدا دەردەکەوت، من دەستم دەلەرزی. کە دەمبینی لەگەڵ ئەو پیاوە تەنگ ئەستوورو سمێڵ فش و دزێوانەدا دانیشتووە لە ناوەوە دەسووتام، کە دەمبینی دەست دەخەنە قژیەوە، یاخود هەولدەدەن ماچیبکەن، یاخود دەست دەخەنە کەمەری، من فلووتەکەم لە دەست دەکەوتە خوارێ. هەستمدەکرد هەموو ئەو ڕەفتارە سەیرانەی لە پرتەقاڵی سپییدا دەینوێنم هیچ نییە جگە لە مەرهەمێک بۆ بیرچوونەوەی دالیا سیراجەدین، ئەو زمانە درێژەی دڵی کچانی تری پێخۆشدەکەم هیچ نییە جگە لە تۆڵەیەکی منداڵانە لەو. بە کورتی، من بە جۆرێکی گەمژانە عاشقی دالیا سیراجەدین بووم، ئەو دوورکەوتنەوە ئەنقەست و سەیرەشی وایدەکرد پتر بسووتێم، بیرتان نەچێت، من ئەو کات حەڤدە ساڵ بووم، هەستمدەکرد دوورکەوتنەوەکەی ئەو هیچ نییە جگە لە ئازاردانێکی بێڕەحمانەی من، ڕۆژێک لەسەر پلیکانەکان گرتم و بە دەنگێکی غەمبار لێم پرسی: دالیا بۆ قسەم لەگەڵ ناکەیت؟. بێباکانە سەیریکردم و گووتی: نا هیچ نییە، کەمێک سەرم قاڵە. یەک دوو پلە سەرکەوت و بێئەوەی تەماشام بکات، گووتی: ئا تەنیا سەرم قاڵەو هیچی تر، هیچی تر، یەعنی چی بێت؟. نەمدەزانی ئایا ڕاستتدەکات یان نا، نەمدەزانی

ئایا هەستم پێدەکات یاخود نا. بێماناترین شت لە ئافرەتدا ئەوەیە کە نازانیت هەستت پێدەکەن یان نا. بە شێوەیەک خۆیان تەلیسماویدەکەن جگە لە خۆکوشتن ڕێگایەکی ترت بۆ ناهێڵنەوە. کە دەچوومە سالۆنەکەوە بەردەوام لە جێگایەکدا دادەنیشتم ئەو ببینم، دڵنیابووم دەزانێت من بەردەوام سەیریدەکەم، زۆر هاوڕێی کچێک بوو ناوی «سودا ڕەمەزان» بوو. منیش هەوڵمدەدا لەگەڵ سودادا ببمە هاوڕێ، بەڵام وەک ئەوەی ڕێگاکانم لێببەستێتەوە، هەوڵیدەدا تادەتوانێت سودا لە من دووربخاتەوە. من نەمدەویست وا دەرکەوم کە خەریکە لە عەشقدا دەمرم، ئاه هەموو شتێکم دەکرد بۆئەوەی عاشقێکی وا بێمانا دەرنەکەوم، پێم باش بوو بمرم و کەس نەزانێت من لە چ حاڵێکدا دەژیم. من ئەو ماوەیە لە هیچ ئافرەتێک نزیک نەبوومەوە، لەگەڵ هیچ کچێکدا نەخەوتم، مۆسیقارەکانی تر هەموو لەگەڵ کچەکانی پرتەقاڵی سپییدا دەخەوتن، بەڵام من جگە لە زمانێکی درێژ هیچی دیم نەبوو، کە بە هەموو جێگایەکدا دەمگێڕا، بێئەوەی کردەوەیەکی لەگەڵدا بێت. هەتا جارێکیان هودا تەواب ئەو کچەی سەرەتا زۆر بە مۆسیقاکەم سەرسامبوو، لە بەردەم ئاوێنەکاندا گرتمی، من ئەوکات تازە پێمگووتبوو «خانم جوانی تۆ لەو چەشنانەیە کە بەحر لەتدەکات. فیرعەون دەکوژێت، ئیمپراتۆرییەت دەڕوخێنێت، مەملەکەت دروستدەکات، سوپا هەپرون بە هەپرون و تاج وا لێدەکات با بیبات». هودا بە نازەوە گووتی «کەوایە بۆ نایەیت ئێستا بچینە ژوورەکەم، کوڕی قۆز بۆ تۆ بەلاشە، ئێمە پارە لە کوڕی جوان ناسەنین». ئاه من هیچ چارەیەکم نەبوو، جگە لەوەی بڵێم «جوانی وەکو تۆ شایستەی پادشاهەکانە، گەدای وەکو ئێمە، چاکترە هەر لە دوورەوە تەماشایبکەین، چاکترە ئەم ڕوخسارە شاهانەیە هەر لە خوێنی شاهان جووت بێت». ئەو سەرێکی بادا و بەدەنگێکی بەرز کە هەمووان گوێیان لێبوو، دووجار گووتی «دەبەنگی کوڕی دەبەنگ».

من ئەو ماوەیە بە دەگمەن دەچوومە دەرەوە، شەو کە لە بەرنامەکانم

دەبوومـەوە، سـەردەكەوتمەوە بـۆ ژوورەكـەم، دەرگاكـەم كلۆمدەكـردو لـە بالْكۆنەكـەدا بـە تەنیـا سـەیری ئەسـتێرەم دەكـرد، بـەدوای ئـەو پرسـیارە ناكۆتایانـەدا دەگـەڕام كـە وەلامیان نەبوو، لـە خۆمـم دەپرسـی: مۆسیقا چییە؟ ژیـان چییـە؟ ڕۆح چییـە؟ خۆشەویسـتی چییـە؟ بـۆ هیـچ یـەک لـەم وشـانە مانایەكیـان نییـە مـرۆڤ ئاسـوودەبكات. ئـەو شـەوانە زۆر درەنـگ خـەوم لێدەكـەوت، بـە ڕۆژیـش كـە بـە ئاگادەهاتمـەوە، عەسرێكی درەنگ بوو، ئیدی هێندەم كات هەبوو نـان بخۆم و خۆم بشۆم و خۆم بۆ بەرنامەكانی ئێوارە ئامادەبكەم. من ئەگـەر چی لەسـەر سـەحنەكە دادەنیشتم، بەلام هەموو خەیالْم لای دالیـا سـیراجەدین بـوو، بـەردەوام چـاوم لەسـەری بـوو، سـەیرمدەكرد چـی دەكات، چـۆن پێدەكەنێـت، چـۆن لەگـەلْ میوانەكانـدا دادەنیشـێت، چـۆن لەگەلْیانـدا دەچێتـە دەرێ، ئـەوە بـە جـۆرێ سـەرقالْیدەكردم، زۆرجـار گوێـم لـە قسـەی سـەرەک تیپەكـەش نەدەبوو. ئـەو كەمجـار سـەیریدەكردم یاخـود لـە ڕاسـتیدا وام هەسـتدەكرد سـەیرم نـاكات. دەبێت بلێـم چـاوی ژنـان وەكو چـاوی ئێمـە نییـە، بـە هیـچ جۆرێـک سـەیرتناكەن كەچـی دەتبینـن، شـێوەی سـەیركردنیان جۆرێكی تـرە، پشـتیان لێتـە و دەتبینـن، لـە سوچێكی مردوودا وەسـتاون و تـەواوی دیمەنەكـە لـە پێش چاویانـە. ئـەو شـەوەی كـە فلووتـم بـۆ بەدرییـە ڕەحمـان لێدەداو ئـەو سـەركەوتە سـەرەوەو پێیگووتـم حەربـای پیس و پۆخـلْ، زۆر خۆشـحالْ بووم، لـە خۆشـیدا نەمدەزانـی چیبكـەم، دواجـار توانیبـووم بیهێنمـەوە قسـە. كـە بەرنامەكانـم تـەواو بـوو، بـە خۆشـییەكی بێئەنـدازەوە گەڕامـەوە بـۆ ژوورەكـەم، لـە بالْكۆنەكـەدا هـەردوو دەسـتم كردبـووەوە بۆئـەوەی بفـڕم. شـەوێكی سـەیربوو، تـا چەنـد سـەعاتێكیش دوای خامۆشـبوون و بێدەنگبوونـی تـەواوی شـار مـن خـەوم لێنەدەكـەوت، هەسـتێكی سـەیرم هەبوو كە بڕۆم و پیاسـەبكەم، یەكەمجار بوو حەزبكـەم بڕۆمـەدەرێ و هـەوا هەلْمـژم، بـەو شـارەدا بگەڕێـم، كوچەكانی بناسـم، تەنیـا وەک قەلەندەرێكی دلْخۆش بگەڕێم و لـەو كۆلانە خالْییانەدا سـەیری ئەستێرە

بکەم. لە پلیکانەکان هاتمەخواری، دونیا کش و مات و خامۆش بوو، سالۆنەکە بێدەنگییەکی ترسناکی تیابوو، بەلام پڕبوو لە بۆنی بەجێماوی کچان، پڕبوو لە غەریبییەک کە تەنیا لە بێدەنگیدا دەردەکەوت، لە غەمێک کە هەندێ جێگا تەنیا دوای خالیبوونەوەیان لە ئادەمیزاد ئاشکرایدەکەن.

ئەوشەوە کە دابەزیم هەستم بە دەنگێک کرد لە سالۆنەکەدا. بە هێمنی دەرگای سالۆنەکەم کردەوە، تاریکییەکی ئەنگوستەچاوو ترسناک بوو، هێند تاریکبوو نەمدەتوانی بڕۆم. گەڕامەوەو چەرخێکی بەجێماوم لەسەر یەکێک لە مێزەکان هەلگرت و دیسان چوومەوە بۆ ناو سالۆنی سەماکە، بۆنێکی کوشندەی شەراب و جگەرە لە دیوارەکان دەهات، کە لە کاتی تردا هەستم پێنەکردبوو. چەند هەنگاوێک لە تاریکیدا ڕۆیشتم، دلنیابووم یەکێک لەوێیە، هەستم بە هەناسەی مرۆڤێک دەکرد، گوێم لە دەنگێکی خنکاو بوو لەبەر خۆیەوە قسەدەکات. کە چەرخەکەم داگیرسان، دالیا سیراجەدینم لە سوچێکی سالۆنەکەدا بینی، بەتەنیا دانیشتبوو دەگریا، ئەگەرچی ڕێک بەرابەری من بوو، ئەگەرچی دەبایە ڕوناکی چەرخەکەم ببینێت، بەلام نەیبینی، وەک کوێرێک چۆن سەیری نادیار دەکات، ئاوەها لە هەوادا تەماشای شتێکی دیکەی دەکرد، قسەی لەگەل مەخلوقێکی خەیالیدا دەکردو فرمێسک بە چاوانییدا دەهاتە خواری.

بێئەوەی ئاگای لە من بێت دەیگووت: ئاخر تۆ گووتت، کە وا ناکەیت، تۆ گووتت، لە هەر کوێ بیت ئاگادارمدەکەیتەوە، گووتت نە با، نە ئاو، نە ئاگر ناتوانن لەیەکمان دووربخەنەوە.

کەمێک وەستا، وەک ئەوەی لە کورسییەکەی بەرامبەریدا گوێ لە وەلامێک بگرێتەوە، کە من ناتوانم بیبیستم. دوای ئەوەی بەرابەرەکەی ڕستەکانی تەواودەکرد، سەری باداو گووتی: بەلام تۆ وات نەگووت، تۆ دەتگووت، ئێمە لە هەموو شتێک بەهێزترین، هەتا لە مردنیش، هەتا لەو

دیوارانـەش کـە مـردن و ژیـان لەیەکتـر جیادەکەنـەوە.

دیمەنێکـی ئێجـگار سـەیربوو، مـن تـا نزیکتـر ببوومایـەوە ئـەو هـەر نەیدەبینیم. دالیا بەگەرمییەکی بێوێنـەوە دەیگـووت: ژیانـم هیـچ نییـە، گرنـگ تۆیت، گرنـگ ئەوەیـە تـۆ بێیتـە دەرێ، ژیانـی مـن لـە بـەردەم ژیانـی تـۆدا وەک ژیانی چۆلەکەیـەک یـان پەپولەیـەک وایـە، مـن لێرەم بۆئـەوەی بۆتـۆ بژیـم، من ئامـادەم بـۆ مـردن، بـەڵام تـا تـۆ نەیەیتـەدەرێ نامەوێت بمـرم.

کەمێکی دی دەوەستایەوەو ئینجا بەدەنگی بەرز دەیگووت: دەزانم، دەزانم تـۆ نازانیت لـە کوێیت، مـن پێم نەگووتوویت کـە تـۆ دەبێت بزانیـت... تـۆ لـە کوێ بزانیت لـە کوێیت؟ هـا لـە کوێ بزانیـت، بـەردەوام چـاوت دەبەسـتنەوە، وانییە؟ چاوت دەبەسـتنەوە، دڵنیام... پێشـم نەڵێیت خـۆم دەزانـم، دەزانـم لـەو ڕۆژەوەی بردوویانیـت ڕوناکیـت نەبینیـوە، پێویسـت نـاکات خەفـەت لـە مـن بخۆیـت، مـن داوای هیچـم لێکردویـت؟ نەمگووتـووە کـە هاتیتـە دەرێ مـن بهێنـە، نەمگووتـووە سۆزانییەکی بـەرەڵای سـەر شـانۆی تیاترۆخانـەکان بێنـە، ئەگـەر وادەزانـی مـن دەمەوێت تـۆ بمهێنیت بـە هەڵـەدا چوویت، مـن دەمەوێت زیندووبیت، هەسـتبکەم لـەم سـەر زەوییـەی... مـن دڵنیـام ماویـت، مەڵێ مـن مـردووم، دڵنیـام، مەمترسـێنە، هـەر ڕۆژێـک مـن مـردم ئەوسـا بـاوەڕ بە مردنی تـۆ دەکـەم، تـا تـۆ هەناسـەبدەیت، منیـش زینـدووم. ئەگـەر تـۆ نەمێنیـت مـن دەمـرم، بێئـەوەی کـەس پێمبڵێـت، بێئـەوەی هەواڵێـک ببیسـتم، مـن دەمـرم، تـا مـن بتوانـم هەناسـە بدەم دڵنیام تـۆ دەژیـت. هیـچ قسـەیەکی بێمانـام بۆمەکـە، گـوێ لـەم قسـانەی تـۆ ناگـرم. پێشـم مەڵـێ ئـەم جێگایـە بـە جێبهێڵـم، وەک شـەوانی تـر زویـرم مەکـە، گـەر ئێرە بـە جێبهێڵـم ئیتـر ناتوانـم بـەدوای تـۆدا بگەڕێـم، ئێرە باشـترین جێگایـە، هەمـوو نهێنییەکانی دونیـا دێنـە ئـەم شـارەوە، تـۆ ئەوەنـدەت لەسـەرە ئـاگات لـە خـۆت بێـت.

مـن مۆمێکـم دەهێنـاو دامدەگیرسـاند و لـە سـوچێکی نزیکـەوە دادەنیشـتم و سـەیرمدەکرد، هیـچ تێنەدەگەیشـتم، بـەڵام دەمزانـی قسـەکانی پەیوەندیـان

بە نهێنییەکی زۆر قووڵی ژیانی دالیا خۆیەوە هەیە. بەلام نەمدەزانی ئاخۆ هوشیارە یان خەوتووە، مەستە یان وریا. لەقسەکانیدا تورەدەبوو، بەردەوام بە بەرامبەرەکەی دەگووت «تۆ تێناگەیت، دواجار هەر دەتدۆزنەوەو دەرتدەهێنن، تێدەگەیت، من شەو رۆژ ئیشدەکەم و هەرچییەکیش پەیدا دەکەم دەیدەم بەوان... چاکە و سەدەقە؟ ها تۆ ناوی دەنێیت چاکە و سەدەقە؟ تۆ بەم قسانە دەمکوژیت. نا من هیچم لە تۆ ناوێت... کە بەربوویت، مەبەرەوە بە هاورێم، گەر لەو بەری شەقامێکەوە منت بینی سلاوم لێ مەکە، برۆ بە رێگای خۆتدا و بلێ نایناسم، من باکم نییە، لێت زویرنابم. بەلام خۆشەویستی مەکە بە چاکە، من چاکەت لەگەل ناکەم من خۆشمدەوێیت».

ماوەیەکی درێژ دەستی دەخستە سەر دەموچاوی و بێدەنگ دەبوو، هەندێجار سەری دەلەقاند وەک ئەوەی تەنیا بەسەر وەلامی پرسیارەکان بداتەوە، کە دەستی لابرد کەمێک چاوی سرِی و گووتی «درەنگە، باسم، درەنگە دەبێت برۆم، ناگەمەوە مال، دوا قسەم ئەوەیە من دەمەوێت کۆلیج تەواوبکەم، گەر تۆ رازی نیت نایکەم، گەر بزانم دەستم دەگرێت و ناهێلێت بەدوای تۆ بکەوم، نایکەم، بەلام دلنیام دەتوانم پێکەوە هەموویان ئەنجامبدەم. پێتخۆشە؟ من دلنیابووم لەوەی پێتخۆشە، دلی من دلنیابووم، تۆ هەمیشە لە پشتم بوویت... ئێستا زۆر زۆر درەنگە، خودایە چۆن دەگەمەوە مالێ؟ بە چاوی تۆ ناتوانم زیاتر بمێنمەوە. ناتوانم. سبەی شەو هەر لێرە یەکتر دەبینین، گەر نەتتوانی بێیت قەیناکا، من هەر لێرەدا چاوەرێتدەکەم».

وەک عادەتی هەمیشەیی خۆی لە ناکاو هەلدەستاو بێ خوداحافیزی دەرۆی. لەوساتەدا کە هەلدەستا، من لە تاریکییەکەدا، بۆ یەکەمجار شتێکی سەیرم بینی، بۆیەکەمجار ئەو فریشتە بچکولانانەم لە هەوادا بینی کە باسیاندەکات، رەنگە وشەی بینین زۆر راست نەبێت، راستتر وایە بلێم

هەستم پێکرد، دەیان تارمایی بچوکم هەست پێکرد کە لە دەوری دەفڕین، وەک ئەوەی هەڵیبگرن و بیبەن، وەک ڕۆحێکی ئاسمانی، گیانێکی وێڵ لە گەردەلوولدا بڕوات، ئاوەها بە تەنیشتمدا تێپەڕی و نەیبینیم.

من وەک یەکێک لە ڕۆژی نیوەڕۆدا، لە بەر سووره هەتاوی بیاباندا بروسکە لێیدابێت سەراسیمەو حەپەساو سەیرمدەکرد. مرۆڤ کەمجار تووشی سەرسامی وەها دەبێت، وەک ئەوەبوو هەموو شتەکان تەنیا لە چرکە ساتێکی کورتدا ڕوویاندابێت، وەک لە ناکاو ڕوناکییەکی بەهێزت لێبدەن و تا ماوەیەک نەتوانیت هیچ لە دەوری خۆت ببینیت. من بە پەنچە مۆمەکەم خامۆشدەکردو لە تاریکییەکەدا دادەنیشتم، بێئەوەی بتوانم هیچ بکەم، بێئەوەی بتوانم بجوڵێمەوە، بێئەوەی بتوانم بیربکەمەوە. نازانم چەند سەعات لەو تاریکییەدا دانیشتم، نازانم بە درێژیی ئەو ماوەیە بیرم لە چی دەکردەوە، نازانم دەگریام یان وەک باڵدارێکی غەمگین لە تاریکییەک ڕادەمام کە تا دەهات بێسنوور لە بەردەممدا قووڵترو قووڵتر دەبووەوە.

* * *

ڕۆژانێک کە داهات خاوو بێمانابوون، دالیا چەند جارێک سەفەریکردو هاتەوە، هەر جارێک کە دەگەڕایەوە بە کۆمەڵێک دیاری چکۆلانەوە دەهاتەوە، کە بە تایبەت بۆ منی دەهێنا، بەڵام وەک هەمیشە کەم قسەی لەگەڵدا دەکردم. هەرکاتێکیش بمویستایە بیدوێنم بە بەهانەیەک لێم دووردەکەوتەوە، هەندێجار لە بەرچاوی کچەکان باوەشی پیادەکردم و ماچیدەکردم و دەیگووت: کوڕی پوری عەزیزم چۆنی؟ بەڵام لەوە بترازایە نەیدەهێشت زۆر نزیکی ببمەوە. لە قووڵایی دڵیدا دەیزانی من خۆشمدەوێت و دەیویست بەدوورکەوتنەوە ئەو خۆشەویستییەم بکوژێت. تا ئەویش

زیاتر و زیاتر دووربکەوتایەتەوە، من زیاترو زیاتر لە دونیایەکی پڕ درۆو نادروستدا نوقمدەبووم، زیاتر ڕووی خراپم لە کاراکتەری خۆمدا بۆ دەردەکەوت، توانای ترسناک و بێمانام لە خۆمدا دەدۆزییەوە. هەرجارێک لەسەفەر دەهاتەوە، کۆمەڵێک کتێبی ئینگلیزی زۆری پێبوو، وەک ئەوەبوو هەمووان بزانن دەچێت بۆ کوێ، بەڵام لە ڕاستیدا من نەمدەزانی چی دەکات و دەچێت بۆ کوێ؟ لەگەڵ ئەوەشدا من بەوجۆرە دەڕۆیشتم کە دەبایە بڕۆم، من لەسەر دانیشتن و پێکەنین و درۆکانی خۆم بەردەوامبووم. ئێواران پێش هەموویان دادەبەزیمە سالۆنەکە، بە ڕاست و چەپدا ستایش و نوکتەم دابەشدەکرد، بە جگەرەیەکەوە ناوەڕاستی سالۆنەکەم دەگرت، لەگەڵ مۆسیقارەکاندا باسی یارییەکانی هەڵبژاردەی نیشتیمانی و یانەی قوتابیان و هێزی ئاسمانی و یانەی پۆلیسم دەکرد. بێئەوەی ناوی یاریزان و یانەکانیان بزانم وەک ئەوانی تر وێنەی کۆمەڵێک یاریکەرم پەیداکردبوو و بە ژوورەکەمدا هەڵمواسیبوو. لە ڕاستیدا هیچ شتێک لەوە ئاسانتر نییە کە مرۆڤ خۆی تێکەڵاوی ئەو قسەوباسانە بکات، قسەی زۆریان تیابکات بێئەوەی هیچ بزانێت، من بێئەوەی هیچ لە یاری شەق بزانم کەسانێک لە پرتەقاڵی سپی وەک پسپۆڕ تەماشایاندەکردم. لە کاتی یارییەکاندا لە ناوەڕاستی هەمووانیدا لە بەردەم تەلەفزیۆنەکەدا دادەنیشتم و بەردەوام قسەمدەکرد و دەمگووت: ها، دیفاعی چەپم زۆر بە دڵ نییە، من بم لە بری ڕاهێنەرەکە ژمارە هەشتەکە، مەبەستم شوبهەکەی ئەوسەرە دەیهێنمە شوێنی دیفاعی ڕاست، ئەو ڕەقەم سێیە دەبەمە ئەوسەر، بۆئەوەی لەویادا بۆشایی دروست نەبێت، ئەویا زۆر گرنگە، چونکە تۆپەکانی زەورا زۆربەی بە لای چەپدا دەڕوات، یان من بم سەر لەبەری پلانی یارییەکە دەگۆڕم، دەیکەم بە پێنج ـ سێ ـ دوو، لەمجۆرە یارییانە کە خاڵ کۆکردنەوە گرنگە، دەبێت دیفاعبکەیت.

یان دەمگووت: عەدنان ئەمڕۆ زۆرباش نییە، لەم حاڵەتانەدا کە

یاریکەرێکی ئەساسیت تەواو نییە، دەبێت زۆر بڵاوبیتەوەو تۆپی درێژ یاریبکەیت، زۆر تۆپ لە قاچی خۆتدا بهێڵیتەوە، ئەوەندە تۆپەکە بهێنیت و ببەیت تا یاریکەرەکانی ئەولا شێتدەبن، لەم حاڵەتەدا شووت بۆ گۆڵ لێمەدە، هەر تۆپەکە بهێنەو ببە، بیهێنە و ببە، بیهێنەو ببە، سەیردەکەیت پاش تۆزێک دیفاعەکەیان گێژ بووە. وەلقورعان لعظیم لە یاریدا ئەوە موهیمە ئەولا گێژبکەیت. من بم لە جیاتی مودەرییەکە گێژیاندەکەم.

لەو ماوەیەدا بڕێکی زۆر لەم قسانە فێربووبووم کە مانایان نەبوو، بەڵام وەک قسەی زۆر گرنگیش دەردەکەوتن. لە یارییە نێو دەوڵەتییەکاندا دەمکرد بە هەرا، کە هەڵبژاردەی نیشتیمانی دەیدۆڕاند لە هەموویان زیاتر دەگریام، لە کاتی پەنالتی لێداندا دەکەوتمە نینۆک خواردن، کە فاولیان لە یاریکەرەکانی ئێمە دەکرد، جنێوم دەدا، کە دەشماندۆڕاند هەموو وەخت خەتاکەم دەخستە ملی حەکەمەکە.

مۆسیقارەکانی پرتەقاڵی سپی، هەمیشە حەزیان لەوەبوو پێیان بڵێیت گوناهی حەکەمەکە بووە کە دۆڕاندووتانە، منیش ئەو درۆیەم بۆ دەکردن کە حەزیان لێیبوو. لە دوای تەواوبوونی گەمەکان تا دوو ڕۆژ هەموو گوێیان لە تەفسیرەکانی من دەگرت، دەمگووت: لەسەرەتای یارییەکەدا پەنالتییەکی بۆ ئەوان حسابکرد، پەنالتی نەبوو، کوێریش دەیبینی لەو دیو خەتی جەزاوە بوو، وەلحوسەین لەو دیو خەتی جەزاوە بوو، گۆڵی یەکەمیان تەسەلول بوو، ئەخیل کەریم، تۆپ دەرنەچوو، هجومەکەیان دە مەتر لەودیوەوەیە، یەعنی چی ئاوتسساید نییە، یەعنی هەر ئەو حەکەمە قانون دەزانێت؟ ئاخر ئێمەش شتێکی لێدەزانین، وە شەرەف ئەلئەنبیاء من ڕەئیسی ئیتیحادی کورە بم، سبەێنێ موقاتەعەی هەموو دەورەکە دەکەم، یاریکەرەکان سەحبدەکەمەوەو خەلاس، با ئیتیحاد ئاسیاوی سەری خۆی لە دیوار بدات، بێ مونتەخبی ئێمە وە حەقل ڕەسولل کەریم دەورەکە

دەبێتە مەهزەلە.

بەڵام درۆکانم هەر لەم ئاستەدا نەبوون، بەڵکو پەلی دەکوتا بۆ هەندێ بواری تریش، هەندێک شەو لە بەینی بەرنامەکاندا دادەنیشتین و سەیری زنجیرە میسرییەکانمان دەکرد، من هەمان شێوە دەمکردە هەرا، دەمگووت گەر من دەرهێنەرەکە بامایە، فڵانە ئەکتەرم دەکردە دەرێ، فڵانە دەور بۆ ئەم باش نییە و بۆ ئەوی تر باشە. مەکیاجی ئەم ئەکتەرە تۆختر دەبێت کەمێک کاڵبکرێتەوە، جوڵەی کامێراکە لێرەدا دەبێت لە ڕاستەوە بۆ چەپ بێت، نەوەک لە چەپەوە بۆ ڕاست. لێرەدا باشترە ئەکتەرەکە لە مسەرەوە بێتە ناو کادرەوە، ڕوناکی لێرە تۆزێک کەمتربووایە دیمەنەکە جوانتر دەبوو.

هێندەم قسەدەکرد، هەندێک لە کچەکان لە ناوەڕاستی زنجیرەکاندا بە پێڵاو لێیاندەدام تا بێدەنگ بم، بەڵام هەندێکی دیکەیان هێندەی حەزیان لە قسەکانی من دەکرد حەزیان لە زنجیرەکە نەبوو. من بەردەوام کۆمەڵێک سیناریۆم دادەڕشت، کە هەندێجار لەو سیناریۆ بێمانایەی سیناریستەکە باشتربوون. من بۆ خۆم لەبری زنجیرەکە، لە پاڵەوان و ڕووداوەکان زنجیرەیەکی ترم دروستدەکرد، کە هەندێک لە کچەکان بە هەمان شەوق و ئارەزووەوە گوێبیستی دەبوون، بۆ نمونە گەر لە زنجیرەکە پاڵەوانەکە بچووبایە بۆ شارێکی دوور، من پاڵەوانەکەم دەنارد بۆ دوورگەیەکی چۆڵ و نادیارو نەدۆزراوە لە دەریای سپی ناوەڕاست. گەر پاڵەوانەکە هەندێ چەتەو پیاوخراپی تووش ببوایە، پاڵەوانەکەی من لە دوورگە چۆلەکەدا هەندێک خێڵی سەرەتایی نەدۆزراوەی تووش دەبوو، گەر کچێک لە ناو چەتەکاندا پاڵەوانی زنجیرەکەی خۆشبویستبایە، پاڵەوانەکەی منیش عاشقی حۆرییەک دەبوو کە بە ڕۆژ دەچووەوە ناو ئاوو بە شەو دەهاتە دەرێ... ئیدی شان بە شانی ڕوداوەکانی زنجیرەکە من چیرۆکێکی درێژم دروستدەکرد، کە سەرتاپای کوشتن و شەڕو خۆشەویستی بوو،

بەلام پڕ لە قسەی پڕوپووچ و گۆڕانکاری ناوەخت و نابەجێ، لە ڕاستیدا گۆڕانکارییەکان بە جۆرێک کوتوپڕو سەیربوون، من خۆم پێکەنینم پێیدەهات، بەلام لەبری ئەوەی وا لە کچەکان بکات بڕشێنەوە هەندێکیان زیاتر بە خەیاڵ و فەنتازیاکانی من سەرسامدەبوون.

دالیا سیراجەدین هەمیشە لە دوورەوە تەماشایدەکردم و تێکەڵ بە دانیشتنەکانم نەدەبوو، لەگەڵ ئەوانی تردا وەک خۆی قسەیدەکرد، وەک خۆی هەڵدەستاو دادەنیشت، هەموو ڕۆژێک ئەملاولای کچەکانی ماچدەکرد، دڵی مۆسیقارەکانی دەدایەوە، کە قسەیدەکرد هەموو گیانی دەجولا، کە پێدەکەنی شتەکانی دەوروبەری دەدرەوشانەوە. بە خێرایی دەهات و دەچوو، بەر لە دەست پێکردنی بەرنامەکان بەو کراسە پولەکە گران و قەشەنگانەوە، بەو پێلاوە زۆر بەرزانەوە کە بە زەحمەت دەیتوانی پێوەی بڕوات، بە هاڕەهاڕی کۆمەڵێک خشڵی بەدەوییەوە دەبایە هەموو شتێک کۆنترۆڵبکات، ئەو مکیاجە شێتانەیەی نەبێت کە بە جۆرێکی ترسناک لە دەموچاوی دەسوو هەموو شتێکی تری جوان بوو. کە منی دەبینی بە هێمنی قژی لادەدا و دەیویست سەیرمنەکات... ناخۆشترین شت لە کچاندا ئەوەیە کە تەماشات ناکەن لە بەرئەوە نییە کە تەماشات ناکەن، بەڵکو بۆئەوەی تێتبگەێنن کە تەماشات ناکەن. بۆئەوەی پێت بڵێن: بەڵێ جەناب، من تەماشات ناکەم و تۆش چیت لەدەست دێت بیکە. تەماشات ناکەن بۆئەوەی وات لێبکەن زیاتر تەماشایانبکەیت. بۆئەوەی دوایی کە شتێک لە نێوانتاندا دروستبوو، کە تۆ قسەیەکت لە دەم ترازا بڵێن «ها من ئەوکات تۆم هەر نەدەبینی، تۆ کێ بوویت، من ئەسڵەن سەیری تۆم نەدەکرد، تۆ ڕێگات بە من گرت». من ئەوکات هەموو ئەو فێڵانەی دالیا سیراجەدینم بەسەردا تێدەپەڕی، ئەگەرچی لە ناوەڕاستی کچان و مۆسیقارەکاندا وەک شەیتانێکی حەوت شاخ دەرکەوتبووم، بەلام لەبەردەم هەموو تەکنیکێکی سەرەتایی دالیادا پەکمدەکەوت. ئەو دەیتوانی بە منداڵانەترین یاری کە بەسەر منداڵێکی

دوازدە ساڵدا تێناپەڕێت، تائەوسەری دونیا من بەدوای خۆیدا ڕاکێشێت. کە دەمبینی تەماشام ناکات، من ئیتر بەردەوام تەماشامدەکرد، کە دەمبینی ئەو بە هیچ جۆرێک بیر لە من ناکاتەوە، من بەردەوام بیرم لەو دەکردەوە، لەبەرئەوە هەموو شتێکم لە دالیا سیراجەدیندا لەبەرکردبوو، جولانەوەکانی، هەستانی، ڕۆیشتنی، گۆرانی نێو نیگای، شوێنی تاڵەکانی پرچی، جۆری مکیاجەکەی، ڕەنگەکانی پشتچاوی، ژمارەی ئەو قەڵەمانەی کە لێوی پێ سوردەکات، جۆری ماسکاراکەی. هەندێجار هێندە سووک دەجولایەوە پێدەچوو بفڕێت، هەندێجاریش هەستمدەکرد ناتوانێت بڕوات، مەسەلەکە تەنیا پێڵاوەکانی نەبوو، بەڵکو شتێکیش بوو لە ڕۆحیدا کە هەندێجار هێند لەشی قورس دەکرد نەتوانێ بجولێتەوە، هەندێجاریش بەجۆرێک باری سووکدەکرد بتوانێت بفڕێت.

من دوای ئەو شەوە گەلەک شەوی تر دالیا سیراجەدینم لە هۆڵی سەماکەدا بینییەوە، هەمیشە بە مۆمێکەوە لە سوچێکدا دادەنیشتم و تەماشامدەکرد، لە کاتێکی دیاریکراودا دادەبەزی، لە سەر هەمان کورسی دادەنیشت، باوەشیدەکرد بە سێبەری پیاوێکی خەیاڵیدا، پێکەوە دادەنیشتن و تا بەربەیان قسەیان دەکرد. لەو شەوە سەیرانەوە چیرۆکی ژیانی دالیا سیراجەدینم زانی، ڕستەڕستە حیکایەتەکەم نایەوە بەیەکەوە. هەموو شەوێکیش لە بەر ڕوناکی مۆمەکەمدا فریشتە بچوکەکانیم دەبینی لەگەڵیدا دێن و دەڕۆن، دەستی دەگرن و پارێزگاریدەکەن.

بەڵێ، ژیانی دالیا سیراجەدین وەهابوو، بە ڕۆژ لە ژوورەکەی خۆیدا تا درەنگ دەمایەوە و بە شەویش دوای بەرنامەکان ژوانێکی خەیاڵی هەبوو، لەگەڵ کوڕێکی خەیاڵیدا، لەشوێن و کاتێکی خەیاڵیدا.

ئەو ڕۆژانەی دالیا سیراجەدین لە شاری زەردی سۆزانییەکان نەبوو، وەڕزی و بێتاقەتی منیان فێری گەڕانی ناو کوچەکان کرد. من لەو کاتەوە

دەمزانی ئەو خۆشەویستییە خەنجەرێکە لە دڵمدا، بەڵام دەشمزانی بێئەو خەنجەرە ناتوانم بە زەویدا بڕۆم، دەمزانی هەرچییەک بکەم ئەو کچە منی وەک خۆشەویستێک قبوول نییە. ئێستاش دەڵێم گەر مرۆڤ یەکەمین خۆشەویستی گەورەی خۆی دۆڕاند، ئیدی تا مردن بوونەوەرێکی دۆڕاوە. خۆشەویستی وەک شەترەنج نییە، مرۆڤ کە دەستێکی دۆڕاند خۆی کۆبکاتەوە بۆ دەستێکی تر، مەشق بکات، فێرببێت، لە عەشقدا یەک دەست هەیە، یەک یاری هەیەو تەواو، کە دۆڕانت بزانە بۆ هەتاهەتایە دۆڕاندووتە، هیچ کەس نییە لەم سەر ئەستێرەیە دووجار بە هەمان شێتی، هەمان سۆز، هەمان پلەی سووتان و دێوانەگییەوە عاشق بێت. وەک چۆن لە ژیانی هەموو سەرکردەیەک یان سەرهەنگێکی سوپادا شەڕێکی زۆر گەورە هەیە، شەڕێکە بوون و نەبوون و مانای ژیانی لەو شەڕەدا کۆدەبێتەوە، لە ژیانی هەموو مرۆڤێکیشدا عەشقێکی وەها هەیە، عەشقێکە دەچێتە دەرەوەی قانونەکانی عەقل، دەچێتە ئەودیو سنووری شیاوو نەشیاوەوە. ئەمجۆرە عەشقە پەیوەندییەکی بەو تاکتیک و گەمانەوە نییە کە بە درێژایی مێژوو ژنان و پیاوان گەشەیان پێداوەو لەسەر پلان و نەخشەکانی یاریدەکەن، ژنان و پیاوان هەموو ڕۆژێک، لە هەموو یەکدی بینینێکدا، لە هەموو نزیکبوونەوەیەک و دوورکەوتنەوەیەکدا ئەو گەمانە دەکەن، هەر یەکەیان کۆمەڵێک تەکنیکی خۆنزیکخستنەوەو دوورکەوتنەوەی هەیە، هەر یەکەیان جۆرە پلانێکی ڕاکێشان و دوورکەوتنەوەی هەیە، هەریەکەیان ژمارەیەک فێڵی کۆنترۆڵکردن و دەستەمۆکردنی بەرامبەرەکەی لەلایە، ئەم تەکنیک و گەمانە لە هەموو پەیوەندییەکی ژن و پیاودا ڕەنگدەدەنەوە، هەتا کاتێک ژن و پیاوێک بۆ کورتترین ساتیش لە کوچەیەکی خاڵیدا بەلای یەکتردا تێپەڕن و کەسیشیان تەماشای ئەوی دیکەیان نەکەن، هەتا ئەو کاتانەش ئاسەواری ئەو گەمانە لە لەش و جوڵەو شێوەی ڕۆیشتنیاندا دەردەکەوێت. بەڵام عەشق شتێکی ترە، عەشق ئەو جێگایەیە کە هەموو ئەم یاسایانە

پەکیاندەکەوێت، هەموو ئەم گەمەو تەکنیک و پلانانە ئیدی ئیشناکەن. جیاوازی نێوان عەشقی ڕاستەقینەو گەمەکانی تر وەک جیاوازی نێوان کوشتنی مرۆڤێک وایە بە ڕاستی لەگەڵ کوشتنیدا لەسەر تەختەی شانۆ، وەک جیاوازی خوێنێک وایە کە خەنجەرێکی ڕاستەقینە لە دڵت دەریدەهێنێت لەگەڵ شوشەیەک مەرەکەبی سووردا کە دەرهێنەرێک دەیڕێژێت بەسەر سینەتدا، مرۆڤ تەنیا لە ساتی عەشقدا ناتوانێت ئەکتەر بێت، ئەو ساتەی لێدەرچێت لە کۆی ساتەکانی تری زیندەگیدا مرۆڤ ئەکتەرە و کەسیش هەستی پێناکات.

من لە پرتەقاڵی سپی ئەکتەرێکی گەورەبووم، تەنیا شتی ڕاستەقینە لە ژیانمدا ئەو عەشقە نهێنییە بوو کە بۆ دالیا لە دڵمدا بوو، شتێکی سەیرە گەر بڵێم عەشقم بۆ ئەو بێهودەو سەرابی بوو، چونکە بێهودەیی، نەگونجان لەگەڵ ژیاندا، تێکەڵنەبوون بە ئیقاعی شتەکانی تر بەشێکە لە خۆشەویستی. شتێکی سەیریش دەبێت گەر بڵێم خۆشەویستییەکەم بۆ دالیا شتێکی ترسناک بوو، مەترسییەکی بێوێنەی لەسەر ژیانی منیش و ئەویش هەبوو، من شێتانە خۆشمدەویست، بۆئەوەی زەمانێکیش بدەم بەو خۆشەویستییەم دەمتوانی شتی زۆر خراپ بکەم. تا ئەندازەی ئەوەی بتوانم بیکوژم، یاخود بتوانم خۆم بکوژم یان شتی خراپتریش. بەلام ئەوەی وا لە مرۆڤ دەکات دەستبگیرێتەوە، چاوەڕوانکردنی موعجیزەیە، من دوای ئەم چەند ساڵە دەتوانم بڵێم، من چاوەڕوانکردنی موعجیزە لەو شارەدا ڕایگرتم. من بە موعجیزە لەسەر زەمین مابووم، هەر کەسێک بۆ کوشتن بردبێتیانە ئەو بیابانانەی باشوور و بە زیندوویی هاتبێتە دەرەوە بە موعجیزە ماوە، لە بەرئەوە لە بیرتان نەچێت من منداڵی موعجیزە بووم، من کوڕی موعجیزە بووم، یەک لە دوای یەک موعجیزەی سەیر سەیر لە ژیانمدا ڕوویاندەدا. ئەو کاتیش کە لە کوچەکانی شاری زەردی سۆزانییەکاندا دەسوڕامەوە چاوەڕوانی موعجیزەم دەکرد.

شارێک بوو تا پتر بە کوچەکانیدا بگەڕابایتایە ترسناکترو سەیرتر دەردەکەوت، لە گۆڕانێکی بەردەوامدا بوو، لە دەریایەک دەچوو کە هەڵچوون و داچوونی هەبێت، هەندێجار کە پیاسەمدەکرد تا ناکۆتا کوچەی باریک و درێژ و پێچاوپێچ بوو، پێموابوو هەرگیز ناگەمە ئەوسەر، وەک دەریایەک وابوو کە تێیدا شەپۆل شەپۆلی تر دروستدەکات، هەر کوچەیەک کوچەیەکی تری وەک خۆی دروستدەکرد، کە بەردەوام کۆمەڵێک ڕێبواری تۆزاوی بە ناویاندا دەگەڕان. هەتا دیمەن و نیگاو ڕوخساری ڕێبوارەکانیش دووبارە دەبوونەوە. هەستمدەکرد هەندێک لەو ڕێبوارانە ئەزەلیین، هەستمدەکرد کۆمەڵێک میوان هەن لەم شارەدا تارمایین، بەردەوام بە هەموو کوچەکاندا دەگەڕان، هەندێک مەخلوقاتم دەبینی بە جانتاکانی دەستیانەوە لەو تۆزە زەردەدا بەدوای ناونیشانێکدا وێڵبوون کە نەیاندەدۆزییەوە، هەندێکیان تارمایی سپیپۆش بوون کە هەمیشەو هەمیشە بێئامانج دەسوڕانەوە. هەندێک پیاوی شەرمنبوون کە هێزی دەستیان نەبوو لە هیچ دەرگایەک بدەن. هەندێکیان بۆ مەبەستی نادیار، نیازی بەد، خواستی خراپ لەوێ بوون، هەندێکیان عاشق بوون بەدوای تۆڵەیەکی گەورەدا دەگەڕان، هەندێکیان لەوانەبوون کە بۆ سۆراغی یەکێک دێن و ئیدی بۆ هەتا هەتایە وندەبن، هەندێکیشیان سووک و سادە مەخلوقاتێکی بێشوێن و جێگا بوون، ڕۆحی وێڵ بوون و لەو کوچانە زیاتر شوێنێکی دیکەیان نەبوو ڕووی تێبکەن. بەڵام ئەو شارە هەندێجار لە ناکاویش بچوکدەبووەوە، وەک ئەوەی زەوییەکە هەناسەوەرگرێت و لەگەڵ هەوادا شەقام و کوچەکانیش هەڵمژێت، یان وەک بەحرێک داچێت و لەگەڵ کشانەوەی شەپۆلەکانیدا کوچەو ماڵ و شەقامەکانیش بچنە بنەوە. من هەندێجار کە دەهاتمەدەرێ بۆ پیاسە، دەمبینی ئەو شارە بەجۆرێک بچوک و تەسکبۆتەوە، وەک ئەوەی هێزێکی نهێنی ماڵەکان و کوچەکانی ترازاندبێتە ناو یەک، من دەوەستام و بە خۆم دەگووت هەموو ئەو قسانەی کە موسای بابەک لەسەر ئەم یۆتۆپیای

ناو لمە کردی ڕاستبوون، هەندێجار شتەکان لە ناکاو دەگۆڕان، وەک ئەوەبوو، ئێمە و پرتەقاڵی سپی بە تەنیا لە دەریایەک لمدا ونبووبین. وەک ئەوەبوو کەوتبێتینە بورجێکی نادیارەوە، شتێک ئێمەی جیاکردبێتەوەو لە هەموو ئەو شارەی دابڕیبێتین. چەندەها ڕۆژ چاوەڕێماندەکرد و کەس نەدەهات بۆ پرتەقاڵی سپی، من دەهاتمە دەرەوەو دەمویست بەو شارەدا پیاسەبکەم، بەڵام جگە لە بیابانێکی بێسنووی لم هیچی دیکەم نەدەبینی. ئەو ڕۆژانە مۆسیقارەکان و کیژەکانیش دەگەڕانەوە ژوورەکانی خۆیان، هەرکەسەو لەخەڵوەتی خۆیدا دەرگای لەسەر خۆی دادەخست و نەدەهاتە دەرێ، هەندێک لە مۆسیقارەکان ئەو ڕۆژانەیان ناودەنا «جەژنی لم»، بەڵام بۆ من جگە لە وەرزی زەردو ترسناکی مردن زیاتر هیچی دی نەبوو. لەو ڕۆژانەدا من بە تەنیا لە بالکۆنەکەدا یان لە سالۆنەکەدا دادەنیشتم و بیرمدەکردەوە. لە پرتەقاڵی سپی هیچ هاوڕێیەکی ڕاستەقینەم نەبوو، بە گشتی وەک کوردێکی غەریبە سەیردەکرام کە ڕیشەیەکم لەو زەوییەدا نییە. باوەڕناکەم هەموو ئەوانەشی کە لە پرتەقاڵی سپی کاریاندەکرد باوەڕیان بە چیرۆکەکەی دالیا سیراجەدین کردبێت، دەربارەی کوڕی پورێتی من بۆ دالیا، بەڵام هەموو ئەوانەی کە لەو تیاترۆخانە تۆزاوییە کاریاندەکرد بە گشتی نهێنی خۆیان هەبوو، نهێنییەک نەیاندەویست کەسی تر بیزانێت، لەبەرئەوە جۆرە پەیمانێکی بێدەنگ و شاردراوە لە نێوان هەمووانیدا هەبوو کە نهێنی یەک بپارێزن. ئەو ڕۆژە سەیرو سارد و خنکێنەرانە تەنیا یەک ئافرەت دەهات بۆ پرتەقاڵی سپی، ژنێکی عەرەبی زل بوو، ئەسمەرێکی تۆخ بوو بە دوو گوارەی ئاسنینی گەورەوە، بە لووتەوانەیەکی ڕەشەوە، بە ڕیزێک خاڵی سەوزەوە کە پێدەچوو بە درێژایی هەموو لای چەپی لە ناوچاوانییەوە تا قوولەپێی درێژبووبێتەوە، بە جووتێ مەمکەوە کە لە دوو جەوەندەی پڕ هەوا دەچوون، پێیاندەگووت «شاژنی تۆز»، ئیشی ئەوەبوو ئەو تەپوتۆزە بسڕێت کە بە جۆرێکی سەیر هەموو جێگایەکی دادەپۆشی،

ئافرەتێک بوو تەنیا لەسەر سڕینی تۆز دەژیا، زنجیرەیەک ماڵ و کوچە و شاری هەبوو بەسەریاندا بگەڕێت و لە تۆز پاکیانبکاتەوە، هەموو ژیانی لە شەڕێکی کوشندەدا لەگەڵ تەپوتۆزدا بردبووەسەر. هێندەی ئەو با بیابانییە خنکێنەرانە بە خۆیان و گێژەنە سامناکەکانی لمەوە هەڵیدەکرد، ئەو سەفەری ئەفسوناوی خۆی لە ڕەشەباکاندا دەست پێدەکرد، تەنیا کەسێک بوو لەو گەردەلوولە سامناکانەی لمدا بە ئاسانی دەژیا، دەیتوانی بڕوات و ڕێگا وننەکات، شارەو شار بگەڕێت و نەخنکێت.

ڕۆژێک لەو ڕۆژە ترسناکانەی تەپوتۆز، لە ژوورەکەی خۆم دابەزیم، کراسێکی بێجیم لە بەردابوو، دەستەسڕێکی سووری خەتدارم کردبووە ملم و جگەرەیەکم داگیرساندبوو، بە دەم فیکە لێدانەوە هاتمە ساڵۆنەکەوە، لە دەرەوە گەردەلوولێکی ترسناک لوورەی دەهات، دەرگاو پەنجەرەکانی پرتەقاڵی سپی هەموویان داخرابوون، بەڵام لە ژوورەوەش گوێم لە دەنگی ئەو دەنکە زیخانەبوو کە دەیاندا بە پەنچەرەکاندا، من فیکەم لێدەداو سەمامدەکرد و لە بەر خۆمەوە گۆرانییەکی عەرەبیم دەگووتەوە کە لە کۆتاییەکەیدا دەبووایە بە دەنگێکی کچانە بڵێیت «سوکەر یا سوکەر». گۆرانییەکی زۆر بێمانابوو، بەڵام بەوەدا کچەکان زۆر لەسەر سەحنەکە دەیانگووت منیش لە بەرم کردبوو. کە شاژنی تەپوتۆز دەرکەوت من لە مەتبەخەکەدا پارچەیەک گۆشتی قوتوی کۆرن بیفم لەگەڵ هێلکەدا سووردەکردەوەو گۆرانیم دەگووت، وەک هەمیشە بەدەم گۆرانی گووتنەوە بەسەر سڵاوێکم لێکرد و هیچم نەگووت. ئەو ژنێکی بێدەنگ و پڕ نهێنی دیاربوو، بەڵام تووڕەیی و ڕقێکی بێدەنگ بەرابەر بە هەموو گەردون لە چاویدا بوو. ژنێکی جوان نەبوو، بەڵام ناشیرینییەکی تەلیسماویی هەبوو، هەر جارێک دەمبینی گەردەلوول و لم و بیابانی ناکۆتام بە یادا دەهاتەوە، ناشیرینییەکەی لەو دزێویانە نەبوو کە شەیتان دروستیدەکات، بەڵکو جۆرە ناشیرینییەک بوو خودا بە وردی کاری تیا کردبوو، دەموچاوێک بوو لە

دەموچاوی جوانی کچانی پرتەقاڵی سپی زیاتر بەرەو خەیاڵ و بیرکردنەوەی رادەکێشایت. ئەو ڕۆژە شپرزەترو سەیرتر هاتە بەرچاوم، بەر لەوەی دەستبکاتە پاککردنەوە، سەرکەوتە سەرێ بۆ لای دالیا. پاش تۆزێک بە شپرزەیی هەردووکیان هاتنەدەرێ و لە پرتەقاڵی سپی چوونەدەرەێ. من بە دەستەسرەکەی ملمەوە زوو زوو ملم لە مەتبەخەکەوە درێژدەکردو بە دەنگی بەرز دەمگووت «سوکەر یا سوکەر وە حیاتک یا سوکەر، یا بەطە یا سوکەر». بەدەنگێک گۆرانیم دەگووت هەموو ماڵەکە دەلەرییەوە، زۆری پێنەچوو دالیا سیراجەدین هاتەوە ژوورێ و بەرەو لای من لە مەتبەخەکەدا هات، کە دالیا سیراجەدین هاتە ژوورێ خەریکبوو خواردنەکەم پێدەگەیی، دالیا گووتی: بێزەحمەت دەتوانیت تۆزێک ڕاوەستیت و ئەم گۆرانییە بێمەعنایە نەڵێیت.

من گووتم: بۆچی بیوەستێنم گۆرانییەکی خۆشە، دەنگی من زۆر لەگەڵیدا دەگونجێت، وانییە؟ دالیا بە دەنگێکەوە کە تکای تیابوو، گووتی: تکات تیادەکەم جەلادەت شتێکی زۆر گرنگە... شتێکی زۆر زۆر گرنگە، دەمەوێت گوێم لێبگریت، مەسەلەی ژیان و مردنە، پێویستیم بە یارمەتی تۆ هەیە.

من گووتم: خانمم گەر دەتەوێت، تا مردن قسەناکەم، تا مردن گۆرانی ناڵێم، گەر حەزدەکەیت سەد ساڵ لە پێناوی تۆدا بە پێوە لەسەر قاچێک دەوەستم، با لم و ڕەشەبا لێمبدەن، من بۆ جوانییەکی وەک تۆ ئامادەم هەزار ساڵ بە کەڕو لاڵی لەسەر زەوی بسوڕێمەوە، ئامادەم هەزارساڵ دەستبخەمە سەر ساجێکی گەرم و نەڵێم وەی. ئامادەم شەش هەفتە ئاو نەخۆمەوەو نەڵێم تینوومە، شایەتومان لەسەر ناوت بهێنم و خۆم فڕێبدەمە ناو تەنوورەوەو نەسووتێم، لەناو لمدا خۆم بنێژم و تەنیا لووتم بەدەرەوە بێت، بەشی ئەوەی هەوا هەڵمژم، بچمە ژێر داری کەژاوەیەک کە تۆ بە بوکێنێ بۆ غەریم و ڕەقیبانم دەبات، هەر بەو مەرجەی تۆ ڕازیبیت.

دالیا وەک هەموو کچەکانی تر، حەزی لە درۆکانی من دەکرد، بە زەردەخەنەیەکی غەمگینەوە گووتی:جەلادەتی کۆتر، کاتی ئەم قسانە نییە، کەمێکی تر وەرە خوارەوە بۆ ژێر زەمینەکە، کارم پێتە.

* * *

هەر سێکیان چاوەڕوانیاندەکردم. لەدەرەوە گەردەلوولێکی ترسناکی لم بوو، هەستمدەکرد هەوا پڕە لە دەنگی گیانەوەری زامدارو نەبینراو، من هەمیشە ڕۆژانی ڕەشەبا گوێم لە دەنگی ئەو گیانەوەرانە دەبوو لە بادا، دڵنیابووم ڕۆژانی ڕەشەبا هەموو ڕۆحلەبەرە زامدارەکان دێنەدەرێ و هاواردەکەن. ڕەشەبا ڕۆژێکی باشە بۆ هەر ڕۆحێکی بریندار بیەوێت هاواربکات. کە گەیشتمە ژێر زەمینەکە «دالیا سیراجەدین» و «شاژنی تەپوتۆز» و پیاوێکی غەمگین چاوەڕوانیاندەکردم. نەقیبێک بوو لەتەواوی جلە سەربازییەکانیدا. بە هێمنی لەسەر لێواری قەرەوێڵەکەی من دانیشتبوو «مەبەستم ئەو قەرەوێڵەیەیە کە من یەکەمجار بە برینداری لەسەری کەوتبووم»، من لەو ئێوارەیەوە کە موسای بابەک لە تەک خۆیدا بردمی ئیدی ئەو ژێر زەمینەم نەبینیبوو. جۆرێک لە ترس لە دالیادا بوو کە بە ڕوخساریی نائاشنا بوو، هەوای ژێر زەمینەکە وەسوەسەو دوودڵی لێدەباری. من وەک مۆسیقارێک ڕۆژێک لە ڕۆژان بڕوام بە کەسێک نەبووە لە سوپادا کاربکات، هەموو ئەوانەی لە سوپادا کاردەکەن دڕندەیەکی نەخۆش لە ناویاندایە، لای من گرنگ نییە تۆ لە چ سوپایەکدا کاردەکەیت، لە سوپای وڵات و دەڤەری منداڵیت یاخود لەگەڵ دوژمندایت، هەموو ئەفسەرو دەرەجەدارەکانی دونیا لای من دڕندەن، حەزیان بۆ کوشتن لە هەرشتێ گەورەترە، حەزیان لە دەسەڵات و لێخوڕینی ئەوانی دی

لەهەموو حەزێکی دی فراوانترە، هەتا ویقاریان لە ویقاری گورگێک دەچێت بەرلەوەی دەمبخاتە خوێنی نێچیرەکەیەوە. دالیا دەیزانی وەک کوردێک من بڕوام بە هیچ کەسێک نییە جلی سەربازی لەبەردابێت، دەیبینی چۆن خۆمیان لێدەپارێزم، چۆن لە پرتەقاڵی سپی بێدەنگ سڵاوێکیان لێدەکەم و مل شۆڕدەکەم و بەلایاندا دزەدەکەم. دزێوترین کاراکتەرێک لەسەر ئەم ئەستێرەیە کاراکتەری ئەوانەیە کە جلی سوپایان لە بەردایە، لای من هەموو لەشکرەکانی دونیا لەشکری شەیتانن، خودا ڕۆژێک لە ڕۆژان سوپای نەبووە، ئەگەر خودایەک هەبێت ئەوا هەرگیز پێویستی بە سوپا نییە. خودا شاعیرانی هەبووە، خۆفیداکارانی هەبووە، پێغەمبەرانی تاک و تەنهای هەبووە کە چوونەتە ناو ئاگرو سەر خاچ، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان پێویستی بە سوپا و جەنگاوەر نەبووە، پێویستی بە ئەفسەرو دەرەجەدار نەبووە.

ئەو ڕۆژە یەکەمین ڕۆژم بوو نەقیب «سامیری بابلی» ببینم. یەکەمین جاریشم بوو ئەفسەرێک بە غەمگینی ببینم، لەو ماوەیەدا گەلەک سەربازو ئەفسەری ماندوو شکستم بینی بوو، بەڵام ڕێکەوتی ئەفسەرێکی وەها غەمگینم نەکردبوو. ئەو ئەفسەرە بێڕەحمانەی کە لە دە ساڵی ڕابوردوودا سوپا پەروەردەیکردبوون، چەشنە جانەوەرێک بوون لە ساتی شکست و دۆڕاندنیشدا غەمت لە چاویاندا نەدەبینی. دوو شت لە ڕوخساریاندا بوو، سەرکەوتن یان زەلیلی، شانازیی یاخود ملهوڕی، بەڵام بەختەوەری ڕاستەقینە یاخود غەم لە چاویاندا نەبوو. هەتا کاتێک کە دەهاتنە پرتەقاڵی سپی و لەسەر کورسییەکان دادەنیشتن هەمانشێوە بە ویقارێکی سەربازی ڕەقەوە پاڵیاندەدایەوە، کە دەیانخواردەوە چرچترو دزێوتر و درێژتریش دەبوون، کە زۆر زۆریان دەخواردەوە وەک ئەوەبوو لەسەر ئاگرێکی هێمن پیشیان خواردبێت لچیان بە جۆرێکی سەیر شۆڕدەبووەوە، چەناگەو بەر گەروویان بە جۆرێکی نائاسایی ئەستووردەبوو، وەک ئەوەی چەند

توێژێکی دی لە چەرمت تێگرتبێت. کە لەگەڵ کچەکانیشدا هەڵدەستان بچنە سەرەوە، هێشتا هەر لەوە دەچوو بە گۆچانەکانی بنباڵیانەوە لە مەیدانی مەشق و عەرەزاتدا بن، هەر هەمان گرژی و مۆنی لە چاویاندا بوو. ئەوە یەکەمجاربوو ببینم ئەفسەرێک دوو چاوی ڕەشی گەورەی هەبێت، دوو چاوی سەیر، وەک چاوی تەڕی باڵدارێکی گەورە کە بە درێژایی شەو بە ژێر باراندا فڕیبێت.

دالیا سیراجەدین بە دەنگێکەوە کە پڕبوو لە دوودڵی گووتی: جەلادەتی کۆتر، ئەمە ئەو نهێنییەیە کە لە مێژە لە تۆی دەشارمەوە، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پێتبڵێم. گوێبگرە، ئەم دوو کەسە تۆیان لە مردن ڕزگارکرد. نەقیب سامیری بابلی و ئوم فەزڵ، شاژنی تەپوتۆز، ئەم دووانە پێکەوە تۆیان لە سەحرایەکی دوورەوە بە برینداری هێنا بۆ لای من.

خودای گەورە ئوم فەزڵ شاژنی تەپوتۆز منی ڕزگارکردبوو، ئەو ژنەی من تەنیا بەسەر سلاوم لێدەکرد، ژنێک هەرگیز تەماشای نەدەکردم، وەک مەخلوقێکی بێلایەن و دوور لە دونیا خەریکی ئەو مەملەکەتە پڕ تەپوتۆزەی خۆی بوو. ژنێک وەک شاژنی کۆشکێک تەماشامدەکرد سەرتاپای لە پلەکە و پەیژەو پەنجەرەی تۆز دروستبوو‌بێت، خانمێک لە گەنجیدا لەگەڵ یەکەمین نەوەی کەشتییەکانی وڵاتدا، لەگەڵ بارە خورمادا بەرەو دونیای ئەوبەری زەریاکان ڕۆیشتبوو، وەک ڕاوکەرێکی غوبار، وەک خانمێک کە پەنجەرەکانی کەشتی پاکدەکاتەوە، غوباری نیشتووی سەر دەزگاکان و مێزەکان و شوشەی دەرگاکان دەسڕێت. لەسەر تەختەی ئەو کەشتییە دەریاوانێکی خۆشدەوێت، لەسەر ئەو کەشتییە شووی پێدەکات، ڕۆژی بوکێنیشی تا ئەو سەعاتەی دەچێتە ژووری بۆ لای مێردەکەی هەر غوباری کەڵەکەبووی سەر ژیان پاکدەکاتەوە، دوای ساڵێک لە خۆشەویستی، دوای ئەوەی لەگەڵ مێردەکەیدا لە هەموو بەندەرەکاندا، لە هەموو شوێنە نهێنی و چەپەکەکانی ئەو کەشتییەدا دەخەوێت. ڕۆژێک

لە دەمەقاڵێیەکی بچوکدا لەسەر سەلکێک پیازی ڕزیو لەگەڵ سەرۆکی چێشتکەرانی کەشتییەکەدا، مێردەکەی بە کێردێکی درێژ کە ئەمدیوەو ئەودیو لە کەمەرەوە دەیبڕێت، دەکوژرێت. ئەو دەمە شاژنی تەپوتۆز زگی بە کوڕێک پڕە کە مانگێک دوای کوژرانی باوکی لە ئێوارەیەکی غوباردا لە ناوەڕاستی زەریای باشووردا لە دایکدەبێت، مەخلوقێکی زەردباوی سەیرە، پتر لەوەی لە گیانەوەرێکی ئاوی بچێت یان بۆنی دەریای لێبێت، وەک باپیرە بەدەوییەکانی بۆنی لمی لێدێت. منداڵێکە بە نەخۆشی لەدایکدەبێت، غوبارو شێی دەریا بە سییەکانی ناکەون. پزیشکی کەشتییەکە پێیدەڵێت «ئەم منداڵە ناتوانێت لە هەوای زەریادا بژی، تاکە جێگایەک بۆ ئەمجۆرە مەخلوقانە ناو سەحرایە، چونکە سییان بە جۆرێک دروستبووە لە هەوای تەڕدا وەک ئەسفەنجێک لە باراندا جێیبهێڵێت دەڕزێت». دایکی بە ناچاری واز لە ئیشەکەی دەهێنێت و ڕوودەکاتە گوندێکی کەنار سەحرا، منداڵەکەی کوڕێکی گەڕۆکە کە تەنیا خولیای گەمەی خۆونکردنە لە تەپوتۆزی بیاباندا، بەر لەوەی تەمەنی ببێت بە دەساڵ ڕۆژێکی تەپوتۆز ڕوودەکاتە بیابان و ئیتر ناگەڕێتەوە. دایکی چەندەها مانگ لەسەر یەک ناو سەحرای بۆ دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە، بەڵام وازناهێنێت، بۆئەوەی بتوانێت بۆ کوڕەکەی بگەڕێت و لەگەڵیشیدا بژی، دەبێتە شەرکەرێکی گەورە لەگەڵ ڕەشەبا و خۆڵی باڵدارو ڕوخسارە باڵدارەکانی ناو لمدا، لەگەڵ پاکردنەوەی هەر چینێکی لم و خۆڵدا، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی هەر پەنجەرەیەکدا، لەگەڵ سڕینی هەر ئاوێنەیەکدا چاوەڕوانی دەرکەوتنی کوڕەکەیەتی. لەسەفەرەکانیدا لە نێوان شارەکان و گوندەکاندا هەمیشە بۆ فەزلی کوڕی دەگەڕێت، دەبێتە شارەزاترین گەڕیدەی سەحرا، کەسێک بست بە بستی نهێنی چۆڵەوانییە گەورەو بێبنەکان دەزانێت.

ڕۆژێک لە ڕۆژان ئوم فەزل لە گەشتەکانی بیاباندا لە بری ئەوەی کوڕەکەی بدۆزێتەوە، سامیری بابلی دەدۆزێتەوە کە چۆن ڕاوکەرێک

ئاسکێکی کوژراو دەدا بە شانیدا کوڕێکی برینداری داوە بە شانیدا و لە بیاباندا بە دوای شاری ئاوێنەیی و زەردی سۆزانییەکاندا دەگەڕێت. ئەو کوڕە بریندارە منم کە بەردەوام خوێنم لێدەڕوات، شاژنی تەپوتۆز تەنیا کەسێکە کە دەرگا نهێنییەکانی گەیشتن بەم شارە دەزانێت، تاکە کەسێکە لە ڕێگا پێچاوپێچەکانییەوە دێت و دەڕوات. ئەو کە ماندوێتی سامیری بابلی دەبینێت، کە تینوێتی و کەنەفتییەکەی دەبینی. من دەدات بە شانی خۆیدا و دەستی سامیری بابلی دەگرێت بۆ ئەو ژێر زەمینە. هەردووکیان دالیا سیراجەدین دەناسن، ئەو کوردە ڕۆح شیرینە بەدبەختەی تاکە کوردێکە لە تخوبی سەحرادا نیشتەجێ بووبێت، تاکە مرۆڤێکە دەتوانێت نهێنی بپارێزێت، تاکە خانمێکە دەتوانێت ژیان ڕزگاربکات.

ئەو ڕۆژە من لەو ژێر زەمینەدا، بە هەر سێ فریادرەسەکەی خۆم گەیشتم، بۆیەکەمجار لە بەردەم تێگەیشتنی تەواوی چیرۆکی زیندووبوونەوەمدا بووم. بەلام دالیا منی بۆئەوە بانگ نەکردبوو تا نهێنی زیندووبوونەوەی خۆمم بۆ ئاشکرابکات، بەلکو بۆئەوەی هەموومان پێکرا سامیری بابلی ڕزگاربکەین کە دواجار جێگایەکی نەبوو خۆی تیابشارێتەوە.

پیاوێکی ئەسمەری بالابەرزبوو، دەموچاوێکی باریکی هەبوو بە چەناگەیەکی درێژ و تیژەوە، قژێکی کەمێک لوول و کورت، بە خالێکی گەورە لەسەر لای چەپی ڕوومەتی، کوانوویەکی خورما لە نێوان برۆی چەپ و گوێچکەیدا، بە دوو چاوی تەڕو سەیرو ئێجگار گەورەوە، دوو چاو لە دوو دەنکە خورمای ڕەشی گەورە دەچوون.

دالیا وەک هەمیشە دەیویست شتێک لە من بشارێتەوە، بە منی گووت: ئەم پیاوە بوو ژیانی تۆی ڕزگارکرد، تۆی لە مردنەوە هێناو پێشکەش بە منی کردیت، وەک ئەمانەتێکی خودایی تۆی خستە گەردنی من. ئەمرۆ دەبێت من و تۆ چاکەی بدەینەوە، ئەم کەسەی سەحرا بە سەحرا تۆی برینداری دا بەشانیدا و ڕزگاریکردی... ئا، جەلادەتی کۆتر، من هەمیشە

پێمگوتووە شازادەی بابلی من تێناگەم چ بەدبەختییەک تۆی کردوە بە نەقیب، لە کوێش لە فەیلەقی چوار، تۆ دەبووایە ئەندازیار بوویتایە، نیگارکێش، شاعیرێکی شەرابخۆر، بەلام تۆ ئەمانە هیچیان نییت، تۆ نەقیب سامیری بابلییت، کە لە بەر کێشەیەک کە جەلادەت لێم مەپرسە چییە دەبێت بە نهێنی زۆر بە نهێنی لە ژوورەکەی تۆدا بمێنێتەوە. تاکەی نازانم... تاکەی؟ خودای دەکرد تا ڕۆژی حەشر، بیرت نەچێت ئەو ژیانی تۆی ڕزگارکردوە.

ئەوکاتە سامیری بابلی بە هێمنی گووتی: نا خانمی دالیا، ئەوەیان ئیشێکی باش نییە، بەوجۆرە نابێت، جەلادەت دەبێت بزانێت من چیم کردوە، دەبێت بزانێت، چونکە گەر نەزانیت لە گەورەیی مەترسییەکان و بەر پرسیارێتییەکان تێناگات. پاشان تەنیا لە بەرئەوەی ڕزگارمکردوە، مافی ئەوەم ناداتێ جارێکی دی ژیانی بخەمە بەر مەترسییەکی وا گەورەوە، دەبێت بە بڕوای خۆی و قەناعەتی قووڵی خۆی قبوولمبکات، ئەمەیان قەناعەتە، شتێک نییە لە ژێر باری منەتدا بکرێت. ئینسان نابێت لە ژێر باری منەتدا یارمەتی کەس بدات.

سەری داخست و گووتی: یارمەتی ئینسان بۆ ئینسان، هیچ نییە جگە لە دۆزینەوەی ئینسان بۆ خۆی. جگە لە پەشیمانی مرۆڤ لە گوناهەکانی خۆی.

دالیا بە پەژارەوە سەیریکرد و گووتی: ئاە، شازادەی بابلی، تۆ نایناسیت، چ منداڵێکی سەرکێش و زۆر بلێیە، چ گەنجێکی سەرەڕۆیە، نازانم چی دەکات و چی ناکات، من خۆشمدەوێت، بەلام بڕوام پێی نەماوە، هەرگیز نەمدەزانی دەتوانێت بەوجۆرە درۆزن بێت. ها ئوم فەزڵ تۆ لەو باوەڕەدایت...

سامیری بابلی خۆی هەستاو گووتی: نا با ئوم فەزڵ هیچ نەڵێت، دالیا هیچ ڕێگایەکی تر نییە، جەلادەتی کوتر دەبێت بزانێت من بۆ خۆم دەشارمەوە، گەر نەزانێت هیچ شتێک ناکرێت، مەترسی گەورە لەوەدایە

کە نەزانێت.

بە ئارامی هەستایە سەرپێ و هاتە بەردەمم و گووتی: گوێم لێبگرە جەلادەتی کۆتر، تۆ کوڕێکی گەورەیت، تۆ منداڵێکی نەجیبیت، من لە تۆ دڵنیام، دڵنیام شایستەی ئەوەیت نهێنی زۆر گەورە بپارێزیت، من لە چاوتدا دەیبینم، مرۆڤ دەتوانێت، بۆ هەموو شتێکی گەورە بڕوای پێتبێت، جەلادەتی کۆتر، من لە دەوڵەت ڕامکردوە، سەیری ئەم جلانەم مەکە، سەیری ئەم ڕوتبانە مەکە، من بەشێک بووم لە پلانی کودیتایەکی گەورە کە دەبوو سەرۆک کۆمار بڕوخێنێت، دەبووایە دیکتاتۆرمان بگرتبایە و خۆمان دەسەڵات وەربگرین، چل و سێ ئەفسەر بووین، بەرلەوەی نەخشەکەمان دەست پێبکەین هەموو شتێک ئاشکرابوو، من ئێستا تاکە کەسێکم لە ناویاندا زیندووم، لە هەفتەیەک لەوەوبەرەوە هەموو خێزان و خزم و هاوڕێکانم گیراون، هیچ جێگایەکم نییە لەم دونیایەدا بۆی بچم، هیچ جێگایەک نییە لەمسەر زەوییە ڕووی تێبکەم، لە هەر جێگایەکیش بمگرن هەموو ئەوانەم پێوە دەکوژن کە داڵدەیان داوم، تێدەگەیت... گەر من لە ژوورەکەی تۆدا بگرن تۆش دەکوژن. بەڵام من داوات لێدەکەم چەند ڕۆژێک لای تۆ بمێنمەوە، لە ژوورەکەتدا بە نهێنی و بێدەنگی، تا کاروباری خۆم ڕێکدەخەم و بە ڕێگایەکدا خۆم دەگەێنمە دەرەوەی وڵات.

من گووتم: من چیم هەیە، من لە مردن ناترسم، سەبارەت بەوەی کە ویستووتە سید الرئیس بکوژیت، ئیشێکی خراپت نەکردوە، ئەو کوڕی قەحبەیە دواجار هەر یەکێک دەبێت بیکوژێت، یان دەبێت بزانێت کە خەڵکێک هەن دەیانەوێت بیکوژن. مەعقول نییە وا بزانێت ئەوەندەمان خۆشدەوێت هەموو بۆی مردووین. هیوادارم ئێستا تێگەیشتبێت کە خەڵکێک بە جیدی دەیانەوێت بیکوژن بۆئەوەی تۆزێک بچێتەوە بەسەر خۆیدا.

دالیا دەیگووت: جەلادەت، ئەمە چ زمانێکە، ئەمە چ جۆرە قسەکردنێکە، تۆ کوڕێکی خێریشت تیابێت بە جۆرێک دەیکەیت، خراپیدەکەیت. ئاه، من

قسـەم زۆرە لەگەڵتدا، دڵی من قسـەم زۆرە لەگەڵتدا. خـوای گـەورە، بـەس تێبگـەم تـۆ چـۆن بیـر دەکەیتـەوە؟

دەترسـام دالیـا هەمـوو درۆکانـم بـۆ ئـەوان بگێڕێتـەوە، لەبەرئـەوە زوو گووتـم: بەڕێـز نەقیـب سـامیر، زۆر سـوپاس کـە ژیانـی منـت ڕزگارکـرد، خانمی ئازیزم ئوم فـەزڵ، من هـەر دەمزانـی تۆ شـتێکی گرنگی، تۆ ژنێکی ئاسـایی نیـت، هەمـوو ئـەو چیرۆکـە جوانانـەی لەسـەرت دەیبیسـتم هێشـتا نیوەی حەقیقەتـی خـۆت جوان نیین. من لـە خزمەتـی ئێوەدام، بەڕێز بـەڵام ئێستا کاتێکی باش نییە تۆ بێیتە ژوورەکەی من، شـەو کە تاریک داهات، لە دەقیقـەو سـاتێکی گونجاودا خـۆم ئاگادارتدەکەمـەوەو وەرە سـەرێ، دەتوانیت لای من بمێنیتـەوە. وادانێ من میوانـی تۆم.

بە غەمگینییـەوە گووتـی: ئێمـە هەمووهـان میوانـی یەکیـن، کەسـمان هیـچ شـتێکمان نییـە، هـەر چوارمـان دۆڕاوی گەورەیـن، مـن هەوڵـدەدەم زۆر نەمێنمـەوە، بـەڵام دەبێت دەستم بگاتـە هەندێ کەسـی تایبەتـی، پێویستیم بـە هەندێ ئەوراقی تایبەتـی هەیـە، دەمەوێت لێرە دەرچـم، ئـەوە تەنیـا هیـواو دوا هیوامـە.

کـە من لـە ژێـر زەمینەکـە هاتمـەدەرێ مرۆڤێکـی تـر بـووم. چەنـدە بـە خـۆی سەرسـامبووم، دە هێنـدەش بـەو زمانـە سەرسـامبووم کـە قسـەی پێدەکرد، عەرەبییەکـی هێنـد سـاف و جوانـی هەبـوو، پێشـتر لـە زمانـی هیـچ مەخلوقێکـی تـرەوە گوێـم لـێ نەبووبـوو، یەکەمجـارم بـوو حەزبکـەم زیاتـر گوێم لە عەرەبی بێت. ئـەو زمانەی هەستمدەکرد جۆرە کاراکتەرێکی درۆزن و پـڕ فیشـاڵ بەسـەرمدا دەسـەپێنێت. نازانـم لەبـەر هـەر هۆیـەک بێـت مـن بەشـێکی گۆڕانـی کاراکتـەری خۆمـم دەگێڕایـەوە بۆ ئـەو خواسـتە نهێنیانـەی عەرەبـی وەک زمـان لـە منـدا دروسـتیدەکرد. بـەڵام گـەر ڕاسـتگۆبم دەبێـت بڵێم، کـە سـامیری بابلی بیروبۆچوونـی منی لەسـەر زمانـی عەرەبی گـۆڕی، وەک چـۆن پێشـتر ئیسـحاقی لیوزێڕیـن بۆچوونـی منـی لەسـەر زمانـی کـوردی

گۆڕیبوو، کوردیش لای من زۆر جار زمانی تورەبوون و جنێودان و هاوار هاواری ناو کوچەکان و دەمەقاڵێی ناو بازاڕ بوو، زمانی قیڕەقیڕ و زۆربلێی بێماناببوو، بەڵام ئیسحاقی لێوزێڕین یەکەمین کەس بوو منی والێکرد تێبگەم کوردی چ توانایەکی نهێنی و سەیری تێدایە. دوای گوێگرتن لە سامیری بابلی گەیشتمە ئەو بڕوایەی هەموو زمانەکانی دونیا تەنیا چەند کەسێکی کەم دەتوانن قسەی پێبکەن. لەڕاستیدا ئەوەی منی والێکرد دوای ئیسحاقی لێوزێڕینیش بکەوم بۆ ناو چیاکان تەنیا ئارەزووی من نەبوو بۆ مۆسیقا، بەڵکو سیحری ئەو زمانە سەیرەی بوو، کە وایدەکرد بێ هیچ بیرکردنەوەیەک بەدوایدا بڕۆم، ئەوەی وای لە من کرد ڕێگای سامیری بابلی بدەم بێتە ژوورەکەمەوە، دوو شت بوو، ئەو سیحرە بوو کە لە دەنگ و زمان و چاویدا هەستم پێکرد، لەگەڵ بۆنێکی سەیر، بۆنی بێستانێکی ناکۆتای پرتەقاڵ کە لە جەستەی دەهات. بۆنێک هێند ترسناک بوو، وایدەکرد بمانخاتە بەر مەترسی ئاشکرابوون و مردنەوە، بە شێوەیەک منی ناچارکرد لەو شەوەوە هەموو وەخت سەبەتەیەک پرتەقاڵی تازە بکڕم و لە بەردەم ژوورەکەمدا داینێم تا هیچ کەس گومانی بۆ ئەو پیاوە نەچێت کە بۆنی لەو هەرێمەو هەموو هەرێمەکاندا بەناوبانگ بوو. پیاوێک هێزەکانی دەوڵەت باغە پرتەقاڵەکانی ئەو هەرێمەیان لە دووی دەسووتان، چونکە پێیان وابوو ئەو بە هۆی ئەو بۆنی پرتەقاڵەوە، لە باغاتی پرتەقال بترازێت حەشارگایەکی نییە.

چیرۆکی من و سامیری بابلی لە چیرۆکی هەزار شەوو یەک شەو دەچوو، ماوەیەک پەیوەندی من و ئەو وەک پەیوەندی شەهرەیارو شەهرەزاد وابوو. ئەو هەندێک شەو تا بەر بەیان چیرۆکی بۆ دەگێڕامەوە، من شەو لە دوای شەو تکام تیادەکرد نەڕوات تا هەموو چیرۆکەکانم بۆ تەواودەکات، ئەو لە ڕێگای چیرۆکەکانییەوە حەقیقەتی ئەو وڵات و زەمینەی نیشاندام کە تیادەژیام، حەقیقەتێک پێش ئەو من تەنیا وێنەیەکی تەماوی و

کاڵم دەربارەی هەبوو، ئەو وەک هەر حیکایەتخوانێک بیەوێت گوێگرەکانی شێتبکات، هەمیشە لە شوێنە پڕ مەترسییەکاندا دەوەستا، باوێشکی دەداو دەیگووت: جەلادەتی کۆتر، ئەی هەرزەکاری بەنەزاکەت، ئیدی بخەوە سبەی شەو بۆت تەواودەکەم.

## بەشێك لە چیرۆکەکانی نەقیب سامیری بابلی
## لە گەشتی دوور ودرێژیدا لە نێوان جەنگ و پەشیمانیدا

جەلادەتی کۆتر، ئەی منداڵی نەجیب، ئەی هەرزەکارێکی تازە کە زۆرشت لە دونیا نازانیت، کەمێک سەرسامی بەدبەختی خۆت و کەمێک لە خۆبایی و مەغروری گەنجێتیتی. حیکایەتی من وەک گەشتی سندبادێکی نوێیە، سندبادێک کە وەک سندبادی یەکەم لە بەغداد لە دایکبووە، بەلام من هەرگیز سوار کەشتی نەبووم و بەدەریادا سەفەرم نەکردوە، نەچوومەتە دەریاو بە گێژەندا نەڕۆیشتووم، هیچ سیمرخێک هەڵینەگرتووم، هیچ دێوێکی یەکچاو دیلی نەکردوم، لەدۆڵی هیچ ئەژدیهایەکدا گیرم نەخواردووە، لەسەر پشتی هیچ نەهەنگێکی خەوتوو ئاگرم نەکردۆتەوە، بەلام من لەهەموو ئەو شتانە ترسناکترم بینیوە... من جەنگەڵەکان و چیاکان و زۆنگاوە ترسناکەکانم بینیوە، ئەو جێگایانەی بەدەگمەن مرۆڤ بە زیندوویی لەوێوە گەڕاوەتەوە. بەر لەوەی باسی هیچت بۆبکەم دەبێت من بناسیت، ڕەنگە منداڵی من شتێکی ئەوتۆ گرنگ نەبێت، منداڵی لەم ولاتەی ئێمەدا کۆمەڵێک ڕاکردنی شێتانەیە، بە کۆمەڵێک کۆلاندا، هەڵهاتنی کتوپڕو کاتییە لە ماڵ و گەڕانەوەیە بە پەشیمانی. من دایکی خۆمم نەبینیوە، لەبەرئەوە زۆربەی ژیانم لە ناو باغی خورماو مێرگ و بێستانە بێکۆتاییەکانی پرتەقاڵدا بردۆتەسەر. گرنگترین شت کە لە منداڵیمەوە تا ئێستا لەگەڵمدا دەژی بۆنی گەلای

پرتەقاڵە. جەلادەتی کۆتر، من پیاوێکم هەمیشە بۆنی گەڵای پرتەقاڵم لێدێت، ئەو بۆنەی زۆرجار مایەی دەردو زۆرجار مایەی ڕزگاریم بووە. من کوڕی بیستانداریکی گەورەبووم، هەزاران هەزار فەدان زەویمان هەبوو، ڕۆژانێک لەو باوەڕەدابووم هەموو گۆی زەوی موڵکی باوکمە، باغەکانی باوکم بێکۆتایی بوون، بەشی هەموو وڵات پرتەقاڵ و هەنارو لیمۆ و لالەنگیمان دەنارد. لە دیوەخانەکانی باوکمدا شەوان سەدان کەس نانیان دەخوارد. لەسەر سینی مەزن، کە چێوەکانیان لەم ژوورەی تۆ گەورەتر بوو بریانی ڕۆدەکرا، لە دەریای سوورەوە تا باکووری دوور بازرگان و توجاری هەمەشێوە دەهاتنە ماڵی ئێمە، لە دیوەخانەکانی ئێمەدا ڕێکەوتنی سەدان هەزاری دەنوسرا، کۆمپیالەی سەیر سەیر کە ژمارەی ئەوتۆیان لەسەر بوو، من سفرەکانیانم بۆ نەدەژمێردرا. بەدەست ئێمەبوو، میللەت پرتەقاڵ بخوات یان نا، هیچ حکومەتێک نەیتوانی لەدەسەلاتی باوکم کەمبکاتەوە، پیاوێک بوو لە هەر جێگایەک بیزانیبایە هەژارێک هەیە، کۆمەکی بۆ دەنارد، لە بن خەیمە ئەفسانەییەکانی ئەودا وەزیرەکان دادەنران و لادەبران، لە زاری ئەوەوە عەشرەتەکانی باشوورو ناوەڕاست کۆدەبوونەوە، خۆی بە عەبا سپییەکەیەوە دەچووە ناوەڕاستی ئاگرو شەڕی خوێناوی خێڵە عەرەبەکانی دەکوژاندەوە. لە کاتی شەڕی باکووردا، چەندەها جار چوو بۆ بینینی سەرکردە ئەفسانەییەکانی شۆڕش، جارێک لە ئەشکەوتێکی دووری ناو شاخەکاندا سەرۆکەکانی کوردی بینی بوو، بەڵام لەوسەر لە بری ئاشتی، کیسەیەک توتن و سەبیلێکی بەدیاری هێنایەوە. ئەو ڕۆژە کە باوکم لە باکوور گەڕایەوە، تا هەفتەیەک نەهاتەدەرێ، من تەنیا کەسێک بووم دەمتوانی بچمەلای، بەردەوام لە ژوورەکەی خۆیدا دەگریا و دەیگووت: سامیر ئەگەر کوردو عەرەب ڕێنەکەون، ژیانی هەموومان دەبێتە جەهەنەم، بە تایبەت ژیانی تۆ.

ئەو کات من نەمدەزانی کورد چییە، وەک منداڵەکانی تر ئەو گۆرانییەم

دەگووتەوە کە باس لە سەربازێکی قارەمانی عەرەب دەکات، کە لە شیمال کچی کورد دەهێنێت، تا لێرە زگیان بە منداڵی چاوڕەشی عەرەب پڕبکات.

بەلام وامەزانە من منداڵێکی خۆشدەست و ئاسان بووم، باوکم جگە لە هەولە بێوچانەکانی بۆ کوژاندنەوەی شەڕ، خەمێکی قورسی هەبوو، کە ناوی سامیری بابلی بوو، من دەردێکی ڕاستەقینە بووم... جەلادەت من لە منداڵییەکی زووەوە نەخۆشم، هەرگیز بیرت نەچێت من پیاوێکی نەخۆشم و هەرگیز دوای وەسوەسەکانی من مەکەوە، من بێ مۆتەکە و دێوەزمەی بەردەوام ناژیم. کابوس... کابوس... کابوس... ئەوە ژیانی منە، وەک ئێستا کە بەردەوام کۆمەڵێک ئەسپی سپی لەسەرمدا غاردەدەن... جەلادەتی کۆتر مانگێکە بەردەوام کۆمەڵێک ئەسپی سپی لەسەرمدا دەفڕن و ڕەوتدەکەن و دەسوڕێنەوە... شەوانە دەتلێمەوەو ئەوان هەر غاردەدەن، دەنگی سمییان وەهایە، وەک ئەوەی بەسەر زەوییەکی ئاگراویدا بڕۆن، هەندێجار وەک پشکۆ دەگەشێنەوە، دەبنە قەوارەیەک لە ئاگر و دووبارە سپی دەبنەوە. هەستدەکەم ڕۆژێک دەمبەن بۆ زەمین و زەمانێکی تر. بەلام ئەی هەرزەکاری بێحاسڵ دەنگی حیلەو سمکوڵی بەردەوامیان ئازارمدەدا، وەک ئەوەی لەشکرێک لە سەرمدا بەرەو پێش پەلاماربدات، دەیانبینم لە هەوادا دێن و بە تەنیشتمدا غاردەدەن، هەست بە تەپوتۆزەکەیان دەکەم لە هەناسەمدا، بەلام چاو دادەخەم و سەردەخەمە ناو کراسەکەمەوە. وەک خوداوەندێکی دێرین لە عەرەبانەیەکی ئەفسانەیی بەستبێتن، بە تیژی غار دەدەن.

ئەوکات کە منداڵ بووم و لەگەڵ یازدە براکەی دیکەمدا لە باغەکانی زوهەیری بابلیدا دەژیام، مۆتەکەیەکی ترم بۆ هات، هەمیشە کۆمەڵێک سەگی وێڵگەڕ و بێلانە لە دوام بوون، شەوان کە لە کابوسەکانمدا دەردەکەوتن من ڕامدەکرد، ئەو شەوانە دەچوومە سەر لقی بارێک و ناسکی دار پرتەقاڵەکان، هەندێک لەو لقانەی من دەچوومە سەریان بە

جۆرێک ناسک بوو، چۆلەکەش ناتوانێت لەسەریان بوەستێت، بەڵام من دەمتوانی، من وەرزگەلێکی درێژ لە سەر درەختەکانی پرتەقاڵ ژیام کە تاکە شوێنێک بوو، بۆی خۆشی گەڵاکانی منیان لەو سەگە خەیاڵیانەی ناو سەری خۆم وندەکرد، لەوێدا بۆ ئەبەد بۆنی درەختی پرتەقاڵم گرت، بۆنێک دواتر کچان شەیدا دەکات، ناوبانگم وەک «پرتەقاڵی بابلی» بەزەویدا دەڕوات، کە دەشبم بە ئەفسەر، لە هەر وەحدەیەکدا ئیشبکەم ناویدەنێن «گوردانی پرتەقاڵ». بەڵام لەوەگەڕێ، جەلادەتی کوتر لەو شەوانەدا باوکم «زوهێری بابلی» بە خۆی و عەباکەیەوە بە ناو باغەکاندا دوامدەکەوت و دەیگووت: سامیر، کوڕی بەدبەختم، ئەو سەگانە تەنیا لەسەری خۆتدا هەن، تەنیا سەگی ناو خەیاڵی خۆتن، مرۆڤ لە هەر شتێک رابکات، ناتوانێت لە جانەوەرەکانی ناو خۆی رابکات.

بەڵام جەلادەت ئەو جانەوەرانە خەیاڵی نەبوون، من هەموو مۆتەکەکانی ناو سەری خۆم لە دەرەوە دەبینمەوە، هیچ مۆتەکەیەک نییە لەسەری مندا، پێشەکی ڕوداوێکی گەورە نەبێت.

ڕۆژێک لە ڕۆژان من لە باغەکانی پرتەقاڵدا پیاسەمدەکرد، لە ناکاو ئەو سەگانەم بینی، هەمان ئەو سەگانەی ساڵێک بوو ڕاویاندەنام، دە سەگی گەورەی لمۆز خوێناوی بوون، کە بە هەمان شێوەی ڕاکردنیان لە ناو خەونەکانمدا بەرەو من ڕایاندەکرد، من ڕامدەکرد و ئەوان بەدوامدا ڕایاندەکرد، ئەوە یەکەمین جار بوو بڕوابهێنم جانەوەرێکی دڕندەترو خێراتر لە سەگ لە ناومدایە، ئەو سەگانەی ساڵێک بوو لەسەرمدا دەوەڕین، منیان کردبووە سەگێکی دی، سەگێکی خێراترو دڕتر. ئەو ڕۆژە سەگەکان ڕایاندەکرد و منیش ڕامدەکرد، سەگەکان پشوویاندەدا و منیش پشوومدەدا، جەلادەت من نازانم چەندە بە زەویدا ڕامکردوە، هێند دەزانم بە وڵاتی سەیرو خاکی نەبینراو و جەنگەلی پڕ جانەوەرو شەقامی پڕ ئەژدیهادا ڕۆیشتم، بە تەک شاری جەنجاڵدا، بە ناو کوچەی پڕ خودا و کوڵانی پڕ لە مزگەوت و

کلیسەدا رامکرد، بە کەنار دەریاچەکاندا ڕۆیشتم، بە قەراغ ڕووباردا پڕبوو لە ماسی کە لە ئاو دەهاتنە دەرەوەو دەبوون بە باڵندە، دەچوونەوە ناو ئاوو دەبوونەوە بە ماسی. بە کێڵگەی گەنمدا ڕۆیشتم، بە کێڵگەی لۆکەدا، بە ناو مەرەزەی سەوزدا، بە ناو بەحری بێسنووری گوڵەبەڕۆژەدا کە لەوێدا گوڵەکان سەیریانکردم. جەلادەت من نازانم چەندجار ماڵاواییم لە مانگ و ئەستێرە کرد، چەند جار خۆر لە بەردەممدا هەڵهات و ئاوابوو، لە چەند وەرزو وڵات و ئاوەدانیدا پشووماوە، بەڵام دەزانم ئەو ڕاکردنە بێڕەحم و دوورو درێژە منی کرد بە سەگی تەواو. جەلادەت هەندێک ڕۆژ من و سەگەکان بەرابەر یەکتری دادەنیشتین و هیچ لایەکمان هیچمان نەدەکرد، لە کوچەو کۆڵانی هەندێک شاردا خاوماندەکردەوەو بە پیاسە دەڕۆیشتین، لەو شارانەدا کە هەمووی ڕوناکی بوو، کە تیایدا ڕێبوارەکان لە فوارەی تیشک دەخۆنەوە نەوەک ئاو، لە فوارەکان ڕوناکیمان دەخواردەوەو سەر لە نوێ دەستماندەکردەوە بە ڕاکردن. هەندێجار سەگەکان لەسەر ڕێگا نێچیری ئادەمییان دەستدەکەوت و دەیانخوارد، من بەرابەریان دادەنیشتم و لێمدەڕوانین، هەندێجار بە لای دیمەنی خۆرهەڵاتن یان خۆرئاوابووندا تێدەپەڕین و دەوەستاین تەماشاماندەکرد، دە سەگی سەیربوون، کاتێک لە هەندێک شاردا قوبەی مزگەوت و منارەکانیان دەبینی سەرسامانە لێیڕادەمان، کاتێک بەناو باغی پرتەقاڵدا دەڕۆیشتین پشووی درێژیان دەدا، لە هەموو کێڵگەیەکی گەنمەشامییدا دەخەوتن، لە نزیک هەموو تافگەیەکەوە دەوەستان، جەلادەت بە ناو شاری ئەوتۆدا ڕاماندەکرد، دیوارەکانی هەمووی تەم بوون، بە ناو گوندی بێدەنگدا تێدەپەڕین کە سەدای ئەبەدی مەلایەک لە بلندگۆی مزگەوتێکی دوورەوە لە ناو کوچەکانیدا دەنگیدەدایەوە. بەلای بورجدا ڕاماندەکرد پاییز لەگەلا دروستیکردبوون، بەناو گۆڕستاندا کە مردووەکان چرایان بۆ دەگرتین تا بەردی کێلەکان بریندارماننەکەن، بەلای قەلادا کە لە غوبار دروستبووبوون و شازادەی سپی سپی لە ڕیواقەکانیدا

دەگریان، بەلای شاردا بە شەو دروستدەبوون و بە ڕۆژ نەدەمان. بەلام ئەو چەند وەختە سەگەکان هەمیشە مەودایەکیان لە نێوان خۆیان و مندا دەپاراست، هەندێجار بە جۆرێک ماندوو دەبووم دەمگووت ئێستا دەگەنە سەرم و پارچە پارچەمدەکەن. کاتێک ئاوڕمدەدایەوە دەمبینی ئەوان بە قەد توانای من لەسەر ڕاکردن ڕادەکەن، هەرگیز خێراتر لەوە ڕایاننەدەکرد کە پێویست بێت بمگرنەوە، کە هەستیاندەکرد دەبێت پشووبدەم دەوەستان، کە دەیانزانی دەبێت بخەوم دەخەوتن، کە دەیانزانی دەبێت نانبخۆم ئەوانیش دەیانخوارد. لە ڕۆژێکدا هەستمکرد جڵەوی من بە دەست ئەوانەوە نییە، بەڵکو جڵەوی ئەوان بە دەست منەوەیە، وەک ئەوەی من بووبم بە ڕابەری گەلە سەگێکی دڕ و لە پێشیانەوە ڕابکەم. تێگەیشتن لەو حەقیقەتە زۆربەی شتەکانی گۆڕی، شەوێک لە شەوان بە ژێر مانگە شەوێکی ڕۆشندا ڕاماندەکرد، بەلای باغێکی پرتەقاڵدا تێپەڕین، جەلادەت من چوومە ناو ئەو باغەوە و ئاوڕمدایەوە و سەیرمکرد بەدوامەوە نین. لە ناکاو وەک هەوا هەڵیانگرێت و مانگەشەو بیانتوێنێتەوە نەمان، وەک زەوی قووتیان بدات و ئاسمان هەڵیانکێشێتەوە ونبوون.

ئەی منداڵی نەجیب لەو شەوەدا لە کۆتایی ئەو باغەدا، من لە دەرگای ماڵێکی گەورەمدا، پیاوێک وەک ئەوەی چاوەڕوانم بکات دەرگای لێکردمەوەو فەرمووی لێکردم بۆ ماڵی خۆی و گووتی: من نەقیب بیلالی بابلیم، خزمی تۆم، تۆ سامیری بابلیت، کوڕی زوهێری بابلی، برای مەهدی و هیدایەت و هادی و هوزەیل، برای جەلیل و جەمال و جەبارو جەمیل و جاسم و جسوری بابلیت، تۆ بچوکترین کوڕی ئەو شێخە موبارەکەیت، خودا لێی ڕازیبێت، من ئامۆزای تۆم، کوڕی زوبێری بابلیم، مامی تۆ، بەلام من و تۆ یەکترمان نەبینیوە، چونکە من لە ژنی پێشووتری مامتم کە دوور لە ئێوە دەژیاین، ئێره ماڵی خۆتە، دەمێکە چاوەڕێتدەکەم. باوکت وەسییەتی خۆی بۆ تۆ لای من داناوە.

ئەوە یەکەمجارم بوو بزانم کە باوکم کۆچی دوایی کردوە، یەکەمجارم بوو هەستبکەم چ زەمانێکی دوورو درێژ بەسەر مندا تێپەڕیوەو تەنیا رامکردوە. لەو نێوەندەدا سێ برام لە باکوور کوژرابوون، دوو برام لە شەڕی خێڵەکیدا تیاچووبوون، برایەکم لە غەمی خۆشەویستییەکی ناکامدا خۆی کوشتبوو، ئەوانی تر هەر یەک بە کونجێکی دونیادا پەرتەوازەبووبوون، خوشکێکم لەسەر شەرەف سەربڕدرابوو، خوشکێکی دیشم لە هەقی خوێنێکدا درابوو بە پیاوێکی کوێرو سەفەریکردبوو بۆ شارێکدا هێندە دوور ئادەمیزاد تەنیا بە خەیاڵ دەتوانێت سەفەری بۆ بکات. بە کورتی هیچ کەس لە خێزانەکەی من نەمابوو، زەوی و باغەکانیشمان تەفروتوونا بووبوون.

نەقیب بیلالی بابلی حیکایەتی ئەو سالانەی بۆ گێڕامەوە کە من لەوێ نەبووم، باسی شەڕێکی خوێناوی بۆ کردم لە نێوان عەشیرەتی ئێمەو هەموو خێڵەکانی دیکەدا کە لەسەر نرخی پرتەقاڵ دروستبووە، باسی کوژرانی براکانمی لە سەر پیکابێک لیمۆ بۆ کردم بە ڕۆژی نیوەڕۆ، لە ناوەڕاستی شاردا و بەقەمەی سپی. باسی سووتانی باغە پرتەقاڵەکانی ئێمەی کرد، کە تا چەندەها هەفتە خامۆش نەبووە، باسی گریانە بەردەوامەکانی باوکمی بۆ کردم کە یەک لەدوای یەک کوڕەکانی بە کوژراوی لە کوردستان دەگەڕانەوە. باوکم بەر لە مردنی لە ناو خۆڵەمێشی هەتا هەتایی باغەکانیدا چاوەڕوانی منی کردبوو، چاوەڕوانی ئەو بۆن پرتەقاڵە ئەزەلییەی کردبوو، کە من لەگەڵ خۆمدا بە زەویدا دەمگێڕا. دواجار دەیتوانی لە بۆنی مندا بۆنی هەموو باغە ونبووەکانی خۆی بدۆزێتەوە، بەلام من نەبووم... من لە کوێ بووم؟

بیلالی بابلی بە فرمێسکەوە وەسییەتەکەی باوکمی دامێ و من خوێندمەوە، باوکم وەسیەتی کردبوو، کە بچمە کۆلیژی سەربازی، چونکە خێزانی من هەزاران دوژمنی هەیە، دەیزانی من وەک تاکە وەچەی زوهێری

بابلی هەمیشە لە ژێر هەڕەشەی مردندا دەبم، گەر واشبێت، سوپاو ئەو دەزگا سەربازییە گەورانە تەنیا شوێنن من بتوانم خۆمیان تیا بشارمەوە، من ڕۆحێکی بێدیفاع تەنیا دەوڵەت دەتوانێت بمپارێزێت، دڵنیابووم گەر وا نەبایە باوکم هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە من بکات بە ئەفسەر، بەڵام لەو ساتەدا کە ئامۆژگاری منی کردبوو ببم بە ئەفسەر، خەیاڵی لای پاراستنی نەسلی بابلییەکان بوو، کە دەیزانی یەک نەسیمی کوشندەی تر، بۆ هەتا هەتایە لەسەر زەوی دەیانسڕێتەوە. بەڵام باوکم لە خواری وەسێتەکەیدا فەرمانێکی سەیرو عەجیبی نوسیبوو، فەرمانێک لەوانەیە ئەو تاکە باوکێک بووبێت لە هەموو ئەو سەردەمەدا شتی وای لە وەسێتێکدا تۆمارکردبێت، باوکم نوسی بووی: هەرگیز مەچۆ بۆ هیچ شەڕێک، نە شەڕ لەگەڵ جولەکەکاندا بکەو نە لەگەڵ نەسرانییەکاندا. بشزانە هیچ شتێک لە کوشتنی کوردێک لای من حەرامتر نییە، هەرگیز مەچۆ بۆ شەڕی کورد، گەر چووشیت، کەس مەکوژە، گەر کوشتیشت دەبێت بزانیت هیچ شتێک پاکت ناکاتەوە.

براکانی پێشووم کوشتەی ئەو وەسێتەبوون، هەر سێکیان لە شەڕدا کوژرابوون، چونکە شەڕیان نەکردبوو. ئەوەی شەڕ نەکات دەکوژرێت، ئەوە قانونی ئەو سەردەمە تازەیە بوو کە باوکم تێینەدەگەیشت. ئەو ڕۆژە من زۆر تورە بووم، زۆر تورە، باوکم بەم وەسێتە بێمانایەی هەمووومانی بە کوشت دابوو. لە عورفی ئەودا شەڕکردن گەورەترین حەرامی دونیا بوو، هەمووومان کوشتەی ئەو یاسا پۆلایینەی ئەوبووین «شەڕ مەکەن». ئەوە یاسای هەرە گەورەی ئەو بوو، ئەو یاسایە لای ئەو لەسەروو دەستوور و دین و نەریتەکانی قەبیلەوە بوو. هیچ شتێک لە گەردونـدا لای ئەو بەئەندازەی ئەوە خراپ نەبوو مرۆڤ شەڕبکات. ئەو هەمیشە عەبا سپییەکەی ڕادەوەشاند و دەیگووت: لێگەڕێن بتانکوژن و شەڕنەکەن. دڵنیابووم کە منی ناردوە بۆ کۆلێژی سەربازی بۆئەوە

نەبووە ببم بە جەنگاوەر، بەڵکو بۆئەوەی وەک ژنێکی ترسنۆک لە ناو سوپادا خۆم بشارمەوە. من ئەو هەموو ساڵە بووبووم بە سەگێکی دڕ، وەسیتەکەی باوکمم بە چاوی پڕ فرمێسکەوە دڕی و گووتم: بیلالی ئامۆزام بمبە بۆ کۆلیژی سەربازی، من دەمەوێت تۆڵەی براکان و باوکم و باغە پرتەقاڵەکانمان بکەمەوە.

جەلادەتی کۆتر لەو دەقیقەیەدا نیوەم بۆنی سەگی لێدەهات و نیوەشم بۆنی پرتەقاڵ.

لە کۆلیژی سەربازی مرۆڤ دەکەن بە سەگ، من لەوێ فێریان کردم چۆن مرۆڤ بە کاڵی بخۆم، فێری قەپاڵگرتنیان کردم لە سەری ئەژدیها و گەرووی کەروێشک، فێریانکردم چۆن دەستبخەمە بینی گورگ، چۆن لەگەڵ پڵنگ و ورچدا زۆران بگرم. جەلادەتی کۆتر، تا لەسەر ئەم ئەستێرەیە کۆلیژی وەها هەبێت مرۆڤ ناحەسێتەوە، من لەوێ فێربووم چۆن قەمەبکەم بە دڵی مرۆڤدا، فێربووم دەستبخەمە زگی دوژمن و ڕیخۆڵەکانی ڕاکێشم و دەم بخەمە ناو خوێنەکەیەوە، ئێمە فەسیلێک بووین لەسەر نمونەی زیندوو مەشقماندەکرد، لە هەموو کۆلیژەکانی دونیادا لەسەر ئەو شتانە مەشقدەکەن کە پێیدەڵێن ئۆبجێکتی دەستکرد، بەڵام من لەوێ قوتابی وەحشیترین سەرهەنگ و ژەنراڵی دونیابووم، ئەوانە لە وانەکانماندا ئۆبجێکتی زیندوویان بۆ دەهێنایین، دەبووایە ترسمان لە کوشتنی مرۆڤ بشکایە، کەرەستەی مەشقەکەنمان ئەو کوردانە بوون کە لە زیندانی دائیرەی هەواڵ و بیستی عەسکەری کۆدەبوونەوەو نەیاندەزانی چییان لێبکەن. من لەساڵی یەکەمەوە، بووم بە بەرپرسی هەڵبژاردنی ئەو کوردانەی کە لە دائیرەی هەواڵ دەمانهێنان بۆئەوەی مەشقیان لەسەر بکەین. لەو ساڵانەوە فێربووم چاویلکەیەکی ڕەش بکەمە چاوم و وەک کڕیار لە بازاڕێکی مانگافرۆشتندا یەکەیەکە هەڵیانبژێرم. لەو ساتەوە من وەسیەتەکەی باوکم لە بیرکرد. ئەو ڕۆژانەی من دەچووم بۆ بەندیخانە

عەسکەرییەکان، پێش خۆم بۆنی پرتەقاڵم بە ژوورو ڕیواق و زیندانەکاندا بڵاودەکردەوە، بۆنێک سامی دەخستە دڵی ئەو دیلانەوە کە دەیانزانی دەیانبەم بۆ مردن، هەر کەسێک من پەنچەم بخستبایاتە سەر بە زیندوویی نەدەگەڕایەوە.

من لەو مەشقانەدا بۆ یەکەمجار مرۆڤم کوشت، لەو مەشقانەدا فێری سەربڕینیان کردم، فێری ئەوەیان کردم چۆن بە لەقە جومجومەی مرۆڤ وردبکەم. تیپێکیان لێ دروستکردین شەووڕۆژ لە خەیاڵی ئەوەدا بووین شەڕ هەڵگیرسێت، تا ئەو غەریزە ترسناکانەی ناومان ئاسوودەبکەین. زۆربەی ئەوانەی لە کاتی مەشقدا دەمانکوشتن کوردبوون، فێربووبووین کە دەپاڕانەوە دەمیان ببەستین، من یەکێک بووم لەوانەی زمانیانم دەبڕی، هەندێک لە قوتابییەکان زەکەری کوردە کوژراوەکانیان کۆدەکردەوە، بەڵام من زمانم کۆدەکردەوە، هەمان بوو پەنجەی کۆدەکردەوە، هەمان بوو گوێچکە و هەشمان بوو چاو. هەموومان لە شوشەی تایبەتیدا هەڵدەگرت، بەر لە تەواوکردنی ساڵی سێهەم من زمانی بیست و یەک کوردم هەبوو، بە ناوەکانیانەوە. شەوان بە لاقرتێیەوە دەچوومە بەردەمی شوشەکان و دەمگووت: کاک حەسەنی خەلیل داود، ئاغام بەو زمانە جوانەی خۆت کەمێک بۆم بخوێنە. کاک عەلی ئەکبەر، تو شەرەفی باپیرە کێوییەکانت ئەگەر گۆرانییەکم بۆ نەڵێیت. جەلادەت من عومرێکم لەو گەمانەدا بردەسەر کە لەگەڵ ئەو زمانانەدا دەمکرد، زمانی بێدەنگ و بێخەتا کە لە شلەیەکی زەردا وەک کۆمەڵێک ماسی بچوک مەلەیان دەکرد. ساڵی یەکەم و دووەم لە کۆلێژ هیچ مۆتەکەیەکم بۆ نەدەهات، لە ناو کۆلیژدا مەشق و ماندوێتی دەیکردین بە گورگی برسی، دواتر کە بەرەڵای شەقام و کوچەکانیان دەکردین دەمانویست وەک پادشا بژین، بە سوار ماشێنی زۆر گرانبەهاوە دادەبەزینە خۆشترین بارەکانی پایتەخت، لەگەڵ جوانترین

کچدا دەچووین بۆ سینەما، لە هەر شوێنێک بمانویستبایە شەڕماندەکرد. ج خانمێکمان بویستایە لە مێردەکەی یان دەستگیرانەکەیمان دەپچڕاند، هەموو شتێک ڕێک و ئاسوودە بوو، من هەستم بە هیچ عەیبێک نەدەکرد لە خۆمدا. تەنیا هەفتەیەک بەر لە تەواوکردنی ساڵی سێهەمی خوێندن، شەوێک جومجومەیەک هاتە خەوم. سەرێکی باڵدار بوو، کە دوو چاوی خەوتووی تیابوو، بێئەوەی دەم بکاتەوە بە منی دەگووت: گەر دەتوانیت، زمانم دەربهێنەو بیبە بۆ خۆت. من لە خەوەکەمدا هەموو شتێکم دەکرد بۆ ئەوەی زمانی بکەمەوەو بیبەم بۆ خۆم، بەڵام نەدەکرا، من شێت دەبووم، هەموو ڕێگاکانم دەگرتە بەر و سوودی نەبوو. ماوەیەک هەموو شەوێک ئەو خەوەم دەبینی، هەموو شەوێک ئەو سەرە دەهاتە خەوم و خەبەریدەکردمەوە، وای لێدەهات نەمدەتوانی بخەوم، هەناسەم بۆ نەدەدرا، لاوازو بێئیرادە دەهاتم و دەچووم. جەلادەت شەوێک لە شەوان من لە شەقامێکدا پیاسەمدەکرد، جلی تایبەتی قوتابیانی کۆلیژی سەربازیم لە بەردابوو. بۆ یەکەمجار لە سەر سوچی کۆلانێکدا بیست و یەک زاری خوێناویم بینی، لە دەوروبەرم دەفڕین، بیست یەک زمان هاواریاندەکرد «پرتەقاڵی بابلی مەڕۆ... پرتەقاڵی بابلی مەڕۆ». بیست و یەک زاری کراوە، کە بیست و یەک زمانی بڕدراو لە ناویدا سەمایاندەکرد، منیان بە کوچەکانی ئەو شارەدا ڕاونا، قەپاڵیان لێدەگرتم، دەیانقیژان بە گوێچکەمدا، گازیان لە دەستم دەگرت، قەپیان بە پشتملمدا دەکرد. لەو شەوەوە بۆ ماوەیەکی درێژ ژیانم بوو بە دۆزەخ، بەر لەوەی ساڵی چوارهەمی کۆلیژ تەواوبکەم ماوەیەکی درێژ لە نەخۆشخانەی دەرونی کەوتم، سەریلن لە کارەبا دام، بەڵام سوودی نەبوو، بۆ هەر کوێیەک دەچووم ئەو زارانە لە بەردەممدا هاواریاندەکرد، دەستم دەگرت بە گوێمەوەو خۆم گرمۆڵەدەکرد بەڵام ئەو هاوارە ترسناکانە هەر لەسەرمدا دەزرینگانەوە، ئەو ساڵە نەمتوانی درێژە بە خوێندنەکەم بدەم. نەمدەتوانی بخەوم، هیچ مرۆڤێک نەیدەتوانی ئاسان

لێم نزیک ببێتەوە. کە دەهاتن بۆم شتم فڕێدەدا، شتم دەشکاند، بە کوچەو کۆلانەکاندا ڕامدەکرد، خۆم لە شوێنی بەرزەوە دەخستە خوارێ، پالم بە ڕێبوارانەوە دەنا، دەچوومە ناو ئاو، بەرەو مەزراو کێلگەکانی دەرەوەی شار ڕامدەکرد، بەلام ئەوان بەردەوام لە دوامەوە بوون، ئازاریاندەدام، دەگریان، پێدەکەنین، گۆرانیان دەگووت، هوتافیان دەکێشا، جەلادەت هەمووشی بە کوردی بوو، زمانێک من تێینەدەگەیشتم. شەوێک چووم بۆ لای ئەو پیرەمێردەی لاشەی کوردەکانی دەناشت، ئەو کوردانەی ئێمە لە کاتی مەشقدا دەمانکوشتن، پیرەمێردێک بوو پیکابێکی هەبوو، مەیتەکانی هەلدەگرت و دەیبردن دەیناشتن، تیاپاڕامەوە کە گۆڕی ئەو کوردانەم نیشانبدات کە لەو چەند ساڵەدا ناشتونی، پیاوێکی سەیربوو، ناوی هەموو مردوەکانی دەزانی، هەر شوناسنامەیەکیشی دەست کەوتبێت پاراستبووی، منی لە حالێکی هێندە ڕەجاڵ و پەککەوتەدا بینییەوە بەزەیی پیامدا هاتەوە، پێمگووت: دەبێت ئەم زمانانە بدەمەوە بە ساحێبەکانیان، ئەگەر ئەم زمانانە نەگێڕمەوە تا قیامەت ئاسوود نابم. پێیگووتم: تۆو ئاسودەیی؟؟!! تۆو دلنیایی؟؟!! دڕندەی وەک تۆ هەرگیز ئاسوودە نابێت، تۆزێک ببەرەوە بە مرۆڤ... من تۆم بینیوە، وەک وەحشێکی بێڕەحم ڕەفتاردەکەیت. هێزی خۆت لە هەندێ بەستەزماندا تاقیدەکەیتەوە کە دەست و دەمیان بەستراوە و ناتوانن هیچ بکەن، ئەوە کەی پیاوەتییە، یەکێک شەهامەتی ببێت وا لەگەل هەندێک نەفسی بێدیفاعدا ناکات، تۆ چیت لە گورگ بوویت یان ئینسان؟. من هێندە مەجبوری ئەو بووم، هەرچییەکی بگووتایە لێم قەبوولدەکرد، بە کۆمەکی ئەو، بە یاریدەی ئەو ناوانەی لای من هەبوون و لای ئەویش هەبوون، زۆربەی گۆڕەکانمان دۆزییەوە، زۆربەیمان هەلدایەوە، زمانەکانمان خستەوە جێگای خۆیان و سەری گۆڕەکانمان داخستەوە.

لەدوای ئەوەوە تارماییەکان وازیان لێهێنام و دوای ساڵێکی درێژ لە ئازار گەڕامەوە بۆ تەواوکردنی خوێندن... بەلام جەلادەتی کۆتر، ئەی هەرزەکاری

نەجیب، ئەی کوردی بەنمەک و شەرەف، ئەمشەو بنوو، ئەی منداڵی پێکراو، ئەی کوڕی وەفا، بنوو بنوو، بەربەیان نزیکەو کەمێکی دی کەڵەشێر دەخوێنێت و عەندەلیب بەیانی دێتە زمان، تەبیعەت هاتنی سوبحێکی دی ڕادەگەیێنێت، سبەی تۆ کارت زۆرە، سەر بخە سەر بالیفەکەت و بنوو. ئەی منداڵی داکەوتوو لە سوارچاکترین خێڵەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە، بنوو.

* * *

سامیری بابلی لە ژوورەکەی مندا وەک گیانلەبەرێکی بێخشپە دەژیا، من لەو ماوەیەدا بوارم بە کەس نەدەدا بێتە ژوورەکەی من. ئەو لەو ژوورەوە هەوڵیدەدا دەمی بگاتە هەندێ کەس تا بتوانن بینێرن بەرەو دەرەوەی وڵات، بەڵام هیچ کەس نەیدەوێرا بچێتە ژێرباری یارییەکی وا ترسناک، هاوڕێکانی وەڵامیان نەدەدایەوە. دۆستە کۆنەکانی حاشایان لێدەکرد. من بە غەمگینی بە دیارییەوە دادەنیشتم و نەمدەزانی چی بکەم؟

هەندێک شەو بۆئەوەی لەگەڵ خەیاڵەکانی خۆیدا تەنها بژی، من جێمدەهێشت و لە ساڵۆنە تاریکەکەدا چاوەڕوانی دالیام دەکرد، ئەو زۆربەی شەوان بە دەم خەوەوە دەهات و لەو ساڵۆنەدا تارمایی باسمی جەزائیری دەبینی. هێدی هێدی دووبارەبوونەوەی ئەو شەوانە بوون بە لەزەتێکی قووڵ و بێبنی ژیانم. لەو شەوانەدا تێدەگەیشتم کە دالیا گەڕاوەتەوە بۆ خوێندن و خۆی بۆ دواهەمین قۆناغی کۆلێژ ئامادەدەکات. هەندێجار لە ناکاو بە ئینگلیزییەکی ساف دەکەوتە قسەکردن لەگەڵ باسمدا. هەندێجار دەگریا، هەندێجار هەڵدەستاو بە تەنیا سەمایدەکرد. من شەو دوای شەو چاوم تیژتر دەبوو، شەو دوای شەو پتر دەمتوانی قووڵایی ئەو تاریکییە داخراوو ترسناکەی ناو ساڵۆنەکە ببینم، تا زیاتر بمبینیایە زیاتر دەترسام ئاشکرابیم. زیاتر خۆم دەخزاندە سوچەکانەوە، هێدی هێدی چاوم وەک

چاوی کونە پەپوییەکی لێدەهات کە بە ئاسانی ناو زوڵمەت دەبینێت. چیتر پێویستیم بە مۆم نەبوو، بەڵکو تینی ئەوەم تیابوو وردترین و بچوکترین شتەکانی ناو تاریکی ببینم، دەمتوانی ئەو مێشوولە بچوکانە ببینم کە لە تاریکیدا لە نابەینی کورسییەکاندا دەفڕین، تا زیاتر دەمبینی، شتی سەیرترم لە تاریکیدا دەدۆزییەوە، هەستمدەکرد وردە وردە لەوە دەردەچم کەسێکی ئاساییبم، وەک ئەوەی حیجابێک هەبێت لە نێوان دوو جیهاندا کەمە کەمە ئەو حیجابە لە پێشچاوم بدڕێت و کەمە کەمە هێزی ئەوەم تیا دروستبێت بتوانم دونیایەکی تریش ببینم کە دەکەوێتە ئەو دیو ئەم دونیایەوە. سەرەتای دۆزینەوەی من بۆ دونیایەکی تر، لەو ساڵۆنە تاریکەی پرتەقاڵی سپییدا بوو، لەو کاتە بەدواوە زۆر شتی گرنگی ژیانی من لە تاریکییدا ڕوودەدەن، تاریکییەکی ئەنگووستە چاو، کە ئادەمیزادەکانی تر لایان وایە هیچ شتێکی تیا ڕوونادات، تاریکییەک تیایدا جوڵەی جیهانێک دەوەستێت و جوڵەی جیهانێکی تر دەست پێدەکات. لە یەکێک لەو ساتە تاریکانەی عەشقی دالیا سیراجەدیندا، هێدی هێدی تارماییەکی تەنک و ڕوونم بینی، شتێکم بینی کە لە شەپۆلێکی نەرمی ئاو دەچوو لە هەوادا مەلەبکات. شەوی یەکەم بە گومان بووم، نزیکبوومەوەو قووڵ قووڵ بە ناو زوڵمەتدا ڕوانیم، بەڵام هێشتا تینی نیگام نەیدەتوانی ئەو توێژە ئەستوورو سەیرەی تاریکی ببڕێت. کە چوومەوە ژوورەکەم، سامیری بابلی، نیوە ڕووت لە جێگاکەی خۆیدا لە تاریکییدا تەماشایدەکردم، خودای گەورە، لە تاریکیدا سەیری یەکترمان دەکرد و یەکدیمان دەبینی، بێئەوەی مۆسیقا مەستیکردبین، یاخود وەجدێک ئێمەی گرتبێت. وەک ئەوەی سامیر سەراسیمەیی و ناحاڵی بوونی من بخوێنێتەوە، هەڵدەستاو بەو دەنگە هێمنەی خۆی کە تەنیا تا ئاستی گوێچکەی من بڕیدەکرد، دەنگێک وەک چۆن خوێن بە بۆرییەکی باریکدا لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر دەڕوات، ئاوەها بە ڕێگایەکی باریکدا لە زاری ئەوەوە بۆ لای من دەهات، بێئەوەی هیچ شەپۆلێکی بە هیچ

جێگایەکی دیکەدا پەرش ببێتەوە، بێئەوەی هیچ چپەیەکی بە هەوادا بڕوات. سامیری بابلی کە وەک پادشاهێکی ئەکەدی دێرین پاڵکەوتبوو، گووتی: جەلادەتی کۆتر، هەی مێردمنداڵی نەجیب، ئەی هەرزەکاری بەدبەخت، لەوە سەرسامیت کە لە تاریکیدا دەبینیت، لەوە سەرسامیت کە چیتر تاریکی و ڕوناکی بۆ تۆ نرخێکیان نییە، تۆ دەبێت لە تاریکیدا ببینیت. ئەوە قەدەری تۆیە لە تاریکیدا ببینیت، چونکە گەر لە تاریکیدا نەبینیت، ناتوانیت بڕۆیت، ناگەیتە هیچ.

خۆی ڕاستدەکردەوەو وەک یەکێک لە غەیبەوە قسەبکات دەیگووت: هەندێجار هەموو ڕێکەوت و پلانەکان کۆدەبنەوە بۆئەوەی مرۆڤ بگەیێنە شوێنێکی دیاریکراو، هەموو هێزەکانی سروشت و سەرتاپای ئیرادەیان لەسەر ئەوە ڕێکن یەکێک بپارێزن، هەندێجار لە ناو جەرگەی هەموو شتە ئاساییەکانی دونیادا، لە ناکاو موعجیزەیەکی سەیر ڕوودەدات، بۆئەوەی دووبارە ئەو ڕاستییە بچوک و سادەیەمان نیشانبداتەوە کە ئێمەی گەمژە زوو زوو لە یادیدەکەین. تۆ ئەی منداڵی نەجیب، ئەو کەسەی کە لە ناو دونیاکاندا سەفەردەکەیت، تۆ ئەو ڕۆحەیت کە نهێنی تاریکی دەهێنیت بۆ ڕوناکی و نهێنی ڕوناکی دەبەیت بۆ تاریکی. نهێنی ئێمە دەبەیت بۆئەو دونیا و نامەی ئەوان دێنیت بۆ ئێمە.

قسەکانی سامیری بابلی بە پەخشان و ڕەمز تێگەیشتم، بەڵام ئەو دەستی دەخستە سەرشانم و چاوە ڕەشە گەورەکانی لە تاریکیدا وەک دوو دەرگای ڕوناکیان لێهات، کە لێوەی مرۆڤ دەتوانێت وەک تونێلێکی ئەفسووناوی بەرەو ئەوسەری هەموو تەلیسمەکان سەفەربکات، گووتی: دوو ساڵ لە مەوبەر، لە یەکێک لە شارەکانی کوردستاندا، دەورییە بووم، لەگەڵ هێزێکی تایبەتدا دوو پیکاب سەربازم پێبوو، شەوان بە شەقام و کوچەکاندا دەگەڕام، تەقەم لە هەموو شتێک دەکرد، تەقەم لەو گەڵایانە دەکرد کە با لە درەختەکانی دەفڕێنێت، تەقەم لە باڵندە بچوکەکان دەکرد،

تەقەم لە مارمێلکەو خشۆک و مێشوولەکانیش دەکرد. خۆم دەچوومە سەر دۆشکاکەو شریتێکی درێژم دەخستە سەر و نیشانەم لە پەنجەرەی مالان دەگرتەوە، نیشانەم لە تەنکی سەربانەکان دەگرتەوە، نیشانەم لە ئەریەلی تەلەفزیۆنەکان دەگرتەوە، پشیلەم لە سەر ستارەکانەوە فڕێدەدایە خوارێ، لە قەیسەرییەکاندا بە ناو مەخزەنی بۆدرەو عەترەکاندا دەستڕێژمدەکرد، ئاگرم لە دوکانی کوتالچییەکان بەردەدا، قفلم دەشکاند، بە تەقە دوای پەپولەی بچوک دەکەوتم، مانگی سەر منارەکانم دەکرد بە نیشانە، بەدۆشکا بلندگۆکانم بەسەر منارەکانەوە دەشکاند، بە فیشەک لەسەر دیواری مزگەوتەکان ناوی خۆم لەپاڵ ناوی خودادا دەنوسی، کەسێک بووم ترسناک. ئەو کاتانەی من بەشەو دەوریبەبووم، چۆلەکەکانیش نەیاندەتوانی سەر دەربهێنن، هێلکەش نەیدەتوانی بتروکێت، تنۆکی ئاو لەسەر ڕوپەڕی گەلاش نەیدەوێرا بەربێتەوە. کە من بەو شارەدا دەسوڕامەوە «با»ش دەوەستا، سەعات چرکەی نەدەکرد، ئەی منداڵی نەجیب، دەبوایە من ئیجازە بە ئەستێرە بدەم بدرەوشێتەوە، من ئیجازە بە هەوربدەم تێبپەڕێت لە شەوێکی وەهادا من مانگەشەو مەستیکردبووم، هەموو گیانم لە تریفە هەڵکشابوو، خۆم لە ڕیزی هێزە هەرە ئەفسانەییەکانی ناو سروشتدا دەبینییەوە. بەلام ئەو شەوە شتێک ڕویدا هەموو ئەو غرورەی شکاندم. ئەو شەوە گوێم لە دەنگی فلووتێکی غەمگین بوو لە کوچەیەک لە کوچەکانەوە بەرزدەبێتەوە. فلووت، لە شەوی دەسەلاتی مندا؟! فلووت لە کاتی گەشتی مندا بەو شارەدا؟!. جەلادەتی ئازیز، من دەڕۆیشتم و ئەو فلووتەش دەڕۆیشت، دەچوومە هەر جێگایەک دەنگی ئەو فلووتە لە کۆلانەکەی ئەو دیوتر بوو، بەدرێژایی ئەو شەوە من دەمویست ڕاوی ئەو مۆسیقارە بکەم و بۆم نەدەگیرا، دەچوومە لای ڕاست ئەو دەچووە لای چەپ، دەچوومە لای چەپ ئەو دەهاتە لای ڕاست، من دەچوومە دواوە ئەو دەچووە پێشێ، سەردەکەوتم بە کوچەکاندا ئەو دادەگەڕا، ڕۆژ دەبووەو

من شکست و کەنەفت دەگەڕامەوەو ئەو مۆسیقایەش خامۆش دەبوو. بەڵام وەسوەسەیەکی سامناک لە مندا دروستدەبوو، شتێک لە دڵمدا دەیگووت، گەر ئەو مۆسیقایە بێدەنگ نەکەیت، هەموو شەرەف و ناوبانگ و شکۆی خۆت دەدۆڕێنیت. ئەی منداڵی بەنەزاکەت و بەوەفا، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە دۆعامدەکرد جارێکی تر گوێم لە دەنگی ئەو فلووتە نەبێت، حەزمدەکرد گەر شەوێکی تر چووم بۆ گەڕان و بەسەرکردنەوەی شەقامە خاڵی و تاریکەکانی شار، ئەو دەنگە نەبیستم، ئەو ئاوازەم گوێ لێ نەبێت.

شەوی دواتر لەهەمان جێگادا، لە هەمان ساتدا، لە ژێر هەمان درەخت و ئەستێرەدا دەنگی ئەو فلووتە دووبارە بەرزبووەوە. نەمدەزانی لە چ ماڵێکەوە دێت، لە چ کوچەیەکەوە؟ لە چ زەوییەکەوە هەڵدەقوڵێت یاخود لە چ ئاسمانێکەوە دادەبەزێت؟ فەرمانم بە هێزەکانم دا فیشەک بتەقێنن، چی فیشەکمان هەبوو بە هەوادا تەقاندم، بۆئەوەی ئەو دەنگە نەبیستم، بە دەیەها کلاشینکۆف و دیکتاریۆف تەقەماندەکرد، بەڵام ئەو مۆسیقایە بەردەوام لە ژێرەوە دەهات، هەستمدەکرد گوللەکانی من هیچ نابڕن، بەڵام ئەو مۆسیقایە قووڵ تا هەناوی من نەشتەری خۆی دەبات. ئەی منداڵی نەجیب، ئەی جوانترین گوێگرێک من بینیبێتم، من کۆڵم نەدەدا، شتێک بوو لە خوێنەکەمدا، دەبووایە بیگرم، دەبووایە یان من بیکوژم یاخود ئەو من بکوژێت.

هەموو شەوێک ئەو چیرۆکە دووبارە دەبووەوە، ئەو مۆسیقایە شتێک بوو بە گژ هەموو هێزو جەبەروتی من و دەوڵەت و سوپادا دەچووەوە، بێئەوەی هیچ شتێک بکات. بێئەوەی مانایەکی زەق لەودیو ئاوازەکانییەوە بێت. مۆسیقایەک بوو لەویادا، شتێک بوو پێچی بە ڕۆح دەکردەوە، شتێک بوو ناچاریدەکردیت بێدەنگ بیت و گوێی لێبگریت، دونیای ناچاردەکرد بێدەنگ بێت و گوێی لێبگرێت. من شێت دەبووم، بلدۆزەرەکانم دەهێنا و دەکەوتمە تێکدانی ماڵ و گەڕەکەکان، لە ناو وێرانە و داروپەردووی

ماڵە خاپووررو وێرانەکاندا بەدوای ئەو مۆسیقایەدا دەگەڕام بیدەنگیبکەم. ئاگرم لە باغچەکان بەردەدا و لە خۆڵەمێشەکەیدا بۆ ئەو ئاوازانە دەگەڕام بیدەنگیانبکەم، خەڵکم لە ماڵەکانی خۆیان دەهێنایەدەرێ و بە درەختەکاندا هەڵمدەواسین، بۆئەوەی ئەو مۆسیقایە خامۆشبکەم، بەڵام سوودی نەبوو. ئەو لە دونیایەکی ترەوە دەهات، دونیایەکی هاوسێ بە ئێمە، نزیک لێمانەوە، تێکەڵ لەگەڵ خوێنماندا، بەڵام نادیارو نەبینراو. نازانم چەند هەفتە و چەند مانگ شەڕم لەگەڵ ئەو مۆسیقارەدا کرد... نازانم، بەڵام دەزانم هەر ڕۆژەو شتێک لەو دیوارە تاریکەی ناو ڕۆحم دەڕوخا، لەدەرەوە دڕندەتر دەبووم، بەڵام لە ناوەوە غەمگینتر. شەوێک لە شەوان دانم بە شکستی خۆمدا نا و هەموو هێزەکانم گێڕایەوە بۆ بنکەکانی خۆیان و بەتەنیا، بەدەستی بەتاڵ، بەبێ ئەو چاویلکە ڕەشە تاریکەی دەمکردە چاوم، دەستمکرد بە گەڕان بە کوچەکاندا و گوێگرتن لەو مۆسیقایە. یەکەمجارم بوو لە ژیانمدا بەڕاستی گوێ لە مۆسیقا بگرم، یەکەمجارم بوو هەستبکەم خەریکە دڵم دەستەمۆ دەبێت. جەلادەتی نەجیب، ئەی کوڕی غەمگینترین خاکی سەر ئەم زەوییە، ئەو مۆسیقایە منی بەزاند و قووڵ هاتە ژیانمەوە. شەوان ئەو شارە سەرتاپای خاڵی بوو، ئەو مۆسیقارە ئێوارەیەک لە ناو تاریکییەوە بە خۆی و فلووتەکەیەوە دەرکەوت و سڵاوی لێکردم. ئەو لەسەرەتاوە بۆ ئەو ئێوارەیە گەڕابوو، منیش لەسەرەتاوە لەو ئێوارەیە ڕامدەکرد، ئەو لەسەرەتاوە دەیزانی لە ساتێکدا من و ئەو ڕووبەڕووی یەک دەبینەوە. بە هەموو جلە سەربازییەکانمەوە، بە نۆتەو مەدالیاکانمەوە بەرابەری وەستام، ئەو دەستێک جلی سپی سپی لە بەردابوو، قژی کەمێک بە خاوی هاتبووە سەر چاوی، فلووتێکی سپی پێبوو. لەو شەوەوە زمانی من گۆڕدرا، دڵم بە جۆرێکی تر پێچیکردەوە، من پێمگووت: ئەی سەرگەردان و بێجێی شەو، تۆ کێیت؟ لە کوێوە دێیت. چیت لە من دەوێت، چ شەڕێک لەگەڵ مندا دەکەیت، کە بە من ناکرێت.

بە هێمنییەکەوە قژی لابرد و گووتی: هەر کەسێکم گرنگ نییە، من لە شاری مۆسیقارە سپییەکانەوە هاتووم بۆ لای تۆ. هیچ شتێکم لە تۆ ناوێت ئەوەنەبێت گوێبگریت.

من دووبارە پرسیارم لێکردەوە، گووتم: لە کوێوە؟

بە هێمنی و بە دەنگێکی ساف وەک تکەی شەونم، وەڵامیدامەوە: لە شاری مۆسیقارە سپییەکانەوە هاتووم، لەو شارە دوورەوە بۆئەوەی گوێم لێبگریت.

من دەستم گرت و ویستم لەگەڵ خۆمدا بیبەم، بەڵام بەهێمنی ئەو دەستی وەرگێڕاو مەچەکی منی گرت و گووتی: ئەمشەو تۆ لەگەڵمدا وەرە.

من دۆڕاوو شکستەی ئەو جەنگەبووم. بێئەوەی بیر لە هیچ بکەمەوە خۆم دایە دەست ئەو مۆسیقا سیحراوییەی ڕۆحمی لە تەپوتۆزو تاریکی و خوێنڕێژی چەندەها ساڵ پاکدەکردەوە. من ئەو شەوە تێگەیشتم مۆسیقا مەعدەنی ڕاستەقینەی مرۆڤەکان دەدۆزێتەوە، ئەو کانزا جاویدو پاکەی ئێمەی لێ دروستبووین، جەلادەتی کۆتر ئەوشەوە من بە ناو دارستانەکاندا دەڕۆیشتم، ئەفسەرێکی دزێو کە هەموو ژیانم لە کوشتن و سووتان و وێرانکردندا بردبووە سەر، نەقیب سامیری بابلی، هاوڕێی سەرۆک کۆمار، دلاوەرترین ئەفسەری فەیلەقی چوار، خاوەنی نۆتەی قارەمانی، ئەو پیاوە ترسناک و تەنیایەی کە بۆنی پرتەقاڵی لێدێت. ئەو پیاوەی سەدان گوندی لە کوردستان لەگەڵ زەویدا تەختکردبوو، چەندەها شاری ڕوخاندبوو، ئەی منداڵی بە نەزاکەت من ئەم جانەوەرە ترسناکەی بەردەمت، کەدەستکردی سوپا و سیاسەت و قەبیلەکانی وڵات بووم، مۆسیقا وەک منداڵێک دەستەمۆیدەکردم. وەک یەکێک خەوی لێکەوتبێت و بڕوات، دوای دەنگی ئەو فلووتە دەکەوتم کە سات دوای سات تێکەڵ بە سروشت و ژیان و جوانی دەکردمەوە. پارچە مۆسیقایەکی ناکۆتا بوو، هیچی نەدەگووت و هەموو جوانی و شیرینی ژیانیشی ئاشکرادەکرد، هیچی نەدەگووت و لە ناوەوە

هەمـوو شتێکیشـی بـۆ مـن ڕوناکدەکـردەوە، منـی بـەرەو نـاو دارسـتانێکی خەیاڵی بـرد، لەوێوە بـەرەو کەنـاری زەریاچەیـەک کەوەک ئـەوەی سـەر لـە نوێ لـە دایکببمـەوە، خـۆم لـە شـەپۆلەکانی هەڵکێشـا، ئـەو فلووتی لێدەدا و من بە هێمنی مەلەمدەکرد، لەگـەڵ هەمـوو تەکانێکی تـازەی نـاو ئاودا، ئـەو مرۆڤە خەوتـوو و دیلـەی نـاو ڕۆحـم بەئاگادەهاتـەوە.

دوای چەندیـن سـەعات مۆسـیقا و مەلـە، مۆسـیقا و ئـاو، فلـووت و پاکی، ئـاوازو ئیشـراق. لـە ئـاو هاتمـە دەرەوەو بووبـووم بـە مرۆڤێکی تـر.

* * *

مـن دەسـتی سـامیری بابلیـم دەگـرت و تـکام لێدەکـرد، بەردەوامبێت، مـن دەمتوانـی چەندەهـا سـەعاتی تـر دانیشـم و گوێی لێبگـرم، بـەڵام ئـەو گووتـی: ئـەی منداڵـی نەجیـب بخـەوە، تۆزێکـی تـر کەڵەشـێری بەیـان دەخوێنێـت و نەسـیمی سـوبح هەڵـدەکات، تۆزێکـی تـر لاولاو دەگەشـێتەوە و شـەونم بـۆ مـردن ئامادەدەبێـت. بـەر لـەوەی عەندەلیبـی بەیـان بێتەزمـان بخـەوە، تـۆ سـبەی کارت زۆرەو کەمێـک پشـووبدە.

ئـەوە دووەمیـن جـار بـوو، نـاوی شـاری مۆسـیقارە سپییەکان ببیسـتم. دووبارەبوونـەوەی ئـەو نـاوە، شـتێکی سـەیربوو، مـن ئەوەتـەی هاتبوومـە شـاری تەپوتـۆزی سـۆزانییەکان، تەلیسـم لـە دوای تەلیسـم، نهێنـی لـە دوای نهێنـی تووشـم دەبـوو. بـەڵام ئێسـتا هەسـتمدەکرد ئـەو نـاوە پتـر لـە هـەر شـتێکی تـر، هەوایەکـی نهێنـی و ئاوازێکـی تەلیسـماوی لـە خەیاڵـی منـدا دەوروژێنێت، بـەڵام وەک سروشـتی هەمیشـەیی خـۆم هێنـد سـەبرم هەبـوو، بژیـم و چاوەڕوانبکـەم. دڵنیابـووم سـامیری بابلـی نهێنـی زیاتـری لایـە، دڵنیابـووم دەتوانێـت یارمەتیمبـدات، کەمێـک ئـەو ئامـاژەو نیشـانە سـەیرانە

پێکـەوە گرێبـدەم.

شـەوی دواتر دوای تەواوکردنی هەموو کارەکانی خۆم لەسـەر سـەحنەکە، دوای ئـەوەی پارەی شاباشـەکانم لەسـەر تەختەکە کۆکردەوە، ئـەو پارەیـەی پیـاوە بێهـۆش و مەسـتەکان بەسـەر سـەماکەر و کچـە گۆرانیبێژەکانـدا هەڵیانـدەدا. گەڕامـەوە بۆ ژوورەکـەی خـۆم، ئـەو شـەوە دالیـا لـە سـەرەتای دەسـت پێکردنی بەرنامەکانـەوە لەگـەڵ پیاوێکی باریک و غەمگیندا چووبـووە ژووری، یەکێک بوو لـەو میوانانـەی لـەدوورەوە دەهـات تـا بەتایبـەت لەگـەڵ دالیا سیراجەدیندا بخەوێت. ئـەو شـەوە لەوانـە بـوو کە من مەراق دەیکوشتم، دڵنیاشـبووم دالیـا نایەتـە خـوارێ، لـە گەنجینەکـەی پشـتەوە سـەبەتەیەک پرتەقاڵی نوێـم هێنـاو لـە پێشـدەم دەرگاکـەدا دامنـا تـا کـەس گومانـی هیـچ نـەکات، گەڕامـەوەو ئـەو خواردنـەی لەکاتی بەرنامـەدا پێچابوومـەوە هەڵمگرت و هێنامەسـەرێ و چوومـە ژوورێ و دەرگاکـەم داخسـت. سـامیر بیسـتۆکێکی چکۆلانـەی لـە گوێدابـوو گوێـی لـە ڕادیـۆ دەگـرت، دواتـر مـن و ئـەو پێکـەوە نانمانخـوارد. مـن پێمگـووت: سـامیری بابلی، تۆ چی لەسـەر شـاری مۆسـیقارە سـپییەکان دەزانیـت؟. سـەیریکردم و بـە زەردەخەنەیەکـەوە کـە بەدەگمـەن دەکەوتـە سـەر ڕوخسـاری، گووتـی: دەزانـم دەتەوێـت لـە ئێسـتاوە هەمـوو چیرۆکەکە بزانیت. منیش وەک تۆ وەهـام، منیش زۆرجار بێسـەبر و بێبڕوام، بـەڵام گـەر مـرۆڤ پەلەنـەکات، ژیـان خـۆی لەهـەر هێزێکی تر جوانتر شـتەکان تەفسـیردەکات، هەرگیـز هێـزی تەفسـیرکردنی ئینسـان لـە ئاسـتی هێـزی تەفسـیرکردنی ژیانـدا نییـە، مـن ئـەم چەنـد سـاڵەی دوایـی ئەزمـوون دوای ئەزمـوون بـۆم دەرکەوتـووە، گەورەتریـن حیکایەتخـوان ژیـان خۆیەتـی.

کەمێک بێدەنـگ بـوو، بـە هێمنی تیکەکـەی لەگـەڵ مندا قووتـداو بە غەمگینی گووتـی: ئـەی منداڵـی نەجیب، ئـەو کـوڕە مۆسـیقارە هیچـی پێنەگووتـم، بـەڵام زۆر شـەو، لە زۆر جێگادا، من مۆسـیقاکەیم بیسـتەوە. وەک ڕۆحێکی گەڕۆک وابـوو... ئـەو شـەوە بڕیارمدا تامـاوم دەسـت نەخەمـە خوێنی کەسـەوە و هیـچ

مرۆڤێک نەکوژم، لەو شەوەوە بڕیارمدا ئازاری باڵندەیەک نەدەم، بەلام درۆمکردو نەمتوانی. من جار دوای جار پەیمانی خۆمم دەشکاند، ئەو جانەوەرەی ناوم درتربوو لەوەی من چاوەڕوانمدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مۆسیقایە هەمیشە لەسەرمدا دەنگیدەدایەوە، بۆ هەر کوێ دەچووم لەگەڵمدا بوو، وەک ئەوەی لە ڕۆحمدا تۆمار بووبێت و لە ناکاو یەکێک پەنچە بنێت بە دوگمێکی نهێنیداو سەرلەنوێ دابگیرسێتەوە.

جەلادەت... من بەردەوامبووم لەسەر کوشتن، بەردەوامبووم لەسەر وێرانکردن، بەلام لەدوای ئەو شەوەوە هەرچییەکم بکردایە، لەزەتم لێ نەدەبینی، بۆ هەر جێگایەک دەچووم غەمگین بووم، هەرچییەکم دەکرد تەنها بووم، هەموو ئەو شتانەی لەوەوپێش لەزەتم لێوەردەگرتن لەزەتیان نەما، ئەو مۆسیقایەی جاران کەیف و سەفام پێدەهات، نرخی کەوت و بەهایەکی لەلام نەما. ئەو مۆسیقایە یەکجار منی لەو دونیایەی خۆم هەڵگرت و فڕێیدامە ناو دونیایەکی ترەوە. جاران بە ئیمانەوە گوندەکانم دەسووتان، بەلام دوای ئەو مۆسیقایە ئیمانم گۆڕدرا، جاران بە لەزەتەوە خەڵکم دەکوشت، دوای ئەو ئاوازە تێگەیشتنم لە لەزەت گۆڕدرا، جاران بە واجیبم دەزانی دوژمنان زیندە بەچاڵبکەم، بەلام وشەی فەرمان و بەرپرسیارێتی بوونە کاو با. لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی من لەسەر ئەو وشانە دروستبووبوون، ژیانی من لەسەر ئیمان و لەزەت و واجیب خولقابوو، سێ دەردی کوشندە کە دەشێت هەر یەکەیان بە تەنیا مانایەکیان هەبێ، بەلام کە کۆدەبنەوە ئافاتی ئەوتۆ دروستدەکەن لە تاعوون بەدتر. نەمدەزانی چی لەو مۆسیقایە بکەم، نەمدەزانی چۆن بیکەم بە شتێک ڕێنمایی ژیانی لێوەرگرم، لەبەرئەوە بەردەوام گوناهی گەورەم دەکرد و پەشیماندەبوومەوە، خەڵکم دەکوشت و دواتر دەگریام. تا دواجار شتێکی دیکە ڕویدا ڕۆحی منی هێندەی تر لە بنەوە هەڵتەکاند.

هێزێکی نهێنی بەردەوام ڕێگای منی دەخستە سەر ڕێگای مۆسیقارەکان.
شەوێک وەک شەوانی تر، لەیەکێک لەو شارە خاپوورانەی کوردستاندا، بە ناو کوچەو کەلاوەو کۆلانەکاندا پیاسەمدەکرد، گیانم لە تریفەدا شەلاڵ بوو، لە ناکاو دەنگی کەمانچەیەک بەرزبووەوە، بە وێنەی یەکەمین جار، بە وێنەی ئەو زەمانەی مۆسیقا شێتیکردم، دەنگێکی کوتوپڕو سەیرو پڕ حیکمەت بوو، دەنگێک بوو منی بانگدەکرد، منێک کە وەک ئاژەڵێکی تووڕەم لێهاتبوو، بە گایەکی بیمار دەچووم کە شێتانە سەر بە دیوارێکی سووردا دەکێشێت. من دەمویست وەک نەقیب سامیری بابلی بمێنمەوە، تا هەمیشە ئەو پیاوە ترسناکەبم کە جێدەستم بەسەر ژیانی هەموو باڵندەو مرۆڤ و بەردێکەوەیە، ئەو کەسە بمێنمەوە کە هەر پەرەسێلکەیەک هێلانەیکرد، دەبێت حیسابی ئەوەبکات کە دەشێت من بیڕوخێنم، هەر ژنێک هێلکەیەکی لە گوڵداندا سەوزبوو حیسابی ئەوەبکات دەشێت من منداڵەکەی لەناوبەرم، هەر باغەوانێک درەختێکی چاند، ئاگاداربێت کە ئەگەر لە بەری ئەو درەختەی خوارد، ئەوە منم بوارمداوە نەوەک خودا... ئەی کوڕی بە نەزاکەت، ئەمجارە من ڕۆژ و هەفتەو مانگ دوای سەرچاوەی دەنگەکە نەکەوتم، هەر ئەوشەوە دۆزیمەوە، کەمانچەژەنێکی باڵابەرزو باریک بوو، لەسەر بەردێکی گەورە لە ناوەڕاستی کەلاوەیەکدا کەمانچەی لێدەدا، وەک ستوونێکی درێژ وابوو لە برۆنز، لە ناو داروپەردووی وێرانەیەکدا ئاوازێکی دەژەن سیحراوی وەک ئەو ئاوازەی لە فلووتی ئەو مۆسیقارە سپیپۆشەم بیستبوو. من نەفرەتم لەو ڕۆژە دەکرد کە مۆسیقا تیا لەدایکبووە، دەترسام هەموو مۆسیقارەکانی دونیا خۆیان لەسەر ڕۆحی من تاقیبکەنەوە، هاوارمدەکرد: بۆ من... بۆ بە تەنیا من. ئەم وڵاتەی ئێمە پڕێتی لە هەزاران ئەفسەری مرۆڤکوژ، ئەمە چ هێزێکە من بەم شێوەیە تاقیدەکاتەوە؟ چ هێزێکە ناهێڵێت ئاسوودە بژیم و بخەوم؟ تفەنگەکەم دادەگرت و دەمدایە بەر گوللە، نەدەکرا بهێڵم ئەو کەمانەش بە هەمان دەردمبەرێت. ئەو بە

ئارامی کەمانچەی خۆی لێدەداو دەڕۆی، من دڵنیابووم پێکاومە، دڵنیابووم... جارێکی دی تەقەم لێکردەوە، بەڵام جەلادەتی کۆتر هیچ، ئەو لەسەرەخۆ کەمانی لێدەداو دەڕۆی. من دوای دەکەوتم، دڵنیابووم خوێنی لەبەر دەڕوات، بەڵام بێ هیچ ماندووبوونێک کەمانی لێدەدا، بەرەو قووڵایی ئەو شارە ڕۆی، بەرەو بازاڕە بێدەنگەکانی شەو، بەرەو قەیسەرییە ساردەکان، من خوێنەکەیم دڵۆپ دڵۆپ حیسابکرد، بەڵام لە نیوەی ڕێگادا هەستمدەکرد من دڵێکی مەبهورم کە دوای مۆسیقا کەوتووم، نەوەک ئەفسەرێکی بێڕەحم کە دوای نێچیرێک کەوتبم. ئەو بە هەموو شەقامەکاندا دەڕۆیی و مۆسیقای لێدەدا، من شەیدای ئەو ئاوازە دوای دەکەوتم و نەمدەزانی بۆکوێم دەبات، فریوی نەغمەکانیم دەخوارد و مەستبووم. ئەو دەڕۆی و وەک بە هێزێکی ئەفسوناویی ڕامکێشێت بەدوایدا دەڕۆیشتم، ئەو دەڕۆیشت و من دەڕۆیشتم، ئەو دەڕۆیشت و من دەڕۆیشتم، لە جێگایەکی ئەو ڕێگا درێژەدا بێئەوەی پێبزانم تفەنگەکەم فڕێدا، لە شوێنێکدا کە نەمدەزانی کوێیە، چاویلکەکەم لێکەوت. دەڕۆیشت و دەڕۆیشتم... دەڕۆیشت و دەڕۆیشتم. دواجار بە ماندوویی لە گوزەری قەسابەکاندا گرتمەوە، پاڵی دابوو بە دەڕابەیەکەوەو نیوە مردوو تەماشای شتێکی دەکرد کە من و تۆ نایبینین. پێیگووتم: سامیری بابلی، منت کوشت. لەو دەقیقەیەدا هەموو پەشیمانی گەردون لە گەرووی مندا بوو، من بووبووم بە پیاوێکی بێمانا، دەستمدایە خۆی و کەمانەکەی و گووتم: هەستە فریاتبکەوم، هەستە فریاتبکەوم. پێکەنینێکی غەمبار پێکەنی و گووتی: هێشتا زووە، سامیری بابلی، هێشتا زووە، ڕۆژێک دێت، دەبێت فریای مۆسیقارێک بکەویت، شەوێک دێت، وەک ئەمشەو مۆسیقارێک دەکوژیت، بەڵام لە ناکاو ئەم ئاوازە سیحراویانە دێنەوە بیرت، دەگریت و پەشیمان دەبیتەوە، بە سەحرادا ڕادەکەیت، جەستەی دەدەیت بە کۆڵتدا و ڕزگاریدەکەیت. بەڵام من ئەو مۆسیقارە نیم، تۆ ناتوانیت من ڕزگاربکەیت.

کەمانەکەی بەدەستەوە بوو، بە ئارامی دەستی خستە سەر دەستم و گووتی: غەمی منت نەبێت، من دەگەڕێمەوە بۆ شاری خۆم، دەگەڕێمەوە بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان، من تەنیا نامەیەکم هەبوو بۆ تۆی بهێنم، ئاوازێکم هەبوو دەبایە یادی تۆی بهێنمەوە... شەوێکی دی، لە زەمانێکی دیکەدا، تۆ یەکێکی تر دەبینیتەوە، ئەو پێویستی بە کۆمەکی تۆیە نەوەک من، ئەو پێویستی بە کۆمەکی تۆیە...

جەلادەتی کۆتر ئەو مۆسیقارە تۆ بوویت.

جەلادەتی کۆتر، من لەو چەند ساڵەی دواییدا، بەردەوام ئەو مۆسیقارانەم دەبیست، کە دەهاتن و لە جێگایەکی نزیکەوە ئەو ئاوازەیان لێدەدا، لەبەرەکانی جەنگدا، لە شەوی تاریکی شارە دوورەکاندا، لەو شەوانەدا کە لە بیابان گۆڕی گەورەمان هەڵدەکەند و ژن و منداڵمان تیا زیندە بەچاڵدەکرد. ئەو کاتەی من بەرپرسی یەکەمی گۆڕە دەستەجەمعییەکان بووم، من نەخشەکانیانم دادەنا، من بەرپرسی ڕێکخستن و دابەشکردنیان بووم، دەبایە بە جۆرێک لە زەویدا ونیانبکەم هیچ فریشتەو ئەهریمەنێک نەیاندۆزێتەوە، بیانخەمە جێگای ئەوتۆوە ئاسەوارێکیان لەسەر زەوی نەمێنێت، تونێلیان بۆ دروستبکەم کە ڕاستەوخۆ دەچێتەوە سەر قیامەت. ئەو شەوانەی من خۆم لەگەڵ فەسیلی تیرباران و ناشتن و کوشتندا کارمدەکرد، لە هەر جێگایەک بوومایە، دەنگی ئەو مۆسیقایە بەرزدەبووەوە، هەندێجار لە ناو زوڵمەت و تاریکیدا مۆسیقارەکانم دەبینی، هەموویان جلی سپییان لەبەردابوو، لە تاریکیدا مۆسیقایان لێدەدا، فلووتیان لێدەدا، کەمانیان لێدەدا، هەندێجار لە جیپەکەی خۆمدا بە سەحرادا دەگەڕامەوە، بە درێژایی ڕێگاکە دەمبینین، لە ڕۆخی شەقامەکە دەوەستان و ئەو ئاوازە سیحراوی و قەشەنگانەیان لێدەدا، لە ناکاو یەکێکیان لە بەر ڕۆشنایی چرای ئۆتۆمبێلەکەمدا دەردەکەوت و وندەبوو. ئەوانە تا ئەو ڕۆژەی تۆم ڕزگارکرد بە دوامەوە بوون، جەلادەتی کۆتر هەموو ئومێدی ئەوان ئەوەبوو، تۆ ڕزگاربکەم، پتر لە ساڵێک بە

دوای منەوە بوون بۆ ئەوەی تۆیان بۆ ڕزگاربکەم. دڵنیام دەیانزانی ناتوانن هەموو ئەو کوژراوانە ڕزگاربکەن، ناتوانن بەر بەو دەریا گەورەیەی لاشە بگرن کە من و دەیەها ئەفسەری تری وەک من دروستماندەکرد، بەڵام دەبووایە یەکێک دەربازبێت و بتوانێت چیرۆکەکە بگێڕێتەوە، یەکێک ئەرکێکی مەزنی هەیە. سەیرە کە من نازانم چییە، جەلادەتی کۆتر ئەو کەسە تۆیت. تۆیت وەک پێغەمبەرێکی تازە وەهایت، من دەبووایە ڕزگارتبکەم، لە گۆڕ دەرتبهێنمەوە بۆئەوەی بژیت.

من بە غەمگینییەوە دەمگووت: پێغەمبەری چی و قسەی چی؟ نابینیت لە حەوتی ئێوارەوە تا دووی شەو قەحبە هەڵدەپەڕێنم، پێغەمبەرت بینیوە ئاوا بێت؟

ئەو بێئەوەی هیچ بڵێت دەیگووت: ئەی منداڵی بە نەزاکەت، ئەو شەوەی تۆم تیابینی، شەوێکی تری سەیری ژیانم بوو، من لە ماشێنێکدا بووم لە پێش ئەو زیلەی ئێوەوە دەڕۆیشتین، یەکێک بوو لەو شەوە دەگمەنانەی هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد. لە ڕێگا بۆ شتێک وەستاین، یەکێک لە زیلەکانی پێش ئێمە تایەیەکی تەواو نەبوو. من بەدەستووری هەمیشەیی خۆم لەوکاتانەدا دادەبەزیم، کەمێک هەوام هەڵدەمژی و سەیری ئەستێرەکانی بیابانم دەکرد. زیلەکەی ئێوە ڕاستەوخۆ لە دوای جیبەکەی منەوە بوو، کە دابەزیم گوێم لە مۆسیقاکەی تۆ بوو، سەرەتا وامدەزانی ئاوازی یەکێک لەو مۆسیقاره سپییانەیە کە بەردەوام بەدوامەوە بوون. بەڵام وانەبوو، ئاوازێکی نزیکترو سیحراویتربوو، جیاوازییەکی گەورەی لەگەڵ هەموو ئەو ئاوازانەدا هەبوو کە پێشتر بیستبووم، ئاوازێک بوو وەک ئەوەی ڕاستەوخۆ خالق خۆی دەستی لە دارشتنیدا هەبێت. بە جۆرێک ئاسمانی و بزوێن بوو، هەستمدەکرد هەواش وەستاوە و گوێدەگرێت، لەو کاتەدا دڵنیابووم کە ئەو مۆسیقایە جودایە لە هەر مۆسیقایەکی تر کە من لە ژیانمدا بیستوومە، هەتا جیاوازە لە مۆسیقای ئەو گەنجە سپیپۆشەی

لە گوێ ئەو دەریاچەدا بۆ ماوەیەک لەهەموو پیسی و دزێوییەکانم پاکیکردمەوە، مۆسیقاکەی تۆ زیندووترو کاریگەرتربوو، وەک گریانی ئاسمان و لەخەوهەستانی زەوی بوو بەسەر کارەساتێکی گەورەدا، تۆ بوویت لەو زیلەدا فلووتت لێدەدا، هەموو دیل و سەرباز و ئەفسەرەکان، زیندەوەران و نازیندووەکان گوێیان دەگرت، هەستمکرد هەموو بێهۆشن، ئەو مۆسیقایە بە شێوەیەک بردوونی مردن و تیربارانیان بیرچۆتەوە، من چادری سەر زیلەکەم کەمێک لادا بۆئەوەی بتبینم، خۆشت نوقمی بێهۆشییەکی قووڵ بوویت، ئەی منداڵی نەجیب، هەموو ئەم گەردونە لە ڕێگای ئەو فلووتەی تۆوە هاواریدەکرد. من دڵنیابووم تۆ ئەو منداڵەی کە لە شەوێکی تاریکدا تووشم دێیت و دەبێت ڕزگارتبکەم. دڵنیابووم تۆ ئەو کەسەی کە دەبێت ڕزگارتبکەم، تۆ ئەو موعجیزە چکۆلانەیەیت کە دەبێت بژیت. بەڵام چۆن، کە ماشێنەکان دەستیانکردەوە بە ڕۆیشتن تۆ بێدەنگ بوویت، لە ڕێگا زیلەکان پاش و پێشکەوتن، نەمدەزانی چۆن ڕزگارتبکەم، ئەوانەی کە دەهێنرانە ئەو سەحرایە هیچ هێزێک هیچ قانونێک، هیچ ڕەحمێک نەیدەتوانی فریایانکەوێت، ئەوەی کە دەهاتە ئەوێ دەبایە بمردایە، ئەوەی تێکەڵ بە یەکێک لەو قافڵانەی مردن دەبوو، هێزێک نەبوو لەسەر زەمین دەریبهێنێت، هەرکەسێک شتێکی وەهای بکردایە دەجار دەیانکوشت و زیندوویاندەکردەوە، نە من نە هیچ کەسێکی تر نەیدەتوانی ئەوەبکات، ئەوەی کە دەهات نەدەبایە بگەڕێتەوە، دەمزانی گەر ئەوانی تر تەقەت لێبکەن دەتکوژن، نەمدەویست بمریت، دەبایە خۆم تەقەت لێبکەم بۆئەوەی دواتر بتوانم ڕزگارتبکەم. ساڵانی دوورو درێژی تەقەکردن و مرۆڤ کوشتن فێری ئەوەی کردبووم، چۆن دەتوانم خەڵک برینداربکەم بێئەوەی بمرن. ئەوە تەنیا ڕێگابوو، لەوە زیاتر ڕێگایەکی تر نەبوو، هیچ هێزێک نەبوو تۆ لەو قافڵەیە دەربهێنێت. کە هەمووتان لە زیلەکان دابەزین بەرلەوەی سەربازو مولازمەکان سەرنجی هیچ بدەن، یەکەم دەسڕێژم لە

تۆکرد، تەقـەم لێکردیـت و بەپـاڵ فڕێمدایتـە کەندێکـی چکۆلانـەوە لـە قـەراغ ڕێگاکـەداو هـاوارم لـە بلـدۆزەرەکان کـرد «ئـەم کـوڕی سـەگە، نەکـەن بـە ژێر گڵـەوە، هـەروا فڕێیـدەن تـا بەیانـی سـەگ دەیخـوات، شـایەنی ئـەوە نییـە گۆڕیشـی هەبێت»، هەندێجـار وامـان لـە هەندێـک دیلـی تـر کردبـوو، لەبەرئەوە کـەس گومانـی لـێ نەکـردم. بەدەسـتی خـۆم فڕێمدایتـە قەراغێکـی چەپەکـەوە، بۆئـەوەی کـەس بیـر لـە هیـچ نەکاتـەوە. هاوڕێکانتمـان هەمـوو کوشـت، ئـەی منداڵـی نەجیـب، هاوڕێکانـی تۆمـان کوشـت و کردمانـن بـە ژێـر لمـەوە. ئـەوە پیشـەی هەمیشـەییمان بـوو. ئـەوەی تـۆی ڕزگارکـرد ئـەو ئـاوازە ئاسـمانییەی خـۆت بـوو، کـە بـە یەکجـارو بـۆ هەتـا هەتایـە منـی گـۆڕی. ئێسـتا ئەوەتـام لـە بەردەسـتتدا، ئـەی منداڵـی نەجیـب، مـن لەبـەر دەسـتی تـۆدام و دەتوانیـت بمکوژیـت. بـەڵام مـن لـە تـۆ دە پرسـم، ئـەی هـەرزەکاری بـە نەزاکـەت دەتەوێت تۆڵـەی کـێ بکەیتـەوە و لـە کـێ؟ لـە مـن یـان لـە هـەزاران بکـوژی تـر، لـە مـن یـان لـە ئاسـمان؟. ئـەو شـەوە، لاشـەکانمان شـاردەوە، بـەڵام بـەردەوام ئـەو مۆسـیقایە لەسـەرمدا بـوو، لـە دەمارەکانمـدا بـوو، لـە دڵمـدا پیاسـەیدەکرد. لـە گەڕانـەوەدا مـن لـە دووڕیانێکدا پێچـم بـە جیپەکـەم کـردەوەو گەڕامـەوە سـەر تـۆ، ئـەی منداڵـی نەجیـب تـۆ مردبوویـت، بەدرێژایـی چەندیـن سـەعات خوێنـت لێڕۆیشـتبوو، هـەر شـتێکم لـە تیمارکـردن دەزانـی بـۆم کردیـت و تـۆم خسـتە پشـتی جیپەکـەوەو هاتـم، هیـچ جێگایـەک نەبـوو بتبـەم، تەنیـا کەسـێک شـکم دەبـرد دالیـا سـیراجەدین بـوو، مـن و ئـەو لـە مێژبـوو یەکترمـان دەناسـی، ئـەوکات لـە پایتەخـت بـوو، هێشـتا کچێکـی تـازە پیاکەوتووبـوو کـە ناسـیم، سـەمەر سـاڵح پێیناسـاندم، تاکـە کوردێـک بـوو مـن لەسـەر ئـەم ئەسـتێرەیە دیبـووم و ئەزیەتـم نەدابـوو، لـەو بترازێـت هـەر کوردێکـم بینیبـوو ئازارمدابـوو، بـەڵام نەمدەتوانـی بەڕاسـتەجادەدا تـۆ بهێنـم. جیپەکـەم لـە قـەراغ شـەقامێک پەکخسـت و بەجێمهێشـت، تـۆم هەڵگـرت و بـە هەمـوو بیابانـدا هاتـم، دەمویسـت لـە جێگایـەک کۆمەڵێـک دەواری بەدەویـی بدۆزمـەوەو کەمێـک پشـوو بدەیـن

نەبوو، ڕۆژێکی ڕێک نەشارەزا بە سەحرادا هاتم، شەوەکەی گەردەلوولێکی لـم هەڵیکرد، دڵنیابووم تۆ مردویت، بەڵام نەمدەویست داتبنێم، بەردەوام لەسەرمدا ئەو ئاوازە دووبارەدەبووەوە، هەستمدەکرد یەکەمجارە لە ژیانمدا ئیشێک دەکەم بۆنی ئەوەی لێدێت کە منیش مرۆڤم، ئەوە یەکەمجارم بوو لە ژیانمدا یارمەتی مرۆڤێک بدەم، پێشتر لە هەموو تەمەنمدا تەنیا ژان و بەدبەختیم بڵاوکردبووەوە. تۆ مردبوویت، بەڵام دەمزانی دەشێت بژیت و زیندووبکرێیتەوە. بەڵام من دەرگاو دەروازە نهێنییەکانی ئەم شارەم بۆ نەدەدۆزرایەوە، ئەم شارە لە دوورەوە وەک سەراب وایە، دێیت و پێتوایە دەیبینیت، نزیکدەبیتەوە، وەختە دەستت بگاتە دیوارەکانی، واهەستدەکەیت، گەیشتویتە ناو کوچەکانی، بەڵام دەبینیت لە ناو کۆمەڵێک وەهم و خەیاڵ و نیگاری ئاویدا ونبوویت، بەناو ئەو لمە زەردەدا دەهاتم، لەم شاری سەرابەوە بەرەو ئەو شاری سەراب، لەم کوچەی ئاوێنەوە بەرەو ئەو کوچەی تر. تا ئەو ژنەم لە تەپوتۆزدا نەبینی نەمزانی کە زیندووم، ڕۆیشتنی زۆر بەسەحرادا، بە لاشەی یەکێکەوە کە قووڵ چنگی لە بنکی بێقەراری مەرگ گیرکردوە، ڕوخساری زەمین و ژیان لە بەرچاوت دەگۆڕێت، من بەر لەو ڕۆژە هەموو شتێکم کردبوو، لە چیاکان و زۆنگاوەکان و دەڤەرە گردین و پێدەشتە دڕکاوییەکانی سنووردا شەڕمکردبوو، چووبوومە شارو شارۆچکە جیاوازکان، بەڵام ئەو ڕۆژە هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی ئەم شارە لە تەپوتۆزی وەهمەکان بسرم. شاژنی تەپوتۆز، ئەو خانمەی کە ئیشی ئەوەبوو تۆزی سەر ڕوخساری زەمین بسرێت، ئەو منی دۆزییەوە، هێند ماندووبووم چیتر نەمدەتوانی تۆ هەڵگرم. بێئەوەی هیچ بڵێت، تۆی دا بە شانی خۆیدا و پێشمکەوت، ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە پرتەقاڵی سپی، تۆ هەر خوێنت لێدەڕۆیشت و ڕەشەبا خوێنەکەتی بە سەحرادا دەبرد، من هەندێجار ئاوڕمدەدایەوەو داوێک دەزووی باریک و درێژم لە هەوادا دەبینی کە با دەیبات، تا ئەوسەری جیهان، دەزوویەکی باریکی خوێن کە

وەک خەتێکی نهێنی و سەیر تۆی بە شتێکەوە دەبەستەوە دەکەوتە ئەودیو ئەم دونیایەوە... تۆی بە کەسانێکەوە دەبەستەوە لێرەنین، کەسانێک سەر بەم دونیایەی ئێمە نین. ئەو ئێوارەیە بێئەوەی ئێمە دالیا بانگبکەین تۆمان هێنایە ئەو ژێر زەمینە چۆڵ و فەرامۆشەوە، بێئەوەی دالیا بانگبکەین، خۆی و فریشتە چکۆلەکانی لە بەردەمماندا ئامادەبوون. من تۆم تەسلیمی ئەو کردو گووتم «بە دۆعا خانمی فریشتە بچوکەکان، دەبێت ئەم کوڕە نەمرێت، بە دۆعا، من دەبێت بڕۆم، من ئیشی ترسناکترم هەیە، بەلام بزانە ئەمە نهێنییەکی گەورەیە کە تەنیا خۆت و خودا دەبێت بیزانن».

* * *

بۆ بەیانی کە لە خەو هەستام سامیری بابلی نەمابوو. پارچە کاغەزێکی چکۆلانەو زۆر کورتی لەسەر سەرینی خەوەکەی جێهێشتبوو، تیانوسرابوو: ئەی منداڵی نەجیب، ئاگات لە خۆت بێت، من و تۆ یەکتری دەبینینەوە... بەلام کەی؟ نازانم، من دەبێت بڕۆم... بەرەو کوێ؟ نازانم، زۆر نهێنی گەورە هەیە دەبێت بیدەمە دەست تۆ... چۆن؟ نازانم.

من ئەو بەیانییە لە دەرگای ژوورەکەی دالیامدا، لەوەوبەر هەرگیز لە دەرگای ژوورەکەیم نەدابوو، بە جوتێک چاوی خەواڵو و جلێکی زۆر تەنکی خەوەوە دەرگای لێکردمەوە، لەدرزی دەرگاکەوە ئەو پیاوە باریکە درێژەم بینی بەڕووتی خەوتبوو. نامە چکۆلەکەی سامیری بابلیم دایەو پێمگووت: ها خانم، شەوێکی خۆش بوو؟ بۆ خۆت باش دەژیت، ئێمەش بە حیساب پێغەمبەرین هەموو دەردەکان بۆ ئێمە دەمێنێتەوە... ها خانم من تا بەیانی گریاوم، بەلام تۆ چیت کردوە، ها تۆ پێتوایە ئێمە داڵدەی یەکێکمان داوە، کە منی لە مردن ڕزگارکردوە؟ ئەوەی من و تۆ ڕزگارمانکردوە، هیچ نییە جگە لە جەلادێک کە تەقەی لە من کردوە، هاوڕێکانی کوشتووم، من

ئەمشەو ئەوەم زانی، من ئێستا چی بکەم... ئێستا من نازانم چی بکەم، بە تایبەت کە تۆ دەبینم بەم کراسە تەنکەوە و ئەو پیاوە دەبینم بە ڕووتی لەویا خەوتووە، هێندەی تر سەرم لێدەشێوێت، ها ئێستا تۆ پێمبڵێ من چی بکەم؟

من بەڕاستی دەستەپاچەو زەلیل بووم، بەڵام قسەکانم بە جۆرێک منداڵانە بوو، دالیا دەستیکردە پێکەنین، نامەکەی دڕاندو پارچەکانی خستە مستییەوە، چەناگەی گرتم و گووتی: چی دەکەیت بیکە، تۆ هەمیشە دڵی منیت، بۆ هەر کوێ بچیت هەر کوڵی خۆمیت. وایگووت و دەرگاکەی داخست.

من نەمدەزانی چیبکەم، ئەو شەوە لە قووڵایی یادەوەریمدا شتێکی سامناک زیندووبووەوە، شتێک کە دەبێت ئێوەش بیزانن، ئەو شەوە دوای ئەوەی سامیری بابلی پێیگووتم: جەلادەتی کۆتر بنوو، تۆزێکی دی کەڵەشێری بەیان دەخوێنێت، عەندەلیبە زامدارەکانی تاریکی دەچنەوە هێلانەکانیان، کوکوختی بێزار دێتە دەرێ و ئەستێرەی ماندوو دەڕوات بۆ خەو. من نەنوستم... ئەو نوست و من نەنوستم. هەموو شتێکم بیرکەوتەوە، هەموو شتێکم بیرکەوتەوە، هەموو شتێک، بەو شەوە خەریکبوو وەک شێت ڕاکەم بۆ ناو کوچەکان، وەختەبوو هاواربکەم، وەختەبوو پڕ بە هەموو پرتەقاڵی سپی بنەڕێنم، نەمدەزانی چی بکەم، نەمدەزانی بگریم یان پێبکەنم... من پێغەمبەر بووم، سووک و سادە لە قووڵایی یادەوەریی خۆمدا ئەو بەڵگە گەورەیەم دەدۆزییەوە کە من پێغەمبەرم.

ئەو یادگارییە ساڵەهای ساڵ بوو لە یادەوەریمدا خەوتبوو، یادگارێک بوو، قووڵ لە ڕۆحمدا خەوتبوو، بەڵام نەمردبوو، شتێک هەڵیگرتبوو بۆ ئەمشەو. چەند ساڵێک لە مەوبەر کە هێشتا منداڵ بووم، زۆر منداڵ بووم لەگەڵ تیپی مۆسیقای شارەکەماندا سەفەرمکرد بۆ شارێکی تر، شارێکی زۆر دوور لە شاری خۆمان، بۆ ڤیستڤاڵێکی مۆسیقی چکۆلە. لە ڕێگا، پێش

سەد کیلۆمەتر دوور لە شاری مەبەست، پاسەکەمان وەرگەڕا و هەموو سەرنشینەکانی مردن، هەموویان مردن من نەبێت، بیست و سێ مۆسیقار بووین، ئەوانی دی هەر هەموویان مردن، من دوای بێهۆشییەکی درێژ بەئاگا هاتمەوە، هەموو ئەو چیرۆکەش کە بۆتان دەگێڕمەوە لە ماوەی بێهۆشییەکەمدا ڕوویدا. من لە بیرمە دوای ڕوداوەکە من و مۆسیقارەکان لە پاسە وێرانەکەمان دابەزین و کەوتینە ڕێگا بەرەو شارێکی تر، هەموو کەمان و ئۆکۆردیۆن و عودو سەنتورەکانی خۆمان پێبوو، هەموویمان لە ناو ئاسنی تێکشکاوی پاسەکەدا دەرهێنا، تەپوتۆزو وردە شوشەی شکاومان لێتەکاند، خوێنی خۆمان لەسەر ئامێرەکان سڕی، وەتەرەکانیانمان تاقیکردەوە، لە جانتاکانمان جلە سپییەکانی خۆمان دەرهێناو لە قەراغ ئەو ڕێگایە خۆمان گۆڕی و کەوتینە ڕێگا بەرەو شارێکی دیکە. نازانم چەند ڕۆیشتین، گەلێک شارو خاک و زەریاچەمان بڕی، کە نزیک کەوتینەوە، لەسەر بورجێکی بەرزەوە، مۆسیقارێک کە بە گیتارێکەوە پاسەوانێتی ئەو دەڤەرانەی دەکرد، هاواریکرد، بەخێربێن بۆ شاری ئێمە، بەخێربێن بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان، دڵنیام لە بیرمە، دڵنیام ئەو وشانەم لەو کاتی بێهۆشییەدا گوێ لێبووە، ئێستا وشە بە وشە ئەو ناوەم لە یادە، وەک چۆن ئاوێکی ساف خوڕەی بێت، وەک کانییەکی ڕوون لێیبخۆیتەوە، ئەو ناوە ڕوون و ساف لە خەیاڵمدایە. دڵنیاشم ئەوە خەیاڵێک نەبوو دواتر لە ژێر کاریگەریی چیرۆکەکانی پرتەقاڵی بابلیدا لە مندا دروستبوبێت، بە پێچەوانەوە، ئەوە حەقیقەت بوو، یەکێک بە گیتارێکەوە لە بەرگێکی سپیدا، لەسەر قوولەیەکی بێئەندازە بەرزەوە، کە پێدەچوو بەسەر زەوییەکی زۆر بەریندا بڕوانێت هاواری لێکردین بەخێربێن بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان. بەخێربێن... بۆ... شاری... مۆسیقارە... سپییەکان. ئەو وایدەگووت و لەو دیو ئاسۆوە، شارێکی گەورە گەورەمان لێدەردەکەوت، شارێکی سپی سپی، پڕ لە منارەو بورج و قوولەی بڵندی سپی سپی. شارێکی گەورەبوو

لە ناو پێدەشتێکی سەوزدا، شتێکی زۆر عاجباتی تیانەبوو، گەر شەڕو وێرانکاری نەبووایە دەبوو هەموو شارەکانی دونیا ئاوەهابن، ئاسوودەو هێمن بە کۆمەڵێک باڵندەی سپییەوە کە بەسەر گومەزو قەڵا و منارە سپییەکانیدا دەفڕین. لە بەردەرکی ئەو شارەدا سێ پاسەوان وەستابوون کە سێ کەمانچەیان پێبوو، یەکە یەکە هەموو هاوڕێکانی منیان کردە ژووری، کە هاتە سەر سەرەی من گووتیان : نا جەلادەتی کۆتر بۆی نییە، جەلادەتی کۆتر بۆی نییە، کاتی نەهاتووە، ئەو دەبێت بگەڕێتەوە. من منداڵ بووم، بەڵام لە هەموو مۆسیقارەکانی تر منداڵتر نەبووم، لە من منداڵتر لە تیپەکەدا هەبوو کە بۆی هەبوو بچێتە شاری مۆسیقارە سپییەکان. دەستمکرد بە گریان، نەمدەویست لەوانە جیاببمەوە کە هەموو بە خۆشحاڵی بەرەو شاری مۆسیقارە سپییەکان بەڕێکاوەبوون.

مۆسیقارێک منی بردە ئەولاوە، مێزێکی سپی لە ناو چیمەنێکی سەوز سەوزدا دانرابوو، گووتی: جەلادەتی کۆتر فەرموو دانیشە. من بە گریانەوە پرسیم: من بۆ بۆم نییە لەگەڵ هاوڕێکانمدا بڕۆم، بۆ من جیادەکەنەوە؟. مۆسیقارەکە گووتی: لەبەرئەوەی هێشتا کاتی تۆ نەهاتووە، تۆ لەسەر زەوی ئیشی گرنگت هەیە ئەنجامیبدەیت، سەفەری درێژت لە بەردەمدایە، ڕێگای پێچاوپێچ کە تەنیا تۆ بە خۆت و ئامێرەکانتەوە دەتوانیت پیابڕۆیت، تۆ ناوت جەلادەتی کۆترە، دەبێت بگەڕێیتەوە باش شارەزای سەر زەمینی خۆت ببیت، مەشقێکی دووروودرێژ بکەیت، چونکە تۆ ئیشت زۆرە. منداڵێکی بێخەیاڵ مەبە، دڵنیاشبە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەگەڕێیتەوە بۆ ئەم شارە.

من هەموو قسەکانیم لە بیربوو، وشە بە وشە. دوای ئەوە نازانم چی ڕوویدا، هێند ئاگادارم لە بیمارستان چاومکردەوەو تەنیا منداڵی زیندووبووم کە لە کارەساتێکی سەیرو ئاڵۆزی ئۆتۆمۆبیل ڕزگارم بووبوو.

من هەر لەسەرەتاوە بە موعجیزە دەگەڕامەوە بۆسەر زەوی، ژیانم لە

جۆلانێیەکی بەردەوامدا بوو لە نێوان مردن و زیندوبوونەوەدا. جۆلانێیەک دواتر ئیقاعێکی خێراتر و سەیرتر وەردەگرێت، وەک ئەوەی یەکێک لە ناکاو گوژمێکی گەورەی پێوەنابێت و دیلانێکردنەکەی منی بە جۆرێک خێراکردبێت، بە کەس نەگیرسێتەوە.

* * *

ئەو بەیانییە چووم بۆ لای موسای بابەک، لە مێژبوو نەمبینی بوو، هەستمدەکرد ئەو تاکە کەسێکە دەتوانێت یارمەتیمبدات. دەستمکردە ملی و گووتم: سەیرکە، دکتۆری خۆشەویستم چییان لێکردوم، سەیرکە، منیان کوشت؟ سەیرکە مۆسیقارەکەی ناویان کوشتم، ئێستا هیچم بۆ لێ نادرێت، بووم بە کورێکی درۆزن، خۆم دۆڕاند... تەماشامکە چیم لێهاتووە.

موسای بابەک وەک باوکێکی بە ڕەحم دەستی بەسەرمدا هێناو گووتی: جەلادەت، من بڕوایەکی گەورەم بە تۆیە، من دەزانم تۆ سەردەمێکی ترسناک دەژیت، تۆ دەردی گەورەت تووشدێت، بەلام دواجار تۆ شتێک دەکەیت بە هیچ کەس ناکرێت.

من هەموو چیرۆکەکەم لە نوکەوە بۆ گێڕایەوە، باسی منداڵی خۆمم بۆ کرد، باسی ئەو سەفەرەم کرد بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان، باسی سامیری بابلی و چیرۆکەکانی، باسی سەربوردی مردن و ڕزگاربوونم و هاتنم بۆ ئەو شارە. دکتۆر موسای بابەک تۆزێک سەراسیمەو کەمێکیش ڕامانێنیگا سەیریدەکردم و بیریدەکردەوە. من لێم پرسی: دکتۆر چی بکەم، دەتوانم چی بکەم؟ دەبێت من لەو پیاوە ببوورم یان نا؟ ئەو هاوڕێکانی کوشتم، پیاوکوژێکی گەورەیە، بەلام ئەمڕۆ جوانتر لە هەر فریشتەیەک قسەدەکات، جوانتر لە هەر ڕەبەنێک کە خۆی بۆ پاکی تەرخانکردبێت لەگەڵ ڕۆحی خۆیدا هیلاکە، دوای ئەوە منیشی لە مردن ڕزگارکرد، پێمبڵێ

چیبکەم، لێی ببوورم یاخود نا؟

دکتۆر بابەک سەیریدەکردم و دەیگووت: گەورەترین ئازارێک مرۆڤ بیجێژێت پەشیمانی ڕاستەقینەیە، هیچ سزایەکی دەرەکی وەک پەشیمانی مرۆڤ لە ناوەوە پاکناکاتەوە، دوای ئەوە تۆ دەتەوێت بیر لە چی بکەیتەوە، لە تۆڵە... دەتەوێت تۆڵە بکەیتەو؟... ها، پێمبڵێ، دەتەوێت تۆڵە بکەیتەوە؟ تۆ دەبێت تێبگەیت کە سزای هیچ کەس لای تۆ نییە. ئینسان دەبێت هەوڵبدات مرۆڤەکان خۆیان سزا بدەن. جیاوازی نێوان جەلاد و فریشتە ئەوەیە جەلاد مافی کوشتنی نییە و خەڵک دەکوژێت، بەلام فریشتە مافی تۆڵەی هەیە و تۆڵەناکاتەوە، تۆ کامیانیت؟.. ها پێمبڵێ کامیانیت، دەتەوێت کامیان بیت؟ ها دەتەوێت کامیان بیت؟

من دەستمدەکرد بە گریان و بەدەم فرمێسکەوە دەمگووت: هیچیان، دکتۆر موسا، هیچیان، من دەمەوێت مرۆڤ بم و تەواو. نامەوێت هیچی تربم، نامەوێت فریشتەبم، نامەوێت جەلاد بم، نامەوێت پێغەمبەربم، نامەوێت شەیتان بم، دەمەوێت بژیم، ڕۆژێک لە ڕۆژان دالیا سیراجەدین شووم پێبکات و ببیەم بۆ شوێنێکی تر، دەزانم شتێک لە بیمێشکی لە مندایە، بەلام من دەمەوێت فێری مۆسیقا ببمەوە، دەزانم دالیا چەند شتی خراپی کردوە، دەزانم منی خۆشناوێت، دەزانم لە هەموو شتێکی من پەستدەبێت، بەلام من دەمەوێت لەسەر شاخێکی دوور لەگەڵ دالیادا بژیم، دەمەوێت لەسەر ئەو شاخە مۆسیقا فێرببمەوە، ئەگەر نەکرا، ئەگەر دالیاش لەگەڵمدا نەهات، دکتۆر گیان، من دەمەوێت ببم بە شوان، یان ببم بە جووتیارێک لەسەر تەپۆڵکەیەکی دوور، لەوێ هەمیشە فلووت بۆ هەورەکان لێدەم. یان گەر ئەوەش نەبوو، لە سەر مەرزێکی دوور، لەسەر ڕێگای کاروانەکان، لە ناو شاخە هەرە بەرزو ساردەکاندا، لەوێ خانێکی بچوک بکەمەوە، کاروانچییەکان لەوێ لابدەن، من لە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆمەوە تەماشای کاروانچی و ئەسپ و باڵندەکان بکەم و

فلووت لێبدەم، یان دەمەوێت بە هەمان ئەو ڕێگاو شارانەدا بە دەم فلووت لێدانەوە بڕۆم، چاو بنوقێنم و هەستبکەم هەمووو کۆترو پاسارى دونیا بەدوامەوە دەفڕن، دەمەوێت شتێک بکەم کە خۆم دەمەوێت... ئا، موسای بابەک، من حەزدەکەم تۆڵە بکەمەوە، یەکێک بکوژم و بەزەویدا ڕابکەم، یەکێک لەو پیاوکوژە گەورانە بکوژم و بە زەوییەکی بەرین و بێئەمسەرو ئەوسەردا ڕابکەم، چونکە ئەو ڕاکردنە، ئەو هەڵهاتنە دوورو درێژە لەوانەیە چاکمبکاتەوە... دکتۆر من دەبێت ماوەیەکی درێژ درێژ بە تەنها بەزەویدا سەفەربکەم... ئێوە هەموو ناڵێن تۆ پێغەمبەری، هەموو نیشانەو ئاماژەکان بۆ ئەوە نییە کە من پێغەمبەرم، پێغەمبەر دەبێت ماوەیەکی درێژ بچێتە خەڵوەتەوە، دەبێت بیربکاتەوە، ها، هەموو پێغەمبەرو شتەکان وابوون، بەڵام من دەمەوێت بە جۆرێکی تر بکەم، دەمەوێت وەک کوردێک ببم بە پێغەمبەر، وەک ئەوەی گۆچانێک هەڵگرم و فەرەنجییەک لەبەرکەم و جامانەیەک لە ملمەوە بئاڵێنم و ڕیشێکی درێژ درێژ بهێڵمەوەو بچم بۆ حەسارۆست، بۆ سەکری سەکران، نازانم لەوانەیە بۆ قولەی قافیش، بڕۆم لە نێوان کەندو کەندڕەکانی ئاسۆسدا ونببم، لە قەندیل کوختێک بکەم، لەوێ دانیشم و لەگەڵ بەفر بارینداا چاوەڕوانی هاتنە خوارەوەی فریشتە و ئەو شتانە بکەم. یەعنی من چۆن دەبم بە پێغەمبەر ئەگەر یەکێک نەیەت بۆلام، یەکێک دوو قسەم لەگەڵ نەکات، من کە سەیردەکەم دەبینم، پێغەمبەرەکان بلیمەت نەبوون، هەرچییەکیان گووتووە خودا فێریکردوون. من دەڵێم ئەگەر زەمانی ئەمڕۆ بووایە لەوانەیە خودا لە بری پێغەمبەرەکان ڕێگای ئاسانتری بگرتبایەتە بەر، وەکو ئەوەی جوبرائیل لە ناکاو لە کەناڵی دووی تەلەفزیۆنەوە دەردەکەوت و خۆی ڕاستەوخۆ سورەتەکانی بەدەنگ و بە نوسین بۆ دادەگرتین، من دەڵێم، من دەزانم پێغەمبەرەکان بەبێ قودرەتی ئیلاهی کەسانی ئاسایی بوون، یەعنی ئەوەی من زۆر بلیمەت نیم، مەرج نییە شانسێکی باش نەهێنم...

مـن زۆر بەڕاسـت قسـەمدەکرد، کـە زۆر لـە دڵـەوە قسـەمدەکرد هەمـوو پێـم پێدەکەنین، تـا مـن زیاتـر قسـەمبکردایە دکتـۆر موسـا پتـر پێدەکەنـی. دواتـر کـە هەسـتیکرد بـە پێکەنینەکانـی مـن ئـازاردەدات، چاوەکانـی کزکـردو کەمێک بـەرەو ڕووم چەمییـەوەو دەسـتێکی بەسـەرە ڕووتاوەکەیدا هێناو بـە هێمنـی گووتـی: گوێبگـرە جـەلادەت، بـاواز لـە نهێنـی پێغەمبەرایەتـی بهێنین، مـن زۆر سـەر لەوەیـان دەرناکـەم، مـن هێندەی لـە مانـای جوانـی ڕامـاوم لـە ئیلاهیاتـدا قووڵ نەبوومەتـەوە، نـا ڕاسـتت دەوێت زۆر لـە ئیلاهیاتدا تێفکرینـم نەبووە، بـەلام شـتێکی گرنـگ هەیـە دەمەوێت پێتبڵێـم مـن هەرگیـز بـاوەڕم بـە عەدالـەت نەبـووە، هیـچ عەدالەتێـک، هیـچ تۆڵەیـەک ئـەو ئازارانـە ناسـڕێتەوە کـە قوربانییەکـی بێگونـاە دەیچێژێـت. مـن بـاوەڕم بـە شـتێکی تـر هەیـە، بـاوەڕم بـە جوانـی هەیـە. مـرۆڤ ناتوانێـت دادپـەروەر بێـت، بـەلام دەتوانێـت لـە بـری ئـازار جوانـی دروسـتبکات... گەورەتریـن تۆڵـە لـە ناهەقییەکانـی دونیـا ئەوەیـە مـرۆڤ شـاعیر بێـت، مۆسـیقای جـوان لێبـدات، تابلـۆ دروسـتبکات لـە پێشـدەمیدا سەرسـام بوەسـتین، لـەوە بترازێـت هیـچ عەدالەتێـک نییـە. پێتدەڵێـم، گەمـژە ئـەو کەسـانەن کـە چاوەڕوانـن سیاسـییەکان عەدالەتیـان بـۆ بێنـن، ئـەو گەمژانـەن دونیایـان وێرانکـرد، پـەح، دەبێـت چەنـد بێمێشـک بن ئەو بەشـەرانەی چاوەڕوانـن سـەرۆکە گەمژەکانیـان عەدالەتیـان بـۆ بهێنـن، ئەوانـەن دونیایـان بـە ڕشـانەوە بۆگەنەکانـی خۆیـان پیسـکرد، ئـەو گەمژانـەی چاوەڕوانـن دیـن دونیایـان لـە شـەیتان بـۆ پاکبکاتـەوە، تێناگـەن کـە شـەیتان دەتوانێت ملیونێک جـار لـە ڕوخسـاری خـودادا بەرجەسـتەبێت، ملیۆنێـک جـار و پێشـی نەزانین، هەمـوو مێـژووی مرۆڤایەتـی حیکایەتـی ئـەو پێڕابواردنـە گەورانەیـە کـە شـەیتان لەگـەڵ مرۆڤـدا دەیـکات، هەمیشـە مـرۆڤ بـە نـاوی خـوداوە دەیکاتـە شـەڕ، دەیکاتـە خوێنڕشـتن، دواتـر کـە هەمـوو شـتێک تەواودەبێـت، کـە خوێـن تـا بینەقاقامـان دەگات، لەوسـەر شـەیتان دەمامکەکـەی لادەبـات و دەڵێـت: هـەلاو کوڕگـەل، یوهـو مـن شـەیتان بـووم و خـودا نەبـووم. نـا جـەلادەت... نـە

قانون، نه دین، نه سیاسەت پەیوەندییان بە دادپەروەرییەوە نییە، جوانی تاکە شتێکە دەتوانێت هاوسەنگی بۆ دونیا بگێڕێتەوە، مرۆڤ دەکرێت لەسەر هاوسەنگی قسەبکات، بەلام لەسەر دادپەروەری نا، دادپەروەریی نامومکینە. ئەگەر شتێکیش هەبێت ناوی عەدالەت بێت، ئەوا لەو مۆسیقایەدا بوو کە من گوێم لێبوو، ئەو مۆسیقایەی یەکەمین ڕۆژ لە پرتەقاڵی سپی تۆ پێشکەشی ئێمەت کرد. ئەوەیە عەدالەت، ئەو مۆسیقا سیحراویە بوو عەدالەت، کوڕی من، عەدالەت شتێکە لە ئاستی ژیانی تایبەتی مرۆڤدا ناتوانین سەیریبکەین، بەڵکو لەسەر ئاستی هاوسەنگییەکی گەردونی لە نێوان جوانی و خراپەدا دەبێت تەماشایبکەین. تۆڵە پەیوەندییەکی بە جوانییەوە نییە، حەقیقەت پەیوەندی بە جوانییەوە هەیە، بەلام تۆڵە نا.

بە ژوورەکەدا دەهات و زوو زوو دەستی بەسەریدا دەهێنا، پشتە پیرو کۆمەکەی دادەنەواند و سەیری شتی دەکرد کە من نایانبینم، بەدەم قسەوە پەنجەی لە تووکە سپییەکانی لاجانی دەدا دەستی دەخستە سەر دڵی و وەک لە عەشقی شتێکدا بفڕێت، دەیگووت: جوانی، مۆسیقا، تابلۆ دەتوانن ئەو هاوسەنگییە دروستبکەن، ئەو هاوسەنگییەی بە هیچ شتێک ناگەڕێتەوە. زوڵم لەسەر ئەوە دروستبووە بەردەوام بیری ئادەمیزاد دەهێنێتەوە کە تێپەڕو بچوک و لەناوچووە، زوڵم لەسەر ترساندنی مرۆڤ لە مەرگ کاردەکات، بەلام جوانی بە پێچەوانەوە لەسەر ئەوە کاردەکات بە مرۆڤ بڵێت، تۆ نامریت، ڕاگوزەر نیت، لە ناو ناچیت. بەلام جەلادەت ئەوەی تۆ ئەمڕۆ باسیدەکەیت، ئەوەی خەونی تۆیە دوورە لە مانای بوونی تۆوە، من نازانم مانای بوون یانی چی، نازانم، چونکە هەر یەکەمان بۆ شتێک دەژین، بەلام تۆ لە چیایەکی دووردا دەتوانیت چی بکەیت؟ وا دانێ تا دەمریت فلووت بۆ هەورەکان لێدەدەیت، وا دانێ، دەزانم ئەمە جوانە... بێگومان دەزانم، دەزانم مرۆڤ نابێت داوای هیچ لە هونەر بکات، بەلام تەماشاکە ساتێک هەیە هونەر پێشکەشماندەکات، ساتێکە تیا هەستدەکەیت دەفڕیت،

هەستدەکەیت تۆ زەمان و شوێنەکان هەمووی دەشکێنیت، هەستدەکەیت لە قەفەزی خۆت دەرچوویت و بەسەر هەموو وجودا کراویتەوە، بەسەر ئەو دیوارەدا کە تۆ لە من جیادەکاتەوە، تۆ لە باڵندەکان جیادەکاتەوە، تۆ لە سەردەمەکانی تر جیادەکاتەوە. دادپەروەری ئەوە نییە دوژمنەکەت بکوژیت، دادپەروەری ئەوەیە دوژمنەکەت مۆسیقاکەی تۆ ببیستێت و بگری، مۆسیقاکەی تۆی گوێ لێبێت و ئەو ئادەمیزادە خەوتووەی ناو رۆحی خەبەرببێتەوە. دادپەروەری ئەوەیە بەر لە دوژمنەکەت تۆ دەستت بگاتە زەوییەکانی ترو سەردەمەکانی تر، دادپەروەری ئەوەیە کە تۆ رۆحی قوربانییەک هەڵگریت و بیهێنیتەوە قسەی خۆی بکات، قسەی خۆی بەتەنیا... قسەی ناو خەیاڵی خۆی، قوربانییەک هەڵگریت و مۆسیقاکەی ناو دڵی لێبدەیت، شیعرە کوژراوەکەی دڵی بدۆزیتەوە، جەلادەت ئەگەر عەدالەتێک هەبێت، ئەوەیە کە مرۆڤ تێبگات چی دەنێرێت بۆ ئەبەدییەت و لەوێوە چی دەهێنێتەوە. مرۆڤی دادپەروەر، بەتایبەتە دادپەروەرە گەورەکان موسافیرێکن لەسەر ئەو رێگایە.

من دەمگووت: جەنابی دکتۆر ئەی زوڵم، ئەی ئەوانەی بە زیندوویی مرۆڤ زیندە بەچاڵدەکەن، ئەی ئەوانەی مرۆڤ دەرخواردی سەگ دەدەن. ناتەوێت جارێک یەکێکیان بکوژیت؟ من پڕ بەدڵ حەزدەکەم یەکێکیان بکوژم.

بە غەمگینی و تورەییەوە سەری بادەداو دەیگووت: عەدالەت ئەوە نییە زاڵمەکان بکوژیت، ئەوەیە شتێکی جیاواز بخەیتە جێگای زوڵم. دادپەروریی ئەو مۆسیقایەیە کە شوێنی مردن دەگرێتەوە، ئەو ئاوازەیە کە جێگای ترس دەگرێتەوە، ئەو نیگارەیە کە جێگای ئازار دەگرێتەوە... ئەوەی تۆ باسیدەکەیت دادپەروەری حاکم و دادگاو یاساکانە، من باسی عەدالەتی خۆمت بۆدەکەم، گوێبگرە، عەدالەت هەرگیز ئەوە نییە کە حاکمێکی پیر لەسەر کورسییەکەی خۆیەوە دەریدەکات، بەڵکو ئەو بڕیارەیە کە

پارچەیەک مۆسیقا دەریدەکات، شیعرێکی مەزن دەریدەکات، تابلۆیەک بە نهێنی لە ڕەنگەکانیدا دەینوسیتەوە... ئەوە تەنیا عەدالەت و دوا عەدالەتە لەسەر ئەم ئەستێرەیە.

دەمپرسی: دکتۆر مرۆڤ لە هەقی خوێندا دەیەوێت خوێن ببینێت، ئێمە وا دروستبووین. مرۆڤ وا دروستبووە. من دەمەوێت لە هەقی خوێنی هاوڕێکانمدا، خوێنی یەکێک بڕێژم، یەکێک لەم عەرەبە خوێنمژانە کە ملیونێک ساڵە لێمان دەکوژن. ڕاستت دەوێت من دەمەوێت یەکێک بکوژم.

دکتۆر پەنجەی بۆ درێژدەکردم و بە نیگەرانییەوە دەیگووت: نا، مرۆڤ وادروست نەبووە، تۆ تەماشای جەوهەری هاوکێشەکە بکە، تەماشای مانا قووڵەکەی بکە، مرۆڤ ئازار دەچێژێت، بەڵام تەماشاکە بە درێژایی مێژوو، چ وەڵامێکی مرۆڤ بۆ ئازار نەمرو ئەبەدییە، چ وەڵامێک... تەنیا ئەو وەڵامە ئەبەدییە کە جوانی دەیداتەوە، کە مۆسیقاو تابلۆو شیعر دەیدەنەوە. وەڵامی مرۆڤ بۆ ئازار ئەوە نییە ئازاری تر دروستبکات، ژان لەسەر ژان کەڵەکەبکات، برین لەسەر برین سەفتە بکات، ئەوە وەڵامە ئاسان و سادەو بێماناکەیە، مرۆڤ وا وەڵامناداتەوە، هەرگیز وا وەڵامناداتەوە، مرۆڤ بە هاوارێک وەڵامدەداتەوە کە دەگاتە ئەبەدییەت و دەگەڕێتەوە. ئەو هاوارە وەڵامی مرۆڤە.

دەوەستاو دەستی دەخستەوە سەر دڵی و مەستانە دەیگووت: من چەندین ساڵە دەمتوانی بڕۆمە دەرێ، ببمە چەکدار، زیانی گەورە لە دوژمن بدەم، بکوژم، سەیری ناو چاوی جەلادە خوێناوییەکەم بکەم و بڵێم: تەماشاکە مەلعون، من ئاوەها تۆڵەت لێدەکەمەوە. ئاوەها لە هەقی ئازاردا ئازارت دەدەمەوە، نا... جەلادەت، بەڵام ڕۆژێک بیرمکردەوەو گووتم: ئەمە دڕندەکەی ناومانە کە وابیردەکاتەوە. جەلادەت من هونەرمەندم، ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان یەکێک بیری لە من کردەوە، ئومێدم ئەوەیە ئەو شەرەفەم بداتێ و بڵێ تۆ هونەرمەندی، من شاعیرێکم کە ناتوانم

شیعر بنوسم، نیگارکێشێکم کە دەست و پەنجەی ڕەسمم نییە، مۆسیقارێکم بە کەمانەکەم هەندێک ئاوازی کەم دەردەکەم، توانای سازکردنی ئاوازی نەمرم نییە، بەلام من گوێدەگرم... من لەم وڵاتەدا مامەوە بۆئەوەی گوێ لەو هاوارە بگرم، ڕەنگی ئەو قریشکەیە ببینم کە لە دەست و پەنجەی مرۆڤەوە بەرەو ئەبەدییەت دەڕوات. کارەسات ئەوەیە کە مرۆڤ نەتوانێت بە تابلۆ، بە مۆسیقا وەلامی کارەسات بداتەوە. من لێرە مامەوەو گوێم هەڵخست، چاوانی خۆم تیژکردەوە، ورد بە زەویدا ڕوانیم و بۆ ئەو هاوارە دەگەڕام. ئەو تابلۆیانەی لەو گەلەرییە نهێنییەدا خەوتوون، ئەوانەن تۆڵەی ڕاستەقینەی ئینسان، ئەوانەن کە دەبێت هەڵبگیرێن، ئەوان کە بۆئەوەی ببن بە بەشێک لە ئێمە دەبێت ببن بە بەشێک لە ئەبەدییەت، بۆئەوەی بشبن بە ئەبەدییەت دەبێت ببن بە بەشێک لە ئێمە، ئا جەلادەت لە ناو ڕستەکانمدا سەرت لێ نەشێوێت، من قسەکەرێکی کارامە نیم... عەفوومکە، قەت ڕۆژێک لە ڕۆژان قسەکەرێکی کارامە نەبووم، بەلام ئەو ئەبەدییەتەی من باسیدەکەم پەیوەندی بە خوداو بەهەشت و دۆزەخەوە نییە، پەیوەندی بەو هاوارەوە هەیە کە من بۆ تۆی دەپارێزم و تۆ بۆ منی دەپارێزیت، ئەبەدییەت ئەوەیە ڕۆحی من ببێت بە شوێنێک سەدای هاوارەکانی تۆ تیا دەنگبداتەوە، ڕۆحی من ببێت بەو مۆزەخانە نهێنییەی هەموو هاوارەکان لە ناویدا جێگایان دەبێتەوە، هەروەها ڕۆحی تۆ، هەروەها ڕۆحی هەموو ئەوانەی کە تەنیا ڕێگە بە مرۆڤەکەی ناویان دەدەن هاواربکات، هاواربکات، هاواربکات... تا دواجار تۆڕێکی گەورە لە هاوار دروستدەبێت.

من قوول گوێم لە قسەکانی موسای بابەک دەگرت، هەستمدەکرد دەزوویەکی سەیرو نهێنی ئەم پیاوە بە ئیسحاقەوە گرێدەدات، بەلام لە موسای بابەکدا شتێکی سەیرترو قووڵتر هەبوو، خۆی هونەرمەند نەبوو، بەلام شتێک بوو گەورەترو زیاتر لە هونەرمەند. لەساتێکدا وەک

پێغەمبەرێک هاتە بەرچاوم کە نەوەک لە ئاسمانەوە هاتووە، بەڵکو زەوی خۆی دروستیکردوە، پەیامهێنێک کە لەم تەپوتۆزە زەردە خولقاوە. من بە فزولی یەکێکەوە لە پێشدەم غەیبدۆزێکی مەستدا وەستابێت، دەمگووت: ئەی دکتۆر، شاری مۆسیقارە سپییەکان چییە، تەفسیری تۆ چییە، ئەمە چ نهێنییەکە کە بە هیچمان ناکرێتەوە؟

سەردەستە سپییەکانی هەڵدەکرد، قۆپچەیەکی هێلەکە کۆنەکەی دادەخست و دەیگووت: نازانم، من ناتوانم شتێکی ئەوتۆی لەسەر بڵێم، زانیارییەکم نییە، چیرۆکەکە کەمێک سەیرو عەجیب دێتە بەر گوێم، بەڵام دواجار دەشێت تۆرێک بێت، تۆرێکی لە من و تۆ گەورەتر، کە هاواری هەموو مرۆڤەکان پێکەوە دروستیانکردوە، شارێکە ئەو ڕۆحانە دروستیانکردوە کە هێشتا دەنگیان لە سەر زەوی سەدای خۆی وەرنەگرتووە، تۆرێکە ئێمەی زیندوو و داهێنەرو مۆسیقی و نیگارکێشە نائومێدەکان پێکەوە گرێدەداتەوە، لەوانەیە ئەو شوێنە بێت کە ئینسان لە ئاوازی خۆی بینایناوە... ئەو شارە بێت کە دەکەوێتە سەر سنووری تەمەنی کورتی ئێمەو ئەبەدییەتەوە، ڕەنگە لەوێ مایستڕۆیەکی نهێنی هەبێت کە جوڵەی هاوارەکانمان ڕێکدەخات، لەوانەیە ئێمە هەمیشە لەو تۆڕەدا بووبین، هەمیشە یەکێک بووبین لە هاوڵاتییانی شارێک کە هەموو جوانپەرستە ناکامەکانی دونیا تیادەژین. شارێک وەک ئەم گەلەرییە نهێنییەی من، بەڵام لە بری ئەوەی تابلۆو ئاوازەکان کۆبکاتەوە، ڕۆحی مۆسیقارو شاعیرو نیگارکێشەکان کۆدەکاتەوە.

من بەسەرسامی سەیرمدەکردو دەمگووت: قورسە تێیبگەم، ماوەیەکی درێژی دەوێت.

هەمان ئەو جۆرە وەڵامە سەیرانەم لێدەبیستەوە کە ئیسحاقیش دەشێت بیدایەتەوە، ئەو دەیگووت: لە بەر ئەوەی مرۆڤ خۆی بوونەوەرێکی ئاڵۆزو سەختە. هیچ شتێکی ئاسان لەسەر ئەم ئەستێرەیە نییە، تەنیا گەمژەیی ئاسانە، تەنیا خوێنڕشتن و دڵڕەقی ئاسانە، ئیدی هەموو شتێکی تر سەختە.

سەیریدەکردم و دەیگووت: جەلادەت ئەگەر شارێکی وەها هەبێت، ئەوە شاری هەموو جوانییە کوژراوەکان دەبێت، هەرچییەک دیکتاتۆرەکان لەم وڵاتەدا کوشتوویانە دەبێت لەوێ بن، دەبێت هەموو ئەوانەشی لێبێت کە دەشێت ببوونایە بە مۆسیقار و نەبوون، ئەوانەش کە دەشێت ببوونایە بە نەقاش و نەبوون، ئەوانەی بە دڵێکی مەستەوە قەڵەمیان هەڵگرتووە بنوسن و نەبوون بە نوسەر. ئەگەر مردم ئومێدم ئەوەیە کە لە بری بەهەشت یان دۆزەخ بەرەو شارێکی وەها بڕۆم.

من دەمگووت: دکتۆر ئەوەی من بە منداڵی بینیم شارێکی گەورە بوو، زۆر زۆر گەورە، پڕبوو لە قەڵای سپی و بورجی سپی، باڵندەی سپی بە ئاسمانیدا دەڕۆیشتن، مۆسیقارم دەبینی لەسەر پاسکیلی سپی دەڕۆیشتن و کەمانیان لێدەدا، ئەسپی سپیم بینی لە مێرگەکانی دەوروبەردا دەلەوەڕان، شاربوو وەک هەر شارێک، بەڵام ئاسوودەو بێخەم لە ناو دەشتێکی بێکۆتایی سەوزە گیادا خەوتبوو، سەوزە گیایەکی ئەبەدی... ئەبەدی.

لەو ساتەدا دەکەوتمەوە درۆکردن، بە هەمان دەستوورو عادەتی خۆم لە ناو کیژانی پرتەقاڵی سپیداو دەمگووت: ئەو کاتەی کە من بینیم فوارەکانی سپی سپی بوون، وەک ئەوەی شیری لێبێتەدەر، هەندێک درەختی سپیم بینی کە میوەیەکی سپیان گرتبوو، کە مرۆڤ دەستی لێدەدا، دەنگی مۆسیقایەکی شیرین بەرزدەبووەوە، هەموو شتێک سپی بوو، چۆلەکەو کەروێشکەکان، دکتۆر هەتا من کۆمەڵێک تاوسم بینی کە پەڕەکانیان هەموو سپی بوو، بەڵام لە جوانیدا لە تاوسی ڕەنگاوڕەنگ کەمتر نەبوون. خەڵکم دەبینی گۆرانییەکیان دەگووت حەرفەکانی بە سپێتی لە گەرویان دەهاتە دەرێ، بە جۆرێک تا دەنگی گۆرانییەکە زۆر بەرز نەبووایەتەوە بۆ ئاسمان حەرفەکان نەدەخوێنرانەوە. هێلکەی سپی سیمرغم بینی کە بە مۆسیقا دەتروکا، کچم بینی بە کەمانچەوە لە هەوادا دەفڕین...

وەخت بوو زۆر درێژە بەدرۆکانم بدەم، کە دکتۆر بابەک تێگەیشت و بە

ئاماژەیەک لە دەستییەوە پێببڕیم، دڵنیابووم یەکێک چیرۆکی درۆکردنەکانی منی لە پرتەقاڵی سپی بۆ گێڕاوەتەوە، بەڵام گێڕانەوەیەکی ئاسایی نا، بەڵکو زۆر بەدرێژیی، چونکە هەر دەستمکرد بە درۆکردن ئەو لە هەمان جێگاوە، نە ڕستەیەک پێشترو نە ڕستەیەک دواتر دەیزانی درۆدەکەم.

* * *

ئێوارە کە گەڕامەوە، بیری سامیری بابلیم دەکرد، هێندەم بیردەکرد نەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ ژوورەکەم، لە ساڵۆنەکەدا بە تەنیا بەرابەر تەلەفزیۆنەکە دانیشتنم و سەیری لاشەی سووتاوی ئەو ئێرانیانەم دەکرد کە لەگەڵ دەنگوباسدا نیشاندەدران. کچەکان هەموو دەیانزانی من دڵتەنگم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قاچم خستبووە سەر قاچم و گوڵەبەڕۆژەم دەخواردو بە فیکە ئاوازێکی فارسیم لێدەدا، بەوەدا لەو سەردەمەدا قەدەغەبوو مرۆڤ گۆرانی فارسیش بە فیکە لێبدات، هەمیشە دەمگووت: فیکەی گۆرانییەکانم، ئاوازی هەندێک مەقاماتی کوردییە کە دایکم لەسەر بێشکە بۆی گووتووم. ئەو شەوە لە کاتی بەرنامەکانیشدا غەمباربووم، مۆسیقای سەمام لێدەدا و خۆم تا بڵێی غەمگین بووم. شەوانی دی وانەبووم، زۆر شەو بە جۆرێک تێکەڵی ئاهەنگەکە دەبووم وەک ئەوەی لە منداڵییەوە لەسەر سەحنەی تیاترۆخانە ئیشمکردبێت، شەوانی تر هەڵدەستام لەگەڵ کچەکاندا سەمامدەکرد، بەدەوری مۆسیقارەکانی تردا دەسوڕامەوە، کە عود ژەنە خراپەکەمان هەموومانی بێدەنگدەکرد بۆئەوەی بە تەنیا سۆلۆیەک عەزفبکات، من خۆم وا نیشاندەدا کە لە سەرسامیمدا بەبەهرەی ئەو خەریکە دەبووریمەوە. کە کچەکانمان گۆرانیان دەگووت، من دەمم لە فلووتەکەم بەردەدا و لەگەڵ کۆرسەکەدا دەمگووتەوە، لە هەموو وچانێکی بێدەنگیدا من بە دەنگی بەرز دەمگووت: یا عین یا لیل... فدوه یا بدرالبدور،

یا ام الشمس، یا اخت الهلالین. هەندێجار بە حەماسەتەوە، وەک یەکێک لە خۆپیشاندانێکدا هوتاف بکێشێت، هاوارمدەکرد: یا حلوە، واللە العظیم، واللە العظیم الهوا غلاب. قسەو جولەو کۆمێنتارەکانی من بووبوون بە بەشێک لەو دیمەنانەی بینەران حەزیان لێبوو. بەتایبەت کە هەندێکیانم بە شێوەزمانی میسری و لوبنانی و سووری دەگووت، هاوارمدەکرد: لکان، مابقی لی صبر، یا قمر. شوو یا حبیبتی، یالی تقبرنی و تحیینی. دخیلک شوو جبار و شوو دمار الحب.

کە کچێک باش بایبدایە، دەچوومە سەر چۆک و فلووتەکەم لەسەر ئاستی کەمەریدا دەگرت و لە نێوان عەزفەکەمدا سەرم بادەداو دەمگووت: یاویلی من رقتک یا سمره. غدار الزمن و غدار عیونک یا ملک.

ئەو شەوە بە جۆرێک غەمگین بووم هەموو دەیانزانی من مەراقێک لێیداوم، ئەو ڕۆژە هیچ جۆرە تێکەلاوییەکم لەگەڵ مۆسیقاو بەزمی سەر سەحنەکەدا نەبوو. شەو کە هەموویان خەوتن، کاتێک چی دی دەنگ نەماو پرتەقاڵی سپی بوو بە ئاشی ئاوکەوتوو، من بە ئەسپایی گەڕامەوە بۆ ساڵۆنەکەو لە تاریکییەکەدا دانیشتم، هێشتا دالیا سیراجەدین نەهاتبووە خوارێ. من بەردەوام سەیری تاریکییم دەکرد، سەیری ناو جەرگەی تاریکیم دەکرد، ناو دەرگا نهێنی و دابەشبوونە سەیرەکانی، گەر مرۆڤ لەسەیرکردنی تاریکیدا قووڵ ببێتەوە، دەبینێت کە تاریکی پڕە لە دابەشبوونی سەیر سەیر، لە ئاستی پڕ نهێنی، لە ئاستی دیکەی تێکەلاوبوونی سێبەرو تیشک. مرۆڤ تاوای لێ نەیەت بە تەواوی لە تاریکیدا ببینێت ناتوانێت لە ڕوناکیدا ببینێت، پێموایە کۆمەڵێک باڵندە و مرۆڤ و مەخلوقات هەن تەنیا ڕۆحلەبەری تاریکین، لە ئاستێکی سادەی بینیندا نابینرێن. من تا زیاتر لە تاریکیدا بمایەتەوە تا پتر تەماشای ناو جەرگەی زوڵمەتم بکردایە، بوونەوەری سەیرتر و شتی نەبینراوترم دەبینی. ناو تاریکی پڕێتی لە

درەخت و گیای تایبەتی کە تەنیا ڕێبوارانی ناو جەنگەڵەکانی شەو دەیبینن، پڕێتی لە فەزای تایبەتی کە دەرگای دونیای نەبینراوترو نهێنیترن. ئەو شەوە دالیا سیراجەدین هاتەخوارێ، من لە هەر شەو باشتر و ڕوونتر فریشتە چکۆلەکانیم دەبینی. فریشتەکان پەشۆکان و نائارامییەکی سەیریان پێوەدیار بوو. سەمایەکی تایبەتییان دەکرد، سەمایەک لە سەمای شیوەن و سەرسامی دەچوو، دالیا لەسەر هەمان کورسی شەوانەی خۆی دانیشت، ئەو شەوە بۆ یەکەمجار لە تاریکیدا توانیم باسمی جەزائیری ببینم، ئەو شەوە منیش خەیاڵی ئەو کوڕەم بینی کە لەوەوبەر تەنیا دالیا دەیبینی، من دەمزانی تەنیا کەسێک دەتوانێت ئەو جۆرە تارماییانە ببینێت کە ڕۆحێکی وێڵگەردو تاریکیدۆز بێت. ڕۆحێک بێت، بتوانێت لە تاریکیشدا ببینێت. سەرسامی من لەوەدا نەبوو کە دەبینم، بەڵکو لەوەدا بوو کە دەمزانی دالیا شەوان بە خۆڕا دانابەزێتە خوارێ، دالیا لەگەڵ وەهمێکدا کۆنابێتەوە، بەڵکو لەگەڵ تارماییەکی ڕاستەقینەدا، لەگەڵ ڕوخسارێکدا کە بە جۆرێک لە جۆرەکان تارمایی جەستەیەکی هەیە، پەیامهێنی نامەیەکە کە مرۆڤێک لە جێگایەکی ئەم جیهانەوە بە سێبەرێک لە سێبەرەکانی خۆیدا دەینێرێت. من تا ئەو کات بە تەواوی دەنگی تارماییەکەم نەدەبیست، وەک ئەوە بوو لە دالیا بپاڕێتەوە، وەک ئەوەبوو چیرۆکی ئازارێکی بۆ بگێڕێتەوە کە لە توانای مرۆڤدا نییە تەحەمولیبکات. وەک ئەوەی کڕنوشی بۆ بەرێت تا لە دەردێک ئازادیبکات کە چیتر لە تواناو تاقەتیدا نییە بەرگەی بگرێت. دالیا تەماشای پاڕانەوەی تارماییەکەی دەکردو دەگریا، دەستی دەخستە سەر دەمی خۆی و بەدەم فرمێسکەوە دەیگووت: نامەوێت هێندە لاواز بتبینم، نامەوێت، گەر هێندە لاواز دەبیت، گەر ئاوا چۆک دادەدەیت مەیە بۆ لام. کە بەو جۆرە دەتبینم دەمرم.

پێدەچوو تارماییەکە چیرۆکی ژانەکانی خۆی بگێڕێتەوە، چیرۆکی دیلی و تەنیایی خۆی، باسی ئەوە بکات کە تەنیا مەودایەکی بچوک لە مەرگەوە

دووره، لە جێگایەکی دوورەوە دەست درێژبکات و هەر لەوێوە ئومێدی بەیەکێک بێت لە بنی ناکۆتای ترسەوە دەریبهێنێتەوە. دالیا وەک ئەوەی خوێن لە چاوی بێتەخواری دەگریاو دەیگووت: هەموو شتێکم کرد، هەموو شتێک... هەموو شتێک بەڵام ناتدۆزمەوە، نازانم لە کوێیت، کەس نازانێت تۆ لە کوێیت، تۆ شێتمدەکەیت، وەک دێوانە هەموو شارەکان گەڕاوم، وەک دێوانە هانام بۆ هەموو جەلادەکان بردووە، بەڵام هیچ کەس نازانێت تۆ لە کوێیت. بەڵام دەزانم تۆ زیندوویت، دەبێت خۆتبگریت، دەبێت بەرگەی ئەشکەنجەکان و دەردەکان و تەنیاییەکانت بگریت. من ماندوونابم. هەمیشە لەدووتم تا کۆتایی.

لە شوێنێکی دیاریکراوی قسەکانیانەوە، پێدەچوو ئەو ڕۆحە عاشق و ماندووانە لەیەکدی تێنەگەن، دەنگیان نەگاتە یەک، وەک ئەوەی باو گەردەلوول و گێژەنی نهێنی لە نێوانیاندا بێت، وەک ئەوەی هێزێکی گەورەو تاریک ئەو تارماییە بەرەو ناو خۆی ڕاکێشێت، ڕەشەبایەکی شێت پەلیگرتبێت و نەهێڵێت بەوجۆرە جوگرافیای شوێنەکان بشکێنێت. دەمبینی وەک ئەوەی شەڕ لەگەڵ هێزێکی ترسناکدا بکات، وەک خۆی لە هەوایەکی ڕەش بپارێزێت کە قووڵ بەرەو ناو تاریکی دەیباتەوە، دەستی بۆ ڕزگارکەرێک درێژدەکرد کە هەرگیز پەنچەکانی نەیدەگرت و نەیدەگەیشتێ، دوو دەست کە نەدەگەیشتن بەیەک، دالیا بە هەموو تینی خۆی دەیگرت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جگە لە هەوایەکی سپی چنگی لە هیچی دیکە گیرنەکردبوو، دالیام دەبینی هاواری لێدەکات مەڕۆ، بەڵام وەک ئەوەی زوڵمەت بیتوێنێتەوە، تاریکی بیخاتەوە ژێر باڵی خۆی، لە هەوادا نەدەما، هێزێکی لە عەشق گەورەتر دەیڕفاندو دەیبرد. دالیا وەک بیەوێت بەدوایدا لە تاریکیدا بتوێتەوە، دەرگای دەرەوەی سالۆنەکەی دەکردەوە و بەرەو ناو زوڵمەتی بێقەراری شەو ڕایدەکرد. ئەوە یەکەمجاربوو شەو دەرگاکە بکاتەوە و بەرەو ناو کوچەکانی ئەو شاری تەپوتۆزە ڕابکات. من

وەک بینەرێکی سەرسام دوایدەکەوتم، شەو هێشتا هەر ساردبوو، زوڵمەت پڕبوو لە دەرگاو ڕێگای سەیر، شەقامەکان وەک لوولەی تلیسکۆپێکی ڕەش درێژدەبوونەوە، لەوسەریش لە ناکۆتادا فەزایەکی پڕ ئەستێرەم دەبینی، کە ئەستێرەکانی هێند نزیکبوون خەریکبوو دەڕژانە سەر شەقامەکان. دالیا بە هێمنی بەرەو ئەوسەری تونیلێک دەڕۆی، کە لە ناو باغێکی گەورەی ئەستێرەدا کۆتاییدەهات، من وا تێدەگەیشتم کە ئەو دواجار دەکەوێتە ناو دەریایەکی ئەستێرەوە، ئۆقیانوسێکی ئارام کە مرۆڤ لە جێگایەکدا لەوسەری ئەوسەر ئەو شەقامە پێی لە زەوی دەبڕێت و ئیدی بە هەوادا بۆ ناو ئەستێرەکان دەڕوات، هەستمدەکرد خێرایی دالیا چەندەها جار لە خێرایی من گەورەترە. بەڵام ئەو هەر دەڕۆیی و هەر نەدەگەیشتە ئەو باغی ئەستێرە گەورانە، فریشتە چکۆلەکانی پەرێشان و غەمگین بەسەر هەموو کونج و کەلێنێکی ئەو خاکەدا بڵاوبووبوونەوە. هەموو جێگایەکی ئەو ڕێگای ئەستێرەیە فریشتەی چکۆلەبوو، بەڵام نەمدەزانی ئەو بۆ کوێ دەڕوات، ڕێگایەکی ڕاست وەک ڕێگای قیامەت من و ئەوی بەرەو سەر سنوورە هەرە تاریک و ناسکەکانی ئەو شارە دەبرد، دالیا دوای تارمایی عەشقی ناکامی خۆی و من دوای تارمایی عەشقی ناکامی ئەو کەوتبووم، ئەو بەدوای قوربانییەکدا بەرەو تخوبی جیابوونەوەی ئێمەی زیندوو لە خاکی قوربانییەکان دەڕۆیشت، بەرەو سەر سنوورێک کە هاواری زیندووەکان و هاواری مردووەکان تەنیا دیوارێکی نەبینراو لە یەکیان جیادەکاتەوە. دالیا بەرەو ئەوسەری ڕێگایەک دەڕۆیشت کە نەمدەزانی لە کوێدا تەواودەبێت، ڕێگایەک پێدەچوو بەرەو سەری ئەوسەری ژیان بڕوات. من هەمیشە لەدوایەوە بووم، ئەو هەتا جارێکیش ئاوڕی نەدەدایەوە، نەمدەزانی ئاخۆ ئاوڕیشبداتەوە دەمبینێت یاخود نا؟. تا زیاتر بڕۆیشتبایانیە دەنگێکی نهێنی و نادیار پتر و پتر بەرزدەبووەوە، سەرەتا تەنیا واژەواژێکی نادیاربوو. نەمدەزانی ئەو دەنگانە لە کوێوە دێن، هیچ مەخلوقێک بە ڕێگاوە نەبوو،

بەدرێژایی ئەو ڕێگایە لە فریشتە ترساوو شپرزەکانی دالیا سیراجەدین بەولاوە هیچی دیکەم نەبینی. لە جێگایەکدا هەستمکرد ئێمە دەگەینە سەر تخوبی شاهنشینێکی دیکە، هەستمکرد دیوارەکان لەوە دەردەچن دیواری کوچەو کۆلانی شارێک بن، بەڵکو دیوارن لە گاشەبەردی ئەستووری تاریکی دروستبوون، لە شورای زوڵمەت، کە لە هەر بەربەستێکی دیکەی دونیا ڕەقتر و سەختتره برینی. ئەو دەگەیشتە بەردەم ئەو زەریا بێسنوورو خنکێنەرەی تاریکی و لەویادا دەوەستا، ئالەویادا دەنگە دەنگێکی سامناک بەرزدەبووەوە، هاواری هەزاران ئادەمی تێکەڵ بە گڤەی گەردەلوول و ڕەشەبایەکی بیابانی دەبوو. لەو دیو ئەو دیوارە بەرزو پەردە ترسناکانەی تاریکییەوە، لە زوڵمەتێکی بێوێنەدا، من هەزاران تارماییم دەبینی هاواردەکەن، هەزاران تارمایی وەک ئەوەی بایەک بەرەو دەروازەی دۆزەخ بیانفڕێنێت، دەستێک بەزۆر بەرەو جێگایەکی ترسناک بیانبات دەیانقریشکاند، لە دیمەنێک دەچوو لە دیمەنەکانی قیامەت، هەزاران تارمایی لە مەودایەکی دیاریکراودا ڕایاندەکرد و دەگەڕانەوە، ئەوانەی کە ڕایاندەکرد تێکەڵاوی ئەوانە دەبوونەوە کە بە خێرایی دەگەڕانەوە، ئەوانەشی دەگەیشتنە کۆتایی وەک ئەوەی هێزێکی سیحراوی بیانسوڕێنێتەوە دووبارە دەهاتنەوە سەرەتا. من دەمبینی لە جێگایەکی دیاریکراوەوە زەوییەکە شەقدەبێت و تارماییەکان دەخوات، تارماییەکان بەرەو ناو جەرگەی ڕەشی خۆی قووتدەدات، ئەوانەی کە دەڕۆیشتنە بن زەوی هاوارێکیان لێبەرزدەبووەوە کە پێشتر من هەرگیز گوێم لێ نەبووبوو، هاوارێک دەبایە گوێم بگرم تا نەیبیستم، هێندە تیژ و قووڵ و کوشندەبوو، لە دەمی خەنجەرێک دەچوو کاتێک ڕۆح لەتدەکات. هەموو قریشکەیەک برینێکی تاریکی لە خەیاڵمدا جێدەهێشت، کە دەمزانی تا مەرگ خوێن و تاریکی و لمی لێدەتکێت. خۆم وەک پیاوێک دەهاتە پێشچاو کە دەڕوات و لەسەر سەری فوارەیەک لمی خوێناوی بە زەویدا دەگێڕێت. فوارەیەک کە لە جێگایەکی نادیاری سەرییەوە بە

پرتاو دێتەدەرێ و هەمان ئەو قریشکەو هاوارانەی تیانوسراوە کە ئێستا دەیبیستم، سەیری ئەو تارماییە زەجرکێشانەم دەکرد و خەیاڵم لای خۆم بوو کە دەبم بە مرۆڤێک بە فوارەیەکەوە لە لمی خوێناوی لەسەر سەریدا. گوێمدەگرت و دەترسام ئەو هاوارانە تا مردن لەسەرمدابن. دالیا وەک یەکێک لە شوێنێ خۆی کردبێتی بە بەرد دەوەستا، ئەویش وەک من دەستی دەخستە سەر گوێی، فریشتەکانی وەک شێت بە هەوادا دەفڕین و خۆیان دەدا بە زوڵمەتدا. من و ئەو و فریشتەکان لەسەر سنووری دوو زەوی جودا وەستابووین، تخوبی ئەو شارە لەگەڵ بیاباندا دواهەمین خاڵی لێکجیابوونەوەی ژیان و مردن بوو. دواهەمین پێتی لەیەکجیابوونەوەی قوربانییە زیندووەکان بوو لە قوربانییە مردووەکان، هەستمدەکرد من و دالیاش جێگامان ئەو دیوی ئەو بەربەستانەیە، جێگامان ناو ئەو تاریکییەیە، وەک یەکێک نەیەوێت لە قەدەری خۆی ڕابکات، بە هەموو توانای خۆمەوە وەک مردووەکان هاوارمدەکردو بەرەو ناو تاریکی ڕامدەکرد، بەرەو ئەو دیوی ئەو دیوارە سەیرو ئەستوورانەی زوڵمەت، بۆیەکەمجار دالیا سیراجەدین منی دەبینی، بۆ یەکەمجار من خۆم دەدا بەو دیوارەدا و وەک یەکێک بەر سنووری خەونەکانی خۆی بکەوێت، دەکەوتم. لەو ساتەدا دالیا هەڵیدەگرتم و بەسەرسامییەوە دەیپرسی: خودای گەورە، خالیقی بەهەشت و دۆزەخ، خاوەنی ئەردو ئاسمان، تۆ چیدەکەیت لێرە؟

ئەوە یەکەمجاربوو دالیا خەبەری بێتەوەو من ببینێت.

# ئەسپە سپییەکان

## بەشی یەکەم

لێرەوە دووبارە من «عەلی شەرەفیار» چیرۆکەکە لە جەلادەتی کۆتر وەردەگرمەوە. مەبەستدەکەم ئەو بەشانەی کە دواتر جەلادەت لە کتێبەکەی خۆیدا لەسەر ژیانی خۆی لە شاری سۆزانییەکاندا نوسیویێتی، پڕن لە خولیاکانی یادەوەرییەکی ماندوو، تا تەواوی ساتە هەڵهاتووەکانی خۆی دووبارە بدۆزێتەوە، پڕن لە خواستی زیندووکردنەوەی هەموو ئەو ڕۆژانەی کە بەپێی تێڕوانینی جەلادەت سەرەتای تێکەیشتنی ئەو بوون لە تەواوی ئەو هێماو شفرە سەیرانەی ژیانیان کۆنترۆڵکردوە. پێموایە هێندەی بەسەرهاتی ونبوونێکی گەورەیە کە یەکێکی ونبوو خۆی بۆ خۆی دەگێڕێتەوە، گێڕانەوەی چیرۆکێک نییە کە بشێت مرۆڤ بیکاتە ڕۆمانێک. بەسەرهاتی کەسێک کە لە گێڕانەوەکەیدا مەبەستێتی هەموو ئەو کەلێنە تاریکانەی ناو یادەوەریی خۆی دابخات کە تێپەڕینی ڕۆژ و هەفتەو مانگە غەمبارەکان دروستیانکردوە.

مەبەستی جەلادەتی کۆتر لە گێڕانەوەکانی بە دواداچوونی سات دوای ساتی ژیانی خۆیەتی، تێڕامانە لە ڕەفتارە سەیرەکانی خۆی لە پرتەقاڵی سپییدا، یادهێنانەوەی بەردەوامی درۆ و ڕامان و غەمەکانێتی. نابێت ئەوەمان لە یادبچێت کە جەلادەتی کۆتر ژیانی خۆی وەک گوڵدانێکی شکاو

تەماشادەکات، کە هێناویێتی بۆ من پێکەوە پارچەکانی بنێینەوە بە یەکەوە، ئەو مەبەستی نییە دواجار ئەو گوڵدانە شکاوە کە ئێمە پێکەوە دەینێینەوە بەیەکەوە لە چی دەچێت، جوانە یان ناشیرین؟ ئەو دواجار بۆ ڕوخساری خۆی دەگەڕا، ئەو بەلایەوە گرنگ بوو بەر لە ڕۆیشتنی، گوڵدانەکە بگرێت بەدەستییەوەو بڵێت، ئەمە من بووم، ئەمە غونچەکانی عومرمەو ئەمە پشکۆکانی، ئەمە کوڵەکانێتی و ئەمە درزەکانێتی، ئەمە ئەو نیگارە ڕوکەشانەیە کە چاو فریودەدات و نەخشی ڕوکاری سەر گوڵدانەکەیە، ئەمەش ئەو نەخشە نهێنی و سەیرانەیە کە شکان و درزی یەک لە دوای یەک لە بنەوە، لە دیوی ناوەوە گوڵدانەکەدا دروستیانکردوە.

من ڕام وابوو، ئێمە دواجار گوڵدانێکی قەشەنگمان پێویستە، گرنگ نییە دووبارە هەمان گوڵدانی شکاو لەسەر نەخشەو چۆنێتی یەکەمجاری خۆی دروستبکەینەوە، بەڵکو دەبێت دانانی پارچەکان ملکەچی جوانییەکی تایبەتی بن. ئەو خۆی مۆسیقاربوو، من ماوەیەکی درێژ باسی مۆسیقای ناوەکی تێکستەکانم بۆکرد، باسی پەیوەندی و کیمیای نهێنی نێوان ڕستەکان و بەشەکان و وێنەکان، بەڵام ئەو تێنەدەگەیشت مانای چی چیرۆکێک لە ناوەوە مۆسیقاو کیمیای نهێنی هەبێت، ئەو تەنیا حەقیقەتی مەبەست بوو، حەقیقەت بێئەوەی بە مەوشووری هیچ جوانییەکدا تێپەڕێت. من و ئەو ماوەیەکی درێژ لەسەر پەیوەندی نێوان حەقیقەت و جوانی قسەمانکرد، من ڕام وابوو لە هونەردا هەموو حەقیقەتێک دەبێت جوان بێت، حەقیقەت لە هونەردا وەک حەقیقەت نییە لە ژیاندا، لە ژیاندا حەقیقەت تاڵ، غەمبزوێن، زامئەنگێزە، زۆر جار ناشیرین و کوشندەیە، بەڵام لە هونەردا شتە ناشیرینەکانیش دەبێت بە جوانی دەرکەون. دزێوی لە هونەردا دەبێت بە ستایلێکی ئیستاتیکی بنوسرێتەوە. مرۆڤ لە هونەردا ناتوانێت گوڵدانەکە وەکو خۆی بنێتەوە بەیەکەوە، گوڵدانەکە وەکو خۆی گرنگ نییە، بەڵکو گرنگە گوڵدانێکی نوێی قەشەنگ دروستبکەین کە بەشێک لە ڕوخساری

گوڵدانە ئەسڵییەکەی تێدابێت و لە هەمان کاتیشدا بە جۆرێک قەشەنگ بێت نرخێکی نەمری بداتێ، من پێمدەگووت: ئەوەی وادەکات کارێک نەمر بێت، حەقیقەت نییە بەڵکو جوانییە. کتێبەکان لەبەرئەوە نەبوونەتە کتێبی نەمر چونکە حەقیقەتیان پێیە، بەڵکو چونکە جوانن، تابلۆکان زۆربەیان دوورن لە ڕەنگ و ڕوخساری ڕاستییەوە بەڵام جوانی دەیانکاتە کاری نەمر.

هەستمدەکرد ئەو دڵنیایە لە جوانییەکانی خۆی... شتێکی سەیر لە ناوەوە ئاسوودەگییەکی پێبەخشی بوو، هێزی ئەوەی پێدابوو تێبگات لە جیهانی ئەودا حەقیقەت و جوانی بە جۆرێک تێکەڵاوبوون لە یەکدی جیاناکرێنەوە، جارێک بە منی گووت: شەرەفیار، جوانی چییە؟ ئەویش هەر حەقیقەتە، حەقیقەتیش چییە؟ ئەویش هەر جوانییە. تێرمێکی فەلسەفی بوو ئەو بێئاگا لە هەموو قوتابخانەکانی فەلسەفە لە قووڵایی ئەزموونی خۆیەوە پێیگەیشتبوو. ئەو هەمیشە لەوە توڕەدەبوو کە دەمگووت، من بەلامەوە گرنگ نییە ئەم چیرۆکە ڕاست بێت یاخود هەڵە، ئەوەم بەلاوە گرنگە تێکستێک بنوسم درێژترین کات بژی و بمێنێتەوە. ئەوە تەواو جەلادەتی کوتری ناڕەحەتدەکرد، بەتایبەت خۆی کەسێک بوو بەدرێژایی ژیانی لە ژێر گوماندا بوو. ئەو پێی وانەبوو ئەو مەیلە قووڵەی بۆ فەنتازیاو درۆکردن مانای ئەوە بێت کە ڕاستگۆ نییە، بە پێچەوانەوە کە بەرابەرم دادەنیشت، کە قاچی دەخستە سەر قاچی و قسەکانی بۆ دەگێڕامەوە، هێند ڕاستگۆیانە قسەیدەکرد، حەرف بە حەرف باوەڕی بە هەموو شتێکی خۆی بوو. من هەتا جارێکیش هەستمنەکرد کە درۆ دەکات، ئەو خۆی بە وردی ئەو جێگایانەی ژیانی خۆی لە یادبوو کە تیایدا درۆیکردوە. دۆنکیشۆتێک نەبوو ڕاستی و درۆ لەیەکتر جیانەکاتەوە، بە پێچەوانەوە کەسێک بوو تەواو دەیزانی لە چ کاتێکدا ڕاستگۆ بووەو لە چ کاتێکی دیکەدا درۆزن بووە... بە پێچەوانەی زۆر لە ئێمەوە کە باوەڕ بە درۆکانی خۆمان دەکەین، ئەو بەغەمەوە سەری بادەداو دەیگووت، ئاغا ئەو ڕۆژە درۆزنێکی ڕەزاقورس

بووم. کە پێمگووت لێرەوە من دەبمەوە بە حیکایەتخوانی چیرۆکەکە، بە غەمگینییەوە گووتی: لە بیرت نەچێت ئەمە کتێبی منە نەوەک هی تۆ، ناوی منی لەسەر دەبێت، هەموو لاپەڕەکانی باسی من دەکەن، من تەنیا پاڵەوانی ئەم چیرۆکەم، ئەمە لەو چیرۆکانە نییە کە زیاد لە قارەمانێکی هەبێت، من یەکەم و دواهەمینَ قارەمانی ئەم چیرۆکەم، کە من قسەم نەما ئیدی ئەم کتێبە تەواو دەبێت، تامن قسەم هەبێت ئەم کتێبە بەردەوامە. من پاڵەوانی تاک و تەنیای ئەم حیکایەتەم، هەموو شتێکی تری دونیا لە پەراوێزی مندا هەیە و دەژی، هەتا مێژووش، هەتا جوانییەکان و جەنگەکانیش، هەموویان بە هۆی منەوە لەم حیکایەتەدا جێگایان دەبێتەوە، من جەلادەتی کۆتر، منم خاوەنی ئەم موعجیزەیە، پاشان وەک دەبینی من زیندووم، بەوەدا بەرابەری تۆ دادەنیشم و هوشیاری تەواوم هەیە هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە، کەواتە هێشتا نەمردووم، ئەوەش مافی ئەوەم دەداتێ، بزانم تۆ چی بە ناوی منەوە دەنوسیت. ئەوەی نوسەرێکی باشیت، لە من چاکتر ڕستە دادەڕێژیت و وشە دەدۆزیتەوە مافی ئەوەت ناداتێ، یاری بە هیچ حەرفێکی ئەم حیکایەتە بکەیت، چونکە دواجار ئەم چیرۆکە لە بەرگەوە تا دواهەمین لاپەڕە لەسەر ژیانی من قسەدەکات و لەدەوری تەمەنی من دەسوڕێتەوە.

من هەر بەشێکم بنوسیایە چەندجارێک دەیخوێندەوە، تێبینییەکانی لەسەر زمان و پێکهاتی ڕستەکان تورەیدەکردم، جارێک پێیگووتم: تۆ بۆ مۆسیقار بەکار دەهێنیت، بۆ لە بری ئەوە وشەیەکی کوردی دروستناکەیت، وەک مۆسیقاکار یان مۆسیقازان یاخود مۆسیقاژەن. من لەو ساتەدا وەک ئەو ڕەخنەگرانە هاتە بەرچاوم کە لەو دەورو زەمانەدا بە چاخانەکاندا دەسوڕانەوە، لە ناو ڕۆژنامەکاندا تەراتێنیاندەکرد و دونیایان بەو جۆرە تێبینییانە سەرقاڵکردبوو. بە سەبرەوە دەمگووت: لای من ئەوە گرنگ نییە ئایا ئەم وشەیە کوردییە یان عەرەبی یان تورکی، ئەوە گرنکە چەند ماناو

بارگەی ستاتیکی هەلگرتووە، من ئەو وشانە دەزانم بەلام مۆسیقار لەسەر زاری من خۆشتر، پڕ ماناترە، ئاە حەزناکەم وەک ناسیونالیستێکی تەسکبیر سەیری زمان بکەیت، تۆ پێمبڵێ گەر توانیشت مۆسیقار بکەیتە کوردی، ئەی مۆسیقا خۆی چۆن دەکەیت بە کوردی، گەر تۆ ڕاستگۆیت مۆسیقارم بۆ مەکەرە کوردی، بەلکو مۆسیقام بۆبکەرە کوردی... ها گوێبگرە دواجار گەر ڕۆژێک ئەو کتێبە دەرچێت خەڵک ڕەخنە لە من دەگرن... سەد کەس هەن لەم سەرەو سەری دونیادا، لەسەر ئەم کاسبییە دەژین، کە کاسبی نوسەرە بێبەهرەکانە، پێویست ناکات تۆ سەری خۆت بەوەوە بێشێنیت.

دەمزانی هەندێجار تەنیا بۆ ئازاردانی من ئەو قسانەدەکات، هەر کاتێک بمزانیبایە دەیەوێت ئازاری من بدات ڕەق و بێبەزەیی وەلامدەدایەوە، بەلام ئەویش لە شتەکانی تردا ڕەق و بێڕەحمانە ڕەفتاریدەکرد. بەلایەوە گرنگ بوو ئەوەی من دەینوسم وەک ئەوەی خۆی دەینوسێت لە سەدا سەد حەقیقەت بێت، زۆرجار لەسەر بۆچوونە سەیرەکانی لەسەر حەقیقەت دەبوو بە شەڕمان، من سووربووم لەسەر ئەوەی شتێک نییە ناوی حەقیقەتی سەد دەر سەد بێت، ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بۆ هەموو مرۆڤێک شتێک هەیە ناوی حەقیقەتی سەد دەر سەدە. دەیگووت: لەوانەیە ئەوەی لای من حەقیقەتی سەد دەر سەدە لای تۆ حەقیقەت نەبێت، بەلام دواجار ئەوە هیچ لەوە ناگۆڕێت کە لای من ئەوە حەقیقەت و تەنیا حەقیقەت و دوا حەقیقەتە.

لە هەر شتێک زیاتر ترسی لەوە بوو، چیرۆکەکەی وەک فەنتازیا، وەک ئەدەب، وەک ڕۆمان تەماشابکرێت، ئەو پێیوابوو کە ئەو مێژوو دەنوسێتەوە، بەلام من پێموابوو ئێمە ئەدەب دەنوسین، کێشەیەک لەسەرەتاوە تا کۆتایی لە نێوان من و ئەوەدا بە هەڵواسراوی مایەوە.

* * *

ئەو شەوە کە جەلادەتی کوتر و دالیا سیراجەدین پێکەوە لەسەر سنووری نێوان شاری تەپوتۆزە زەردەکان و بیابانەکانی مردن تارماییە سەیرو پڕ هاوارەکانیان بینی، بێئەوەی شتێکی ئەوتۆ لەگەڵ یەکدا بڵێن گەڕانەوە بۆ پرتەقاڵی سپی.

ئەو هەفتەیە هەموو شەوێک دالیا دێتە خوارێ، زۆربەی شەوان کراسێکی سپی و هێلەکێکی شینی لەبەردایە، شتێک لە مەستی و پەشۆکان لە نیگایدایە، وەک یەکێک بە ڕێگادا دەڕوات کە دەزانێت تۆفانێکی ترسناک لە پێشدەمیایەتی و ناشتوانێت بگەڕێتەوە بۆ دواوە. دێت و لەسالۆنەکەدا تارماییەکی سپی دەبینێت، باوەش بەو تارماییەدا دەکات، لە فریشتەیەک دەچێت ئامێزی کردبێت بە هەورێکدا تا نەکەوێتەخوارێ. هاواری تارماییەکەو تلانەوەو ئازارەکانی دەیخاتە گریان دواجار تارماییەکە لە ناو زوڵمەتدا وندەبێت و دالیا وەک شێت بە شەقامێکی پڕ ئەستێرەدا دوای دەکەوێت، ئەو تارماییە وەک شەپۆلێکی گەورەی تاریکی بیفڕێنێت لە زوڵمەتدا وندەبێت و ئەو بەرەو کۆتایی ئەو شەوە ئەنگوستەچاوە دوای دەکەوێت. دەگاتە کۆتایی ئەو شەقامەی مردن لە زیندەگی جیادەکاتەوە. لەویادا دەوەستێت و جەلادەتیش لە دوایەوە دەوەستێت... هەمیشە جەلادەت بە دوایەوەیەتی، لەسەر سنووری ئەو شارەدا پێکەوە دەوەستن و وەک دوو شاهیدی بێدەنگ تەماشای ئەوانە دەکەن کە لە بەردەمیاندا زیندەبەچاڵ دەکرێن. هەزاران ڕۆح کە بە بیاباندا ڕادەکەن و لە سەر ئەو سنوورەدا کە ژیان لە مردن جیادەکاتەوە دەوەستن، لەو دیو تەلبەندەکانی تاریکییەوە دەست بۆ فریادەرەسێکی نادیار ڕادەکێشن کە لە هیچ دەرگایەکەوە ناتوانێت بێتە ژوورێ، ناتوانێت دەستی بیانگاتێ و ڕزگاریانبکات.

هەموو شەوێک ئەم دیمەنە دووبارەدەبێتەوە، هەموو شەوێک ئەو مەحشەرە دەبینن، دەست لەو کۆتاییە ترسناکەی دونیا دەدەن، بیابان

لە هەموو لایەکەوە وێنەکانی خۆی دەهێنێت و لەبەردەمیاندا دەیکاتەوە، وەک ئەوەی زەمین ئەندازەو قانونەکانی خۆی بگۆڕێت بۆئەوەی ئەوان شتێک ببینن کە هیچ کەسێک لەسەر ئەم ئەستێرەیە نایبینێت. جەلادەت دڵنیایە تارمایی شپرزەو غەمگینی باسمی جەزائیری دێت بۆئەوەی شتێکی ترسناکیان نیشانبدات. ئەو دەیانهێنێتە بەردەم ئەم سەحرایەو خۆی لە زوڵمەتدا وندەکات. بەڵام شەوێک تارمایی باسمی جەزائیری وندەبێت و ئیدی ناگەڕێتەوە، چەندەها شەو دالیا چاوەڕواندەکات و ئەو تارماییە نایەت، لەو شەوانی درێژی چاوەڕوانی و دوودڵی و ترسانەدا، هەمیشە جەلادەت لە سوچێکی ئەو هۆڵەدا لە تاریکییدا دادەنیشێت و تەماشای دالیا دەکات، سەرنجی ترس و گریان و دوودڵییە سەیرەکانی دەدات. پرسیارێک مرۆڤ هەمیشە لە خۆی دەکات ئەوەیە: بەڕاست دالیا لەو شەوانەدا، هیچ ئاگایەکی لە جەلادەتی کۆتر نەبووە، کاتێک لە ناو کورسییەکاندا، لە ناو بۆنی شەرابی ڕژاو و سوتوی جگەرە و پاشماوەی مۆسیقای سەمادا دادەنیشت؟ بەڕاست نەیزانیوە لە تاریکی ئەو هۆڵەدا هەمیشە و هەمیشە دوو چاوی عاشق لە تاریکییدا سەیریانکردوە؟ نەیزانیوە کە جەلادەت لە سوچێکدا وەک چاوەڕوانی هەڵهاتنی موعجیزەیەک بێت تەماشایدەکات؟

دالیا هەموو شەوێک بە کوچەکانی ئەو شارە زەردەدا بەرەو سنووری نێوان مردن و ژیان، هاوار و بێدەنگی، خوێن و فەرامۆشی ڕادەکات.

هەفتەیەک دواتر ڕۆژێک جەلادەت لە دەرگای ژوورەکەی دالیا سیراجەدین دەدات، تا ئەو ڕۆژە جەلادەت ژوورەکەی دالیای نەبینیوە، چەند جار ویستویتی بچێتە ژووری، دالیا هەمیشە بەهەر بەهانەیەک بێت ڕێگای لێگرتووە، بەڵام ئەو ڕۆژە دوای هەفتەیەک لە پێکەوەژیانی بێدەنگ، دوای ئەوەی هەموو شەوێک پێکەوە لەو دیو شورایەکی نهێنییەوە تەماشای یەکێک لە سەیرترین دیمەنەکانی قیامەت دەکەن، نهێنییەکان قووڵترو سەیرتر پێکەوە گرێیاندەدات، ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو پێکەوە دانیشن و

بدوێن. دیمەنـەکان لـە خەیـاڵ و نیگای هەردووکیـان دەرنەدەچـوو، دیمەنـی خاکێکـی ناکۆتـای لـم کـە دەسـتە بـە دوای دەسـتە هـەزاران گیانلەبـەری خوێنـاوی لە هەنـاوی خۆیدا دەشـاردەوە، هـەزاران باڵندە و پەپولـە، هـەزاران مانگـی سـەیر سـەیر کە بەسـەر قیامەتدا دەدرەوشـانەوە، مانگ کـە دەکەوتـن و لەگـەڵ مردووەکانـدا نغرۆدەبوون، مانگ کە دوای خنکانیش بۆ ماوەیەکی درێژ لـە ژێر لمەکانـەوە ڕۆشـنبوون و دەسـووتان. ئەسـتێرە کە وەک گڕکانـی بچـوک لـە ناوەڕاسـتی بیاباندا دەتەقینـەوەو خامۆشـدەبوون. دالیا وجـەلادەت دەیانتوانـی خەونـی قوربانییـەکان ببینـن، هیواکانیان کـە وەک هاوارێکـی ڕوناک بـە نـاو زوڵمەتـدا دەکشـان، هەندێکیـان بـە بێدەنگـی و سـەبرەوە دەمـردن، هیچیـان نەدەکـرد، دەچوونـە سـەر ئەژنـۆو سـەیری خودایـان دەکـردو دەمـردن، بـەڵام هەمـوو ڕۆحـەکان مۆسـیقایەکی سـیحراویی و غەمناکیـان لێهەڵدەسـتا. هەندێکیان وەک شـەڕ لەگەڵ ئاسـماندا بکەن لمەکانیان هەڵدەگرت و دەیانگرتـە ئاسـمان، ئـەو لمانـەی دەبوونـە تۆزێکـی زێڕیـن و بێهـودە «بـا» بەسـەر زەویـدا پەخشـیدەکردنەوە، هەندێـک لـە مـردووەکان دەچوونـە ژێـر لـم و بـە کاری هێزێکـی ئەفسـوناوی دەهاتنـەوە سـەرەوە، لـە نێوان هەمـوو داچـوون و سـەرکەوتنەوەیەکدا ناڵەیەکـی ترسـناکیان لێدەهـات، وەک هـاواری یەکێـک بـە ناهـەق بینێـرن بـۆ دۆزەخ. لـە نـاو تارماییەکانـدا هـەزاران منـداڵ هەبـوو، هەندێـک لـە منداڵـەکان بـەدەم سـەماکردنەوە دەمردن، سـەمایاندەکردو زەوی وەک ئـەوەی نەیەوێت ئازاریانبدات لەسـەرەخۆ قووتیدەدان، هەندێـک لـە مـردووەکان بـە کۆمـەڵ دەسـتی یەکدیـان دەگـرت و گۆرانیـان دەگـووت، تـا زیاتـر تێکەڵـی زەوی ببوونایـە زیاتـر دەنگیـان بەرزدەکـردەوە، سـەدای گۆرانییەکانیـان شـتەکانی ڕوناکتـر دەکـردەوە، کـە دەمـردن سیمایان ڕونـاک و عاشـقانە بـوو، هەندێکیـان بـە جۆرێـک باوەشـیان بەیەکدا دەکـرد بـەر لـەوەی زەوی قووتیانبـدات لـە نـاو یەکـدا دەتوانـەوە، هەندێکیـان کۆتـری سـپییان پێبـوو، وەک ئـەوەی بیانەوێت ئاشـتییەکی ئەبـەدی لەگـەڵ مردندا ببەسـتن، یان

لەو سەحرا ناکۆتایەی مردنەوە هەواڵێکی پیابنێرنەوە، هەمیشە بەر لەوەی زەوی بیانبات کۆترەکانیان بەرەو ئاسمانێکی قووڵ و بێبن ئازاددەکرد، هەندێک لە باڵندەکان دەکوژران و دەکەوتنەوە سەر زەوی هەندێکیشیان دەفرین و لە قووڵایی ئاسماندا وندەبوون. بایەکی باکووریی جامانەی هەندێک لە مردووەکانی بەرەو جێگایەکی نادیار لە سەحرادا دەڕفاند، هەندێک لە ژنەکان بەر لە مردن لەچکە خوێناوییەکانیان دەکردەوەو بەرەلای هەوایان دەکرد، سەرپۆش و لەچکەکان هەندێجار بە جۆرێکی ئەفسوناوی سەردەکەوتنە سەرێ وەک ئەوەی بە هەموو زەویدا ڕووەو شارو وڵات و کیشوەری تر سەفەربکەن، وەک ئەوەی بەسەر ڕووبارو دارستان و زەریاکاندا بڕۆن و لە هەموو جێگایەک تنۆکێکی خوێن جێبهێڵن. هەندێکی دی لە قوربانییەکان بە جۆرێکی سەیر دەستیان دەخستە خوێنی خۆیانەوەو بەر لە مردن هەندێ شتیان لەسەر زەوی دەنوسی، هەندێکیان ناوو ناونیشانیان جێدەهێشت، هەندێکیان نیگاری سەیریان ڕەسمدەکرد، هەندێکیان تەنیا دەستێکی خوێناویان بەزەوی دەسرِی و دەڕۆیشتن. بەڵام هەمیشە با بەسەر لمەکاندا دەهات و دەنک دەنک ئەو ناو و نیشانانەی دەکردە تۆزو بە بیاباندا پەخشیدەکردەوە. بەڵام ئەو مۆسیقا ئاسمانییە ون نەدەبوو، مردووەکان دەمردن و ئەو مۆسیقایە بە سەحرادا بەرەو ئاوەدانییە دوورو نادیارەکان تێدەپەڕی، بە ئاڕاستەی ڕووبارە دوورەکان دەڕۆیشت و لە ئاسۆکاندا زرینگەیەکی غەمگینی جێدەهێشت، وەک ئەوەی بیەوێت بچێت بۆ مەلەکووت، یاخود ببێتە هەور، یان بە تەرزی دوکەڵی دوای خەراباتی جەنگێک تێکەڵ بە ئیقاعی با ببێت، پەخشبوونەوەیەکی شەپۆلاویی بەسەر مردووەکان و بیاباندا پەخشدەبووەوە، وەک شنەبایەکی سیحراوی بەرەو لای دالیاو جەلادەت دەهات، یاری بە قژیان دەکرد، دەچووە ناو خوێنیانەوە، دەچووە ژێر کراسەکانیانەوەو گەمەی بە ڕۆحیان دەکرد، لە جەستەیاندا دەنگیدەدایەوە، بە خوێنیانەوە دەنووساو بە ئارامی

بەرەو ناو دەهلیزە تاریک و ئەبەدییەکانی یادەوەرییان شۆڕدەبووەوە.

هەموو شەوێک ئەو دیمەنانە دووبارەدەبوونەوە، هەموو شەوێک جەلادەت دەیویست خۆی فڕێبداتە تاریکییەوەو بگاتە مردووەکان، بەلام لە تاریکی بەولاوە نەدەگەیشتە هیچ شوێنێکی دیکە. هەمیشە بەربەستە ئەستوورەکانی تاریکی بەریان لێدەگرت و وایان لێدەکرد لە بازنێکی بۆشدا بەدەوری دیمەنی هەزاران تارماییدا بسوڕێتەوە. بەلام شتێک لە ناوەوە پێیدەگووت تۆ لە بیاباندا وننەبوویت، تۆ لە خەیاڵە پڕ مۆتەکەو ترسەکانی دالیا سیراجەدیندا ونبوویت کە لە کوچەو تخوبی ئەم شارەدا بەدوای لاشەی خۆشەویستێکی ناکامدا دەگەڕێت، کچێک کە خەوتنی زۆر لەگەڵ جەلادەکاندا... تەماشای دووررودرێژی لم... هەستێکی خوێنین بە گوناه... خوێندنەوەی بێوچانی ئەدەب... ئابڕووچوونێکی ئەزەلی تووشی وڕێنەو هەلوەسەی سامناکیان کردبوو. جەلادەت نەیدەزانی ئاخۆ ئەو لە ناو جوگرافیای ئەو شارەدا دەگەڕێت یاخود تەنیا لە ناو کوچەیەک لە کوچەی ترسەکانی دالیا سیراجەدیندا؟

هەموو شەوێک دالیا جەلادەتی ماندووی هەڵدەگرت و لێیدەپرسی : خودای گەورە، پێغەمبەری گەورە، تۆ چیدەکەیت لێرە؟

هەموو شەوێک هەمان پرسیارو هەمان دیمەن دووبارە دەبووەوە. هەموو شەوێک دالیا پێیدەگووت: تۆ نابێت بێیت بۆ ئێرە، تۆ لەوە منداڵتری لە ئێستاوە ئەم هەموو مردنە ببینیت. تێگەیشتی... تێگەیشتی، تۆ دوای ئەوەی مۆسیقاکەی خۆت تەواودەکەیت دەبێت بچیتە ژوورەکەی خۆتەوە و بە ئارامی سەربخەیتە سەر سەرینەکەت و بنوویت، تێدەگەیت. تێناگەم تۆ بۆ وادەکەیت، خودایە تۆ چەند ئەزێتم دەدەیت، تۆ دەبێت بە کوچەو کۆلانەکانی ئەم شارەدا نەگەڕێیت، تێگەیشتی... نابێت شەو درەنگ بەم شارەدا بگەڕێیت. تۆ لەوە منداڵتری سەیری ئەم شتانە بکەیت.

دالیا وەک ئەوەی لە بازنەیەکی خاڵیدا بسوڕێتەوە، وەک ئەوەی شەو دوای شەو دیمەنە کۆنەکانی لە یادچووبێتەوە، ئەو قسانەی دووبارەدەکردەوە.

ئەو ڕۆژە کە جەلادەت چووە بەردەرگای ژوورەکەی دالیا چاوەڕوانی ئەوە نەبوو ئاسان بیکاتە ژووری، بەڵام وەک شتێکی ترسناک لە نێوانیاندا گۆڕابێت، دالیا بە هێمنی دەرگاکەی کردەوەو تەماشای نیگا وێڵ و غەمگینەکانی جەلادەتی کردو گووتی: جەلادەتی نوقڵ، وەرە ژووری. ڕۆحی من، خودایە گیان بۆنت چەند خۆشە.

ژوورەکەی دالیا، لە هەموو شتێک دەچوو لە ژووری سۆزانییەک نەبێت، بەشی هەرە زۆری ژوورەکە دۆلابی پڕ کتێب بوو، سەدان کتێبی ئینگلیزی کە بەجۆرێکی سەیر و ئەندازەیی ڕێکخرابوون، دیوارەکان پڕبوون لە وێنەی گەنجێکی قژ ڕەش بە جووتێک چاوی غەمگینەوە، جەلادەت دڵنیابوو کە ئەو کوڕە هەمان ئەو ڕۆحە تەنیاو ئازارچێژەیە کە شەوانە لە ساڵۆنەکەدا سێبەرە غەمگین و بریندارەکەی دەبینی. جەلادەت بە هێمنی چووە پێشدەم یەکێک لە وێنە گەورەکان و بە دەنگێکی غەمگین پرسی: دالیا، ئەمە باسمی جەزائیرییە، ئەو کوڕەی تۆ شێتی بوویت، وانییە، خانم ئەمە ئەو نییە؟

دالیا بێئەوەی بپرسێت: تۆ لە کوێ باسم دەناسیت؟ بە ئەسپایی گووتی: بەڵێ، دڵی من، ئەمە باسمە، ئەو کوڕەیە کە من شێتی بووم و تا کۆتاییش هەر شێتی دەبم... تا مردن... تا دوای مردن... تا ئەبەد.

ئەو ڕۆژە جەلادەت ئارەزوویەکی نییە لە سەر ژیانی دالیا قسە بکات، دەیەوێت تێبگات ئەو دیمەنانە چین کە شەوان پێکەوە دەیبینن، دەستی دالیا دەگرێت و دەڵێت: ئەی جوانترین خانمی دونیا، پێمبڵێ من و تۆ شەوانە چی دەبینین...چی؟ ئەو تارماییانە چین؟ ئەو پێدەشتە بەرینانەی مردن چین؟ ئەو لاشەو خوێن و هاوارانە لە کوێوە دێن؟

دالیا دەستی دەگرێت و لەسەر کورسییەکی چکۆلانەی ژوورەکەی

دایدەنیشـێنێت و دەڵێـت: دەزانـم، گوڵـی مـن دەزانـم تـۆ تـا دەمریـت ئـەو دیمەنانـەت لـە یـاد ناچێتـەوە، تـۆ بـەم هەمـوو منداڵـی و پاکییـەی خۆتـەوە نابێت شتی وا ببینیت بەم هەموو بۆنە خۆش و جوانییەوە، خوای گەورە، جارێک بەو هەموو برینەوە دێتە لام و جارێکی تریش مەحکومی سەیری ئـەو قـات و قڕانـە گەورەیـە بکەیـت. مـن چییـت لێبکـەم؟

دەست بەسەری جەلادەتدا دەهێنێت و دەڵێـت: گوێبگـرە دڵەکـەی مـن، گوێبگرە، سوێندم بۆ بخۆ کە پێمگووتی خۆت شێت نەکەیت، تێگەیشتی، نازانم لەوە ناچێت تێمبگەیت، خودای گەورە. جەلادەت گوێبگرە، من هەموو شتێکت لەسەرەتاوە بۆ باسدەکەم، لەوانەیە نەتوانم وەڵامی هەندێ پرسیارت بدەمەوە، چونکە من خۆشم وەڵامیان نازانم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باش گوێبگرە، ئەوەی من و تۆ دەیبینین خەیاڵ نییە، دەبێت تێبگەیت، من و تۆ تارمایی و ئەو شتانە نابینین. من و تۆ لەو سەحرایەدا شتێکی ڕاستەقینە دەبینین، یەکێک هەیە، لە زەوی بێت یاخود لە ئاسمان، لەم دونیا بێت یاخود لەو دونیا دەیەوێت من و تۆ ببین بە شاهیدی شتێکی گەورە. لەوانەیە من و تـۆ نەمانەوێـت، نـە مـن ئـەو کچـەم شایسـتەی ئـەوەم ببـم بـە شـاهیدی شـتی وا، نـە منداڵێکی وەک تـۆش دەبێـت شـتی وا ببینێـت. بـەڵام لـە ژیانـدا شـتەکان هەمـوو دێـن و دەڕۆن کەسـیش پرسـیارمان پێنـاکات. قـەت مەڵـێ نەدەبووایە مـن ئـەم ژیانـە بژیـم... نەدەبووایـە ئـاوام بەسـەر بێت، هەمیشـە خۆشحاڵبە کە زیندوویت، تۆ دەبێت زیندووبیت، ئەگەر منیش مردم تـۆ دەبێت زیندووبیت... سەیرمکە، دەبێت چاوبکەینەوەو تەماشابکەین، ئـا دڵـی مـن، مـن و تۆ ئێستا یەک شتمان لەسەرە کە چاوبکەینەوەو تەماشابکەین، هـەر شـتێک مـن و تـۆ ئێسـتا دەیبینیـن نرخـی خـۆی هەیـە، تێبگـە، وامەزانـە مـن هیـچ ناکـەم، وامەزانـە. منیش وەک تۆ تەماشـادەکەم و هەمـوو نهێنییـەکان لێرەمدا، ئا لێرەمدا، یەعنی دەزانیت لە کوێدا؟ لە یادەوەریمدا دەنوسـمەوە. گوێبگرە لە جێگایەکدا کە هیچ کامێرایەک نییە وێنەبگرێت، هیچ شتێک نییە

هاوارەکان تۆماربکات، جەلادەت لە جۆرە شوێنێکی وەهادا تەنیا ناو ڕۆحی ئینسانەکان هەن ڕاستی هەڵگرن، جەلادەت، کوڕە پورە گەمژەکەم گوێبگرە، لێرەدا تەنیا ڕۆحی من و تۆ هەیە دەبێت هەموو شتەکان هەڵگرێت، تەنیا چاوی ئێمە، کە بەڵگە نەما، ناو ڕۆحی ئینسان خۆی دەبێتە بەڵگە، ئا دڵی من، هاوارەکانی ناو دڵمان دەبن بە بەڵگە. خۆمان و ژیانمان دەبین بە بەڵگە.

جەلادەت بە تووڕەییەوە دەڵێت: دالیا ئەوانە کێن دەمرن، ئەوانە چیین دەمرن، بۆ دەمرن؟

دالیا بە ئەسپایی دەڵێت: ئەوانە ئێمەین دەمرین، کەسی ئێمەن کە هەموو شەوێک دەیانهێننە ئەو بیابانەو دەیانکوژن، ئەو کوردانەن کە وەک تۆ لە باکوورەوە دەیانهێنن و لەو دەشتانەدا دەیانکوژن، گوێبگرە، دەبێت هەموو هەمووومان بمرین، هەموو هەمووومان، من دەزانم، لێم مەپرسە چۆن دەزانم، بەلام لە دەمی هەموویان ئەو قسەیەم بیستووە، هەموویان لە ئەفسەرە بچوک و گەورەکانەوە تاسەر دەرەجەدارە گچکەکان، جەلادەت هەموویان ئەوە دەزانن، ئەفسەرە زۆر بەرزەکان و سەربازە بچوکەکانیشیان ئەوە دەزانن، ئێمە دەبێت بمرین، دەبێت دەشتەکان و شاخەکان و مانگەکان هەموو بمرن، دەبێت درەختەکان و زەریاچەکان و مێرگەکان بمرن، دەبێت هیچ شتێک نەمێنێت، ببێت بە زەوییەکی خاڵی، تێدەگەیت، ڕۆژێک دێت شتێک نامێنێتەوە نە مرۆڤ، نە کێڵگەکان، نە بیرەکانی ناو چیاکان، نە فوارەکانی باغچەی گشتی لە شار، نە قەیسەرییەکان، نە بۆنی بەهارات لە گوزەری دارووفرۆشەکاندا، نە بۆنی هەنگوین لە جەنگەڵە دوورەکاندا. ڕۆحی من جەلادەت، هیچ شتێک نامێنێت، هیچ شتێک... هیچ شتێک. بۆنی ئەو عەترە نامێنێت کە لە شارەکانی باکووردا کوڕان ئێواران دەیدەن لە خۆیان، ئەو مۆسیقایە نامێنێت کە کچان خۆیانی بۆ دەسووتێنن، پەرەسێلکە وێڵەکانی هاوین نامێنن کە هێندە نزم دەفڕن سینەیان دەدات لە زەوی،

پاییزی شەقامی خەستەخانەکە نامێنێت، سەهۆڵفرۆشەکەی هاوینان دەمرێت، سەرمای ڕێگای مەکتەب دەمرێت، مانگی خنکاو لە فرمێسکی کچاندا دەمرێت. ئەو کات جەلادەت کە هەموو شتێک مرد، من و تۆ لەم زەوییەدا وەک نوێنەری نەسلێکی لە ناوچوو دەمێنینەوە، لەوانەیە ئێستا من و تۆیان لە بیرنەبێت، بەڵام کە هەموو شتێکیان لە باکوور کوشت، ئەوسا من و تۆش دەکوژن، لەبەرئەوە دەبێت ئەو نیگایانە لەسەرماندا هەڵگرین و بیر لەوەبکەینەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕابکەین بۆ وڵاتێکی تر.

جەلادەت دەیپرسی: ئاخ دالیا، تۆ دەڵێیت چی؟ چ وڕێنەیەک دەکەیت؟... تۆ شێتی یاخود چی؟ ئەوەی من و تۆ بە شەو دەیبینین خەوێکە پێکەوە دەیبینین، یان خەوێکە تۆ دەیبینیت و لە بەرئەوەی منیش خۆشمدەوێیت دەتوانم بیبینم لەگەڵتدا. وانییە، خەوێکەو هەردووکمان دەیبینین، من چەندین مانگ لە کوردستان بە شاخ و هەردەکاندا پیاسەمکردوە، گەڕاوم، موعجیزەم سازکردوە، بە مۆسیقا مردووم زیندووکردۆتەوە، بەڵام ئەوەی ئێستا دەیبینم خەوە؟ دالیا من دەڵێم خەوە، دڵنیام ڕاست نییە.

دالیا سەری بادەداو دەیگووت: نا گوڵی من خەو نییە، من و تۆ هەموو شەوێک دەچینە قەراغی ئەم شارە، خۆمان دەگەێنینە نزیکی ئەو گۆڕستانانە، ئەوان هەموو ئەم بیابانەیان کردوە بە گۆڕستان، چواردەوری ئەم شارەو هەموو شارەکان، ئەم بیابانەو هەموو بیابانەکان، قەراغی ڕووبارەکان، دامێنی چیاکان، ژێر درەختەکان و ژێر شەقامەکان. جەلادەت هەر کەسێک بتوانێت شەوان خۆی بگەێنێتە قەراغی تاریکی، توانای بینینی ناو جەرگەی زوڵمەتی هەبێت، هەموو شتێک دەبینێت، هەموو ئەو ڕۆحانە دەبینێت کە من و تۆ دەیبینین.

دالیا ئەو ڕۆژە دادەنیشت و بە هێمنی چیرۆکی خۆی لەگەڵ تارماییەکاندا بۆ جەلادەت دەگێڕێتەوە. ئەو لەسەفەری درێژیدا بەدوای باسم جەزائیریدا، پەنجەی جەنراڵ و جەلادەکان بەسەر لەشیدا تێپەڕیبوون، ئەو پەنجانەی

مردن دروستدەکەن، مردن دەنوسنەوە، ئازارەکانی لە سەری پەنجەیانەوە دێتە دەرێ، ئەو دەستانەی کە دەیخەنە سەر هەر جێگایەکی لەشی دالیا لەگەڵیدا ئازاری مردوویەک، سێبەری کوژراوێک دەچێتە ژوورێ بۆ ناو خوێنی، بۆ ناو خەون و مۆتەکەکانی. ئەو بە هەر کوێیەکدا دەڕوات لەگەڵ خۆیدا بۆنی مردووەکان دەهێنێتەوە، ئەو بۆنەی لە دەستی ئەفسەرو سەربازەکانەوە دێتەدەرێ و دەچێتە ناو ڕۆحی. ژەنراڵەکان چیرۆکی مردووەکانی بۆ دەگێڕنەوە. دالیا لە کوچەی شارە دوورەکاندا ئەو مردووانە دەبینێت، لە شەقامە تاریک و خامۆشەکانی شەودا، لەو کۆلانی تاریکی شارە جیاوازەکاندا، لە باغچەی کۆلیژەکەیاندا، لە ڕیواقە غەمگینەکانی بەشی ئینگلیزیدا، لەو ئوتومبێلە ڕەشانەدا کە بە پرتاو بە شەقامەکاندا دەڕۆن، لەژێر سێبەری درەختەکانی هاویندا. دێنە بەردەمی، بە خێرایی بە تەنیشتیدا دەڕۆن، ئاوڕدەداتەوەو دەیانبینێت. هەندێجاریش دوایان دەکەوێت و لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن بۆ جێگای نهێنی مردنیان. دالیا لە ڕێگای ئەو تارماییانەوە ڕێدەباتە سەر دەیان گۆڕستانی شاردراوە. ئەو گۆڕستانانەی دالیا دەڵێت هەموو جێگاکانی لە خەیاڵ و یادەوەری خۆیدا هەڵگرتووە.

ئەو شەوانەی کە بەرەو تخوبی ئەو شاری تەپوتۆزە دەڕوات، دەزانێت چی ڕوودەدات، ڕۆژنامەکان دەخوێنێتەوە، گوێ لە ڕادیۆکان دەگرێت، قسەی ئەو ئەفسەرانەی دێتەوە یاد کە لە ژوورەکەی ئەودا لە پاشەڵە ڕووت و درێژەکانیانەوە پێدەکەنن و باس لە نهێنی شەوگارە سەیرەکانی خۆیان دەکەن لە بیاباندا. ئێواران لە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیەوە تەماشای ئەو دەریا بێسنوورەی لم دەکات و گوێی لێیە با هاواری ئەو ڕۆحانە دەهێنێت کە لە گەردەلوولدا دەلاوێنەوە... با دەنگی گریانیان دەهێنێت، دەنگی پێی ڕاکردنیان لە ناو لمدا، دەنگی ئەو ماشێنانە دەهێنێت کە گۆڕی گەورە گەورە دروستدەکەن، گۆڕ کە بە ئەندازەی گەرووی ئەم

ئەستێرەیە بێت بۆ هاوار. گوێی لە بیلدۆزەرەکانە لە بیاباندا ئیشدەکەن، دەنگی زنجیری ئەو مەکینە گەورانە دەبیستێت کە لە وڵاتە دوورەکانی مردنەوە دەگەڕێنەوە. گوێ شلدەکات و دەزانێت لە کوێی ئەو شارەوە دەتوانێت بەرەو لای قوربانییەکان بڕوات. دەیەوێت بیانبینێت و بیانناسێت، دەیەوێت شوێنی گۆڕەکان و نەخشە سەخت و دژوارەکانیان لە یادەوەری خۆیدا هەڵکەنێت. دەست دەخاتە سەر دەستی جەلادەت و دەڵێت: کوڕی پوری ئەزیزم، من و تۆ هەردووکمان تەنیا شاهیدین، تەنیا شاهید.

* * *

بەدرێژایی بەهاری ئەو ساڵە تا دوای سەرەتاکانی هاوینیش، دیمەنی تارماییەکان بەردەوامبوو، شەو دوای شەو ژمارەی قوربانییەکان گەورەتر و شێوەی سەماکان بەجۆشتر و سروشتی گۆرانییەکان غەمگینتر دەبوون، جەلادەت و دالیاش وەک دوو ڕۆح کە شاهیدن لەسەر گوناهێک کە شاهیدێکی دیکەی لەسەر زەوی نییە، لە تخوبی ئەو شارە خەیاڵییەوە سەیری شەپۆلی یەک لە دوای یەکی تارماییەکان دەکەن کە شەو دوای شەو دێن و سەحرا دەیانخوات و لم دەیانبات و با لە یادیان دەباتەوە.

لە هاوینی گەرمی ئەو ساڵەدا، گەرما گەیشتە هەندێک ئاستی خەیاڵی، لە هەندێک جێگادا هەموو زەریاچەکان بوون بە هەڵم، هەزارەها مراوی تینوو لە زۆنگاوەکان و هۆڕە غەمگینەکانی باشوورەوە پەلاماری ئەو شارانەیان دا کە دەکەوتنە لێواری فورات، هەندێک باغی خورما بە باغەوانەکانەوە گڕیانگرت، لە هەندێک جێگادا هەندێک شارۆچکەی چکۆلە بە تەواوی سەرنشینەکانیانەوە ونبوون، هەندێک بورجی بەرز لە ناکاو بڵێسەیان سەند، هەندێک کەشتی لە دەریادا سووتان. لە بەرەکانی جەنگدا ئێرانییەکان کە کەمتر دەیانتوانی بەرگەی گەرما بگرن پاشەکشێیەکی قووڵیان بەرەو

ناوەوەکرد، خۆر لە سەنگەرەکاندا هەزارەهای کوشت. جەنگ کەمەکەمە لە باشوورەوە بەرەو باکوور سەرکەوت، تۆپی سەیرسەیری ئاگر لە ئاسمانی هەندێ شوێندا دەرکەوتن، لە هەندێ کێلگەو ئاوەدانیدا چەندەها فریشتە بە باڵی وەک مەشخەڵەوە بینران، لە بیابانەکانەوە گەرما هەزارەها چەشنە جانەوەری بەرەو شارەکان ڕاونا، لە هەندێ شوێندا لمێکی ئاگرین و تواوە بەرەو ناو ماڵ و کوچەکان هاژەیکرد، با بۆنی هەندێک ژەهری لە شارە دوورەکانەوە بەرەو ناوەوە گێڕایەوەو مرۆڤەکان لەسەرتاسەری وڵاتدا دەبایە هەوای کوشندە هەڵمژن، بازاڕەکان پڕبوون لە میوەی ڕەش، کوچەکان پڕبوون لەو تارماییانەی کە نەیاندەتوانی هەرێمی مردن و ژیان لە یەکدی جیابکەنەوە.

ئەو بەهارە دالیا سیراجەدین، بە گشتی سەرقاڵی خوێندن بوو، گەر ئەو پەیوەندییە سەیرانەی نەبایە کە دەیبەستێتەوە بە پرتەقاڵی سپییەوە دەشیا ژوورەکەی خۆشی چۆڵبکات و بە تەواوەتی بگەڕێتەوە بۆ پایتەخت، بەڵام شتێک پاڵی پێوەدەنا بەردەوام ئاگای لە جەلادەت بێت، کە هەمیشە لە ژێرەوە تکای لە هەموو مۆسیقارەکان و کیژەکانی پرتەقاڵی سپی دەکرد ئاگایان لێبێت و بە ئەندازەی عەقڵی خۆی وەریبگرن. دالیا لە پایتەخت دەیخوێندو لەڕێگای خاتوو سەمەر ساڵحیشەوە دەرگای نهێنی و تازەی بەرەو ناو ژوورە هەرە نهێنی و سەیرەکانی دەوڵەت دەدۆزییەوە. هەفتەی ڕۆژێک یاخود دووان دەگەڕایەوە بۆ پرتەقاڵی سپی، بە ڕۆژ هەمیشە خەریکی خوێندن بوو، شەوان کەمتر لە جاران دەهاتە ساڵۆنەکە. جەلادەت لە دووری ئەو وەک شێت بە کوچەکانی ئەو شاری تەپوتۆزەدا بەدوای تارماییە سەیرەکانی ناو خەیاڵیدا دەڕۆیشت. ژیانی جەلادەت لەو شارەدا تەنیا لەچاوەڕوانی شتێکی نادیارو نەزانراودا بەردەوامبوو... مرۆڤ دەشێت بپرسێت دەبێت جەلادەت لەو تەپوتۆزەدا چاوەڕوانی چی کردبێت؟ لە ڕاستیدا زۆربەمان نازانین چاوەڕوانی چی دەکەین، مرۆڤیش بە گشتی

هەندێجار نازانێت چاوەڕوانی چی دەکات، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ بەردەوام دڵنیایە شتێک بە ڕێگاوەیە، ئەو هەستە هیوایەکی گەورەی دەداتێ بەردەوامبێت. هەموو بەیانییەک جەلادەت لە خەو هەڵدەستێت، چاوەڕوانە شتێکی گرنگ و گەورە ڕوبدات، خۆشی نازانێت دەبێت ئەو شتە چی بێت، بەردەوام نیگاو وێنەی تارماییەکان لە خەیاڵیدان، تێناگات ئایا ئەو لە سەر سنورەکانی شێتی و عەقڵدا گیرۆدە وەستاوە، یاخود لە نێوان خەیاڵ و حەقیقەتدا دەسوڕێتەوە؟

کۆتایی بەهارو سەرەتای هاوین کەمە کەمە دیمەنی ئەو تارماییانە کەمتر و کەمتر دەبنەوە، بیابان خامۆشدەبێت و جگە لە هەناسەی دووری مردووەکان کە جارجار لە خاکەوە هەڵدەستێ هیچی تر نامێنێت. دالیا جار دوای جار هەواڵی قات و قڕییە گەورەکان بۆ جەلادەت دەهێنێت، هەموو جارێک بانگیدەکاتە ژوورەکەی خۆی و بەدەم چا خواردنەوەوە لەسەر نەخشەیەکی گەورەی ولات شوێنە وێرانەکانی نیشاندەدات، قوومی درێژ لە چاکانی دەدات، یاری بە کلۆ دیشلەمەکانی ژێرزمانی دەکات و جێگای ئەو عەشرەت و خێلانەی نیشاندەدات کە ئاسەواریان نەماوە. دالیا ڕای وایە کە دوای چەند ساڵێک زیندووەکان بە چەشنێک دێنە کەمی و کزی، هەموویان لەسەر کەشتییەک جێیان دەبێتەوە، هەموویان دەتوانن لە شەمەندەفەرێکدا سواربین و بەزەویدا سەفەربکەن، شەمەندەفەرێک تەنیا بە شەو بۆی دەبێت لە ناو پێدەشت و کێڵگەو کەنار ڕووبارەکاندا بڕوات. فەنتازیا ترسناکەکانی دالیا هەمیشە جەلادەتی دەترسان، ئەو دەیگووت: ڕۆژێک دێت مردووەکان چادر هەڵدەدەن، باغ دروستدەکەن، شاری تازە بونیاد دەنێن کە هێند سپییە هیچ شتێک نایشێوێنێت. بە ترسەوە دەستی جەلادەت دەگرێت و باسی ئەو کەمایەتییە زیندووەی بۆ دەکات کە بە کاروانی بچوک بچوک، وەک گەڕۆکی بێئارام و هەمیشەیی زەوی تەیدەکەن. باسی ئەو کەسانە دەکات کە دەبنە پەیامنێر لە نێوان مەرگ و ژیاندا. دەڵێت:

ژیان و مردن بە شێوەیەک تێکەڵدەبن هیچ کەس نازانێت زیندووە یاخود مردوو. دەیگووت: باغەکان بە چەشنێک تێکەڵدەبن، کەس نازانێت ئەوەی بۆنیدەکات گوڵی مردنە یان زیندەگی. لەوانەیە ڕۆژێک بێت سنوورەکانی نێوان ژیان و مردن هێندە تەنک ببێت، مرۆڤ بە ئاسانی بڕوات بۆ مەرگ و بگەڕێتەوە. دالیا وەک عادەتی هەمیشەیی خۆی چیرۆکەکانی دەگێڕێتەوەو سەمادەکات، قسەدەکات و پێدەکەنێت، لە ناکاو سەرسام و نائومێد دەبێت و دەستدەکات بە گریان. دەگری و دەگری، کە ئارام دەبێتەوە دەستدەکاتەوە بە پێکەنین. کە پێشدەکەنێت هێشتا پڕە لە پاشماوەی گریان، قاقاکانی تەڕن بە فرمێسک و خەندەکانی پڕن لە هەنسک.

پەیوەندی دالیا و جەلادەت دەگۆڕێت، ئەوەی هەردووکیان پێکەوە پەیوەندییەکی نهێنی و سەیریان بە زەمین و زەمانی مردنەوە هەیە زیاتر لە یەکدییان نزیکدەکاتەوە، بەوەدا هەردووکیان دەتوانن سەیری ناو تاریکی بکەن و مردووە سەحراییەکان ببینن شتێک لە پەیوەستی سۆفییانە لە نێوانیاندا دەخولقێنێت... خۆشەویستی جەلادەت بۆ دالیا تێکەڵ بە ڕێزێکی بێسنوور دەبێت کە تا ڕادەیەکی کوشندە لەو بێحەیایی و کەم شەرمییە دەکوژێت کە عەشق پێویستی پێیەتی، تا دێت خۆی دوورتر و نامۆتر لە دالیا دەبینێت، زەمانی دانیشتنەکانیان دەبێتە زەمانێکی گریاناویی، هەوای پێکەوەبوونیشیان غەمێکی ڕەش باڵی بەسەردا دەکێشێت، دالیا دەڕوات و هەمووجارێک بە دیدێکی مەرگبینترەوە دەگەڕێتەوە. هەمیشە باسی پایتەخت و ئوتێلە گەورەکان و شەقامە تایبەتییەکان و سەردابە نهێنییەکان دەکات. بەر لە کۆتایی بەهار گۆڕانکارییەکی تراژیدی و بنچینەیی لە ڕەوتی هەموو ڕوداوەکاندا ڕوودەدات. یەکێک لە ئەفسەرەکان دالیا دەباتە ناو سەردابێکی نهێنییەوە کە پڕە لە ملیۆنەها فایل، بە دالیا دەڵێت ئەگەر باسمی جەزائیری کوژرابێت فایلەکەی لێرەدایە، ئێرە مۆزەخانەی فایلی ئەو کەسانەیە کە لە دەساڵی ڕابوردوودا کوژراون. هەفتەیەک بۆت هەیە بگەڕێیت، ئەم هەفتەیە

من لێره خەفەرم، ئەگەر لەم هەفتەیەدا فایلەکەیت دۆزییەوه ئەوا باسمی جەزائیری مردووه، ئەگەر نەشتدۆزییەوه ئەوه مانای یان زیندووه یان دەبێت بوەستیت تا جارێکی دی من خەفەر دەبم و دووباره دەستبکەیتەوه بە گەڕان. دالیا دەیزانی ئەوه تەنیا شانس و دواهەمین شانسە بتوانێت لە ونبوونی کوتوپڕی تارمایی ئەو کوڕه تێبگات. ئەو شەپۆلە ترسناکەی قڕان و لە ناوبردن کە ئەمسەرەوسەری وڵاتی گرتۆتەوه دالیایان خستۆتە گومانێکی قووڵەوه، هێنده قووڵ کە چیتر بڕوا بە هەستەوەرەو سەلیقەو خەیاڵی خۆی ناکات. شەوان ئەو ئەفسەره بۆ سەعاتێک دێت، لە ناو تەپوتۆزی فایلەکاندا، لە ناو بۆنی کوشندەی مردنەوه کە لە فایلەکان دێت لەگەڵ دالیا سیراجەدیندا دەخەوێت، بێدەنگ ڕووتیدەکاتەوەو بە ناو پێچاوپێچی دۆڵابەکاندا ڕاویدەنێت. دالیا واهەستدەکات بە ناو خوێنی هەزاران مرۆڤدا ڕادەکات، وا هەستدەکات ئەوەی ئێستا لە ناو ئەو فایلانەدا دەیکات تێپەڕینە بە دەروازەی دۆزەخێکی ترسناکدا کە هەر دەبێت بە ناویدا بڕوات، پێیوایە بۆئەوەی بگاتە کۆتایی جەنگەڵێکی ترسناک کەساڵەهای ساڵە بەناویدا تێدەپەڕێت، دەبێت ئازاری ئەو شەوە ترسناکانەش بچێژێت. گەشتنی بەو سەردابە کۆتایی گەشتێکە کە لە مێژه دەستی پێکردوه. لەگەڵ ئەو ئەفسەرەدا دەخەوێت و واهەستدەکات، لە بری شەهوەتی ئەو هاواری هەموو کوژراوەکان دەچێتە خوێنیەوه، کە لە ناو فایلەکاندا دەیگەوزێنێت وەک ئەوه وایە لە خوێن و تاریکی هەڵیکێشێت. هەموو ئەو ژێر زەمینە نسرمە لای دالیا هیچ نییە جگە لە ژوورێک لە ژوورەکانی سەقەر، ساردی پەنجەکانی ئەو ئەفسەره لە ساردی ڕۆحی ئەو مردووانە دەچێت کە لەو سەردابەدا دێن و دەچن، وەک ئەوەی مانەوەی زۆر لەگەڵ فایل و دۆسییەی دێرینی ئەو مردووانەدا هەستی ڕاستەقینەی ژیانیان لەو پیاوەدا کوشتبێت، نیگاکانی، جوڵەکانی، تێپەڕینی بەکاوەخۆی لە نێوان ڕەف و دۆڵاب و سندوقەکاندا لە جوڵەی پاسەوانی گۆڕستانێکی غەمگین دەچێت

کە بە شەو ناچارە زۆران لەگەڵ ئەو ڕۆحە سەرکێشانەدا بگرێت کە لە گۆڕەکان ڕادەکەن، شێوەی خەوتنی ئەو ئەفسەرە لەگەڵ دالیادا لە زۆرانگرتن دەچێت نەوەک لە عەشق. کە تەواودەبێت بە قوونێکی ڕووت و ڕەشەوە لەسەر ئەرزی سەردابەکە درێژدەبێت و بە دالیا دەڵێت: دالیا، وردە وردە شێت دەبم، هەموو شەوێک ئێرە پڕدەبێت لە ڕۆحی مردوو. دێن بۆ ئەوەی فایلەکانی خۆیان ببەنەوە، هەموو شەوێک دێن، من دەرەقەتی هەموویان نایەم. کە بینیتن مەترسە، بە هێمنی سڵاویان لێبکەو توڕەیان مەکە، لەوانەیە هەندێک خەتەرناک بن، لەوانەیە ڕۆحی ئاژاوەچی بن... لە بەرئەوە توڕەیان مەکە.

ئەفسەرەکە کە مولازمێکی ڕەشتاڵەی لاوازو چکۆلانەیە، پەنجە بۆ جێگایەکی نادیار درێژدەکات و دەڵێت: من شەوان لە نزیک ئەو شورا بەرزانە دەوەستم و بە کێبڵێکی ئەستوورەوە ئەو ڕۆحانە دەردەکەم کە بەسەر دیوارەکاندا سەردەکەون و خۆیاندەکەن بە نێو ئەم سەردابەدا و فایلەکانی خۆیان دەدزن و دەیبەن بۆ جێگایەکی تر، بەڵام عەزیزی من هەرچییەک دەکەم سوودی نییە، ئەوان لەهەر شوێنێکەوە بووە خۆیان دەکەن بەم سەردابانەداو کۆڵنادەن.

ئەو ئەفسەرە چیرۆکی جیهانێکی سەیر دەگێڕێتەوە، جیهانی جەنگێکی نهێنی لەگەڵ ئەو ڕۆحە غەمگین و بریندارانەدا... هەموو ئەوانەی لەو شوێنەدا کاردەکەن دەزانن کوژراوەکان شەو دێن و دۆڵابەکان بەسەر یەکدا دەڕۆخێنن و فایلەکان تێکەڵدەکەن. هەموو ڕۆژێک بەیانیان پاسەوانەکان دێن و لەو سەردابەدا فایلە تێکدراوەکان چاکدەکەنەوە، ڕەفەکان پڕدەکەنەوە لە دۆسییە. هەموو شەوێک ڕۆحەکان دێن و دەگەڕێن، هەندێکیان فایلەکانی خۆیان دەدۆزنەوەو دەڕۆن، هەندێکیان نایدۆزنەوەو لەڕقدا دۆسییەکان بەسەریەکدا دەڕوخێنن، دۆڵابەکان دەخەن و سندوقەکان دەشکێنن، ئەوانەی دۆسییەکانی خۆیان دەدۆزنەوە، بە جۆرێکی سەیر دەینوسێنن

بەسنگی خۆیانەوە و ئەم خانەیە جێدەهێڵن و ئیدی ناگەڕێنەوە، ئەوانەشی نایدۆزنەوە جار دوای جار تورەترو شەڕانگێزتر دێنەوە. ئەو ئەفسەرە وەک شێت لە دالیا دەپرسێت: دالیا کچان باشتر لە دنیا تێدەگەن، ئەوانەی دۆسییەکان دەبەن، دەچن بۆ کوێ؟ عەزیزی من بەڕای تۆ ئەم مردووانە ئەم فایلانەیان بۆچییە؟ خۆ ئەگەر من بمرم باوەڕناکەم مشووری کۆمەڵە کاغەزێکی وەها بخۆم. دالیا بیردەکاتەوەو بە هێمنی دەڵێت: چیت پێبڵێم؟ نازانم، بەلام دڵنیام ئەوان دۆسییەکانیان زۆر دوورناخەنەوە، نزیک لە ئێمەوە دایاندەنێن، دەیبەن بۆ شارێک ئێمە ئاسان دەستمان بگاتە ناو تاقەکانی. حەزدەکەن ڕۆژێک لە ڕۆژان ئێمە بیخوێنینەوەو تێبگەین بە چ دەردێک مردوون.

دالیا بە چەشنێک باسی ئەو شارە دەکات، ئەفسەرەکە سەراسیمە دەبێت، بەڕای دالیا ئەو شارەی کە مردووەکان دۆسییەکانی خۆیانی بۆدەبەن هێند نزیکە مرۆڤ دەتوانێت لە پەنجەرەکەی خۆیەوە دەست درێژ بکات و دەستی بگاتە سەر ڕەفەکانی، دەتوانێت لە پەنچەرەی ماڵەکەی خۆیەوە تەماشای فوارەکانی بکات. لە ژوورەکەی خۆیەوە بۆنی گوڵەکانی بکات، لە حەوشی ماڵی خۆیەوە لە سەر کورسی باغچەکەی خۆی دانیشێت و بارانەکانی ئەو شارە تەڕیبکەن.

دالیا لەو چەند شەوەدا ئەو کوژراوانە دەبینێت کە بە دەست و پلی تۆزاوی و بە بەرگی خوێنینەوە دێن و لە ناو ئەو سەردابەدا دەیکەنە هەلایەکی گەورە، لەو شەوانەدا چۆن ژنێکی لادێی مراوییەکی سرک ڕاودەنێت، دالیا هەندێک لەوانە لە ناو دۆلاب و ڕاڕەوەکاندا ڕاودەنێت، وەک چاوشارکێیەکی تاڵی لەگەڵدا بکەن، تا شەکەت نەبێت وازناهێنن. هەندێجار نێو ئەو سەردابە پڕدەبێت لەو پیاووژنە غەریبانەی هەر یەکەی بە بێدەنگ بە دیار کۆمەڵێک دۆسییەوە وەستاون و وەک خوێنەری کتێبخانەیەکی گەورەبن بە بێدەنگ ژیانی یەکتر دەخوێننەوە. هەندێکیان پێناچێت بۆ

دۆسییەکی تایبەتی بگەڕێن، بەڵکو لە خوێنەری ڕاگوزەر دەچن، هەندێکیان مردن ناوو سەربوردی خۆیانی یادبردوونەتەوەو بە ئاشکرا نازانن بۆ چی دەگەڕێن، هەندێکیان خوێندەوارییان بیرچۆتەوەو ئەلف و بێی ژیان لەگەڵ ئەلف و بێیەکی دیکەدا تێکەڵاودەکەن کە ئەلف و بێی مەرگە. دالیا تێناگات ئاخۆ ئەو خۆی یەکێکە لەو مردووانە و بە ڕێگایەکی پێچاوپێچدا گەڕاوەتەوە بۆ ئەو ژێرزەمینە یاخود زیندووەو دەژی و بە ڕاست هەوای سەر زەمین هەڵدەمژێت. لەو ژێر زەمینەدا بەردەوام دەپرسێت فاسیلەی نێوان ژیان و مردن چییە؟ مرۆڤ چۆن دەتوانێت دڵنیابێت کە زیندووە؟. شەوان کە ئەو ئەفسەرە بۆ سەعاتێک پۆستەکەی خۆی جێدەهێڵێت بۆ ئەوەی لە ناو دۆسییەکاندا ڕووتیبکاتەوە و لەگەڵیدا بخەوێت، لەساردی بەولاوە هەست بە هیچ ناکات، بەڵام لە مێژە ئەو هەست بە هیچ ناکات، لە مێژە لە تارماییەک دەچێت کە پیاوان بە ناو سێبەرەکەیدا تێدەپەڕن و دێنەدەرێ، وەک تێپەڕینی هەورێکی سارد بە ناو هەورێکی دیکەدا.

ئەو هەفتەیە دالیا پەیوەندییەکی سەیر لەگەڵ ئەو مردووانە دروستدەکات، لەگەڵیاندا کۆدەبێتەوە، ئەوان دەست بە قژیدا دەهێنن، ماچیدەکەن، لە نزیکییەوە دەوەستن، فایلەکانی خۆیانی نیشاندەدەن، دالیا بە دەستووری هەمیشەیی خۆی حیکایەتە دوورو درێژەکانی خۆیان بۆ دەگێڕێتەوە، کەدەست بە قسەدەکات ناتوانێت بوەستێت، چیرۆکی پەرییە چکۆلەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەو پەرییە بچوکانەی بەئەندازەی چوکلێتێک دەبن. لە شارێکی دووردا دەیپارێزن، لەوێن تا ڕۆژێک ڕۆحی بەرەو جێگایەکی جوان ببەن، لەوێن بۆئەوەی شەیتانەکان نەکەونە سەر خەیاڵی ئازاردان و ڕفاندنی بۆ دۆزەخ، ئەو جەهەنەمی نییە، دالیا لە ناو سەردابەکەدا تەماشای ڕۆحە غەمگینەکانی هاوڕێی دەکات و هاواردەکات: من دۆزەخی نیم، من جەهەنەمم نییە... پەرییەکان لەوێن بۆئەوەی بمبەن بۆ بەهەشت... من دەبێت لەوێ بم... تامردن دەبێت لەوێ بم. دالیا دەگەڕێت و هەندێجار

وا هەستدەکات هەموو ئەوانی دیش لەگەڵیدا دەگەڕێن، گوێی لە چپەیەکی نهێنییە لەمسەرەوسەری سەردابەکەدا دەنگدەداتەوە «باسمی جەزائیری... باسمی جەزائیری... باسمی جەزائیری». وەک ئەوەی تارماییەکان پێکڕا ناوی ئەو کوڕە بڵێنەوەو لەگەڵیدا بگەڕێن. دالیا بە جۆرێکی سەیر لە ناو زەریای ئەو دۆسییانەدا نوقمدەبێت، هەندێجار بە شێوەیەک نوقمی خوێندنەوەی فایلەکان دەبێت هەموو شتێکی بیردەچێتەوە، شەوان

ناخەوێت، بۆئەوەی بەسەر وەنەوزو ماندووبوونەکانیدا سەرکەوێت، زوو زوو ڕادەکات و لەسەر دەستشۆرێکی بچوک و چڵکن دەموچاوی دەشوات. لە گەڕانیدا فایلی هەندێک کەس دەدۆزێتەوە کە لە کات و شوێنی جیاوازی ژیانیدا ناسیونی، فایلی کچێکی هاوڕێی دەدۆزێتەوە کە لە کۆلیژی ئاداب فەرەنسی دەیخوێند، بەرنامەی ڕۆژانی ئەشکەنجەو شەوانی نەخەوتنی دەخوێنێتەوە، ناوی ئەو جەلادانە دەخوێنێتەوە کە ئیشیان تەنیا ئەتککردن و لاقەکردنی ئەو بووە، فایلی پۆلیسێکی پیر دەدۆزێتەوە کە جاران لە فولکەیەکی چکۆلانەدا لە نزیک هێڵی ئاسمانی فلیپینی ڕادەوەستا، فایلی شەربەت فرۆشێک دەدۆزێتەوە ئێواران لەگەڵ کیژەکانی هاوڕێیدا لە نزیک کۆلیژ شەربەتیان لادەخواردەوە، فایلی شۆفێرێک دەدۆزێتەوە شەوێکی درەنگ لە پرتەقاڵی سپییەوە بردبووی بۆ گەراجی شارێکی دوور. دۆسییەی ئەفسەرێک کە هەموو هەفتەیەک دوو شەو ژنەکەی دەناردەوە بۆ ماڵی باوکی، تا خۆی لەگەڵ سۆزانییەکاندا مەست بێت و بادەبکات، دواجار لە ناو دۆلابێکی کۆندا دۆسییەی «فەخرەدین سیراجەدین عبداللە» دەدۆزێتەوە، برا گەورەکەی خۆی کە بە بارێک قاچاغەوە لەسەر سنوورە شاخاوی و دوورەکانی باکوور، کۆپتەرەکان هەڵیدەگرنەوەو بە تۆمەتی گوازتنەوەی کەلوپەلی لۆجستی بۆ دوژمن لە شارێکی باشووردا لە سێدارەیدەدەن.

ئەوە یەکەمجارە دالیا دەزانێت کە فەخرەدینی برای مردووە. بە

جۆرێک دەگری ئەفسەرە خەفەرەکەی هاورێی گوێی لە دەنگی گریانەکەی دەبێت کە دەرگا بەدەرگاو دالان لە دوای دالان دێت و بە حەوشێکی گەورەدا تێدەپەڕێت و دەگاتە گوێی ئەو لە کاتێکدا خەریکی نانخواردن و تەماشاکردنی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی تایبەتە لەسەر چەشنەکانی ماسی لە باشووری پاسفیک. ئەفسەرەکە پێیوایە دالیا فایلەکەی باسمی جەزائیری دۆزیوەتەوە، بە خێرایی بە دالان و حەوش و پلیکانەکاندا ڕادەکات، بەلام تووشی سەرسوڕمانێکی گەورەدەبێت کە تێدەگات دالیا فایلی برایەکی کوژراوی خۆی لە سەردابەکەدا دۆزیوەتەوە، ئەو شەوە ئەفسەرەکە هەرچییەک دەکات ناتوانێت دلی ئەو کیژە بداتەوە کە خەیال و قسەو عاتیفەی لە خەیال و قسەو عاتیفەی ئەو سۆزانییانە ناچێت کە ئەو پیاوە تائەو کاتە بینیونی. تەنیا دەمەو بەیان دالیا کەمێک ئارامدەبێتەوەو بە پانتۆل و تی شێرتەکەی خۆیەوە لەسەر بەتانییەکی نوێ دەخەوێت کە ئەفسەرەکە بە تایبەت لە نۆردووی تایبەتی ئەفسەرەکان دەریدەهێنێت و بۆی ڕادەخات.

بۆ ڕۆژی دوایی کە دالیا بە ئاگا دێتەوە، ئارامترو واقیعبینترە، تێدەگات جارێکی دیکە ناتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەم ژێر زەمینە، لە بەرئەوە دەبێت بەسەر گریان و فرمێسک و ترسەکانیدا سەرکەوێت. ئەمە دواهەمین شانسەو دەبێت بەجۆرێک بەکاریبهێنێت بکاتە حەقیقەت. لە ئێوارەی شەشەمین ڕۆژدا تارمایی کچێکی چکۆلانە کە هەمیشە بە ماکسییەکی ئەرخەوانی تۆخەوە، بە جووتێ پرچی ڕازاوەوە بە گولی یاسەمین ناو فایلەکان دەگەڕێت، فایلێکی گەورە دێنێت و دەیخاتە بەرپێی دالیاو دەڕوات، دالیا بە بێدەنگ هەلیدەگرێت و لاپەڕەی یەکەمی هەلدەداتەوە، بە خەتێکی جوان نوسراوە «المتهم باسم ولید صبحی الجزائری». لاپەڕەکانی فایلەکە هەلدەداتەوە و لە دواهەمین لاپەڕەدا بڕیاری مردنەکەی دەخوێنێتەوە «حکم علیه بالموت و علی الجهات المسئولة تنفیذ الحکم». بە هێمنی فایلەکە

هەڵدەگرێت و دەیخاتە شوێنێکی تایبەتی. دەموچاوی دەشوات، بە هەموو توانای خۆی فرمێسک و ژانەکانی دەباتەوە ناوەوە، لە جانتا دەستییەکەی مکیاجەکانی دەردێنێت و مەکیاجێکی تەواودەکات، دەچێتەوە سەری، بە دالان و ڕیواقە درێژەکاندا تێدەپەڕێت، گرەی ئێواران لە حەوشەکەدا لێیدەدات، دەچێتە ژووری ئەفسەرەکە، فایلەکە لەسەر مێزەکەی دادەنێت و پەردەکان دادەداتەوە و لەبەر ڕوناکی گڵۆپێکی زەردا خۆی ڕووتدەکاتەوەو بۆ دواهەمین جار لەگەڵ دواهەمین پیاودا دەخەوێت.

* * *

لە دوای مانگی پێنجەوە سەفەر بە ڕێگاکانی باشووردا کوشندەیە، جگە لە تیشکی خۆر کە ڕێبوارەکان تووشی وڕێنەو ڕێشکەوپێشکە دەکات، تۆزێکی وشکی خنکێنەر بەدرێژایی هەموو شەقامەکان دێتە ناو ماشێنەکان و توانای بینین و بیرکردنەوە لە مرۆڤ دەستێنێتەوە. لەو جۆرە وەرزانەدا سەفەرکردن لە ئوتومبیلێکی بچوکی موسافیراندا خواستێکی ترسناکی خۆکوشتن و بێزاری لە مرۆڤدا دروستدەکات. هیچ شتێک وەک گەرما وا لە مرۆڤ ناکات بیر لە خۆکوشتن بکاتەوە، بەتایبەت گەر مەحکوم بێت بە ڕێگایەکی چۆڵ و بێ ئاوەدانیدا گوزەربکات کە لە نێویدا تا ناکوتا لم و خۆر بە شێوەیەکی بازنەیی و ئاوێنەیی لە ناو یەکدا دووبارەدەبنەوە. ئەو ڕۆژەی دالیا سیراجەدین لە پایتەخت گەڕایەوەو دۆسییەکەی باسمی جەزائیریی لە بندەستدا بوو. بەدرێژایی ڕێگا دالیا بیری لە خۆکوشتن دەکردەوە، لەوەوبەر چەندەها جار بیری لە خۆکوشتن کردبووەوە. هەندێجار کە لەگەڵ ئەفسەرێکی جانەوەرئاسادا دەخەوت، کە بیری لەوە دەکردەوە ئەو چ ئێشێکی بێماناداەکات و لەگەڵ چ تۆخمە ئادەمییەکدا تێکەڵاودەبێت، حەزی بە مردنێکی کوتوپڕدەکرد... مردنێک وەک بروسکە بێت و تەواوی ئەم

ئازارانەی لە بیر بەریتەوە. کە لەبەر ئاوێنەدا تەماشای شوێن قەپاڵەکانیانی دەکرد لەسەر مەمکی، کە ناچاردەبوو سوراوێکی زۆربکات بۆئەوەی شوێن ددانەکانیان لەسەر ڕوومەتی بشارێتەوە، بەردەوام بیری لە خۆکوشتن دەکردەوە، بیریدەکردەوە بگەڕێتەوە بۆ باکوورو خۆی بخاتەوە ناو هەمان ئەو بیرەی چەند ساڵ لەوەوبەر براکانی فڕێیاندابووە ناوی، بیریدەکردەوە لە نزیک فورات دابەزێت و خۆی بخاتە شەپۆلە لاواز و کزەکانییەوە، بەڵکو لەسەرەخۆ لاشەکەی بەرەو باشوور ببەن. دڵنیابوو فورات هێند لاوازو بێتینە چەندەها ساڵی دەوێت تا جەستەی دەگاتە ناو کەنداوو لەوێوە دەچێت بۆ دەریا. ئەو خەیاڵەی کە ڕۆحیشی تەکان لە دوای تەکان لەگەڵ جەستەیدا دەڕوات و لە ئاوە گەورەکان دەدات و لە تۆڕو بازنەی ترسناکی مینەکانی دەریا ئازاددەبێت و دەگاتە ئۆقیانوسە دوورەکان، لەگەڵ ڕۆحی ڕاوکەرە خنکاوەکانی ماسیدا دەبێتە دۆست، بیرێکی هێند ڕۆمانسی و خەیاڵاوی بوو، دالیای بە جۆرێکی سەیر فریودەدا. ئەو ڕۆژە کە دالیا سیراجەدین دەگەڕێتەوە بۆ پرتەقاڵی سپی نازانێت بۆچی دەگەڕێتەوە، بڕیاری داوە تا مردن لەگەڵ هیچ پیاوێکدا نەخەوێت، بڕیاری داوە واز لە خوێندن بهێنێت و نەگەڕێتەوە بۆ دوا تاقیکردنەوەکان لە بەشی ئینگلیزی. کۆمەڵێک سیناریۆی لە خەیاڵدایە، لەلایەک چیرۆکی ئەو کەسانەی بیستووە کە بە نهێنی لە بەندەری باشوور سوار کەشتییەکان دەبن و دەچن بۆ کیشوەرێکی دی و لەسەر زەمینێکی دوور دەگیرسێنەوەو داوای پەناهەندەیی دەکەن، لەلایەکی تریشەوە نایەوێت ئەو شاری تەپوتۆزە بەجێبهێڵێت، نایەوێت جەلادەتی کۆتر جێبهێڵێت کە وەک منداڵێکی ئیسک سووک تەماشایدەکات، دەزانێت کە خۆشیدەوێت، بەڵام دەشزانێت کە عەشقی ئەو، عەشقێکی هەرزەکارانەیە، لەو عەشقە دێرینانە دەچێت کە خۆی لە ڕێگای قوتابخانە لە شارە ساردو غەمگینەکەی خۆیدا لە باکوور تیاژیابوو، جۆرە خۆشەویستییەکە کە بۆ ماوەیەکی کەم گڕدەگرێت و قووڵ ناوەوەی مرۆڤ دەسووتێنێت و دەڕوات،

دواتر مرۆڤ دەموچاوی مەعشوقەکەی بیردەچێتەوە، بەڵام هەرگیز ژانەکانی بیرناچێتەوە. خۆشەویستی لەو تەمەنەدا هیچ نییە جگە لە کڵپەیەکی کوتوپڕ کە لە ناکاو هەڵدەکات و لە ناکاویش خامۆشدەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستیدەکرد هێڵێکی سەیرو نهێنی بەو کوڕەوە دەیبەستێتەوە کە دەبێت زۆر چاوەڕوانبکات تا تەواو دەیدۆزێتەوە، دەبێت لێگەڕێ هێدێ هێدی نهێنییەکانی دەرکەوێت. دەیزانی ئەو شەوە سەیرانەی پێکەوە لە قەراغی بیابان تەماشای کەرنەفاڵەکانی مردنیان دەکرد، شەوی ئاسایی نەبوون، دەشیزانی سروشتی شێتانەی ئەو کوڕە هیچ نییە جگە لە پەردەیەک بۆ شاردنەوەی کۆمەڵێک شتی دیکە، ڕەفتارە منداڵانەو نەفامەکانی ئاوێنەن بۆ قەدەرێکی تایبەتی. ئەو لە مێژبوو هەستیدەکرد کە لە خوێندا مەلەدەکات، دەیویست تا لەو خوێنە دەپەڕنەوە دەستی جەلادەت بەرنەدات، گوزارەی مەلەکردن لە خوێندا، گوزارەی ئەفسەرێک بوو لەو چەند ساڵەدا هەرجارێک بە مۆڵەت لە بەرەکانی جەنگ بگەڕایەتەوە دەهات بۆ لای دالیاو دەستی دەگرت و بە ترسێکی گەورەوە دەیگووت: دالیا، ئێمە لە خوێندا مەلەدەکەین، لە خوێندا مەلەدەکەین. هەندێجار لە کاتی سێکسکردنیشدا بە هەناسەی قووڵ و چاوی داخراوەوە ئەو گوزارە سەیرەی دەگووتەوە، دوای ئەوەی کە تەواودەبوو بە خاولییەکی سپی هەموو گیانی خۆی دەسڕی و وەک شێتێک خۆی لە چڵکێکی وەهمی پاکبکاتەوە یەک لەسەر یەک دەیگووت: ئێمە لە خوێندا مەلە دەکەین، ئێمە لە خوێندا مەلەدەکەین، ئێمە لە خوێندا مەلەدەکەین. دالیا لە مێژبوو دڵنیابوو کە هەموو ئەو ئادەمیزادانەی ئەو سەروکاری لەگەڵیاندا هەیە لە خوێندا مەلەدەکەن، دەشیزانی جەلادەت دەستی بە دەستی ئەوەوەیە دەبێت تا تینی تێدا بێت بیگرێت، دەترسا ئەو دەستی لێبەربدات نوقمبێت. ئەو کوڕە لەو زیاتر کەسی تری نەبوو، ڕاستە ئەو خۆی وا نیشاندەدا کە ژیانێکی سەربەخۆ دەژی، ئەمیش نەیدەویست وابزانێت بەبێ ئەم ناتوانێت بژی، لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەزانی بەبێ

چاوەدێری بەردەوامی ئەو، چۆن دەتوانێت بەردەوامبێت؟. ناسیاوەکانی لە باکوور چیرۆکی کاولبوون و خاپوورکردنێکی ترسناکیان دەگێڕایەوە، چۆن دەکرا منداڵێکی وا بگێڕێتەوە بۆناو ئەو کاولکارییە، منداڵێک کەسێکی نییە، پشت و پەنایەکی نییە. دەکرێت ونبێت و جارێکی دی بیگرنەوەو بیکوژن. لە باشترین حاڵەتدا لە بیاباندا وێڵدەبێتەوە، لە ناو وێنە ئاوێنەییەکانی ئەو شارەدا وندەبێت، ئەو شارەی کە وەک دووبارەبوونەوەی دەنکەکانی لم خۆی دووبارەدەکاتەوە، ئەو شارەی سەرابی خۆی لە سەرابی چارەنوسە تاریکەکانی ناویەوە وەرگرتووە. هەرێمێک هەموو مرۆڤێکی بەشێکی لەسەرابدایە، درێژکراوەیەکی لە جیگایەکی دیکەدایە. دالیا لەو باوەڕەدا بوو، هەندێک کەس هەن تەنیا بەشێکی ژیانیان لە وەهمەوە دەئاڵێت، هەندێکی تریش هەن لەسەرەتاوە تا کۆتایی منداڵی وەهمن. جەلادەت هەر لە سەرەتاوە وەک کەسێکی خەیاڵی ناو چیرۆکێک کەوتبووە ناو ئەو شارەوە. ئەو ئێستا لە گەرمای هاوین و لە دۆزەخی ناو ئەو ماشێنەدا هەستیدەکرد تەنیا بۆ لای جەلادەت دەگەڕێتەوە... دڵنیابوو گەر بژی دەبێت بۆ ئەو مێردمنداڵە بژی کە خودا دەزانێت تا چەندی دیکەش هەلی بۆ نارەخسێت ببێتەوە بە مۆسیقارەکەی جاران. هەستیدەکرد لە نێو دڵیدا، لە جەستەیدا نهێنییەک هەیە دەبێت پێش مردن بیدات بەو، لەو ساتەوەی لەو سەردابەوە هاتبووە دەرێ، دەنگی ئەو مردووانە هەمووی بەدوایەوەن. هەستیدەکرد ئەو ڕۆحانەی لە سەردابەکەدا ناسینی بوون بە هاوڕێی، لەو ماشێنەدا لەگەڵیدا سواربوون، لە دەرەوەی ماشێنەکەو لە بەر سوورە هەتاوی بیاباندا دەیانبینێت و دەستی بۆ بەرزدەکەنەوە، فایلەکانی خۆیانی نیشاندەدەن. دەیویست نەیانبینێت بەلام دەیبینین، دەیزانی هەمووی خەیاڵە، بەلام چما هیچ ئادەمیزادێک هەیە بتوانێت لە خەیاڵ ئازاد بێت، دەیزانی ئەو گەرمایەی ناو ماشێنەکە تووشی وڕێنەو هەلوەسەی دەکات، بەلام هێشتا ئەو وڕێنانەی پێباشتربوو لەوەی تەنیا سەیری دووبارەبوونەوەی

لمەکان بکات... ئەو چەند ساڵە ترسێکی قووڵی لە دووبارەبوونەوە تیا دروستکردبوو، دووبارەبوونەوەی گۆرانییەکان لە پرتەقاڵی سپی، دووبارەبوونەوەی موشتەرییەکان، دووبارەبوونەوەی بۆنی کوشندەی باروت و خوێن و زەلکاو لەسەر جەستەیان، دووبارەبوونەوەی ناکۆتای لم، دووبارەبوونەوەی بەردەوام و بێوچانی ڕەشەباکان بە هەمان ئیقاعی ترسناکی خۆیانەوە، بە هەمان ئاوازی غەمگینەوە. دووبارەبوونەوەی شارەکان، وەک یەکی کوچەکان، وەک یەکی جەلادەکان، وەک یەکی قوربانییەکان... خودای گەورە، خاوەنی زەوی و مەلەکووت هەموو شتەکان بە جۆرێکی بێمانا دووبارەدەبوونەوە. ئەگەر مردن دووبارەبوونەوەبێت ئەوا دەبێت ئەو مردبێت، لە دواجاردا کە بە کوچەکانی پایتەختدا دەگەڕا هەستینەدەکرد کە جیاوازییەکی لەگەڵ شاری تەپوتۆزی سۆزانییە زەردەکاندا هەبێت. کوچەکان بە جۆرێکی ترسناک لەیەکدەچوون، هەستیدەکرد هەموو فرۆشیارەکان لەبەریەک دروستکراونەتەوە، هەموو ئەو قوتابییانەی بەیانیان دەچوون بۆ قوتابخانەو دەهاتنەوە یەک کارخانە بەرهەمیهێناون، دەیبینی کوچەکان و فولکەکان و بورجەکان هەموو لە بەریەک دروستکراونەتەوە، ئەو پیاوانەی کە دەیانبینێت و لە بەردەمیدا خۆیان ڕووتدەکەنەوە، هەموویان لە یەک قالب هاتوونەتە دەرەوە.

دالیا لەو ڕۆژەوەی هاتبووە سەر سنووری ئەو سەحرایە، دەیزانی بیابان هیچ نییە جگە لە ئارەزوویەکی ترسناک بۆ دووبارەبوونەوە. لە بیاباندا تیشک خۆی دووبارەدەکاتەوە، لم خۆی دووبارەدەکاتەوە، سەراب خۆی دووبارەدەکاتەوە، شارەکان خۆیان دووبارەدەکەنەوە. لە شاری زەردی سۆزانییەکاندا چەندین جار بە هەموو ماڵەکان و کوچەکاندا گەڕابوو، دەیبینی دەموچاوی سۆزانییەکان خۆیان دووبارەدەکەنەوە، پێخەفەکانی خەویان، دۆشەکی غەمگین و ڕاخراویان لەسەر زەوییەکی ڕووت و ڕەق، مەرکانەی چلکنی ئاو و مەسینەی تۆزاویی و سەبەتەی هەلاهەلای

میوەهاتە سیسەکانیان خۆیان دووبارەدەکەنەوە، ئەو مێشە گەورانەی کە لەدەوری فەقیریی دەئاڵێن، هەمان ئەو مێشە گەورەو دڕندانەن کە وەک ئەوەی لە ئاوێنەدا زاوزێبکەن بەردەوام زۆردەبن، مێش کە هەندێجار وەک لمیان لێدێت، با لە زۆنگاوەکانەوە دەیانهێنێت و بە کوچەو شەقامەکانی ئەو شارەدا دەیانبات بۆ ئەوسەری زەمین، هێندە زۆردەبن دەبێت بەدەست لە هەوادا لایاندەیت ئەوسا بڕۆیت، هەموو شتێک خۆی بە وێنەی دێرینی خۆی دروستدەکاتەوە، مۆسیقارەکان... کچانی سەماچی کە بەردەوام پەڕۆی عادەکانیان بە تەنافەکانەوە بادەیبات. دووبارەبوونەوەی ئەو پیاوانەی ئیشیان کۆکردنەوەی ئەو پەڕۆیانەیە، لە شارە دوورەکانەوە بە تایبەت دێن و لە باکاندا دەوەستن و ئەو پەڕۆیانە لە هەوادا دەگرنەوەو وەک یادگار هەڵیاندەگرن، دووبارەبوونەوەی بۆنی بۆیەی نینۆکی شکاو لە سەر تاقەکان، ئەسیتۆنی ڕژاو بەسەر جلی ژێرەوەدا، بێخەوی دووبارەی ناو بێدەنگی شەو، قریشکەی دووبارەو هەمیشەیی ناو زوڵمەت کە هەرجارەی لە مۆتەکەی سەر سینەی ئافرەتێکەوە دێت، بۆنی فاسۆلیای و نۆکی تێکەڵاو لە سەر مەنجەڵێکی ڕەش، دووبارەبوونەوەی بۆنی خواردنی سووتاو لە سالۆنەکەی پرتەقاڵی سپییدا، هاواری دووبارەی ئەو کچانە کە بەردەوام نوکی تەوقەو چقڵی شانە و دەرزی شکاو دەچێت بە قاچیاندا، دووبارەبوونەوەی لە یادکردنی حەبی مەنع کە کچەکانی دەخستە مەراقی ڕەشەوە... لە هەمووشی بەدتر، دووبارەبوونەوەی لم لە پێڵاوەکەتدا... دووبارەبوونەوەی با لە ژێرکراسەکەتدا، دووبارەبوونەوەی جیرەی ڕەبابە لە خەونتدا، دووبارەبوونەوەی دەنگی تەپڵە بەدەوییەکان لەسەرتدا.

لەناو ئەو هەموو دووبارەبوونەوەیەدا تەنیا جەلادەت، وەک ئەوەی منداڵی سەر ئەستێرەیەکی تر بێت، بە نیگاکانی، بە فلووتەکەی، بە درۆ سەیرەکانی، بە گۆرانییە عەرەبییەکانی سەر زاری کە لە گۆرانی کەس ناچێت. تا ئێستا کەس وەک ئەو سەیری نەکردوە، سەیریدەکات و فلووتەکەی لێدەکەوێت،

ئاوڕ لەو دەداتەوەو خۆی دەدات بە کورسییەکدا، قسە لەگەڵ یەکێکدا دەکات و خەیاڵی لای ئەمە، ئیدی ڕستەکان تێکەڵاودەکات، کوردییەک قسەدەکات لە کوردی هیچ ڕۆحلەبەریکی تر ناچێت، عەرەبییەک تێکەڵاوە لە سیحریی زمان و هەڵەی زمان و گاڵتەکردن بە زمان. تەنیا جەلادەت دووبارەبوونەوەی هیچ بوونەوەرێک نییە، هەوڵدەدات لە شتەکان بچێت و ناتوانێت، لە نێوان خۆی و خیانەتکردندا لە خۆی مرۆڤێکی تر دروستبووە کە پڕە لە سەرسامی و پرسیار. ئەو تەنیا کەسێکە خەڵکی ئەو دەڤەرە نییە، هاتووە و دەڕوات... حەرف بە حەرف باوەڕی بەو چیرۆکەبوو کە سامیری بابلی دەیگێڕایەوە، چیرۆکی ئەو مۆسیقارانەی کە لە شارێکی دوورەوە دێن و مۆسیقارێکی نەناسی دەخەنە ئەستۆ، ڕاسپاردەیەکی دووری دەخەنە گەردن، دەیکەنە بەرپرسیار لە ژیانی کوڕێک کە شەوێک چارەنوسی دەکەوێتە دەستی ئەوەوە. خۆشی لە سەرەتای گەنجییەوە هەستێکی واژیابوو، دەیزانی ئەو هەرگیز منداڵی نابێت، نابێت بە دایک... خودایە ڕۆژێکیش چییە لە ژیانیدا خۆی وەها نەبینیوە بە کەڵکی ئەوە بێت ببێت بە دایک... لەگەڵ باسمیشدا جارێکیش باسی منداڵیان نەکردبوو، هەمووی قسەی هیچ بوو کە خەو بە منداڵەوە ببینن، هەردووکیان کالدویلیان دەخوێندەوە، تینسی ولیامزیان دەخوێندەوە، جۆن ئۆزبۆرنیان دەخوێندەوەو گاڵتەیان بە خێزان دەهات. باسم دەیگووت ئەدەب لە سۆفۆکلیسەوە، لە ئۆدیبی پادشاوە هیچ نییە جگە لە هیجایەکی بەردەوامی خێزان. بەلام لە قووڵایی دڵیدا، لە ناو شوێنێکی تاریکی دەرونیدا باوەڕێکی سەیری هەبوو کە ڕۆژێک دەتوانێت وەک دایک باوەش بە منداڵێکدا بکات، ئەو هەستە دایکانە سەیرەشی بەرابەر ئەو کچە منداڵانە هەبوو کە دەهاتن بۆ ئەو شارەو لە منداڵییەکی زووەوە لە تەپوتۆزە زەردەکانیدا وندەبوون، چەندەهاجار ویستبووی یەکێک لەو کچانە ڕزگاربکات، بەلام هەموو هەوڵەکانی بە خەسار دەڕۆیشت، زۆرجار کە کارەساتەکان کەڵەکەدەبن کە ژیان وەک کێڵگەیەکی مینی لێدێت، گرنگ

نییە بە کوێدا دەڕۆیت، قاچ لە کوێدا دادەنێیت، هەرچۆنێک بجوڵێیتەوە هەر دەبێت پێ بخەیتە سەر مینێک، هەر دەبێت بکەویتە ناو تونێلێکی کوشندەوە کە لە تاریکییەکی بێسنووردا دوایدێت. هەر دەبێت کارەساتێک بە ڕۆحتدا بتەقێتەوە. بەڵام دالیا لە جەلادەتدا ئەو کوڕەی دەبینییەوە کە خودا بۆی ناردووە... ڕەفتارە پیاوانەکانی جەلادەت زیاتر منداڵی و ناکامڵی ئەوی بەرجەستەدەکرد، کەسێک بوو لەیەکەم دەقیقەوە دەتوانی باوەڕی پێبکەیت. ئەو باوەڕی پێکردبوو، لە یەکەم دەقیقەوە مرۆڤ چۆن باوەڕ بە پێغەمبەرێک دەکات، ئاوەها باوەڕی پێکردبوو، سامیری بابلیش باوەڕی پێکردبوو، موسای بابەک نهێنی ترسناکی بۆ درکاندبوو... بە تەنیشت هەر کەسێکدا دەڕۆیشت دڵنیایی پەخشدەکردەوە، لە پرتەقاڵی سپییدا قسەکانی ژیانیان خۆشتر دەکرد. هەتا ئەو مۆسیقارانەی کە هیچ کەس لە ژیانیاندا پێی نەگووتبوون ئێوە عازیفێکی باشن، جەلادەت ستایشی گەورەی دەکردن. ئەو کچانەی کەس پێی نەگووتبوون ئێوە جوانن جەلادەت بەوەسفە سەیرەکانی دەیکردن بە جوانترین پەری. جەلادەت لە سەرەتاوە لەیەکەم ڕۆژەوە کە هاتبووە ناو ئەو شارە لەگەڵ مرۆڤەکاندا قسەی نەدەکرد، بەڵکو لەگەڵ خەونەکانیاندا قسەیدەکرد، لەگەڵ بەرزترین تەماحییاندا لە زیندەگیدا، لە کچە ناشیرینەکاندا شتێکی جوانی دەدۆزییەوە کە لەوێوە بچێتە ژووری و ستایشیانبکات، بە یەکێک لە کچەکانی دەگووت «فیجەنتی مالا»، کچێکی ناشیرین بوو، بەڵام جەلادەت لە بەردەمیدا دەچووە سەر چۆک و هەزار سوێندی دەخوارد کە ئەو لە فیجەنتی مالا جوانترە، بە یەکێکی دیکەیانی دەگووت؛ خانمی «نوش ئافرین»، سوێندیشی بە پەریزادەو فریشتەکان دەخوارد کە ئەو دەنگ و ڕەنگی نوش ئافرینیان تێپەڕاندووە، بە یەکێکی دیکەی دەگووت خانمی «سۆفی مارسۆ»... دالیا دڵنیابوو جەلادەت لەگەڵ خەونی ئەو کچانەدا قسەدەکات، لەگەڵ هیوایەکی دوورو ناڕاستیاندا کە ئەو دەهات و لە چرکەیەکدا بە ستایشێک کە باوەڕیان پێ دەکرد، بۆی

دەکردن بە حەقیقەت... وەک ئەوەبوو ڕۆحێک بێت لە دوورەوە هاتبێت و لە پرتەقاڵی سپییدا ئەو خەون و هاوارو هیوایانە سەوزبکاتەوە، کە لە ناو مرۆڤەکاندا مردبوون. سەرەتا دالیا لە هەموو شتێکی تورەدەبوو، کە لەگەڵ بەدرییە ڕەحماندا دەیبینی ئەو کچە دوپشکەی لەدەستی دەهات زەهر بکاتە خواردنەکەی دالیاوە، تەواو دەهری دەبوو. هەموو شتێکی قەبووڵ بوو ئەوە نەبێت جەلادەت، کوڕە پورە شیرینەکەی خۆی، چوکلێتەکەی پرتەقاڵی سپی «وەک کچان ناویان نابوو» لەگەڵ بەدرییە ڕەحماندا ببینێت، کە بە دووری نازانێت لەیەکەم فورسەتدا بیخاتە داوێکی خەتەرناکەوە تەنیا بۆئەوەی دڵی دالیا بشکێنێت. بەلام جەلادەت بەوەسفەکانی بە ستایشەکانی دەیتوانی هەتا ژەهری ئەژدیهایەکی وەک بەدرییە ڕەحمانیش ڕوونبکاتەوە و مەترسی نەهێڵێت.

لەو ڕۆژەوە دالیا دەیویست بە جۆرێکی تر بژی، دەیویست لەو شارەدا بژی و چیتر سۆزانی نەبێت، ئێستا قێزی لە هەموو پیاوەکانی دونیا دەهاتەوە، قێزی لەو ئاژەڵە برسی و خەوتووەی ژێر ناوکیان دەهاتەوە کە هەمیشە بۆنێکی پیستر لە زێرابی لێدێت، قێزی لە بۆنی بنباخەڵیان دەهاتەوە کە بە خوێنی جەنگ و عارەقی سەنگەرەکانی شەڕەوە دەیانهێنا بۆ ناو ژوورەکانی پرتەقاڵی سپی. ساڵوەختێک بوو موسای بابەک پێیدەگووت: وەرە و کۆمەکی من بکە، لەگەڵ مندا دەرزی لێبدە، دەرمانەکانی دەرمانخانەکەم بۆ ڕێکبکە، کە من دەڕۆم ئاگات لە هەندێک نەخۆشی تاک و تەنها بێت کە ناچار لە سەر قەرەوێڵەکان دەمێننەوە. بەلام دالیا هەمیشە لەدوای سێبەرو تارمایی ئەو کوڕەبوو کە لە هەر کوێیەکی دونیا بووایە دەهات و دەیدواند، ئێستا بە دوودڵییەوە باوەڕی بە مردنی باسم هێنابوو، فایلەکەی و بەرواری مردنەکەی هێند نزیکبوون دەگەڕایەوە بۆئەو کاتەی باسم لە خەونەکانی ئەودا ونبوو. باسم تا مردن هیوای بەو بوو، تا مردن. بەلام نەیتوانی هیچ بکات... نەیتوانی. ئێستا دەبێت چاوەڕوان بێت تا

ڕۆژێک لە سەرزەمینێکی تر و لە دونیایەکی تر یەک دەبیننەوە.

دالیا لە گەرمای باشووردا لە خۆی دەپرسی: چۆن مردووەکان یەکتری دەدۆزنەوە و چۆن لە یەکدی وندەبن؟. گومانێک سالانێک دواتر جەلادەت تالاوەکەی دەژی. سالانێک دواتر دەیەوێت دووبارە ئەو قەدەرە ڕەش و بێبن و تاریکە بشکێنێت کە دوو مرۆڤ مەحکومدەکەن تا هەتا هەتایە جودا لە یەکتر بژین.

* * *

ئەورۆژەی دالیا گەڕایەوە بۆ پرتەقالی سپی و فایلەکەی باسمی جەزائیری لە بندەستیدا بوو ڕۆژێکی غەمگین بوو. جەلادەت لە نیوەڕۆیەکی زووەوە لە بالکۆنەکەدا سەیری ئەو پەپولانەی دەکرد کە بە شێوەیەکی سەیر وەک هەوا دروستیانبکات و بیانبات لە هەوای بالکۆنەکەدا دروستدەبوون و دەتوانەوە. هەندێجار لەوە دەچوو ئەو پەپولانە لە بیابانەوە بێن و هەندێجاریش لەوە دەچوو هەر ڕاستەوخۆ لە ناو بالکۆنەکەدا دروستبن و لەویاشدا بمرن. لە بالکۆنەکەوە دەیتوانی بەشێک لەو ڕێگا دوورو درێژە ببینێت کە ڕێبوارەکان لە شەقامە گشتییەکەوە دەیانگرتە بەر بۆ گەیشتن بە پرتەقالی سپی. جەلادەت یەکەمجار دالیای لەسەر ئەو ڕێگایە بینی بە جانتایەکی قورس و فایلێکی ئەستوورەوە لە بندەستیدا، ئەو هەمیشە ئەوکاتانە دەگەیشتەوە، کە دەشگەڕایەوە دەچووە ژوورەکەی خۆی و تا سبەی بەیانی دەخەوت. ڕۆژی دوایی بەیانیان زوو بە کراسێکی تەنک و قژێکی هەڵچوو و نیگایەکی زامدارەوە دەهاتە سالۆنەکەو پەرداخێک چای گەورەو پاکەتێک ئەسپرینی بەدەستەوە بوو. جەلادەت ئەو بەیانیانە دەهاتەخوارێ و بەگەرمی پێیدەگووت: کچی پور چۆنیت؟. هەمیشە یەک وەڵامیدەدایەوە و دەیگووت: باش نەخەوتووم، لە مێژە باش ناخەوم، پێنج

سـالّیش دەبێت بـاش ناخـەوم.

ئـەو ڕۆژە کـە دالیـا گەیشـتەوە پرتەقاڵـی سـپی، ڕەنگـی بـە جۆرێکـی سـەیر سـپی بووبـوو، جلەکانیشـی پرتەقاڵـی بـوو، جـەلادەت بـە فانیلەیەکـی عەلاگـەی ڕەشـەوە، بـە مێش کوژێکی زۆر گـەورەوە، بـە زنجیرێک لـە ملیدا کـە لـە کۆتاییدا تووتییەکی زێڕینی پێوەبوو، لـە دەرگای ژوورەکـەی خۆیدا بانگی لێکردو گووتـی: هـا کچی پور، تۆ دەتەوێت شـێتمانبکەیت یان چی؟ مـن ئـەم ماوەیـە داخـی دووری تـۆم بـە مێشـەکان ڕشـتووە، هـا هـەر کاتێک ئەسـتێرەیەک بکشـێت، وادەزانـم ڕۆحـی جوانـی ئێوەیـە بـە ئاسـماندا بـەرەو لای ئێمـەی چکۆلانـەو غەمگین دێتـەوە، تەنیا بەبینینی فریشـتەکان لـە خـەودا تاسـووقی فیراقـی عەزیزانـی وەک ئێـوە دەشـکێت، تـۆ کـە خـۆت غـەریبەیت، دەبێت باشـتر لـە دەردی غـەریبی وەک مـن تێبگەیـت، تـۆ کـە خـۆت تەبیبـت دەوێـت، بـۆ زام دەکەیتـە ڕۆحـی ئێمـەی دڵشکسـتەو بیمـار.

دالیا کلیلەکانی لـە جانتـا سـپییەکەی شـانی دەردەهێناو دەیگووت: خودایە، ئەمجـۆرە بەلاغەتـە لـە کـوێ فێربوویـت، کـوڕم ئەمـە بەلاغەتـی مەلاکانـی سـەدسـاڵ لەمەوپێشـە.

دواجـار جـەلادەت دەیویسـت دالیـا بـە ڕوویەکـی خـۆش و بـە هەنـدێ وشـەی شـیرین پێبخاتـەوە ژوورەکـەی خـۆی، بـە جۆرێکـی شـەرمنتر لەسـەر ستایشـە عوزرییەکانـی خـۆی بـەردەوام دەبـوو، دەچـووە بـەردەم دالیـاو بـە چۆکـدا دەهـات و وەک ئەکتەرێـک لـە شـانۆگەرییەکی کلاسـیکیدا ڕۆڵ ببینێت دەیگووت: بەڵـێ ئـەی خانمـی زیـزم، وادانـێ ئەمـە بەلاغەتـی ڕۆژگاری بابەتاهیـری عوریانـە، ئـەو شـاعیرە بەدبەختـەی تـا ئێسـتا خۆشـی نازانێت شـاعیری چ نەتەوەیەکـە لـەم نەتـەوە سـەر لێشـێواوانەی ئـەم دەڤـەری جەنـگ و ئاگـرە. بـەڵام ئەمـەی مـن دەیڵێم بەلاغەتـی عاشقێکە کـە خوێنـی دڵـی خـۆی دەخواتـەوە، فرمێسـکی خـۆی دەنۆشـێت.

دالیـا پێیدەگـووت: جـەلادەت بێدەنـگ بـە... تـۆ هەمیشـە کاتێـک خـۆت

دەکەیتە لیبۆک کە من تاقەتی پێکەنینم نییە. وەرە، دڵی من، واز لەمانە بهێنە، ئاە ئەگەر دەتوانیت ئەو جانتایەم تا ژوورەوە بۆ هەڵگری، بەقوربان، تینم نەماوە، تینم نەماوە هەتا ناتوانم جانتاکانی خۆشم هەڵگرم. گەرما دەمکوژێت، دواجار دەزانم من گەرما دەمکوژێت... هەر کاتێک بە ژێر ئەو خۆرەدا دەڕۆم حەزدەکەم بمرم. تۆ گووتت چی، گووتت کە من وەک کشانی ئەستێرەیەک وەهام... تۆ ڕاستدەکەیت، ئاە خوای گەورە، من لە کشانی ئەستێرەیەک دەچم، بەڵام جەلادەت ئەستێرەیەک لەمڕۆوە کوژاوەتەوە، دڵی من وەرە، زۆر شتم هەیە بۆتی باسبکەم، ئازیزم، جانتاکەت بۆ هەڵناگیرێت؟ وازی لێبهێنە... زۆر شتم هەیە بۆتی بگێڕمەوە. لەمڕووەوە من دەڕۆم... ئیشوکارەکانی خۆم ڕێکدەخەم و تەواو، ئاە حەزم لە چایە، با چاکەتەکەم داکەنم، باری تەعالا ئەو سوورە هەتاوەی هاوین کە مرۆڤ بە زیندوویی دەبرژێنێت، لەم ژوورەی من فێنکترە. تۆ باسی خۆتم بۆ بکە، باسی خۆتم بۆ بکە... دووبارە پێمبڵێ: تۆ بەڕاست بیری ئەم کچە پورە غەمگینەی خۆت دەکەیت، یان وەک هەمیشە درۆزنێکی فێڵزانی کە هەموو درۆی دنیا دەکەیت تا دڵی کچێک بشکێنیت؟.

جەلادەت دەیگووت: من دەتوانم درۆ لەگەڵ مانگ و ئەستێرەکاندا بکەم، دەتوانم درۆ لەگەڵ زەمین و ئاسماندا بکەم... بەڵام خانمی سیراجەدین، ئەی کچێک پێکەوە چیرۆکی عەشق لە نێوانماندایە، ناتوانم درۆت لەگەڵدابکەم.

دالیا دۆسییە گەورەکەی باسمی دەخستە سەر کتێبخانەکەی و دەیگووت: جەلادەت گوێبگرە، بۆ من هەموو شتێک تەواو، من ئیتر بۆ تۆ دەژیم، یەعنی چەند بتوانم ئاگام لە تۆ دەبێت.

ئەو ڕۆژە دالیا سیراجەدین بە هێمنی دەستی بەقسەکردن کرد، زۆر بە هێمنی، بەڵام زۆری نەبرد وەک ئەوەی ڕەشەبایەکی ناو ڕۆحی بەرەڵابکات دەستیکرد بە گریان، واتە پێش ئەوەی جەلادەت لە حیکایەتەکە تێبگات، لە نێوان هەنسکەکانی دالیادا هەندێک وشەی گرتەوە کە پێکڕا مانایەکیان

نەدەدا بەدەستەوە، وەک وشەگەلی لە بابەت «سەرداب، شەو، مولازمێکی ڕەشتاڵە، مۆزەخانە، فایل، باسمی جەزائیری، فەخرەدین سیراجەدین عەبدوڵا، ماسییەکان لە باشووری پاسفیک، لاشەی من لە فوراتدا». کە دەگریا ئیدی دەبایە ڕایوەشێنیت، دەبایە بە هەموو هێزی خۆت زللەیەکی لێبدەیت، بە هەموو توانای خۆت هاواربکەیت بەسەریدا ئەوسا ئارام دەبووەوە. بەڵام جەلادەت دەستەپاچە بە دیارییەوە دانیشت و تەماشای ئەو هەنسک و گریانە هیستیرییەی دەکرد، دەیزانی دەبێت شتێک بکات، بەڵام نەیدەکرد، دالیا لە نێو هەنسکەکانییەوە بەردەوام دەیگووت «دەمەوێت بمرم... دەمەوێت بمرم».

جەلادەت هێشتا لەو تەمەنەدا نەبوو کە بزانێت مرۆڤ چۆن ئافرەت لە کاتی فرمێسک ڕشتندا دەلاوێنێت، چۆن بە ئارامی دەیگرێتە ئامێز، چۆن سووک باڵ بەدەوریدا دەهێنێتەوە، وەک ئەوەی ڕۆحێکی ناسکی لە باوەش گرتبێت، بەجۆرێک لە دڵە شکاوەکەی کچدا هەستێک دروستببێت کە ئەو مەخلوقێکی شوشەیی ناسکەو تەنیا تۆ دەزانیت چۆن ئەو دڵە شوشەیە هەڵگرێت تا نەشکێت. گرنگترین شت لەو کاتەدا ئەوەیە ئافرەت تێبگات کە تۆ دەزانی دڵی ئەو چەند شکاوەو تۆش دەزانیت چۆن بە ناسکی پارچەکانی بنێیت بەیەکەوە، کەسێکی هەوڵدەدەیت ئەو دڵە زێڕینە گەردێکی تر نەگرێت، هێند بە ئارام و وریایانە باوەشی پیادەکەیت، وەک ئەوەی بەو هێمنی و ناسکییەت مەرهەمێکی سیحراوی بخەیتە سەر ئەو دڵە شکاوە تا هەموو بەشەکانی یەکبگرنەوە. بەڵام جەلادەت جگە لە زمان، هیچ کردەیەکی شاعیرانەی تری نەبوو، دەوەستاو تەماشای دالیای دەکرد، باوەڕی وابوو تەنیا زللەیەکی ڕەشەبا ئاساو هیستیریی وەک گریانەکانی دالیا خۆی دەتوانێت ئارامیبکاتەوە، خەیاڵی بۆئەوە نەدەچوو کە پەنچەیەکی ناسک، مەلمەسێکی هێمن، دەست بەسەرا هێنانێکی شاعیریانە دەتوانێت هەموو شتێک لە دڵی کچدا بگۆڕێت. جەلادەت لەو ژوورەدا وەک بتێکی

گەمژە دەوەستاو تەماشایدەکرد. کەس نازانێت دالیا ئەو ڕۆژە چەند گریاوە، بەلام بە حیکایەتی جەلادەت خۆی، گریانەکەی چەندین سەعاتی خایەندووە، گریانێک لەوانەی کە مرۆڤ هەستناکات لە دڵی غەمگینی ئادەمیزادێکەوە دێت، بەڵکو هەستدەکات لە کانییەکی ئەزەلی فرمێسک لە مەلەکووتەوە هەڵدەقوڵێت. بەدرێژایی ئەو چەند سەعاتە دالیا خۆی دەدات بەسەر ئەو قەرەوێڵەیەدا، دەموچاوی لە ناو بالیفەکەدا دەشارێتەوەو دەگری، جەلادەتیش بە ژوورەکەدا دەسوڕێتەوە، یان مێش دەکوژێت یاخود سەیری کتێبەکان دەکات، یان لەسەرەخۆ بە دالیا دەڵێت: هۆو دالیا، ئیدی بەسە مەگری. کچی پور، تۆ بۆ وادەکەیت، یەعنی ئێستا دەتوانم چی بۆ تۆ بکەم.

کە دالیا ژیردەبێتەوە، هەڵدەستێت و بە ئارامی دەست بەسەری جەلادەتدا دەهێنێت و دەڵێت: دواجار گوڵی من، تەنیا فریشتەکان دەتوانن ژیرمبکەنەوە. کە ئارامدەبێتەوە وەک ئەوەیە مەخلوقێکی تر لە خوێنەکەیدا هەستابێتەوە. وەک ئەوەیە بووبێتە مرۆڤێکی تر، بووبێتە ڕۆحێک کە لە کانییەکی سروشتی پاک خۆی شت بێت. دالیا ئیتر بە حەرفی ڕوون قسەدەکات. باسی ئەگەرەکانی مردنی باسمی جەزائیریی بۆدەکات، باسی ئەو سەفەرە درێژەی خۆی بۆ دەکات بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، سەفەرێک لە یەک کاتدا لە چەند جیهانێکی جیاواز جیاوازدا ڕوودەدات. سەفەرێک لە دونیای ئاگایی و حەقیقەتدا، سەفەرێکی دیکە لە دونیای بێئاگایی و خەیاڵدا، سەفەرێک لەم سەر زەمین و جوگرافیا ئاشنایەی ئێمە ڕۆژانە تیادەژین، سەفەرێکی دیکە لەسەر زەمین و جوگرافیایەکی تر کە تەریب بە دونیای ئێمە درێژدەبێتەوە. سەفەرێک لە ناو هەستە سادەو ڕووکەشەکانماندا، سەفەرێکی تر لە ناو ئەو توانا سیحراویی و قووڵ و نائاساییەی کە بە نهێنی لە ناوماندا دەژی.

سەری جەلادەت دەخاتە نێو دەستییەوەو دەیلاوێنێت، بەو هێمنییە

کوتوپڕەوە کە زۆرجار لە ناکاو لە نیگاو دەنگیدا دروستدەبوون، دەیەوێت نیگاهی خۆی سەبارەت بە فاجیعەکان بۆ باسبکات. پێیوایە هەموو برینێکی قووڵ، سەدایەک دروستدەکات کە هەرگیز دەنگدانەوەی کۆتایی نایەت. دالیا ڕای وابوو لە زەمەنی کارەساتە گەورەکاندا، کە بەردێکی ترسناک بەر ئەو گۆمە گەورەیەی ژیان دەکەوێت، مرۆڤ گەر بڕوانێت ئەو شەپۆلانە دەبینێت کە تا ئەبەد دەڕۆن و دەگەڕێنەوە. هەرگیز لە فەزاکان و شوێنەکان و کاتەکاندا ونناین، نە مردن دەیانوەستێنێت و نە دوورییە ناکۆتا و نەناسراوەکان. ئەو شەپۆلانەی وەک هەڵچوون و داچوونی دەریایەکی گەورە وەهان، دێن و دەڕۆن، دێن و دەڕۆن، دێن و دەڕۆن. بە جۆرێکی هێند توند دەجوڵێنەوە ئەو ئەندازەیە تێکدەدەن کە لە خەیاڵی ئێمەدا مردن لە زیندەگی جیادەکاتەوە. کە دێن لەگەڵ خۆیاندا بڕێکی زۆر لە ژیان ڕادەدەن و دەیبەن بۆ مەرگ، کە دەگەڕێنەوە بڕێکی زۆر لە مردن لەگەڵ خۆیاندا دەهێننەوە. هەندێجار شەپۆلەکان بە جۆرێک تێکەڵاودەبن هەندێکیان بە ئاڕاستەی ناوەوەو هەندێکیان بە ئاڕاستەی دەرەوە دەڕۆن، ئەوەی لە ئەبەدییەتەوە دەگەڕێتەوە بەر ئەو شەپۆلانە دەکەوێت کە بەرەو ئەبەدییەت دەڕوات، ئەوەشی بەرەو ئەبەدییەت دەڕوات بەو هاوارانە تێکەڵدەبێت کە لە ئەبەدییەتەوە دێتەوە.

دالیا ڕای وابوو، لە وڵاتی ئێمەدا کە بەردەوام بەردی گەورە گەورە بەر ژیان دەکەوێت، بروسکەی سەیر سەیر بەر ئەو گۆمە چکۆلانەیە دەکەوێت، ئەو ئەندازە دێرین و نەگۆڕەی ژیان و مردن بەجۆرێک تێکدەچێت، وەک ڕوخانی چەند شورایەکی لێدێت کە دوو ئاوی جودا لە یەکتر جیادەکەنەوە. لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دەوەستا، دەستی بەرزدەکردەوە، کراسە سپییەکەی و تەنوورە پرتەقاڵییەکەی ڕێکدەکرد، دەستی بە قژیدا دەهێنا و دەیگووت سەیرکە جەلادەت من دەسوڕێمەوە، دەسوڕێمەوە، دەسوڕێمەوە وەک دوا پارچە سەما، وەک دوا بزاوتی سەماکەرێک لەسەر سەحنەیەکی

گـەورە، دەسـوڕێمەوەو هـەوا جلەکانـم دەبـات، دەسـوڕێمەوەو مۆسـیقایەکی شـێت کۆتایـی ئـەم سـەمایە ڕادەگەیێنێت، بـەلام لـە کاتـی سـەماکەدا مۆسـیقا دەمبـات، دەمبـات بۆ دوور، دوورتـر لـە هـەر جێگایەک هەسـت و نەسـتەکانمان تێیبگات، من هـەر دەسـوڕێمەوە، من هـەر سـەمادەکەم، ئـەو مۆسـیقایە لێرەدا لـە نـاو دەمارەکانمـدا هـەر لێدەدات، لـە چرکەیەکدا ئیتـر تێناگـەم ئاخـۆ ئـەو مۆسیقایە لـەدەرەوە هـەر بەردەوامـە یاخـود نـا، دەزانـم ئـەو مۆسیقایە لـە نـاو جەسـتەمدا هـەر لێدەدات... لێدەدات. کـە چاودەکەمـەوە لەسـەر زەمینێکی ترم، بەلام من هیچ ناکـەم جگـە لـەوەی کـە سـەمادەکەم، سـەمادەکەم، سـەمادەکەم.
جـەلادەت مـردن ئەوەیـە، مـردن ئەوەیـە تـۆ سـەمادەکەیت و لـە نـاکاو چاوتدەکەیتـەوە و دەبینیت لەسـەر زەمینێکی تریت، شـەپۆلێک لـە شـەوێکی تاریکـدا هەڵیگرتوویـت، کـە ڕۆژ دەبێتـەوە، کـە جارێکـی دی یەکـەم تیشـکی ڕوناکیـت بەردەکەوێـت دەبینیـت، تـۆ چوویـت بـۆ خاکێکـی تـر. هەندێجـار کـە هاوارێـک لـە گەروتـدا بێـت، بێئـەوەی چاوبکەیتـەوە شـەپۆلەکان بـە دەم سـەماکردنەوە دەتهێنـن و دەتبـەن، جارێـک دەپەڕێیتـەوە بـۆ سـەر زەمینـی مـردن و جارێـک دەگەڕێیتـەوە بـۆ ژیـان.

ئـەو ڕۆژە دالیـا بێوچـان قسـەیدەکرد، سـەمایدەکرد، پێدەکەنـی، دەگریـا. هەندێجاریـش وەک مامۆسـتایەک یەکێـک بـۆ گەشـتێکی ترسـناک بـە خاکـی مردنـدا ئامادەبـکات قسـەی لـە هاتوچۆیەکی بێئەندازە درێژدەکـرد لـە نێوان دوو زەمینـدا کـە جیاوازیـان تەنیا وەک جیـاوازی نێوان دوو مەملەکـەت وایـە. حیکایەتەکانی ئـەو ژێـر زەمینـەی دەگێڕایـەوە، چیرۆکـی ئـەو کوژراوانـەی بـە دوای حیکایەتـی مردنـی خۆیانـدا گەڕابوونـەوە بـۆ ژیـان. باسـی ئـەو کچـە چکۆلانەیـەی کـە قژی بـە گوڵـی یاسـەمین دەڕازانـدەوە و نـاو دۆلابـەکان بۆ فایلی خۆی و باوکی و خوشکەکانی دەگەڕا. ئەو پیاوە پیرەی لـە سـوچێکدا دۆسـییەی هەمـوو کوڕەکانـی یـەک لـە دوای یـەک دەدۆزییـەوە. ئـەو گەنجـەی هـەر کەسـێک فایلەکـەی دەگـرت بەدەسـتییەوە دەسـتی خوێنـاوی دەبـوو، ئـەو

دۆسیەیەی هەر دەتکردەوە ڕەشەبایەکی تۆزاویی هەڵیدەکرد و گلێنەکانتی پڕدەکرد لە تۆز، ئەو فایلەی بۆنی گۆڕێکی لێدەهات تازە هەڵدرابێتەوە. ئەو فایلەی دەتکردەوەو لاپەڕەکانی هاواریاندەکرد، پەنچەت بۆ هەر پەڕەیەکی دەبرد وەک جەستەیەکی بریندار دەیقیژاند.

چیرۆکەکانی دالیا مایەی سەرسامی جەلادەت بوو، هەندێجار وای هەستدەکرد دالیا خاوەنی فەنتازیایەکی ڕەشە. ئەوەی سەیربوو ئەو بڕیارەی بوو کەواز لە گۆرانی و سەما بهێنێت، واز لەوە بهێنێت وەک سۆزانییەک بژی، تا ئەوکاتە هەرچییەکی کردبوو بۆئەوەبوو باسمی جەزائیری ئازادبکات، هەرچییەکی کردبوو بۆ ئەوەبوو لە ڕێگای لەشی خۆیەوە ئەو قەڵا تاریکانە ببڕێت و بشکێنێت کە بە سەختترین دەزگاکانی سیخوڕی دونیا نەدەبڕدران، ویستبووی بگاتە ناو تاریکترین و نهێنیترین زیندانەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە. سەفەرێک بکات سەختتر لەسەفەری پاڵەوانی ئەفسانە گریکییەکان بۆ دونیای خوارەوە، سەختتر لەسەفەری پاڵەوانی ناو چیرۆکە خەیاڵییەکان بۆ سەر ئەستێرەیەکی دوورو پڕ درندە. دالیا لەو سەفەرەدا هەموو نهێنی و کەلێن و سوچەکانی ئەو ماشێنە جەهەنەمییەی بینی بوو کە وڵات دەباتبەڕێوە، گەیشتبووە زیندانە زۆر تاریکەکان، گەیشتبووە شوێنە زۆر نهێنی و نەزانراوەکان، بەڵام هەرچەند دەگەیشتە جێگایەک کە پێی وابوو ئەوە دوا هەرێم و دوا وێستگەیە، شوێنی قووڵترو تاریکترو نهێنیتری لە ژێر قاچی خۆیدا دەبینی، بە جۆرێک نەیدەزانی ئەو ڕۆچوونە بە ناو ژوورەکانی ئەشکەنجە و زیندان و گۆڕستانەکاندا لە کوێدا دواییدێت. تا ڕۆبچووایە ئەو شانشینی مردن و تاریکییە قووڵترو قووڵتر دەبووەوە. هیچ جێگایەک نەبوو کە ناوی خاڵی سەرەتاو خاڵی کۆتایی بێت، بەڵکو داچوونێکی ترسناک هەبوو تا ئەبەد بە ناو گوزەرێکی تاریکدا کە ڕۆژ دوای ڕۆژ ئاڵۆزتر و لقدارتر و فرەباڵتر بەرەو ناو ئۆقیانوسێکی بێبن لە نهێنی دەکشا. ئەوانەی لەو جیهانە ئاڵۆزو پڕ نهێنییەدا وندەبوون هێزێک

نەبوو بیاندۆزێتەوە، چونکە لە بنەڕەتدا بوونەوەرێک نەبوو بتوانێت بزانێت لە هەموو بەشەکان و لقەکان و ژوورەکانی ناو ئەو ئامێرە گەورەیەدا چی هەیە… ئیدی گەڕان بە دوای یەکێکدا دواجار ونبوونێکی بێسەروبن بوو لە گەورەترین و ئاڵۆزترین گمۆکەی سەر ئەم ئەستێرەیەدا. وەک ئەوەبوو لە ناو ملیونێک بازنەدا ونببیت کە هەر یەکەیان لە هەزارەها ژوور دروستبووە، هەر ژوورەو کۆدی نهێنی و شفرەی تایبەتی هەیە بۆ کردنەوەی دەرگاکانی، بە جۆرێک سەرنشین و بەرپرسیارانی هیچ یەک لەو ژوورانە ناتوانن بزانن چی لە ژوورەکەی تردایە. دالیا لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا دەرگای هەزاران ژووری کردبووەوە، بەڵام نەیدەزانی ئەو شوێنانەی ئەو دەستی پیاپاگەیوە لەسەدا چەندی تەواوی ئەو سەرزەمینی نهێنییە پێکدەهێنن. نەیدەزانی چەند قات بەو ژێر زەمینە تاریکەدا ڕۆچۆتە خوار، دواجار یەکێک لە ئەفسەرەکان پێیگووتبوو، هیچ کات جۆرە پرسیاری وەها لە خۆت مەکە، چونکە هیچ ئادەمیزادێک نییە بزانێت خۆی لە کوێی ئەو ئامێرەدایە، بزانێت شوێنی لەو ئامێرەدا چەند گرنگە. چەند کەس لەخوار ئەوەوەن و چەندی تر لەسەروو ئەوەوەن. دالیا هەستیدەکرد لەو گەشتەدا نهێنی گەورە گەورەی سەبارەت بە ئیشی هەموو ئەو ئامێرە ترسناک و زەبەلاحە دۆزیوەتەوە، نهێنی گەورەی لەسەر پیاوە ترسناکەکانی ناو ئەو ئامێرە فێربووە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو ڕەنجە گەورەیەشدا، لەگەڵ ئەو ڕێگا پڕ مەترسی و کوشندەیەدا نەگەیشتبووە هیچ، چونکە لەو گەشتە ئاڵۆزەیدا هەرگیز نەکەوتبووە سەر ڕێگایەک بیگەێنێتەوە بە باسمی جەزائیری. ئەوەی لە سەفەری ئەو چەند ساڵە دەستی کەوتبوو، ئەو دۆسییەیە بوو کە بە هەموو گەرمای باشووردا هێنابووی بۆ پرتەقاڵی سپی. ئێستا هەستیدەکرد درێژەدان بەو سەفەرە مانایەکی نییە، ئەو هەموو ژیانی تەنیا ڕۆڵی سۆزانی بینی بوو، چونکە دەیزانی ئەو پیاوە دڕندانەی ئەو دەزگا سامناکە دروستیکردون تەنیا لەشی ئافرەت چۆکیان پێدادەدات،

تەنیا ئەو شەهوەتە دیل و چەوساوەیەی ناویان وایان لێدەکات خیانەت لەو ئامێرە زەبەلاحەبکەن. تەنها شتێک بەمرۆڤەوە دەیانبەستێتەوە نە دڵیانە، نە هۆشیانە، نە عەقڵ و خەیاڵیانە، بەڵکو ئەو پارچە گۆشتەیە کە وەک مۆمێکی هەڵگەڕاوە هەمیشە لە ناو پانتۆڵەکانیاندا دەسووتێت. ئەو سۆزانی نەبوو، خولیای ئەوەی هەبوو ببێت بە وەرگێڕ لە یەکێک لە بنکەکانی وەرگێڕان، ببێت بە ڕۆماننوسێک و ژیانی خۆی بگێڕێتەوە. ببێتەوە بە مامۆستای ئینگلیزی و بڕوات لە کوردستان، لە شاری منداڵی خۆی وانە بڵێتەوە. بەڵام ئەو خولیایانە چیتر سوودی نەبوو، سەعاتێکی نهێنی لە ناوەوە ئاگاداریدەکردەوە کە دەبێت ئاگاداربێت چونکە مردن لێوەی نزیکە. هاتەوە بۆئەوەی ئەمجارە بە جۆرێکی تر لە پرتەقاڵی سپی بژی. باوەشیدەکرد بە جەلادەتدا و دەیگووت، لەبەر تۆ ئەم شارە جێناهێڵم، دەترسم ڕۆژێک تەپوتۆزەکان بتبەن، دەبێت ئاگادارتبم.. جەلادەتیش نەیدەویست بڕوات. ئەو جەلادەتی وەک کوڕە منداڵەکەی خۆی سەیردەکرد، ئەگەرچی لە یەکەم ڕۆژەوە دەزانێت کە خۆشی دەوێت، ئەگەرچی لە ناو ڕۆحیدا هەندێجار هەستە کچانەو هەستە دایکانەکانی تێکەڵدەبوون، لەوە دەترسا لە ساتێکی تێکەڵاوی و سەرلێشێواندا، هەستەکانی بە جۆرێک لەدەستبدات تەسلیمی وەسوەسەکانی بێت و دوای تەماعەکانی جەلادەت بکەوێت، کە دەیویست وەک عەشیقەیەک لە ئامێزیدا بێت. لە یەکەم ڕۆژەوە دەیویست زۆر زۆر لێی نزیک بێت و زۆر زۆریش دووربێت، عەشقی کچان هەمیشە ئاوەها پڕە لە داواکاری ئەستەم و نەکردە. لەیەککاتدا نزیکی و پێچەوانەکەشیان دەوێت، دووری و پێچەوانەکەشی، خۆشی و پێچەوانەکەی، ئازارو پێچەوانەکەشی.

داڵیا ڕۆژی دوایی شتەکانی کۆکردەوەو چوو بۆ لای موسای بابەک. بەڵام سوێندی خوارد کە هەتاهەتایە ئاگای لە جەلادەت بێت، هەموو هەفتەیەک بێتەوەلای، جەلادەتیش هەر کاتێک ویستی دەتوانێت بچێتەلای، چونکە ئەو دواجار لە بەر خاتری ئەو لەو تەپوتۆزەدا دەمێنێتەوە. چۆڵکردنی

ژوورەکەی دالیا لە پرتەقاڵی سپی پڕبوو لە سۆزو عاتیفەی گەرم، هەموو مۆسیقارەکان و کچە سەماچییەکان گریان، جەلادەت لە هەمووان زیاتر گریا. پیکابێکی سپی چڵکن هەموو کتێبەکانی دالیای گواستەوە بۆ بیمارستانە چکۆلەکەی موسای بابەک، جلەکانی خۆی بەسەر کچەکانی پرتەقاڵی سپییدا بەشکرد، تەختی خەوتنەکەی بەخشی بە مۆسیقارێک کە چەندین مانگ بوو لەسەر زەوییەکە دەخەوت. کە دالیا ڕۆیشت غەمێکی ترسناک باڵی بەسەر هەموو پرتەقاڵی سپییدا کێشا. سەمەر ساڵح و مێردە باریکەکەی لە هەموو کەس غەمگینتربوون، کە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا پەیوەندییەکی سەیریان لەگەڵ ئەو کچە چاونەترسەدا پەیداکردبوو کە بوو بوو بە هاوڕێیەکی نزیکیان. بەڵام موسای بابەک دڵخۆشترین کەس بوو بەو بڕیارە، ئەو پیاوە پڕخەندەو حیکمەتە پێیوابوو لە دالیاو جەلادەتدا دوو شتی گەورەی دۆزیوەتەوە کە پێشتر بەدرێژایی ژیانی لێی مەحروم بووە.

* * *

کە جەنگ کۆتایی هات، چەندین هەفتەبوو دالیا لای موسای بابەک کاریدەکرد، کۆتایی جەنگ کوتوپڕو چاوەڕواننەکراوبوو، ئێرانییەکان یەک لایەنە قەبووڵی یاداشتێکی نێودەوڵەتی کۆنیان کرد، لە بەرەکاندا بە چەشنێکی خێراو نائاسایی کە هیچی لەگەڵ ئەو عینادە دێرینەیاندا نەدەگونجا پاشەکشێیانکرد، لە هەر شوێنێکەوە بستێک هاتبێتنە پێشەوە گەڕانە دواوە. پاشەکشەی ئێرانییەکان غوبارێکی ترسناکی لەسەر سنوورەکان جێهێشت، لەگەڵ لەشکرە شکستە و براوەکاندا تارمایی هەزارەها سەربازانی کوژراو لە سەنگەرەکانی مردن هەستان و کۆڵەپشتەکانیان هەڵگرت و گەڕانەوە بۆ ماڵ، لە ئەمبەرەو بەری سنووردا مارشێکی سەیر دەستی پێکرد، مارشێکی هێمن، غەمگین، پڕ ئەفسوس. لە هەردوولاوە سەربازە مردووەکان

لـە خاکـی یەکتـردا هەڵدەسـتانەوە، قەیتانـی پۆسـتاڵەکانیان دەبەست، کڵاوە سـەربازییەکانیان دەکـردە سـەر، تەپوتـۆزی مردنیـان دەسـڕی و ڕوویـان وەردەگێڕاو دەگەڕانەوە بۆ نیشتیمان. سەربازو گوردانە زیندووەکان بە خەتی ئاشکراو ڕێگای ڕێک و زەمینی دیاریکراودا دەگەڕانـەوە، بـەڵام مـردووەکان دەبایـە بـە هەمـوو پیدەشت و چیاو کێڵگە تاریکەکانـی شـەودا بڕۆشـتبانایە، هیچ ڕێگایەکی تایبـەت نەبوو لەوێوە پاشەکشـەبکەن، هیچ ئەفسـەرێک نەبوو فەرمانیـان بداتـێ چـۆن بـڕۆن، هیـچ گـوردان و وەحدەیـەک نەبـوو خۆیانـی پێبناسـێنن، لەبەرئـەوە ئازادانـە لـە قووڵایی خاکـی دوژمنـەوە هەڵدەسـتان و بـە نـاو گەرمـای کوشـندەی ئابدا، بـە نـاو ئـەو خاکـەدا کـە هێشـتا لـە برینـە دێرینەکانییـەوە تـۆز هەڵدەسـتا، بـە نـاو زەریاچـەو جۆگەلـەو جۆبارەکانـدا کـە تـا ئـەوکات دەنگـی تەقینـەوەی خەیاڵـی لـە نـاو وردە شـەپۆلەکانیاندا مەلەیدەکـرد. لـە ڕێـگا مردووەکانـی هـەردوولا بـە ڕەو ڕووی یـەک دەهاتـن و سـڵاویان لـە یـەک دەکـردو بـە هێمنـی بـەلای یەکـدا تێدەپەڕیـن. سـەدان هـەزار مردووبـوون کـە دەگەڕانـەوە بـۆ نیشـتیمانێک مەرگی ئـەوان هیچی تیا نەگۆڕیبـوو، ڕێـگاکان هەموویـان لـە جێـگای خۆیـان بـوون، ئەسـتێرەکان لـە جێگای خۆیـان بوون، گـردە چکۆلـەکان لـە جێگای خۆیـان بـوون، کانییـەکان و درەختـەکان، هەتـا باڵندەکان هەموویـان لـە جێگای خۆیان بوون... سـەفەری گەڕانـەوەی مـردووەکان بـۆ ماڵـەوە سـەفەرێکی درێژ بـوو، هیـچ کـەس نەبـوو پرسـیاری لێبکـەن، بەبێدەنـگ بـە سـەر مەرزەکانـدا دەپەڕینـەوە، بـە شـەو بـە نـاو کێڵگـەی تەماتـەو باغـی خورمـاو مـەرەزەی ئاودارو بێسـتانی میوەهاتـدا دەهاتـن. ئەوانـەی زوو گەیشـتنەوە سـەرجادەکان، یەکەمیـن دەسـتەبوون کـە تێگەیشـتن ئـەوان نابنـەوە بـە نیشـتەجێی ئـەو ئاوەدانـی و خـاک و شـەقام و کێڵگانـە، بـەڵام شـەپۆل لـەدوای شـەپۆل دەهاتـن و تێکـەڵ بـە ژیـان دەبوونـەوە، تەنهـا ئەوانـەش دەیانبینیـن کـە دەیانتوانـی نـاو جەرگـەی تاریکـی ببینـن. ژمارەیـان هێنـد زۆربـوو، جیاکردنـەوەو هەڵاوێردکردنیـان کارێکـی نەکردەبوو.

هەموو بەر لەوەی بگەنە بەر قاپی ماڵەوە دەیانزانی نابێت لەدەرگا بدەن، نابێت کەس بەئاگا بهێننەوە، نابێت هیچ شتێک بجوڵێنن. دەیانتوانی بوەستن سەیری قاپی کۆنی دەرگاکانی ماڵ بکەن، سەرکەونە سەر سەربان و لەوێوە لە حەوشە کۆن و غەمبارەکانی منداڵیان بڕوانن، بچنە ژوورەکانەوە، دایکیان ببینن، منداڵە خەوتووەکانیان ماچبکەن، دەست لە قژی ژنەکانیان بدەن کە تەنهایی سپی کردوە. بەڵام نەدەبوو هیچ مەخلوقێک لە خەوهەستێنن، خۆیان لە هیچ شتێک بدەن، ئاسەواری دەستیان لەسەر هیچ پەنجەرەیەک جێبهێڵن. دەیانتوانی ئاو بخۆنەوە، بێئەوەی زیندووەکان گوێیان لە دەنگی بەلۆعەکان بێت، دەیانتوانی چراکان داگیرسێنن بێئەوەی زیندووەکان خەبەریان بێتەوە، لەسەر کورسییە کۆنەکانی ناو چیمەنی هاوین دانیشن، یادگارەکانی جارانی خۆیان بدۆزنەوە، تەماشای وێنەکانی خۆیان بکەن، بۆنی گوڵەکان بکەن... بێئەوەی کەس بیان بینێت.

ئێوارەیەکی درەنگ یەکێک لەو مردووانە بە خۆی و فلووتێکەوە، دوای گەشتێکی دوورو درێژی چەند ڕۆژە بە زۆنگاوەکانی باشوور و باغەکانی نێوان دیجلەو فوراتدا گەیشتە شاری تەپوتۆزی زەردو لە یەکێک لە کوچە تاریکەکاندا جەلادەتی کۆتری بینی. چاوپێکەوتنێک دواتر سەدایەکی سەیری لە هەموو ژیانی جەلادەتدا دەبێت، کە درەنگ تێدەگات، یەک بینین لەگەڵ مردوویەکدا هیچ نییە جگە لە داوەتێکی کراوە بۆ سەفەر بە ئەبەدییەتدا.

دوای کۆتایی شەڕ، ئەو چەند هەفتەیە وڵات هەمووی شادیدەکرد، لەمسەرەو سەری ئەو زەمینەدا ئاهەنگی شێتانە ڕێکدەخرا، لەهەموو کوچەکاندا، لە هەموو فولکەکاندا، لە ناوەڕاستی شارەکاندا، لەبەردەم مزگەوتەکان و لە ناو قوتابخانەو لە یاریگا گەورەکاندا. هیچ ئان و زەمانێک وەکو ئەوساتە وڵات پێویستی بە سەماکەر و مۆسیقار و لافیتەنوس نەبوو، هەر لە دوو ڕۆژی یەکەمەوە شاری تەپوتۆزە زەردەکانی ئێمەش

لەسەر نشینەکانی خاڵی بووەوە، لە هەموو شارەکان و بەندەرەکان و ئاوەدانییەکانەوە کەسانێکی نەناسراو بە ماشێنی تایبەتییەوە هاتن و لە پاسی گەورە گەورەدا مۆسیقارو کچانی سەماچی و سۆزانییان سوارکرد و بەدەم هۆڕن لێدانەوە بردیانن بۆ ئەو ئاهەنگە خەیاڵی و گەورانەی لەسەر شەرەفی ژەنراڵەکانی سوپا و سەرۆکە حیزبییەکان ڕێکدەخرا. لەو بگرەو بەردە سەیرەدا، لەو فرکان فرکانەدا، لە ساتێکدا شارەکان لەسەر سەماکەرێک دەیانکردە شەڕ، لە ساتێکدا فیشەکە شێتە دەتەقێنرا، ئاسمان یەک پارچە تیشک و درەوشانەوە بوو، لە هەموو کۆلانەکانی ئەو شارەدا دەنگی سروود لە بڵندگۆی گەورە گەورەوە دەگوێزرایەوە. کچە سۆزانییەکان بە ڕووتی خۆیان فڕێدەدایە ناو پاسەکانەوە، مەمکە زلەکانیان لە پەنجەرەکانەوە شۆڕدەکردەوەو بانگی یەکتریان دەکرد، قوونە زلەکانیان دەخستە سەر کوشنە گەرمەکان و دەیانزریکاند، لە کاتێکدا پرتەقاڵی سپی لە گەرمەی خۆئامادەکردندا بوو، تا بەتەواوی ئیدارەیەوە ڕووبکاتە باغێکی گەورەی پایتەخت تا لە ئاهەنگە مەزنەکانی سەرکەوتندا بەشداربێت، جەلادەتی کۆتر کە دەیزانی ناتوانێت لەو شارە بچێتەدەرەوە، دەیزانی دەشێت تووشی چ مەترسییەک بێت، لە هەرای خۆئامادەکردن و خۆپێچانەوەو بارکردنی کەلوپەلدا، لە ساتێکدا دڵنیابوو کە هیچ کەسێک نایبینێت لە تاریکی کوچەیەکدا خۆی ونکرد. وەک یەکێک بەدەم خەوەوە بڕوات، سەیری ئەو چرا هەواییە بەرزانەی دەکرد کە وەک پەرشبوونەوەی گوڵێک، وەک تەقینەوەی شەست پەڕێک دەتەقینەوەو دەبوون بە بارانی ڕەنگ و دەبارین. لە ناو ئەو تیشک بارانەدا جەلادەت بەرەو لای موسای بابەک کەوتەڕێ، دڵنیابوو لەو هەرا گەورەیەدا کەس ئاگای لەو نییە. لەوساتە پڕتامانەی خۆشیدا هەمووان لە بیریاندەکرد، بەڵام چاکتر... ئێستا بێخەم دەستی دەخستە گیرفانی پانتۆڵەکەی و سەیری شەوقی فیشەکە گڕدارەکانی دەکرد کە گروهێک سەرباز، لەوانەی دەروازەکان و

ئەمسەرەو سەری شاریان کۆنترۆڵدەکرد دەیانتەقاند. هەستیدەکرد ڕەنگە ڕوناکەکان، لافاوە سەیرەکانی تیشک بێباک لە هەموو شتێک بەسەر ئەودا دێنەخوارێ، بەلام ئەو بەجۆرێک لە جۆرەکان هەر لە زوڵمەتدا بوو، گوێی لە فیشکەی پەرشبوونەوەو بلاوبوونەوەی ڕوناکییەکان بوو، گوێی لە هاواری سەرسامی کیژەکان بوو، گوێی لە هەلهەلەی شێتانەیان بوو، گوێی لە هۆسەکردنەکانیان بوو. بەلام لە چاوی زۆربەشیاندا غەمێکی پەنهانی دەدۆزییەوە، غەمێک کە ئەو لە هەر کەس زیاتر دەیبینی. «جەنگ تەواو... جەنگ تەواو... جەنگ تەواو» هەموو هەڵدەپەڕین و وایان دەگووت، شێتانە بە کوچەکاندا ڕایاندەکردو وایان دەگووت. سۆزانییەکان لە بەردەرگا کۆشیان بۆ ڕێبوارەکان هەڵدەدایەوەو وایان دەگووت. جەلادەت لە خۆی دەپرسی دوای جەنگ چی دەبێت؟ دەبێت دونیا بە جۆرێک ئارام و ئەمین ببێتەوە بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ باکوور؟ بەلام خودای گەورە کوردستانی چی، ئەو ئێستا هەژدەساڵە... بێگومان دەیگرنەوە بە سەرباز... هەرگیز لێناگەڕێن... دەبێت بڕوات بۆ ناو سوپا... لەوانەیە جەنگی تر سەر هەڵبدات... لەوانەیە قات و قڕی تر... ئاە ئەو دواجار نایەوێت مردووەکانی خۆشی لە بیربکات، چیرۆکی خۆی لە بیربکات... بەلام چیرۆکی چی؟ دەتوانێت چی لەو چیرۆکانە بکات بە خەوتوویی لەسەریدا... ملیۆنێک چیرۆکی خەوتوو لە ناو سەری ئادەمیزادا، سوودی هاوارێکیان نییە کە مرۆڤ بێ وشە لە گەرووی خۆیەوە دەریدەکات... لەسەرییەوە فیشەکەشێتەیەک دەتەقییەوەو تاریکی پڕدەکرد لە ڕەنگ. بیریدەکردەوە، بەلام بەر لەوەی فریابکەوێت بزانێت بیر لە چی دەکاتەوە تەپوتۆزی ماشێنێکی شێت، بە دەیەها سەرنشینی شێت و بە ئاوازی گۆرانییەکی عەرەبی شێتانەترەوە دایدەپۆشی. جەلادەت وەک شتێک لە دونیایەکی ترەوە پەیوەندیی پێوە ببەستێت دەوەستا، کوتوپڕ وێنەیەکی سەیر دەهاتە خەیالی، وێنەیەک بۆ ئێستێک لەو کەرنەفالی ڕەنگ و مۆسیقا شێتانەیەی

شادیی دووریدەخستەوەو دەیبردەوە بەرەو ئەو زەوییە خەیاڵیانەی لە سات و کاتی ئاساییدا تیادەژیا. لەوساتەدا مردووەکانی دەبینی لە سەنگەرە دوورەکاندا هەڵدەستن... مردووەکانی دەبینی خۆیان دەتەکێنن و پێڵاوەکانیان لە پێدەکەن و کوڵەکانیان دەکەنەوە کۆڵ و دەگەڕێنەوە. ساتێک چاویدەکردەوەو پاشەکشێی هێمنی ئەو مردووانەی دەبینی لە گۆڕەپانەکانی مردندا، بەڵام بەرلەوەی ئەو تەپوتۆزە لە نیگایدا بسڕێتەوە چاویدەکردەوەو چاوانی پڕدەبوونەوە لە تیشکی ئەو ڕوناکییە ڕەنگاوڕەنگانەی کە وەک بروسکە دەهاتن و تێدەپەڕین، دەهاتن و تێدەپەڕین. جەلادەت لە ناو دەنگی تەقینەوەو ڕەنگی پڕشنگداری ڕوناکییەکاندا هەنگاوەکانی خۆی خێراتر دەکردو پڕ بە هەموو شەو دەیناڵاند و دەیگووت: هاوار.

## بەشی دووەم

شاری سۆزانییەکان دەڕۆژ بوو چۆڵ بوو، لە موسای بابەک و دالیا سیراجەدین و جەلادەتی کۆتر بەولاوە کەسێکی تری تیا نەمابوو. کوچەکان سەرتاپا چۆڵ و ماڵەکان سەرتاپا خاڵی. جگە لە بارەشێکی زەرد کە وەک غەریبەیەکی بێسرەوت بە ناو شەقامەکاندا دەسوڕایەوە دەنگی هیچی تر نەدەهات. لە منداڵییەکی زۆر زووەوە جەلادەت خەونی بینی بوو کە جارێک لە جارەکان بە شارێکی وەها چۆڵدا دەڕوات. شارێک شەقامەکانی و کوچەکانی تەنیا بۆئەو دەبن، ئەستێرەو مانگ و ڕەشەباکانی تەنیا بۆ ئەو دەبن. لەو دە ڕۆژەدا جەلادەت هیچی نەکرد، بەردەوام بەو شارە چۆڵەدا دەگەڕا. گوێی لەو دەنگانە دەگرت کە ڕەشەبا لە ناو شارێکی بێدەنگدا دروستیاندەکات. پێی وابوو ئەو دەنگانە دەنگی جیاوازن، ڕەشەبا کە بە شاری جەنجاڵدا دەڕوات دەنگێکی تەواو جیاوازی لەگەڵ ئەو دەنگەدا هەیە

کاتێک بە شارێکی ئاوەها چۆڵ و هۆڵدا دەگەڕێت. بە شێوەیەکی تر پەنجە بەسەر شتەکاندا دەهێنێت، بە جۆرێکی تر یاری بە لەوح و پەردەو تەناف و ئاریڵەکان دەکات. تەواو وەک مۆسیقارێک لە ساڵۆنێکی گەورەدا بۆ خۆی عەزفبکات، لەگەڵ مۆسیقارێکی دیکەدا لە بەردەم دەیان هەزاران خەڵکدا مۆسیقا بژەنێت. جەلادەت هەستیدەکرد ئەو بایەی بە ناو شارێکی چۆڵدا دەڕوات هەمان هەستی ناکۆتاو ترس و تەنهایی تێدایە کە مۆسیقارێک هەیەتی کاتێک بە تەنیا لەسەر لووتکەی چیایەکی بەرز لە بازنەی دەیان گەواڵە هەوردا مۆسیقا لێبدات. جەلادەت خۆی بە پسپۆڕێکی گەورەی گوێگرتن لە با دەزانی، لە شارەکەی خۆی گوێگرێکی زیرەکی ڕەشەبا بوو، لە چیا دوورەکان ئیسحاقی لێوزێڕین پێی گووتبوو، ئەوەی لە با تێنەگات هەرگیز نابێتە مۆسیقار، لە شاری سۆزانییەکان تێکەڵاو بە باکان بووبوو کە هەمیشە بە ئیقاعێکی قورس لە ناو کوچەکاندا دەگەڕان و ڕۆحێکی پیریان یاد جەلادەت دەهێنایەوە کاتێک بە هەناسەی قورس و هەنگاوی لەرزۆکەوە بە زەویدا پیاسەدەکات.

گوێگرتن لە با یەکێک بوو لە خولیا سەیرەکانی جەلادەت کە پێدەچوو لە باپیرە کاروانچییەکانییەوە بۆی مابێتەوە. بەدوای گوێگرتن لە دەنگی ئەو بایەدا شەوو ڕۆژ لەدەرەوە بوو، تەنیا نیوەڕوان و ئێواران دەگەڕایەوە بۆ لای موسای بابەک و دالیا. شەوێک بە دوای مۆسیقای نهێنی ئەو بایەدا لە کوچەکانی باشووری شاردا هێند دوورکەوتەوە، هەستی بە ونبوون کرد، شەوێک بوو ڕەشەباکان لە شەوانی تر بەهێزتربوون، شەوێک بوو سەیرترو توڕەتر لەسەر لم و پەنجەرەو دەرگاکان پەنجەکانی خۆیان دەجولاند. توندتر شتەکانیان لە بناغەوە دەلەقاند، چینکۆ ئەستوورەکانیان ڕادەوەشاند و بە ئیقاعێکی خێراتر شتەکانیان لە هەوادا دەجولاندەوە. جەلادەت چۆن عاشقێکی مۆسیقا تەماشای پەنجەکانی پیانۆژەنێک دەکات کاتێک لەسەر کلاڤیرەکەی سەمادەکات، دوای پەنجەی ئەو بایە دەکەوت

و لەگەڵ شەپۆلەکانیدا دەڕۆیشت. دواجار لەیەکێک لە کۆلانەکانی ئەو شارەدا هەستیکرد تارماییەکی ماندوو لە ناو تەپوتۆزو زوڵمەتەوە بەرەو ڕووی دێت. سەرەتا پێی وابوو ئەوەی دەیبینێت فیلێکە لە فیلەکانی نیگا و هەڵەیەکی کوشندەی ڕوانینە کە با لە هەست و نەستەکاندا دروستیدەکات. جەلادەت لە جێگای خۆی دەوەستاو ئەو تارماییە ماندووەی دەبینی بەکاوەخۆ بەرەو لای ئەو دێت. تا نزیکتر ببووایەتەوە ئاشکراتردەبوو، شێوەو ڕوخسارێکی هەبوو لەو سەربازانە دەچوو کە لە شەوی سەرکەوتندا کاتێک بە ڕێکاوەبوو بۆلای دالیا لە ناو تەقینەوەی ڕەنگەکاندا بینیبوونی... ئەو شەوی سەرکەوتنە شوومە، ئەو شەوەی ولات وەک قەبیلەیەکی بەربەری لەسەر کەلاکی خۆی هەڵدەپەڕی، ئەو شەوە جەلادەت بەردەوام ڕوخساری ئەو سەربازانەی دەبینی کە لە مردن هەڵدەستانەوەو بەرەو دوا دەگەڕانەوە. وەک مۆتەکەیەکی ترسناک وابوو چاوی دەنوقاند و سەربازی مردووی دەبینی لە گۆڕەکانیان هەڵدەستنەوەو پۆستاڵەکانیان لە گۆڕەپانی جەنگدا دەدۆزنەوەو لەپێیدەکەن و بە مارشێکی هێمن بەرەو دوا دەگەڕێنەوە. ئەو شەوە چەند دەنوست لە ناکاو خەونی ئەو سەربازانە بەئاگایاندەهێنایەوە، لە خەویدا ئاسمان دەبووە تونێلێکی کراوەو ترسناک کە لە نێویدا دەیەها تۆفانی گەورە گەورەی ڕەنگ لەمسەری گەردونەوە بۆ ئەوسەر دەجولانەوە، لەسەر زەویش ئادەمیزادەکان یەک لەشکربوون بە ڕیتمێکی هێمن لە تاریکیدا دەڕۆیشتن. ئەمشەویش کە لە ڕەشەبادا دەوەستا ڕیتمی ڕۆیشتن و نزیکبوونەوەی ئەو تارماییە لە ڕیتمی مەخلوقاتی نێو خەونەکانی دەچوو. جەلادەت وەک بترسێت لە باکاندا دەوەستاو نەدەڕۆیشت. سەربازێک بوو بە کۆڵەپشتێکی قورسەوە، لەفافێکی خوێناوی بە ناوچاوانییەوە بەستبوو، سەیری لەوە دەهات کە جەلادەت بەردەوام تەماشایدەکات، وەک ئەوەی بە ڕاگوزەرو نەزان هاتبێتە ئەم شارەوە، نەیدەزانی چۆن ڕێی کەوتۆتە ئەم چۆڵەوانییەوە. چەندین ڕۆژ بوو بە

ڕێگاوەبوو چەندین شاری قەرەباڵغی بڕیبوو، لە هەموو جێگاکاندا بە ناو ئاهەنگ و سەماو دڵخۆشییەکی بێوێنەی ئادەمیزادەکاندا تێپەڕیبوو، بێئەوەی بزانێت دەچێت بۆ کوێ، بەردەوام بە زەویدا هاتبوو، لە ڕووبارە گەورەکان پەڕیبووەوە، بیپشوو زۆنگاوو هۆڕەکانی لە دوای خۆیەوە جێهێشتبوو، زەلستانەکان و پردە ئاوییەکان و مێرگە زەردەکانی دەوروبەری ئەو شارە گەڕابوو، لە بەلەمی چکۆلەی ڕاوکەرەکانی مراویدا سواربووبوو، بەڵام تا ئەوکاتە هیچ کەس تەماشای نەکردبوو. وەک ئەوەبوو هەموو ئەم سەفەرە درێژەی بۆئەوەکردبێت بەم نیگا سەیرو زیندووەی ئەم کوڕە تەنیایەی ناو ڕەشەبا بگات. کە لە جەلادەتی کوتر نزیکدەبووەوە، دڵنیابوو بەرلەوەی درێژە بەسەفەرەکەی بدات دەبێت لێرەدا پشوویەک بدات. جلێکی سەربازیی دڕاوو کۆنی لە بەردابوو، زنجیرێکی ژەنگاوی لە ملیدا، خەندەیەکی دێرین و تاڵ لەسەر لێوی، چەند دڵۆپە خوێنێک لەسەر لاملی، پاکەتێک جگەرە لە گیرفانی چەپیدا، هارمۆنیکایەک لە گیرفانی ڕاستیدا. سەری فلووتێک لە کۆڵەپشتەکەی هاتبووە دەرێ. مەتارەیەکی لیباداری سەربازیی بەلای ڕاستی کەمەریدا و قەمەیەکی سپی بە لای چەپیدا شۆڕبووبووەوە. دڵنیابوو جەلادەت دەیبینێت، ئەو یەکەم زیندووە بیبینێت، لە دوورگەکانی مەجنونەوە بە پێ هاتبوو، پێی بەسەر هەموو مینەکانی سەر ڕێگادا نابوو، لەسەریان هەڵپەڕیبوو بەڵام نەتەقیبوونەوە، بە هەموو شارەکانی باشووردا هاتبوو، چووبووە بەردەمی منداڵان لە بەردەمیاندا هەڵپەڕیبوو، سەمایکردبوو، کەس نەیبینیبوو. ئێستا دڵنیابوو لەم شارە چۆڵ و هۆڵەدا کە لە هەموو شارەکانی باشوور بێدەنگتر و مردووترە یەکێک لە بادا وەستاوەوە تەماشایدەکات.

بە دوودڵی یەکێکەوە دڵنیانییە ئەوەی بەرامبەری دەیبیستێت یاخود نا، بە دەنگێکی قووڵ کە پێدەچوو ساڵانێکی درێژبێت قسەی نەکردبێت، دەنگێک کە قرغەیەکی سامناکی تێدابوو، پێدەچوو وشەکان گەرووی بریندابکەن دەیگووت: ئەی ئەوەی لە بادا وەستاویت دەمبینیت یان نا؟ گەر

دەمبینیت قسەبکە. من خۆڵی مەیدانەکانی جەنگم لە گەروو و گوێچکەکانم پاککردۆتەوە، وا تەماشامەکە وەک ئەوەی ڕۆحی غەریبانت نەبینیبێت، گەر دەمبینیت، مەمخەرە گومان و دوودڵییەوە، وا غەمگین تەماشامەکە، دەستت بێنەو بیخەرە سەر دڵم، دڵێکم نییە لێبدات، من لێرەوە بەرەو جێگایەکی تر تێدەپەڕم، بەرەو شارێکی تر دەڕۆم... شارێک لە منداڵیمەوە لە خەیاڵمدایە، دەشزانم مرۆڤ لێرەوە بۆی دەچێت؟

با یاری بە قژی جەلادەت دەکرد، چاوانی لە ناو تەپوتۆزدا کەمێک کزتر بەڵام بەخەبەرتر دەدرەوشانەوە. لەدوای شەوەکانی ناو سەحرا لەگەڵ دالیادا فێربووبوو سەیری مردووەکان بکات و نەترسێت. لەو کاتەوە بیرکردنەوە لە مردن و تەماشاکردنی مردن و خەوبینین بە مردنەوە بەشێکی ژیانی بوو. بەڵام ئەم سەربازە غەمگینە کە بە لەفافێکی سپییەوە لەوسەری دونیاوە هاتووە بۆ ئێرە، ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ دەکات، یەکەمجاربوو مردن ڕاستەوخۆ بیدوێنێت. جەلادەت و ئەو غەریبە زامدارەی ناو ڕەشەباکانی شەو لەیەکتر نزیکدەبوونەوەو لە ناو بادا بەرامبەر بەیەک دەوەستان. جەلادەت سەیری چاوە شینەکانی دەکرد کە پێدەچوو تەماشای دووروودرێژی ئاسمان شینی کردبێت، شینییەک کە تاریکی و زوڵمەتی شەو نەیاندەشاردەوە، بەڵکو ڕوونترو ئاشکراتریان دەکرد. جەلادەت بێئەوەی بترسێت، دەیگووت: تۆ کێیت؟ چی دەکەیت لەم بایەدا؟ کە دەتوانیت وەها ساف و ڕوون کوردی قسەبکەیت، بۆ نەگەڕایتەوە بۆ باکوور؟ تۆ ئەی ڕۆحی غەمگین و وێڵ بە هەڵە هاتوویت بۆ ئێرە، تۆ خەڵکی ئێرە نیت، سەیرکە، من ناتوانم یارمەتیت بدەم، چونکە نازانم مرۆڤ لێرەوە چۆن دەگەڕێتەوە بۆ باکوور. گەر دەتەوێت من ڕێگات نیشانبدەم ئەو شارە بدۆزیتەوە، من ڕێگای هیچ شارێک نازانم... هیچ شارێک، لێرەش دەرچیت شارە ئاوێنەییەکان دەتبەن، ئەو شارانەی هەر چۆنێک بڕۆیت دەتهێننەوە بۆ ئێرە.

سەربازەکە کەمێک دەوەستا، کۆڵە پشتەکەی تۆزێک ڕاستدەکردەوە. دەستیدەخستە سەر لەفافەکەی ناوچاوانی و دەیگووت: کەواتە تۆ گوێت لێمە، تۆ دەمبیستیت، من دە ڕۆژە بە زەویدا وێڵم و کەس نامبیستێت. هیچ کەس، پێمبڵێ سەرنشینانی ئەم شارە لە کوێن، لە ترسی با ئێرەیان چۆڵکردوە، یاخود لە ترسی شەوێک کە ئاوا نابێت؟

جەلادەت دەیپرسی: شەوێک کە ئاوا نابێت؟ لێرە هیچ شەوێک نییە ئاوا نەبێت، هیچ ڕۆژێک نییە ئاوا نەبێت. ئێرە شارە وەک هەموو شارەکانی تری دونیا... هێند هەیە کە هەندێجار تۆزی زۆر لە سەحراوە دێت، هەندێجار مراوی زۆر لە زۆنگاوەکانەوە بەسەر ئەم شارەدا دەفڕن... هەندێجاریش مێشێکی زۆرو زەبەندەو دڕ دێن کە با لێرەوە دەیانبات بۆ جێگای تر.

سەربازەکە وەک ئەوەی بیربکاتەوە دەیگووت: مێشی دڕ، کە با لێرەوە دەیانبات. مێشی دڕ... بەڵام ئەی تۆ چیدەکەیت، تۆ بۆ شارەزای هیچ شارێکی تر نیت، بۆ بە تەنها لەم شارەدا دەژیت، کە خەڵکی ئێرە نیت، بۆ نارۆیت؟

جەلادەت دەیگووت: نازانم، دەبووایە بهاتبامایە بۆ ئێرە، من مۆسیقاربووم، لە شاخەکان، لە پێدەشتەکاندا مۆسیقام لێدەدا. ڕۆژێک من و هاوڕێکانم گیراین، دواتر هاوڕێکانیان کوشتم و من بە برینداری هاتم بۆ ئێرە. پیاوێک منی هەڵگرتەوە ناوی نەقیب سامیری بابلی بوو. نەقیبێکی دڕندەو خوێنمژ کە دوایی لە هەموو شتێک پەشیمانبووەوە، بەڵام من لێی نابوورم... ها، ئەی ڕۆحی غەمگینی ناو ڕەشەباکان، من لێی نابوورم... لە قووڵایی دڵمدا لێم نەبووردوە و ناتوانم لێی ببوورم، تێدەگەیت من هەرگیز لێم نەبووردووە، کە هاتم بۆ ئێرە ئیتر هەموو ژیانم وێران بوو. تێدەگەیت ڕۆژێک دێت ژیانی مرۆڤ کۆتاییدێت، گەر ئینسانێک دەستبخاتە ئەو گەمەیەوە هەموو شتێک تێکدەچێت، تێدەگەیت... ناکرێت من بەردەوام بمرم و یەکێک نامەردانە دەست بخاتە ناو گەمەکەوەو نەهێڵێت بمرم، ئەمە

جۆرێکه لە نامەردی... ناوی سامیری بابلی بوو... هاوڕێم ناوی سامیری بابلی بوو، ئێستا نازانم لە کوێیه، بەلام سوێندی خواردووه بمبینێت تا نهێنی گەورەم پێبلێت، من هەموو پێمدەڵێن بۆیه لێرەم تا نهێنی هەلگرم... شتێک بکەم بە کەس ناکرێت... شتێک ببینم کە کەس نایبینێت... ناوی سامیری بابلی بوو، لە سوپادا بوو، نەقیب بوو، درندەیەک بوو ئێستا خۆی چاککردوه، تۆ لە مردن هاتوویتەوه پێمبلێ مرۆڤ دوای ئەو هەموو خوێنڕێژییه هەقی ئەوەی هەیه خۆی چاکبکات و بژی... هەقی هەیە...؟

باکە زیاتر بەرەو ڕووی سەربازەکە هەلیدەکرد، بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوه تەماشای جەلادەتی دەکرد، دڵۆپە خوێنەکانی لاملی دەدرەوشانەوه، چوار دڵۆپ خوێنی قەشەنگ بوون. بێرییەکەی دادەکەند، سەری تەواو سفر بوو. بێرییەکەی دەتەکاند و دەیخستە گیرفانی، کۆڵەپشتەکەی دادەنا و لە تەنیشت دیوارێکی نزیکەوه هەلیدەپەسێراو دەیگووت: تۆ منداڵێکی سەیری، باسی مۆسیقات کرد، دەتەوێت پێکەوه کەمێک مۆسیقا لێبدەین. دەتەوێت؟ منیش مۆسیقارم... فلووت لێدەدەم، پیانۆژەنێکی باشم، جاران بەر لەوەی بخەوم شەوان لە ژێر بەتانییەکەوه هەمیشە هارمۆنیکام لێدەدا. تۆ چی عەزفدەکەیت... چی؟

جەلادەت بە غەمگینی دەیگووت: زۆربەی ئامێرە هەواییەکان دەزانم، هەندێک لە وەتەرییەکانیش... ئاه وازبێنە، من لە مێژە مۆسیقام بیرچۆتەوه... ئەو شتانەی لێرە عەزفیدەکەم مۆسیقا نین... پێمبلێ، تۆ کێیت... ها، بۆ لەم شارەوه دەڕۆیت... ناوت چییە؟؟

کوڕە سەربازەکە دادەنیشت و پالیدەدایەوه بە کۆڵەپشتەکەیەوەو دەیگووت: دوو ساڵ لە مەوبەر ئاوەها کوژرام؟ پاڵمدایەوه بە کۆڵەپشتەکەمەوەو گوللەیەک لە دوور دوور هات، ووویو... ووویو...ووویو. بەر ناوچاوانم کەوت. من وەک خەو ببینم مردم. هاوڕێیەکم لەگەڵدا بوو تەنیا یەک لەفافی پێبوو، بۆی بەستم و ڕۆیشت... گووتی دەڕۆم و

دیمەوە بۆلات، بەلام من دوو ساڵ ئاوەها دانیشتم، هیچ شتێکم نەکرد، هەستم بە گوللەکە دەکرد لە سەرمدا، بەلام هیچ نەجولام، تەنیا سەیری ئاسمانی شینم دەکرد. ڕۆژ هەڵدەهات من سەیری ئاسمانی شینم دەکرد... شەو هەڵدەهات من سەیری ئەستێرەکانم دەکرد. دوو ساڵ سەربازەکان بەلامدا هێرشیان دەهێناو دەگەڕانەوە، ئەفسەرەکان بەلامدا پەلاماریاندەداو لەوسەر بەشکستی و برینداری دەهاتنەوە، بەلام من پاڵم دابوو بە کوڵەپشتەکەمەوەو سەیری ئاسمانم دەکرد. هیچ شتێک لەوە خۆشتر نییە لە جەنگدا بتوانێت پاڵبدەیت بە کوڵە پشتەکەتەوەو سەیری ئاسمان بکەیت، ئاگادار بووم بە ڕۆژ هەندێجار لاشەی هەندێک سەربازیان هەڵدەگرتەوە، بەلام بەشەو من چاوم دەنوقاند و هەستم وا بوو کە لەوێن. حەزمدەکرد دەستبەرم و هارمۆنیکاکەم دەربێنم، بەلام دەترسام گوللەکە لەسەرمدا بجولێتەوەو هەست بە بۆشاییەکانی ناو جەستەم بکەم. لەبەرئەوە هەموو شەوێک دەمگووت. ئەمشەویش مۆسیقا لێنادەم... ها لێت پرسیم ناوت چییە؟ وابوو لێت پرسیم ناوت چییە: ناوم سەربازی موکەلەف «شاڕوخ مەهدی شاڕوخە». لە وەحدەی سەدویازدەم فیرقەی هەشت فەیلەقی دوو. پێشتر لە لیوای مودەرەعی زولفەقار لای ئامیرلیوا «مثنی شهاب جواد» بووم. کە پێکرام لە «جزر مجنون» لە پێشی پێشەوە بووم.

جەلادەتی کۆتر، بە غەمگینی لێی پرسی: بەلام کە مردوویت، بۆ هەستاویتەوە؟ بۆ هاتوویت بۆئەم شارە؟ چ کارەیت و بۆ لێرەوە تێدەپەڕیت؟

بە زەردەخەنە غەمگین و تاڵەکەی خۆیەوە گووتی: هەستاومەتەوە، لەبەرئەوەی دەبێت بڕۆم بۆ جێگایەکی تر، بۆ شارێکی دوور، شارێک لە منداڵییەوە خەونی پێوەدەبینم. دوای ئەوە ئازیزم... برا، لە مێژە زیندوو و مردوو نەماوە. پێش ئەوەی ئەو گوللەیەش بمپێکێت، من دەزانم زیندوو و مردوو نەماوە، زیندوو و مردوو لە ولاتێکدا نییە مرۆڤ تەنیا لە خەیاڵدا دەژی. مەسەلەکە تەنیا جەنگ نییە، من لە منداڵیی زووەوە هەستم پێکردوە،

مردن تەنیا گوللەیەکی گەمژە نییە لە دوور بێت و بچێتە کەللەتەوە، بەڵکو شتێکی ترە، شتێکە هەستدەکەیت تەواو، هەستدەکەیت ئیتر پێویستناکات لەم سەر زەوییە بیت، هەموو مرۆڤێک جۆرە ساتێکی وەهای هەیە، ساتێکە تیایدا دەڵێیت ئیدی بەسە، با بڕۆم بۆ جێگایەکی تر. مرۆڤ کە لە تەماشای درەخت و باڵندە تێربوو، ئیدی واتە تەواو. کە لە گوێگرتنی مۆسیقا تێربوو ئیتر تەواو. بەلام گەر وانەبێت، گەر باوەڕت بە مردن نەبوو، واتە مردن نییە. هێی برا، وەک مردوو تەماشاممەکە، زۆر هەستم برینداردەبێت. من دەچم بۆ شارێکی دوور، شارێکی زۆر دوور، شارێکە لەسەر نەخشەکان نییە، تێدەگەیت، نە خودا ئاگای لێیەتی، نە ئەهریمەن، نە زیندووەکان، نە مردووەکان. شارێکی دوورە، کە لە دەرەوەی دەستەلاتی سیاسەت و شەڕ و دیکتاتۆرەکاندایە، شارێکە خودا کارێکی بەسەریەوە نییە، شاری ئەو مرۆڤانەیە کە ژیانیان وەک پارچەیەک مۆسیقا وایە. هاوڕێم تۆ لە خۆتت پرسیوە: ئایا پارچەیەک مۆسیقا دەمرێت؟ ها.. هەرگیز بیستووتە پارچەیەک مۆسیقا بمرێت؟ نا.. یەکجار لە دایک دەبێت و تا هەتا هەتایە دەژی. ژیانیش هەیە لە پارچەیەک مۆسیقا دەچێت... مرۆڤ هەیە لە پارچەیەک مۆسیقا دەچێت. من دەچم بۆ شاری ئەوان... شارێکە وەک مۆسیقا وەهایە، دەچم بۆ شارێک لە منداڵییەوە دەزانم دەچم بۆئەوێ... لە منداڵی زووەوە، دەڕۆم بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان.

جەلادەت کە جارێکی تر ناوی ئەو شارەی دەبیست ڕادەچڵەکی و دەیگووت: ئەمە یەکەمجار نییە من ناوی ئەو شارە دەبیستم، دڵنیام بە خۆڕاش نییە من و تۆ لەم ڕەشەبایەدا یەکتر دەبینین. ئەو شارەی تۆ باسی دەکەیت چ جۆرە شارێکە؟ من ڕۆژێک لە ڕۆژان تا بەردەرگای ئەو شارە چووم و بێئەوەی بچمە ژووری، ڕۆژێک لە ڕۆژان کە ئێستا واهەستدەکەم من لە خەودا بووم... ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو شارە منی دەرکرد. بۆ ئێستا هەستدەکەم بانگمدەکات... بۆ؟

شاروخ مەهدی شاروخ سەری بادەداو دەیگووت: نازانم. منیش لە منداڵییەوە هەستدەکەم دەبێت بچم بۆئەوێ. لەم دوو ساڵەدا کە لە جەنگ پاڵم بە کوڵە پشتەکەمەوە دابوو، شەوێک مۆسیقارێک بەلامدا ڕابوورد کە لەوێوە هاتبوو، بە منی گووت: مۆسیقا هیوا دروستدەکات، کوڕگەل مۆسیقا هیوا دروستدەکات. من هاتووم لێرەوە تێپەڕم و مۆسیقا لێبدەم، تا ئەوەی گوێم لێدەگرێت، نائومێد نەبێت. من لە بەرەکانی جەنگدا هەندێک شەو گوێم لەو مۆسیقارانە بووە کە لەوێوە دەهاتن، کاتێک دەنگی خومپارە و گوللەتۆپەکان ئارامدەبوونەوە دەستیان بە عەزفدەکرد، مۆسیقایەکی خودایی کە هەردوولامان، شەڕکەرەکان لە مبەرەو ئەوبەر گوێمان لێدەگرت. هەردوولا، مەبەستم ئەو ڕۆحانەیە کە دەتوانن مۆسیقا ببیستن، لە بێدەنگیدا گوێ هەڵخەن و ئەو مۆسیقاژەنە نهێنییانە بدۆزنەوە کە بێدەنگی دەژەنن. قەت لە بیرت نەچێت دائیمە لە تاریکیدا مۆسیقارێک هەیە، دەبێت بیدۆزیتەوە، ها کوڕی کوتر... ئێستا کە من و تۆ قسەدەکەین مۆسیقارێک هەیە لە جێگایەکدا کە من و تۆ نایبینین، دڵنیاتدەکەمەوە مۆسیقارێک هەیە... دڵنیاتدەکەمەوە. شەوێک یەکێک لەوانە باسی شاری مۆسیقارە سپییەکانی بۆکردم. گوێبگرە شاری مۆسیقارە سپییەکان شاری ئەو مرۆڤانەیە کە پەیوەندییان بە ئەبەدییەتەوە هەیە. هەموو مۆسیقارێک، شاعیرێک کە لەدایکدەبێت، خولیایەک لەسەریایەتی خولیای ئەبەدییەتە، ها تۆ وادەزانی من مردووم، بەلام من هەمیشە لەگەڵ شتە ئەبەدییەکاندا ژیاوم. ئەو کاتانەی لە سەربازگا مەشقیان پێدەکردم، یەک، دوو، یەک دوو، یەک دوو، بۆلای ڕاست وەرگەڕێ... لەو کاتانەدا بیرم لای شارێک بوو کە شتە نەمرەکانی تیایە، دەمزانی ئەو ئەفسەرە ناشیرینەمان ناگاتە ئەو شارە، لەوانەیە زۆر بژی، لەوانەیە دوای مردن هەستێتەوە، بەلام نەیدەتوانی وەک من چاو بنوقێنێت و ئەبەدییەت ببینێت، نەیدەتوانی وەک من پیانۆیەکی گەورە لەسەری خۆیدا بشارێتەوە، کەمانچەیەک لە دڵیدا بشارێتەوە. من دەمتوانی... من لەسەرمدا

مۆسیقام دەنوسی، گۆرانیم دەنوسی کە لام وابوو ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ڕۆحەوە هەیە و بەڵام وەک ئاو لەدەست و هەناسەو چاوم هەڵدەقوڵێت. هەندێجار لە ژێر بەتانییەکەوە لە شادی ئەو ئاوازانەی کە بە خوێنمدا دەڕوات دەگریام، مۆسیقایەک بوو لە جەستەمەوە دەهاتەدەرێ، بەڵام لە کوێی جەستەوە نازانم؟ ئەو ساتانە ساتەوەختی سەیرن، شتێکە لە ناوتدا دەتوێتەوە، هەموو بوونت وەک ئامێرێکی لێدێت... ئیتر ژیانت لەو مۆسیقایە جیانابێتەوە، جیاوازی مردن و نەمردن ئەوەیە. یەکێک ڕۆحێکی هەیە لە جوانییەکان جیانابێتەوە، یەکێکیش ڕۆحێکی هەیە ناتوانێت بە هیچی نەمرەوە بنوسێت. ئازیزم کە تۆ مۆسیقایەکی نەمر لە ناوتدابوو کە دەتکوژن ئەو مۆسیقایەی ناوت نامرێت... هیچ هێزێک نییە ئەو مۆسیقایەی ناوت بکوژێت، شاری مۆسیقاره سپییەکان شاری ئەو جوانییە ئەبەدیی و نەمرەیە کە لە ناوماندایە. پەیوەندی بە خوداوە نییە، بەڵکو سوک و ئاسان ئەو جوانییەی ناو ڕۆحی من و تۆیە کە شەڕو مردن و دەردو ئەشکەنجە نایکوژێت. من دوو ساڵ لە جەنگ پاڵم نابوو بە کۆڵەپشتەکەمەوەو بەردەوام ئەو مۆسیقایەم لێدەدا... ئێستا هەستدەکەم شتێکی نەمرم هەیە... مردووەکانی هاوڕێی من ئەوانەی هیچی نەمریان نییە لە گەرمادا دەوەستن، دەچنە سەر درەختێک و تا هەتا هەتایە نایەنە خوارێ، لە باراندا دەمیننەوەو باران سێبەرەکانیان لەگەڵ خۆیدا دەبات، لە بادا دەوەستن و هێدی هێدی با لە زوڵمەتدا دەیانتوێنێتەوە، بەڵام ئەی ڕەفیقی ناو تاریکی، من شتێکم هەیەو دەبێت بڕۆم، دەبێت بڕۆم بۆ شاری مۆسیقاره سپییەکان... دەبێت بگەمە ئەوێ... سەربازەکە هەڵدەستا و خۆی دەتەکاندو جارێکی تر دەیگووت: دەبێت بڕۆم... دەبێت بگەمە ئەوێ... دەبێت بڕۆم.

کۆڵەکەی هەڵدەگرت، کەمەکێک ناواخنەکەی چاکدەکرد، کتێبێکی لە کۆڵەپشتەکە دەردەهێنا، بە ناونیشانی «گوناه و ئاهەنگ»، کتێبێکی لاکێشەیی چکۆلە بوو، تۆزێکی زۆری لێنیشتبوو، لەسەرەخۆ تۆزەکەی لێدەتەکاند و لە

دوو فانیلەی دەپێچاو دەیخستەوە ناو بارەکەی خۆی. هەڵدەستا و سەیری ڕەشەباکانی دەکرد و دەیگووت: شارێکی خامۆشە... بڕۆ... هاوڕێم بڕۆ لەم شارە مەمێنە.

وایدەگووت و دەستی بەرزدەکردەوە و دەڕۆی، جەلادەت کە بە جۆرێک سەراسیمەبوو نەیدەزانی چی بکات، لە ناو گڤەی ڕەشەبادا بانگی لێدەکرد: هاڕێم، مەڕۆ، تکات تیادەکەم مەڕۆ، بۆ واکورت لەم بایەدا دەرکەوتیت و ئاوا خێرا دەڕۆیت. کەمێک بوەستە، تکات تیادەکەم... پێویستیم بەوەیە تۆ قسەم بۆ بکەیت... برادەر گیان، ئەمشەو لەم شارە چۆڵەدا لای من بە... تکایە لای من بە... فلووتم بۆ لێبدە... مەڕۆ. سەربازەکە وەک با بیبات، لە ماوەیەکی کەمدا مەودایەکی زۆر لە جەلادەت دوورکەوتەوە... بەجۆرێک تەپوتۆزی شەو دایپۆشی جەلادەت گوێی لە هیچ وەلامێکی نەبوو. ئەو لە تاریکیدا لە شوێنی خۆی وەستابوو هاواریدەکرد: برادەر گیان... من دەزانم هاوڕێکانم لەوێن... دەزانم... هاوڕێکانی منداڵی و گەورەیم لەو شارەدان کە تۆ بۆی دەڕۆیت... برادەر گیان، پێیان بڵێ من لێرەم، من جەلادەتی کۆتر... پێیان بڵێ بیریاندەکەم... من لێرەم... لەم تۆزە زەردەدام... ناوەکەی منت بیر نەچێتەوە، ناوم جەلادەتی کۆترە، برادەر گیان، پێیان بڵێ، با یارمەتیم بدەن... من جەلادەتی کۆتر... لێرەم... لەم شاری تەپوتۆزە گەورەیەدام... پێیان بڵێ... تکات تیادەکەم... پێیان بڵێ.

وەک با قووتی بدات، وەک شەو لە خۆیدا هەڵیگرێت، لە چاو وندەبوو، جەلادەت بەو شارەدا ڕایدەکردو بانگی لێ دەکرد... بەو شارەدا ڕایدەکردو دەگریاو دەیگووت: پێیان بڵێ من لێرەم... پێیان بڵێ یارمەتیم بدەن... پێیان بڵێ فریام کەون.

بەلام جگە لەسەدای خۆی کە با وەک جۆلانێ دەیهێنا و دەیبرد هیچی دیکەی نەدەبیست.

* * *

ئاخۆ بەڕاست، جەلادەت سەربازێکی لەو جۆرەی بینیبوو، یاخود حیکایەتەکە وڕێنەو ڕیشکەوپیشکەی مێردمنداڵێکی هەژدە ساڵە کە ماندوێتی و ڕەشەباو بیرکردنەوەی زۆر لە مردن ماندوویانکردوە؟ زەحمەتە لە ئێستادا مرۆڤ وەلامێکی تەواوەتی بنوسێت، لەو ساتەدا جەلادەت لە هیچ شتێک دڵنیانەبوو، بە جۆرێک لە نێوان وڕێنەو حەقیقەتدا جۆلانێیدەکرد، خۆشی نەیدەزانی لە چ خاڵێکدا پێی خستۆتە ناو مەملەکەتی خەیاڵ و ڕیشکەوپیشکە و وەهمەوە و لە چ خاڵێکدا جۆلانێکە هێناویەتییەوە بۆ ئەوسەر. بەجۆرێک ساڵانێک دواتر کە حیکایەتەکەی بۆمن دەگێڕایەوە دەیگووت «وەک جۆلانێیەک وەهایە کە بە چاوی نوقاوە دەیکەیت، سەرەتا دەزانیت تۆ لە خوارەوەیت یاخود لەسەرەوەیت، بەلام کە هەر بەردەوامبوویت، هەر گوژمت دا... لە ساتێکدا ئەو هەستەت تیا دەمرێت، نازانیت جۆلانێکە بە چ ئاراستەیەک دەتبات، نازانیت تۆ لە ناو جۆلانێکەدایت یاخود دەستت بەرداوەو دەفڕیت، نازانیت جۆلانێ دەکەیت یاخود ڕەشەبایەک هاتووەو تۆی ڕفاندووە، نازانیت خۆت چاوت لێکناوە یاخود کوێرو نادیدە بوویت، نازانیت خۆتیت گێژبوویت یاخود شوێنەکانی دەوروبەرتن جیا لە تۆ دەسوڕێنەوە». جەلادەت بەو هەستەوە کە ئەو سوار جۆلانێیەکی وەها شێت بووە، بیری لە بینینی ئەو سەربازە دەکردەوە.

تا ڕۆژی گەڕانەوەی مۆسیقارو کیژە سەرسامەکان بۆ پرتەقاڵی سپی ئەو هەموو شەوێک لە کوچە خاڵییەکاندا دەگەڕا و کەسی نەدەبینی. چەندەها جار بیری لەو یەکدی بینینە سەیرە کردەوە. دواجار قەناعەتی هێنا کە شاڕوخی شاڕوخ هیچ نییە جگە لە بەرهەمێکی ئەو خەیاڵە نەخۆش و پڕ تۆزەی کە پڕە لە تارمایی و ترس و بوونەوەری تێکشکاو.

لەو ماوەی بێزاری و بێکارییە درێژەدا، جەلادەت چەندین جار دەرفەتی دۆزییەوەو گەڕایەوە بۆ ناو تابلۆکانی موسای بابەک. هەرجارێک پێی دەخستە ئەو ژێرزەمینە سەیرەوە کە وەک گەلەرییەکی بە شکۆ بە فەرش و هۆرتەی فارسی سەیر سەیر ڕازێنرابووەوە، هەستیدەکرد دەگەڕێتەوە بۆ نیشتیمانی ڕاستەقینەی خۆی. هێندەی پێیدەنایە بەردەم ئەو نیگارانەوە دڵنیایی دایدەگرت، زۆربەی ڕۆژ لەو ژێر زەمینەدا بەدیار تابلۆی شاری مۆسیقارە سپییەکانەوە دەوەستا. تابلۆیەک لەگەڵ خۆیدا بەرەو قووڵاییەکی بێسنوور هەڵیدەگرت، بەرەو جێگایەکی دوور. تابلۆکە شتێک لە سیحر و تەلیسمی تێدابوو کە مرۆڤی ئالودەی داوێک دەکرد لە داوی ئەڤین دەچوو. نیگای ئەو مۆسیقارە سپییەی بە کەمانچەیەکەوە ملی لارکردبووەوە، شتێکی لە ئارامی و هیوای تێدابوو، ئەو بە دەگمەن لە چاوی مرۆڤە زیندووەکاندا نیگای وەهای بینیبوو، چاوێک بوو هێمن و قووڵ تەماشایدەکردیت و بەرەو خۆی بانگیدەکردیت، جوڵاندنەوەی دەستی بە شێوەیەک لە شێوەکان ئامادەیدەکردیت بۆ بیستنی مۆسیقایەکی ئاسمانی و ناوازە. کە جەلادەت لە ناو وردەکاری تابلۆکەدا نوقمدەبوو هەستیدەکرد هێدی هێدی گوێی لە مۆسیقایەک دەبێت لە تابلۆکەوە دێتەدەرێ، تا پتر لە ناو ئەو نیگارەدا نوقمبووایە دەنگی ئەو مۆسیقارە زیاتر بەرزدەبووەوە. کە جەلادەت لە تابلۆکە دووردەکەوتەوە بۆئەوەی سەیری تابلۆکانی تر بکات، هەستی بە غەریبییەکی قووڵ دەکرد، هەستی دەکرد ئەو تابلۆیە بانگیدەکات. ئەو ماوەیە هەندێجار موسای بابەکیش لەگەڵیدا دەهاتە ژێر زەمینەکەوە، هەندێجار کەمانچەیەکی زۆر کۆنی دەهێنا و بەرابەر ئەو تابلۆیە دەوەستا، هەمیشە پاش ئێستێک چاوی دادەخست و نەیدەکردەوە، ئەو پیرە وەک بە خەیاڵ بڕوا بۆ سەرزەمینێکی تر هێدی هێدی بە تەماشاکردن مەست دەبوو، چاوی دەنوقاندو نەیدەکردەوە، وەک ئەوەی بە چاوی داخراوەوە جوانتر تابلۆکە ببینێت. هێند بە کوێری و بە نیگای

ناو دڵ لە بەردەم ئەو تابلۆیەدا دەوەستا لەشی شەکەت دەبوو، بەڵام ڕوخساری هەمیشە ئارام و ئاسوودەو خۆشنوودبوو، زەردەخەنەیەکی نهێنی لەسەر لێوی بوو. جەلادەت لەسەر سیمای ئەو پیاوە پیرە سێبەری گەشتێکی درێژی بە خاکێکی نیهاندا دەبینی. کە تێر دەبوو لەو سەفەرە، جارێک چاویدەکردەوەو کەمانچەکەی هەڵدەگرت و دەستیدەکرد بە مۆسیقا. مۆسیقاکەی موسای بابەک تێکەڵەیەک بوو لە هەندێک پارچەی کلاسیکی و ئاوازی هەندێک گۆرانی عەرەبی دێرین کە لە ڕۆژگاری گەنجیدا عاشقیان بووبوو، بەڵام شتێکی زۆر لە سۆزو ڕاستگۆیی تێدابوو. مۆسیقای یەکێکی بلیمەت نەبوو، بەڵام ئاوازی پیاوێک بوو لە بری ئەوەی بگری، لە بری ئەوەی ئەلبومی یادگارەکانی دەربهێنێت و فرمێسک بڕێژێت، مۆسیقای لێدەدا. وەک خۆی دەیگووت، بەم مۆسیقایە شەڕ لە دژی بێدەنگی دەکات، کە لە منداڵییەوە وەک تاعوون ڕاوی دەنێت و قووڵترو قووڵتر بە هەرێمی خۆیدا ڕایپێچیدەکات. کە موسای بابەک مۆسیقای لێدەدا جەلادەت کات و شوێن و هەموو شتێکی لە بیردەکرد. زۆرجار بە سەعات لەو ژێر زەمینەدا دادەنیشت و گوێی لە کەمانچەکەی ئەو دەگرت. بیری لەوە نەدەکردەوە کە خۆی ڕۆژێک لە ڕۆژان مۆسیقارێکی ئەفسونساز بووە. لە سەر کورسییەکی چکۆلانە دادەنیشت و گوێی لەو کەمانچە غەمگینە دەگرت کە دکتۆرێکی پیر چیرۆکی عومری خۆی لە ڕێگایەوە دەگێڕایەوە. ئەو ئێستا ڕقی لەوەبوو هیچ کەس وەک مۆسیقار تەماشاییکات، خۆی بە دێوانەیەک دەزانی کە لە ناو تەپوتۆزی ئەو شارەدا ونبووە... دێوانەیەک و هیچی تر... هیچی تر. خۆشحاڵ بوو کە بەیانیان هەڵدەستێت و دالیا سیراجەدین دەبینێت، ئەوە یەکەمین و دواهەمین بەختەوەری عومری بوو. دالیا کە هەمیشە لە هەیوانەکەدا دادەنیشت و ڕۆمانی ئینگلیزی دەخوێندەوە. دی. ئێچ. لۆرانس و تۆماس هاردی و گۆلدینگ. ترۆمان کاپۆت و پۆل ئاستەر و جۆن ئیرفینگ. زۆربەی شەو جەلادەت لەوە دەیناڵاند ناتوانێت

باش بخەوێت، زۆربەی شەو کە لە گەشتە دوورو درێژەکانی دەهاتەوە لە بادا بە جۆرێک ماندووبوو وەک ئەوە بوو لەگەڵ جانەوەرو دڕندەی سەیر سەیردا زۆرانی گرتبێت، بە زەحمەت دەیتوانی دەستبەرێت و خەیارێک لە سەبەتەکان هەڵگرێ و پاکیبکات. دالیا دەیبینی کە خەیارەکە پاکدەکات و دەستی دەلەرزێ، خوێدانەکە دەگرێت بە دەستییەوەو خوێکە دەڕژێت. شتێک لە لاوازی و شەکەتی تیابوو کە کەمە کەمە ڕوخساری تێکدەدا. شەوان کە دەهاتەوە موسای بابەک لەسەر قەرەوێڵە هاوینەکەی خۆی، بە فانیلەو دەرپێ سپییەکانییەوە، بە برۆو لاجان و سمێڵە سپییەکەیەوە خەوتبوو، ئەو لە سەر کورسییەکە بەرابەر دالیا دادەنیشت، ئەو سوراحییە بەفراوەی خاڵیدەکردەوە کە شتێک لە گڕی ناو ڕۆحی دادەمرکاند، دەیگووت ئاو لەو درەنگ وەختەدا تامێکی تری هەیە. ئەو کۆنە گەڕۆکێکی چیابوو هەندێک شەو لەگەڵ ئیسحاقی لێوزێڕیندا درەنگانێک، دوای گەشتێکی درێژ، دوای عەزفی چەندەها سەعاتە بە ڕێگاوە، دەگەیشتنە سەر کانییەک، کە دەمی دەخستە ناو ئەو ئاوەوە هەستیدەکرد لەیەککاتدا ڕۆحی شەوو لەزەتی بێسنووری ئاو دەچنە گەروییەوە، هەستیدەکرد لەیەک قومدا ئاسمان و ئەستێرەش دەخواتەوە. دەیزانی کە مرۆڤ سەری پڕدەبێت لە مۆسیقا لەزەتێکی تر لە ئاو دەبینێت. بەڵام شەوان درەنگ کە دەگەڕایەوە بۆ لای دالیا هەستیدەکرد سەری پڕە لە ڕەشەبا، پڕە لە شەپۆلی تۆزاویی گەرما، پڕە لە بۆنی ڕزینی مەخلوقات لە ژێر ئاسمانی هاویندا.

دالیا و موسای بابەک پێدەچوو پێکەوە ئاسوودەبن، زۆرجار نیوەڕوان موسای بابەک دادەنیشت و باسی یادگارە دێرینەکانی خۆیَ دەکرد، باسی ئەو کاتانەی لە لەندەن دەچوو بۆسەیری یارییەکانی مانچستەر یونایتد، باسی سیحری بۆبی شارلتۆن و بۆبی مۆری دەکرد لە گۆڕەپاندا. سەری دەخوراند و یادگارییەکانی خۆی لەگەڵ گۆرانییەکانی کلثومدا دەگێڕایەوە. هەموو شتێکی لە یادبوو، لە یادی بوو کەی یەکەمجار گۆرانی «ژێردەریایی

زەرد» ـی بیتلزەکانی گوێ لێبووە، ئۆپرای «هۆڵەندی باڵداری» فاگنەریی بە گەروییەکی گڕ وەکو گۆرانیبێژەکانی ئۆپرا دەخوێند، هەندێ پارچەی لە «فیدیلیۆی» بیتهۆڤن لەبەر دەگووت و لە نێوانیدا دەوەستا و تەواوی چیرۆکی ئۆپراکەی دەگێڕایەوە، چۆن فلۆرستان بە زوڵم و ناهەق لەلایەن پیتزارۆی زاڵمەوە دەگیرێت و فڕێدەدرێتە بەندیخانەوە، چۆن لیۆنۆرای ژنی خۆی دەکات بە پیاوو بە ناوی فیدیلیۆوە وەزیفەیەکی دەستدەکەوێت و مێردەکەی ڕزگاردەکات. بەڵام هەمیشە لەگەرمەی گۆرانییە ئۆپرالییەکانیدا دەوەستاو دەستێکی بەسەری خۆیدا دەهێناو وەک شتێکی گرنگی بیرکەوتبێتەوە باسی ئەو ساتەی دەکرد کە یەکەمجار گوێی لە ئیرەج بووە، دەوەستاو کەمێک بیریدەکردەوەو دەیگووت: دالیا بەلاتەوە سەیر نەبێت، تاسەر گۆرانی پەپولەی ئازادی مەزهەری خالقی من باوەڕم بە بوونی گۆرانی کوردی نەبوو. دالیا نیوەڕوان چەندین جار چای لێدەنایەوە، موسای بابەک حیکایەتی گەشتە کورتەکانی خۆی لە پێچاوپێچی شارەکاندا بەدوای تابلۆو هونەرمەندەکاندا باسدەکرد. جەلادەت لەزەتێکی بێسنووری لە قسەکانی ئەو پیاوە دەبینی، هەستیدەکرد گەر بمرێت سەدەیەک لە جوانی و نهێنی لەگەڵ خۆیدا دەبات. شەوێکیان جەلادەت زۆر غەمگین بوو، کەمێک زووتر لە گەشتە شەوانەکانی خۆی گەڕایەوە. هێشتا موسای بابەک نەخەوتبوو. بەدەرپێ و فانیلە سپییەکەیەوە دوو سێ ئینجانەی بچوک و زەردو بێڕەونەقی ئاودەدا، کە جەلادەت باوەڕی وابوو لەم تەپوتۆزەدا نەسەوزدەبن، نەدەمرن. هەموو ئینجانەکانی ئەو شارە وابوون، نە بەتەواوەتی سەوزدەبوون و نەدەشمردن، وەک ئەوەی ئەوانیش لە نێوان ژیان و مردندا جۆلانێبکەن. وەک ئەوەی ئەوانیش ئەو ئازارە بچێژن کە لە تێکەڵبوونی ژیان و مردن دروستبووە. جەلادەت ئەو چەند ڕۆژە زۆر قووڵ بیری لەوەدەکردەوە کە ئەو دەتوانێت دوای مردنی موسای بابەک چی بکات؟. لە ناخیدا هەستیدەکرد کە ئەو تابلۆ بێشومارو زۆرانە

لە ملی ئەون... بەڵام چۆن؟ چۆن دەتوانێت دوای مردنی موسای بابەک ئەم تابلۆیانە ڕزگاربکات، بیانبات بۆ کوێ؟. ئەو شەوە هەموو خولیای لەسەرئەوەبوو گەر موسای بابەک بمرێت، گەر ئەم پیرەمێردە غەمگینە بمرێت، ئەو مۆزەخانە سەیرو ناوازەیە چی بەسەر دێت؟ دڵنیابوو ڕۆژێک هەموو ئەو ئیرسە دەکەوێتە ملی ئەو، ئاه، ئەی ئەوکات ئەگەر نەیتوانی هیچ بکات، ئەگەر نەیتوانی ئەو مێژووە دوورو درێژە بپارێزێت، ئەوسا چی؟ هەستیدەکرد لەوە بچوکترو بێئەزموونترو بێهێزترە ئیرسێکی وەها بخرێتە گەردنی، دەشیزانی لەو زیاتر کەسی تر نییە، هیچ کەسێکی تر. بە موسای بابەکی گووت: دەبێت پێکڕا پلانێکمان هەبێت، دەبێت شتێک هەبێت لە کاتی مەترسیدا بیکەین... من دەبێت کە لەم شارە دەرچووم تابلۆکان لەگەڵ خۆمدا ببەم. خۆ تا قیامەت لەم تەپوتۆزەدا ناژیم، من تۆ نیم، دکتۆر من ناتوانم لێرەدا بژیم.

دکتۆر ئینجانەکانی ئاودەداو پێدەکەنی و دەیگووت: جەلادەت تۆ کاتێکی زۆرت هەیە، بۆئەوەی تەماشای تابلۆکان بکەیت و خۆشتبوێن. من نازانم چی ڕوودەدات، چی دەبێت؟ چۆن بزانم؟ بەڵام دەزانم کە دەبێت تابلۆکانت خۆشبوێت. جەلادەت مەهێڵە مەهێڵە تیابچن، هیچ نەبێت لە خەیاڵی خۆتدا هەڵیانگرە، لە خەونەکانتدا هەڵیانگرە، هەموو توانای خۆت بخەرە کار، بەڵام گەر شتێک لەسەروو ئیرادەی تۆوە بوو، خەم مەخۆ، دڵنیابە جێگایەک هەیە کە شتە جوان و نەمرەکانی لێ دەژین. شتە جوانەکان نامرن.

جەلادەت دەستیدەگرت بەسەرییەوەو قسەکانی ئەو سەربازەی بیردەکەوتەوە. دەربارەی نەمردنی مۆسیقا، دەربارەی شارێک کە لە جوانییە جاویدەکان دروستبووە. وەک لە نێوان ئەو هەموو پرسیارەدا وێڵ و دەستەپاچەبێت، دەیگووت: بەڵام جوانییەکان چۆن دەژین... چۆن، کە نەگەن بە دەستی مرۆڤ، نەگەن بە چاوی، نەگەنە ناو ڕۆحی؟

دکتۆر سەری دەخوراند و کەمێک بیریدەکردەوەو دەیگووت: گوێبگرە کوڕی گەنج... جوانی دەگمەنترین شتی سەر ئەم ئەستێرەیەیە، لەوانەیە بتوانیت دروستیبکەیت، بەڵام چۆن وای لێدەکەیت بمێنێتەوەو بژی؟ ئەوە پرسیارەکەیە... چۆن ناهێڵیت لە مەملەکەتێکی جەهەنەمی وەک ئەم وڵاتەدا کە هەموو شەوێک سەدان ڕۆحلەبەر بە زیندوویی دەکرێن بە ژێر زەوییەوە و دەمرن، چۆن... چۆن وادەکەیت بیرکردنەوە لە جوانی نەمرێت؟ ئەو ساتەی کە بیرکردنەوە لە هونەر مرد ئیتر هەموو شتێ کۆتاییدێت، نەتەوە، وڵات، شەرەف هەموو شتێک... هەموو شتێک. ڕەنگە نەتوانین هیچ شتێک ڕزگاربکەین، ڕەنگە دواجار هەموو ئەم شتانە بفەوتێت، من نازانم... جەلادەت... چوو زانم... دەتوانم چیت پێبڵێم؟ من وەڵامێکم نییە، من هیچ خودایەک، هیچ دەنگێکی نهێنی فەرمانی پێنەکردوم ئەم مۆزەخانە گەورەیە دروستبکەم... هیچ شتێک... لەبەرئەوە نازانم کە من مردم ئەم شتانە دەچن بۆ کوێ؟ تۆ تاکە کەسێکی کە دەتوانیت شتێک لەمانە دەربازبکەیت. ڕەنگە بتوانیت هەمووی ڕزگاربکەیت، و لەوانەشە بتوانیت تەنیا حیکایەتەکەیان ڕزگاربکەیت. لەم شارە بچیتە دەرێ و بڵێی پیاوێکی شێت لە سەحرادا هەبوو کە ژیانی خۆی لە خۆشەویستی تابلۆدا سەرفکرد. هەندێجار هەستدەکەم ڕزگارکردنی حیکایەتێکیش وەک ڕزگارکردنی هەموو بەشەرییەت وایە.

جەلادەت دەیگووت: دکتۆر، من دواجار بەبێ نیشتیمانی خۆم ناژیم... تۆ تاکە کوردێکی بینییێتم هێند بەرگەی سەحرای گرتبێت، دکتۆر من بەم ئەستێرانە و بە جوانی دالیا سیراجەدین سوێندت دەدەم کە شتێک بکە، ئەم تابلۆیانە بگەنە جێگایەک لە باکوور. من لەوێ هەموو عومرم بۆت دەپارێزم، دەبم بە پاسەوانیان، پێشانگای گەورە گەورەیان بۆ ڕێکدەخەم... دەیانگێڕم بە زەویدا، شارەو شار دەیانبەم... بەڵام دکتۆر من لێرەدا تەنیا دەتوانم لە تەپوتۆزو تارمایی و ڕەشەبا هەڵبێم، دکتۆر دەتوانم چیبکەم، لێرەدا دەتوانم چی بکەم؟

موسای بابەک دەستی دەکێشا بە ناوچاوانیدا و وەک خەفەت لە بێخەبەری جەلادەت بخوات دەیگووت: چەندە نەفام و بێئاگایت، کوردستان ئێستا ترسناکترین شوێنی دونیایە... ئێستا هیچ جێگایەک نییە ئەم تابلۆیانە بپارێزێت ئێرە نەبێت. ئەم ژێر زەمینە تەنیا جێگایەکە مرۆڤ ئەم نهێنییەی تیا هەڵگرێت. وەکو خۆت، وەکو دالیا، وەکو من، ئێمەش مەخلوقاتین وەک ئەو تابلۆیانە لێرە زیاتر جێگایەکی تر نییە تیابژین و بمانپارێزێت، ڕۆژێک هەموو شتەکان دەگۆڕێت، هەموو شتەکان، ئەوکات پێکەوە تابلۆکان دەبەین بۆ شارێک لە باکوور، لەوێ هۆڵێک دەگرین گەورەو ئەفسانەیی، هۆڵێک درێژتر لە هەر گەلەرییەکی دونیا، هەموو نیگارەکان نیشاندەدەین، بەلام تا ئەو کاتە بە ئومێدی ئەوەبە کە جوانی نامرێت. جوانی هەرگیز نامرێت. لەوانەیە من و تۆ لە جێگایەکدا وەستابین نەیبینین، بەلام نامرێت.

* * *

کۆتایی جەنگ لەگەڵ خۆیدا شاری تەپوتۆزە زەردەکانی بە جۆرێکی سەیر چکۆلانەکردەوە، هەزاران ئافرەت کە مێرد و براو بابیان لە جەنگدا گیرابوون، یاخود ماڵ و حاڵیان فەرامۆشکردبوو، ساڵەهابوو بێ مۆڵەت لە نێوان بەرەکانی باشوورو باکووردا هاتوچۆیاندەکرد، گەڕانەوە بۆ ماڵی جارانی خۆیان و خولیایان بوو ژیانێکی نوێ دەست پێبکەنەوە. ئافرەتانیش لەدووی کۆتاییهێنان بە زیلەتێکی درێژ، بە کۆمەڵ شاریان جێدەهێشت، جەلادەت زۆربەی بەیانیان لە باڵکۆنەکەوە ئەو خانمانەی دەبینی کە لە پیکابی چکۆلانەدا بە هەلهەلە لێدان ماڵاواییان لە شار دەکرد، لە پرتەقاڵی سپی زۆربەی کچان و خانمان وازیان هێناو جگە لە چەند خانمە گچکەیەکی بێکەس کەس نەما لەسەر سەحنەکە سەمابکات، هەندێک لە مۆسیقارەکان بە جۆرێکی ئاڵۆزو بێبەهانەو بێ قسەیەکی پێشوەخت

ونبوون و نەگەڕانەوە بۆ پرتەقاڵی سپی. ڕۆژگارێک هاتە پێشێ جەلادەت بە تەنیا عەزفی بۆ سەماکەرێکی چکۆلانە دەکرد، ڕەونەقی ڕۆژە زێڕینەکان نەمان، ساڵۆنەکەی پرتەقاڵی سپی زۆربەی شەوان خاڵی بوو لە میوان. هەندێجار جگە لە جەلادەت کەس لە پرتەقاڵی سپییدا نەدەما. هەندێک شەو جەلادەت دەچووەدەرێ و بە کوچە چۆڵەکاندا دەگەڕا کە جگە لە هەندێ ڕۆحی غەریب و وێڵ میوانێکی تریان نەبوو. مانگەکان دەڕۆیشتن و وەک ئەوەبوو ئەو شارە لە بیر دونیا چووبێتەوە، هەندێک شەو جەلادەت هەڵدەستاو هەستیدەکرد ئەو شارە دەجوڵێتەوە، زۆر شەو لە تاریکیدا لە بالکۆنەکەدا دەوەستاو وەک ئەوەبوو لە سەر کەشتییەکی گەورە وەستابێت و لەدەریادا تەماشای بەندەرە دوورەکان بکات. هەندێجار چۆن موسافیرێکی دەریایی لە دوورەوە چرای شارانی دوور دەبینێت، لە دوورەوە چراخانی هەندێک شاری خەیاڵی دەبینی، هەندێجاریش هەناسەی هەڵدەکێشاو بۆنی ڕووبارو ئاوی نزیک سینەی پڕ دەکرد لە شێیەکی غەمگین، لە بۆنی ماسی بەجێماو لە هەوادا. هەندێجار وا هەستیدەکرد بە ناو باغی خورمادا دەڕۆن، هەندێجاریش هەستی وابوو بە ناو جەرگەی شاری جەنجاڵدا سەفەردەکەن، بەڵام کە بەیانیان هەڵدەستا جگە لە سنووری ئاسنینی ئەو سەحرا پیرو دزێوە زیاتر هیچی دیکە نەبوو... هیچی دیکە.

لە زستاندا جەلادەت و دالیا کاتێکی زۆر زیاتریان پێکەوە بردەسەر، زۆربەی بەیانیان جەلادەت دەچوو بۆ بیمارستانە چکۆلەکەی موسای بابەک. ئەو ماوەیە کاتێکی دوورو درێژیان لە ناو تابلۆکاندا دەبردەسەر. زۆرجار دالیا سیراجەدین و دکتۆر موسای بابەک گفتوگۆی درێژیان لەسەر جیاوازی هونەرەکان ئەنجامدەدا، دالیا ڕای وابوو بەراورد بە هونەرەکانی دیکەی وەک شیعر و مۆسیقاو سەما توانای هونەری شێوەکار لەسەر تەعبیر لە ناخی مرۆڤ کەمترو سنووردارترە. پێیوابوو تابلۆ شتێکە لەوانەیە باش تەعبیر لە ڕۆحی هونەرمەند بکات، بەڵام ناتوانێت باش

قسە لەگەڵ ڕۆحەکانی دیکەدا بکات، توانای لەسەر دواندنی قووڵایی مرۆڤ، لەسەر هەژاندنی ناوەوەی بچوکترە. بەڵام موسای بابەک ڕای وابوو توانای شێوەکار لەوەدا نییە چەند کار لە ناوەوە دەکات، بەڵکو لەوەدایە چەندە چرکەیەکی ڕۆحی دەگۆڕێت بۆ ئەبەدییەت. چەندە دەتوانێت نهێنییەک ئاشکرابکات کە بە شێوازە ئاساییەکان ئاشکراناکرێت. پێیوابوو هونەر نیگارکردنە، هیچ هونەرێک ناتوانێت لە نیگارکردن ئازادبێت. هەموو هونەرێک خولیایەتی شتێک نیگاربکات و بەو نیگارەش تێکەڵ بە ئەبەدییەت بێت. هیچ هونەرێکیش وەک شێوەکار ناتوانێت ئەو توانای نیگارکێشانە بەرجەستەبکات. پێیوابوو نیگارکێش چەکێکی سیحراویی هەیە کە هیچ هونەرمەندێکی تر نییەتی، ئەویش ڕەنگە، بە هۆی ڕەنگەوە دونیا بەتەواوەتی دەگۆڕێت. هەموو گۆڕانکارییەکانی دونیا، گۆڕانن لەسەر ئاستی فەنتازیادا، تەنیا لە تابلۆدا ئەو فەنتازیایە سروشتی تەماوی و نادیاری خۆی وندەکات و دەبێت بە بەرهەمێکی ڕاستەقینە. موسای بابەک پێی لەسەر زەوییەکە دادەکوتا وەک ئەوەی ئامادەبێت بۆ شەڕ دەیگووت: دونیا لەناو تابلۆ نەبێت، هیچ وەخت گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە، ئەوە ماتیس و پیکاسۆن سەیرکردنی ئێمەیان بۆ جیهان گۆڕیوە نەوەک موحەمەد و مارکس، نەوەک شۆڕشی فەرەنسی و شۆڕشی ئۆکتوبەر. بەڵام دالیا سیراجەدین دەیگووت: مامۆستا بوەستە، بوەستە. تابلۆ کەمتر دەتوانێت ئاوها کاریگەربێت، خوای گەورە تۆ باسی چی دەکەیت؟ کێشەی هەرە گەورەی نیگارکێشان ئەوەیە کە دەشێت بفەوتێت و لە بەینبچێت، تابلۆ شتێکی ناسکە، بوونێکی مادیی هەیە قابیلی هەڵگرتن نییە.

دالیا ڕوون و ئاشکرا ڕای وابوو هونەر شتێکە دەبێت مرۆڤ لەگەڵ ڕۆحی خۆیدا هەڵیبگرێت، لە یادەوەریدا هەڵیبگرێت، بتوانێت بیپارێزێت، بەڵام تابلۆ دیلی خۆیەتی، یەکجار کە لەناوچوو، ئیتر بۆ هەتا هەتایە

دروستناکرێتەوە. لێرەوە شێوەکار پەیوەندییەکی لاوازی بە ئەبەدییەتەوە هەیەو نوقمی ساتەوەختە تێپەڕەکانە.

موسای بابەک وەک ئەوەی پێشتر زۆر بیری لەم مەسەلەیە کردبێتەوە دەیگووت: تابلۆیەک کەدەمرێت بۆ هەتا هەتایە دەمرێت، ئەوە زۆر ڕاستە، فورسەتی نیگارێک بۆ ژیان لە فورسەتی شیعرێک یان مۆسیقایەک کەمترە. بەلام ئەو شتانەی تابلۆ دەربازیاندەکات و دەیانبات بۆ ئەبەدییەت، لە هەر شتێکی نەمری دیکە بینراوترو بەرجەستەترن. توانای مۆنالیزا لەسەر مانەوە هەزاران جار لە توانای ئیمپراتۆرییەتە گەورەکان لەسەر ژیان و بەردەوامی درێژترە. پادشاکان دێن و دەڕۆن... سەرۆکەکان دێن و دەڕۆن... بەلام مۆنالیزا تەمەنی لە تەمەنی هەموو پادشاکان و ئیمپراتۆرییەتەکان درێژترە. مێژوو دەڕوات بەلام مۆنالیزا هەر لەوێیە، مایای ڕووت و قووتی گۆیا هەمیشە تا کۆتایی مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیە لەویادایەو بە چاوە عەیارەکانی سەیرماندەکات، ئۆلۆمپییای چاوخومارو کارەکەرە ڕەشپێستەکەی هەر لەوێن، ئەستێرەکانی ڤان کوخ هەر لەوێن. با ئەستێرە لە ئاسمان نەمێنێت، با بەیانییەک هەستین و کەوتبینە زەمینێکەوە بێ ئاسمان و ئەستێرە، تا ئەبەد ئەستێرە گەورەکانی ڤان کوخ لەسەرماندان. مۆسیقاو شیعر ڕوخسار لە شتەکان دەستێننەوە ئینجا دەیانبەن بۆ ئەبەدییەت، بەلام شێوەکار ڕوخسار بە شتەکان دەبەخشێت، ئینجا بەرەو ئەبەدییەت هەڵیاندەگرێت... ڕوخسار... ڕوخسار جەوهەری هونەرە. هونەر تەنیا هەستکردن نییە بەو شتانەی کە نایانبینین بەڵکو بینینی ئەو شتانەیە کە دەبێت ببینین. ئەبەدییەت شتێک نییە تەنیا بە خەیاڵ هەستی پێبکەین، ئەبەدییەت شتێکە دەبێت ببینین. تەنیا هونەری شێوەکار ئەو دەرفەتەمان بۆ دەڕەخسێنێت ئەبەدییەت ببینین.

جەلادەت سەیری لەوەدەهات دکتۆر موسای بابەک بەردەوام باس لە «بینینی ئەبەدییەت» دەکات. هەمیشە گفتوگۆکانی دالیا و دکتۆر لەو

خاڵەدا دەگەیشتە بونبەست کە قسەیان لە «بینینی ئەبەدییەت» دەکرد. دکتۆر ڕای وابوو مرۆڤ لە ڕێگای تابلۆیەکەوە دەتوانێت ئەبەدییەت ببینێت، ڕای وابوو بینینی مۆنالیزا بینینی ئەبەدییەتە، بینینی ئەو جوانییە جاویدان و ئاوانەبووەیە کە تەمەنی لە تەمەنی هەموو شتەکانی دیکەی مرۆڤ درێژترە. بەڵام لای دالیا ئەبەدییەت شتێکی تر بوو، ئەبەدییەت ئەوەبوو چاو بنوقێنیت و بە سەرزەمینێکدا سەفەربکەیت کە تا ناکۆتا درێژدەبێتەوە. هەستکردن بوو بەو دەرگا گەورەیەی ئاوازێک لە خەیاڵتدا دەیخاتە سەر پشت، شتێک بوو لە سەفەرێک دەچوو لەسەر کەشتییەک لە ناو زەریایەکی گەورەدا بە ناو بێشومار دیمەنی نەناسراودا. ئەبەدییەت لای دالیا بینین نەبوو بەڵکو مەلەکردن بوو لە ئۆقیانوسێکدا پڕ لە وشەو نەغمەو هەست. ئەو دەیگووت: ئەبەدییەت بە چاو نابینرێت، بەڵکو تەنیا بە خەیاڵ دەبینرێت، چونکە سەفەرێکی دووردرێژە بە ناو تەلیسمدا.

جەلادەت نەیدەتوانی هیچ بڵێت. بەڵام سەرسام بوو لەوەی دوو مرۆڤ کە شەیدای شتە جاویدەکانن لەم شارە تێپەڕو ناجێگیرو سەرابییەدا دەژین، شارێک کە هەردووکیان باوەڕیان وابوو لە لم زیاتر هیچ شتێکی تیانییە بەرگەی گورزەکانی زەمەن بگرێت. جەلادەت خۆی شتێکی دیاریکراوی نەبوو لەسەر ئەبەدییەت بیڵێت، هەستیکرد لەو ڕۆژەوەی کە مۆسیقای لە یادی خۆی بردەوە، پەیوەندی بە هەموو شتێکی جاویدەوە پچڕابێت، هەستیدەکرد توانای لەسەر تێگەیشتن تا بێت بچوک دەبێتەوە. باوەڕی وابوو شتی زۆر قووڵ دەبینێت بەڵام لە ماناکانیان تێناگات. پرسیاری زۆر تاریک و سەیر لە سەریدا سەرهەڵدەدەن وەڵامەکانیان نازانێت، لە وێستگەی تاریکەوە بۆ وێستگەی تاریکتر دەڕوات و نازانێت بۆ دەڕوات. ڕۆژ دوای ڕۆژ خۆشەویستی بۆ دالیا قووڵتر و پڕ ژانتر و ئەستەمتر دەبوو. دڵنیابوو ئەو خۆشەویستییەش بەشێکە لەو شتە دووردەستانەی تێیانناگات. جەلادەت ئەو سەردەمە جگە لە خۆشەویستی بیری لە هیچی

تر نەدەکردەوە، بیرکردنەوە لە خۆشەویستی دەچووە شوێنی بیرکردنەوە لە مۆسیقا، دەچووە شوێنی بیرکردنەوە لە مردن. «ئاە مۆسیقا...» هەندێک بەیانی لە خەو هەڵدەستاو لە نائاگایدا ئۆکسترایەکی گەورە سیمفۆنیای «مۆسیقای چکۆلانەی شەو»ی مۆزارتی لێدەدا. چوار پێنج ساڵ لەوەوبەر کە هێشتا وەک منداڵێک خەونی ئەوەی هەبوو ببێتە بلیمەتێکی تر لە مۆسیقادا، باوەڕی بە مۆزارت لە باوەڕی بە خودا بە هێزتربوو. هێدی هێدی مۆزارت بوو بوو بە ژێر تەپوتۆزی ترسناکی ڕوداوەکانەوە، بەڵام ئێستا هەموو بەیانییەک هەڵدەستاو ئەو مۆسیقا ئەفسانەیەی مۆزارت لەسەریدا بوو، دەیویست دەستی لەسەر ئیقاعی ئاوازەکان بجوڵێنێت و نەیدەتوانی، پەنجەکانی نەیاندەکرد، شەرمی لە خۆی دەهات. «ئاە مۆزارت...» بە کوچەکاندا ڕایدەکردو ئەو سۆزە قووڵەی مۆزارت، ئەو گریانە نهێنییەی لە کەمانەکانی ئەو دەتکان لە دڵیدا بوو. بەڵام مۆسیقایەک بوو ئازاری دەدا. تەنهایی و بچوکی خۆی بیردەخستەوە، هەستیدەکرد لەوە گەمژەترە شایستەی ئەوەبێت پاشماوەی ئاوازەکانی مۆزارت هەر لەسەریدا بێت. چیتر بیری لای ئەوە نەبوو ببێت بە مۆزارتێکی تر، بەڵکو بیری لای ئەوە بوو بتوانێت بژی و بیر لە مۆزارت نەکاتەوە... بژی و ئەو «مۆسیقا چکۆلانەیەی شەو» بەیانیان بە ئاگای نەهێنێتەوە. ڕایدەکرد بۆ لای دالیا، بەڵام چی لە دالیا دەویست؟ چی؟ خۆشی نەیدەزانی. پەیوەندیشی لەگەڵ دالیادا هەروەکو پەیوەندی بوو بە مۆسیقای مۆزارتەوە، وەک پەیوەندی بوو بە شاکارەکانی ئەوەوە «سیرانادای ژمارە نۆ» یاخود «سیرانادای ژمارە شەش» کە هەندێجار وەک کانییەکی نهێنی بن و لە یادگارەکانیدا بتەقن لە خەیاڵیدا هەڵدەقوڵێن و دەبایە لێیان ڕابکات. چی لە دالیا دەویست؟ نەیدەویست خۆشیبوێت، گرنگ نەبوو دالیا وەک ئەم خۆشیبوێت، گرنگ نەبوو وەک مەعشوق تەماشایبکات. نەیدەویست لەگەڵیدا بخەوێت، نەیدەویست بیگرێت و ماچیبکات، نەیدەویست غەزەلی لەگەڵدا

بکات، بەڵام چی دەویست؟ خۆشەویستی لای جەلادەت وەک مۆسیقابوو، وەک چۆن لە مۆسیقادا دواجار مرۆڤ نازانێت دەیەوێت بڵێت چی، لە خۆشەویستی ڕاستەقینەشدا مرۆڤ نازانێت دەیەوێت بڵێت چی. کێشەکە هەر بێتوانایی زمان و کەم قودرەتی وشە نەبوو لە تەعبیرکردندا، بەڵکو ئەوەبوو کە دواجار خۆشەویستی ڕاستەقینە وەک مۆسیقا ئامانجێکی نییە، تەفسیرێکی نییە بۆ لێرەیە و چی دەوێت، کە توانی تێبگات چی دەوێت، لەوە دەکەوێت خۆشەویستی بێت، کە ڕوخسارێکی نەگۆڕ و تەفسیرێکی کۆتایی وەرگرت ئیتر دەمرێت. خۆشەویستی ئەوەیە کە شادومانی بە بوونی ئەم مرۆڤە لەسەر زەوی، شادومانییەک کە هیچ مەبەستێکی لە پشت نییە، عاشقی ڕاستەقینە یەکێکی خۆشناوێت لە بەرئەوەی جوانە، بە ویقارە، ئەفسوناوییە، بەڕەوشتە، بەمەکرە یان هەر سیفەتێکی بێ مانای تر. بەڵکو لەبەرئەوەی ئەوە تەنیا ڕێگایە بیر لە هیچ غایەتێک نەکاتەوە. خۆشەویستی لای جەلادەت لەو کاتانەدا ئەوە بوو واز لە هەر مەبەستێک بهێنێت بێئەوەی واز لە ژیان بهێنێت، واز لە بیرکردنەوە بهێنێت بێئەوەی شێت بووبێت، واز لە پاشەڕۆژ بهێنێت بێئەوەی مردبێت. هیچ داوایەکی لە دالیا نەبوو، بەڵکو تەواوی عەشقی بۆ دالیا لەسەر ئەوە دروستبووبوو کە عەشقێکە بێهۆ و بێ داواکاری. کە خۆشەویستی ئامانجی ئەوە نەبوو لە بەیەککەیشتندا کۆتایی بێت، وەک ژوانێکی لێدێت کە تا هەتا هەتایە دوادەخرێت، ژوانێک کە جێیدەهێڵێت لە ئەبەدییەتدا بێتەدی. کە خۆشەویستی ئامانجی نەبوو وەک فیراقێکی لێدێت کە لە زەمانێکی دووردا ڕوویدابێت و لێرە لەسەر زەوی دەرکی پێدەکەرێت، کە وای لێهات وەک ئەوە بێت ڕۆحێک هەستبکات پێشتر لەگەڵ مەعشوقەدا یەک شت بووە، پێشتر لەسەردەمێکی لە بیرکراوو لە ناوچوودا ئەو بەشێک بووە لە یار، کە دەگاتە ئەو بڕوایە زەمین و ژیان هیچ نییە جگە لە وێستگەیەک بۆ هەستکردن بەو فیراقە، کە خۆشەویستی لە بری خواستی یەکگرتنەوە بوو

بە هەستێکی قووڵی دابڕان، ئیتر دەبێت بە پڕۆژەی ئەبەدییەت. کە دالیا بە دکتۆر بابەکی دەگووت: دکتۆر ئەبەدییەت بە چاو نابینرێت، بەڵکو بە خەیاڵ دەبینرێت. لای جەلادەت وەک ئەوە بوو بەو بڵێ عەشق بە چاو نابینرێت، بە دەست ناگیرێت، بەڵکو تەنیا بە خەیاڵ دەتوانیت تیا بژیت.

چەند ساڵێک دواتر کە دەهات بۆ لای من، کە بە جزمە درێژ و پاڵتۆ چەرمە ڕەشەکەیەوە بە خۆی و جگەرەیەکەوە بەرابەرم دادەنیشت، پێکەوە گوێمان لە «سیرانادا میلانکۆلیکیۆ» ی چایکۆفسکی، یان هەر کۆنسێرتێکی فیۆلینی دیکەی ئەو دەگرت. هەمیشە سەیری بنمیچەکەی دەکردو دەیگووت: خۆشەویستی من بۆ دالیا ئاواتی تێکەڵاوبوونی تیا نەبوو، بەڵکو وردبوونەوە بوو لە فیراق. خۆشەویستی هەیە تەنیا بیر لە یەکگرتن و تێکەڵاوبوونی ڕۆح و جەستەکان دەکاتەوە، عاشقیش هەیە تەنیا لە فیراق ڕادەمێنێت. عاشقە بچوکەکان دەپرسن کەی بە مەعشوقە دەگەم، عاشقە گەورەکان دەپرسن، کەی و لە کوێی ئەم وجودەدا من لە مەعشوقە جیابوومەتەوە. وەک ئەم کەمانە تەنیاو هەناسە درێژانەی چایکۆفسکی کە هەرکات گوێمان لێی دەبێت وەک ئەوەیە دەنگێکی خەوتوو لە ناو سەری خۆماندا بدۆزینەوە، دەنگێک کە لە سەرەتای خەلیقەتەوە لە دڵماندا ڕوواوەو دواتر لێمان جیابۆتەوە. عەشق وەک هەموو مۆسیقایەکی مەزن شتێکە هەستدەکەیت لەوەوبەر، لە دێرزەمانەوە بەشێک بووە لە تۆ.

* * *

تەواوی زستان پرتەقاڵی سپی شوێنێکی خامۆش بوو، تەنیا جەلادەتی کۆتر و یەک دوو کچی غەمگینی تیابوو کە بە جلە عەرەبییە درێژەکانیانەوە لە ساڵۆنەکەدا دادەنیشتن و لفکەیان دەچنی، بە خەنە نەخشیان لەسەر دەست و قاچ و سنگیان دروستدەکرد. لەوجۆرە کچانە نەبوون جەلادەت

بتوانێت بە ستایشکردن و پیاهەڵدان خۆشحاڵیانبکات. دوو کچی شێت بوون نەعلەکانیان دەخستە سەر مێزەکان و خۆیان لەسەر زەوییەکە پاندەبوونەوەو پێکەوە بە دیالێکتێکی باشووری گۆرانی ناو هۆرەکانیان دەگووتەوە. گەلەک درەنگ درەنگ خۆیان دەشت، بەجووتە لەسەر یەک سینی نانیاندەخوارد کە پڕیاندەکرد لە برنج و شلەیەکی زۆر و بەدەست تێیدەنیشتن. جۆرە گیایەکیان دەدا لە لەشیان بۆنێکی کەسکونی هەبوو، جەلادەتی وا لێدەکرد دەرگای ژوورەکەی داخات و نەیەتەدەرێ. هەندێ شەو کە تاک و تەرا هەندێک میوان دەردەکەوتن سەمای خاوو بێڕۆحی ئەو دوو کچە هەرزوو دەیتۆرانن و پاش ئیستێکی کورت هەڵدەستان و دەڕۆیشتن. ئەو ڕۆژانە سەمەر ساڵح و مێردەکەشی بەدەگمەن دەهاتن بۆ پرتەقاڵی سپی، چەندجارێک کڕیاریان هێنایە سەر پرتەقاڵی سپی بیفرۆشن، بەلام پێدەچوو کەس ئارەزووی نەبێت پارەیەکی زۆر بخاتە شوێنێکی وەها مردووەوە. لە کۆتایی زستاندا بارانێکی زۆر باری، دوای نزیکی ساڵێک ئەوە یەکەمجاربوو جەلادەت باران ببینێت. باران هەستێکی سەیری بە کۆتایی تیادروستکرد، ئەو چەند ڕۆژەی باران باری لە پرتەقاڵی سپی نەچووە دەرێ، کە هێدی هێدی دەبووە شوێنێکی خاڵی و پەتی، لەو نێوەندەدا ئەو دوو کچەش پرتەقاڵی سپییان چۆلکرد و جەلادەت بە تەنیا مایەوە. بێدەنگی نێو ئەو ماڵ و ساڵۆن و ژوورانە شتێکی کوشندەبوو، بۆیەکەمجار جەلادەت دەیتوانی بە ئاسانی هەموو ژوورەکان ببینێت، هەموو دەرگاکان بکاتەوە، تارماییەکانی ڕابوردوو ڕاوبکات و بۆنە خەیاڵییەکانی ئەو ڕۆژگارە بەسەرچووانە پڕ بە سینەی هەڵمژێت. هەندێک ئێوارە بە تەنیا لەسەر پلیکانەکان دادەنیشت و بە خەیاڵ دیمەنی ئەو ڕۆژگارانەی ڕەسمدەکردەوە کە پێدەچوو بۆ ئەبەد لە بەین چووبن. بەر ئاوێنەکانی پڕ دەکردەوە لەو کچانەی بە پەلەپەل دەیانویست مەکیاجەکانیان تەواوبکەن، بە ساڵۆنەکەدا ڕایاندەکردو بەسەر یەکدا دەیانزریکاند، دەکەوتن و پێدەکەنین، باوەشیان

دەکرد بە یەکدا و دەگریان. خۆشحاڵ بوو بە خەیاڵیش بێت یادگاری بە جێماوی ئەو کچانە بینێت کە هەمووی چەند مانگ لەوەوبەر ئەو تیاترە چکۆلەو شادمانەیان بەسەفاو جوانی خۆیان پڕکردبوو، بەڵام ئێستا بۆ هەتاهەتایە ونبووبوون، ڕۆیشتبوون و لە شارێک لە شارەکانی ئەم وڵاتە غەمگینەدا جۆرە ژیانێکی تریان دەست پێکردبوو. چەلادەت دڵنیابوو گەر بڕوات لەوانەیە چیتر ئەو خاڵ و بنکانەی پشکنین وەک جاران سەختگیرنەبن، لەوانەیە بتوانێت لە دەستیان دەربازبێت و بگاتە پایتەخت، لەوێوە ماشێنێک پەیدابکات بیباتەوە بۆ کوردستان. بەڵام لەوێ دەتوانێت چیبکات؟. تاکە جێگایەکماڵی ئەو برا گەورەیەتی کە بەدرێژایی منداڵی ئازاری دابوو، میزی بەدەفتەری نۆتەکانیدا کردبوو، دڵنیابوو ناتوانێت لە هەفتەیەک زیاتر بەوڵاوە بمێنێتەوە، ژنەکەی کەویستی دەریبکات، گەر شەوی تەرزەبارانیش بووە دەریدەکات. لەوێ بترازێت کوێ هەیە ڕووی تێبکات، دەبێت ببێت بە سەرباز، بەڵام مردن لە سەربازی خۆشترە. لەو ساتەدا چەلادەت لەم شاری تەپوتۆزە زیاتری نەبوو کە بیکات بە پەناگا، لەم تیاترۆخانە خاڵییە زیاتر جێگایەکی تری نەبوو لێی بژی. ئەو ماوەیە جار دوای جار دەگەڕایەوە بۆ تەماشاکردنی ئەو تابلۆیە لە مۆزەخانە نهێنییەکەی موسای بابەک. شتێک بەو تابلۆیەوە دەیبەستەوە وەک پەیوەندی ڕاوکەرێکی ماسی بە دەریاوە، پەیوەندی باڵدارێکەوە بە درەختێکەوە لە ناو ملیۆنەها درەختدا، پەیوەندی مامۆستایەکی ماتماتیک یان فیزیک بە پرسیارێکەوە کە ناتوانێت وەڵامەکەی بدۆزێتەوە. هەمیشە دوای ماندوبوونێکی درێژ دەگەڕایەوە بۆ لای دالیا و سەری دەخستە سەر کۆشی و دەگریا. نەیدەزانی بۆ دەگری، بەڵام دەیزانی دەتوانێت بەدەنگی بەرز لە بەردەم دالیادا بگری، دەیزانی هەردووکیان بۆنی مردنیان لێدێت. ئەو مردووانەی کە پێکەوە بینیبوویانن لەگەڵیاندا بوون، لە نێوانیاندا بوون، کە سەیری چاوی یەکتریان دەکرد ئەو منداڵانەیان بە یادا دەهاتەوە کە لە سەحرا بینیبوویانن، ئەو منداڵە

بچوکانەی کە با لەسەحراوە دەهات بۆنی ڕۆحیان لەگەڵ خۆیدا دەهێنا. کە سەری خستە ناو دەستی دالیاوەوە دەگریا هەستیدەکرد بۆ ئەو ڕۆحە تەنهایانەی ژێر لم دەگری کە خەیاڵی هەردووکیانی پڕکردبوو. دوو کەس بوون بێئامانج، بێپاشەڕۆژ، بێئومێد... چاوەڕوانی ڕوودانی موعجیزەیەکیان دەکرد لەو شارە دەریانبهێنێت و بیانخاتە سەر ڕیتمی ژیانێکی تر.

هەندێجار لەگەڵ هەندێک مۆسیقاری دیکەی ئەو شارەدا لە سالۆنێکی چکۆلانەدا کە فەهمی بەسری دەیبرد بەڕێوە یەکتریان دەبینی، کۆمەڵێک مۆسیقاربوون هەر یەکەیان لەگەڵ گروپێک و تیاترێکدا کاریاندەکرد، زۆربەیان تەنها مابوونەوە، بێکارییەکی کوشندە هەموویانی گرتبووەوە، بچوکبوونەوەی ئەو شارەو تەسکبوونەوەی کوچەکانی ئەوانی زیاتر لەیەک نزیکدەکردەوە، زۆربەی کات لە کوچەکاندا یەکتریان دەبینی، کە پیکابی فرۆشیارە گەڕۆکەکان دەهات لە نزیکییەوە لەگەڵ یەکدا دەوەستان، زۆربەیان خەڵکێک بوون شوێنێکی تریان نەبوو لەم سەر زەمینە ڕووی تێبکەن. پێکەوە لە کولبەیەکی گڵ و شێداردا کۆدەبوونەوە، هەموو دەیانخواردەوەو مەستدەبوون، جەلادەت بۆ یەکەمجار لەو دانیشتنانەدا فێری خواردنەوە بوو. کە دادەنیشت خۆی لە بیردەکرد ئەو دانیشتنانە کردی بە جگەرەکێشێکی هێند زۆرکێش لەگەڵ تەمەنیدا نەدەگونجا. ئەو ماوەیەی کە کارنەبوو بۆ پارەی بیرەو جگەرەکانی دەبایە لە دالیا قەرزبکات. ئەو هەمیشە بە پەژارەیەکی زۆرەوە تەماشای جگەرە خواردن و بیرە خواردنەوەکانی دەکرد و بە ناسکییەکەی خۆی دەیگووت: عومری من تۆ چیدەکەیت، وا بڕوات هەر بە گەنجی خۆت دەکوژێت.

ئەو شەوانەی مەستی و بێهۆشی یارمەتی جەلادەتیان دەدا خۆی لە بیربکات، لەگەڵ مۆسیقارە عەرەبەکاندا «فوگ النخل فوگ» ی دەگووتەوە. لەو دانیشتنانەدا فەهمی بەسری ڕەبابەی لێدەدا، جەلادەت کە تەماشایدەکرد پاشەڕۆژی دووری خۆی تیادەبینییەوە، مۆسیقارێک لە تیپی سەمفۆنی

ولاتەوە بووبوو بە ڕەبابەژەنێکی عەگال بەسەر، کە بۆ نیشاندانی میوانداری و کەرەمی خۆی قاوەی بۆ میوانەکان تێدەکرد. جار جار هەڵدەستا و دەستە سووتاوەکانی هەڵدەکردو عەگالە سوورەکەی دەبەست بە سمتە زلەکەیەوەو بایدەدا. فەهمی ئەو پیاوەی کە مۆسیقای لە بیر دەیان مۆسیقار بردبووەوە، کە مەستدەبوو، کە ئاگای لە خۆی نەدەما خۆی دەدا بەسەر دەستی مۆسیقارەکاندا و دەیگووت: بمبوورن. دەگریا و سەری خۆی دەدا بە قەراغی مێزەکەدا، سەری دەدا بە قەراغی دیوارە کۆنکریتییەکاندا. دەینالاند و دەیگووت: ئەی هاوار، من ئێوەو خۆشم کوشت، من ئێوەو خۆشم کوشت. لەو کاتانەدا جەلادەت بە مەستی و بە پێلاوەکانییەوە دەچووە سەر مێزێک لە مێزەکان و بە سەرخۆشی دەیگووت: ئوستاز، تۆ ئێمەت نەجات دا... ها.. ها. ژیان گرنگە ئوستاز... ژیان. بژی و شەرابەکەت هەڵدە، هەموو مۆسیقای دونیا ئەو ساتە ناهێنێت کە بەمەستی دەچێتە سەر مێزێک و بوتڵێک دەگریت بەدەستەوەو هەڵیدەدەیت. مۆسیقا هەر عەزابێکی ڕووتە... تێیهەڵدە ئوستاز... تێیهەڵدە. میزبکە بە مۆزارتدا و بژی.

دانیشتەکان بەوە تەواودەبوو، هەمووان بە مەستی و بێهۆشی فەهمی بەسریان تا ناو جێگاکەی خۆی هەڵدەگرت و دایاندەپۆشی و ماچیاندەکرد و خوداحافیزیان لێدەکرد، جەلادەت بە سەرخۆشی بە کوچەکاندا دەگەڕایەوەو بەدەم لەنجەولاری مەستانەوە، جار جار دەوستاو میزیدەکردە بەردەمی مالان، میزیدەکرد بە شەقامەکاندا. تا دەگەیشتەوە ماڵێ بە خەیاڵی خۆی قسەی لەگەڵ فەهمی بەسریدا دەکردو دەیگووت: تێیهەڵدە، لە جوانی هەڵدە، میزبکە بە شۆپاندا... و بژی. ئوستاز، وەک من سەیرمکە... سەیرمکە چۆن میزی پیادەکەم... ئاوەها میزی پیابکەو بژی.

* * *

لەگەڵ کۆتایی زستاندا، وەک ئەوەی دونیا دەستارێکی زەبەلاح بێت و یەکێک لە ناکاو بە ئاراستەیەکی پێچەوانە بیسوڕێنێتەوە، وەک ئەوەی هێزێک زەمەن بەرێتەوە بەرەو دوا، هەموو شتێک لە شاری تەپوتۆزە زەردەکاندا گۆڕدرا. لە ناکاو ڕێگاکان پڕبوونەوە لەسەرباز، لە پڕدا دەیان کەرت و کەتیبەو لیوای زرێپۆش جارێکی تر بە ئاراستەی باشوور کەوتنەوەڕێ. هەزاران سەربازی منداڵ بە خۆیان و کۆڵەپشتەکانیانەوە لە ئۆردوگا و سەربازگەکانی دەوروبەری شاری تەپوتۆزدا دەرکەوتن، لە ماوەیەکی کورتدا دەیەها خانم و کیژی گەنج لە نێوماڵ و گرووپ و تیاترەکانی ئەو شارەدا سەریان هەڵدایەوە، لە کەمتر لە مانگێکدا پرتەقاڵی سپی وەک جارانی لێهاتەوە، پڕبووەوە لە کیژی ناسک، سەماکەری نوێ، مۆسیقار بە نیگای پڕنهێنی و زەردەخەنەی شەرمنەوە. هەموو بۆنی شەڕێکی دیکەیان لە هەوادا دەکرد، ئەو ژنانەی جارێکی تر کەسوکاریان کرابوونەوە بەسەرباز، بێچارەو پەشیمان لە هەر خەوێکی بێمانا کە دیبێتیان بە لێشاو دەگەڕانەوە بۆ ئەو شارە. بۆیەکەمجار کوچەکان پڕبوون لەسەربازی کورد کە بەخۆیان و تەپلە نارێکەکانی سەریان و نیگا گەڕۆک و بزێوەکانیان هەموو شتێکیان دەپشکنی، بۆیەکەمجار جەلادەت گوێی لە هاوار هاواری ئەو سەربازە کوردانە بوو کە بێپەروا بەسەر ماڵە خراپەکاندا دەگەڕان و گۆرانیان دەگووت. ئێوارەیەک چوار سەربازی کورد بە دەم گۆرانی ماملێوە خۆیان کرد بە پرتەقاڵی سپیدا. چوار سەربازبوون بە دەنگێکی هاوبەش و گڕ دەیانگووت «هەندە هەندی بەیانان دۆست و دوژمن زاهیربوون ـ بە سۆزەی بای پاییزان مەمکۆڵەی کیژان خڕبوون ـ ئەی گەردەو گیانم گەردە ـ گەردن هەڵاڵەی زەردە». چوار دەنگی غەمگین بوون کە لە قووڵایی حوزنێکی سەیرەوە مامڵێیان دەچڕی. جەلادەت لە مێژبوو جگە لە دالیاو موسای بابەک کوردی ئاوەها لە نزیکەوە نەدیبوو، بەڵام شەرم و شوورەییەکی قووڵ وای لێدەکرد خۆی ئاشکرا نەکات،

ڕۆژانی دواتر دەستە دەستە ئەو سەربازە کوردانە کە هەموو هەڵاتووی جەنگی پێشووبوون و ئێستا لە تخوبی ئەو سەحرایەدا بۆ جەنگێکی تر کۆکرابوونەوە لەو شارەدا دەردەکەوتن. بەڵام ئەوەی جەلادەت لە یادینەکرد دەنگی غەمگینی ئەو چوار سەربازەبوو کەلە داهاتوودا ڕۆڵێکی سەیر لە ژیانی جەلادەتدا دەبینن.

جەنجاڵ بوونەوەی شار مایەی خۆشحاڵی جەلادەت بوو، ئەو ماوەیە هێند بەسەر دالیا سیراجەدیندا گریابوو، دالیاشی لە ئاقارەکانی شێتی نزیککردبووەوە. شەوانیش بە جۆرێک مەستدەبوو، مەستدەبوو، هەموو شتێکی لە یاددەکرد.

ئەو چەند مانگەی دواتر تا نزیکی هاوین، بەردەوام شار پڕبوو لەو سەربازە کوردە برسییانەی کە دەهاتن و بۆیەکەمجار لە ژیانیاندا لەو ماڵانەدا لەگەڵ یەکەم ئافرەتدا دەخەوتن. بەجۆرێک برسی و گێژبوون چەندەها جار خۆیان لە ناو کوچەکاندا وندەکرد، خۆیان دەدا بە دەرگای ماڵەکاندا، کە ئافرەتیان بە ڕووتی دەبینی دەبوورانەوە... مەستدەبوون، شەڕیاندەکرد. دەهاتن و ئازارەکانی سەربازییان لە باوەشی ئەو کیژە عەرەبانەدا خاڵیدەکردەوە. کاتێک لەگەڵ ئەو کیژە عەرەبانەدا دەخەوتن پێیانوابوو تۆڵەی ئازارەکانی خۆیان دەکەنەوە، بە تایبەت دەهاتن بۆئەوەی شکانی شەرەف و نوشوستی خۆیان بەوجۆرە هەستێننەوە. پێیان وابوو خەوتن لەگەڵ عەرەبێکدا بەسە تۆڵەی نوشوستی و مردن و کاولکاریەکانی نیشتیمانیان بۆ بکاتەوە.

لە ناوەڕاستی هاویندا جەنگێکی ترسناکی تر دەستی پێکرد، هێزەکانی دەوڵەت مارشیانکردە ناو وڵاتێکی چکۆلانەی بێدەسەڵاتەوە لە باشووری باشوور و لە ماوەی چەند سەعاتێکدا هەموو شارەکان و بیرە نەوتەکانیان داگیرکرد. میرنشینێکی چکۆلانە کە تا ئەو ڕۆژە لە خەوێکی قووڵدا دەژیا. تا ئەو ڕۆژە زۆربەی خەڵکەکەی ژیانیان لە سەفەر و ڕاوکردنی

ئافرەت و تەماشاکردنی یاری تۆپی پێدا بردبووەسەر، سەرەتای ئەو جەنگە سەرەتای کۆتاییە گەورەکان بوو..کۆتایی سەدەیەک و ڕوخانی ئەفسانەکانی بوو... کۆتایی دونیایەک و سەرهەڵدانی دونیایەکی تر بوو لە خۆڵەمێشە خوێناوییەکەی، وەک قەقنەسێک کە دەسووتێت و لە خۆڵەمێشی خۆیدا دروستدەبێتەوە. ئەو جەنگە تەنیا سەرەتای گۆڕانی ژیانی جەلادەتی کۆتر نەبوو، بەڵکو سەرەتای گۆڕانی هەموو دونیا بوو. سەرەتای دەست پێکردنی ڕۆژگارێکی تر بوو لەسەر ئەم ئەستێرەیە.

## بەشی سێهەم

بەر لە دەست پێکردنی پاییز بە چەند هەفتەیەک دەیەها هەزار سەرباز لەملاولای جیهانەوە گەیشتنە ئاوە نێودەوڵەتییەکانی کەنداو و لەوێوە بەرەو ئەو بەندەرە زۆرو زەبەندانە کەوتنە ڕێگا کە شەو ڕۆژ بێوچان لە کەنارەکانی خۆیاندا پێشوازی سەربازو زرێپۆش و نەفەرهەڵگریان دەکرد. هێندە ئامێری سەیر و چەکی نەبینراو دەرکەوتن کە پێشتر مرۆڤایەتی لە مێژووی خۆیدا شتگەلێکی لەو جۆرەی نەبینیبوو. لەشاری تەپۆتۆزە زەردەکان، وەک لە زۆربەی شوێنی دونیادا، خەڵک شەووڕۆژ گوێیان لە ڕادیۆکان دەگرت. جەلادەتی کۆتر تاکە کەسێک بوو ئارەزوویەکی نەبوو گوێ لە هیچ هەواڵێک بگرێت، لە قووڵایی دڵیدا نەیدەویست هیچ ئومێدێک لەسەر ئەو شەڕە دروستبکات. دەترسا هیوایەکی گەورە بونیادبنێت و دواتر جەنگ ڕوونەدات، دیکتاتۆرو سوپاکەی زیان نەخۆن. دەیویست گەر جەنگ ڕوویدا ئەو لە حاڵەتێکی ڕۆحی ئەوتۆدا بێت بیری لێ نەکاتەوە. جەنگ تاکە ئومێدی بوو گۆڕانکاری گەورە لەگەڵ خۆیدا بهێنێت، تاکە ئومێدی بوو بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ باکوور. بەڵام دواجار جەنگ کارەساتی

ترسناکیشی لە پشت بوو. جەلادەت تەماشای ئەو سەربازانەی دەکرد و دەترسا هەموو لەو جەنگەدا بمرن. موسای بابەک پتر لەهەر کەسێکی دی گوێی لە ڕادیۆکان دەگرت. پێیدەدا بە زەوییەکەدا و دەیگووت: نابێت جەنگ ڕووبدات، ئەمە جەنگ نییە، ئەمە کۆتایی دونیایە، ئەمە مەحشەرە. هیچ کەسێک هیچ ئادەمیزادێک ناتوانێت پێشبینی ئەوەبکات چی ڕوودەدات. وێرانە... وێرانە... جەلادەتی کۆتر من وێرانە دەبینم... کاولکاری دەبینم... نغرۆبوونی دونیا دەبینم. دالیا دەیگووت: دکتۆر من دەزانم، جەنگێکی وەها نەبێت هیچ شتێک ناگۆڕێت. ئەی چۆن، هیچ هێزێک نییە ئەم دەوڵەتە بڕوخێنێت، هیچ هێزێک نییە. با من و تۆ بیر لە خۆمان نەکەینەوە، خودای گەورە من هەر بیر لە خۆم و تۆ ناکەمەوە. گەر ئەم سوپایە شکست نەهێنێت، وەک دێوێکی گەورە ڕۆژ دوای ڕۆژ گەورە دەبێت، ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر زەمین و وڵات و میللەتان دەکات بە خۆراکی خۆی، ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر وڵات دەخوات، ژیان دەخوات، نەوە لە دوای نەوە منداڵان گەورە دەکات و قووتیان دەدات. دکتۆر سەیری دەستی من بکە... ئا. دەستی من، هیچ خوێنێکی لەسەر دەبینیت، نا هیچ خوێنێکی لەسەر نییە، دوای ئەوە فریشتەکان شاهیدی منن، بەڵێ دکتۆر، فریشتەکان شاهیدی منن کە گوناهم نییە. من دەزانم لێرەدا دەمرم، چونکە فریشتەکان تەنیا کاتێک لەگەڵمدان کە لە سنووری ئەم شارەدا بم، تێدەگەیت، بەڵام من ترسم لە مەرگ نییە، ها یەعنی چی، جەلادەت باوەڕم پێناکەیت.... نا... نا... گوڵی من، دڵنیام باوەڕم پێدەکەیت، تۆ دەزانی من ترسم لە مەرگ نییە. من ئەم جەنگە بە ترسناکترین شتی دونیا دەزانم، بەڵام چاوی من موسیبەتەکە ئەوەیە پاشەڕۆژی ئێمە بە موسیبەتەوە بەندە. دەبێت هەمووومان بە دۆزەخدا تێپەڕین ئەوسا ئەوەی دەرچوو دەردەچێت و ئەوەی پەڕیوە دەپەڕێتەوەو ئەوەی لە ڕێگا مرد دەمرێت. وازبێنە دکتۆر باترسم لە مەرگ نەبێت، ئەوەی ترسی لە مردن نەبێت باشتر بیردەکاتەوە.

جەلادەت دەیزانی دەبێت بە دۆزەخدا تێپەڕێت، بۆنی ئەو دۆزەخەی دەکرد، بۆنی ئەو شەپۆلە سەیرو ئاگرین و کوشندانەی دەکرد کە لە دوورەوە دێن، هەندێک شەو لە بالکۆنەکەی خۆیدا دەوەستاو سەیری ناو جەرگەی زوڵمەتی دەکردو ئەو لێشاوە ئاگرانەی دەبینی کە لە دوورەوە دێن.

شاری تەپوتۆزە زەردەکان لەو وەرزەدا وەک شوێنێکی ترسناک دەینواند، دەیان سەربازگەی تازە لە بیابان و سەحرا نزیکەکاندا کرابوونەوە، تا دوژمنان سەربازی زۆرتریان بهێنایەتە ئاوەکانی کەنداوەوە، تا هەڕەشەی ئەمریکاییەکان و ئینگلیزەکان توندتربووایە، ژمارەی ئەو ئۆردوگاو سەربازانەی کە دەوڵەت دروستیدەکرد زیاتر دەبوون. هەر شەوێک سەرکردەکانی ئەوان ڕستەیەکی توندیان بگووتبایە، بۆ ڕۆژی دواتر دەوڵەت دەیان هەزار خەڵکی بانگهێشتی سەربازی دەکرد. بەجۆرێک ئۆردوگاکانی دەوروبەر پڕبوون لە منداڵی چکۆلانە و پیری پەککەوتە کە هەموو بە زۆرکرابوونە سەربازو لەو بیابانەدا توڕدرابوون. ئەو چەند مانگەی کەوتە نێوان پێشەکی جەنگ و جەنگی ڕاستەقینە خۆیەوە، شاری سۆزانییە غەمگینەکان بە جۆرێکی سەیر جەنجاڵ بوو، سەرە ڕێی هەزاران سەربازو ئەفسەر بوو بەرەو مردن، وەک ئەوەی ئەو شارە ئەو تونێلە خەیاڵییە بێت کە دەبێت بەر لە گەیشتن بە دوا کەناری ژیان هەموو موسافیرەکان پیاتێپەڕن. کۆتایی هەفتان ئەو شارە پڕدەبوو لە هەزاران سەرباز کە بە جلە سەربازییە تۆزاوییەکانیانەوە دەهاتن و لەبەردەمماڵەکاندا ئاپۆرەیان دەبەست، ئەو ماوەیە پڕبوو لە ڕۆژانی پڕ تەم، ئێواران هەمیشە تەپوتۆزی سەحرا تێکەڵاوی تەمێکی سپی دەبوو. سپێتی تەم و زەردێتی خۆڵ ڕوخساری کۆمەڵێک تارماییان دەبەخشی بەو میوانە ماندووانەی بە خۆیان و کڵێتە خوارەکانیانەوە وەک ئەوەی لە دوکەڵی مەحشەردا مەلەبکەن بە کوچەکاندا دەسوڕانەوە. میوانەکانی ئەو سەردەمە، لەو میوانانە نەبوون

کە شەوان بێنە سالۆنەکەو بخۆنەوەو مەست بن و زەوقبکەن. لەو عەرەبە عەگال بەسەرانە نەبوون کە ڕۆژگارێک پارەیان بەسەر سەماکەرەکاندا فڕێدەدا، بەڵکو پتر ئەو سەربازە لاواز و نەخۆشانەبوون کە دەهاتن چەند دەقیقەیەکی بەتام لەگەڵ کچێکدا ببەنەسەر و بڕۆن. ئەگەرچی کیژەکان شەو و ڕۆژ کارێکی زۆریان هەبوو، بەڵام بەدەگمەن سالۆنەکە شەوان وەک جارانی لێدەهاتەوە، زۆر شەویش مۆسیقارەکان یان هەر ئیشیان نەبوو یاخود پێکڕا بە کوچە تۆزاوییەکاندا بۆ گۆرانی گووتن دەردەچوون. ئەو چەند هەفتەیە کە فەقیرییەکی گەورە ڕوویکردە وڵات، کە ئابلۆقەیەکی دوورو درێژی ئابووریی دەستی پێکرد، زۆربەی دەرمانخانەی شارە گەورەکان بێ دەرمان و بێ کەلوپەلی پێویست مانەوە. وەک دەستێکی سیحریی دەرمانە گرنگ و دەگمەنەکان لە بازاڕدا کۆبکاتەوە، بازرگانە ترسناکەکان هەموو شتێکیان گسکدا و وڵات کەوتە نەدارییەکی توندی دەرمان و کەلوپەلی تەندروستییەوە. مرۆڤ لە عەلەفی بزن و کەرو هێستر خواردنی بۆ خۆی دروستدەکرد. ئەو دەمە موسای بابەک زەخیرەیەکی گەورەی لە کەلوپەل و دەرمان هەبوو کە خەڵکانێکی زۆری بیمار لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێدەکرد. سەربازە نەخۆشەکان کە چیتر دەرمانیان لە بنکەکانی سوپا وەرنەدەگرت، ڕوویاندەکردە ئەو دکتۆرە سەر سپییەی بە ڕەحمێکی بێوێنەوە بیمارەکانی دەلاواند. ئەو ماوەیە دالیاو دکتۆر بابەک بە جۆرێکی سەیر سەرقاڵی خەمخواردن بوون بۆ ئەو سەربازە داماوو نەخۆشانەی لە چاوەڕوانی شەڕێکی کوشندەدا لەو سەحرایەدا توڕدرابوون. بەڵام خەونی ڕوونەدانی جەنگ، خەونێکی دروست نەبوو. بەڵکو ئومێدێک بوو ئەو سەربازە تینوو و برسییانەی ناو سەحرا «کە دەبایە بە نانی جۆو شلەی شێلم بچن بۆ مۆدێرنترین شەڕی سەر ئەم ئەستێرەیە» دڵی خۆیانیان پێخۆشدەکرد.

لەدەرەوەی سەنگەرەکان هەموو جیهان دەیزانی شەڕ دەبێت. هەستێکی

ترسناک بە نزیکبوونەوەی قیامەت لە هەموو ولاتدا، وەک گەردەلوول بڵاویبکاتەوە، وەک سەماکەرێکی ئەهریمەنساز لەسەر هەموو سەحنەیەک سەمایدەکرد. هیچ کات وەک ئەو سەردەمە مرۆڤەکان پێشوەخت گۆڕیان بۆ خۆیان ئامادەنەکردبوو، گۆڕستانەکان بە جۆرێکی سەیر پڕبوون لە خەڵکانێک لە نابەینی کێلەکاندا بۆ شوێنێکی گونجاو دەگەڕان شوێنی خۆیانی تیا بگرن. ئەوانەی دەیانویست لە نزیک کەس و کاریانەوە بنێژرێن لە گۆڕستانە گەورەو ناسراوەکاندا جەنجاڵییەکی بێمانایان خستبووەوە. نرخی گۆڕ لەو دەمەدا لەنرخی خانووبەرەکان گرانتربوو. سەدان کەس کە خۆشبەخت بوون بەوەی گۆڕی تازەو باشیان بۆ خۆیان پچڕیوە، شەوانی سەرما کە هەموو گۆڕستانەکان دەکەوتنە بەر گێژەنی گەلاڕێزان، چەتریان هەڵدەداو لە چاوەڕوانی ئاخیرەتدا بە چیچکانەوە لەسەر گۆڕەکانی خۆیانەوە سەیری ئاسۆ دوورەکانیان دەکرد. دەبێت بڵێم کە وێنەکانی قیامەت بەپێی شارەکان و گوندەکان دەگۆڕا. ئەوانەی لە بەردەم گۆڕەکانی خۆیاندا چاوەڕوانی کۆتایی دونیایان دەکرد، قیامەتیان وەک بایەکی سارد دەبینی کە لە دوورەوە دێت و بەخێراییەکی کوشندە هەزارەها گەڵای زەرد لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، ڕەشەبایەک بە تورەیی هەڵدەکات و لەگەڵ خۆیدا دەتبات، تۆ هێندە دەزانێت کە ئەو بایە بردویتی بۆ جێگایەکی تر، لە ناکاو لە جلەکانت ڕووت بوویتەوەو بە وێنەی کەوتنە خوارەوەی خودایەکی گریکی لە ئاسمانەوە، لە شوێنێکی بەرزەوە کە ئاسمانی زیندووەکانە بەرەو زەوییەکی تر کە زەوی مردووکانە بەربوویتەوە.

بەڵام سەربازە برسییەکانی ناو سەنگەر، خەیاڵێکی تریان لەسەر قیامەت هەبوو، قیامەت لەدیدی ئەوانەوە وەک پەلاماری کۆمەڵێک سواری ڕەشپۆش بوو کە لە ناو لمەوە دێن. هەزاران هەزار سواری ڕەشپۆش کە کەس ناتوانێت بە دروستی ڕوخساریان ببینێت، پێشتر گلێنەی مرۆڤ پڕدەکەن لە لم تا نەتوانێت ببینێت. ڕەشەبایەکی تۆزاوی لە گلێنەکانماندا

دادەگیرسێنن و وەک چۆن سوارچاکێک نێچیرێکی بەنرخ لە زەمین هەڵدەگرێتەوە، هەر بە سوار ئەسپەکانیان پڕ بە ڕۆحلەبەراندا دەکەن و دەیخەنە پاشکۆی ئەسپەکانیان و لە ڕەشەبایەکی سامناکدا «کە ڕەشەبای کرانەوەی دەرگاکانی قیامەتە» بە خێراییەکی شێتانە هەڵماندەگرن و دەمانبەن بۆ دونیایەکی تر.

ئەوانەی لە گوندە دوورەکانی ناو چیادا دەژیان، قیامەت لەلایان وەک بەفربارینێکی هێمن هێمن بوو کە لەسەرخۆ دەبارێت و دەبارێت، تا هێدی هێدی لەگەڵ بەرزبوونەوەی خۆیدا ئێمەش بەرەو سەرەوە بەرزدەکاتەوە، هێند بەرز فریشتە سپیپۆشەکانی ئاسمان دەستیان بمانگاتێ. هێند بەرز ئەو فریشتانە دەست درێژدەکەن و ئێمەش دەست درێژدەکەین، وەک ئەوەی مرۆڤێک لە سەربانێکی نزمەوە سەرکەوێت بۆ سەربانێکی بەرزتر. ئاوەها دەستماندەگرن و سەردەکەوین بۆ ئەو دونیا، لەوێ فریشتەکان باوەشمان پیادەکەن و ماچماندەکەن و دەڵێن «بەخێربێن».

ئاوەها وێنە جیاوازەکانی قیامەت لە مسەرەو سەری وڵاتدا لە هاتوچۆدا بوون. جەلادەتی کۆتر کە چیرۆکە جیاوازەکان و وێنە جیاوازەکانی قیامەتی دەبیست، خۆی وێنەیەکی تری لە خەیاڵدا بوو، قیامەت سەفەرێک بوو لەسەر ئاوازی کۆمەڵێک سەمفونیای گەورە گەورە کە پیاوێکی تەنها بە ناو دارستانێکی درێژو ناکۆتادا دەیکرد. سەفەرێکی هێمن لە ناو شنەی شەماڵ و درەختی بە ئاورینگ بەرداردا. ڕێبوارێک کە ئازادانە دەڕوات، قیامەت لای ئەو زیندانێک نەبوو شورای گەورە و دەرگای گەورەی هەبێت، دوو باغ نەبوو یەکێکیان فیردەوسین و ئەویتریان ئاگرین. بەڵکو یەک باغی ناکۆتابوو، مرۆڤ وەک گەڕۆکە دێرینەکان بە کۆڵەپشتێکی چکۆلانەوە ڕێی تێدەکەوت و بە ناو هەموو ئەو شتانەدا کە لە ژیانی خۆیدا جاوید و بێسنووربوون سەفەرێکی بێسنووری دەست پێدەکرد. مردن لای جەلادەت

ڕۆژی دەستپێکردنی بیرکردنەوەی ڕاستەقینە بوو لە شتەکان، ڕۆژی لەزەتبردنی ڕاستەقینە بوو لەو جوانییە قووڵانەی مرۆڤ لەسەر زەوی نەیتوانیبوو لەزەتیان لێ بەرێت. ئەو لە منداڵییەوە بە تەرزێکی دینی بیری لە مردن نەکردبووەوە، هەر یارییەکی نەتوانیبایە بیکات دەیگووت: دواجار لەو دونیا دەتوانێت بیکات. هەر پرسیارێکی نەیتوانیبایە حەلیبکات، سووک و سادە دەیگووت، لەو دونیایەی تردا کە دوای مردن دادێت، لەوانەیە بتوانێت شیکاریبکات. هەر مۆسیقایەک نەیتوانیبایە ئازادانە چێژی لێ ببینێت، دەیگووت لەو دونیا ئازادانە چێژی لێ دەبینێت.

بەر لە دەست پێکردنی جەنگ خەڵک بە گشتی ڕەفتارو ڕەوشتیان دەگۆڕێت، مرۆڤ دەتوانێت تەماشابکات و بەوردی ببینێت کە ترسێکی تایبەتی و گومانێکی قووڵ لە چاویاندایە، هەتا شێوازی قسەکردن، شێوەی ڕاوەستان و چۆنێتی جلوبەرگەکانیان دەگۆڕێت. ئەوەی سەیرە لە کاتی جەنگدا ژنان پتر لە پیاوان دەگۆڕێن، هەندێکیان بە جۆرێکی سەیر و کوتوپڕ حەزدەکەن چی حەرام و نەکردەیە لەو وەرزەدا بیکەن و هەندێکیان بە پێچەوانەوە لە پڕێکدا خۆیان دادەپۆشن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا. جەلادەت بە شێوەیەکی سەیر سەرنجی ئەو گۆڕانکارییە قووڵانەی دەدا کە لە دەنگ و گەروو و نیگاو خەندەکاندا ڕوودەدەن، گۆڕانێک بەسەرەتای دەست پێکردنی گۆڕانی دونیای دەزانی، چونکە بە ڕای ئەو گۆڕان سەرەتا لە دەنگ و نیگای مرۆڤەوە دەست پێدەکات. شەوی دەستپێکردنەوەی جەنگ شار چۆڵ و هۆڵ بوو. جەلادەت ئەو شەوە دیسانەوە فریشتەکانی دالیای لە هەوادا بینییەوە، ئەو فریشتە چکۆلانانەی کە بەجۆرێکیَ سەیرو شێتانە لە هەموو کوچەکاندا دەفڕین. فڕینیان نائاسایی و غەمگین بوو، لە بازنەی گەورە گەورەدا دەسووڕانەوە، وەک ئەوەی شتێک پاسبکەن، یاخود خۆیان بۆ هەندێ ڕووداوی نادیار ئامادەبکەن. بەڵام فریشتە شپرزەو بێئارامەکان تەنیا دەرکەوتەی سەیری ئەو شەوە نەبوون، لەگەڵ نزیکبوونەوەی کات و

ساتی شەڕدا لە ناکاو سەدان هەزار باڵندەی پەشۆکاو لە زەریاوە هاتن، شتێکی سەیربوو کە بە پۆلی جودا جوداو گەورە، دەهاتن و لەسەر بان و سەر سەکۆو بەربەست و عەمودە ئەلەکتریکییەکان دەنیشتنەوە، هەزاران باڵندە کە هێشتا تەڕی زەریاکانیان پێوەبوو، پێدەچوو لە دوورەوە هاتبن و لەو شارەش زیاتر شوێنێکیان نەبێت ڕووی تێبکەن. هاتنی باڵندەکان شتێکی سەیربوو کە سەرنشینانی ئەو شارەی پەشۆکان، بە پۆلی گەورە گەورە دەفڕین و دەنیشتنەوە. مرۆڤ ئێستا بەدروستی نازانێت لە چ ساتەوەختێکدا هەموو شتەکان سروشتێکی سەیرو خەیاڵیان وەرگرت، هاتنی باڵندەکان و تێکەڵاوبوونیان بە فریشتەکان تەنیا وێستگەیەکی ئەو ئاڵوگۆڕە خەیاڵیانەبوو کە لەگەڵ سەرەتای شەڕدا لێرەدا ڕوویاندەدا. دوای چەند سەعاتێک لە گەیشتنی باڵندەکان و پێش چەند سەعاتێک لە دەست پێکردنی شەڕ هەوای ئەو شارە وەک هەوایەکی خەیاڵی لێهات، لە ناکاو سێبەری ماسی گەورە گەورە لە هەوادا دەرکەوتن، تارمایی کەشتی خەیاڵی، تارمایی دەریاوانی خنکاو، جانەوەری ئاوی جیاواز جیاواز، ڕاوکەری مرواری خەندەدار بە ددانی زێڕینەوە، ڕۆحی کەشتیەوانە مردووەکانی ڕۆژگاری دێرین. هەموویان لە ناکاو لە کوچەکاندا سەریانهەڵدا، ڕەوێکی سەیرو ترسناک بوو لە قەراغە پڕ مەترسییەکانی زەریاوە بەرەو ئەو شارە غەمگینە. جەلادەت دەیزانی ئەم شارە لەسەر نەخشەکان نییە، شارێکە لەسەر سنوورەکانی حەقیقەت و خەیاڵ، بەڵام ئەوەی لە ناکاو هەموو زیندەوەرو تارمایی نێو کەنداوە دوورەکان ڕووی تێبکەن شتێک بوو لەودیو توانای باوەڕو دیدەوەوە. جەلادەت ئەو شەوە دوای گەشتێکی کورت لە ناو کوچەکانی ئەو شارەدا کە پڕبوو لە باڵندەی ڕاستەقینەو ماسی خەیاڵی گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. بەدرێژایی شەو بەتەنها لە بالکۆنەکەی خۆیدا دانیشت و سەیری ئەو ڕۆحە سەرگەردانانەی دەکرد کە ترسی شەڕ لە باشوورەوە ڕاوی نابوون و ئێستا بێئامانج لەم شارەدا دەسوڕانەوە. ئەوشەوە وەک

ملیونەها ڕۆحلەبەری دیکە لەسەر ئەم ئەستێرەیە نەخەوت. بڕیاربوو لە دوازدەی شەودا جەنگ دەست پێبکات، چەند سەعاتێک دوای ئەوە موشەکە ترسناکەکان دایان بە زەویدا. جەلادەت ئەو گڕکانە ترسناکانەی ئاگری بینی کە لە سەربازگەو ئۆردوگا نزیکەکاندا بەرزدەبوونەوە، لە تاریکی و زوڵمەتدا دەیڕوانی و چاوانی قووڵ مەودا دوورەکانی دەبڕی و لە ناو دوکەڵ و ئاگردا ئەو سەربازە سووتاوانەی چاودەکرد کە بە گڕەوە لە سەنگەرو پەناگاکانیان دەهاتنەدەرێ. دەنگی تەقینەوەکان هێند سامناک بوون، جەلادەت دڵنیابوو ئەو موشەکانە دەرگاکانی سەدەیەکی تازەدەکەنەوە. بەو شەوە چاکەتێکی ڕەشی ئەستووری لەبەردەکردو دیسانەوە دەهاتە دەرێ، لە کوچەکاندا بە ناو پاشماوەی سەردەمە دوورەکاندا دەڕۆیشت، بە تەنیشت ئەو ماسییە خەیاڵیانەدا دەڕۆیشت، بەلای فریشتەکاندا، بە ناو پۆلە مراوی دێوانەدا... ڕوویدەکردە قەراغ شار، تەواوی خەڵکی لە شوێنە قایمەکاندا خۆیان حەشاردابوو، دەنگی تەقینەوەکان لەوە گەورەترو بە ناڵەتربوون مرۆڤ لێیان نەترسێت، پریشکی ئاگرینی موشەکەکان دەگەیشتنە سەر ئەو شارەو وەک فوارەیەکی ئاگرین دەهاتنەخوارێ، فڕۆکەو موشەکەکان بە سەر سەریدا دەفڕین و ڕوویاندەکردە بنکە سەربازییە پێشومارەکانی باشوورو باکوور. جەلادەت ئەوشەوە بە چاکەتە ڕەشە ئەستوورەکەشییەوە هێشتا هەستی بەسەرمایەکی کوشندەدەکرد. لە لێواری ئەو شارەدا لەسەر بەستێکی چکۆلە دادەنیشت و سەیری تەقینەوە گەورەکانی دەکرد، وەک ئەوەبوو هەموو ئەو وڵاتە بەیەکجار بتەقێتەوە، هەموو ئەو هەرێمەی چواردەوری ببێتە پارچەیەک زەمینی هەڵهاتوو لە دۆزەخ. لەویادا ئەو سەربازانەی بینی بە ئاگرەوە ڕووبە ڕووی دەهاتن، سەدان سەربازبوون بە ئاگرەوە ڕایاندەکرد و دەیانویست بگەنە بەر دەروازەکانی ئەو شارە، بەڵام بەر لەوەی نزیکببنەوە دەبوونە خۆڵەمێش و با دەیبردن. ناو تاریکی پڕبووبوو لە بوونەوەری سووتاو، بۆنی بۆکڕوزی

ئینسان، جەلادەت لە جێگای خۆیەوە سەیری ناو زوڵمەتی دەکرد و چاوە تیژو سەیرەکانی لە ناو تاریکیدا بە هەموو لایەکدا دەیانڕوانی، چاوانی وەک چاوانی بەختگرەوەیەکی بلیمەت، وەک نیگای یەکێک بتوانێت بە ناو شوێن و زەمەندا سەفەربکات بەیەکجار هەموو دیمەنە سامناکەکانی دەبینی. هەزارەها سەرباز کە هەندێکیان بە زیندوویی و هەندێکیان بە مردوویی لە سەربازگە نزیک و دوورەکانی خۆیان ڕاپاندەکرد. جەلادەت جارێکی تر ئەو تێکەڵاوبوونە سامناکەی دەبینییەوە، تێکەڵاوبوونی ژیان و مەرگ. چاوی دەکردەوەو شارەکانی دەبینی لە بەردەمیدا دەسووتێن. باڵەخانە بەرز و دوورەکانی دەبینی گڕدەگرن، منداڵە بەرەڵاکانی ناو زوڵمەتی دەبینی لەگەڵ هەناسەیاندا دوکەڵ دێتەدەرێ. ئەو ئافرەتانەی دەبینی کە بە ئاگرەوە دەفڕین و خۆیان لە ڕووبارەکان هەڵدەکێشاو دەبوونە پارچە خەڵوزێکی سەرئاو کەوتوو. شەپۆل لە دوای شەپۆل بوونەوەری سووتاو لە تاریکیدا دەردەکەوتن و دەبوونە غوبار، دەبوونە بەشێک لە هەورێکی بریندار کە دەشێت ڕۆژێک لە ڕۆژان لە بری باران هاواری ئادەمی ببارێنێت. تا دونیا ڕوناک دەبووەوە بەردەوام جەلادەت لە تاریکیدا مرۆڤی دەبینی بە گڕەوە ڕاپاندەکردو دەبوونە خۆڵەمێش... ڕاپاندەکردو دەبوونە خۆڵەمێش.

کە شەفەق دادێ دونیا ئارامییەکی ترسناکی تێگەڕا، جەلادەت لە شوێنی خۆی هەستاو وەک ئەوەی لە دۆزەخەوە بگەڕێتەوە، بە سیمایەکی حەپەساوەوە گەڕایەوە بۆ پرتەقاڵی سپی و وەک بمرێت لەسەر جێگاکەی خۆی خەوی لێکەوت.

ڕۆژانی دوایی جەلادەت بەردەوام بە پاڵتۆیەکی درێژی سپی و کاسکێتێکی ڕەش و جووتێ چاوی گەورەوە کە لە چاوی عەرافەکان دەچوو، بە ناو شاردا دەگەڕا. پێدەچێت ئەوە سەرەتای ئەو ئارەزووە سەیرەی بێت بۆ لەبەرکردنی پاڵتۆی سپی درێژ، کە ساڵانێک دواتر بەردەوام زستانان لەبەریدا بوو. شار بەجۆرێکی نائاسایی پڕبوو بوو لە باڵندەو جانەوەر

و تارمایی سەیر سەیر. گەلەک جنسی سەیر و نەدۆزراوەی باڵندە لە سەر باڵکۆن و سەکۆو گوێسەبانەکان دەرکەوتن، جەلادەت وەک چووبێتە قۆناغێکی ترسناکی هەلوەسەو تێکچوون و لەدەستدانی ڕۆشنایی عەقڵ، بە شاردا دەڕۆی و بێئەوەی سلاو لە هیچ ناسیاوێک بکات، لەهەوادا ئەو بەلەمە چکۆلانانەی دەبینی کە بەسەر سەریدا دەفڕین، کەشتی ئارام و گەورەی دەبینی بە سەر ماڵەکاندا دەڕۆی، مرۆڤی خوێناوی و بێسەری دەبینی دەستیان خستبووە گیرفانیان و لە شەقامەکاندا دەگەڕان. تارمایی سووتاوی دەبینی لە ماڵە سۆزانییەکان دەهاتنەدەری. هەمووشتێ لەو شارەدا بۆنی نەوت و باروتی لێ دەهات. هەموو شتێک. ئەو ماوەیە هەندێک ڕۆژ دەچووە لای دکتۆر موسای بابەک و دالیا، کە بە جۆرێکی سەیر سەریان قاڵ بوو. بەردەوام خەڵکی زامدار و نەخۆش لەبەردەم ماڵەکەیاندا لەسەرمادا چیچکەیان کردبوو و چاوەڕوانی دەرفەتێکیان دەکرد بچنەژووری. شەوان کاتژمێرێکی زۆر درەنگ دەیانتوانی دەرگای بیمارگا چکۆلەکەیان داخەن و بەشەکەتی لە جێگاکانیاندا بکەون. دکتۆر بواری بە چەند سەربازێکی زامدار دابوو لە یەکێک لە ژوورەکاندا بمێننەوە، دالیاو دکتۆریش دەیانزانی چ مەترسییەکی کوشندەو یارییەکی ترسناکە لەم ڕۆژانەدا داڵدەی ئەو سەربازە زامدارانە بدەیت کە بە برینداری لە وەحدەکانی خۆیان هەڵهاتوون. هەندێک شەو کە جەلادەت دەهات بۆ ماڵی دکتۆر موسای بابەک، سەدان سەربازی بیماری دەبینی کە بە بۆنی جەنگەوە، بە خۆڵی ناو سەنگەرەکانەوە، بە شێیەکی زستانەوە لەسەر لێویان، بەو چاوە عەرەبییە جوان و غەمگینانەوە کە پڕبوو لە بێگوناهی، بە پۆستاڵە دڕاوەکانیانەوە، بەو قەمسەڵە ڕۆمانییە ئەستوورانەوە کە تەپوتۆز هێندەی تر قورسی کردبوون، دەوەستان بۆئەوەی دکتۆر تەماشای زامەکانیان بکات. جەلادەت لە ناوەڕاستیاندا دەوەستاو نەیدەزانی ئاخۆ زیندوون و بۆ دەرمان دەگەڕێن، یان مردوون و خۆیان تێکەلاوی

جەنجاڵی و قەرەباڵغییەکان کردوە. هەموویان یەکجۆر نیگاو سەیرکردن و لاوازیی و پەژموردەییان هەبوو. دکتۆر موسای بابەک ئەو ماوەیە ریشێکی سپی هێشتبووەوە. کاتێکی نەبوو وەک جاران بایەخ بە خۆی بدات، رۆژ دوای رۆژیش ریشی درێژتر دەبوو، چاوانی کزترو پشتی کومتر. بەردەوام خەریکی تیمارکردنی نەخۆشەکان بوو، سەری هەڵنەدەبڕی بۆئەوەی بزانێت کێ تیماردەکات، کێ لەدەوریێتی. جەلادەت هەندێجار بە سەعات لە نزیکییەوە دەوەستا بێئەوەی هەست بە بوونی بکات. ساتێکی قووڵی خۆفەرامۆشکردن بوو، ساتێک بوو دکتۆر هەستیدەکرد دونیا پێویستی پێیەتی، بێئەوەی گوێبداتە هیچ بەردەوام کاریدەکردو هەمیشە رادیۆکەش لە تەنیشتییەوە بە کزی دەسووتا. دالیا زۆر رۆژ جەلادەتی لە تەنیشت خۆیەوە دادەناو بە غەمێکی زۆرەوە سەیری نیگا پەشۆکاوەکانی دەکرد، سەیری ئەو لەرزە کوتوپڕانەی دەکرد کە تووشی دێت، سەرنجی ئەو نەوبەتە درێژانەی بێدەنگی دەدا کە دایدەگرێت. گوێی لەو قسە بزرکان و ورێنە دووردرێژانەی دەگرت سەبارەت بە دەرکەوتنی جانەوەرو باڵندەو ماسی سەیر سەیر لە خەیاڵیدا. بەردەوام هەندێک دەرمانی تایبەتی دەدایەو شەربەتی تایبەتی بۆ دەگرتەوە کە لە هەندێک گیای تایبەتی و پێکهاتەی کیمیایی ئامادەیدەکرد. هەندێ شەو کە حاڵی زۆر خراپ دەبوو، نەیدەهێشت بڕوات، خواردنی دەدایە و لە قەرەوێڵەیەکدا گەرم دایدەپۆشی و خۆی لە تەنیشتییەوە لە سەر کورسییەک بەتانییەکی لە خۆی دەئاڵاندو لە تاریکیدا گوێی لە دەنگی تەقینەوەکان دەگرت.

چەندین هەفتە ژیان بەوجۆرە بەردەوامبوو. بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەموو شتێک لە شاری تەپوتۆزە زەردەکاندا وەستابوو. هەمووان بەردەوام چاوەڕوانی قیامەتیان دەکرد، هەندێک لە سۆزانییەکان ئەو مانگە حیجابیان لەسەرناو لە ماڵێکی تایبەتیدا پێکەوە نوێژی دەستەجەمعییان دەکرد. هەندێک بە حیجابە رەشەکانیانەوە بە کوچەکاندا دەسووڕانەوەو بە

دەنگی بەرز تۆبەی خۆیان ڕادەگەیاند. هەندێکی دیکەشیان بە پێچەوانەوە بە ڕووتی دەهاتنە بەردەرگاو تارمایی و ڕێبوار و سەربازە نەخۆشەکانیان فریودەدا، بە هەموانیان دەگووت گەر بەر لە مردن مرۆڤ تێر لە ئامێزانبوون و ڕاموسان و دەست لە ملان نەبێت بە جەهەنەمی دەمرێت. ئێوارەیەکی تەماویی جەلادەت لە سەر یەکێک لە ماڵەکان لەوحێکی گەورەی خوێندەوە، یەکێک بە خەتێکی جوان نوسیبووی : بەر لەوەی بمریت، بە خۆرایی وەرە بۆ سەیری بە هەشت. جەلادەت کە زوو فریوی ئەو جۆرە ناونیشانانەی دەخوارد، دەرگای ئەو ماڵەی کردەوەو چووە ژووری، ماڵێکی گەورە بوو بە دەیان ژووری گەورە گەورەوە، حەوزێکی چکۆلانەی وشک لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا بوو، لەدەوری حەوزەکە دەیان کچی ڕووتی بینی، دەیان ئافرەت بێئەوەی هیچ جلێکیان لە بەردا بێت، هیچ هیچ وەک چۆن لەدایکبوون ئاوەها. هەموویان بە بێدەنگ لە قەراغ ئەو حەوزە وشکەدا وەستابوون و بەزەردەخەنەوە تەماشای میوانەکانیان دەکرد، حەوشەکە پڕبوو لە سەربازی نەخۆش کە وەک لە دەوری مردنی خۆیان بسوڕێنەوە بەدەوری ئەو خانمانەدا دەسوڕانەوە کە لە بەر سەرمای زستاندا بەڕووتی و بە مەکرەوە لەشی خۆیان لە تیشک و تەم هەڵدەکێشاو میوانەکانیان داوەتی شەوێکی جەهەنەمی دەکرد. جەلادەتی کۆتر نەیدەتوانی لە هیچ دڵنیابێت، نەیدەزانی ڕێگای ونکردوە یاخود درەیکردۆتە سەر زەمینێکەوە بە هێمنی بەرەو بەهەشتی دەبات. لە قەراغ کوڵەکەیەکی ئەستوور دەوەستاو نەیدەزانی کەوتۆتە چ زەوییەکەوە، کچێکی منداڵکاری سپیکەلە کە لەتەمەنی خۆیدا دەبوو، دەستیدەگرت و بە هێمنی لێوی لە لێوی نزیکدەکردەوە ماچیبکات، جەلادەت وەک بترسێت، نیگایدەکردو لێیدەپرسی: تۆ کێیت؟. کچەکە وەڵامی نەدەدایەوە، دەستی دەگرت و بە ناو تەمی ئێوارەدا دەیبرد، حەوشەکە بە جۆرێکی سەیر درێژ دەبووەوە، بەجۆرێکی نائاسایی، جەلادەت ماوەیەکی درێژ لەگەڵ ئەو کچە

منداڵکاره ڕووتەدا بەناو تەمدا دەڕۆی، نەیدەزانی هەر لەوماڵەدایە یاخود نا، لە ناکاو هەستی بە باڵی مراوییەکان دەکرد لە هەوادا. وەک ئەوەی بە ناو تەمی دەریاچەیەکدا بڕۆن، بەسەر بەحرێکدا بڕۆن کە دەڕژێتە نادیارەوە، دوای ئەو کیژە دەکەوت کە بەردەوام بە زەردەخەنەیەکی سیحراویی و پاکەوە تەماشایدەکرد، دەموچاوێکی خڕ و منداڵانەی هەبوو، جووتێک چاوی بادەمی کە پڕبوو لە موژدەی بەهەشت. تا دەهات پتر بە ناو بێدەنگیدا شۆڕدەبوونەوە، وەک ئەوەبوو لە حەوشێکی تەماوییەوە بچنە ناو حەوشێکی تەماوی تر، وەک ئەوەبوو گوێی لە دەنگی فوارەیەکی سیحری بێت، وەک ئەوەی کپی و هێمنی ئەو ماڵە پێچەوانەی ئەو دونیا جەنجاڵ و پڕ تەقینەوانەی دەرەوەبێت. کیژەکە دەیبرد بۆ جێگایەکی نادیار، کە دەوەستا تەماشای دەوروبەری خۆی بکات، کەدەوەستا تەماشای ئەو فانۆسە خەیاڵیانەبکات کە لە هەوادا هەڵواسرابوون، کچەکە بە دەنگێکی ناسک بانگیدەکرد «جەلادەتی کۆتر بڕۆ». دەچوونە حەوشێکی گەورەوە، حەوشێکی بەرینەوە کە دەیەها فوارەی گەورەی تیابوو، کە وەک ئەوەی لە خەیاڵەوە هەڵقوڵێن، ئاوەکانیان لە هەوادا دەبووە غوبارو نەدەگەیشتە سەر زەوی. لە ژێر ئەو فوارە خەیاڵیانەدا جەلادەت سەدان سەربازی برینداری دەبینی، سەدان سەرباز بە خوێن و برینەوە، بە لەشی سووتاوەوە، بە کۆڵەپشتەکانیانەوە، بەو بەیداخە ناشیرینەی ولاتەوە کە دەست و خەتێکی ناشیرین لە ناوەڕاستدا نوسیبووی «اللـه اکبـر». لەو حەوشەیەدا لەگەڵ ئەو ئافرەتە ڕووتانەدا دەخەوتن، بەلام شوێنێک بوو لە بری ئەوەی بۆنی خۆشەویستی لێبێت، بۆنی شادی لێبێت، بۆنی مردنی لێدەهات. جەلادەت دەستی ئەو کیژەی بەردەداو لە نزیکەوە تەماشای چاوی ئەو سەربازانەی دەکرد، دڵنیابوو سەیری بنی بێکەرانی کیشوەرێکی نادیار دەکات، کە کیشوەری مەرگە. کچەکە دەستی دەگرت و دەیویست ڕووتیبکاتەوە، پاڵتۆ چەرمە سپییەکەی دادەکەند، کاسکێتە ڕەشەکەی دادەکەند، سەیری ئەو

چاوانەی دەکرد کە هاڵاوی تایەکی ترسناکیان لێ بەرزدەبووەوە. جەلادەت هیچی نەدەکرد، سەرسامانە لەو کیژە وردەبووەوەو سەیری ئەو مراوییە سەوزانەی دەکرد کە لە هەوادا دەفڕین و پەڕە گرانبەهاکانی خۆیان لە هەوادا دەوەراند. لەو ساتەدا کیژەکە دەستی دەبرد بۆ زنجیری پانتۆڵەکەی گوێی لە دەنگی مۆسیقایەکی خەیاڵی دەبوو لە هەوادا، پیانۆیەکی مەزن، سۆناتی بیست و سێی بیتهۆڤن، ف، مینۆر. قسەی ئەو سەربازەی بەیادا دەهاتەوە کە دەیگووت، هەمیشە مۆسیقارێکی نهێنی لە تاریکیدا هەیە، مۆسیقارێکی نهێنی و تووڕە، یەکێک وەک ئەوەی بە لێدان و سەر پەنجە تووڕەکانی ئەو مۆسیقا سیحراویتر کردبێت. وەسوەسەی پێغەمبەرەکانی دەهاتەوە یاد. ئەو کیژە دەیویست زیاتر ڕووتیبکاتەوە، دەستی کچەکەی دەگرت و دەیگووت: تۆ مردویت یان زیندووی؟ تۆ چیت، تۆ فریشتەیت یان ئەهریمەن... پێمبڵێ؟. بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی کیژەکە بکات، تەماشای ئەو سەربازو سۆزانییە غەمگینانەی دەکردو دەیگووت: هاوار. پڕ بە شەو، پڕ بەو حەوشە ترسناکە دەیقیژاند: هاوار. ئەوانە هیچ نەبوون، نە فریشتەبوون نە شەیتان، نە زیندووبوون نە مردوو، کۆمەڵێک ڕۆحلەبەربوون لە چاوەڕوانی کۆتاییەکی ترسناکدا، تێکەڵاوی یەکتردەبوون و لە یەکتر جیادەبوونەوە. هیچ نەبوون، سۆزانی و سەرباز بوون... ئەو وڵاتە سی ساڵ بوو لە سۆزانی و سەرباز بەولاوە هیچ شتێکی تری پەروەردە نەکردبوو، حەوشێکی ناکۆتا بوو، جەلادەت دەیویست ئەوسەری ئەو حەوشە ببینێت و نەیدەتوانی، تا ناکۆتا سۆزانی و سەربازبوون لەگەڵ یەکدا دەخەوتن و خۆیان دووبارە دەکردەوە، سۆزانی و سەرباز... سۆزانی و سەرباز... سۆزانی و سەرباز. وەک ئەو شارەی تا ناکۆتا فیگەرە ترساو و نائومێدەکانی خۆی دووبارەدەکردەوە. جەلادەت وەک ئەوەی لە نهێنییەکی ترسناک تێگەیشتبێت، زریزەی پانتۆڵەکەی دادەخست و پاڵتۆ چەرمەکەی هەڵدەگرت و کاسکێتەکەی دەکردەسەری و وەک شێت بەو تەمە سپییەدا

ڕایدەکردو سۆناتی بیست و سێی «بیتهۆڤن» بە هێمنییەکی سەیر لە سەریدا لێیدەدا... ڕایدەکردو پیانۆیەکی گەورە لە تاریکیدا دوایدەکەوت. بێهۆش ڕایدەکردو دەیگووت: هاوار. کە بە ئاگا دەهاتەوە لە ناوەڕاستی شەقامێک لە شەقامەکاندا کەوتبوو... دەمەو بەیان بوو، جگە لە تەمێکی سپی سپی هیچ شتێکی دی دیارنەبوو، جگە لە دەنگی بێدەنگی بەیانیان چرکەیەکی دی لە هیچ شتێکی گەردونەوە نەدەهات.

* * *

ماوەیەک بوو کەس لە پرتەقاڵی سپی جەلادەتی نەدەبینی، بە ڕۆژ پتر خەریکی گەشت و سوڕانەوەی ناو کوچەکان بوو، ئێوارانیش درەنگ بە لمێکی زۆرەوە لە قژیدا دەگەڕایەوە بۆ لای موسای بابەک و دالیا. حاڵی لە حاڵی شێتەکان بەدتربوو، کەس لەو گۆڕانە کوتوپڕە تێنەدەگەیشت، کەس لەو حوزنە ترسناکە تێنەدەگەیشت، بەڵام جەلادەت هەستیدەکرد ئەو بووە بە مەخلوقێک کە دیوێکی تری دونیا دەبینێت کەکەسی تر نایبینێت. دالیا هەمیشە کاتێکی دەدۆزییەوە، ملی جەلادەت بگرێت و بڵێ: هێشتا قیامەت هەڵنەستاوە، هەر وەختێک قیامەت هەستا تۆ ئاوها خۆت شێت بکە. سەری بە توندی دەخستە ژێر دوشی حەمامەکەوە تا لە لم و بۆنی باروت پاکیبکاتەوەو دەیگووت: گوڵی من، نازانم لەکەیەوە فێربوویت ئاوەها خۆت وەکو کەر لە لمدا دەگەوزێنێت، تێناگەم ئەو مێشکە پووتەی تۆ چی تیایە. ڕۆژی چەندین جار ئەو ڕستەیەی پێدەگووتەوە: نازانم ئەو مێشکە پوتەی تۆ چی تیایە؟ نازانم ئەو مێشکە پوتەی تۆ چی تیایە؟.

ڕۆژ بە ڕۆژ ئیشی بیمارگاکەی دکتۆر بابەک زیادیدەکرد. ڕۆژ بە ڕۆژ سەربازی هەڵهاتووو زامدار پتر ڕوویاندەکردە ئەو شارە. دالیا هەستیدەکرد هێدی هێدی گەمەکەیان شتێکی ترسناکی لێدەردەچێت. بەڵام موسای

بابـەک بـەردەوام یـەک ڕسـتەی دووبارەدەکـردەوە و دەیگـووت: نامەوێـت بـە ویژدانێکی بێئـارام و برینـدارەوە بمـرم. دالیـا دڵنیابـوو دوای جەنـگ ئـەم چیرۆکـە دەگاتـەوە دەمـی پیاوانـی ئاسـایش و ئەوانیـش بەدوورودرێـژی دەکەونـە سـۆراغی. تاکـە هیـوای دالیـا ئەوەبـوو کـە دەیبینـی هێـدی هێـدی سـوپا لـە یەک هەڵدەوەشێت، سـەربازەکان ئارەزوویەکیان نامێنێت بۆ شـەڕ، ئەوەشـی بە ئاماژەیەکی سـەرەتایی دەزانـی بۆ لەدایکبوونـی جیهانێکی دیکە. بە جەلادەتی دەگووت: جـەلادەت پێدەچێت هەنگاوێک، یـەک هەنـگاوی بچوک مابێت و ڕزگارمـان بێت. بـەڵام جەلادەت کـە سـەیری چاوانـی دالیـای دەکرد جگـە لـە دوکـەڵ و هـاوار هیچـی تـری نەدەبینـی. دوکـەڵ و هـاوار. دوکـەڵ و هـاوار، دوکـەڵ و هـاوار.

دەسـتی دەخسـتە سـەر دەسـتی دالیـاو دەیگووت: دالیـا بابڕۆیـن... دڵـی من، بابڕۆیـن، بابڕۆیـن ئێسـتا کاتێتـی لێرە دەربازبیـن. دالیـا بـە مەکرێکی کچانـەوە سـەیریدەکردو دەیگـووت: گوڵـی مـن ئـەی فریشـتە چکۆلەکانـم چـی لێبکـەم. جـەلادەت دەیگـووت: ئـەو فریشـتانە هیـچ نیـن جگـە لـە دەرکەوتنـەوەی جوانـی تـۆ لـە هـەوادا، لەدەرکەوتنـەوەی ڕۆحـی خـۆت لـە هـەوادا. تـۆ لـە کـوێ بێـت ئـەو فریشـتانە لەوێـن، بـەڵام دەبێـت بیاندۆزیتـەوە... دالیـا بابڕۆیـن...بابڕۆیـن. دەچیـن لـە شـوێنێک بـە هێمنـی دەژیـن و دەمریـن... نـەوەک لێرەدا، ئێرە شـاری ئادەمیـزاد نییـە. دالیـا باوەشـی پیادەکـردو دەیگـووت: چەنـد قسـەی شـیرین و خۆشـم بۆدەکەیـت، خـودای گـەورە بـەو قسـانە دەمکوژیـت. ئـاە... چەنـد ڕۆژە حەزدەکـەم بگریـم، بـەڵام کاتـم نییـە، تێدەگەیـت، هێنـدە خەڵکـی زامـدارو غەمگیـن دەبینـم کاتـم نییـە بگریـم... جـەلادەت، تـۆ دەڵێیـت چـی، دیسـانەوە بـەو تەماشـاکردنەت دەمکوژیـت، مـن کاتـم نییـە بگریـم، تێمدەگەیـت، کاتـم نییـە، خـودای گـەورە، چەنـد ڕۆژە دەمەوێـت بگریـم، بـەڵام کاتێـک بـە ئاگادێمـەوە ئـەو سـەربازە بەسـتەزمان و بیمارانـە لـە بەردەگان داوای ئـاو دەکـەن، داوای نـان دەکـەن، داوای دەرماندەکـەن. جـەلادەت ئـاە دەمەوێـت بگریـم و وەختێـک

نادۆزمـەوە تیـا بگریـم.

«مەلعـون بـوو ئـەو ڕۆژانـە... مەلعـون». کـە جـەلادەت چیرۆکەکـەی بـۆ دەخوێنمـەوە، مـژی لـە جگەرەکـەی دەداو وایدەگـووت.

«مـن شـێت بـووم... شـێت، بەلام ئەو ساتانەی قسـەم لەگەڵ دالیادا دەکرد، خەیاڵێکی سـافم هەبـوو، تـام نەبـوو، وڕێنـەم نەدەکـرد، نەدەلەرزیـم... بەڵکـو بـە هەمـوو هـۆش و وریایـی خۆمـەوە بـە دالیـام دەگـووت: بابڕۆیـن، پێـم دەگـووت: مـن نـاو تاریکـی دەبینـم... مەسـافە دوورەکان دەبینـم... ڕێگاکان... مـن هەمـوو شـتێک دەبینـم، نەخشـەیەکی شـێت لەسـەرمدایە، تێدەگەیت نەخشـەیەک تەنیـا لەسـەری منـدایە، کە نازانـم چ شـەیتانێک خسـتویەتییە سـەرمەوە، بەلام دەزانـم دەربازماندەکات.

بەلام دالیـا دەیویسـت حیکایەتەکە بەوجۆرەبێت کە ئەو دەیەوێت. دەسـتی جەلادەتـی دەگـرت و دەیگـووت: ڕۆژێـک کـە تـرس لەسـەر ڕێگاوبانـەکان نەمـان مـن پێدەڵێم. تـۆ دوای ئـەو نەخشـە کەرانەیـەی سـەری خـۆت مەکـەوە، خـودای گـەورە، گوڵـی مـن هەسـتناکەم ئـەم مێشـکە پووتەی تـۆ نەخشـەو شـتی وای تێدابێـت. جـەلادەت دەپاڕایـەوەو دەیگـووت: دالیـا بـاوەڕم پێبکـە... بـاوەڕم پێبکـە، مـن نەخشـەیەکی سـەیر لەسـەرمدایە و هەمـوو شـتێک دەبینـم... مـن پێغەمبـەرم... تێدەگەیـت... مـن خـودا نەینـاردووم، بەڵکـو لـە زەویەکـی تـرەوە هاتـووم، لـە شـارێکی تـرەوە هاتـووم کـە نـاوی شـاری مۆسـیقارە سـپییەکانە... هەسـتی پێدەکـەم... دالیـا مـن هەسـتی پێدەکـەم».

دالیـا دەیگـووت: دڵـی مـن دڵنیابـە دەڕۆیـن. بـەلام هێشـتا زووە. بەقسـەم بکـە... ئەمـە وەک یارییەکـی ترسـناک وایـە، عەزیـزم، دەزانـی چـۆن، وەک یەکێـک بەسـەر پەتێکـی باریکـدا بـڕوات، هـەر کاتێـک قاچـی بـە هەڵـە لـە جێگایەکـدا دانـا یاخـود پەلەیکـرد بەردەبێتـەوە. ناتوانـم تـۆ بخەمـە مەترسـی ئاوهـاوە... دەبێـت بوەسـتین.

جـەلادەت دڵنیابـوو ئـەو ڕۆژانـە دواهەمیـن فرسـەتن و ئیـدی دەرفەتێـک

نارەخسێت تیایدا دەستی دالیا بگرێت و لەو تەپوتۆزە دەربازیبکات. بە هەرحاڵ ڕووداوەکان هێند سەیرو خێرا تێپەڕین کاتێکی نەهێشتەوە بۆ بیرکردنەوە. جەنگی هەرە گەورەی دونیا لە ناکاو گەیشتە دواهەمین ڕۆژو سەعاتەکانی خۆی، هێزە پیادەکانی هاوپەیمانان لە ماوەیەکی کورتدا نەیارەکانی خۆیان ڕاداو گەورەترین هەرەسی سوپایەک لە مێژوودا دەستی پێکرد، هەرەسێک نەبوو لە یەک جێگاوە، بەڵکو لە هەموو بەرەکانەوە، لە هەموو ئۆردوگاکانەوە، لە هەموو بنکەیەکی سەربازییەوە، لە چەند سەعاتێکدا زۆری هێزەکانی دەوڵەت وەک ئەوەی لە بەفر بن توانەوە، سەر ڕێگاکانی باشوور پڕبوون لە دەیان هەزار تانک و زرێپۆش و نەفەرهەڵگری سووتاو، دەیەها هەزار سەرباز کە لە قەراغی شەقام و لە ناو ماشێنەکانی خۆیاندا بووبوونە خۆڵەمێش و ئێسکی پوکاوەی ڕەش. بۆنی سووتانی ئادەمیزاد تا دەریا زۆر دوورەکان دەڕۆیشت. دەیەها هەزار سەربازی دیکە بە پێی پەتی و تینوێتی و برسێتی بە سەحرادا کەوتنە مارشێکی ئەفسانەیی، مارشێک بەرەو شارەکانی خۆیان، بەڵام بە ناو لم و تۆزو گەردولوولدا، هەزارەها سەربازی پێپەتی و زامدار کە نەیاندەزانی بۆدەبێت بەدەردێکی وابچن. دوکەڵێکی خۆڵەمێشی تێر لەسەر زەوی چۆکی دادابوو، ساتێکی ترسناک بوو، جەلادەت چاوی خۆی دەگرت و بەردەوام سەربازی سووتاوی دەبینی، بە گڕەوە بە ڕێگاکاندا دەڕۆیشتن، سەرباز کە بووبوون بە خەڵوز و هەر مارشیاندەکرد، سەرباز کە سەیری ئاسمانیان دەکردو بە یەک دەنگ دەیانگووت: هاوار. جەلادەت چاوی دەنوقاند و دەیبینی ئاسمان پڕبووە لە باڵداری سووتاو، کۆتری خەڵوزین، ڕێگاکان پڕبوون لە ئەسپی سووتاو کە هەر غاردەدەن، لە ئاسک کە بە گڕەوە لە سەحراکانەوە دێن، لە ماسی کە لە هەوادا وەک چرا داگیرساون.

جەلادەت لەڕۆژانی کۆتایی شەڕدا پێنج ڕۆژ لە پرتەقاڵی سپی نەچووە دەرێ. بەردەوام شۆربایەکی پیازی دروستدەکردو چایەکی لێدەناو وەک

یەکێک دەردێکی کوشندەی گرتبێ لە ناو جێگاکەیدا وڕێنەی دەکرد، چاوی لێکدەناو وەک عەڕافێکی پیر شتی دەبینی، شاره دوورەکانی دەبینی، بورجە سووتاوەکانی دەبینی، خانووی ڕوخاوی دەبینی، ژن و منداڵی دەبینی پەلاماری دەزگا گەوەرەکانی دەوڵەت دەدەن، دوکەڵی دەبینی لە هەر چوار لای دۆنیاوە هەڵدەستێت. نەیدەویست ئەو ژووره جێبهێڵێت، شۆربای گەرمدەکردەوەو هەڵیدەقوڕاند و وەک یەکێک دەردێکی سەختی گرتبێت دەچووەوە ناو جێگاکەی خۆی. بەردەوام هەستی بە برسێتییەکی کوشندە دەکرد، هیچ شتێک لەو شارەدا نەبوو، بیکڕێت، ڕێگاکان هەمووی داخرابوون، پرتەقاڵی سپی لە ناکاو تەواو چۆڵ و هۆڵ بووبوو. لە جێگایەکدا فەردەیەک پیازی کۆنی دۆزیبیەوەو بەردەوام بە کۆمەڵێک نانەڕەقی کۆنەوە، بە سەموونی وشک هەڵهاتووەوە دەیخوارد، دەیکرد بە شۆرباو هەڵیدەقوڕاند. چاوانی هێدی هێدی دەچوون بە قووڵدا، نەیدەتوانی ڕیشی بتاشێت، کە خۆی دەگۆڕی دەستی دەلەرزی. بەردەوام هاوارێکی سامناک لەسەریدا بوو، لە پەنجەرەکەوە تەماشایدەکردو ئەو دوکەڵە ڕەشەی دەبینی کە بە ناو هەموو شاردا دەڕۆی، ئەو ڕۆحلەبەره برسییانەی دەبینی ناو خۆڵەکان بۆ پاشماوەی خواردن دەگەڕان... سەربازەکانی دەبینی لە ناو شەقامەکاندا مراوی ڕاودەکەن، ماسییە خەیاڵییەکانی دەبینی لە ناو دوکەڵەکاندا مەلەدەکەن. بەحری دەبینی لە بەرچاوی دەسووتێت. هاوڕێکانی خۆی دەبینی لە دوکەڵدا بانگیدەکەن. زۆربەی شەو لەسەر بانگی هاوڕێکانی بە ئاگادەهاتەوە، زۆربەی شەو سەرهەنگ قاسم و ئیسحاق دەهاتنە خەوی و مۆسیقایان بۆ لێدەدا، دەیویست بیانگرێت، بە ناو ژوورەکانی پرتەقاڵی سپییدا دوایان دەکەوت، لەسەر پلیکانەکان بەردەبووەوە، لە پەنجەرەکانی پرتەقاڵی سپییەوە دەیبینین لەسەحرادا وندەبن، هاواری لێدەکردن... دەستی بەسەریەوە دەگرت و دەنگی ئەو فلووتەی ئیسحاقی زێڕین لە سەریدا بوو. سەری خۆی دەدا بە دیوارەکاندا بەڵام سودی نەبوو.

کەدوای پێنج ڕۆژ دالیا لەو دۆخە ترسناکەدا دۆزییەوە باوەڕینەکرد، سەرتاپای گیانی شین بووبووەوە، جلەکانی سەرتاپا پاشماوەی خۆراکی ڕژاوبوون، قژی وەک شێتەکان هەڵچووبوو، لە هەموو ئادەمیزادێک دەترسا... تا دالیا پێینەگووت. من دالیام، دالیا سیراجەدین، نەیدەویست لێی نزیک بێتەوە. ترس و کەمخۆراکی و لاوازی و هەڵمژینی بەردەوامی ئەو دوکەڵە ژەهراوییە تووشی حاڵەتێکی ترسناکیان کردبوو. بەو تاکسییە چکۆلانەیە کە ڕۆژانی ئاشتی و شەڕ لە بەردەم پرتەقاڵی سپییدا دەوەستا، بەو شۆفێرەوە کە پێدەچوو لە ناو ئەو ماشێنەدا لەدایکبووبێت، دالیا جەلادەتی گەیاندە لای دکتۆر بابەک، جلەکانی گۆڕی، شتی، خواردنی دایە و پێیگووت: جەلادەت ئێستا دەبێت خۆت بگۆڕیت بۆئەوەی بڕۆین، ئیتر تەواو هیچ شتێک نەما من و تۆ لێیبترسین، لە هەموو شارەکانی باشوور شۆڕشە، تێدەگەیت لە هەموو شارەکان ڕاپەڕینە، لە هیچ جێگایەک دەوڵەت نەماوە. ئێستا تۆ دەتوانیت بەو شەقامەدا بڕۆیت و نەترسیت.

ئێوارەیەکی درەنگ، دالیاو جەلادەتی کۆتر ماڵاواییان لە دکتۆر بابەک کردو لەو شارە دەرچوون، دیارە دوا ماڵاوایی و دوا ساتی جیابوونەوەیەکی گەورە نەبوو، بەڵکو جەلادەت و دالیا دەیانویست بڕۆن و پێکەوە ببینن چ باسە، هەواڵی شۆڕشێکی گەورە کە سەرجەمی باشووری گرتۆتەوە لە هەموولایەکەوە دەهات، دەوڵەت و بازگەی پشکنین و هێزی سەربازی لە هیچ جێگایەک نەمابوون. دکتۆر بابەک لەبەر هەندێک لە نەخۆشەکان نەیدەتوانی شوێنی خۆی جێبهێڵێت، کە ماڵاوایی لێکردن سوێندی لێ سەندن کە ئەگەر سبەی نەگەڕێنەوە ئەوا بە دڵنیاییەوە لە دوو ڕۆژی داهاتوودا چاوەڕوانیاندەکات. هیچ یەک لە جەلادەت و دالیا نەیاندەویست بە چەشنێکی وەها خێراو کوتوپڕ ئەو شارە چۆڵبکەن، بەڵام ئەو ئێوارەیە دەیانویست سنوورەکانی ئازادی خۆیان تاقیبکەنەوە. کە بەو شەقامەدا کەوتنە ڕێ دونیا هێدی هێدی تاریک دەبوو، کەمی سووتەمەنی و سووتانی

بیرەکانی نەوت وایدەکرد بەدەگمەن ماشێنێک بەو جادانەوە بێت، ڕێگایەکی درێژیان لە بەردەمدا بوو، کە دەبایە بە شەقامێکی غەمگیندا بیبڕن، بە ناو دەیەها ئۆردوگای سەربازی خاپووردا ڕابوردن، ئەو بنکە گەورانەی سوپایان بینی کە بووبوون بەکەلاوەی گەورە، بە ناو سەدان جەمەلۆنی گەورە گەوردا تێپەڕین کە تەنیا چێوەکانیان مابووەوە، بەسەر هەزاران شێلمانی تواوەو کوڵەکەی ئاسندا ڕۆیشتن کە وەک مۆم ڕژابوونە سەر زەوی. دەیان مرۆڤی برینداریان بینی لە ژێر دارو پەردووەکاندا کەس نەبوو دەریانبهێنێت، سەدان ژن و منداڵیان بینی لە ناو پاشماوەی ئەو سەربازگەو ئۆردوگا سووتاوانەدا خواردن و جل و چەکیان دەردەهێناو بەسەر خۆیاندا دابەشیاندەکرد. جەلادەت بەدرێژایی ڕێگاکە بەدەگمەن قسەیدەکرد، وەک شێت بە لۆقە درێژ و هەنگاوە گەورەکانی بە ڕێگادا دەڕۆیشت و سەری بە جۆرێکی سەیر داخستبوو. دالیا لە جلێکی عەرەبی ڕەش و درێژدا، بە لەچکێکی ڕەشەوە، بە خێراییەکی گەورە هاودەم و هاوئاهەنگ لەگەڵ جەلادەتدا دەڕۆی، لە ڕێگا هەندێ ماشێنیان دەبینی کە سەرنشینەکانی لەچکی سەوزیان لە پەنجەرەکەوە دەرهێنابوو و هەلهەلەیان لێدەدا. هەر ماشێنێک بەلایاندا دەڕۆی تا ماوەیەکی درێژ تەپوتۆزەکەی لە هەوادا دەمایەوە. لە ڕێگا وێنە سووتاوەکانی سەرۆکیان دەبینی، کە تا ئەو کات دوکەڵیان لێ هەڵدەستا. دوای چەند سەعات ڕۆیشتن پیکابێکی سپی کە دەیان فەردە ئاردی بارکردبوو، پیرێکی کەڕولاڵ لێیدەخوڕی، کە لەگەڵیدا مرۆڤ نەیدەزانی دەچێت بۆ کوێ سواری کردن. گرنگ نەبوو دەچێت بۆ کوێ، ئەو ساتە دەمێک بوو خەڵکان هەموو نەیاندەزانی دەچن بۆ کوێ، گرنگ ئەوەبوو مرۆڤ بڕوات، بڕوات و بەس. هەندێ ساتگەل هەن لە ژیاندا، مرۆڤ تەنیا دەبێت بڕوات بێئەوەی بپرسێت بەرەو کوێ؟. خۆی بداتە دەست شۆفێرێکی کەڕولاڵ و لێگەڕێ بیگەێنێتە جێگایەکی دیکەی ئەم ژیانە. ئەو ڕۆژە دالیاو جەلادەت خۆیان دایە دەست ئەو شۆفێرە و دواجار

لە شارێکی تاریک بەلام جەنجاڵدا خۆیان دۆزییەوە، شارێک لەو شارە پیرۆزانەی باشوور، ئەو شارانەی پڕن لە گومەزی زێڕین، منارەی تەلا، قوبەی ئەڵماس. شۆفێرەکە لە نزیک یەکێک لەو منارانەوە دایگرتن و وەک کەڕوالێکی نەجیب بێئەوەی پارەیان لێ وەرگرێت مالاوایی لێکردن. شارێک بوو بە جۆرێکی سەیر خرۆشابوو، پێدەچوو سەدان ساڵ بێت خرۆشانی وەهای بە خۆیەوە نەبینیبێت، لەوە دەچوو دوای چەند سەدەیەک شتێکی خەوتوو لە هەناوی ئەو شەقام و کوچانەدا بە ئاگاهاتبێتەوە... لە هەموو منارە و گومەزەکانەوە هاوار بوو، بانگ و سەلا بەو نەغمە غەمگینەی دڵی لەت لەتدەکرد. لە زۆر شوێن دەنگی تەقەو گوللەبارانێکی سەیر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی بە پۆلی گەورە گەورە بە شەقامەکاندا دەڕۆیشتن و ڕوویان لە قسنەکان و نێو گۆڕەپانی بەر مەرقەدەکان دەکرد. خەڵکانێک بە چەکی سووکەوە پەڕۆیەکی سەوزیان بە نێوچاوانیانەوە بەستبوو لێی نوسرابوو «یا علی» «ادرکنی یا مهدی» «ثورە ثورە جعفریە». هەلایەکی سەیربوو، هەزاران خەڵک بێ هیچ ئاڕاستەیەک بە شەقامەکاندا ڕایاندەکرد، هەندێکیان دەگریان، هەندێکیان پێدەکەنین، هەندێکیان لە خۆیاندەدا، هەندێکیان بە دیسداشەی چلکنەوە بە کوچەکاندا هەڵدەهاتن و هاواریان لە حوسەین دەکرد. هەندێک خەڵک خواردنیان هێنابووە سەر جادەکان و هاواریان لە غەریبەکان دەکرد بێن نان بخۆن. خەڵکانێک باوەشیاندەکرد بە یەکدا و پیرۆزباییان لە یەک دەکرد. جەلادەت و دالیا کەوتبوونە دونیایەکی تازەوە، دونیایەک بێ دەوڵەت، بێ پۆلیس، بێ سوپا، بێ پیاوانی ئاسایش. دونیایەکی جوان، بەلام بێ هیچ دەستێک بتوانێت شتەکان ڕێکبخات. بێئەوەی بزانن دەچن بۆ کوێ، لە نزیک دەرگای یەکێک لە مزگەوتەکان دوو لەفەی شفتەی ساردیان خوارد، لە سەر عەرەبانەیەک دوو چایان خواردەوە... جەلادەت وەک شێت سەیری هەموو شتێکی دەکرد، سەیری منارەکان و گومەزە تەلاکان، سەیری مانگ کە بە جۆرێکی سەیرو

گەورەو بێمانا لەسەر سەری وەستابوو، بۆنی ڕۆحانییەتێکی تاریک لە زاری مزگەوتە گەورەکان دەهاتەدەرێ، هالاوی چەندەها سەدەی کۆن لە قوبە و باڵندەکان و سورەتی هەڵکەنراوی سەر دیوارەکان دەهات. ئەو شەوە جەلادەت بۆ هەر کوێ دەچوو وا هەستیدەکرد مانگ ڕاستەوخۆ لەسەر سەریێتی. بەو چاوە جوان وسەرسامانەوە کە هیچیان لە چاوانی ئەو مۆسیقارە نەفامەی پرتەقاڵی سپی نەدەچوو سەیری ئەستێرە و شەقام و دەموچاوەکانی دەکرد، ئێستا نیگاکانی لە نیگای کەشتیوانێکی دەکرد کە ڕێک سەیری گەردەلوولێکی گەورەبکات لە بەردەمیدا، نیگایەک دواتر من زۆرجار لە چاوانیدا بینیومەتەوە، نیگایەک پڕبوو لە ترس و سەرسامی، غەم و قووڵی، تەنهایی و غوربەت.

کە لە بەردەرکی مزگەوتەکەدا وەستابوون گوێیان لێبوو، کە حەشاماتێکی زۆر لە یەکێک لە کوچەکانەوە ڕایاندەکرد، حەشاماتێکی بە هات و هاوار، بێسەبر و پڕ لە دەنگەدەنگ، سەدان خەڵک بێ هیچ هۆیەک ڕایاندەکرد و دوای گروپێکی تری ئادەمیزاد کەوتبوون کە ئەوانیش دوای کۆمەڵێک منداڵ کەوتبوون کە دەیانگووت زیندانێکی نهێنیان دۆزیوەتەوە. جەلادەت و دالیا دوای ئەو حەشامەتە زۆرە دەکەوتن. سەدان ژن و پیاو، هەندێکیان بە پاچ و چەکوش و قوڵنگەوە شەقامەکەیان تەیدەکرد و تەکبیریاندەدا. خەڵکانێک کە دیسداشە دڕاوەکانیان، چاوە پڕ فرمێسکەکانیان، دەستە بریندارەکانیان، هەناسە ساردەکانیان لە هەر کتێبێک ڕوونتر قسەیدەکرد، مەقهورترین ڕۆحلەبەری سەر ئەم ئەستێرەیەبوون، مەگەر تەنیا مردووەکان لەوان شکستەتر و ماندووتربن. جەلادەت و دالیا بێ هیچ بەهانەیەک بە حەماسەتێکی زۆرەوە دوای ئەوانە کەوتن. بە چەندین کوچەی تەسک و تاریکدا ڕۆیشتن، کوچەی درێژ کە بۆنی بوغرد و خوێن و هەریسەیان لێدەهات. لە کۆتاییدا گەیشتنە گۆڕەپانێک کە بە سەدان چرای دەست ڕوناککرابووەوە. پێدەچوو بەر لەوانیش چەندین کەس لەو جێگایەدا کاریانکردبێت، دیاربوو یەکێک

لە دەرگایەکی نهێنییەوە سەردابێکی دۆزیبووەوە کە ڕاستەوخۆ بردبوویە سەر زیندانێکی نهێنی لە ژێر زەویدا. بەر لەوان دەیەها کەس چیمەنتۆیان شکاندبوو، دیواریان ڕوخاندبوو، دەرگایان هەڵکەندبوو، بۆئەوەی بگەنە دەمی ئەو سەردابە نهێنییە. گۆڕەپانەکە ئێجگار گەورەبوو، دەمی زیندانە نهێنییەکە دەکەوتە سەر حەوشی ماڵێک کە بەقسەی کەسانێک لە ناو حەشاماتەکەدا بنکەیەکی تایبەتی هێزەکانی ئاسایش بووە. لەوێوە زیندانێکی سەیریان دۆزیبووەوە بە هەزاران لق و پۆپەوە، بە هەزاران ژوورەوە، بە دەیان هەزار زیندانییەوە کە کەس نەیدەزانی لە چ دەورو زەمانێکدا گیراون. هەندێکیان زمانی سەردەم و ڕۆژگارێکی تر قسەیان دەکرد، هەندێکیان ناوی خۆیان یادکردبوو، هەندێکیان زیندان تووکی پێوە نەهێشتبوون، هەندێکیش بە جۆرێک سەرو ڕیشیان درێژبووبوو لە دڕندەیەکی دارستان دەچوون. خەڵکانێکی زۆر پاڵەپەستۆیاندەکرد بچنە ژووری بۆ ناو سەردابەکە، کۆمەڵێک خەڵکی چەک بەدەست دووریان دەخستنەوەو دەیانگووت: بەوجۆرە نابێت، بەوجۆرە نابێت، خوارەوە خەڵک زۆر ناگرێت، پێویستیمان بە چەند کەسێکی گەنجە زنجیرەکان بشکێنن، تێدەگەن خەڵکمان دەوێت زنجیرەکان بشکێنن. جەلادەت کە سەیرترین ڕوخساری ناو حەشاماتەکە بوو، بە چاکەتە ڕەش و کاسکێتە چەرمەکەیەوە پتر لە ئەکتەرێکی سینەما دەچوو نەوەک لە زنجیرشکێنێک، بەلام بەدەر لە ئیرادەی خۆی یەکەم کەس بوو، گووتی: هاوڕێم بیدەن بە من، من ئامادەم ئامادەم. من زنجیرەکان دەشکێنم. ئەوەی کاروباری بەر دەرگاکەی ڕێکدەخست کوڕێکی گەنج بوو، پێدەچوو شتێک سەروسیمای جەلادەتی خستبێتە دڵیەوە، گووتی: تۆ و دوو کەسی ترم دەوێت، دوو کەسی تر، ئەوانی تر هەموو بڕۆنە دەرێ، زیندانییەکان پێویستیان بە کۆمەکە، لیژنەیەک دروستبکەن بۆ کۆمەکی زیندانییەکان، ها برام لیژنەیەک دروستبکەن بۆ کۆمەکی زیندانییەکان. ماڵ و حاڵ و شوێنی خەویان بۆ بدۆزنەوە، تیماریانبکەن... تا کەس نەیێتە

ژووری، خوارەوە کەسی تر ناگرێت. ئەوەی کەس و کاری هەیە سەبربگرێت ئێستا یەکە یەکە زیندانەکان بەردەدەین، زۆرن زۆر زۆرن، کەس نازانێت چەند ساڵە زیندانن، لە زەمانی حەجاجەوە، چوزانم لە زەمانی هارون ئەلڕەشیدەوە... هاهاها... ڕەب الحلو... بەرمەکییەکانیش لێرەن... سەبرتان بێت ئەمشەو بەرمەکیەکانیش دەبینن، هاهاها... هەموویان لێرەن... ڕەب لحلو لە عەبدولرەحمانی داخلەوە تا مەلیکە بچکۆل.

خەڵکی بە گشتی پێدەکەنین، کوڕە گەنجەکە بە دەنگێکی بەرزتر دەیگووت: کەس نازانێت چەند هەزار زیندانە، تا عەقڵ دەیبڕێت زیندانە و درێژ بۆتەوە، من خۆم مەلیک غازی و عەبدولکەریم قاسمم بە چاوی خۆم دی، ڕەب لحلو باوەڕم پێناکات. دە بە شەرەف لەوانەیە نوری سەعیدیش هەر لەوێ بێت. تا دەهات خەڵکەکە پتر لەگەڵ قسەکانی کوڕەکەدا تێکەڵدەبوون و پێدەکەنین. خەڵکی لە گەرمەی پێکەنیندا بوون کە تیپەکانی ژێرەوە یەکەم زیندانیان دەهێنایە سەری. پیاوێکی پیرو باریک کە هێندەی حەشاماتەکەی بینی دەستیکرد بە گریان، خەڵکانێک باوەشیان پیادەکردو دەیانگووت تۆ ئازادبوویت، پیرەمێردەکە زنجیرێکی ئەستوور لە قاچ و دەستیدا بوو دەیگووت «نامناسن... نامناسن، من سەعیدم کوڕە چکۆلەکەی ئایەتوڵا حەسەنی قەزوینی». پیاوەکە تەنیا دەرپێیەکی کورتی لە پیابوو، تەمەنی لەسەروو حەفتاوە بوو، هیچ موویەکی ڕەش بە بەدەنییەوە نەمابوو، بەوەدا هێشتا خۆی وەک کوڕە بچوکی ئایەتوڵایەک ناوزەددەکرد کە کەس یادی نەمابوو، شتێک بوو عەرەبە بەختەوەرەکانی زیاتر دەخستە پێکەنین، کە تەنیا ئەمشەو دوای زیاد لە حەفتاساڵ یەکەمین شەوی ئازادی دەژیان. جەلادەت چەکوشێکی گەورەی هەڵدەگرت و هاواریدەکرد: دووربکەونەوە، با زنجیرەکانی بشکێنم... دووربکەونەوە. خەڵکەکە پیرەکەیان لەسەر دەست هەڵدەگرت، مەستانە و گەرم بە جۆش و خرۆشێکی بێوێنەی شادیی دەیانگووت: بژی... بژی، کوڕە هەرە چکۆلەکەی

ئایەتولا قەزوینی. لەسەر بەستێکی کۆنکرێتی کە لە کاتی ئاساییدا بۆ گرتنی بەردەمی شوێنە دەوڵەتییەکان بەکاردەهات، جەلادەت وەک ئەوەی هێزێکی ئەفسانەیی تیا بەرجەستەبووبێت، بە زرمەیەکی گەورەوە، بە دەست بادان و بازوو وەشاندنێکی پاڵەوانئاساوە ئەو زنجیرە ئەستوورانەی دەپچڕاند. دالیا لە نزیکییەوە لە جلە عەرەبییە ڕەش و لەچکە بە حیشمەتەکەیدا تەماشایدەکردو تێنەدەگەیشت ئەو هێزە کوتوپڕو گەورەیە چییە کە لە جەلادەتدا کۆبۆتەوە، کوڕێک ڕۆژانی ڕابوردوو، کاتێکی سەختی برسێتی و گێژی بەسەربردبوو. خەڵک کە زنجیرە پچڕاوەکەیان دەبینی دەیانکردە چەپڵە ڕێزانێکی زۆر... جەلادەت وەک شتێک مەستیبکات، چەکوشەکەی بەرزدەکردەوەو دەیگووت: زنجیرەکان بێنن... زنجیرەکان. بە درێژایی شەو جەلادەت زنجیری ئەو زیندانیانەی دەشکاند کە دەهاتنەدەرێ، زنجیر لە دوای زنجیر... زنجیر لە دوای زنجیر. لەگەڵ هاتنەدەرەوەی هەموو زیندانییەکدا خەڵکی دەیانکردە چەپڵە ڕێزان و تەکبیرلێدان، دەگریان و هاواری حەسەن و حوسەینیان دەکرد، هەندێک خۆشحاڵانە باوەشیان بەیەکدا دەکرد، جەلادەت هەر زنجیرێکی دەشکاند، باوەشی بە زیندانییەکەدا دەکردو پێیدەگووت: بڕۆ برام ئازاد بە، تا هەتا هەتایە، مەهێڵە جارێکی تر هیچ کەسێک بتگرێت. هەندێجار کە ماندوودەبوو چەکوشەکەی دەدایە گەنجێکی تر کە هەر لە تەمەنی خۆیدا بوو، دالیا لە ناو خەڵکەکەوە، خواردن و ئاوو چای شیرینی بۆ دەهێنا، کەسانێک بە سەتڵی گەورەوە شەربەتێکی هێلداریان بەسەر خەڵکدا دەگێڕا. جەلادەت بەردەوام چەند پەرداخێکی دەخواردەوەو لە ناو حەشاماتەکەدا هاواریدەکرد: شەربەتی سەرکەوتن، شەربەتی ڕزگاربوونی ئێمەی ئادەمی لە ژیانێکی حەیوانی و پڕ زەیلەت.. بژی ئینسان... بژی خودا. دالیا هەرکات دەیزانی جەلادەت جۆش و خرۆشی تێدەگەڕێ، دەترسا، بە تایبەت دڵنیابوو جەلادەت هیچ لە عەقلییەتی ئەو خەڵکە ئیماندارو چەوساوەیە تێناگات، نازانێت چەندە

ناجێگیرو مەزاجی و زووگۆڕن. جەلادەت بە حەماسێکی بێوێنەوە، ئارەقەی دەردەدا و زنجیرەکانی دەشکاند، هەزاران زیندانیبوون کە دەستە دەستە لەو ژێر زەمینە دەهاتنەدەرێ و نەیاندەزانی چیبکەن و بۆ کوێ بچن. زیندانی سەردەم و زەمانی جیاواز جیاوازبوون، هەندێکیان بۆنی قەڕنە دوورەکانیان لێدەهات، نە ناویان هەبوو نە ناونیشان. سێ گەنجی مێزەر بەسەر و چاویلکە لە چاو کە هەر سێکیان بەیەکەوە دەجولانەوە، بەیەکەوە چاویان دەتروکاندو بەیەکەوە دەستیان بەرزدەکردەوە، دەیانگووت: قوتابی حەوزەن. لە ناو حەشاماتەکەدا زیندانییەکانیان وەردەگرت و لە پاسێکی تایبەتدا کە بەردەوام لە هاتوچۆدا بوو دەیاننناردن بۆ حەمامێکی تایبەتی و لەوێوە بۆ ناو مەرقەدەکان. دالیا لەگەڵ چەند ژنێکی تردا، ئەو جل و کەلوپەلانەیان جیادەکردەوە کە خەڵک بۆ زیندانییەکانیان دەهێنا، هەندێکیان ڕووت و قووت بوون، کە دەهاتنە سەرێ و هەوا لێیدەدان هەڵدەلەرزین، بەجۆرێک دەلەرزین مرۆڤ دەترسا لەویادا بمرن. زۆربەیان دوای شکاندنی زنجیرەکانی دەست و قاچیشیان هەر نەیاندەتوانی بەڕێگادا بڕۆن. دالیا جلەکانی ئامادەدەکردو دەیدایە گەنجێکی یەکچاو کە دەیگووت «بەعسییە کافرەکان چاوێکیان دەرهێناوەو داویانە بە پشیلەیەکی گەڕ». جەلادەت تا دەمەوبەیان بێماندووبوون زنجیری دەشکاند، لە نزیکی بەربەیان خەڵکانێکی زۆر کە شەو نەخەوتبوون ئەو دەوروبەرەیان چۆڵدەکردو خەڵکانێکی تر جێگایان دەگرتەوە، لە وچانێکدا جەلادەت جگەرەیەکی دادەگیرساند و بە لەزەتێکی قووڵەوە مژێکی لێدەدا، لەو مژانەی کە ساڵانێک دواتر لە کاتی گێڕانەوەو خوێندنەوەو چاکردنی تێکستەکەیدا من دەمبینی و پێموابوو دەیەوێت لەگەڵ مژەکانیدا هەموو بای گەردون بباتە ناو ڕۆحی خۆیەوە. دادەنیشت و سەیری مانگی دەکرد کە هەمیشە بەسەر سەریەوە بوو، لە ناکاو ئەو گۆرانییە ئەفسووناوییەی «مەزهەری خالقی» دەهاتەوە یاد: لەیەکێک تاریک ئەی مانگ، لە یەکێک ڕوناک / تاکەی دەکەوم ئەی مانگ،

مات و تەنیاو تاک. سەیربوو لە ناوەڕاستی ئەو مەیدانەدا، لە شارێک لە شارە موبارەکەکاندا، لە ناو دەنگی تەکبیرو وەلوەلەی شیعەمەزەبەکاندا، لە سێبەری مزگەوت و منارە زێڕینەکاندا. لەناکاو مرۆڤ سەیری مانگ بکات و مەزهەری خالقی بیربکەوێتەوە. ساتێکی ناماقووڵ و بێمانابوو، بەڵام ئەو شەوە خۆی بێمانابوو، ساتێکی کورتی ئازادی بوو لە بەحرێکی ترسناک و قووڵی ئەشکەنجەدا. هێندەی لەگەڵ ئیسحاقدا وەک فلووت ژەنێک بە زەویدا گەڕابوو، ئەو گۆرانییەی بەیادنەکەوتبووەوە، بەڵام لە ناکاو وەک لەگەڵ شکاندنی زنجیرەکاندا، ئەو زنجیرە سەیرانەی سەر ڕۆحیشی شکابێت، ئەو قفڵانەش شکابێت کە چەندین کاتە لە ڕۆحی دراون. لە پڕدا خەیاڵی پڕدەبووەوە لەو ئاوازو گۆرانی و سۆناتانەی لە یادیکردبوون، وەک ئەوەی ئەو تەماشاکردنە کورتەی مانگ، ئەو سەر هەڵبڕینە، ئەو دزەکردنەی دەنگی ئەفسوناوی مەزهەری خالقی، هەموو یادەوریی لەخەوهەستاندبێت، هەموو ژیانی خۆی دۆزیبێتەوە، هەموو تەپوتۆزی ئەو شارە زەردەی سڕیبێتەوە. بەیەکجار مژی لە جگەرەکەی دەداو چاوانی پڕدەبوون لە ئاو. وەک ئەوەی بەدرێژایی شەو زنجیرەکانی ناو خەیاڵ و سەری خۆی شکاندبێت... وەک ئەوەی یەکجار ڕۆحی خۆی لە هەموو کۆتەکانی کات و شوێن ڕزگارکردبێت. یەکجار بووبێت بەو کۆترەی باڵ دەکاتەوەو بە ناو موستەحیلدا دەفڕێت.

بەر لەوەی جگەرەکەی تەواوبکات، لەو پەڕی گۆڕەپانەکەوە چوار چەکداری دیسداشەپۆش دەردەکەوتن، کەوەک ئێستا لە شەڕ گەڕابێتنەوە، گورج و بەپرتاو لە شەقامە کە دەپەڕینەوە. دونیا بەرەو ڕوناکبوونەوە دەڕۆی، هەندێک چراکانیان کوژاندبووەوە، جەلادەت لە ناکاو بۆن پرتەقاڵێکی سەیر دەچوو بەسەریدا، کە پێیوابوو بۆنی پرتەقاڵی ناو خەونەکانێتی، دالیا کە لە ناو بارگەی جلە کۆن و دیسداشەی بۆنداردا بە بۆی عارەق و پیسی نوقم

بووبوو، گوێی لێبوو، دەنگێکی سەرسام و خۆشحاڵ پڕ بە شەو، پڕ بەو مەیدانەی لە نێوان تاریک و ڕووندا جۆلانێیدەکرد، هاواردەکات: جەلادەت، هاوڕێ کوردەکەم، ئەی منداڵی نەجیب، ئەی گەورەترین مۆسیقاری سەر ئەم ئەستێرەیە، خوای مەزن تۆ شێت بوویت، بەم بەیانییە زووە چی دەکەیت لێرەدا؟.

دالیا تەماشایدەکردو چاوە عەرەبییە تەڕەکانی سامیری بابلی دەبینی، ئەو شادومانییە قووڵەی دەبینی لە ڕوخساری پیاوێکدا کە پێدەچوو لە دڵەوە سەرسام و شاد بێت. جەلادەت بێئەوەی کاتی بیرکرنەوەی هەبێت، لە قووڵایی ڕۆحییەوە هاواریدەکرد: پرتەقاڵی بابلی، مەلعونی کوڕی مەلعون. تۆ چیدەکەیت لەم بەیانییە پاکەدا... ها، هەی پیاوی پیسو پۆخل تۆ چی دەکەیت لەم بەیانییە پاکەدا؟

وایدەگووت و باوەشیاندەکرد بە یەکدا و هەردووکیان وەک دوو منداڵ دەستیاندەکرد بە گریان.

* * *

سامیری بابلی پێیگووتن، هەرایەکی گەورە بەڕێوەیە، تیپێکی زرێ پۆشی گاردی کۆماری بەرەو ئێرە دێت، ئەوان ئیشیان ئەوەیە کە چەک بەسەر خەڵکدا دابەشبکەن بۆئەوەی لەدەرەوەی شار بەر بە تانکەکان بگرن. سامیری بابلی دەیگووت «جەلادەت من پێتان دەڵێم شەڕێکی دۆڕاوە ئێوە بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆتان، نابێت لەم شەڕەدا بکوژرێن، شەڕێکی سەد دەر سەد دۆڕاوە... هێزمان نییە، چەکمان نییە، هێزێک دروست نەبووە خەڵک لە ژێر فەرمانیدا بجەنگێت... دەبێت ئەمڕۆ بگەڕێنەوە بۆ جێگای خۆتان، من زۆر شتی نهێنیم هەیە پێتی بڵێم، گەر لەم شەڕە دەربازبووم دێمەوە بۆلات لە پرتەقاڵی سپی، نهێنییەکی گەورەم هەیە بتدەمێ، نهێنییەکی کە

دەبێت تۆ خاوەنی بیت، تۆ ئەی منداڵی نەجیب».. دالیا سووربوو لەسەر ئەوەی کە هەردووکیان لە ناو شاردا بمێننەوەو چاوەڕوانبکەن. سامیری بابلی پێیگووتن کە لە هەموو حاڵەتێکدا کە جەنگ لە ناوەڕاستی شار نزیکبووەوە نەچنە ناو قسنەکانەوە، گەورەترین خەتەر ئەوەیە ڕووبکەنە قسنەکان یاخود گۆڕستانەکانی دەوروبەری. دەبێت بە جۆرێک لە جۆرەکان ڕووبکەنە دەروازەی باشوور و لە ڕێگایەکی سەحراییەوە ڕووبکەنەوە شاری خۆیان. جەلادەت دالیای لە شوێنێکدا نزیک یەکێک لە قەیسەرییەکان بەجێهێشت و لەگەڵ سامیری بابلیدا ڕۆیشت تا لەیەکێک لە مەشجەبە کونەکان چەک وەرگرێت. پێشتر لە هەموو ژیانیدا چەکی نەگرتبوو بە دەستییەوە، بەڵام ئەو ڕۆژە ئارەزوویەکی سەیری هەبوو بچێت بۆ شەڕ. بەڵام سامیری بابلی دەیگووت «ئەگەر تۆم بە عەمودێکەوە بەستۆتەوە، گەر دەست و قاچ و دەمم بەستویتەوەو فڕێمداویتە خانێکەوە ناهێڵم بێیت بۆ شەڕ. تۆ چی لە جەنگ دەزانیت، چی؟ دەبێت بەختەوەربیت کە هیچ جەنگێک نەبینیت. خۆشبەخت و نەجیبە ئەو مرۆڤەی لە ژیانیدا مەیدانی شەڕی تاقینەکردۆتەوە، شادو بە شکۆیە ئەو ڕۆحەی هەرگیز تفەنگ بەڕوی مرۆڤەکانی تردا بەرزناکاتەوە...» وای دەگووت و دەوەستا، کەمێک تێدەفکری و دەیگووت«بەڵام گوێبگرە دەبێت ئێستا تفەنگێک وەرگریت تا گەر پێویست پێیبوو ژیانی خۆت دەربازبکەیت... ژیانی خۆت و بەس». جەلادەت دەیگووت «یان ڕۆحی تۆ، یان ویژدانی تۆ، سامیری بابلی تۆش نابێت بمریت، من و تۆش حیسابێکمان لە نێواندایە، نابێت بمریت، وەعدم بدەرێ کە نامریت و دەگەڕێیتەوە».

هەردووکیان لەو بەیانییە زۆر ساردەدا بە شەقامەکاندا دەڕۆیشتن و قسەیاندەکرد، سامیری بابلی بێئەوەی بزانێت جەلادەت مەبەستی چییە، بەو عەرەبییە شیرینەی دەیگووت «ئەی منداڵی نەجیب، من و تۆ زۆر شت لە نێوانماندایە... زۆر شت... پەیمانت دەدەمێ بە زیندوویی بگەمەوەلات...

لێم مەترسە، من گورگم... نا عەزیزم تۆ قەت لە گورگ مەترسە...».
لە ناکاو دەوەستا و دەستی جەلادەتی دەگرت و دەیگووت «جەلادەتی کۆتر، بەردەوام ئەو ئەسپانە لەسەرمدا غار دەدەن... جەلادەتی کوتر، بەڵێ، چۆنت پێدەڵێم وایە، بەردەوام ئەو ئەسپە سپییە شێتانە، لەسەرمدا بەرەو جێگایەکیَ نادیار غاردەدەن، دوو ئەسپی شێت، چەندین مانگە لەسەرمدا بێوچان ڕەوتدەکەن، دەحیلێنن، کورژندەکەن، چەندین مانگە... گەر شەو نەخەوم، لە وچانە چکۆلەکانی نێوان هوشیاری و زیندەخەودا دەردەکەونەوە، دوو ئەسپی سپیین، وەک چووڕی شیر، وەک کەفی دەریا، وەک بەفرەکانی باکوور...». جەلادەت تێنەدەگەیشت بۆ حیکایەتی ئەو ئەسپە سپییانەی بۆ باسدەکات، بەڵام سامیری بابلی، بواری بیرکردنەوەی نەدەداو دەیگووت «جەلادەت ئەوانە ئەسپی موعجیزەن، تەنیا موعجیزە دەتوانێت ڕزگارمانبکات، گەر ئەو ئەسپە سپییانە نەگەنەلامان ڕزگارمان نابێت».

جەلادەت باوەڕی وابوو ئەوانەی موعجیزە ڕزگاریاندەکات، لە مردنەوە نزیکترن تا لە ژیان. هەر مرۆڤێک دەست لە دیواری مردن بدات و بگەڕێتەوە، هەرگیز وەک مرۆڤە ئاساییەکان ناژی، پردێکی پتەوتری بە دونیای مردووەکانەوە دەبێت. ساڵانێک دواتر کە لە پێشی ماشێنەکەمدا توند خۆی دەگرت و بە سامێکەوە لە تەنیشتمەوە دادەنیشت، بێئەوەی هیچ لە شۆفێری بزانێت سەیری دەست و قاچی دەکردم، بەو نیگا خەیاڵییەی تەماشای پێشەوەی دەکرد، ڕای وابوو مرۆڤ یان دەبێت بمرێت یان نابێت لە ڕێگای موعجیزەوە بژی. موعجیزە نایەت بۆ ئەوەی بمانگێڕێتەوە بۆ ژیان بەڵکو دێت بۆئەوەی دەرمانبکات لە مردن. بەڵام ئەو ڕۆژە لە شاری منارە موبارەکەکانی باشووردا، هێشتا تەواو لە مانای موعجیزە تێنەگەیشتبوو، موعجیزە لەلای ئەو تەنیا بازێک بوو بەسەر ئاگرێکی گەورەدا بێئەوەی بسووتێیت، بەڵام ساڵانی دواتر موعجیزە دەبێتە شتێکی دیکە وەک گەمەی

ڕۆلێتی ڕوسی. وەک ئەوەی تۆ پێنج جار بچرکێنیت و نەمردبیت، سەری شەشەم جاریش بچرکێنیت و گوللەیەکی مەلعون و دوابڕاو نەبێت لەسەرتدا ناڵەبکات. وەک ئەوەی لە بەختی تۆ هەمیشە گوللەکە خانەیەک بازبداتە دواوەو تەرەقەکەی خۆی نەداتە بەر ئەو چەکوشە چکۆلەیە، جەلادەت دەیگووت «گەر گەمەکە وای لێهات چیتر ئەوە ژیان نییە باوەش بە تۆدا دەکات، بەڵکو مردنە تۆی ناوێت».

ئەو ڕۆژە جەلادەت بە چەکێکەوە «کە نەیدەزانی بەکاریبهێنێت» لەگەڵ دالیا سیراجەدیندا بە شاردا دەسوڕانەوە، شارێک جار دوای جار ڕەنگی دەگۆڕا، لە هەندێک ساتدا هەوایەکی خۆڵەمێشی مایل بەرەو سپی دەهاتەسەرێ و هەندێ ساتی دیکەش تۆزێکی سووربڕاوی خوێنئاسا لە باکوورەوە دەهات. لای نیوەڕۆ، چەند کزەیەکی زەرد لە باشوورەوە هاتن و هەناسەیەکی زەعفەرانییان بەخشی بە کوچە بێدەنگ و خامۆشەکان، دواتریش شەپۆلی سەیرو گەورەی دوکەڵ لە هەوادا دەردەکەوتن. لەگەڵ گۆڕینی ڕەنگی هەوادا پەیتا پەیتاش هەواڵی جۆراوجۆرو دژیش سەبارەت بە هێزەکانی گاردی کۆماری دەگەیشتە ناو خەڵک، سەبارەت بە شکستی هێزەکانی ڕاپەڕین، سەبارەت بە ڕاپەڕینی تازە لە باکوور، سەبارەت بە مارشی کوردەکان بەرەو پایتەخت. بەڵام خەڵکانێکی زۆر لە هەموو کوچە و گەڕەکەکاندا خۆیان کۆکردبووەوە تا ڕووبکەنە سەحراکان و بەرەو باشوور بکەونە ڕێگا. دالیاو جەلادەت لە هەموو شوێنەکاندا چایان دەخواردەوە، لەفەیان دەخوارد. گەر پێویستبایە لە نزیک مزگەوت و حوسەینییەکانەوە پشوویاندەدا. جەلادەت بەردەوام بە ڕێگادا دەڕۆیشت و یاری بە کاسکێتەکەی دەکرد، شەقی لە شتەکانی بەردەمی هەڵدەدا، کوچەو شەقامەکان پڕبوون لە هەر شتێک کە مرۆڤ دەشێت خەیاڵی بۆی بچێت، لە هەندێ جێگادا منارەی چکۆلەی لاشەیان دەبینی، کە لەسەریەک کەڵەکە کرابوو، لاشەی ئەو بەکرێگیراوو جەلادانەی دەوڵەت کە لە بنکە

حیزبییەکانیاندا کوژرابوون و هەندێک حەرامیانکردبوو بنێژرێن، سەدەها لاشە کە هێدی هێدی بۆگەنیاندەکرد. سەری هەندێک لەسەربڕاوەکان لە ناوەڕاستی شاردا بەڕیز لەسەر هەندێک تەنەکەی ژەنگاوی دانرابوون، دەستێک بە خەتێکی کوفی جوان، بەڵام بە شێوە تەعبیرێک کە مرۆڤ دروست نەیدەزانی فارسییە یاخود عەرەبی لەسەر تەنەکەکانی نوسیبوو «انتقام ربانی». لە بازاڕێکی چکۆلانە و داخراوو جەنجاڵدا چەک و تەقەمەنی دەفرۆشرا، هەندێک لە شۆستەکان پڕبوون لە شتی تالانکراو کە خەڵک لە مەخزەنە گەورەکان دەریانهێنابوون. لە هەندێک گەڕەکدا دالیاو جەلادەت هەستیانکرد دەنگەدەنگ و تەق و هوڕی ترسناک کەوتۆتە ناو ڕیزی خەڵکانی ڕاپەڕیو خۆیانەوە، دەوروبەری قسنەکان پتر بەدەست کۆمەڵێک چەکداری عەبابەشانەوە بوو کە خۆیان وەک قوتابیانی حەوزە بە خەڵک دەناساند، هەندێ بەشی تر بە دەست خەڵکانێکی ترەوە بوون کە ئەوان تەواو لە ناوەکانیان حاڵی نەدەبوون. دەمەو ئێوارێ یەکەمین فڕۆکەی هێزە دەوڵەتییەکان لە ئاسماندا دەرکەوتەوە، سەرەتا لە بەرزاییەکی گەورەوە هەندێک موشەکی ئاسمانی گرتە کوچەو ڕێگاکانی باکووری خۆرهەڵاتی شار، لەو جێگایەوە کە دەبایە تانک و زرێپۆشەکانی گاردی کۆماری بە ڕەتڵی گەورە بێنەوە ناوەوە. لە دوور بەردەوام دەنگی تەقینەوەو زرمەی تۆپ و ڕێژنەی ڕەشاش دەهات، دیکتاریۆفێک بە درێژایی ڕۆژ لە شوێنێکی نەزانراوەوە تەقەیدەکرد. خەڵکانێکی دیش بێبەهانە تەقەیاندەکرد، ژن و منداڵێکی زۆری ترساو بە بوخچەی چکۆلانەوە خۆیان ئامادەدەکرد لە شار بچنەدەرێ... هەموو شتێک ئاڵۆزبوو، هەموو شتێک بێمانا بوو، هەموو شتێک لە دەریایەکی گەورەی تەمدا مەلەیدەکرد.

* * *

«ئاه دالیا… ئاه دالیا سیراجەدین… ڕاکە، ئەوان لە هەموو لایەکەوە دێنەوە ناو شار، لە هەموو لایەکەوە بە تانک و زرێپۆشەکانیانەوە دەگەڕێنەوە، ئەو پیاوکوژانەی دێنەوە ناو خەونەکانمان… بە خۆیان و خودە ئاسنین و قەمە خوێناویەکانیانەوە، دالیا سیراجەدین ئەی خانمی ناو خەونەکانی من، ڕاکە، من نازانم چەکەکەم لە کوێدا فڕێدا… دەستم بدەرێ و ڕاکە. ئەوان بست بە بست و کوچە بە کوچە ئەم شارە بۆردوماندەکەن، گومەزەکان بۆردوماندەکەن، قوببەی تەلا بوردوماندەکەن، سەحنی پیرۆز دەدەنە بەر موشەک… دالیا لە نزیکمانەوە خومپارە دەتەقێتەوە، دالیا کەسانێک هەن لە نزیک من و تۆوە دەمرن، منداڵ هەیە لە پێش من و تۆوە دەکەوێت، ئاه دالیا خۆشەویستە خەیاڵییەکەم، خۆشەویستە ئەفسانەیی و نائومێدەکەم، ئەی عەشقێک کە هەمیشە لێمەوە نزیکیت و بە ئەندازەی دوورترین ئەستێرەش لێم دووری، بازدە دالیا سیراجەدین… ئەی ئەو سۆزانییە چکۆلەیەی فریشتەکانت سەرسامکردوە.. بازدە، سەیرکە هەردووکمان بەسەر ژن و منداڵدا بازدەدەین، بەسەر لاشەی خەڵکی بێخەتادا بازدەدەین، بەسەر لاشەی ئەو زیندانیانەدا کە دوێنێ شەو من زنجیرەکانیانم دەشکاند، من کە لەناکاو توانایەکی ئەفسوناویم تیا دروستبووبوو، وەک ئەوەی توڕەیی هەموو ئاسنگەرەکانی دونیا لە دەستمدا بێت، توڕەیی ئەو ئاسنگەرانەی دەیانەوێت لەسەر سندانەکانی خۆیان زەمەن و قەڕنە دوورەکان بشکێنن، ئاه دالیا سیراجەدین ڕاکەو تەماشای ئەو پیاوانە مەکە کە دوێنێ شەو من ئازادمکردن و ئەمڕۆ بە گرەوە لە دەرگای مزگەوتەکان دێنەدەرێ، ئەمڕۆ بە گرەوە بە کوچەکاندا ڕادەکەن، ئاه دالیا.. من چیم کرد… چی؟ من ئەوانەم کوشت یاخود نا؟ تۆ پێمبڵێ؟ ئەی عەشقە نەکردەو بێئومێدەکەی من. سەیری منارەکان مەکە دەڕوخێت، سەیری خودا مەکە دەدرێتە بەر گوللە، سەیری ئەو منداڵانە مەکە کە ژێری گەرم و تواوەی قسنەکان دەیانسووتێنێت، دالیا سیراجەدین ڕاکە… کێ هەڵدەگرێتەوە؟

تانکەکان نزیکدەبنەوە دالیا، دالیا من و تۆ لەبەردەم لولەی تانکەکاندایین، دەبێت ڕاتبکێشم... دالیا، دەبێت نەهێڵم سەیری چاوی مردووەکان بکەیت، نەهێڵم دەست بۆ عەبای سووتاوی ئەو ژنە شیعانە بەریت کە بەسەدان ڕادەکەن و عەباو جبەو کراسە ڕەشەکانیان گڕی گرتووە، هەزارانن دالیا... هەزاران... عەباکانیان وەک مەشخەڵانێکی گڕ لە دویانەوە دەسووتێت و ڕادەکەن، دالیا ئاوڕ لە هیچ کەس مەدەرەوە کە لە نزیکمانەوە دەکەوێت، ئاوڕ لە هیچ لاشەیەک مەدەرەوە. هیچ شتێک وەک سەیرکردنی چاوی مردووەکان ترسناک نییە، دالیا ڕاکەو پێمبڵێ، بۆ من و تۆ قەدەرمانە بکەوینە ناو مردووەکانەوە، بۆ ڕێگاکان هەمیشە من و تۆ بەرەو ناو مردووەکان دەبەن. خودای گەورە، ئاوڕ لە هیچ مەدەرەوە... شەوێکی بێ مۆسیقایە... تۆ وادەڵێیت: دەڵێیت جەلادەت شەوێکی بێ مۆسیقایە... ڕاکە دالیا، لەم کوچەیەی باشوورەوە، بە سەر لاشەی ئەم گەنجە غەمگینانەدا کە کۆماندۆکانی دەوڵەت تیربارانیانکردون، لێرەوە دالیا، لێرەوە، ئەمە شەقامێکی خاڵییە، ڕێگایەکە بۆنی سەفەرێکی درێژو شەوێکی ناکۆتاو خەمێکی ئەبەدی لێدێت. گرنگ نییە بۆ کوێ دەچین... هەر ڕێگایەک بگرین یان دەمانباتەوە سەر مەرگ یان دەمانباتەوە سەر پرتەقاڵی سپی. ڕاکە دالیا و گوێ لە بێدەنگییەکی کوتوپڕ بگرە، گوێبگرە لە نێوان تەقینەوەکاندا، لە نێوان لرفەلرفی ئاگرێکی سامناکدا کە بە هەواو ئاسماندا هوروشم دەهێنێت، گوێبگرە دەنگی پیانۆیەکی گەورە دەبیستیت، دالیا گوێبگرە، گوێبگرە... گەر چرکەیەک خیزە خیزی خوێناوی سەر زەمینی ئەم شاری تەپوتۆزو لمە هێمن بووەوە گوێبگرە، گوێت لە مۆسیقارێک دەبێت، لە تاریکیدا بانگماندەکات... نا مۆسیقارێک نییە بگری، بەڵکو تەماشاماندەکات و بانگماندەکات. سەیری هەنگاوەکانی من و تۆ دەکات و ئەوکات مۆسیقا دەژەنێت، ئەو ڕۆحی من و تۆ دەژەنێت... ڕاکردنەکانی من و تۆ دەکات بە مۆسیقا... ئەو مۆسیقارە ترسی ئێمەیە لە شەودا دەبێت بە هەڵم و

لەوسەری گەردونەوە وەک ئاواز دەگەڕێتەوە. دالیا ڕاکە، هەست ناکەیت ئەستێرەکان دەکەونە خوارێ، هەست ناکەیت باڵندەکان لە بەردەممانـدا باڵی دیکە قەرزدەکەن و دەفڕن، مەهێڵە مردووەکان دامێنت بگرن، من دەیانبینم کە دەیانەوێت بمانگرن، بەڵام لەمجۆرە شەوانەدا مرۆڤ دەبێت توانای هەبێت بەسەر مردووەکاندا بازبدات، بتوانێت بازبدات... بازبدە بەسەر لاشەکاندا، بازبدە بەسەر خوێنێکدا کە وەک فوارە لە سینەی مردووەکانەوە دێتەدەرێ. ئەو مردوانەی تکادەکەن یەکێک تێیانبگەیێنێت جەهەنەمیین یان بەهەشتی. خومپارەکان لە چواردەورمان دەتەقنەوە. هاوار. دالیا تەقینەوەکان لە پێشچاوی من خاودەبنەوە، تەقینەوەکان خاودەبنەوە، پارچەی خومپارەکان بە هێمنییەکی ترسناک بە هەوادا دەفڕن، دەیانبینم پارچەی تەلاییـنی خومپارەکان دەبینم وەک فوارەیەکی ڕوناک لە تیشک کە خودا خاویکردبێتەوە لە هەوادا دەوەستن، هەزاران پارچە زێڕی کوشندە لە شەودا دەبریسکێنەوە، بەڵام وەستاون، لە سەر سەری ئێمە وەستاون، من و تۆ دەتوانین بە ناویاندا ڕابکەین، بە ناو ئەو پارچە وەستاوانەی موشەکەکاندا ڕابکەین کە وەک خەزانێک لە ناکاو بووبێتە بەرد، وەک زەمانێک بۆ موسافیرێکی دوور وەستابێت، وەک کۆمەڵێک باڵندە هەور بە ڕۆحی خۆیدا هەڵیواسیبێتن وەستابن. من و تۆ بە ناویاندا تێدەپەڕین. دالیا ئەمشەو کە مردن لەسەر هیچ کەس ناوەستێت لەسەر من و تۆ دەوەستێت، من منداڵی موعجیزەکانم دەستم لێ بەرمەدە، ڕاکە لەگەڵمدا، دالیا... ڕاکە. ئەی ئاگر ببە بە سەرما و سەلامەتی بۆ ئێمە، سەیرکە دالیا ئەو ژنە باڵدارانە ببینە کە بە جبە سووتاوەکانیانەوە بە پۆل بەرزدەبنەوە بۆ ئاسمان. ئەو هەزاران هەزار مردووە ببینە کە بە خوێنی خۆیانەوە، بەرزدەبنەوە بۆ ئەوپەڕی مەلەکوت. لە سەدان مراوی دەچن کە بە کوژراویی دەفڕن. دالیا مردووەکان بەسەر سەرماندا دەفڕن و من و تۆ لەسەر زەوی دەتوانین بە ناو دوکەڵی وەستاوی ئەم کارەساتەدا

ڕابكەین. ئەمە هەمان ئەو شەقامەیە كە دەمانبات، تۆ دەتوانیت ڕابكەیت و سەرنجبدەیت كە شەقامەكە دەمانبات، هەوایەكی نهێنی كە لە قووڵایی زەوییەوە دێت دەمانبات... داڵیا دەستت بكەرەوە، وەك مەسیح لەسەر خاچ، ڕاكەو دەستەكانت وەك مەسیح بكەرەوە، حیجابەكەت فڕێدە، چونكە خودا مرۆڤی حیجابداریٚ خۆشناوێت، دەستت وەك مەسیح بكەرەوەو ڕابكە... مەهێڵە تەماشاكردنی ئەو دوكەڵەی لە ماڵ و خانووبەرەو قەیسەری و بازاڕەكان دێت بتكوژێت، لەسەرخۆ ڕاكە، چیتر ئاسان نییە ئەو تانك و زرێ پۆشانە بمانگرنەوە، دەبێت ئەو خومپارانە لەسەرمان بوەستن، دەبێت ئاگرو گوللە لەسەرمان بوەستێت، ڕاكە داڵیا..ڕاكە».

مۆنۆلۆگێكی درێژبوو كە هەندێك شەو جەلادەت لە بەردەم خۆیەوە دەیگووتەوە، من چەندینجار گوێم لێبووە كە وەك ئەكتەرێك لە شانۆگەرییەكی مۆنۆدرامادا دەوەستاو هەڵدەلەرزی و چاوانی پڕدەبوون لە ئاو و سەرلە نوێ ئەو ڕستە پڕ سەیرو سەمەرانەی خۆی دەگووتەوە. هەندێجار لە شەوانی سەرمادا، لە ژێر باراندا دەستی بەرزدەكردەوەو ئەو مۆنۆلۆگەی دووبارەدەكردەوە. نازانم من چەندین جار گوێم لێبووە، بەڵام دڵنیام لە شەوانی سایەقەدا گوێم لێبووە، لە ئێوارانی ڕەشەباو گەردەلوولدا بیستوومە، بینیومەوە كە بە ناو بەفردا ڕۆیشتووە و ئەو قسانەی كردوە، وەك ئەوەی ڕستەكان گەرمیبكەنەوە، وزەی تێگەڕێنن و توانای لەبەرخەن. بینیومە لە شەوی لێزمەو بروسكەدا، لە ژێر باراندا وەستاوەو هەموو ئەو تێكستەی وەك خۆی دووبارەكردۆتەوە.

جەلادەت كە یادەوەرییەكی بێئەندازە بەهێزی هەبوو، بەهێزتر لە یادەوەری فیلێك، زۆر وردەكاری ژیانی خۆی لە بیربوو، بەڵام پێناچێت هیچ پارچەیەكی زیندەگی خۆی بە هەمان وردەكاری وەك ڕوداوەكانی ئەو شەوە لەبیربێت... كاتێك خۆی و داڵیا، بە ناو ئاگرو سووتان و تەقە

و تەقینەوەدا لەو شارە پیرۆزەی باشوور دەربازبووبوون، جەلادەت بۆنی شەقامەکانی لە یادبوو، ڕەنگی کوچەکانی لە یادبوو، دەنگی دڵی ئەو پاساری و کوکوختیانەشی لە یادبوو کە بەسەر سەریدا فڕیبوون، هیچ یەک لەو خولیاو خەیاڵ و وشانەی یادنەچووبووەوە کە لەو شەوەدا بە دڵیدا گوزەریانکردوە، هەتا دەیتوانی دڵۆپ دڵۆپ لەسەر ئەو خوێنانە قسەبکات کە بینیوونی، لەسەر ڕەنگ و هاڵاوو گەرمیان، دەیتوانی لەسەر ئەو برینانە بدوێت کە لە ناوچاوانی کوژراوەکاندا بینیبووی، لە گۆشەی زاریان کە بەر لە مەرگ بۆ هاوار کردبوویانەوە.

بەدرێژایی شەو ڕادەکەن، بە کوچەو شەقامەکاندا، بە شارۆچکەو گوندە غەمگینەکانی سەرە ڕێگادا، لە هەموو جێگایەکدا لە سووتان و کاولکاری و مەرگ بەولاوە هیچی تر نابینن. مرۆڤ کە بە عەمودی کارەباوە بەستراونەتەوەو تیرباران کراون، منداڵ و ژن کە پێکەوە کۆکراونەتەوەو سووتێنراون، کەسانێک لە بن دارخورماکاندا سەربڕاون... بەدێژایی شەو بەسەر لاشەکاندا بازدەدەن، گوێیان لە دەنگی تانک و زرێپۆشە لەدوایانەوە دێت، خەڵکانێک دەبینن بە پێخاوسی هەڵدێن. خەڵکانێک بە ئاگرەوە دەفڕن، خەڵکانێک بە جبەکانیانەوە بەرزدەبنەوە بۆ ئاسمان، سەری مەلاکانی حەوزە کە تلدەبنەوە بێئەوەی مێزەرەکانیان بکەوێت. دەمەوبەیان بە دوو قاچی زامدارەوە، بە ڕوخسارێکەوە کە دوکەڵی جەنگ و تەقینەوە ڕەشیکردوە، بە چاوانێکەوە ترس و بێخەوی ماندوویکردون دەگەنەوە شاری تەپۆتۆزە زەردەکان، شارێک چیتر بە هیچ سەراب و ئاوێنەیەک دەورە نەدراوە، شارێک هەتیوو غەمگین لە ناو ڕووبەرێکی ترسناک و بێسنووری لمدا وەک دوا قەلای حەقیقەت پاڵکەوتووە. شارێک کە بەدرێژایی مێژووی خۆی لەناو هاوکێشەیەکدا ژیابوو، کە لە بنەوەڕا لەسەر جیابوونەوەی ژیان لە مردن، جوگرافیا لە وەهمەکانی، شار لە سێبەرەکانی، واقیع لە خەیاڵەکانی، مێژوو لە حەقیقەتەکانی دروستبووبوو. بەرهەمی مێژوویەک

بـوو شـارەکانی گۆڕیبـوو بـۆ گیانلەبەرێکـی دوو دیـو، دیوێکـی ئاشـکراو دیوێکی نهێنی، دیوێکی هوشیار و دیوێکی نائاگا، شـارەکانی دایەشکردبووە سـەر دەیەهـا ڕوخسـار، دەیەهـا چەشـنی کوچـە، کـە هـەر چەشـنێکیان ناتەبابـوو لەگـەڵ ئەوانـی دیکـەدا. بـەڵام ئـەو شـەوە چیتـر ڕاسـتی و درۆ، ژیـان و شـێوە خەیاڵییەکانـی لەیەکتـر جیانەدەکرانـەوە. شـاری تەپوتـۆزە زەردەکان، وێنەیـەک نەبوو، خەیاڵێک نەبوو لـە شـارەکانی تـر جیابووبێتـەوە، ئـەو بەشـە نهێنییـەی نـاو جوگرافیا نەبوو کە جگـە لـە دەروازەیـەک ڕێگایەکی تری نەبێت بۆ گەیشتن بـە جیهان. چیتر شـوێنی شـتە حـەرام و نهێنییـەکان نەبوو، چیتر حـەرام و نهێنـی بوونیـان نەمابـوو، بەڵکـو خۆیـان بووبـوون بـە تەنیـا حەقیقـەت. ئیـدی ئـەو شـارە بووبـوو بـە تەنیـا شـاری دونیـا. لـە بـەر دەروازەکانـی شـاردا هـەزاران فریشـتەی غەمگین پێشـوازی دالیایـان دەکرد، بەسـەر سـەریدا فڕین، لەسـەر سـنگی دەنیشـتنەوە. ئـەو ڕۆژە دەمـەو بەیـان دالیا و جـەلادەت گەڕانـەوە بۆ لای تەنیاترین دکتـۆری سـەر ئـەم ئەسـتێرەیە، بـۆ لای موسـای بابـەک. بەیانییەکـی زووبـوو، دەنگـی تـۆپ و تەقینـەوە لـە دوورەوە دەگەیشـتە کوچـەکان، موسـای بابـەک بـە خـۆی و ڕیشـێکی سـپی درێژەوە کورسـییەکی لـە بـەر دەرگاکـە دانابـوو، بەتانییەکی دابـوو بـە خۆیداو لەسـەرەخۆ کەمانـی لێدەدا. کاتێـک جـەلادەت و دالیـا گەیشـتنە پێشـدەمی بـە ئەندازەیـەک ماندووبـوون لەبـەردەم موسـای بابەکدا کەوتـن کـە بـە هەمـوو پیری و ماندوێتی خۆیـەوە دەبایـە کۆمەکیـان پێبکات هەسـتن. موسـای بابـەک لـەو تاریـک و ڕوونـە غەمگینـەدا دەیگـووت: ئازیـزان دەبێـت خێرا پشـووبدەن، ئـەوان بەڕێـوەن، لـە چەنـد سـەعاتی داهاتـوودا ئیشـێکی زۆرمـان هەیـە.

لـە ژوورەوە قاچـە زامدارەکانـی بـۆ بیماردەکـردن و زامەکانـی دەبەسـتن و ناوچاوانـی هەردووکیانـی ماچدەکردو دەیگـووت: بخـەون، چەنـد سـەعاتێک بخـەون... جەهەنـەم بەڕێوەیـە.

پێکـەوە لـە ژوورێکـی تاریکدا دەخەوتن. جـەلادەت نەیدەتوانـی بخەوێت لـە

هەوادا فریشتە غەمگینەکانی دالیا سیراجەدینی دەبینی دەگرین، فرمێسکەکانی دەبینین وەک مرواری لە هەوادا دەدرەوشانەوە. تەماشایدەکردو سەرتاپای تاریکی ناو ژوورەکە پڕبووبوو لە دڵۆپە فرمێسکی زیوین کە لە هەوادا مەلەیاندەکرد. دالیا وەک فریشتەیەک دەخەوت، جەلادەت هەڵدەستاو لە تاریکییدا تەماشای ئەو نیگاو ڕوومەت و لێوە زەردانەی دالیا سیراجەدینی دەکرد، کە ماندوێتی ڕوخسارێکی خوداوەندانەیان پێ بەخشیبوو، بۆیەکەمجار وەک عاشقێک بە هێمنی لێوی دەخستە سەر ڕوومەتی و ماچیدەکرد، ئەوە یەکەمین ماچ و دواهەمین ماچی ڕاستەقینەی هەموو ژیانی بوو. ماچیدەکردو وەک بەسەر لاشەی مردووییەکدا بگری، سەریدەخستە لێواری قەرەوێڵەکەیی و دەیگووت: هاوار... هاوار. دەگەڕایەوە ژێر جێگاکەی خۆی و دەگریا، خۆی لە ژێر بەتانییەکدا گرمۆڵەدەکرد و دەگریا.

بەیانی بوو، ڕۆژ هەڵاتبوو جەلادەت لە پەنجەرەکەوە گوێی لە دەنگی هەندێک باڵندەی غەمگین دەگرت کە بە پۆلی گەورە گەورە لە بەردەم پەنجەرەکەدا کۆبووبوونەوە، یەکەم دەنگی ئادەمی گوێی لێبوو، دەنگی گۆرانییەکی کوردی بوو، دەنگێک لەوەوبەر جارێکی تر لە پرتەقاڵی سپی بیستبووی، چوارکەس بوون، چوارقۆڵی بە دەنگێکی کۆراڵی گۆرانییەکی دێرینیان دەگووتەوە «ئەرێ بە توێی عارەقچن وا ڕۆیی و بەجێیهێشتم»... هەڵدەستاو لە هەیوانەکەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد. ئەو چوار سەربازەی دەبینییەوە، لە جلوبەرگێکی دڕاودا، لە پۆستاڵی دڕاودا، بە سەرو ڕوخسارێکی لاوازەوە، ڕەشداگەڕاو، پڕبرین. هەر چواریان دەستیانکردبووە ملی یەک، بە ئیقاعێکی هێمن بە ڕێگادا دەڕۆیشتن و گۆرانیان دەگووت، یەکێکیان خراپ دەشەلی. لە ناکاو لە بەردەرگای دکتۆر بابەکدا دەوەستان، چوار سەربازی کوردبوون، بە درێژایی چەندین ڕۆژ بێخەبەر لە دونیا بە هەموو سەحرادا هاتبوون، کەگەیشتنە شاری تەپوتۆزە زەردەکان و ئەو لەوحی دکتۆرەیان بینی هاتن تا برینەکانیان بۆ بپێچێت و بەرەو باکوور

بکەونەوەڕێ. جەلادەت لە هەیوانەکەدا پێشوازی لێکردن هەر چواریان لەوە سەرسام بوون، لە شارێکی ئاوەهادا، لە ماڵێکی ئاوەهادا کوردێک ببیننەوە، چوار هاوڕێ بوون ناویان «حەسەنی تۆفان» «عەبدوڵای تەرزە» «نوری بەفر» «جەلیلی باران» بوو، چوار بۆیاخچی کە پێکەوە گیرابوونەوە بە سەرباز، پێشتر بەردەوام پێکەوە قۆنتەراتی بۆیەیان گرتبوو، بەیەکەوە تیپێکی مۆسیقای میللی چکۆلانەیان دانابوو، چوارووەرزە پێکەوە گۆرانیان گووتبوو. جەلادەت ئەو ڕۆژەی لە بیربوو کە بەدەم گۆرانی مامڵێ وە خۆیان کرد بە پرتەقاڵی سپیدا. چوار زەردەخەنەی غەمگینیان هەبوو، چوار نیگا کە پێدەچوو لە چوار چەشن بۆیەی جیاواز هەڵکێشرابێت، ئەوکات پڕ جوڵەو بزۆک و زیندووتربوون، وەلێ ئێستا وەک ئەوە بوو لە ناو ئاشێکی گەورەی باروتەوە هاتبن بۆنی جەنگیان لێدەهات. جەلیلی باران لە هەموویان بچوکتربوو، لە ئەنجامی تەقینەوەی خومپارەیەکدا لە نزیکییەوە، قاچی چەپی پڕبووبوو لە وردە پارچە، لە وەحدەکەی خۆیان پزیشکەکەیان بە جۆرێکی سەرەتایی برینەکانی بۆ پاککردبووەوەو بۆی پێچابوو، دوای ئەوە لە چەند شەوێکدا وەحدەکەیان کەوتبووە ژێر بەرداشی بۆردومانە ترسناکەکانەوەو بەشی هەرەزۆری سەربازەکانی هاوڕێیان کوژرابوون. ئەو چوار کوردە کە پێکڕا لە مەخزەنی بارکردنی تەقەمەنی کاردەکەن، شەوێک پەیوەندیان بە سوپاوە دەپچڕێت، دوو شەو لە ناو جەمەڵۆنە خاڵییەکانیاندا بە پۆستاڵ و بێرییەکەیانەوە دادەنیشن و بەردەوام گۆرانی دەڵێن، بەلام چیتر نە نان دێت، نە ئاو، نە هەواڵ. شەوی سێیەم دەستدەکەن بەسەفەرێکی ئۆدیسۆسی بەسەحرادا. لە ڕێگا تووشی چەندین گەردەلوول و تارمایی و ئەژدیهای سەیر سەیر دێن، بەلام دوای شەش شەو دەمەوبەیان ژنێک بە ناوی ئوم فەزلەوە، کە لە گەردەلوول و سەحرادا بۆ کوڕە ونبووەکەی خۆی دەگەڕێت لە سەحرادا دەیاندۆزێتەوەو پێشیاندەکەوێت بۆ ئەم شارە، لە بەر دەروازەکانی شاردا ناونیشانی دکتۆر

بابەکیان دەداتێ و بە بێدەنگ لێیان جیادەبێتەوە.

سەرەتا ئاو دەخۆنەوە، چوار قاپ نیسک هەڵدەلوشن، چەندین سەموون بە چاوە دەخۆن، چەندینیش دەخەنە ناو تورەکەکانیان، لەو سەموونانەی ژنێکی عەرەب لەو وەرزی بێئیشییەدا بەتایبەت بۆ موسای بابەک و خەستەخانەکەی دروستدەکات. دکتۆر دەڵێت، بەر لەوەی بەرەو باکوور بکەونەوە ڕێ دەبێت کەمێک برینەکانی جەلیلی باران پاکبکاتەوە. سێ سەربازەکەی دی دەڕۆن لە ناو ماڵە سۆزانییەکاندا پیاسەبکەن. جەلادەت، جەلیلی باران دەهێنێتە ژوورێکی تایبەتەوە. کوڕێکی گەنجی ڕوخۆشە، بە دوو چاوی کاڵ و خەندەیەکی کراوەوە. لەسەر شوێنی تیمارکردنەکە پاڵیدەخات، ئەمە یەکەم نەخۆشە لە ژیانیدا کۆمەکیبکات. جەلیل باران کە پێدەچێت تەنیا ساڵێک لە جەلادەت گەورەتر بێت، بە هێمنی لەسەر تەختەکە ڕادەکشێت و تەماشای ئەو پانکە چکۆلانەیە دەکات کە جاڵجاڵۆکەی زستان نێوباڵەکانی بە جۆرێکی ئەندازەیی تەنیوە، دوای ئێستێک ڕامان بەئەدەبەوە دەپرسێت: برام تۆ ناوت چییە؟. جەلادەت بە ئارامی سەیریدەکات و دەڵێت: ناوم جەلادەتی کۆترە. جەلیلی باران وەک ئەوەی شۆکێکی ئەلەکتریکی لێبیدات ڕادەچەنێت، چاوانی پڕدەبن لە ئاو، دەستیدەگرێت و پێیدەڵێت: هاوڕێم بە ڕاستی پێمبڵێ، تۆ ناوت چییە؟. جەلادەت سەرسام دەوەستێت و دەڵێت: ئازیزم، من یەک ناوم هەیە، ئەوەتەی لە دایکبووم، پێمدەڵێن، جەلادەتی کۆتر، یەعنی دەبێت ناوم چی بێت؟ مرۆڤ لە هەر چییەکدا درۆبکات نابێت لە ناوی خۆیدا درۆبکات، ناو شتێکی موقەدەسە. جەلیلی باران چاوانی دەنوقێنێت و دەڵێت: نابێت، نابێت، جەلادەتی کۆتر ئەفسانەیە، جەلادەتی کۆتر ناوێکی ئەفسانەییە، تۆ لە من بپرسە، نابێت مرۆڤێکی ڕاستەقینە هەبێت ناوی جەلادەتی کۆتر بێت.

جەلادەت نارەحەت و تورە دەستی دەگرێت و پێیدەڵێت: کێ وای بە تۆ گووتووە؟ کێ گووتوێتی جەلادەتی کۆتر ئەفسانەیە؟.

جەلیلی باران، چاو لێکدەنێت و دەڵێت: منی بەدبەخت دەڵێم، من دەڵێم... من دوای ماوەیەکی دوورودرێژ هاتمە سەر ئەو باوەڕەی کە جەلادەتی کۆتر ئەفسانەیە، تێدەگەیت، حیکایەتەو هیچی تر... تۆ ئەو نیت، ناتوانیت من بخەڵەتێنیت... ئاه، مۆسیقارێکی وا گەورە کە دەڵێن موعجیزەی دروستکردوە، چی دەکات لەم گوندە پیسەدا؟

جەلادەتی کۆتر دەڵێت: بەڵام، من جەلادەتی کۆترم... حیکایەت نیم، بەشەرێکی بەدبەختم و تەواو، بۆدەبێت حیکایەت بم، بۆ دەبێت ئەفسانەبم؟

جەلیلی باران دەیگووت: گوێبگرە، لەوانەیە تۆ یەکێکی تر بیت، عەفوومکە، دەشێت ناوەکانتان لە یەک بچن، ئەوەیان شتێکی هێند گرنگ نییە. دوو ساڵیشە هیچ ئادەمیزادێک جەلادەت و هاوڕێکانی نەبینیوە. من هاوڕێیەکم پێیگووتم، جەلادەتی کۆتر ئەفسانەیەکی ناو مۆسیقارەکانە، درۆیەکە مۆسیقارەکانی شار خۆیان بۆ خۆیانیان دروستیانکردوە.

جەلادەتی کۆتر دەیگووت: هاوڕێم، بۆم باسبکە... بۆم باسبکە... چۆن باسی جەلادەتی کۆتر دەکەن... چۆن، خودایە، بۆ هیچ کەس هەیە باسی جەلادەتی کۆتر بکات؟

جەلیل دەیگووت: منی داماو چۆن شتەکانت بۆ بگێڕمەوە، منیش جەلادەتی کۆترم نەبیستبوو، ئەو بەدبەختەم نەدەناسی. هەموو حیکایەتەکە لەو فلووتەوە دەستی پێکرد کە من لە جەمیلی پرۆشەوە بۆم مایەوە. من هاوڕێیەکی مۆسیقارم هەبوو مرد. ناومانانابوو «جەمیلی پرۆشە»، ئەوکات ئێمە پێنج کەس بووین قۆنتەراتی بۆیاخمان دەگرت، ڕۆژێک قۆنتەراتی بەرزترین بینای شارمان گرت، دەبایە سەرتاپای ئەو بینایە بۆیەبکەین، جەمیلی پرۆشە لە هەر چوارمان دەنگی خۆشتربوو، لە هەر چوارمان باشتر فلووتی دەزانی، لە هەرچوارمان باشتریش بۆیاخی دەکرد، ڕۆژێک کە ئاسن و تەختەو پلەو پێیانمان بۆ قاتە بەرزەکان دادەنا، کاتێک هەر پێنجمان پێکەوە گۆرانیمان دەگووت، کاتێک لە ئامادەکردن و بەستنی

تەختەکاندابووین، جەمیلی پڕوشە، بێبەهانە فلووتەکەی دەژەن، بێبەهانە مەست بووبوو، لەو بەرزاییەوە بێئەوەی تەختەو پێیانەکانمان قایمکردبێت، ڕاستەوخۆ لەسەر ئەو ڕاڕەوە باریکانە مەستانە کەوتە فلووت ژەنین، بەشێوەیەک فلووتی دەژەن منی داماو وامدەزانی دەفڕێت، هەستمدەکرد قاچی لە تەختەکان پچڕاوەو بەرزبۆتەوە، کە بەربووەوە لام وابوو باڵی گرتووە... کەوتنەخوارەوەکەی لە نزمبوونەوەی کۆترێک دەچوو لە کاتی فڕیندا، وەک پەڕێک چۆن لە بەرزەبەرزانی دونیاوە لە باڵی سیمرغێک دەبێتەوەو بە هێمنی و بە بازنەی چەشناو چەشن دێتە خوارێ، ئاوها بەربووەوە، من گوێم لێ نەبوو بدات بەزەوییەکەدا، بەڵکو وەک نیشتنەوەی گەڵایەک لەسەر زەوی بەو چەشنە نیشتەوە، کە گەیشتینە سەری مردبوو. بۆچی مرد، نازانم؟ منی داماو نازانم بۆ خەڵک لە خۆیانەوە دەمرن. کە جەمیلی پڕوشە مرد، فلووتەکەی بۆ منی دەستخەڕۆ بەجێهێشت. پێش ئەوەی بمرێت وەسیەتێکی وەهای نوسیبوو کە دەبێت من فلووتەکەی ئەو بە ئیرس وەرگرم، ئەوە تەنیا شتێک بوو لەو بەجێما. هەندێجار بە شەقامەکاندا دەڕۆیشتم و فلووتم لێدەدا، من هەمیشە بەیادی جەمیلی پڕوشەوە مۆسیقام لێدەدا، لە گۆڕستان بە ناو گۆڕەکاندا دەڕۆیشتم و مۆسیقام لێدەدا، بە کوچەکاندا دەڕۆیشتم و فلووتم لێدەدا، هەمیشە هەستمدەکرد تارمایی جەمیل لەگەڵمدایە.

جەلیلی باران هەناسەیەکی درێژی هەڵدەکێشاو بێدەنگ دەبوو. جەلادەت سەراسیمەو حەپەساو، وەک یەکێک دوای کارەساتێک ئەژنۆکانی شکابێتن، بەرابەری دادەنیشت و تکای تیادەکرد بەردەوامبێت، نەیدەزانی چی دەبیستێت، حیکایەتی دووبارەی خۆی، یاخود چیرۆکێکی دیکە؟

جەلیلی باران، کەمێک قاچی دەجولاند و دەستی بە قژە کورت و چڵکنەکەیدا دەهێنا و دەیگووت «شەوێک لە شەوان منی بەدبەخت بە کوچەیەکدا دەڕۆیشتم و فلووتم لێدەدا، لە تاریکیدا ڕۆحلەبەرێکی غەمگین

لێم نزیکبووەوە، پیاوێکی کۆماوەی پیربوو، پیرێک بوو پێدەچوو لە حەشر جێمابێت، لە سواڵکەرێک دەچوو هاتبێت منی بەدبەخت خێری پێبکەم، من پێمگووت «پیری بەدبەخت تۆ هاتوویت داوای کۆمەک لە یەکێک بکەیت، لە خۆت بەدبەختترە... هەزار جار لە خۆت داماوترە». پیرەمێردەکە بە دەنگێکی حەسرەتاوی پێمی گووت «من هاتووم لێت بپرسم، تۆ جەلادەتی کۆتر دەناسیت، سەرهەنگ قاسم دەناسیت، ئیسحاقی لیوزێڕین دەناسیت؟». بە جۆرێک ناوەکانی دەخوێندەوە، هەستمدەکرد ئەستێرەو مانگ لەسەرمانەوە دەلەرێنەوە، دەنگی لە دەنگی سوارچاکێکی پیر دەچوو، نەفەسی بە نەفەسی میرزادەیەکی غەمگینی دەکرد. من پێمگووت: «پیرەمێرد بە دەنگتدا لە ئاغازادەیەک دەچیت حاڵ و ماڵی دۆڕاندبێت، ئەمانە کێن. من کەس ناناسم ئەو ناوانەی هەبێت». پیرەمێردەکە گووتی: «من میرزادەنیم، ئاغازادەنیم، کوڕم، من دێوەرەیەکی داماوم بە کوچەکاندا دەڕۆم و شت دەفرۆشم، ماوەیەک لەوەوبەر بەر لە تۆ دوو کوڕی تر، بە کوچەکاندا دەڕۆیشتن و فلووتیان لێدەدا... نەیان لێدەدا، زۆر خۆشیان لێدەدا. بە حوکمی ئەوەی کوچەگەڕم ڕۆژانە دەمبینین. بەڵام لە پڕدا ونبوون، لە پڕدا وەک زەوی قووتیان بدات هەواڵیان نەما. ڕۆژ و هەفتەو مانگ من چاوەڕوانمکردن، کەس خەبەری لێیان نەبوو... دواتر بیستم مۆسیقارێکی پیر بە ناوی ئیسحاقی لیوزێڕین بردوونی لەو شاخانە دەرسیاندابات... خەڵکی دەگێڕنەوەو دەڵێن لەو شاخ و گوندانە موعجیزەیان دروستکردوە، کوێریان چاکردۆتەوە، مردوویان زیندووکردۆتەوە، بارانیان باراندووە، کانی وشکیان خستۆتەوەسەر فەڕ، شتی زۆریان کردوە کە خەڵک باسیدەکات، شتی زۆر... کوڕی من، دڵت لە دێوەرەیەکی وەک من نەڕەنجێت کە ئاوەها دەتوەستێنم و شەوت لێ ناخۆشدەکەم... من نەیەکەی جەلادەتی کۆترو سەرهەنگ قاسمم حەز لێبوو... گووتم، ڕەنگە تۆ بیانناسیت، برات بن، کەسێکی ئەوان بیت»».

جەلیلی باران، ئەو سەربازە زامدارەی لە جێگای خۆیەوە سەیری جەلادەتی دەکرد، دەیگووت: تۆ ئەو نیت؟ وا نییە، باوەڕناکەم تۆ ئەو بیت؟ حیکایەتێک هەیە دەڵێت ئەوان چوون بۆ ئاسمان... ڕۆیشتوون، خودا هەڵیکێشاون بۆ مەلەکووت، تا لەوێ لە بە هەشت، لە بەر مەقامی باری تەعالادا مۆسیقا لێبدەن.

جەلادەتی کۆتر هیچی نەدەگووت، باران بە غەمگینییەوە هەناسەی هەڵدەکێشاو دەیگووت: لە ماوەی ئەو ساڵەدا بەرلەوەی بمکەن بەسەرباز، لە هەر شوێنێک لەگەڵ مۆسیقارەکاندا بووبێتم، باسی ئەفسانەی جەلادەتی کۆترو سەرهەنگ قاسمیان کردوە... لەهەر کوێ بووبێتم.

جەلادەت دەیگووت: برام جەلیلی باران من هیچ شتێکم لە تۆ ناوێت، هێندە نەبێت، لێت بپرسم: گەر ڕۆژێک لە ڕۆژان گەڕامەوە بۆ باکوور، ئایا تۆ ئەو مۆسیقارانەم پێدەناسێنیت؟ گەر گەڕامەوە بۆئەوێ دەمبەیتە لای ئەو مۆسیقارانە؟

جەلیلی باران زەردەخەنەیەکی دەگرت و دووبارە تەماشای پانکە چکۆلانەکەی سەقفەکەی دەکردەوەو دەیگووت: چەندین جاری تر ئەو دێوەرە پیرەم بینییەوە. هەموو جارێک بانگیدەکردم و دەیگووت: کوڕم، پێمبڵێ، هیچ هەواڵی تازەت لەسەر جەلادەتی کۆتر و هاوڕێکانی نییە؟. ئاه، برینەکانم زۆر ئازارمدەدەن، ناشزانم بۆ لە هەموو شوێنێک ئەم چیرۆکە دەگێڕمەوە، برام لەوانەیە لە بەر ئەوە بێت، حیکایەتێکی تر نازانم، شتێکی گرنگ و بە نرخ لە ژیانمدا ڕوونادات، ها، دەبێت لە ژیانی داماوێکی وەک مندا چی ڕووبدات؟. برام گەر ناوی ڕاستەقینەی خۆتم پێ بڵێیت، بە هەموو مۆسیقارەکانی شارت دەناسێنم، من هەموویان دەناسم... بەڵام ماڵ خراپ ئەم گوندە خۆشە بۆ جێدەهێڵیت؟... برام مەیەرەوە بۆ باکوور، خودا دەزانێت چ کارەساتێکی تر بەڕێگاوەیە؟ ئێرە لە هەر جێگایەکی تر بۆ تۆ باشترە.

جەلادەت سەری دەخستە ناو دەستییەوەو لە جێگای خۆی گرمۆڵەدەبوو، چاوانی پڕدەبوون لەفرمێسک و دەیگووت: ڕقم لە تەپوتۆزە، ڕقم لەم زمانەیە، خۆت دەزانی عەرەبی زمانی جەلادەکانە، ها خۆت دەزانیت کە کەس ناتوانێت شەو ڕۆژ ئەم زمانە قسەبکات کە پیاوکوژەکان قسەی پێدەکەن. ڕقم لە بێدەنگی بەربەیانی ئەم شارەیە، ڕقم لە تارماییەکانیتی، ڕقم لە سەربازو سۆزانییەکانە... ڕقم لە هەموو شتێکە، ڕقم لە خۆمە.

جەلیلی باران دەیگووت: من شتێک لە تۆ گەورەترم، شتێک لە تۆ گەورەترم، گەر گەیشتمەوە باکوور و تۆش گەیشتیتەوە، دەتوانم کۆمەکت بکەم. مەترسە، لە بازاڕی ئاسنگەران لە هەر کەسێک بپرسیت جەلیلی باران، کوڕی موحسینی لوولەساز دەتبات بۆلای باوکم.

جەلادەت وەک گیاندارێکی تەنیاو بریندار دەیناڵاند: هاوڕێم من کەس ناناسم، کەس ناناسم، هاوڕێ و کەسم نییە، گەر ڕۆژێک بێمەوە نازانم دەبێت لە کوێ بخەوم... لە کوێ بژیم، چ کارێک بکەم؟ نازانم.

جەلیلی باران بە بەزەییەوە سەیریدەکرد و پێدەکەنی: ئاوها قسەبکە، باشترە لەوەی درۆ بکەیت و بڵێیت من جەلادەتی کۆترم. جەلادەتی کۆتر مۆسیقارێکی بەناوبانگە، لە هەموو شوێنێک حورمەتی خۆی هەیە، خەڵکانی زۆروزەبەندە دەست دەگرن بە سنگیانەوە بۆی. ها تۆش لە ناو ئەم قەحبەخانە گەورەیەدا خۆت ەکەیت بە جەلادەتی کۆتر..مرۆڤ درۆ نەکات باشترە.

جەلادەت بێئەوەی هیچ بڵێت لە ژوورەکە دەڕۆیشتە دەرەوە و وەک هێزێکی نهێنی ڕاکێشیبکات ڕوویدەکردە نێوکوچەکان. ساتێکی سەیربوو، لە هەر چوارلاوە دەنگی تەقینەوە دەهات، لە هەموو لایەکەوە خەڵکانی ئاوارەو هەڵهاتوو لە هەموو شارەکانی باشوورەوە دەهاتنە ژووری بۆ ئەم شارە چکۆلەیە، وەکو ئەوەی ئێرە دواهەمین پەناگای ئەو سەر زەمینە بێت. جەلادەت سەدەها ژن و منداڵی سەرگەردانی دەبینی وەک شێت دەڕژانە ناو

جەلادەت سـەری دەخستە ناو دەستییەوەو لە جێگای خۆی گرمۆڵەدەبوو، چاوانـی پڕدەبـوون لەفرمێسـک و دەیگـووت: ڕقـم لـە تەپوتـۆزە، ڕقـم لـەم زمانەیـە، خـۆت دەزانـی عەرەبـی زمانـی جەلادەکانـە، هـا خـۆت دەزانیت کـە کـەس ناتوانێـت شـەو ڕۆژ ئـەم زمانـە قسـەبکات کـە پیاوکـوژەکان قسـەی پێدەکـەن. ڕقم لـە بێدەنگی بەربەیانـی ئـەم شـارەیە، ڕقـم لـە تارماییەکانێتـی، ڕقم لـە سـەربازو سـۆزانییەکانە... ڕقم لـە هەمـوو شـتێکە، ڕقم لـە خۆمـە.

جەلیلـی بـاران دەیگـووت: مـن شـتێک لـە تـۆ گەورەتـرم، شـتێک لـە تـۆ گەورەتـرم، گەر گەیشـتمەوە باکوور و تـۆش گەیشـتیتەوە، دەتوانم کۆمەکت بکـەم. مەترسـە، لـە بـازاڕی ئاسـنگەران لـە هـەر کەسـێک بپرسـیت جەلیلـی بـاران، کـوڕی موحسـینی لوولەسـاز دەتبـات بـۆلای باوکـم.

جـەلادەت وەک گیانداریکـی تەنیـاو برینـدار دەینالانـد: هاوڕێـم مـن کـەس ناناسـم، کـەس ناناسـم، هـاوڕێ و کەسـم نییـە، گـەر ڕۆژێـک بێمـەوە نازانـم دەبێت لـە کوێ بخـەوم... لـە کـوێ بژیـم، چ کارێـک بکـەم؟ نازانـم.

جەلیلـی بـاران بـە بەزەییـەوە سـەیریدەکرد و پێدەکەنـی: ئاوهـا قسـەبکە، باشـترە لـەوەی درۆ بکەیـت و بڵێیت مـن جەلادەتـی کۆتـرم. جەلادەتـی کۆتـر مۆسـیقاریکی بەناوبانگـە، لە هەمـوو شـوێنێک حورمەتـی خۆی هەیە، خەڵکانی زۆروزەبەنـدە دەسـت دەگـرن بـە سـنگیانەوە بـۆی. هـا تـۆش لـە نـاو ئـەم قەحبەخانـە گەورەیـەدا خـۆت دەکەیـت بـە جەلادەتـی کۆتر... مـرۆڤ درۆ نـەکات باشـترە.

جـەلادەت بێئـەوەی هیـچ بڵێـت لـە ژوورەکـە دەڕۆیشـتە دەرەوە و وەک هێزێکی نهێنی ڕاکێشییکات ڕوویدەکردە نێوکوچەکان. سـاتێکی سـەیربوو، لە هـەر چوارلاوە دەنگـی تەقینـەوە دەهـات، لە هەمـوو لایەکەوە خەڵکانی ئاوارەو هەڵهاتـوو لـە هەمـوو شـارەکانی باشـوورەوە دەهاتنـە ژووریّ بـۆ ئـەم شـارە چکۆلەیـە، وەکـو ئـەوەی ئێـرە دواهەمیـن پەنـاگای ئـەو سـەر زەمینـە بێـت. جەلادەت سـەدەها ژن و منداڵی سـەرگەردانی دەبینی وەک شێت دەڕژانە ناو

کوچەکانەوە، دەیەها چەکداری دەبینی لە ڕوخسارياندا ترس و شکست هەبوو، هەموو دەیانگووت: هێزەکانی گاردی کۆماری لە هەموو قۆڵەکانەوە بە خێرایی و بێ بەرگرییەکی گەورە بەرەو پێش دەچن. لە چەندەها لاوە چەکدارەکان بریندارەکانی خۆیان لە دەستەبەرەدا دەهێنایە ئەو شارە و بۆ دکتۆر دەگەڕان، هەندێک لە بریندارەکان بە کۆڵی هاوڕێکانیانەوە بوون، هەندێکیان لە بەتانیدا هەڵگیرابوون و خوێنەکەیان لە بەتانییەکانەوە دەتکایە سەر زەوی. ناڵەی بریندارەکان تێکەڵ بە هاواری ئەو ژنانە بوو بوو کە دوێنێ شەو مێردو براو کوڕەکانیان لە شەڕدا دۆڕاندبوو. هەندێک لە چەکدارەکان بە زۆر دەرگای ماڵەکانیان دەشکاندو بەدوای نان و ئاودا دەچوونە ژوورێ. جەلادەت وەک شاهیدێکی شێت تەماشایدەکردو هیچی نەدەکرد، بە کوچەکاندا دەگەڕا و سەیری ئەو ژنانەی دەکرد کە بە خۆیان و عەبا ڕەشەکانیانەوە شاریان پڕدەکرد لە گریان و فیغانێکی گەورە. لە هەندێ جێگادا چەکدارەکان لەگەڵ سۆزانییەکاندا دەبووە شەڕیان، هەندێک لە سۆزانییەکان بە ترسەوە دەیانقیژاند و دەیانگووت: بڕۆنە دەرێ، بە هۆی ئێوەوە هەموو ئەم شارە خاپووردەکەن... جەلادەت چەکدارەکانی دەبینی قورئان دەخوێنن و تەقە لە کچەکان دەکەن، قژیان دەگرن و بە شەقامەکاندا ڕایاندەکێشن. دەیبینی لە دوا ساتەکانی ژیانیاندا هەموو غەریزە وەحشییەکانیان دەهێننەدەرەوە... کچ سەردەبڕن، بە لەقە دەرگاکان دەشکێنن، تووشی هیستریا دەبن، هاواردەکەن، دەگرین... ئەو چاو دەنوقێنێت و دەبینێت تانکەکان لە هەر چوارلاوە بەرەو ئەو شارە دێن، بە هەموو شەقام و کوچە تۆزاوی و زەردەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ پرتەقاڵی سپی، بۆ ژوورەکەی خۆی، بۆ لای یادگارەکانی خۆی. لەوێ دەیەها چەکدارەکانی ڕاپەڕین دەبینێت چاوەڕێی ئەوەن لە کوچەکانی ئەم شارەدا شەڕی مان و نەمانی خۆیان بکەن. پرتەقاڵی سپییان کردوە بە بنکەی سەرەکی خۆیان. دەیەوێت بە ناویاندا دزەبکاتە ژوورێ، پێیاندەڵێت من

مۆسیقارم و ئێره ماڵی منه، دەیەوێت تێیانبگەیێنێت کە کەلوپەلەکانی لەوێن. بەپاڵ دەیکەنەدەرێ، تفەنگەکانی لە ڕوودا بەرزدەکەنەوە، پاڵی پێوەدەنێن، هەڕەشەی لێدەکەن و دووریدەخەنەوە. گرمەی تەقینەوەکان تا دێت زیاتر نزیک دەبێتەوە، تا دێتیش کوچەو کۆڵانەکانی شار پتر پڕدەبن بە ژن و منداڵ و پیاوانی ماندوو و بریندار، کە لەگەڵ مراوی و ماسییە خەیاڵییەکانی ناو سەری جەلادەتدا بە جۆرێک تێکەڵدەبن ناتوانێت لە یەکیان جیابکاتەوە. هەوا پڕە لە بوونەوەری بریندار، لە باڵندەی خورافی کە لەسەردەمە دوورەکانەوە ڕایانکردوە، مراوی کە بە پۆلی گەورە بە ناو شاردا دەفڕن، کوکوختی کە لەدەوری بریندارەکان نیشتوونەتەوە، قولنگی پیر کە بە ناو دوکەڵەکاندا دەفڕن و دەگەڕێنەوە. لە گەڕانەوەیدا بۆ لای دکتۆر بابەک، هەندێک لە مۆسیقارەکان دەبینێت، لە بەر دەرگاکان وەستاون و مۆسیقا لێدەدەن، مۆسیقایەک غەریبە بەو ڕۆژە، نامۆیە بە دیمەنی باڵندەکان، نامۆیە بە ترس و تەنهایی و نائومێدی ئەو ساتە. مۆسیقایەکی پووچە... مۆسیقای بێهودەییە. جەلادەت بیردەکاتەوە، کە مۆسیقا دەتوانێت پووچ بێت، ڕاکردن بێت لە هەموو مانایەک، دەتوانێت تەعبیر بێت لە بێهودەیی ئینسان. گوێچکەکانی خۆی دەگرێت و دەڵێت «هاوار، مۆسیقا هیچ نییە جگە لە چاوەڕوانییەکی دووروودرێژی کارەسات... مرۆڤ مۆسیقا لێدەدات چونکە لە نێوان چاوەڕوانی کارەسات و کارەساتدا هیچی دی نییە بیکات». ئەو پرسیارە ئەبەدییە هەمیشە لە دڵیدا بوو، ئەو پرسیارەی لەیەکەم ڕۆژانی فێربوونی مۆسیقاوە لە خۆی پرسیبوو: پەیوەندی نێوان، مۆسیقاو کارەسات چییە؟ لەو ڕۆژەدا مۆسیقا لە دیدی ئەودا هیچ نەبوو جگە لە بێهودەیی، ئەویش هیچ نەبوو جگە لە مەخلوقێکی بێسوود، مۆسیقارێک کە ناتوانێت هیچ بکات، نازانێت هیچ بکات. ئێستا جگە لەکارەساتێک کە لە هەوادا مەلەیدەکرد، شتێکی دی نەبوو مانای هەبێت، لەو شاری سەراب و خەیاڵ و تەپوتۆزەدا کارەسات تەنیا شتێک بوو مانای دەبەخشی، وەک ئەوەبوو

مۆسیقارەکان ڕیزبووبێتن تا بێهودەیی بنووسنەوە... سەیریدەکردن لە بەردەرکی ماڵەکانی خۆیان مۆسیقایان لێدەدا، بە چاوە غەمگینەکانیانەوە بە دوکەڵی ئەو ساتەدا دەڕۆیشتن و هیچیان نەبوو بیڵێن. جەلادەت بیریدەکردەوە، لە هەموو ساتە گرنگەکانی مێژوودا مۆسیقارەکان مەخلوقاتی بێسوودن. نەیدەزانی ئاخۆ ئەوە مردنە کە گوێ ناگرێت، یاخود مۆسیقایە نایەوێت لەگەڵ مردندا دیالۆگی هەبێت؟ ئەوە مردنە کەوەک ڕەشەبایەکی گەوج دێت و ناوەستێت تا مرۆڤ بە عەقڵ، بە ئاوان، بە مۆسیقا قسەی لەگەڵدابکات، یاخود مۆسیقایە بێباکانە شان هەڵتدەتەکێنێت و بەرەو ئەبەدییەت دەڕوات و ئێستای بەلاوە گرنگ نییە؟ ئەوە چ نهێنییەکە مۆسیقارەکان دەگۆڕێت بۆ بوونەوەری بێسوود؟ جەلادەت بە ناو قوربانییەکاندا دەگەڕاو دەیویست شتێک بکات، بەڵام چی؟ چۆن دەتوانێت بچێتە ئەم گەمەیەوە بێئەوەی ببێت بە مەخلوقێکی تر؟ بۆ مۆسیقا دەبێت تەنیا لە پێش کارەسات یان دوای کارەسات قسەبکات؟ بۆ لەساتی کارەساتدا مۆسیقا قسەیەکی نییە بیکات؟ جەلادەت لە ناوەڕاستی شتەکاندا دەوەستاو بەدەوری خۆیدا دەسوڕایەوە. وەک ئەوەبوو ئەو هێشتا کاتی قسەکردنی نەهاتبێت، هێشتا ئەو ساتە نەهاتبێتە پێشێ ئەو بێتە سەر شانۆ. دەوەستاو دەیگووت، بەلام چی ئەگەر ئەمڕۆ من مردم، ئەگەر کوژرام؟ بێئەوەی وەڵامی هەبێت، وەک شێت بە کوچەکاندا دەگەڕایەوە بۆلای موسای بابەک، لە کوچەکاندا سێ هاوڕێکەی جەلیلی بارانی دەبینی دەستیانکردۆتە ملی یەک و لە ناو دەنگی تەقینەوەکان و ترسی ئەو چێشتەنگاوەدا گۆرانی ماملێ دەڵێن. لە بەردەرکی خەستەخانەکەی دکتۆر بابەک دەیان برینداری دەبینی لە کۆلانەکەدا ڕیزبووبوون، بە ناو چەکدارو بریندارەکاندا دەچووە ژوورێ، سەرتاپای حەوش و هەیوانەکەش خەڵکی زامداربوون، بە ناو ژوورەکاندا دەگەڕاو دەیبینی هەموو قەرەوێڵەکان پڕن لە بیمار، نێوان قەرەوێڵەکانیش پڕن لە کەسانێک کە دەناڵێنن، وەک ئەوەبوو

دکتۆر بابەک هەموو ئەو قەرەوێڵانەی بۆ ڕۆژێکی وەها دانابێت، بەڵام ئێستا دەیبینی کارەساتەکە لەوە گەورەترە بتوانێت هیچ بکات. وەک شێت بە خۆی و ڕیشە سپییەکەیەوە لە نێوان قەرەوێڵەکاندا هاتوچۆیدەکرد، برینەکانی دەبەست، باوەشی بە زامدارەکاندا دەکرد، منداڵەکانی ماچدەکرد، مردووەکانی بە کۆمەکی هاوڕێ و کەسوکاریان هەڵدەگرت، کاتێکی نەبوو تەماشای جەلادەت بکات. ئەو وەک شێت بەدوایەوە بوو، تەماشایدەکرد، ئیلهامی لێوەردەگرت. جەلادەت لە کاتێکدا لە گەرمەی سەیرکردنی دکتۆر موسای بابەکدا بوو، لە ناکاو پۆل پۆل فریشتەکانی دالیای دەبینی لە هەوادا دەگرین، دیمەنی غەمگینی فریشتەکان دەیفڕاند بۆ لای دالیا کە بەسەرێکی تر سەرقاڵی بیمارەکان بوو، کەمە خواردنی دەدانێ، ئاویدەکرد بە دەمیانەوە، برینەکانی دەپێچان، حەبی ئازاری دەدانێ، دەستی دەخستە سەر ناوچاوانیان و باوەشێنیدەکردن. جەلادەت دەیویست بچێتە لای جەلیلی باران، بەڵام کەسی نەدەبینی، قەرەوێڵەکەی یەکێکی دی لەسەربوو. هەموو ژوورەکان دەگەڕاو جەلیلی بارانی نەدەبینی، لە هەموو جێگایەکیش وەک شێت بەر ئەو فریشتە چکۆلانانەی دالیا سیراجەدین دەکەوت، کە هەوایان پڕکردبوو لە فرمێسکی زیوین. دالیا لە گەرمەی سەرقاڵیدا جەلادەتی دەبینی و دەیگووت، جەلادەت یارمەتیم بدە، بەڵام ئەو نەیدەزانی چی بکات، وا هەستیدەکرد ئەو دەبێت بە تەنیا تەماشابکات و هیچی دی... تەماشابکات و هیچی دی. دەستەوەستان لە ناو کارەساتدا دەوەستاو سەیریدەکرد. هەموو ئەو نیوەڕۆ سەیرەی لە سەیرکردندا دەبردەسەر، حەزیدەکرد دالیاو دکتۆر بابەک هەموو شتێک جێبهێڵن و وەک جاران لە هەیوانەکەدا دانیشن و باسی ڕۆژگارە زێڕینەکانی جاران بکەن، حەزیدەکرد دکتۆر بابەک جارێکی دی باسی ئۆپرای «هۆڵەندی باڵداری» بۆ بکات، ئەو دیمەنەی بۆ دووبارەبکاتەوە کە سێنتا و کەشتیەوانە هۆڵەندییەکە پێکەوە دەچن بۆ ئاسمان. دەیویست چاو بنوقێنێت و چیتر ئەو فریشتە چکۆلەو غەمگینانە

نەبینێت لە هەوادا، ئەو ماسییە خورافیانە نەبینێت کە لە زەریا دوورەکانەوە ڕایانکردبوو، ئەو مراوییانە نەبینێت کە بە هەزارەها بە ناو شاردا دەفڕین. جارێکی تر دەچووەدەرێ و لە کوچەکاندا بەدوای جەلیلی باران و هاوڕێکانیدا دەگەڕا، بەڵام کەسی نەدەبینی. دەنگی تەقینەوەکان زۆر نزیکدەبوونەوە، تا دەهات خەڵک و چەکداری زیاتر دەهاتنە شارەوە. جەلادەت چاویدەکردەوەو دەیبینی لە هەر چوارلاوە تانک و زرێپۆشەکان بەرەو ئەوێ دێن. پاڵیدەدا بە دیوارێکەوەو هەستیدەکرد ئەو شارە دەجوڵێت، ئەو شارە دەڕوات، وەک کەشتییەک لە بەحرێکی گەورەی لمدا بجوڵێت بە تەواوی سەر نشینەکانییەوە بەرەو نادیار دەچێتە پێشێ... وەک چۆن گیاندارێکی بریندار دەیەوێت لە ئابلۆقەیەک دەرچێت، ئەو شارە وەک نەهەنگێکی بریندار لەسەرەخۆ پێچیدەکردەوەو بە ناو شەپۆلەکاندا دەڕۆیشت. جەلادەت چاویدەکردەوەو گوێی لە دەنگی یەکەمین موشەکی گەورەدەبوو دەیدا بە ناو شاردا، لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا دەیەها موشەکی گەورە گەورە دەیاندا بە شاردا، خەڵکانی بێپەناو پەرێشان بە دەم هاوارو دۆعاکردنەوە بە کوچەکاندا ڕایاندەکرد، بەڵام هیچ جێگایەکی ئەمین لەو شارەدا نەبوو، موشەکەکان دەیەها کوژراویان بە جیدەهێشت، خەڵکان بە شەپۆل لە شوێنی تەقینەوەکان دووردەکەوتنەوە، لەو ساتی ترس و سامەدا جەلادەت تەنیا کەسێک بوو بەرەو ئەو شوێنانە دەڕۆی و دەیویست لە نزیکەوە بۆنی باروت بکات، بۆنی خوێنی کوژراوەکان بکات و لە یادەوەری خۆیدا بینوسێت. لە شوێنی موشەکەکاندا منداڵی پارچەپارچەو لاشەی هەلاهەلای دەبینی، سەری بڕاو و دەستی قرتاو و قاچی بێساحێب، لە ناو دوکەڵ و هالاوی مردندا دەڕۆیشت و هەستیدەکرد وەزیفەی ئەو ئەوەیە کارەساتەکان ببینێت، وەزیفەی ئەوەیە تەماشای کوژراوەکان بکات و هەوای مردن هەڵمژێت.

لەگەڵ تاریکبوونی دونیادا ژمارەی موشەکەکان بە جۆرێکی ترسناک

زیادیکرد، لە هەموو لایەکەوە ئاگر هەڵدەستا، هەموو شاری تەپوتۆزە زەردەکان دەسووتا. وەک کەشتییەک بە دەیەها کەشتی تر ئابلۆقەدرابێت، ئەو شارە دەیویست لە گەمارۆ دەربازبێت، دەیەویست خۆی لە زەوی ڕاپسکێنێت، مەودا نزیک و دوورەکانی زەمان ببڕێت، دەست بە ئاسمانەوە بگرێت و بە تەواوی سەرنشینەکانییەوە بەرەو کەشکەشانی فەلەک سەرکەوێت. بەڵام هیچ هێزێک نەبوو ئەمجارە ڕزگارییبکات. بۆنی ئاگرو دوکەڵ دونیای تەنیبوو، سەر شەقام و ماڵەکان پڕبووبوون لە لاشە. جەلادەت دەگەڕایەوە بۆ ماڵی دکتۆر، لەوێش دەیەها مرۆڤی سووتاو و پارچەپارچەی لە پێش دەروازەکەدا دەبینی، موشەکێک لە ناو بریندارەکاندا تەقیبووەوەو دەیەها کەسی پارچەپارچەکردبوو. جەلادەت بەناو بۆنی باروت و دوکەڵدا ڕایدەکردە ژووری، دالیای دەبینی بە جلە خوێناوییەکانییەوە لە ناو دوکەڵ و ئاگردا بریندارێک هەڵدەستێنێتەوە. موسای بابەکی دەبینی خەڵکانێک دەباتە ژووری و هاواردەکات «بەرەو ژێر زەمینەکە، بەرەو ژێر زەمینەکە». خودایە چۆن بەرەو ژێر زەمینەکە؟ ئەی تابلۆکان؟. موسای بابەکی دەگرت و هاواریدەکرد: نا دکتۆر، تۆ چیدەکەیت، هەموو ڕەنجی خۆت دەدەیت بەبا، ماندووبوونی چەند ساڵەت دەفەوتێت.... هاوار تۆ چی دەکەیت؟. دکتۆر بێئەوەی وەڵامبداتەوە، پاڵێکی هێمنی پێوەدەناو پەیتا پەیتا خەڵکانی دەکردە ئەو ژێر زەمینە نهێنییەوە کە ژیانی خۆی لە دروستکردنیدا بە هەدەردابوو.

جەلادەت لە ساتی یەکەمەوە دەیزانی ئەو ژێرزەمینە فاقەیەکی گەورەیە، تۆڕێک کە هەموو ماسییەکان بەرەو ڕووی مەلەدەکەن. جەلادەت لە ناو ئاسەوارو دوکەڵی تەقینەوەکەدا دەستی دالیای دەگرت و دەیگووت: دالیا، مەڕۆ، تۆ شێت بوویت، هەمووان لەو ژێر زەمینەدا دەمرن... ئێوە چی دەکەن؟ مەڕۆ، وەرە لەگەڵمدا، تۆ نابێت بچیتە ژووری، تۆ نا.

دالیا وەک فریشتەیەک زەردەخەنەیەکی دەگرت و وەک لە سەر زەمینێکی

ترەوە قسەبكات، وەک لە قوولایی مەرگەوە قسەبكات، بە هێمنییەک کە لە هێمنی مەخلوقێک دەچوو مەلەکووت ببینێت دەیگووت: جەلادەتی ئازیز، تۆ دەڵێیت چی؟ ئەوانە پێویستیان بە منە، ئەمڕۆ ئەوانە پێویستیان بە منە. ئازیزم، وەرە دڵی من حەزدەکەم باوەشت پیابکەم، تۆ ئاگات لە خۆت بێت، تۆ مەیەرە ژێرەوە، بەڵام من دەبێت سەرپەرشتیانبکەم... پێویستیان بە منە... تەنیا ئەمڕۆ پێویستیان بە منە، تەنیا ئەمڕۆ.

جەلادەت ژن و منداڵەکانی دەبینی بە کۆمەڵ دەچنە ژێر زەمینەکەوە. دکتۆری دەبینی کۆمەکی هەندێ کەس دەکات بریندارەکان بگوێزنەوە، دالیای دەبینی دەستی پیرە مێردێک دەگرێت، بە پلیکانەکاندا دادەبەزێت. ترسێکی کوتوپڕ دووری دەخستەوە، دەنگی تەقینەوەیەکی نزیک جارێکی تر هەموو خەستەخانەکەی دەلەراندەوە. جەلادەت ڕایدەکردەدەرێ، شەو دادەهات و کوچەکان خاڵی بوون لە هەر ڕۆح لەبەرێک، وەک شێت ڕایدەکردو موشەکی گەورە گەورە لە چواردەوری دەتەقینەوە. تەواوی شار وەک کەلاوە و خەراباتێکی گەورەی لێ هاتبوو... جەلادەت ڕایدەکرد و دەنگی تەقینەوەکان زیاتر و زیاتر دەبوون، ڕایدەکردو لە هەر چوارلاوە ئاگر دەباری، لە یەکێک لە کوچەکاندا دەوەستاو یەکەمین زرێپۆشی دەبینی، سەربازێک لە سەر زرێپۆشەکە وەستابوو و دوو سەری بڕاوی بەدەستەوە بوو، دوو سەری بڕاوی کە تنۆک تنۆک خوێنیان لێ دەچۆڕا، جەلادەت لە ناو زوڵمەتدا سەرەکانی دەبینی، سەری فەهمی بەسری و ئوم فەزل بوون. سەری مۆسیقارێک بەدبەخت و ژنێک کە ئەمشەو نەیتوانی بوو تەپوتۆزی دونیا بسڕێت. هاوار... هاوار... هاوار. بەرەو ئەوسەری شار ڕایدەکرد و دەنگێک لە دوایەوە بانگیدەکرد، ڕایدەکردو دەنگێک پڕ بە هەموو کوچەو کۆلانەکان بانگیدەکرد «جەلادەتی کۆتر تۆ لە کوێیت؟». دڵنیابوو ئەو دەنگە دەنگی دالیایە، بەڵام پێدەچوو لە دونیایەکی ترەوە بێت،

لە ئاسمانەوە دابەزێت، لە شوێنێکی نادیاری ناو وجودەوە بانگی لێبکات. بەدوای ئەو دەنگەدا دەگەڕایەوەو هیچی نەدەبینی، پڕ بە شەو هاواریدەکرد «دالیا... من لێرەم، لێرەم...» بەلام گرمەی موشەک و ترس و ماندوێتی نەیاندەهێشت هاوارەکانی بڕوات، گەرویان بە دەردێکی سامناک بردبوو. دەوەستا نەیدەزانی ئەو هاوارانە تەنیا زرینگەی وەهمێکە لە وەهمەکانی ناو سەری خۆی یاخود دەنگی مرۆڤێکی ڕاستەقینەیە. دیسانەوە پڕ بە شەو هاواریدەکرد، بەلام هاوارەکانی بە جۆرێک تێکەڵ دەنگی تەقینەوەکان دەبوون، خۆشی دەنگی خۆی نەدەبیست.

لە یەکێک لە کوچەکاندا بۆن پرتەقاڵێکی تازە دەچوو بەسەریدا. دەوەستاو لە زوڵمەتدا سامیری بابلی دەبینی بە خۆی و دوو ئەسپی سپییەوە بەرەو ڕووی دێت... دوو ئەسپ وەک کەفی دەریا... وەک چوڕی شیر... وەک بەفری دوور. دوو ئەسپ لە ئەسپی سەر زەمین نەدەچوون، بەڵکو لە ئەسپی ناو چیرۆکە ئەفسانەییە کۆنەکان دەچوون. سامیر بێئەوەی هیچ بڵێت، بە دەنگی پیاوێکی شکست دەیگووت: جەلادەتی کۆتر سواربە... سواربە لەگەڵمدا و با لەم شارە دەرچین. جەلادەت ئاوڕیدەدایەوەو بەردەوام یەکێک لە تاریکیدا بانگیدەکرد. دەنگی دالیا بوو، کە وەک با بیهێنێت نزیک دەبووەوە، دەوەستا و تەماشای زوڵمەتی دەکرد، دالیا بە خۆی و فریشتە غەمگینەکانییەوە لە تاریکیدا دەردەکەوت، دەهاتە پێشێ و شتێکی پێچراوەی پێبوو، لە هەر کاتێکی تر جوانتربوو، لەو شەوەش جوانتربوو کە یەکەمجار بە جلی سەماوە هات تا زامەکانی بیماربکات، ئەو شەوەی پێیگووت من ناوم «تریفەی زستانە». «ئاه دالیا بۆ برینەکانی منت تیمارکرد، بۆ لێنەگەڕایت بمرم، بۆ لە بری گوللەیەک هەزار برینی ترت کردە ڕۆحم». ساتێکی سەیربوو، جەلاد و قوربانی و فریشتەیەک لە ناو کۆلانێکی تاریکدا، لە ناو نالەی موشەک و زرمەی تەقینەوەی سامناکدا بەیەکدی دەگەیشتنەوە، باوەشیان بەیەکدا دەکرد، هەر سێکیان یەکتریان

ماچدەکرد، هەر سێکیان دەگریان، هەر سێکیان لە ناو تەپوتۆزی تەقینەو ئاگرو دوکەڵدا دەوەستان. دالیا ناو ئەو هەموو تەقینەوەو ترسەی بڕیبوو تا ئەمانەتێکی گەورە بۆ جەلادەت بهێنێت، وەک ئەوەبوو هەمووان کۆتایی ئەم حیکایەتە بزانن، دالیا ماچیدەکردو بەو دەنگە مەلەکوتییەی خۆی پێیدەگووت: جەلادەت، ئەمە دواهەمین ڕاسپاردەی من و دکتۆر موسایە بۆ تۆ، تۆ دەبێت ئەم فایلەو ئەم تابلۆیە ڕزگاربکەیت، دەبێت لەم شارە دەرچیت و ئەم شتانە ڕزگاربکەیت؟. جەلادەت تەماشایدەکرد، فایلی مردنی باسم جەزائیری و تابلۆی «شاری مۆسیقارە سپییەکان» بوو. بە دەنگێکی پڕ فرمێسکەوە دەیچپاند بە گوێیدا: دالیا سیراجەدین، خانمی ناو خەونەکانم، لەگەڵمدا وەرە، تۆ لەگەڵمدا نەبیت دەمرم. دالیا دەیگووت: گوڵی من، من و تۆ لێرەدا دەبێت لەیەکدی جیاببینەوە، هەموو چیرۆکێک کۆتاییەکی هەیە، حیکایەتی من و تۆش پێدەچێت لەم شارەداو لێرەدا کۆتاییبێت. لەم شەوە تاریکەدا، حەزمدەکرد لە شوێنێکی دیکەدا کۆتایی بێت، لە شارێکی تردا، بەلام گوڵی من سەری نەگرت، ئەگەر نەمردم، دەتدۆزمەوە، ساڵ و ڕۆژ و جێگا گرنگ نییە، گەر نەمردم دواجار لە شوێنێکی ئەم دونیایەدا یەک دەبینینەوە... جەلادەت گوڵی من، دەبێت بە جێت بهێڵم... پێویستیان پێمە، من لەگەڵ ئەو ژن و مندالانەدا دەمێنمەوە... تۆ دەبێت بڕۆیت... لەوانەیە لە سەر زەوییەکی تر و لە زەمانێکی تردا من و تۆ یەکدی ببینینەوە، ئێستا تۆ دەبێت بڕۆیت... بڕۆیت و غەم نەخۆیت.

دالیا جەلادەتی ماچدەکردو دەیگووت: گەر ئاوەها خەفەتبار بیت، زۆر مەراقم دەدەیتێ، من پێویستیم بە ئومێدە، دەبێت هێزی ئەوەم هەبێت یارمەتیانبدەم، دۆعام بۆ بکە هێزی ئەوەم تیا بێت یارمەتیانبدەم.

جەلادەت دەیویست باوەشی پیابکات و نەهێڵێت بڕوات، بەلام دالیا دەستیدەگرت و دەیگووت: جەلادەت دەبێت بە تەنیا بەردەوامبیت، بمبورە، من جگە لەوەی خەم و دەردم بۆ زیاد کردیت، هیچم نەکرد... من وام...

مـن بـه لای هـەر ڕۆحلەبەرێکدا دەڕۆم غەمباریدەکەم. لـه بیـرت نەچێت کـه تـۆ تەنیـا شـاهیدیت، مـن ناتوانـم لەگەڵتـدا بیـم، تـۆ تەنیـا شـاهیدیت. سـوار ئـەو ئەسـپه ببـەو ئـاوڕ مـەدەرەوه، ئـەم شـاره وەک شـارەکانی تـر نییـه، کـه نغرۆبـوو هیـچ ئاسـەوارێک لەسـەر زەوی جێناهێڵێـت. جـەلادەت دەیویسـت بیگرێت، دەیویسـت باوەشـی پیابکات و لەگـەڵ خۆیـدا هەڵیگرێت، بـەلام وەک بـاوەش بەسـەرابێکدا بکات دالیـا لـه نـاو تاریکیدا بـێ خوداحافیـزی وندەبوو، جـەلادەت پـڕ بـه شـەو هاواریدەکـرد: دالیـا، خانمـی نـاو خەونەکانـم. پـڕ بـه شـەو هـاواری دەکـردو جگـه لـه سـەدای تەقینـەوەو گرمـەو ناڵەی موشـەکەکان هیچـی تـری نەدەبیسـت. دەنگـی لـه نـاو گرمـەی تەقینەوەکانـدا وندەبـوو. دەوەسـتاو هەسـتیدەکرد بایەکـی قایـم هەڵـدەکات، بایەکـی ترسـناک. لەگـەڵ سـامیری بابلیـدا سـوار یەکێـک لـه ئەسـپه سـپییەکان دەبـوو، وەک یەکێـک هەمـوو ژیانـی لـه ئەسـپ سـواریدا بردبێتـه سـەر، وەک ئـەو بایـه بـەرەو زەمانێکـی تـر هەڵیانگرێـت، وەک گەردەولوولێـک بێـت فڕێیانبداتـه دەرەوەی شـوێن و زەمانـەوه ئەسپەکان دەیبردن... کـه بۆ یەکەمجـار بـه ئـاگا دەهاتـەوه لـه نـاو سـەحرایەکی گەورەدا بـوو، تەنیـا خـۆی و سـامیری بابلـی بـوون، لـه دوو ئەسـپی سـپی و مەلەفێـک و تابلۆیـەک بـەولاوه هیچـی دییـان پـێ نەبـوو، تابلۆیـەک وەک تاکـه پـرد لـه نێوان شـوێن و زەمـان و نازەمانـدا دەمێنێتـەوه.

* * *

دوای سـێ سـاڵ ژیان له شـارێکی بیاباندا جەلادەتی کۆتر لەگەڵ سـامیری بابلیدا لەسـەر دوو ئەسـپی سـپی گەیشـتنەوه کوردسـتان. بەر لەوەی جەلادەت بگاتـەوه شـاری خـۆی، لەسـەر ئەسـپه سـپییەکەی سـەفەرێکی درێـژی لـه باشـووردا ئەنجامدا. هـەر ئـەو شـەوەی کـه هاتنـەدەرێ، تـا بەیانـی بێدەنـگ لـه دوورەوه تەماشـای سـووتانی ئـەو شـارەیان کـرد، تـا بەیانـی هەمـوو شـتێک

سووتا، سەرتاپای شار یەک ئاگری گەورەبوو، کە پێشتر نە چاوی مرۆڤ و نە خەیاڵی شتێکی وایان نەبینیبوو، ئاگرێک نغرۆبوونە ئەفسانەییەکانی یاد دەهێنایەوە، سووتانی شارە گەورەکان، نوقمبوونی سادوم و ئامورا، خنکانی کیشوەرە کۆنەکان لە ژێر دەریادا. دیمەنەکانی ئەو نغرۆبوونە مەزنە هەمیشە لە چاوانی جەلادەتدا دەمێننەوە، ساڵانێک دواتر بە منی دەگووت: عەلی شەرەفیار، سەیرمکە سەیری چاومبکە، بزانە چی دەبینیت؟ من تەماشای قووڵایی بیلبیلە ڕۆشنەکانی ئەوم دەکردو لە ناوەوە ئاگرێکی داگیرساوی گەورەم دەبینی. ئەو دەستی دەخستە سەر شانم و دەیگووت «ئەوە ئاگری نغرۆبوونی شاری تەپوتۆزە زەردەکانە لە ڕۆحی مندا». هەر ئەو ڕۆژە دەمەوبەیان هێدی هێدی لەگەڵ کەوتنی خۆردا هیچ دیار نەما، نە ئاگر، نە شار، نە ئاسەواری وێرانەیەک. جەلادەت و سامیری بابلی بە خۆیان و ئەسپەکانیانەوە بەسەر ئەو زەوییەدا هاتنەوەو هیچیان نەبینی، وەک ئەوەی هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان شارێکی وەها لە بووندا نەبووبێت، لە شوێنی ئەو شارە تەنیا لمێکی پاکیزو زەردیان بینی، کە پێدەچوو ئەو بەیانییە لەوێدا ڕۆکرابێت. شاری زەردی سۆزانییە غەمبارەکان، شاری سەربازە نائومێدەکان، شاری ئەو مۆسیقارانەی مۆسیقایان یادچووبووەوە یەکجار لەسەر زەوی ونبوو، تاکە شاهیدیش لەسەربوون و نەبوونی تابلۆیەک بوو جەلادەتی کۆتر لە پشتی ئەسپەکەی خۆی بەستبووی.

بەسوار ئەسپە سپییەکانیانەوە، وەک با بیانفڕێنێت، بە سەحراکانی باشووردا هاتن، بەتەک ئەو شارانەدا تێپەڕین کە تەنیا خۆڵەمێشەکەیان مابوو، بەتەک ئەو باغانە ڕۆیشتن کە هەمیشە دەسووتان، بەتەک ئەو ڕووبارانەدا تێپەڕین کە ماسییەکانی ئاوە لیخن و ژەهراوییەکانیان جێهێشتبوو و لە هەوادا مەلەیاندەکرد، دواجار لە ناو کۆمەڵێک بورجی ئەفسانەییدا وەستان، کۆمەڵێک ئاسەواری کۆن و عەجیب کە بۆنی دەستی یەکەمین مرۆڤی سەر ئەم ئەستێرەیان لێدەهات. سامیری بابلی

لە بن دیواری یەکێک لە بورجەکاندا، هەندێک دەفتەرو کاغەزی پێچراوەی دەردەهێناو دەیگووت: جەلادەتی کۆتر، لێم مەپرسە ئەمانە چیین، لێم مەپرسە، تا ڕۆژێک من خۆم پێتدەڵێم. جەلادەت بێئەوەی هیچ بڵێت، سەیری دەستە تۆزاوییەکانی سامیری دەکرد و دەیگووت: پرتەقاڵی بابلی باسواربین و بڕۆین. جەلادەت ئەو کات نەیپرسی ئەو نوسراو و بەڵگەنامە پێچراوانە چیین؟ کێ لە بناغەی ئەو بورجە ئەفسانەییانەدا شاردونێتیەوە؟ بۆ کێ هەڵگیراون و سوودیان چییە؟

کەس نازانێت جەلادەتی کۆتر و سامیری بابلی چەند بە ڕێگاوەبوون، چۆن بە سەحراو پێدەشت و شارە ئاڵۆزەکاندا دەربازبوون، چۆن لەسەر ئەو ئەسپە سپی و ئەفسانەییانە بە ناو زەمینە ترسناک و تاریکەکاندا تێپەڕین، جەلادەت تەواوی ئەو سەفەرەی وەک خەونێک دەگێڕایەوە کە مرۆڤ لەناو تەم و دوکەڵ و ڕەشەبادا بیبینێت. سەفەرێک کە ناگێڕدرێتەوە، هەوڵی گێڕانەوەشی هیچ نییە جگە لە هەڵشاخانێکی گەمژانە بە کارێکی ئەستەم و نەکردەدا. لەوەش بترازێت، دەبێت بڵێم منیش و جەلادەتیش کە حیکایەتخوانی گەورەی ئەم چیرۆکەین حەزمان بە گێڕانەوەی سەربوردە دووروودرێژەکانی سەفەر نەبوو. هێند هەیە کە جەلادەتی کۆتر شەوێکی باران بە سوار ئەسپێکی سپییەوە گەیشتە قەراغ شار، شاری ڕاستەقینەی خۆیان، سامیری بابلی لە ژێر باراندا دەلەرزی، دوو کەس بوون نەیاندەزانی دەچن بۆ کوێ، گەیشتنە ناو باغێک کە لە بەرزاییەوە بەسەر شاردا دەیڕوانی، باران هێند بەهێزبوو، مرۆڤ باش گوێی لە دەنگی یەک نەبوو. هەردووکیان لەسەر ئەسپەکانیان دابەزین، دوو ئەسپی سپی کە پێدەچوو لە جێگایەکی دوورەوە هاتبن بۆئەوەی ئەوان هەڵگرن و بە ناو کارەسات و دوکەڵ و مردندا بیانپەڕێننەوە، دوو ئەسپ تەنیا لە ساتی موعجیزەکاندا دەردەکەون. جەلادەت تابلۆکەی خۆی بە چەندەها شت پێچابووەوە تا تەڕ نەبێت، سامیری بابلیش، هەمان شێوە بەڵگەنامەکانی خۆی بە شێوەیەکی

سەیر بەرابەر باو باران و بروسکە قایمکردبوو. ئاوها لە بەر دەروازەکانی شاردا، لە زولمەتی شەوێکی باراندا، هەردووکیان مالاواییان لە ئەسپەکان کرد و بەرەو نزیکترین کوچەو کولانی خەوتوو کەوتنە ڕێ. بەر لەوەی پێ بخەنە سەر یەکەمین شەقامی شار، جەلادەت لە باراندا دەوەستاو دەیگووت: سامیری بابلی، لە ئێستاوە، لەم ساتەوە تۆ دیلی منیت، تۆ ئەسیری منیت. گوێبگرە من هەرگیز لە تۆ خۆش نەبووم.

بابلی بێئەوەی هیچ بلێت، لەژێر لێزمەکەدا دەوەستاو دەیگووت: ئەی مندالی نەجیب، تۆ چۆنت دەوێت باوا بێت، لەئێستاوە من ئەسیری تۆم.

لەو چرکەیەوە کە پێیان دەخستە ناو ئەو شارە، کە جەلادەت بۆنی کۆلانەکانی مندالی خۆی دەکرد، هەناسەی ئەو ئاوەدانییەی هەلدەمژی کە پڕبوو لە تیشک و ئاسوودەگی، ڕۆژگارێک کۆتاییدەهات و ڕۆژگارێکی دیکە دەستی پێدەکرد. لەو ساتەوە ئیدی پەیوەندی نێوان سامیری بابلی و جەلادەت وەک پەیوەندی پاسەوان و دیلی لێدەهات، جەلادەت دەستی سامیری بابلی دەگرت و دەیگووت: ئەمە شاری مندالی منە، شارێکە نامرێت، بەلام کەس نازانێت لێرەوە چۆن بڕوا بەرەو ئەبەدییەت.

وای دەگووت و چۆن پێغەمبەرێک ڕوودەکاتە مەلبەندی پەیامی خۆی، بە ناو باراندا بەرەو شارێک دەڕۆیشتن ئەگەرچی کۆن بوو، بەلام لە پێشچاوی ئەوان تازەو ئەفسانەیی دەینواند. جەلادەت لە ناوەڕاستی یەکەم شەقامدا دەوەستاو دەیگووت: ئەی شار، من دەرگاکانی خۆتت بۆ دەکەمەوە و کلیلی زەمین و زەمانی ترت بۆ دەهێنم..

سامیری بابلی دەیگووت: ئەی مندالی نەجیب، بوەستە، بوەستە، لەم شەوەدا کە شەوی حەقیقەتە دوای خەیال مەکەوە.

بەلام جەلادەت دەیگووت: ئەی شار، ئەمە منم، منم، جەلادەتی کۆترم دووبارە دەگەڕێمەوە، مندالی موعجیزەکانم...

لەسەریانەوە بروسکەکان دەنگی دەهات، لە پشتیانەوە کزەیەکی سارد

پاشەوپاش بەرەو ڕابوردوو دەگەڕایەوە، لە پێش دەمیشیاندا شارێکی تاریک ڕۆحی خۆی دەکردەوەو دەیبردن. جەلادەت لە باراندا دەکەوت و دەیگووت: سامیری بابلی ئەمە باران نییە، ئەمە تۆفانی گەڕانەوەی من و تۆیە.

بابلی دەیگووت: هەستە جەلادەتی کۆتر، هەستە با بڕۆین، دەبێت ئەم حیکایەتە دووردرێژە تەواوبکەین.

جەلادەت بێباکانە دەیگووت: هاوڕێم بابڕۆین، بابڕۆین ئەم حیکایەتە تەواوبکەین.

هەردووکیان ئاوڕیاندەدایەوەو دڵنیابوون ماڵاواییان لەسەدەیەک کردوە، لە تاریکترین سەدەکانی دونیا. دڵنیابوون لەوسەری گەردەلوولێکەوە هاتۆتەنەتەدەری، لە تونێلێکی ترسناکی زوڵمەت پەڕیونەتەوە، کە تا هەتا هەتایە جانەوەرو دێوەزمەو دڕندەکانی وازیان لێناهێنن، شەیتانەکانی لەسەریاندا دەژین، ئیبلیسەکانی ڕاویاندەنێن.

## بەشی یەکەم

# ئوتێلی گێلاسی سپی

ئەو کاتەی لەگەڵ ڕەوشـەنی مستەفا سـەقزیدا چووین بۆلای لە ژوورێکی سـاردو داڕوخـاوی نـاو ماڵـە ئاوارەکانـدا دەژیـا، لـە ئوتێلێکـی سـووتاو و وێرانـدا بـوو لـە ناوەڕاسـتی شـاردا، کـە چەنـد سـاڵێک دواتـر، گـۆڕدراو لـە بنـەوە تازەکرایـەوە، بـوو بـە شـوێنی ئـەو وەفدە بێئیشـانەی لەمسەرەوسـەری دونیـاوە ڕوویـان لـە کوردسـتان دەکـرد، ئـەو وەفدانـەی بێئـەوەی هیـچ نیازێکـی دیاریکراویـان هەبێـت دەهاتـن و بێئـەوەی هیـچ شـتێکی دیاریکـراو بکـەن دەڕۆیشـتن. ئـەو کاتـەی مـن چوومـە ئـەو ئوتێلـە سـووتاوەوە، نیشـانەو ئامـاژەیـک لـە گـۆڕێ نـەبوو کـە سـەردەمێک دێـت دەبێتـە شـوێنی گەلـەک لـە گەورەپیاوەکانـی سیاسـەت، دەبێتـە قیبلەگاهـی وەزیـرو بارۆنـە گەورەکانـی دەسـەڵات و پـارە. ئـەو کات ئـەو ئوتێلـە جێگایـەک بـوو بۆنـی فەقیـری و بەدبەختـی لێدەهـات، دوو بـۆن مـن بـە درێژایی ژیانـم ڕێزو مەحەبەتێکی قووڵم بۆیـان هەبـووە. فەقیری کـە پێمـوابوو تاکـە نیشـانەیەکی شـەرەفە لـەم شـارەدا مابێتـەوە، فەقیری کـە تاکـە مەدالیایەک بوو مرۆڤ بیکات بە سینەی خۆیەوەو بڵێت «سـەیرکەن خەڵکینـا مـن هێشـتا پاکـم، هێشـتا نەبـووم بـە قەحبـە». ئـاه، بـە هەرحـاڵ ئێسـتا کاتـی باسـکردنی ئـەو ڕۆژە زێڕینانـەی ئوتێلـی ناوبـراو نییـە کـە ئـەوکات ماڵـی ئـاوارە بەدبەختـەکان بـوو، ئـەو ئاوارانـەی سـاڵانێک

دواتریش گەلەک سیاسەتی چەپەڵ لەسەر خوێن و ئێسقانی ئەوان دەکرێت.
بەلام ببورن قسەکردنی من لەسەر ڕۆژگاری زێڕین، سەردەمی تەلایی ئەو ئوتێلە مانایەکی بۆ ئێوە نییە، کە ئەگەر مرۆڤ ڕاستگۆ بێت دەبێت بڵێت، هەرگیز ڕۆژگاریی زێڕینی خەڵکانی وەک جەلادەتی کۆتر نەبووە، کە بەبێ هیچ سەردەمێکی زێڕین دەژین و دەمرن. ئەوکاتەی ئێمە چووینە ئەو ئوتێلە بڵندەوە، ئەو لە ژوورێکی تاریک و ڕەشدا دەژیا. یەکەمجار ڕوخسارە سپییەکەی سەرنجی منی ڕاکێشا، ئێجگار سپی بوو، ڕەنگی لە ڕەنگی ئەو نەورسە پاکانە دەچوو کە لە سەر ڕۆخەکانی دەریای باکوور بینیبوومن. ئەو ڕیشە درێژ و چاوە خەیاڵیانەی منیان وەستان کە پڕبوون لە نیشانەی حەسرەت و دوودڵی. ئەو چاوە گەشانەی کە وام هەستدەکرد لێوان لێون لە ئەستێرە... سیحری نیگاکانی سروشتێکی ئەرستۆکراتیانەیان پێ دابوو، سەیربوو مرۆڤ بەو نیگایەوە لەجۆرە وێرانەیەکی وەهادا بژی. کە سەیری نیگا وێڵەکانیت دەکرد تێدەگەیشتی نایەوێت زۆر لێی نزیک بیت. سەلیقەی زۆری من لەگەڵ نوسیندا فێری ئەوەی کردبووم خەڵکان زۆر بە وردی بخوێنمەوە، واتە کە یەکێکم دەبینی دەمزانی ئاخۆ خۆشحاڵە بەوەی لە نزیکەوە بیبینیت، بیناسیت یاخود نا. جەلادەتی کۆتر لەو کەسانە بوو کە لە یەکەم نیگاوە هەستتدەکرد مەخلوقێکە سەر بە دونیایەکی تر، شتێکی تێدایە لە ئێمەدا نییە. بێباکییەکی تێدایە لە توانای تێگەیشتنی ئێمە قووڵترە، بەلام لە یەکەم دەقیقەدا بۆ من زەحمەت بوو بزانم، ئاخۆ دەرهەق بەچی بێباکە؟ دەرهەق بە دونیا بێباکە یاخود بە ژیانی خۆی؟. ژوورێکی سەیری هەبوو، جگە لە قەرەوێڵەیەک و تەپڵەکێک و دوو کارتۆن و چوار مێخی گەورە هیچی تری تیا نەبوو، سەرەتا خۆی سەرنجی بۆ بزمارەکان ڕاکێشام و گووتی: برام بزمارەکانت لە بیر نەچێت، ئەوانە ڕۆژێک لە خوێنی مندا بوون.

وەک ئەوەبوو بزانێت من سەیری دارونەداری ئەو دەکەم. سەرەتا

تێنەگەیشتم مەبەستی چییە، بەڵام هەردوو دەستی کردەوەو بە ڕوونی شوێن مێخەکانم لەسەر دەستی بینی، دوو شوێن مێخی گەورە وەک ئەو شوێن مێخانەی دەکرا لەسەر دەستی مەسیح بماندیبایە، گەر لە خاچ دابەزیبایەو نەمردبایە. من وا چاوەڕوان بووم قاچیشیم نیشانبدات، بەڵام لەبری ئەوە قۆپچەی کراسەکەی کردەوەو جەستەیەکی پڕ زامی خستە بەر دەستم، سەر سینەو زگی هەمووی جێ برین بوون، بەڵام ئەوەی ترسناک بوو دوو برینەکەی دیکەی بوون لەسەر سنگی، وەک دەستێک ویستبێتی مێخێکی گەورە بە ناو دڵیدا بەرێت، یەکێک لەسەر هەردوو گۆی سینەی، لەملاولاوە دوو بزماری گەورەی چەقاندبوو و دوو جێگا برینی گەورەی جێهێشتبوو کە لە پشتیشەوە دوو دەلاقەی خوێنینیان دروستکردبوو. من بە حەپەسانەوە گووتم: کێ وای لێکردویت؟ چ کوڕی سەگێک وای لێکردویت؟ ئەمە چ ویژدانێکە؟. بە زەردەخەنەیەکەوە گووتی: گرنگ نییە کێ وای لێکردوم، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ هەیە وا لە مرۆڤ دەکات. ئەوە گرنگە... لەوە بترازێت هیچی تر گرنگ نییە. کەی گرنگە ئەوەی وای لێکردوم کوردە یان عەرەب، کۆمۆنیستە یان ئیسلام، دیموکراتە یان ناسیونالیست، عەشایەرە یان نوێخواز... ئەوە گرنگە دواجار مرۆڤێک هەیە وا لە مرۆڤ دەکات.

ئەو دوو برینە سەیرەی سەر دەستی، ئەو دوو مێخەی ڕۆژێک لە ڕۆژان لەسەر سنگی چەقێنرابوون وایکرد لەگەڵیدا بڕۆم، وایکرد ژیانی خۆم بۆ نوسینی ئەم کتێبە تێکبدەم، کتێبێک بە تەنیا کتێبی ئەو بێت. پیاوێکی ئەفسانەیی کە مێخەکانی سەر لەشی خۆی بە زێڕ زرکەفتکردبوو و لە ژوورەکەی خۆیدا پاڵتۆ و کاسکێتەکانی پیا هەڵدەواسین.

لە ساتی یەکەمەوە جیاوازییەکی گەورە لە نێوانماندا بوو، من دەمویست وەک شێت هەموو شتێک لەسەر ئەو بزانم، بەڵام ئەو دڵۆپ دڵۆپ حیکایەتەکەی خۆی ئاشکرادەکرد. ئێستا دەزانم چ خولیایەکی

گەورەی تێدابوو تا هەموومان چیرۆکەکەی ئەو بە ڕاستی بزانین، چەند بەلایەوە گرنگ بوو ژیانی خۆی لە نێوان هەندێک ڕستەی کورت و هەندێ نیگاری خێرادا کاڵ نەکاتەوە. من لە دوای یەکەمین سەعاتەوە ویستم ببم بە هاوڕێی، بەڵام ئەو بێباکانە گووتی: گەر توانیمان لە بەردەمی یەکدا بگرین ئەوا هاوڕێی یەکین، مرۆڤ تا لە بەردەمی یەکدا نەگری نابێت بە هاوڕێی یەک. قسەکانی وەک ئەوەبوو نەیەوێت من و ئەو ببین بە هاوڕێ، لایەنی کەم بەو مانایەی ئەو لە هاوڕێتی تێگەیشتووە. وەک بزانێت ئەو مرۆڤێکە پەڕیوەتەوە بۆ ئەوبەری فرمێسک و لە جێگایەکدا وەستاوە تا لە مانای ژیان و مردن ڕابمێنێت. دانیشتنی یەکەممان بۆ من سەخت بوو، چونکە لە زۆر شت تێنەگەیشتم. وەک ئەوە بوو بیەوێت پەیمانێک لەگەڵ مندا مۆربکات. هەندێجار وام هەستدەکرد بە میفیستۆفیلیسم تێدەگات لە چیرۆکی فاوستدا، بە جۆرێک لە جۆرەکان دەیگووت: من ڕۆحی خۆمت دەدەمێ و تۆ نەمریم پێدەبەخشیت. ئەو گێڕانەوەی حیکایەتەکەی خۆی بە جۆرێک لە فرۆشتنی ڕۆح دەزانی. بەڵام ئەوەی جەلادەتی کۆتری لە دکتۆر فاوەست جیادەکردەوە ئەوەبوو کە وشەی ڕۆح و وشەی نەمریش لای ئەو مانایەکی مەجازیان هەبوو. ڕای وابوو لەو ساتەوەی کە لە ژێر زەمینەکەی موسای بابەکدا تابلۆکانی بینیوە، چیتر ڕۆحی موڵکی خۆی نییە، چیتر ئەو حیکایەتەی دەبێت بیگێڕێتەوە بە تەنیا حیکایەتی خۆی نییە، نەک هەر ئەوە بەڵکو پێیوابوو کە ئەوەی لە ڕێگای جەلادەتی کۆترەوە دەژی و نەمر دەبێت، خودی جەلادەت خۆی نییە، هێندەی ئەو ڕوداو و کاراکتەرانەی ترن کە ئەو دەبێت بە دونیایان بناسێنێت. زۆرجار هەستمدەکرد ڕێزی گەورەی بۆ خۆی لەوەوە دێت کە ڕێزێکی قووڵی بۆ هەموو ئەو مرۆڤانە هەیە کە بە ژیانیدا تێپەڕیوون. بایەخی گەورەی بۆ چیرۆکەکەی خۆی لەوەدا دەبینییەوە کە تەنیا ڕێگای ناساندنی ئەو مرۆڤ و ڕۆژگارانەیە کە ئێمە نەمانبینیوون، بە جۆرێک لە جۆرەکان هەستیدەکرد هەموو ئەو سەردەمە

تەنیا بە ناو ژیانی ئەودا هاژەیکردوە، دڵنیابوو حیکایەتی ئەو شتێکە سەیرترە لە چیرۆکی سیاسییەکان و هونەرمەندەکان و مرۆڤە سادە و ساکارەکانی تر. لە ساتی یەکەمەوە من پێمگووت، نوسینی کتێبێک شتێکەو گێڕانەوەی یاداشت شتێکی ترە، من ئەگەرچی بەجۆرێک سەرسامی ئەو کوڕەبووبووم، ئامادەبووم واز لە زۆر شتی خۆم بهێنم بۆ ئەوەی تێبیگەم، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەستە سەیرە بە دووری و دابڕان، ئەو نیگایانەی کە پڕبوون لە جوانییەکی کوشندە، ئەو دڵنیابوونە قووڵەی دەرهەق بە سیحرو ئەفسونی خۆی وایدەکرد بە زەحمەت بتوانین لەیەکتر تێبگەین. من پێمگووت، ئاغای کوتر، من دەتوانم دواجار ڕۆمانێک بنوسم، من عەلی شەرەفیارم، کەسێکم بەهرەی چیرۆک نوسینم تێدایە، چیرۆکیش مانای ئەوەی بڕێک لە حەقیقەت دووربکەویتەوە.

بە غەمگینییەوە سەیریکردم و گووتی: یەکەمینجار ناوی تۆم لە زاری مۆسیقارێکی گەورەوە بیست، لە سەر زەمینێک کە تۆ نازانیت هەیە یاخود نییە، ئەو مۆسیقارە گەورەیە پێیوابوو من و تۆ دەبێت پێکەوە کتێبێک بنوسین، کتێبی حەقیقەتە گەورەکان، ئیدی تێناگەم تۆ چۆن دەتەوێت لە حەقیقەت دووربکەویتەوە.

من و ئەو گەلەک شەو ڕۆژمان بەیەکەوە بەسەربرد، بەڵام هەرگیز ئەو ژوورەم لە یاد نەچووەوە، ئەو نیگا سەرسامانەم لە یاد نەکرد، بۆنی ئەو ئوتێلەی کە پێدەچوو بەردێک بێت لە هەسارەیەکی سووتاوەوە کەوتبێتە خوارێ. یەکدی ناسینی من و ئەو وەک بەریەککەوتنی دوو مانگ بوو، دوو ئەستێرەی گەورە کە بە جۆرێک پارچەپارچە دەبن لە ئاسماندا کەس نازانێت کام پارچەیە لەکام مانگ بۆتەوە. ئەو ڕۆژەی کە ئەو باسی فرۆشتنی ڕۆحی خۆی دەکرد، من دەمزانی کە دواجار ئەوەی لە نێوان من و ئەودا ڕوودەدات، کڕین و فرۆشتنی ڕۆح نییە، هێندەی پارچە پارچەبوونی یادەوەری و ئارەزوو و زمانە، هێندەی تێکەڵبوونی

دوو تەقینەوەی ترسناکە، یەکێکیان لە ناو ژیانی ئەودا و ئەوی تریان لە ناو خەیاڵی مندا ڕوودەدات. من تێکەڵبوونی دوو جۆر لە وەرزم دەبینی، تەقینەوەی دوو فوارەی جیاوازم دەبینی لە ڕووی یەکدا، تێکەڵبوونی دوو شەوم دەبینی کە ئەستێرەکانیان دەگرنە یەک، تێکەڵبوونی دوو گەردەلوول کە هاژەیان لەسەر دەستی یەک دەپڕژێ. من ئەوکات تەنیا لەسەرەتای نهێنییەک ڕادەمام، ئەو نهێنییە بەس بوو کە بمبات و خۆم فەرامۆشبکەم. ئەو ڕۆژە بێئەوەی لە هیچ تێبگەم لەو ئوتێلە هەڵهاتم، چونکە نەمدەزانی دەبێت چی بکەم... دەمزانی ئەستەمە هیچ کەس ڕۆحێکی وا وێڵ و ناوازە بکات بە حیکایەت، ڕۆحی گەنجێک کە لە هەرێمێکەوە دەگەڕایەوە ئێمە هەرگیز پێی تێناخەین، دەرک بە بوونی ناکەین، لە نەبوونیشی دڵنیانابین.

ئەستەمە بتوانم چیرۆکی ئەو ڕۆژە بگێڕمەوە، هەڵبەت باس لەو بەشەی چیرۆکەکە دەکەم کە دەکەوێتە ئەودیوی زمانەوە، ئەو بەشەی هەستدەکەیت لێت ڕادەکات و نامومکینە تۆ بتوانیت بیگێڕیتەوە، باس لە گێڕانەوەی «یەکەم تێگەیشتن» ـم لە ژیانی یەکێک کە بە پێوەرە ئاساییەکانی من و تۆ ناپێورێت. من هەمان ئێوارە بە ڕەوشەنی سەقزی و هاوڕێکانیم گووت: نا هاوڕێیان بمبورن، من لەوە بێتواناترم چیرۆکی جۆرە مرۆڤێکی وەها بنوسم. ئەو خۆی لە یەکەم ساتەوە دەیزانی من وادەڵێم، لە یەکەم ساتەوە کە چوومە ژوورەکەی بە هێمنی پێیگووتم: تۆ دەبێت گومانت لەوە بێت بتوانیت چیرۆکی من بنوسیت. ئەو دەیزانی تەنیا خۆی دەتوانێت خۆی بنوسێتەوە. ڕای وابوو زۆربەی چیرۆکنوسەکان تەنیا دەتوانن درۆ بنوسنەوە، ڕای وابوو هەموو چیرۆکنوسەکانی مێژوو کۆبکەیتەوە بە هەموویان ناتوانن ژیانی مرۆڤێک بە ڕاستی وەک ئەوەی هەیە تۆماربکەن. بەڵام دەشیزانی هەر زیندەگییەک نەبێتە ئەدەب ناتوانێت نەمر بێت. جارێک بە زەردەخەنەوە پێیگووتم: نەمری هەموومان لەوەدایە یان ببینە مۆسیقا، یان ببینە شیعر. سەرەتا تێنەدەگەیشتم مەبەستی چییە،

بەلام دەمزانی خولیای گەورەی ئەو ئەوەیە مرۆڤ ببێت بە مۆسیقا، واتە وەک چۆن لە ناکاو خاکێکی وشک و برینگ دەبێتە لانکەی بەهارێکی سەوز، ئاوەها مرۆڤ لە هەموو لایەنە دونیاییەکانی ببێتەوەو ببێتە جوانییەکی جاویدان کە دەکەوێتە سەروو گومان و کاریگەری زەمەن و مردنەوە. من جارێک ڕاشکاوانە پێمگووت: جەلادەتی کۆتر، من نازانم تۆ کاتێک باس لەوە دەکەیت، مرۆڤ ببێتە مۆسیقا مەبەستت چییە؟ هەست ناکەیت ئەمە جگە لە یاریکردنێکی بێمانا بە وشە هیچی تر نییە؟. وەک ئەوەی زۆر ئازارم دابێت، بە نائومێدییەکی قووڵەوە سەیریکردم و گووتی: هەر وەختێک تۆ جوان بوویت و مردیت، کەواتە بوویت بە مۆسیقا. مۆسیقا ئەوەیە بە ناو ژیاندا سەفەربکەیت بێئەوەی هیچ تێکبشکێنیت. واتە ڕەشەبایەک بیت، نە بزانیت لە کوێوە هاتوویت و نە بزانیت بۆ کوێ دەڕۆیت... وەک مۆسیقا، کە هیچ کەس نازانێت لە کوێوە دێت و بۆ کوێ دەڕوات... تۆ پێمبڵێ عەلی شەرەفیار مۆسیقا لە کوێوە دێت؟ پێت وایە لە ڕۆحەوە دێت؟ بەلام ڕۆح لە کوێیە.. ها تۆ پێمبڵێ... کامەیە ڕۆح؟... ئەی لەم ئامێرە چکۆلانەی مۆسیقاوە دێت؟ ها گەر لەم ئامێرەوە دێت ئەی ئێمە ڕۆڵمان لەم گەمەیەدا چییە؟. بۆ مۆسیقارەکان نابن بە مۆسیقا، بۆ دوای ئاوازەکانیان نابنە دەزوویەک دوکەڵی سپی و بەرەو ئەستێرە دوورەکان بڕۆن؟... چی دەکەن لەسەر زەوی؟ بۆ مۆسیقا دەڕوات و مۆسیقارەکان سەر گەردان لەسەر زەوی دەمێننەوە؟ بۆ لە ناکاو ئەو سیحرە کپ دەبێت و ئێمە وەک کۆمەڵێک لاشەی بێهۆش و گێژ لەسەر زەوی دەمێنینەوە؟. ئەی بۆ ئێمە دەمرین و دەڕۆین و مۆسیقاکەمان جارێکی دی لە ڕێگای دەست و پەنجەی مۆسیقاری ترەوە دەگەڕێتەوە سەر زەوی؟ ئەو لە کوێیەو ئێمە لە کوێین؟ عەلی شەرەفیار، وەک تۆ و وشەکانت، تۆ لە کوێیت و وشەکانت لە کوێن، ها تا تۆ زیندوویت، ئەو ساتەی حەرف دەخەیتە سەر کاغەزو تەواو دەبیت هەستدەکەیت بوویت بە لاشەیەکی بەتاڵ، هەستدەکەیت

هەرچییەکت نوسیوە ڕستە بە ڕستە خیانەتە لە مانایەک کە هەرگیزاو هەرگیز نەتدرکاندووە. بەڵام تۆ دەڕۆیت و دەمریت و سەر لە نوێ وشەکانت دێنەوەو دوور لە تۆ دەژین، دەزانی مرۆڤ ببێتە مۆسیقا یانی چی، واتە مرۆڤ لەگەڵ ئەو حەقیقەتە نەمرەدا یەکبگرێتەوە کە قووڵ لە ناخی هەموو جوانییەکدا خەوتووە... قووڵ لەگەڵ هەموو هونەرێکدا دەژی. واتە من کە تۆ دەخوێنمەوە، تەنیا حەرفەکانت ناخوێنمەوە، تەنیا ئەو وشانە ناخوێنمەوە کە دوای خۆت بە جێیاندەهێڵیت، بەڵکو تۆ زیندوودەکەمەوە، تۆ کە بۆ هەمیشە دێیتە ناومەوەو ئیدی ناڕۆیت، تۆ کە ئیتر لە ڕێگای منەوە هەناسەدەدەیت، دێیتەوە و دەژیت، بە زەماندا سەفەردەکەیت، لە هەموو شوێنێک دەبیت و لە هیچ جێگایەکیش، لە مردندایت و لە زیندەگیشدا،ماڵت دەکەوێتە سەر تخوبێک کە هیچ یەک لە ژیان و مردن ناتوانن داگیربیکەن. ئاە عەلی شەرەفیار تۆ پێتوایە کە مۆسیقای نەمر ژیانە؟ بێگومان نا؟ هەموو کارێکی مەزن قاچێکی لە مەرگدایە، کاری مەزن ئەو کارە نییە کە دەژی و دەژی، بەڵکو کارێکە دەمرێت و زیندوو دەبێتەوە، دەمرێت و زیندوو دەبێتەوە، دەمرێت و زیندوودەبێتەوە. کاری مەزن شتێکە وەک مرۆڤ خۆی، نامەردەکان بەر تانەی دەدەن، کەسە خراپەکان بەر خەنجەری دەدەن، بێشەرەفەکان لە خاچی دەدەن. دەمرێت و جێماندەهێڵێت، دەڕوات، وندەبێت، دەفەوتێت، بەڵام لە ناکاو بە جۆرێک لە جۆرەکان لە جێگایەکی ترەوە دێتەوە، تا نەشمرێت نازانین کە بۆ هەتا هەتایە زیندووە. وەک مرۆڤی مەزن کە دەبێت بمرێت بۆ ئەوەی بزانین زیندووە. بەڵام مردنی مۆسیقا، مردنی جوانی وەک مردنی چۆلەکەیەک نییە کە یەکجار بەردەبێتەوەو دەکەوێتە خوارێ، وەک مردنی گیایەک نییە کە لە باغچەیەکدا پێی پیادەنێین و دەڕۆین. نا با پێتبڵێم، مردنی مۆسیقا ئەو کپییە لە ناکاو و بێفاسیلەیەیە کە پێویستمان پێیەتی بۆ ئەوەی بزانین لێرە نییە، بۆئەوەی گوێ لە دەنگی گەردون بگرین دوای بێدەنگی ئەو. گوێگرتن و بێدەنگی...

گوێگرتن و بێدەنگی وەک ژیان و مردن... ژیان و مردن. مرۆڤ ببێتە مۆسیقا مانای ئەوەی بڕوات لەو پەڕی مەرگەوە پەیامێک بهێنێت، وەک چۆن مۆسیقا دەڕوات لەو پەڕی بێدەنگییەوە پەیامێک دەهێنێت. ببێت بە مۆسیقا مانای ئەوەی لە نێوان ژیان و مردندا جۆلانێبکەیت، وەک چۆن مۆسیقا لە نێوان دەنگ و بێدەنگیدا جۆلانێدەکات. عەلی شەرەفیار گەر مرۆڤ بەردەوام قاچێکی لە مەرگدا نەبێت ناتوانێت بنوسێت، چونکە ئەوە بێدەنگی مردنە وا دەکات تۆ گوێت لە دەنگی خۆت بێت. هەموو داهێنەرێک کەسێکە لەو هەرێمەدا دەژی کە نە ژیانە و نە مەرگ...

دیارە دەزانم کە کارێکی سادە نییە مرۆڤ لە مانای تەواوی ئەو تێڕوانینانەی جەلادەت تێبگات، بەتایبەت هەستمدەکرد ئەو دوای سەفەرێکی درێژ لەنێوان ژیان و مردندا گەیشتۆتە ئەو بڕوایانە، لە دەنگی ئەودا سەدای دەنگی ئەو کەسانەم دەبیستەوە کە لای ئێمە مردبوون و بە جۆرێک لە جۆرەکان هێشتا ئەو پەیوەندی لەگەڵیاندا هەبوو.

سەفەری ڕاستەقینەی جەلادەتی کۆتر دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەک دوای گەڕانەوەی لە شاری تەپۆتۆزە زەردەکان. بۆ کاتێک لە وادەی خۆیدا ئێوەش خەبەری تەواوەتیتان لێیدەبێت. بەڵام ئێستا بۆ ئەوەی حیکایەتەکەمان لێتێکنەچێت، دەبێت بە خێرایی هەندێک شتتان بۆ باسبکەم. لە بەر ئەوە دەگەڕێمەوە ئەو جێگایەی کە جەلادەتی کۆتر و سامیری بابلیمان تیا جێهێشت، لە کوچەیەکی شاردا، لە شەوێکی تاریکدا کە باران دەباری، جەلادەت لە حاڵەتی خوماردا بوو، بەڵام پێش ئەوە بە سامیری بابلی گووتبوو: تۆ دیلی منیت. من دەبایە لەویادا بوەستابامەیە، چونکە ئەو ساتەی جەلادەتی کۆتر پێدەخاتەوە سەر زەوی و ناو زێدی باوپیرانی خۆی، دەکرێت مرۆڤ بە خاڵێکی وەرچەرخانی ببینێت، ئەوە ئەو ساتەیە کە جەلادەت بە شێوەیەکی ڕاستەقینە یاخود مەجازی دەتوانێت لەو دیلییە ڕزگاری ببێت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە سەر چەم و ڕووبارێکی

دوور تووشی هاتبوو، ئەو ساتە ساتی وەرگەڕانی شتێکی گەلەک قووڵ و ماناداره، من تەنیا وەک ئاوەژووبوونەوەی پەیوەندی نێوان جەلاد و قوربانی تەماشایناکەم، وەک ئەوەی جەلادەت ببێتە زیندانەوان و سامیری بابلی ببێتە زیندان، بەڵکو وەک دروستبوونی جۆره پەیوەستێکی دیکە لە نێوان جەلادەت و دونیادا دەیبینم. ئەو شەوه جەلادەت و سامیری بابلی هیچ جێگایەکیان نییە بۆی بچن، شار جۆره خامۆشییەکی ترسناکی تێدایە، هێزەکانی دەوڵەت بە ژماره کەمن و بە جۆرێکی زۆر شەرمن و ترسنۆکانە لە هەندێ شوێندا بڵاوبوونەتەوه. جەلادەت کە گەڕۆکێکی پیری ناو کوچەو بازاڕەکانی ئەو شارەیە دەزانێت چۆن جێگایەکی ئەمین بۆ خۆی بدۆزێتەوه، لە کوچە تەسک و باریکەکانی بازاڕەوه دەچێتەوه سەر شوێنی دوکانە دێرینەکەی باوکی و لە پشت ئەوەوه بە سەربانێکی کەمێک نزمدا بۆ ناو حەوشێکی فەرامۆشکراوو کۆن و لەوێشەوه بۆ سەردابێکی کۆنتر، کە هەندێک بازرگانی بازاڕ کەلوپەلی دێرین و شتی ستۆک و کالای بێکەڵکی تیا هەڵدەگرن. لە منداڵییەوه ئەو جێگایەی دەزانی، تا ڕادەیەکیش دڵنیابوو کە تێپەڕینی کات و بەسەرچوونی زەمەن هیچی لەو حەوشە فەرامۆشکراوو سەردابە دێرینە نەگۆڕیوه، کە ساڵانە تەنیا جارێک پاکدەکرێتەوەو کەلوپەلەکانی توڕدەدرێن تا شوێن بۆ کالای دیکە چۆڵبکەن. شەو لەوێ دەخەون و فایل و تابلۆو نەخشەکانیان دەشارنەوه. دواتر جەلادەت دەیگووت: یەکەمین شەوی نوستن لەو شارەدا، وەک خەوی ئاسمانگەڕێک وەهابوو کە لە ڕۆکێتێکی بچوکدا لەدەرەوەی هێزی کێشکردنی زەوی بە هەواوه دەخەوێت. ڕۆژانی دواتر شتی ئەوتۆ گرنگ ڕوونادات، شار نیمچە خاڵییە، خەڵکانێکی کەم تیادەژین، کە حیکایەتی دەست پێکردنی پرۆسێسی «چەکوشی ئامادە» لە باکوور دەست پێدەکات، جەلادەت و سامیر بەپێ ڕووەدەکەنە دەرەوەی شار، لەگەڵ کۆمەڵێک ماڵە ئاوارەدا تێکەڵدەبن کە لە نزیک مەرزەکان لە مەزرایەکی گەورەدا چادریان

هەڵداوە، لە یەکێک لەو ڕێکخراوانەی کە هاتوون کۆمەک بە خەڵکی ڕاکردوو و ئاوارە بکەن چادرێک وەردەگرن و تێیدا دەخەون. ئاشکرا نییە چەند ڕۆژ لەو چادرەدا دەمیننەوە، لەو ساتەوەی دەگەڕێنەوە ئیدی جەلادەت ڕۆژەکان حیساب ناکات، مانگەکان و ساڵەکان بەوردی حیساب ناکات، بە جۆرێک ئەوکاتەی کە من بینیم نەیدەزانی تەمەنی چەندە، نەیدەزانی ئەو فاسیلەیەی ڕوداوەکان لە یەکدی جیادەکاتەوە چەندە، درەنگ و زووی کاتی بۆ گرنگ نەبوو، لە ڕاستیدا من وەک یەکێک هاتە بەرچاوم کە نازانێت کات چییە. تەنیا شتێک لەسەر کات دەیزانی گۆڕانی شەوو ڕۆژ بوو، لەوە بترازێت لەدەرەوەی زەمان دەژیا. پێدەچێت ئەو ڕۆژانەی کە لەگەڵ ئاوارەکاندا لەو ژێر دەوارو چادرە سەوزانەدا بردویێتییە سەر، کردبێتی بە ئاوارەیەکی جاوید، ئاوارەیەک بە پێچەوانەی هەموو ئاوارەکانی ترەوە چیتر خۆی وەک قوربانی سیاسەت و جەنگ تەماشانەدەکرد، بەڵکو وەک یەکێک سەیری خۆی دەکرد لە زەوی، لە باغەکان، لە جۆیبارەکان، لە شارەکان و شوێنەکان ئاوارە بێت. من پێموایە ئەو ماوە درێژە لە بێدەنگی و بێئیشی و تێڕامان و خەون، زۆر شتی تیا گۆڕیبوو کە خۆی نەیدەبینی.

ئەو هەستی ئاوارەبوونە لای ئەو شتێکی تازەبوو، کاتێک لەگەڵ سامیری بابلیدا بەرەو دەرەوەی شار ڕۆیشتن دەیانزانی ئەوان زۆر لە دوای ئەو ڕەوە گەورەیەوەن کە پتر لە چەند هەفتەبوو دونیای دەهەژاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی تایبەتی پاڵی پێوەدەنا ببێت بە ئاوارە، شتێک من ناوی دەنێم ئارەزووی جەلادەتی کۆتر بۆ جیابوونەوە لە دونیا، من پێموایە جەلادەتی کۆتر دواتر هەرگیز لەو ساتەوەختە دەرناچێت، لەو هەستە ڕزگاری نابێت کە ئەو ئاوارەیە. سەردەمانێکیش کە ئاوارەیی نامێنێت، کاتێک دەتوانێت وەک گەنجێک بژی و سەروەت و سامانێک بۆ خۆی پێکەوەبنێت، ئەو هەردەم وەک ئاوارەیەک دەژی. ئەو ڕۆژەی من لە ناو ئەو ئوتێلە ڕەشەدا بینیمەوە، هەستمکرد ئاوارەیی قووڵاییەکی شاعیریانەی

بۆ دروستکردوە، ئاوارەیی لای ئەو وەک تراژیدیا نەکەوتبووەوە بەڵکو جۆرێک بوو لە بە ختەوەری، لە خۆشحاڵی، لە یاریکردنێکی قووڵ و مانادار لەگەڵ هەموو شتەکاندا. جۆرێک لە تەبایی نێوان ڕۆح و زیندەگی، نێوان هەستە ناوەکییەکان و واقیعی دەرەوە. ڕۆژێک پێیگووتم: عەلی شەرەفیار، تەنیا ئاوارەکان لە ژیان تێدەگەن. من ئەوەم پێ ئاسایی بوو، بەلام کە گووتی: تەنیا ئاوارەکانیش لەگەڵ جیهاندا تەبان. کەمێک وەستام و سەیرمکردو پێمگووت: جەلادەتی کۆتر تێناگەم دەڵێیت چی؟ چۆن ئاوارەکان لەگەڵ جیهاندا تەبان؟ ئاوارەیی خۆی ناتەباییە. بەو چاوە سەیرانەیەوە کە بە شێوەیەکی سەیر دەکرانەوە لێی پرسیم: تۆ هەرگیز زنجیری هیچ مەخلوقێکت شکاندووە؟ من گووتم: نا عەزیزم، من زنجیری هیچ مەخلوقێکم نەشکاندووە. بە ئەسپایی گووتی: عەلی شەرەفیار، من زنجیری زۆر کەسم شکاندووە، هەتا زنجیرەکانی ناو ڕۆحی خۆشم هەر خۆم شکاندوومن. ئاوارەبوون ئەوەیە مرۆڤ زنجیری خۆی بشکێنێت و بڕوات. ئەی ئەوە ڕۆحی ئێمە نییە لە ژیان ئاوارە دەبێت و دەمرێت، ئەی ئەوە ڕۆحی ئێمە نییە لە عەدەم ئاوارەدەبێت و لەدایکدەبێتەوە، ئەی ئەوە ڕۆحی ئێمە نییە لە یەکتر دەترازێت و دەڕوات و یەکناگرێتەوە. گەردون چییە جگە لە یەکنەگرتنەوەیەکی مەزن... یەکنەگرتنەوەی ئەستێرەکان و هەسارە دوورەکان لە یەکتر، یەکنەگرتنەوەی وەرزەکان، لەیەکترازانی ئەبەدی نێوان مرۆڤ و خودا، یەکنەگرتنەوەی ڕۆح لەگەڵ یەکدا هەتا لە دوا پلەکانی عەشقیشدا. گەردون هیچ نییە جگە لە جیابوونەوەو ونبوونێکی بەردەوام، دواجار تەنیا کاتێک ئاوارەیی نامێنێت، کە هەموومان بچینە یەک ماڵەوە کە ماڵی هەموومان بێت، ها پێناسەی ئاوارەیی چییە؟ ئاوارەیی دەربەدەربوون نییە لە ماڵ؟... تۆ ناڵێیت ئاوارەیی دەربەدەربوونە لە ماڵ... بەلام پێمبڵێ، گەر ئەو ماڵە نەبوو تۆ چیدەکەیت، گەر جیهان ئەو ماڵەی تیانەبوو... ها... بۆ وەلامم نادەیتەوە؟ ئاغای شەرەفیار وەلامەکەی زۆر

سادەو ئاسانە ئەوسا تۆ دەبێت بە یەکێک کە هەمیشە بۆ ماڵ دەگەڕێت، دەبێتە ڕۆحێک کە لە فەنتازیاکردنی بەردەوامی ماڵدایە... دەبێتە یەکێک ڕوودەکاتە هەر جێگایەک دەڵێت ئەمە ماڵی منە، بەڵام دواتر دەردەکەوێت کە ئەوە ماڵی ئەو نییە... دەڕوات شتێکی دیکە هەڵدەگرێت و دەڵێت ئێرە ماڵی منە، بەڵام ئەوێش هەر ماڵی ئەو نییە... دەگەڕێت و دەگەڕێت و ماڵی ڕاستەقینە نادۆزێتەوە، ڕۆژێک دەگاتە ئەو بڕوایەی کە دواهەمین ماڵ و ڕاستەقینەترین ماڵ لەوانەیە تەنیا مردن بێت. بەڵام مردن کاتێک دەبێتە ماڵ کە دەروازەیەکی هەبێت لێوەی سەیری دواوە بکەین، چونکە جێگایەک کە دەرگاو پەنجەرەی نەبوو، دۆزەخە نەوەک ماڵ. دەبێت پەنجەرەیەک هەبێت لەوێوە گوێمان لەسەدای دەنگی خۆمان بێت لەسەر زەوی. زۆربەمان نازانین لەودیو مەرگەوە چی ڕوودەدات، بەڵام دەزانین مردووەکان چاوەڕوانی چین. دەزانین مردووەکان پەنجەرەیەکیان هەیە لەوێوە سەیری ئێمە دەکەن. مرۆڤ شەیدای ئەوەیە دەنگی خۆی ببیستێتەوە... ئاوارەیی ڕاستەقینە هاوارێکی دوورو درێژە لە پێدەشتێکی بێبڕانەوەدا، کە سەداکەی هەرێم بە هەرێم دەڕوات و دەگەڕێتەوە. شکاندنی ئەو زنجیرە ئەستوورەیە کە لە نێوان من و زەماندا هەیە. گەر ئەو زنجیرە نەشکێت مرۆڤ نەمر نابێت... ئاوارەیی مانای نەمری، واتە جێنەمان لە زەمەن، نەچەقین لە جوغزێکی مێژوودا، نوقمنەبوون لە یەک شوێندا، نەخنکان لەیەک گۆمدا، ڕوونەکردن لە هیچ دارستانێک کە درەختەکانی بە درەختەکانی تری دونیاوە نەبەستراون. ئاوارەیی هیچ شتێک نییە جگە لە جوڵەیەکی ناکۆتا بە هەموولایەکدا، جگە لەوەی زەمین و زەمانەکانی تر تۆ ببینن و بتبیستن، عەلی شەرەفیار پێمبڵێ مۆسیقای یەکێکی وەک مۆزارت، چییە جگە لە ئاوارەییەکی گەورە لە نێو زەماندا؟ هیچ نیشتیمانێک نیشتیمانی ئەو نییە، هیچ زەمانێک زەمانی ئەو نییە، هەمووان دەیبیستن و هەستی پێدەکەین... دێت و لە ئێمەوە دەڕوات بۆ ڕۆژگارێکی تر... ئاوارەیی نەمرییە، جیهانیش

نەمرە، نەمرە لەوەدا کە سەر بە هیچ زەمانێک نییە، سەر بە هیچ جێگایەک نییە...

ئەو کاتەی کە من ناسیم تێگەیشتنی قووڵ و فەلسەفیانەی بۆ ژیان لە ترۆپکی پێگەیشتن و کامڵ بووندا بوو، خۆی وەک ئاوارەیەکی جاویدان تەماشادەکرد. نازانم ئەو ڕۆژگارانەی لەو چادرە قوڕاوییەدا لە ژێر بارانی بەهارێکی بێڕەحمدا دەژیا، هەمان تەفسیری فەلسەفیانەی بۆ ئاوارەیی هەبوو یاخود نا؟ ڕۆژانێک زۆربەی وەخت لە ناو ئەو چادرەدا، لە سەر دۆشەکێک پاڵدەکەوت و بیری لە ڕابوردووی خۆی دەکردەوە، ئەو ڕۆژانە بەردەوام لەگەڵ سامیری بابلیدا قسەیاندەکرد، باسی ماناکانی گوناه و لێبوردن، باسکردنی بەرپرسیارێتی مرۆڤ لە تاوانەکانی خۆی لە دوای پەشیمانی. باوەڕناکەم ئەو سەردەمە جەلادەت بیرێکی قووڵی لە مۆسیقا کردبێتەوە، بەڵکو زیاتر خەیاڵی لەسەر تێڕامان بووە لە مانای ئاوارەیی. پێموایە لەو قۆناغەدا بە تەواوەتی وەک ئاوارەیەک دەرک بە خۆی دەکات. گەڕانەوەی بۆ کوردستان و دەست پێکردنەوەی بە ژیان لە ناو کۆمەڵێک چادردا ئەو هەستەی تیا دروستدەکات کە ئەو سەر بە هیچ جێگایەک نییە، پێناچێت لەو ماوەیەدا هەوڵیدابێت هیچ جۆرە هاوڕێتییەک دروستبکات. بەدرێژایی ڕۆژ لە ژێر چادرێکدا دەژی، کەم دێتەدەرێ، ئێواران درەنگ خۆی و ئەو هاوڕێ عەرەبە تەلیسماوییەی ئاگرێک لە بەردەم چادرەکەدا دەکەنەوەو خواردن ئامادەدەکەن، گەر خۆشبێت سەیری ئەستێرە دەکەن، گەر ناخۆشیش بێت دەچنەوە ژێر چادرەکەو بە بەتانییەکانیان خۆیان دادەپۆشن و گوێ لە ئیقاعی باران دەگرن. لەو کاتەوە ڕیش دەهێڵێتەوە، بە خۆی و پاڵتۆیەکی درێژ و شەرواڵێکی کورتەوە کە لە شار لە کۆنەفرۆشێکی کڕیوە ئێواران بە تەنیا بەناو چادرەکاندا پیاسەدەکات، خۆی وەک مۆسیقارێک بە خەڵک دەناسێنێت، وەک هەمیشە زمانێکی شیرینی لەگەڵ مرۆڤە سادەکاندا هەیە، دوای ساڵەهای ساڵ لە نزیکەوە منداڵان دەبینێتەوە، دەبێت بیرتانبێت کە

شاری تەپوتۆزە زەردەکان منداڵی تێدانەبوو، جەلادەت ئەو چەند ساڵە منداڵی نەبینیبوو، لە دوا ڕۆژی خاپووربوونی شاری تەپوتۆزە زەردەکاندا منداڵی ئاوارەو کوژراوی بینیبوو، منداڵی بینیبوو ئازارو ژانی دونیای گەورەکان دەچێژن، سزای گوناهێک دەدەنەوە کە نازانن چییە. بەڵام بۆ یەکەمجار لە ناو ئەو چادرانەدا دەبێتەوە بە دۆست و هاوڕێی ئەو منداڵە بچوکانەی کە بەردەوام لە قوڕو لیتەکاندا یاریدەکەن، دەبێتە هاوڕێی ئەو خێزانە ئاوارانەی بە خۆشحاڵییەوە ئامێزی بۆ دەکەنەوە. بەڵام ئەو لە هەر شت زیاتر کەسێکی گەڕۆکە، هەندێک شەو سامیری بابلی جێدەهێڵێت و بە ناو تاریکیدا دەڕوات، خۆشی نازانێت بۆ کوێ دەچێت، هەمیشە دەڕوات، دەچێتە سەر ترۆپکە بەرزەکان، بە ناو پێدەشتەکاندا تێدەپەڕێت، لەوێکانەدا مۆسیقا ئەفسوناوییەکەی ئیسحاقی لێوزێڕینی دێتەوە یاد، گوێی لە هاوارێکی نادیار دەبێت لە تاریکیدا بانگیدەکات، گوچانێک دەتاشێت و بەسەر چیا سەختەکاندا سەردەکەوێت، لە ناو ئەشکەوتەکاندا تونێلی دوورو درێژ دەدۆزێتەوە، بۆیەکەمجار لەسەر یەکێک لە لوتکە سەختەکانەوە، ئەو باڵندە سپییە سەیرانە دەبینێت کە لەسەر سەری دەسوڕێنەوە، باڵندەی نەناسراوو نەبینراو کە تێکەڵەیەکن لە کۆترو مورغێکی خورافی دیکە، سەریان سەری کۆترەو باڵە گەورەکەیان لە باڵی سیمورغێک دەچێت کە خۆرەتاو پەڕەکانی بە تیشک داگیرساندبێت. لەشێکیان هەیە وەک بەفر و دەنگێکیان هەیە وەک دەنگی بولبولێک لە سپێدەدا.

جەلادەت بە جۆرێک لە جۆرەکان هەستدەکات ئەوە سەرەتای دەرکەوتنی کۆمەڵێک نیشانەی سەیری دیکەیە کە ڕۆژ دوای ڕۆژ کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی نامەیەکی تایبەتی بۆ جەلادەت بگوازنەوە. لەو شەوانەدا جەلادەت بەردەوام کۆمەڵێک تەیری سپی دەبینێت کە نە لە ڕاستی دەچن و نە خەیاڵیشن، ئەو باڵندە سەیرانە بەردەوام لەسەر چادرەکەی دەنیشنەوە، کۆمەڵە باڵدارێکی سەیرن لە ناکاو وندەبن و لە ناکاو دەگەڕێنەوە، دەرکەوتن و

ونبوونیشیان وەک دواتر دەردەکەوێت پەیوەندی بە شفرەیەکی نهێنییەوە هەیە کە جەلادەت بە نیشتیمانێکی دوورو نادیارەوە گرێدەدات. پێدەچێت جەلادەت سەرەتا لەو باڵندانە ترسا بێت، هەر کاتێک لە سەر ترۆپکەکان دەیانبینێت گۆچلنەکەی هەڵدەگرێت و دێتەوە خوارێ، هەرکاتێک لە ناو پێدەشتەکاندا دەیانبینێت بە خێرایی دەگەڕێتەوە بۆ ژێر چادرەکەی خۆی، کە باڵندەکان دادەبەزن و لەسەر چادرەکەی دەنیشنەوە دەچێتە ژێر بەتانییەکەیەوە، بەلام کە لە ناکاو وندەبن دووبارە لە جێگاکەی خۆی دێتەدەرێ و بەدوایاندا دەگەڕێت. ماوەیەکی درێژ ناتوانێت تێبگات ئاخۆ ئەو باڵدارانە مورغی ئەفسانەیین و لە خەیاڵی ئەودا زیندووبوونەتەوە یاخود باڵداری ڕاستەقینەن و تیشکێکی کێوی لە نیگای ئەودا بەرەو خۆی ڕایاندەکێشێت. سامیری بابلی کە ناتوانێت ئەو باڵدارانە ببینێت، پێیدەڵێت: ئەوانە سەرەتای شێتبوونی تۆن. گەر بزانین شێتبوون لای سامیری بابلی سەرەتای گەڕانەوەی ڕاستەقینەی مرۆڤە بۆ عەقڵ، سەرەتای هوشیاری مرۆڤە بە مانای ڕاستەقینەی ژیان. تێدەگەین کە سامیر ئاگاداری ئەوەیە جەلادەتی کۆتر لەسەر ڕێگایەکی گەورەی خۆدۆزینەوەدایە.

دەبێت ئاگاداری ئەوەبین جەلادەت لە شاری سۆزانییە زەردەکاندا کەسێکە لە چاوەڕوانی مەرگ یان ڕزگاربووندا دەژی، مرۆڤیش لە دۆخی چاوەڕوانیدا مرۆڤێکی ڕاستەقینە نییە، مرۆڤ لە کاتی چاوەڕوانیدا لە منداڵێک دەچێت هێشتا لە دایک نەبووبێت. هیچ شتێک وەک چاوەڕوانی ماهییەتی مرۆڤ زەوتناکات، چاوەڕوانی مانای ئەوەی هێشتا ئەو هەلومەرجانە لەدایک نەبوون کە مرۆڤ تێیدا جەوهەری خۆی ئاشکرابکات، هێشتا مرۆڤ ناتوانێت بڕیار لەسەر بڕیارە گەورەکانی خۆی بدات. جەلادەت لەناو ئاوارەکاندا تێدەگات کە ئەو ناتوانێت تا مردن لە چاوەڕوانیدا دانیشێت، دیارە زەحمەتە بۆ مرۆڤێکی بێپشت و پەنای وەک ئەو لە سفرەوە دەست پێبکات. ڕاستە ئەو شارە شاری خۆیەتی، ئەو نیشتیمانە نیشتیمانی

خۆیەتی، مرۆڤەکان هەمان زمانی ئەو قسەدەکەن، بەڵام لەوێ جگە لەو منداڵانەی لە قوڕوچڵپاودا یاریدەکەن دڵی بە هیچ شتێکی دی خۆش نییە، ئەوێ کچێکی وەک دالیا سیراجەدینی لێ نییە، دکتۆرێکی وەک موسای بابەکی لێ نییە کۆمەکی پێبکەن و ڕێگای نیشانبدەن. ڕۆژێک مەفرەزەیەکی پزیشکان ڕوو لە چادرگەکەی ئەوان دەکەن، لە ژێر درەختێکدا چادرێک هەڵدەدەن و دەکەونە پێشوازی نەخۆشەکان. جەلادەتی کۆتر کە هەمیشە وێنەی دکتۆر موسای بابەکی لە خەیاڵدایە، بە یادی ئەوەوە دەچێت بۆ بینینی ئەو پزیشکانەی کە پێیوایە لەوانەیە سێبەرێک لە سێبەرەکانی ڕۆحی موسای بابەکیان لابدۆزێتەوە، بەڵام لە بری دۆزینەوەی مرۆڤێکی وەک موسای بابەک، هەندێک گەنجی لە خۆبایی دەبینێتەوە کە لە ژێر لێویانەوە بە لووتێکی منگن لێی دەپرسن: ها... کاکە چیت دەوێت؟. لەو دکتۆرانەبوون لە بری ئەوەی مرۆڤ چاکبکەنەوە، هەر بینینیان مرۆڤی نەخۆش دەخست. جەلادەت پاشەوپاش لە ژێر ئەو چادرە دێتەدەرێ و تێدەگات هەندێجار ئەو بێحورمەتییەی پیاوە بەڕێزەکانی نیشتیمان بە مرۆڤی دەکەن، کەمتر نییە لەو بێحورمەتییەی جەلادەکان لە غەریبیدا پێتدەکەن. ئەو ماوە کورتە بەسبوو تێبگات سەختترین جۆری ئاوارەیی نییە لە نیشتیمان، بەڵکو ئاوەرەییە لە مرۆڤەکانی دی.

ئەو ماوەیە سامیری بابلی بەدەگمەن لە ژێر چادرەکەی دەهاتەدەرێ، بە جۆرێکی سەیر خۆی لە هەموو کەس دووردەخستەوە، بۆن پرتەقاڵی جەستەی دەماردەمار بە هەموو لایەکدا دەڕۆیشت. سامیری بابلی لەو ئۆردوگایەدا بەشی زۆری کات لە ڕادیۆیەکی چکۆلانەوە گوێی لە گۆرانییە درێژەکانی کەلسوم دەگرت و دەگریا، گوێی لە دەنگ و باس دەگرت و دەگریا، گوێی لە باران و ڕەشەبا دەگرت و دەگریا. تەنیا بە شەو دەهاتەدەرێ، هەندێک ئێوارێ لە بەردەم چادرەکەدا سەیری هەورەکانی دەکرد و خۆی بە ئامادەکردنی خواردنەوە سەرقاڵدەکرد، وەک دیلێک

ڕەفتاریدەکرد. ئەو پەیمانێکی ڕاستەقینەی لەگەڵ جەلادەتدا هەبوو، بە جۆرێک مامەڵەی لەگەڵ ئەو کوڕەدا دەکرد وەک ئەوەی مان و نەمانی، ژیان و پاکبوونەوەی بەدەست جەلادەت بێت. دیلێتی سامیری بابلی پتر لە پەیمانێکی ڕۆحی دەچوو، نەوەک جورێک لە سزای جەستەیی. جۆرێک بوو لە ڕێکەوتنی موقەدەس، ئەو دیل بوو، بەلام بەپێی هیچ قانونێکی نوسراو نا، بەڵکو بەپێی پەیمانی نێوان دوو ڕوح کە ڕێکەوتوون یەکێکیان لەلای ئەوی دیان ئەسیر بێت.

لێرەدا دەبێت ئێستێک بکەین و بلێین: سامیری بابلی کەسێکە بۆ پاکبوونەوە دەگەڕێت، بەلام پرسیارەکە ئەوەیە کێ دەتوانێت لە کەسانی وەک سامیری بابلی ببورێت؟ کێ دەتوانێت پاکی ببەخشێت بە ڕۆحێکی پەشیمان کە قووڵ لە خوێن و بەدکاریدا ڕۆچووە؟ ئاخۆ پەشیمانی بەسە، بۆئەوەی مرۆڤ پاکبێتەوە؟ ئایا دیلی بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ پاکبێتەوە؟ ئایا مردن یاخود سزا بەسە، بۆئەوەی لە جەلادەوە ببینەوە بە قوربانی؟

دەبێت بڵێم کە ئەم پرسیارە سەختانە شوێنی قسەو دیالۆگی دوورو درێژی نێوان سامیری دیل و جەلادەتی زیندانەوان بوون. لافاوی ئەو پرسیارانە شەوێک دەستی پێکرد کە سامیری بابلی بە جەلادەتی گووت: ئەی منداڵی نەجیب، من دیلی تۆم، قەدەری من ئێستا بەدەست تۆیە. تۆ زیندانەوانیت و من ئەسیر. هەرچییەک بکەین و هەرچییەک بلێین هەمیشە زیندانەوانەکانن چارەنوسی ئەسیرەکان دیاریدەکەن، نەوەک بە پێچەوانەوە.

جەلادەت ئەو شەوە «کە شەوێکی فێنکی بەهار بوو» دەیگووت: سامیری بابلی، ئەی نەقیبی جەهەنەمی، ئەی ئەفسەری ئەهریمەنەکان، ڕاستە تۆ ئەسیری منیت، بەلام من دواجار خاوەنی چارەنوسی خۆم نیم... تا ئێستا تۆ و جەنگەکانی تۆ، ئێوەو شەڕە دزێوەکانتان من دەبات بەڕێوە. تا ئێستا لە قوولایدا هەر من دیلی ئێوەم، من کۆیلەی ڕۆژگارە دزێوەکانی ئێوەم... وانییە جەنابی نەقیب... وانییە؟

سامیری بابلی، کە چا خۆرێکی سەیربوو، وەک یەکێک بزانێت چەلادەت لەسەر هەقە، سەیری ئەستێرە دوورەکانی دەکردو چا لەسەر چا دەیخواردەوەو دەیگووت: ئەی مندالّی نەجیب، جارێک لە جارەکان لە پێشی پێشەوەی شەڕبووین، من لە ژێر فەرماندەیی عەقیدێکدا بووم کە خەیالّێکی هێند شەرانی هەبوو دەیتوانی ببێت بە مامۆستای شەیتان، ناوی عەقید علوان عریبی بوو، بە تەمەن لە من گەنجتر بوو، بەلام بە هۆی ئەوەی لە هەر درندەیەکی تری سەر ئەم ئەستێرەیە دڕندەتر بوو، بە خێراییەکی سەیر بە پلەوپایەکانی سوپادا سەردەکەوت. ڕۆژێکیان چاوەڕوانی هێرشی ئێرانییەکانمان دەکرد، هێزی ئێمە کەمتربوو لە هێزی ئەوان، چەند ڕۆژبوو لە هەموو بالەکانی شەڕەوە فشاریان دەهێنا، دروست نەماندەزانی هێرشە گەورەکەیان لە چ قولیکەوەیە. ئەو ڕۆژەی کە ئەو ئەفسەرە ئێرانییەمان گرت، عەقید عەلوان یەکەمین جار بی هیچ قسەوباسێک ئاگرێکی خۆشکردو زەکەری بەو کابرایە دەرهێناو بەزۆر پێیخستە ناو مەقەلّی پشکۆکە، من زەکەری ئەو پیاوەم بینی دەسووتێت، بەلام هیچی نەگووت، ئازارێکی گەورە لە دەموچاویدا بوو، عارەق لە هەموو دەمارەکانی دەهاتە دەرێ و هیچی نەدرکاند. عەقید عەلوان خۆی پەیتاپەیتا لە ئاگردانێکی چکۆلانەوە پشکۆی دەگەشانەوەو بە منی دەگووت بە مەقاش پشکۆکان وردبکەم. دوای ئەوەی کە زەکەری ئەو ئێرانییە بووە زوخالّ، ئینجا بە چوارکەس ئەو پیاوە بێ زەکەرەمان بە دەمدا پالّخست، وەک یەکێک چوارمێخەی بکەن دەست و قاچمان بەستەوە، بە جۆرێک گەر لە ئاسمانەوەڕا تەماشای ئەو پیاوەت بکردایە وەک زەربێکی چکۆلانە لەسەر زەوی دەتبینی. منَ دەبایە بۆرییەکی باریکی بەلۆعە لە کۆمەوە ڕا ببەمە ژورێ، بۆرییەکی تازە دایسکراو، من دەبایە بە ڕەحەتییەکی ئاسن ئەو پشکۆ وردە بکەمە ناو کۆمییەوە، دەبایە تۆزێک پشکۆ بکەمە کۆمییەوەو چەند دلّۆپ بانزینێکیش بە دوایدا، تۆزێکی تر پشکۆ ڕۆکەم و تۆزێکی دیکە بانزین، هەرجارەش تۆزێک زیاتر پالّ

بەو بۆریە دایسکراوەوە بنێم. دروست نازانم ئەو پیاوە کەی مرد، بەلام کاتێک مرد دوکەڵ لە گەروو و گوێچکەکانییەوە دەهاتەدەرێ. ئەی مندالی نەجیب، من سالانێک دواتر کە وردە وردە ئەو هەستەم تیا دروستبوو کە ئەو دڕندەیەی ناو خۆم لەو مرۆڤەی ناوم جیابکەمەوە. شەوانێک لە خۆمم دەپرسی ئاخۆ ئێمە هەموو ئەسیری هێزێکی لە خۆمان گەورەتر نین، هێزێکی شەڕانی کە لە بناغەی دروستبوونی گەردوندایە، هێزێک بێئەوەی بزانین دەمانجوڵێنێت، هەموومان دەخاتە ناو چنگی خۆیەوە، دەیسەپێنێ بەسەرماندا چی بکەین و چی نەکەین. جەلادەتی کۆتر من هەمیشە کە بیردەکەمەوە وا هەستدەکەم ئەوە من نەبووم، من نەبووم کە ئەو گوناهانەم کردوە، من نەبووم وردە پشکۆم کردۆتە قوونی دیلێکی بەستەزمانەوە کە هەرگیز پێشتر نەمبینیوە، بەڵکو شتێکی ترسناکترو گەورەترو گەردونی تر لە من و لە هەموو ئەفسەرەکان ئەو گوناهانەی کردوە... تۆ ئەسیری من نیت جەلادەت، تۆ ئەسیری ئەو هێزە گەورەیەیت. ئەسیری شتێکی لە بناغەی گەردوندایە... شتێک دەتوانێت هەموومان بکاتە جەلادی ئەوی دیکەمان... هیچ یەکێکمان ناتوانین لێی دەربازبین، وەک چۆن کۆمەڵێک بەرد لەسەر داشماڵێکی شەترەنج ناتوانن هیچی دیکە بکەن جگە لەو شتانەی کە یاساکانی سەر ئەو داشماڵە دیاریدەکات.

جەلادەتی کۆتر دەیگووت: جەنابی نەقیب، با هەستین... با هەستین و کەمێک پیاسەبکەین... ئەمشەو پڕە لە ئەستێرە، وەرە و با بۆنی ئەو پرتەقاڵە سیحراوییەی تۆ زەوی پڕبکات. لێرەدا، لە بن ئەم چیایەدا پیاوانی سەرۆک چیتر دەستیان ناگاتە تۆ؟ جەنابی نەقیب، منیش مۆسیقارێکی گەرۆک بووم، من باوەڕم وەک تۆ نییە، دەشێت لە بناغەی گەردوندا ناشیرینی هەبێت، دەشێت سروشت پڕبێت لە خراپە، بەلام خراپەی مرۆڤ بەرامبەر مرۆڤ لەو خراپەیە ناچێت کە سروشت لە مرۆڤدا چاندویێتی، بابڕۆین جەنابی نەقیب بابڕۆین و بە سروشتدا پیاسەبکەین... گەر پەلەنەکەین،

مـرۆڤ دەبینیـن درەخـت دەسـووتێنێت، مـرۆڤ دەبینیـن باڵنـدە ڕاودەکات و دەیخـوات، مـرۆڤ دەبینیـن دەوروبـەری خـۆی ویرانـدەکات. جەنابـی نەقیـب ئـەو خراپەیـەی لـە بناغـەی گەردونـدا هەیـە خراپەیەکـە مـرۆڤ والیـدەکات باڵنـدەکان بکوژێـت و بیانخـوات، بـەڵام ئـەو خراپەیـە واتلێنـاکات بـۆری دایسـکراو بـە قوونـی ئادەمیزادەکانـدا ڕانێیـت. ئـەو خراپەیـەی لـە ڕەشـەباو لافـاو گەردەلوولـدا هەیـە، شـتێکی دیکەیـە، هیچـی لـەو خراپەیـە ناچێـت کـە دەبێتـە مایـەی ئـەوەی زەکـەری ئینسـان بـە زیندوویـی بسـوتێنیت. ئینسـان ناتوانێـت زەوی سـزا بـدات، دەشـێت زەوی و ئاسـمان و دەریـا گەمژەیـی خۆیـان هەبێـت، بـەڵام ئەمانـە مرۆڤیـان لـە باوەشـگرتووە، ئەمانـە ئێمەیـان گەورەکردوە... بـەڵام کـە تـۆ بـۆری لـە قوونـی مـن ڕادەنێیت، جەنابـی نەقیـب ناچارمدەکەیـت، منیـش بیـر لـەوە بکەمـەوە کـە بـۆری لـە قوونـی تـۆ ڕانێـم. مـن و تـۆ دوو داشـی شـەترەنج نیـن کـە مەحکـوم بیـن یەکتـر بخۆیـن، ئـەو خراپەیـەی لـە تۆدایـە وادەکات مـن دیلـی ئەوەبـم بیـر لـە تۆڵەبکەمـەوە، دیـل بوونـی ڕاسـتەقینە جەنابـی نەقیـب ئەوەیـە، مـن تـا دەمـرم مەحکومـم بـەوەی بـۆ ئـازادی خـۆم بگەڕێـم و بـەدوای تۆڵـەدا لـە تـۆ عـەودال بـم. بۆیـە گـەر ورد تەماشـابکەیت، ئاغـای نەقیـب، جەلادەکان بـە دوو جـۆر حوکمـی قوربانـی دەدەن، جارێـک بـەوەی دەیانکـەن بـە قوربانـی و جارێکیـش بـەوەی دەیانکـەن بـە کۆیلـەی خولیایەکـی تـر، کۆیلـەی ئارەزوویـەک کـە نامرێـت، ئـارەزووی ئـەوەی ڕۆژێـک لەگـەڵ جەلادەکانیانـدا جێگاکانیـان بگۆڕنـەوە.

سـامیری بابلـی دەڵێـت: ئـەی منداڵـی پـڕ موحیبـەت، ئـەی مۆسـیقاری بێکـەس، گـەر قوربانییەکانیـش هەمـان شـت بکـەن کـە جـەلادەکان دەیکـەن، ئیتـر هیـچ شـتێک نامێنێـت زەوی ڕابگرێـت، هیـچ کوڵەکەیـەک نامێنێـت مـرۆڤ ژیانـی خـۆی بخاتـە بـن سـێبەری.

جەلادەتیـش دەڵێـت: گـەر منیـش تۆڵـە نەکەمـەوە، گـەر شـتێک نەبێـت تـۆ هەمـان ئـەو ئـازارە بچێژیـت کـە مـن چەشـتوومە، ئـەی عەدالـەت چییـە؟ هـا

ئەی عەدالەت چییە؟ عەدالەت ئەوەیە هەمان ئەو ئازارە ببینیتەوە کە من بینیومە، هەمان بۆری دایسکراو بە بەنزینەکەوە لە قوونی تۆدا ببینم.

پرتەقاڵی بابلی هاواردەکات: بەلام گەر وابێت ئەوا عەدالەت هەردووکمان دەکات بە جەلاد، عەدالەت ئەوەیە یەکێکمان بوەستین و وانەکەین.

جەلادەت بە تورەییەوە دەڵێت: ئەمە چۆن عەدالەتێکە، چۆن عەدالەتێکە؟ ها سامیری بابلی... پێمبڵێ ئەمە چۆن عەدالەتێکە... تۆ هاورێکانی منت کوشت، تۆ منت کوشت و دەبێت من هیچ نەکەم، بڵێم لێگەرێ ئەم پیاوە خودا ئازاری بدات، ویژدانی خۆی ئازاری بدات، خودا تۆڵەی لێبکاتەوە... ها، ئەی ئەگەر هیچ خودایەک نەبوو تۆڵە لە تۆ بکاتەوە، ها.. ئەی ئەگەر خودا نەبوو، ئەوکات چی؟ ئەی ئەگەر هیچ ویژدانێک نەبوو تۆ یان ئەوانی تر ئازار بدات، ئەو کات چی؟ ها ئەو کات چی؟ ئەوەش عەدالەتە... ها ئەوەش عەدالەتە؟

سامیری بابلی بە هێمنییە قووڵ و پڕ سەداکەی خۆیەوە دەڵێت: عەدالەت ئەوەیە هەمووومان نەبین بە جەلاد... لەوە دەرچێت ئیتر نازانم عەدالەت چییە. گەر تۆش ببیت بە جەلاد هیچ بەهانەیەک نامێنێت تا ئیدی من دیلی تۆ بم، هیچ هۆیەک نامێنێت من ئەسیربم لەلای تۆ، ئەی منداڵی نەجیب، گوێبگرە، من زۆر بە ڕاستمە، من تا ئەو دەقیقەیە ئەسیری تۆم کە تۆ جەلاد نیت، کە تۆ مۆسیقاریت و من نەقیبێکی شەڕانی و نەخۆش، تۆ بۆنی فلووتت لێدێت و من بۆنی پرتەقاڵی ژەهراوی... کە ئەوە نەما، کە تۆش بوویت بە پیاوکوژ، ئیتر چۆن من ببم بە دیلی تۆ، ئەوکات ئیتر من و تۆ دەبین بە دوو سەری یەک جانەوەر، دوو سەر کە یەکتر دەخۆن.

جەلادەتی کۆتر بە ژێر ئەستێرەکاندا دەڕوات و شەق لە بەردو داری پێشدەم خۆی هەڵدەدا، هەوای فێنکی شەو لە بری ئەوەی هێمنیبکاتەوە تورەیدەکات. بە گاڵتەجارییەوە دەڵێت: من فلووت ژەن بووم، فلووت ژەنێکی باش بووم؟ تۆ خۆت بڵێ، من مۆسیقایەکی سیحراویم لێ نەدەدا؟

کێ منی گرت، ها.. کێ من و هاوڕێ بەستەزمانەکانمی گرت... کێ منی خستە ناو زیلێکی پیسەوەو بردمی بۆ باشوور.. کێ؟ کێ تەقەی لێکردم؟ کێ ناچاریکردم مۆسیقا لە بیر خۆم بەرمەوە؟ ئێوە مۆسیقارەکەی ناو منتان کوشت... تێدەگەیت، ئێوە کوشتتان.

سامیری بابلی، کە هێدی هێدی هێمنی خۆی لە دەستدەدات، دەڵێت: من نا... من نا. من تۆم ڕزگارکرد... تۆ خۆت دەزانی من لە بەر خاتری ئەو مۆسیقارە ژیانی خۆم خستە مەترسییەوە.

جەلادەت کە لە پێشەوە بۆ سەر ترۆپێکێکی سەخت سەردەکەوت، کە دەنگی هەندێک باڵندەی سەر لێشێواو سەرسامیاندەکرد، بە قێزو لاقرتێیەوە گووتی: بە تەنیا چاکەیەک دەتەوێت ببیتەوە بە فریشتە... دوای ئەو هەموو گوناهە هیچ کەس بە تەنیا چاکەیەک نابێتەوە بە فریشتە.

لە ناکاو بە کەمێک جیدییەتەوە سەیری سامیری بابلی دەکرد، دەچووە بەردەمی و وەک تیا بپاڕێتەوە دەیگووت: پرتەقاڵی بابلی... سامیری هاوڕێم... بمبورە، بمبورە، من دوژمنی تۆ نیم... من دوژمنی کەس نیم.. هاوار، سەیرکە من دوژمنم نییە. بەڵام تۆ دەبێت سزای خۆت وەرگریت... لەبەر خاتری هەموومان، لە پێناوی خۆتدا... لە پێناوی هەموومان‌دا... لە پێناوی هەموو شتێکدا، تێدەگەیت... تۆ دیلی منیت و دەبێت من بیربکەمەوە چۆن سزای خۆت وەرگریت... من نامەوێت ببم بە جەلاد... نامەوێت، بەڵام دەبێت ڕێگایەک هەبێت تۆ ببیتەوە بە مرۆڤ، ئەو ڕێگایەش یان ڕێگای سزایە یان ڕێگای لێبوردن... لەو دوو ڕێگایە زیاتر هیچی تر نییە، بەڵام پرتەقاڵی بابلی... من هەموو شتێک نیم... من ئەو کەسە نیم ئەو هەقەم هەبێت سزات بدەم یان لێتببورم... دەبێت دادگایەک لێتببورێت... دادگلیەک... وا نییە، دەبێت دادگایەک لێتببورێت.

سامیری بابلی دەڵێت: چ دادگایەک؟... ئەی منداڵی نەجیب.. چ دادگایەک؟ هەموو ئەوانەی لەم وڵاتەدا دادگایان بەدەستە، خۆیان لە من خراپترن.

جەلادەت وەک خەیاڵێکی باڵدارو قووڵ لەسەریدا بێت، دەڵێت: نا سامیری بابلی، من تۆ تەسلیمی دادگای حیزبەکان ناکەم، تەسلیمی ئەو حاکمانەت ناکەم کە لە کۆلیژەکانی قانون دەرچوون، تەسلیمی ئەو قازی و داوەرانەت ناکەم کە لە چل ساڵی ڕابوردوودا لە دادگاکانی ولاتدا خەڵکیان حوکمداوە، ئەوانە هیچ شتێک لە عەدالەت نازانن... هیچ شتێک...

سامیر بە سەرسامییەوە دەپرسێت: بەلام چ دادگایەک... جەلادەتی کۆتر، چ دادگایەک؟

جەلادەتی کۆتر، دەست دەخاتە گیرفانی و بە نیگایەکی پڕ ماناوە تەماشایدەکات و دەڵێت: دادگایەک من و تۆ پێکەوە دایدەنێین، من و تۆ، لە کەس و کاری ئەو قوربانیانەی تۆ کوشتووتن، لەوانەی هێشتا دەژین و نەمردوون... دادگایەک تۆ خۆت دروستیدەکەیت... تەنیا ئەو دادگایە دەتوانێت لێتببورێت و هیچ دادگایەکی تر نا... ئەوە تەنیا دادگایەکە سامیری بابلی تۆ دەبێت حوکمەکانی قەبوولبکەیت.

چیرۆکی ئەو دادگایە دەبێت بە بەشێک لە خولیا سەرەکییەکانی جەلادەتی کۆتر، کە ئێمە لەم بەشەی چیرۆکەکەماندا دوای دەکەوین. ئەو شەوەو شەوانی دی جەلادەتی کۆتر و سامیری بابلی بەردەوام باس لەو دادگایە دەکەن... دوو بوونەوەرن دابڕاو لە جیهان. هێدی هێدی دونیا هێور دەبێتەوە، بەلام وەک ئەوەی ئەوان لەو کونجە فەرامۆشکراوەدا لەزەت لە ئاوارەیی ببینن، لە ژێر چادرەکەیاندا دەمێننەوە و ناڕۆن... ڕۆژ دوای ڕۆژ ئاوارەکان چادرەکانیان دەپێچنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ شارو گوندەکانیان، بەلام جەلادەتی کۆترو سامیری بابلی نە شاریان هەیە بۆی بگەڕێنەوەو نە گوند. لە دوو باڵندە دەچن کە بای ئەو ئاسمانە دوورانەی تیا فڕیون، بە چەشنێک باڵی قورس کردبن چیتر نەتوانن لە زەوی هەستنەوە. جەلادەت شەوان لە ژێر چادرەکەیدا بەر لەوەی بخەوێت، گوێ لە بای ساردی

شەوگاران دەگریێت و دەڵێت: سامیری بابلی ئەم بایە من بانگدەکات... هەستدەکەم بەرەو قووڵایی تاریکییەکی زۆر دوور بانگمدەکات. ئەو لە تاریکیدا هاوارێک دەبیستێت کە پێدەچێت هاوارێکی نهێنی بێت و تەنیا ئەو بیبستێت. لە ناکاو هەڵدەستێت و لە پرتەقاڵی بابلی دەپرسێت: تۆ گوێت لێبوو... گوێت لێبوو، یەکێک لە دوورەوە منی بانگکرد؟ بەڵام سامیری بابلی گوێی لە هیچ نییە. ئەو شەوانە سروشتی دەگۆڕێت، لە چادرەکەی دێتەدەرێ و بە تاریکیدا دەڕوات و دادەبەزێت بۆ ناو مێرگ و دارستانێکی چڕ، لەوێوە هاواردەکات: هێی، تۆ ئەی ئەوەی من لە ناو زوڵمەتەوە بانگدەکەیت... من گوێم لێتە، گوێم لێتە تۆ کێیت؟ جەلادەت دڵنیایە یەکێک لە ناو تاریکییەکی زۆر دوورەوە بانگیدەکات، بەڵام ئەوە دەنگی کێیە؟ هەندێجار وەک دەنگی سەرهەنگ قاسم دەیبیستێت، هەندێجاریش وەک دەنگی ئیسحاقی لیوزێڕین... هەندێک شەو گوێ ڕادەدێرێت و دڵنیایە ئەوە دەنگی دالیا سیراجەدینە... هەندێ شەویش لە نوزەی پیرێکی وەک موسای بابەک دەچێت، بەڵام زۆرجاریش لە دەنگی کەسێکی بیمار دەچێت کە لەو بەری شەوەوە بانگیدەکات.

سامیری بابلی پێیدەڵێت: جەلادەتی کوتر، ئەی منداڵی بێئاگا لە دونیا، ئەوە دەنگی ڕابوردووی خۆتە. ئەوە دەنگی ڕابوردووە، شەوانی ڕەشەبا تێکەڵ بە گەردەلوولەکان دەبێت و ناهێڵێت بخەویت.

پێموایە ئەو هاوارە تا ماوەیەکی درێژ لەگەڵیدا دەمێنێتەوە، دەنگێک نازانێت کێیە و لە کوێوە هاواری لێدەکات. بینینی بەردەوامی ئەو باڵندە سپییانە، بیستنی بەردەوامی هاوارێکی نادیار کە سەرو سەرچاوەی نییە، ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر جەلادەت بەو چادرگەیەوە گرێدەدەنەوە کە بەردەوام بچوک دەبێتەوە، هێدی هێدی سەرنشینان ماڵاواییدەکەن و دەڕۆن، یەکدی ماچدەکەن و خوداحافیزیی لەیەک دەکەن و ماڵەکانیان لە پشتی کامیونێک دەنێن و دەڕۆن، ئەوانەش کە لەوێ دەمێننەوە زۆربەیان

پیرێژنی بێکەس و ژنی بێمێرد و پیرەمێردی بێخەمخۆرن. لەدوای تێپەڕینی چەند مانگێک، ڕۆژێک فەرمانبەرێکی قژ زەردی نەتەوە یەککگرتووەکان لە لاندکرۆزێکی سپیدا دێت، لەگەڵ گەنجێکی چاوسەوزی باریکدایە کە وەک وەرگێری ئینگلیزی خۆی بە خەڵک دەناسێنێت، گەنجێکە بە غرورێکەوە قسە لەگەڵ ئاوارەکاندا دەکات. ئەو وەرگێڕە هەموو سەرنشینانی چادرگەکە خڕدەکاتەوەو خۆی دەچێتە سەر بەردێکی گەورە، لەوێوە زوو زوو دەست بە دەم و سمێڵە تاشراوەکەیدا دەهێنێت و پێیان دەڵێت: چیتر نەتەوە یەککگرتووەکان و ڕێکخراوە ئینسانییەکان کۆمەکی ئەمجۆرە چادرگایانە ناکەن، لە ماوەی مانگێکدا دەبێت هیچ یەک لەم چادرە پەرتەوازەو ناڕێکانە نەمێنێت، ئا ئازیزان وابزانم بە فەرەنسی قسەناکەم، بە کوردی پێتان دەڵێم، ئێرە دەبێت نەمێنێت.

گەنجەکە بە فیزی یەکێکەوە تەرجومانی پێغەمبەر بێت باس لە ئەمن و ئاسایشی شاردەکات، باس لە کشانەوەی هێزەکانی دەوڵەت لەسەرتاپای شارەکانی باکوور دەکات، دواجاریش بە دەنگێکی وشک و بێرۆح پێیاندەڵێت: مژدەتان دەدەمێ، کە لە شار شوێنی ترمان بۆ دابینکردون.

پیرێژن و پیرەمێردەکان زۆریان لە قسەکانی ئەو گەنجە تێناگەن کە بە کوردیەکی تێکەڵاو بە دەیان وشەی عەرەبی و ئینگلیزی قسەدەکات، جەلادەت لە ژێر درەختێکی نزیکدا، لە ناو گیایەکدا کە هێدی هێدی دەبێتە پوشێکی زەرد دانیشتووەو گوێدەگرێت، خۆری سەرەتای هاوین خەریکە دەبێت بە جانەوەرێکی دڕندە کە مرۆڤ ناوێرێت توخنی بکەوێت. لەو چەند مانگەدا ئەو چەندەها لەم فەرمانبەرو وەرگێڕانە دەبینێت کە دێن و دەڕۆن و ئیتر نایانبینێتەوە، چەندەها لەو بەرپرسانە دەبینێت کە بە هێزی زۆرو تفەنگچی بێشومارەوە خۆیان دەکەن بە ئۆردوگاکەدا، بە ڕۆژ کۆبوونەوە بە خەڵک دەکەن، بە شەویش خۆیان دەکەن بە ژێر هەندێک لەو خێوەتانەدا کە ژنە قەشەنگ و کچە جوانەکانی ئۆردوگای تێدایە.

لەو ماوەیەدا چەندین جار لەلایەن بەرپرسی «بەرەی نیشتیمانییەوە» بۆ ئەوەی بزانن کێیە بانگهێشت دەکرێت؟. خۆی وەک سەربازێکی هەڵاتوو دەناسێنێت کە لە باشوورەوە لەگەڵ هاورێ عەرەبەکەیدا هەڵهاتووە و لە ژێر ئەم چادرانە بەولاوە شوێنێکی تری لەسەر ئەم ئەستێرەیە نییە. بەرپرسی بەرەی نیشتیمانی پیاوێکی سەررووتاوەی ورگزلە، هەموو جارێک پشتێنە شلەکەی توندەکاتەوە، جامانە نارێکەکەی «کە هەردەم بەلای چەپدا خواردەبێتەوە» راستدەکاتەوەو دەڵێت: جەلادەت عوسمان، بزانم درۆدەکەیت، لوولەی کلاشینکۆفەکە دەبڕمە قوونت. جەلادەت هەمووجارێک دەڵێت: گەورەم مەبەستت، جەلادەت ئیسماعیلە، وا نییە، مەبەستت منە. بەرپرسەکە سەری دەخورێنێت و دەڵێت: نازانم بۆ بەردەوام تۆم لەگەڵ ئەو کورەدا لێتێکدەچێت، کورێکی گەنج بوو، ماوەیەک حیمایەم بوو، ناوی جەودەت عوسمان بوو، رۆژێک تورەییکردم، لوولەی کلاشینکۆفەکەیم بریە قوونی، دوای ئەوە خوا بیگرێ، رۆیشت هەر نەهاتەوە بە حیزبدا، تەسەوربکە لەسەر ئەوە وازی لە پێشمەرگایەتی و شتیش هێنا. ئاخر میللەتی ئێمە بۆیە قەت هیچمان نابێت بە هیچ. تەسەوربکە، کەس هەیە لەسەر شتی وا واز لە پێشمەرگایەتی بێنێت، ئەگەر دڵ و دەروونی پاک بێت.

هەفتەیەک دوای ئەو سەردانە ئازوقەیان لە ئۆردوگاکە بڕی، لە ڕاستیدا زۆربەی ئەوانەی کە لەوێ دەژیان جێیان هێشتبوو، جگە لە هەندێک خەڵکی پەککەوتە نەبێت کە شوێنێکیان نەبوو رووی تێبکەن. دوای دوو هەفتە لەو سەردانە، ئێوارەیەک ڕەشەبایەکی زۆر سەیر هەڵدەکات، جەلادەتی کۆتر تا ئەو کات ڕەشەبای وەهای نەبینیبوو، تا دونیا تاریکتر دەبوو ڕەشەباکە بەهێزتر دەبوو، بە ناو چیاکاندا بە لوورەلوور دەهات و لە تەسکە دوڵێکی بچوکدا کۆدەبووەوەو بە خێراییەکی شێتانە خۆی دەکرد بە ئۆردوگاکەدا، لە نزیکی سەعات دەی شەو ڕەشەباکە بە جۆرێکی وەها سەیر گوڕوتینی

دایـە خـۆی، جـەلادەت لـە شـوێنی خۆیـەوە وای هەسـتدەکرد بـا خەریکـە ئـەو پارچـە زەوییـە لـە زەمیـن هەڵدەکەنێت و لەگـەڵ خۆیدا بـەرەو ئاسـمان دەبیـات، لـە سـاتێکدا جـەلادەت و پرتەقاڵـی بابلـی لـە چادرەکـەی خۆیـان سـەردەهێننە دەرێ دیمەنێکـی ترسـناک دەبینـن، تـەواوی ئـەو ئۆردوگایـە بـا دەیبات، دەبینـن بـا چـادرەکان بـەرەو کەشکەشـانی فەلـەک هەڵدەگرێت، چـادر لـە دوای چـادر... لـە ئێسـتێکدا سـەر بەرزدەکەنـەوەو ئۆردوگایەکـی فڕیـو بەسـەر ئـەو چیـاو پێدەشـت و دۆڵانـەوە دەبینـن کـە لـە تاریکیـدا دەفڕێت. تەنیـا خێـوەت و خەیمەیەکـی بەجێمـاو لەسـەر زەوی خێـوەت و خەیمەکـەی خۆیانـە، ئـەو شـەوە دووقۆڵـی بـە دوای سـەرنشـینانی ئۆردوگاکەیاندا دەکەونە نێـو هـەردو دۆڵـەکان، ڕوودەکەنـە ئـەو بێسـتان و بەردەلانـە گەورانـەی دەوروبـەر، بـە دەربەندەکانـدا وێـڵ دەبـن، بـەلام کـەس نادۆزنـەوە. خـودای بێکـەس و بێمـەکان لـە چەنـد سـاتێکدا گەردەلـوول هەمـوو ئـەو خێوەتگایـە دەبـات بـۆ ئاسـمان، بـە هەمـوو سەرنشـینە پیرەکانییـەوە، بـە هەمـوو ئـەو چـادرە شـینانەوە کـە ڕێکخـراوە مرۆڤدۆسـتەکان لـەو دۆڵـەدا بەسـەر خەڵکانی هـەژارو ئـاوارەو لێقەومـاودا دابەشـیانکردبوو، کـە بەیانی دەگەڕێنـەوە، جگـە لە چادرەکـەی خۆیـان هیـچ چادرێکـی دی لـەو ئۆردوگایـەدا نییـە... سـامیری بابلی و جـەلادەت تێناگـەن کـە لـە خەونـدان یـان لـە ڕاسـتیدان... تێناگـەن ئـەوەی شـەو بینیویانـە هەلوەسـەو خەیالاتـی دوو پیـاوی نەخۆشـە یاخـود کۆتایـی کۆمەڵێک ڕۆحلەبـەری بێکەسـە کـە جگـە لـە فڕیـن بـۆ ئاسـمان دەروازەیەکـی دیکەیـان لـە بەردەمـدا نەبـووە. بـۆ ڕۆژی دوایـی جەلادەتـی کۆتـر هەواڵـی فڕینـی ئۆردوگاکەیـان لـە بنکەیەکـی نزیکـی بـەرەی نیشـتیمانی تۆمـاردەکات، لە حاڵێکدا بەرپرسـەکان خەریکـن لـە پێکەنینـدا دەپچڕێـن، بـەدەم قاقـاوە داواکـەی جەلادەتـی کۆتـر تۆماردەکـەن، کـەوەک یەکێـک بەرمیلێـک بـاروت لـە نزیکییـەوە تەقیبێتـەوە وڕو کـاس، غەمگیـن و سەراسـیمە دێتـەدەرێ و نازانێـت ڕوو لـە کـوێ بـکات. هیـچ کـەس بـاوەڕ بـەو حیکایەتـەی جەلادەتـی کۆتـر نـاکات، کـە

هەمیشە بە حەسرەتەوە باسی فڕینی ئۆردوگایەکی ئاوارەکان دەکات بۆ ئاسمان، فڕینی چەندەها پیرێژن و پیرەمێردی بێکەس کە ڕۆژێک ڕەشەبا هەڵیاندەگرێت و دەیانبات و ئیدی هیچ کەس نایانبینێتەوە.

ئاه، بوەستن دیارە دەمەوێت زۆر شتی ترتان لەسەر ئەو ڕۆژگارە بۆ بگێڕمەوە، زۆرە وردە نهێنی تر لە ژیانی ئەو ئۆردوگا چکۆلانەیەدا، بەڵام نا... ئیدی لێرەوە بیمانایە من ڕۆڵی حیکایەتخوانێک ببینم کە دەزانم پاڵەوانی چیرۆکەکەم لە من باشتر دەتوانێت شتەکانتان بۆ ئاشکرابکات، من دوای تێڕوانینێکی ورد لە هەموو ئەو کاغەزو دەستنوسانەی جەلادەت خستیە بەردەستم، ڕام وایە من دوای ئەم پێشەکییە کورتە، چیرۆکەکە بدەمەوە دەست جەلادەتی کۆتر خۆی، تاباسی ئەو ڕۆژانەتان بۆبکات کە دەگەڕێتەوە بۆ شار، باسی مستەفای شەونمتان بۆ بگێڕێتەوە، باسی دروستکردنی دادگایەکتان بۆبکات کە هەرگیز ناتوانێت عەدالەت بەرقەراربکات. من لێرەوە ماڵاوایتان لێدەکەم و تەنیا لەگەڵ دیمەنی هەڵواسین و لە مێخدانی جەلادەتی کۆتردا دەگەڕێمەوە، دیمەنێک کە هەرگیز لە یادەوەری من دەرناچێت... بەڵام دەبێت بزانن کە ماڵاوایی حیکایەتخوان لە ڕۆماندا هەمیشە ماڵاواییەکی فێڵزانانەیە، دەبێت بزانن من لە هەموو ڕستەیەکدا لەگەڵ جەلادەتی کۆتردا بووم، هەموو دارشتن و وەستان و هەستانەوەیەک لەم چیرۆکەدا کاری منە، ڕاستە من پاڵەوانی ئەم چیرۆکە نیم، بەڵام بیرتان نەچێت کە من عەلی شەرەفیار حیکایەتخوانی ئەم چیرۆکەم، دەبێت بشزانن کە هەمیشە حیکایەتخوان لە پاڵەوان گرنگترە.

## من و پرتەقاڵی بابلی
## بیر لە ڕێگایەك دەکەینەوە بەرەو پاکی و ئاسوودمیی

نا ئازیزان هەمیشە پاڵەوان لە حیکایەتخوان گرنگترە. ئەوە من بووم ئەو ڕۆژە تاریکانەم بینی نەوەک عەلی شەرەفیار. من بووم لە باشوور نغرۆبوونی شاریکم بینی کە سەرابێک بوو تیکشکانی شارەکان و شوێنەکان دروستیانکردبوو. من بووم بە سوار ئەسپێکی خورافی سپییەوە بە هەموو وڵاتدا لە باشووری دوورەوە تا باکوور گەڕامەوە، من بووم لەم شارەدا وێڵ بووم و شوێنێکم نەبوو رووی تێبکەم. من بووم بە سامیری بابلیم گووت بۆئەوەی لە کوچە دڵڕەقەکانی ئەم شارەدا لە برسا نەمرین ڕووبکەینە ئۆردوگای ئاوارەکان، من بووم ئاوارەییم وەک قەدەر و وەک ئازادی هەڵبژارد. من بووم شەوێکی ڕەشەبا دەیەها چادرم بینی بە ئاسماندا دەفرین... هەموو ئەم مێژووە، مێژووی من بوو.

من یەکەمین کەس بووم کە چوومە ئەو ئوتێلە سووتاوەوە، بەرلەمن کەس بیری لەوە نەکردبووەوە ئەو جێگایە بەکەڵکی ئەوە دێت بکرێتە نیشتەجێی ئاوارەکان. من سەرەتا لە قاتی شەش ژوورێکم بۆ خۆم و سامیری بابلی پاککردەوە. کە من چوومە ئەو ئوتێل ... ێشتا بۆنی دوکەڵ و سووتانی بەرنەدابوو، بۆسۆیەکی ترسناک لە ... موو ... ێگایەکی دەهات، لەوە دەچوو بەشێک بووبێت لە دۆزەخ و ئێستا فەراموشکرابێت. من بە درێژایی ژیانم زۆر جێگام بینی بوو کە پێموایە بەشێک بوون لە دۆزەخ و دواتر فەرامۆشکراون. هەستدەکەم خودا زۆر زوو زوو شوێنی دۆزەخ دەگۆڕێت تا ئێمە نەیناسینەوە. ئەو ڕۆژەی کە من چوومە ئەو ئوتێلەوە، هەستێکم هەبوو کە ئێرە ڕۆژێک لە ڕۆژان دۆزەخ بووە، ئوتێلێکی گەورەبوو لە ناوەڕاستی شاردا، ئەندازیارێکی بە نێوبانگ دروستیکردبوو. نەمدەزانی

کێ سووتاندویتی و بۆچی سووتاوە؟ بە هەرحاڵ ئەوجۆرە پرسیارانە دوای ڕاپەڕین بیمانان، زۆربەی بیناو ساختمانە گەورەکان سووتابوون، من هەرگیز لە کەسم نەپرسی کێ ئەم ساختمان و بینا گەورانەی سووتاندوە؟ کێ دادگای سووتاندوە؟ کێ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە و خەستەخانەکان و بینا گەورەکانی زانکۆی سووتاندووە؟ لەو باوەڕەشدام هیچ کەس ئەو پرسیارەی لە خۆی نەکردوە. تا سەردەم و ڕۆژگاریش زیاتر بڕوات خەڵک کەمتر ئەو پرسیارانە دەکەن، دواجار گەر ئێوە شارەزای وڵاتی ئێمەبن تێدەگەن، مرۆڤ گەر وەڵامە ڕاست و دروستەکەش بزانێت سوودێکی نییە. من لە منداڵیەوە حەزمدەکرد بچمە ئەو ئوتێلەوە، بەڵام پێدەچێت من لەو کەسانەبم کە تەنیا لە کاتی کاولبوون یان دوای کاولبوون بۆم هەبێت ڕوویکەمە شوێنە خۆشەکانی سەر زەوی. ئەو ڕۆژە من بە نیازی نیشتەجێبوون ڕووم نەکردە ئەو ئوتێلە، دواجار دەمزانی ڕۆژێک دێت دەمانکەنە دەرەوە، بەڵام لەو دەقیقەیەدا کە چوومە ژووری و پێم خستە ناو دارو پەردووی بیناکەوە، هەستێکی سەیر دای گرتم، هەستێک کە زۆرجار دوودڵم باسیبکەم، بەڵام سوێندم خواردوە جگە لە ڕاستی هیچی تر نەگێڕمەوە. من لەو ساتەدا کە لە ناو دارو پەردووی سووتاو و پارچە شوشەی شکاودا وەستابووم، هەستمکرد دالیا سمیراجەدین دەبینم. دالیا کە هەرگیز لە بیرم نەچووبووەوە، شەوانی وێڵگەردیم لە دەوروبەری ئۆردوگای ئاوارەکان هەمیشە بیرم لێدەکردەوە. بەڵام هیچ کات ئاوەها بە ڕۆشنی و نزیکی نەمبینیبوو، ئەو ڕۆژە هەستمکرد لە پێشمەوە دەڕوات، پشتی لێم بوو، من لە شوێنی خۆم وەستام... وەک هەر پیاوێکی ترسنۆک کە لە تاریکیدا خێوێک دەبینێت و دەوەستێت، منیش ئاوەها وەستام... ئەو لە پێشمەوە دەڕۆیشت و لە ناو ساختمانەکەدا ونبوو، پاش ئێستێک گوێم لێبوو بانگمدەکات... وەک هەمان ئەو شەوەی لە کوچەکانی شاری بەدبەختیماندا ئەو لە ناو گرمەی زرێپۆش و تانکەکاندا بانگی لە من کرد و هاوارەکانی

بە نێو هەموو شەودا تێپەڕین و دەنگیاندایەوە، ئاوەها بانگیکردم. سەرتاپای ئەو بینایە دەنگیدەدایەوە، دەنگی ئەو لە هەموو جێگایەکی ئەو ئوتێلە سووتاوەدا بوو، من ڕامکرد بە دوایدا و ئەو بانگیدەکردم. من ڕامکردو ئەو بانگیدەکردم، بە پێپلکەکاندا سەرکەوتم و گوێم لە دەنگی بوو، قات لە دوای قات دەڕۆیشت و من بەدوایەوە بووم... هەمیشە پشتی لێم بوو. دڵنیابووم پێم دەڵێت، ئەو شوێنە بکەمە نیشتەجێی خۆم، بینیم بە هێمنی دەچێتە ئەو ژوورەوە لە قاتی شەش، بەدوایدا ڕۆیشتم و نەمبینییەوە، ئالەویادا لێم ونبوو، بەلام دڵنیابووم بینیومە، دڵنیابووم ئەو منی گەیاندە ئەو نهۆمە. کە چوومە ئەو ژووره بۆنی دالیا لەوێ بوو، بۆنێک وەک بۆنی لەو ڕۆژانەدا کە لە سالۆنە گەورەکەی تیاتری پرتەقاڵی سپییدا دەردەکەوت. ئەو ژووره تاکە شوێنێک بوو لەو بینا گەورەیەدا بۆنی دۆزەخی لێنەدەهات. ئەو ساتە زانیم کە دالیا سیراجەدین وازی لێنەهێناوم و لەگەڵمدایە... وەک چۆن منی لە دۆزەخی ئەو شارە ترسناکەی باشووردا پاراست، ئاوەها لەگەڵمدایە. ژوورێکی ناوەند بوو، نەزۆر گەورەو نەزۆر بچوک. پەنجەرەکانی بەسەر هەموو ئەو شارە کپ و خامۆشەدا دەیڕوانی، لەوێوە دەمتوانی هەموو ئەو شارە ببینم. لەو ژوورەدا هەستم بە هەناسەکانی کرد، هەستم بە هەوایەکی فێنک کرد کە هەوای ڕۆحی ئەو بوو. من لە بەر پەنجەرەکەدا وەستام و گووتم ئێره ماڵی منە... دالیا ئێره ماڵی منە. لەو ساتەوە دەستمکرد بە پاککردنەوەی ژوورەکە، بە کۆکردنەوەی ئەو دارو پەردوە سووتاوەی لە ژوورەکەدا کۆبووبووەوە. بۆنی ئەو لەوێ بوو، لەگەڵمدا بوو. من لە پەنجەرەکەوە سەیری ئەو شارەم دەکرد و دوای ماوەیەکی ئێجگار درێژ بۆ یەکەمجار هەستم بە خۆشحاڵییەکی گەوره دەکرد، دڵنیابووم دالیا سیراجەدینم بینیوە، دڵنیابووم گەر بۆ ساتێکی کورتیش بێت خۆی نیشانداوم، گەر بۆ چەند بانگێکی کورتیش بێت، بانگیکردوم. من نەوەستام تا ئەو ژوورەم پاککردەوە، نەوەستام تا وام لێکرد کەڵکی دانیشتن و

خەوتنی هەبێت، بێئەوەی نهێنی خۆم بدرکێنم گەڕامەوە بۆ لای سامیری بابلی، لەگەڵ ئەودا دۆشەک و بەتانی و کەلوپەلەکانمان بە کۆڵ تا نزیکترین جادە ڕاکێشا، لەوێوە لە پشتی جیبێکی کۆندا سواربووین و ماڵەکەمان لە بەردەم ئەو ئوتێلەدا داگرت و بووین بە یەکەمین ئاوارە کە پێدەخاتە ئەو کۆشکە سووتاوەوە.

من هیچم لای سامیری بابلی نەدرکاند، بە هیچ جۆرێک باسی بینینی دالیا سیراجەدینم لە وێرانەی ئەو ئوتێلەدا بۆ نەکرد. شەو درەنگ دوو پاسەوان کە چاویان بە چراکەی ئێمە کەوتبوو لە قاتی شەشدا دەسووتێت هاتن بۆ لامان، دوو پێشمەرگەی منداڵکاربوون. من و سامیری بابلی ئەو شوناس و بەڵگەنامانەمان نیشاندان کە بەرپرسەکانی بەرەی نیشتیمانی لە ئۆردوگا بۆیان کردبووین. لای ئەوان خۆمان وەک سەربازی هەڵهاتوو نەناساند، خۆمان وەک دوو زیندانی سیاسی ناساند کە لەگەڵ ڕاپەڕیندا لە زیندانەکانی باشوور ڕامانکردوەو ئێستا جێگامان نییە ڕووی تێبکەین. ڕۆژانی سەرەتا هێمن و ئاسوودە تێپەڕین، من شەوان هەستمدەکرد گوێم لە دەنگی پێی خانمێکە بەو ئوتێلەدا دێت و دەچێت، شەوان لە تاریکییەکەدا دادەنیشتم و چاوەڕوانی دەرکەوتنەوەی دالیا سیراجەدینم دەکرد، بەڵام بێسوود بوو، ئەو چەند شەوە من دالیام نەبینییەوە. ڕۆژێک لە ناکاو من جەلیلی بارانم بە یادا هاتەوە، جەلیلی باران ئەو سەربازە بریندارەی کە لە دوا سەعاتەکانی شاری تەپوتۆزە زەردەکاندا من تیمارمکرد و ناونیشانی خۆیم لێوەرگرت. ئەوکات بەر لەوەی دەستبکەم بە خۆئامادەکردن بۆ دروستکردنی دادگایەک بۆ سامیری بابلی، دەبایە ئیشبکەم بۆئەوەی بژیم، دەبێت بزانن کە من زۆر لە سامیری بابلی دەترسام، لەوە دەترسام بیناسنەوەو بیکوژن. من هەرگیز بیرم لە کوشتنی نەدەکردەوە، بەڵام نەشمدەزانی ئەو پیاوە شایستەی چ جۆرە سزایەکی دیکەیە. بە درێژایی ئەو ماوەیە سامیری بابلی نهێنی هەرە گەورەی خۆی پێنەگووتبووم،

نهێنی ئەو نوسراوە سەیرانەی لە شوێنێکی تایبەتیدا لە باشوور لە بناغەی بورجە دێرینەکانی بابلدا، لە بناغەی باغچە ئەفسانەییە هەڵواسراوەکاندا شاردبوویەوە، نهێنی ئەو شتانە تا ئەو کات لای من نەزانراوبوون. من دەمزانی کۆمەڵێکَ دۆکۆمێنت و بەڵگەی گرنگی پێیە، دەمزانی شتی ترسناک دەزانێت، دەمزانی ئەو دەریایەکە لە نهێنی کە دەتوانین بیکەینە شاهیدێکی گەورە، دەبێت بڵێم دواجار سامیری بابلی پاکبوونەوەی خۆی لەوەدا دەبینی ببێت بە شاهید لەسەر عەسرو زەمانێک کە خۆی دروستیکردبوو.

ماوەیەک بوو لەو ئوتێلەدا بەیەکەوە دەخەوتین، شەوێکیان دوای ئەوەی چراکانمان خامۆشکرد لە ژێر جێگاکەیەوە هەستاو و گووتی: جەلادەتی کۆتر، ئەی منداڵی نەجیب بۆ لێم ناپرسیت، نهێنی ئەو بەڵگەنامانە چییە کە من پێمە... بۆ لێم ناپرسیت؟. من بە هێمنی گووتم: سامیری بابلی، دەزانم ئەوانە کۆمەڵێک بەڵگەن تۆ گوناهباردەکەن، باوەڕناکەم تۆ هیچ بەڵگەیەکت هەبێت باشی و نەجیبیت بسەلمێنێت، لەبەرئەوە لێت ناپرسم، نامەوێت لەوە زیاتر تورە و نیگەران بم لێت.

لە جێگاکەی خۆی هەستاو چووە باڵکۆنی ئۆتێلەکەو سەیرێکی ئەو شارە بێدەنگەی کرد، کە وەک هەمیشە کارەبای بەشێکی دەسووتاو کارەبای بەشێکی دیکەی خامۆش بوو. لە باڵکۆنەکەوە گووتی: جەلادەتی کۆتر، من گەورەترین و سامناکترین نەخشەی دونیام پێیە، نەخشەیەک پێشتر لەسەر ئەم ئەستێرەیە دروست نەکراوە، نەخشەیەک پێشتر نەبووەو دواتریش دووبارەنابێتەوە.

ئەو شەوە زانیم سامیری بابلی دەیەوێت قسەم بۆبکات، ئەو ساتانەی بیویستبایە ڕاستگۆیانە قسەبکات، لە کاتی ئاسایی زیاتر بۆنی پرتەقاڵی لێدەهات. لە جێگاکەی خۆم هەستام و کەمێک ئاوم لەو قوتووەدا خواردەوە کە لە ڕاستیدا قوتووی دۆشاوی تەماتە بوو ئێمە کردبوومانە پەرداخی ئاو خواردنەوە. گووتم: سامیری بابلی، نەخشەی چی؟. بە غەمگینییەوە گووتی:

نەخشەی هەموو گۆڕە دەستەجەمعییەکان... هەموو گۆڕستانە نهێنییەکان، ئەو گۆڕستانە نەناسراو و نەزانراوانەی سەدان هەزار کەسیان تێدایە... سەدان هەزار مرۆڤی بێخەتا.

دەنگی ترس و پەشیمانییەکی سەیری تێدابوو، کە یەکەم ڕۆژ و یەکەم شەوی یەکترناسینمانی بەیاداهێنامەوە. من هەناسەیەکم هەڵکێشاو گووتم: ئاه، خودای گەورە تۆ دەڵێیت چی؟ دەڵێیت چی؟ بە ئەسپایی گووتی: دەڵێم، من نەخشەی هەموو ئەو گۆڕستانەم پێیە کە لە بیست ساڵی ڕابوردوودا بە نهێنی لەمسەرەو سەری وڵاتدا دروستکراون، ئەو بەڵگە نامەیەم پێیە کە دەتوانێت دیکتاتۆر بروخێنێت.

من نەمدەزانی بڵێم چی، کەمێک سەرم خوران و گووتم: باری تەعالا، تۆ دەڵێیت چی، دیکتاتۆری چی و تەڕەماشی چی، گوێبگرە، تۆ ئەو بەڵگەنامەیەت پێیە کە سەری هەردووکمان دەدات بە فەتارەتدا... گوێبگرە هەر کەسێک بزانێت ئێمە شتی وامان پێیە، بە زیندوویی کەوڵماندەکەن... تێدەگەیت، تۆ دەزانیت دەڵێیت چی؟

دەبێت بڵێم کە سامیری بابلی ئەفسەربوو، بەڵام شتێکی لەو دونیا ترسناک و دڕندەیەی تر نەدەزانی کە لەدەرەوەی سوپا هەیە، واتە لەو گەمژانەبوو کە لایان وایە خەڵکی دڕندە و پیاوکوژ تەنیا لە ڕیزی گاردی کۆماری و دەزگای هەواڵگری سەربازی و هێزی پاراستنی تایبەتی و ئەم شتانەدا هەن، لەوە بترازێت هێند گەمژە بوو هەندێجار هیچی لەسەر ئەو خراپەو دڵڕەقییە نەدەزانی کە لە نێوان خەڵکانی سادە و ساکاریشدا لە گۆڕێیە. وەنەبێت من لەو ڕووەوە لەو بلیمەتتر بم، بەڵام ئەو ساڵە دوورە درێژانەی خۆشاردنەوەو خۆ ونکردن لە پرتەقاڵی سپییدا، وانە بەردەوامەکانی دالیا سیراجەدین، ئەو گومانە قووڵ و ترسناکەی دالیا بەرابەر زۆرکەس هەیبوو بە جۆرێک لە جۆرەکان لە منیشدا سەوزبووبوو. من بە غەریزە دەمزانی ئەوە ترسناکترین شتێکە مرۆڤ هەڵیگرێت. خودایە هەرچییەکمان

بکردبایە ترسناک بوو. من بەجۆرێک لە جۆرەکان دەستەپاچەو تۆقیبووم، لە شوێنی خۆم هەستام و گووتم: سامیری بابلی، تۆ بوەستە، بوەستە دەبێت بیربکەینەوە، دەبێت زۆر بە وردی بیربکەینەوە، تەماشاکە منیش دوو شتم پێیە، دوو شت، یەکێکیان تابلۆیەکە کە تا ئێستا لە نهێنی و سیحری تێناگەم، لەگەڵ فایلی زیندانییەکدا کە نازانم چی لێبکەم... بەڵام یادگاری دالیا سیراجەدینە، یادگاری ئەو خانمەیە کە لەم سەر ئەستێرەیە خانمێکی دیکەی وا نابینمەوە. بەڵام باری تەعالا، پێمبڵێ، یارمەتیمبدە، دەتوانین چی لەو نەخشانەبکەین... ئاه، ئەگەر وادەزانیت بەعسییەکان لێرە دەستیان بە ئێمەدا ناگات گەمژەیت، تێدەگەیت، ئەوان لێرەن، ڕاستە سوپاکانیان دوور خستۆتەوە بەڵام هێشتا لێرەن، لێرە.

سامیری بابلی دەیگووت: بەڵام جەلادەتی کۆتر، ئەم نەخشانە دەبێت بگاتە بەردەمی دونیا، دەبێت بڵاوبێتەوە.

من بە توڕەییەوە دەمگووت: چۆن؟ ئاغای بابلی چۆن؟ تێمبگەیێنە، چۆن؟... دەتەوێت بیفرۆشیت بە ڕۆژنامەکان؟... ها دەتەوێت بیفرۆشیت بەوان، لەوە ناترسیت بکەوێتە بەردەستی ڕۆژنامەگەرێک کە بە چەند ملیۆن دۆلارێک بیفرۆشێتەوە بەدەوڵەت، لەوە ناترسیت ئەو سیخوڕی دەزگا نێودەوڵەتییەکان بێت و نەخشەکان ببەن و نەیهێننەوە، لەوە ناترسیت خۆتی بۆ ئاشکرابکەیت و حیکایەتەکەت بکەوێتە سەر هەموو زارێک و دواتر کەس لەم دونیایەدا نەبێتە پشتوپەنات و وەک سەگێکی گەڕ هەر دووکمان لەم ئوتێلە حیزەدا سەربڕن و کەسیش پێمان نەزانێت؟؟؟. ها.. دەتەوێت چی لێبکەیت؟ ها دەیدەیت بە حیزبەکان؟ ئەو ساتەی ئەوان دەزانن تۆ نەخشەی وەهات هەیە، هەردووکمان کەوڵدەکەن، بە زیندووی پێستمان دادەماڵن... گوێبگرە، دەبێت من و تۆ ئەو نەخشانە هەڵگرین... ئێستا کەس ئەو نەخشانەی لا گرنگ نییە، دەیانەوێت لیمانی بسێنن، دڵنیام، ئا پرتەقاڵی بابلی، دڵنیام، دەیانەوێت لیمانی بسێنن، بەڵام نەبۆئەوەی بیکەن

بـە نیشـانەی حەقیقـەت، بەڵکـو بۆئـەوەی بـە جۆرێـک لـە جـۆرەکان بیکەنـە فەزڵێـک بـۆ خۆیـان، یـان بیفرۆشـنەوە، یاخـود بیفەوتێنـن و لـە بیریببەنـەوە، بـەڵام لـە هەمـوو حاڵەکانـدا مـن و جەنابـت وەک دوو بابـای بـێ پشـتوپەنا تیادەچیـن.

مـن دەوەسـتام و لـە تاریکییەکـەدا سـەیری سـێبەرەکەیم دەکرد. دڵنیابووم تـەواو تێگەیشـتووە مـن دەڵێـم چـی. هەردووکمـان دەمانزانـی چارەنوسـی قوربانییـەکان هەرگیـز نابێتـە غەمـی ڕاسـتەقینە. منیـش و سـامیری بابلیـش دڵنیابووین کـەس بەلایـەوە گرنـگ نییـە مردووەکان لـە کوێ نێژراون... دەبێت بزانن لەو سـاتەدا کەس گۆڕو گۆڕسـتانی بەلاوە گرنگ نەبوو، ئەوە سـاڵانێکی دواتـر حیکایەتـی ئـەو گۆڕانـە سـەرهەڵدەدات، کـە کامێرا بەدەسـتەکان بسـت بە بسـتی زەوی بـەدوای ئێسـک و پروسـک و جومجومەکانـدا هەڵدەگێڕنـەوە تـا بیکەنـە فلیمێکـی ترسـناک و بەدونیـای بفرۆشـنەوە. بـەڵام لەوسـاتەدا سـامیری بابلـی نەیدەزانـی چـی بـکات، لەلایەکـەوە دەیویسـت هەمـوو دونیـا ئـەو نەخشـانە ببینێـت، لەلایەکـی دیشـەوە دەترسـا نەخشـەکانی لێبسـتێنن و بیکـەن بـەماڵـی خۆیـان و بیکـوژن. مـن لـەو سـاتەدا هەسـتمدەکرد کـە دەبێـت ئـەو نەخشـانە بشـارینەوەو بێدەنگبیـن، بـەڵام لـە ناخـی دڵیشـەوە هەسـتم بـە ترسـنۆکییەکی گـەورە دەکـرد... هەسـتم بـە خیانەتێکـی قـووڵ دەکـرد. بـەڵام نەمدەزانـی چـۆن بڕیاربدەم.

هیـچ شـتێک لـەوە سـەختتر نییـە لـە سـەردەمێکدا شـاهید بیـت مرۆڤـەکان پێویسـتیان بـە شـاهید نییـە، هیـچ شـتێک لـەوە سـەختتر نییە ببیت بـە زمانحاڵی قوربانییـەکان لەسـەردەمێکدا هەمـوو مرۆڤـەکان، هەتـا جەلادەکانیـش خۆیـان بـە قوربانـی دەزانـن. هیـچ شـتێک لـەوە غەمگینتـر نییـە پێـت وابێـت حەقیقەتێکی گـەورەت پێیـە، بـەڵام دڵنیـاش بیـت کـەس پێویسـتی بـە حەقیقـەت نییـە. مـن کـە وا دەڵێـم دڵنیـام گـەر ئیسـحاقی لێوزێڕیـن یـان موسـای بابـەک یاخـود دالیـا سـیراجەدیم لەگەڵدابایـە ئـەوان شـتێکی دیکەیـان دەگـووت، بـەڵام مـن لـەو ئوتێلە

سووتاوەدا دڵنیابووم من لە سەر ئەستێرەیەک دەژیم حەقیقەت لەوێکانە شتێکی هێند گرنگ نییە. من دەمزانی ئەو نەخشانە شتێکی بەنرخن، بەڵام کێ هەبوو ئەو نەخشانەی بدەینە دەست، دەبایە بێدەنگ بین و بوەستین تا باشترین ڕێگا دەدۆزینەوە نەخشەکان بپارێزین. من بە سامیری بابلیم دەگووت: پرتەقاڵی بابلی، دەبێت ئەو نەخشانەم بدەیتێ، تێدەگەیت، دەبێت ئەو نەخشانەم بدەیتێ، تۆ دیلی منیت، دەبێت هەر ئەمشەو ئەو نەخشانەم بدەیتێ... هەر ئێستا دەبێت ئەو نەخشانە لە جێگایەکدا هەڵگرم کە هیچ کەس نەیزانێت. باری تەعالا تازە درەنگە، تازە بەم شەوە تاریکە هیچ ناکرێت... سبەی دەبێت هەموو شتێکمان جێبەجێکردبێت. گوێبگرە... زۆر حەقیقەت هەیە دەبێت مرۆڤ هەڵیانگرێت... زۆر حەقیقەت هەیە دەبێت بیشاریتەوە تا ساتێکی تایبەتی دێت، تا ڕۆژێک دێت هەستدەکەیت خەڵکی هەموو پێویستیان بەو حەقیقەتەیە.

سامیری بابلی وەک ئەوەی بڕوایەکی کوێری بە من بێت، وەک یەکێک دڵنیابێت کە من لە خۆی باشتر ئەو ئەمانەتە دەپارێزم، هاتەوە ژووری، نوێنەکانی هەڵدایەوە، لە ژێر دۆشەکەکەیدا بەستەیێکی پێچراوەی دەرهێناو گووتی: لە تاریکیدا سەیری مەکە، وەعدم بدەرێ لە تاریکیدا سەیری نەکەیت. لە ڕاستیدا من نەمدەویست سەیریبکەم. بە ترسێکەوە نەخشەکانم وەرگرت و نووساندم بە سنگمەوە. بە دەنگێکی لەرزۆک گووتم: سبەی لە جێگایەکدا دەیشارمەوە، سبەی... ئێستا بخەوە، سامیری بابلی بخەوە و زۆر بیرمەکەوە.

ڕۆژی دواتر من دوو جانتای دەست، سندوقێکی ئەلەمنیۆم، چەند مەترێک چەرم و بڕێکی زۆر مشەماو سوژنێک وکەمێک بەنم کڕی. بەردێکم لە ناو دەربەندێکی گەورەدا پێدەزانی، جێگایەک بوو لە ماوەی نیشتەجێبوونمدا لە ئۆردوگای ئاوارەکان دۆزیبوومەوە، شوێنێک بوو دوور دەست لە هەر خولیاو تەماحێکی ئادەمیزاد. ئەو نەخشانەم برد

بۆ ئەوێ، بێئەوەی هیچ کەسێکی دی، جگە لە من ئەو نهێنییە بزانێت. نەخشەکانم خستە ناو چەند چینێک لە موشەماوە، موشەماکەم خستە ناو جانتایەکی چکۆلانەوە، جانتاکەم سەرلەنوێ بە موشەما دەوردایەوە، دیسانەوە خستمەوە ناو جانتایەکی دەستی تر، سەر لە نوێ ئەو جانتایەم بە موشەما گرتەوە و خستمە ناو ئەو سندوقە ئەلەمنیۆمەوە، سندوقە ئەلەمنیۆمەکەم بە چەند قاتێک لە چەرمی ڕەش و ئەستوور پێچایەوەو دواجار لە هەموو جەمسەرەکانەوە درووم، بە جۆرێک هیچ تکەیەک ئاو، هیچ شێیەک، هیچ کاریگەرییەکی سروشت نەگاتە سەر ئەو نەخشانە. ئێوارەیەکی درەنگ ڕۆیشتم بۆ شوێن ئۆردوگا بابردووەکەمان کە ئەوکات بووبوو بە زەوییەکی خاڵی لە ناوەڕاست پوشەڵانێکی زەردا، هەوا بە جۆرێک خۆش بوو مرۆڤ پێویستی بە پێخەف و ڕاخەرێک نەبوو بۆ ئەوەی ئاسوودە لە ژێر ئەستێرەکاندا بخەوێت، من پاچێک و خاکەنازێکی چکۆلەشم لە بەتانییەکەوە پێچابوو، ئەو سەردەمە لە هەر جێگایەکدا خەڵکت بە کۆڵە پشت و بە تانی و باروبنەوە بدیبایە ئاسایی بوو، کەس لەسەر ئەو شتانە گومانی لە کەس نەدەکرد. من بە هێمنی لە ژێر درەختێکدا پاڵکەوتم و دیمەنی ئەو ئۆردوگایەم دەهاتەوە یاد کە شەوێک لە شەوان فڕی و نەگەڕایەوە. تا تاریک دانەهات من لە شوێنی خۆم نەجوڵام. کاتێک دونیا وەها تاریک بوو ئیدی کونەپەپوو چاوی لە کونەپەپووی هاوسێی نەبوو، بارەکەی خۆم هەڵگرت و ڕوومکردە ئەو بن بەردە. بەردێکی گەورەبوو دەکرا مرۆڤ لە سەرەوەڕا بەرەو خوار بنی بۆشبکات، بێئەوەی هیچ لە ئارامی و جێگیریی بلەقێنێت. بە جۆرێک گەورەو بەرقەرار دەینواند دەکرا مرۆڤ هەموو نهێنی جیهانی لە بندا بشارێتەوە. لە چەند سەعاتێکدا من هەموو شتێکم جێبەجێکرد. پێموابوو ئەوە ئەمینتر جێگایەکی دونیایە، بەڵام نەمدەزانی ئاخۆ من حەقیقەتێک دەپارێزم یان دەیخنکێنم؟ نەمدەزانی من ڕاستییەک هەڵدەگرم یان بۆ هەتاهەتایە دەیکوژم؟.

ئەو شەوە بۆ دەمەو بەیان گەیشتمەوە ئوتێلە غەمگینەکەمان. کە گەیشتمەوە ئەوێ سامیری بابلی لە ناو جێگاکەیدا چاوەڕوانیدەکردم، لێی نەپرسیم لە کوێ نەخشەکانم هەڵگرتووە، بەلام من پێمگووت، لە جێگایەکدا قایممکردوە کە هیچ ڕۆحلەبەرێک نایدۆزێتەوە. لەو شەوە بەدواوە هیچی دەربارەی ئەو نەخشەیە لێنەپرسیم، هیچ کات. بەلام من دڵنیام چیرۆکی ئەو نەخشانەی لە بیرنەکردبوو، بەلام چاوەڕوانی پاکبوونەوەیەکی گەورەی دەکرد تا ژیانی بۆ ئەو پەیامە تەرخانبکات. دواجاریش هەموو ئەو ڕوداوانەی لە ژیانی من و ئەودا ڕویاندا ڕێگرێکی گەورەبوون ئەو خەونە بێتەدی.

* * *

ڕۆژانی دواتر ژیان لەو ئوتێلەدا گۆڕا. دەبێت بزانن من لەو نێوەندەدا ئوتێلەکەم ناونابوو «ئوتێلی گێلاسی سپی»، وەک وەرگێڕانێک و یاریکردنێکی مندالانە بە ناوی «تیاتری پرتەقاڵی سپی» کە من عومرێکم لە ناودا بردبووە سەر. گێلاس ناوی کچێکی ئاوارەبوو کە تەنیا بۆ هەفتەیەک لەگەڵ خێزانەکەیدا هاتە ئەو ئوتێلە. یەکەمین خێزان بوو دوای ئێمە لەو ئوتێلەدا نیشتەجێبوون، خەڵکی شارێکی دیکەبوون، کچەکە تەمەنی لە تەمەنی مندا دەبوو. هێند قەشەنگ بوو، جارێک بە جۆرێکی شێتانە لێی نزیکبوومەوەو پێمگووت: پێت وایە خانم زەوی چەند جوانی دیکەی وەک تۆی تێدایە؟ ڕاستیت دەوێت مەگەر مرۆڤ کۆمەڵێک باڵی گەورەی هەبێت، هەموو ژیانی لە گەڕانێکی بێوچاندا بباتە سەر تا بتوانێت یەکێکی دیکەی وەک تۆ لە کونجێکی تری سەر ئەم ئەستێرەیەدا بدۆزێتەوە.

کچێکی شەرمن نەبوو، بە ئارامی پێیگووتم: ئەی تۆ پێت وایە چەند گەمژەی تری وەک تۆ لەسەر ئەم ئەستێرەیە هەبێت، مرۆڤ دەبێت چەند

باڵی هەبێت تا بێعەقڵێکی تری وەک جەنابت بدۆزێتەوە؟. من پێمگووت: نازانم، لە ڕاستیدا نازانم، بەڵام دڵنیاشت دەکەم کە هەموو باڵندەکانی دونیا باڵی خۆیانت بدەنێ، کەسێکی تری وەک منت بۆ پەیدا ناکرێت بەئەندازەی من شەیدای جوانی تۆ بێت.

لەسەرەخۆ پاڵێکی پێوەنام و گووتی: شەیدایەکەت هەڵگرە بۆ خۆت با لێت نەکەوێت. تێپەڕی و تا ڕۆیشتن سەیری نەکردمەوە. خانمێکی زۆر جوان بوو، سێ برای هەبوو کە شەوو ڕۆژ چاوەدێریاندەکرد. ئەو هەفتەیە من تەنیا چوار جار بینیم، جارێکیان لەگەڵ براکانیدا خۆیان گۆڕیبوو دەیانگووت دەچین بۆ سەیرکردنی خانوویەک، جارێکیشیان لەبەردەرکی ژوورەکەیاندا بە ماکسییەکی زەردەوە وەستابوو و دایکی بانگیدەکرد «گێلاس وەرە ژوورەوە... وەرە ژووری، عەیبە زۆر لەویا مەوەستە» من بەوەدا زانیم ناوی گێلاسە. جارێکیشیان لەگەڵ کچێکی دیکەدا بینیم لە شەقامی بەردەم ئوتێلەکە دەپەڕینەوە، دواجاریشیان ئەو کاتە بوو کە بە ڕێکەوت پێکەوە سەردەکەوتین و من ئەو قسانەم پێگووت. من ئەو ئوتێلە خاپوورو وێرانەم بە ناوی ئەوەوە ناونا «ماڵی گێلاسی سپی». ڕۆژێک ڕۆیشتن و ئیتر نەگەڕانەوە، پێدەچوو خانوویەکی کرێیان لە گەڕەکێک لە گەڕەکەکانی شاردا دەستکەوتبێت و چیتر پێویستیان بەوە نەبێت لە ناو ئەودارو پەردووەدا بژین.

ڕۆژ دوای ڕۆژ «گێلاسی سپی» پڕدەبوو لە خەڵک، ڕۆژ دوای ڕۆژ ئەو ئاوارانەی شوێن و جێگاو ڕێگای گەڕانەوەیان نەبوو دەهاتن بۆ ئەو ئوتێلە سووتاوەی کە دەبایە هەموومان لە خۆ بگرێت. دروست نازانم کێ بە تەواوەتی ئەو پێشنیارەی بۆ لایەنە بەرپرسەکان کرد، ئەو ئوتێلە بکرێتە مەڵبەندی کۆبوونەوەی ئاوارەکان. لە ماوەی دوو سێ ڕۆژدا هێند ئاوارە هاتن ئیدی جێگایەکی خاڵی نەمایەوە. وای لێهات من و سامیری بابلی لەوە دەترساین ژوورەکەمان لێبستێننەوە. دەبایە هەموومان ناوی خۆمان

لە بنکەیەکی تایبەتی ئاسایش تۆماربکەین کە تازە بە تازە دامەزرابوو، شەوانە نوێنەری حیزبە جیاوازەکان دەهاتن و هەریەک جیا لەوانی تر ئیستیمارەی تایبەتی خۆی پێ پڕدەکردینەوە، بەوەدا هیچ هێزێک کاغەزی هێزەکانی تری نەدەخوێندەوە، دەبایە ئێمە لەیەککاتدا پسولەی و ڕێئاسانی هەموو حیزبەکانمان پێبێت. لە ماوەیەکی کورتدا لە ڕێگای دەستڕەنگینی ئەو وەکیلانەوە کە بەڕێوەبەری دائیرەکان لەدەرەوەی ئۆفیسەکان دایاندەنان، بە پارەیەک کە بەرتەقای بەرهەمی ئیشکردنی چەند ساڵەی من بوو لە تیاتری پرتەقاڵی سپی هەموو ئەو شوناس و ڕەگەزنامەو بەڵگەنامانەمان دەستکەوت کە ئادەمیزادێک بۆ ژیان پێویستی پێیەتی. لە گیلاسی سپیشدا ژوورەکەی خۆمان وەک ژووری دوو زیندانی هەڵهاتوو تۆمارکرد کە جێگایەکی تریان لەسەر ئەم ئەستێرەیە نییە.

سامیری بابلی دڵنیابوو ناتوانێت ماوەیەکی درێژ لەو ئوتێلە غەمگین و سووتاوەدا بژی، بە پێچەوانەی منەوە کە بڕیارم دابوو گەر لێم بگەڕێن تا مردن لەو ئوتێلە دەرنەچم. دواجار من مرۆڤێک بووم هیچ خەونێکی ئەوتۆم نەبوو، لە یادم نییە ڕۆژێک خەونم بە ژیانی خۆشەوە بینیبێت، تا ڕادەیەکی زۆر دڵنیابووم چۆن لەسەرەتاوە بە هەژاری ژیاوم تا کۆتاییش بە هەمان شێوە دەڕوات و هەر بەو جۆرەش حیکایەتەکە کۆتاییدێت. هاتنی ئاوارەکان منی وەک سامیری بابلی نیگەران نەکرد، هات و هاواری منداڵان و قیژەقیژی ژنانی زامدارو دڵ بریندار بە جۆرێکی سەیر سامیریان لەو شوێنە هەڵکەند. ناڕەحەتییەکەی لەوەوە نەهاتبوو کە دەنگەدەنگی منداڵان پشوویان لێتێکدەدا، بەڵکو لەوەوە هاتبوو کارەساتی ئەم خێزانانە، کارەساتی وڵاتێکیان بەیادادەهێنایەوە کە دەرهەق بە تراژیدیاکانی سامیر خۆی بە بەرپرسی ڕاستەوخۆ دەزانی. من نەمبینی بگری، بەڵام هەر وەخت باسی هەژاری و لێقەومان و بێدەرەتانی ئەوانەمان دەکرد، شەرمێکی قووڵم لە ڕوخساریدا دەبینی. بۆ من ژیان لە ناو ئاوارەکاندا ژیانێکی خۆش بوو،

هیچ کەسێک وەک خەڵکی ئاوارە پاک و بێگەرد نین. ئەو مرۆڤانەی کە هیچ شتێکیان لەسەر زەوی نییە لە مرۆڤەکانی تر جوانترن، ئاوارەش خەڵکێکن خاوەنی هیچ شتێک نین. ئەوان لای من لە دوو سەرەوە جوان بوون، ئەو کاتەی کە باسی ڕابوردوویان دەکرد و یادی ئەو ڕۆژە خۆشانەیان دەگێڕایەوە کە خاوەنی ماڵ و شکۆو سامان بوون، زۆربەیان لە چیرۆکی ڕابوردووی خۆیاندا درۆیاندەکرد، هەوڵیاندەدا زەرەرو زیانی خۆیان چەندەهاجار گەورەتر نیشانبدەن، ماڵ و حاڵی فەوتاوی خۆیان بە سەدان هەزار دینار دەقەبڵاند، نازانم بۆ کاتێک ئەو چیرۆکانەیان بۆ دەگێڕامەوە وام هەستدەکرد پێیانوایە من دەتوانم شتێکیان بۆ بکەم کە خەڵکانی دیکە ناتوانن بیکەن. بەڵام لەوەش جوانتر ئەو کاتە بوو کە خەونیان دەبینی، بیریان لە خۆری سەرهەڵدانی سەردەمی نوێ دەکردەوە، باسی ئەو ڕۆژانەیان دەکرد کە لەوێ دەربازدەبن و بەسەرفرازی دەگەڕێنەوە بۆ شارەکانی خۆیان، دەگەڕێنەوە سەر ماڵەکانیان، دەچنەوە کوچەو کۆڵانی جاران.

لەو ماوەیەدا گەلەک خێزان هاتن و ڕۆیشتن، بە جۆرێک هەر لە سەرەتاوە من ماندووبووم لە ناسینی خەڵک و ماڵاوایکردن لێیان. من لەو ئوتێلە سووتاوەدا هێندە خێزان و خەڵکم ناسی ساڵانێک دواتر کە ناچاربووم بە هەموو نیشتیماندا بسوڕێمەوە لە زۆر شوێنی ئەم وڵاتەدا خەڵکانێکم تووشدەهاتەوە کە لە بازاڕەکاندا، لە کوچەکاندا، لە قەراغ ڕێگاکاندا دەستیان بۆ بەرزدەکردمەوە و دەیانگووت: کاک جەلادەت ئیسماعیل چۆنی... کاک جەلادەت ئێستا لە کوێی؟. کە دوای تێپەڕینی ئەو ساڵانە، دوای ئەوەی کوردستان بووبوو بە حەوزی پارە، من بە پێکەنین و خۆشییەوە دەمگووت: ها بەڕێز من هەر لە شوێنی خۆمم، هەر لەو ئوتێلە جوانەدام کە تازە بووە بە نیشتیمانی من. زۆربەیان سەیریان لێدەهات، گەنجێکی وەک من لەو چەند ساڵەدا نەمتوانیوە خۆم دروستبکەم.

هەندێکیـان حورمەتێکـی زۆریـان لێدەگرتـم، هەندێکیـان جلوبەرگـی کۆنـی خۆیانیـان بـۆ دەپێچامـەوەو دەیاندامـێ، هەندێکیان هەواڵـی هەندێـک کـەس و خێزانـی تریـان دەپرسـی کـە مـن یـادم نەمابوون، هەندێکیان لـەلاوە پارەیـان دەخسـتە گیرفانـم. مـن سـەرەتا لـە بەرچـاوی ئـەوان بـە خۆشـحاڵییەوە هەمـوو شـتێکم وەردەگـرت، جلەکانـم وەردەگـرت، پارەکانـم وەردەگـرت، وردە دیـاری و شـتە بچوکەکانـم وەردەگـرت و دواتـر لـە هـەر شـارێکەوە نزیکبامایـە دەچـووم هەمـوو شـتەکانم لـە مزگەوتێـک یـان لـە جێگایەکـی بەرچـاودا دادەنـاو دەڕۆیشـتم، هەمـوو شتەکان، هەتـا پارەکانیش، بە جۆرێک لـە جـۆرەکان خـۆم بـە شایسـتەی هیـچ جـۆرە یارمەتییـەک نەدەزانـی. لـە ڕاسـتیدا مـن کۆمەکی دالیـا سـیراجەدین نەبێت، پێویسـتیم بـە کۆمەکـی هیـچ مرۆڤێکـی تـر نەبـوو. مـن سـەرەتا زۆربـەی ڕۆژ لـە بەردەرکـی ئوتێلەکـەدا دەوەسـتام و یارمەتـی ئـەو خێزانانـەم دەدا کـە ماڵیـان دەهێنایـە ژوورێـک لـە ژوورەکانـی ئـەو ئوتێلـە، نوێنەکانـم بـۆ هەڵدەگرتـن منداڵەکانیانم سەردەخست، بـارە قورسـەکانیانم دەخسـتە سەرشـانم، ئەگـەر ژوورەکانیـان پێویسـتی بـە پاککردنـەوە هەبایـە یارمەتیمـدەدان، ڕۆژانـی دواتریش بـەردەوام تەنەکـە ڕۆن و ئازوقـەم سەردەخسـت، دەبـەی نەوتـم تـا قاتـی هەشـتەم دەگەیانـد، بوتڵـی غـازم دەنایـە سـەر شـانم و هەڵمدەگـرت بـۆ ئاسـمان. مـن لـە ڕۆیشتنیشـدا کۆمەکـی خەڵکـم دەکـرد، هەمـان ئـەو کارەم بـۆ دووبارەدەکردنـەوە، شـتەکانم لەگەڵـدا دادەگرتـن، نوێنـم لەگەڵـدا دەپێچانـەوە، مەلۆتکـەم بـۆ دادەبەزانـدن، بێشـکەم بۆ دەگەیاندنـە بـەر پیکابەکـە. هەمـوو ئەوانـەی «گێلاسـی سـپی» یان جێدەهێشـت زۆربـەی وەخـت پەیمانـی ئەوەیـان دەدامـێ کـە سـەرم لێدەدەن، سوێندیان دەخـوارد کـە دەگەڕێنـەوەو داوەتمدەکـەن، بەڵام لە ڕاسـتیدا هەرگیز ڕێکەوتـی نەکـرد هیـچ یـەک لەوانـە بگەڕێنـەوە و سـڵاویشـم لێبکـەن. دەبێت بڵێم مـن لـە گێلاسـی سـپی لەسـەر هەمـان ڕەفتـارو کرداری خـۆم بەردەوامبـووم بەوەی کچـان و ژنانـم بـە قسـە خۆشـەکانی خـۆم دەبزوانـد، ئـەوە دەردێکـی

کوشندەیە مرۆڤ لە عەشقدا زمانێکی هاری هەبێت و کرداری نەبێت. دەبێت بزانن ئافرەت باڵدارێکی عەجیبە، هەردوو شتەکەی لە پیاو دەوێت، واتە گەر پیاو تەنیا کرداری هەبێت و خۆی مەڕێکی شەرمن و بێدەنگ بێت، وەک زۆربەی پیاوی وڵاتی ئێمە، ئەوا ژنان وەک ئاژەڵێکی بێدەم و پل سەیریدەکەن، گەر وەک منیش هەر دەمی هەبێت و کرداری نەبێت، وەک زۆربلێیەکی ڕەزاقورس تەماشایدەکەن. واتە هونەری لاواندنی ژنان و کچان، هونەرێکی دوو سەرەیە، سەرەتا بەو قسە لووسانە دەست پێدەکات کە من مامۆستایەکی گەورەبووم تیایدا، پاشان دەبێت دەستت کەمێک ئیشبکات، دوای ئەوە جارێکی تر زمانت، دوای ئەوە دەستت، دوای ئەوە زمانت، دوای ئەوە دەستت و دوای ئەوە زمانت و دوای ئەوە شتی تر و... هەتا دوایی. من لەو کەسانەبووم کە دەمتوانی تەنیا قۆناغی یەکەم ببڕم، پاشماوەیەکی کەم هەموو کچان و ژنانی ئەو ئوتێلە منیان دەناسی، هەموو بڕوایان پێمبوو، کەس ترسی لەوە نەبوو من شتێک بقەومێنم. ڕەفتاری من بەجۆرێک ئاشکراو لە ڕوو بوو پیاوەکانی گێلاسی سپیش دەیانزانی چۆنم، ناووناوبانگی من وەک کوڕێکی باش لەسەروو گومانەوەبوو. بەڵام من جگە لەودیوە ئاشکرایە، دیوێکی نهێنیشم هەبوو کە کەس نەیدەزانی، من لەوێ سێ نهێنیم هەبوو، سێ نهێنی گەورە، یەکەمیان نهێنی من و دالیا سیراجەدین بوو، نهێنی ئەو تارماییەی دالیا بوو کە دەمبینی، نهێنی دووەمیشم نهێنی ئەو باڵدارە خورافیانە بوو کە دواتر من بە کەسێکی زۆر سەیر دەناسێنن، سێیەمیش ئەو هاوارە سەیرانەی لە تاریکیدا دەمبیست و سامیری بابلی بەردەوام دەیگووت: ئەوە دەنگی ڕابوردووە. لەنێو ئاوارەکاندا کەس ئاگاداری نهێنییەکانی من نەبوو. من لەو ماوەیەدا چەند جارێک دالیا سیراجەدینم بینی، چەند جارێک شەوان لە تاریکییەکەدا دەردەکەوت، هەمیشە لەسەر پلیکانەکان دەمبینی یان سەردەکەوت یاخود دەچووەخوارێ، هەمیشە لە شوێنێکدا وندەبوو، بەڵام من دەمتوانی

بۆنییکەم. هیچ جارێک لەو جارانە قسەی لەگەڵ نەکردم، تەنیا خۆی نیشاندەدام و دەڕۆیشت، وەک ئەوەبوو بیەوێت دڵنیابم کە ئەو ئاگای لە منە، ئەو لەگەڵمدایە، هەمیشە ئەو جلە سەیرو جوانانەی لە بەردابوو کە لە تیاتری پرتەقاڵی سپی لەبەریدەکرد. لە دالیاش بترازێت، ئەو باڵندە سپییانەبوون کە دەمبینین، من لە هەفتەی یەکەمەوە لەو ئوتێلەدا، لەو باڵکۆنە چکۆلانەیەوە ئەو باڵدارە سپییانەم بینی، کە تێکەڵەیەک بوون لە کۆترو سیمرخ بەوجۆرەی لە هەندێک وێنەی کۆندا بینیبووم، باڵندەیەکی سپی سپی، بە جەستە گەورەتر لە باڵدارێکی ماڵی و شارنشین، بەڵام جوانترو ئارامتریش لە باڵدارێکی کێویی. ئەو باڵدارانە بە جۆرێکی سەیر لە ئاسماندا دەفڕین، هەندێجار بە جۆرێکی سەیر لێم نزیکدەبوونەوە، من نەمدەزانی ئایا خەڵکانی تر ئەو باڵندانە دەبینن یاخود نا. ڕۆژێک لە ڕۆژان من بە ناو بازاڕدا دەڕۆیشتم، بە ناو بازاڕێکی زۆر قەرەباڵغدا، هەستمکرد ئەو باڵندانە بە دوامەوەن، دیمەنێکی سەیربوو پیاوێک بە شەقامێکدا بڕوات و دەیان باڵندەی سپی دەوریبدەن و بەسەر سەریدا بفڕن... من دەڕۆیشتم و باڵدارەکان بە دوامەوەبوون، وەک ئەو کاتە نەبوو کە لە ئۆردوگای ئاوارەکان دوامدەکەوتن، دەهاتنە سەر چادرەکەم، لەسەر درەختە نزیکەکان دەنیشتنەوە، بەڵکو جوانترو شاعیریانەتر دەفڕین. من دەمبینی بە نێو خەڵکەکەدا فڕکەیان دەهاتن، لەو قەرەباڵغییە گەورەیەدا بە پۆل خۆیان دەکرد بە ناو حەشاماتە گەورەکاندا، وەک کۆمەڵێک تارمایی کە بەربەست و ڕێگرەکان نایانوەستێنێت... دەفڕین و بەر هیچ شتێک نەدەکەوتن، وەک کۆمەڵێک باڵداری سەرابی، سینەو جەستەی ڕێبوارەکانیان دەبڕی و پێش من دەکەوتن. من سەرەتا ترسێکی گەورەم لەو باڵدارانە هەبوو، ترسێکی گەورە گەورە، بەڵام دواتر تێگەیشتم کە ئەوانە باڵندەی منن. دەبێت بزانن کە من لەو زیندەگییە کورت و بێمانایەی خۆمدا پەیوەندییەکی زۆرم لەگەڵ باڵندەکاندا بەستبوو، لەو باڵندە بچوکانەوە کە بە منداڵی خۆشمدەویستن،

تا ئەو هەموو پەلەوەرە کێوییە قەشەنگەی لە گەشتە دوورو درێژەکانمدا لەگەڵ ئیسحاقی لێوزێڕین و سەرهەنگ قاسمدا بینیبووم. ئیتر لەوێوە وەرن بۆ لای مراوییە قەشەنگەکانی باشوور کە لە هۆرە غەمگینەکانەوە بەرەو شاری سۆزانییە ناسک و دڵ پڕ لە غەمەکان دەفڕین، وەرن بۆ لای ئەو هەموو باڵدارەی لە ڕۆژانی شەڕی دووەمی کەنداودا لە ئاوە گەورەکانەوە بەرەو باکوور دەفڕین، بەلام هیچ کات من هەستمنەکردوە کە کۆمەڵە باڵدارێک هەیە باڵداری منن... ئاە من ئێستا دڵنیام مرۆڤ زۆر شتی تایبەتی لە گەردووندا هەیە کە پێی نازانێت، زۆر شت هەن کە شتی ئەون بە تەنیا و شتی هیچ کەسێکی دی نین، گرنگ تێگەیشتن و ناسین و دۆزینەوەی ئەو شتانەیە کە تەنیا و تەنیا شتی تۆن. دیارە دەزانم من ئێستا لەدەرگای چ باسێکی سەخت دەدەم، بەلام باسێکە ئێجگار گرنگە بۆ تێگەیشتن لە هەموو شتەکان. من پێموایە هەڵەی گەورەی مرۆڤ لەوەوە دەست پێدەکات کاتێک پەیوەندی خۆی بە جیهانەوە وەک تەنیا جۆری پەیوەندی تەماشادەکات. واتە گەر مرۆڤێک نەیتوانی لەگەڵ هەورەکاندا قسەبکات، لای وایە ئیدی هیچ مرۆڤێکی دی ناتوانێت لەگەڵ هەورەکاندا قسەبکات، گەر مرۆڤێک نەیتوانی شتی جاوید و نەمر بنوسێت لای وایە ئیدی هیچ مرۆڤێکی دی ناتوانێت شتی جاوید و هەتاهەتایی بنوسێت. گەر مرۆڤێک نەیتوانی بڕوات لە بنی دەریادا ماسییەک ببینێت و خۆشی بوێت لای وایە هیچ کەس نییە بتوانێت لە قوولایی ئاودا حەز لە مەخلوقاتی دووردەست بکات.

منیش بە هەمانجۆر وامدەزانی نابێت و ناکرێت پۆلە باڵندەیەک هەبێت باڵندەی من بن، بەلام ئێستا چۆن دڵنیام لەوەی ئەم چیرۆکە تەنیا چیرۆکی منەو چیرۆکی هیچ ئادەمیزادێکی دی نییە، چۆن دەزانم ئەم ژیانەی لێرەدا دەیگێڕمەوە ژیانی منەو ژیانی هیچ کەسێکی دی نییە، ئاوەهاش دڵنیام کە ئەو باڵندانە باڵندەی من بوون و باڵندەی کەسی تر نەبوون. هەموو

مرۆڤێک هەندێک شتی لە گەردوندا هەیە، مەبەستم ئەوە نییە بڵێم ئەو ماسییەی تۆ لەسەر سفرەکەت دایدەنێیت و دەیخۆیت، ئەو ماسییەی کە لە دەریایەکی دووردا ژیاوە، لەوانەیە بە ئۆقیانوسە گەورەکاندا گەشتی شاعیریانەی کردبێت، لە ئەزەلەوە ماسی تۆ بووە، لە بناغەی وجودەوە هێزێک بۆ تۆی دیاریکردوە، نا... من بەو مانایە قسە ناکەم، من مەبەستم ئەوەیە کە زۆر شت لە گەردوندا هەن دەیانەوێت تۆ بدوێنن، نامەی تایبەتیان لە سروشتەوە بۆ تۆ پێیە، کاتێک تۆ ناتوانیت لەو نامانە تێبگەیت، خۆت ماندووناکەیت بیکەیتەوەو ناوەکانی ببینیت و شفرەکانی تێبگەیت، ئەو نامەیە دەڕوات و بۆ هەتا هەتایە لە دەستتدەچێت. وەک سروەیەکی هێمن کە لە بەیانیدا هەڵدەکات، سروەیەک کە هەموو ناسکی سروشتی هەڵگرتووەو بۆ ئێمە لە دوورەوە هاتووە، تۆ ئازادیت پەنجەرەکەت بکەیتەوەو بۆنی سروشت بکەیت، ئازادیت پڕ بە سینەت ئەو نەسیمە هەڵمژیت و لە سیحری ئەو بنۆشیت، گەر تۆ پەنجەرەکەت نەکردەوە ئەوا ئەو سروەیە بۆ تۆ نییە، چونکە یەکێکی دی لە شوێنێکی دیکەدا پەنجەرەکەی کردۆتەوە و هەوا هەڵدەمژێت. ئەوە سروەی ئەو کەسەیە کە چاوەڕوانیدەکات.

ئەو باڵندانەش باڵندەی من بوون، من لە ساتێکدا وەستام و هەستمکرد کە پەیامێکیان بۆ من پێیە، پەیامێک کە ئەو کات نەمدەزانی چییە. ئەو ڕۆژەی کە تێگەیشتم ئەو باڵندانە باڵندەی منن، دەمتوانی باشتر و ڕوونتر بیانبینم، کە لە شتێک دڵنیادەبیت ئیدی پەیوەندیت لەگەڵیدا دەگۆڕێت. پەیوەندی من لەگەڵ ئەو باڵندانەدا وەک پەیوەندی باغەوانێکی لێدەهات لەگەڵ گوڵەکانیدا. وەک چۆن ئێمە چەندە گوڵمان خۆشبوێت، پەنجەمان لە ناسکیدا هێشتا ناگاتە ناسکی پەنجەی باغەوان و هەردەم غەریبییەک لە نێوانماندا دەمێنێت. منیش بۆ باڵندەکانی خۆم وەهابووم، من سەروکارم لەگەڵ هەر باڵدارێکدا بووبێت، هەمیشە وەک دەستێکی غەریب وابووم کە لە دوورەوە بێ موحیبەتێکی قووڵ و ناسینێکی ڕاستەقینە دەستی سڵاو

درێژدەکات، بەڵام بۆ ئەو باڵدارە سپییە سەیرانە چەشنێکی دیم لێدەهات. ئەو باڵدارانە باڵداری من بوون. شەو کە دونیا خامۆشدەبوو کە سامیری بابلی دەخەوت، باڵندە سپییەکانی من دەهاتنە ژووریَ، یاخود من دەچوومە دەریَ بۆ بەر باڵکۆنەکەم و لە دوور دەمبینین وەک پەڵەیەک هەوری سپی بەرەو لای من دێن، لە نزیکم دەنیشتنەوە، لە سەر شان و سەرم ئارامیاندەگرت. هەندێک شەو من دەچوومە دەریَ، بۆ گەڕانێکی کورت بە کوچەو کۆلانەکانی دەوروبەری ئەو ئوتێلە سووتاوەدا، هەستمدەکرد لەگەڵمدان، دەمبینین بەسەر سەربانی ماڵ و باڵەخانە نزیکەکاندا دەفڕن، هەندێجار بە پۆل لەسەر درەختە گەورەکان دەنیشتنەوەو بە پۆلیش دەفڕین. من ئەو کات بە تەواوەتی لە حیکمەتی ونبوون و دەرکەوتنیانم نەدەزانی. بەڵام هەندێک شەو کە ئەو هاوارە نەناسراوە لە قووڵایی تاریکییەوە سەری دەردەهێنا، ئەو بانگە سەیرەی لەو بەری زوڵمەتەوە منی بانگدەکرد، من هەندێجار وەک شێت دەکەوتمە کۆلانەکان، وەک شێت لەو ئوتێلە سووتاوە دەهاتمەخواریَ و لە بەر دەرکی ئوتێلەکەدا دەمقیژاند «کێیە من بانگ دەکات؟»، بەڵام هیچ کەس وەڵامی نەدەدامەوە... سەدای غەمگینی خۆم لەوسەری شەوەوە دەهاتەوەو جگە لە ترس و ناکامی هیچی دی لەگەڵدا نەبوو. هەندێک شەو کوچە بەدوای کوچە لە دوای ئەو هاوارە دەڕۆیشتم و باڵندەکانیش بەدوامدا دەهاتن... هەموو شەو دەگەڕاین و هیچ شتێکمان چنگ نەدەکەوت.

ڕۆژێکیان من چووم بۆ گوزەری ئاسنگەران، لەویَ پرسیارم لە موحسینی لوولەساز کرد، پیاوێکی چکۆلانەیان نیشاندام کە کڵاوێکی گەورەی لەسەردا بوو، دیاربوو چاوی بە دیار کوورە و گوێی لەسەر دەنگی ئەو چەکوشە گەورانە کزبووبوو کە بەردەوام لە چوارلاوە زرمەیان دەهات. ئەو کات وەرزی بێئیشی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرابوو ئاسنگەران هێدی هێدی شت بۆ ڕۆژانی داهاتوو ئامادەدەکەن، موحسینی لوولەساز سەرەتا بە

کوڕی دۆستێکی قەدیمی خۆی تێمگەیشت، زۆری ویست تا تێمگەیاند من ئەونیم، من ناسیاوێکی جەلیلی بارانم. پیاوێکی بەڕێزبوو، ئاسنگەرەکان هەرچەندە زۆر سەروکاریان لەگەڵ چەکوش و قوڵ و بازوودایە، بەلام خەڵکانێکی زۆر هێمن و پرموحیبەتن، پێدەچێت شەڕی بەردەوامیان لەگەڵ ئاسندا، کارێکبکات ڕۆژانە هەموو شەڕانگێزی خۆیان لەو پارچە تەنەکەو لەوح و ئاسنانەدا بەتاڵبکەنەوە کە ڕۆژ لەگەڵ شنەی بەیانیدا تاخۆرئاوا دەیکووتن. موحسینی لوولەساز تا گەڕانەوەی جەلیلی باران منی لای خۆی دانا، کە جەلیلی باران گەڕایەوە سەرەتا منی نەناسییەوە، پێیوابوو یەکێکم هاتووم پەنجەرەیەک بدەم بەکردن یان لەوحێکی چینکۆ بکڕم، کە پێمگووت: من جەلادەتم، ئەو کوڕەم کە لە باشوور لە خەستەخانەکەی دکتۆر موسای بابەکدا تۆم تیمارکرد. کەمێک ڕەنگی سپی بوو، دیاربوو لەوە دەترسا باوکی شتێک لەو گەشتە سەیرانەی ئەو لە شاری زەردی سۆزانییەکاندا بزانێت. من بە ئەسپایی تێمگەیاند کە من بۆئەوە نەهاتووم حیکایەتی ئەو لەگەڵ سۆزانییەکاندا بۆ باوکی بگێڕمەوە، من بۆ شتی دیکە هاتووم. خۆشحاڵ بوو کە من تەواو لە مانای تێکچوون و ترسەکانی تێدەگەم، بەلام پێدەچوو باوەڕنەکات کە من دەبینێت، پێدەچوو لەو ماوە کورتەدا هەموو ئەو ڕۆژە تاریک و سەیرانەی بیرچووبێتەوە. من بە ئارامی لێم پرسی: دەتوانیت یارمەتیم بدەیت؟. پرسی: یارمەتی؟ چ جۆرە یارمەتییەکت دەوێت؟. من بە غەمگینییەوە گووتم: کارێکم بۆ بدۆزەوەو بمناسێنە بەو گەنجانەی کە ئێستا لەم شارەدا خەریکی مۆسیقان. بە کەمێک بێتاقەتییەوە گووتی: بە مەرجێ درۆ نەکەیت، نەڵێیت من جەلادەتی کۆترم... تێگەیشتی، لەبەرئەوەی هیچ کەس باوەڕت پێناکات، دوای ئەوە تۆ بە یارمەتی خۆت دەزانیت مۆسیقا لێبدەیت؟

من ئەو ڕۆژەم لە یادبوو کە ئەو و هاوڕێکانی بە دەم گۆرانی «ماملێ» وە خۆیان کرد بە پرتەقاڵی سپیدا، من لەسەر سەحنەکە فلووتم لێدەدا، بەلام

دڵنیابووم منی نەبینیوە، چونکە پیاوان کە دەهاتن، بە جۆرێک لەسەیری کچە سەماکەرو گۆرانیبێژەکاندا نوقمدەبوون مۆسیقارەکانیان نەدەبینی. چارەنوسی مۆسیقارەکان لە وڵاتی ئێمەدا ئاوهایە، لەسەر شانۆبن و لەسەر شانۆ نەبن کەس نایانبینێت. دیاربوو ئەو ڕۆژە منی لەسەر سەحنەکە نەبینیوە، تەنیا ئەو بەشەی لە یادبوو کە لە ماڵی دکتۆر بابەک پێکەوە قسەمانکردبوو. بۆئەوەی ڕازیبکەم گووتم: من جەلادەتی کۆتر نیم، من ناوم جەلادەت ئیسماعیلە. هیچ شتێک لە مۆسیقا نازانم... هیچ شتێک، تەنیا حەزدەکەم مۆسیقارەکان بناسم. من پیاوێکی بێکەسم، ئێستا لەگەڵ ماڵە ئاوارەکاندا لەو ئوتێلە سووتاوەدا دەژیم، پێویستیم بە کارە، هیچ کەسێکی وەها ناناسم کۆمەکم بکات، بۆیە هاتووم بۆ لای تۆ.

جەلیلی باران وەعدەکەی خۆی لە یادبوو، گووتی: ئەمشەو من لەگەڵ کۆمەڵێک مۆسیقاردا وەعدم هەیە، دەتوانیت لەگەڵمدا بێیت.

من لە ڕاستیدا دەمویست کۆمەڵێک مۆسیقار بناسم، دەمویست بزانم بەڕاست خەڵکانێک هەن ناوی ئەو مۆسیقارە چکۆلانە گەڕۆکانەیان بیستووە کە چەند ساڵێک لەمەوبەر بە ناو پێدەشت و چیاکاندا سەفەرێکی درێژیان کرد، موعجیزەیان سازکرد، بە مۆسیقا مردوویان زیندووکردەوە؟ دەمویست بە دوای خۆمدا بگەڕێم، بە دوای جەلادەتی ڕاستەقینەدا، جەلادەتێک کە لە بیابانەکانی باشووردا مردبوو.

* * *

دە کەس بوون، لە ژێر زەمینێکی دوکەلاویدا کۆبووبوونەوە، دە کەسی لە یەکتر جودا، لە ژێر زەمینێکدا سەقفێکی زۆر نزمی هەبوو، هەر دەیان دەموچاویان غەمگین بوو، دەکەس بوون وەک لە تابلۆیەکی دێرین ڕایانکردبێت سیمای سەردەم و زەمانێکی تریان هەبوو. گەنج

بوون، بەڵام پێدەچوو لە ڕۆژگارێکی گەلەک کۆنەوە هاتبن، وەک ئەوەی لە مێژە خەوتبن و ئێستا زیندووبووبێتنەوە. چاویان خەواڵوو و هەستیان پەرت. هەر یەکەیان خەریکی ئامێرێکی مۆسیقا بوو، هەر یەکەیان بە تەنیا شتێکی جیاوازی عەزفدەکرد. تیپێکی مۆسیقایان دروستکردبوو ناوی تیپی «بەلەمی بەفر» بوو. جەلیلی باران لەو تیپەدا فلووتی لێدەدا، کە ئێمە چووینە ژوورەوە، کەس تەماشای منی نەکرد... دڵنیابووم هەندێکیان منیان بینیوە، بەڵام کەس بە تەواوەتی سەری بەرزنەکردەوە سڵاوم لێبکات. یەکێکیان لە سوچێکی ژێر زەمینەکەدا کتێبی دەخوێندەوە، یەکێکی دیشیان لە سوچێکدا لە پێشدەم سێ پایەکی وێنەکێشاندا وێنەیدەکرد... سەیربوو ببینیت لە ناو ئەو هەموو مۆسیقارەدا کە هەر یەکەیان شتێک عەزفدەکات کە لەوانی دی ناچێت، یەکێک بخوێنێتەوە و یەکێک نیگار دروستبکات. هەموو بە جۆرێک لە دونیای خۆیاندا ڕۆچووبوون، هەستت نەدەکرد هیچ ئادەمییەک لەوان ئاگای لەوانی دیکەیە، ئەوەی سەیربوو ئەو لەوحە گەورەیە بوو کە یەکێک بە دەستوخەتێکی ئێجگار جوان نوسیبووی، «ئەی بەلەمی بەفر... هەڵمگرە بۆ شارێکی دوور... بۆ شارێک نە شەیتانی لێیەو نە خودا.. شارێک نیشتیمانی ئەو مۆسیقارانەیە کە ناتوانن بمرن». تابلۆیەکی گەورەش لەسەروو ئەو شیعرەوە بوو، تابلۆی کەشتییەکی گەورەی سەهۆڵ، کەشتییەک لە شەختەی سپی، لە ناو دەریایەکی هێمن و ئارامدا کە هاڵاوێکی گەرمی لێهەڵدەستا و چین چین بوخاری دەکرد. من لە جەلیلی بارانم پرسی: هاوڕێم، ئێرە کوێیە، ئەم شیعرە مانای چی؟ بۆ ئەم تیپە ناوی تیپی بەلەمی بەفرە؟. جەلیلی باران بە ئەسپایی گوتی: ئەوە شیعری محەمەدی فیردەوسییە، ئەو کوڕەی لەویادا ڕەسمدەکات، ئەو کەشتییەش کە دەیبینیت هەر ئەو نیگاریکردوە، شاعیرو شێوەکارە. دوایی دەتوانیت لێی بپرسیت... ئێستا وەرە تا تەواو دەبن، من و تۆ شتێک بخۆین. لە جەلیلی بارانم پرسی: ئێوە چی دەکەن لێرەدا، ئاهەنگ و شت

پێشکەشدەکەن، لەگەڵ گۆرانیبێژەکاندا دەردەچن، یان چی دەکەن؟؟. جەلیلی باران بە هێمنی پێیگووتم: گوێبگرە جەلادەت ئیسماعیل، لەم دەساڵەی دوایدا کۆمەڵێک تیپی زۆر دروستبوون، دەیەها تیپی مۆسیقی، زۆربەیان لەو مۆسیقارانەن کە بۆ ژیان و پارە مۆسیقا دەژەنن، مۆسیقاری ئاهەنگی ژنهێنان و شووکردن و موناسەبات و ئەو شتانەن، لەگەڵ گۆرانیبێژە دەنگ ناخۆشەکاندا عەزفدەکەن، مۆسیقاری بەرپرسە سیاسییەکانن. لەو دەساڵەدا هەمیشە ڕێکەوتووە، مۆسیقارێک بە خەیاڵیدا هاتووە بە خۆی بڵێت: ئەمە مۆسیقا نییە ئێمە دەیژەنین، ئەمە هونەر نییە، مرۆڤ دەبێت بۆ شتێکی تر بگەڕێت، بۆ مۆسیقایەکی تر، بۆ جۆرە هونەرێکی تر، لە هەموو ئەو شتانەی پێشوو بەرزتر بێت، ئەم تیپەی تۆ دەیبینیت لەوانە دروستبووە... لەو مۆسیقارانەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دڵنیابوون ئەوەی لەم شارەدا لێدەدرێت و خەڵکی گوێی لێدەگرن مۆسیقا نییە... ئێمە هیچ نین، ئێمە تیپمان نییە، ئێمە هەوڵی یەک شت دەدەین ئەویش ئەوەیە خۆمان لەو مۆسیقایە ڕزگاربکەین کە لەدەرەوە هەیە.

من گوێم لە جەلیلی باران دەگرت و دەمپرسی: ئەی ئێوە چی دەکەن لێرەدا؟

جەلیل بە هێمنی دەیگووت: بۆ مۆسیقا دەگەڕێین، مۆسیقایەک نەمرێت، مۆسیقایەک لەو مۆسیقایە نەچێت کە لەدەرەوەیە. بۆ نموونە من ماوەیەک لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەدا کە تۆ بینیتن تیپێکی مۆسیقای میللیمان هەبوو، تیپێکمان هەبوو لە ئاهەنگەکاندا هەموو خەڵکمان دەهێنایە هەڵپەڕکێ. بەر لە دوو مانگ، هێشتا زۆرنەبوو بەعسییەکان کوردستانیان چۆڵکردبوو، بەرپرسێکی گەورە ئێمەی بانگکرد ئاهەنگی بۆ بگێڕین... ئاهەنگێکی گەورە بوو، زۆر زۆر گەورە، ژنان بە جوانترین تەرز خۆیان ڕازاندبووەوە، کچانی ناسک لە دە قۆڵەوە هەڵدەپەڕین، من لە ناوەڕاستی ئەو هەرایەدا، لە ناکاو وەستام، وەک ئەوەی تووشی دەردێک بووبم، دەردێکی کوتوپڕ، لە پڕێکدا

دەمم لە شمشاڵەکە بەرداو هەستمکرد ئەمەی من دەیکەم ئیشێکی بێمانایە، ئەمەی من دەیکەم خۆکوشتنە. هەموو ئەم مۆسیقارانەی لێرەدا دەیانبینیت، تووشی ساتێکی وەها هاتوون، ساتێکە ناتوانم بۆت باسبکەم، باسکردنی قورسە.

من دەمگووت: نا جەلیلی باران بۆم باسبکە، تکایە بۆم باسبکە، من دەبێت بزانم ئەو ساتە چییە... زۆرجار هەستدەکەم من لەو شارەی باشوورەوە بۆ کۆمەڵێک شتی زۆر تایبەت گەڕاومەتەوە؟ لەوانەیە یەکێکیان ئەوە بێت کە من ئێستا گوێم لەو حکایەتە بێت.

جەلیلی باران دەیگووت: ساتێکی سەیرە، لە ناکاو شتێک لە ناوتدا دادەگیرسێت، وەک چرایەکی سپی سپی وەهایە، ڕۆشناییەکی بەهێزە، لە ناکاو هەموو شتەکان لە پێش چاوت دەگۆڕێن، من جاران کە مۆسیقام لێدەداو خەڵکم دەبینی هەڵدەپەڕن زۆر دڵم خۆش بوو، دەمگووت: تەماشا من چ جۆش و خرۆشێکم سازکردوە، بەڵام کە لە ناکاو تووشی ئەو دەردە دەبیت، دیمەنەکان و مانای دیمەنەکان هەموویان لە پێش چاوت دەگۆڕێن، من لە ساتێکدا هەموو ئەو خەڵکەم وەک خێڵێکی مەیمون دەبینی کە لەسەر دڵی من هەڵدەپەڕن، لە ساتێکدا تێدەگەیشتم ئەو هەڵپەڕکێیە هیچ نییە جگە لە هونەرێکی نزم کە هەست و نەستمان سڕدەکات، بۆئەوەی نەتوانین شتێکی قووڵترو جوانتر ببینین. من ئەو ساتەی دەمم لە شمشاڵەکە بەردا، ناخۆشترین و خۆشترین ساتی ژیانم بوو، ناخۆشترین سات بوو چونکە زانیم من مۆسیقار نیم... بە خۆمم گووت: جەلیلی باران، لێو لەو ئامێرە بەردەو بەشەرەفەوە بگەڕێوە بۆماڵێ، تۆ بە تەمای چییت؟ دەتەوێت بەم مۆسیقا تۆپیوەی خۆت بڵێی مۆسیقا، لەو ساتەدا هەستمکرد من لە ژیانمدا هەرچییەکم کردوە بە زایە چووە و لە خۆڕا بای شەوگار بردویتی. بێئەوەی هیچ بڵێم لە شانۆکە هاتمەخوارێ و ڕۆیشتم. ئەو شەوە نەچوومەوە بۆ ماڵێ، جەلادەت ئیسماعیل وەک شێت ڕۆیشتم بۆ قەراغ شار، لەوێوە بە

چیایەکدا سەرکەوتم، شار تاریک تاریک بوو، من لەسەریکەوە دەگریام و لەسەریکەوە خۆشحاڵ بووم، دەگریام و ئارام دەبوومەوەو هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد. ئاسوودەبووم لەوەی ئێستا دەزانم چیم دەوێت، دەمزانی بۆ رامکردوە... بەلام نەمدەزانی دەبێت چی بکەم؟. بۆ رۆژی دوایی هاورێکانم دەیانویست تێبگەن بۆ وام بەسەرهاتووە، دەیانویست بزانن لە ناکاو چ جرو جانەوەرێکم بینیوە تووشی دەردی وەهای کردوم؟. من تەفسیرێکی تەواوم نەبوو، بەلام دەمزانی جارێکی تر مۆسیقای وەها لێنادەمەوە، لەگەڵ ئەواندا ناچمەوە سەر سەحنە. ئەو شەوە کە وێڵ و بێئاراستە بەسەر زەویدا دەسوڕامەوە دەزانی بیرم لە چی دەکردەوە؟ بیرم لە جەلادەتی کۆتر دەکردەوە، بیرم لە تۆ دەکردەوە کە گووتت من جەلادەتی کۆترم. نازانم بۆ ناتوانم باوەڕت پێبکەم کە تۆ جەلادەتی کۆتریت... بۆ نابیت تۆ ئەو بیت؟ بۆ نابێت تۆ ئەو بیت؟

ساتێکی قورس بوو بۆ من، نەمدەزانی بڵێم چی. دەمویست بڵێم من جەلادەتی کۆترم، بەلام من ئەو نەبووم، دەمویست بڵێم من جەلادەتی کۆتر نیم، بەلام من ئەوبووم. بە هێمنی سەرم باداو گووتم: بەڕاستی نازانم چیت پێبڵێم.

ویستم بە کۆمەڵێک گوزارەو ڕستەی بێمانا حیکایەتەکە تێپەڕێنم، پاش ئێستێک گووتم: مرۆڤ ئازادە لە چ گۆشە نیگایەکەوە سەیردەکات، ئێمەی مرۆڤ بە جۆرێک ئاڵۆزو تێکەلاوین زۆرجار خۆمانمان لێوندەبێت، زۆرجار وا هەستدەکەین شتێکین و دواتر بۆمان ئاشکرا دەبێت کە وانییەو ئێمە ئەو شتە نین، زۆرجاریش بە پێچەوانەوە پێمانوایە هیچ نین و سەیردەکەین شتێکین.

جەلیلی باران بە وردی گوێی لە وەلامەکەم گرت و گووتی: تۆ پێت وایە رۆژێک لە رۆژان جەلادەتی کۆتر بوویت؟.

پرسیارێکی کوشندەبوو، من بێئەوەی تەماشای بکەم گووتم: بەڵێ من

پێم وایە، ڕۆژێک لە ڕۆژان جەلادەتی کۆتر بووم.

بە جیدیەتێکی سەیرەوە دەستی گرتم و گووتی: کەواتە تۆ دەتوانی فلووتێکی سیحراوی بژەنیت؟ دەتوانیت؟ قسەبکە دەتوانیت یان ناتوانیت؟

بە کەساسییەکەوە گووتم: ناتوانم، جەلیلی باران ناتوانم... تۆ دەزانیت کە ناتوانم، ئیدی بۆ ئەو پرسیارەم لێدەکەیت؟

بە هەموو هێزی خۆی دەستی کێشا بە مێزەکەی بەردەمماندا و گووتی: کەواتە بۆ درۆدەکەیت؟ بۆدەڵێیت من جەلادەتی کۆترم؟

من کە دەترسام پەلامارم بدات، دەستم گرت و بە سەبرێکی زۆرەوە گووتم: لە بەرئەوەی من ئەوم، جەلیلی باران، لەبەرئەوەی من ئەوم و کەسی دیکە نیم.

بەسەرسامییەوە پرسی: کەواتە چۆن ناتوانیت فلووتێکی قەشەنگ بژەنیت؟

گووتم: جەلیلی باران، چیرۆکەکەی من بە پێچەوانەی چیرۆکەکەی تۆوەیە. تۆ شمشاڵی خراپت لێدەداو لە ساتێکی ئیشراقدا تێگەیشتی کە ئەمە مۆسیقایەکی جاوید نییە، ئەمە ئاوازێک نییە ڕۆحی مۆسیقای تیا بەرجەستەبێت. من بە پێچەوانەی تۆوە مۆسیقایەکی مەزنم لێدەدا و لەساتێکدا دەبایە بگەڕێمەوە بۆ دواوە، دەبایە ببم بە مۆسیقارێکی خراپ، بۆئەوەی بژیم، دەبایە بژیم و زیندووبم... ژیان لە مۆسیقا گرنگترە.

بە غەمێکەوە سەری باداو گووتی: من لە تۆ تێناگەم، لە تۆ تێناگەم.

دەمزانی ئاسان نییە هەموو ئەو چیرۆکە دووورودرێژەی بۆ بگێڕمەوە. ئاسان نییە کە باسی مردن و زیندووبوونەوەی خۆمی بۆبکەم، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو گووتم: ئاغای باران ئەوە چیرۆکێکی زۆر دوور و درێژە. لەو چیرۆکانەیە کە تاڕادەیەک نامۆیی مۆسیقا و هونەرمان لەسەر ئەم ئەستێرەیە بۆ دەگێڕنەوە... بە هەرحاڵ لە بیریبکە، من ئێستا جەلادەت

ئیسماعیلم نەوەک جەلادەتی کۆتر. خۆ من یەکەم مۆسیقاریش نیم لە ناکاو ئەو مەشخەڵەی ناوم کوژابێتەوە، دواتریش ئەوە حیکایەتێکی کۆنە، کاتێکی بەسەردا تێپەڕیوە، ئێستا زیاد لە چوار ساڵە مۆسیقار نیم، تەنیا لاشەی مۆسیقارێکم و بەسەر زەویدا دەڕۆم. چاکتریش وایە هیچ کەس نەزانێت من جەلادەتی کۆترم...

چەلیلی باران کەمێک هێوردەبووە، بە وردی سەیریدەکردم. نەیدەزانی چی بکات، باوەڕم پێبکات یاخود نا؟. من بۆئەوەی ئارامتری بکەمەوە گووتم: پێویست ناکات دوودڵ بیت، پێویست ناکات. ئەو جەلادەتی کۆترەی کە تۆ ناوت بیستووە کە مۆسیقارەکانی دی ناویان بیستووە، ئەو جەلادەتە مردووە، لە بەرئەوە چاکترە وا تێنەگەیت کە من جەلادەتی کۆترم... من ئێستا پیاوێکم بۆ ئیشێکی چکۆلانە دەگەڕێم لێی بژیم، حەزدەکەم هەندێجاریش دانیشم و بە ئارامی گوێ لە مۆسیقا بگرم... لەوە بترازێت هیچم ناوێت... چونکە ژیانم پڕە لە مۆتەکەو خەیاڵ و تارمایی. بەشی هەموو ژیانم یادگارم لایە کە دەمەوێت بۆیان بژیم، سەرم پڕە لە دەنگەدەنگ و هاوار، یەکێک وەک من سەری پڕ بێت لە سێبەری مەخلوقاتی سەیر ناتوانێت زۆر بە ئارامی و شاعیریانە بیر لە مۆسیقا بکاتەوە.

هەستمکرد بە گومانێکی زۆرەوە گوێم لێدەگرێت، تۆزێک کورسییەکەی لە مێزەکە دوورخستەوەو گووتی: کەوایە بۆ دەتەوێت مۆسیقارەکان بناسیت؟ چ کارت بە مۆسیقارەکان هەیە؟

بە زەردەخەنەیەکەوە گووتم: دەمەوێت جارجارێک ناوی جەلادەتی کۆتر ببیستمەوە، ناوی سەرهەنگ قاسم و ئیسحاقی لێوزێڕین لەسەر زاری ئەم مۆسیقارانە ببیستمەوە... هەستدەکەم ئەوە تۆزێک ژیانم ئاسانتر دەکات. پاشان ڕاستە ناتوانم مۆسیقا لێبدەم، بەڵام لەوانەیە بتوانم قسە لە مۆسیقا بکەم... من بە خۆشحاڵییەوە قسە لە مۆسیقا دەکەم.

دەمزانی چەلیلی باران دەیان پرسیاری لەلایە، بەلام من پێمگووت:

جەلیلی باران، ژیانی جەلادەتی کۆتر لە بیرکە، سوێندم بۆ بخۆ کە لە بیریدەکەیت... خەیاڵی خۆت بەو پرسیارەوە سەرقاڵ مەکە، بپرسیت: من کێم؟. من خۆشم نازانم کێم... شتێکی هێند گرنگیش نییە بزانم من کێم. من ئێستا لە ژوورێکدام لە ناو ئاوارەکانداو ئاسوودەم... زۆر زۆر ئاسوودەم... ژیانم بەتاڵ نییە، شتی خۆمم هەیە بۆی بژیم. هەندێجار سەرقاڵی هەندێک پرسیارو شتی ترم کە پەیوەندیان زۆر بە مۆسیقاوە نییە، وەکو ئەوەی دەپرسم: عەدالەت چییە؟ نەمری چییە؟ پاکبوونەوە چییە؟ حەقیقەت چییە؟. ئەگەر پرسیارێکی وەها نرخیشی هەبێت، ئەوا تەنیا لای خۆم نرخی هەیە: جەلادەتی کۆتر کێیە؟ چی بەسەرهات؟ ئەوە پرسیارێکە دەبێت من بەدوای وەڵامەکەیدا بگەڕێم نەوەکو تۆ. نا جەلیلی باران باباسی من نەکەین... ها بەڵام تۆ پێت نەگووتم، چۆن ڕێگای ئەم تیپەت دۆزییەوە؟.

دوای بێدەنگییەکی درێژ، گووتی: ئاه... ئەم تیپە، مەبەستت ئەم مۆسیقارانەیە، ئێمە تیپ نین، نازانم ئایا ڕۆژێک لە ڕۆژانیش دەتوانین ببین بە تیپ، من محەمەدی فیردەوسیم دەناسی، ئەوم دەناسی، کۆن پێکەوە لە قوتابخانەبووین، ئەو منی دۆزییەوە. ڕۆژێک هات بۆلام و گووتی: ها جەلیلی باران چیتە، بۆ مۆسیقا لێنادەیت؟ ئیدی من هەموو حیکایەتەکەم بۆگێڕایەوە، هەموو چیرۆکی خۆمم بۆ گێڕایەوە. ئەو هەموو شتێکی لەسەر ئەو حاڵەتەی من دەزانی، خۆی ڕۆژێک لە ڕۆژان تووشی شتێکی وەها بووبوو. من و ئەو پێکەوە بیرمانکردەوە، کە تیپێک دروستبکەین... ئێرە شوێنێکی تازەیە، زۆر کۆن نییە، جارێ من نازانم چی دەکەین.

لە دوای ئەو پرۆڤەیە، مۆسیقارەکان بە هێمنی ئامێرەکانیان کۆکردەوەو بەرەو ئەو سەر مێزە چکۆلانەیە هاتن. خاوەنی ئەو ژێر زەمینە محەمەدی فیردەوسی بوو، کوڕێکی سپیکەڵانەی قژ درێژ، وەک خۆی دەیگووت، لە مێژە شیعر دەنوسێت، تەمەنی نزیکی بیست و پێنجساڵ دەبوو، برینێکی قووڵ لاڕوومەتی چەپی تەواو شێواندبوو، شوێنی شەڕەچەقۆیەکی ڕۆژانی

گەنجی بوو. پێشتر وەک کوڕێکی شەڕانی ناسرابوو، تا گەیشتبووە بیست ساڵ لەسەر شەڕە چەقۆ چەندین جار چووبووە بەندیخانە، خەڵکانێک ناویاندەنا محەمەدی ڕامبۆ، دواجار بەهۆی کچێکی ئێرانییەوە کە بە ڕێکەوت لەلای خوشکی یەکێک لە هاوڕێکانی دەیبینێت، فێری فارسی دەبێت، محەمەدی فیردەوسی بە جۆرێک شەیدای ئەو کچە دەبێت هەموو ژیانی دەگۆڕێت، واز لە شەڕەچەقۆ دەهێنێت. بە پارەیەکی زۆر مامۆستایەکی فارسی دەگرێت و لە ماوەیەکی کورتدا هەموو نامە دڵدارییەکانی بۆ خانمی «مریەمی ناسری» بە فارسییەکی پوخت و بێوێنە دەنوسێت، تا بۆ کچەکەی بسەلمێنێت خۆشەویستی شتێکە موعجیزە دروستدەکات. کچەکە کە ئەو هەموو ڕووکارە سەیرو ناکۆکەی محەمەد شەیدای دەکات، لە هەمانکاتدا چیرۆکی عەشقێکی نهێنی لەگەڵ کوڕی یەکێک لە سیاسییە ئێرانییەکانیشدا دەژی. لە ماوەیەکی کورتدا مریەمی ناسری دەکەوێتە نێوان بەرداشی دوو عاشقەوە کە هەردووکیان وەک شێت خۆشیاندەوێت. مریەم کە لە ناوەوە دەبێت بە بوونەوەرێکی برینداری پارچەپارچە، لە ژێر فشاری ئەو هەموو خۆشەویستییەدا نەخۆشدەکەوێت. نەخۆشییەکەی بە جۆرێکە بابی ناچار دەبێت، هەموو سامان و دەسەڵاتی خۆی بخاتەکار بۆئەوەی بە فیزای یەکێک لە گروپە ئێرانییەکانەوە بینێرێت بۆ دەرەوەی وڵات. وەک دەگێڕنەوە مریەمی ناسری لە فەرەنسا لە یەکێک لە خەستەخانە دەرونییەکاندا حەز لە کوڕێکی دیکە دەکات بە ناوی «سفین باسکال» ـەوە. لەگەڵیدا لە خەستەخانەی دەرونی هەڵدێن و شوێن و ئاسەواریان وندەبێت و ئیدی هیچ کەس شتێکیان دەربارە نابیستێتەوە. دیارە محەمەد لە ماوەی چاوەڕوانیکردنی مریەمی ناسریدا بڕیاردەدات هەموو ئەدەبیاتی فارسی لەبەربکات، لە دیوانە دێرینەکانەوە دەست پێدەکات، حافزو سەعدی دەستپێکینی، بە فیردەوسیدا دێت، ئەدیبانی سەردەمی مەشرووتە هەموویان جێدێڵێت و دەگاتە سەر ئەدەبیاتی نوێ، ئەوەی سەیرە ئەو توانا گەورەیەتی

لەسەر لەبەرکردن، بە جۆرێک دەتوانێت شاهنامە لەسەر بۆ ئەوسەری بەبێ وەستان بڵێتەوە. دوای تێپەڕینی ساڵێک بەسەر سەفەری مریەمی ناسریدا، هەتا بۆ یەکجاریش نامەیەکی بۆنانێرێت، محەمەدی فیردەوسی بڕیاردەدات لە ئێرانەوە ڕووبکاتە فەرەنساو لەوێ مریەم بدۆزێتەوە، لەسەر سنوور بەر لەوەی پێبخاتە ئێرانەوە، نیگارکێشێک دەناسێت کە لەو سەر سنوورانە بە جووتێک جزمەوە چیا بە چیا و هەرد بە هەرد دەگەڕێت و تەنیا سروشت نیگاردەکات. محەمەدی فیردەوسی سەرسام لەو گەنجە کە داوای لێدەکات لەگەڵ ئەودا بمێنێتەوەو فێری ڕەسمم بێت، بە شێوەیەکی منداڵانە تەسلیمی سیحری ئەو نیگارانە دەبێت کە ئەو کوڕە لە پێشدەمیدا نیگاریاندەکات. محەمەد کە لە قووڵایی دڵیدا دەزانێت گەڕان بە دوای مریەمی ناسری هیچ نییە جگە لە گەڕان بە دوای وەهمێکی دووردا، لە نیگارەکانی ئەو گەنجەدا زەمینێک و عەشقێک دەدۆزێتەوە کە لای وایە لە خۆشەویستی مریەمی ناسری قووڵترو کوشندەترە، بۆ ماوەی مانگێک لەو چیا دوورانە، لە ناو دارستانەکاندا، لە ناو پاشماوەی گوندە وێرانەکاندا دوای ئەو کوڕە دەکەوێت، وەک ئەو جزمەکانی هەڵدەکێشێت، بە ناو سەنگەری چۆڵ و چیای سووتاو کێڵگەی فەرامۆشدا دەڕوات لە ماوەیەکی کەمدا دەتوانێت وێنەی درەختە سووتاوەکان، خاکە وێرانەکان و گوندە ڕوخاوەکان بکێشێت. ئەو کوڕە گەنجەی کە فێری نیگارکێشانی دەکات لە تواناکانی سەرسام دەبێت، دوای ماوەیەکی کورت دەتوانێت هەر نیگارێکی بوێت بیکێشێت. ڕۆژێک محەمەدی فیردەوسی کە کوڕی شارە نەوەک گوند لە ژیانی ناو شاخ و کێو بێزار دەبێت و بە کۆمەڵێک تابلۆوە کە لە پشتی هێسترێک باریاندەکات، دەگاتەوە گوندێکی نزیک شارو لەوێوە تابلۆکان لە پشتی خۆی دەبەستێت و بە جزمە درێژەکانییەوە خۆی دەکاتەوە بە ماڵدا. محەمەد کە دوای لەبەرکردنی بۆ شاهنامە هاوڕێکانی بە محەمەدی فیردەوسی بانگیدەکەن، کوڕی یەکێک لە موڵکدارە گەورەکانە

کە بابی چەندەها ماڵ و زەوی و ڕیزە دوکانی هەیە. دوای مردنی باوکی ژمارەیەکی زۆر ماڵ و زەوی و موڵکی بەردەکەوێت کە یەکێکیان ئەو ژێر زەمینە نزم و تاریکەیە لە ناوەڕاستی بازاڕدا. فیردەوسی ئەو ژێر زەمینە دەکاتە نیشتەجێی خۆی و تەواوی موڵک و بۆماوەکانی ڕووبەڕووی خوشک و براکانی دەکاتەوەو لەوێکانەدا خۆی بۆ نوسینی شیعرو دروستکردنی تابلۆ تەرخاندەکات.

من لەسەرەتادا هەستم بە نزیکییەک لەگەڵ محەمەدی فیردەوسیدا نەکرد. کوڕێکی داخراو هاتە بەرچاوم کە شتێکی زۆر لە ئەرستۆکراتییەتی خێزانەکەی و غروری ڕۆژانی چەقووەشێنی تیاماوە، وەک یەکێک هاتە بەرچاوم خوێندنەوەی زۆری شیعری کۆنی فارسی و عەشقێکی ناکام پیریانکردبێت. لەو ژێر زەمینەدا وەک سەرۆکێک ڕەفتاریدەکرد، بەڵام جەلیلی باران وەک «مرۆڤێکی بێوێنە و شاعیرێکی گەورە» باسیکرد. ئەو شەوە کێشەیەک لە نێوان مۆسیقارەکاندا هەبوو من هیچی لێ تێنەگەیشتم، ئەو کێشەیە هەستی ئەوەی دا بە من کە میوانێکی ناوەخت و نابەجێم و لە شوێنکاتێکی نالایەقدا گیرساومەتەوە. من قسەیەکی زۆرم لەگەڵ ئەو مۆسیقارانەدا نەکرد.کە زۆربەیان بێئەوەی قسە لەگەڵ مندا بکەن بە توڕەیی ڕۆیشتن. هەندێکی دیکەشیان بە ئارامی شتەکانیان پێچایەوەو خوداحافیزیانکرد. جەلیلی باران منی وەک کۆنە مۆسیقارێک بە محەمەدی فیردەوسی ناساند، ئەو بە ئارامی بەخێرهاتنی کردم و بە پلەکانەیەکدا سەری خستین و بردینی بۆ ژوورێکی دی کە بەسەر حەوشێکی سەوزدا دەیڕوانی، ژوورەکە گەلەک لەو ساڵۆنە ڕوناکتر و ڕاخراوتر بوو، بە فەرشی گەلەک جوان ڕازابووەوە، مێزو کورسییەکی تێدابوو پێشتر بە دەگمەن شتی وەها جوانم بینیبوو. هەوای ژوورەکەو کەلوپەلەکانی ناوی بۆنی سەروەت و سامانێکی سەیریان لێدەهات. ئەوە یەکەمجارم بوو لە ژیانمدا شوێنێک ببینم بۆنی دەوڵەمەندی و زەنگینی لێبێت... خۆتان دەزانن

مـن کـوڕی فەقیریـی بـووم، ژیاننامـەی مـن ڕێکەوتـی وەهـای تێدانەبـوو، هەتـا جارێکیش چییـه ڕێگام نەکەوتبـووه ماڵـی خەڵکانی زەنگین و پـارەدار. سـەیربوو بەلامـەوه خەڵکانێـک پـارەی زۆریـان هەبێـت و کاتـی خۆیـان بـه هونـەرو ئـەو جـۆره شـتانەوه سـەرفبکەن. مـن کۆمۆنیسـت نەبـووم بـەڵام دەبێت بڵێم، بەدرێژایی ژیانـم لـه قووڵایی دڵـەوه ڕقـم لـه خەڵکانی دەوڵەمەند بـووه، هەمـوو وەخـت وەهابـووم، بیـرم نایـەت ڕۆژێـک وەهـا نەبووبـم.

محەمـەدی فیردەوسـی دەیتوانـی سەرسـامی مـن لـه چاوانمـدا بخوێنێتـەوه، بـه نەزاکەتـەوه دەربـارەی ڕابـوردووی مـن هەندێـک پرسـیاری سـەرپێی کـرد. مـن پرسـیارەکانم وەڵامدایـەوەو ویسـتم ڕاسـتەوخۆ دەربـارەی ئـەو دێـڕه شیعره پرسـیاری لێبکـەم کـه لەخوارەوه لەسـەر لوحێکـی گـەوره نوسـرابوو: ئـەی بەلەمـی بەفـر... هەڵمگـره بـۆ شـارێکی دوور... بـۆ شـارێک نـه شـەیتانی لێیـەو نـه خـودا.. شـارێک نیشـتیمانی ئـەو مۆسـیقارانەیه کـه ناتوانـن بمـرن.

مـن بـه هێمنـی لێـم پرسـی: کاک محەمـەدی فیردەوسـی ئـەو دێـڕه مانـای چـی؟

کەمێـک وەسـتاو گووتـی: هیـچ مانایەکـی تایبەتـی نییـه، هێنـد هەیـه کـه هونـەر بـه گشـتی وەک بەلەمێکـی بەفـر وایـه، بەلەمێـک نامانگەیێنێتـه هیـچ جێگایـەک. بەلەمێـک ئەگـەر بیخەینـه نـاو قووڵایـی دەریـاوه، لـه ناوەڕاسـتدا دەتوێتـەوەو نوقمدەبیـن. مـن ئەزموونـی ئـەم چەنـد سـاڵەم لەگـەڵ شـیعرو نیگارکێشـاندا پێمدەڵێت هونـەر جگـه لـه بانگەوازێکـی قـووڵ بـەرەو مـەرگ هیچـی تـر نییـه. ملدانـه بەسـەفەرێک نامانگەیێنێتـه هیـچ.

دەنگـی دڵنیایـی و بـڕوای تێدابـوو، ئاشـکرابوو کەسـێکه دەتوانێت قووڵتـرو تیژتـر لەوانـی دی بڕوانێـت، کـه لـه ژوورەکـەدا دەجوڵایـەوه هـەوای غرورێکـی برینـداری لەگـەڵ خۆیـدا دەگێـڕا. ئێسـتێکیکرد و بـه تێرامانـەوه گووتـی: وەک ئـەوەی یەکێـک بـۆ دوور دوور بانگتبـکات، هاوارێـک لەوسـەری ژیانـەوه بێـت و تـۆ نەتوانیـت وەڵامیبدەیتـەوه. گـەر وەڵامیشـتدایەوه وەک کوێرێکـت لێدێـت

کە پێدەخاتە نێو جەنگەڵێکی چڕو بێڕێگاو بێناونیشانەوە.

سمێڵێکی ڕەشی قەترانی و برۆیەکی ڕەشترو کۆمەڵێک پێڵوی ڕەشی درێژی هەبوو، بەڵام وەک سروشت بیەوێت ناکۆکییەکی جوان لە ڕوخساریدا دروستبکات، ڕیشی بە جۆرێکی سەیر کاڵ و مەیلەو زەردبوو. کە ڕوناکی چراکە لێیدەدا هەموو مووەکانی دەبریسکانەوە، ئەو برینەی سەر دەموچاویشی وەک نیشانەیەک بوو هەرجارەی بە جۆرە مانایەک دەدرەوشایەوە، هەندێجار کە ڕووی گرژدەکرد ئەو برینە شێوەی قوربانییەکی غەمگینی پێدەبەخشی، کە ڕوخساریشی ئارام دەبووەوە، ئەو برینە وێنەی دڕندەیەکی تێدا بەرجەستەدەکرد. بەڵام لە ناو ئەو ژوورە خۆشەدا، لەناو ئەو ئەساسە گرانبەهایەدا، لە نێوان ئەو تابلۆیانەدا کە هەندێکیان چێوەی زێڕینیان هەبوو، وەک مەخلوقێکی نامۆ دیاربوو، لە جانەوەرێکی کێوی دەچوو خستبێتتە ناو قەفەزێکی ئاڵتونەوە، یان هەورێکی زۆر ڕەش لە ئاسمانێکی ساماڵدا. ئەو تابلۆیانەی هەڵیواسی بوون بەشی هەرە زۆریان بە دەست و پەنجەی خۆی نیگارکرابوون، سەرەتا من شتە قەشەنگەکانی ژوورەکەی سەرنجیان ڕاکێشام، جوانی و گرانبەهایی فەرشە فارسییە نوێکان سەرسامیانکردبووم. دۆلابێکی شوشەی هەبوو پڕبوو لە پەیکەری جۆراوجۆر کە زۆربەیان پەیکەری جەنگاوەرگەلێک بوون بە خوێنەوە دەڕۆیشتن و سەیری ئاسمانیان دەکرد. خۆی بە ئارامییەوە فیگەرەکانی وەک کۆمەڵێک پاڵەوانی ناو شاهنامەی فیردەوسی ناودەنا. لەبەرئەوەی من هیچ زانیارییەکم لەسەر شاهنامە نەبوو تەنیا گوێمدەگرت و لە وردەکاری هونەرەکەی ڕادەمام. کاتێک ئەو قسەیدەکرد، من بەوردی تەماشای تابلۆکانیم کرد، توندوتیژییەکی ترسناک لە تابلۆکانیشیدا هەبوو، زۆربەیان نیگاری کوڕ و کچی گەنجی مردوبوون، بەڵام هەرجارەی بەشێوەیەک و لە جێگایەکدا. کوڕی گەنج کە لە تەنیشت دیوارێکەوە کوژراون و بە نیگا هێشتا هەر سەیری ئەستێرە دەکەن. کوڕێکی دی کە لەسەر کورسییەکی

زێڕین دانیشتووه و یەکێک گوللەیەکی ناوه بە نێوچاوانییەوه، بەڵام ئەو پێدەکەنێت. تیپێکی مۆسیقا کە هەموویان بە کۆمەڵێک درەختدا هەڵواسراون و هێشتا ئامێرەکانیان هەر بە دەستیانەوەیە. کچێکی گەنج لە کراسێکی سووردا بەڵام بە خەنجەرێکەوه چەقیو لە ژێر مەمکی چەپیدا گۆرانی دەڵێت. تابلۆکانی محەمەدی فیردەوسی هەموویان باسی مردن بوون... من لەو تابلۆیانەوه تێگەیشتم پیاوێکە پڕە لە نیگارو خەیالاتی مردن.

وەک بیەوێت توانای تێگەیشتنی من تاقیبکاتەوە، گووتی: جەلادەت بەگ، تۆ پێت وانییە، مۆسیقاش زۆر لە مردنەوه نزیک بێت؟

هەموو کەسێکی بە «بەگ» بانگدەکرد، دروست نەمدەزانی ئەوە نیشانەی ڕێزگرتنە، یاخود گاڵتەپێکردن، یان جۆرە عادەتێکە بۆی تەرک ناکرێت. بە ئەسپایی گووتم: تۆ لە شیعرەکەتدا باس لە شارێک دەکەیت کە مردنی تیا نییە، کەواتە مۆسیقا شتێکە پێچەوانەی مەرگ.

بە زەردەخەنەیەکی شەرانییەوه گووتی: هیچ شتێک پێچەوانەی مەرگ نییە، هیچ شتێک.

من بە هێمنییەکی زۆرەوە، بە سەبری پیاوێکەوه بیەوێت وەڵامێکی ڕاستەقینەی دەستبکەوێت گووتم: بەڵام مردن تەنیا ئەوە نییە زەوی جێبهێڵێت... مردن تەنیا ماڵاوایی نییە لەم جیهانە بە مانا مادییەکەی. وانییە؟

گووتی: هەموو مرۆڤێک تابلۆیەکی ناتەواوە، هەموو ژیانێک تابلۆیەکی ناتەواوە و بە ناتەواویش دەمێنێتەوە... هیچ کەسێک، هیچ شتێک ناتوانێت ئەو تابلۆیە تەواوبکات کە مرۆڤ بە ناتەواوی جێیدەهێڵێت... ئەو شارەش کە من باسیدەکەم هیچ نییە جگە لە شارێکی خورافی، شارێک مرۆڤ ناتوانێت بە بەلەمێک لە بەفر بیگاتێ... ئێمەش هیچ نین جگە لەسەر نشینانی بەلەمێک لە بەفر، کە ناگەینە ئەو شارەو نوقمدەبین.

وەک ئەوەبوو محەمەدی فیردەوسی ناڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ مندا بکات، وەک ئەوەبوو شتێک لەسەر من بزانێت، یان خەیاڵم بخوێنێتەوە،

یان لەسەفەرێک بمترسێنێت کە من مەحکوم بووم پێی. ئاوازی محەمەدی فیردەوسی ئاوازێکی غەمگین بوو، هێند غەمگین بوو من لێیدەترسام. خۆشحاڵ بووم کە دوای ئێستێک بابەتەکەی گۆڕی و لە ژوورێکی پشتەوە مەرسەمە گەورەکەی نیشاندایىن، ساڵۆنێکی گەورەبوو پڕبوو لە تابلۆی تەواو نەکراو، دەیان تابلۆ کە دەیگووت لە یەککاتدا کاریان لەسەردەکەم. پێم سەیربوو کە دواجار نیگارکێش و شاعیرێک باوەشی بۆ مۆسیقارەکان کردۆتەوە. بە حەسرەتەوە پرسیم: چما مۆسیقارەکان خۆیان شوێنێکیان نییە، وا هەموویان لای تۆ کۆدەبنەوە؟. بە هەمان زەردەخەنەی شەڕانییەوە گووتی: من و ئەم مۆسیقارانە لەوەدا بەشدارین کە لە بێهودەییەکی هەمیشەیداین، هەرچییەک دروستدەکەین بە هونەری نازانین، من هەر نیگارێک دەکێشم، چەندە جوان بێت هێشتا ئەو گومانە لە ڕۆحمدایە کە ئەمە هونەر نییە، هونەر شتێکی قووڵترو سەیرترە، سیحراویترو مانادارترە، ئەوانیش هەمان شێوە کۆمەڵێک مۆسیقارن کە دەیانەوێت بگەنە شتێک کە نازانن چییە؟ جوانییەک کە ناو و سیفاتی نییە....

لێم پرسی: تۆ ڕات وایە، ئەو جوانییەی بۆی دەگەڕێیت بوونی نییە یاخود بە پێچەوانەوە هەیە و ئێمە دەستمان پیاناگات؟.

بە غەمگینییەوە گووتی: نازانم... نازانم، بەڵام دڵنیام شوێنێک هەیە لە هونەردا مرۆڤ لە ڕێگایەوە دەستی بە موعجیزەدا ڕادەگات. لەویادا ئینسان دەرگای دونیایەکی تری لێدەکرێتەوە، لەویادا ڕۆحی تێکەڵاوی ڕۆحی بوونەوەرەکانی تر دەبێت.

من بۆم تەواوکردو گووتم: دەبێت بە بوونەوەرێک کە دەکەوێتە دەرەوەی جەبری زەمان، دەکەوێتە دەرەوەی ئەو سنوورە تاریک و ڕەشانەی شوێن... جوانی دەبێت بە پردێک حەقیقەت و نەمری شان بە شانی یەک بەسەریدا دەڕۆن.

محەمەدی فیردەوسی کەمێک وەستا، وەک لە شتێک بترسێت، وەک

ئەوەی بزانێت، من باس لە زەوییەک دەکەم ئەو نایگاتێ، باس لە هونەرێک دەکەم لای ئەو دەکەوێتە سەر سنووری ئەفسانە. کەمێک بە ترس و سڵەوە گووتی: تۆ دڵنیایت ئێمە ڕۆژێک لە ڕۆژان بگەینە ئەو شوێنە.

گووتم: نازانم.. چووزانم، منیش وەک تۆ لە هیچ دڵنیانیم. کەوام گووت نەمدەزانی ساڵانێک دواتر محەمەدی فیردەوسی لەو تخووبە ئەفسوناویانەدا وندەبێت و ئیتر هەرگیز ناگەڕێتەوە.

ئەو شەوە تێگەیشتم کە ئەوە دواهەمین دانیشتنم نابێت لەگەڵ محەمەدی فیردەوسیدا، دڵنیابووم ئێستا ئەو حەزدەکات بزانێت من کێم و منیش حەزدەکەم پتر ئەو بناسم، لە نزیکەوە ئەو مۆسیقارانە بدوێنم کە پێیان وایە سوار بەلەمێک بوون لە بەفرو لە ناوەڕاستی ئاوێکدا نوقمدەبن.

کە گەڕامەوە بۆ ئوتێلەکە لە سەرسامی و گێژییەکی کوشندەدا دەژیام. لە خۆمم دەپرسی بۆ ئەمجۆرە مرۆڤانە دێنە سەر ڕێگای من؟ بۆ لە ئیسحاقی لێوزێڕینەوە پەیتاپەیتا خەڵکانێک دێنە بەردەمی من کە دەیانەوێت ئەم ئەستێرەیە لە ڕێگای جوانییەوە ڕزگاربکەن؟ بۆ ئەو کەسانە دێنە ژیانمەوە کە بە جۆرێک لە جۆرەکان هەموویان سەرقاڵی کۆمەڵێک پرسیاری وەک یەکن؟ بۆ پەیوەندی هونەر و مردن ئاڵۆزترین پرسیاری ئەم جیهانەیە؟ بۆ؟ ئاخۆ لە بەرئەوەی دونیای ئێمە خاڵییە لە هونەرو پڕە لە مردن؟. بۆ هەموو عەودالی ئەوەین بزانین، جوانی کە دەمرێت، دەچێت بۆ کوێ؟ دەچێت بۆ هەمان شار کە هەموو مردووەکان بۆی دەچن، یان دەچێت بۆ شوێنێکی دی؟. ئەگەر جوانی و حەقیقەت یەک شت نین، بۆ من هەستدەکەم هاوارێک لە گەرومدایە خەریکە دەمخنکێنێت هاوارێک هاواری خۆم نییە بە تەنیا، هاوارێک هاواری ئەوانەیە کە مردن و جێیان هێشتم؟ بۆ مرۆڤ هەمیشە لە جێگایەکدا دەمرێت کە هێشتا پەیامی خۆی تەواو نەکردوە؟ بۆ ئیسحاقی لێوزێڕین و سەرهەنگ قاسم مردن و فەرمانێکی نهێنیان هەبوو تەواویان نەکرد؟ بۆ موسای بابەک مرد و سەردەمێکی

لەگەڵ خۆیدا ناشت، ئێستا ئەو مۆزەخانە سەیرەی ئەو لە کوێیە؟ ئەی محەمەدی فیردەوسی تا چەند ڕاستدەکات، کە دەڵێت: ئێمە هەموومان تابلۆیەکی ناتەواوین؟. ئەی من بەرەو کوێ دەڕۆم... منیش چیم جگە لە مۆسیقاریکی دۆڕاو کە ئێستا ئیشوکارم بووە بەوەی دەمەوێت بژیم؟ بۆ لە شوێنی خۆم ناجوڵێم؟ بۆ ڕۆژێک هەستمدەکرد من وەک پێغەمبەرەکان وەهام و ئێستا چاوەڕوانی شتێک دەکەم کە نازانم چییە؟ دەبێت ئێستا چی بکەم؟ هەنگاوی داهاتووی من چییە؟.

لە ئوتێلی گێلاسی سپی سامیری بابلی خەوتبوو. من لە باڵکۆنەکەدا وەستام و چاوەڕێی دەرکەوتنی ئەو باڵندە سپیانەم دەکرد، بەڵام چەندین ڕۆژ بوو نە دالیا سیراجەدین دیاربوو، نە ئەو باڵندە سپییانە، نە ئەو هاوارە قووڵەی ناو تاریکی. من لەو باڵکۆنەوە تەماشای ئەو شارەم دەکرد، شارێکی سەیر بوو، هەموو ئەوانەی لێرەدا گەورەدەبوون دواتر عاتیفەیەکی سەیریان بۆی هەبوو، بەڵام من نا... من ئەم شارەم خۆشنەدەویست، لەوانەیە سوچێک یان گۆشەیەکیم خۆشویستبێت، بەڵام تەواوی شارەکە، تەواوی ئەو ڕووبەرە کۆنکرێتییە دڵڕەقە، هەموو ئەو دیوارە چیمەنتۆ و کۆڵەکە بەردین و ستوونە خەرسانەییە ڕەقانە، هەموو ئەو ڕووبەرە ناکۆتایانە لە بەرد و خشت، نا ئەستەم بوو من شتی وام خۆشبوێت... شارێک بوو هەستی باڵدارێکی تیا دروستدەکردم لە ناو گمۆکەیەکی ئاسنیندا ونبووبێت. ئەو چەند ڕۆژە کە زۆر بە درێژیی بە ناو شاردا دەگەڕام لەو دیوارە چیمەنتۆیانە دەترسام کە لە هەموو لایەکەوە ئابڵۆقەیان دەدام، بەڵام من جگە لەم شارە و شاری سۆزانییەکان شوێنێکی ترم نەبینیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا پێموابوو ئەو لم و تەپوتۆزەی باشوور لەو چیمەنتۆ و دیوارە خواروخێچ و بەرزانەی ئێرە بە ڕەحمترن‌بوون. شارێک بوو بۆ ئەوە دروستبوو بوو مرۆڤ تیا بخنکێت، شەقامە باریک و تەسکەکانی کە پڕبوون لە ماشێن، لە شۆفێری توڕە، لە دوکانداری مۆن کە بەردەوام

سەیری دەغیلەکانیان دەکرد، کچان کە سەریان دادەخست و بێئەوەی سەیری ئەملاولابکەن، وەک تەنێکی قورمیشکراو بەیەک ڕێگادا دەهاتن و دەڕۆیشتن، ژنانی عەبابەسەر کە سالانی دووردودرێژی مەحرومی وشەرم کارێکی پێکردبوون نەیاندەتوانی قسەبکەن یان کە دەمیاندەکردەوە دەیان شیڕان. هیچ شتێک لەو شارەدا ئاسایی نەبوو، نە شەقامەکان، نە درەختە غەمگینەکان، نە ئەو قەیسەری و کۆگایانەی لە بری بۆنی عەترو کالا، بۆنی تەماحی دوکاندارەکانیان لێدەهات. لەو باڵکۆنەدا وەستابووم و سەیری ئەو چرا تاک و تەرایانەم دەکرد کە لێرەو لەوێ دەسووتان... شارێک بوو تاریک تاریک. من لەزەتێکی زۆرم لە تاریکی دەبینی، چونکە بەردەوام سۆزو میهرێکی بێوێنەی بۆ ڕوناکی تیادروستدەکردم. لەو ساتانەدا من بە خۆمم دەگووت: من پیاوێکم لە تاریکیدا، بەلام بیر لە ڕوناکی دەکەمەوە. ڕستەیەکی بێمانابوو، بەلام من زۆر پێی ئاسوودەدەبووم. ئەو شەوە لە باڵکۆنەکەدا سەیری ئەو شارەم دەکرد، شارێک بوو بەبێ مسقاڵێک لە شاعیرییەت... لە تاریکیدا نەمدەتوانی هەموو شوێنەکان ببینم، بەلام دەمتوانی بە خەیاڵ هەموو وێنەکانم لە پێش چاوی خۆم دروستبکەمەوە، گۆشە ئەندازەییە تیژەکانی، هاوڕەنگی خانووەکانی، ناڕێکی کوچەکانی و پێچە لە ناکاوو چاوەڕواننەکراوەکانی. لە تاریکیدا دەمگووت: من پیاوێکم لەم شارەدا، بەلام بیر لە شارێکی دی دەکەمەوە. دەمگووت: بمبورە ئەی شار، من لە باوەشی تۆدام و بیر لە جێگایەکی تر دەکەمەوە. دەمزانی ئەوە چەند سەختە، وەک ئەوەبوو لە ئامێزی کچێکدا بیت و بیر لە کچێکی دی بکەیتەوە. بەلام هەستمدەکرد لەم شارە زیاتر شوێنی ترم نییە بۆی بڕۆم، هەستم بە قولاپێک دەکرد لە گەرومدا، قولاپێک بە کوچەکاندا ڕامدەکێشێت. سالانێک دواتر کە ڕۆمانی «پیرەمێرد و دەریا»م بە کوردی خوێندەوە، وامدەزانی باسی منە، وامدەزانی ئەو ڕۆمانە بیۆگرافیای تایبەتی منە، بەلام من سانتیاگۆ نەبووم، من ماسییەکە بووم، ئەو ماسییە گەورە بەستەزمانە

بووم کە قولاپێک منی بە هەموو زەریادا کێشدەکرد، دڕەماسییەکان لێیاندەخواردم، کاتێک دەگەیشتمە لێوار زەریاش هیچ نەبووم جگە لە پەیکەرێکی گەورە، تەنیا ئێسک و پرووسکەکەم دەمایەوە... ئەو شەوە بۆ یەکەمجار من ئەو هەستەم تیا دروستبوو کە من ماسییەکم و ئەم شارە زەریایەکی پڕ دڕندەیە، هەستمکرد قولاپێک لە گەرومدایە دەمبات و دەمبات... ڕاوکەرێکی بەهێز لەسەرەوەڕا من ڕادەکێشێت... گەر بوەستم ئەو قولاپە دەمکوژێت، گەر نەشوەستم هەر دەمکوژێت.

* * *

لەو ماوەیەدا بڕیارمدا خەیاڵی داهاتووم بخەمە سەر «دادگاییکردنی» سامیری بابلی. هەستمدەکرد یەکێک لە ئەرکە گەورەکانی مرۆڤ بەدیهێنانی بڕێک لە عەدالەتە، پێشموابوو هەر مرۆڤێک لە ئێمە لە بڕێکی دیاریکراو لە عەدالەت بەرپرسیارە، عەدالەت وەک وێنەیەکی گەورەیە کە لە چەندەها پارچەی بچوک بچوک دروستبووە، هەریەکێک لە ئێمە کە لەدایکدەبین یەکێک لەو پارچە بچوکانەی وێنە گەورەکە لە دەستماندایە، دواتر کە گەورە بووین ئیشی ئێمە ئەوەیە ئەو پارچەیە لە عەدالەت لە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیدا لەناو تابلۆکەدا دابنێین. مرۆڤانێک هەن ئەو پارچە چکۆلانەیەی ناو مستی خۆیان فەرامۆشدەکەن، کەسانێکیش هەن دەستدەنێنە ناو ئەو تابلۆیەوەو تێکیدەدەن، بە جۆرێک نارێکی و ناتەبایی دەخەنە نیگارەکەوە دەبێت دەیان ساڵ دانیشین تا نەوەیەکی دیکە لەدایکدەبێت و دووبارە نیگارەکە دروستدەکاتەوە. دیارە لەو نێوەندەدا خەڵکانێکی دی لە دایکدەبن کە دەیانەوێت سەر لە نوێ تابلۆکە بشێوێننەوە. بەڵام جارێکی دی خەڵکانێکی دی دێن دەیانەوێت وێنەکە ڕاستبکەنەوە، جارێکی دیش کەسانێکی دڵڕەق دێن و دووبارە پارچەکان تێکەڵدەکەن و دەیشێوێننەوە... ئیدی لەوانەیە ئەو

تابلۆیە ڕۆژێک لە ڕۆژان تەواو نەبێت. تەواوبوونی وێنەی عەدالەت جگە لە خەیاڵ هیچی تر نییە، یان وەک دەڵێن یۆتۆپیایە. بەلام ئێمەی ئادەمیزاد دەبێت بزانین کە لەگەڵ لەدایکبوونماندا بڕێک لە بەدیهێنانی عەدالەت لەسەرشانمانە، دەبێت بێ هیچ دوودڵییەک بەرەو ڕوی ئەو تابلۆیە بڕۆین و ئەو پارچە چکۆلەیەی خۆمان بخەینە شوێنی ڕاستەقینەی خۆی لە ناو وێنەکەداو نەترسین، لەوانەیە لەو ساتەدا کە بە ڕێگاوەین بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە لە دواوە بمانپێکن، لەوانەیە ئەو پارچەیەی کە لە دەستماندایە بکەوێت و با بیبات، بەلام دڵنیابن کە دەستێکی تر هەیە لە دوور ئەو پارچەیە دەگرێتەوە. لەوانەیە ئەویش بپێکرێت، بەلام مەترسن و دڵنیابن کە ئەو پارچەیە دەڕوات و دەگاتە دەست یەکێکی دی، تا ڕۆژێک لە ڕۆژان یەکێک دەبێت دەستی دەگاتە ئەو تابلۆیەو ئەو پارچەیە دادەنێت.

بەلام مەسەلەکە هەر ئەوە نییە مرۆڤ دەستیبگاتە تابلۆکە، گرنگ ئەوەیە ئەو پارچەیە لە جێگای ڕاستەقینەی خۆیدا دابنێت، چونکە دواجار عەدالەت هیچ نییە جگە لە هارمۆنیایەکی گشتی لە نێوان هەموو پارچەکاندا کە پێکەوە دیمەنێک دروستدەکەن. گەر پارچەکان لە جێگای خۆیان نەبن، گەر یەکێک یاری بە شوێنەکانیان بکات، وەک ئەوەیە یاری بە وێنەی عەدالەت و ماناکەی بکات.

من هەستمدەکرد دادگاییکردنی سامیری بابلی ئەو پارچە بچوکەی وێنەکەیە کە دەبێت من بیخەمە ناو تابلۆکەوە، من تفم لە چارەنوسی خۆم دەکرد، هەستمدەکرد یەکێک لە ئالۆزترو قورسترین پارچەکان بەر من کەوتووە، بەلام دەشمزانی کە عەدالەت هەمیشە تاقیکردنەوەیەکی قووڵی مرۆڤ خۆیەتی. من پێویستیم بە یەکێک هەبوو ڕێنمایم بکات، بەلام هیچ کەس نەبوو... هیچ کەس... دڵنیابووم گەر دالیا سیراجەدینم لەگەڵ بایە نەیدەهێشت بیر لە سزای سامیری بابلی بکەمەوە، ئەو کچە لەوە ناسکتربوو بیر لە سزای هیچ کەس بکاتەوە. بەلام منیش دڵنیابووم کە من بەدوای

پاكبوونەوەی ئەو پیاوەدا دەگەڕام... پاكبوونەوەی ئەو بەشێک بوو لەو پەیامە ئەستەم و نەکردەیەی کە دەبایە هەموومان لەو سەردەمەدا بۆی بژین. وەک شێت بڕیارمدەدا سامیری بابلی دادگاییبکەم... بەڵام چ دادگایەک و چۆن؟ سیاسییەکان لەوە پیسترن دادگا بۆ یەکتر دابنێن، من بڕیارمدابوو میزبکەم بە هەر دادگایەکدا کە سیاسییەکان بۆ یەکتری دادەنێن. میزبکەم بە بڕیاری ئەو حاکمانەدا کە لە ڕۆژگاری ستەم و زوڵمدا وەک مەڕی گێژ فەرمانی زاڵمانیان جێبەجێکردوە. من ئەو ڕۆژانەی مێرد منداڵێکی بێجێگاو ڕێگا بووم کە براکەم و براژنەکەم دەریانکردم، کە لە کەلاوەکاندا دەخەوتم، کە ڕووم لە خانووی چۆڵ و کوختی پاسەوانە پیرەکان دەکرد، هەندێک شەو بەسەر سیاجی دادگای هەرە گەورەی ناو شاردا بازمدەدا و میزم بە دیوارەکانیدا دەکرد. من مێردمنداڵ بووم کە دەمگووت: گەر تۆ ماڵی عەدالەت بیت، ئەوا من میزت پیادەکەم. ئێستا دوای بینینی ئەو هەموو زوڵمە، نەدەبوو سامیری بابلی بدەمە دەست ئەوان، گەر کاری وام بکردایە وەک ئەوەبوو ئەو پارچە وێنەیەی لە مشتمدایە لە جێگایەکی هەڵە دابنێم. ڕۆژێک هەستمدەکرد من تەنیا کەسێک نیم لەو شارەدا کە ئەو هەستەم هەیە، جارێک بوو بە لای بینای دادگادا ڕۆیشتم و بینیم یەکێک بە پارچەیەک خەڵووز لەسەر دیوارەکەی نوسیوە «ئەی ئەوەی بۆ عەدالەت دەگەڕێیت، دوورکەوەرەوە لێرە»... ساتێکی سەیر بوو، لەو جۆرە کاتانەی شتێک لە دڵتدا دەهەژێت، لەو ساتەدا دەمویست ئەو کەسە بناسم کە جورئەتی ئەوەی کردوە ئەوە بنوسێت، دەمهێنایە پێش چاوی خۆم کە پارچەیەک خەڵوزی هێناوەو بەوپەڕی ترس و نائومێدییەوە ئەو ڕستەیەی نوسیوە، ویستویتی پاسەوانەکان نەیبینن، ویستویتی هیچ کەس نەیبینێت، لەوانەیە ویستبیتی تەنیا خودا، یان هەر هێزێکی هوشیاری دی کە لە مرۆڤ باڵاترە سەیریبکات. بەڵام پێم حەیف بوو کە چەند مانگێکی دی زستان دێت، هەورە ڕەشەکان دەردەکەون، باران دادەکات و ئەو نوسراوە

دەسڕێتەوە. ئیتر لەوانەیە هیچ مرۆڤێکی دی جارێکی دی جورئەت نەکات ئەوە بنوسێتەوە.

من چەندەها شەو لەگەڵ سامیری بابلیدا باسی ئەو دادگایەم کرد. دامەزراندنی ئەو دادگایە قورسترین شتی ژیانم بوو، سامیری بابلی لە ڕەوتی ژیانی خۆیدا لەو پازدە ساڵەدا ڕاستەوخۆ دەیەها کەسی کوشتبوو، لە شەڕو شۆڕو پاکسازییە گەورەکانیشدا ناڕاستەوخۆ بەرپرس بوو لە مردنی دەیەهای دیکە، لە کوردستان و لە ناوچە سنوورییەکانی ئێراندا چەندین جێگای خاپوورکردبوو. هاوڕێکانی منی کوشتبوو، بەڵام دواجار ئەو ڕزگارکەری منیش بوو... بۆئەوەی خۆی پاکبکاتەوە دەستی دابووە چەک و لەگەڵ هاوڕێ کوشندەکانی دوێنێدا کەوتبووە جەنگ. من شەوان بەر لە خەوتن بە سامیری بابلیم دەگووت: پرتەقاڵی بابلی بیرت نەچێت تۆ دیلی منیت. هەموو شەوێک وام بە سامیری بابلی دەگووت. شەوێک سامیر لەژێر بەتانییەکەیەوە کەوتە قسەکردن، پشتیکردبووە من و ڕوویکردبووە دیوارەکەو بەو بەلاغەتە جوان و کوشندەیە دەدوا کە دەیزانی من سەرسامدەکات، گووتی: ئەی منداڵی بەنەزاکەت، ئەی ڕۆحێک کە لەو ساتەوەی تۆم بینیوە، دڵنیام کە ژیانم گۆڕاوە. من زۆر بیرم لێکردۆتەوە، هەموو گوناهبارێک بە دوو ڕێگادا دەگاتە پاکبوونەوە، دوو ڕێگای زۆر جیاواز، ڕێگایەکیان ئەوەیە گوناهبار خۆی لە ناوەوە لە خۆی نەبورێت، خۆی دڵنیابێت کە هیچ هێزێک نییە لە گەردوندا پاکیبکاتەوە، هیچ دادگایەک نییە پێیبڵێ : بڕۆ تۆ بێگوناهیت. ڕێگای دووەمیش تۆڵەی قوربانییەکانە.

لە جێگاکەی خۆی هەستاو گووتی: من دادگاکان ئازادمبکەن یان نا... ئازاد نابم. ئادەمیزادەکان لێمببورن یان نا... پاکنابمەوە. مرۆڤ کە جارێک گوناهیکرد دەبێت تا کۆتایی گوناهبار بێت، بەڵام عەدالەت ئەوەیە قوربانییەکان وا بیرنەکەنەوە... عەدالەت ئەوەیە تۆ کۆمەکم پێبکەیت پاکببمەوە، هەتا ئەگەر ئەو پاکبوونەوەیە ئەستەمیش بێت.

من کە گوێم لێیدەبوو چاوانم پڕدەبوون لە فرمێسک، دەمگووت: پرتەقاڵی بابلی، من حەزدەکەم تۆ بمریت... حەزدەکەم لە هەقی گوناهەکانتدا بمریت، لەبەرئەوەی عەدالەت وای دەوێت. بەڵام من ڕقم لە تۆ نییە، دەمەوێت ڕقم لێت بێت، بەڵام ڕقم لە تۆ نییە. تۆ دیلی منیت، من دەبێت بەشەرەفەوە لەگەڵتدا بجولێمەوە.

لە تاریکیدا سەیریدەکردم و دەیگووت: من باوەڕم بە عەدالەتی تۆیە. تۆ لە هەموو دادگاکانی تری دونیا عادیلتریت. بەڵام گەر مردم نامەوێت تۆ جەلادم بیت. جەلادەت سوێندم بۆ بخۆ تۆ حوکمی مردن نەدەیت بەسەرمدا. من گوناهەکانم چەندە گەورەبن نابێت تۆ حوکمی مەرگ بدەیت بەسەرمدا... دەبێت لێمببوریت، نا لە بەرئەوەی من پێویستیم بەو لێبوردنەیە، بەپێچەوانەوە لە بەرئەوەی تۆ پێویستیت بەو لێبوردنەیە. نە لەبەرئەوەی ئەو لێبوردنە پلەوپایەت لەلای خودا بەرزدەکاتەوە... بەڵکو ئەو لێبوردنە تەنیا ڕێگایەکە تۆ دەتوانیت پیابڕۆیت. نە لەبەرئەوەی من شایستەی لێبوردنم، بەڵکو لەبەرئەوەی تۆ شایستەی بەخشندەییت. جەلادەت من ئێستا پیاوێکی بێئیمانم، بەڵام ئەو ڕۆژانەی کە خەڵکم دەکوشت ئیمانداربووم، دەستنوێژم دەگرت و دواتر خەڵکم دەکوشت. تا زیاتر ئەو ئینسانەی ناو خۆمم دەدۆزییەوە زیاتر لە خودا دووردەکەوتمەوە، تا پتر ئەو گورگەی ناو خۆمم دەکوشت، خودا هەنگاوێک زیاتر جێیدەهێشتم. جەلادەت من پردێکم تۆ بەسەر مندا دەڕۆیت بۆ ئەوەی زیاتر لە خۆت تێبگەیت. من تەنیا بە ویستی خۆم لەگەڵ تۆدا نیم... ئەی منداڵی نەجیب تۆ هێشتا لەسەرەتادایت، ڕێگایەکی درێژت هەیە دەبێت تەواوییکەیت... لە هەر شت گرنگتر ئەوەیە کە تۆ وەک فریشتەکان بە پاکی بمێنیتەوە، لە بیرت نەچێت کە تۆ شاهیدی شتێکی گەورەتری.

من هێشتا چاوانم پڕبوون لە فرمێسک، بە دەنگێکی گریاوەوە گووتم: سامیری بابلی تەنیا قوربانییەکان دەتوانن لە تۆ ببورن، ئەوانیش لە دونیایەکی ترن کە من و تۆ دەستمان نایانگاتێ. ئێستا تۆ دەبێت بەدەستی

خۆت ئەوانە هەڵبژێریت کە دەبێت حوکمتبدەن، من بەلامەوە گرنگ نییە، چی لە ویژدانی تۆدا ڕوودەدات. تۆ هەست بە گوناه بکەیت یان نەیکەیت، ئازاربچێژیت یان نەیچێژیت... ئەوە هیچ شتێک لە ئیشی من کەم ناکاتەوە. پرتەقاڵی بابلی من نامەوێت گەر ڕۆژێک لە ڕۆژان مردم و لە جیهانێکی تر ئیسحاقی لیوزێرین و سەرهەنگ قاسمم بینی بڵێم من ئاسوود لەگەڵ بکوژەکانی ئێوەدا خەوتووم... تۆ دیلی منیت و تا ئەوکاتەی قوربانییەکان لێت دەبورن، بە دیلی دەمێنیتەوە... سامیری بابلی پێمبڵێ، کێن ئەوانەی قوربانی تۆن و زیندوون و نەمردوون، لە کوێن؟ من دەبێت لەوانە دەستەیەک دروستبکەم کە حوکمی تۆ بدەن. گەر دەتەوێت نەبم بەو جەلادە تاک و تەنیایەی لە جیاتی هەموو قوربانییەکان تۆ حوکمدەدات، یارمەتیمبدە.

لەو شەوەوە سامیری بابلی دەستیکرد بە حیکایەتە سامناکەکانی خۆی، لەو شەوەوە دەبایە دووبارە گوێ لە چیرۆکە ترسناکەکانی ئەو بگرم. چەندەها شەو تکام تیا دەکرد بوەستێت، تیا دەپاڕامەوە لەوە زیاتر قسەنەکات. دەستم دەگرت بە سەرمەوە و بە خێرایی لە پلەکە تاریک و نوتەکەکانی ئوتێلی گێلاسی سپی دەهاتمە خوارێ و ڕامدەکرد بۆ ناو تاریکی و دەگریام.

لەو شەوە دوورو درێژانەوە، لەو چیرۆکە بێکۆتاییانەی مردن و ئەشکەنجەوە، سامیری بابلی هەر شەوەو ناوێکی لەسەر کاغەزێکی سپی دەنوسی، ناوی یەکێک لەوانەی کە ناوو ناونیشانیانی لە بیرمابوو. یەکێک دەکرا مرۆڤ بچێتەوە سەر شوێنەواریان و سۆراغیان بپرسێتەوە. لە کۆتاییدا پتر لە دوازدە ناومان لە بەردەستدا بوو، کە بەجۆرێک لە جۆرەکان لەم دەڤەرەو دەڤەرەکانی دەوروبەردا دەژیان و دەکرا بیانکەین بە دەستەیەکی داد بۆ دادگاییکردنی پرتەقاڵی بابلی.

ئیشی من ئەوە بوو ئەوانە بدۆزمەوە، لەگەڵیاندا بدوێم و بیانهێنم و دادگایەکیان لێدروستبکەم. ئیشێک دڵنیابووم کاتێکی درێژ و زۆری دەوێت.

## بەشی دووهەم

# سێ کەسی پڕ نهێنی

بەر لەوەی تەواو دەستبکەم بە خۆ ئامادەکردن بۆ دادگاییکردنی سامیری بابلی کۆمەڵێک شتی گرنگ روویاندا کە پەیوەندییەکی نەپساویان بە مانای هەموو چیرۆکەکەی منەوە هەیە. لە ماوەیەکی کورتدا سێ کەسی سەیرو ئاڵۆز لە ژیانمدا دەرکەوتن، سێ کەس کە دەرکەوتنیان هێندە سەیرو کوتوپڕو تەلیسماوی بوو، وەک ئەوە بوو بەر لە دادگاییکردنی پرتەقاڵی بابلی پەلەیان بێت دەربکەون و ڕەوتێکی تایبەتی و ئاڕاستەیەکی دیاریکراو بدەن بە ڕووداوەکان. سێ کەس هەستدەکەم، بە خێرابییەکی ترسناکی وەک ڕەشەبا دێنە ژیانمەوەو بە هاوئاهەنگییەکی نهێنی، پێکڕا من بەرەو ئەو جێگایە دەبەن کە دەبایە بەرەو رووی بڕۆم، سێ پاڵەوان کە کەسیان ئاگاداری ئەوی دیان نییە، بەڵام گەر بە وردی بڕوانیت، هەستدەکەیت بەبێ هاوکاری هەر یەک لەم سیانە لەگەڵ یەکدا چیرۆکی من چیرۆکێکی ناتەواو دەمێنێتەوە. یەکێک لەو پاڵەوانانە ئێوە لە شاری تەپوتۆزە زەردەکانەوە دەیناسن، واتە پێشتر ئاشنان پێی، بەڵام لێرە، لەم شارە غەمگینەی باکووردا بە شێوەیەکی تر دەردەکەوێتەوە، بە جۆرێک من دەبێت دووبارە پێتانی بناسێنمەوە، چونکە من باوەڕم وایە هەندێک مەخلوقات کە لە جێگایەکەوە دەچن بۆ جێگایەکی تر، بە جۆرێک دەگۆڕێن دەبێت مرۆڤ سەر لەنوێ وێنەو نیگاریان لە خەیاڵی خۆیدا دروستبکاتەوە. دووانەکەی دیکەیان کەسانن کە نە من، نە ئێوە پێشتر ئاشنایان نین، دەرکەوتنیان لە ڕێکەوت دەچێت، بەڵام ڕێکەوتیش نییە. من پێم وایە بۆ ئەوەی ڕوداوێکی گرنگ رووبدات، هەمیشە سەرەتاکانی وەک

ڕێکەوت دەردەکەوێت، هەمیشە وادیارە وەک ئەوەی شتێکی ڕاگوزەرو تێپەڕ لە ژیانتدا ڕوویدابێت، شتێکی بێنرخ و کەم بەها کە کاریگەرییەکی ڕاستەقینەی لەسەر ڕەوتی کۆی شتەکان نییە. بەڵام هێندەی دەچیتەوە بۆ دواوە، دەبینیت ژیان سەد دەر سەد لە شەترەنجێک دەچێت، ئەو سەربازە چکۆلەیەی لەسەرەتای یاریدا بێ بیرکردنەوە دەیخەیتە سەر خانەیەک، لە کۆتاییدا وەک ئەو هەڵە کوشندەیە دەردەکەوێت کە تەواوی عەرش دەڕوخێنێت.

سەرەتا من و سامیری بابلی خانمی «شاناز سەلیم»مان بەوجۆرە ناسی.

## کەسی یەکەم

خانمی شاناز سەلیم و حەزی بێسنووری بۆ خەوتن لە ئامێزی مەرگدا

هەرچەند سامیری بابلی دیلی من بوو، بەڵام من کەسێک بووم نە زیندانم هەبوو، نە زنجیر و نە کلیل و نە کەلەپچە. سامیری بابلی دەیتوانی شەوێک هەستێت و ڕووبکاتە هەر جێگایەکی دیکەی ئەم دونیایە، بێئەوەی من بتوانم بیوەستێنم یاخود ڕێگای لێبگرم. دەیتوانی بڵێت «ئاغای کوتر، تۆ یارییەکەت ناخۆشکردوە و من لێرەدا خوداحافیزیت لێدەکەم و دەڕۆم، تۆش چ کارێک سەختەو لە هەگبەتدایە بڕۆ بیکە» یان بڵێ «فەرموو، وا من دەڕۆم و تۆ بازۆڵەی خۆتم بۆ دەرخە». لە ڕاستیدا من دڵنیاتان دەکەمەوە کە لە جۆرە حاڵەتێکی وەهادا هیچم بۆ نەدەکرا، جگە لەوەی دەستبکەم بە گریان و تیا بپاڕێمەوە نەڕوات. من یەک شتم هەبوو لە ڕێگایەوە سامیری بابلیم بەستبووەوە، بەردەوام دەمگووت: سامیری بابلی

لە بیرت نەچێت تۆ ئەسیری منیت. بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستام ئەو ڕستەیەم دەگووتەوە، کە بەرچایمان تەواودەکرد ئەو ڕستەیەم دەگووتەوە، کە دەڕۆیشتمە دەرێ بۆ پیاسەیەکی ناو بازاڕ، ئەو ڕستەیەم دەگووتەوە، دەهاتمەوە دەمگووتەوە، نیوەڕوان دەخەوتین و بەدەم خەوەوە دەمگووتەوە، شەو بەر لەوەی بچینە ژێر جێگاوە ئەو ڕستەیەم دووبارەو سەدبارە دەکردەوە. سەیر بوو بەلامەوە کە هێزی ئەو ڕستەیەو توانای بەستنەوەی لە هەموو کۆت و زنجیرەکانی دونیا بەهێزتر بوو. ئەو ماوەیە سامیری بابلی تووشی جۆرە مۆتەکەو خولیایەکی سەیر دەبوو، جۆرە خەیاڵاتێک جیاواز لەو خەیاڵاتەی پێشتر لە ژیانیدا بینی بووی، شەوانە بەردەوام خەوی بە باغچەیەکەوە دەبینی کە پەیکەری ئاسنینی خۆی و ژنێک لە کەنارِیایەتی، حەوزێکی کاشی قەشەنگ لە ناوەڕاستیایەتی، چەندەها فوارەی چکۆلانە بە چواردەوریدا ئاوپرژێندەکەن. لە خەوەکەی سامیری بابلیدا من لە پاڵ درەختێکدا وەستاوم و خوێن لە برینەکانمەوە دێت... درەختێک هەزاران باڵندەی سپی لەسەری کۆبۆتەوە، کە نیوەیان کۆترەو نیوەیان باڵدارێکی ئەفسانەیی نەناسراو. لە خەونەکەی ئەودا من سەیری ئەو پەیکەرە دەکەم و خوێنم لەبەر دەڕوات. سامیر هەموو کات ئەو خەوەی دەبینی، لە شەودا، لە ڕۆژدا، لە کاتی وریایدا، لە کاتی زیندەخەودا... هەردووکمان دەمانزانی لە داهاتوودا شتێک ڕوودەدات، شتێکی ترسناک، بەڵام کەسمان نەماندەزانی ئەو شتە چییەو کەی ڕوودەدات. ترسناکترین شت ئەوەیە دڵنیابیت شتێک ڕوودەدات، بەڵام نەزانیت کەی و لە کوێدا ڕوودەدات، ئیتر بەردەوام چاوەڕوانی ئەو شتەیت، لە ماڵ دێیتە دەرێ و لە شەقامەکان دەترسیت، لەسەری هەموو کوچەیەکدا چاوەڕوانی شتێکی نەزانراو بێتەدەرێ و یەخەت بگرێت، دەڕۆیت و دەڵێیت ئەو کارەساتە نەزانراوە لە دواوە بۆم دێت، دواتر دەڵێیت نا نا لە پێشەوە بۆم دێت، دواتر دەڵێیت نا لەسەرەوە بۆم دێت، بە هەرحاڵ ئەوە هەستێکی هێندە

زۆرو ترسناکە کە هیچ ئادەمیزادێک نییە ساتی وەها نەژیابێت، من هەر کتێبێکم خوێندبێتەوە شتێکی وەهای تێدابووە. هەر مرۆڤێک جۆرە ترسێکی قووڵ و بێچارەی تیاسەوز بووبێت، ساتی وەها دەژی، هەر کتێبێکیش سەروکاری لەگەڵ ترسدا بێت، باسی ئەوجۆرە هەستەی تێدایە.

سامیری بابلی بە دەگمەن لەو ژووره چکۆلەیەی «ئوتێلی گێلاسی سپی» دەجولا. کراسێکی شینی هەبوو، هەندێک خەتی سپی زۆر باریکی تێدابوو، گەر زۆر بجولایە هەندێک ئێوارەی فێنک ئەو کراسەی لەبەر دەکردو دوو سەد مەترێک لەولا ئوتێلەکەوە لە یەکێک لە مەحەلەبیخانەکان مەحەلەبییەکی دەخواردو دەگەڕایەوە. لەبەر ئەو بۆن پرتەقاڵە نەیدەتوانی زۆر بسوڕێتەوە. بەراورد بە یەکەمین جار کە من لە ژێر زەمینی زامەکانی خۆمدا لە پرتەقاڵی سپی بینیم سەرو ڕوخساری گۆڕابوو، ئێستا قژێکی لوولی درێژی هەبوو، لێوە عەرەبییەکانی ڕەشترو وشکتر دیاربوون، چاوانی وەک هەمیشە لە چاوانی باڵندەیەک دەچوو لە ژێر باراندا فریبێت، بەلام دەنگی مردووتر و سەیرکردنەکانی نائومێدترو بێئاسۆتربوون. ئەو شەوانەی دادگاکەمان دادەمەزراند، لەو هەموو گوناهە دەترسا کە بە کۆلیەوەیەتی. شەوێکیان لێم پرسی: پرتەقاڵی بابلی لە مردن دەترسیت؟. گووتی: نا... جەلادەتی کۆتر لە مردن ناترسم، بەلام دەمەوێت بەر لەوەی بمرم، بۆماوەیەکی کەمیش بووە ژیانێکی ئاسایی بژیم. واتە وەک هەر مرۆڤێکی ئاسایی ژن بهێنم، منداڵم ببێت، لە ماڵێکدا بژیم لەو ماڵانەی کە لە پەنجەرەی ئەم ئوتێلەوە دەیانبینین، گەر کرا حەزدەکەم ئیشێکیشم هەبێت.

ڕۆژێک ئەو ڕووداوە ڕوویدا، کە بوو بەسەرەتای بەگەڕکەوتنی ئەو چەرخ و فەلەکە گەورەیە. ئێوارەیەکی درەنگ بوو، کە قریشکەو هاوارێکی سەیر لەسەروو ئێمەوە لە قاتی حەوتدا بەرزبووەوە، کە چووینە دەرەوە چاومان بە ڕوناکی ئاگرێکی گەورە کەوت. ژن و منداڵێکی زۆر بە پرتاو لەو قاتەو قاتەکانی سەرووترەوە ڕایاندەکردە خوارێ، بە هات و هاوار

هورووژمیان دەهێنا، پیاوەکان کەمێک بە ویقارتر و سەنگینتر دادەبەزین، هیچ کەس نەیدەویست وەک ترسنۆکێک دەرکەوێت کە لە ئاگر رادەکات. دیاربوو یەکێک لەو تەباخە چکۆلانانەی چا کە هەموو ئاوارەکان بە کاریاندەهێنا لە ناکاو گڕی گرتووەو بە خێراییەکی شێتانە ئاگرەکەی گەیشتۆتە هەندێک نوێن و کەلوپەل و لە پڕ بووە بە ئاگرێکی گەورە. پیاوێکی پیر کە پێدەچوو لە هەمووومان بەغیرەتتر بێت، داوایدەکرد رانەکەین و چی ئاوێک لە بەردەستماندایە سەری بخەین بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە، هەڵبەت گەمژەیی بوو بیر لە هاتنی ماشێنەکانی ئاگرکوژاندنەوە بکەین. لەو دەمەدا زۆربەی سیاسییەکان نەیاندەزانی چەند مانگ، چەند ساڵ شارەکانیان بەدەستەوە دەبێت، لە سیاسەتیشدا گەر یەکێک نەیزانی جێگایەکی چەند بەدەستەوە دەبێت، ئیدی وەک مەڵبەندی تالانی تەماشایدەکات. ئیدی زۆربەی ئەو ماشێنە سوور و جوانانە لە رێگای سنوورەوە ئاودیوی هەندێک مەملەکەتی تر کرابوون، لەو رۆژگارەدا ئوتومبێلی ئاگرکوژاندنەوەکانی ئێمە لە ولاتانی تر، ئاگری خەڵکی تری دەکوژاندەوە. ئەو شەوەی لە گێلاسی سپی ئاگرکەوتەوە، ئاوارەکان پێکرا بە خێراییەکی گەورە زنجیرەیەکیان دروستدەکرد، تەنەکە لە دوای تەنەکە ئاویان لە تەنکەرێکی گەورەوە دەردەهێناو دەیانگەیاندە قاتی حەوت. من و سامیری بابلی لەوانەبووین کە خۆمان کرد بە ناو ئاگرەکەدا بۆئەوەی هەندێک ژن و منداڵ رزگاربکەین کە لە ژوورێکی چکۆلەدا لەوسەر گیریان خواردبوو، هەندێک خەڵکمان رزگارکرد و کەلوپەلی چەندینماڵمان داگرت و هێنامانە لای خۆمان. شەو درەنگ ئاگرەکە کۆنترۆڵکرا. لە راستیدا قسەکردن لەسەر زەرەر و زیانی زۆر قسەیەکی بێمانابوو، چونکە لە ئوتێلێکی سووتاودا، لە ناو کۆمەڵێک ماڵە ئاوارەدا کە لە بنەڕەتدا خۆیان جگە لە هەندێک دۆشەک و لێفە و بەتانی بەولاوە هیچیان نەبوو، مرۆڤ ناتوانێت باس لە زەرەربکات، بەلام هەندێک کەس هەبوون وەک هەمیشە

دەیانگووت، پارەیان هەبووە لە ژێر دۆشەکەکاندا سووتاوە، ئاڵتونیان هەبووە ونبووە، تاقمی زێڕ و زیویان هەبووە لە کەڵک کەوتووە. ئەو شەوە ئێمە کەلوپەلی هەندێک خێزانمان هێنایە لای خۆمان. شتەکان سەرەتا لە ڕاڕەوەکاندا کەڵەکەبووبوون، هەندێک لە خاوەنەکانیان لە ترسی ئاوو ئاگر تکایان لێکردین شتەکانیان لای خۆمان بۆ هەڵگرین. بۆ ڕۆژی دوایی وردە وردە خاوەن کەلوپەلەکان دەرکەوتنەوە و کەلوپەل و کەرەستەی خۆیان وەرگرتەوە، ئەوەی ژیانی ئێمەی گۆڕی دواهەمین خانم بوو کە هات دواهەمین جانتا وەرگرێتەوە. دوو جانتای ڕەشی بریقەدار بوون کە هەردووکیان لە دوو سەرەوە قفڵکرابوون، ئەو خانمەش شاناز سەلیم بوو. خانمێکی بالابەرزی، سینەپڕ، بەلام بە ڕوخسارێکی مندالانەوە. لەشێکی پڕی هەبوو، بەلام لەوانە نەبوو کە مرۆڤ پێیان بڵێت قەڵەو، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەستووری سینەی هاوڕێ بوو بە کەمەرێکی باریک، بە دوو لاقی درێژ و بەرز، بەلام پڕ و گۆشتن، لە پاڵ ئەو سیفەتە ناوازانەدا، نیگاو تەماشاکردنەکانی سیحرو ئەفسونێکی ژنانەی ئەوتۆیان پێبەخشیبوو، کە من بۆ چەند دەقیقەیەک لە بەردەم جوانییەکەیدا هێند حەپەسام، نەمدەزانی دەڵێت چی و بۆچی هاتووە. دیارە من پێشتر خانمی وەهام لە گێلاسی سپی نەبینیبوو، ژنێکی پۆشتەو پەرداخ بوو، لە یەکێک نەدەچوو ئازارو دەردەسەری ئاوارەیی چەشتبێت. دواتر دەرکەوت، ئەم خانمە ناسیاوی یەکێک لە ماڵە ئاوارەکانی قاتی حەوتەمە، کە شەو ناسیاوەکانی گەیاندبووە لای خۆی و ئێستا هاتبوو کەلوپەلەکانیان بۆ وەربگرێتەوە. لە یەکەمین ساتەوە هەستمکرد من بە شتێکی گرنگ تەماشاناکات و لە پشتی منەوەو بەسەر مندا ڕووی دەمی کردە سامیری بابلی. بەلام بابلی کوردییەکی ئەوتۆی نەدەزانی تێبگات. من کە زۆر باکم بەوە نەدەهات ئافرەت بایەخم پێبدەن یان فەرامۆشمبکەن، قسەکانی خانمەکەم بۆ بابلی وەرگێڕایە سەر عەرەبی، شاناز سەلیم بێئەوەی سەیری من بکات، بە

عەرەبییەکی ساف گووتی: ئاها تۆ عەرەبیت، نەمزانی عەرەبیت. دیاربوو دڵخۆشە بەوەی سامیری بابلی عەرەبە، من لەو دەقیقەیەوە هەستمکرد، ئەو بۆن پرتەقاڵەی لە بابلییەوە دێت بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەو خانمەی گێژکردوە. ئەوکات نەمدەزانی کە هەندێک ژن هەن لەم شارەدا دەمرن بۆئەوەی لەگەڵ پیاوێکی عەرەبی وەک سامیری بابلیدا بخەون، نا تکاتان لێدەکەم، ئەمە بە شتێک وەرمەگرن کە کەرامەتی نەتەوەییمان بریندار بکات، چونکە شتەکە دیاردەیەکی ئاسایی بوو. عەرەبەکان نەتەوەی بەهێزتربوون، فریوی جنسی پیاوانی نەتەوەی سەردەست هەمیشە لە فریوی پیاوانی دی بەهێزترە، دوای ئەوە لە بیست ساڵی ڕابوردوودا، ژنانی ئێمە ژیانیان لەبەردەم تەلەفزیۆندا بردبووە سەر، تەلەفزیۆن سەرچاوەی پێوەرەکانی جوانی و ناشیرینی بوو، لە تەلەفزیۆنەکانیشەوە مرۆڤ نەیدەتوانی زۆر پیاوی کورد ببینێت، کۆمەڵێک موزیع نەبێت کە هەندێکیان بەڕاستی هی ئەوەبوون مرۆڤ بیانداتە بەر شێلمی کولاو. ژنانی ئێمەش چی پیاوێکی جوانیان دەبینی لەو فلیم و زنجیرە عەرەبیانەدا بوو کە ئەو خانمانە نیوەی ژیانیان بە تەماشاکردنییەوە لەدەستدابوو. لەبەرئەوە ئاسایی بوو یەکێکی وەک پرتەقاڵی بابلی بەو جووتە چاوەوە کە لە چاوی باڵندەیەک دەچوو لە ژێر باراندا فڕیبێت، ئەژنۆی زۆر خانم شلبکات و وایان لێبکات دەست بخەنە سەر دڵیان و بڵێن «وییییی کە قۆزە».

نازانم ئەو ڕۆژە لە چیەوە هات کە خانمی شاناز سەلیم بیئەوەی بایەخێک بۆ بوون و نەبوونی من دابنێت، لەسەر تاکە تەپڵەکی چکۆلانەی ژوورەکەم دانیشت و لەگەڵ سامیری بابلیدا کەوتە باسکردنی بەغداد، باسکردنی ئەبونەواس، شارع نهر، مەنسوور، شۆریجە، سوق الصفافیر، مەیدان، کەڕادە، بەیاع نازانم کوێ. سامیر باسی هەر شوێنێکی دەکرد، شاناز خانم دەستی دەخستە سەر دڵی و خۆی دەبوراندەوەو دەیگووت: دەمخۆش، چەند خۆشە ئەو جێگایە، بەو خوا گەورەیە شوێنی وا خۆش

لـە دنیـادا نییـە... زۆر خۆشـە... زۆر زۆر خۆشـە.

کـە باسـی گـەڕە باغچەیەکیـان لـە بەغـداد دەکـرد، کـە مـن هەرگیـز نەمبینیبوو، شـاناز خانـم دەیگـووت: جەنەتـە، وەی ئیتـر یەعنـی جەنـەت قابیلـە چییـە. خۆشـترین ڕۆژی ژیانـم ئـەو ڕۆژە بـوو کـە چـووم بـۆ ئـەو باغچەیـە، لەوێـوە چـووم بـۆ مەنسـوور، لەوێـوە هاتمـەوە بـۆ کەڕادە، لەوێـوە چووین بـۆ سـوق عەرەبـی، بەسـەیارەکە ڕۆیشـتین بـۆ وەزیریـە.

کـە ڕۆیشـت مـن لـە ناوەڕاسـتی ژوورەکـەدا وەسـتام و بـە پەسـتییەکی زۆرەوە کەوتمـە لاسـاییکردنەوەی، بـەڵام بـە چـی دەچـوو، هەتـا سـامیری بابلیـش لـەوێ نەبـوو مـن ببینێـت کـە لاسـاییدەکەمەوە. ئەوکاتـەی کـە ڕۆیشـت مـن ویسـتم جانتایـەک لـە دوو جانتاکـەی بـۆ هەڵگـرم، بێئـەوەی سـەیرمبکات، گووتـی: تـۆ نـا، تـۆ نـا، خـۆم هەڵیدەگـرم، ئـەوی تریـش ئـەو کـوڕە باشـە هەڵیدەگرێـت. دیـارە مـن خەریکبـوو دڵـم بتەقـێ، یەکەمجاربـوو لـە ژیانمـدا خانمێـک وا تووڕەمبـکات. کـە سـامیری بابلـی سـەرکەوتەوە، بـە زەردەخەنەیەکی مەکربازانـەوە کـە پێشـتر لـە ڕوخسـاریدا نەمبینیبوو، لـە نێـوان دوو پەنجەیـدا پارچـە کاغەزێکـی چکۆلـەی نیشـاندام و گووتـی: سـەیرکە، ژمـارە تەلەفونەکـەی، دەشـبێت بـە خـوا بـە خـوا بـە خـوا تەلەفونـی بۆبکـەم. کـە دەیگـووت «بـە خـوا بـە خـوا بـە خـوا» کەمێـک وەک ئـەو خـۆی ڕادەوەشـاند بۆئـەوەی دڵنیابـم کـە ئـەوە قسـەی خانمـی شـانازە. مـن بـە جۆرێـک بەربینـم گیرابـوو قسـەم بـۆ نەدەکـرا. لـە ڕاسـتیدا مـن ڕۆژانـە کچانـی گێلاسـی سـپی بـە ڕاسـتی و بـە گاڵتـە جنێویـان پێـدەدام، بـەڵام پێـم ناخـۆش نەبـوو، لـە پرتەقاڵـی سـپی، دەیـان ئافرەتـی لەوجـۆرە بەدتـرو نمایشـبازترم بینیبوو، کەچـی لەبـەر هۆیەکـی نەزانـراو خانمـی شـاناز سـەلیم بێئەنـدازە پەسـتیکردم. بـە تووڕەییـەوە گووتـم: بـەر لـەوەی فریابکەویـت هیـچ بکەیـت، کاروبـاری دادگاییەکـەت هەمـووی جێبەجێدەکـەم. سـامیری بابلـی بـە زەردەخەنەیەکـی پیسـەوە کـە یەکەمجـار بـوو لـە چاویـدا ببینـم گووتـی: باوەڕناکـەم.

دوو ڕۆژ دوای ئەوە، نیوەڕۆیەکی گەرم، دوای پیاسەیەکی بێهودەی ناو بازاڕ گەڕامەوە بۆ ئوتێلی گێلاسی سپی، کە گەڕامەوە بەرلەوەی بچمە ژووریی گوێم لە دەنگی خانمێک بوو لە ژوورەکەماندا بەدەنگی بەرز قسەیدەکردو پێدەکەنی، بێئەوەی پەردەی ژوورەکە لابدەم زانیم خانمی شاناز سەلیمە. کە چوومە ژووریی وەک ئەوەبوو منی نەبینیبێت، نە لەقسەکردن وەستا، نە هەستایە سەرپێ، نە تەماشایکردم، وەک ئەوەی من هەوایەک بم، شتێک بم کە نامبینێت و هەستم پێناکات. ئەوە دواهەمین سەردانی ئەو خانمە نەبوو، بەڵکو لەو ڕۆژە بەدواوە بەردەوام دەهات بۆ گێلاسی سپی، شەوانە سامیری بابلی لە پێشدەم دەرگای پۆستەوە تەلەفونی بۆ دەکرد، کە دەگەڕایەوە هێند مەست بوو وەک ئەوە بوو یەک لەسەر یەک سێی بوتڵ شەرابی فڕکردبێت. من هیچم نەدەگووت، شەوێکیان سامیری بابلی زۆر درەنگ گەڕایەوە، من لە باڵکۆنی چکۆلانەی ئوتێلەکەوە سەیری ئەستێرەو مانگم دەکرد، کە لە شەقامی بەرابەر ئوتێلەکەدا، ماشێنێکی نوێی ئێجگار جوان وەستاو سامیری بابلی لێی دابەزی. شاناز سەلیم خۆی ماشێنەکەی لێدەخوڕی. ئەو کات نزیکی سێی هەفتە بەسەر پەیوەندی سامیری بابلی و خانمی شاناز سەلیمدا تێپەڕیبوو. من دەمزانی بابلی بە پێچەوانەی منەوە ئێجگار لە ژیانی ئەم ئوتێلە بێزارە، بەڵام نەشیدەزانی بچێت بۆ کوێ، ئەگەرچی من هەموو ئەو بەڵگەنامە پێویستانەم بۆ سازاندبوو کە لە کاتی پشکنین و لێپرسینەوەدا دەریدەخستن، بەڵام هێشتا ترسێکی گەورەی لەدەرەوە هەبوو، دەیزانی تەنیا بە کۆمەکی یەکێکی تر دەتوانێت بژی. دڵنیابوو من جگە لەو دادگایە هیچ ڕێگایەکی دی ناگرمە بەر بۆئەوەی تۆڵەی لێبکەمەوە، بەڵام دەترسا یەکێک لەدەرەوە بیناسێتەوە و تیابچێت. دەبێت ڕاستیتان پێبڵێم، سامیری بابلی لە مردن نەدەترسا، ئەوەی لامەبەست نەبوو بکوژرێت، بەڵام دواجار لە مردندا بە دوای مانایەک دەگەڕا، دەیویست لە ڕێگای مردنەوە خۆی پاکبکاتەوە، لە گورگێک دەچوو لە ناخی خۆیدا

بڕیاری دابێت نەهێڵێت گورگەکانی تر بیخۆن، لە بەرئەوە سووک و سادە چارەنوسی خۆی دابووە دەست کۆترێکی وەک من. نەیدەویست خۆی بۆ هیچ دڕندەیەکی تر شلبکات. دەیگووت: من تەنیا مەرگم بەدەستەوە ماوە. سەرەتا نەمدەزانی مەبەستی چییە، بەلام هێور هێور تێگەیشتم مەرگ لای ئەو تەنیا ڕێگای پاکبوونەوەیەتی. من دڵنیابووم سامیری بابلی لەم سەر زەمینەو لەم دونیادا پاکنابێتەوە، نەشمدەزانی مردن دەتوانێت چی بۆبکات، بەلام بەختەوەری خۆی لەوەدا دەبینی بەدەستی یەکێک لە قوربانییە بێگوناهەکانی خۆی بمرێت، نەوەک لە شەڕو پێکداداندا. جارێکیان گووتی: من لە کێڵگەی گورگەکانەوە هاتووم بۆ کێڵگەی کۆتر. من دەمزانی هاتووە بۆئەوەی بمرێت، لەوە دەترسا کە بایەکی بەهێز بێت و بیگێڕێتەوە بۆ ناو گورگەکان، بۆ ناو شەڕ. ئەو ئۆتێلەی بە جێگایەکی خراپ دەزانی، جێگایەک ناتوانێت بیپارێزێت. دەرکەوتنی خانمی شاناز سەلیم لای ئەو وەک دەرکەوتنی فریشتەیەک وەهابوو کە دەتوانێت ڕزگاریبکات... دەیویست لەسەرەتاوە دەست پێبکاتەوە. ببێتەوە بە کوڕێکی هەرزەکار، عاشق بێت، ژن بهێنێت، خێزان دروستبکات، منداڵ بخاتەوە، ژیان لە ڕووەکەی تریدا بژی، لە ڕووە سادە مرۆڤانەکەیدا، بەلام زۆر درەنگ بوو... من پێموایە بۆ ئێمە هەموو ئەوانەی لە سالانی حەفتاو هەشتاکانی سەدەی بیستدا لەو وڵاتەدا ژیاین، چ جەلاد بین و چ قوربانی ناتوانین ژیانێکی ئاسایی بژین، هەمووومان یەک ڕێگامان لە بەردەمدایە ئەویش ئەوەیە زیندەگی نائاسایی خۆمان درێژە پێبدەین، ژیانی سوریالی خۆمان نەپچڕێنین، تەسلیمی بین و بڕۆین. بیرکردنەوە لە ئاساییکردنەوەی ژیان ترسناکە، دەمانکات بە شێت یان گاڵتەجاڕ یان پیاوکوژ. بەلام سامیری بابلی دەیویست گەر بە خێراییەکی کوتوپڕیش بووە، هەموو ئەو قۆناغانە ببڕێت و ڕێگای خۆی وەک مرۆڤێکی ئاسایی ئەزموونبکات.

پێویستە ڕاستگۆبم لەگەڵتاندا، ئەوە من نیم کە دەمەوێت جۆرێک

لە شاعیرییەت ببەخشم بەپیاوێکی دڕندەو جەلاد.. سامیری بابلی خۆی لەو کەسانەبوو کە لە ناکاو فریشتەیەکی خەوتووی لە ناخی خۆیدا دۆزیوەتەوە. بەڵام پرسیارێکی گرنگ کە لێرەدا دێتە بەردەممان ئەوەیە: کاتێک فریشتەیەک لە ڕۆحی جەلادێکدا دێتە سەرکار و پاشماوەی عەرشێکی خوێناوی وەردەگرێت دەتوانێت چی بکات؟ هەڵبەت ئەمە قورسترین پرسیارێکە مرۆڤ خەیاڵی بۆی بچێت. من کە ئێستا بیر لە سامیری بابلی دەکەمەوە، هەستدەکەم ئەو فریشتەیەی نێو ڕۆحی بابلی، فریشتەیەکی فێڵبازو مەکربازبووە، واتە بە جۆرێک لە جۆرەکان لە ڕۆحی بابلیدا تەنیا خەریکی پاککردنەوەی ویژدان نەبووە، بەڵکو لە هەمان کاتدا گەمەی خۆ ڕزگارکردنیشی دەکرد. واتە فریشتەیەک بوو گەمەیەکی دزێوی دەکرد، گەمەیەک من پێموایە بەشێک بوو لە وانەکانی شەیتان، گەمەی لە بیرچوونەوە. خەونی سامیری بابلی خەونێکی ئەفسانەیی نەکردەبوو... پێیوابوو دەتوانێت بەیانییەک لە خەو هەستێت و لە گورگەوە بووبێت بە کۆتر، یاخود پێیوابوو هەستکردنی بە گورگێتی خۆی ڕێئاسانی بۆ دەکات ببێت بە کۆتر. بەڵام من لەسەر قانونێکی تر کارمدەکرد، من ڕام وابوو گورگ نابێت بە کۆتر... هەتا ئەگەر هەموو کەڵبەکانی خۆشی بشکێنێت، پێستی خۆشی بگۆڕێت. سامیری بابلی سووربوو لەسەر ئەوەی ئێمە نە گورگین و نە کۆتر، ئێمە مرۆڤین، عەقڵمان هەیە، ویژدانمان هەیە، توانای گۆڕانیشمان تێدایە، لە بەرئەوە دەبێت جەلادەکانیش شانسێکی تریان هەبێت، دەبێت ڕێگایان پێبدەین پاکببنەوە. کێشەکە ئەوەبوو من و ئەو کەسمان ئیماندارى تەقلیدی نەبووین، واتە نەماندەویست کێشەکە ببەینەوە بۆ بەردەم دادگایەکی ئیلاهی، تا خودا لەسەرەوەڕا حوکم بدات. من دەمویست لێرەدا، لە سەر زەوی، لەم کاتەدا کە ئێمە تیا دەژین عەدالەت بێتەدی. سامیری بابلی دەیگووت «ئەی منداڵی خۆشەویست، کوڕی نەجیب. مرۆڤ لەسەرەتادا دڕندەبووە، زۆر زۆری ویستووە تا ئەو دڕندەیەی ناو

خۆی ڕامبکات. ئێستاش کە لە دایک دەبین، هەندێکمان مرۆڤ و هەندێکمان دڕندەین. گەر نەهێڵین دڕندەکان ببنەوە بە مرۆڤ، وەک ئەوەیە هێزێک هەبێت لەسەرەتای خەلیقەتەوە، لە بەربەیانی دروستبوونی مرۆڤەوە، نەهێڵێت مرۆڤ لە دڕندەوە ببێت بە مرۆڤ». نا وا تێمەگەن وەک ئەوەی سامیری بابلی لە دادگا ڕابکات، من دڵنیابووم نایەوێت ڕابکات و ناشتوانێت ڕابکات، دڵنیابووم بشچێت بۆ ئەوسەری زەمین هەر دەگەڕێتەوە بۆ ئێرەو لەبەردەم مندا دەوەستێتەوە. لە ڕاستیدا من باوەڕم بەوە نەبوو، لێگەڕێیت دڕندەیەک ژیانێکی سادە و ئاسایی بژی، تا لە ڕێگای تێکەڵاوبوون و لەزەتبردن لە ژیان خۆیەوە ببێتەوە بە مرۆڤ. ئەو دڕندانەی سیاسەت دروستیاندەکات جیاوازییەکی زۆریان لەو جانەوەرو وەحش و دڕەئاژەڵانە هەیە کە سروشت خولقاندوونی، مەکربازتر و خۆگۆڕترن، ئاسانتر دەتوانن شێوەی فریشتەیەکی پاک وەربگرن، دەتوانن لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە بەبێکێشەو گرێی گەورە هاتوچۆبکەن. بۆ نمونە ئەو وەحش و دڕە ئاژەڵانەی سروشت دروستیاندەکات، لەگەڵ گۆڕانی سروشت و وەرگەڕان لە هەلومەرجەکانی ژینگەدا زۆربەیان لە نێودەچن، بەڵام ئەو حەیوانە دزێوانەی سیاسەت دروستیاندەکات لەگەڵ لابەلابوونەوەی باری سیاسیدا دەتوانن بە دەموچاوێکی دیکەوە بێنەوە سەر شانۆ. لە ڕاستیدا من نەمدەویست ڕێگربم لە نێوان سامیری بابلی و هەر هەوڵێکدا کە خۆی بەباشی دەزانێت بۆ پاکبوونەوە، بەڵام دواشت بە خەیاڵی مندا هاتبێت ئەوەبوو سامیر بیەوێت لە ڕێگای ئافرەت و خۆشەویستییەوە ببێتەوە بە کەسێکی ئاسایی، لەوەش سەختتر بۆ من تێگەیشتن بوو لەو ئافرەتە سەیرو پڕ نهێنییەی لە ماوەیەکی کورتدا دەرکەوت و بە خێرایی بوو بە مەعشوقەی سامیری بابلی. ئەو شەوە کە سامیری بابلی لە ماشێنەکەی خانمی شاناز سەلیم دابەزی، سەری بەرزکردەوە و لە باڵکۆنەکەدا منی بینی. کە هاتە سەرێ من هێشتا لە باڵکۆنەکەدا سەیری ئاسۆ دوورەکانم

دەکردو چاوەڕوان بووم باڵندە سپیەکانم لە دوورەوە دەربکەون. بێئەوەی بێتە باڵکۆنەکەوە، لە ژوورەوە کراسە شینەکەی داکەند و دیسداشە عەرەبییە بۆرەکەی لەبەرکرد و گووتی: ئەی منداڵی نەجیب، دەمەوێت ژن بهێنم. بێئەوەی ئاوڕی لێبدەمەوە، هەر لە شوێنی خۆمەوە لە باڵکۆنەکەدا گووتم: چی دەکەیت بیکە، بەڵام بیرت نەچێت تۆ دیلی منیت.

دوای ئەوە من چەندین سەعات بە پێوە لە باڵکۆنەکەدا وەک بت وەستام و سەیری جێگایەکی نادیارم دەکرد.

* * *

زۆری ویست تا توانیم زانیاری تەواو لەسەر خانمی شاناز سەلیم کۆبکەمەوە. ڕیشەی پەیوەندیی نێوان غەریزە جنسییەکانی و بۆنی پرتەقاڵەکانم پشکنی، لە ژیانی پێشینەیدا قووڵ بوومەوە. من دەمویست ئەو ڕۆژەی کە چووم تکای لێبکەم واز لە سامیری بابلی بهێنێت، هەموو ئەو زانیاریانەم بزانیبایە، بەڵام ئەو ڕۆژە شتێکی ئەوتۆم پێ نەبوو حوکمەکانی خۆمی لەسەر پێکبهێنم. ئێستاش دەپرسم: چۆن خانمی شاناز سەلیم توانی بۆنی مردن بکات؟ چ غەریزەیەکی دڕی هەبوو ڕاستەوخۆ بەرەو ئامێزی کەسانی وەک بابلی ڕایدەکێشا؟ ئەوانەی یارمەتی منیان دەدا، هاوڕێ کچەکانی خۆی بوون، ئەو ژنانە بوون کە هەموویان لەسەر یەک شت تەبابوون، ئەویش ڕقی هاوبەشیان بوو لە شاناز کە وەک ژنێک تەماشایاندەکرد لە ژێر دەمامکی بێگوناهی و پاکیدا، لە پشت دەموچاوێکی منداڵانەی جوانەوە ژیانێکی پڕ نهێنی و بێڕەحم و ترسناک دەژی.

باوکی شاناز سەلیم یەکێک بوو لەو بەڵێندەرانەی لە ساڵانی هەشتادا خواردنی بۆ سوپا ئامادەدەکرد، بەڵێندەری سەوزەو میوەهات بوو بۆ هەموو پایگا سەربازییەکانی دەوروبەری شار، لە پشتی ماڵی خۆیانەوە

ئـەو مەخزەنـە گەورەیەیـان هەبـوو کـە عەمبـاری میوەهـات و سـەوزەبوو، هەندێک لـە میوەهـات و سـەوزە زیـادەکان کـە لـە بـڕی دیاریکـراوی سـوپا تێدەپەڕیـن لـەو عەمـارەدا کۆدەکرانـەوەو بەنرخێکـی هـەرزان بـە هەندێـک فرۆشـیاری دەسـتگێڕ دەفرۆشـرانەوە، هەندێجـار میـوەو سـەوزەجاتی تـازەو جـوان بـوون و هەندێجاریـش سـێوو پرتەقـاڵ و کاهـووی ڕزیـو. سـەلیم ڕۆسـتەم ڕەشـید کـە بـە «سـەی سـەلیمی سـەی ڕۆسـتەم» بەناوبانـگ بـوو، پیاوێکـی توندوتیژبـوو، بـەڵام وەک هەمـوو باوکـە توندوتیژەکان دواجـار دوو کچـی هەبـوو پـڕ لـە حـەزی ژیـان و لێـوان لێـو لـە ئارەزوویەکـی بێوێنـە بـۆ شـکاندنی هەمـوو لەمپـەرە حەرامـەکان، دوو خوشـک کـە پێکـەوە سـەر دەنێن بەسـەری یەکـەوەو هەمیشـە کۆمەڵێک پیلانـی جەهەنەمیـان هەیـە بـۆ گەیشـتن بـە هەمـوو خۆشـییە قەدەغـەکان. دیـارە کـە بـاس لـە خۆشـی دەکـەم، قسـە لـە هەندێـک لەزەتـی کچانـەی بچـوک دەکـەم، وەک چاوبازییەکـی بێگونـاه، سـەرەتاتکێیەکی کـورت، گۆڕینـەوەی نامـە بـۆ ماوەیەکـی کـورت لەگـەڵ کوڕێکـدا دواتـر نوسـینی نامەیەکـی کورتـی دابـڕان و ماڵاوایـی بـە بیانـووی هاتنـی داواکارێکـی ناوەختـەوە بـۆ شـووکردن.

بـەڵام گومانـی تێـدا نییـە کـە خانمـی شـاناز لـە تەمەنـی بیسـت سـاڵیدا بـۆ یەکەمجـار بـە تەواوەتـی عاشـق دەبێـت، واتـە ئـەو عەشـقەی مـرۆڤ بێهۆشـدەکات، نـەوەک ئـەو عەشـقەی کچـان بـۆ ڕزگاربـوون لـە ترسـی تەنهایـی و ناشـیرینی و بێزاری خۆیانـی تـێ فڕێدەدەن، عەشـقێکی ڕاسـتەقینە کـە مـرۆڤ تـا مـردن هـەر کاتێـک بـە هـەر زمانێـک وشـەی خۆشەویسـتی بیسـت یادیدێتـەوەو دڵـی ڕادەچڵەکێـت و ئاهێکـی قـووڵ لـە سـینەیدا قەتیس دەبێـت. ئـەو کـوڕەی «شـاناز» خۆشـیدەوێت، دوو سـاڵ لـە خـۆی منداڵتـرە، یاریکەرێکـی باسـکەیە کـە ئوتومبیلێکـی نوێـی هەیـەو ژیانـی بـە سـوڕانەوە لـە دەوری قوتابخانەکانـی کچـان بردۆتەسـەر. کـوڕی کابرایەکـی کوتاڵفرۆشـە کـە لـە نـاو قەیسـەرییەکاندا ڕیزێـک دوکانـی جۆراوجـۆری هەیـە، لـەو منداڵـە

پڕ نازو دەلالانەیە کە ئەگەر ئەستێرەی ئاسمان داوابکات دەبێت بۆی دابگیرێت. وەک هەموو ئەو کوڕە جوان و دەوڵەمەندانەی لە هەموو دەورو زەمانێکدا دەردەکەون، جۆرە بیچمێکە نیوەی کچان شێتی دەبن و نیوەکەی دی وەک شەیتان ڕقیان لێیەتی. ناوی «شاسوار خورشید» ـە. پێدەچێت نزیکی ناوەکان لە یەکتر هۆیەکی گرنگی ئەو کارەساتە بێت. لە ڕاستیدا هیچ کەسێک شوێن و کاتی یەکتر بینینی شاناز سەلیم و شاسوار خورشید نازانێت، بەلام پێدەچێت یەکدی ناسینێکی عادەتی بێت، واتە شاسوار چەند جارێک بە ماشێنەکەیەوە بە دەوری شاناز دا دەسوڕێتەوە، چەند جارێک سەیری یەکدی دەکەن، چەند جارێک ئامازەی بچوک بۆ یەکتر دەنێرن، دواجار لە کۆلانێکی چۆڵدا فرسەتێک دروستدەبێت کە شاناز بتوانێت سوار ئوتومبیلی کازانۆفا بەدبەختەکەمان بێت. وادیارە ئەو دوو عاشقە کە پێدەچێت بەراورد بە خەڵکانی تری دەورو زەمانی خۆیان ئەزموونداترو خاوەن پێشینەترین، زیادەڕەوییەکی گەورەیان لە دووبارەکردنەوەی ژوان و یەکتر بینیندا کردبێت، بە جۆرێک حیکایەتەکەیان لە نێوان خەڵکدا وەها زۆر بلاودەبێتەوە، دەگاتە دەم چەندەها ناحەز کە ڕقێکی گەورەیان لە هەردوو خێزانەکەیە، بە تایبەت هەردوولایان دوو خێزانی پارەدارو دەست ڕۆیشتوون لە سەردەمێکدا بەشی هەرە زۆری خەڵک بە کولەمەرگی دەژین. یەکێک لەو دەستە ناحەزانە کە پێدەچێت گەنجێکی عەقڵ منداڵ بێت، شەوێک بە قوتویەک بۆیەی سوورەوە لە سەر دیواری هەموو ماڵەکانی کۆلانەکە، لەمسەر بۆ ئەوسەر دەنوسێت «شان + شاس = ❤».
باوکی شاناز ئەگەرچی لەسەرەتادا هیچ لە ماناو هێما شاردراوەکانی ئەو نوسینە تێناگات، پاش ڕۆژێک خەڵکانێکی خێرخوا لە بەردەم لۆرییەکانی خۆیدا دەیگرن و هەموو ئەو هاوکێشە نهێنییەی بۆ شیدەکەنەوە کە دواتر دەبێت بە هاوکێشەی مردن. پێناچێت سەی سەلیم ویستبێتی گەمەکە بگەیێنێتە ئاستێکی کوشندە، ئەوانەی چیرۆکەکەیان بۆ من گێڕایەوە، باسیان

لەوەکرد کە سەی سەلیم ئەگەرچی تاسەر ئێسقان برینداربووە، ئەگەرچی تووشی سڕبوون و بێدەنگییەکی کوتوپڕ هاتووە، بەلاَم جگە لەوەی کە بۆیەچییەکی پیر دەگرێت تا تەواوی ئەو خەتە سوورانەی بۆ بسڕێتەوە هیچی دی ناکات. بەلاَم چەند شەوێک دواتر هەمان دەست دووبارە هەمان ڕستە بە کۆمەڵێک ئامـاژەی ناشیرینترەوە دەنوسێتەوە. سەی سەلیم بە سەبرو ئارامـی پیاوێکەوە کە دەیەوێت خۆی لە کارەساتێک لابدات، جارێکی تر هەمان بۆیەچی پیر دەهێنێتەوەو دووبارە هەموو نوسینەکان دەسڕێتەوە. ئەم کارە چەند جارێک دووبارە دەبێتەوە، شەوێک لە شەوان ئەو دەستە فیتنەکارە دەگوازێتەوە بۆ کۆلاَنەکانی پشتەوەش، دەپەڕێتەوە بۆ سەر جادەکان، دەگوازێتەوە بۆ کۆلاَنە دوورەکان، بۆ سەر دیواری مەکتەبەکانی کچان و کوڕان... هێدی هێدی ئەو نوسراوە دەڕوات، کەسانی تر کۆپیدەکەن و لەسەر دیواری کەلاوەکان دەینوسن، لە دیواری ئاودەستی مزگەوتەکان، دیواری ئاودەستی قوتابخانەکان. شەوێک یەکێک جورئەت دەکات و بە قوتویەک سپرای تایبەت لەسەر هەموو لۆرییەکانی سەی سەلیم هەمان ڕستە دەنوسێتەوە. لەو نێوەندەدا سەی سەلیم کە پیاوێکی فرەسەر و فرە دۆستە، دوای ئەوەی هەر دوو کچەکەی لە قوتابخانە دەهێنێتەدەرێ، بە تەواوەتی دەچێتە سۆراغی هەموو شتێکی شاسوار خورشید. شەوێک هەندێک خەڵک ڕادەسپێرێت، ئەو کوڕەی بۆ بڕفێنن و بە کۆتەوە بیهێننە بەردەستی. هەڵبەت خەڵکانێکی لێزان کە ئیشیان کوشتن و ڕفاندنە شاسوار لە بەردەرکی ماڵی خۆیاندا بە کلکە دەمانچە سوار ئوتومبێلێک دەکەن و دەیهێنن بۆ ئەو عەمبارە گەورەیەی سەی سەلیم میوەهاتە زیادەکانی خۆی تیاعەماردەکات. شەوێکی درەنگ سەی سەلیم شانازی کچی لە ژوورەکەی خۆی دەهێنێتە دەرێ و دەیبات بۆ ناو عەمبارەکە. لەوێ شاناز دوای چەندین هەفتە دابڕان، شاسوار لە ناو سەدەها سندوقە پرتەقاڵدا دەبینێتەوە. سەی سەلیم کە شەرەفی بەجۆرێکی

سەیر ژاندەکات، کە ئابڕووی وەک گورگێک دەلورێنێت، دوای دەمەقاڵێیەکی کورت لە نێو سندوقە پرتەقاڵەکاندا بەدەستی خۆی شاسوار خورشید بە چەشنێکی دڕندانە دەکوژێت، هەر بە ئوتومبیلەکەی خۆشی لاشەکە دەبات و لەبەردەرکی ماڵی باوکیدا فڕێیدەدات. لەو شەوەوە بۆنی مەرگ و بۆنی عەشق و بۆنی پرتەقاڵ لە ژیانی شاناز سەلیمدا بەجۆرێک دەبێت بە یەک کە دوای دەساڵ لەو شەوە من دەرەنجامی ئەو تێکەڵاوییەم لە ئوتێلێکی غەمگیندا بینییەوە.

لەوشەوەوە شاناز سەلیم بە جۆرێکی دڕندانە حەز لە درەختی پرتەقاڵ دەکات، حەز لە گەڵای پرتەقاڵ دەکات، حەز لە بۆنی پرتەقاڵ دەکات... بەڵام جگە لەوەش حەز لە بۆنێکی دی دەکات «بۆنی مردن».

سەی سەلیمی سەی ڕۆستەم دوای ماوەیەکی زۆر کورت لە ناو لۆرییەکانی خۆیدا، هاریکارێکی گەنجی خۆی دەیداتە بەر گوللەو دەکوژرێت، لە ڕوداوێکدا ئاشکرا دەستی «خورشیدی گوڵ کەتان»ـی لە پشتە، باوکی شاسوار، ئەو پیاوە دڵشکاوەی دەیویست ئەستێرە بۆ کوڕەکەی دابگرێت.

لە دوای مردنی سەی سەلیم، کچەکانی و دایکێکی پیر سامانێکی گەورەیان بۆ دەمێنێتەوە، بەڵام شاناز سەلیم کە کچێکی وریاترو کراوەترە بە خێراییەکی بێوێنە ئەو بەشە سامانەی خۆی دەخاتە بواری عەقاراتەوە، لە ڕێگای هەندێک دەڵاڵی تایبەتی زەوی و زارەوە چەندەها پارچە زەوی گرنگ دەکڕێت، کۆمەڵێک خانوو دەکڕێت لەو خانووانەی خەڵکی لێقەوماو لەو سەردەمی بێپارەییەدا تالانفرۆشیدەکەن. لە ماوەیەکی کەمدا دەبێت بە خاوەنی ڕیزێک پەیوەندی سەیر لەگەڵ کۆمەڵێک پیاو وَ خێزان و خەڵکانی دەست ڕۆیشتوودا. هەرگیز کەس شتێکی خراپ لەسەر شەرەفی نابیستێت، بەڵام توانای سەیری خۆنزیککردنەوە لە خەڵکی دەسەلاتدار، خۆنزیککردنەوە لەسەرپەرشتی بەڕێوەبەرایەتییە گەورەکان، پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی لەگەڵ فەرمانبەرانی عەقارات و تاپۆ و باجدا بازنەیەکی سوور لەسەر ناوەکەی

دروستدەكەن. وەک ژنێکی پارەدار کە بە مارسیدسێکی سپییەوە «کە لەو زەمانەدا بێوێنەیە»، ئێواران لە شەقامە گرنگەکاندا دەبینرێت. لە ئاهەنگەکانی نەورۆز و سەری ساڵدا، لە ئاهەنگە تایبەتییەکانی ژنهێناندا هەمیشە بە چەند کیلۆیەک ئاڵتونەوە دەردەکەوێت، هەردەم کراسێکی پولەکەی تەنک بەسەر ژێرکراسێکی سپیدا لە بەردەکات، بەردەوام برێکی زۆری سینەی بەڕووتی و بەشێکی ستیانەکەی دیارە. لەو وێنانەدا کە من لای هاوڕێ دێرینەکانی بینیومە، هەردەم بە زەردەخەنەیەکی ڕۆشنەوە، وەک ئەسپە ژنێک بە جووتێک چاوی سیحراوییەوە سەیری کامێراکەی کردوە، وەک ئەوەی بە نیگا شتێکی دیاریکراو بۆ پاشەڕۆژ بنێرێت، وەک ئەوەی بڵێت «تۆ ئەی ئەوەی کە دواتر سەیری ئەم وێنەیە دەکەیت، تا مردن ناتوانیت ئەم نیگا ئاڵۆزو سیحراویەی من فەرامۆشبکەیت». من هەستدەکەم شاناز سەلیم بەو نیگا سەیرەیدا پەیامێکی بۆ ڕۆژگارە دوورەکان ناردووە. کاریگەرییەکی دروستکردوە، مرۆڤ لە ناو هەزار وێنەدا، دەبێت وێنەکەی جیابکاتەوەو بپرسێت:ئەرێ ئەم خانمە کێیە؟.

بەڵام بە پێچەوانەی ژنانی دەوڵەمەندەوە کە هەمیشە حەزیان لە پیاوانی وەک خۆیان پارەدارە، شاناز سەلیم حەزی لە پیاوانێکە کە بۆنی مەرگیان لێبێت. بۆنی مەرگ لای ئەو، بۆنی ئەو پیاوانەیە کە دەمرن و مردنیش دروستدەکەن. سەرەتا خۆشی بەدروستی نازانێت بۆنی مەرگ چییە، غەریزەیەکی تایبەتی بەرەو هەندێک پیاو ڕایدەکێشێت، کە دەزانێت لە پیاوانی تر ناچن، جۆرە نیگایەکی تایبەتیان هەیە، شتێک لە چاویاندایە کە مرۆڤی ئاسایی هەستی پێناکات و شاناز سەلیم دەیبینێت... تێکەڵەیەکە لە غەم و دڵڕەقی، لە تەنهایی و وەحشییەت، لە ترسێکی قووڵ و بوێرییەکی شێتانە. ناسینەوەی ئەو مرۆڤانە نهێنی هەرە گەورەی شاناز سەلیمە، کە یەکجار سەیری یەکێک بکات، دەزانێت زوو دەمرێت یاخود نا، پیاوکوژە یاخود بێگوناه. ڕۆژێک بە نەشمیلی سوبحان «کە سەردەمێک یەکێک لە

هاوڕێ نزیکەکانی بوو» دەڵێت: «نەشە گیان، ئەم دنیایە لە بەر چاوی من لەقادرمەیەک دەچێت، هەندێک لەسەرەوە دێنە خوارێ و دەچن بۆ ژێر زەمینێکی تاریک، ئەوانە مردووەکانن. هەندێکی تریان چاوەکەم بە پلەکاندا سەردەکەون، سەردەکەون سەردەکەون. ئەوانە پیاوکوژەکانن... حەیاتم، هەندێجار لەو بەینەدا خەڵکانێک دەبینیت گەیشتونەتە سەری سەرەوەی پلەکەکە، گەیشتونەتە پلەیەک کە نەشە گیان، ئیتر ناتوانن لەوە زیاتر بڕۆن... ئیتر دەبێت دابەزن، لە سەر ئەو پلەکانەیەی دوایی، یەعنی لەویادا دەبێت پێچبکەنەوە، ئا لەویادا بۆنی هەر دوو جنسەکەیان لێدێت، بۆنی یەکێک کە وەستای مردن بووە، بۆنی یەکێکیش کە خۆی دەمرێت، ئیتر نەشنوشی گیان گلەییم لێمەکە، پیاوان کە دەگەنە سەر ئەو پلەیە، من ڕۆحم بۆیان دەردەچێت، بۆنەکەیان شێتمدەکات».

عەشقی یەکەمی لە دوای شاسوار، کوڕێکی گەنجە کە لەسەر کوشتنی دوو خوشکی بێگوناه پۆلیس بەدوایدا دەگەڕێت، عەشقێکی کورت کە دواجار دوای ئەوەی کەسوکاری دوو قوربانییە بێخەتاکە، ماڵەو ماڵ وسەربانەو سەربان بە گوللە هەڵیدەبڕن، بە بەربوونەوەی ئەو کوڕە لە سەربانێکی بەرزەوە دواییدێت. عەشقەکەی تری پیاوێکی چکۆلانەی سەر سپییە کە پێشتر لە شەستەکاندا دەستێکی گەورەی لە کوشتن و سەربڕین و سووتانی کۆمۆنیستەکاندا هەبووە. دوای ناسینی بۆ شاناز سەلیم بە ماوەیەکی کورت، کوڕی یەکێک لەو قوربانییە دێرینانەی جاران، دەردەکەوێت و دوای حەڤدە ساڵ تۆڵەی باوکی لێدەکاتەوەو لە ناو مەحەلەکەی خۆیدا، لە ناو نەخشەی خانوو و دۆسییەی عەقار و دۆکۆمێنتەکانی تاپۆدا سەری دەبڕێت.

شووی یەکەمی شاناز سەلیم بە کوڕێکی سمێڵ ڕەشی برۆ قەترانییە کە سەردەمانێک مفەوزی پۆلیس بووە، بە هۆی دڵڕەقییەکی بێوێنەوە، بە هۆی کوشتنی بۆ چەندەین دیل لە ژێر تێهەڵدان و فەلاقەکردنی پۆلیسخانەدا لە پۆلیسی دەردەکرێت. کاتێک شاناز سەلیم دەیناسێت بابایەکی بێئیشە

کە لە مەزاتخانەی شار کاسیتی سبیل کان و ماقی و ئیبراهیم تاتلیساز دەفرۆشێت و لە ژێریشەوە بازرگانی بەو فلیمە سێکسیانەوە دەکات کە پیاوێکی بستەبالای قەموور بۆی دەهێنێت. کڕیاری فلیمەکانی ئەو زەڕەنگەرو فەرشفرۆش و جوملەچییانەن کە بەردەوام بە ویقاری فشەڵی پشت قات و بۆینباخەکانیانەوە دەیگرن و لێیدەپرسن: هێی کوڕی باش هیچی تازەمان بۆ نەهاتووە؟ شاناز سەلیم یەکەمجار لای زەرەنگەرێک دەیبینێت، هەر لەوێ یەکتری دەناسن، پاش دوو مانگیش لەو ڕۆژە کابرا مێزەکەی خۆی لە مەزاتخانەکە دەفرۆشێت و بە قات و بۆینباخێکەوە گرانبەهاتر لە قات و بۆینباخی بازرگانە هەرە ناسراوەکانی شار ڕوودەکاتە کۆشکێکی گەورەو لەوێ دەبێت بە یەکەمین مێردی خانمی شاناز سەلیم، کە لەیەکەم ئێوارەی زەماوەندیانەوە وەک شێت خۆی فڕێدەداتە ئامێزییەوەو لە کاتی پێکەوە خەوتندا هێند لە بۆنی مردن نزیکدەبێتەوە وەک خۆی دەڵێت: وەک ئەوەبوو مرۆڤ دەستبەرێت و لە زەریای مردندا دوورترین بەرد لە قووڵترین جێگادا هەڵگرێت. لەو سەرەتایەوە شاناز تێدەگات کە ئەو کوشتەی بۆنێکی تایبەتییە، بۆنێکە لە نێوان هەموو عاشقەکانیدا هاوبەشە... جار دوای جار لەگەڵ ئەو مێردە گەنجەیدا دەخەوێت و هەست بە دابەزینێکی زیاتر دەکات بەرەو بنکی خەرەندێکی نادیار. بەرەو جێگایەکی کوشندە کە هەستی مرۆڤ لەگەڵیدا بە تاریکی گەورەتر و گەورەتر دەبێت. دوای سێ مانگ لە زەماوەندیان، شاناز سەلیم بێئەوەی هیچ شتێک لە ئارەزووە تاریکەکانی مردبێت، بێئەوەی لە هاوسێتی مردن تێربووبێت، بێئەوەی بتوانێت غەریزە ڕەشەکانی لە باوەشی ئەو لەزەتە سەیرە جیابکاتەوە کە لەزەتی تێکەڵاوبوونی مردن و ژیانە، بەیانییەک دوای شەوێکی درێژی لەزەت کە دەکرێت مرۆڤ بە شەوی تەقینەوەی بورکانەکانی دۆزەخ ناوزەدیبکات، هەڵدەستێت و ئەو پیاوە چاوڕەشە لە جێگای خەوتنە ئاوریشمییەکەیدا بە مردوویی دەبینێتەوە.

نامەوێت زۆر لە چیرۆکەکانی خانمی شانازدا قووڵببمەوە، تەنیا دەمەوێت ئەوەتان بۆ بسەلمێنم کە ئەو ژنە پڕ نهێنییە، ئەو خانمەی کە پارچەیەک عیشوەو جوانییە، هەمیشە هێلێکی سەیرو نهێنی هەیە، بە ڕێبوارەکانی ڕێگای مەرگەوە گرێی دەداتەوە. ژنێکە لە دووڕیانێکی گەورەدا وەستاوە، باوەش بۆ ئەو پیاوانە دەکاتەوە کە لەمسەرەوە وەک پیاوکوژان دێن و لەوسەرەوە وەک لاشە تێدەپەڕن. لەم ڕێگاوە دێن و مردن لە دوای خۆیان جێدەهێڵن و لەو ڕێگاوە دەڕۆن و خۆیان بوونەتە مردوو. شاناز سەلیم لە ژنێکی ئەفسانەیی دەچێت کە لە پێش دەرگای دۆزەخدا وەستابێت و وەزیفەکەی ئەوەبێت لەگەڵ ئەو پیاوانەدا بخەوێت کە بەر لە مردن پێویستیان بە باوەشی ژنێکە تا لە لەزەتی ژیان و زوڵماتەکانی تێبگەن.

بەرلەوەی خانمی سەلیم جێبهێڵم پێویستە پێتان بڵێم کە ئەم ژنە شوودەکات بە سامیری بابلی و دواتر ڕۆڵێکی ترسناک لە چارەنوسی مندا دەبینێت، من دواتر دوای دوو ساڵ لە سەفەری هەرە گەورەی ژیانم، لە ئاهەنگێکی مۆسیقیدا بینیمەوە، لە پێشی پێشەوە دانیشتبوو. یەکەمجاری بوو تەماشامبکات، پێشتر هەرگیز تەماشای نەکردبووم، هەتا ئەوجارەش کە چووم بۆ لای و تکام لێکرد واز لە سامیری بابلی بهێنێت، ڕاستەوخۆ تەماشای نەکردم، کە قسەی لەگەڵدا دەکردم ڕوویدەکردە تابلۆیەکی گەورە کە پڕبوو لە وێنەی درەختی پرتەقاڵ. من ئەو ڕۆژە کە بینیم وام دەزانی نامناسێتەوە. دوای ئاهەنگەکە ویستی بە بێدەنگی لە هۆڵەکە بچێتەدەرێ، من لە ناو قەرەباڵغییەکی گەورەدا دوایکەوتم، لە ناو ئوتومبیلەکاندا گرتم و لێم پرسی: شاناز سەلیم، بۆ وات لێکردم؟ بۆ ویستت بمکوژیت؟ من چ شتێکم نەکردوە دژی ویژدان و عەدالەت بێت. وەک ئەکتەرێک ڕۆڵی خۆی لە شانۆگەرییەکی ترسناکدا تەواوکردبێت، دەرگای ئوتومبیلەکەی کردەوەو سواربوو، پەنجەرەکەی دادایەوەو بێئەوەی وەڵامبداتەوە ڕۆیشت و ئیدی هەرگیز نەمبینییەوە.

## کەسی دووەم
### شاروخی شاروخ و دووەمین دەرکەوتنی لە باغێکی غەمگیندا

من دەمزانی لێرەیە، دەمزانی یەکێکیان لێرەیە، دەمزانی جگە لە دالیا سیراجەدین یەکێکی تر هەیە کە لە تاریکی و ڕووناکییە سەیرەکاندا سەیرمدەکات و بانگمدەکات. هەندێک شەو هەڵدەستام و هەستم پێدەکرد لە ژوورەکەدایە، دەمزانی یەکێکە دۆستی منە، ڕۆحێکی گەڕۆکە، کەسێکە سنووری نێوان ژیان و مەرگ نازانێت. نا هاوڕێیان من هیچ چیرۆکێکی تایبەتیتان لەسەر خێوو تارمایی پێشکەش ناکەم، من باس لە خەڵکانێک دەکەم کە دیارنەماون، بەڵام گەر بە قووڵی ناو تاریکی بگەڕێین، بە قووڵی ناو ڕۆحی خۆمان بگەڕێین دەیاندۆزینەوە، لە جێگایەکدان نزیکە لە ئێمەوە، لە شارێکی تردان لە ناو شارەکانی خۆماندایە، لە ماڵێکی تردان کە هەر لە ناو ماڵەکانی خۆماندایە، لە باغچەیەکی تردان کە لە ناو باغچەکانی خۆماندایە. کۆمەڵێک ڕۆحن ئیشیان ئەوە نییە باسی جیهانێکی غەیبیمان بۆبکەن، ئیشیان ئەوە نییە بڵێن تەماشاکەن لەم دیو ئەم ژیانەوە ژیانێکی تریش هەیە، بە پێچەوانەوە ئیشیان ئەوەیە کە یارمەتیمان بدەن ئەم زەوییە جوانتر ببینین. تێبگەین لە ناو ئەم شارو باغ و شەقامانەدا، لە ناو ئەم کۆڵان و کوچانەدا، لە نێو هەندێک لەم مرۆڤ و بوونەوەرە ڕاگوزەرانەدا، لە نێوان هەندێک لەم ئاواز و نوسین و تابلۆیانەدا، شتێک هەیە کە سەر بەم جیهانە ساویلکەو یەک دیوە نییە، شتێک هەیە دەتوانێت دەنگی مرۆڤ سافترو ڕوونتر لەسەر ئاستی وجود بەرجەستەبکات. من لە ئەزموونی خۆمەوە پێتان دەڵێم، لە ناو هەموو مرۆڤەکاندا شتێک هەیە کە نامرێت، لە ناو هەر باغێکدا هەندێک گوڵ هەن جاویدن، لە ناو هەر شارێکدا هەندێک شت هەن کە تەنیا لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەدا قسەناکەن،

بەڵکو لەگەڵ ئەبەدییەتدا قسەدەکەن. دڵنیام هەمووتان ئەو هەستە ژیاون، هەمووتان ڕۆژانە ئەو هەستە دەژین... دەچیتە شارێکەوە بە شەقام و کوچەکانیدا دەگەڕێیت، بەڵام بەردەوام هەستێکی نادیارت هەیە وات لێدەکات هەستبکەیت ئەو شارەت نەبینیوە، زۆرجار هەموو ئەو شارە دەگەڕێیت بەڵام هەستدەکەیت چەقێکی دیاریکراو هەیە، خاڵێکی نادیار هەیە تۆ بۆی دەگەڕێیت و نەتدۆزیوەتەوە، لەوانەیە تۆ هەرگیز ئەو چەقە نەدۆزیتەوە، بەڵام دەزانیت خاڵێکی وەها هەیە، پنتێکی وێڵ و نەدۆزراوەی وەها هەیە. دەچیتە ماڵێکەوە تا نەگەیتە سەر پنتێکی دیاریکراو، تا نەگەیتە خاڵێکی نهێنی، پێت وایە هەرگیز ئەو ماڵەت نەبینیوە، هەندێجار هێندەی پێدەخەیتە ئەو شوێنەوە هەستدەکەیت ماڵی تۆیە، هەستدەکەیت تۆ توانیوتە ئەو جێگایە بکەیتە ئاشنای خۆت، بەڵام هەندێجار ئەو پنتەت لە ماڵی هەرە دێرینەی خۆشتدا لێ وندەبێت و دەبێت بۆی بگەڕێیت، دەچیتە ژووری و ئەو پنتەت ونکردوە، بوویت بە غەریبێک کە هەرگیز ئەو ماڵ و مەنزڵەی نەبینیوە. بۆ مرۆڤیش وەهایە... بۆ مرۆڤیش پنتێک هەیە دەبێت بیدۆزیتەوە، گەر ئەو پنتە نەدۆزیتەوە هەتاهەتایە ئەو کەسە لای تۆ غەریبەو غەریبەو هەر بە غەریبی دەمێنێتەوە... ئەو خاڵە دەرگای ئێمەیە بۆ گەیشتن بە نهێنی دونیا، بۆ پەڕینەوە لە نیگارە سادەکان و ئامادەگییە سادەکان و پەیوەندییە سادەکان، لەو بەر ئەو خاڵەوە جیهانێکی تر دەست پێدەکات، ئەو پنتە ئەو پنتەیە کە لە شارەکاندا نامرێت، لە باغەکاندا جاویدەو لە مرۆڤدا ئەبەدییە.

شەوێکیان گوێم لە دەنگی بوو... لە باڵکۆنەکەدا دانیشتبووم و چاوەڕوانی باڵندەکانم دەکرد، لەو مەخلوقاتانە ورددەبوومەوە کە دەمتوانی لە تاریکیدا بیانبینم، لەبەردەم ئەو باغچە بێنازەدا دەرکەوت کە ڕاستەوخۆ لەوبەر ئوتێلەکەوە بوو، بە هێمنی هات و لە بەر ئوتێلەکەدا وەستا، جلێکی سپی لە بەردابوو، جانتایەکی سپی بە شانەوە بوو، لە جانتا سپییەکەوە سەری فلووتێکی سپی هاتبووە دەرێ. بە هێمنی لە ژێر باڵکۆنە چکۆلەکەی مندا

وەستاو و سەرێکی بەرزکردەوەو تەماشایکردم. ئەو شەوە وەک ڕێبوارێک هاتە بەرچاوم کە شەو درەنگ لە ماڵ هاتۆتەدەر بۆئەوەی بەربەیان زوو بگاتە هەواری خۆی. بەڵام ئەوە یەکەمین و دواهەمین دەرکەوتنی نەبوو، چەند شەوێک دواتر کاتێک لەلای محەمەدی فیردەوسی دەگەڕامەوە، بە نێو قەیسەرییەکی چۆڵدا دەڕۆیشتم، بازاڕێک بوو تا ئەوکات پڕ لە تەپوتۆزی ڕۆژ، لە بۆنی کالای نوێ، لە جریوەی ئەو باڵدارە بچوکانەی بەدەم خەوەوە لە نێوان شێلمانی ژەنگاوی سەقفەکاندا دەفڕین. لە ناکاو لەوسەری قەیسەرییەکەوە بینیم، هەمان کەس، بە هەمان جلی سپییەوە، بە هەمان کوڵە پشتەوە، بەڵام ئەمجارەش نەمتوانی ڕوخساری بە ڕوونی ببینم، دەرکەوت و ونبوو. نەمدەزانی ئاخۆ یەکێکە دەیەوێت خۆی نیشانی من بدات، یان ڕێبوارێکی ڕاگوزەرەو بەڕێگای خۆیدا دەڕوات، بەڵام دڵنیابووم هەر دوو جارەکە لە تاریکیدا لە منی ڕوانی، هەر دوو جارەکە ئێستێکی کرد و سەری هەڵبڕی و بۆ ساتێک تەماشایکرد و تێپەڕی. بەڵام هەر دوو جارەکە بە مەودایەکی هێند زۆر لێم دوور بوو نەمتوانی قسەی لەگەڵدا بکەم. هەر دووجارەکە شەو بوو، هەر دوو جارەکە من تەنهابووم، هەر دوو جارەکە لە من دووربوو. هەندێک شەو ئیدی من بە تەنها دەهاتمەدەرێ، خۆم دەکرد بە ناو کۆڵانەکاندا، دەچوومە ناو بازاڕە خاڵییەکانەوە، دەستمدەخستە ناو گیرفانەکانی چاکەتێکی سپی درێژەوەو وەک لەقلەقێکی نەخۆش چاوەکانم کزدەکردەوەو بێئەوەی بیر لە هیچ بکەمەوە دەکەوتمە پشکنینی تاریکی. من بست بە بست تاریکیم بۆ شتێک دەپشکنی، بۆ دەروازەیەکی نهێنی، بۆ ڕێگایەک کە ئادەمیزادەکانی تر نایدۆزنەوەو ناتوانن پیا بڕۆن، بەڵام من دەمویست بیدۆزمەوەو پیابڕۆم.

لەو شەوانەدا چاوەڕێمدەکرد دەرکەوێت، بەڵام نا... لەو شەوە تاریکانەدا، من ڕێگام کەوتە سەر ڕێگای پیاوێکی تر کە جەمسەرە لەیەکترازاوەکانی دوو دونیای بۆ من بەیەکەوە گرێدا، لەو شەوانەدا من مستەفای شەونمم

ناسی کە چوارهەمین و دواهەمین مرۆڤی ڕاستەقینەو گەورەیە من لەسەر ئـەم ئەسـتێرەیە دیبێتـم، لەگـەڵ ئیسـحاقی لیۆزێرین و دالیـا سـیراجەدین و دکتـۆر بابەکـدا ئـەو چوارگۆشـە گەورەیـە دروسـتدەکات کـە مـن لـە ناویـدا خاڵێکـی چکۆلـە بـووم و بانگـەوازە دوورو لـە یەکترازاوەکانیانـم پێکـەوە گرێـدەدا... بـەڵام بوەسـتن، بـەر لـەوەی درێـژە بـە باسـی نهێنییـە گـەورەکان بـدەم دەپرسـم : ئێـوە کەسـتان ئـەو یارییەتـان کـردوە کـە وێنەیـەک بـە لەیەکدانـی کۆمەڵێـک خـاڵ دروسـتبکەن، نیگارێـک وەک ئـەو نیگارانـەی لـە گۆڤـاری منداڵانـدا هەیـە، کۆمەڵێـک پنتـت هەیـە هـەر یەکەیـان ژمارەیەکـی لەسـەرە، ئیشـی تـۆ ئەوەیـە کـە ئـەو پنتانـە بەیەکـدی بگەیێنیـت تـا دواجـار وێنەیەکـت بـۆ دەربچێـت؟ دڵنیـام زۆربەتـان لـە منداڵـی یـان گەورەیـدا ئـەو وازییەتـان کـردوە. مـن ژیانـم وەک شـتێکی وەهـا دێتـە پێش چـاو، ئازیـزان، ڕەنگـە یەکێـک بڵێـت ئەمـە وێنەیەکـی کـۆن و تەقلیدییـە بـۆ ژیـان، بـەڵام مـن ئێسـتاش هـەروا دەیبینـم، مـن خـۆم وەک ئـەو هێڵـە دەبینـی کـە ئـەو خاڵـە دوورو لەیەکترازاوانـە بەیەکدەگەیێنێت... بـەڵام جیاوازی هـەرە گـەورەی ئـەم یارییـە لەسـەر کاغـەز لەگەڵ ژیانـدا ئەوەیـە، لەسـەر کاغـەز هەمـوو خاڵـەکان ژمارەیـان لەسـەرە، تـۆ لـە یەکـەوە دەچیـت بـۆ دوو، لـە دووەوە دەچیـت بـۆ سـێ و تـا کۆتایـی، بـەڵام لـە ژیانـدا خاڵـەکان ژمارەیـان لەسـەر نییـە، تـۆ نەخشـەیەکت لـە بەردەمدایـە پڕە لـە پنتـی پەراگەنـدە، پڕە لـە هـەزاران خـاڵ، لـە هەمـوو پنتێکـدا تـۆ دەبێـت بـە زەحمەتێکـی زۆر، بـە ئەگـەر کارییەکـی ناکۆتـا بگەیتـە ئـەو بڕیـارەی دواتـر بـۆ کـوێ دەچیت. هەندێـک مـرۆڤ هـەن هەرگیـز خاڵـەکان پێکـەوە گرێنـادەن، لـە جێگـای خۆیانـدا دەوەسـتن و پێیـان وایـە ئـەو وەسـتان و ڕامانـە هەمـوو زیندەگییـەو کەماڵی کەماڵـە. هەندێکیـش بەشـێکی نیگارەکـە تەواودەکـەن و دەوەسـتن، هەندێکیـش بـە ڕێگایەکـی هەڵـەدا دەڕۆن و هەرگیـز ئـەو وێنەیەیـان بـۆ دروسـتناکرێت کـە دەبێـت دروسـتیبکەن، بەڵکـو لـە نێـو خەتـی ئاڵـۆزو بەیەکداچـوودا ونـدەبن. بـەڵام مـن ڕام وابـوو

هەر یەکێک لە ئێمە لە ژیاندا دەبێت وێنەیەک دروستبکات، کۆمەڵێک خاڵ بەیەکەوە گرێبدات و لەو خاڵانە نیگارێکی تایبەتی بکێشێت، وەلێ ئێجگار کەمن ئەو مرۆڤانەی تا کۆتایی لەگەڵ نیگارەکەدا دەڕۆن، ئێجگار کەمن ئەوانەی وێنەکە تەواودەکەن... من کە تەواو مستەفای شەونمم ناسی، دڵنیابووم توانیومە دوو خاڵی گرنگ پێکەوە گرێبدەمەوە، وەک ئەوەی وێنەی مانگێکی گەورەت هەبێت و تۆ دواجار خاڵەکانی ئەمسەرەوسەری کەوانەکەت دۆزیبێتەوە، ئەو دوو پنتەت دۆزیبێتەوە کە جەوهەریین لە دروستکردنی هەموو نیگارەکەدا. بەڵام ئەو شەوانەی کە بەدوای ئەو کوڕە سپیپۆشە دەکەوتم، نەمدەزانی چی دەکەم، نەمدەزانی من لە نێوان هێڵەکان و خاڵەکاندا ونبووم یاخود بەڕێگا ڕاستەکەدا دەڕۆم؟.

بە پێچەوانەی چاوەڕوانی منەوە، سێیەمین جار ئەو کوڕەم لە نیوەڕۆیەکی گەرمدا، لە خراپترین و ناشیرینترین شوێنی شاردا بینییەوە، ئەو سەردەمەبوو کە سەراف و پارەفرۆشەکان نیوەی ئیشەکانی خۆیان دابووە دەست هەندێک منداڵ کە بە سەفتە پارەی زۆرەوە لەسەر شۆستەکان دەهاتنە بەر لووتت و داوایاندەکرد پارەکانت بگۆڕیتەوە. ئەو ڕۆژە من ژنێکی ئاوارە تکای تیاکردم، لە بازاڕ پرسیاری بۆ بکەم سەد مارکی ئەڵمانی چەند دینار دەکات. دەبێت پێتان بڵێم کە من لە هەر شت زیاتر ڕقم لە ناوی پارەبوو، نازانم لە بەر هەر هۆیەک بێت ناوی ئەو دراوە سەیرانەم وەک ناوی جنۆکەو جڕوجانەوەر دەهاتە بەر گوێ «غڵدن، پاوەن، دراخما، پیزۆ، شێخڵ». بە ناڕەحەتییەوە ڕوومکردە ئەو ژێر زەمینە تاریکەی سەدان کەس لەوێدا بۆگەنی ڕۆح، بۆگەنی دەست، بۆگەنی هەناسەو بۆگەنی پاشەڵیان تێکەڵکردبوو. من لەو جەنجاڵییەدا لە بەردەم دوو کەسدا وەستابووم، کە لە دوو فەردەی گەورەوە سەفتەی پێنج دیناریان دەردەهێناو بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر دەیانژمارد. من خەریکی پرسیارکردن بووم کاتێک ئاوڕمدایەوەو لەنزیکمەوە لەسەر

پلەکەکان بینیمـەوە، سـەرەتا ئـەو چـوار دڵۆپـە خوێنـەم بینییـەوە کـە لەسـەر لاملـی بـوو. لـە سـەرەوە سـەیریکردم و بـە هێواشـی دەسـتی بەرزکـردەوەو سڵاوێکی لێکردم، ئێستا دەمتوانـی بـە ڕۆشـنی ببینـم، خـۆی بـوو، شـاروخی شـاروخ بـوو ئـەو سـەربازە بـوو کـە شـەوێکی ڕەشـەبا و تەپوتـۆز دوای کۆتاییهاتنی جەنگی ئێران لـە شاری تەپوتۆزە زەردەکاندا بینیم، ئەو بوو بە چاوە شینەکانییەوە، بە سـەرە سفرەکەیەوە، بە فلووتەکەیـەوە، بـە هارمۆنیکا بچوکەکەیـەوە لـە گیرفانـی چەپیدا. لەسـەرەخۆ لـە پلەکەکانـی ئـەو بـازاڕی ئەهریمەنـە دابـەزی، مـەودای نێوانمـان زۆر گـەورە نەبـوو، بەڵام لـە نێوان مـن و ئـەودا بێشـومار خەڵـک هەبـوون، دەیـان سـەراف بـە چـاوی پـڕ تەماحـەوە، دەیـان مێردمنـداڵ بـە فـەردەی گـەورەی پـارەوە، دەیـان کڕیـار بـە چاویلکـەی ڕەشـەوە، دەیـان خەڵکـی گیرفـان بەتاڵیش کـە هاتبوون تەنیا بۆنی پـارە بکەن. مـن بـەرەو ڕووی ڕۆیشـتم و وام هەسـتدەکرد ئەویـش بـەرەو ڕووی مـن دێت. بـەڵام لـە چاوتروکانێکدا لـە نـاو جەنجاڵییەکـەدا ونبـوو. مـن هـاوارم لێکـرد: بـرای مـن، شـاروخی شـاروخ، کاک شـاروخ، ئاغـای شـاروخ... بـەڵام وەک ئـەوەی زەوی قووتیبـدات لـە نـاو قەرەباڵغییەکـەدا دیارنەمـا... بـەڵام دڵنیابـووم بینیومـە، دڵنیابـووم خـۆی بـوو، شـاروخی شـاروخ بـوو، خاوەنـی هەمـان ئـەو چـاوە شـینە غەمبارانەبـوو کـە لەوەوبـەر بینیبـووم. مـن هەمـوو ئـەو بـازاڕەی بـەدوادا گـەڕام و نەمبینییـەوە، هـەر کەسـێک جلـی سـپی لـە بەردابایـە دەمگـرت و تەماشـامدەکرد و ئـەو نەبـوو. دوای ئـەوە سـێ ڕۆژ لەسـەر یـەک گەڕامـەوە بـۆ ئـەو بـازاڕە و هیـچ ئاسـەوارێکی نەبـوو. دواجـار ئێوارەیەکـی درەنـگ لـە چایخانەیەکـی چکۆلانـەدا دانیشـتبووم، لـە شـوێنێکی غەمگینـدا. مـن دواهەمین کـەس بـووم کـە چایچییەکـە چاوەڕوانیدەکـردم هەسـتم و ئیـدی دەرگای چایخانەکـەی دابخـات و بڕواتـەوە بـۆ نـاو مـاڵ و منداڵـی خـۆی، هێـدی هێـدی گڵۆپـی شـەقامەکانی ئێـوارێ دادەگیرسـان. بـازاڕ بـەرەو هێمنـی و شـەقامەکان بـەرەو خامۆشـی دەڕۆیشـتن. چێشـتخانە و چایخانـە و فرۆشـیارەکانی

دەوروبەرمـان زۆربـەی داخرابـوون و ئەوانـی دیش کـە مابـوون خەریکـی کۆکردنـەوەی شـتەکانیان بـوون، لـەو سـاتەدا لـەو بـەری شـەقامەکەوە دەرکـەوت، هـەر دووکمـان یەکترمـان بینـی، هـەر دووکمـان سـەیری نێوچاوی یەکدیمـان کـرد، بەدەسـت ئاماژەیەکـی بـۆ کـردم وەک ئـەوەی بڵێـت دوامبکەوە. مـن پـارەی چاکـەی خۆمـدا و بـە پەلـە چوومـەدەرێ، وەک ئەوەبـوو بـە یەکجـار شـەو داهاتبێـت، بـە یەکجـار لـە چاوتروکانێکـدا شـەقامەکان خاڵـی و کوچـەکان خامـۆش بووبێتـن، هەسـتمکرد جگـە لـە سـەنگینی شـەو کـە بـە خێراییەکـی ئەفسـوناوی دەیـدا بەسـەر شـاردا هیـچ شـتێکی دی نابینـم، هەسـتم بـە تاریکییەکـی کوشـندە دەکـرد، تاریکییەکـی قـووڵ و بێسـنوور کـە تەنیـا ڕوناکـی هەندێـک گڵۆپـی زەرد دەیشـکاند. وامدەزانـی ئەوجارەش ونمکـردوە، وامدەزانی یارییەکـی دزێـوی دەرکەوتـن و خۆشـاردنەوەم لەگەڵـدا دەکات، بـەڵام بینیمەوە لەوسـەری شـەقامەکەوە وەسـتابوو، بـە تەنیـا… مـن جگـە لـەو کەسـی دیکـەم لـەو شـەقامەدا نەبینـی، هیـچ کەسـی دیکـە، وەک ئـەوەی لـە نـاکاو هەمـوو زەمین بـۆ ئـەو یەکتـر بینینـەی مـن و ئـەو چـۆڵ بووبێـت، هەمـوو زەمیـن تەنیـا بـۆ ئەو چاوپێکەوتنـە سـیحراوییەی مـن و ئـەو خـۆی ئامادەکردبێـت. مـن نەمدەزانـی ئاخـۆ بـە ڕاسـتی لـە نـاکاو شـەقامەکان و کوچـەکان لـە نێـوان مـن و ئـەودا چـۆڵ بـوون، یاخـود ئـەوە منـم کـە هەسـت بـە دوورکەوتنەوەیەکـی ئەوتـۆ دەکـەم لـە دونیـا کـەس نابینـم. بـەڵام گرنـگ ئـەوە بـوو ئـەو لـەوێ بـوو، لـە ژێـر گڵۆپێکـدا وەسـتابوو، بۆئـەوەی بـاش ببینـم، لـەدوورەوە بـە هەمـان شـێوەی یەکەمجـار دەسـتی بـۆ بەرزکردمـەوە و بانگیکـردم. مـن دوای کەوتـم و ئـەو ڕۆیشـت، نەمدەزانـی دەیەوێـت بگەیـن بـە کـوێ، بـەڵام بـە ئاڕاسـتەی ئوتێلـە سـووتاو و غەمگینەکـەی مـن دەجـوڵا. گرنـگ ئەوەبـوو مـن جگـە لـەو هیچـی دیکـەم نەدەبینـی. لـە نـاکاو ماشـێنەکان و پاسـە چکۆلەکانیش نەمابـوون، شـەقامەکان بـە شـەقامی نێـو شـارێکی خاپـوور دەچـوون، شـارێک ئافاتێکـی کوتوپـڕ ڕووی تێکردبێـت، لـە دوور بایـەک دەهـات یـاری بـە پاشـماوە و پیسـی تـوڕدراوی

سەر جادەکان دەکرد، من دوای دەکەوتم و گرنگ نەبوو بەلامەوە بۆ کوێ دەچێت، گرنگ نەبوو بایە یاخود نا، ڕوناکییە یان زوڵمەت، گەردەلوولە یان ئارامی، گرنگ ئەوەبوو من دەمبینی... دواجار خۆی کرد بەو باغچە زەردەدا کە دەکەوتە بەرابەر ئوتێلە سووتاوەکەی منەوە، باغێک بوو چۆڵ و تاریک. یەکەمجارم بوو بچمە ئەو باغەوە، نازانم لە بەر هەر هۆیەک بێت وەک باغ سەیرم نەدەکرد. زیاتر لە شوێنێکی لە بیرکراو دەچوو، لە گۆڕستانێک دەچوو مردووەکان جێیانهێشتبێت، لە شوێنێک دەچوو کە خەڵک هەموو دەزانن هەیە، بەڵام نازانن بۆچی هەیە. خەڵک لەو شارەدا بۆ باغچە نەدەگەڕان، کە ڕوویان لەو باغچەیەش دەکرد بۆ شتێکی تر بوو. خەڵکی ئەم شارە هەموو شتێکیان دەزانی ئەوە نەبێت بتوانن بۆ سەعاتێک بە تەنها لەسەر کورسییەک دانیشن و تەماشای سەوزی و درەخت و گوڵ بکەن. سەعاتێک بە ئارامی لە ناو درەختەکاندا چاو لێکنێن و لێگەڕێن دەنگەکانی سروشت بچێتە ڕۆحیانەوە، من پێموابوو ساڵ دوای ساڵ ئەو باغچەیە خۆشی لە یادیکردبوو کە باغچەیە، وەک بەشێک لەو جیهانە کۆنکرێتییە تەماشای خۆی دەکرد. من لەوەوبەر بەردەوام لە باڵکۆنەکەی خۆمەوە تەماشامدەکردو دەمزانی نازانێت باغچەیە. هەندێجار دەمویست خەبەریبکەمەوە، دەمویست پێیبڵێم، هەستە لە خەو تۆ باغچەیت، بەڵام هەموو جارێک پەشیمان دەبوومەوە، هەستمدەکرد گەر بیریبکەوێتەوە باغچەیە خەفەت زۆر دەخوات، بە تایبەت هەموو ڕۆژێک دەبێت ئاوارەکان لە ئوتێلە سووتاوەکەدا ببینێت، دەبێت ئەو کچە شەرمن و ترسنۆکانە ببینێت کە ناتوانن بچن بۆ باغچە، دەبێت ئەو پولیسانەی بەر دەرکی نیشتەجێی حکومییەکانی ئەو بەر ببینێت، ئەو کەبابچییەی کوچەکەی پشتەوە کە جگە لە خواردنی گۆشت لە ژیانیدا بیری لە هیچی دی نەکردۆتەوە، زۆر خەفەت دەخوات کە نیوەڕوان ئەو هەموو پیاوە برسییە لە بەردەمیدا ڕادەکەن بۆ چێشتخانە پیسەکانی ناو بازاڕ و کەس ئاوڕ لەو ناداتەوە، کەس پێینالێت

باغچـە تـۆ گەرماتـە یـان نـا؟. نـا وامەزانـن مـن زۆر شـاعیری و شـتی وام، بـەڵام هـەر کـەس وەک مـن ماوەیەکی درێژ لـە باڵکۆنـی ئوتێلی ئاوارەکانـەوە سەیری ئەو باغچەیەی بکردبایە سووک و ئاسان ئەو حەقیقەتەی دەبینی... مـن حەزمدەکـرد شـاروخی بچووبایـە بـۆ هـەر جێگایەکـی دی و نەچووبایە بۆ ئەو باغچەیە. بەڵام بچووبایە بۆ دۆزەخیش هـەر بە دوایدا دەچووم. کە چوومـە ئەو باغچەیـەوە بایەکی سـەیر هـات، پڕبوو لـە خەفەتی درەختـەکان، شـاروخی شـاروخ لـە نێوان دوو سنەوبەری بـەرزدا وەستابوو. مـن پێمگـووت: هاوڕێـم ئیـدی مـەڕۆ، بوەسـتە. ئـەو بەرابـەرم وەسـتاو بـە زەردەخەنەیەکـەوە گووتـی: هیـوادارم تـۆ هەمـوو شـتێکت لـە بیـر بێـت و ژیانـی پێشـووی خۆتت فەرامۆش نەکردبێت. مـن لێرەم بۆئـەوەی لەگەڵتدابـم. لێرەم بۆ ئـەوەی یارمەتیت بدەم، ئـەو ڕۆژانـەی لـە بـەردەم تۆدان سـەخت و گـەورەن... مـن دەبێـت لەگەڵتدابـم. تـۆ لـە مـن زیاتـر هیـچ یارمەتیدەرێکی تـرت نییـە، مـن چەنـد ڕۆژە لـەم شـارەدا دەسـوڕێمەوە، لێـم مەترسـە وننابـم. مـن چەندین ڕۆژە دوور بـە دوور ئـاگام لـە تۆیـە، بـەڵام دروسـت نازانـم لـە چ ئان و سـاتێکدا دەبێت تـۆ ڕزگاربکـەم... هەمـوو مۆسـیقارێکی گـەورە فریشـتەیەکی هەیـە منیش فریشـتەی تۆم.

مـن لێـی نزیـک دەبوومـەوەو دەمگـووت: کـێ تـۆی نـاردووە بـۆ لای مـن، خـودا یـان شـەیتان؟ تـۆ فریشـتەی کێیـت و دەتەوێـت چیـم بۆبکەیـت؟

بـە هێمنـی دەیگـووت: مـن نـە خـودا ناردومـی، نـە شـەیتان... مـن هیـچ نیـم جگـە لـەو مۆسیقا خەوتـووەی نـاو خـۆت، تۆ لـە بیرت چۆتـەوە مۆسـیقارێک لە ناوتدایـەو کوژراوە. مـن هاوڕێـی ئـەو مۆسـیقارە مـردووەی ناوخۆتـم کـە بـە نـاوی هەمـوو مۆسـیقارە مردووەکانـەوە هاتـووم، مـن مۆسـیقارە مـردووەکان ناردویانـم، ئـەو هـاوڕێ دێرینانـەی خـۆت ناردویانـم، ئـەو کوژراوانـە ناردویانم کـە تـۆ تاکـە شـاهیدیت کـە لـە بیابانەکانـدا کـوژراون... تـۆش ڕەوانەکـراوی ئەوانیـت. تـۆ ڕەوانەکـراوی مۆسـیقارە مردووەکانیـت، مـن لـەلای خـوداوە

نەهاتووم بۆ لای تۆ، لەلای ئەوانەوە هاتووم کە خودا فەرامۆشیکردون. جەلادەتی کۆتر نامەیەک هەیە دەبێتە بگات، تۆ هەڵگری ئەو نامەیەیت.

من دەمپرسی: شاروخی شاروخ ئەو نامەیە چییە، لە کوێیە، من لە کێی وەردەگرم و دەیدەم بە کێ؟

زەردەخەنەیەکی دەگرت هەموو تاریکی ڕۆشندەکردەوە: تۆ تەنیا هەڵگری نامەیەک نیت، تۆ پۆستەچییت لە نێوان ئێمە و ئەواندا... منیش کۆمەکت دەکەم. جەلادەتی کۆتر، نابێت منداڵێکی وا ساویلکە بیت، تۆ پۆستەچییەک نیت لە بابەتی پۆستەچییە ئاساییەکان. من نازانم تۆ دەبێت چی بگوازیتەوە، بەلام دەزانم شتێک دەهێنیتەوە کە دونیا پێویستی پێیەتی.

تا دەهات باغچەکە تاریکتر دەبوو، من و ئەو شان بە شانی یەک بە ناو درەختەکاندا دەڕۆیشتین، دەمگووت: چ جۆرە نامەیەکە دونیا پێویستی پێیەتی؟ شاروخی شاروخ من هێشتا زیندووم، تۆ پێمبڵێ مردووەکان چییان هەیە، ئێمە پێویستمان پێیبێت؟

شاروخی شاروخ دەیگووت: مۆسیقایان هەیە... مۆسیقا... سەیرکە جەلادەتی کۆتر. مردن هەمیشە کاتێک دێت مرۆڤ هێشتا کارو قسەی خۆی تەواو نەکردوە، گرنگ نییە مرۆڤ کەی دەمرێت و لە کوێ دەمرێت، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ هەر کاتێک بمرێت هێشتا قسەیەکی ماوە بیکات، هێشتا ئاوازێک ماوە بیژەنێت، هێشتا نامەیەک ماوە بینوسێت. هیچ ئادەمیزادێک نامرێت و سەر مێزەکەی خاڵی بێت. بەلام جەلادەتی کۆتر، بمانبورە ئێمە نەوەی جەنگین، کە مردین ئاوازەکان هەمووی لەسەری پەنجەماندا بوون، مۆسیقاکان هێشتا لە هەناسەماندا بوون، حەرفە ساواکان لە گەروماندا بوون. تۆ لەو سەرۆکی ئۆرکسترایە دەچیت کە لە شوێنی خۆتەوە هاوارە ناتەواوەکانی ئێمە تەواو دەکەیت...

من دەمگووت: من خودا نیم تا ئەوە بکەم... خودا نیم.

شاروخی شاروخ دەستە سپییەکانی دەخستە سەر شانم و دەیگووت: پێویست ناکات خودا بیت تا ئەوە بکەیت، دەبێت مرۆڤ بیت، مرۆڤێک بیت بە هەموو لاوازیٚ و خەوشەکانی مرۆڤەوە. پێویست ناکات خودا بیت تا ئاوازێکی من تەواوبکەیت، هێندەت دەوێت بە وردی گوێ لە سۆزم بگریت.

من بە ترسەوە دەمپرسی: بەڵام ئەو کات من دەبم بە چی، دەبم بە خزمەتچی مردن یان ژیان؟

بە ئامادەگی پیاوێکەوە کە خۆی بۆ هەموو پرسیارێک ئامادەکردوە، گووتی: تۆ دەبیت بە پێغەمبەری مۆسیقارە مردووەکان، دەبیت بە کەسێک ژیان پێویستی پێیەتی، ژیان کە زۆرجار قسەی خۆی ناکات و دەمرێت، تۆ مردووەکان زیندووناکەیتەوە، تۆ ژیان تەواو دەکەیت. زیندووبوونەوەی مردووەکان درۆیە، بەڵام ئەوەی هەموو مەخلوقێک مافی ئەوەی هەبێت رستەی راستەقینەی خۆی تەواوبکات، دەنگێک هەبێت بۆی تەواوبکات، مافی هەموو رۆحلەبەرێکە. تۆ هەستناکەیت ئێمەی مرۆڤ لەسەرمانە ژیان تەواوبکەین... ژیان بەو مانا گەورەیەی کە شتێکە لەسەروو جەستەی من و تۆوە، شتێکی گەورەترو بەرینترە لە من و تۆ، وەک ئاگرێک وەهایە کە من بەشێکی لە دڵی خۆمدا هەڵدەگرم، ئاگرێک کە من دەرۆم و زەوی جێدەهێڵم هێشتا برێکی هەر دەسووتێت، وەک مەشخەڵێک کە هەتا هەتایە لە دوورەوە دەسووتێت. جەلادەتی کۆتر، قەدەری تۆ ئەوەیە لە بری هەموومان بژیت. تۆ نوێنەری هەموومانی لەسەر زەوی...

بە ئەسپایی دەمگووت: بەڵام بۆ من؟ بۆ من بە تەنیا؟

بە سەرسامییەوە دەیگووت: لە بەرئەوەی ئەو مۆسیقارە مردووەی ناو تۆ، ئەو شاعیرە کوژراوەی ناو ناخت، ئەو جوانییە زیندەبەچاڵکراوەی نێو دڵت، بەشێکە لەو مۆسیقا کوژاوەی ناو من، بەشێکە لەو ئاوازە

کوژراوانەی مۆسیقارە گەورەکانی دونیا نەیاننوسیوە، بەشێکە لەو جوانییە جاویدانەی کە لەگەڵ جوانییەکانی تردا بە درێژایی مێژوو کوژراون.

بە ترس و گومانی یەکێکەوە کە لە هیچ تێنەگات، دەمگووت: بەڵام خۆ من تەنیا کەسێک نیم مۆسیقارێکی کوژراوم لە دڵی خۆمدا هەڵگرتبێت، تەنیا کەسێک نیم پڕبم لە جوانی کوژراو، پڕبم لە ئاواز کە ڕۆشناییان نەبینیوە.

شاروخی شاروخ سەیری درەختە بەرزەکانی دەکردو دەیگووت: کێ دەڵێت تۆ بە تەنیایت؟ کێ دەڵێت بە تەنیایت؟ لەم ساتەدا کە من و تۆ قسە دەکەین، دەشێت یەکێکی تری وەک من، پیاوێکی سپیپۆشی تر، بە کتێبێکەوە لە جانتاکەی پشتیدا، لە باغچەیەکی تردا، یان لە کتێبخانەیەکدا لە کتێبخانە غەمگین و فەرامۆشکراوەکانی سەرزەوی، لەگەڵ مرۆڤێکی تردا قسەبکات، هەوڵبدات ئەو شیعرانە بهێنێتەوە زمان کە دەبایە بنوسرابانایە، ئەو وشانە زیندووبکاتەوە کە خۆیان زیندوون و دەرفەتیان نەبووە لە دایکبن. لەوانەیە لە مەرسەمێکی بچوکدا لەم شارەدا، یاخود لە شارێکی تردا نیگارکێشێکی مردوو، لەگەڵ ئەو هونەرمەندە کوژراوەی ناو کەسێکدا قسەبکات تا ئەو نیگارانە بکێشێت کە هەرگیز نەکێشراون... جەلادەتی کۆتر تۆ بەتەنیا نیت. زۆرجار مرۆڤ دەنوسێت، مۆسیقا لێدەدات، نیگاردەکێشێت، بێئەوەی بزانێت کە لە ڕاستیدا ئەوەی دەیکات تەواوکردنی ئیشێکە بەر لەو لە شوێن و زەمانێکی تردا دەستی پێکردوە. مرۆڤ هەمووی تەواوکەری یەکە.

من دەمپرسی: بەڵام من کەی دەست پێدەکەم، کێ ئەو کارانەم پێ ڕادەسپێرێت کە دەبێت بیکەم؟

شاروخی شاروخ دەیگووت: جەلادەتی کۆتر تۆ ئێستا دەستت پێکردوە، تۆ لە مێژە دەستت پێکردوە، من لێرەم بۆئەوەی لەگەڵتدابم، تەنیا بۆ ئەوەی لەگەڵتدابم، من لە جیهانێکی ترەوە هاتووم تا لە بری هەموو هاوڕێکانت،

لـه بـری هەمـوو ئەوانـەی پێویسـتیان بـه تۆیـە. جەلادەتـی کۆتـر مـن لێرەم، مـن لـەم شـارەدام، لـەم باغچەیـەدام، شـەوانه لێرەوه مۆسـیقا لێدەدەم. ئـەم باغچەیه ماڵی منـە.

مـن باوەشـم پیادەکـردو دەمگـووت: شـاروخی شـاروخ تـۆ چییـت؟ تـۆ مردویـت یـان زیندوویـت، پێمبڵێ؟

چـاوه شـینەکانی لـه تاریکیـدا دەدرەوشـانەوەو دەیگـووت: تـۆ دەبێـت وەڵامـی ئـەو پرسـیاره بزانیـت، ئێسـتا دەبێت بیزانیـت، مـن نەزینـدووم نـه مردووم جەلادەتی کۆتـر، هیـچ کەسێک لـەم شـارەدا نەزیندووه و نـه مـردوو، وەک چـۆن ئـەم شـاره پـڕه لـه خەڵکـی مـردوو کـه وادەزانـن زینـدوون، گۆڕستانەکانیش، گۆڕەپانەکانـی جەنگیش پڕن لـه خەڵکی زیندوو کـه خەڵکی وادەزانـن مـردوون. مـن چەنـد سـاڵێک لەمەوبـەر ئـەو وەڵامەمدایتـەوه، چەنـد سـاڵێک لەوەوبـەر، بـەلام مـن خەڵکـی ئـەم شـاره نیـم، مـن لێره غەریبـم، مـن لـه هەمـوو شـارەکانی دونیـا غەریبـم، ئیشـی مـن ئەوەیـه ئـەو جوانییـه تێکشـکاوه بەیەکـەوه بنێمـەوه. ئـەو جوانییـەی مـردن پچڕاندویەتی. بـەلام دەبێـت بزانێـت مـن خەڵکـی شـارێکی تـرم...

وەک یەکێـک ئارامـی لەبەربڕابێـت گووتـم: دەزانـم چ شـارێک دەڵێیـت، شـاری مۆسـیقاره سـپییەکان، وانییـە؟ تـۆ لەوێـوه هاتوویتـەوه، لـەو شـارەوه گەڕاویتـەوه، تـۆ لـەو شـارەوه هاتوویـت.

به ئارامی دەسـتی خسـته سـەر شـانم و گووتی: جەلادەتی کۆتر، من و تۆ نابێـت زۆر قسـەبکەین، تۆ دەبێت پشـووبدەیت، مـن هەمیشـه لـەم باغچەیەدام، ئێره ماڵـی منـە. تـۆ ژیانـی خـۆت دەژیـت وەک ئـەوەی منت نەبینێت، بـەلام شـەوان لـەم باغـەدا فلـووت لێدەدەم، ئاوازێـک تەنیـا تـۆ لەسـەر ئـەم ئەسـتێرەیه دەیبیسـتیت، ئـەوه زمانـی نهێنـی مـن و تۆیـە، لـەم شـەوەوه مـن تەنیـا بـه مۆسیقا قسـەت لەگەڵدا دەکـەم... نابێت ئـەوەت بیربچێتـەوه کـه مۆسیقا زمانی مـن و تۆیـە... جەلادەتـی کۆتـر، تـۆ ژیانـی خـۆت دەژیـت، مـن لەگەڵتدام، لـەم

باغچەیەوە لەگەڵتدام... تا کۆتایی.

وای دەگووت و بە خێراییەکی گەورە لێم دووردەکەوتەوە، من دەستم دەبرد بیگرم بەڵام نەمدەتوانی، لە چاو تروکانێکدا لە پێچاو پێچی ئەو باغەو لە ناو درەختە پیرەکانیدا وندەبوو.

من لە یادم نییە ئەو شەوە چۆن گەڕامەوە بۆ گێلاسی سپی، لەیادم نییە چۆن خەوتم، بەڵام کە بەیانی بە ئاگا هاتمەوە دڵنیابووم ئیدی من بەشێکم لە دونیایەکی نادیار نەزانراو...

## کەسی سێهەم

### مستەفای شەونم... ئەو پیاوەی لە شەوێکی تاریکدا باڵندەکانی بینی

لەو شەوە دوورو درێژانەدا کە من بە دوای شاروخی شاروخدا دەگەڕام، ڕێگام کەوتە سەر پیاوێکی سەیر. شەوێکی بێوێنە بوو لەو شەوانەی باڵندە سپییەکان دروستیانکرد، هێندەی لە ئوتێلی گێلاسی سپی دابەزیم، دەیان باڵدار لە چواردەورم کەوتنە فڕین، دەڕۆیشتم و ئەوان بەسەر سەرمەوە وەک چەترێکی سپی وەهابوون، دەیان باڵندەی نەسرەوت کە هەندێجار لە سەر شانم دەنیشتنەوە، لەسەر دەستم دەوەستان، بە نزمییەکی سەیر کە وەخت بوو باڵیان دەیدا لە زەوی دەفڕین. من بەو باڵندانەوە بە هەموو قەیسەرییەکاندا ڕۆیشتم و کەسم نەبینی، چوومە ناوەڕاستی شار و هیچ کەس دیارنەبوو، لە فولکەکەی ناوەڕاستی شاردا وەستام، ئەو فولکەیەی هەمیشە پۆلیسێکی خەواڵووی هاتوچۆ تیادەوەستا، کە لە ئامێرێک دەچوو خراپ قوڕمیشکرابێت، بە ئارەزووی خۆی فیکەی لێدەداو بە ئارەزووی خۆی دەستی دەجولاند. لەو فولکەیەوە هەستمکرد ئەو باڵدارانە دەیانەوێت من بەرەو جێگایەکی تایبەتی ببەن، پێشتر کاتێکی وا زۆر و مەودایەکی وا

درێژ هاوڕێ لەگەڵ مندا نەفڕیبوون، هەندێجار هەستمدەکرد بە شەقامێکی تایبەتیدا دەمبەن، بە ئاڕاستەیەکی دیاریکراو ڕامدەکێشن. خۆشحاڵبووم ئەو باڵداره سەیرو سپییانەی خۆمم هەیە، من پیاوێک بووم هیچ شتێکم نەبوو، نەماڵ، نە دەستگیران، نە پارە، نە ئیش، نە بەهرەیەک بتوانم بیخەمەکار، بەلام شتێکم هەبوو کە کەس نییەتی، کۆمەڵێک باڵندە کە هەندێجار بەسەر سەرمدا دەفڕن... تا هیچ کەسی تر لە دونیادا ئەوەی نەبووە، هیچ پاشایەک لە هیچ سەردەمێکدا نەیتوانیوە سەیری ئاسمان بکات و بە پۆلێک باڵداری وێڵ و کێوی بڵێت ئەوانە باڵندەی منن، بەلام من دەمتوانی... کاتێک ئەو باڵندانەم دەبینی خۆم بە دەوڵەمەندترین پیاوی دونیا دەزانی، چونکە دەمزانی من تاکە مرۆڤێکم لەسەر زەوی پۆلێک باڵندەی خۆی هەبێت.

ئەوان دەفڕین و من بەدوایاندا دەڕۆیشتم، من دەڕۆیشتم و ئەوان بە دوامدا دەفڕین. کوچە لە دوای کوچە و شەقام لە دوای شەقام. شار سەرتاپای نوقمی تاریکی بوو، لە هیچ جێگایەکدا گڵۆپ نەدەسووتا، بەلام من دەمتوانی لە تاریکیدا باڵندەکانی خۆم ببینم. هێدی هێدی هەستمکرد بە ڕێگایەکی تایبەتیدا بەرەو شەقامێک دەڕۆم کە پێشتر تەنیا چەند جارێکی کەم پێیدا ڕۆیشتبووم، شەقامێک بوو پڕ لە کۆشکی گەورە گەورە. لەوسەری ئەو شەقامەوە بە بنارێکی پڕ درەختدا سەردەکەوتیت و دەگەیشتیتە سەر یاڵێکی بەرز، لەوێوە دەتتوانی بەسەر بەشێکی دیکەی شاردا بڕوانیت کە دەکەوتە پشت هەندێک بەرزایی بچکۆلەوە. من دەمویست بگەمە سەرەوە، لەوێدا پاشماوەی دیوارێکی کۆن هەبوو، ساڵ دوای ساڵ داچووبوو، هەر ماوەیەو زەوی چینێکی خواردبوو، تا وای لێهاتبوو مرۆڤ دەیتوانی وەک بەستێکی نزم بۆ دانیشتن بەکاریبهێنێت. ئەو شەوە دەمویست لەسەر ئەو بەستە دانیشم و کەمێک بیر بکەمەوە. کە گەیشتمە سەرەوە هەموو باڵندە سپییەکان لەسەر ئەو درەختە بەرزانە نیشتنەوە. لەوێکانەدا چڵە بەرزەکان و لقە شێتەکانیان بە جۆرێک تێکەلاوی یەک بووبوون، دیمەنی دارستانێکی

شەیتانیان بەخشیبوو بەو شوێنە. من لەسەر لێواری ئەو دیوارە دانیشتم و سەیری شەقامێکی دوورم دەکرد کە جار جار ماشێنێک بەخێرایی پیا تێدەپەڕی، هێند بێدەنگ بوو، مرۆڤ دەیتوانی گوێی لە هەوا بێت کە بەسەر گەلاکاندا دەڕوات. لەگەڵ ئەوەشدا من گوێم لە دەنگی پێی مستەفای شەونم نەبوو کە لە نزیکمەوە دانیشت و گووتی «چ شەوێکی فێنک و خۆشە». من کە دەنگی کوتوپڕی ئەو پیاوە ڕایچڵەکاندم، بە ترسەوە لام کردەوەو لەلای ڕاستی خۆمەوە سێبەری جەستەیەکی زەبەلاحم بینی، جەستەیەک دوو جار لە من گەورەتر، هێند تاریک بوو نەمدەتوانی هەموو وردەکارییەکانی ڕوخساری ببینم، بەڵام پیاوێکی پان و پۆڕی گەورە بوو، بە ناوشانێکی پان و قژێکی کەمێک درێژەوە. هەستمکرد ئەویش لە تاریکییەکەدا دەیەوێت من ببینێت. بەڵام ئاشکرابوو چاوی لە من کزترە. سەرەتا ترسێکی گەورەم لێنیشت، بە قەدو قەوارەدا کەسێک نەبووم بتوانم لە وێزەی بێم، بەڵام بە جلەکانیدا، بەو چاکەت و پانتۆڵەی بەریدا لە پیاوخراپێکی شەوگەڕ نەدەچوو، کە بەدوای نێچیرێکدا کوچەکان تەیبکات. من بە پەشۆکانەوە گووتم: ها بەڕێز منت ترساند، لە ڕاستیدا شەوێکی فێنک و خۆشە، بەڵێ، بەڵێ شەوانی هاوینی ئەم شارە هەمیشە خۆش بووە، ئەم شارە هیچ شتێکی نییە شەوانی هاوین نەبێت، ئەوەی لێدەربهێنە و باقیەکەی فڕێدەرە جەهەنەمەوە زەرەر ناکەیت. بە ئەدەبەوە پرسی: دەتوانم دابنیشم؟ گەر ڕوخسەت هەبێت؟. گووتم: بێگومان دەتوانیت، من یەکەمجارمە بێم بۆ ئەم جێگایە، حەزمکرد لێرەوە سەیری ئەو ئوتومبیلانە بکەم کە لە دوور بەسەر ئەو شەقامەدا دەڕۆن... بە دوای هاوڕێیەکیشدا دەگەڕێم کە تەنیا بە شەو دەردەکەوێت.

لە تەنیشتمەوە دانیشت و گووتی: بەڵام ئەو باڵندە سپییانە باڵندەی تۆن، وا نییە لەگەڵ تۆدا بوون؟. سەراسیمە ئاوڕم لێدایەوەو بە قووڵی تەماشامکرد و هیچم نەگووت. کەس لەوەوبەر ئەو باڵندە سپییانەی نەبینیبوو،

من بە ڕۆژی ڕوناک لەگەڵ ئەو باڵندانەدا بە بازاڕدا دەسوڕامەوەو کەس نەیدەبینین. شتێکی سەیربوو لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا یەکێک لە تاریکیدا دەرکەوێت و پرسیاری ئەو باڵدارانەم لێبکات کە لەسەر درەختەکان ئارام هەڵنیشتبوون. کە زانی من بێدەنگ دەبم گووتی: دڵنیام ئەوانە باڵندەی تۆن. کەمێک پێش ئێستا من لە سەربانی ماڵەکەی خۆمەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد و تۆم لەگەڵ باڵندەکاندا بینی، من شەو زۆر کەم دەخەوم، شەوان لە سەربان تا بەیانی دێم و دەچم، هەندێجار زۆر درەنگ خۆم دەگۆڕم و دێم بۆ ئێرە، دێمە سەر ئەم بەستەو دادەنیشم، گەر کارەبا هەبێت، شار لێرەوە دیمەنێکی قەشەنگی هەیە، بە تایبەت بەری خۆرئاوا. من حەزم لەسەیرکردنی گڵۆپی شارە گەورەکانە لەشوێنێکی بەرزەوە، ئەوەش نەبێت ئێرە شوێنێکی باشە بۆ بیرکردنەوە... من بەردەوام لێرەدا دادەنیشم و بیردەکەمەوە.

گوێم لە خیزەی سنگی بوو کە قسەیدەکرد، لەو پیاوە قەڵەوانەبوو کە دوای چەند ڕستەیەک هەناسەیان سواردەبێت. من بۆئەوەی باسی باڵندەکان نەکەم، گووتم: بیر لە چی دەکەیتەوە؟. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکشاو گووتی: زۆر بیر لە تەنهایی دەکەمەوە. زۆرجاریش بیر لە خودا دەکەمەوە.

وەڵامەکەی گەلێک کورت و ئاڵۆزبوو بۆ من، وەک ئەوەی خۆی بزانێت چ وەڵامێکی سەیری داوەتەوە گووتی: بیر لە شتی تریش دەکەمەوە، زۆر شتی تریش، بەڵام لە هەرشت زیاتر بیر لە تەنهایی دەکەمەوە، مرۆڤ تا نەزانێت بۆ تەنهایە نازانێت بۆ دەژی. تۆزێک وەستاو گووتی: من ناوم مستەفای شەونمە. ماڵم لەسەر ئەو شەقامە گەورەیەیە، برایەکی بچوکترم هەیە، پێکەوە دەژین.

هەناسەیەکی هەڵکێشاو گووتی: بەڵام دەبێت پێتبڵێم، ئەو باڵندانە منیان بەرەو لای تۆ هێنا.

من گووتم: منیش ناوم جەلادەت ئیسماعیلە، لە ئوتێلی ئاوارەکان دەژیم. لە ژوورێکی بچوکدام لە قاتی شەش.

کە ناوی خۆم پێگووت دووجار دووبارەی کردەوەو گووتی: جەلادەت ئیسماعیل و کۆترەکان، جەلادەت ئیسماعیل و باڵندەکان. نەمزانی مەبەستی چییە، بەلام هەستمکرد بیر لە شتێک دەکاتەوە، بە دڵتەنگییەوە پرسی: بەلام پێت نەگووتم، ئەو باڵندانە باڵندەی تۆن یان نا؟

من گووتم: لەوانەیە باڵندەی من بن، لەوانەیە، منیش نازانم، دڵنیانیم، بەلام هەستدەکەم باڵندەی منن.

بەسەرسامییەوە گووتی: من پێم سەیرە کۆمەڵێک باڵندە هۆگری مرۆڤێکی وەک تۆ بن. هۆگری یەکێک بن لە ئوتێلی ئاوارەکان بژی.

هەستم بە برینداری کرد و گووتم: دەتەوێت بڵێیت چی، دەتەوێت بڵێیت ئاوارەکان جنسێکی نزمترن لە مرۆڤ یان چی؟

بە سەرسامییەوە گووتی: نا..نا.. بەهیچ جۆرێک، بەلام بۆ ئەو باڵندانە لەدەوری تۆ دەفڕن. تۆ کێیت و لە کوێوە هاتوویت؟

من باسی ئەو ئوردوگا چکۆلەیەم بۆکرد کە شەوێک چوو بۆ ئاسمان، گووتم، من پاشماوەی ئەو ئاوارانەم، هاوڕێکانم ئێستا لە ئاسمانن، ئەو باڵدارانەش هاوڕێی ئەو ڕۆژانەن کە دەزانن من ئاوارەیەکی هەمیشەییم.. دواجار گووتم: هەست ناکەیت، باڵندەکانیش وەک من وەهان، ئاوارەیەکی هەمیشەیین؟ هەتا هێلانەکانیشیان وەرزییە، نیشتیمانیان نییە، خەڵکی هیچ شارێک نین.

ئەوە تەفسیرێکی کوتوپڕ بوو بۆ پەیوەندی من و باڵندەکان کە لەو ساتەدا بە خەیاڵمدا هات. هەستمکرد بە قووڵی سەیرمدەکات، گووتی: تۆ لە ئاوارەیەکی ئاسایی ناچیت، نازانیت ئەو باڵندانە چییان لە تۆ دەوێت؟

بەسەرسامییەوە گووتم: بێگومان هیچیان لە من ناوێت، هیچ شتێکیان ناوێت. کە تۆ گوڵێک لە باغچەکەتدا دەڕوێنیت و گەورە دەبێت، گوڵەکان

چییان لە تۆ دەوێت؟ ئەوانە گوڵی تۆن و تەواو. سروشت هیچ مرۆڤێک بە تەنهایی دروستناکات، تۆ گووتت تۆ زۆر بیر لە تەنهایی دەکەیتەوە، بەلام من ڕام وایە، گەر زۆر ورد بڕوانیت تێدەگەیت مرۆڤ هەمیشە هاوڕێیەکی هەیە. لەوانەیە درەختێک بێت، کێلگەیەک بێت، نەسیمێک بێت کە هەندێجار لە نزیکتەوە تێدەپەڕێت، من خانمێکم دەناسی هەندێک فریشتەی چکۆلە چکۆلەی خۆی هەبوو، من هەرگیز لێم نەپرسی : ئەو فریشتانە چییان لە تۆ دەوێت.

کە من قسەمدەکرد، مستەفای شەونم هەناسەی لە خۆی دەبڕی و گوێی دەگرت، منیش ئەو دەردە کوشندەیەم لەگەڵدابوو، کە بمزانیایە یەکێک گوێم لێدەگرێت، نەمدەبڕییەوە. لەسەری ڕۆیشتم و گووتم:ساڵێک پیاوێکم بینی، دوو پشیلەی هەبوو کە بەردەوام بەدوایەوە بوون، بەلام کەس لێی نەپرسی: کابرا، ئەو پشیلانە چییان لە تۆ دەوێت؟

مستەفای شەونم گووتی: بەلام باڵندەکان شتێکی ترن، باڵندەکان بە پۆل دوای هیچ ئادەمیزادێک ناکەون، مەگەر خۆی ڕۆحی باڵدارێکی هەبێت، یەعنی ڕۆحێکی هەبێت لە یەک کاتدا بتوانێت لەسەر زەوی و لە ئاسمانیشدا بێت. چونکە من دەزانم باڵندەکان تەنیا دوای کەسێک دەکەون کە دەتوانێت بفڕێت... من دەپرسم: تۆ دەتوانیت بفڕیت؟

من بە پێکەنینەوە گووتم: بێگومان ناتوانم بفڕم، بەو مانایەی باڵ ڕاوەشێنم و لەسەر زەوی بەرزبمەوە... نا، بێگومان من ناتوانم بفڕم. بەلام من زۆرجار ئەو هەستەم هەبووە کە لە ئاسمانم... فڕین ئەوەیە ئەو هەستەت هەبێت کە لە ئاسمانیت.

لە تاریکیدا دەستی گرتم و تەوقەیەکی توندی لەگەڵدا کردم و گووتی: بێگومان، منیش باسی ئەوەت لەگەڵدا ناکەم کە باڵت ڕاوەشێنێت، باسی ئەوەت لەگەڵدا دەکەم، ئایا هەستتکردوە لە ئاسمان بوویت؟

دەستێکی گەورەو قورسی هەبوو کە بۆ ماوەیەکی کەم هەستم بە

ئازارێکی کورت و تیپەڕ کرد. دواتر بۆم دەرکەوت، هەر ڕستەیەک خەیاڵی بوروژاندایە دەستی درێژدەکرد و تەوقەی لەگەڵدا خاوەنەکەیدا دەکرد. من سەیرێکی ئاسمانم کردو گووتم: فڕین چییە؟ هەموو بەرزبوونەوەیەک بەسەر شتە سادەو ئاساییەکاندا فڕینە، مۆسیقای جوان فڕینە. دەزانیت من کەی لە ئاسمان بووم... دەزانیت کەی؟ ئەو کاتانەی گوێ لە مۆسیقارە مەزنەکان دەگرم.

بە حەماسی منداڵێکەوە گووتی: جەلادەت ئیسماعیل منیش لە ئاسمان بووم. زۆرجار لە ئاسمان بووم، کە بیردەکەمەوەو لە ناکاو خەیاڵێکی جوانم بۆ دێت، کە سەیری فلیمێک دەکەم و لە ناویدا وندەبم، کە کتێبێک دەخوێنمەوەو پەیوەندیم بە دونیاوە دەپچڕێت... منیش زۆر زۆر لە ئاسمان بووم... من خۆشحاڵم بە ناسینیت... زۆر زۆر خۆشحاڵم بە ناسینیت. من لەم شارەدا زۆر گەڕاوم یەکێک بدۆزمەوە ئەویش لە ئاسمان بووبێت، فڕی بێت، لەگەڵ مۆسیقادا، لەگەڵ وشەدا، لەگەڵ وێنەدا، لەگەڵ هەستەکانی خۆیدا، بەڵام خەڵک تێمناگەن... تێدەگەیت. لەوانەیە کەسانێک وەک شێت سەیرمبکەن. من زۆرجار لە خەڵکم پرسیوە: هاوڕێم تۆ قەت لە ئاسمان بوویت. بەڵام کەس تێنەگەیوە ئاسمان کوێیە.

من بە کەمێک تێفکرینەوە گووتم: بەڵام هەموو مرۆڤێک دەتوانێت لە ئاسمان بێت، وا نییە.

بە غەمێکەوە کە هێشتا سێبەری ئەو جۆش و خرۆشەی پێشووی پێوەبوو، گووتی: بەڵام باڵندەکان نابن بە هاوڕێی هەر کەسێک کە لە ئاسمان بووبێت... تۆ دەڵێیت چی؟

من گووتم: بەڵام مستەفای شەونم تۆ دەتوانیت باڵندەکان ببینیت، دەتوانیت بیانبینیت. لە کاتێکدا هیچ کەسێکی تر ئەو باڵدارانە نابینیت.

گووتی: لە بەرئەوەی باڵندەی تۆن. بەڵام بە ڕاستی تۆ کێیت... تۆ تەنیا گەنجێکی ئاوارە نیت لە ئوتێلێکی سووتاودا... وانییە... تۆ کێیت.

من گووتم: نازانم چیت پێبڵێم، ڕاستیت دەوێت من زۆرجار ئەو پرسیارەم لە خۆم کردوە بەڵام بێهودە بووە، من ژیانێکی کەمێک ئاڵۆزو نابەجێم هەیە، زۆر شتی تیایە مایەی شەرمە، بەڕێز مستەفای شەونم ئەگەرچی من و ئێوە هێشتا یەکتری ناناسین، بەڵام حەزدەکەم بە بەڕێزتان بڵێم، من نە منداڵیم منداڵییەکی ئاسایی و نە گەنجیشم گەنجێتییەکی ئاساییە... کێشەکەش ئەوەیە، زۆرجار خۆشم واهەستدەکەم شایستەی ئەو جۆرە ژیانە نابەجێیەم.

هەستمکرد تۆزێک ورکی جوڵاند و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گووتی: ژیان کوا بە گوێرەی شایستەو ناشایستە حوکمدەدات. من بە پێچەوانەی تۆوە هەستدەکەم ژیان لەوە زیاتر شتی پێبەخشیوم کە شایستەم. خەفەت مەخۆ من لەو باوەڕەدام پاشەڕۆژ باشتر دەبێت.

کەمێک وەستاو بە لاقرتێیەوە گووتی: من وابیردەکەمەوە لە پێنج شەش ساڵی داهاتوودا وڵاتی ئێمە دەبێتە بەهەشت.

من بە دەنگێکی زۆر جیدییەوە گووتم: من ئاوارەیەکم لە جۆرێکی تر، من لە جۆرێکی ترم. بەڕێز مستەفای شەونم ئێوە خۆتان دەزانن ئەگەر زەویش ببێت بە بەهەشت، هەندێک لە مۆسیقارەکان، هەندێک لە شاعیرەکان وا هەستدەکەن هەر لە دۆزەخدا دەژین. من نە شاعیرم و نە مۆسیقارێکی باشیشم، بەڵام دەتوانم بڵێم، لە توخمی ئەو مرۆڤانەم. من لەو باڵندانەم ئەگەر هێلانەشم بدەیتێ نازانم چی لێبکەم. ئەگەر کۆشکێکی خۆشیشم هەبێت، حەزدەکەم بڕۆمەوە بۆ ئەو ئوتێلە سووتاوە، لە باڵکۆنە چکۆلانەی ژوورەکەمەوە لە قاتی شەشەوە دونیاببینم، هەستدەکەم لەوێوە دونیا جوانتر دەبینم.

لە تاریکییەکەدا بەترسێکەوە گووتی: کەواتە تۆ ئاوارەیەکی بەختەوەریت.

من بە کەمێک ناڕەحەتییەوە گووتم: نا... نا. هێندە هەیە من لە کارەسات ڕاناکەم، خەڵکی لە کارەسات ڕادەکەن و من بە پێچەوانەوە خۆمی

تێفرێدەدەم. خەڵکی دوای ماوەیەکی کەم هەموو شتێک لە بیردەکەن. بە جۆرێک ڕەفتاردەکەن وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت، بەڵام من دەستدەخەمەوە ناو خۆڵەمێشەکەوەو دەگەڕێم، دەگەڕێم، تا دوا پشکۆی تراژیدیاکە بەدەست دەگرم.

مستەفای شەونم گووتی: چەندە ئەو باڵدارانە هاوڕێتن... ماوەیەکی درێژە؟ وانییە... ماوەیەکی درێژە؟

من گووتم: نا... ماوەیەکی درێژ نییە، ماوەیەکی زۆر کورتە.

کەمێک هەناسەی لە خۆی بڕی و پاش ئێستێک وەک یەکێک شتێکی ترسناکی لە دەرونی خۆیدا گرتبێت و لە ناکاو بەرەڵایبکات، گووتی: تۆ یەکەمین کەس نیت من لەگەڵ باڵندەکاندا ببینم... تۆ یەکەم کەس نیت... پێش تۆ ئەو باڵندە سپیانە باڵداری «هاوڕێ قودسی» بوون، کە من ناومنابوو «هاوڕێی باڵندە سپییەکان».

من گووتم: بەیارمەتی خۆت دەتوانم هاوڕێ قودسی بناسم. دەتوانیت پێم بناسێنیت.

بۆ یەکەمجار بەدەنگی بەرز پێکەنی، دواتر وەک هەستبکات پێکەنینەکەی لایەق نییە، کوتوپڕ وەستاو گووتی: هاوڕێ قودسی لە پازدەساڵ لەمەوبەرەوە مردووە. ئەوەی من بۆت باسدەکەم پێش هەژدە ساڵ لەوەوبەر بوو. ئەو ڕۆژگارەی هاوڕێ پرۆژەیەکی هەبوو هەموو شار بکات بە یەک تابلۆی گەورە... هەموو شار لە مسەر بۆ ئەوسەر بە هەموو دیوارو شەقام و گۆڕەپان و سەربانەکانەوە، دەیویست دیواری هەموو ماڵێک بکات بە بەشێک لە تابلۆیەک بە جۆرێک گەر لە دوورەوە تەماشاتکرد هەموو ماڵەکان وەک یەک نیگاری تەواوکار وابن. نیگاری شارێکی هێمن و سیحراوی کە ملیۆنەها باڵندەی سپی بەسەریدا دەفڕن. دەزانم بیرۆکەکە خۆی شێتییەکی تەواوبوو، پرۆژەیەکی خورافی بوو، خۆشی دەیزانی کە هەرگیز ناتوانێت تەواویبکات، بەڵام گرنگ نەبوو بەلایەوە تەواودەبێت

یاخود نا... دڵنیابوو ڕۆژێک یەکێک دێت دوای خۆی تەواویدەکات.... شێتی بوو، من پێتدەڵێم شێتی تەواوبوو، بەڵام ئەو خۆی وای هەستدەکرد ئیشی نیگارکێشێکی تر تەواو دەکات، ئیشی یەکێکی تر کە شەوێک لە شەوە تاریکەکان لە باغێکدا بینیبووی و پێی گووتبوو کە لە شارێکی ترەوە هاتووە تا داوای لێبکات ئەو ئیشەی بۆ تەواوبکات. من یەکەمجار هاوڕێ قودسیم لێرەدا ناسی، پێش هەژدە ساڵ لەمەوبەر... لەسەر ئەم بەستە، لە شەوێکی تاریکدا، بە خۆی و کۆمەڵێک باڵندەوە.

کە قسەکانی تەواوکرد خەریک بوو دەخنکا، هەستمکرد لەگەڵ دوا ڕستەیدا منیش هەناسەم بۆ نادرێت. تا ئەو کاتە وام هەستدەکرد سەرەتای ئەم چیرۆکەی من دەگەڕێتەوە بۆ دەنگی ئەو مۆسیقا نادیارەی لە ناکاو لە ژیانی سامیری بابلیدا سەری هەڵدابوو، بەڵام ئێستا هێدی هێدی شتەکان ئاڵۆزتردەبوون... ئەوە یەکەمین جارم بوو هەستبکەم، ئەم چیرۆکە نەسەرەتای هەیەو نە کۆتایی، بەڵکو وەک بازنەیەکی گەردونی وەهایە، کە تا ناکۆتا بەدەوری چەقێکی نادیاردا دەسوڕێتەوە.

مستەفای شەونم دوای ئێستێک لە تاریکیدا سەیریکردم و گووتی: بۆ بێدەنگیت؟.

بە دەنگی یەکێک کە خەریکە دەخنکێت، گووتم: لەبەرئەوەی نازانم چی بڵێم.

پاش پشوویەکی دی، مستەفای شەونم لە شوێنی خۆی هەستاو گووتی: شەوێک هاوڕێ قودسی، هاوڕێی باڵندە سپییەکان، لە ناوەڕاستی شاردا، کاتێک خەریکی دروستکردنی بەشێک بوو لە نیگارەکەی خۆی، مەفرەزەیەکی عەسکەری تەقەیان لێکرد و لەسەر پەیژەکەی خۆی خستیانە خوارەوەو مرد. من لەو کاتەوە بەردەوام دەیبینم... هەر کاتێک دێم بۆ ئێرە و دادەنیشم دەیبینم... بمبورە کاک جەلادەت ئیسماعیل، هیوادارم

تێبگەیت بۆچی من بەم تاریکییە بەدوای تۆدا هاتم، هیوادارم لێمببوریت... من دەبێت بڕۆم... هەستدەکەم هەڵەبووم، هەستدەکەم ئەو باڵدارانە منیان بە هەڵەدا برد. نەدەبایە بهاتمایە.

دەستی درێژکرد و تەوقەیەکی سەیری لەگەڵدا کردم، وەک عەزیزێکی خۆی بە خۆیەوە بنوسێنێت منی بە خۆیەوە نوساند و گووتی: بمبورە، باشتر وایە بڕۆم... نامەوێت دونیا ڕوناک ببێتەوە. لەوانەیە ڕوناکی بمانکاتە هاوڕێی یەک. من یادگاری تاڵم لەم جێگایەدا هەیە... یادگاری تاڵ

بە پەلە لەو یاڵە دابەزی و لێم دووركەوتەوە. لە دوورەوە هاوارم لێکرد: بەڕێز... بەڕێز... قوربان، جەناب، کاک مستەفا... دەتوانم بزانم کامەیە ماڵی ئێوە؟

بێئەوەی وەڵاممبداتەوە لە تاریکییەکەدا ونبوو.

ئەوە یەکەمین یەکدی بینینی کورت و ترسناکی من بوو لەگەڵ مستەفای شەونمدا، ئەو پیاوەی دوای گەڕانەوەی من لە گەشتی دوورودرێژی خۆم لە شارو گوندەکانی کوردستاندا دەرکەوتەوەو دووبارە سەرتاپای دونیای منی دایەوە بەیەکدا. مستەفای شەونم، ئەو پیاوەی لە ساتێکدا دەرکەوت کە ژیانم بەرگەی نەسیمی نەدەگرت، کەچی ئەو گەردەلوولی بۆ هێنا.

## بەشی سێهەم

## دادگا

خۆتان دەزانن بینینی من بۆ شاروخی شاروخ چەند ڕۆژێک دوای ئەو چاوپێکەوتنە سەیرو ئاڵۆزو پڕمانایە بوو لەگەڵ ئەو پیاوە قەڵەوەدا کە بە زەحمەت دەیتوانی هەناسەبدات. دوای دەرکەوتنی شاروخی شاروخ شتەکان لای من ئاشکراتربوون. دەمتوانی سێبەری هێڵێکی دیاریکراو لە بەرچاوی خۆم ببینم، دەمزانی لەیەککاتدا لە دوو جیهاندام، جیهانێک ئەو دونیا سادەو ساکارەیە کە هەموومان تیادەژین، جیهانێکی تریش دونیایەکی ترە، دونیایەک تا ئەوکاتە نەمدەتوانی وردەکارییەکانی باسبکەم، نەمدەتوانی باس لە چۆنێتی و دروستبوونی بکەم. جیهانێک بوو لە سەرەتاوە ڕوخساری خۆی نیشاندەدام و وندەبوو. لە دوورگەیەک دەچوو لە ناوەڕاستی دەریایەکدا کە مەلەوانێکی ماندوو بەرەو ڕووی مەلەدەکات، دورگەیەک کە هەندێجار لە پێشچاوی وندەبێت و هەندێجار دەردەکەوێت، هەندێجار نزیک دەکەوێتەوە و هەندێجاریش دەبێت بەسەراب. نامەوێت پێش وردەکارییە ئاڵۆزەکانی حکایەتەکە بکەوم، بەلام من دڵنیام هەموو ژیانێک دوو دیوی هەیە، دیوێکی بینراو لەگەڵ دیوێکی نەبینراودا، هەموو شارێک دوو دیوی هەیە دیوێکی بینراو لەگەڵ دیوێکی نەبینراودا، هەموو چرکەساتێکی مێژوو دوو دیوی هەیە، دیوێکی بینراو لەگەڵ دیوێکی نەبینراودا، هەموو مەرگێکیش دوو دیوی هەیە دیوێکی بینراو لەگەڵ دیوێکی نەبینراودا. کێشەی هەرە گەورەی مرۆڤ ئەوەیە کە زۆرجار ئەم دوو دیوە ئاگاداری یەکتر نین، لەبەرئەوە جیهان هەمیشە وەک شوێنێکی ئاڵۆزو پڕنهێنی دەمێنێتەوە، وەک جێگایەک کە تەنیا یەکجۆر حەقیقەت و یەکجۆر

لۆژیک دەبیات بەڕێوە. من ئێستا وادەبینم کە هەندێک لەوانەی دەمرن دەتوانن نیوەیەکی زیندووی خۆیان لەسەر زەوی جێبهێڵن. بەڵام نیوەیەکی خەوتوو... دیارە لەم حاڵەدا دەبێت زۆر وریابن، من باس لە خەوتن ناکەم، بەو مانایەی کە ئەمیرەیەک دەخەوێت و دواتر کەسێک دێت بە ماچ لە خەوی هەڵدەستێنێ، نا خەو لێرەدا مانایەکی تەواو جیاوازتری هەیە، من باس لەو زیندەگییە خەوتووە دەکەم وەک خەونی پارچەیەک مۆسیقا بەرلەوەی یەکێک لێیبدات و بیهێنێتەوە قسە. کاتێک مۆسیقا ونە، کە ئامێرێک و پەنجەیەک نییە لە خەوی هەستێنێ، ئەوە بەو مانایە نییە کە لە ناو هەر ئامێرێکدا هەزاران پارچە مۆسیقای خەوتوو بوونی نییە. ئێمە ئێستا کە گوێ ڕادەدێرین، جگە لە هاژەی بێدەنگی هیچی تر نابیستین، گوێمان لە مۆزارت نییە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە مۆزارت نییە. مۆزارت لە دیوە نەبینراوەکەی جیهاندایە. زۆرجار کە شیعرێک دەخوێنینەوە، هەستدەکەین پێشتر ئەو شیعرە لە ناوماندا بووە، بەجۆرێک لە جۆرەکان لەسەری زمانماندا بووە یاخود ڕاستتروایە بڵێم لە بەردەرگای ڕۆحماندا وەستاوە. لەو کاتانەدا گەر بتوانین لەگەڵ ئەو شیعرەدا بدوێین، هەقمانە لێی بپرسین: ئەی شیعری جاویدو جوان تۆ چەند وەختە لە کوێی؟ بێگومان ئەو شیعرە نیشتەجێی هەرێمێکی دیکەبووە، هەرێمێک ئێجگار نزیکە لە ئێمەوە، بەڵام سووک و ئاسان لە ئاستە نەبینراوەکەی وجودایە... من هەر وەختێک مۆسیقای جوانم لێدابێت، هەستمکردوە دوای بێدەنگبوونی ئامێرەکان، دوای خامۆشبوونی دەنگی ئاوازەکان، هەمیشە بەشێکی ئەو مۆسیقایە بە زیندوویی لە هەوادا ماوەتەوە، وەک چۆن زۆرجار ڕۆژ دەبێتەوە، بەڵام تا ماوەیەکی درێژ هێشتا هەر گوێمان لە هەناسەی شەوە لە ناو کوچەکاندا، چۆن زۆرجار لە ناوەڕاستی پاییزدا چاو لێکدەنێین و لەناکاو لە ناو ڕۆحی درەخت و خەزان و خەزەڵوەردا سەوزییەکی کوتوپڕ دەبینین. من هەمیشە لە خۆمم پرسیوە کە پاییز دێت بەهار دەچێت بۆ کوێ؟ لە خۆمم پرسیوە

کە مردن دێت ژیان دەچێت بۆ کوێ؟ کە ئەم شاره ئاسنین و دڵتەنگانە دێن، شاره جوان و ئەفسانەییەکان دەچن بۆ کوێ؟. ئێستا دڵنیام وەک چۆن پاییزان بەهار سووک و ئاسان بازدەداتە دیوە نەبینراوەکەی وجود، وەک چۆن کە بێدەنگی دێت، مۆسیقا بازدەداتە دیوە نادیارەکەی وجود، ئاوهاش کە مردن دێت مرۆڤ بازدەداتە دیوە نادیارەکەی وجود.

لەسەرەتاوە من ئەو بیرۆکە سەیرانەی خۆم لە دەفتەرێکی شەست پەڕەیی کۆندا کە لە ناو تۆزو خۆڵی ئوتێلەکەدا دۆزیمەوە تۆماردەکرد. لە ڕاستیدا من هەمیشە دەفتەرێکم دەدۆزییەوە شتەکانی خۆمی لەسەر تۆماربکەم، بەدرێژایی ئەو چەند ساڵە، بەر لە دەرکەوتنی عەلی شەرەفیاریش بیرم نایەت دەفتەرم کڕی بێت، هەمیشە دەفتەرەکانی خۆم یان لە خۆڵدا دەدۆزییەوە یان لە بادا دەمگرتنەوە. هەندێجار لە ڕەشەباکاندا دەوەستام و دەفتەرێکی وێڵم دەبینی با لە دوورەوە دەیهێناو من دەستم درێژ دەکرد و دەمگرتەوە. لە ماوەیەکی کورتدا دەیەها دەفتەری تۆزاویم هەبوو کە هیچ ئادەمیزادێکی تر نەیدەتوانی بیانخوێنێتەوە. شێوەی نوسینی من وەک ئەوەبوو ڕەشەبا یاری بە حەرفەکان کردبێت، گەردەلوولی بەهێز چی لە شۆڕەبیی دەکات، بیرکردنەوەی لە ناکاوو خەیاڵاتی سەیر وایان لە وشەکانی من دەکرد. گەر ئەو دەفتەرە دڕاوانە نەبانایە ئەستەم بوو دواتر خەیاڵات و بیرۆکە سەیرەکان و ئیشراقاتە کوتوپڕەکانی خۆم بیربێتەوە. من لەو کاتەوە کە لە شاری سۆزانییە غەمگینەکان گەڕابوومەوە، لەو کاتەوەی کە تەواو فلووتەکەم توڕدابوو و چیتر مۆسیقای خراپم پێ نەدەژەن، لە باڵکۆنەکەدا دەوەستام و ئیشراقاتی ناوەکی ڕۆشنیدەکردمەوە. من کە ژیانم بێماناترین و ناچیزترین ڕەوتی هەبوو، دەمتوانی وەک خانمی هەتاهەتایی خەونەکانم «دالیا سیراجەدین» ژیانی خۆم وا نیشانبدەم کە قووڵاییەکی نهێنی هەیە. کە شاروخی شاروخ لە باغچەکەی ئەوبەردا مۆسیقای لێدەدا من پڕدەبووم لە نورێکی ناوەکی، پڕدەبووم لە خەیاڵاتی جوان، پڕدەبووم

لە ئارەزوویەکی کوشندە بۆ بیرکردنەوەو نوسین و مۆسیقا لێدان. بەلام هەستمدەکرد هەموو ئەو جوانییانە لە جێگایەکی عاسی ناو ڕۆحدان کە نایەنە دەرێ. دەبێت بزانن کە ئەوە چ خەمێکی قورس بوو بۆ من، کە ماوەیەکی درێژ بوو وامدەزانی هەموو دەرگا داخراوەکانی ڕۆحی خۆم خستۆتە سەرپشت، هەستمدەکرد بووم بە باڵندەیەک بە جووتێ چاوی دیکەو بە خەیاڵێکی ترەوە، بەلام ئێستا کە گوێم لەو مۆسیقا نادیارەی شاروخی شاروخ دەگرت، دووبارە ئەو پرسیارە ئەزەلییەی من سەبارەت بە ڕۆح لە خەیاڵمدا دادەگیرسایەوە، دەمزانی ڕۆح بێشومار دەرگای هەیە کە هیچ کەس ناتوانێت تا کۆتایی هەموویان بکاتەوە، کە مرۆڤ دەشکاتە سەر دوا دەرگا نازانیت لە پشت ئەوەوە چەندی دی هەیە کە ناگاتە بەردەمیان.

هەندێک شەو کە شاروخی شاروخ ئاوازە سیحراوییەکانی خۆی لێدەدا، من لە ئوتێلەکە دادەبەزیم و دەچووم بۆ ناو ئەو باغچەیە، هەموو شوێنێک، هەموو قوژبنێک دەگەڕام، بەلام هیچ کەسم نەدەبینی... من دەیەها شەو ئەو کارەم کردوە، دەیەها شەو بە خێراییەکی شێتانە لەو پلەکانە دابەزیوم و ڕوومکردۆتە ئەو باغەو کەسم نەبینیوە، دەیەها شەو هاوارمکردوە «شاروخی شاروخ دەمەوێت بتبینم، دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم». بەلام لە مۆسیقا زیاتر وەلامێکم نەبیستووە، مۆسیقایەک هێدی هێدی منی ڕادەهێنایەوە بتوانم تەنیا بە مۆسیقا قسەبکەم، تەنیا مۆسیقا لە بری هەناسە وەرگرم، تەنیا مۆسیقا لە بری ژیان بژیم. من کە پەنجەکانم ڕەق بووبوون کە وام لێهات بوو لە تەماشاکردنی فلووتِ دەترسام، لەبری مۆسیقا ئیشراقە نهێنییەکانی ناو ڕۆحی خۆم دەنوسییەوە، لەو قۆناغەدا نوسینەوەی ئەو تێکستە سەیرانەی پڕبوون لە تەفسیری شێتانەی پیاوێک کە لە نێو دونیا جیاوازەکاندا ونبووبوو، شێوازی قسەکردنی من بوو لەگەڵ شاروخی شاروخدا کە لە جێگایەکی نادیاری ئەو باغچەیەدا، لە دیوە نەبینراوەکەی باغدا بە ئاواز قسەی لەگەڵدا دەکردم.

لە دوای شەوی یەکدی بینینمانەوە، تا ئەو ڕۆژەی مێخەکانی لە سەر سینەم دەرهێنا، هەموو شەوێک مـن و شاروخی شاروخ قسەماندەکرد، ئەو بە مۆسیقاو َمن بەو تێبینی و ئیشراقانەی لەسەر دەفتەرە تۆزاوی و دڕاوەکانم دەمنوسین. من ئەو ماوەیە بێئەوەی هێشتا جورئەتبکەم دەست بۆ ئەو ئامێرانە بەرم کە زۆرجار لە ژێرزەمینەکەی محەمەدی فیردەوسیدا بانگیاندەکردم، ئەو هونەرە فێربوومەوە کە لە منداڵیمەوە دەمزانی، هونەری قسەکردن لەگەڵ جیهاندا بە مۆسیقا.

لەدوای بینینی شاروخی شاروخەوە ژیانی ڕۆژانەو ژیانی شەوانەی من دووکەرتبوونێکی ترسناکی تێکەوتەوە، شەوان کە هەموو ئادەمیزادەکان دەخەوتن من لە باڵکۆنەکەدا گوێم لە مۆسیقا دەگرت و قسەم لەگەڵ باو ئەستێرە و باڵندەکاندا دەکرد، یان لە ژوورەوە لەسەر ڕۆشنایی مۆمێکی کز، ئەو دەفتەرانەم دەنوسی و وشەکانم وەک ئەسرینی منداڵ درێژدەبوونەوە. بەڵام بە ڕۆژ ژیانێکی ئاسایی دەژیام، بەیانیان لەبەردەم ئوتێلەکەدا دەوەستام و یارمەتی ئەو ماڵە ئاوارانەم دەدا کە کەسێکی بە تواناو گەنجیان نەبوو، بارێکی قورسیان بۆ سەربخات، هەندێک ئیشی بچوکی بازاڕم بۆ هەندێک پیرێژن و پیرەمێردی پەککەوتە دەکرد، نەوتم بۆ پەیدادەکردن، پلیتەی چرام بۆ دەگۆڕین، ئاردم بۆ دەگوێزانەوە، وەرەقەی شەکروچام بۆ سەرفدەکردن. گەر کارێکی لەوجۆرەشم نەبایە وەک هەمیشە دڵی کچانم بە قسە خۆشدەکرد، بە هەموو مرۆڤێکم دەگووت: تۆ جوانی. بە شێتەکانم دەگووت: ئێوە عاقڵن. بە پیاوە تەنیاکانم دەگووت: خەم مەخۆن، ڕۆژێک دەبێت هەموو دونیا دەبێت بە هاوڕێی ئێوە.

ئالەو ڕۆژانەدا سامیری بابلی بڕیاریدا بەجێم بهێڵێت. پەیوەندی نێوان شاناز سەلیم و پرتەقاڵی بابلی گەیشتبووە ئاستێک چیدی بواری پاشەکشێ و گەڕانەوەی تیانەبوو، من هەوڵمدا ئەو پەیوەندییە بپچڕێنم، لە بەرئەوە نا

کە سامیری بابلی لە ماوەی دیلێتی خۆیدا لای من مافی ژنهێنانی نەبوو، بەڵکو لەبەرئەوەی دەترسام منداڵێک لەو پەیوەندییە دروستبێت و دواتریش ئەو منداڵە مەعسوم و بێخەتایە بەبێ باوک گەورەببێت. من ئێوارەیەک چووم بۆ لای شاناز سەلیم کە لە کۆشکێکی بێوێنەدا دەژیا، هەموو ئەو نهێنیانەم بۆدرکاند کە نەدەبایە بیاندرکێنم، باسی ڕابوردووی سامیری بابلیم بۆ کرد، باسی ئەوەم بۆ کرد کە ڕۆڵی لە کوشتنی دەیان مرۆڤی بێگوناهدا هەبووە، هەموو ئەگەرە کوشندەکانی داهاتووی ئەو پیاوەشم خستە بەردەستی. ئەو بە درێژایی دانیشتنەکە سەیری منی نەکرد، وەک ئەوەبوو هەموو ئەو شتانە بزانێت، من پێمگووت: من کارێکم بەوەوە نییە ئێوە ببن بە هاوسەری یەکتر یاخود نا، بەلام دەترسم منداڵێکتان ببێت و دواتر بە هەتیوی گەورە ببێت. بە زەردەخەنەیەکی ئەهریمەنانەوە سەیری دەرەوەی کرد و گووتی: خێرت بنوسێت، بەلام مەترسە من منداڵم نابێت. کە وای گووت، من بە حورمەتەوە هەستام و بێئەوەی قسەیەکی ئەوتۆی تر بکەم ماڵەکەم بەجێهێشت.

شاناز سەلیم خۆی شتەکانی جێبەجێکرد، کاروباری دادگا، کاروباری تەندروستی، ئامادەکردنی سامیری بابلی و هەموو شتێکی دی. ئەو ماوە کورتەی کەوتە نێوان بڕیاری هاوسەری و زەماوەندەوە، ژوورە چکۆلەکەی ئێمە بە جۆرێکی دی ڕازایەوە، ئێوارەیەک گەڕامەوەو بینیم، قەرەوێڵەیەکی نوێ، فەرشێکی نوێ و قەنەفەیەکی مەخمەڵی ڕەنگاوڕەنگ، لەگەڵ کۆمەڵێک ئاوێنەی قەراغ زێڕ لە ژوورەکەمدایە. ژوورەکە بە جۆرێک بچوک بووبووەوە دۆشەک و بە تانییە شڕەکەی من بەزەحمەت لە کونجێکدا جێگایان دەبووەوە. شاناز سەلیم بە سەخاوەتێکی بێوێنەوە پارەی لە سەر قات و بۆینباخ و جلی ئاغای بابلی سەرفدەکرد. ئێوارەیەکیان سامیری بابلی دەستیکردە ملم و گووتی: ئەی منداڵی نەجیب، من هەموو شتێکم لەگەڵ شانازدا بڕیوەتەوە، من بەو مەرجە زەماوەندی لەگەڵدا دەکەم کە

تۆ لەگەڵمدا بژیت، دەبێت تۆش لەگەڵمدا بگوێزیتەوە.

من دەمزانی پرتەقاڵی بابلی ڕاستدەکات، دەمزانی یەکێک لە هەرە مەرجە سەختەکانی سامیر ئەوەبوو، منیش لەگەڵیدا بگوازمەوە و پێکەوە بچینە مەنزڵێکی تازە. وارێکەوتبوون شوێنێکی تایبەتی بۆ من چاکبکەن کە بە جۆرێک بێت، من ئازاد و سەروەر لەوێ بژیم. لە دڵەوە سوپاسی پرتەقاڵی بابلیم کردو گووتم «تا ئەم ئوتێلە هەبێت، من ناتوانم ئاوارەکان بەجێبهێڵم... من لێرەدا ژیانێکی خۆش و بەختەوەر دەژیم، هیچ بەهانەیەکیش شک نابەم، ژیانی خۆم تێکبدەم. من پیاوێکی بێکەڵکم، سوودێکم بۆ ئەم سەر زەوییە نییە، هیچ نەبێت لێرەدا دەتوانم یارمەتییەکی پیرەکان بدەم کە هیچ ئادەمیزادێکی تر نییە یارمەتیان بدات، پاشان لێرەوە هەندێجار تارمایی دالیا سیراجەدین دەبینم، لێرەوە باڵندەکان دێن بۆ لام، لێرەوە شەوان گوێم لە مۆسیقایەکی نهێنی دەبێت کە کەسی تر گوێی لێ نییە».

سامیری بابلی زۆر هەوڵیدا و بێسوود بوو، دواجار بەرلەوەی بڕوات لیستی هەموو ناوەکانی دامێ و گووتی: ئەی منداڵی خۆشبەخت، تۆ کەی منت بانگکرد، من ئامادەم لە بەردەمتدا بوەستم. من تا کۆتایی چاوەڕوانی ئەو دادگایەم کە تۆ دایدەنێیت.

دوازدە ناو و ناونیشان بوون کە خۆی بە خەتێکی جوان نوسیبوونی.

کاغەزەکەم خستە گیرفانم و گووتم: پرتەقاڵی بابلی، دڵنیابە بە زووترین کات دەست پێدەکەم، هیوادارم تا ئەوکات ژیانێکی خۆش بژیت.

ئەو ڕۆژەی کە ڕۆیشت، بە جۆرێکی سەیر خۆی گۆڕیبوو، کامەران نەبوو، بەڵام وەک کەسێک کە دەیویست سەرەتایەکی تازە بژی جۆرێک لە گەشانەوەو ئارامی پێوە دیاربوو. دیارە شاناز سەلیمیش خانمێک نەبوو مرۆڤ بە دڵی تەنگەوە لەگەڵیدا بخەوێت، ژنێک بەو جوانی و زمان لوسییە، بەو هەموو سامان و نگینەوە، گەر یەکێک هەموو نهێنییەکانی نەزانیبایە نەیدەتوانی لە ئەفسوونی دەربازببێت. سامیری بابلیش خۆی ژیانێکی

هێند دزێوو ناشیرینی هەبوو، گوناهی هەر کەسێکت بە گوناهەکانی ئەو بەراوردبکردبایە دەبوو بە فریشتە، لەبەرئەوە بێمانابوو خراپەکانی خۆی بە خراپەکانی شاناز بەراوردبکات. دەشیویست بەر لە مردن ڕاست یاخود درۆ قومێک ئەڤین بنۆشێت. منیش و ئەویش دەمانزانی عەدالەت ئەوەیە تا بڕیاری دادگا دەردەچێت کەمێک بە ئاسوودەگی بژی، ئەوە بەشێک بوو لە عەدالەت کە من بۆ هەموو گوناهبارێکی زیندوو قبوڵم بوو. من تکام لە سامیری بابلی کرد بەرلەوەی بڕوات فەرش و قەرەوێڵەو قەنەفەو ئاوێنەکانی خۆی بباتە دەرێ، چونکە من ژوورەکەم وەک ژوورێکی خاڵی دەویست، ژووری ئاوارەیەک کە لە بری ئەوەی لە بەر باو باران بخەوێت لەو ئوتێلەدا گیرساوەتەوە. سامیر کە لە جلە نوێکانیدا بە زەحمەت دەناسرایەوە، دوو گەنجی کۆڵکێشی هێناو شتەکانیان بەخشی بە دوو سێ خێزانی دیکە کە بە خۆشحاڵییەوە وەریانگرت. دوو ڕۆژ دوای ئەوە شاناز سەلیم و پرتەقاڵی بابلی زەماوەندیانکرد. زەماوەندێکی چکۆلانە کە هەندێک هاوڕێ و دۆستی شاناز خۆی داوەتکرابوون، هەڵبەت من یەکێک بووم لە داوەتکراوەکان، بەلام دوای ئەو مێژووە لە جەفاو ساردی لەگەڵ خانمی شانازدا، سۆنگەیەکم نەبوو بچم بۆ جۆرە ئاهەنگێکی وەها.

بەیانییەک لە خەو هەستام و بڕیارمدا بەدوای یەکەمین شاهیدا بڕۆم، یەکێک بوو جودا لەو کەسانەی پرتەقاڵی بابلی خۆی دەستنیشانیکردبوون، تەنیا شاهیدێک بوو من هەڵمبژاردبێت. یەکەمین شاهیدی من، باوکی سەرهەنگ قاسم بوو کە دەبایە لەو دادگایەدا ئامادەبێت. لەو ڕۆژەوەی من گەڕابوومەوە بۆ شار، چەند جارێک بە بەردەمی ماڵەکەیاندا تێپەڕیبووم و هیچ جارێک جورئەتم نەکردبوو بچمە ژوورێ، نەمدەزانی ئاخۆ دایک و باوکی سەرهەنگ هیچ دەربارەی کوژرانی کوڕەکەی خۆیان لە بیابانەکانی باشووردا دەزانن یان نا. خۆتان دەزانن ڕووبەڕووبوونەوەی وەها چەند تاڵە. بەلام نەدەبوو تا هەتاهەتایە لێی ڕابکەم. بەدرێژایی ڕۆژ بیرم لەوە

دەکردەوە چی دەکەم و چۆن باسی مردنی سەرهەنگ قاسم دەکەم، چۆن باسی دواهەمین ڕۆژەکانی ژیان و هاوڕێتی خۆمان دەکەم، دەمەو ئێواره بەر لەوەی تاریک دابێت، بە ترسێکی گەورەوە، بە جووتێ ئەژنۆی لەرزیوو لێوێکی وشکەوە لەدەرگامدا. دایکی دەرگاکەی کردەوە، من ئەوکات بووبووم بە کوڕێکی کەڵەگەتی ڕیشن، کە بەردەوام بە جووتێک چاوی غەمگینەوە، لە چاکەتێکی سپی درێژ و پانتۆڵێکی کاوبۆی کۆندا دەسوڕامەوە، کراسێکی ڕەشم لە بەردابوو کە مانگی یەکجار دەمشت. دایکی سەرهەنگ قاسم نەیتوانی من بناسێتەوە، ئەو سەردەمانێک منی بینی بوو کە من هێشتا گەنجێکی ناکامڵی غەمگین بووم، بە فلووتێکی سپییەوە دەهاتم و لەگەڵ کوڕەکەیدا خۆمان فێری مۆسیقا دەکرد، ئازارێکی گەورەبوو بۆ من پێیان بڵێم، کوڕە تاقانەکەی ئێوە کوژراوەو من زیندووم، بەلام بە دەنگێکی لەرزیوەوە پرسیم: کاک قاسمی برینپێچ لە ماڵە؟. ژنەکەی وەک خانمێکی بەئسووڵ فەرمووی لێکردم، تێپەڕینی سالان باوکی سەرهەنگی پەکخستبوو، بووبوو بە پیرەمێردێک کە بە زەحمەت چاوی دەبینێت. لەسەر فەرشێکی ئێرانی دانیشتبوو، گوێی لە دەنگوباس دەگرت. کە منی بینی بەزەحمەت لە شوێنی خۆی هەستاو فەرمووی لێکردم. من کەمێک لە بەردەمیدا وەستام و گووتم: کاک قاسم، کاک قاسم منت لەبیرە؟... هیوادارم منت لە بیربێت، من جەلادەتم، جەلادەتی کۆتر، ئەو کوڕەی سەردەمێک هاوڕێی سەرهەنگی کوڕی ئێوە بوو. کە وامگووت، ئەو پیاوە بەستەزمانە بە شێوەیەک ڕاچەنی وەک ئەوەی هێزێکی نادیار لە دواوە پاڵی پێوەبنێت، شتێکی سەیربوو کە بینیم باوەشی پیاکردم، ماچیکردم، گریا. دەیزانی کوڕەکەی مردووە، دڵنیابوو کە کوڕەکەی نەماوە. من پێموایە دایکان و باوکان ڕادارێکی نهێنی لە دڵیاندایە، ئەو حیکایەتانەیان بۆ دەگوازێتەوە. کە تۆزێک فرمێسکەکانی نیشتنەوە گووتی: پێمبڵێ، جەلادەتی کۆتر، پێمبڵێ، چۆن بوو، ئازاریان زۆردا، یان بە ئاسوودەیی مرد؟. من ئەوکات بە گەرمی دەگریام. گووتم:

مردنی ئاسوودە کوا هەیە، مرۆڤ لەم وڵاتەدا لە کوێ مردنی ئاسوودەی دەستدەکەوێت؟. دەگریام و قسەم دەکرد، بەجۆرێک دەگریام هەر ڕستەیەکم دەگووت و ڕستەی پێشووترم لە بیردەچووەوە، هەندێجار هەندێک ڕستەم دەیەها جار دووبارە دەکردەوە. چیم دەزانی بێ درۆ بۆم گێڕانەوە، باسی ئەو ڕێکەوتەم بۆکردن کە منی هێشتۆتەوە، گووتم گەر لەو زیلەدا لە بری من سەرهەنگ مۆسیقای لێبدایە، ئێستا ئەو زیندووبوو من مردوو، گووتم: بۆ من زۆر ئاسوودەتر بوو بمردبامایە، من بێکەسێکی بێکەڵکم، نەدایکم هەیە نە باوک، بوون و نەبوونم لەسەر ئەم ئەستێرەیە وەک یەکە. باوکی دەیگووت: وامەڵێ، ئەوە حیکمەتی خوای گەورەیە، حیکمەتی باری تەعالایە، کە من و تۆ تێیناگەین، ئەوە قیسمەتی ئەوە، کێی بوێت دەیمرێنێت و کێی بوێت زیندوویدەکاتەوە. بەرماڵەکەی دادەخست و دەگریا، دایکی چای بۆ من تێدەکرد و دەگریا، من پیاڵەکەم وەردەگرت و دەگریام، ئەوە یەکەمجار بوو هەستمکرد فرمێسک لە هەر شتێک زیاتر دەتوانێت مرۆڤەکان بکات بە هاوڕێ و نزیکی یەک، سێ کەس کە پێکەوە دەگرین، فرمێسکەکانیان وەک حەرفی ناو پەیمانێکی ڕۆحی وەهایە کە هیچ هێزێک نایشکێنێت.

ساڵێک لەوەوبەر دایک و باوکی سەرهەنگ قاسم پرسەیان بۆ دانابوو، چیرۆکی جیاواز جیاواز و خورافاتی جیاوازیان لەسەر شوێن و شێوەی مردنەکەی بیستبوو، پێدەچێت بەشی هەرەزۆری ئەو چیرۆکانە لەناو مۆسیقارەکان خۆیانەوە هاتبێت. دەرکەوتنی من و ڕاستکردنەوەم بۆ هەموو حیکایەتەکان مایەی دڵنیایی و ئاسوودەیی بوو. من پێمگووتن کە یەکێک لە بکوژەکانی سەرهەنگ قاسم یەکێک لەو ئەفسەرانەی لە شەوی مردنی سەرهەنگدا بەشداربووە ئێستا لێرەیەو چاوەڕوانی دادگا دەکات، دیارە من لە هەر شتێکدا درۆم بکردایە نەدەکرا لەوەدا درۆبکەم، من ڕاشکاوانە گووتم، من باوەڕم بەو دادگایانە نییە کە سیاسییەکان بۆ یەکتری دادەنێن، باوەڕم

بە حاکمەکانی ئەم وڵاتە نییە، باوەڕم بە پارێزەرەکانی ئەم هەرێمە نەماوە، هیچ یەک لەوانە ناتوانن عەدالەت بۆ مرۆڤ دەستەبەربکەن. عەدالەت گەر هەبێت کەسانێک دروستیدەکەن کە خۆیان قوربانی ڕاستەوخۆن. باوکی سەرهەنگ برینپێچێکی پیربوو، بەڵام دەیزانی باسی چی دەکەم، خۆشحاڵ بوو کە من بەدوای مافی سەرهەنگەوەم و بۆ ڕۆژێکیش خوێنی ئەوم لە بیر نەکردوە. وەک یەکێک لە مانای قووڵی پشت هەموو قسەکانم تێبگات گووتی: چ شتێک ڕۆحی سەرهەنگ ئاسوودەدەکات ئەوە بکە. دەستیم ماچکردو گووتم: هەر ڕۆژێک لە دادگای گەورەو ڕاستەقینە نزیکبووینەوە من ئاگادارتدەکەمەوە، دەبێت تۆ لەوێ بیت، دەبێت تۆ ویژدانی خۆت بکەیتە مەحەک و حوکم بدەیت... تۆ و دایکی لە هەر کەس زیاتر ئازارتان چەشتووە.

ئەو شەوە کە لە ماڵی سەرهەنگ قاسم هاتمەدەرەوە، لە بەردەرگاکە وەستام و دەستمکرد بە گریان، دەستم خستبووە چاکەتە سپییەکەمەوە و دەگریام، کە گەڕامەوە بۆ گێلاسی سپی، دوای ماوەیەکی درێژ تارمایی دالیا سیراجەدینم بینی لە بەردەرگای ئوتێلەکە چاوەڕوانمدەکات. دەرکەوتنی دالیا وەک دەرکەوتنەکانی تری بێدەنگ و خێرا بوو، وەک هەمیشە چۆن بەسەر پلەکانەکانی پرتەقاڵی سپییدا سەردەکەوت، بەسەر پلەکانەکاندا سەرکەوت و لە شوێنێکدا لە نێوان قاتی پێنج و شەشدا ونبوو. من بۆ یەکەمجار پڕ بە ئوتێلەکە هاوارمکرد: دالیا سیراجەدین مەڕۆ، دالیا وەرە. بە جۆرێکی هێند بڵند هاوارمکرد، تەواوی ئوتێلەکە خەبەری بووەوە. هەندێک وایان دەزانی من سەرخۆشم و مەستی خەیاڵی مەحبوبەیەکی کۆنی هێناوەتەوە سەرم، بەڵام بێئەوەی گوێبدەمە هیچ کەس لەسەر پلەکانەکان دانیشتم و گریام. لە یادمە هەندێک دەستی نەناس هەڵیانگرتم و بردیانمەوە ژوورەکەی خۆم. دەبێت بزانن من ئەو تارماییەی دالیا سیراجەدین چەند ئازاری دەدام، دالیا لە بوون و ونبوونیدا خەونێکی ئەستەم بوو، ئەو شتە بوو کە هەمیشە نزیکەو

هەمیشە نایگەیتێ. ئەو لە نێوان شارەکان و قۆناغەکاندا هاورێی من بوو، هەندێک شەو هەڵدەستام و هەستمدەکرد فریشتەکانی ئەو لە ژوورەکەدان، بەلام خەیال بوو، هەمووی ورێنەو خەیالی سەری خۆم بوو... لەگەل ئەوەشدا لەگەڵمدا بوو، بەردەوام ئەو ئاماژە کورت و بچوکانەی دەدامێ کە لەگەڵمدایە. ئاماژەکانی وەک هەمیشە ئاماژەی کچێکی دڵڕەق بوو، کە هەموو جارێک کورت خۆی نیشانی عاشقەکەی دەدات، بۆئەوەی هەرگیز برینەکانی سارێژنەبێت. دەرکەوتنە سەیرەکانی دالیا هیچ نەبوون جگە لە ئاماژەیەک بۆ ئەوەی کە هێشتا لێرەیە، هێشتا لە ناو گەمەکەدایە، هێشتا شتێکی گەورە هەیە من و ئەو پێکەوە دەبەستێتەوە، واتە هێشتا خاڵێکە کە لە جێگایەکی تری وێنەکەدا دەردەکەوێتەوە، بەلام کەی و لە کوێ؟. من بێئەوەی بیر لە وەلامی ئەو پرسیارە بکەمەوە، بەو سۆزە ترسناک و قووڵەی خۆمەوە دەگریام.

ڕێگایەکی زۆر درێژ لە بەردەممدا بوو، سەخت بوو بۆ پیاوێکی بێپارەی وەک من دادگایەکی وەها گەورە ڕێکبخات، بەلام هیچ هێزێک نەبوو من پەشیمانبکاتەوە. ئەوە بەشی من بوو لە گێڕانەوەی جوانی و مانا بۆ سەر زەوی، من ئەو کاغەزەی پرتەقاڵی بابلیم دەرهێناو خوێندمەوە. دوازدە ناونیشان، لە دوازدە شوێنی جیاوازدا، لە گوندە دوورەکانی گەرمیانەوە دەیگرتەوە تا دەگاتە هەندێک لادێی بچوکی ناو چیاکانی سەر سنووری تورکیا.

ناوی یەکەم «کەریمی خەزێن» بوو. باوکێک کە سامیری بابلی، هەر دوو دەستی بە گوولله شکاندبوو، لە پێش چاوی خۆی سەربازەکانی بەردابووە دوو کچەکەی تا ئەتکیانبکەن، پاش ئەوەی شەوێک بە درێژیی سەربازە دڕندەکانی پرتەقاڵی بابلی دەستدرێژی لە کچەکانی دەکەن، بەیانی بە دوو درەختدا هەڵیاندەواسن و لێدەگەڕێن باوکی تەماشای لاشەکانیان بکات. ناوی دووەم «مەریوانی کوکوختی» بوو، کوڕێکی قوتابی کە سامیری

بابلی و سەربازەکانی چاویان دەرهێنابوو و خستبوویانە گیرفانییەوە. «خالق مەحمود» بوو ئەو ماسیگرەی زەکەریان بڕیبوو و کردبوویان بە قولاپێکەوە بۆ ئەوەی ماسی پێبگرێت. «نەسرین غەفوور» بوو کە هەفتەیەک بە ڕووتی لە گۆڕەپانی مەشقی تیپێکی مغاویردا دەیبەستنەوە و دواتر هەر دە پەنجەی بە تەور دەقرتێنن. «ئەمیری گوڵەباغ» بوو کە لووتی دەبڕن بۆئەوەی نەتوانێت بۆنی گوڵەکانی خۆی بکات. «سوارە فەتحوڵا» بوو کە وەک ماسی لە لەوحێکی دەبەستن و لەسەر ئاگرێکی هێمن دەیکەن بە مەسگوف، بەڵام نامرێت. «حەلیم شێواز» بوو کە پێستی نیوەی دەموچاوی لێدەکەنەوەو چەناگە درێژەکەی بە مشارێکی کارەبایی بۆ ڕاستدەکەنەوە. «سەبری شیخانی» بوو کە هەر دوو مەمکی دەبڕن و بە شیشێکی سوورەوەکراو پاکیزێتی لێدەستێننەوە. «سەردار بابا کەریم» بوو کە یەکێک لە مغاویرەکان هەردوو گونی بەقەپاڵ دەردەهێنێت و دەیخوات. «پەپولە جەمال» بوو کە دوای ئەوەی براکەی ڕادەکات، دەیگرن و بە شیشێکی گەرم لەسەر نێوچاوانی دەنوسن «قەحبە». «سۆزان مەغدید» بوو کە لەگەڵ خوشکەکەیدا «سازان مەغدید» دەیانگرن و تا یەکێکیان دەمرێت زیخی گەرمیان دەرخوارد دەدەن. «ئەردەڵان سۆفی» بوو کە کچە بچوکەکەی لە بەرچاوی خۆی هەڵدەواسن و تا لاشەکەی وشک نەکاتەوە دایناگرن.

ئەو ناوانە بوون کە دەبایە بیاندۆزمەوە. من بەیانییەک هەستام و سەفەری درێژی خۆم دەست پێکرد. لە ڕاستیدا دەبێت بزانن کە من پارەم نەبوو، لە بەرئەوە بەیانییەک بە بێ پارە هاتمەدەرێ و بڕیارمدا بێئەوەی گوێبدەمە کات و ماندووبوون دەستبکەم بەسەفەرێکی دوورو درێژ بە وڵاتێکی وێراندا بۆ دۆزینەوەی شاهیدەکانی خۆم، دەمزانی حکومەتەکان دەیان ساڵیان دەوێت بۆ جێبەجێکردنی عەدالەتێکی لەوجۆرەی من دەمەوێت. ئەو ڕۆژەی کە لە بەردەرکی گێلاسی سپییەوە بەرەو نادیار

دەرچووم، پێشتر ژوورەکەم بە ئەمانەت سپارد بوو بە دراوسێیەکم، نەوەک یەکێکی دی بیگرێت. بە خۆم و کۆڵێکی چکۆلانەی پڕ لە نانەڕەق و خورمای وشکەوە، بە شەرواڵێکی کورت و جامانەیەکی کۆنەوە لە ملمدا بە ڕێگایەکی سەختدا بەرەو دەرەوەی شار کەوتمە ڕێ. بێئەوەی بیر لە هیچ شتێک بکەمەوە، وەک ئامێرێک خۆی بۆ ڕۆیشتن تەرخانکردبێت، سەرم دانەواندبوو و دەڕۆیشتم. هەندێجار دەستم لە هەندێک پیکاب و تاکسی و جیپی ڕاگوزەر ڕادەگرت بەڵکو هەڵمگرن، بەلام کەس لەسەرم نەوەستا. دەمەو ئێواری لە کاتێکدا سێبەرێکی فێنک باڵی بەسەر زەویدا دەکێشا، کە من لە فیکری ئەوەدا بووم بۆ شەو جێگا خەوێک خۆش بکەم، موعجیزەیەکی گەورە ڕوویدا، موعجیزەیەک چاوەڕوانم نەدەکرد، لە کاتێکدا لە بن درەختێکدا دانیشتبووم و سەیری دارستان و چیاو پێدەشتەکانم دەکرد، لە ناکاو لە ڕێگایەکی خۆڵەوە کە لە قوولایی چیایەک لە چیاکانی ئەوبەرەو بەرەو ناو دۆڵێک شۆڕدەبێتەوە، ئەو ئەسپە سپییەم بینییەوە، ئەو ئەسپەی شەوێک منی لە باشوورەوە بەرەو باکوور هەڵگرت و بە ناو هەموو ڕێگا پڕ مەترسی و دووروودرێژەکانی ولاتدا منی گەیاندەوە کوردستان، هەمان ئەسپ بوو، هەمان نیگای هەبوو، هەمان یالی ئاوریشمی، هەمان سمکوڵکردن، هەمان ڕەوت، هەمان سپێتی خودایيانە کە پێدەچوو بە تۆزی هیچ زەمینێک گەرد نەگرێت. ئەو ئەسپەی وەک لە دونیایەکی ترەوە هاتبێت کومەک بە من بکات، لەدوورەوە بە غار هات و لە پێشدەممدا وەستا. من بە درێژایی ئەو شەوە بە ڕێگاوەبووم، لەو شەوە سەیرانە بوو کە تێیدا مرۆڤ هەست بە باڵە ئەفسانەییەکانی خۆی دەکات، هەستدەکات نیوەی سەر بە زەمینێکی ترە، وەک بوونەوەرێک نیوەی نوقمی ئاگر بێت و نیوەی نوقمی ئاو. کە دونیا تەواو تاریک بوو باڵندە سپییەکانیشم دەرکەوتن، ئەو باڵندە قەشەنگانەی وەک بەسەر ئەمیرێکدا بفڕن بەسەر سەرمدا دەفڕین، بەدرێژایی شەو، وەک مەخلوقێک بە بۆنی زەمینێکی سیحراوی خوماربێت،

ئاوەها مەست بە سەر ئەسپەکەی خۆمەوە بە زەویدا تێدەپەڕیم. ئەسپێک دەیتوانی لەبڕینی لەمپەرەکانی شوێن و کاتدا یارمەتیمبدات. لەسەر ئەو ئەسپەوە دەمتوانی نیشتیمان جوانتر ببینم، وام هەستدەکرد ئەسپێکە لە قووڵایی ئەفسانەکانەوە هاتۆتەدەرێ، بەڵام چاوێکی ڕوونترو ڕۆحێکی سافتری پێدەبەخشیم، تەنیا منی بە ئەستێرە دوورەکانەوە گرێنەدەدا، بەڵکو منی توند بە زەویشەوە دەنوساند، هێمایەکی گەردونی لە ڕەوتکردن و غاردانەکەیدا هەبوو، بە ئەسپێک دەچوو کە پێغەمبەرێک لە جێگایەکەوە ببات بۆ جێگایەکی دی، بەڵام من پێغەمبەر نەبووم، من تەنیا پەیامهێنێکی بچوکی جوانی بووم شەوێک بە سوار ئەسپێکەوە دەچووم بۆ گوندێکی دوور تا شاهیدێکی فەرامۆشکراو بدۆزمەوە. ئەو ئەسپە ئەو هەستەی دەدامێ کە من بەشێکم لە جیهان. هەستێکی سەیربوو کە من لە ئوتێلی گێلاسی سپی ونمکردبوو. من لەو ئوتێلەدا، ئەگەرچی تا دوا ئەندازە لە ناو شتە ڕۆژانەکاندا نوقم بووم، ئەگەرچی خۆم بە پیاوێکی تەبا دەبینی لەگەڵ کۆی ئیقاعی بووندا، بەڵام هەمیشە ئەو هەستە قووڵەم هەبوو کە ئەز ئادەمیزادێکم دەرکراو لە دونیا. لەسەر ئەو ئەسپەوە ڕوونتر دەمتوانی جیهان لە هەموو دەموچاوە جیاوازەکانیدا ببینم، جیهان وەک باڵدارێک کە هەر ساتەی بە جۆرە باڵێک بە ناو جۆرە هەورێکی جیاوازدا دەفڕێت. جیهان لە شاری تەپۆتۆزەکان، جیهان لەم شارە پڕ غرورەی ئێستادا، جیهان لە ئۆردوگای ئاوارەکان، جیهان لەو باغچە غەمگینەدا بەرابەر گێلاسی سپی... هیچیان لە یەک نەدەچوون. من هەمیشە چەندە سەرسامم بە جیاوازی مرۆڤەکان هێند سەرسامم بە جیاوازی شوێنەکان. لەوانەشە دواجار هەر خودی ئەو سەرسامییە منی بەرەو ئەو هەموو شوێنە جیاوازانە بردبێت، چونکە مرۆڤ بەبێ سەرسامی وەک ماسییەکی کوێری لێدێت کە دەڕوات و ئاو نابینێت. من هەمیشە بەر لەوەی بگەمە دوا مەنزڵ لەدەرەوەی شارەکان، لەدەرەوەی گوندەکان، لە دەرەوەی هەر ئاوەدانییەک کە مرۆڤی

لێیە، دەوەستام و لەسەر ئەو ئەسپە دەهاتمە خوارێ. هەر کات دەگەڕامەوە ئەو ئەسپە لە هەمان جێگادا چاوەڕوانیدەکردم. من یەک لە دوای یەک ئەو ڕۆحە زامدارانەم دۆزییەوە، هەندێجار ئاسان و هەندێجار زۆر بە زەحمەت، هەندێجار دەبایە چەندین شارو گوندی دیکە بگەڕێم تا شوێن پێیان هەڵدەگرم و دەیاندۆزمەوە. کۆمەڵێک مرۆڤ بوون لە پەراوێزی ئەم گەردونەدا لە تاریکییەکی ترسناکدا دەژیان، لەو جۆرە قوربانییانە نەبوون کە ئاڵۆگۆڕی سیاسەت و مێژوو هەڵیان بستێنێتەوە، بەڵکو هەموویان لەو قوربانیانە بوون کە مرۆڤ دەتوانێت بڵێت گەر جارێک بوونە قوربانی ئیدی بۆ هەتا هەتایە قوربانین. کەریمی خەزێنم لە ناو دارو پەردووی گوندێکدا بینییەوە کە جگە لە خۆی هیچ کەسی تری تێدا نەدەژیا. بە پەنجە ماندووەکانی ئەو دارەی نیشاندام کە سامیری بابلی کچەکانی پیاهەڵواسیبوو، دەستە شکاوەکانی خۆی نیشاندام، پیاوێکی چکۆلانە بوو کە هەموو سەر نشینانی گوندەکەی کوژرابوون، ئێستا دەیویست بە تەنیا ئەو گوندە دروستبکاتەوە. کە من ناسیم لەسەرەتای ئەو پڕۆژە سەیرەدا بوو، ڕای وابوو کە ڕۆحی هەموو کوژراوەکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگایەو دەبێتماڵێکیان هەبێت، من مێژووی ئەو دادگایەم بۆ داناو ناونیشانی خۆمم دایەو ماڵاواییم لێکرد. دوای ئەو پەپولە جەمالم دۆزییەوە، کچێکی جوان کە بەردەوام ناوچاوانی بە پەڕۆیەکی سپی بەستبوو، ئەو کچەی لە خەویدا هەموو شەوێک فریشتەکان دەهاتن و دەستیان بە نێوچاوانیدا دەهێناو چاکیاندەکردەوە، لە ماڵی کوڕی پورێکی دەژیا کە شەوان بەزۆر پەڕۆ سپییەکە لە ناوچاوانی لادەبرد و لاقەیدەکرد. پەپولە جەمال یەکەمین ناو بوو کە نەیدەتوانی بێت بۆ دادگاکەی من، یەکەمین قوربانی بوو کە گووتی «کوڕی پورەکەم ناهێڵێت لێرە بچمەدەرێ...». مرۆڤێک بوو مەحکوم بە زیندانییەکی ئەبەدی، لەو کەسە بەدبەختانەی هیچ ئادەمیزادێک ناتوانێت هیچیان بۆبکات، دێن و وەک نەفرەت لێکراوێک لەسەر زەوی

دەژین و دەڕۆن، نە خودا سەبووریان دەداتێ و نە مرۆڤ. دوای پەپولە، ئەمیری گوڵەباغم دۆزییەوە، ئەو پیاوە بێ لووتەی بۆئەوەی کەس نەیبینێت بووبوو بە پاسەوانی شەوانەی باغێک. من لە تاریکە شەوی شارۆچکەیەکی دووردا لە ناو گوڵەباغەکاندا دۆزیمەوە، وەک هەمیشە خۆی بە ئەمیری گوڵەکانی دونیا دەزانی، لە ناو گوڵەکاندا دەوەستاو باسی سیحری بۆنەکەیانی دەکرد، کە من لێم دەپرسی: گەلۆ تۆ بە چی بۆن دەکەیت، بەو زمانەی کە تێکەڵەیەک بوو لە دیالێکتێکی ناوچەیی و شێوە نوتقێکی تایبەت بە خۆی بە شانازییەوە دەیگووت «خارۆزاگیان، من بە بینین بۆنی گورەکان دەکەم»، من دەمگووت: گەلۆ بەلام شەوە، تۆ نابینیت شەوەو دونیا تاریکە. بە زەردەخەنەیەکەوە کە ناشیرینی ئەو لووتە بڕاوەی نەیدەتوانی جوانییەکەی بشارێتەوە، دەیگووت: پسمام، خودا عافووتکا، ئێ خۆ من بە چاوم نابینم، من بە درم دەبینم.

کە ئەو پلانەم بۆ باسکرد، بە غەمگینییەوە گووتی: کوڕی پلک، ئەدی هەندێک پێویستیان هەر بە دادگای نییە، چاترە لە باغێکدا وەکی بلبل بەریاندەی، لێگەڕێی تا ڕۆح لە قەلبیاندا دەمێنێ سەیری گوران بکەن، ئەدی کوو، یەکێک بیژی نەبێ و شیری داکی بە حەرار مژی بێ، سەیری گور لەهەر چتەک زاتر مرۆڤ لە پیسی و فەصاد پەشیماندەکاتەوە.

ئەمیری گوڵەباغ پەیمانی دامێ، کە ڕۆژێک پێش دادگا دێت بۆ گێلاسی سپی و هەر شتێک من فەرمایشتی بدەم، «دەیکاتن».

حەلیم شێوازم لە هەورەبانێکی تاریکدا دۆزییەوە، لە ژوورێکدا شەش ساڵ بوو پەردەکانی لانەبرابوون، شەش ساڵ بوو لە هاوڕێیەکی نزیکی خۆی و خوشکەکانی زیاتر کەسی تر نەدەچوو بۆلای. پیاوێک بوو شەرمی لە ڕوخساری ناشیرینی خۆی دەکرد. سەرەتا یەکێک بوو لە هەرە کوڕە جوانەکان، بەلام وەک جانەوەرێک نیوەی ڕوخساری خواردبێت، ئێستا نیوەی دەموچاوی نەمابوو، کە قسەی لەگەڵدا دەکردم هەمیشە

دەستێکی لەسەر ئەو بەشە فەوتاوەی ڕوخساری بوو. پێش کارەساتەکە تەنیا ئەدەبیاتی مارکسی دەخوێندەوە، لە دوای ئەوەوە ژیانی خۆی بۆ خوێندنەوەی هەموو کتێبەکانی دونیا لەسەر جوانی تەرخاندەکات. ئەو دەیگووت: هەڵەی هەرە گەورەی مارکس ئەوەیە کە پێش ئەوەی بزانێت جوانی چییە، بیری لە گۆڕینی جیهان کردۆتەوە. مرۆڤ بەرلەوەی بزانێت عەدالەت چییە، دەبێت بزانێت جوانی چییە. کتێبێکی پیشاندام و گووتی: هەمیشە ئەم کتێبە دەخوێنمەوە. «وێنەی دۆریان گرای» ئۆسکار وایلد. من هیچم دەربارەی ئەو کتێبە نەبیستبوو. بێئەوەی زۆر لەسەری بڕۆم داوام لێکرد لەو ژوورە بێتەدەرێ و لە دادگاییکردنی سامیری بابلیدا بەشداربێت، بەڵام پێشتر کەس نەیتوانیبوو لەو ژوورە بیهێنێتەدەرێ. بێیاکانە گووتی: بەدرێژایی مێژوو زۆرداران دێن و دەڕۆن و کەس سزایان نادات، تۆ دوای سەراب کەوتوویت، وادابنێ ئێمە سامیری بابلیشمان کوشت، ئەوە هیچ لە دونیا دەگۆڕێت؟. ئاخۆ من دەتوانم جارێکی تر بێمەدەرێ و دەموچاوی خۆم دەرخەم... ها دەتوانم؟ من پێمگووت: هەموو کەس دەزانێت تۆ ڕۆحێکی بێگوناهیت... هەموو کەس دەزانێت، هەمووان ڕێزی ئەوە دەگرن کە تۆ قوربانییەکی لە قوربانییەکانی ئەم دەوڵەتە دڕندەیە.

گووتی: ڕاست نییە، ئەو قسانەی تۆ هیچی ڕاست نیین، تۆ زەلامێکی خەودەبینیت، شێتێکی هێشتا نازانیت شێتیت، تۆ هێند بێدەماغیت شایەنی ئەوەنیت مرۆڤ گوێت لێبگرێت، بابایەکی شتێک لە دڵتدایەو دەتەوێت بە هەر نرخێک بووە جێبەجێیبکەیت. من لەم ژوورە نایەمە دەرێ لەبەرئەوەی خەڵکم خۆشدەوێت، سبەینێ گەر بێمەدەرێ چی ڕوودەدات؟. ها، هێند بێمێشکیت وا دەزانی من حەزم لەدەرەوە نییە، وادەزانی نامەوێت ئەو پەردەیە بکەمەوەو سەیری خۆر بکەم؟... گەر بێدەنگ بیت من حاڵیتدەکەم، گەر گوێبگریت من شتێکت تێدەگەیەنم، هەرچەند بەدرێژایی ژیانم گومانم

هەبووە خەڵکی وەک تۆ گوێیان هەبێت. سبەینێ من دیمەدەرێ و خەڵک بەو چاوە درێوو بێڕەحمانە سەیرمدەکەن. ئەوانەشی کەدەزانن من زوڵم و ناهەقی وای لێکردوم، پاش ماوەیەک بیریان دەچێتەوەو بەس ناشیرینییەکەم دەبینن. وام لێدێت وەک شێت پەلاماری ئەوانە بدەم کە سەیرمدەکەن... شێتی وام لێدەکات لە خەڵک بپرسم بۆ وا لێم دەڕوانن؟ بۆ لێناگەڕێن بە ڕێگادا بڕۆم؟. ها... تۆ پێمبڵێ، وایە یاخود نا؟... ها چەند ساڵێکی دی، کێ ئەوەی بیر دەمێنێت کە دەوڵەتێکی خراپ هەبوو، کۆمەڵێک ئەفسەری خراپی هەبوو، ڕۆژێک خەڵکانی بێگوناهیان دەگرت و دەموچاویان دەشێواندن و بەرەڵایاندەکردن... چۆن ئەوە لە منداڵان تێدەگەێنێت؟ ها... هەی بێمێشک... چۆن ئەوە لە منداڵان تێدەگەێنێت. هەی گەمژە... هەی گوێدرێژ.

من هەرگیز لە جنێوەکانی حەلیمی شێواز توڕەنەبووم، بە هێمنی گوێم لێگرت و سەرم بۆ لەقاندو بەو زمانە لووسەی خۆم گووتم: حەلیمی شێواز تۆ کەیفی خۆتە، لەوانەیە من گەمژەبم، بەڵام لەم دونیا هیچ و پووچەدا بەس خودا خۆی دەزانێت کێ گەمژەیە و کێ عاقڵە، بەڵام دڵنیام گەر کەرێکی لە من گەورەتر هەبێت، ئەوا تۆیت، تۆ بارگیرێکی بێوێنەیت. من بەزەیم بە تۆدا نایەتەوە، من دڵنیام تۆ جوانیت، تۆ لەبەرچاوی من کوڕێکی قۆزیشیت، ناوەوەشت پڕە لە جوانی...

ویستم درێژە بەقسەکانم بدەم، دەستی بەرزکردەوەو گووتی: هەر تۆم بینی، زانیم پیاوێکی درۆزنیت، تۆ ناشیرینترین درۆزنی من بینیبێتم. دەزانم ئێستا باسی شتێکم بۆدەکەیت لە سوکرات و ئەفلاتوونی حەکیم کۆنترە، باسی جوانی ناوەوەو دەرەوە، ئەو درۆ سەخیفە دەکەیت کە هەمووان دەیکەن، ئەوانەی دەڵێن، جوانی یەعنی جوانی ناوەوە. پێمبڵێ تۆ پیاویت یان نا؟

من سەرم لەقاندو بە گومانێکەوە گووتم: نازانم، وابزانم پیاوم... ئەگەر درۆم نەکردبێت، چونکە خۆت دەزانی پیاو پێناسەی جۆراوجۆری هەیە.

بێئەوەی دەستی لەسەر دەموچاوی لاببات گووتی: ئەگەر پیاوبیت، دەزانیت ئێمە هەموومان لە نێوان کچێکی جوانی بێعەقڵ و کچێکی ناشیرینی بلیمەتدا، هەمیشە جوانە گەمژەکە هەڵدەبژێرین... هیچ پیاوێک نییە وانەبێت... هیچ پیاوێک نییە لەسەر ئەم ئەستێرەیە وانەبێت.

ویستم نارەزایی خۆم دەربڕم، نەیهێشت قسەبکەم و گووتی: هەموو ژنانی سەر ئەم ئەستێرەیەش وەهان... جوانی دەرەوە هەمیشە و هەمیشە لە جوانی ناوەوە گرنگتر بووە، هەموو مێژووی مرۆڤ ئەوەیە. ئەم دونیایە دونیای دۆریان گرایە نەوەکو دونیای کازیمۆدۆ... تێدەگەیت هەی گەمژە، جارێ دەزانیت کازیمۆدۆ کێیە؟ نازانیت، هیوادارم حیکایەتی قەموورەکەی نۆتەردامت بیستبێت، ئەو قەمووره ناشیرینەی زەنگەکان لێدەدات، ئەوە کازیۆمۆدۆیە.

من سەرم بۆ لەقاندو گووتم: بەڕێز فلیمەکەیم بینیوە.

بە قێزێکەوە سەیریکردم و گووتی: گەر ئەوەت بینیبێت دەزانیت، جوانێکی گەمژە هەزارجار لە ناشیرینێکی بلیمەت خۆشبەختتر دەژی... بڕۆ مێژوو بخوێنەوە... ئەوە سەدجار باشترە لەوەی خۆت بۆ کۆمەڵێک قسەی قۆڕ تەرخانبکەیت و بەم خەیاڵە قۆڕانەوە زەوی بگەڕێیت و لات وابێت سوارچاکێکی خۆت بۆ عەدالەت تەرخانکردوە. تۆ لە باشترین حاڵەتدا هیچ نیت جگە لە مەخلوقێکی دەجار لە دۆنکیشۆت گەمژەتر. دەجار... بەلایەنی کەمەوە دەجار.

کە دواتر ڕۆمانی «وێنەی دۆریان گرای» ئۆسکار وایلدم خوێندەوە، تەواو لە هەموو قسەکانی تێگەیشتم. من شەوێک بە درێژایی لەگەڵیدا مامەوە، زۆرجار وام هەستدەکرد لە ناوەڕاستی قسەکردندا حەزدەکات بە پاڵ لە ژوورەکەی بمکاتە دەرەوە، لەدوای دالیا سیراجەدینەوە کەس هێندەی حەلیم شێواز بە منی نەگووتبوو گەمژە، لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیابووم،

دەرکەوتنی من شتێکی تازەبوو لە ژیانیدا، دواجار وای هەستدەکرد کە کەسێکی دۆزیوەتەوە قسەی لەگەڵدابکات. کە بەجێمهێشت دڵنیانەبووم ئاخۆ دێت بۆ ئەو دادگایە یاخود نایەت، بەڵام هەستم بە دوو فرمێسکی زیوین کرد لە چاویدا، فرمێسکی پیاوێک کە لە هێزی تەنیایی زیاتر هێزێکی دیکەی نییە.

چەند ڕۆژێک لە ناو چیاو گوندو دارستانی چڕدا ونبووم تا «مەریوان کوکوختی» م دۆزییەوە ئەو قوتابییە کوێرەی لەگەڵ مەفرەزەیەک گومرگی سەرسنوودا ئیشی ئەوەبوو گوێ بە زەوییەکەوە بنێت و بە پۆلیسەکانی گومرگ بڵێت، قاچاغچییەکان لە چ ڕێگایەکەوە دەپەڕنەوە. لە ژوورێکی بلۆکدا لە ژێر بەتانییەکی ئێرانییەوە دەرمهێنا کە وێنەی پڵنگێکی لەسەر بوو، ژوورێکی سارد لە نزیک چیایەک کە هاوینانیش بەفری ناتوێتەوە. ئیشەکەی لەوە ترسناکتربوو کە من تێدەگەیشتم، بە دزییەوە بە منی گووت: ئەگەر تا ڕۆژی دادگا بمێنم باشە. من بەڕاستیمە، قسەکانم بە گاڵتە وەرمەگرە، لێرە کۆمەڵێک هەن دەیانەوێت بمکوژن، خۆت دەزانیت، بەرپرسەکانی گومرگ لەگەڵ قاچاغچییەکاندا شەریکن، نەوەڵا گاڵتەت بەقسەکەم نەیەت. هەفتەی پێشوو زۆر لە نزیکەوە دوو گوللەیان بە پەنا گوێدا تەقاندم، دەزانم، ئەوە ئاگادارکردنەوە بوو. یەکێک بەردەوام بە شەو دێت و بە گوێمدا دەچپێنێت و دەڵێت: مەریوان زۆر مەڕۆ. نایناسم، نازانم کێیە، بە قەبری باوکم نازانم کێیە. پێمدەڵێن : سبەی شەو سەعات دە کاروانێک لە پشتەوە دەردەچێت، تۆ خۆت دەکەیت بە کەڕ، تێدەگەیت، بە کەڕو کوێر. ها... منیش ئەم ئیشە نەبێت لە برسا دەمرم. ئاغا گیان بەقوربانی دڵت بم، نازانم چی بکەم، دەمێنم نامێنم خودا دەزانێت، گەر مام مامۆستا گیان، بەسەرچاو تۆ چیم پێبڵێیت، فەرمایشتی جەنابتە، بەقوربانی دڵت بم... بەڵام وەزعەکە وایە.

هەندێجار چەندەها شەو بەسەر ئەو ئەسپەوە دەڕۆیشتم، هەستمدەکرد

ئەو ئەسپە بەشێکە لە خۆم، بەشێکە لە تواناکانی خۆم، هیچ نییە جگە لە باڵێکی خەیاڵی کە هەمیشە لە خۆمدا شاردومەتەوە. من لەسەر ئەو ئەسپەوە جارێکی تر کوردستانم دەبینییەوە، ئەو نیشتیمانەم دەبینییەوە کە پڕبوو لە مرۆڤی ئاسایی جوان، زەمینێکی بێوێنە لە پاکیدا کە ئەوانەی داگیریانکردوە ئەتکیانکردوە، ئەوانەش کە ویستویانە ڕزگارییبکەن هەر ئەتکیانکردوە. نیشتیمانێک لە کچێک دەچێت دێوێکی زل و ناشیرین ڕفاندبێتی و جوانی ژاکاندبێت، سوارچاکێکیش هاتبێت ڕزگارییبکات، بەڵام شەهوەتی ئەو سوارچاکە بۆ لاقەکردن و ئەتککردنی ئەو کچە کەمتر نییە لە شەهوەتی دێوەکان.

لەسەر ئەو ئەسپەوە هەندێجار بەو ڕێگاوبانانەدا دەڕۆیشتمەوە کە هێشتا بۆنی ئیسحاقی لێوزێڕین و سەرهەنگ قاسمیان لێدەهات. هەندێک شەو لە ئەسپەکەم دادەبەزیم و لە بن درەختێکدا بارگەم لێدەخست، چرایەکی چکۆلەم بەدرەختێکدا هەڵدەواسی و لە یەکێک لە دەفتەرە دڕاوەکانمدا یاداشتەکانی ئەو گەشتەم تۆماردەکرد، قسەی شاهیدەکان، نیشانەو ئازارەکانیان.

خەفەتی هەرە گەورەی ئەو سەفەرەم ئەوەبوو کە زانیم «سوارە فەتحوڵا» لە ڕاپەڕیندا شەهیدبووە. وێنەیەکیم لە یەکێک لە دۆستەکانی وەرگرت و خستمە ناو یەکێک لە دەفتەرەکانمەوە، دوای خۆی تەنیا برایەکی چکۆلەی جێهێشتبوو، کە بۆ کرێکاری چووبوو بۆ ئێران. زۆرم هەوڵدا کەناڵێک بدۆزمەوە لەڕێگایەوە بگەم بە براکەی، بەڵام بێهودە بوو. لە دەستچوونی هەر شاهیدێک کەلێنێکی دەخستە ئەو عەدالەتەوە کە من بۆی دەگەڕام. سوارە فەتحوڵا تاقانە ونبووی من نەبوو. گەشتەکانم ئەوەشیان بۆ دەرخستم کە گەڕان بەدوای سۆزان مەغدیدیشدا گەڕانە بەدوای سەرابدا، سۆزان مەغدیدیش لە کاتی ڕەوەکەدا لە نێوان دوو شاردا لە ئێران وندەبێت و هیچ کەس دواتر هەواڵی نازانێت، لەدەستدانی

ئەو دوو شاهیدە گورزێکی کوشندەبوو بۆ من کە هەندێجار هەستمدەکرد ونبوونی هەر شاهیدێک مردنی بەشێکی گەورەی عەدالەتە.

من لە هەموو جێگایەکدا تووشی شتێکی چاوەڕواننەکراو دەبووم، زۆربەی ئەو کەسانەی تا ئەو کات بینیبوومن ئەو دادگایەیان وەک مەسەلەی گەورەی ژیانیان تەماشانەدەکرد، زۆربەیان بە ئازارەکانی خۆیان ڕاهاتبوون، زۆربەیان ئەو هەوڵەی منیان وەک شتێکی خەیاڵی و بێمانا سەیردەکرد، هەندێکیان دەترسان ئەو دادگایە تووشی دەردەسەری گەورەتریان بکات. تاکە کەسێک کە خواستێکی جەهەنەمی بۆ تۆڵە تێدابوو نەسرین غەفوور بوو کە ژنی پێشمەرگەیەک بوو، کە پاش ئەتککردنی ئەویش تەڵاقیدەدات و ژنێکی تر دەهێنێت. ژنێک بوو دەبووایە بەبێ دەست جگە لە خۆی دوو برازای هەتیویش پەروەردەبکات، تاکە سەرچاوەی دارایی کەروێشک و هێلکەی مریشک بوو، دەیگووت: مامۆستا، گەر کەروێشک زۆر زاوزێیان نەکردایە، عەیامێک بوو لە برسا فەوتمانکردبوو. خۆی لەگەڵ دوو برازا چکۆلەکەی سەدان مریشک و کەروێشکیان بەخێودەکرد. دوو منداڵی چکۆلەبوون کە هەندێجار هەر سێکیان بە سەعات دوای کەروێشکێک دەکەوتن تا دەیانگرت. کە من چیرۆکی بابلیم بۆ گێڕایەوە، دەیویست هەر ئەو شەوە لەگەڵمدابێت و سامیری بابلی بخنکێنێت. دەیگووت: پێمگووت، سەیدی، بمکوژە و ئەتکممەکە، سەیدی شەرەف عەزیزە، سەیدی. سەیدی من حورمەم بە حورمەیی خۆمم لەگەڵدابکە، وەڵا سەیدی زەعیفەم خێرت دەگات، بەڵام بە سەگەکانی گووت، ڕووت و قووتی بکەنەوە، من گووتم سەیدی مەعز بۆ خوا، مەعز بۆ پێغەمبەر، مێردەکەم دەمکوژێت ومنداڵەکانیشم هەتیودەکەون، خوا قبووڵی نییە. سەیدی دوایی تا دەمرم پێم دەڵێن ئەوە ئەو ژنەیە کە ئەوەندە عەرەب سواری بوون لنگی بۆ جووت ناکرێت... سەیدی. سەیدی بەقوربانی قۆنەرەکانت بم... سەیدی حەیاوحورمەتم داپۆشە... سەیدی ئەو پێڵاوەت ماچدەکەم، سەیدی

ئەتکتکردم دە واز لە دەست و پەنجەم بێنە، سەیدی بمکوژە، ڕەحمەت لە گۆڕی دایک و باوکت بمکوژە، سەیدی عینسان لەم دنیایەدا بە دوو شت دەژی، بە دەستەوپەنجەو بە حەیاوحورمەت، یەکێکیانم بۆ دانێ، سەیدی بەساقەی سەگەکانت بم، یەکێکیانت برد ئەوی تریشیان مەبە.

نەسرین غەفوور کە قسەیدەکرد دووبارە ترس و هاواری ئەو ساتە هەمووی دەژیایەوە. ژنێکی دلێربوو، لەو ژنە مەزنانەی کە ئەم ئەستێرەیە دەبێت شانازیان پێوەبکات، لەو ژنە کوردانەی مەزنتربوو لە هەموو ئەو وەسفە ئینشائی و بێمانایەی ئەدیبە پلە دەکانی کورد لە وەسفی ژندا دەیاننوسی و دواتر من لە ڕۆژنامەکاندا دەمخوێندەوە، مەزنتر بوو لەو ژنە پڕ ئەتەکێتانەی سالانی دواتر دەبوون بە وەزیرو بەڕێوەبەرو ئەندام پەرلەمان، لەوانەی بە ناوی ڕزگارکردنی ژنی کوردەوە دەبوون بە عەبدی وەزیرو سەرۆک وەزیرو سەرۆک حیزبەکان. ژنێک بوو لە بەرچاوی من گەورەتر لە هەموو ئەو سیاسییە فشەلانەی ئەو سەدەیە بەرهەمیهێنابوون. کە من ڕۆیشتم ئەو ملی ماچکردم و گووتی: کەس نەیە بۆ ئەو دادگایە من دێم، ئەوە ژیانی منە کوڕم، تۆ فرسەتێکم ئەیەیتێ مەگەر خودا بە گەورەیی خۆی بە عینسانی بدا.

ژنێکی نەخوێندەوار بوو، بەلام من لەبەردەمیدا نوشتامەوە، لەبەردەمیدا دانەوێم و گووتم: خوشکی گەورەم، هەموو پاکی ئەم ئەستێرە کۆبکەیتەوە بەقەد دامێنی ئەو کراسە دڕاوەی تۆ پاک نییە. هەموومان بەسەریەکەوە بەقەد تۆ شەریف نین، ئێمە هەموو مرۆڤین بەو مانایەی کە ئەم زەمینە دروستیکردوین، بەلام تۆ مرۆڤی بەو مانایەی کە خودا دروستیکردوە.

من لە ئیرادەی ئەو ژنەدا هێزی پالەوانە ئەفسانەییەکانم بینییەوە، ڕاستگۆییەک لە چاویدا بوو، لە هەمان ئەو ڕاستگۆییە دەچوو کە جارێک لە چاوی ئوم فەزلدا بینیبووم. من لە ڕێگای ئەو دوو ژنەوە تێگەیشتم کە ژنان نیشتیمانیان نییە، نیشتیمانی ڕاستەقینەی ئەوان، نەتەوەی ڕاستەقینەی

ئەوان ژیان خۆیەتی. لەو ساتەدا گرنگ نەبوو بۆ من نەسرین غەفوور یان ئوم فەزڵ کوردە یان عەرەب. هەر دووکیان مەخلوقاتی ئەفسانەیی مەزن بوون، لە تراژیدیای ژنێتی خۆیانەوە موعجیزەیەکیان دروستکردبوو کە ئێمەی پیاو لەبەردەمیدا هیچ نین جگە لە هەندێک جوجەڵەی ترسنۆک.

«سەبری شێخانی» لە کیژەکانی تر بەختەوەرتر بوو، دواجار کوڕێکی هێمن و شەرمنی دۆزیبووەوە، کە پیاوێکی بە شەهامەت بوو، هەرگیز ئەوەی بۆ گرنگ نەبوو ژنەکەی مەمکی نییە. سەبری خۆی هەموو چیرۆکەکەی بۆ گێڕابووەوە، بەر لەوەی مارەیبکات، پێیگوتبوو، کە ئەو ژنێکە ناتوانێت لەزەت لە پیاو ببینێت، چونکە سووک و ئاسان دیوارەکانی ڕەحمی هەموو سووتاون، بەڵام لە جنس بترازێت دڵێکی گەورەی هەیە کە دەتوانێت بێسنوور عاشق بێت. دیارە کەم پیاو هەن حەزبکەن ژیانیان لەگەڵ ژنێکدا بژین، کە تەنیا ڕۆحەو جەستەی نییە. وەلێ بۆ مێردەکەی ئەو، بۆ ئەو کوڕە گەنجەی کە لە خۆشەویستی زیاتر بۆ هیچی تر نەدەگەڕا، ئەو ساتانەی کە بە ماندوویی لە بازاڕ دەگەڕایەوە و سەبرییە چکۆلی دەگرتە باوەش جوانترین و خەیاڵاویترین ساتەکانی دونیابوون، ئەو ساتانەی ماچ کە لە ناو یەکدا دەتوانەوە، لە هەموو چێژە گەورەکانی تری لەش شیرینتربوو کە سەبری لە زۆربەیان بێبەش بوو. ژن و مێردێکی ناسک و فریشتە ئاسابوون کە من ئێوارەیەک لەسەر مێزەکەیان برنج و تاسکەبابییەکم خوارد، خۆشترین خواردنێک بوو تا ئەو کاتە لە ژیانمدا خواردبێتم، چونکە تامی خۆشەویستیی دەدا. من لە ژیانمدا کەمجار سفرەم بینی بوو تامی عەشق بدات. بەڵام ئەو جارە، لەو شارۆچکە چکۆلە و غەمگینەی باکووردا، من نانێکم خوارد پڕبوو لە خۆشەویستی. کە من چیرۆکی خولیای خۆمم بۆ گێڕانەوە، برینەکانی سەر سینەی خۆمم نیشاندان، باسم لەو دادگایەکرد کە بڕیارە حوکمی سامیری بابلی بدات، مێردەکەی سووربوو لەسەر ئەوەی سەبری بێت و قسەی خۆی بکات، بەڵام سەبری شێخانی بەردەوام

دەیگووت: حەزدەکەم ڕابوردووم بیربچێتەوە، نامەوێت بیری لێبکەمەوە. سەبری دەترسا کردنەوەی دەرگای ڕابوردوو، لەگەڵ خۆیدا ڕەشەبای ئەوتۆ بهێنێت ژیانی ئێستاشی وێرانبکات. دوای شەوێکی تەواو بیرکردنەوە، ئەو کوڕە هێمن و پڕ میهرو وەفایە، لەبەرچاوی من باوەشی بە سەبریدا کردو فرمێسکەکانی بۆ سڕی و گووتی: نابێت بترسیت، نابێت لە هیچ بترسیت، من لەگەڵ تۆدام، هەقی خۆت لە هەموو شتێک گەورەترە... کە ئینسان عاشق بوو، دەبێت لە هەقی خۆشی نەبورێت.

بەیانی کە ئەوماڵەم جێهێشت دڵنیابووم دێن بۆ دادگاکە، مێردەکەی دەستی خستە سەرشانم و گووتی: بێخەم بە، ئێمە لەوێ دەبین، دڵنیابە لەوێ دەبین.

ئێوە نازانن چەند لەو سەفەرەم کامەران و دڵڕازی بووم؟. سەفەرێک بوو بەناو ڕۆحی شاردراوەوە نادیاری ئەو مەملەکەتەدا. من نازانم ئەو سەفەرەم چەندی خایاند، هەتا پێش گەشتەکەشم پەیوەندییەکی ئەوتۆم بە کاتەوە نەمابوو، پچڕانی پەیوەندی بە کاتەوە یان نیشانەی مردنە یان نیشانەی سەفەرێکە بە ناکۆتادا. من بەلامەوە گرنگ نەبوو مردووم یان بووم بە ڕێبواری سەرزەمینی ئەبەدییەت، دەڕۆیشتم و بیرم لەلای هەفتەو مانگەکان نەبوو، بەلام دواجار دەبایە مێژوویەکم بۆ ئەو دادگایە دابنایە، من ڕۆژی ١٥ ی شەشی ساڵی١٩٩٣ م وەک مێژووی تەواوەتی دەستپێکردنی ئەو دادگایە دەستنیشانکرد. دەبایە ئێوارەی ڕۆژی ١٤ی شەش هەموو شاهیدەکان لەوێ بن. دەبایە تا ئەوکات من هەموو شتێک ئامادەبکەم. شتەکان جوان و سادە دەهاتنە بەرچاوم. ئیدی بەسەر زەویدا دەڕۆیشتم و خۆشحاڵانە گۆرانیم دەگووت، زۆربەی کات ئەو گۆرانییە عەرەبیانەم دەگووتەوە کە کچانی پرتەقاڵی سپییان بەیادا دەهێنامەوە، ئەو کچە عەرەبە جوان و دڵسافانەی هەرگیز هەندێکیانم لە بیرناچێتەوە. ئێوارەیەک بەدەم گۆرانی گووتنەوە گەیشتمە شارێکی چکۆلە لە تخوبەکانی گەرمیان، ئەو

هەرێمەی کە پێموابوو خاڵی بەیەکگەیشتنی دۆزەخ و بەهەشتە. گەرمیان خاکێکە تێیدا دۆزەخ و بەهەشت بە جۆرێکی سەیر لە یەکدی نزیک دەبنەوە، گەر پێوانەیەک هەبایە مرۆڤ دەیتوانی لەوێکانەدا بە ئاسانی نزیکترین دوو خاڵ بپێوێت کە تێیدا دۆزەخ لە بەهەشت نزیک دەبێتەوە. لە گەرمیاندا ئازارە جەستەییەکانی مرۆڤ، ئەو بۆن غەمەی لە خۆڵ و داروبەردی ڕێگاکان دەهات، هەموو ئاماژەبوون بۆ ئەو نزیکییە سەیرە لە دۆزەخ. بە ئاراستەیەکی تردا، ڕۆحی ساف و ئاوێنەیی مەخلوقاتەکان، نیگا ناسک و ڕۆشنەکانیان، سەیرکردنە ڕوون و بێگرێکەیان، ئەو جوانییە سەیرەی کە دژی بە ئازار دەداو لە ڕۆحەوە دەهاتەدەرێ، ئەو دڵنیاییە قووڵەی مرۆڤ لە بەرامبەر ئەواندا هەستی پێدەکرد، ئاوازێکی بەهەشتی تیا دەبزواندیت. ئەوەی خوداو سیاسەت لەو هەرێمەیان حەرامکردبوو، مرۆڤ بەدەستەکانی خۆی دروستیدەکردەوە، ئەو ئازارانەی سروشت و دەوڵەت زەمینی ئەو دەڤەرەیان پێخنکاندبوو، جووتیارەکان، کرێکارە ماندووەکان، ژنە بێکەسەکان بە ئیرادەی خۆیان هەناسەیان دەهێنایەوە بەر. من لەو گەشتە سەیرەمدا بەسەر ئەسپێکی سپییەوە لە هاوینێکی گەرمدا ڕێگام کەوتە ناو خەڵکێک کە دواتر چەندەها جاری دیش بە ناویاندا سەفەردەکەم و دەگەڕێمەوە، خەڵکێک سیمایان وەک سیمای ئەو مرۆڤانە بوو کە شەوانێکی ترسناک لە باشوور، لە قەراغی شاری سۆزانییە دڵپاکەکان بینیبوومن. ئەو مرۆڤانەی زەوی قووتیدەدان، ئەو پیاوانەی گەردەلوول جامانە خوێناوییەکانی دەبردن، من لەوێ لە ئێوارەکانی ئابدا ئەسپەکەم دەوەستان و سەیری ئاسمانم دەکرد، هەزاران لەچکی سپی و جامانەم دەبینی بە ئاسماندا دەفڕین... سەیرمدەکردو تا جێگایەک کە جێگای بەیەکگەیشتنی سنووری زەمینە لەگەڵ بەهەشت و دۆزەخدا شتی چکۆلەم دەبینی بە ئاسمانەوە مارشدەکەن. بێشکەی منداڵم دەبینی وەک بەلەمی چکۆلە بە ئاسماندا دەفڕێت، شەربەی چکۆلانەم دەبینی بۆ کۆمەڵێک تینووی نادیار لە ئاسمان

وەستابوون. نانم دەبینی کە وەک باڵندە دەفڕین. زەوی ئەو دەڤەرە لە هەندێک جێگادا وەک خوێن بدەڵێنی وەهابوو، گەر لەوێکانە مشتێک خۆڵ بگریت بەدەستەوەو بۆنیبکەیت، دڵنیابە بۆنی مەرگی لێدێت، مەرگێک کە پێدەچێت لە دێر زەمانەوە بە شتەکانەوە گرێدرابێت. گەر ورد سەیری ئاسمانیش بکەیت تێدەگەیت دڵڕەقی مانای چی، تێدەگەیت خاڵی بوونەوەی گەردون لە ڕەحمەت مانای چی، تێدەگەیت بێباکی خودا چی دەردێک بەسەر زەمیندا دەهێنێت. لەو دەڤەرەدا باڵندە سپییەکان لێم جیانەدەبوونەوە، هەستمکرد ژمارەی ئەو باڵندانە بە جۆرێکی سەیر لە زیادبووندان، لە ناکاو باڵندەکان دەبوونە هەزاران، بۆ هەر کوێ دەچووم بەدوامەوە بوون لە هەر گوندێک لام بدایە لە سەر هەموو سەربانەکان دەنیشتنەوەو دوور بە دوور چاوەدێریاندەکردم. لە گوندێکی گەرم و چکۆلەو بێئاودا ئەردەڵانی سۆفیم لە دوکانێکی چکۆلەدا دۆزییەوە، هەندێک کەلوپەلی ناچیزی دانابوو بۆ فرۆشتن، ڕوخساری زۆر پیرتر لە ناوەکەی دەینواند. کۆنە فەقێ و مەلایەک بوو کە سەردەمانێک دیانەتی بەدەرس خوێندبوو، بەڵام ئەمڕۆ پیاوێک بوو ناویان نابوو «ڕاوکەری با»، چونکە کە تاریک دادەهات، لەو پێدەشتە پڕ مەترسییانەی گەرمیاندا بە دوای ڕەشەباکانی شەودا ڕایدەکرد، ئەو بە دوای ئەو ڕۆحانەدا دەگەڕا کە لە باکاندا دەیبینین. ئەو بە منی گووت «من ڕۆحی کچەکەم لەگەڵ خۆمدا دەهێنم بۆ ئەو دادگایە، ڕۆحی کچەکەم. گەر تۆ ڕازی بیت». من وام دەزانی لاقرتێم پێدەکات، بەڵام بەڕاستی بوو. ئەو شەوانە دەچووە ڕووتەن و دەشتەکان و لە ژێر تریفەی مانگەشەوی گەرمیاندا کچەکەی لەو دیو شورایەکی نادیارەوە دەبینی لەگەڵ کۆمەڵێک منداڵی تردا یاریدەکات. کە من ئەردەڵان سۆفیم ناسی، هەستم بە نزیکییەک کرد لە نێوان خۆم و ئەودا، کە باسی ئەو شورایەی بۆ کردم کە ئەو لەمدیویەوە دەوەستێت و مردووەکان لەودیوەوە دەبینێت، وەک ئەوە بوو حیکایەتی هەمان ئەو شەوانە بۆ من بگێڕێتەوە کە من

و دالیا دەوەستاین و لە نێوجەرگەی تاریکیدا مردووەکانمان دەبینی. من باوەڕم بەو پیاوەکرد کاتێک چیرۆکی خۆی لەگەڵ ڕۆحە سەرگەردانەکاندا گێڕایەوە، کاتێک بە منی گووت، دەتوانێت مردووەکان ببینێت، دەتوانێت شەوانە کچەکەی بانگبکات و سلاو لەیەک بکەن. بە شێوەیەکی سەیر دڵنیابوو کە دەتوانێت وابکات ڕۆحی کچە بچکۆلەکەی لە دادگا ئامادەبێت. پیاوێک بوو خەڵکی وەک شێت سەیریاندەکرد، بێئەوەی ئەو ڕاستییە بچوکە بزانن کە ئەو مرۆڤێکە خاوەنی چاوێکی ترە، دەتوانێت دیوێکی تری دونیا ببینێت کە بۆ کەسانی سادە عاسی و ناگوزەر دێتە بەرچاو.

لە گەڕانەوەمدا لە پێدەشتەکانی گەرمیانەوە، لە یەکێک لە شیرینترین شارەکانی کوردستاندا، لەسەر دەریاچەیەکی چکۆلە خالق مەحمودم لە ناو ئەو ماسی فرۆشانەدا دۆزییەوە کە ماسییە تازەکانیان لە دەریاچەکە دەردەهێناو لەسەرجادە گشتییەکە دەوەستان و بە شۆفێرو ڕێبوارەکانیان دەفرۆشتەوە. زۆر گەڕام تا دۆزیمەوە، کە دەمگووت «خالق مەحمود» کەس نەیدەناسی، دواجار منداڵێک زانی من باسی کێ دەکەم و گووتی: مامۆستا تۆ باسی «خەلقە بێ کێر» دەکەیت، ملی جادە بگرەو لە ماسیگرەکان بپرسە، ئەوان نیشانتدەدەن. هەموو هاوڕێکانی بەو جۆرە بێلەزەتە بانگیاندەکرد. ئەوانەی کە شەرمیاندەکرد بەوچەشنە ناوی بهێنن ناوێکی کورتتر و پڕ نهێنیتریان بەسەریدا بڕیبوو پێیان دەگووت «بێ زەکەر». خالق مەحمود کە لەسەر تەشتێکی نایلۆنی سوور و بەدیار مێزێکی ئاسنی ژەنگاوییەوە وەستابوو، هاوڕێکانی دەیانگووت، لە زگی ماسییەکاندا بۆ زەکەری ونبووی خۆی دەگەڕێت. کوڕێکی گەنج بوو کە دوو ساڵی ڕەبەق لە ئێران پزیشکەکان گەڕابوو بە ئومێدی ئەوەی یەکێک دەرمانی بداتێ و دەعبا خۆشەویستەکەی بڕوێتەوە. دواجار پیرێژنێکی داڕوساز لەوانەی لە گژوگیای کێوی دەرماندەگرنەوە، پەیمانی دەداتێ بەرابەر پارەیەکی زۆر و مۆڵ، وای لێبکات زەکەری سەوزببێتەوە، خەلقە بۆ ئەوەی ئەو پارە

زۆرە پەیدابکات، بە تفەنگێکەوە دەچێتە رووتکردنەوەی هەندێک کاروانچی، بەوەدا دزێکی لێهاتوو شارەزا نییە هەر یەکەم شەو بە دەست دەگیرێت و دەینێرن بۆ پۆلیسخانە، لەوێ کە شەرواڵەکەی دادەکەنێت و خۆی نیشانی مفەوەزەکە دەدات، کابرا دەڵێت: وەڵا برا باشە لە داخدا هەمووومان ناکوژیت، من ئەوەم پێوە نەبێت، قافڵەی خوسرەوشاشی بۆ رووتدەکەمەوە، خوایە گیان هەزار حەمدو شوکور گەر من وەک تۆبامایە، دەبووایە تادەمرم لای خەلفە شەریف برنج و شلە بخۆم چونکە دایکی منداڵەکان هەر نان و قوزەڵقورتی دەدامێ.

کە من خالق مەحمودم بینی و باسی چیرۆکەکەم بۆکرد، گووتی: من هیچ تۆڵەیەکم لەو سەگبابە ناوێت، ئەوە نەبێت لە بندا زەکەری ببڕمەوە، دەبێت ئەو چی لە من کرد، منیش وای لێبکەم. کاتێک دڵم ئیسراحەتدەکات، یان ئەم دوابڕاوەی خۆم سەوز ببێتەوە یاخود دوابڕاوەکەی ئەو بکەم بە قولاپەوەو دەرخواردی ماسییەکانی بدەم. ئاخر مامۆستا گیان توخودا ناهەقمە؟

دڵنیابوو خالق مەحمود ئێوارەی رۆژی چواردەی شەش ئامادە دەبێت. کە بەجێم هێشت دەستیکردە ملم و گووتی: بەساقەی دڵت بم مامۆستا، من بەس ئەو کوتە گۆشتەیم دەوێت، باقییەکی بۆ خۆت.

ئەو سەردەمەی من دەستمدایە دادگاییکردنی سامیری بابلی، وڵاتی ئێمە بەرەو کۆتایی سەردەمێک دەچوو، کە دەتوانم بە کۆتایی سەردەمی پاڵەوانان ناوی بنێم. لە دوای راپەڕینەوە ئیتر وڵاتی ئێمە هیچ پاڵەوانێک بە ماناکەی جاران بەرهەمناهێنێت، نەوەیەکی تر لە قارەمانی نوێ لەدایکدەبن کە لەسەر زەوی ئیشناکەن، بەڵکو بە پێچەوانەی هەموو چاوەڕوانییەکەوە لەسەر عەموود ئیشدەکەن، هەڵبەت مەبەستم کرێکارە بەستەزمانەکانی کارەبایە، لەسەردەمێکدا شەوانە دەیان محەویلە دەتەقێتەوە، قاچاغچییەکان

هێڵەکان دەپچڕن، تەلەکان دەدزن، عەموودی نێوان شارەکان دەبڕنەوە، تاوەرەکان دەخەن، کێبڵەکان پارچەپارچەدەکەن، لەسەردەمێکی ئاوا تاریک و بێ ڕۆشناییدا، چەند تیپێکی چکۆلانەی کارەبا، بە کۆمەڵێک کەرەستەی زۆر سەرەتاییەوە، شەوو ڕۆژ لە شەڕدان لەگەڵ مافیاکانی دزین و جەردە ڕەسمییەکانی ناو بازاڕدا، لەگەڵ نەزانینی خەڵک و بێڕەحمی ئەو بەرپرسە گەمژانەی سەر فیدەرەکاندا کە بە هۆی بێئاگایی ئەوانەوە هەفتانە کرێکارێک بەسەر عەموودەکانەوە دەسووتێت. من ئێوارەیەکی فێنک «سەردار بابا کەریم» م بەسەر یەکێک لەو پەیژانەوە دۆزییەوە، کە خەتی دزراوی نێوان دوو شارۆچکەیان ڕادەکێشایەوە. کە بینیم لەسەر یەکێک لە عەموودەکانەوە عارەقی دەردابوو و جنێوی بە ژنی بەڕێوەبەری کارەبا دەدا، جنێوی بە خوشکی قایمقام دەدا، لە پوری مودیر ناحییەکەی دەبرد، سوێندی دەخوارد هەموو لەگەڵ تەل دزەکاندا شەریکن، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بە سەبرو هیمەتێکی بێوێنەوە ئیشیدەکرد، دڵی لای ئەوە بوو کە قوتابخانە کرایەوە منداڵان لەبەرچی دەرس و دەورەکەیان بخوێنن، دەیگووت کارەباکە نەبێت، خەڵکی هەژارو ڕەشوڕووتی ئەو هەرێمە، دەبێت نیوەی پارەوپولیان بدەن بە نەوت و بلوری چراو پلیتە. کە دابەزی من لێی نزیکبوومەوەو ناوی خۆمم پێگووت وایدەزانی داوای لێدەکەم خەتێکمان بۆ ببەستێتەوە، یان مەحەولەیەکی سووتاومان بۆ چاکبکات، گووتی: باوەڕت بێت لە بەیانییەوە نانم نەخواردووە، ئەوەندەی من ئەمڕۆ بەسەر ئەم عەموودانەوە بووم، خوا بەقوربانی بم، تاقەتی نییە ئەوەندە لەسەر عەرشی خۆی دانیشێت. من بە هێمنی تێمگەیاند کە من چیرۆکێکی ترم هەیە، من دەمەوێت باسی ئەو کارەساتەی لەگەڵدا بکەم کە کاتی خۆی نەقیب سامیر زوهەیر بابلی بەسەریدا هێناوە. کە وامگووت: بە خێرایی منی لە هەموو هاوڕێکانی جیاکردەوەو گووتی: نابێت هیچ شتێک بڵێیت، هیچ شتێک، تکایە با کەس نەزانێت، بزانن لە دائیرە دەرمدەکەن. من بەسەرسامییەوە گووتم: بۆ

دەرتدەکەن؟ تۆ کرێکارێکی چاپوکی، قارەمانێکی ڕاستەقینەیت، ڕاستت دەوێت، ئێوە ئێستا تاکە پاڵەوانی ڕاستەقینەی ئەم وڵاتەن، دوای ئەوە چ پەیوەندییەک لە نێوان حاڵەتەکەی تۆو کارەبادا هەیە.

بە کەمێک بێزارییەوە گووتی: خۆ من ناڵێم، عەیب نەبێت کارەباکە بەو شتەی منەوە بەستراوە، بەڵام من کچێک لەوێ داینـاوم، تێدەگەیت کچێک حەزی لێمە، دەیەوێت بیهێنم، ئێستا هەر کەسێک بەو حیکایەتە بزانێت، دەگاتەوە دەمی ئەویش و ئیتر بەس خوا دەزانێت چی ڕوودەدات. دەبێت من بوەستم تا ڕۆژێک خوا دەروویەک دەکاتەوە... ئێستا ئەو کچە بە چیرۆکەکە بزانێت، دەرمدەکەن... دوو برای بچکۆلەم هەن لە مەکتەبن، گەر من پارە پەیدا نەکەم، دەکەونە سەرجادە.

من ئارامکردەوەو گووتم: سەردار بابا کەریم، هیچ کەس نازانێت، هێندە هەیە ئێستا تۆ دەتوانێت مافی خۆت بەکاربهێنێت، دەتوانیت لە سامیری بابلی ببوریت و دەتوانێت داوای سزادانیشی بکەیت.
سەردار بابا کەریم گووتی: هاوڕێم، دەبێت بیری لێبکەمەوە، لە ڕاستیدا من ئەوەندە ماندوودەبم، ئێستا کاتی ئەوەم نەماوە بیر لەوە بکەمەوە عەیب نەبێت لە ڕووتا ئەو جووتە هێلکەیەم هەیە یان نا، لە ڕاستیدا من زۆریشم پێناخۆش نییە کە نیمە، چونکە خەڵکێکی زۆر لەم وڵاتە هەیانە و وەک ئەوەیە نەیانبێت، مامۆستا گیان ڕاستت دەوێت، عەیب نەبێت، لەم وڵاتەدا دوو شت ببن و نەبن هیچ لە هیچ ناگۆڕن، ئەو هێلکانە و عەقڵ، بە تایبەت مامۆستا ئەوانەی من.
سەیربوو من ئەو سەفەرە درێژ و پڕ ئەفسانەیەم بەو ڕستە سەیرانەی سەردار بابا کەریم تەواودەکرد. کە ماڵاواییم لە سەردار بابا کەریم کرد، ئەو لەگەڵ دوو کرێکاری تردا پەیژەیەکی ئاسنی درێژیان لە پاڵ

عەموودێکەوە دەگواستەوە بۆ بن عەموودێکی دی. من لە وەردێکی نزیکدا سوار ئەو ئەسپە سپییە دەبوومەوەو بە هەموو ڕێگادا وەک یەکێک لە دێرینترین سوارچاکەکانی ئەم دەڤەرە دەهاتم. سۆزو ئیشتیاقێکی قووڵم بۆ گێلاسی سپی هەبوو، بیری پیرێژن و پیرەمێردە ئاوارەکانم دەکرد، بیری ئەو باڵکۆنەم دەکرد کە لەوێوە شەوان سەیری تاریکی شارم دەکرد. بیری ئەو فلووتە سیحراوییەی شاروخی شاروخم دەکرد، کە لە دیوێکی نهێنی باغچەدا بۆ من و بۆ هەموو دونیا جیاوازەکان مۆسیقای لێدەدا.

شەوێکی درەنگ دەگەیشتمەوە گێلاسی سپی، دەچوومەوە ژووری. بنە مۆمێکی چکۆلانەم دەدۆزییەوە، دیاربوو دوای من هیچ مەخلوقێک نەچۆتەوە ئەو ژوورە، دۆشەک و بە تانییەکەمم ڕادەخست، نەمدەزانی چەند ڕۆژ، چەند هەفتە، چەند مانگە من بەڕێوەم؟ هەناسەیەکی دڵنیایم هەڵدەکێشا، بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا هەستمدەکرد شتێکی گەورەم کردوە، هەستێک بوو پڕ لە کامەرانی لەو هەستە سەیرانەی مرۆڤ تەنیا لە ڕێگای مۆسیقاوە تێیدا دروستدەبێت، هەستمدەکرد ڕێگای ژیانێکم هەڵبژاردووە لەگەڵ هەموو سەختییەکاندا پەشیمانی هەڵناگرێت. بێئەوەی بزانم سبەی چی چاوەڕوانمدەکات، دەخەوتم و خەوم بە دالیا سیراجەدینەوە دەبینی.

## مۆزارت و باغێکی جاویدان

لەدوای گەڕانەوەم دوو ڕۆژ نەچوومە دەرێ، هەندێجار ئەو ئارەزووە شەیتانییە لە ڕۆحمدا سەوزدەبوو کە لە شوێنی خۆم دانیشم و ڕوونەکەمە هیچ جێگایەکی دیکە، ئەو دەردە ئافەتێکی کۆن بوو کە لە شاری تەپوتۆزەکانەوە لەگەڵمدا بوو، زۆرجار حەزمدەکرد ماوەیەکی درێژ لە ژوورەکەی خۆمدا دانیشم و نەچمەدەرێ، دیارە ئێستا هەندێک دەڵێن،

یەکێک گەر خاوەنی ئارەزوویەکی وەها بێت، چۆن دەتوانێت خۆی بە ئاوارە ناوبنێت؟ لە ڕاستیدا ئاوارەیی هەندێجار ئەوە نییە ماڵت نەبێت، بەڵکو ئەوەیە نەزانێت بچیت بۆ کوێ، لە پەنجەرەکەوە سەیردەکەیت و هەستدەکەیت دەبایە تۆ لە جێگایەکی تر بایتایە، ئەوە ئاوارەییە. منیش لە باڵکۆنەکەدا دەوەستام و هەستمدەکرد نازانم بچم بۆ کوێ. لە ڕاستیدا من نە هاوڕێم هەبوو، نە کەسێکم دەناسی دەرگای ماڵی خۆیم بۆ بکاتەوە، نە جوانییەکیشم لەو شارەدا دەبینی لە شوێنەکانم نزیکبکاتەوە. سێهەم ڕۆژ، دوانیوەڕۆیەکی گەرم لە جێگاکەمدا خەوتبووم کە دەستێک بە هێمنی لە شانەوە جوڵاند می و گووتی: جەلادەت، هەستە... جەلادەت. کە چاوم هەڵبڕی مجەمەدی فیردەوسی و جەلیلی بارانم بینی. بەو نیوەڕۆ گەرمە هاتبوون بۆ ئەوەی مژدەم بدەنێ کە کارێکیان بۆ دۆزیوەتەوە. لە ڕاستیدا من زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئیشم دەکرد، ئەو شتە کەمەی بەحیسابی ئاوارانە وەرمدەگرت، بەزەحمەت بەشیدەکردم، لێتانی ناشارمەوە زۆر شەو بە برسێتی دەخەوتم. بەڵام دواجار جەلیلی باران ئیشێکی بۆ دۆزیبوومەوەو هاتبوو پێمبڵێت. کاتێک ژیانی منیان بینی، سەریان لە هەژاری و پەڕپوتی حاڵم سوڕما، کەسیان لەو باوەڕەدا نەبوون لە جێگایەکی ئاوها وێراندا بژیم. خەڵکی ئەو شارە کەسیان نەیاندەزانی ژیانی ئاوارەکان لە گێلاسی سپی چۆنە، زۆربەشیان نەیاندەویست بزانن چۆنە. بەڵام بەر لەوەی باسی ئەو کارەتان بۆ بکەم، دەبێت باسی ئەو ئێوارەیەتان لەگەڵ مجەمەدی فیردەوسی و جەلیلی بارانِدا بۆبکەم. هۆی سەرەکی سەردانەکەی مجەمەدی فیردەوسی و جەلیلی باران تەنیا ئەوە نەبوو مژدەی ئیشێکم پێبدەن، بەڵکو هەوڵێکی نزیکبوونەوەو ناسین و پشکنینی ناوەوەی من بوو. پرسیاری گەورەی ئەوان ئەوەبوو: ئاخۆ من جەلادەتی کۆترم، یان جەلادەتی کۆتر نیم؟. پرسیارێک من نەمدەتوانی وەلامیبدەمەوە. مجەمەدی فیردەوسی دەیویست دڵنیابێت من جەلادەتم

یاخود نا، چونکە گەر من جەلادەت بم، گەر ئەم پیاوە مردووە بێرۆح و بێداهێنانە کە لە ژوورێکی پیسو پۆخڵی ئوتێلی ئاوارەکاندا دەژی جەلادەتی کۆتر بێت، کەواتە هەموو تیورەکەی ئەو لەسەر هونەر، وەک بەلەمێکی بەفر ڕاست دەردەچێت. بۆچوونی سەرەکی محەمەدی فیردەوسی لەسەر هونەر ئەوەبوو کە ڕێگایەکە لە خۆوێرانکردندا دواییدێت. ئەو ڕۆژە کاتێک محەمەدی فیردەوسی دەستی بە قسەکردن کرد، ڕای وابوو من دەبێت خۆم بۆ دونیا ئاشکرابکەم، دەبێت هەموو مۆسیقارەکان بزانن من جەلادەتی کۆترم، دەبێت بە هەموو داهێنەرەکانی ئەم شارە بڵێم: تەماشابکەن، هونەر دواجار هیچ نییە جگە لە جۆرێک لە مردن و ڕیسوابوون. لە ڕاستیدا من ئارەزوویەکم نەبوو شتێکی وابکەم، باوەڕیشم بەوە نەبوو هونەر جۆرێک بێت لە جۆرەکانی خۆوێرانکردن. بە توندی هەموو ئەو تیورەیەم قبووڵ نەبوو، پێموابوو ژیانی من هونەر وای لێنەکردوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕام وابوو هونەر تاکە ڕێگای زیندووبوونەوەیە. من گووتم: هونەر ئەو کاتە وێرانماندەکات کە بە ڕێگایەکی هەڵەدا پیا دەڕوێن، کە نایدۆزینەوە، کە جەوهەرەکەی وندەکەین... کە خیانەتی لێدەکەین. من بە نیگەرانییەکی زۆرەوە دەمگووت: هونەر سەر کێشان نییە بە دیوارێکی ڕەقدا، خەڵکانێک هەن ڕێگای هونەریان بۆ نادۆزرێتەوەو خۆیان دەدەن بە دیوارە ڕەقەکاندا، پێیان وایە ئەو خۆکێشانە بە دیوارە ڕەقەکاندا ڕێگایان بۆ دەکاتەوە، هونەر ڕێگایەکی کراوەیە، تا ناکۆتا کراوەیە، بەڵام ڕۆیشتن بەو ڕێگایەدا پێویستی بە شفرەیەکی تایبەتی هەیە، هەندێک هەن هەموو ژیانیان لە خۆڕا سەرفدەکەن و ئەو شفرەیە نادۆزنەوە، خەڵکانێک هەن لە ساتێکدا ئەو شفرەیە دەدۆزنەوە و دواتر ونیدەکەن، خەڵکانێک هەن لە بەرچاوی دونیا، لە بەرچاوی خەڵکی سادە وا نیشاندەدەن کە ئەو شفرەیەیان دۆزیوەتەوە بێئەوەی هیچ شتێکیان دۆزیبێتەوە، کەسانێکیش هەن بێئاگایی کوێریاندەکات و لە کوچەیەکی تاریکدا گیردەخۆن و پێیانوایە

ئەو کوێرییە ڕوانین و دۆزینەوەیە. هەر شتێک هونەر نەبێت و مرۆڤ بە ناوی هونەرەوە پێشکەشی دونیای بکات، وەک ئەوە وایە ژەهرێک بە ناوی ئاوی زوڵاڵەوە بفرۆشێت. محەمەدی فیردەوسی ئەوە هونەر نییە کە ئێمە وێراندەکات، بەڵکو ئەو ژەهرەیە.

محەمەدی فیردەوسی وەک باڵندەیەکی برینداری لە ژوورەکەمدا دەسوڕایەوە، نەیدەزانی لە کوێدا دابنیشێت و دەیگووت: بەگم، کە مرۆڤ نەزانێت هونەر چییە دەکرێت هەموو شتێک هونەر بێت. کێشەکە ئەوەیە کە تۆ هەرگیز دڵنیانابیت ئایا ئەو شفرەیەت دۆزیوەتەوە یاخود نا... لە بەرئەوە دەمریت و نازانیت چیت کردوە. دەگەڕێیت و دەگەڕێیت بەڵام نازانیت چیت دۆزیوەتەوە... ئێمە هەموومان لە ڕاوکەرێکی کوێر دەچین کە تیرێک دەهاوین و نازانین بەرچی کەوتووە... وەک تۆ جەلادەتی کۆتر، وەک ئەو تیرەی تۆ کە هاویشتت و ئێستا هیچ مرۆڤێک نازانێت لە کوێ گیرساوەتەوە.

من بە زەردەخەنەیەکی منداڵانەوە دەمگووت: من دەزانم لە کوێ کەوتۆتەوە، لایەنیکەم دەزانم لە کوێ کەوتۆتەوە. گوێبگرە سوپاستدەکەم کە تۆ باسی ئەو ڕاوکەرەت بۆ من کرد، بەڵام هەرچی پەیوەندی بەو تیرەوە هەبێت دەبێت مرۆڤ بوەستێت و تەماشابکات، تیری ڕاوکەرە ڕاستەقینەکان دوورتر دەڕوات، تێدەگەیت دوورتر لەم جیهانە چکۆلەو ناچیزە دەڕوات، دەچێتە شوێنێکەوە پێشتر نە عەقڵ نە چاو بە جوانییەکانی ڕانەهاتوون. دەبێت بزانیت ئەو تیرە وێرانماننا‌کات، بەڵام پێویستە دوای بکەوین... ئەو هێڵە بگرین و دوای بکەوین، بۆئەوەی بگەینە ئەو شارەی کە تۆ دەڵێیت مۆسیقارەکان تیا نامرن.

محەمەدی فیردەوسی دەیگووت: نا، جەلادەتی کۆتر، ئێمە جار دوای جار تیر دەهاوین و نازانین گەیشتوە یاخود نا، تیر دەهاوین و دەوەستین،

تیر دەهاوین و دەوەستین، بەڵام هیچ دەنگێک. هیچ ئاماژەیەک لەوسەرەوە نایەتەوە. لە ساتێکدا مرۆڤ تێدەگات هەموو ئەم ئیشە پووچ و بێهودەیە، لەو کاتەدا دەزانێت تەنیا مردن لەو گەڕانە بێهودەیە ڕزگارتدەکات. هونەر خۆوێرانکردنە، چونکە لەسەریەکەوە دەبێت باوەڕمان بەوەبێت کە ئێمە لەسەفەردایین لەسەریێکیشەوە دەبێت باوەڕمان بەوەبێت کە ناگەینە هیچ.

من تۆزێک دەوەستام و دوای کەمێک تێفکرین چیرۆکێکم دروستدەکرد، چیرۆکێک کۆمەکمبکات، بۆچوونەکانی خۆم لەسەر جوانی بۆ محەمەدی فیردەوسی و جەلیلی باران ڕوونبکەمەوە، من بە ڕامانەوە دەمگووت: گوێبگرن ئازیزان، هەبوو نەبوو دوو پیاو لە شارێکی زۆر دووردا هەبوون، هەردووکیان گوڵیان دروستدەکرد و بە ژنان و پیاوانی دەوڵەمەند و زەنگین دەیانفرۆشتنەوە. یەکێکیان ڕۆژێک بڕیاریدا بچێت بە سۆراغی گوڵە دێرینەکانی خۆی، واتە کەوتە گەشتێکی بچوک بەشاردا بۆ ماڵی کڕیارە کۆنەکان، دەیویست بزانێت دوای ئەو چەند ساڵە گوڵەکانی چییان بەسەرهاتووە، ژاکاون، ماون، بە حورمەتەوە هەڵگیراون یان فەرامۆشکراو و بیرکراون؟. لە دوای تەواوبوونی گەشتەکەی بۆی دەرکەوت ئەو لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا هەرچییەکی کردوە بە هەدەر ڕۆیشتووە، گوڵەکانی ئەو لە هەر ماڵێکدا بانایە، تەپوتۆز خنکاندبوونی. کە گوڵفرۆشە بەستەزمانەکە گەڕایەوە بۆ ماڵێ، دەیزانی گوڵەکانی لە کوێ گیرساونەتەوە، دەیزانی ئەوەی ئەو دروستیکردوە هیچ نەبووە جگە لە خۆراکێکی بچوک بۆ مردن. هەر ئەو شەوە بڕیاریدا بچێت بۆ لای گوڵسازەکەی هاوڕێی تا چیرۆکەکەی بۆ بگێڕێتەوە. گوڵسازەکەی دۆستی کەمێک بە عەقڵی پێکەنی و گووتی: گرنگ ئەوەیە من گوڵی خۆم دروستبکەم و پارەی خۆم وەربگرم و بژیم، ئیدی گوڵەکان چییان بەسەردێت کاری من نییە. هاوڕێکەی ئێمە ناموراد و پڕمەراق هاتە دەرێ و دڵنیابوو ئەو چەندین ساڵە تەنیا خۆراکی بۆ بیرچوونەوە و مردن دروستکردوە. دەبووایە شتێکی جاوید بخولقێنێت،

گوڵێک مرۆڤ نەتوانێت فەرامۆشیبکات، گوڵێک نەسووتێت و نەژاکێت، گوڵێک مرۆڤ بتوانێت لە یادەوەری خۆیدا هەڵیگرێت، هەر ساتێک ویستی بۆنی پێوەبکات، نەکەوێتە دەست ئەو کەسانەی کە نایناسن. هاوڕێ غەمگینەکەمان بڕیاریدا باغێکی خەیاڵی دروستبکات، باغێک هیچ مەخلوقێک ڕێی تێنەکەوتبێت، ڕۆژێک دەرگا و پەنجەرەی گوڵسازییەکەی خۆی داخست و لەودیوەوە کەوتە دروستکردنی ئەو باغە خەیاڵییە، باغێک بوو تەنیا بە خەیاڵ، شەو و ڕۆژ لەگەڵ گەڵا و گوڵە خەیاڵییەکانیدا خەریک بوو، هێدی هێدی لەگەڵ دروستکردنی باغچە خەیاڵییەکەی خۆیدا دەڕوات، هێدی هێدی ئەو زەمین و مەودایەی باغەکەی ئەو داگیریدەکات گەورە دەبێت، تا وای لێدێت بە زەحمەت بتوانێت بە هەموو باغەکەدا سەفەربکات. ڕۆژێک لە گەشتی باغەکەیدا ڕێگای دەکەوێتە گۆشەیەکەوە، هەستدەکات ئەو گوڵانە دەستکردی خۆی نین، گوڵی قەشەنگ و بێوێنەن بەڵام خۆی دروستی نەکردوون، بەشێکن لە باغێکی تر. لەو گۆشەیەوە دەڕوات و دەڕوات پێدەخاتە سەر زەمینی کەسانی تر، پێدەخاتە ناو باغێکی بێکۆتاییەوە، باغێکی مەزن کە نەسەرەتای هەیە و نە کۆتایی. سەفەرێکی درێژ بەو باغە گەورەیەدا دەکات، کە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ناو گوڵەکانی خۆی، دەیەوێت باغچەکەی خۆی بدۆزێتەوە، نازانێت چۆن، نازانێت کوامەیە گوڵەکانی ئەو لە ناو ئەو باغە جاویدەدا، ساتێکە هەستدەکات ئەو باغە هەمووی ئەو دروستیکردوە، ئەو بەشێکە لە باغێکی گەورە کە بەشەکانی یەکتر تەواودەکەن. باغی یەک کەس نییە، بەڵکو باغێکی جاویدە کە بەر لەوەی مرۆڤ بیگاتێ، کەس نەدەزانێت هەیە و نەدەزانێت لە کوێیە.

من دەوەستام و هەناسەیەکم هەڵدەکێشا، بۆ ساتێک سەرسام دەبووم بە توانای خۆم لەسەر دروستکردنی حیکایەت، بەڵام سەرسامییەکەم تەنیا لە ئاستەنگ توانای حیکایەتخوانی خۆمدا نەبوو، بەڵکو دڵنیابووم لەوەی حەقیقەتم گووتووە، دوودڵ نەبووم لەوەی ئەو باغەی من باسیدەکەم درۆ

و ئەفسانە نییە، دەمزانی ئەو باغە هەیە، باغێکە شاعیر و مۆسیقار و شێوەکارەکان دروستیدەکەن، لە جێگایەکی دونیادایە. باغێکە مرۆڤ لەوێدا هەموو جوانییە خنکاوەکان دەدۆزێتەوە، هەموو ئەو شتانە دەدۆزێتەوە کە مرۆڤ دەکەن بە شاهید لەسەر ئەم گەردونە، لەسەر جوانییەکانی، لەسەر ناشیرینییەکانی، لەسەر خۆشییەکان و ئازارەکانیشی. من بە محەمەدی فیردەوسیم گووت: هونەر دەشێت بۆماوەیەک مرۆڤ ونبکات، دەشێت تۆ بۆماوەیەک نەزانیت چی دروستدەکەیت، دەشێت ببیت بەو گوڵسازەی تەنیا گوڵ بۆ مردن دەسازێنێ، گوڵگەلێک ناچنە ناو ئەو باغچە جاویدانەوە، هونەر تەنیا لەو ساتانەدا دەبێتە ژەهرێکی کوشندە کە دەزانیت سەنعەتی تۆ هیچ نییە جگە لە خۆڵەمێش، جگە لە غوبار و تەپوتۆز. بیهێننە پێشچاوی خۆتان گەر ئەو گوڵفرۆشە ڕێگایەکی تری تاقینەکردبایەتەوە، چی بەسەر دەهات؟ بێگومان دەمرد، بێگومان مەراقێکی گەورە دەیکوشت. ئەوکاتە گوڵ دەبوو بەو خەنجەرەی کە دڵی ئەو پیاوەی هەلاهەلادەکرد... هونەر کاتێک دەمانکوژێت کە دەبێت بەدەرگایەکی داخراو و کەچی مرۆڤ هەر سەری پیادەکێشێت.

جەلیلی باران، توند دەستی دەگرتم و دەیگووت: جەلادەتی کۆتر، تۆ هەرگیز لەو باغەدا بوویت، هەرگیز ڕۆژێک گەیشتویتەتە ئەو باغە؟

من دەستم دەخستە سەرشانی جەلیل و دەمگووت: جەلیلی ئازیز زۆرجار هەستمکردوە کە لەو باغە نزیککەوتومەتەوە، بەلام ئەو باغە شتێکە مرۆڤ بۆی ناگەڕێت، مرۆڤ ئیشی خۆی دەکات و لە ناکاو خۆی لەوێکانەدا دەدۆزێتەوە، ڕێگایەک نییە مرۆڤ نەخشەی بۆ بکێشێت و نیشانی ئەوانی تری بدات، گەڕان بەدوای ئەو باغەدا سەنعەتێک نییە مرۆڤ خەڵکی تر فێربکات، هەر مرۆڤەو بەڕێگای خۆی دەگاتە ئەو باغە، ئەو ڕێگایەی مرۆڤێک دەیگرێتە بەر بۆ گەیشتن بەو سەرزەمینە جارێکی دی دووبارە نابێتەوە.

جەلیلی باران کە چیرۆکەکەی من سەرسامیکردبوو، نیوەگێڕ دەیپرسی: بەڵام جەلادەت چۆن مرۆڤ بزانێت کە ئەو باغەی دۆزیوەتەوە.

دەستم دەخستە سەر دڵی جەلیل و دەمگووت: دەنگێک هەیە، دەنگێک لێرەوە هەڵدەقوڵێت، ئاماژەیەک هەیە، کەسانێکی تر هەن لەو باغەوە بانگتدەکەن، نامەت بۆ دەنێرن، تۆ دەبێت توانای گرتنەوەی ئاماژەکانت هەبێت، دەبێت توانای تێگەیشتنت لە ئاماژەکان هەبێت. ئەو باغە شتێکە لە ناو هەموو مۆسیقارێکی وەک تۆدا خەوتووە، دڵی تۆ ئێستا پڕە لە هاواری مۆسیقارەکانی تر کە بەرەو لای خۆیان دەتبەن... جەلیلی باران، مۆزارت و شکسپیر و فیردەوسی و گۆران و مەحوی لەو باغەدان... پەیامهێنەکانی ئەو باغە شەو و ڕۆژ بە زەویدا سەفەردەکەن، خەڵکانێکن دین و نەتەوە ناناسن، تەنیا جوانی دەناسن، جوانی و حەقیقەت.

محەمەدی فیردەوسی و جەلیلی باران ئێستا دڵنیابوون من جەلادەتی کۆترم، بەڵام من سووربووم لەسەر ئەوەی جەلادەت لە ڕێگای خۆیدا بۆ ئەو باغە مردووە، من تەنیا سێبەری ئەوم، جەستەی ئەوم، دەنگی ئەوم کە لەسەر زەمین جێماوم و چاوەڕوانی ئاماژەیەکی تایبەتیم تا بەرەو جێگایەک بجوڵێم کە نازانم کوێیە. محەمەدی فیردەوسی تیورەکەی منی بە جوان دەزانی، بەڵام پێیوابوو ئێمە هەموومان، هەموو خەڵکی ئەم شارە، هەموو مۆسیقارەکان و شاعیرەکان و نیگارکێشەکانی ئەم وڵاتە لەوانەین کە لە ڕێگادا دەکوژرێین، یەکێ شتێک هەیە لە بۆسەماندا بێت و نەهێڵێت بگەینە ئەو باغە. ئەو دەیگووت: ئێمە هەموومان دەست و قاچمان بەستراوەتەوە، چۆن بڕۆین و دەستمان پڕە لە زنجیر؟ چۆن بڕۆین و قاچمان بە کۆتەوەیە؟. کۆتی هەموو شتە ناشیرینەکان، کۆتی ئەو پیاوانەی دەتبەستنەوە بۆئەوەی نەڕۆیت، زنجیری ئەو ژنانەی ژیانت وێراندەکەن و سەرت پڕدەکەن لە خەیاڵی نەخۆش، پێوەندی ئەو سیاسیانەی ڕاتدەگرن،

پێوەندی ئەوانەی هونەرێکی نزمت لێداوادەکەن کە غەریزە بچوک و عەقڵە بچوکەکانیان پێویستی پێیەتی.

محەمەدی فیردەوسی لەسەر هەق بوو، بەلام من ڕام وابوو لە هەموو سەردەمەکانی دۆنیادا، لە هەموو شارەکاندا ڕێگایەک هەیە دەچێتەوە سەر جوانییە جاویدانەکان. من دەمگووت: جوانی دواجار لەو شەڕەدا دروستدەبێت، ڕێگای مرۆڤ بۆ ناو ئەو باغە ڕێگایەک نییە مرۆڤ تەنیا لە خەیاڵدا بیبڕێت، بەڵکو ڕێگایەکە بە ناو هەموو ژیاندا تێدەپەڕێت. ڕێگایەکە مرۆڤ بە عەقڵ و بە ویژدانی دەیدۆزێتەوە، نەوەک تەنیا بە هەستەوەرەکانی.

من دەستم دەخستە سەر دەستی محەمەدی فیردەوسی و دەمگووت: هاوڕێم، تۆ دەبێت بە ناو جەهەنەمدا بڕۆیت، گەر بە جەهەنەمدا نەڕۆیت ناگەیتە ئەو باغە، دوو جۆر باغ لە دونیادا هەن، ئەو باغانەی دێن و دەڕاکێن و با جوانییەکانیان دەبات، لەگەڵ باغێکدا گوڵەکانی لە ئازاردا سەوزبوون، گوڵەکانی بە دۆزەخدا تێپەڕیوون، بۆئەوەی بزانیت گوڵێک لە گوڵێک جیابکەیتەوە، دەست بخەرە سەر گەلاکانی و دەزانیت بە دۆزەخدا تێپەڕیوە یاخود نا. گوێبگرە محەمەدی فیردەوسی من دڵنیام مرۆڤ لەو باغەدا تەنیا پارچە مۆسیقا قەشەنگەکان نادۆزێتەوە، تەنیا شیعرە جوان و نەمرەکان نادۆزێتەوە، لە کوچەو کۆڵانەکانی ئەو باغەدا تەنیا مۆزارت و شکسپیر و گۆران نابینێتەوە، تەنیا هاوڕێ داهێنەرەکانی خۆی نابینێتەوە، بەڵکو ئەو مرۆڤانەش دەبینێتەوە کە هەڵگری ئازاری گەورەن، هەڵگری خۆزگەی کوژراون، هەڵگری خەونی گەورەن... چونکە ناکرێت مرۆڤە بریندارەکان، خۆزگە کوژراوەکان لە باغی جوانی دەربکەین... ئەو باغە تەنیا شوێنی ئەو ژیان و ئازارانە نییە کە بوون بە هونەر، بەڵکو شوێنی هەموو ئەوانەشە کە دەبایە ببن بە هونەر و نەبوون... شوێنی ئەو مۆسیقایانەیە کە لە دایک نەبوون، شوێنی پاڵەوانی ئەو چیرۆکانەیە کە

نەبوون بە پاڵەوان. باغی جوانی باغێک نییە تەنیا فیردەوسی و بیتهۆڤن و ڤان کوخی تیابژین، بەڵکو هەموو ئەو ئازارە گەورانەی مرۆڤیشی تیادەژی کە چاوی ئێمە تا ئێستا نەیبینیوە... محەمەدی فیردەوسی یەک شت هەیە دەبێت بیزانیت... یەک شت. هەر ئاواتێکی خنکاو، هەر خۆشەویستییەکی کوژراو، هەر ناکامییەکی قووڵی ئینسان چاوەڕوانە یەکێک بیکات بە هونەر... لەو باغەدا دەوەستێت و سەیرماندەکات. ئەو باغە تەنیا باغی ئەو جوانییانە نییە کە دروستمانکردون، بەڵکو باغی ئەو جوانییانەشە کە چاوەڕێماندەکەن دروستیانبکەین.

کە لە قسەکانم دەبوومەوە، نەمدەزانی ئەو چیرۆکە پێشبینییەکی ترسناکە بە پاشەڕۆژ، بەلام دڵنیابووم بۆ هەتاهەتایە دوو هاوڕێی گەورەم دەستکەوتووە... دوو کەس لەم بێکەسییەدا پێویستم پێیان بوو. محەمەدی فیردەوسی کە لە بەردەممدا دەنوشتایەوەو دەیگووت: جەلادەتی کۆتر، من نازانم تۆ چەند ڕاستیت یاخود هەڵە، بەلام پێشتر کەسێکم نەبینیوە، وەک تۆ قسەبکات. زمانی تۆ زمانی خەڵکێک نییە لەسەر ئەم ئەستێرەیە بووبێت، یان تۆ ڕۆحێکیت لە جێگایەکی ترەوە هاتوویت؟

بێئەوەی وەلامیبدەمەوە، هەناسەیەکی پڕ مەراقم هەڵدەکێشاو دەمگووت: عەزیزم، ئێستا ئەوەتا دەمبینیت، من پێویستیم بە ئێشێکە بۆئەوەی بژیم، پێویستیم بە کەسێکە دەستمبگرێت.

بەر لەوەی بڕۆن تکام تیاکردن، من بە ناوی جەلادەتی کۆتر بە کەس نەناسێنن، نا لە بەرئەوەی من ئەو نیم، بەڵکو لەبەرئەوەی بە قۆناغێکی سەیرو ئاڵۆزی ژیاندا تێدەپەڕم کە نازانم دەمگەیێنێتە کوێ. لەو ساتەدا وام هەستکرد هەردووکیان بە ئەندازەیەک ڕێزمدەگرن، هیچ داوایەکم ڕەتناکەنەوە.

* * *

ئەو ماوەیە چەندین ئیشی جۆراوجۆرم تاقیکردەوە. ماوەیەکی کەم لای مریشک فرۆشێک ئیشمکرد، دواتر بەرابەر گسکدانی حەوشی قوتابخانەیەک هەندێک پارەم پەیداکرد، ماوەیەک لەبری کوڕێکی پاسەوان کە خۆی تاقەتی ئیشی نەبوو ئیشکم گرت، هەفتەیەک لەبری هەندێک فەرمانبەر کە دەبایە لە دائیرەکان خەفەربانایە خەفەرییم کێشا... هەموو ئیشەکانم ئیشبوون لە بری خەڵکی تر، سەردەمێکی سەیربوو هەموو کەس دەیتوانی یەکێک بکاتە وەکیلی خۆی، من لەو ماوەیەدا بەوەکالەت کەناس بووم، فەراش بووم، حەسحەس بووم، فەرمانبەربووم، کرێکاری کارگە بووم، هەتا جارێکیش بۆ شەوێک بووم بە قایمقام، ئیشەکەم ئەوەبوو گەر ژنێک تەلەفوونی کرد، تۆزێک دەنگی خۆم بگۆڕم و بڵێم: وەی نەجیبە گیان بیرتدەکەم، بمبورە بمبورە، ئیجتیماعم هەیە، دواتر تەلەفوونت بۆدەکەم. دواتر دەبووایە تەلەفون بۆ قایمقام بکەم لە ماڵێکی تر و پێیبڵێم: جەناب، نەجیبەخان تەلەفوونی کرد، بەڵکو لوتف بفەرموون و تەلەفونی بۆبکەنەوە. هەڵبەت لە بری نەجیبەخان ژنێکی تر تەلەفوونیکرد، من و ئەو دوو سەعات قسەمانکرد، ژنێکی زۆر قسەخۆش بوو، دیاربوو زۆر بێتاقەتە، هەرچی نوکتە خراپەکانی ئەو بیست ساڵەی ڕابوردوو هەیە بۆی گێڕامەوە، ئەو نوکتانەی کە من ڕوومنایەت بیخەمە ئەم کتێبەوە، وەک نوکتەی ئەو ژنەی کە شتی خراپ دەکات و دوای هەموو کارێک دەنکێک فاسۆلیا دەخاتە ناو تەنەکەیەکەوە و دوایی ژنەکە نەخۆشدەکەوێت و لەسەرە مەرگدا مێردەکەی بانگدەکات و مێردەکەی دەحەپەسێت کە دەبینێت تەنەکەکە پڕبووە لە فاسۆلیا و ئیتر نازانم چی و شتی تری زۆری لەو بابەتە. ژنەکە دواجار گووتی بۆ نایەیت بۆ ماڵمان، ئێستا من کەسم لا نییە، مێردەکەم شەو نایەتەوە. دیارە ئەو وایدەزانی کە لەگەڵ قایمقامدا قسەدەکات، بەوردی پێیگووتم سەیارەکەم لە کوێدا بوەستێنم و چۆن بیوەستێنم و بە کوێدا

بـڕۆم. بـەڵام مـن بـۆ ئێستێک بیرمچـووەوە کـە قایمقامـم، گووتـم: عەزیـزم تـۆ شـێت بوویت، بابایەکی وەک من، لـە ئوتێلێکی سـووتاودا دەژیم، سـاڵێک زیاتـرە تێر زگی خـۆم نانـم نەخـواردووە، سـەیارەی چـی؟ مـن لـە هەمـوو ژیاندا پشـت سـوکانم نەبینیوە، سـەیارەم لـە کوێ بـوو؟. کە وامگووت ژنەکە بـە جۆرێکی سـەیر پەشـۆکاو گووتـی: تـۆ کێیت، کـە قایمقام نییت بۆ ئەوەنـدە بێئەخلاقیت قسـەناکەیت؟. مـن هیـچ چارەیەکـم نەمـا، گووتـم: خانـم خەتـای مـن نییـە، تـۆ ژمارەکـەت هەڵـە لێداوە، مـن کۆنـە جابـی پـاس بـووم، ئێسـتا هاوینـان شـووتی دەفرۆشـم و زسـتان لـە کۆنەکـە باڵـە هەڵدەوەشـێنم. کەوامگـووت گووتـی: گـوو بەڕیشـی باوکـت، منیـش لـە بەیانییـەوە وادەزانـم لەگـەڵ قایمقامدا قسـەدەکەم. وایگـووت و تەلەفوونەکـەی داخسـت.

ئیشـەکانی مـن هەمـووی پچڕپچـڕ بـوون، چەنـد شـەوێک یـان ئەوپەڕی هەفتەیەکیـان دەخایەنـد. بـەڵام مـن لەزەتێکی زۆرم لێدەبینـی، سـێ ڕۆژ لـە بری عەترفرۆشـێک لـە کۆگایەکدا عەتـرم فرۆشـت، دوو ڕۆژ لـە سـینەمایەکدا بلیتـم دەبـڕی و دوایـی سـەیری فلیمەکەشـم دەکـرد، ڕۆژێـک لـە بـری پاقلەفرۆشـێک پاڵـم بـە عەرەبانـەی پاقلـەوە نـا، سـێ شـەو لـە بـری پۆلیسـێکی نەخۆشـی هاتۆچـۆ لـە فولکەیەکـی چـۆڵ و هۆڵـدا وەسـتام، ڕۆژێـک لای جگەرچییـەک پیـاز و تەماتـەم دەجنـی، سـێ ڕۆژ لەگـەڵ بازرگانێکی دۆلاردا دوو عەلاگـەی ڕەشـم هەڵدەگـرت و لـە پێشـییەوە دەڕۆیشـتم، عەلاگـەکان پڕبـوون لەسـەفتە وەرەقـەی سـپی، کابـرا دەیویسـت بزانێـت ئاخـۆ دوژمنـی هەیـە و کـەس بۆپارەکـە تەقەمـان لێدەکات. دیاربـوو ئیشـێکی زۆر خەتـەرە، چونکـە گـەر یەکێـک تەقـەی لێبکردبامایـە، مـن بـە کۆمەڵێـک وەرەقـەی سـپییەوە بـە خۆڕا دەکوژرام. لـە مـاوەی دوو مانگدا زۆربـەی ئـەو ئیشـانەم تاقیکردەوە کـە لـەو وڵاتـەدا هەیـە، هەتـا ڕۆژێکیـش لـە شـانۆگەرییەکدا چوومـە سـەر سـەحنەو لەبری کۆمبارسـێکی نەخۆش کـە نەهاتبوو دەورێکی بچوکم بینـی، دەورێکی بێمانـا بـوو دەبایـە ڕووبکەمـە بینـەران و بڵێـم: ئێوە دەڵێن چـی؟ ئاخـۆ فەرهـاد

دەگەڕێتەوە بۆلای شیرین؟ شانۆگەرییەکی هێند خراپ بوو دوای ئەوە سێ ڕۆژ نەخۆش کەوتم. کەچی هەموو ڕۆژێک لە کۆتاییدا خەڵک هەڵدەستان و چارەکێک چەپڵەیان لێدەدا.

هەر جارێک لە ئیش دەهاتمەوە دالیا سیراجەدینم لەسەر قادرمەکانی گێلاسی سپی دەبینی، وەک کچێک لە خۆشەویستییەکی بێهودە ڕابکات، هەمیشە لە من ڕایدەکرد. من زۆرجار لەسەر پلیکانەکان دەوەستام و دەگریام و دەمگووت: دالیا سیراجەدین بەجێم مەهێڵە. وەک باران فرمێسک لە چاوم دەهاتەخوارێ و دەمگووت: دالیا، مەڕۆ. وای لێهاتبوو زۆربەی خەڵک ناوی منیان نابوو «ئەو پیاوەی لەسەر قادرمەکان دەگری». لەو ماوەیەدا سامیری بابلی چەندەها جار هات بۆلام، ژیانێکی ئاسوودە و بەختیاری لەگەڵ شاناز سەلیمدا دەبردەسەر. شاناز بە هۆی پەیوەندییەکانی خۆیەوە کۆمەڵێک هاوڕێی زۆری بۆ سامیری بابلی دروستکردبوو، لە ماوەیەکی کورتدا سامیر توانیبووی ببێت بە هاوڕێی هەندێک لەسەرکردەکان، دۆستی لە هەموو حیزبەکان پەیداکردبوو، ڕۆژێک بە منی گووت: جەلادەتی کۆتر گەر تۆ ئازادتکردم، حیزبێک دروستدەکەم و دژی دیکتاتۆر خەباتدەکەم، دەگەڕێمەوە بۆ باشوور، ڕێکخراوێکی نهێنی دروستدەکەم و دەمبینی دەتوانم گورزی کوشندە لە دیکتاتۆر بوەشێنم.

من زۆر بە جیدییەتەوە گووتم: سامیری بابلی ئەم وڵاتە بە کەسانی وەک تۆ ناگۆڕێت، تکات تیا دەکەم، بیر لەوە مەکەرەوە ئێوە دیکتاتۆر بڕوخێنن، تکات تیا دەکەم... من ئازادتبکەم یان نا، واز لە پاشەڕۆژ بهێنن، ئێوە دەست لە پاشەڕۆژ مەدەن.

سامیری بابلی بە غەمگینییەوە دەیگووت: پاشەڕۆژ موڵکی هەموومانە، ئەی منداڵی نەجیب، پاشەڕۆژ موڵکی هەر هەموومانە.

من دەمگووت: پرتەقاڵی بابلی، نازانم پاشەڕۆژ موڵکی کێیە، نازانم،

بەڵام تکاتان تیا دەکەم، واز لە پاشەڕۆژ بهێنن، چونکە گەر واز لە پاشەڕۆژ نەهێنن کەس نازانێت ئەم وڵاتە چی بەسەردێت.

سامیری بابلی زۆرجار بە دڵێکی شکاوەوە لای من دەڕۆیشت، دڵنیابووم شاناز سەلیم پێیدەڵێت، خۆی لە من دووربخاتەوە. دیاربوو سامیری بابلی گەر بیەوێت دەتوانێت بە ئاسانی من لە ناو ببات، من چۆلەکەیەکی بێدیفاع بووم، هیچ بوونەوەرێک نەبوو لەم دونیایەدا لە من لاوازتر، هەتا ئاوارەکانی تر لە من پشت و پەنایان زیاتر بوو، من دەمزانی قسەکانی حەلیم شێواز هەمووی ڕاستە، من مەخلوقێک بووم دەجار لە دۆنکیشۆت گەمژەتر. بەڵام دڵنیابووم سامیری بابلی شتی واناکات، بابلی دڵنیابوو دەبێت بەم ڕێگایەدا بڕوات، ئەم ڕێگایە تەنها ڕێگا و دوا ڕێگای ئەوبوو، دڵنیابوو کە دیلە و ئازادبوونیشی ئاسان نییە. من هەموو شتێکم بە سامیری بابلی گووت، باسی سەفەرە دوورودرێژەکەی خۆمم کرد، باسی ئەو ئەسپە سپییەم کرد کە منی بە کوردستاندا گێڕا. چەندەها جار لە کاتی گێڕانەوەی چیرۆکەکاندا پێمگووت: تۆ جانەوەرێکی بێویژدانی کە شایستەی مردنیت. پێمگووت: هیچ هێزێک نییە دڕندەی وەک تۆ پاکبکاتەوە. بەڵام بابلی سەری دادەنەواند و هیچی نەدەگووت.

من ئەو ماوەیە بڕیارمدا خۆم کەمێک لە پرتەقاڵی بابلی دووربخەمەوە، نەمدەویست دۆستایەتیم بۆ ئەو کارێکی لەسەر ڕەوشی دادگاییەکە هەبێت، کە لای من دەرگای هەرە گەورەی پاشەڕۆژ و مانای هەرە باڵای ژیانم بوو.

ئەوکات هێشتا نەمدەزانی ئاخۆ بیروبۆچوونەکانم لەسەر هونەر چەند کاریگەریان لەسەر محەمەدی فیردەوسی جێهێشتووە، ئێوارەیەک منیان داوەتکرد بۆ باغە چکۆلەکەی خۆیان، هەموو مۆسیقارەکانی تیپی «بەلەمی بەفر» لەوێ بوون. چیمەنێکی سەوز و چکۆلانەبوو کۆمەڵێک کورسی تێدا دانرابوو، ماڵێک بوو لە ناوەڕاستی شاردا، لە

ناو پێچاوپێچی بازاڕ و قەیسەرییەکاندا، لە هەر چوارلاوە بە کۆڵانی تەسک و گوزەری پێچاوپێچ ئابلۆقەدرابوو. دیاربوو بەبێ ناونیشان هەتا باڵندەش ناتوانێت ڕێگای بکەوێتە ئەو چیمەنەوە کە لە باغێکی ئەفسانەیی داخراو دەچوو. محەمەدی فیردەوسی بە خۆی و ئەو ڕیشە زەرد و برۆ ڕەشانەوە پێشوازیکردم، ئاسەواری ئەو چەقۆیەی سەر ڕووی، بە جۆرێکی سەیر خوێناوی و تازە دەینواند. مۆسیقارەکان وەک ئەوەی یەکدی ناسینی پێشوویان یادچووبێتەوە، بە هێمنی و شەرمەوە تەوقەیان لەگەڵدا کردمەوە. بە خۆیان و ئامێرەکانی دەستیانەوە لە تیپێک دەچوون لەسەر سەحنە چاوەڕوانی دەرکەوتنی گورانیبێژێک بکەن. کە هەموومان دانیشتین محەمەدی فیردەوسی دانیشتنەکەی بەوجۆرە کردەوە کە ئەمە کۆبوونەوەیەکە بۆ ئەوەی هەر یەکە و لەسەر ئەزموونی خۆی قسەبکات. دیاربوو ڕێکەوتوون مانگانە دانیشتنێکی لەوجۆرە بکەن، من نەمدەزانی بۆ داوەتکراوم. سەرەتا مۆسیقارەکان بە باسی خۆیان دەستیان پێکرد. زۆربەیان گومان هێنابوونی بۆ ناو ئەم تیپە، ئەو بڕوایەی کە دەرەوە هونەری لێ نییە. ئەو شارە لای ئەوان چاڵێکی قووڵ بوو، خودا ئەوانی بۆ سزا فڕێدابووە ئەو شوێنەوە، ئەوێ نیشتیمانی مۆسیقای ناڕێک و شیعری دزێو و سیاسەتمەداری دڵڕەق و هونەرمەندانی بێبەهرە بوو. نیشتیمانی ڕەشەبا و تەپوتۆز. هەموو بەو ڕاچەنینە سەیرەدا تێپەڕیبوون، هەموو باوەڕیان وابوو کە ساتێک لە ساتەکان نیشانە و ئاماژەیەکیان بینیوە و پێیگووتوون کە دەبێت ڕێگایەکی تر بگرنەبەر. بەڵام پێیان وابوو خودی ئەم شارە شوێنێکی نەفرەت لێکراوە کە تا هەتاهەتایە دوور لە جوانی و لەزەتبردن لە مۆسیقای ڕاستەقینە دەژی، ڕایان وابوو کە گەورەترین سزایەک خودا نەتەوەیەکی پێ سزا بدات ئەوەیە لە مۆسیقا و هونەری مەزن مەحرومیاندەکات، خەڵکێک دەکات بە ڕابەر و ڕێنیشاندەریان کە هیچ شتێک لە جوانی و مۆسیقا نازانن. «ئاریانی مانی» کە کوڕێکی

ڕەشتاڵەی دڵتەنگ بوو، بە نیگایەکی غەمگینەوە گووتی: گەورەترین کارەسات تووشی میللەتێک ببێت ئەوە نییە خاکەکەی داگیربکرێت، ئەوەیە سەرۆکەکانی گوێیان لە مۆزارت نەگرتبێت. ئەو ڕستەیەی ئاریانی مانی هەموو گفتوگۆکەی بەرەو ئەو ئاڕاستەیە ڕاکێشا کە هەموو بەشداربووان بپرسن: گەورەترین کارەسات چییە میللەتێک تووشی ببێت؟. من گووتم: هاوڕێیان چەندە کارەساتە سیاسەتمەدارە زۆر بەڕێزەکانی ئێمە، کە دیارە خەڵکێکی زۆر حورمەتیان بۆیان هەیە، بەڵام من خۆشبەختانە لەو کەسانە نیم، من ژیان فێریکردوم تەنیا حورمەتی ئەو شتانە بگرم کە بەڕاستی جاوید و ناکۆتان و پەیوەندییان بە هەست و نەستە زۆر بەرزەکانەوە هەیە، چەند کارەساتە دوژمنەکەت گوێ لە مۆزارت نەگرێت، ئەوەندەش کارەساتە ئەوەی ڕزگارتدەکات گوێ لە مۆزارت نەگرێت... وانییە بەڕێزینە... من گومانم لەم ڕاستییە نییە، بەڵام دواجار کارەساتی هەرە گەورەی میللەتێک ئەوەیە کە سنووری ڕاستەقینەی نێوان کاری بچوک و کاری مەزن نەمێنێت... ها عەزیزان من ڕاشکاوانە پێتان دەڵێم کارەساتی هەرە گەورەی میللەتێک ئەوە نییە ئاخۆ جەنابی سەرۆک گوێ لە مۆزارت دەگرێت یان نا، بە جەهەنەم جەنابی سەرۆک گوێ لە مۆزارت ناگرێت، حیمایەکانی گوێ لە مۆزارت ناگرن، مەکتەبی سیاسییەکەی بە دیار مۆزارتەوە ناگرین. کارەساتی لەوە گەورەتر ئەوەیە کە لە نێوان مۆزارت و ئەو مۆسیقارە بێبەهرە و بچوکانەدا جیاوازییەک نەمێنێت، کاتێک شار گوێی بە مۆسیقای دزێو قاندەدرێت هەستی ڕاستەقینەی مۆسیقا وندەکات، کاتێک مۆسیقارە بچوک و بێبەهرەکان خۆیان لێدەبێت بە مۆزارت. کاتێک هەموو مرۆڤە بێبەهرە و بچوکەکان هاوپەیمانییەتێک دروستدەکەن. برایان کێشەکەی ئێمە ئەوە نییە کە سەرۆک گوێ لە مۆزرات ناگرێت، بەڵکو ئەوەیە ئێمە لە شارێکداین گەر مۆزارتیشی لێبێت، نە خۆی نە هیچ کەسی دیکە نازانێت کە مۆزارتە... گەر مۆزارتیشی لێبێت دەکەوێتە ناو بەرداشێکەوە لەوسەرەوە

وەک مرۆڤێک لـە خـۆڵ و خاشـاک دێتـەدەرێ.

محەمـەدی فیردەوسـی جگەرەیەکـی درێـژی بەدەسـتەوە بـوو، دەسـتی بەرزکـردەوەو گووتـی: نازانـم کاک جـەلادەت چـۆن لەمـە تێبگـەم، ئێمـە شـارێکمان هەیـە هونەرکـوژ، چـۆن لـە شـوێنێکی وەک ئـەم شـارەوە مـرۆڤ دەکات بـە جاویـدان..

مـن دەمزانـی محەمـەدی فیردەوسـی جارێکـی دی دەیەوێـت مـن بـەرەو ئەو جوغـزە ڕاکێشـێت، هونـەر وەک ڕێگای مـردن وێنابکـەم، بـەلام بەبـێ وەسـتان گووتـم: با وادابنێیـن مـۆزارت دێـت بۆ ئـەم شـارە، وا دابنێین کە چاوسـاغەکانی سـەرۆک کەسـیان مـۆزارت ناناسـن و لـە بـری ئـەم بلیمەتـە بەدبەختـە مۆسـیقارێکی ئیفلیـج و بێبەهـرە دەگـرن و دەیبـەن بـۆ لای سـەرۆک و دەڵێن «جەنابـی سـەرۆک ئەمـە مۆزارتـە»، وادابنێیـن کـە ئـەوان ئـەو پیاوە ئیفلیجـە بـە نـاوی مۆزارتـەوە پێشکەشـی خەڵـک دەکـەن، وادابنێیـن سـەدان کۆدەبنەوەو چەپڵـە بـۆ ئـەو مۆزارتـە درۆزنـە لێدەدەن، وادابنـێ کـە ڕۆژنامەنوسـە ئیفلیـج و بێبەهرەکانـی دەڤـەری ئێمـە کـە بێبەهرەتریـن خەڵکی سـەر ئـەم ئەسـتێرەیەن، ئەوەیـان لێدەبێتـە ڕاسـت. واشـدابنێ مۆسـیقارو نوسـەرو شـاعیرە دووڕوو و درۆزنـەکان هەمـوو گەمەکـە تـا کۆتایـی بـە بێدەنـگ دەبـەن بەڕێـوە، کەسـیان غیرەتـی ئەوەیـان نییـە لـە شـوێنی خۆیـان هەسـتن و بڵێن ئەمـە مـۆزارت نییـە و تـڕی کەریـش نییـە.

لـەو کاتـەدا جەلیلـی بـاران دەنگـی بەرزکـردەوەو گووتـی: وادابنـێ، وادابنێی چـی؟ ئـەوە حەقیقەتـە، ئێمـە ڕۆژانـە ئـەوە دەژیـن، ڕۆژانـە نمونەکانیـان دەبینین.

مـن دەسـتم بەرزکـردەوە و گووتـم: بمبـورە زۆر بەڕێـز جەلیلـی بـاران... بمبـورە، باقسـەکەم تەواوبکـەم... پرسـیارەکەی مـن ئەوەیـە ئاخـۆ مۆزارتـی ڕاسـتەقینە چـی بـکات؟ لـەم حاڵەتـەدا کـە تـۆ شـارێکت هەیـە ناتوانێـت داهێنەرێـک و دەجاڵێـک لەیەکتـر جیابکاتـەوە، چـی ڕوودەدات؟ چـاری مۆزارتـی بەسـتەزمان چییـە کـە بێچـارە دەبێـت بـە شـەقامەکاندا بسـوڕێتەوەو هەمـوو

ئازاری درۆکە بچێژێت... گەر بچێتە ناوەڕاستی شەقامەکان و هاواربکات من مۆزارتی ڕاستەقینەم کەس گوێی لێدەگرێت؟ ها... برایان کەس گوێی لێدەگرێت، بێگومان نا... گەر ئالەتەکەی هەڵگرێت و بەشەقامەکاندا بسوڕێتەوە و عەزفبکات، کەس دەزانێت کە ئەم بەڕێزە کاک مۆزارتە، بێگومان نا، چونکە دواجار شارێکە گوێچکەکانی بووە بە بەرد. من پێموایە مۆزارتی ڕاستەقینە نە غەم دەخوات، نە قەهری دەبێت، چونکە ئاوازی نەمر ڕێسایەکی تری هەیە، ڕێگایەکی تری هەیە، بە شوێنێکی تردا دەڕوات، بەڕێز محەمەدی فیردەوسی هیچ پارچەیەک مۆسیقا ناگەڕێتەوە بۆ لای پاشاو حاکمەکان، ناگەڕێتەوە بۆ لای بەڕیوەبەری ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان ڕوخسەتیان لێوەرگرێت بۆئەوەی نەمری بەدەستبهێنێت، ئەو بەڕێوەبەرانەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن کە جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ قەشەی دەمارگیری زەمانی دادگاکانی تەفتیشدا، مۆزارتی هاوڕێمان ناچێت بۆلای ئەو ڕۆژنامەنوسە بێویژدان و کوێرانەی لە فەسیلی تیربارانکردنی جوانی دەچن. مۆسیقا پێویستی بە پاشاکان و نۆکەرەکانیان نییە بۆئەوەی نەمربێت... مۆزارت پێویستی بە هیچ یەکێک لەوان نییە بۆئەوەی بژی. جاویدانەگی لەسەری نەفامەکانەوە دەست پێناکات، بەڵکو لەسەری ئەواندا دەمرێت. مۆزارت بە بێدەنگ وەک فەرهادێکی زامدار ئیشدەکات... ئیشدەکات، خوێنی خۆی دەکات بە ئاواز، چونکە جگە لەوە ڕێگایەکی تری نییە. مۆزارت دەزانێت کوڕی باغێکی جاویدانە، کوڕی مەملەکەتێکی ترە، برای ئەو ڕۆحانەیە کە مۆسیقا لە ئەبەدییەتدا پێکەوە گرێیداون. مۆزارت بەلایەوە گرنگ نییە پادشاکان چی دەڵێن، بەلایەوە گرنگ نییە ئەمڕۆ قەبیلەی ڕۆژنامەنوس و نوسەرە درۆزنەکان لەسەر سەحنە چەپڵە بۆ کێ لێدەدەن، ئەوەی بەلاوە گرنگە کارێک بکات، لەسەردەمێکی تردا، لە جیهانێکی تردا، لە شارێکی تردا سەدای ئێمە بەرێت بەرەو ئەبەدییەت و دەنگی ئەبەدییەت بهێنێتەوە بۆ ئێمە.

یەکێک لە مۆسیقارەکان دەنگی بەرزکردەوەو پێیبڕیم و بە گومانەوە گووتی: بەڕێز، کەواتە تۆ پێتوایە مۆسیقا پەیوەندی بە خەڵکەوە نییە.

دەرفەتێکی باش بوو بۆئەوەی جارێکی تر دەنگ بەرزبکەمەوە و بۆچوونەکانی خۆم بڵێم و گووتم: ئازیزی من، شارێک کە گۆڕستانی مۆسیقایە، کە گۆڕستانی شیعرە، کە گۆڕستانی جوانییە، گۆڕستانی مرۆڤیشە. مۆسیقا هیچ نییە جگە لە دەنگی ڕەهای مرۆڤ، دەنگی مرۆڤ بەو جۆرەی کە لەسەروو زمان و سەروو زەمان و سەروو شوێنەوەیە، بەڵام مرۆڤێک نا کە ئازارەکانی خۆی بیرچۆتەوە، تراژیدیاکانی خۆی بیرچۆتەوە. خەڵک... بەڕێز تۆ مەبەستت چییە لە خەڵک، ها... من حورمەتم هەیە، ڕێزی هەموو بۆچوونێک دەگرم، بەڵام ئینسان لە تێکەڵاوبوونی دوو هێزی گەورە دروستبووە، هێزی جوانی و هێزی ئازار... بەڵام گەر مەبەستت لە خەڵک ئەو کەسانەیە کە لە جوانی و ئازار تێناگەن ئەوا مۆسیقا کارێکی بەوانەوە نییە.

گفتوگۆیەکی سەیربوو، مۆسیقارەکان هەموو ڕایان وابوو بەوەدا مرۆڤ داوای شتێکی ئەستەم لە مۆسیقا دەکات، هەرگیز ناگاتە ئەنجام... پرسیارو گومانەکانی ئەوان، هەمان پرسیارو گومانە دێرینەکانی خۆم بوون سەردەمێک کە هێشتا قوتابییەکی ناکامڵ بووم. هەموویان بە شێوەیەکی سەیر لە ژێر کاریگەری محەمەدی فیردەوسیدا بوون. ئەویش هونەر و مردنی وەک یەک تەماشادەکرد. مۆسیقارەکان لەو جێگایەدا خۆیان وانیشاندەدا کە خۆیان لە جۆرە هونەرێکی پیس دەپارێزن، کە دەترسن دواجار مانای هونەر لە بەر دیدەیان بشێوێنێت. بەڵام ئەو ترسەیان بووبوو بە ترس لە هەموو دونیا، بووبوو بە زیندانێک کە چەندەها دیواری بۆ دروستکردبوون. من لە کۆتایی دانیشتنەکەدا هەستی ئەوەم هەبوو ئەوان لە زینداندان، مۆسیقایان کردبووە بەندیخانەیەکی ترسناک،

پیانوابوو مۆسیقای جوان تەنیا لە نائومێدیدا تەواودەبێت.
من ئەو ڕۆژە بە غەمگینی گەڕامەوە بۆ گێلاسی سپی، هەستمکرد لە نێوان من و مۆسیقارەکانی بەلەمی بەفردا شتێکی ئەوتۆ دروست نابێت ببێتە کۆمەکێکی ڕۆحی گەورە، من بەرەو مۆسیقا ڕابکێشێتەوە. دڵتەنگ بووم کە ئەو هەموو نائومێدییەم دەبینی، بەڵام دڵنیابووم ڕۆژێک دێت من لەگەڵ ئەو تیپەدا بەختەوەر دەبم... دڵنیابووم.

* * *

ڕۆژێکیان خۆم و باڵندەکانم بە ناو یەکێک لە قەیسەرییەکاندا تێدەپەڕین. بازاڕ هێند جەنجاڵ بوو بە دەگمەن مرۆڤ بیتوانیبایە چەند مەترێک ئەولای خۆی ببینێت، من بەختەوەر و بێباک بە ناو بازاڕدا دەڕۆیشتم و سەیری دەموچاوی ئادەمیزادەکانم دەکرد. تاکە لەزەتێک پیاوێکی بێئیش و بێ پارە بتوانێت بیچێژێت، سەیرکردنی دەموچاوی خەڵکی ترە، منیش دەمویست تا ئەندازەیەکی زۆر سوود لەو لەزەتە خۆڕاییە وەربگرم. لە گەرمەی خۆبیرکردن و خەیاڵاتدا بووم دەرهەق بەو سەروسیمایانەی دەمبینین، یەکێک لە کتێبفرۆشییەکی نزیکەوە بانگی لێکردم «کاک جەلادەت، کاک جەلادەت فەرموو فەرموو بالە خزمەتدا بین». لە ڕاستیدا من نەمزانی کێ بانگمدەکات... چوومە کتێبخانەکە و چاوم گێڕا هیچ کەسم نەبینی، بەو هەموو باڵندانەوە سەخت بوو ماوەیەکی درێژ لە کتێبفرۆشییەکدا بمێنمەوە هەتا ئەگەر ئەو باڵندانە نەشبینرێن و کەسیش هەستیان پێنەکات. لە پشتەوە پیاوێکی زۆر قەڵەو خەریکی تەماشاکردنی هەندێک گۆڤار و ڕۆژنامە بوو. یەکەمجارم بوو بە خۆم و باڵندەکانمەوە بچمە ناو کتێبفرۆشییەکی ئاوهاوە، بۆئەوەی هەموو میوانەکانی کتێبخانەکە گوێیان لێبێت، بە دەنگی بەرز لە خاوەنەکەیم پرسی: بەڕێز یەکێک لێرەوە منی بانگکرد، نازانیت

کێ بووە؟ کە وام گووت پیاوە قەڵەوەکە سەرسامانە سەری بەرزکردەوە و سەیری سەقفی کتێبفرۆشییەکەی کردو و گووتی: خودای گەورە، ئەم هەموو باڵندەیە چییە؟ خۆی بوو «مستەفای شەونم» بوو. خەڵکانی دەوروبەرمان هەمَوو ئاوڕیاندایەوە و سەیری سەقفەکەیان کرد و هیچیان نەبینی. مستەفای شەونم کە پێدەچوو بینینی من و باڵندەکان تەنگەنەفەسیان کردبێت، بەسەرسامییەوە سەیری فڕینی خێراو بێسرەوتی مەلە شێت و وێتەکانی منی کردو گووتی: جەلادەت ئیسماعیل... جەلادەت ئیسماعیل. ئەو باڵندانە لێرە ببەرە دەرێ و بابڕۆین. من چاوەڕوانمدەکردیت، دوو ڕۆژە چاوەڕوانتدەکەم.

باڵندەکانی من هەراوزەنایەکی بێسەروبەریان لە ناو کتێبفرۆشییەکەدا دروستکردبوو.

من هەر ڕوخساری ئەو پیاوەم بینی زانیم مستەفای شەونمە.

پیاوێکی قەڵەو بە تیشێرتێکی هاوێنەی سپییەوە، مووە سپییەکانی بە چڕییەکی زۆر لە ملوانی تیشێرتەکەوە هاتبوونە دەرێ، چاکەتێکی ڕەشی ئەستووری لەبەردابوو، کە بە جۆرێکی نائاسایی دوو سێ ڕیز قۆپچەی لە چاکەتی ئاسایی زیاتر بوو، چاکەتەکەی وەک پاڵتۆی دەریاوانە ڕوسەکان تا سەرەوە داخرابوو، بەلام بەوەدا یەخەیەکی کراوەی هەبوو نەیتوانی بوو ملوانی تیشێرتەکەی داپۆشێ، قژێکی ڕەش و درێژی هەبوو، دەموچاوێکی پفکردووی سوور بە جووتێک چاوی کاڵ و زۆر گەورەوە. بەلام لە یەکەم نیگاوە دیاربوو ترسێک و شەرمێک لە ڕوخسارییەتی، کە پێموایە سیفەتی زۆربەی ئەو پیاوە قەڵەوانەن کە هەموو ژیانیان لە هەوڵی ئەوەدان بە جۆرە جل و بەرگێکی تایبەت ئەو گۆشتە زیادە داپۆشن کە داناپۆشرێت. کە پێدەکەنی بە جۆرێکی سەیر دەگەشایەوە و خوێن دەزایە سەر کوڵمەکانی، کە پەستیش دەبوو غەمێکی قووڵ قووڵ دەکەوتە سەر ڕوخساری کە ئەستەمە مرۆڤ بە وشە وەسفیبکات. پانتۆڵێکی ڕەشی

لـە بەردابـوو، جووتێـک پێـڵاوی بۆیاخکـراوی ڕەش کـە بـە جۆرێکـی سـەیر دەبریسـکانەوە، ڕۆژنامەیەکـی لـە بندەسـتدا بـوو. کـە گەیشـتینە دەرەوەی کتێبفرۆشـییەکە گووتـی: دەمزانـی لێرەدا یەکتـر دەبینینـەوە، دەمزانـی.

بـۆن کۆلۆنیایەکـی زۆر تیـژی لێدەهـات، هەسـتتدەکرد ئێسـتا لـە ڕیش تاشـین و خۆشـتن تەواوبـووە. دەسـتی منـی گـرت و گووتـی: هـەژدە سـاڵ لـە مەوبـەر هـاوڕێ قودسـیم لێرەدا بینییـەوە، هـەر وەک تـۆ وەهـا بـوو، بـە باڵندەکانییـەوە خـۆی کـرد بـەم کتێبفرۆشـییەدا و گووتـی یەکێـک بانگیکـردوم، وەک تـۆ دەنگـی بەرزکـردەوە و گووتـی: بەڕێـزان یەکێـک لێرەوە منی بانگکرد. مـن دەمزانـی هەمـان شـت دووبارەدەبێتـەوە.

لەگـەڵ قەڵەویەکەشـیدا بـە خێرایـی دەڕۆی، منـی داوەتـی چێشـتخانەیەک کـردو گووتـی: لەسـەر نانخـواردن قسـەدەکەین. منـی بـرد بـۆ چێشـتخانەیەک لە چێشـتخانە پیسـو پۆخڵەکانـی نـاو شـار. مسـتەفای شـەونم دەیگـووت، سـەیری کورسـی و مێـزە ژەنگاویەکـەی مەکـە، سـەیری چڵکاوی سـەر ئەرزەکـە مەکـە، چـاوت بنوقێنـە و تامـی برنجەکـەی بکـە. مـن کابرایـەک نەبـووم زۆر خواردنـم بـۆ گرنـگ بێـت. بـە درێژایـی ژیانیشـم زۆر لـە نەدارییـدا نەبوومایـە بـە زەحمەت قەبوولمدەکـرد یەکێـک شـتێکم بـۆ بکڕێـت، لـەدوای پـازدە سـاڵیمەوە تاکـە کەسـێک کۆمەکـم لـێ قەبوولکردبـوو، ئەسـتێرە ون و نادیارەکـەی ژیانـم «دالیا سـیراجەدین» بـوو، لەبەرئـەوە بـە ئەدەبـەوە گووتـم: سـوپاس مـن برسـیم نییە، پاشـان بەڕێـز مـن بـە دەگمـەن نانـی دەرەوەش دەخـۆم. مسـتەفای شـەونم بـە حورمەتـەوە وازی لێهێنـام و گووتـی: مـن بەیانیـش نانـم نەخـواردووە، ئایـا دەتوانـم مـن نـان بخـۆم و قسـەبکەین؟ پیاوێـک بـوو لەوانـەی لەسـەر نانخـواردن زۆر حەزیـان لـە قسـەکردنە. مـن ئەوجـۆرە ئەخلاقـەم تەنیـا لـە نێـو پیـاوە قەڵەوەکانـدا بینیبـوو، بـەر لـەوەی بەرابـەرم دانیشـێت و دەسـتبکاتە خـواردن، جـۆرە نیگارێکـم لـە خەیاڵـی خۆمـدا بۆکێشـابوو، بـەڵام هـەر دانیشـت تـەواوی سـەیرکردنەکانم بـۆی گـۆڕا. نـا لـەو پیـاوە قەڵەوانـە نەبـوو کـە بـە

جۆرێکی نارێک و شپرزه دەخۆن، بەڵکو لە شوێنێکی تایبەتیدا دانیشت و بە پێچەوانەی زۆر لە کڕیارەکانی ترەوە خزمەتچییەکان بێوێنە حورمەتیان لێگرت. من وامدەزانی ئەو پیاوانەی کە زۆر بە پەلە بە ڕێگادا دەڕۆن زۆر بە پەلەش نان دەخۆن، بەڵام مستەفای شەونم وانەبوو، زۆر لەسەرەخۆ نانی دەخوارد، هەندێجار چاوی دەنوقاند و لەزەتێکی زۆری لە تامی خواردنەکە دەبینی. من نەمدەزانی منی بۆچییە. سەرەتا گووتی: بمبورە ئەو شەوە بەوجۆرە بەجێمهێشتی. من لێت ناشارمەوە پیاوێکی ترسنۆکم... من زۆر لە یادگارە ناخۆشەکان دەترسم. زۆرجار وا بەخەڵکی دەڵێم. بەڵام زۆربەیان باوەڕیان وایە لە بەرئەوەی من قەڵەوم ئیدی یادگاری تاڵ و ناخۆشم نییە. بەڵام ئەو شەوەی کە لەسەر بەستەکە بەجێمهێشتی و ڕۆیشتم لە یادگارە تاڵەکانی خۆم هەڵدەهاتم، لە ڕوخساری هاوڕێ قودسی هەڵدەهاتم. مرۆڤ دەبێت ڕابکات... من وەک تۆ نیم، من ناتوانم خۆم فڕێبدەمە ناو تراژیدیاوە تا پشکۆکان بەدەست بگرم، نا... بیرتە... بیرتە جەلادەت وات بە من گووت، من کە خەڵکی ئازا دەبینم شەرمدەکەم... لە ڕەوەکەدا لە پێشی پێشی هەموو میللەتەوە ڕامدەکرد، سەرکردەکان نەبێت کەسی تر لە پێش منەوە نەبوو.

وایدەگووت و پێکەنینێکی سەیر پێدەکەنی، هەستمدەکرد ئەو پێکەنینە زۆر بەر سنگی دەگرێت، منیش لەگەڵیدا پێکەنیم.

کە هێمن دەبووەوە، بەو دەستە گەورەیەی شانی ڕادەتەکاندم و دەیگووت: حەیفدەکەیت ناخۆیت، حەیفدەکەیت...

دواتر بە جیدییەتێکی سەیرەوە دەیگووت: تۆ چۆن لە باڵندەکان تێدەگەیت، تەفسیرت چییە بۆیان؟

لەو ساتەدا باڵندەکانی من بە ناو هەموو چێشتخانە گەورەکەدا دەفڕین، بە ناو خەڵکدا گوزەریاندەکرد، دەچوونە سەر مێزەکان و هەڵدەستانەوە. من

گووتم: دونیا بە زیاد لە زمانێک قسەدەکات، ئەو باڵندانە کۆمەڵێک حەرفن، کۆمەڵێک وشەن، ڕستەی دونیایەکی ترن، مرۆڤ دەبێت لە لۆژیکی زمانی ئەو دونیایەی تر بزانێت ئەوسا تەواو تێدەگات ئەو باڵندانە چیین، من تا ئێستا ئەو زمانە بەتەواوی نازانم.

مستەفای شەونم پارچەیەک مریشکی بەدەستەوەبوو، بە کەمێک تێفکرینەوە گووتی: ئم ئم، وانییە... جەلادەت ئیسماعیل، ئەوان وشە نین، وا سەیریان مەکە، ئەوان وەک دەلیل وەهان، تێدەگەیت وەک دەلیل وەهان، ئەوان هیچیان نییە پێت بڵێن، بەڵکو ئاماژەن.

ئینجا کەمێک دەنگی کزکردو گووتی: هەر کەسێک ئەوان ببینێت یەعنی لە بازنەکەدایە.

من بەسەرسامییەوە پرسیم: بازنەی چی؟

بە قووڵی سەیری چاوی کردم و بە ترسێکەوە گووتی: نازانم، بەڵام دەزانم بازنەیەک هەیە... بازنەیەک هەیە، بازنەیەکی لە من و تۆ گەورەتر، لەوانەیە بازنەیەکی گەردونی بێت، من بەردەوام هەستمکردوە یەکێکم لە بازنەکەدا، هەستمکردوە شتێکی گەورە هەیە و من بەشێکم لەو شتە، بەڵام تا ئێستا بە تەواوەتی نازانم وەزیفەکەم چییە. بەردەوام چاوەڕواندەکەم، من بەردەوام چاوەڕێدەکەم یەکێک بێت و پێمبڵێت: من وەزیفەم چییە.

هەستمکرد درۆ دەکات. من بێئەوەی خۆم ئاشکرابکەم، پاڵمدا بە کورسییەکەوە و گووتم: تۆ لەو باوەڕەدایت من بتوانم یارمەتیت بدەم، لەو باوەڕەدایت کە من ئەو کەسەم کە دەزانم تۆ دەبێت چی بکەیت و چی نەکەیت؟

بێئەوەی ڕاستەوخۆ سەیری چاوم بکات، گووتی: لەوانەیە، لەوانەیە تۆ بزانیت.

تێگەیشتم بۆ شتێک دەگەڕێت، بۆ نهێنییەک دەگەڕێت. من بە غەمێکەوە گووتم: ڕاستیت پێدەڵێم، من هیچ نازانم... لەوانەیە ئەو بازنەیە هەبێت،

بازنەیەک کە لە من و تۆ گەورەترە، بەڵام من نازانم تۆ دەبێت چی بکەیت. لە ڕاستیدا ناشزانم من خۆم بەتەواوەتی دەبێت چی بکەم، بەڵام هەستدەکەم جۆرە بازنەیەکی وەها هەیە. لەوانەیە هەبێت، لەوانەیە نەشبێت.

مستەفای شەونم بە هێمنی لەسەر خواردن بەردەوامبوو، چێشتخانەکە بە جۆرێکی سەیر پڕبووبوو لە پیاوی برسی، زۆربەیان ئەو فیتەر و پەنچەرچییانە بوون کە لەو دەوروبەرە کاریاندەکرد، بە جۆرێکی سەیر و پەلە نانیان دەخوارد، دووان لە تەنیشتمانەوە بە دەنگی بەرز جنێویان بە کابرایەکی تر دەدا، یەکێکیان دەیگووت «کەللەچی وا چییە تۆ دەم دەخەیتە دەمی. ئەوساڵە کە خوشکەکەیان هەڵگرت، بۆ بەیانی دەستی خستبووە بەر پشتێنەکەی و لە بەر چایخانەکەی ڕەوفدا چای دەخواردەوە، نەبای دی بوو نە باران... من بە عائیلە دەیانناسم، قسەم پێمەکە... دەستت ماچدەکەم قسەم پێمەکە، چۆلەکەی گوێسەبانەکانیشیان تەواو نییە، من لە نزیکەوە دەیناسم، بابەگیان... تۆ سەیریت، تۆ کەی ڕەفیقی ئەویت».

مستەفای شەونم بێئەوەی خەیاڵی لای دوو فیتەرەکەی تەنیشتمان بێت، کەمێک تێفکری و گووتی: جوانترین شت لەم باڵندانەدا فڕینیانە، هەستدەکەم فڕینیان لە فڕینی هیچ باڵندەیەکی تر ناچێت، فڕینیان مۆسیقای تێدایە. سەیرکە جەلادەت ئیسماعیل، من وا هەستدەکەم فڕینیان لەسەر ئیقاعی سەمفونییەک بێت... ئاه لەوانەیە گەر ئینسان زۆر لە ئیقاع شارەزا بێت، بزانێت لەسەر ئاوازی چ سەمفونیایەک دەفڕن.

من سەرم لێ نزیککردەوەو بە ئەسپایی گووتم: دەمخۆش مستەفای شەونم، ئەو باڵندانە مۆسیقان... مۆسیقان لە هەوادا، ئەوانە نۆتەی گەردونین. بەڵام مۆسیقایەکن کەس نایبیستێت، وەک هەزاران پارچە مۆسیقای نهێنی کە لە گەردوندا هەیە، پێمبڵێ مستەفای شەونم تۆ حەزت لە مۆسیقایە؟

لەو کاتەدا دوو فیتەرەکە بە ئەسپایی هەندێک شتیان چپاند بە گوێی

یەکدا و قاقا پێکەنین، مستەفای شەونم بە ویقاری پاشایەکەوە کە جبە و سەوڵەجانەکەی لێکەوتبێت، بە چاوە زۆر گەورەکانی سەیریکردم و گووتی: حەزم لە هەموو هونەرێکە، هونەر دابەشناکرێت. هونەر هەرگیز دابەشناکرێت... هەموویان پێکەوە مانایان هەیە. بەڵام من زیاتر لەسەر نیگارکێشان وەستاوم... لە منداڵی و گەنجیمدا نیگارکێش بووم، تا ئەو شتە ڕوویدا.

من بە فزولێکی زۆرەوە پرسیم: چی ڕوویدا مستەفای شەونم؟

بە غەمێکەوە تەماشایکردم و گووتی: تا خێزانەکەم، تایەفەکەم، عەشرەتە خۆشەویستەکەم، باوکم، براکانم، ئامۆزاکانم، لێیان قەدەغەکردم ڕەسمبکەم.

دوو فیتەرەکەی تەنیشتمان کە ئێستا دەمیان پڕبوو لە برنج سەرلەنوێ دەستیانکردەوە بە قسەکردن بە دەنگی بەرز، یەکێک لە خزمەتچییەکان بە سینییەکی زۆر گەورەوە، کە تا ئەو کات گەورەترین سینی بوو من لە ژیانمدا دیبێتم، بە پلیکەکاندا سەرکەوت، دەیەها قاپە خواردنی لەسەر بوو، دەڕۆیشت و لەگەڵیشیدا پڕ بە هەموو چێشتخانەکە هاواریدەکرد «قەیسییەکە بۆ کێ بوو؟» «عەوازەکە بۆ ئەوسەر» «فاسۆلیایە بۆ ژێر کوپەکە» «مریشکەکە بۆ مامۆستا» «بامیەیەک بۆ غەفوور دیشلیی». دەنگەدەنگێکی هێند ترسناک بوو، من حەزمدەکرد بڕۆینە جێگایەکی دی و قسەبکەین، بەڵام پێدەچوو مستەفای شەونم زۆر خۆشبەخت بێت. کەزانی من کەمێک لەو هەموو دەنگەدەنگە نارەحەتم گووتی: نارەحەت مەبە، ئێرە شوێنێکی خۆشە، ئەمە ئەو شارەی من و تۆیە. لە چێشتخانە زیاتر هیچی تیانییە.

بە سووکی سەری لە گوێم نزیککردەوە و گووتی: گەر خەڵکی ئەم شارە ئەم نانە نەخۆن، نە کەسیان ئیشدەکات، نە کەسیان سیاسەت دەکات، نە هیچ.

پاش تۆزێک بێدەنگی گووتی: لەوانەیە تەنیا یەکتری بکوژن.

خۆی ڕاستکردەوە و بە زەردەخەنەیەکی گەورەوە گووتی: ئەم چێشتخانانە کۆڵەکەی ئاسوودەگی ئەم شارەن. مرۆڤ لە وڵاتەکانی تردا بیەوێت ساتێکی ئاسوودەگی بژی دەچێت بۆ سەر دەریا، دەچێت بۆ کۆنسێرتێک، بۆ مۆزەخانەیەک، بۆ تیاترێک، یان سەفەردەکات بۆ وڵاتێکی تر، لێرە هیچ شتێکی لێ نییە چێشتخانە نەبێت. گەورەترین خۆشبەختی ئەم مرۆڤانە ئەوەیە کە نیوەڕۆ دێن و ناندەخۆن... ئەم چێشتخانانە نەبێت مرۆڤ شێت دەبێت، لەمنی ببیستە، گەر ئەم خواردنە نەبایە من نەمدەزانی چی بکەم، شێت دەبووم.

فیتەرەکانی تەنیشتمان گەڕانەوە بۆ باسی ئەو پیاوەی کە لەسەرەتاوە جنێویان پێدەدا، بەڵام من هەوڵمدا تۆزێک خۆم کۆبکەمەوە و گووتم: جەنابی کاک مستەفا، من تێنەگەیشتم تۆ بۆ وازت لە هونەر هێنا، چی وایکرد واز لە نیگارکێشان بهێنیت:

بەهێمنی کەمێک سەر پەنجەکانی بە دەسرێکی سپی سڕی و دەستیکردەوە بە خواردن و گووتی: هەم، من پێمگووتی، خێزان، باوکم، خوشکەکانم، مێردی خوشکەکانم، ژنی براکانم... هەموویان.

هەستمکرد تا زیاتر دەخوات پتریش هەناسەی سوار دەبێت، دەترسام لە ساتێکدا نەتوانێت قسەبکات. بێ سەبر گووتم: بەڵام بۆ؟

مستەفا بە کەمێک تێڕامانەوە گووتی: حیکایەتێکی درێژە، من ڕۆژێک بڕیارمدا ئیدی ڕەسم نەکەم، هەموو تابلۆکانی خۆمم سووتان. لەساڵی ١٩٧٤ تۆ منداڵ بوویت، من ئەو کات ڕەسممدەکرد، پیاوێکی وا قەڵەو نەبووم، هێشتا کوڕێکی زۆر گەنج بووم، گەنج وەک تۆ، کە شۆڕش دەستی پێکردەوە من وەک هەمیشە لە پێش هەموو میللەتەوە ڕامکرد، چووم بۆ ئێران، ئەوسا کاسکێتێکم دەکردەسەرم و ڕەفتەیەکی زەردم وەک بۆینباخی هونەرمەندەکان دەکردە ملم. کارەساتی من ئەوکات دەستی پێکرد کە لە ئۆردوگای پەناهەندەکاندا حەزم لە ژنێک کرد. سەرەتا نەمدەزانی کە

ژنە، لە کچێکی پاکیز دەچوو کە هیچ مەخلوقێک پەنجەی بۆ نەبردبێت. لای من شتێکی ئاسمانی بوو، کچێک بوو لەوانەی ڕاستەوخۆ خوای گەورە بێ یارمەتی هیچ فریشتەیەکی نەزان دروستیکردون. جەلادەت من بەر لەوەی ئەو بناسم، تەنیا درەخت و جۆگەلە و گوند و گوڵدانم دروستدەکرد، ئیشەکانم زۆری ئاوی بوون... ئیشەکانم زۆری...

مستەفای شەونم بە شێوەیەکی کوتوپڕ وەستا، ڕەنگی گۆڕاو هەناسەی سوار بوو، پەرداخێک ئاویخواردەوە و وەک یەکێک مردبێت بەو چاوە گەورە و جوانانەی خۆیەوە، نیگای خاڵیکی نادیاری کرد، ماوەیەک هیچی نەگووت، نەجولا، من سەرم بەرزدەکردەوە و باڵندەکانم لە هەوادا دەبینی بە هێمنی دەفڕین. دەستی مستەفای شەونمم گرت و گووتم: کاک مستەفا نەخۆش نیت؟ هەموو شتێک باشە، یان نا، بچین بۆ خەستەخانە یان چی؟

وەک ئەوەی لای من نەبێت، وەک بەدەم خەندەیەکی نهێنییەوە مردبێت، نەدەجولا. پاش ئێستێکی درێژ، بەئاگاهاتەوەو وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت، دەستی خستە ژێر گوپە خڕە گەورەکانییەوە و گووتی: ئیشەکانم زۆری لەسەر سروشت بوون... لەسەر ژیانی ناوشار، لەسەر کرێکار و جووتیارانی کورد.

وچانێکی تری دا و بە نیگایەکی ئاڵۆزو غەمگین سەیریکردم و گووتی: ئەو ژنە منی لە جوانی مرۆڤ ئاگادارکردەوە، من هیچ نەبووم جگە لە غافڵێکی خەوتوو کە ئەو هۆشی کردەوە بەبەرمدا. ڕۆژێک لە ژێر خەیمەکەی خۆمدا دانیشتبووم، لەگەڵ ژنێکی تردا هاتن بۆلام و بە شەرمەوە داوایانکرد ڕەسمیانبکەم. لەوەوبەر من ڕەسمێ زۆر خەڵکی تری ناو ئۆردوگاکەم کردبوو، پۆرترێتەکانم جوان بوون، بەڵام جوانترین کاری من دروستکردنی پۆرترێت نەبوو. دەمەو ئێوارەیەکی حوزەیرانی ساڵی ٧٤ لە شوێنێکدا لەدەوروبەری نەغەدە پۆرترێتی یەکەمم بۆ دروستکرد، کارێکی وەها جوان بوو، مەپرسە، خۆشم عاجباتیم لێدەهات. بەر لەوەی

تەواوبم و پۆرترێتەکەی بدەمە دەست، لێم پرسی خانم ناوت چییە؟. بە زەردەخەنەیەکی ئەفسووناوییەوە گووتی: ناوم هەر چییەکە گرنگ نییە، تۆ لە ژێریدا بنوسە لەیلای نیلۆفەر. من عادەتم نەبوو ناوی کەس بنوسم، بەڵام دەمویست ناوی بزانم، بە خەتێکی ڕوون لە ژێر وێنەکەدا نوسیم: لەیلای نیلۆفەر. من تکام تیاکرد جارێکی تر بێتەوە چونکە دەمەوێت کارێکی تایبەتی بۆبکەم و بۆ خۆم هەڵیگرم. دڵنیابووم پێی خۆشە... ئێوارێی ڕۆژی دواتر لە جلێکی جوانتردا بەتەنیا گەڕایەوە و لەبەردەممدا دانیشت و بێئەوەی کەسمان هیچ بڵێت، من دەستمکرد بە تابلۆیەکی زەیتی گەورە، تابلۆیەک دەمویست هەموو هونەری خۆمی بۆ بخەمەکار. ئەو ڕۆژە هەندێک کارمکرد، بەڵام تابلۆکەم تەواونەکرد، ئەو پێیگووتم: لە بەر قسەی خەڵک دەبێت لە جێگایەکی تر یەک ببینین و تابلۆکە تەواوبکەین، چونکە ناتوانم هەموو ڕۆژێک بەبەرچاوی ئۆردوگاکەوە بێم بۆلات. دوای دوو ڕۆژ هات و ناونیشانیماڵێکی ئێرانی دامێ لە شارێکی نزیک لە ئۆردوگاکەمانەوە. ماڵی ژنە ناسیاوێکی خۆی بوو.

من لەو ساتەدا وا بە خەیاڵمدا هات کە ناوی لەیلای نیلۆفەرم بیستووە، بەڵام لە بەر هەر شتێک بێت بەیادمدا نەهاتەوە کەی و لە کوێ ئەو ناوەم بینیوە. زۆر درەنگ زانیم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان خودی ئەو تابلۆیەم لە مۆزەخانە نهێنییەکەی موسای بابەکدا بینیوە. ئاشکرابوو یادگارەکان زۆر ئازاریدەدەن. کە گەیشتە ئەو شوێنە کەوچکەکەی داناو گووتی: خۆشەویستی وەهات بینیوە، ئەو هەموو ساڵە لە خوێنی مرۆڤ دەرنەچێت، لە خەیاڵی دەرنەچێت؟

بە حەسرەتەوە گووتم: بینیومە هاوڕێم بینیومە.

وەک ئەوەی یادگارەکان هێند تاڵ بن بەبێ زەردەخەنە نەگێڕدرێنەوە. خەندەیەکی گرت و گووتی: من چووم بۆ ئەو شارە، چووم بۆ ئەو ماڵە، سندوقی وێنەکێشان و بۆیەکانم پێبوو. ژنەکەی هاوڕێی لەگەڵ دایکی

و دوو برای چکۆلانەدا لە ماڵێکی گەورەی خۆشدا دەژیان، خانوویەک بەدەستووری ئێرانییەکان ڕازابووەوە، پڕبوو لە نەخش و زەخرەفە. ئەویش خانمێکی جوان بوو. خۆی لە ژوورێکی پشتەوەدا چاوەڕوانیدەکردم، جلێکی سپی لەبەردابوو، لە ژنێک دەچوو ئەو ساتە لە هەورەوە دابەزیبێت. نەدەکرا مرۆڤ شەرم لەو هەموو جوانییە نەکات. من ئەوسا وەک ئێستا شەرمن نەبووم، بەڵام ئەو هێندە جوان بوو، نەمدەتوانی سەیریبکەم. دوای سەعاتێک ئیشکردن... دوای سەعاتێک ئیشکردن..

دیسانەوە وەستایەوە و وەک مردبێت بێجوڵە کەوتە نیگاکردنی شوێنێکی نادیار. من دووبارە دەستم لەدەستیدایەوە و گووتم: کاک مستەفا، کاک مستەفا باشیت؟ هەموو شتێک باشە، نەخۆش نیت؟

پاش وچانێک بە پێکەنینەوە گووتی: دوای سەعاتێک ئیشکردن هاتە تەنیشتمەوە و فلچەکەی لێوەرگرتم و گووتی: من بۆیە تۆم هێناوە بۆ ئێرە، بۆئەوەی بەیەکەوە بخەوین. خۆی جلەکانی خۆی داکەند و بە ڕووتی لە بەردەممدا وەستاو گووتی. بەرلەوەی ڕەسمم بکەیت، ناتەوێت بزانیت من کێم و چیم؟.

نازانم ئەو ڕۆژە چەند جار پێکەوە خەوتین، نازانم چەند جار پێکەوە چووینەوە بۆ ئەو ماڵە، نازانم چەند تابلۆم بۆ کێشا

هەناسەی سواردەبوو، وەک ئەوەی ئێستا ئەو ژنە بە ڕووتی لە بەردەمی خۆیدا ببینێت، دەستی درێژدەکرد و دەیگووت: جەلادەت ئیسماعیل، هەستی ئەوەم هەبوو، وەک نیگارکێشە گەورەکانی دونیا وەهام، هەستمدەکرد من گۆیام، ڕێنوارم، مۆدلیانیم. ئەو جەستە قەشەنگە کە هەموو عاجباتییەکانی خودای لە خۆی گرتبوو، ئێستا موڵکی من بوو، جەستەیەک بوو بۆ من بوو... نەمدەزانی ژنی کێیە، ئەو پێی نەگووتم کە ژنی کێیە، منیش نەمدەویست بزانم، پێویستیم بەوە نەبوو بزانم، بەڵام دیاربوو ژنی پیاوێکی دەوڵەمەندە. هەموو هەفتەیەک تابلۆیەکی زەیتی گەورەم بۆ تەواودەکرد.

بـە درێژایـی سـاڵی ٧٤ و زسـتانی سـاڵی ٧٥ یش لەگەڵمـدا بـوو. هەمـوو شـتێکمان کـرد بۆئـەوەی ئاشـکرانەبین. کـە شـۆڕش هەرەسـیهێنا، مـن و تابلۆکانـم گەڕاینـەوە بۆ شـار. هـەرەس هێند کتوپڕبوو، بواری ئـەوەی نـەدام لـە شـەوی بارکـردن و کۆچکردنـی ئـەودا بیبینمـەوە، بەدرێژایـی ئـەو سـاڵە بیرمـان لـەوە نەکردبـووەوە کـە شـۆڕش ڕوخـا چـی بکەیـن. نـە مـن و نـە ئـەو کەسمان شۆڕشـگێڕ نەبووین، هیچمـان لـە سیاسـەت نەدەزانی، شـەوی هـەرەس مێردەکـەی لـە جێبێکدا دێت و هەڵیدەگرێت و دەگەڕێنـەوە بۆ وڵات. مـن زۆر لـە دووی گـەڕام و نەمدۆزییـەوە. ئـەو مـاوە دووروودرێـژە هەرگیز لێم نەپرسـی بـوو خەڵکـی کوێیـت، لـە کـوێ دەژیـت؟. کـە گەڕامـەوە وەک دێوانـە لەسـەرجادەکانی ئـەم شـارە دەسـوڕامەوە، تووشـی داڵغـە و خەیاڵـی خۆکوشـتن بـووم. زۆر ڕۆژ لـە بەیانییـەوە تـا ئێـوارێ مـن لەسـەر ڕۆشـنی یادگارەکانـم ئـەو خانمـەم نیگاردەکرد. لـە ماڵـی خۆمـان ژێر زەمینەکـەم کـرد بـە مەرسـەم. بـەڵام نیگارەکانـم شـەرم و حەیای تیا نەبوو، وێنەکانـم هەموو لەشـی فریشـتە ئاسـای «لەیـلای نیلۆفـەر» بـوو. ئـەوکات باوکم مابوو، بینینی نیـگاری ئـەو ژنـە ڕووتـە، ژنـی براکانمـی تووشـی تووڕەیـی و هیسـتریایەکی گەورەکردبوو، هێدی هێدی براکانـم و ژن و منداڵەکانیـان پێیـان لـە ماڵـی ئێمە بـڕی. خوشـکەکەکانم نەدەهاتـن، زۆر ڕۆژ وەک شـێت بـە ڕیشـێکی درێژەوە بـە شـاردا دەڕۆیشـتم، دێوانەیەکـی بێچارەبـووم کـە لـە هەمـوو ئافرەتێـک وردەبوومـەوە، بەڵکو لەیـلا غەمگینەکـەی خـۆم بدۆزمـەوە، دواجـار یەکێـک لـە هاوڕێکانـم پێیگووتـم، گـەر دەتەوێـت دووبـارە ئـەو ژنـە بدۆزیتـەوە دەبێت پێشـانگایەک بکەیتـەوەو نیگارەکانی نیشـانبدەیت، دڵنیابـە لـە بن زەویشـدا بێت سـەردەردەهێنێتەوە.

بەجۆرێـک هەناسـەی لێبـڕا، دەستەسـڕەکەی گـرت بـە دەمییـەوە و لـە کەپوویـەوە هەوایەکـی قووڵـی هەڵمـژی، ڕوومەتەکانـی سـوور هەڵگەڕابوون. کەمێک وەسـتاو گووتی: بمبورە دەبێت هەموویت بۆ بگێڕمەوە، هەمووشـتێک،

لەوانەیە لە جێگایەکدا نهێنییەک هەبێت من و تۆ پێکەوە گرێبدات.

دوو فیتەرەکە بەدەم جنێودانەوە بەو کابرا نادیار و نەناسراوە کە هەرچی سیفەتی ناشیرین هەبوو خستیانە پاڵی، هەستان و ڕۆیشتن. بەقسەکانیاندا دیاربوو لەگەڵ کابرادا لەسەر نرخی هەندێ پارچەی ئوتومبیل ڕێنەکەوتوون. چێشتخانەکە تادەهات جەنجاڵتردەبوو، مستەفای شەونم بانگی هەندێک خواردنی تری کردو پاڵیدا بە کورسییەکەوە، کە چاوی دەنوقاند شێوەی لە مۆمیای ئیمپراتۆرێکی کۆن دەچوو. وچانەکانی تادەهات درێژتردەبوون، هەندێجار هەستمدەکرد نایەوێت بەردەوامبێت، بەڵام هەمیشە جوڵەیەکی دەکردو چاوەکانی دەکردەوە و بەردەوام دەبوو، گووتی: لە ئەیلولی ساڵی ١٩٧٥ دا، دونیا ڕەنگێکی تری هەبوو، ئاه، جەلادەت ئەو کات دونیا شتێکی تر بوو، هەرەس هەموومانی وێرانکردبوو، بەڵام هیوا هەبوو. من لە یەکێک لە چاپخانەکان ئاگادارییەکی گەورەم چاپکرد، لە هەموو شارەکانی کوردستان بڵاومکردەوە. هۆڵی یەکێک لە قوتابخانەکانم گرت و هەندێک لە تابلۆکانم هەڵواسی. هەموو تابلۆکانم نیگاری ئەو خانمە بوون، ئەوەی یەکجار ئەو ژنەی دیبێت دەیزانی نیگارەکانم نیگاری ئەون. دوو هەفتە چاوەڕوانمکرد، بێشومار خەڵک هات، من بەردەوام لە بەردەرگاکە دەوستام و سەیرمدەکرد، هەموو دونیا هات و ئەو نەهات. بە زەحمەتێکی زۆر توانیم هەفتەیەکی سێهەم پێشانگاکەم درێژبکەمەوە. کارەکانم لە ڕووی هونەرییەوە شایستەی ستایش بوون، هونەرمەندەکان زۆربەیان حورمەتێکیان بۆی هەبوو... هەفتەی سێهەمیش خەڵکێک هات ئەهلی هونەر بوون. دواهەمین ڕۆژ کە دەرگای پێشانگاکەمان داخست و تابلۆکانمان کۆکردەوە، هاوڕێیەکم تەواوی تابلۆکانی بردەوە بۆ ماڵەوەو من بە هێمنی بەرەو بازاڕ کەوتمەڕێ. سەد مەتر لەولا پێشانگاکەوە چاوەڕوانیدەکردم، چاوانی پڕبوون لە فرمێسک، عەبایەکی بەسەرەوە بوو، هاتە بەردەمم و گووتی: چۆن شتی وام بەرامبەر دەکەیت... چۆن؟ من

بۆ ئێستێک نەمدەزانی چی بڵێم، نەمدەزانی ڕاستمکردوە یاخود هەڵە. بە پەلە وەک شێت حیکایەتی ئازارەکانی ئەو شەش مانگەی خۆمم گێڕایەوە، پێمگووت، گەر نەزانم لە کوێیە، چی دەکات، چۆن دەژی شێتدەبم. دەمزانی منی خۆشدەوێت، ئەو دواهەمین ئافرەتی دونیابوو کە منی خۆشویست، دەمزانی دواجار منی دۆزیوەتەوە، ڕاستی نەدەکرد، ئەوەی لا گرنگ نەبوو هەموو دونیا بزانێت ئەوانە نیگاری ئەون، دەمتوانی سوێندبخۆم کە لەو ساتەدا دەتوانێت لە ناوەڕاستی پێشانگاکەدا بوەستێت و بڵێت من ئەوم، من پاڵەوانی ڕاستەقینەی ئەو تابلۆیانەم. وەک دوایی پێیگووتم، فرمێسکەکانیشی فرمێسکی فیراق و دووری بوون نەوەک فرمێسکی توڕەیی. گرنگ ئەوەبوو من و ئەو یەکترمان بینییەوە، دەیانجاری تر بەیەکەوە خەوتین، شێتی یەک بووین... مێردەکەی لە ماوەیەکی کورتدا بەو پارەو چەکانەی دوای شۆڕش فرۆشتبوونییەوە بووبووە پیاوێکی زەنگین، وەک هەمیشە ئاگای لە ژنەکەی نەبوو، پیاوێکی کەچەڵی باریکی ڕەنگزەردبوو، کە لەیلا وەک سەگ تەماشایدەکرد. من ڕۆژێک لە مەحەلەکەی خۆیدا لە بازاڕ بینیمەوە. من و ئەو ژنە نەماندەزانی دەگەینە کوێ، نەماندەزانی تا کەی دەتوانین وا بژین. من تابلۆکانی ئەوم لە مەرسەمەکەدا هەڵواسیبوو، هێدی هێدی هەموو شێوەکارەکان چیرۆکەکەی منیان دەزانی، هەندێکیان ئەو ژنەیان دەناسی، بەڵام من لەو خەیاڵەدا نەبووم کەسیان خیانەتم لێبکات، من بەردەوام ئەو شیعرەی ڕامبۆم دەگووتەوە کە دەڵێت: شاعیران هەموو بران. من پێموابوو نیگارکێشەکانی دونیا هەموو بران.

کەمێک پاڵیدایەوەو دەستیکردەوە بە خواردن، چەند جارێک سەیریکردم و گووتی: حەیف ناخۆیت... بەڕاستی حەیف. دەیزانی چیرۆکەکە گەیشتۆتە جێگایەک کە من بەشەوقەوە دەمەوێت بزانم چی بەسەردێت. جارێکی تر دەمی سڕی و وچانێکی تری گرت و گووتی: ئێستا پێمبڵێ چەند شاعیر لەم شارەدا هەن باوەڕیان وەهابێت کە شاعیران هەموو بران، چەند شێوەکار

هەن وا بڵێن. کەس نییە، کەس نییە وابڵێت، بەڵام من ئەوکات وامدەگووت و ئێستاش هەر وادەڵێم.
شەوێکی شوباتی ساڵی ١٩٧٦، من لەماڵی خۆمان لە قاتی سەرەوە نوستبووم، هەمووومان نوستبووین، بەربەیان لەسەر خەوێکی ناخۆش بە ئاگاهاتمەوە، ئێستا خەوەکەم بیرنەماوە، بەڵام دەزانم خەوێکی سامناک بوو، هاتمە خواری، بچمە مەرسەمەکەم، بەفرێکی زۆر دەباری، لەسەر بەفرەکە شوێن پێی دوو کەسم بینی کە بە تەنیشت یەکەوە ڕۆیشتبوون، دواتر یەکێکیان گەڕابووەوە. من بە ڕۆبێکی زستانەی ئەستوورەوە دابەزیم. دەرگای مەرسەمەکەم کرابووەوە گڵۆپەکەشی دەسووتا. وەلێ دڵنیابووم ئێوارە کە هاتمەدەرێ دەرگاکەم داخست و گڵۆپەکەم کوژاندەوە، بێبیرکردنەوە دەرگاکەم کردەوەو چوومە ژوورێ، ئەو پیاوە کەچەڵە، لوتدرێژە، ڕەنگزەردەم بینییەوە لە ناوەڕاستی مەرسەمەکەدا وەستاوەوە تەماشای نیگارەکانی ژنەکەی دەکات. بەر لەوەی هیچ بڵێم، دەمانچەیەکی لە ژێر پشتێنە کوردییەکەی دەرهێناو گووتی: کوڕی قەحبە... کوڕی قەحبە، کەس هەیە وا بە حەیاو حورمەتی خەڵک بکات. من لە دوای ئەوەوە هیچم لە یاد نییە، چەندین ساڵ بیرم لێکردۆتەوە، بەڵام هیچم لە یاد نییە... هیچ. یەکەمجار دوای ئەوە لە خەستەخانە بە ئاگا هاتمەوە، پێنج گوولەم پێوەبوو، بەڵام هیچیان شوێنی زۆر کوشندەی نەگرتبوو. کە من بە ئاگا هاتمەوە شار هەمووی خرۆشابوو، کەس هیچی پێنەدەگووتم... باوکم نەبێت زۆربەی کەسوکارم نەدەهاتن بۆلام، دواجار یەکێک لە هاوڕێکانم پێیگووتم لەیلای نیلۆفەریان کوشتووە، هەر ئەو شەوە ئەویشیان کوشتبوو. من وەک شێت بەبرینداری لەسەر قەرەوێڵەکەم دابەزیم و دەمویست بڕۆم، دەمویست لەو خەستەخانەیە دەرچم، بە هەموو دکتۆرو برینپێچ وسستەرەکان منیان بۆ نەدەگیرا. ناچار دوو هەفتە منیان بە زنجیر بەو قەرەوێڵەیەوە بەستەوە. کە لە خەستەخانە هاتمەدەرێ و بۆ یەکەمجار سەیری شەقام و درەخت و

ئاسمانی ئەم شارەم کرد، زانیم ئیدی من تا هەتا هەتایە تەنهام. من لەو ڕۆژەوە تەنهام، لەو ڕۆژەوە تا قیامەت، تا کۆتایی دونیا.

من بە غەمێکەوە لێم پرسی: بەڵام مستەفای شەونم بۆ وازت لە ڕەسم هێنا، بۆ بەردەوام نەبوویت؟

گووتی: کە لە خەستەخانە گەڕامەوە، هەموو تابلۆکانی خۆمم سووتاند، دەفتەری سکێچ و هێڵکارییەکانم دڕاند، ئاگرم لە ڕەسمەکانی لەیلای نیلۆفەریش بەردا. دوای ئەو هەموو کارەساتە، دوای ئەوەی من و کەسوکارم بووبووین بە حیکایەتی هەرە گەورەی شار هیچ کەس لە خێزانەکەمدا ڕازی نەبوو من جارێکی تر ڕەسمبکەم. من خۆشم لە دوای ئەوەوە ئارەزوویەکم نەمابوو، هەتا قەدەغەشمکرد کەس هیچ وێنەیەک بە دیوارەکاندا هەڵواسێت. هێدی هێدی پێم لە ناو هونەرمەندانیش بڕی، بە تایبەت کە زانیم ئەوەی ئەو پیاوەی هێنا بۆ ئەو مەرسەمە هاوڕێیەکی خۆم بوو. جەلادەت ئیسماعیل، من زۆر ماندووبووم تا ڕەسمم لە بیرچووەوە، تا چەند ساڵێکیش بە ڕێگادا دەڕۆیشتم و هەر بە خەیاڵ ڕسمم دەکرد، بەڵام دواجار لە ناو ئەم بازاڕ و چێشتخانانەدا لەنگەرمگرت. لێرەدا بەردەوام دەمخوارد... جەلادەت من چەندین ساڵە دەخۆم بۆئەوەی بیر لە ڕەسم نەکەمەوە، بیر لە هەموو شتەکانی دونیا دەکەمەوە، تەنیا بۆئەوەی بیر لە ڕەسم نەکەمەوە، ئێرە نیشتیمانی منە، ئەم چێشتخانانە نیشتیمانی منن، ئەم بۆنە نیشتیمانی منە... دەزانی چەند ماندووبووم تا ڕەسمم لە بیرچووەوە؟ چەند ئازارو ئەشکەنجەم چەشت تا ئەو نیگارکێشەی ناو خۆمم کوشت؟ دەزانیت؟.

پاڵیدایەوەو گووتی: لەدوای ئەوەوە یەک تابلۆ هاتۆتە ماڵی من، یەک تابلۆ، یەک تابلۆی سەیر، کە شەوێکی بەفرانباری شوبات، وەک هەمان ئەو شەوەی تێیدا بریندارکرام، خانمێک لە دەرگای داو ئەو تابلۆیەی دایە دەستم و بە پەلە ڕۆی، خانمێک بوو لە تاریکیدا دەموچاویم نەبینی.

تابلۆیەکی سەیربوو، لەو کاتەوە جگە لەو تابلۆیە ناهێڵم نیگاری تر بێتە ماڵەکەم... دەزانیت ئەو تابلۆیە ناوی چییە؟

من لەو کاتەدا هەموو گیانم دەلەرزی، وەک مردووەکان هەناسەم لە خۆم بڕی و بە ڕوونی گوێم لێبوو کە گووتی: جەلادەت ئیسماعیل، ئەو تابلۆیە ناوی «شاری مۆسیقارە سپییەکان» بوو.

## ئۆقیانوسی هاوار و ئاشکرابوونی حەقیقەتی مستەفای شەونم

هەندێک سات هەن لە ژیانی مرۆڤدا، ساتی ونبوونی گەورەن، ساتەوەختی وێڵبوونن لە ناو چەندەها ڕێگاو چەندەها پردو چەندەها دەروازەدا، ساتێکە نازانیت لە کوێدا وەستاویت، وێنە بچوکەکان بە جۆرێک دەترفێنن وێنە گەورەکەت لە یاد دەبەنەوە، ساتێکە نازانیت لەسەر چ خەتێکیت و لە کوێوە هاتوویت و دەبێت بچیت بۆ کوێ. پێشتر پێتوایە شتێک لەسەر نیگارەکە دەزانیت، شتێک لە نەخشەکە تێگەیشتوویت، بەلام ساتێک دێت هەموو ئەو تێگەیشتنە دەڕەوێتەوەو دڵنیادەبیت تۆ هیچ نازانیت... تۆ وەک بەلەمێک ونبوویت و نەدەزانیت بەرەو پێش بڕۆیت و نەدەشزانیت بەرەو دوا بگەڕێیتەوە. ئەو ساتەی مستەفای شەونم باسی تابلۆی شاری مۆسیقارە سپییەکانی کرد لەو ساتانە بوو. ساتێک بوو من ئارەزوویەکی قووڵم تێدابوو تا کۆتایی لەگەڵ سەفەری تەلیسمەکاندا بڕۆم و نەوەستم، بەلام لە هەمان کاتدا ئارەزوویەکی دژ و کوشندەشم تێدابوو واز لە هەموو ئەو گەمەیە بێنم و بڕۆم بۆ جێگایەک، لە هەموو ئەم بازنەیە دووربکەومەوە. لەو ساتانە بوو کە دەبایە دووبارە بەسەر هەموو تەفسیرەکانمدا بچمەوە. کە من ناوی شاری مۆسیقارە سپییەکانم بیست بێئەوەی هیچ بڵێم، بێویستی خۆم هەستام و بێ خوداحافیزی

ڕۆیشتم. مستەفای شەونم بانگیکردم و من نەگەڕامەوە، هەستمکرد دوای ئەو ڕستەیەی مستەفای شەونم پێویستیم بە پشوو و بیرکردنەوەیەکی درێژ هەیە، بە پەلە بە هەموو باڵندەکانمەوە گەڕامەوە بۆ گێلاسی سپی و وەک یەکێک لەرزۆتایەکی خراپی هەبێت خۆم خزانە ژێر بەتانییەکەمەوە و دەستمکرد بە گریان. من ئەو ماوەیە زۆر دەگریام، لە خۆمەوە دەگریام. ڕۆژی دواتر ئێوارەیەکی درەنگ مستەفای شەونم هات بۆ گێلاسی سپی، چاوەڕوانی ئەوە نەبووم ئەو پیاوە، بەو هەموو گۆشتەوە بتوانێت ئاسان شەش قات سەرکەوێت، بەڵام کە گەیشتە لای من جگە لە ڕوومەتە هەمیشە سوورەکانی ئاسەواری هیلاکی پێوە دیار نەبوو. نازانم بۆ لەو ساتەدا وا هاتە بەرچاوم کە مستەفای شەونم پیاوێکە دەتوانێت بفڕێت، بێئەوەی کاتم هەبێت زۆر بیربکەمەوە مستەفای شەونم گووتی: دەبووایە تۆ بدۆزمەوە، نازانم بۆ بەو جۆرە جێتهێشتم... بۆ؟ من دەمزانی من و مستەفای شەونم لە بازنەکەداین... دەمزانی دەبێت یەکتر بناسین، دەمزانی هیچ چارێک نییە ئەوە نەبێت کە هەموو چیرۆکی خۆمی بۆ بگێڕمەوە، چیرۆکێک هیچ کەس پێشتر بەو وردەکارییە نەیبیستبوو. ئێستا تێدەگەیشتم بۆ مستەفای شەونم دەبایە باڵندەکان ببینێت، گەر باڵندەکانی نەبینیایە ئێمە یەکدیمان نەدەناسی. مستەفای شەونم لەسەر هەق بوو دەبووایە ژیانی خۆمان بۆ یەکتر بگێڕینەوە تا لە جێگایەکدا ئەو خاڵە نهێنییە بگرین کە لە یەکدیمان نزیکدەکاتەوە، ئەو پنتە نهێنی و چکۆلەیە بدۆزینەوە کە من و مستەفای شەونم تێکەڵاوی یەکتر دەکات. ژیان هیچ نییە جگە لە کیمیایەک کە کۆمەڵێک نهێنی زۆر قووڵ لە ژێرەوە دەیجوڵێنێت، مرۆڤەکان بە چەندەها تۆڕی سەیر پێکەوە گرێدەدات کە مرۆڤ دەبێت هەموو هەستەوەرەکانی خۆی تیژبکاتەوە بۆئەوەی لە ماناکانی تێبگات. من ئەو ئێوارەیە نەختێک بەفرم لە دراوسێییەکمان قەرزکردو بەفراوێکمکردو بە مستەفای شەونمم گووت: بەڕێزم دانیشە، ئێستا کاتی ئەوەیە من ژیانی خۆمت بۆ بگێڕمەوە،

کاتی ئەوەیە تۆ بزانیت من کێم، کە من تەواوبووم، ئیدی باشتر دەتوانین لە یەکتر تێبگەین، باشتر دەتوانین بزانین من و تۆ دەبێت چی بکەین.

مستەفای شەونم بە گوپە سووورە پفکردوەکانییەوە، بەو برۆ باریکانەوە کە لە دوورەوە نەدەبینران، بەو مووە سپیانەی سەرسنگی و ئەو قژە رەشە درێژەیەوە، دیاربوو نەداری من و فەقیری ژوورەکەم تووشی رامان و بیرکردنەوەیەکی زۆری کردوە. من لە دۆشەک و بەتانییەکی کۆن، لە کارتۆنێکی گەورە و هەندێ زەخیرەی کەم و دوو قاپ و دۆلکەیەک و پەرداخێک و کۆمەڵێک مۆم بەولاوە هیچی ترم نەبوو، هەڵبەت لە باڵکونەکەش تەباخێکی چکۆلەو جلیکانێک نەوتم هەبوو... ئەوە هەموو ماڵی من بوو، هەموو دارو نەدارم بوو. دیاربوو ئاغای شەونم هەرگیز لە شوێنی وەها خاڵی و پەڕپوتدا نەماوەتەوە، وەک نەتوانێت بەو هەموو ویقار و گۆشتەوە لەسەر نوێنەکانی من دانیشێت، گووتی: ئەی ناتوانین بچینە جێگایەکی تر؟ من گووتم: نا بەڕێز مستەفای شەونم، دانیشەو گوێبگرە. سەیربوو یەکێکی وەک من بەو جلە شڕ و پەڕپوتانەی خۆمەوە، فەرمان بۆ پیاوێکی وا بەویقار دەردەکەم کە کوڕی یەکێک لە هەرە دەوڵەمەنترین خێزانەکانی شاربوو. هەندێک کەس بە «مستەفا بەگی شەونم» بانگیاندەکرد، نازناوی شەونم شتێک بوو لە باپیرە گەورە گەورەکەیانەوە بۆی مابووەوە کە دەیگووت: لە سەر کەشتییەکانی سوڵتانی عوسمانی کاریکردوە و ناخودایەکی بێوێنەو بەڕەزم بووە، کە دواجار لە ناوەڕاستی دەریای سپیدا عاشقی حۆرییەک دەبێت، خۆی ئەو حۆریە ناودەنێت «شەونم»، حۆرییەکی ڕاستەقینەی دەریا کە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت بۆ کوردستان و لەسەر زێی گەورە کۆشکێکی بۆ دروستدەکات. مستەفای شەونم کە خۆی بە نەوەی ئەو حۆرییە جوانەی دەریا دەزانی، لەو ژوورە پەڕپووتەی مندا کەمێک دڵتەنگ و ناڕەحەت بوو. دیاربوو لە مێژە لەسەر ئەرز دانەنیشتووە، بەلام لەوساتەدا من ئارەزوویەکم نەبوو

برۆمە دەرێ، لە ڕاستیدا پارەشم پێ نەبوو داوەتی چایخانەیەکی بکەم، قەبووڵیشم نەدەکرد ئەو وەک میوانێک من داوەتبکات. لەبەرئەوە پێمگووت: مستەفای شەونم بمبورە دەزانم ژوورەکەم لایەقی جەنابتان نییە، دەزانم، بەڵام لێرە باشترم نییە. لێرە خۆشترم نییە، عەفوومبکە لە ئاوی ساردیش زیاتر شتێکم نییە پێشکەشتیبکەم. بە شەرمێکەوە گووتی: نا... نا، جەلادەت ئیسماعیل، ئاوی سارد زۆر باشە، هیچ عەیبی نییە، هیچ عەیبی نییە، من زۆر حەزم لە ئاوی ساردە. هێند هەیە، من لەو باوەڕەدام کە چاکترە شوێنێکی تر بدۆزیتەوە، ئێرە شوێنێکی باش نییە، دڵنیابە ئێرە شوێنێکی باش نییە.

من بێئەوەی گوێ بدەمە قسەکانی مستەفای شەونم دەستمکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی خۆم، هەموو ئەو چیرۆکەم بە هەموو وردەکارییەکانییەوە بە هەموو ئازارەکانییەوە، بە هەموو پەشیمانی و برینەکانییەوە بۆ گێڕایەوە، ئەوە یەکەمجارم بوو ژیانم بەتەواوەتی بۆ کەسێک بگێڕمەوە. بێ پچڕاندن، بێ درۆکردن... مستەفای شەونم گوێگرێکی زۆرباش بوو، لەگەڵمدا گریا، لەگەڵمدا پێکەنی، لەگەڵمدا غەمی خوارد، پرسیاری زۆری لێکردم، وەسفی من بۆ جوانی دالیا سیراجەدین سەرسامیکرد، وەسفی من بۆ شاری سۆزانییەکان دڵی پڕکرد لە گریان، هەموو شتێک لە نێوان من و ئەودا ئاسایی بوو، هەموو شتێک بە هێمنی ڕۆیشت، تا گەیشتمە ئەو شوێنەی ناوی موسای بابەکم هێنا، تا بەوەسفێکی درێژ باسی ئەو دکتۆرەم کرد، کە گەیشتمە سەر ئەو بڕگەیەی چیرۆکەکەم هەستمکرد مستەفای شەونم هەوای پێنامێنێت، گەرووی دەگیرێت، ڕوومەتەکانی سووردەبنەوە و نیگای بە چەشنێکی نائاسایی دەردەپەڕێ، وەک نەتوانێت قسەبکات چەندەهاجار سەری بادا و گووتی: نابێت، نابێت. من باسی ئەو ژێرزەمینە خورافییەم بۆ کرد کە پڕبوو لە هەزاران تابلۆ، بەرلەوەی بگەمە سەر باسی تابلۆی شاری مۆسیقاره سپییەکان، بە دەنگی بەرز وەک هاواربکات گووتی: کەواتە

تۆ ئەویت، جەلادەتی کۆتری ڕاستەقینەیت، من بە هەڵەدا نەچووبووم، تۆ ئەو کەسەی کە هەموومان بەدواتا دەگەڕێین، تۆ هاوڕێی مامۆستا گەورەکەمانی، هاوڕێی موسای بابەکیت... تۆ جەلادەتی کۆتریت، نەوەک جەلادەت ئیسماعیل، تۆ ئەویت.

من لەویادا وەستام و گووتم: هاوڕێی تۆ؟ موسای بابەک هاوڕێی تۆ بووە، چۆن موسای بابەک هاوڕێی تۆ بوو، چۆن؟

مستەفای شەونم بە دەنگێکی خنکاو گووتی: من یەکێکم لەوانەی تابلۆم بۆ موسای بابەک کۆدەکردەوە، من لەو تۆڕە گەورەیەدام، من لە بازنەکەی ئەودام، یاریدەدەری موسای بابەکم. من لە ساڵی ٧٩ وە یاریدەدەری ئەوم.

من نەمدەزانی چی بکەم، وەک شێت بازمدایە سەر ملی مستەفای شەونم و گووتم: مستەفای شەونم تۆ درۆدەکەیت، درۆدەکەیت، درۆدەکەیت... تۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان دکتۆر موسات نەبینیوە، تۆ پیاوێکی سیحربازیت، دەبووایە یەکەمین شەو بمزانیایە، تۆ دەجالێکی لە جلێکی ڕەشدا بەم شارەدا دەسوڕێییتەوە، لەوانەیە پیاوکوژیش بیت، من چوزانم؟ تۆ کێیت و چیت لە من دەوێت؟

مستەفای شەونم چاوەڕوانی ئەو قسانەی نەدەکرد، خۆی ڕاپسکاندو سەیرێکی جلە ڕەشەکانی خۆی کرد و بە حەپەسانێکی سەیرەوە گووتی: جەلادەتی کۆتر تۆ دەڵێیت چی؟ دەڵێیت چی؟ من پیاوکوژ نیم... بەڕاستی پێتدەڵێم من پیاوکوژ نیم.

پێشتر کەس ئەوجۆرە قسانەی پێنەگووتبوو، من بە هۆی سەرسامی و پەشۆکانەوە نەمدەزانی دەڵێم چی، لە دڵەوە دڵنیابووم مستەفای شەونم، لەو قەڵەوە ئێسک سووکانەیە کە هەرگیز درۆناکات، بەڵام دەمویست باوەڕنەکەم، نەمدەویست لەم شاری ئاوارەییەدا هەمان ئەو تەلیسمانە سەر هەڵبدەنەوە کە لە شاری سۆزانییەکاندا جێمهێشتبوون، بە دڵڕەقییەکی سەیرەوە گووتم: دەجالێکی جل ڕەش، بە چاوی سیحربازێکەوە کە

خەیالاتی خەڵک دەخوێنێتەوە، ها... دڵی خەڵک دەخوێنێتەوە، فالچییەک بە قژێکی درێژەوە کە ڕۆحمان دەپشکنێت و دەزانێت چۆن ئازارمان بدات.

مستەفای شەونم بێچارە سەیریدەکردم و دەیگووت: جەلادەتی کۆتر، تۆ دەڵێیت چی... دەڵێیت چی... من دەجالێکی جل ڕەش نیم، من سیحرباز نیم، قەت ناتوانم خەیاڵی خەڵک بخوێنمەوە، ناتوانم.

من لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دەوەستام و دەمگووت: چۆن بزانم تۆ ڕاستدەکەیت، چۆن؟ چۆن بزانم تۆ دەجالێکی جل ڕەش نیت؟

ئەو گووتی: بەر لەوەی وەلامتبدەمەوە، پێمبڵێ بۆ ئەو ڕۆژە کە من ناوی تابلۆی مۆسیقاره سپییەکانم هێنا، تۆ هەستایت و ڕۆیشتیت... بۆ ڕۆیشتیت... بۆ؟؟

من بێ بیرکردنەوە گووتم. لە بەرئەوەی منیش تابلۆیەکی وەهام هەیە... تابلۆیەکم هەیە کە هەمان ناوی هەیە، ئەو تابلۆیەی دکتۆر بابەک ئێستا لای منە... تۆ بەچیم تێدەگەیت؟ من تۆ نیم من لە زۆر شت مەحروم بووم، هەندێجار وەک گەمژەیەکی گەورە وەهام کە نازانێت ئیشی لەسەر ئەم ئەرزە چییە... بۆ هەموو دەتانەوێت من عاقڵ بم، لە کاتێکدا دەزانن من ناتوانم لەزۆر شت تێبگەم.

بێئەوەی بپەشۆکێت یان سەرسام بێت گووتی: جەلادەتی کۆتر دەبێت ئەو تابلۆیە ببینم، دەبێت ببینم... هەر ئێستا.

من لە بنی ئەو کارتۆنە گەورەیەدا تابلۆکەم بۆ دەرهێنا، بەرگەکەیم لێکردەوەو دامە دەستی و گووتم: فەرموو، تۆ وادەزانی تەنیا تۆ ئەو تابلۆیەت هەیە، منیش ئەوەتا تابلۆیەکی وەهام هەیە... ئێستا پێمبڵێ تەفسیری تۆ چییە؟.

زۆر بە وردی تەماشایکرد، بە چاوی یەکێک کە هەموو نهێنی ئەو تابلۆیە بزانێت ماوەیەکی درێژ سەیریکرد. دواتر بە هێمنی تابلۆکەی پێچایەوەو دەستیکردە ملی من و گووتی: تۆ ئەویت، جەلادەتی کۆتر، تۆ

ئەویت، ئێمە چەندین مانگە بەدواتدا دەگەڕێین.

من بە پەشۆکانەوە پرسیم: ئێوە کێن؟

مستەفای شەونم وەڵامی نەدامەوەو گووتی: جەلادەت هەستە، هەستە ئێستا دەبێت بێیت لەگەڵمدا، منیش نهێنییەکی گەورەم هەیە نیشانت بدەم.

پێکەوە لە گێلاسی سپی چووینە خوارێ، بێئەوەی هیچ بڵێت، بە دەموچاوێکەوە کە لە هەڵچوون و پەشۆکاندا سوورهەڵگەڕابوو پێشمکەوت، منی سوار ماشێنێکی سووری تازە دەکرد، لە پشت سوکانەکەوە لە هەر ساتێکی تر زیاتر ویقاری دەبینرا، بەدرێژایی ڕێگا هیچی لەگەڵدا نەگووتم. هەستمکرد دەستی دەلەرزێت، گوێم لە لێدانی دڵی بوو، کە هێند بەرزبوو لە دەنگی مستێکی ترساو دەچوو لە شەوێکی تاریکدا لە دەرگایەکی داخراو بدات، بەلام وەک هەمیشە هەناسەی خۆی گرتبوو. دوای سێ چارەک لێخوڕین گەیشتینە جێگایەکی چۆڵ، شوێنێک بوو لە پاشماوەی کارخانەیەکی کۆن دەچوو، شوێنێک بوو خاڵی، من ئاسەواری هیچ ڕۆحلەبەرێکم نەدەبینی، سێبەرێکی سەنگینی ئێوارێ کە پڕبوو لە هەناسەی پێشینی شەو لەو جێگایەدا نیشتبوو، شوێنێک بوو پڕ لە دڕک و گژوگیای مردوو. چەند ژوورێکی بلۆکی فەرامۆشکراوبوو، دیاربوو یەکێک دەرگاو پەنجەرەکانی دەرهێناوە، دیاربوو دەستێک ویستویتی سەقفەکەی تێکبدات و بۆی نەکراوە لە پشت ئەو ژوورانەوە چەندەها سالۆنی گەورە گەورەم دییەوە، نەمدەزانی ئەم شوێنە کوێیە، زۆر زەحمەت بوو بە شێوەی خانووبەرە و دابەشبوونی هۆڵ و بیناکاندا تێبگەیت ئەم جێگایە بۆچی کراوە، ئاخۆ بنکەیەکی سوپابووە، کارخانەبووە، مەخزەن بووە یان چی؟. مستەفای شەونم لە ناکاو لە ناوەڕاستی ئەو شوێنە خاپوورەدا وەستاو گووتی: گەر ئەو تابلۆیە نەبایە تۆ بۆ هەتاهەتایە وندەبوویت.

من لێم پرسی: مستەفای شەونم بۆ کوێم دەبەیت؟ ئەم جێگایە کوێیە؟

گووتی: پەلەمەکە ئێستا خۆت هەمووشتێک دەبینیت.

منی بردە ناو یەکێک لە سالۆنە زۆر گەورەکانەوە، ڕۆژ خەریک بوو ئاوادەبوو، لە هۆڵەکەدا چەند جارێک بە وردی چاوی گێڕا، لە هەندێ شوێندا چەند جارێک بە پێڵاوەکانی تەپە تەپی کرد، دواجار دەستیبرد و لە شوێنێکی دیاریکراودا، سەرقاپێکی نەبینراوی بەرزکردەوە و دەروازەی ژێر زەمینێکی تاریکی دەرخست و بە منی گووت: جەلادەتی کۆتر، بەخێربێیت بۆ نهێنیترین مۆزەخانەی سەرزەوی، بۆ شاری ئەو تابلۆیانەی لە مردن ڕزگاربوون. بۆ وڵاتی نیگارە نهێنییەکان.

ژێر زەمینێکی قووڵ و تاریک بوو، لە ناو ئەو تاریکییەدا زیاد لە سەد مەتر بە کوێری ڕۆیشتین، لە دیوارێکی دیکەدا دەرگایەکی چکۆلە و نهێنی دیکەی کردەوە، لەوێوە چووینە ناو هۆڵێکی گەورەوە، وەک هەمان ئەو هۆڵەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە شاری تەپوتۆزە زەردەکان لەگەڵ موسای بابەک پێم تێخست. من بە جۆرێک سەرسام بووم، زمانم گۆی نەدەکرد، یەکێک بوو لەوساتانەی دەکەوێتە دەرەوەی تێگەیشتن و توانای تەفسیری مرۆڤەوە، پێشانگایەک بوو بە هەمان پێکهاتەی پێشانگا ئەفسانەییەکەی موسای بابەک، هەمان پێچاوپێچی و ئاڵۆزی، هەمان ڕاڕەوی سەیرو ناکۆتا، هەمان سروشتی ڕێکخستن و هەمان شێوازی ڕوناککردنەوە، تەنیا شتێکی جیاواز، ئەو تابلۆیانە بوو کە لێرەدا هەڵواسرابوون، تابلۆکان هەمان ئەوانە نەبوون کە لە مۆزەخانە نهێنییەکەی موسای بابەکدا بینیبووم. مستەفای شەونم دەیزانی من چەند سەراسیمەو گێژ سەیری دیمەنەکە دەکەم، بەڵام بەسەبرەوە گووتی: جەلادەتی کۆتر، هیچ شتێک لە ژیاندا وەک دۆزینەوەی ڕابوردوو مایەی سەرسامی نییە. تۆ خۆشبەختی کە ساتێکی وەها دەژی، زۆربەی جارەکان ڕابوردوو کە وندەبێت جارێکی تر ناگەڕێتەوە.

من کە خەریک بوو دەخنکام، گووتم: بەڵام چۆن، مستەفای شەونم چۆن؟

مستەفای شەونم لە ژێر ڕوناکی گلۆپەکاندا ڕەنگی وەک جاران سوور

نەبوو، بەڵکو لە مەخلوقێکی بێڕەنگ دەچوو کە لە دەورو زەمانێکی ترەوە هاتبێت، دەیزانی ئەمە لەو تەلیسمانەیە کە مرۆڤ شێتدەکات، کورسی و مێزێکی چکۆلانە لە سوچێکی هۆڵەکەدا بوو وەک پەلی منداڵێک بگرێت، دەستی گرتم و منی لەسەر کورسییەکە دانیشاند و خۆی بە پێوە کەوتە قسەکردن و گووتی: بەر لە هەشت مانگ، من لە کۆبوونەوەیەکی گەورەی «پاسەوانانی جوانی» دا بەشداربووم. من دەزانم دکتۆر موسای بابەک باسی هیچ شتێکی بۆ نەکردویت، چونکە نەدەبایە باسیبکات، تەنیا ئەوانە بۆیان هەیە نهێنی پاسەوانەکان بزانن کە خۆیان دەبن بە پاسەوان، تەنیا ئەوانەش دەبن بە پاسەوان کە ژیانی خۆیان بۆ ڕزگارکردنی هونەرو حەقیقەت تەرخاندەکەن، دکتۆر موسا لەسەرەتاوە دەیزانی کە تۆ یەکێکی لەوانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبیت بە پاسەوان، بەڵام تەنیا لە سنوورێکی دیاریکراودا بۆی هەبوو شتەکانت بۆ باسبکات، لە سنووری پێشانگاکەی خۆیدا، لە سنووری ئەوەی گەر هاتوو ڕۆژێک شتێک ئاشکرابێت تەواوی ئەم جیهانە نەکەوێتە بەر مەترسییەوە، چونکە ئەمە جیهانێکە هیچ ئادەمیزادێک بۆی نییە بیخاتە ژێر مەترسییەوە.

مستەفای شەونم ئێستا لەو پیاوە نەدەچوو کە لەدەرەوە دوای چەند ڕستەیەک هەناسەی سواردەبێت و قسەی بۆ ناکرێت، بەڵکو کە وچانی دەگرت بۆ ئەوەبوو بیربکاتەوە، باشتر ڕستەکانی ڕێکبخات و وشەکانی هەڵبژێرێت. کەمێک لە مێزەکە دوورکەوتەوە و تۆزێک دوگمەکانی چاکەتەکەی توند کرد و گووتی: یەکەمجار ناوی تۆم لەو کۆبوونەوەیەدا بیست، لەو کۆبوونەوەیەدا پێمان گووترا کە دەبێت هەموومان بۆ جەلادەتی کۆتر بگەڕێین، بۆ کوڕێک کە تابلۆی «شاری مۆسیقارە سپییەکان» ـی پێیە، هەموو دەمانزانی دۆزینەوەی تۆ ئاسان نییە، بەڵام دەشمانزانی دواجار نیشانەیەک، هەواڵێک، ڕووداوێک کۆمەکماندەکات و تۆ دەدۆزینەوە.

من بەسەرسامییەوە پرسیم: منتان بۆچی بوو، من کێم تا ئێوە لە دوام

بگەڕێن، ها بابایەکی ئاواره... بۆ لەدوام دەگەڕێن؟

مستەفای شەونم گووتی: دکتۆر موسای بابەک دەیەوێت تۆ ببینێت، دکتۆر موسا خۆی.

من کە خۆشییەکی بێوێنە پەڕیبووە ڕۆحمەوە هاوارمکرد دکتۆر موسای بابەک ماوە؟ دکتۆر موسای بابەک دەژی؟

مستەفای شەونم بە زەردەخەنەیەکەوە گووتی: دکتۆر موسای بابەک چاوەڕوانی تۆ دەکات، ئێستا لە جێگایەکی دووری دونیادا، لە شوێنێکدا لەسەری ئەو سەری ئەم ژێر زەمینە، لە خاڵێکی تری ئەم تونێلە ناکۆتایەدا چاوەڕوانی تۆ دەکات.

بەسەرسامییەوە گووتم: بەڵام چۆن؟ چۆن؟ من هەموو ئەو شارەم بینی دەبێتە خۆڵەمێش، هەموو ئەو شارەم بینی زەوی قووتیدەدات.

مستەفای شەونم گووتی: ناتوانم وەلامی ئەو پرسیارەت بدەمەوە، من شتێکی زۆر لەسەر ئەو چیرۆکەی ئێوە نازانم. بەڵام خۆشبەختم بەوەی ئەو باڵندانە بەو جۆرە کۆمەکیانکردم. من زۆرجار هەستدەکەم پیاوێکی زۆر بەختەوەرم.

بێئەوەی لەسەر من بوەستێت، بێئەوەی چاوەڕوانی هیچ قسەیەکی من بکات، گووتی: جەلادەتی کۆتر، من و تۆ دەبێت ئەمشەو بکەوینە سەفەرێکی دوورو درێژ، لەم ژێر زەمینەوە و بە تونێلێکی ناکۆتادا، تونیلێک نە ئەمسەری هەیەو نە ئەوسەر، بە هەموو خۆرهەڵاتدا تێدەپەڕێت. ئێستا وەزیفەی منە تەواوی ئەم یارییەت بۆ ڕوونبکەمەوە، بەرلەوەی دەستبکەین بە سەفەر دەبێت گوێم لێبگریت، دەبێت بە وردی گوێم لێبگریت.

من لە بەختەوەریدا نەمدەتوانی لەسەر کورسییەکە ئارامبگرم گووتم: گەر تۆ دەمبەیت بۆ لای دکتۆر بابەک، ئامادەم هەموو عومرم گوێت لێبگرم... هەموو عومرم.

مستەفای شەونم بە هێمنی دەستیکرد بە گێڕانەوەی حیکایەتی ئەو

جیهانە، من حیکایەتەکەتان بەو شێوەیە بۆ دەنوسمەوە کە ئاغای شەونم گێڕایەوە، من بەجۆرێک لە جۆرەکان باوەڕم بەو حیکایەتە کرد، دواتریش هەرگیز لە کەسی دیکەم نەپرسی، ئایا ئەو چیرۆکە ڕاستە یاخود هەڵە، لەو چیرۆکانەبوو کە مرۆڤ یان باوەڕ بە هەمووی دەکات یا باوەڕ بە هیچ شتێکی ناکات. مستەفای شەونم بەمجۆرە قسەیکرد:

«جەلادەتی کۆتر، ئەو پێشانگا چکۆلانەیەی کە تۆ لە شاری سۆزانییەکان بینیت و ئەم پێشانگایەی کە ئێستا لێرەدا دەیبینیت، بەشێکن لە جیهانێکی گەورەتر... دوو خاڵی بچوکن لەسەر نەخشەیەکی گەورە، کە لەوانەیە تەواوی ئەو نەخشە ڕاستەقینە لای هیچ کەس نەبێت. لە ژێر هەموو شارێکی ئەم دونیایەدا، لەژێر هەر جێگایەکدا کە هونەر هەبێت، ڕێگایەکی نهێنی و باریکیش هەیە کە من ناوی دەنێم ڕێگای جوانی. جەلادەتی کۆتر حیکایەتەکە بەمجۆرەیە کە هەزاران ساڵ لەمەوبەر، لەسەردەمی پادشایەکی زاڵمدا هێزێکی چکۆلانە دروستدەبێت کە ناویان هێزی پاسەوانانی جوانییە، وەک دەزانیت پادشاکان ڕقێکی کوێرو بێبنیان لە هونەرو جوانی هەیە، ئەو پادشا زاڵمەی ئەو سەردەمە فەرمانڕەوای زەمین بوو، سالاری هەموو ئەم دەڤەرە بوو کە لە چین و ماچینەوە تا سەر دەریای سپی درێژبۆتەوە حەز لە خانمێک دەکات، دیارە پادشاکان کە عاشقیش دەبن خۆشەویستیشیان پڕە لە شەڕانگێزی و خراپە، پڕە لە ویستی کوێر بۆ زەلیلیکردنی مرۆڤ. ئەو پادشا بەدناو و بێڕەحمە پەیکەرتاش و نەقاشێکی هەیە کە پیاوێکی دەست ڕەنگینە، مامۆستایەکی بێوێنەی هونەرە و لەمسەرە و سەری دونیاوە خەڵک دێن تا بەهرە لە هونەری ئەو وەرگرن. وەک کچەمیری زۆر لە حیکایەتە کۆنەکان، خانمی ئەو چیرۆکە دڵی لە شاهەنشا بەقینە و شەیدای ئەو پەیکەرتاشە دەبێت، ئەو سەنعەتکارە بێوێنەیەی قوڵنگی جوانی لە هەموو دەشت و دەرێکدا دەنگیداوەتەوە، دواجار شاهی دڵڕەق لە تۆڵەی ناکامییەکەی خۆیدا بڕیاردەدات کە نەوەک ئەو پەیکەرتاشە خۆی بەڵکو

هونـەر لەسـەر ڕووی زەوی بسـڕێتەوە. جەلادەتـی کۆتـر، لـەو سـەردەمەدا پادشـا هێزەکانی دەنێرێت لـە هەمـوو دەڤەرەکانـی ئـەو شاهنشینە بێسنوور و بێتخوبەدا چی کارێکی نەقاشـی هەیە، چی نەقاشێک و چی پەیکەرتاشێک هەیە، چی شـاعیرێک و چی نوسـەرێک هەیە، چی کتێبێک و چی کتێبخانەیەک هەیـە بیسـووتێنن. لـە زۆربـەی شـارو هەرێمەکانـدا هونەرمەنـدەکان دەگـرن و بـە زیندوویـی دەیانسـووتێنن، نـە دەشـت و نـەدەر، نـە چیـاو نـە سـەحرا پەناگایـەک نابەخشـنە ئـەو ڕۆحـە ناسـکانەی بەسـەر زەمینـی ئـەم دەڤـەرەدا ئاوارەدەبـن، بێهـودە لـەم شـارەوە هەڵدێـن بـۆ ئـەو شـار. وەک حیکایەتەکـە دەگێڕێتـەوە زەمیـن بـە جۆرێـک لـە ڕووی شـاعیرو شـێوەکارو ئەهلـی فەنتازیـادا تەسـکدەبێتەوە، دواجـار زۆر لـە هونەرمەندانـی زەمـان. لـە نەقاشـان و ئەهلـی وشـە لـە شـوێنێکدا کۆدەبنـەوەو بڕیـاردەدەن سـوپایەک دروسـتبکەن نـاوی سـوپای پاسـەوانانی جوانـی لێبنێـن، سـوپایەکی نهێنـی کـە ئیشـی ئەوەیە خەزنەکانـی ئـەدەب و هونـەر بپارێزێـت، توحفەکانـی جوانـی هەڵگرێـت، لـە مەترسـی بیانپارێزێت. سـوپایەک ئیشـی ئەوەیە تەنیا حەشـارگاهێکی سـەلامەت بۆ هونەر دروسـتبکات، کتێب هەڵگرێت، دەسـتنوسـەکان لە سـووتان و فەوتان ڕزگاربـکات. لـەو پێنتـەوە کـە هونەرمەنـدان تیادەوەسـتن، لـە ناوەڕاسـتی ئـەو بازنەیـەوە کـە لـەدەوری کۆبوونەتـەوە دەسـتدەکەن بەدروسـتکردنی تونێلێکـی پێچاوپێچـی مـەزن، ئاخـۆ چ هێزێـک هەبـووە یاریدەی ئەوانـەی داوە بتوانن ئەو تونێلـە درێـژ و بێوێنەیە دروسـتبکەن، چ سـیحرێک و چ ئیلهـام و چ توانایەک؟. بـەڵام جەلادەتـی کۆتـر، دواجـار کـە سـەیری گـەورەیـی ئـەم تونێلـە دەکەیـت و بـە توانـای مـرۆڤ بەراوردیدەکەیـت، شـتێکی ئاسـایی دێتـە بەرچـاوت. مـن کـە سـەیریدەکەم وەک شـتێک لـە جۆری شـورای چیـن، بەڵام لـە ژێـر زەویدا دێتـە بەرچـاوم، شـورایەک کـە هونەرمەنـدان لـە بـری ئـەوەی بـۆ دیفـاع لـە پادشـاکان دروسـتیبکەن بـۆ بەرگـری لـە خۆیـان دروسـتیانکردوە، شـورایەکی گـەورە لـە ژێـر زەویـدا، لـە دیویکـی نادیـاری دونیـادا بـە نـاو سـەردەمەکان و

ڕۆژگارەکاندا دێت و لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ بە نهێنی ماوەتەوەو تا قیامەتیش هەر بە نهێنی دەمێنێتەوە. پێدەچێت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ و ساڵ لە دوای ساڵ، شار بەدوای شار و پادشا لە دوای پادشا ئەم تونێلە گەورەبوبێت. لەسەردەمی جیاواز جیاوازی ئەم خۆرهەڵاتەی من و تۆدا پادشای دیکە دروستدەبێت کە حەزیان لە خاپوورکردنی هونەرە، هونەرمەندانی دیکە دروستدەبن، پاسەوانانی تر دروستدەبن کە ئەوانیش بێئاگا قموچی خۆیان دروستدەکەن و خەندەکی نهێنی خۆیان لە ژێر زەوییەوە ڕادەکێشن، لەگەڵ تێپەڕینی زەماندا ئەم تونێلە دوورو جیاوازنە هەموو دەگەنەوە بەیەک، بەشێک لەم خەندەکانە ڕاستین و بەشێکی مرۆڤ تەنیا بە کۆمەکی فەنتازیا دەتوانێت پێکەوە گرێیانبدات، تەنیا کەسانێک دەتوانن بەم تونێلە دوورو درێژانە سەفەربکەن کە پاسەوانی هونەرو ئەمیری فەنتازیان... لەگەڵ دروستبوونی هەموو شارێکدا، ڕێگایەکی شاردراوەو نهێنی لێدەکەوێتەوە کە ڕێگای هەڵهاتنی جوانییە لە فەوتان، لە گەمژەیی. جەلادەتی کۆتر، هونەر بەدرێژایی دەیەها سەدە لەم سەر زەمینەدا لە ڕاکردنێکی بێوچاندایە. تەنیا لە پادشاکان و جەلادەکانیش ڕاناکات، لە گەمژەکانیش ڕادەکات، بەتایبەت ئەو گەمژەو دەجالانەی جلی هونەرمەندو شاعیر لەبەردەکەن، لەو هونەرمەندانە ڕادەکات کە مانای جوانی خاپووردەکەن و لە قووڵایی خۆی بەتاڵیدەکەنەوە. جەلادەت هونەر باڵدارێکی ئەفسانەیی نەبینراوە، کە تەنیا ئەوانە دەیبینن کە چاوێکی تر لە ناویاندایە... ئەم تونێلەش تونێلێکی نهێنی و نەبینراوە تەنیا ئەوانە سەفەری پیادەکەن کە جوانییەک لە دڵیاندایەو بەرەو جاویدان دەڕۆن، هاوارێک لە دڵیاندایە و لە مردن ڕادەکەن، مرۆڤ یان دەبێت پاسەوانی جوانی بێت یاخود لە مردن ڕابکات ئەوسا دەتوانێت بێتە ئەم مەملەکەتە نەبینراوو گەورەیەوە... لە ژێر هەر شارێکی ئەم وڵات و سەرزەمینەدا کۆمەڵێک پێشانگای ئاوها نهێنی و کتێبخانەی نهێنی هەیە، کە تەنها ڕێبوارە ڕاستەقینەکان دەتوانن بیگەنێ، ئەم بەرهەمانە لە

ڕۆژگاری ئاسوودەیی و ئاشتیدا دێنە دەرەوە و دەبن بە موڵک و ماڵی هەموومان، لە ڕۆژگارانی تریشدا دەچنە ژێرەوە و وندەبن و دەوەستن تا لەسەردەمێکی تردا وەک خۆیان یان بەشێوەی تر دێنەوە دەرێ. تەمەنی پاسەوانانی جوانیَ و تەمەنی ئەم خەرەندە لەوە دێرینترە کەس بزانێت چەندە یان بتوانێت بیپێوێت، خودی پاسەوانانی جوانیش، ئەگەرچی هەریەکەیان دەزانن بەشێکن لە سوپایەکی گەورەتر، بەڵام زۆربەی کات بە تەنیا ئیشدەکەن. زۆربەی جاریش بە تەنیا دەست پێدەکەن. هەر یەکەیان ژێر زەمینێکی نهێنی بۆ خۆی دروستدەکات و دواتر سەیردەکات ئەوەی ئەو دروستیکردوە بەشێکە لە ڕێگایەکی گەردونی گەورەتر، خاڵێکە لەسەر تۆڕێکی نهێنی. زۆرجار مرۆڤ چەندەهاساڵ ئیشدەکات ئەوسا یەکێک لە پاسەوانە ڕاستەقینەکان دەدۆزێتەوە، لەوانەیە چەندین سەدە بێت و بڕوات پاسەوانێکی ڕاستەقینە دروستنەبێت کە ڕزگارکردنی هونەر بکات بە ئیشی خۆی. لەوانەیە یەکێک چەندەها ساڵ کاربکات و ئاگای لە پاسەوانەکانی تر نەبێت. چەلادەت مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت هەموو جوانی ڕزگاربکات، هەمیشە بەشێک لە ڕاستی و جوانی دەڕوات و ڕوودەکاتە جێگایەکی نادیاری تر... تۆ ئێستا بۆیە لێرەیت تا کۆمەکمان بکەیت. لێرەوە لەم ژێر زەمینەوە ڕێگایەکی دوور و درێژ دەڕوات کە من هەرگیز نەگەیشتوومەتە کۆتایی، من و تۆ ئەمشەو لێرەوە بەڕێدەکەوین».

دوای ئەوەی کە ئەو بەشەی چیرۆکەکەی تەواوکرد، کەمێک ماندوو بەرابەرم وەستا و گووتی: دەزانم هێشتا زۆر پرسیار ماوە وەڵامیبدەمەوە، من ئیشم ئەوەیە تا ئەو شوێنەی ئاگادارم هەموو شتێک ڕوونبکەمەوە، هەموو دەزانین تۆ سەفەرێکی زۆر درێژترت لە بەردەمدایە. سەرەتا حەزدەکەم لە پەیوەندی خۆم و دکتۆر موسای بابەکەوە دەست پێکەم. من دوای کوژرانی لەیلای نیلۆفەر، چەند ساڵێک لە هەموو شتێک دابڕام،

وەک پیاوێکی مەئیوس و بێهیوا ژیانم لە چێشتخانەکاندا دەبردەسەر، من ئێستاش هەر نائومێدم و هەر لە نێوان چێشتخانە و جگەرخانە و چایخانە قەبزو تاریکەکانی ئەم شارەدا دەژیم، بەڵام جەلادەتی کۆتر شتێکم هەیە زۆر لەو بێتاقەتی و ناڕەحەتییەم کەمدەکاتەوە، ئەو ڕۆژە بۆم باسکردیت کە دوای لەیلا من تابلۆکانی خۆمم سووتاند، لە ڕاستیدا دوای لەیلای نیلۆفەر نەمدەویست پەیوەندییەکم بە هونەرو نەقاشییەوە بمێنێت. دیارە هەندێک ئیشم هەبوو لێرەو لەوێ، لای هاوڕێ و ناسیاو و برادەرانی دوورو نزیک کە دەستم پێیاندا نەدەگەیشت، بەڵام هێدی هێدی هەموویانم بیرچووەوە. جەلادەتی ئازیز دوای سێ ساڵ لە مردنی لەیلا بۆ یەکەمجار چوومەوە ئەو چایخانە چکۆلانەیەی کە شێوەکارو هونەرمەندەکان لێی کۆدەبوونەوە، وەک دەستێکی نهێنی بەرەو ئەو جێگایە بمبات، دەستێک لە من گەورەتر، شتێک لە من بەهێزتر، چاوێک لە ناوەوە دادەگیرسێت و تینت دەداتێ و ناچارتدەکات بڕۆیت. لەو چایخانەیەدا گەنجێکی چکۆلانەی شەرمنم ناسی، کوڕێکی ڕەشتاڵەی قژدرێژ ناوی «سەفا تەیفوور» بوو، من وەک تۆ داوەتی چێشتخانەیەکم کرد و لەسەر خواردنەکە باسی ژیانی خۆی بۆکردم، دواجار کەزانی ماڵێکی گەورەم هەیە، داوای لێکردم تابلۆکانی بۆ هەڵگرم، چونکە سەفەرێکی درێژی لە بەردایە، سەفەرێکی دوور و درێژ. من ئەوکات سوێندم خواردبوو نەهێڵم هیچ تابلۆیەک ڕوو لە ماڵم بکات، سوێندێک تەنیا یەکجار شکاندم و جارێکی دیش نایشکێنمەوە. بەڵام چاوی غەمگینی ئەو کوڕە، ئەو سەفەرە نادیارەی کە لە بەردەمیدا بوو وای لێکردم بیر لە چارەیەک بکەمەوە، ئەوکات باوکم بیری لەدروستکردنی چەند مەخزەنێکی زۆر گەورە دەکردەوە، چەند مەخزەنێک دەستبدات مرۆڤ گەنم و جۆو ئارد، توتن یاخود شەکری تیا کۆبکاتەوە، بەوەدا موڵکەکانی ئێمە زۆربەی لەدەرەوەی شاربوون، ئەم زەویانەش ئەوکات پارەیەکی ئەوتۆیان نەدەکرد، لەبەرئەوە خەڵک زیاتر ڕووی لەوە بوو مەخزەنیان تیا

دروستبکات، بیانکات بە کێڵگەی بەخێوکردنی مریشک و شتی لەو بابەتە. من ئەوکات بەشێک لەو پڕۆژەیەم سەرپەرشتیدەکرد، واهات بە خەیاڵمدا کە دەتوانم تابلۆکانی سەفا تا لەسەفەر دێتەوە لە یەکێک لەو ژووره خاڵییانەدا هەڵگرم. بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵیدا ڕێکەوتم و چووم بۆسەیری ئیشەکانی، کوڕێکی بێئەندازە بەهرەمەندبوو، کە کارەکانیم بینی سەرەتای دەرکەوتنی بلیمەتێکی نیگارکێشم تیا بینییەوە، چەشنی نیگارو سروشتی هێمنی خۆی زیاتر وای لێکردم کونجێک چۆڵبکەم و ئیشەکانی لە شوێنێکی گونجاودا بپارێزم. جەلادەتی کۆتر، ئەو بینا کۆن و ڕوخاوانەی سەرەوە پاشماوەی ئەو مەخزەنە گەورانەن کە دەبایە ڕۆژێک ببوونایە بە عەمباری توتن و دانەوێڵە، بەڵام قەدەر وایکرد ببن بە بەشێک لە زەوییەکی خەیاڵی کە لەبری بەروبوومی زەوی، بەروبوومی ڕۆح دەپارێزن. ئەو ڕۆژەی کە تابلۆکانمان گواستەوە بۆ ئێرە ئەوە دواهەمین ڕۆژ بوو کە من سەفا تەیفوورم تیا بینی. سەفا ڕۆیشت، بوو بە پێشمەرگە و لە دوازدەهەمین ڕۆژی پێشمەرگایەتیدا شەهید بوو، بەڵام ئیشەکانی بوون بەسەرەتای دروستبوونی پنتێکی دیکە لە ئۆقیانوسی هاوارەکان. ئا، جەلادەت بیرم چوو پێتبڵێم کە ئێمە بەم تونێلە درێژە دەڵێین «ئۆقیانوسی هاوار». ئەوە وشەی نهێنی نێوان ئەوانەیە کە پاسەوانی جوانین، هیچ کەس بۆی نییە ئەو وشەیە بزانێت تا نەبێتە باوەڕپێکراوی گەورەی ئێمە، ئێستاش تۆ یەکێکیت لە ئێمە، یەکێکی لە بازنەکەدا. لە بەرئەوە گەر نەزانیت «ئۆقیانوسی هاوار» گوزارەی نهێنی نێوان پاسەوانەکانە، ناتوانیت بەم دیوە خەیاڵییەی دونیادا بگەڕێیت. من پێتدەڵێم زۆرجار گەر لە شوێنێکدا دەرگاکان نەکرانەوە، گەر یەکێک لێی پرسیت «تۆ لە کوێوە هاتوویت؟» گەر نەڵێیت من لە «ئۆقیانوسی هاوار» وە هاتووم کەس دەرگات لێ ناکاتەوە. ئۆقیانوسی هاوار نازانم چییە، وابزانم ناوی تابلۆیەکە، یاخود لەوانەیە ناوی شیعرێک بێت، یان کتێبێک، من واهەستدەکەم ئەو وشەیەم زۆر بەرچاوکەوتووە،

بەڵام گرنگ نییە، دینە دێرینەکان بەشێک لە دۆزەخیان ناودەنا ئۆقیانوسی هاوار، مرۆڤ زۆرجار دڵی خۆی ناودەنێت ئۆقیانوسی هاوار. بەڵام کاکی کۆتر، ئەم ئۆقیانوسی هاوارەی ئێرە مانایەکی تری هەیە... بەدرێژایی مێژوو هونەر هەوڵیداوە شتێکی ئارام بێت، بەشێک بێت لە تێرامان و بێدەنگی، کەچی هەمیشە زاڵمەکان، دیکتاتۆرەکان، بکوژانی جوانی هونەر ناچاردەکەن خیانەت لە بێدەنگی و رامان بکات و ببێتە هاوار.

دوای شەهیدبوونی سەفا تەیفوور، من لەو چایخانە چکۆلەیەدا سەدان شاعیرو هونەرمەندم ناسی، هەندێکیان ماون، هەندێکیان مردن، هەندێکیان ڕۆیشتن و ئیشەکانی خۆیان بۆ من بەجێهێشت، هەندێکیشیان وازیان لە هونەر هێناو بە بێدەنگی دەژین. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تابلۆی نیگارکێشی غەمگین و نەناسراو لەو خانووبەرە خامۆشەدا کۆبووەوە، مانگ لە دوای مانگ هونەرمەندی بێجێگا و بێپاشەڕۆژم ناسی کە لەسەر ئەم زەوییە وەک ئاوارە دەژیان. کەسانێک ئیشەکانی خۆیان دەهێنا بۆ من بۆیان هەڵگرم، من زۆر شەو تابلۆکانم دەردەهێنا و سەیرمدەکردن، دەمزانی هەندێک لەو هونەرمەندانە نابینمەوە، دەمزانی هەندێکیان جارێک نیگارێکیان دروستکردوەو ساتێک بوون بە هونەرمەندو ئیدی گەڕاونەتەوە بۆ ناو ئیقاعی ئاسایی ژیان، هەندێکیان وەک من هێزێکی گەورەتر، ترسێکی قووڵتر لە ئیرادەی خۆیان هونەری بیربردبوونەوە. ساڵی ١٩٧٩ ئەو ساڵەی دیکتاتۆر بە تەواوی دەسەڵاتی گرتە دەست، کەوتە گرتن و کوشتنی شیوعییەکان، من لەو ساڵەدا سەدان تابلۆم کۆکردەوە کە زۆربەیان ئیرسی ئەو هونەرمەندە کۆمۆنیستانە بوون کە بەعس لە ناوی بردن، هەر لەو ساڵەدا من دکتۆر موسای بابەکم ناسی، ڕۆژێکیان چووم بۆ چایخانە و پیاوێکی سەرسپیم بینی، بە جووتێک چاوی کزەوە لەگەڵ نیگارکێشێکی ناسیاودا تاوڵەیدەکرد، هەموو جارێک زارەکانی هێند توند هەڵدەدا دەکەوتە دەرەوەی تەختەکە و هەموو جارێکیش هەر دووکیان

هێند توند پێدەکەنین چاخانەکە دەلەرییەوە. هەموو چاخانەکە لەدەوری مێزەکەیان کۆبووبووەوە، کە من چوومە ژووری موسای بابەک پڕ بە چایخانەکە دەیگووت «ئیکی بیر». هاوڕێکەی دەیگووت «بە یەک چەهارو بیژ قاپووتێکی وات بۆ دەدرووم، سولتان عەبدولحەمید لەبەری نەکردبێت». موسای بابەک پێدەکەنی و دەیگووت «من ئەو زاره بناسم، چەهارو بیژی تیا نییە». من پێشتر موسای بابەکم نەبینی بوو، تا ئەو کات دکتۆرێکیشم نەبینیبوو بێتە ئەو چایخانەیەوە. بەفزولێکەوە لە هاوڕێیەکم پرسی: ئەم پیاوە کێیە؟ گووتی: دکتۆرێکی بەغدادییە، کوردی بەغدایە، دەڵێت گەلەرییەکی هەیەو هاتووە کۆمەڵێک تابلۆ بکڕێت. دەیەوێت لەسەر مێژووی هونەری نیگارکێشان لەم بیست ساڵەی دواییدا کتێبێک بنوسێت. پیاوێکی سەیره بەر لە تۆ لە ناوەڕاستی چاخانەکەدا باسی ئۆپرای «هۆڵەندی باڵدار» ی ڤاگنەری بۆ کردین، حیکایەتی ئەو پیاوەی تەنیا عەشق لە لەعنەتێکی درێژ ئازادیدەکات.

کە لە یارییەکەیان بوونەوە، وەک یەکێک وێنەی منی نیشاندابێت، ڕووی تێکردم و گووتی: کاک موستەفا، من یەکێک لە نیگارەکانی تۆم بینیوە، حەیفە تۆ ڕەسم ناکەیت.

من لەو باوەڕەدا نەبووم کەسێک لەبیری مابێت من ڕۆژێک لە ڕۆژان نیگارکێش بووم. وەک ئەوەی هەموو شتێکی لە سەر من بیستبێت، بە چاوە کزەکانی سەیریکردم و گووتی: من ناوم موسای بابەکە، حیکایەتی تۆم بیستووە، پۆرترێتێکی تۆم هەیە، پۆرترێتی خانمێکە لە ژێریدا نوسراوە لەیلای نیلۆفەر.

بە سەرسامی سەیرمکردو پرسیم: بەڕێز ئەو پۆرترێتەت لە کوێ دەستکەوتووە؟

سەیریکردم و گووتی: بەر لە دوو ساڵ لە تابلۆ فرۆشێکی عەرەبم کڕییەوە.

موسای بابەک هەموو چیرۆکی من و نیلۆفەری دەزانی، وەک ئەوەبوو بەدوای چیرۆکی ئەو تابلۆیەدا گەڕابێت، فریوی ئەو نیگا سیحراوییەی لەیلای خواردبێت. گەڕیدەیەکی سەیربوو، بەدوای یەکێکدا دەگەڕا تابلۆی بۆ کۆبکاتەوە، تا لەگەڵیدا دانەنیشتم و بەوردی قسەمان نەکرد نەمزانی مەبەستی چییە؟. کە پێمگووت، من سەدان تابلۆم هەیە بۆ سەیریان ناکەیت؟. وەک ئەوە بوو چاوەڕوانی ئەو ساتەی کردبێت، گووتی: ڕاستیت دەوێت من بۆ سەیرکردنی ئەو تابلۆیانە هاتووم.

جەلادەتی کۆتر هەمووومان لەسەرەتاوە پاسەوانی جوانی بووین بێئەوەی بزانین. مرۆڤ ناتوانێت هیچ نەبێت و ببێت بە پاسەوانی جوانی، مرۆڤ یان وەک پاسەوان دێتە ئەم دونیایەوە یاخود هەرگیز نابێتە پاسەوان. ئەمە وەزیفەیەک نییە مرۆڤ خۆی تێدا بدۆزێتەوە، حیرفەیەک نییە فێریببێت.

ئەو ڕۆژەی موسای بابەک ئەو ژێر زەمینەی دروستکرد هیچی لەسەر ئەم ئۆقیانوسە نەدەزانی، ئەم ئیشە بە پێچەوانەی هەموو ئیشەکانی دونیاوە، مرۆڤ دەبێت خۆی بێ هیچ کۆمەک و بێ هیچ مامۆستایەک فێرببێت. هێند هەیە مرۆڤ ڕۆژێک دەستدەبات تابلۆیەک هەڵواسێت، لەو ساتەدا کە خەریکی داکووتانی بزمارێکە دەرگایەکی نهێنی لە بەردەمیدا دەکرێتە بەرەو ئەو جیهانە دەیبات. سەرەتا دەڕوات و دەڕوات و نازانێت بۆ کوێ دەچێت، لەوانەیە چەندە ها شەو و چەندەها ڕۆژ بڕوات تا دەگاتە یەکەمین بنکە، تا تێدەگات ئەو بەشێکە لە تۆڕێکی مەزن، گەڕیدەیەکە بە ڕێگای کەسانێکی تردا دەڕوات کە پێشتر لێرەوە ڕۆیشتوون.

موسای بابەک ساڵی ١٩٧٩ کە هات بۆ ئەمشارە، چەندین ساڵ بوو لەو ئۆقیانوسەدا دەژیا. ئیشی ئەوەبوو بۆ پاسەوانی نوێ بگەڕێت، بتوانێت زۆرترین کاری هونەری ڕزگاربکات، ئەو سەردەمە سەردەمی سەرهەڵدانی دیکتاتۆرەکان و جەنگەکانیان بوو. ئەوساڵانە بوو موسای بابەک بە هیمەتێکی بێوێنەوە کاریدەکرد، لەو ساڵانەدا دەیان هەزار تابلۆی لە فەوتان

ڕزگارکـرد، لـە هەمـوو شـارەکاندا تۆڕێکـی گـەورەی دروسـتکرد، چەندەهـا بنکـە و ڕێـگای تـازەی کـردەوە. ئـەو نەخشـەی ئـەم ژێـر زەمینـەی بـۆ مـن هێنـا. سـەرەتا دوودڵ بـوو لـەوەی هیچـم بـۆ باسـبکات، دوودڵ بـوو لـەوەی پیاوێکی قەڵـەو کەڕ بەزەحمـەت دەتوانێت هەناسـەبدات، ئاخۆ دەتوانێت ببێت بـە پاسـەوان یاخـود نـا. تـا ڕۆژێـک هـات بـۆ ماڵـم و ئـەو تابلۆیـەی بینـی، تابلـۆی شـاری مۆسـیقارە سـپییەکان. ئەو تابلۆیـەی کـە ڕەدیـف و هاوشـێوەی ئـەو تابلۆیـەی خـۆی بـوو کـە ئێسـتا تـۆ دەیپارێزیت، ئەو تابلۆیـەی کـە مـرۆڤ دەبێت بیپارێزێـت چونکـە هـاواری دونیایەکـی تـرە. کـە ئـەو تابلۆیـەی بینـی ڕوخـا، دەسـتیکردە ملـم و گووتـی: مسـتەفای شـەونم ئـەوە نهێنـی هـەرە گـەورەی ژیانمـە. لـەو سـاتەدا ئیـدی مـن بـووم بـە یەکێـک لـە پاسـەوانەکان. بـەڵام ئەوکاتیـش لەسـەر ئـەم تـۆڕە گەورەیـە هیچـی نەگێڕایـەوە، هێنـد هەیـە پێشـنیاری بـۆ کـردم ئـەو تابلۆیانـەی مـن پاراسـتوومن لـە شـوێنێکی مەحکەمتردا بپارێزرم تـا ڕۆژێک دێت مۆزەخانەیـەک دەکەینەوە و ناویدەنێین مۆزەخانـەی مسـتەفای شـەونم. بـاوەڕی وابـوو ڕۆژێـک دێـت سـەرزەوی پڕدەبێت لـە مۆزەخانـەی گـەورە گـەورە کـە ئیشـی ئـەو کەسـانە نیشـاندەدات کەسـەردەمانی تـرس و مـردن هونەریـان پاراسـتووە. ئەوکات مـن قوتابییەکـی ئەوبووم، چەندین جار لەسـەفەرە خێراو نهێنییەکانیدا شـەو لەلای مـن مایەوە، هەمیشـە بـۆ یـەک شـەو دەهـات و دەڕۆیشـت. مـن لەسـاڵانی هـەرە سـەختی شـەڕدا لـەو ژێـر زەمینـەدا کارمدەکرد، بـە ڕۆژ بـەدوای تابلـۆدا دەگـەڕام و بـە شـەو لـە نـاو نیگارو وێنـەو دەریـای ڕەنگەکانـدا وندەبـووم. جەلادەتـی کۆتـر، مـرۆڤ بـەر لـەوەی ئـەو دەرگا نهێنییە بدۆزێتـەوە کـە بـە هەمـوو ئۆقیانوسـی هـاواردا دەیبـات، ئـەو ڕێگایـە لـە ڕۆحـی خۆیـدا دەبینێـت، هێنـد لـە ڕەنـگ و نیگاردا نوقمدەبێت شـەپۆلەکان دەیبـەن، ڕۆژێـک تێدەگات کـە لـە شـوێنێکی ئـەو ژێر زەمینـەدا دەرگایـەک هەیـە کـە بەسـەر هەمـوو گـەردونـدا دەکرێتـەوە، تێدەگات سـەفەری جوانـی لـەوە گەورەتـرە لـە نیگارێکدا، لـە پێشـانگایەکدا، لـە

شاریکدا، لە ڕۆژگاریکدا دیل ببێت... مرۆڤ هەندێجار خۆی دەبێت بەتەنیا ئەو ڕیگایە ببڕێت، هەندیجاریش دەبێت شایستەی ئەوە بێت لەگەڵ یەکێک لە پاسەوانەکانی جوانیدا بڕوات تا هەموو نهێنییەکانی بۆ ڕوونبکاتەوە... جەلادەتی کۆتر، تۆ ئەمشەو لەگەڵ مندا ئەو سەفەرەدەکەیت، ئەمشەو من و تۆ پێکەوە دەکەوینە ڕێ.

من هەستم بە خۆشییەکی گەورەدەکرد، هەستی ئەوەی دواجار بەرەو ناوەڕاستی ئەو گەردەلوولە سەفەردەکەم کە لە مێژە چاوەڕوانی بووم. من لە مستەفای شەونم زیاتر پەلەم بوو بکەوینە ڕێگا.

ڕێگای ئەو گەشتەمان لە هیچ ڕێگایەکی دی نەدەچوو کە مرۆڤ لە ژیاندا دەیگرێتەبەر، کە لەو ژێرزەمینە چووینەدەرێ ماوەیەک بە تونێلێکی تاریک و بێتروسکەدا ڕۆیشتین، دوای ماوەیەک زەمینێکی ڕوناکتر هاتە بەردەممان، بۆ یەکەمجار هەستمکرد، لە بری ئەوەی بە تونێلێکدا بڕۆم بە خەندەکێکی شوشەدا دەڕۆم، ئاسمان لە ژوور سەرمانەوە پڕبوو لە ئەستێرە، بەڵام جۆرە ئەستێرەیەک جیاواز لە ئەستێرەکانی دی، ئەستێرەی پرشنگدارو نرم، وەک ئەوەی مرۆڤ لە تابلۆیەکدا بیانبینێت، هەوا بە جۆرێک ساف بوو لە هەوای سەر زەمین نەدەچوو، ئێمە بێوچان دەڕۆیشتین و ماندوو نەدەبووین، گەشتێکی دیکەبوو لەو گەشتانەی من هەرگیز لە یادیناکەم، لەدوورەوە سێبەری شارەکانم بینی، چرای گوندەکان و لوورەی گیاندارە کێوییەکان، من و مستەفای شەونم لە دوو ڕەبەن دەچووین کە بەرەو دەیرێکی دوور کەوتبینەڕێ، من بەو چاکەتە سپییە کۆن و ڕیشە درێژ و نیگا سەرسامەی خۆمەوە، مستەفای شەونم بەو قەدوقامەتە بەرز و چاکەتە ڕەشە گەورەیەوە، بە قژێکی درێژەوە لە نامەبەری یەکێک لە پاپاکان دەچوو بۆ سوڵتانێکی خۆرهەڵات. یەکەمین وێستگەی ئێمە لە ئۆقیانوسی هاوارەکاندا پێشانگایەکی دیکە بوو، پێشانگایەکی سەیر پڕبوو لە وێنەی کرێکارانی نەوت، سەدان تابلۆم بینی

کە خەڵکانێک دروستیانکردبوون نزیکبوون لە ئازاری ئەو کرێکارانەوە، لەو شەوەدا بە چەندەها وێستگەدا تێپەڕین، بە ناو دەیەها کتێبخانەی نهێنی و پێشانگای نهێنی و مۆزەخانەی ژێرزەمینیدا کە زۆربەیان لە خەڵک و پاسەوان خاڵی بوون، من لەو گەشتەمدا ئێرسێکی دووروودرێژی کتێب و تابلۆو پەیکەر و توحفەی دێرین و نوێم بینی کە سەدە لە دوای سەدە دروستکرابوون و شاردرابوونەوە، سەدە لە دوای سەدە دروستکرابوون و دەرفەتیان بۆ نەخولقابوو بێنەدەرێ. مستەفای شەونم لە هەندێک شوێندا دەوەستاو هەندێک تابلۆی نیشاندەدام، هەندێک پەیکەری کۆن و نوێ، بەرهەمگەلێک کە لە ڕۆژگاری سۆمەرییەکانەوە تا ئەمرۆ درێژەیان هەبوو. مستەفا دەیگووت «جەلادەت هونەر تەنیا لە دیکتاتۆرەکان ڕاناکات، لە چەند وەحشییەکی وەک ئاغای سەرەک کۆمار هەڵنایەت، زۆرجار هونەر و کتێب و جوانی ناچاردەبن لە ترسی جەهل خۆیان بشارنەوە، ئەو بینەر و خوێنەر و ڕەخنەگرانەی لە جوانی تێناگەن و حوکمی بەسەردا دەدەن، ترسناکترن لەو پۆلیس و سەربازانەی ئاگریان تێبەردەدەن. هەندێجار سەدەیەک تێدەپەڕێت و ڕۆحێک سەرهەڵنادات بە قووڵی لە مانای هونەر تێبگات، لە شارستانییەتی ئێمەدا، ساڵان دێت و دەڕوات، هونەر لەگەڵیدا تەنیا وەک هەتیوێکی بێکەس لەدایکدەبێت و بیردەچێتەوە... هاوارەکان لەم ئۆقیانوسەدا وندەبێت، جەلادەت هەر هەرێمێک بتوانێت دیکتاتۆرو جەلاد زۆر بەرهەمبهێنێت، لەگەڵیشیاندا هونەرمەندی درۆزن، ڕەخنەگری گەمژە، بینەری کوێر زۆر بەرهەمدەهێنێت».

ئێستا بەتەواوەتی نازانم چەند بە ڕێگاوەبووین، من هەستدەکەم بە دیوێکی تری کات و بە ڕوویەکی تری شوێندا سەفەرمدەکرد، هەرگیز بۆم گرنگ نەبوو چەند دەڕۆم و بە کوێدا دەڕۆم، لە هەندێ شوێن هەندێک پاسەوانمان بینی، لە هەندێک جێگادا پاسەوانەکان ناوی خۆیان نابوو کلیلدار یان زێوان، لە بەر هەندێک دەرگادا دەنگێک لێیدەپرسین «لە کوێوە

هاتـوون؟» ئێمـەش دەمانگـووت «لـە ئۆقیانوسـی هـاوارەوە». زۆربەیـان مستەفای شـەونمیان دەناسـی. مـن نەمدەزانی چەند شـەو هەڵهاتـووەو چەند ڕۆژ ئاوابـووە، هەندێجـار بەسـەر لم و هەندێجـار بەسـەر گیـای بەهەشـتیدا دەڕۆیشـتین، دیـواری شوشـەیی خەندەکـەکان وێنەیەکـی ڕەنگینـی دونیایـان پێشکەشـدەکرد. دواجـار شـەوێکی تاریـک گەیشـتینە بـەر دەروازەیـەک و لـە تونێلێکی تەسـکەوە بـەرەو نێو سـەردابێکی گـەورە پەڕینـەوە، مسـتەفای شـەونم خۆی کلیلێکی تایبەتی پێبوو کە دەیتوانی ئـەو دەرگایانە بکاتـەوە کە ناکرێنـەوە، سـەردابێکی پڕ تابلۆو پڕ نیگار کە بـە خێرایی بڕیمـان و بـەرەو نـاو ماڵێکی خاڵـی سـەرکەوتین. مـن چاوەڕوانمدەکرد دکتـۆر موسـای بابـەک لـەو ماڵـەدا ببینـم، چـاوەڕوان بـووم وەک جـاران لـە هەیوانێکـی خاڵیـدا لـە دەرپێ و فانیلەیەکی سپیدا بیبینمـەوە، یان ببینم بە خۆی و کەمانەکەیـەوە لـە باغێکدا خەوتبێت، بـەڵام دکتۆر بابـەک لـەوێ نەبوو، ماڵێکی چۆڵ بـوو لـە شـارێکی گـەورەدا، ئێسـتا دڵنیابـووم دکتـۆر بابـەک لـەم شـارەدایە، لـەو کاتـەوەی چووبووینـە نـاو کوچەکانـی ئـەو شـارە مسـتەفای شـەونم قسـەی نەدەکـرد، شـارێکی گـەورە گـەورە، مـن پێشـتر هەرگیـز شـاری وا گـەورەم نەبینیبـوو. سـەیربوو لـە شـەوێکی وەهـا تاریکـدا هـەزاران ئوتومبێـل بـە خێراییەکـی شـێتانە دەڕۆیشـتن و بـە دەگمـەن ڕێکەوتـی ڕێبوارێکـی پیـادەت دەکرد. مـن و مسـتەفای شـەونم پتر لـە چـوار کیلۆمەتـر ڕۆیشـتین، دواجـار گەیشتینە بینایەک بە قەد گێلاسـی سپی بەرزبوو بە پێپلکانەیەکی پێچاوپێچدا سـەرکەوتین، بێدەنگییەکی ترسناک باڵی بەسـەر ئەو بینایـەدا کێشـابوو. مـن هـەر شتێکم لـە مستەفای شـەونم دەپرسـی، ئـەو بـەردەوام بە دەنگێکی نـزم دەیگـووت: بـە کـوردی قسـەمەکە، بـاش نییـە. دواجـار لـە قاتـی چـوار ئـەو لەوحەیەم بینییـەوە. هەمـان دەسـتوخەت کە لـە شـاری تەپوتۆزەکان لەسـەر لەوحێک نوسـیبووی «الطبیـب الاخصائـی ـ موسـی سـلیم بابـک». هەمـان دەسـتوخەت لەسـەر لەوحێکـی جوانتـرو پاکتـر لـە دارگوێـزی ئەسـپرتۆکراو

هەمـان گـوزارەی نوسـیبوو. کـە لەدەرگاماندا موسـای بابـەک کردییـەوە، ئـەو پیـاوە کردییـەوە کـە مـن پێموابـوو زەوی قووتیداوە. بۆ ئێسـتێک منـی نەناسـییەوە، چـاوی زۆر لـە جـاران کزتربووبـوو. من باوەشـم پیاکردو گریام... نەمدەتوانـی قسـەبکەم، دکتـۆر بابـەک وەک هەمیشـە ئامێزە باوکانەکـەی خۆی بۆ کردمـەوە و گـوتـی: جەلادەتـی کۆتر خۆشـحالّم، خۆشـحالّم کە سـەلامەتی. بـە گریانـەوە گووتـم: نـا دکتۆر سـەلامەت نیـم، مـن بێکەسـترین کەسـی دونیام. ژیانـم لـە ژیانـی سـەگ خراپتـرە.

دکتـۆر دەیزانـی بێکەسـی و بێباوکـی و ژیانـی سـەخت وا لـە مـن دەکات، لـە بەردەمیدا منـداڵ ببمـەوە، مـن تاماوەیەکـی درێژ ژێرنەدەبوومـەوە. تۆزێک هێـور دەبوومـەوە دواتـر کـە دەمویسـت قسـەبکەم دەمدایـەوە پرمـەی گریـان، لـە ڕاسـتیدا مـن نەمدەزانـی بۆ وام لێهاتـووە، بەڵام لـەو ئێوارەیـەوە کـە چووم بۆ ماڵـی سـەرهەنگ قاسـم ئـەو دەردەم لـە خۆمـدا دۆزییـەوە، دەردی گریانـی بێبڕانـەوە، گریان وەک منداڵ، ئینجا لە نێوان فرمێسکەکاندا دووبارەکردنەوەی یـەک وشـە بۆ دەیـان جـار. هەتـا مسـتەفای شـەونم لـەو بـاوەڕەدا نەبـوو مـن ئاوەهـا بەوجـۆرە منداڵانەیـە بگریـم، لەڕاسـتیدا گریانەکـەم لـە بـری ئـەوەی لـە فرمێسـکی پیاوێکـی ڕۆمانسـی بـە ویقـار بچێـت، لـە گریانـی منداڵێکـی گـڕۆز دەچـوو. مـن ئـەو کاتـەی دکتـۆر بابەکـم بینـی هەمـوو ئاسـەواری ئـەو گەشـتە ڕۆحـی و ئاسـمانییەم لـە یادچـووەوە، بوومـەوە بـەو بوونـەوەرە ڕوخـاو و بێئەنگـەرەی وەک ئاوارەیەکـی چڵکـن لەسـەر زەوییەکـی ئاڵـۆز دەژی و قـەدەر فڕێیداوەتـە نـاو کۆمەڵێـک هاوکێشـەوە کـە ناتوانێـت تێیانبگـات.

یەکـەم پرسـیار لـە دکتـۆر بابەکـم کـرد گووتـم: دکتـۆر پێمبڵـێ، دالیـا سـیراجەدین مـاوە یاخـود نەمـاوە؟. دکتـۆر کەمێک چاوی کزکـردوو و گووتی: پرسـیارەکە ئەوەیـە ئاخـۆ ئێمـە خۆمـان ماویـن یـان مردویـن؟.

بـە هێمنـی دەسـتی خسـتە سـەرشـانم و گووتـی: دواتـر هەمـوو شـتێکت پێدەڵێـم. هەمـوو شـتێک، هەمـوو شـتێک. ئێسـتا گرنـگ ئەوەیـە مـن تـۆم

دۆزییەوە.

دکتۆر بابەک بە جۆرێکی سەیر پیربووبوو، دەستی گرتم و گووتی: جەلادەتی کۆتر ئێمە ئەو ماوەیە هەموو شارەکان بۆ تۆ گەڕاین، خۆم بە تایبەت سەردانی هەندێک شوێنم کرد، بەڵام هەواڵێکی تۆمان دەست نەکەوت...

مستەفای شەونم گووتی: دکتۆر دۆزینەوەی ئاسان نەبوو، گەر باڵندە سپییەکان نەبانایە نەمدەدۆزییەوە، ئەو لە ئوتێلی ئاوارەکان، لە ناو دەیان ماڵە ئاوارەدا لە ژوورێکی چکۆلانەدا دەژی.

موسای بابەک هەناسەیەکی هەڵکێشاو دەستی خستە سەر دڵی و گووتی: جەلادەتی کۆتر لە ناو ئاوارەکاندا چی دەکەیت؟ بۆ لەوێ دەژیت؟

من گووتم: دکتۆر لە کوێ بژیم؟ من ئاوارەم... شوێنم نییە تیا بژیم، شوێنیشم نییە بۆی بچم. دکتۆر عەفوومبکە، بەڵام پێدەچێت تۆ لە بیرت چووبێتەوە کە من بابەیەکی بێکەسم.

وەک عادەتی خۆی، بە ژوورەکەدا دەسوڕایەوە، دەستی بە سەری خۆیدا دەهێنا، چاوی کزدەکرد، دەستی دەخستە سەر دڵی. گووتی: تۆ ئیتر پاسەوانی جوانیت... بمبورە من ئەو هەموو ساڵە ڕاستیم نەگووت، چونکە ئەوکات ئێمە لە شوێنێکی ترسناک و پڕ مەترسیدا دەژیاین. ئێستا تۆ یەکێکی لە ئێمە، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە تۆ کلیلەکانت پێبێت. ئیتر هەزاران کتێبخانەو پێشانگای نهێنی لە بەردەستی تۆدان. ئیتر ئیشی تۆیە بە دوای جوانیدا بگەڕێیت و بیدۆزیتەوەو نەهێڵیت بمرێت. جەلادەتی کۆتر من ڕۆژێک پەیمانی ئەو کلیلەم پێدایت، بەڵام تۆ هەرگیز لە منت نەپرسی کام کلیلە، هەمیشە واتدەزانی مەبەستم ئەو کلیلە بچوک و ناچیزەیە کە دەرگای دەرەوەی سەردابە نهێنییەکەی خۆمانی پێدەکەینەوە، نا کوڕی خۆم... مەبەستم ئەو کلیلانە بوو کە پاسەوانە گەورەکان وەریدەگرن، ئەو کلیلانەی کە دەرگای جوانییە کوژراوەکان دەکاتەوە، ئەو جوانییانەی

ناتوانن بە ئازادی لەسەر زەوی هەناسە بدەن.

هەمان ئەو جلە کۆنانەی لەبەردابوو کە ڕوخساری پیاوێکی قەدیمییان پێدەبەخشی، ڕوخساری یەکێک هەستدەکەیت لە سەدەیەکی دوورەوە، بۆ جێبەجێکردنی کارێک یان تەواوکردنی فەرمانێک گەڕاوەتەوە. نیشتەجێ تازەکەی عیادەیەکی پزیشکی گەورە بوو، هیچی لەو بیمارستانە گەورەیە نەدەچوو کە لە شاری تەپوتۆزە زەردەکان تێیدا دەژیا، پڕبوو لە مۆبێلی تازە، نیگاری تازە، هەندێک تابلۆ کە ئاماژەیەکی تایبەتیان نەدەدا، مرۆڤ لێوەی ئەو دەرەنجامگیرییە بکات کە ئەم پیاوە سەروکاری لەگەڵ هونەردا هەیە. مستەفای شەونم لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕۆژنامەیەکی گرتبوو بەدەستەوەو سەیریدەکرد، دکتۆر بابەک دەستی گرتم و بردمییە ژوورێکی تر. ژوورێکی چکۆلانەبوو، هەندێک ئامێری نوێی پشکنین و دۆسییەی بۆر لەسەر مێزێک بوون، پەیکەرێکی گەورەی ئێسک لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بوو. کورسییەکان زۆربەیان بە کتێب، جل، ئامێر، بەروانکەی پزیشکی و ماسکی نەشتەرگەری گیرابوون. دکتۆر بابەک کورسییەکی بۆ دانام و گووتی: عەزیزی من، کوڕە وێڵەکەی دکتۆر بابەک بەخێربێیتەوە. کەوای گووت من خەریک بوو دەستبکەمەوە بە گریان. گووتی: دەزانم پەرۆشی ئەوەی هەموو حیکایەتەکە لە دەمی منەوە ببیستیت. دەتەوێت بزانێت دالیا سیراجەدین چی لێهات، پرتەقاڵی سپی چی لێهات، شاری تەپۆتۆزە زەردەکان و سەر نشینانی چییان لێهات. جەلادەتی کۆتر لەدوای تێکشکانی ڕاپەڕین گاردی کۆماری چوونە ناو هەموو شارەکان، هەموو شارە ڕاستەقینە و خەیاڵییەکان، سەدان هەزار مرۆڤیان سەربڕی. سەدان هەزاریان بە زیندووی زیندەبەچاڵکرد، دەیەها جێگای دێرینی کەلەپوریان ڕوخاند، دەیەها کتێبخانەیان گڕتێبەردا، سەدان مزگەوتی دێرینیان تەختکرد، چەندەها شاریان لەسەر ڕووی زەمین سڕییەوە، دەیەها سەرچاوەی ئاویان وشککردەوە، ملیۆنەها درەخت و باڵندەیان کوشت. بەلام پێت

سەیرنەبێت گەر بڵێم شاری تەپوتۆزە زەردەکان لەو میحنەتە دەرچوو... جەلادەتی کۆتر شارەکان توانایەکی سەیریان تێدایە لەسەر دەرچوون لە میحنەت. ئەزموونی من پێمدەڵێت، هیچ کارەساتێک ناتوانێت ئاسەواری شارێک لەسەر زەوی بسڕێتەوە. تاکە شتێک لەسەر ئەم ئەستێرەیە لە قەقنەس دەچێت شارەکانن، ئا کوڕی خۆم، کوڕی وێڵم... شارەکان تاکە شتێکن دەسوتێن و لە خۆڵەمێشی خۆیاندا دروستدەبنەوە. زۆر کەمن ئەو شارانەی بڕیاردەدەن بمرن، شار مەخلوقێکە هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت بە گوللە بیکوژێت، جیاوازی نێوان شارو مرۆڤ ئەوەیە، مرۆڤ ناتوانێت لە خۆڵەمێشی خۆیدا دروست ببێتەوە بەڵام شارەکان دەتوانن دروستببنەوە. شارەکان کۆچدەکەن، لە جێگایەکەوە دەچن بۆ جێگایەکی دیکە بەڵام نامرن. تۆ دەزانیت شاری تەپوتۆزە زەردەکان، شارێکی ئاوێنەیی بوو. کوڕی من شاری ئاوێنەیی تەنیا ئەو شارە نییە کە وەک سەراب جار دوای جار خۆی لە ناو وێنەکانی خۆیدا دووبارەدەکاتەوە. بەڵکو شارێکە هەمیشە نیوەی لە ڕاستی و نیوەی لە وەهمدایە، ئاوێنە بریتییە لە کەرتبوونی مەخلوق لە نێوان خۆی و وێنەکەیدا، هەر کاتێک شارە ڕاستەقینەکان نغرۆبوون، وێنەکان لەدەرەوە، لەسەری ئێمەدا وەک خۆی دەمێنێتەوەو لەسەر ئەو نیگارە دووبارە شارەکان دروستدەکرێنەوە. ئەوێ شارێک بوو دەیتوانی بجوڵێت، بە سەر زەوی و بە ناو زەمانیشدا. جەلادەت من کە ئەو ڕۆژە شاری تەپوتۆزەکانم جێهێشت، ئیدی نەگەڕامەوە، بەڵام دەزانم کە ئێستا هەمان شاری گەڕۆک، هەمان شاری سەرابی، بە کۆمەڵێک مەخلوقاتی دیکەوە بەم زەوییەدا دەگەڕێت، تێکەڵ بە شارەکان دەبێت و جیادەبێتەوە، کەرتدەبێت و یەکدەگرێتەوە، بچوکدەبێتەوەو گەورەدەبێت. من نەگەڕامەوە بۆ ئەو شارە لە بەرئەوەی هەستدەکەم ژیانێکی کەمم لە پێشدەمدایە، دەمەوێت دواجار ژیانم بۆ ئەوە تەرخانبکەم، دوای مردنم ئۆقیانوسی هاوار نەکەوێتە مەترسییەوە، دەبێت بەرلەوەی ماڵاواییبکەم و بەجێتانبهێڵم،

کۆمەڵێک کەسی شایستە جێبهێڵم کە بتوانن پاسەوانی ئەو ئیرسە گەورەیە بن. جەلادەت لە شاری تەپوتۆزە زەردەکان تابلۆمان زۆر فەوتا، ئەو شەوە بەر لە سووتان و نغرۆبوونی ئەو شارە خەڵکێکی زۆرمان بەو تونێلەدا دەربازکرد، هەموو کەسێک دەبایە چەند تابلۆیەک لەگەڵ خۆیدا ڕزگاربکات، کە دواجار ئەو جێگایەشمان بەجێهێشت هێشتا خەزنەیەکی گەورەی نیگار مابوو کە بە ئاسانی بۆمان نەدەگوێزرایەوە. جەلادەتی کۆتر من بیست و هەشت ساڵ بوو کارم لەو مۆزەخانەیەدا دەکرد. بەعسییەکان وەک چۆن لەوەوبەر هەموو ئیشەکانیان سووتاندم جارێکی دی دابەزینە ئەو ژێر زەمینە و سەر لەنوێ ڕەنجی عومری منیان هەموو سووتاندا... ڕقم لێیانە جەلادەت، ڕقێکی گەورە... بەڵام با باس لەوە نەکەین، باباسی شتێکی تر بکەین»

وەستاو دەستی بەسەریدا هێنا، کەمێک یەخەی کراسە سپییەکەی چاککرد، مووەکانی هێند سپی و پاکبوون لە مووی پیاوێک دەچوون لە بەهەشت پیربووبێت. دەستی خستە سەر دڵی و بە تەواوەتی چاوی نوقاند و گووتی: دەتەوێت بزانیت دالیا سیراجەدین چی لێهات؟. دالیا دەژی، دالیا نەمردووە، خۆشبەختانە توانیم هەموویان ڕزگاربکەم، من لە هەموو ژیانمدا پێشتر بە ئەندازەی ئەو شەوە ژیانم ڕزگار نەکردبوو، بەڵام تۆ دەبایە ڕێگای خۆت بگریت، جەلادەت تۆ ئیشی زۆر گەورەت لە پێشە، من دەزانم تۆ سەفەری گەورەت لە پێشە... ڕێگای تۆ لە ڕێگای هیچ کەسێکی تر ناچێت، جەلادەت تۆ ئەو شتانە دەهێنیتەوە کە ئێمە نەمانتوانی ڕزگاریبکەین.

من بێئەوەی تێبگەم یاخود بەلامەوە گرنگ بێت تێبگەم لێم پرسی: دکتۆر دالیا سیراجەدین لە کوێیە؟

دکتۆر گووتی: لە ڕاستیدا نازانم، دوای ئەو شەوە، هەردووکمان پێکەوە هاتین بۆ ئێرە، سێ مانگ پێکەوە بووین، پێکەوە ئەم عیادەیەمان دامەزراند،

ڕۆژێک هەواڵێکی بیست کە تارمایی باسم جەزائیری لە شارێکی باشوور بینراوە، هاوڕێیەکی دێرینی خۆی ئەو هەواڵەی بۆهێنا، ئیدی ڕۆیشت و نەگەڕایەوە، پێموایە ئێستاش لە شارە جیاواز و جێگا جیاوازەکاندا هەر بە دوای سۆراغی ئەو تارماییەدا دەگەڕێت.

لەو ساتەدا خەیاڵی بینین و دۆزینەوەی دالیا سیراجەدین لە هەر شتێکی دی لە ژیانمدا گەورەتر بوو. لەو ساتەدا بڕیاری هەرە گەورەی خۆممدا کە لە دوای دادگاییکردنی سامیری بابلی، دوای داخستنی دۆسیەی ئەو هاوڕێ زاڵمەی خۆم، ژیانم بۆ دۆزینەوەی دالیا تەرخانبکەم. پێموابوو لەو ساتەدا ئیدی ڕەوتی ژیانی من بێ هیچ گرێ کوێرەیەکی ڕاستەقینە، لە بەردەممدا والاو کراوەیە، هێڵەسەرەکییەکانی دیارو فەرمانەکانی منیش ڕوون و ئاشکرابوون. ژیانم عەیبێکی نەبوو، مۆسیقارێکم هەیە لە باغچەیەکدا مۆسیقام بۆ لێدەدا، ئۆقیانوسێکی گەورەی هونەر و کتێبیش لە بەردەستمدایە کە لەگەڵ سەدان ڕۆحی جوان و غەمگینی دیکەدا دەبم بە پاسەوانی. عەشقێکی ناکام و سەرابێشم هەیە تا قیامەت دوای دەکەوم... ژیانێک بوو لە هەموو گۆشە و چەمسەرەکانیدا میعمارێکی تەواوی هەبوو، ئەگەرچی بە ڕوکەش پووچ و ناچیز دەهاتەبەرچاو، بەڵام لە جەوهەردا ژیانێکی کامڵ و پڕمانا بوو.

* * *

ئەو چەند ڕۆژەی لای موسای بابەک بردمەسەر خۆشترین ڕۆژەکانی ژیانم بوون، ئەو چەند ڕۆژە بوو کە بە ڕۆژ لە ژوورێکی عیادەکەدا دادەنیشتم و لە بەردەم پەنجەرەیەکی بچوکەوە تەماشای شەقامێکی جەنجاڵم دەکرد، تەماشای ئەو خانمە سفوورانەم دەکرد کە بەیانیان بە عیشوەو نازێکی تایبەتییەوە دەچوون بۆ کارو ئێواران بە ماندوویی دەگەڕانەوە، سەیری ئەو

پاکەتفرۆشـە بچکۆلەیـەم دەکرد کـە خۆشـی جگـەرەی دەکێشـا. سـەیری ئـەو دوکانـی زەڕەنگـەرەم دەکرد کـە لەگەرمـەی نیوەڕوانـدا ژنێکی گەنـج دەچووە ژووری بۆ لای خاوەنە پیرەکەی و ماوەیەکی زۆر درێژ دەمایەوە و لەوسـەر بـە شـەمزاوی دەهاتـەدەری. سـەیری ئـەو پاسـە گەورانـەم دەکرد کـە سـەدان کـەس سـواریان دەبـوون، ئـەو منداڵـە دڵتەنگانـەی بـە کتێبـی مەکتەبـەوە لـە شـەقامەکە دەپەڕینـەوە، ئـەو شـیرینی فرۆشـەی «زنـود السـت»ی بـە گەرمـی دەفرۆشـت، ئـەو ڕۆژنامەفرۆشـەی هەمـوو بەیانییـەک پیاوێـک دەهـات تفێکـی دەکـردە دەموچـاوی و بێئـەوەی هیـچ بڵێـت دەڕۆی، پیاوەکـەش لەسـەرخۆ تفەکـەی دەسـڕی و هیچـی نەدەگـووت، ئێوارانیـش بەرلـەوەی ڕۆژنامـەکان کۆبکاتـەوە هەمـان پیـاو دەهـات و بـە هەمـان شـێوە تفێکـی دیکـەی دەکـردە ناوچاوانـی و بێئـەوەی حـەرف بڵێـن دەڕۆیشـت. مـن نەمدەزانـی ئاخـۆ جگـە لـە مـن کەسـی تـر ئـەو دیمەنـە دەبینێـت. بـەڵام هەسـتمکرد لـەم شـەقامە شـێتەدا، هەمیشـە چەنـد چاوێـک هەیـە چاوەدێری دیمەنـەکان دەکات، بـەردەوام دوو سـێ کەسـم دەبینـی کـە ئیشـیان تەنیـا ئەوەبـوو سـەیری هەمـوو شـتێکی شـەقامەکە بکـەن، هەندێجـار وام هەسـتدەکرد دێنـە بـەر پەنجەرەکـەی منیـش و بـە گومانـەوە سـەر بەرزدەکەنـەوەو تەماشـامدەکەن. لەگـەڵ ئـەوەشـدا دڵنیابووم لـەو شـەقامە شـێتەدا کـەس گومـان لـە پیرێکـی وەک دکتـۆر بابـەک نـاکات کـە هەندێجـار دادەبـەزی و لـە سـەمونخانەیەکی نزیـک بـە کۆمەڵێـک سـەمونی ئێجگار بەتامـەوە دەگەڕایـەوە، یـان بـەردەوام دەچـوو لای ڕۆژنامەفرۆشـەکە کۆمەڵێـک ڕۆژنامـەی دەهێنـا و لەسـەر هەندێـک مێـزی عیادەکـە دایدەنـا تـا نەخۆشـەکان لـە کاتـی چاوەڕوانیـدا بیخوێننـەوە. سـەیربوو بەڵامـەوە کـە ئەگەرچـی دکتـۆر بابـەک پزیشـکی منداڵان نەبـوو، بـەڵام نەخۆشـەکانی زۆری منـداڵ بـوون، دکتـۆر خـۆی دەیگـووت: جەلادەتـی بـرام، خەڵکـی ئـەم وڵاتـە دەسـتیان لـە ژیانـی خۆیـان شـتووە، خەڵـک هەوڵـدەدەن منداڵـەکان ڕزگاربکـەن.

مـن و دکتـۆر بابـەک شـەوێک چوویـن بـۆ نـاو ئۆقیانوسـی هـاوار، دکتـۆر

لەویکانەدا سەدان تابلۆی ناوازەی نیشاندام، کە هونەرمەندانی ئەم دەڤەرە لە ماوەی سەد ساڵی ڕابوردوودا نیگاریانکردبوو، سەدان پەیکەر کە پێدەچوو جگە لە پاسەوانەکان چاوێکی دیکە نەیبینیبێتن، لە ڕێگای ئەو تابلۆیانەوە مرۆڤ هەموو سەردەمەکان و شوێنەکان و کارەساتەکانی دەبینییەوە. لە زۆر شوێنی ئەو ئۆقیانوسەدا زێوانی دڵسۆزمان بینی کە شەو و ڕۆژ بە پاککردنەوە و پاراستنی تابلۆکانەوە خەریکبوون. هەندێکیان جلی هونەرمەندی نوێ و هەندێکیان جلی ڕەبەنی کۆنیان لە بەردابوو، من دەیەها سەعات گوێم لە مانا و تەفسیرو مێژووی هەندێک لەو تابلۆیانە گرت، لە زۆربەی جێگاکاندا میوانداری پادشاهانەیان بۆ دەڕەخساندین، هەندێک لەو گالێری و مۆزە هونەرییانە لە ئەشکەوتی زۆر دێرین دەچوون، هەندێکیان وەک کۆشکی کریستاڵ وەهابوون، لە زۆر جێگادا مۆزەمان بینی وەک باغێکی ناکۆتا و پێچاوپێچ دروستکرابوون، پڕبوون لە ئینجانەی گەورەی گوڵ، پڕبوون لە جۆگەی دەستکرد، مۆسیقای ئاسمانی و نەبیستراو لە ڕیواقەکانیاندا دەزرینگایەوە. بە هەندێک ڕێگادا ڕۆیشتین لە بری تابلۆ هەندێک دەنگی سیحراوی تەنیا شیعریان دەخوێندەوە، شیعرێکی جاویدو بێبڕانەوە. ئۆقیانوسی هاوارەکان سەرزەمینی هەموو هونەرێکی کوژراوبوو، سەرزەمینی هەموو هاوارێک بوو کە ناگاتە دیدی کەس و ناگاتە بیستی کەس. زێوان و کلیلدارەکان زۆربەیان ناوی منیان دەزانی، پێدەچوو هەموویان لە هەموو شارەکانی دونیادا بۆ من گەڕابێتن. وەک ئەوەبوو سەفەری من بۆنەیەکی خورافی بێت کە دەبێت هەموو زێوان و پاسەوانەکان ئاهەنگی بۆ بکەن، لە زۆر شوێندا سەردەکەوتین بۆ ناو شارەکان و وەک ئەوەی لە ئاهەنگێکی شێتانەدابین کوچە و کۆڵانەکانمان پڕدەکرد لە گۆرانی. من موسای بابەکم بەوجۆرە بەختیار نەبینیبوو، لە پێچاوپێچی شارو شەقامە نەزانراوەکاندا، لە باغی ئەو هونەرمەندانەدا کە خۆیان بەسەر تابلۆکانیانەوە دەخەوتن ئاهەنگمان دەگێڕا، دکتۆر بابەک

گۆرانـی دەگـووت، دەسـتی بەسـەری خۆیـدا دەهێنـا و سـەمایدەکرد، وەک کوردە چیانشـینەکان هەڵپەڕکێیەکی شـێتانەی دەسـازاند، هۆسـەی دەنایەوە، چەپـی هەڵدەپـەڕی و سـەرچۆپی دەگـرت. مـن هەمیشـە دەوەسـتام و بـە زەردەخەنەیەکی گەورەوە سـەیری ئەو هەموو خۆشبەختییە کتوپڕەم دەکرد. هەندێجار وام هەستدەکرد ئێمە چەندین هەفتەیە بە ڕێگاوەین، هەندێجاریش پێموابوو ئـەم سـەفەرە تەنیا چاوتروکانێکی کورتـە و شـادییەکەی ڕاگوزەرە. زۆرجـار وەهـا ڕاسـت و سـەنگین بـوو لەسـەر دڵـم وەخـت بـوو لـە هـۆش خۆم دەچووم، هەندێجاریش وەها خەونـاوی و پڕ تەلیسـم بـوو لـە وەهمێکی ترسـناکی دەکـرد کـە بـەرەو مـردن دەمبـات. مـن لـەو داوەت و ئاهەنگـە سـەیرانەدا دەیەهـا شـارم بینـی کـە باسـکردنیان کتێبێکـی گـەورە گـەورەی دەوێـت، دەیەهـا هونەرمەنـدی غەمگینـم بینـی چاوەڕوانـی موعجیزەیـەک بـوون خۆیـان و هونەرەکەیـان ڕزگاربکات، مـن لەگـەڵ هەموویانـدا دانیشـتم، بەپێچەوانـەی عادەتـی خۆمـەوە لەگەڵیانـدا مەسـت بـووم، بەدەنگـی بـەرز حیکایەتەکـەی خۆمـم دەربـارەی ئـەو دوو گوڵفرۆشـە بـۆ گێڕانـەوە کـە یەکێکیـان دەچێـت بـۆ باغێکـی جاویـد و یەکێکیـان لـە دروسـتکردنی گوڵـە ژاکاوەکانی خۆیـدا بـەردەوام دەبێت. بەدەنگی بـەرز لەسـەر ڕۆڵی هونـەر لـە ئازادکردنـی مرۆڤدا قسـەمکرد. زۆرشـەو کـە لـەو شـارانەدا بێزاردەبووین و دەگەڕاینـەوە بـۆ ئۆقیانوسـی هـاوار، مـن هێنـدەم قسـەکردبوو دەنگم نوسـابوو. دکتـۆر بابـەک هەمیشـە بەسـەرسـامییەوە سـەیریدەکردم و بـاوەڕی نەدەکرد ئـەو کوڕە حەڤدە سـاڵەی چەنـد سـاڵێک لەوەوبـەر لـە ژێرزەمینێکـی تاریکدا لـە مـردن ڕزگاریکـرد بتوانێـت ئەمـڕۆ وا سـاف و زوڵاڵ قسـە لـە جوانـی بکات. کە گەڕاینـەوە بۆ عیادەکە، هەسـتم وابوو دکتـۆر بابـەک شـادومانترین مرۆڤـی سـەر ئـەم ئەستێرەیەیە، ئـەو بەدرێژایـی ژیانـی کارێکـی زۆر مەزنـی ئەنجامدابـوو، ئۆقیانوسـی هـاواری پتـر ڕێکخسـتبوو، گـەورەی کردبـوو، پاسـەوانەکانی زیاتر بـە یەکدی ناسـاندبوو، بـەڵام شـانازی بـە هیـچ شتێکەوە

نەدەکرد بەو ئەندازەیەی کە شانازی بە منەوە دەکرد.
دوای گەڕانەوەمان لەوسەفەرە گەورەیە بە دەریای جوانییە کوژراوەکاندا. دکتۆر بابەک چەند شەوێک منی بردە سەر ڕووبارێکی گەورەو لە ڕۆخی ئەو ڕووبارەدا سەیری مانگمان کرد و قسەمانکرد. لە یەکێک لەو شەوانەدا من و دکتۆر بە کۆرنیشێکی درێژدا پیاسەمانکرد، لە لێواری ئەو ئاوەدا دەیەها پەیکەری گەورە گەورەی جوانم بینی، پەیکەری پادشا و ژەنراڵ و ئەمیر و سەرۆکە جیاجیاکان، کۆرنیشێکی درێژ بوو، پەیکەرەکانی لە ژێر ڕوناکی مانگەشەودا دەدرەوشانەوە، ئاشکرابوو ئەو پەیکەرانە لە کاتی جیاواز جیاوازدا کراون، جوانییەکی سەیریان تێدابوو، جوانییەکی ترسناک. ئەوە یەکەمین جار بوو من لە بەردەم هونەردا بلەرزێم و بترسم. دیاربوو دکتۆر بابەک بە مەبەستێکی تایبەتی منی هێناوە بۆ ئێرە، وەک ئەوە بوو دکتۆر داوایەکی هەبێت و تا ئێستا لە دڵی خۆیدا شاردبێتییەوە. دکتۆر سەیری ئەو ئاوە غەمگینەی کرد و گووتی: جەلادەت حەزدەکەم مانای قووڵ و ڕاستەقینەی ئەو ئۆقیانوسە گەورەیەت بۆ باسبکەم. تۆ ئێستا پاسەوانیت، دەبێت وەک هەر پاسەوانێکی دی مانای ئەم دەریا گەورەیە بزانیت. لە ڕاستیدا هەموو پاسەوانێک لە گۆشەیەکی تایبەتییەوە سەیری ئەم ئۆقیانوسە دەکات، هەموو پاسەوانێک فەلسەفەیەکی تایبەتی هەیە بۆ ئەم دەریایە. جەلادەت زۆرجار ئێمە دەبێت هونەر ڕزگاربکەین، نە لە بەرئەوەی تەنیا ترسمان لەوەیە کە یەکێک بێت و کارەکان بسوتێنێت. یەکێک بێت و پەیکەرەکان بشکێنێت و تابلۆکان بسوتێنێت، یەکێک بێت و ئاگر لە کتێبەکان بەربدات و ئامێرەکانی موزیک قەدەغەبکات... نا، جەلادەت بە پێچەوانەوە، هەندێجار تەواو بە پێچەوانەوە، دەبێت هونەر بشارینەوە تا حوکمڕان و پادشا و فیرعەونەکان نەیکەن بە موڵکی خۆیان. بە درێژایی مێژوو حوکمڕانەکان چەند لە ڕێگای سووتان و شکاندن و حەرامکردنەوە هونەر دەکوژن، دەهێندەش لە ڕێگای خۆشەویستییەوە دەیکوژن. جەلادەت

ئەمە فەلسەفەیەکی گشتییە لە نێوان هەمووماندا، هەموو ئەو پاسەوانانەی کە لە ئێران و تورانەوە کاردەکەن، لە عەرەب و لە عەجەم پاسەوانی جوانین، هەموومان دەزانین، هەتا حاکم و پادشاهەکانیش مەبەستیانە بڕێک لە جوانی ڕزگاربکەن، خۆیان دەکەن بە پاسەوان و چاودێر و پاڵپشتی جوانی، بۆئەوەی شتێک لە نەمریی هونەریان بەربکەوێت. جەلادەت دوو جۆر پاسەوان لە دونیادا دەژین، پاسەوانێکیان هونەر بۆ خۆی دەدزێت، جوانی دەکات بە بەشێک لە ماڵک و ماڵی خۆی، دەیکڕێت، دەیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، هونەرمەندەکان لە زێڕو شکۆو ناوبانگدا نوقمدەکات. چۆن دەستی خۆی لە خوێن هەڵدەکێشێت، ئاوها هونەریش لە خوێندا نوقمدەکات. زۆرجار بەرلەوەی هونەر بکەوێتە ئەو گوناهەوە دەبێت دەستێک لەو گوناهە دەریبهێنێت، وەک چۆن منداڵێک بەرلەوەی پیس بێت دەبێت ڕزگاربیکەین. ترسەکە تەنیا ئەوە نییە پیاوکوژەکان جوانی بکوژن، ترسەکە ئەوەیە جوانیش ببێتە شەریکی پیاوکوژەکان... جەلادەتی کوتر، جەلادەت ئیشی ئێمە ئەوە نییە تەنیا تابلۆکان ڕزگاربکەین، ئیشی ئێمە ئەوەیە جوانی لە گوناه پاکبکەینەوە، دوور ڕایبگرین لە دەستە گوناهبارەکان و نیگا دزێوەکان.

من سەیری پەیکەرەکانم دەکردو دەمگووت: بەلام جەنابی دکتۆر دەتوانین چی بکەین؟

دکتۆر بابەک دەیگووت: هەندێجار پێویستیمان بەسەدەها ساڵ هەیە تا جوانی لەو خەوش و دزێوییە پاکدەکەینەوە کە لە ڕۆژگاری خۆیدا تیانوقمبووە، هەندێجار سەدان ساڵمان دەوێت تا وامان لێدێت لە کارێکدا تەنیا جوانی ببینین و هیچی تر، ئەمڕۆ کە سەیری وێنەی پادشا کۆنەکان دەکەین، چیتر سەیری خودی پادشاکان ناکەین، بەڵکو سەیری جوانی شاردراوەی ناو تابلۆکان دەکەین. هێدی هێدی لەگەڵ تێپەڕینی زەماندا هونەر هەر مانایەکی هەبێت هێدی هێدی کاڵ دەبێتەوە، دەبێتە مانای

تر، چونکە چاوی تر لە دایکدەبن و بە نیگای تر تەماشایدەکەن، ئەوەی کە نامرێت و ئەبەدییە تەنیا جوانی ناو تابلۆکانە. تۆ پێت وایە ئێمە ئەمرۆ کەسەیری پۆرتریتێکی ڤان کوخ دەکەین، سەیری ڤان کوخ خۆی دەکەین؟ پێت وایە کەسەیری تابلۆیەکی ناپلیۆن دەکەین، سەیری ناپلیۆن دەکەین، بێگومان نا... ئێمە سەیری جوانییەک دەکەین کە تەواو لە ناوی کارەکتەرەکان جیابۆتەوە. ئاخۆ ئەو کیژە ئەسمەرانەی گۆگان لە دوورگە درو کێوییەکانی دەریای کاریبیدا نیگاریکردون، ناویان چی بووە؟ ئاخۆ کەس ناویان دەزانێت؟... ئاخۆ کەس بەلایەوە گرنگە فیگەرەکانی مۆدلیانی کێن و ناویان چییە؟ ها... کەس بەلایەوە گرنگ نییە چونکە ئێمە ئێستا تەنیا سەیری جوانی دەکەین... مێژوو تەنیا جوانی هەڵدەگرێت... جوانی و هیچی تر. من و تۆ کە سەیری پەیکەرێکی بودا دەکەین، تەماشای نیگاری خودا یان ڕوخساری پێغەمبەرێک ناکەین، بەڵکو سەیری جوانی دەکەین لەو پەیکەرانەدا، جوانی و هیچی تر. سەیرکە جەلادەت، سەیری ئەم پەیکەرانە بکە... سەرتاپای پەیکەری جەنراڵ و سەرهەنگ و سەرکردەکانی سوپان، سەدان ساڵی تر خەڵک ناوی هەموو ئەمانەیان یاددەچێتەوە، بەڵام گەر جوانییەکی جاوید لە یەکێک لەم پەیکەرانەدا هەبێت دەژی و سەدە لە دوای سەدە خەڵک سەرسامدەکات. زۆرجار هونەرمەندەکان دەبن بە شەریکی پیاوکوژەکان، بەڵام جەلادەت گەر هونەر بپارێزین، ساڵ دوای ساڵ ئەو جوانییە خۆی لە هەموو ئەو مێژووە دزێو و ناشیرینە جیادەکاتەوە، ساڵ لە دوای ساڵ لە مانا دزێو و نامرۆڤانەکانی خۆی دووردەکەوێتەوە. ساڵ لە دوای ساڵ مێژووە ڕەشەکەی دەمرێت و دەبێت بە ژێرەوەو جوانییە نهێنییەکانیشی سەردەکەون و دەگەڕێنەوە. جەلادەت ئێمە پاسەوانی جوانییە نەمرەکانین، پاسەوانی ئەو بەشەین لە جوانی کە ئەمرۆ دەکوژرێت و سبەی زیندوو دەبێتەوە. من یەکەم شەو پێمگووتی کە شارەکان وەک قەقنەس وان لە خۆڵەمێشی خۆیاندا هەڵدەستنەوە، جوانیش هەمان شێوە

دەبێت بە ئاگردا بڕوات و لە ناو خۆڵەمێشی خۆیدا هەستێتەوە، جەلادەتی کۆتر تۆش ئەو کەسەیت، ئەو قەقنەسەیت کە بە ناو ئاگردا دەڕۆیت و لە خۆڵەمێشی خۆتدا هەڵدەستیتەوە. تۆ لە خۆڵەمێشی خۆتدا زیندوودەبیتەوە. من ئەمشەو جەلادەت دەمەوێت پێتبڵێم کە تۆ چیتر ناوت جەلادەتی کۆتر نییە، تۆ ناوت جەلادەتی قەقنەسە، ئەوە ناوی ڕاستەقینەی تۆیە، لە مرۆ بەدواوە پاسەوانەکانی ئەو ئۆقیانوسە تۆ بەو ناوەوە دەناسن، چونکە تۆش مرۆڤێکی زیاد لە جارێک دەسووتێیت و لە خۆڵەمێشی خۆتدا هەڵدەستیتەوە. جەلادەت ئەو باڵندانەی هاوڕێت، شاهیدن لەسەر ئەوەی تۆ قەقنەسیت.

من ئەوکات لە تەواوی قسەکانی تێنەگەیشتم، بە ئینشایەکی قەشەنگم زانی، بەڵام دیارە ڕۆژگارێک هاتە پێشێ من لە هەموو ئەو قسانە تێگەیشتم، ڕاستتر وایە بڵێم دەبایە ئەو هەموو سەفەرە دوورو درێژەم بکردبایە تا تێبیگەم.

ئەو شەوە کە دکتۆر موسا ئەو قسانەی پێکووتم، بەلامەوە گرنگ نەبوو ناوم جەلادەتی کۆتر بێت یاخود جەلادەتی قەقنەس، جەلادەتی مراوی یان جەلادەتی سیمورغ، جەلادەتی شاهێن یان جەلادەتی تیترواسک. درەنگ تێگەیشتم کە ژیانی من لە شاری تەپوتۆزە زەردەکان، مردن و زیندوبوونەوەم لەسەر دەستی سامیری بابلیدا، هەستانەوەم لەسەر دەستی دکتۆر بابەکدا، عەشقم بۆ دالیا سیراجەدین و تارماییەکانی، بینینم بۆ ئەوانەی لە گۆڕە دەستەجەمعییەکاندا نێژران، ژیانی من لەو ئوتێلە سووتاوەدا هەموویان پێکڕا کۆمەڵێک ئاماژەن بۆ مردنێکی ترسناک کە چاوەڕوانێی خۆم دەکات، وەک ئەوەی هەموو ئەو زنجیرە دوورودرێژەی تەلیسم و ئازار ئامادەکردنێکی ڕۆحی و جەستەیی بێت، تا من وەک باڵدارێک بچمە ناو ئاگرەوەو گڕبگرم و لەوسەر بە ساغی بێمەوە دەرێ... پێکڕا کۆمەڵێک ئاماژەبن کە دواتر من لە بری جەلادەتی کۆتر دەبم بە جەلادەتی قەقنەس.

ئەو شەوە لەوە دەچوو دکتۆر بابەک بزانێت کە من دەمرم، بەڵام لە بری ئەوەی وەک پزیشکێک مشورم بخوات، وەک ڕەبەنێک کە لە ڕووی ڕۆحییەوە بۆ مردن ئامادەمدەکات قسەیدەکرد. بە درێژایی ئەو شەوە باسی لەوە دەکرد کە مردووەکان زۆرجار پەیامێکی جاویدیان هەیەو ئەو پەیامە لە دوای خۆیان دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ژیان، چونکە گەر ژیان بە تەنیا موڵکی مرۆڤ بێت، ئەوا پەیامەکانی مرۆڤ، جوانییە قووڵ و شاردراوەکانی، هاوارە گەورەکانی موڵکی هەموو زیندووەکانن. هەندێجار لە سەردەم و ڕۆژگارە تاریکەکاندا، لە سەردەمی ڕەشەکوژی و گۆڕی بە کۆمەڵ و قڕانکردنی مرۆڤدا، دەبێت یەکێک هەبێت لە بری هەمووان هەستێت و ئەو هاوارە زیندووبکاتەوە. یەکێک کە وەک قەقنەس دەسووتێت و لە خاکی مردنەوە جوانییە کوژراوەکان دەگێڕێتەوە... جوانی کوژراوی خۆی و جوانی کوژراوی هەموو دونیا.

سەیربوو هەندێجار قسەکانی بۆ من لە قسەکانی شاروخی شاروخ دەچوو، لە کۆی ئەو دەرسە جیاوازانە دەچوو کە من لە دەمی کەسانی جیاوازەوە دەمبیست و دەمبیستەوە، وەک ئەوەی پێکرا لە ئیسحاقی لیوزێڕینەوە تاسەر مستەفای شەونم بەشێک بن لە کۆراڵێکی گەردونی کە وەزیفەیان ئەوەیە ئەو سرودە بە گوێی مندا بخوێنن.

دەبێت بڵێم لەگەڵ ئەوەی سەردانەکەم بۆ لای موسای بابەک گرنگترین ڕوداوی ژیانم بوو، بەڵام سەرەتای گەشتەکەم لە کۆتاییە ئاڵۆزو پڕ هێماو سمبولەکەی خۆشترو ئاسوودەتربوو. من سەرەتا زۆر بە دڵنیاییەوە هاتم و پێموابوو ئێستا ئیدی بەرەو ناوەڕاستی گەردەلوولەکە دەڕۆم و چیتر زۆربەی نهێنییەکان لە بەرچاوم ڕوونبوونەتەوە، بەڵام قسەکانی دکتۆر بابەک دەربارەی سووتان و هەستانەوە، دەربارەی مردن و زیندووبوونەوە. دەربارەی مەسیح و گەڕانەوەی، منیان گێڕایەوە بۆ سەرەتا، شتەکانیان

گێڕایـەوه سـەر خانـەی چاوەڕوانییەکـی دووروودرێـژ. بـەڵام جگـە لـەوەی کـە بـووم بـە پاسـەوانێکی نـوێ، جگـە لـەوەی کۆمەڵێک کلیلـم وەرگـرت کـە دەمتوانـی بـە هۆیانـەوه لـە ئۆقیانوسـی هاواردا سـەفەربکەم، بوومە کەسـێکیش کـە چاوەڕوانـی مردنێکی نزیکـم دەکـرد. دەبێـت بڵێـم مـن بـاوەڕم بـەو کەسـانە نییـە کـە لـە مـردن ناترسـن، لـەو بـاوەڕەدام کـە مەسـیحیش زۆر لـە مـردن ترسـاوه، دیـاره تـرس بـەو مانایـە نـا کـە دەڕۆیـت و ناگەڕێیتـەوه، بـەو مانایەش نـا کـە زیندوونابیتـەوه، بـەو مانایـەش نـا کـە بتبـەن بۆ بەهەشـت و سـەد هەزار سـاڵ بـە دیـار جۆگەیەکـەوه داتنێـن و دوو سـێ کـەس مێشـت لێدەربکـەن یـان بتبـەن بۆ دۆزەخ و تـا قیامـەت شیشـی سـوورەوەکراو بکـەن بـە شـوێنی خراپتـدا. بەڵکـو بـەو مانایـەی هەندێـک شـتی بچوکـت لـە کیسـدەچێت کـە لـەم دونیـا خۆشـتدەوێن و تەنیـا لـەم دونیایەشـدا ئـەو شـتانە ڕوودەدەن، وەک بینینـی منداڵان لـە سـەر قادرمەکانـی گیلاسـی سـپی، وەک قەرزکردنـی بەفر لە هاوینـدا لـە دراوسـێکەتان، وەک داگرتنـی بێشـکەیەکی شـکاو بـۆ ژنێکـی ئـاواره لـە قاتـی هەشـتەوه تـا خـوارەوه، وەک بیسـتنی ئـەو جنێوانـەی دوو فیتـەر لـە چێشـتخانەیەکدا دەیـدەن بـە هاوڕێیەکـی خۆیـان، وەک گریانێکی بـە کوڵ لەگەڵ باوکـی سـەرهەنگ قاسـمدا. مـن کـە بیرمدەکردەوه نـە لـە بەهەشـت ئـەم شـتانەی تێدایـەو نـە لـە دۆزەخ. ڕاسـتتان دەوێـت مـن ئەهلـی ئـەو کەیـف و سـەفایە نەبـووم کـە لەسـەر بەهەشـت دەیانگێڕایـەوه، نـە ئەهلـی حـۆری بـووم و نـە ئەهلـی غیلمانیـش، بەدرێژایـی ژیانیشـم عەقڵـم زۆر نەخسـتبووه سـەر خواردن و خواردنـەوه و شـەراب و مـەزەو ئـەو شـتانە لـە بەرئـەوه بەڕاسـتی نەمدەزانی گـەر بمنێـرن بـۆ بەهەشـت چیبکـەم، بەهەشـتی مـن ئـەو سـاتە کورتانـە بـوو کـە دالیـا سـیراجەدینم دەبینـی و ڕامدەکـرد بـە دوایـدا و نەمدەگـرت... بەهەشـت و دۆزەخ لای مـن زۆر لـە یەکتـری نزیـک بـوون، هەردووکیـان دوو جێگابـوون نەخشـەیەکی دیاریکراوی خۆشـی و ناخۆشـیان تێدابـوو، هەردووکیـان پێکەوه لەسـەر کۆمەڵێـک قانونـی ئاسـنین دەچـوون بەڕێـوه.

جیاکردنەوەی ڕەهای خۆشی لە ئازارو ئازار لە خۆشی لای من لە ئیشی خودا ناچێت، چونکە خودا دەزانێت خۆشی تەنیا لەگەڵ کەمێک ئازاردا مانای هەیە، ئازاریش تەنیا لەگەڵ کەمێک خۆشییدا دەبێت بە ئازار، لە بەر ئەوە وێنەی بەهەشت و دۆزەخ دوو وێنەی کاریکاتێری وجودن کە من نەمدەزانی چیان لێبکەم... ترسی گەورەم لە مردن ئەوە بوو بگەم بە زەوییەک خۆشیی و ئازار هێند لە یەکجیابووبێتنەوە دوو جۆر مەخلوقیان دروستکردبێت یەکێکیان تەواو خۆشی لە بیرچووبێتەوە و بووبێت بە دڕندەیەکی بریندار کە تەنیا دەناڵێنێت، ئەوی دیشیان مەخلوقێک ئازاری لە یادنەمابێت و بوو بێت بە بوونەوەرێکی گەمژە کە تەنیا پێدەکەنێت.

من بەو خەیاڵ و خولیاو ترسانەوە لە ئۆقیانوسی هاوار گەڕامەوە.

دکتۆر بابەک و مستەفای شەونم ئێوارەیەک داوەتێکی قەشەنگی منیان کرد، سفرەیەکی سەیریان ڕازاندەوە و لە ئاهەنگێکی چکۆلەدا من کلیلی ئۆقیانوسی هاوارم وەرگرت. هەر لەو ئاهەنگە چکۆلەیەدا کە لە چێشتخانە و بارێکی چکۆلانەی سەر کۆڕنیشدا ڕوویدا سەرلەنوێ منیان بە ناوی جەلادەتی قەقنەسەوە ناونایەوە. مستەفای شەونم وەک هەمیشە خواردنی دەخوارد و قسەیدەکرد، یادگارەکانی ساڵی ٧٤ی لە کامپێکی ئاوارەکاندا نزیکی نەغەدە گێڕایەوە. زۆرجار بێدەنگ دەبوو، دەبایە من زوو زوو دەستی بجوڵێنم و بڵێم «مستەفای شەونم، هەموو شتێک باشە، نەخۆش نیت؟» ئینجا دەجوڵا و دەستیدەکردەوە بە گێڕانەوەی حیکایەتی خۆی لەگەڵ لەیلای نیلۆفەردا. من لەو شەوەوە بووم بە جەلادەتی قەقنەس، تا ئەوکات بە ڕوونی دیارنەبوو بۆچی من ناوم قەقنەسە، چی دەبێت و چی دەکەم؟ دکتۆر موسا دەیگووت: پەلەمەکە، زۆرجار دەبێت ساڵەهای ساڵ چاوەڕوان بیت تا دەزانیت چی دەکەیت، بەڵام کاتێک ئەو ساتە دێتە پێشێ کە دەبێت تۆ تێیدا شتێکی گرنگ ئەنجامبدەیت دەبێت ئامادەبیت.

شەوی دواتر سەفەرەکەمان لە ئۆقیانوسی هاواردا کۆتاییهات، دوای

گریانێکی زۆر، دوای باوەشێکی زۆر، دوای ئەوەی کە بڕیارماندا لە نزیکترین فرسەتدا یەکتر ببینینەوە، خوداحافیزیمانکرد. دکتۆر تا ئەو ماڵە خاڵییە لەگەڵماندا هات، خۆی دەرگای ژێر زەمینەکەی بۆ کردینەوە، بە ناو هۆڵێکی گەورەی پڕ نیگاردا ئێمەی بردو لە شوێنێکی دیاریکراودا ئەو ڕۆیشت و ئێمەش بەهەمان ڕێگادا بەرەو شوێنی خۆمان لە باکوور گەڕاینەوە. بەڵام موسای بابەک پەیمانی دامێ کە ئەستێره ونەکەی ژیانم، خانمی هەتا هەتایی خەونەکانم «دالیا سیراجەدین»ـم بۆ بدۆزێتەوە.

* * *

کە گەیشتمەوە «گێلاسی سپی» تا چەندین هەفتە مستەفای شەونمم نەبینییەوە، چەند جارێک لەگەڵ مۆسیقارەکانی تیپی بەلەمی بەفردا دانیشتم، بە درێژیی باسی مۆسیقاو نەمریمان کرد، چەندەها شەو شاروخی شاروخ فلووتە قەشەنگەکەی خۆی بۆ لێدام، چەندەها شەو ڕامکردە ناو باغچەکەوە بۆ ئەوەی بیگرم و نەمتوانی. چەندین هەفتە وەک ئەوە وابوو زەوی لە سوڕاندنەوە وەستابێت، جگە لەوەی جارێک سامیری بابلی هات بۆلام و باسی ژیانی ئارام و ئاسوودەی خۆی بۆکردم هیچی دی ڕوویندا.

من لەو ماوەیەدا دەبایە شوێنێک دابینبکەم بۆ دادگاییکردنی سامیری بابلی، ژوورەکەم لەو ئوتێلە سووتاوەدا لەوە بچوکتر بوو بتوانێت ئەو میوانانە کۆبکاتەوە. دەبایە هەوڵبدەم میوانەکانم دابەشبکەم و شوێنێکی نهێنیش بۆ ئەو دادگایە بسازێنم بتوانێت تەواوی ئیشەکە لە خۆی بگرێت. نازانم چ شتێک خستییە خەیاڵمەوە کە دەتوانم سوود لەو مەخزەنە فەرامۆشکراوانەی مستەفای شەونم ببینم، گەر وا نەبایە من دەبایە سوود لەو خەیمە کۆنانە وەرگرم کە هەندێک لە ئاوارەکان لە ژێرزەمینی ئوتێلەکەدا فڕێیاندابوو. دەبایە بڕۆم و لە دەشتێکدا چادرەکانم بەرزبکەمەوەو نوێنی

پێویست پەیدابکەم و تەواوی کارەکە لەوێدا ئەنجامبدەم.
ڕۆژێک بە خۆم و باڵندە سپییەکانمەوە لە درێژترین شەقامی شار دەپەڕیمەوە، کە من دەوەستام باڵندەکان بەسەرسەرمەوە دەوەستان کە دەڕۆیشتم لەگەڵمدا دەڕۆیشتن. مستەفای شەونم لە بەردەم کەبابخانەیەکی سەر ئەو شەقامەدا بە خۆی و بابۆڵەیەکی درێژەوە لەبەردەم وەجاغی چاپچییەکی دەستگێڕدا بە گوپی پڕەوە بانگیکردم «چەلادات... چەلادات».
وەک هەمیشە چاکەتە ڕەشە درێژەکەی و فانیلە سپییەکەی لەبەردابوو. هیچی لەو مرۆڤە نەدەچوو کە من سەفەرێکی ئەفسوناویم لەگەڵدا کردبوو. دەستی گرتم و گووتی «با شارەفم کەپاپێ دەخۆی». من بە بێزارییەوە پێمگووت: مستەفای شەونم تۆ هەر بیر لە خواردن دەکەیتەوە، من نهێنییەکی گەورەم هەیە کە هێشتا تۆ نایزانیت، پێویستیم بە یارمەتی تۆیە. منی ڕاکێشایە ناو کەبابخانەکەوە بێئەوەی تیکەکەی قووتدابێت گووتی «چەلادات... مەشالا چییە؟». من تکام تیاکرد تیکەکەی قووتبدات تا بتوانین قسەبکەین و لەیەکتر تێبگەین. لە تەنکەرێکی فافۆنی چکۆلانە کەمێک ئاوی خواردەوەو بە تەنگەنەفەسییەکی زۆرەوە کە نیشانەی زۆرخواردنێکی بەردەوامبوو، گووتی: ئێستا تەواو قسەبکە.
من ئەو ڕۆژە چیرۆکی ژیانی خۆمم بۆ مستەفای شەونم تەواوکرد، تا گەیشتمە سەر دادگاییەکەی سامیری بابلی، تاکە شتێک کە باسم نەکرد، شاردنەوەی ئەو نەخشانەی بابلی بوو کە نەدەبایە هیچ ڕۆحلەبەرێک بیزانێت. کە چیرۆکەکەم تەواوکرد، مستەفای شەونم بە چاوی ئەبڵەق و هەناسەی توندەوە گووتی: واو کوڕی ئاسمان، تۆ خەریکی چییت، ئەمەیان زۆر شتێکی ترسناکە.
من پێمگووت: گەر هەست نەکەم شتێکم لە داد و عەدالەت بۆ ژیان گێڕاوەتەوە ئیشی من وەک پاسەوانێکی جوانی نرخی نییە... سوودی چییە مرۆڤ هەموو جوانی دونیا بپارێزێت بەڵام لە ماناکانیان تێنەگات، جوانی

چییە گەر مرۆڤ شەرەفی ئەوەی نەبێت ئیشی بۆ بکات. دەبێت سامیر لە بەردەم دادگایەکی ڕاستەقینەدا بوەستێت، دەبێت بوەستێت، لە بەر من و تۆ نا، لەبەر قوربانییەکان نا، بەڵکو لە بەر خۆی.

ڕوومەتەکانی سووربووبوونەوە و بە ئەسپایی گووتی: واو... واو کوڕی خوا دەتکوژن. حیزبەکانی ئێرە دەتکوژن، سیاسییەکانی ئێرە سەرتدەبڕن و لاشەکەت فڕێدەدەنە هەر ئاوێکەوە. تۆ کێیت بەوان بڵێیت ئێوە داتپەروەر نین؟ کێیت بەوان بڵێیت ئێوە خۆتان گوناهبارن و گوناهبار بۆی نییە دادگا بۆ گوناهبار دابنێت؟ وەڵا من سیاسییەکی لووت قولاپی دەناسم، باریکێکی قژڕەشە کە قسەدەکات دەنگی لە دەنگی قەحبە دەچێت، ئەوە پێت بزانێت دەتکوژێت. تۆ کێیت پێیان بڵێیت، تا ئێستا یەک قوربانیش لە ڕێگای ئێوەوە مافی خۆی وەرنەگرتووە؟ تۆ کێیت بەو سەرکردە گەورانە بڵێیت کە خۆیان وەک قارەمانی ئەفسانە کۆنەکان تەماشادەکەن، ئێوە تا ئێستا گوناهبارێکتان نەهێناوە بەرابەر قوربانییەک بوەستێت و ڕووبەڕوو بەرابەر یەک و بەرابەر هەموو دونیا قسەبکەن؟ ها جەلادەت تۆ کێیت... تکام وایە لێت تێکنەچێت، ئەوەی تۆ لە ئۆقیانوسی هاواردا شتێکی گرنگیت، مانای نییە وا تێبگەیت لە ژیانی ڕاستەقینەشدا یان لەم شارەدا تۆ شتێکیت، ئەوەی کۆمەڵێک باڵندەی سپیت هەیە، خۆت لێنەگۆڕێت، ئەم سیاسیانە باڵندەو شتی وا نابینن... سەیرمکە، من هەموو خەڵک وەک گەمژەیەک سەیرمدەکەن، وەک کابرایەک کە هەموو ژیانی هەر خەریکی پڕکردنی ورگیتی. من پێتدەڵێم خەڵکێک هەیە بە من دەڵێت: مانگای چێشتخانەکان.

هێند هەناسەی سواربووبوو، لە شوێنی خۆی وەستاو دەستیکرد بە کۆکەکۆکێکی زۆر. لە ناو کۆکەکاندا گووتی: تۆ نازانیت من لەم شارەدا ناوم مانگای چێشتخانەکانە؟. باش دەزانیت، دەشزانیت خەڵک لەو شارە وادەزانن موسای بابەک تەنیا دکتۆرێکی پیرو پەککەوتەیە کە بە پارەیەکی کەم نەخۆش تیماردەکات. تۆش تۆش لە بەرچاوی ئەوان ئاوارەیەکی ڕووت و برسیت.

تۆزێک هاتەوەسەرخۆی، من ئەو وچانەم قۆستەوە و گووتم: مستەفای شەونم، من هەرگیز خۆم بە شتێکی گرنگ نەزانیوە، بەلام دەزانم گەر سامیری بابلی بدەمە دەست ئەم سیاسەتمەدارە کوردانە ئازادیدەکەن، یان بێ هیچ دادگاییەک دەیکوژن یان دەیفرۆشنەوە بە بەعس و پارەکەشی دەنێنە تەنکەی باخەڵیان. ئەوەی من دەکوژێت و غەرقی ئازارم دەکات ئەوەیە، دواجار سیاسییەک لەگەڵ دوو هاوڕێی خۆیدا لە ژوورێکدا دادەنیشن، پێدەکەنن، نانەخۆن، نوکتەدەکەن، باسی قەحبەدەکەن، دوایی هەر لە کاتی ئەو قسانەدا لە جیاتی من، لە جیاتی ئیسحاق، لە جیاتی سەرهەنگ قاسم، لە جیاتی نەسرین غەفور و پەپولە جەمال بڕیار لەسەر چارەنوسی سامیر دەدەن... من دەمرم و ناهێڵم شتی وا ڕووبدات. عەدالەت ئەوەیە ئێمە بڕیاربدەین نەوەک ئەوان.

مستەفای شەونم بەردەوام دەیگووت: من نازانم، قەقنەسی برام، بەلام ڕەنگە سامیری بابلی وەک گەنجینەیەک وەها بێت، ڕەنگە شوێنی چەکە نهێنییەکان بزانێت، ڕەنگە کۆمەڵێک زانیاری لەلابێت کە شاردنەوەی ئەو زانیاریانە شتێکی باش نەبێت. دوایی بەوە گوناهبارتدەکەن کە نهێنی گەورەت شاردۆتەوە، کە خیانەتتکردوە، دوایی دەتکوژن، لاشەکەت فڕێدەدەنە سەر جادەیەک و تەواو... تۆ کێیت، بابایەکی بێکەس، تا ئەم یارییە بکەیت؟

من دەمویست بزانم یارمەتیم دەدات یاخود نا. پێشتر مستەفام وەها سوور نەبینیبوو، چەند جارێک تفی قووتداو گووتی: یارمەتی چییت لە من دەوێت؟.

بە دەنگێکی هێمن گووتم: شوێنێکم دەوێت بۆ دادگاکە، بۆ خەوتنی ئەو هەیئەتەی حوکمی پرتەقاڵی بابلی دەدەن. با دادگاکە لەو مەخزەنە کۆنانەی تۆدابێت، شوێنێکی چەپەکە، دووردەستە، دوورە لە چاوەدێری

و چاوی هەموو کەسێک. شوێنێکە دەتوانین بە ئازادی تێیدا قسەبکەین و بیربکەینەوە. خۆت دەزانیت من شوێنم نییە.

ماوەیەکی درێژ وەستا، چایەکی تری بانگکرد و دوای بیرکردنەوەیەکی درێژ گووتی: بەمەرجێ یارمەتیتدەدەم، من لە مەسەلەکە دەربکەیت، هەرچییەک بوو منی تێدا نیم، من کارم زۆرە، وامەکە پەشیمانبمەوە لەوەی شەوێک لە تاریکیدا ئەو باڵدارە سپییە نەسرەوتانەی تۆم بینی، من دەترسم، قەقنەسی برام دەترسم، لەگەڵ هاوڕێ قودسیشدا هەمان شت بوو، ڕۆژێک هات بۆ لام و گووتی دوو هاوڕێی برینداری هەیە کە دەیەوێت بیانشارێتەوەو تیماریانبکات، من مەخزەنێکی کۆنی خۆمانم دایە، دواتر دوای چەندین مانگ یەکێک لە براکانم کە ئاگای لە مەسەلەکە نەبوو گیرا، باوکم بە دەیەها هەزار دیناری ئەو سەردەمە ئازادیکرد، وەختەبوو تەواوی سەروەت و سامانەکەمان بڕوات. خۆت دەزانیت ئێمە لە وڵاتێکی ترسناکداین. ئێستاش گەر شتێکی وەها ڕووبدات، دێنەسەرم، هەموویان دەزانن من پارەدارم، من موڵکێکی زۆرم هەیە، هەموویان دەزانن، بەشێک لەوان چاویان لەسەر ئەو ئەرزانەی منە... تێدەگەیت، جەلادەتی قەقنەس تێدەگەیت... گەر شتێک ڕووبدات بەفرسەتی دەزانن بمخەنە ژێر فشارەوە تا ئەو موڵکانەم لە ژێردەست دەربهێنن، تۆ نایانناسیت، ئەم حکومەتە تازەیە شتێکی ترە، مەسئولەکانی جۆرە زەوقێکی تریان هەیە، ئەم سیاسەتمەدارە پاکوتەمیزانەی من و تۆ حەزیان لە زەوییە، شێتی خانووبەرە و سامانن، شێتی ئەوەن دار و بەردی ئەم وڵاتە هی ئەوان بێت. گوێبگرە گەمژە، ئەمان گەر ئەو پرتەقاڵەی هاوڕێ تۆ پارەنەکات گەر نیوەی دونیاشی کوشتبێت بە پولێکی قەڵب نایکڕن و سەری خۆیانی پێوە نایێشێنن، لەوانەیە سامیری بابلیان بەلاوە گرنگ نەبێت، بەڵام زەوییەکانی منیان بەلاوە گرنگە.

ئەوە یەکەم جار بوو مستەفای شەونمیش بەمن بڵێت گەمژە، بۆ هەر شوێنێک دەچووم یەکێک هەبوو پێمبڵێت گەمژە، چونکە لە زۆر شت

تێنەدەگەیشتم. من ڕام وابوو ئەوەی حەماسەتی بۆ جوانی هەبێت، دەبێت بەهەمان سۆزو شەوقەوە بۆ دادپەرەوەریش هەوڵبدات. مستەفای شەونم چەند جارێک دەستی بەناوچاوانیدا هێنا، قژە ڕەشە درێژەکەی بە پەنچە شانەکردو گووتی: ها، قەقنەسی ئاوارە. من یارمەتیتدەدەم، بەڵام هەرچییەک ڕویدا نابێت من ناوم بێت... هەرچییەک ڕویدا من و تۆ یەکتر ناناسین، تۆ خۆت ئەو مەخزەنە بەتاڵانەت دۆزیوەتەوە، خۆت میوانەکانی خۆتت داوەتی ئەو جێگایە کردوە، خۆت بێئاگای هیچ مرۆڤێکی تر ئەو دادگایەت دامەزراندووە.

من بێ هیچ بیرکردنەوەیەک گووتم: دڵنیابە مستەفای شەونم، دڵنیابە.

مستەفای شەونم لە چاکەتە ڕەشە گەورەکەیدا لە دەریاوانێک دەچوو لە بەندەرێک لایدابێت، تا هەندێک کەلوپەلی ناو بازاڕ بکڕێت و دواتر بە کاوەخۆ بگەڕێتەوە بۆ سەر کەشتییەکەی. چەندجارێک بە پێکەنینەوە گووتی: چۆن دڵنیابم، چۆن؟ ئەو ئێوارەیە منی تا گێلاسی سپی گەیاندەوە و پەیمانی دامێ خۆی لە دەرفەتێکدا نوێن و ڕاخەرو شتی پێویست ببات بۆ ئەو مەخزەنە خاڵییانە.

دوای چەند ڕۆژێک ئێوارەیەک هات بەدوامدا و منی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ مەخزەنەکان. سەرسام بووم لەوەی بەوجۆرە بیری لە هەموو شتێک کردۆتەوە. نوێن و یاتاخی پتر لە پازدە کەس لە دوو شوێنی جیاوازدا دانرابوون، ئازوقەو تەباغ و نەوت، پازدە کورسی و مێزێکی چکۆلانە، دەفتەرو پێنوس و هەموو شتێکی دی. من بێئەندازە سوپاسمکردو گووتم: لێرەوە ئیتر تۆ کارێکت نەبێت، تۆ بە زیادەوە کۆمەکی منت کرد، ئیتر تۆ بکشێ دواوەو ئەوەی دەمێنێتەوە کاری منە.

ئەو ئێوارەیە بە گەرمی خوداحافیزیمان لە یەکدی کرد، باوەشی پیاکردم و گووتی: قەقنەسی ئەزیزم، کۆتری برام ئاگاداری خۆت بە. من چاوەڕوانتدەکەم.

منیش گووتم: ئاغای شەونم، تا دیدار.

لەو ساتەدا باڵندە سپییەکان بە جۆرێکی شێتانە بەسەر سەرماندا دەفڕین. وەک ئەوەی دڵنیابن ئیدی من و مستەفای شەونم تا زیاد لە دوو ساڵی دیکە یەکتری نابینینەوە.

* * *

شاناز سەلیم تەنیا خانمێک نەبوو کە کوشتەی خەوتن بوو لە ئامێزی مردندا، بەڵکو خانمێکیش بوو بۆنی مردنیشی دەکرد، هەفتەیەک بەر لە دەستپێکردنی دادگاکەی سامیری بابلی، بەیانییەک تازە چاوم کردبووەوە، خانمی شاناز بە هەموو جوانی خۆیەوە هەڵیکووتایە ناو ژوورەکەم. هاتنی بە جۆرێک کوتوپڕ و سەیربوو تا ماوەیەک خۆم بۆ کۆنەکرایەوە، هێند جوان بوو کە دەتبینی هەرچییەک بایتایە نەتدەتوانی سەرسام نەبیت، نەتدەتوانی لە شوێنی خۆت نەوەستیت و تف قووت نەدەیت. لەو جوانییانە بوو بۆ ئێستێک هەموو کەسێکی ئیفلیجدەکرد.

خۆی زۆر نەڕازاندبووەوە، هەندێک قسەی ڕەقی لەگەڵ مندا هەبوو، هاتبوو بیکات و بڕوات. من بە ئەدەبەوە فەرمووم لێکرد لەسەر دۆشەکەکەم دانیشێت. دیارە فەرموویەکی بێحورمەتانە بوو، بەڵام نەمدەزانی چیتریش بکەم، چونکە لەو دۆشەکە زیاتر شوێنی ترم نەبوو فەرمووی لێبکەم. بێئەوەی سەیرمبکات گووتی: فەرمووی چیم لێدەکەیت، من لەسەر دۆشەکە چڵکنی تۆ دانانیشم، هاتووم پێتبڵێم هەموو شتێک لەسەر نیازی تۆ دەزانم، هەموو شتێک، سامیری بابلی مێردی منە، ئەگەر شتێکی لێبێت لێت ناگەڕێم بە ئاسوودەیی بژیت.

من بێباکانە وەڵاممدایەوە: سامیری بابلی مێردی تۆیە یان مێردی هەر شەیتانێکی ترە گرنگ نییە، گوێبگرە من لەوانە نیم کە بە بۆنی کراسەکانت

گێژمبکەیت، من پیاوێکم دەتوانم ناو تاریکی ببینم، ڕۆحێکم وەک قەقنەس وەهام دەسووتێم و زیندوودەبمەوە، عاشقێکی ڕاستگۆشم کە ژنانی عەیارو دەستبڕی وەک تۆم لا گرنگ نییە، سامیری بابلی گەر مێردی تۆیە، دیلی منە.

دەمزانی شاناز سەلیم فێری ئەو جۆرە قسەکردنە نەبووە، بەدرێژایی ژیانی پیاوان لە بەردەمیدا خۆیان بچووککردبووەوە، لوتف و ئەڤینیان باراندبوو، نەزاکەت و نەجیبیان نیشاندابوو. بە تووڕەییەوە گووتی: گوێبگرە هەر شتێک ڕوویدات تۆ بەرپرسی. من هەموو شتێک دەزانم، هەموو شتێک دەربارەی ژیانی تۆ دەزانم، سامیر حیکایەتی تۆی بۆ گێڕاومەتەوە، ڕابوردووت، ژیانت لە ناو سۆزانییەکاندا، ئەوەی حەزت لە قەحبەیەکە ناوی دالیا سیراجەدینە، دەتوانم تووشی بەڵای گەورەت بکەم. گەر تۆ پێتوایە لە تاریکیدا دەبینیت، بزانە منیش بۆنم لە بۆنی گورگ تیژترە، دەزانم، دڵم پێمدەڵێت کە تۆ چیت دەوێت. هەموو شتێکیش دەکەم سامیر سەلامەت بێت، بتەوێت و نەتەوێت ئەوە مێردی منە و بە ئاسانی وازی لێناهێنم.

ئەگەرچی بەدرێژایی ژیانم تەنیا ستایشی خانمانم کردبوو، تەنیا وەسفی جوانی و ژنێتی و عیشوەو ویقاریانم دەزانی، هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان بە خانمێکم نەگووتبوو تۆ ناشیرینیت، هەر کاتێکیش دەرفەتم بووبێت ناسکترین وەسفم دابووە پاڵ ناشیرینترین کیژ، بەڵام ئەوەی شاناز سەلیم وەک پەڕۆیەکی پیس تەماشای منی دەکرد، لای ئەو من هیچ نەبووم جگە لە هەتیوە ئاوارەیەکی چڵکن، زۆر برینداریدەکردم. دەمزانی بریندارکردنی شاناز سەلیم وەک بریندارکردنی پڵنگێکی برسی وەهایە، لەگەڵ ئەوەشدا وەک ئەوەی خۆشحاڵ بم بەوەی بچمە شەڕێکەوە لەگەڵ پڵنگێکی برینداردا، بە تۆنێکی تاریک و ڕەش کە دووربوو لە دەنگی ڕاستەقینەی خۆم، وەک ئەوەی شەیتانێکی شاردراوە لە ڕۆحی مندا هاتبێتەسەرێ و لە جستوجوی شەڕێکی کوشندەدا بێت گووتم: تۆ درۆدەکەیت، خاتوو شانازی بەڕێز، تۆ

هیچ نیت جگە لە عاشقێکی بێشەرم و بێحەیای مردووەکان، هەرکەسێک لە ڕێگای مردندا بێت تۆ پەلی دەگریت و ڕایدەکێشیتە سەر سیسەمەکەی خۆت، ژن هەیە حەزیان لە پیاوی بەهێز و پڕ لە ژیانە، تۆ لەوانەیت کە حەزت لە پیاویَ مردووە، تۆ لەیەکەم ڕۆژەوە کە هاتیتە ئێرە دەزانیت سامیر پیاوێکە بۆنی مردنی لێدێت، دەزانیت، بەڵام ئێستا دەتەوێت بۆ خۆتی بسەلمێنیت کە عاشقیت، کە لە پێناوی خۆشەویستیدا شەڕدەکەیت، لە کاتێکدا تۆ دەزانیت کە گەر سامیر بۆنی مردنی لێ نەهاتبایە تۆ نەتدەویست، تۆ هیچ نیت جگە لە قەڵەڕەشێک کە لە بەرگی ژنێکی بە نازو عیشوەدا خۆی گۆڕیوە، لە کاتێکدا خانم تۆ باڵدارێکی شوومیت، هەموو شار دەزانێت کە تۆ لە هەر کەس نزیک بیتەوە دەیکوژیت.

لام وابوو پەلامارم بدات، بەڵام دانی بە خۆیدا گرت و بە ڕقێکی زۆرەوە کە بێرەحمییەکی ئێجگار گەورەی تێدابوو گووتی: من باڵدارێکی شووم نیم، گەر مێردەکانی پێشووم مردبن گوناهی من نییە، خۆ من نەمکوشتوون. بەڵام دەبێت بزانیت من کەسێکم دەتوانم هەر ئەمشەو وابکەم تا دەمریت لەو قسانەی خۆت پەشیمان بیت. تەنیا لە بەر خۆشەویستی بابلی لە تۆ دەخۆمەوە، بزانە گەر ڕۆژێک بابلی بمرێت تۆش لەگەڵیدا دەچیت بۆ جەهەنەم، من ئەوەندە بە تۆ دەڵێم سامیر بە تەنیا ناچێت بۆ جەهەنەم. وەک چۆن پێکەوە گەڕانەوە بۆ ئەم شارە، وەک چۆن سوار ئەسپە سپییەکان بوون ئاوەها لەگەڵ ئەودا سوار یەک ئەسپ دەبن و بەیەکەوە دەچن بۆ جەهەنەم، گەر نیازت لە پرتەقاڵی بابلی خراپە بزانە کە ئەو بە تەنیا نامرێت.

من بە دەنگێکی بەرز کە پێموابوو هەموو دراوسێ ژوورەکەم دەیبیستن گووتم: مردن خانم؟ من لە مردن ناترسم، دەزانم تۆ بۆیە ڕقیشت لە منە لە بەرئەوەی من بۆنی مردنم لێنایەت، گەر بۆنی مردنم لێبهاتایە ئەوا حیکایەتەکە سەرتاپای دەگۆڕا.

شاناز کە تەواو تێدەگەیشت من دەڵێم چی، گووتی: تۆ وەک سەگێکی

بێسفەت وایت، مێردەکەی من تۆی لە مردن ڕزگارکرد، وانییە بۆ کەمێک بیرناکەیتەوە.

گووتم: خانم مێردەکەی بەڕێزتان هاوڕێی منە، هیچ نیازێکی خراپم نییە، ئەگەر هاتووشیت من بترسێنێت، ئەوا خۆت ماندوودەکەیت، چونکە من شتێکم نییە لێی بترسم. گەر بشچم بۆ جەهەنەم خراپ نییە، لەسەر یەک ئەسپ لەگەڵ ئاغای بابلیدا خۆمان بکەین بە جەهەنەمدا، خۆمان بکەین بە ناو ئاگرو پشکۆ و بڵێسەکاندا، بەڵام خانم وەک من بیستوومە خەڵک لەسەر ئەسپ ناچن بۆ جەهەنەم.

چووە بەردەرگاکەو گووتی: نەهاتووم دەمەدەمت لەگەڵدا بکەم، هێند هەیە پێتدەڵێم گەر سامیری بابلی شتێکی لێبێت، ناهێڵم لە دۆزەخیشدا پشووبدەیت.

من بەردەوامبووم لە لاقرتێکانمدا و گووتم: ئەها خانم، بەڵام نازانم تۆ خۆت چۆن دێیت بۆ جەهەنەم، تۆ چۆن دوامان دەکەویت، بە مارسیدس یان بەجۆرە ماشێنێکی تر، وابزانم خانم خەڵک لە جەهەنەم ئیجازەیەکی تایبەتی شۆفێریان دەوێت، کەوەرگرتنی کەمێک سەختترە لەم ئیجازەیە کە تۆ بە شتێک پارە لای پۆلیسەکانی هاتوچۆ کڕیوتە.

شاناز سەلیم بێئەوەی وەڵاممبداتەوە، بێئەوەی سەیرمبکات گووتی: هیوادارم لە قسەکانم تێگەیشتبیت.

وای گووت و لە ژوورەکە چووە دەرێ.

دەمزانی شاناز سەلیم ژنێکی ترسناکە، بەڵام من لەوە داماوتربووم هەڕەشەو شتی وا بمترسێنێت، دواجار کە مرۆڤ هیچی نەبوو لە هیچیش ناترسێت. من دڵنیابووم ئەو هەڕەشانەی شانازیش بەشێکن لە یارییەکە، دڵنیابووم شاناز بێئەوەی ئاگاداربێت یەکێکە لە بازنەکەدا. من دەمزانی ئەو بێئەوەی ئاگاداربێت هەمان ئەو یارییەدەکات کە من چاوەڕوانمدەکرد.

## سەفەرێك بە ڕۆحی نەقیب سامیری بابلیدا

شەوی سیازدەی حوزەیرانی ساڵی هەزارو نۆسەد و نەوەدو سێ، واتە دوو شەو بەر لە دادگا گەورەکەمان، سامیری بابلی هات بۆلام و دەستی گرتم و گووتی: جەلادەتی کۆتر، سەیری چاوم بکە.

چاوانی لە چاوی تەڕی باڵندەیەک دەچوون بە ژێر باراندا فڕیبێت. ئەو چاوە سەیرانە بوو کە ڕاستەوخۆ دەروازەی ڕۆح بوون. بە غەمێکی قووڵەوە گووتی: بەر لە مردن حەزدەکەم تۆ ناو ڕۆحم ببینیت. ئەی منداڵی نەجیب دەمەوێت تۆ پێمبڵێیت من کێم؟. دەنگی هێند قووڵ و سیحراوی و سەیر بوو دەیتوانی خەوم لێبخات. هەستم بە تەزوویەکی سەیردەکرد لەسەری پەنجەکانییەوە دێتە ناو لەشم، ئێستا من و ئەو لە دوو دوژمن نەدەچووین، بەڵکو لە دوو سۆفی دەچووین کە لەیەک خەڵوەتدا پێکەوە دەسوڕێینەوە و پێکەوە هەمان ئاگر و هەمان ڕوناکی و هەمان ئیشراق دەبینین. قاتێکی جوانی لەبەردابوو، بۆینباخێکی سوور لەسەر کراسێکی سپی، لە چاوتروکانێکدا هەستمکرد من و ئەو پێکەوە سەمادەکەین. ساتێکی بێهۆشی و نوقمبوون بوو، وەک ئەوەی دەروازەی ژوورێکی تاریکم لێکرابێتەوە، یان بە خاکێکدا بڕۆم پێشتر هیچ ئادەمییەک پێی تێنەناوە، گەردەلوولێک بمبات پێشتر بەر لەشی هیچ مرۆڤێک نەکەوتووە. ئاگادار بووم سامیری بابلی دەستی گرتبوو و دەیگووت: ئەی منداڵی نەجیب تۆ لە ڕۆحی مندایت، تۆ ئێستا بە قووڵایی ژیانی مندا سەفەردەکەیت. من لێمدەپرسی: سامیری بابلی ڕۆح چییە؟. ئەو دەیگووت: ڕۆح ئاوێنەی ئەو ئیشانەیە کە بەدەستەکانمان دەیکەین، پڕە لە سەدای ئەو هاوارانەی لە زارماندا دەوەستێت،ماڵی ئەو نیگارانەیە کە بە دیدەمان دەیبینین.

ئەو وایدەگووت و من وەک یەکێک خەوم لێبخات هەستمدەکرد لە شوێنێکدام پڕە لە کاتژمێری گەورە گەورە، زەوییەک هەزارەها کاتژمێری گەورەی تێدایە، کاتژمێر لە سەر بورجەکان، لەسەر ترۆپکەکان، لەسەر دیواری شەقامەکان، لە ناو قەدی درەختەکان، لە ناو سنگی باڵندەکان. لە ناو غونچەکان و ژێر ئاوی کانیاوەکان و ژێر کاشییە شوشەییەکاندا. کاتژمێری شکاو، کاتژمێر کە هیچ ساتێک و هیچ ڕۆژێک و هیچ سەردەمێک نیشاننادەنەوە. من سەیری ئەو کاتژمێرانەم دەکردو دەمزانی ئەوان هێمایەکم سەبارەت بە مردنی کات دەدەنێ. من دەمگووت بڕۆ سامیری بابلی بڕۆ. دەکەوتینە ناو باغێکی ناکۆتای پرتەقاڵەوە، دەکەوتینە زەوییەکەوە لەگەڵماندا پرتەقاڵ خلدەبوونەوە، ئەو پرتەقاڵانەی دەبوون بەسەری مرۆڤ و دەبوونەوە بە پرتەقاڵ، دەبوون بە زارێکی کراوە بۆ هاوار و بە نیگایەکی کراوە بۆ فرمێسک، ڕاماندەکردو پرتەقاڵەکان لەگەڵماندا خلدەبوونەوە، سەری مرۆڤەکان لەگەڵماندا خلدەبوونەوە، بۆنی پرتەقاڵ و بۆنی خوێن لەگەڵماندا دەهاتن، ڕەنگی شەربەت و ڕەنگی خوێن لەگەڵماندا دەڕژان. ئاه پرتەقاڵی بابلی، بڕۆ... بڕۆ. بە زەوییەکدا دەڕۆیشتین سەرتاپای دوکەڵ بوو، مرۆڤمان دەبینی وەک ستوونی ئاگر لە ڕێگاکاندا سەیریاندەکردین، مرۆڤمان دەبینی بە ئاگرەوە دەفڕن، منداڵی خۆڵەمێشیمان دەبینی لە ئاسمان دەکەونە خوارێ و لە ڕێگادا دەبنە تۆز، گورگمان دەبینی نێچیری سووتاویان بەدەمەوەیە، باڵندەمان دەبینی میوەی پشکۆیان بە دەنووک دەگواستەوە. دەچووینە جێگایەک پڕ لە ستوونی مەڕمەڕ کە دەبوون بە هەڵم و دروستدەبوونەوە، پڕ لە کۆشک کە دەبوون بە غوبارو هەڵدەستانەوە، پڕ لە بورج کە دەبوون بە تۆز و یەکیاندەگرتەوە، من لە ڕۆحی سامیری بابلیدا ئەو کاروانی ئادەمیزادانەم دەبینی کە لە قەفەزدا بە ڕێگایەکی خۆڵەمێشیدا بەرەو شوێنێکی نادیار کۆچیاندەکرد، ئەو ژنانەم بینی کە لە شوێنێکدا هەڕاجدەکران، ئەو پیاوانەی لە قەفەزەکاندا

وەک مەیموون سەمایاندەکرد، ئەو منداڵە بچوکانەی بە تەنافێکی گەردونیدا هەڵواسرابوون و هەور بە ناویاندا دەڕۆیشت. لەم دەبینی پەپولەی ڕەشی لێدێتەدەرێ، هەزاران بەیداخم دەبینی قەڵەڕەشەکان لەسەر ستوونەکانیان نیشتوونەتەوە، سەربازم دەبینی بە شمشێری سپییەوە لە زەلکاوی ڕەشدا مارشدەکەن، لاشەی کچم دەبینی کە نێوان مەمکیان بووبوو بە کانی و باڵداری نەناسراو لێیان دەخواردەوە، سەگم دەبینی لە مانگێکی کوژراو دەخۆن، چەقەڵ کە بە دوای سەرابی مراوییەکدا ڕادەکەن. کەوتنە خوارەوەی ئەستێرەم دەبینی بەسەر گوڵ و پاساری ترسنۆکدا، زنجیرم دەبینی بەدوای درەختی ترساودا ڕایدەکرد، ئاومدەبینی سەرەوژوور بەقینەوە بەرەو خۆی دەگەڕایەوە، مرۆڤم دەبینی لەگەڵ نیگارە ئاوێنەییەکانی خۆیدا شەڕیدەکرد، مرۆڤم دەبینی دابەشدەبوو و لەگەڵ هەر دابەشبوونێکیشیدا پارچەکانی دەکەوتنە جەنگەوە لەگەڵ یەکدا.

بڕۆ سامیری بابلی بڕۆ… دەچووینە سەر خاکێکی بەیار، دەپەڕینەوە بۆ ناو وشکانییەکی ترسناکتر و چۆڵتر، سەر پێدەشتێکی ناکۆتای تەپوتۆز کە جگە لە هەندێک مزگەوتی سەرابی و منارەی خەیاڵی هیچی دیکەی تیانەبوو، دەچووینە شارێکی بێدەنگ کە مرۆڤەکانی پێکڕا لەسەر شۆستەکان نوێژیان بۆ خودایەکی نەناسراو دەکرد، گۆڕەکان بۆنی پرتەقاڵیان لێدەهات، بە کوچەی باریکدا دەڕۆیشتین و مردووەکان پرتەقاڵیان دەداینێ، دەچووینە ناو بورجی بەرزتر لە بورجە دێرینەکانی بابل کچی ڕووتمان دەبینی بانگیاندەکردین، شەیتانمان دەبینی بە دەنگی پەرییەک قسەی لەگەڵدا دەکردین و پەریمان دەبینی بە دەنگی شەیتانێک دەیدوانین. منداڵمان دەبینی بە دەنگی پیرەمێردەکان بانگیاندەکردین و پیرمان دەبینی وەک زارۆ دەگریان، سەری کچی ئێجگار جوانمان بینی بە لەشی پیاوی ئێجگار دزێوەوە، لەشی پیاوی ئێجگار بە هێزمان بینی بە سەری کچی ئێجگار ناسکەوە. سەرەوخواربوونەوەی ئینسان و شارەکانمان بینی، مانگمان بینی

بەدیوە هەڵگەڕاوەکەیدا، تیشکمان بینی بەڕووە نهێنییەکەیدا. بە کوچەیەکدا ڕۆیشتین پەیکەرەکان بانگیانکردین و مرۆڤەکانیش لە بێدەنگییەکی ئەبەدییدا نوقمبووبوون. بەرەو مەملەکەتی ئەوتۆ هەنگاومان نا سەرتاپای ئاژاوەبوو، بەڵام دۆزەخیشمان تەیکرد نوقم لە گوڵاوی بەهەشتدا، لە کێڵگەیەکی خاڵیدا باڵدارمان بینی لە فڕینی خۆیان پەشیماندەبوونەوە و دەگەڕانەوە، ئینسانمان بینی لە ڕۆیشتنی خۆیان زویردەبوون و دەگەڕانەوە. ئیدی بە هەر لایەکدا دەڕۆیشتین دەرگاکان داخرابوون، من هاوارمدەکرد سامیری بابلی بڕۆ... سامیری بابلی بڕۆ، بەڵام جگە لە کۆمەڵێک پەیکەر کە هەموویان دەموچاوی سامیری بابلیان هەبوو هیچی دیکەم نەدەبینی، من وەک پڵنگێکی بریندار لە دەرگاکانم دەداو هیچیان نەدەکرانەوە، بە پلەکانەیەکی ڕەشدا دادەبەزیم و جگە لە تاریکییەکی قووڵ و بێقەرار بەولاوە هیچی ترم نەدەبینی، دەچوومە خوارێ و لە تاریکییەکی ڕەهاو بێسنوور بەولاوە هیچی تر نەبوو... هاوارمدەکرد «سامیری بابلی ڕۆحی تۆ لە تاریکییەکی بێسنووردا کۆتاییدێت» بەڵام ئەو گوێی لەمن نەبوو، بە قادرمەکاندا سەردەکەوتمەوە و وەک ڕێبوارێکی ترسنۆکی ناو تونێلێکی درێژ لە پێچاوپێچی کۆشکێکی کۆنکرێتی ڕەشدا وندەبووم شوێنێک بەبێ دەرگا، شوێنێک بەبێ ڕێگا کە مرۆڤ تا کۆتایی پیا ڕادەکات و ناگاتە هیچ... هاوارمدەکرد «سامیری بابلی: ڕۆحی تۆ ناگاتە هیچ... ڕۆحی تۆ ڕێگای تیا نییە پیابڕۆم»، بەڵام ئەو گوێی لە من نەبوو.

هەستم بە دەستی دەکرد لەسەر دەستم، هەستم بە قاچی خۆم دەکرد کە ڕادەکات و سەمادەکات، ڕادەکات و سەمادەکات، هەستم بە دەستی سامیری بابلی دەکرد لە هەوای ژوورەکەمدا هاواردەکات و سەمادەکات، هاواردەکات و سەمادەکات... وەک لە بنی گۆمێکی تاریک بێمەدەرێ و بەرەو ڕوناکی سەرکەوم. دەستم درێژدەکردو دەمگووت سامیری بابلی، سامیری

مرۆڤ، سامیری هاوڕێم، دەستتم بدەرێ باپێکەوە بڕۆین و لەم تاریکییە دەرچین، سامیر ئاوڕی لەو شارانە دەدایەوە کە بەجێمان هێشتبوون، ئاوڕی لەو نیگارە ترسناکانەی خۆی دەدایەوە و دەوەستا و دەیگووت: هاوڕێم تۆ بڕۆ... تۆ بڕۆ. من دەمگووت: سامیری برام، ئەی پرتەقاڵی غەمگین لەو ئاشووبە ترسناکەی ڕۆحت وەرەدەرێ. سامیر دەیگووت «ئەی منداڵی نەجیب بڕۆ، بڕۆ، من بەپێی تۆ لەم باغەدا دەرناچم، من ناتوانم بە باڵی باڵندەیەکی نەجیبی وەک تۆ بفڕم». من دەوەستام و فلووتێکی درێژم بۆ سامیر ڕایەڵدەکرد، فلووتێکی درێژتر لە کوڵەکەیەکی زێڕین کە مەلەکوتی ڕاگرتبێت. سامیر فلووتەکەی دەگرت و لە دوورەوە دەیگووت: ئەی منداڵی نەجیب، ئەم فلووتەم بدەرێ با لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ نێو تاریکی، بەڵکو لەوێ یارمەتیمبدات، ئەی منداڵی نەجیب مەگەر ئەم فلووتە لە تاریکیدا یارمەتیمبدات«من دەستم لەو ئامێرە بەردەداو وەک هەوایەکی خێرا هەڵمگرێت بە تونێلێکی ڕوناکدا بەرەو ئاسمانێکی شین سەردەکەوتم، سامیر بە خۆی و فلووتێکەوە بەرەو ناو زوڵماتێکی بێبن دەڕۆی... من لەوسەری ئاسمانەوە بانگم لێدەکردو ئەو لەوسەری تاریکییەوە نەیدەتوانی وەڵاممبداتەوە.

* * *

هەموو شتەکان بەوجۆرە ڕویاندا کە من بۆم گێڕانەوە، دەبێت باوەڕم پێبکەن، دەبێت بزانن من یەکێکم لە فانەتیکەکانی حەقیقەت، ڕابوردووم وەک وەسفبازێکی درۆزن نابێت ئەوەتان لێ تێکبدات کە من لە گێڕانەوەی «ڕاستیدا وەکو خۆی» کەسێکی سەرسەخت و دەمارگیرم، دیارە لەوانەیە ئەو ڕۆژەی ئەم کتێبە چاپدەبێت من لێرەنەبم، لەوانەیە نەتوانم تا دەگەینە

سەر دواهەمین وشە و دواهەمین چاپ هەموو شتێک چاوەدێربیکەم، بەڵام دڵنیابن ئێوە دواجار لەم کتێبەدا هیچ شتێک ناخوێننەوە گەر جەلادەتی کۆتر خۆی نەیبینیبێت و نەیزانیبێت. ئیشی ئاغای عەلی شەرەفیار ئەوەیە چیرۆکەکە بکاتە تێکستێکی جوان، ئیشی ئەو لەوە زیاتر نییە، دەزانم کە دواجار تێکستەکە دەخوێنمەوە، لە نێوان خوێندنەوەی من و چوونیدا بۆ چاپخانە ماوەیەکی درێژ هەیە. دەشزانم ئەو وەک من حەقیقەت پەرست نییە، چیرۆکنوسەکان لە بواری حەقیقەتدا کڵۆڵ و دەستکورتن. تۆ حەقیقەتێکیان دەدەیتێ و سەیردەکەیت دوای دە دێڕ بە جۆرێک شاخ و گوێیان لێڕواندووە مرۆڤ لێیدەتۆقێت. هەوڵدەدەن بەردەوام خورافەتێک بڵاوبکەنەوە کە گوایە چیرۆک لە ژیان سەیرترە، بەڵام هیچ وەخت چیرۆک لە ژیان سەیرتر نەبووە، هەمیشە ژیان لە چیرۆک سەیرترە. ئاغای شەرەفیار لە مێژە لەو هەوڵەدایە کە من بهێنێتە سەر ئەو ڕایەی چیرۆک هەمیشە شتێکی سەیرتری لە ژیان پێیە. ڕۆمانی «سەفەرەکانی گیلڤەر» م دەداتێ بیخوێنمەوە، «دکتۆر جیکل و مستەر هاید»م دەداتێ، «ئەلیس لەسەر زەمینی عاجباتییەکاندا»، ڕۆمانەکانی جۆل ڤێرن، هەندێک چیرۆکی ئادگار ئالان پۆ و کافکا. من هەرجارێک یەکێک لەوانە دەخوێنمەوە دواتر هەستدەکەم ژیانی من و ژیانی ئەو کەسانەی دەیانناسم سەد جار لەو چیرۆکانە سەیرترن. هەتا ژیانی پیرێژنەکانی گێلاسی سپی سەد جار لە ژیانی ئاغای گیلڤەر و خانمی ئەلیس و کەروێشکە سپییە گەمژەکەی سەیرترە. من هەمووجارێک بە حەسرەتەوە دەمگووت، گەرِ من لە ڕۆژگاری جەنابی جۆناسان سویفت یان ڕۆبەرت لویس ستیفنسندا بژیابامایە، گەر ڕۆژێک ڕێکەوتی بەڕێزێکی وەک لویس کارۆڵم بکردبایە، تەواوی ئەو بۆچوونانەم لەلا هەڵدەوەشاندنەوە کە لەسەر پەیوەندی حەقیقەت و خەیاڵ لە ئەدەبدا دروستیانکردوە.

گەر عەلی شەرەفیار لە نێوان دوا خوێندنەوەی من و گەیشتنی کتێبەکەدا بە چاپخانە چیرۆکەکە دەستکاری نەکات، ئەوا تەواوی ئەم کتێبە بەوجۆرە دەبێت کە من دەمەوێت، چونکە دواجار ئەمە سەربوردی ژیانی جەلادەتی کۆترە کە ئێستا هەمووتان دەزانن ساڵی ١٩٧٠ لەدایکبووە و لە کۆتایی سەدەی بیستدا «بەشێوەیەک کە تێکەڵەیەکە لە تراژیدیاو کۆمیدیا» سەفەرێکی سەیری بە هەندێک زەمین و زەماندا کردوە کە لەوانەیە چیرۆکەکانی چەند سەدەیەک وەک حیکایەتێکی خورافی بمێنێتەوە. ئیتر دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەش پەیمانتان دەدەمێ هەرگیز نایبیننەوە. «ئەوە تەنیا پەیمانێکیشە کە پاڵەوانی چیرۆکێک دەتوانێت جێبەجێیبکات».

دەبایە نهێنی ئەو گەشتەی من بزانن کە گەشتێکە هیچی لەوەی جەنابی ئۆدیسیۆس کەمتر نییە دوای ئەوەی لە تەروادەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئێساکا، پاش شەڕوشۆڕێکی درێژ کە ئەخیلۆسی بە جۆرێکی کاریکاتێری تیادەکوژرێت، بەوەی تیرێک دەیدات لە پاشنەی پێی، بەدەستی کێش بەدەستی «پاریس»...ها، ئەو منداڵە ترسنۆکەی کەس تێناگات هیلینا حەزی لە کوێی ئەو میزبەخۆداکەرە کردوە... من هەموو چیرۆکە بێماناکەی تەروادەو گەڕانەوەی ئۆدیسۆسم بۆ لای پینۆلۆپە دەخوێندەوە و خەریک بوو لە پێکەنیندا دەتەقیم، بە ئاغای شەرەفیارم دەگووت: ئاغای چیرۆکنوس ئەمە ئەو شتە سەیرو عاجباتییە ئەدەب پێشکەشماندەکات. ئەمەیە شاکارە نەمرەکەی چیرۆکنوسان کە نازانم چەند سەدەو چەند دەهەرە شانازی پێوەدەکەن، کوشتنی ئەخیلۆس بەدەستی ئەو ترسنۆکە شەڕواڵ پیسە کە هیلینا لە مێردەکەی دەفڕێنێت، ئاخر ئەمە کەی عەدالەتە، ئەمە وەک بەزینی شەمشون وایە بەدەستی پوشکە بە قوونەیەک.

نازانم من لە ناو هەموو جنسەکانی هونەردا، لە شیعرو مۆسیقاو نیگارکێشان گومانێکی سەیرم لە چیرۆکنوسان هەبوو، موسیبەتەکەش ئەوەبوو داوم کەوتبووە داوی ئەوان... ئێستا وا هەستدەکەم بەشێکی

عەیبەکە لە مندایە، هەر کات گوێم لە مۆسیقا دەگرت بیرم لە حەقیقەت نەدەکردەوە، گوێم لە شیعر دەگرت بیرم لە حەقیقەت نەدەکردەوە، سەیری نیگاری شێوەکارەکانم دەکرد بۆم گرنگ نەبوو حەقیقەتە یاخود نا، بەڵام کە حیساب دەهاتە سەر چیرۆک، کە دەمبینی چیرۆکنوسان بۆ نیشاندانی شتی سەیر خۆیان وا نیشاندەدەن پەڕیونەتەوە بۆئەوبەری حەقیقەت، من وەک فانەتیکێکی حەقیقەت دەمگووت: بەڕێزم بوەستە، بوەستە، من شتی لەوە سەیرترت لە ژیاندا نیشاندەدەم کە بەسەر خۆمدا هاتووە، ئا... گەر بەسەر یەکێکی تردا بهاتبایە عەیبی نەبوو تۆ پێمبڵێیت، قوربان یەکێک کڵاوی ناوەتەسەرت و درۆی بۆ کردویت. بەڵام شتێک کە بەسەر خۆتدا بێت کێ دەتوانێت ئاوها سووکایەتیت پێبکات و بڵێ مامۆستا تۆ درۆدەکەیت.

من دەزانم هەرکات دەگەیشتمە ئەو بەشەی باسی سەفەری خۆمم بە ڕۆحی سامیری بابلیدادەکرد، باسی ئەو شارە پڕ ئاشووب و باڵندە پەشیمان و ستوونە خۆڵەمێشانەم دەکرد، ئاغای شەرەفیار بە گومانەوە سەیریدەکردم و دەیگووت: پێشتر ئەدەب شتی وای تیانەبووە یەکێک بە ڕۆحی یەکێکی تردا سەفەربکات، ئەمەیان نابێت. بە گومان بوو لەوەی کە دەمگووت. زەمەن لە ڕۆحی بابلیدا وەستابوو، واتە کاتژمێرکان نەیاندەویست چیتر بەوجۆرە بڕۆن کە لە ژیانی بابلیدا ڕۆیشتبوون. کە دەمگووت: ڕۆحی بابلی پڕە لە پەشیمانی، لە دەرگای داخراو، لە پلەکانەی دوورودرێژ کە تا هەتاهەتایە بەتاریکیدا دادەبەزێت و ناگاتە هیچ.

بەڵام شتەکان بەوجۆرە بوون، من ڕۆژێک چوومە ناو ڕۆحی بابلی و دوای ئەوەی فلووتێکم لەلا بەجێهێشت هاتمەدەرێ.

ئەو ڕۆژە کە من و سامیری بابلی بە ئاگاهاتینەوە هەردووکمان بێهۆش لەسەر زەوییەکە کەوتبووین، جلە جوانەکانی وەها تۆزاوی بووبوو من لەو شەوەدا هەموو گەردو غوباری سەر چاکەتەکەیم دەبینی، شەوێکی

درەنگ بوو، کارەبا لە هەموو شاردا کوژابووەوە، هەتا چرایەکیش نەدەسووتا، بەڵام مانگ هێند نزیک بوو وامدەزانی گەر سەرکەوم بۆ قاتی حەوتەم و لە باڵکۆنەکەوە تۆزێک خۆم درێژبکەم بەدەست دەیگرم. بابلی وەک شێتَ خۆی تەکاند و گووتی: خودایە چی بوو، ئەی منداڵی نەجیب چی بوو. یەکەم جاربوو ئاوها بترسێت. من چوومە باڵکۆنەکەو هیچم نەگووت. وەک یەکێک بەدەم خەوەوە قسەبکات گووتی: پەیکەری ناو باغەکە، پەیکەری من و شاناز بوو، شاناز سەلیم کە دواتر بوو بە ژنی من.

نەمزانی لەگەڵ کێدا قسەدەکات. بەدەنگێکی ترساوتر لەبەرخۆیەوە گووتی: ئەوەی دەمێنێتەوە لەو خەوە جەلادەتی کوترە لە پاڵ درەختێکدا بە خوێنێکی زۆرەوە. قسەیدەکرد و لە ژوورەکەدا بەدوای جزدان و زنجیرو سەعاتەکەیدا دەگەڕا کە پێدەچوو لە کاتی سەماکردندا ونیکردبێتن، سێبەرە تاریکەکەیم دەبینی لە ژوورەکەدا هەڵدەسوڕا لە پیاوێک دەچوو لە گەردەلوولێکی سامناک ڕایکردبێت، بەپەلکووتان شتەکانی دۆزییەوەو گووتی: درەنگە... درەنگ. ئێستا چاوەڕوانمدەکات.

بێئەوەی خوداحافیزیبکات لە ژوورەکە چووەدەرێ و گوێم لە هەنگاوە خێراو کوێرەکانی بوو لەسەر پلیکانەکانی گێلاسی سپی، چاوم لێبوو وەک سەرخۆش بە شەقامە چۆڵ و تاریکەکەی خوارەوەدا دەڕوات و دەکەوێت بەملاولادا. کەمێک دوورکەوتەوە و بەدەنگێکی سەیر پڕ بە شەو، پڕ بە خامۆشی، بە عەرەبییەک کە هەموو گێلاسی سپی لە خەوهەستان هاواریکرد: ئێستا فلووتێکم هەیە... فلووتێکم هەیە... فلووتێک... فلووتێ... فلووت... فلووووو.

# شەوی حیساب

هۆڵێکی چکۆلانەبوو، تیشکی خۆرئاوابوون لە هەموو پەنجەرە غەمگینەکانییەوە دەهاتەژووری. بایەک موژدەی هاوینی پێبوو بەهێمنی هەڵیدەکرد. سامیری بابلی بەر لە چەند ساتێک گەیشت، بەشەرمێکی گەورەوە سەیری قوربانییەکانی خۆی کرد، بێئەوەی هیچ یەکێکیان قسەبکات ئەو یەک بە یەک بە ناوی خۆیانەوە سڵاوی لێکردن، تەنیا باوکی سەرهەنگ قاسمی نەناسی، من بە دەنگێکی غەمگین بەیەکدیم ناساندن. دەستیم گرت و لەسەر کورسییەکی تایبەتی دامنا، هەستمکرد دەستی دەلەرزێت. بۆئەوەی ئارامیبکەمەوە دەستم خستەسەرشانی و پێمگووت: مەترسە. زەردەخەنەیەکی پەشۆکاوی بۆ گرتم و گووتی: ناترسم. بێدەنگییەکی کوشندە باڵی بەسەر هەموومانندا کێشابوو، هەموو سەیری منیان دەکرد و منیش سەیری پرتەقاڵی بابلیم دەکرد. هەموو لە پەنجەرەکانەوە خۆرمان دەبینی ئاوادەبێت. تیشکی خۆرئاوابوون لە پشتەوە دەیدا لە سامیری بابلی و شەبەنگێکی خوێنینی لە دەوری دروستدەکرد. کراسێکی سپی لەبەردابوو. جلەکانی لە هەموومان نوێتر و پاکتربوو. دەستەسڕێکی سپی پێبوو کە دەریهێنا و ناوچاوانی پێسڕی. من کەمێک مێزەکەم نزیککردەوەو گەڕامەوە بۆ پشتەوە، لەوێ ترمۆزێکی گەورەی چام هێنایە پێشێ و زەردەخەنەیەکی بچوکم بۆ هەموویان گرت. دەبایە یەکەمین کەس بم کە قسەدەکەم، پێشتر قسەکانی خۆم ئامادەکردبوو تا سروشتێکی ڕەسمیانەی هەبێت و لەسەرەتاوە کەشوهەوای دادگا بەسەر تەواوی پرۆسێسەکەدا بسەپێنێت. بە ویقارێکەوە چوومەسەر مێزەکە، دوای ئەوەی شوێنی خۆم چاککرد گووتم: ئەمڕۆ پازدەی شەشی ساڵی هەزارو نۆسەدو نەوەد و سێیە. ئێمە دە کەس لێرەدا بەنهێنی کۆدەبینەوە بۆئەوەی

بڕیارێکی گرنگ لەسەر چارەنوسی هاولاتییەکی ئەم ولاتەبدەین کە بە جۆرێکی ڕاستەوخۆ لە ئازارو ئەشکەنجەی ئێمەدا بەشداربووە. بەداخەوە تەنیا کەسێک لەم دادگایە دواکەوت خانمی پەپولە جەمال بوو، کە هێندەی من بزانم، لە هەڵومەرجێکی زیندەگی هێند سەختدایە دەرفەتی بەشداری پێنادات. هەمووتان لەوەوبەر هاولاتی سامیر زوهێرتان ناسیوە. هاولاتی سامیری بابلی کە نەقیبێکی سوپای عێراق بووە، لە پلەوپایەی سەربازیدا تا ڕوتبەی عەقید سەرکەوتووە و جارێکی تر بەهۆی هەندێک سەرپێچییەوە دابەزێنراوەتەوە بۆ نەقیبی. ئێمە لێرەدا تەنیا نمونەیەکی قوربانییەکانی گوناهبار سامیری بابلیین، کە لەماوەی کاری خۆیدا لە کوردستان و لە باشووری ولات و لە بەرەکانی جەنگدا بێشومار قوربانی لەدوای خۆی جێهێشتووە. ئێمە تەنیا دەستەیەکی چکۆلانەی قوربانییەکانی نەقیب سامیری بابلیین، واتە کە بیردەکەینەوە و بڕیاردەدەین دەبێت لە بیرمان بێت کە ئێمە لە بری هەموو بێگوناهانی دی بڕیاردەدەین. لەبری سەدان قوربانی کە ئەمڕۆ لێرە نین. دەبێت بزانین ئێمە ئەو گروپە خۆشبەختەین کە نەمردوین، ئەو گروپەین کە ئەگەرچی بە شێواوی دەژین، بەبرینداری دەژین، بەکەمئەندامی دەژین، بەلام دەیانی دیکە هەن کە مردوون و ئەمڕۆ ئێمە لەبری هەموو ئەوانیش بڕیاردەدەین... ئەمە تەنیا دەرفەتمانە شتێک لە دادپەروەری بۆ ژیان بگێڕینەوە، سبەی گەر دیکتاتۆریش بڕوات، کەس کەسانی وەک سامیری بابلی ناداتە دادگا، لەوانەیە سەرۆکە گەورەکان سزابدەن، بەلام کەسانی وەک سامیری بابلی خۆیان تێکەلاوماندەکەنەوە، لە شەقامەکاندا بەلاماندا دەڕۆن، لە چێشتخانەکاندا بەرامبەرمان دادەنیشن، لە باغەکاندا پیاسەمان لەگەڵدا دەکەن و کەس نازانێت کە ئەوانە چ گوناهێکیان کردوە.

ئێستتیکمکردو سەیرێکی سامیری بابلیم کرد کە بە چاوە تەڕەکانی خۆیەوە «چاوی باڵندەیەک کە لە ژێر باراندا فڕیبێت» سەیریدەکردم.

ساتێک بوو نەمدەویست بەزەیی و سەرسامی یان کینەو تۆڵە بمگرێت. ئەو ڕۆژەم هاتەوە یاد کە لەگەڵ پرتەقاڵی بابلیدا بەسوار دوو ئەسپی سپییەوە گەیشتینەوە ئەم شارە و لەبەردەم دەروازەکانی شاردا گووتم: سامیری بابلی تۆ دیلی منیت. بۆئەوەی ئەو وێنە بروسکەئاسایە بکوژم گووتم: ئازیزانم دەبێت بزانن سامیری بابلی خۆی دانی بە هەموو گوناهەکانی خۆیدا ناوە، ئێمە ئیشمان ئەوەیە بڕیاری مردن یان پاکبوونەوەی سامیری بابلی بدەین. ئێوە یان لە سامیری بابلی دەبورن یاخود نا. من دڵنیاتاندەکەمەوە کە عەدالەت لە دادگاکانی دەوڵەتدا نییە، گەر بمزانیایە حاکمەکانی دادگای شار لە ئێوە عادیلانەتر حوکمدەدەن دەچووم بۆ لای ئەوان، ئێوە ئێستا لێرەن تا خۆتان داد و ناداد لە یەکدی جیابکەنەوە و بڕیاربدەن.

دەوەستام، هەناسەیەکی قووڵم هەڵدەکێشا، حەسرەتێکی خوێنینم لە دڵی خۆمدا سۆراغدەکرد و بە ئەفسوسێکی بەرینەوە دەمگووت: ئازیزان کامە دادگا لە ئازارەکانی ئێوەی پرسییەوە؟ کامە حاکم و کامە دادوەر؟ کامە دادگا لەسەر ئەم ئەستێرەیە لە منی پرسی جەلادەتی کۆتر کوا هاوڕێکانت؟ کوا سەرهەنگ قاسم و ئیسحاقی لێوزێڕین؟ کامە دادگا گووتی: جەلادەتی کۆتر ئەم برینە گەورانە چییە بە لەشتەوە؟ کامە دادگا پرسی: جەلادەت کێ ئەو مۆسیقارە چکۆلانەیەی ناوتی کوشت؟. برایان و خوشکان هەقمانە بپرسین: ئەمانە چ قازی و چ دادگاو چ پارێزەرو داواکارێکی گشتین لەم وڵاتەدا کە تا حیزب و سەرۆک فەرمانیان پێ نەکات قوونی خۆیان ناجوڵێنن. من مۆسیقارێکی چکۆلانەبووم، ڕۆژێک لە ڕۆژان شەڕم لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەبووە لەسەر ئەم ئەستێرەیە، ڕۆژێک لە ڕۆژان ئاژاوەم نەناوەتەوە. بەڵام ئەمانە چ جۆرە حاکمێکن هەموومان دەبینن دەکوژرێین و چاوەڕێن لەسەروو خۆیانەوە فەرمانیان بدەنێ تا باوەڕ بە چاوی خۆیان بکەن؟. مەعاشە چلکنەکەی خۆیان لە عەدالەت بەلاوە گرنگترە. ها ئێوە

پێمبڵێن ئەمانە چ حاکمێکن؟... من هێندە تورەم لەو حاکمانە ئامادەم بێئەوەی شەرم لە هیچ بکەم لە ناوەڕاستی شاردا میزبکەم بەسەریاندا. کێ لە ئێوە دادگاکان لە زامی پرسینەوە... ها.. کێ لە ئێوە؟. بەیانیش گەر سامیری بابلی بدەینە دادگانی ئەم شارە، بیدەین بە دادگاکانی ئەم وڵاتە، کەس ئێمە لە دەرگاکانەوە ناکاتە ژووری تا برینەکانی خۆمان نیشانبدەین. قازییەکی گێژ لە ساڵۆنێکی ساردو بێڕۆحدا، لەبەردەم هەندێ خەڵکی عەبابەشانی تردا کە وەک من و ئێوە ئازاریان نەچەشتوە، ئەوانە بڕیاردەدەن سامیری بابلی گوناهبارە یان نا، گەر لەسەروو خۆیانەوە گووتیان سامیری بابلی بکوژە... دەیکوژن، گەر گووتیان ئازادیبکە، ئازادیدەکەن. ئێمەش تا قیامەت لەدەرەوە هاواربکەین... ئەی ئێمە... ئەی ئێمە... ئەی ئێمە. کەس دەرگامان لێ ناکاتەوە.

زۆر بە ویقارەوە قسەمدەکرد، دەنگێکی گڕو کاریگەرم بەکاردەهێنا، تۆنم لەسەر پلەیەکی دیاریکراو کۆککردبوو و نەمدەگۆڕیی. گووتم: مرۆڤ عەدالەت لە کتێبەکانی قانونەوە فێرنابێت، لە فەلسەفەکانەوە فێرنابێت، بەڵکو عەدالەت لە ئازارو گوناهەکانی خۆیەوە فێردەبێت. بۆیە کە بڕیاردەدەن ئەوەشتان بیرنەچێت کە سامیری بابلی بەویستی خۆی هاتۆتە بەردەم ئەم دادگایە، سامیری بابلی لەساتێکدا خۆی تەماشای دەستی خۆی کردوە، تەماشای ژیانی خۆی کردوە، گوێی لە هاواری قوربانییەکانی خۆی بووە... ڕۆژێک دەگاتە ئەو شوێنەی کە ئیدی دەبێت بگەڕێتەوە، هەستدەکات ژیانی ئەو کەڵەکەکردنی تاوانە لەسەر یەک، ئەو ئەمڕۆ لێرەدا ژیان و مردنی خۆی دەخاتە بەردەستی ئێمە. ئەم دادگایە تەنیا بۆ وەرگرتنەوەی مافی ئێوە نییە، تەنیا بۆ تۆڵەکردنەوە نییە، بەڵکو بەشێکی گرنگی سەفەری سامیری بابلییشە بەدوای پاکبوونەوەدا.

دەمزانی شەوێکی زۆر درێژمان لە بەردەمدایە، دەمزانی ڕوخسارەکانی بەردەمم هەموو قسەی خۆیان هەیە، گووتم: عەدالەت وادەخوازێت من

وەک کەسێک کە ئەم دادگایەم ڕێکخستووە، ئەگەرچی قوربانییەکم لە قوربانییەکانی بابلی، بەڵام کەسێکیشم بابلی فریادڕەسم بووە، هاوڕێم بووە، شەریکی سەفەرم بووە، ڕۆحی خۆی نیشانی من داوە... لەبەرئەوە من بڕیاری مان و نەمانی ئەو بۆ ئێوە جێدەهێڵم. ئێوە کە ماوەیەکی درێژتان هەبووە تا بیربکەنەوە، سەیری ڕۆح و ویژدانی خۆتان بکەن و بڕیاربدەن: ئایا دەتوانن لێیببورن یاخود نا؟ دەتانەوێت چیتر ژیانتان لەسەر ئەم ئەستێرەیە لەگەڵدا بەشبکات یاخود نا؟ دەتانەوێت بژی یاخود نا؟.

من دوای کۆمەڵێک قسەی دی دەوەستام، دیمەنی خۆرئاوابوون لە پەنجەرەکەوە مەستیدەکردم، سەیری دەموچاویانم دەکرد و بێدەنگییەکی قووڵم تیادەخوێندەوە، وام هەستکرد دوای من هیچ کەس نایەوێت قسەبکات، سەرم بەرزدەکردەوەو لەسەقفەکەدا ئاسەواری گەردەلوولێکم دەبینی، بۆئەوەی سەیری بابلی نەکەم خۆم بە تەماشاکردنی هێڵە سەیرو ئاڵۆزەکانی ئەو گەردەلوولە خەیاڵییەوە سەرقاڵدەکرد کە با لەسەر سەقفەکە هەڵیکەندبوو، کە چاوم داگرت دەستی ئەمیری گوڵەباغم بینی کە گووتی: مامۆستا، خودا عەفووتکا قسانم لۆهەیە؟.

«ئەمیری گوڵەباغ» بە خۆی و باندجە سپییەکەی سەر کەپوویەوە بەشەرمێکەوە هاتە سەر مێزەکەو ڕوویکردە سامیری بابلی و دوای تەماشایەکی بێدەنگ و درێژ گووتی: برای خۆم، برای خۆم، تۆ لۆ وەهات لە من کرد. لەفیکرت دێ گووتیت: من ئەو هەفتەیە هەر کەپوویانی قرت دەکەم. گووتیت: وەخودای عەزیم قیامەت دەسازێنم و شارێکتان لێ خەلق دەکەم سەرتاپا بەنیایەمی بێکەپوو... ئێ لۆ کورم لۆ؟. کەپووی من چ دەردێکی لە تۆ دابوو. خوداعەفووت بکا... خۆ کەپووش نەبێتن، بەنیایەم بە دری خۆی، بە قەربی، بە عەقری دەتوانێتن بۆنی گورەباغان بکا. ئەدی من هەنووکە لە زاری مامۆستای دەبیسم کە تۆ ئەو هەمی خەرک و عارەمەت خستۆتە بەر هەراکەت.. ئێ لۆ کورم لۆ؟ ئەوی عارەمی بەستەزمان نانێک

نیینە بیخاطن، تۆ چ دەردتە ئاوهای بەو هەژار و نەدارەی دەکەی. یەکێکت بێ کەپووی کردیە، یەکێکت بێ گونی کردیە، یەکێکت وەڵا نازانم بێ چی کردیە. ئێ خودا ڕوحمت پێبکات، سزا تازەی بە نەفعی چییە؟ وەرا سزای من لۆ تۆ، ئەوەیە وەکی تەیر لە قەفەزێکتکەم، بە درەختێکدا هەرتواسم و تا دونیا ئاخیرەتی دیتێ لەو قەفەزەدا بەخێیرری بە جوانی ببەیتن، تۆ قەربت بە دیدو دیمانی بەنیایەم تێکدەچێتن. من لە باغێکت دەکەم هەر بەنیایەمی جوان ببینیت و پر بە قەربت غەم بخۆی.

من چوومە نزیک بابلییەوەو هەندێجار قسەکانم بۆ دەکردە عەرەبی. ئەمیری گوڵەباغ هەر خەیاڵی لای سزایەکی شاعیریانە بوو، سزایەک سامیری بابلی فێری تەماشاکردنی جوانی بکات، هەستمکرد قسەکانی ئەمیری گوڵەباغ، کەریم خەزێنی تورەکردوە کە گووتی: مامۆستا بە ئیجازەت ئەوە پەتی سەبرم پسا، ئەو برایە چی دەڵێت، بولبولی چی و قەفەزی چی. پیاو دەتوانێت لە کەپووی خۆی بگوزەرێ، بڵێت قەیدی چییە کەپووی باوەحیز بانەبێ، بەڵام بەشەر هەیە لە ژیانی تولفی خۆی بگوزەرێ؟ ها... بەشەر هەیە، ئەم باوەحیزە شەوێک بەدرێژیی دوو تولفی بەستەزمانی منی خستە ژێر سەربازەکانی خۆی، هەردوو دەستی بە گوللە شکاندم. دوو منداڵی کوشتم، هەر دووکیان وەک تۆپەگوڵ وابوون... گوندێکی پڕ لە تولفی سەوزوسووری بارکرد و بردنی و کەس تاقی نەبینینەوە... مامۆستا دادگای چی، باوەحیزی وا هەرچی دادگای عەرزوئاسمانە حوکمی لێبات هێشتا هەر کەمە. من ناگەڕێمەوە تا بەتەور پارچەپارچەی نەکەم.

من دەستم بەرزکردەوەو گووتم: ئازیزان، هەر حوکمێک بدەین دەبێت بە هێمنی بێت. کاک کەریمی زۆر خۆشەویست، دوابڕیار بڕیاری زۆرینەیە، هەموو گوێ لە بڕیاری زۆرینە دەگرین. ئێمە لە دادگادایین بڕیاری تۆڵەمان نەداوە. دەبێت هەمووان قسەبکەن... ئا ئەزیزم... ئا ئەزیزم باشە گوێ لە یەک بگرین

ئەردەڵانی سۆفی، ڕاوکەری بێپێشووی با، ئەو پیاوە خەیاڵاوییەی دەیگووت: ڕۆحی کچەکەمم لەگەڵ خۆمدا هێناوە، لە شوێنی خۆی هەستاو بێئەوەی پرسم پێبکات هاتە سەر مێزەکە، کەمێک گوێی ڕادێراو بەزەردەخەنەیەکی منداڵانەوە گووتی: گوێتان لێیە؟ گوێتان لێیە؟.

مەریوانی کوکوختی کەچاوی نەیدەبینی و پسپۆڕی بیستن بوو، لەشوێنی خۆیەوە گووتی: من گوێم لێیە؟ گوێم لێیە؟.

منیش گوێم لێبوو، دەنگی ڕاکردنی منداڵێک بوو بە زەوی مەخزەنەکەدا، دەنگی کردنەوەی دەرگایەک بوو، دەرکەوتنی تارماییەکی چکۆلەبوو لە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەدا، ئەردەڵان بە غەمگینی سەیری هەموومانی کردو گووتی: ئەوە دەنگی ئەوە، دەنگی ئەوە، من لەگەڵ خۆمدا هێناومە، ئێستا لێرەیە، جەنابی سامیری بابلی دەیبینێت، ئەوەتا، ئەوەتا لە پەنجەرەکەدا، سامیری بابلی ئاوڕێدایەوەو تارمایی ئەو کچە چکۆلانەیەی بینی، چاوانی کە پڕبوون لە ترس و سەرسامی نیشانەی ئەوەبوو کە بینیوێتی. کیژەکە لە ناو پەنجەرەکەدا دانیشتبوو و سەیری خۆرئاوابوونی دەکرد. ئەردەڵانی سۆفی گووتی: من کەسی ترم نەبوو، سامیری بابلی کەسی ترم نەبوو. دەزانی کوشتنی منداڵێک لە چی دەچێت؟ لە کوشتنی خودا دەچێت. شەش ساڵە بەردەوام بیر لەوەدەکەمەوە کوشتنی منداڵ یەعنی چی؟ کوشتنی منداڵ یەعنی چی؟ شەوو ڕۆژ بە ڕەشەباکاندا ڕادەکەم و دەڵێم: کوشتنی منداڵ یەعنی چی؟. لە ڕێبوارەکان دەپرسم کوشتنی منداڵ یەعنی چی؟ لە کڕیاری دوکانە بچوکەکەم دەپرسم: کوشتنی منداڵ یەعنی چی. ئێستا جەنابی نەقیب تۆ پێمبڵێ: کوشتنی منداڵ یەعنی چی؟.

سامیری بابلی لە شوێنی خۆی سەری داخستبوو. زۆر بە نزمی گووتی: من نەقیب نیم.

ئەردەڵانی سۆفی دەستی دا بە مێزەکەداو بە توڕەییەوە گووتی: کوشتنی منداڵ یەعنی چی... ها.. کوشتنی منداڵ یەعنی چی؟.

ئینجا سەیری هەموو دانیشتووەکانی کردو بەهێمنییەکەوە کە زۆر لە تورەبوونی پێشووی جیاوازبوو گووتی: ئێوە کەستان دەزانن کوشتنی منداڵ یەعنی چی؟.

من گووتم: یەعَنی گوێنەدان بە هیچ شەریعەتێک.

بە ئارامییەوە گووتی: نا، مامۆستا نا...

ئینجا دەنگی نزمکردەوەو وەک ئەوەی نهێنییەک بە چرپە بدرکێنێت گووتییەوە: یەعنی کوشتنی خودا، کوشتنی سرِی خەلق. من فەقێ بووم، دینم خوێندووە، مەلایەتیم کردوە. لەبەرئەوە دڵنیام... کوشتنی خالق جیایەو کوشتنی مەخلوق جیایە، کوشتنی منداڵ دەچێتە خانەی کوشتنی خالقەوە نەوەک بچێتە خانەی کوشتنی مەخلوقەوە.

هەموومان بەوریایی گوێمان دەگرت. نەمدەزانی قسەکانی تا چ ئەندازەیەک قسەی پیاوێکی عاقڵە. سەیری منی کردو زەردەخەنەیەکی گرت کە بۆ ئێستێک زۆر ترسناک و شێتانە هاتە بەر دیدەم. گووتی: مامۆستا وادەزانی شێتم؟ من شێت نیم، بەڕاستی ماوەیەکی درێژ علومی دینی و ئیلاهیاتم خوێندووە. گەر تۆ من بکوژیت، مەخلوقەکەی ناوم دەکوژیت، دەشێت ڕقت لەو کوردەی ناو من بێت، حەزبکەیت ئەو گەرمیانەی ناوم تەفروتونا بکەیت، چارەی ئەم مرۆڤەت نەوێت کە منم. بەڵام کە دەستدەبەیت و من دەکوژیت مەخلوقێک دەکوژیت، مەخلوقێک کە ڕەنگ و ڕوخساری ئینسانی گرتووە، ئەم ئەردو ئاسمان و هەوایە شتێکیان لێدروستکردوە، بۆتە بوونەوەرێک سیفاتی هەیە، مامۆستا ئینسان کە مەخلوقێک دەکوژێت، سیفاتەکانی دەکوژێت، کە تۆ عارەبێک دەکوژیت ئینسانی موجەڕەد ناکوژی، قەتڵەکە بۆ ئەو عارەبیە کە لە نێویایەتی. بەڵام منداڵ، منداڵ کە هێشتا بەحاڵ زاری پژاوە، نوتقی کامیل نەبووە، هێشتا نە بۆتە ئینسانی کامل، ئەوە هێشتا پارچەیەکە لە زاتی ئیلاهی، منداڵ پارچەیەکە لە خودا، بەشێکە لە زاتی موبارەکی تەعالا جەلە جەلالوهو.

لە بەرئەوە کەس بۆی نییە لە بکوژی خودا ببورێت... ئەوەی لە بکوژی خودا ببورێت کافرە... ئەوەی لە بکوژی خودا ببورێت کافرە... ئەوەی ئەم زەندیقە عەفووبکات کافرە.

وەک هەموو دیندارەکان بە چەشنێکی سەیر دەستی رادەوەشاند. وەک یەکێک قسەیدەکرد ئێستا بچێت بۆ جیهاد، کچە چکۆلانەکەی هەندێجار ئاوڕیدەدایەوەو من ڕوخساری فریشتەیەکی چکۆلەم دەبینی کە نورێکی ئاسمانی لێدەباری، ئەو پارچەیەک بوو لە زاتی خوداوەند لە ساڵۆنەکەدا. بە هێمنی دەستم خستەسەردەستی ئەردەڵان و ویستم ئارامیبکەمەوە، لەو کاتەدا کەریم خەزێن گووتی: تۆ ڕاستدەکەیت، ئەوەی ئەم فیرعەونە عەفووبکات لەو سەگترە.

باوکی سەرهەنگ قاسم بە توڕەییەوە ئاوڕی لە کەریم دایەوەو گووتی: تۆ کابرا زاری خۆت تۆزێک پاک ڕابگرە، مامۆستا پێیگووتی، قسە قسەی تۆ نییە هی هەمووومانە. من سا کوڕێکی جوانم بەدەستی ڕۆیشتووە، بەڵام گەر تۆزێک ئیمانت بە عەدالەتی ئیلاهی هەیە و باوەڕت بە چارەنوس هەیە دەزانیت کە هەموو موسیبەتێکی ئیلاهی حیکمەتێکی تێدایە لە عەقڵی من و تۆ گەورەتر. ئینسان ئەگەرەکو پاکە ئەگەرەکو پیس، ئەگەرەکو پیاوکوژە یان ئەگەرەکو سافە وەک ڕۆحی ڕەوان هەر عەبدی خوایە. ئەگەر ئەو سەگە خۆ نابێت ئێمەش سەگ بین.

بە بابی سەرهەنگم گووت: کاک قاسم قسەبکە، چیت لە دڵدایە بیڵێ.

بە زەردەخەنەیەکی ماندووەوە هەستاو گووتی: مامۆستا. هیچ کەس لە هەواو نەفەسی خودا تێناگات، من چل و سێ ساڵ برینپێچ بووم، چل و سێ ساڵ، لە ماوەی ئەو چل و سێ ساڵەدا هەموو ڕۆژێک سەروکارم لەگەڵ حیکمەتی ئیلاهیدا بووە، ڕۆژێک نەبووە چاوم غافڵکردبێت و حیکمەتی ئیلاهیم نەبینیبێت. جاری وا هەبووە خەڵکی بیمارم بینیوە چل گوللە بە گیانییەوە بووە نەمردووە و بە هەفتەیەک لە شوێنی خۆی

ڕاستبۆتەوەو هەستاوەتەوە سەرپێ، جاری واش بووە بەنی ئادەمم بینیوە بە زیخێک ڕۆحی دەرچووە. هیچ کەس لە حیکمەتی ئیلاهی تێناگات، هیچ کەس. لە هەموو موسیبەتێکدا ئینسان دەبێت بۆ مەغزای ئەو حیکمەتە بگەڕێت، بپرسێتَ: تۆ ئەی ڕاگری ئەرزو ئاسمان، دەتەوێت چ دەرسێکی من دابدەیت، دەتەوێت چ وانەیەکم فێربکەیت؟. لەوانەیە خودای تەبارەک وە تەعالا بیەوێت ئێمە تاقیبکاتەوە، بیەوێت توانای ئێمە لەسەر ڕەحم و مەغفەرەت تاقیبکاتەوە... لەوانەیە کە ئێمە لێرەدا خۆمان لێ هەڵخستووەو لامان وایە سزای گوناهبارێک دەدەین، لەوانەیە ئەم قسەیە لای تەبارەک وە تەعالا هەر کاو با بێت، لەوانەیە گەر ئێمە ئەم پیاوە بکوژین، ئەوە ببێتە ڕەحمەتێکی گەورەو بەسەریدا ببارێت. کوڕم وەک چۆن پاداشتەکانی ئینسان بۆ ئینسان کاو بایە، وەک چۆن شکۆو شەوکەتی ئەم بەنیئادەمە بەقای نییە، سزاش هەروایە... سزای ئینسان چییە لە چاو سزای خودادا، لەحزەیەکی کورتە، تۆ گوللەیەک دەنێیت بە یەکێکەوەو دەیکوژیت، سزای ئینسان بۆ ئینسان لە لەحزەیەک تەجاوەز ناکات، بەڵام سزای ڕەب العالمین «خوا تۆبە» تا ئەبەدل ئابدینە. گەر ورد لە حیکمەتی ئیلاهی بڕوانیت، دەبینیت مەغفەرەتی ئێمە بۆ ئەم زاڵمە زیاتر لە خودامان نزیکدەخاتەوە، ئینسان لە قودرەتیدا نییە سزای گەورە بدات، ئەوە بەس خودای غەفوورو ڕەحیمە دەتوانێت سزای وەهابدات.

حەلیم شێواز تا ئەوکات بە بێدەنگی دانیشتبوو، دوای چەندین ساڵ ئەوە یەکەمجاری بوو لە کۆبوونەوەیەکی وەهادا دانیشێت، چاکەتێکی ڕەش و کراسێکی سەوزی لەبەردابوو، دەستی بە جۆرێکی سەیر خستبووە سەر جێگا برینەکانی دەموچاوی. بە هێمنی دەستی بەرزکردەوەو گووتی: بەڕێز بەڕێوەبەری دادگا منیش قسەم هەیە.

چاوەڕوانی ئەوە نەبووم بەو ڕێزو حورمەتە قسەم لەگەڵدابکات. منیش بە هێمنی گووتم: فەرموو کاک حەلیم ئێستا سەرەی تۆیە.

بێئەوەی هەستێت یان لە جێگای خۆی بجوڵێت، بە چاوێکی غەمگین سەیریکردم و گووتی: منیش لەوانەم کە دەمەوێت دڵی سامیری بابلی خۆشبکەم، من هاتووم تا بچمە ڕیزی ئەوانەی داوای ئازادکردنی سامیری بابلی دەکەن. چاوەڕوانی هیچ مەغفەرەتێک نیم، تکاش لەو دوو سێ بەڕێزە دەکەم خودا مەهێننە ئەم مەسەلەیەوە، خودا دوور ڕابگرن. لە بەرئەوەی هەر لەسەرەتاوە خودا خۆی لە مەسەلەکەدا نەبووە، خودا کارێکی بەوەوە نییە ئێمە بڕیاری چی دەدەین.

لەو کاتەدا کەریم خەزێن و باوکی سەرهەنگ پێکەوە گووتیان : ئەستەغفرولا.

حەلیم شێواز کەمێک بێدەنگ بوو، دواتر کەمێک دەنگی بەرزکردەوەو گووتی: نازانم خودا کە لە کاتی تاوانەکەدا ئامادەنەبووبێت بۆدەبێت لە کاتی سزاکەدا ئامادەبێت؟

بە توڕەییەوە سەیری ئەردەڵانی سۆفی کردو گووتی: ئەو کاتەی منداڵەکەی تۆ کوژرا خودا لە کوێ بوو. من ناپرسم: خودا هەیە یان نییە. هەر ئادەمیزادە و خۆی سەرپشکە لەوەی چی جەوابی خۆی دەداتەوە، بەڵام دەزانم خودا کارێکی بە گوناهەکانی ئێمەوە نییە و کارێکی بە سزاکانیشمانەوە نییە. ئەگەر خودا هەبێت، ئەوا زۆر سوپاسمان دەکات لەم بابەتەدا خۆمان نەخەڵەتێنین و ئەو تووشی هیچ دەردێک نەکەین.

ئەردەڵانی سۆفی لەوساتەدا وەک کۆنە قوتابییەکی زانستە دینییەکان، بە ئەرکی خۆی دەزانی دەنگ بەرزبکاتەوەو بڵێ: خودا لە هەموو شتێکدایە، بە زاتی خۆی نا، بە جەستەی خۆی نا، بەڵام بە ڕوکنەکانی، بە ئەمرو نەهییەکانی. ئەوە ئیشی ڕەب العالمین نییە دەستی پیاوکوژێک بگرێت و نەهێڵێت کەس بکوژێت. ئیشی ئینسانە.

حەلیم شێواز بە پەشۆکانەوە سەیرێکی ئەردەڵانی کردو گووتی: بەڵام

پێمبڵێ بۆ خودا لە ڕۆژی تاوانەکەدا پشت لە قوربانییەکان هەڵدەکات؟ ئەی بۆ دواتر ڕۆژی سزا دەردەکەوێتەوە؟

باوکی سەرهەنگ قاسم گووتی: بۆئەوەی تاقیمانبکاتەوە؟ بۆئەوەی بزانێت ئێمە توانامان هەیە لە حیکمەتی ئیلاهی تێبگەین؟ ئەوەشت بیرنەچێت، خودا لە ئینساندا هێزو جوانی و حیکمەتی خۆی تاقیدەکاتەوە، لە قوربانییەکان تەحەمول و لە ئێمەش مەغفەرەتی دەوێت... کوڕم.

حەلیم شێواز گووتی: من چەندە خۆم بە چارەنوسی مێرولەیەکەوە خەریک دەکەم خوداش ئەوەندە خۆی بە چارەنوسی منەوە خەریک دەکات.

ئەردەڵانی سۆفی وەک یەکێک شیعرو ئیمانی بۆ لەیەکتر جیانەکرێتەوە گووتی: خودا کاتی بۆ من و بۆ مێرولەیەکیش هەیە، برای عەزیزم کاتی خودا وەک کاتی ئێمە نییە، ئەو خۆی کاتەو ئەبەدییەتیشە. تەنیا لە ئەبەدییەتدا مانای عەدالەتی ئیلاهی تەحقیق دەبێت. پێوەری ئینسانی بۆ عەدالەت پەیوەندییەکی بە پێوەری ئیلاهییەوە نییە. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە خودا پێوەری بۆ عەدالەتی ئینسانی دانەناوە... خودا نەیفەرمووە زەوی بکەنە سەحرای ستەم و لە ئەبەدییەتدا عەدالەتێکی تر هەیە هەقتان بۆدەکاتەوە. عەدالەتی سەر ئەرزیش بەشێکە لە عەدالەتی ئاسمان.

حەلیم شێواز هەر دوو دەستی خستبووە سەر دەموچاوی و گوێیدەگرت: دواتر دەستێکیانی لاداو گووتی: ئەمە چ عەدالەتێکە، لە ناو هەزاران گوناهباردا، سزای یەکێک بدەیت. ئەگەر باوەڕتان بە عەدالەتی ئیلاهی هێند بەهێزە بەجێیبهێڵن بۆ خودا ئەو لە بری هەمووومان سزای دەدات، ئەگەر باوەڕیشتان بە عەدالەتی سەرزەوییە، لە مێژە عەدالەت لەسەر زەوی مردووە. هەزاران ساڵە زاڵمەکان دێن و دەڕۆن. لێگەڕێن ئەویش بڕوات... عەدالەت بە دانانی دادگا بۆ تەنیا گوناهبارێک سازنابێت.

من لە جێگای خۆم هەستام و گووتم: بەڵام ئەی ئەگەر هیچ نەکەین، ئەی ئەگەر لە شوێنی خۆمان دانیشین و تەماشای گوناهباران بکەین

عەدالـەت دێتـەدی؟

حەلیـم شـێواز بـە شـێوەیەکی دڵڕەقانـە لـە ژێـرەوە سـەیریکردم و بـە قینێکی شاردراوەوە گووتی: پرسیارێکی بێمانام لێدەکەیت؟ تۆ پرسیارەکە بـە ڕێگایەکـی تـردا دەبەیت... ئایا خەونی عادیلـەکان چییـە، هـا تـۆ پێمبڵێ، خەونـی عادیلـەکان چییە؟ هـا... تـۆ ناتوانیت وەڵامبدەیتـەوە، لـە بەرئـەوەی جەلادەتـی کۆتـر تـۆ گەمژەیت. هیـچ شـتێک لـە خەونـی عەدالـەت ترسـناکتر نییـە... هیـچ شـتێک.

لـەو سـاتەدا تەماشـای سـامیری بابلیـم کـرد و بینیـم بـە وریاییـەوە گوێدەگرێت. حەلیـم شـێواز بێئـەوەی بجوڵێت، وەک ئـەوەی پەیکەرێـک بێت و دەسـتێکی خسـتبێتە سـەر دەموچـاوی گووتـی: هەمووتـان دەزانـن کـە خولیای عەدالـەت ئەوەیـە گوناهبـارەکان بگرێت و سزایان بـدات، بـەڵام گـەر عەدالـەت بـەوردی جێبەجێبکەیـن، مانـای ئـەوەی دەبێت هەمـوو گوناهبـاران سـزابدەین، دەبێـت بـۆ هەمـوو گوناهێـک سـزایەکمان هەبێت. بـەڵام ئینسـان بـەردەوام گوناهـدەکات... هیـچ مرۆڤێک نییـە شایسـتەی سـزا نەبێت. هەمـوو شایسـتەی سـزاین. بەڕێزینـە عەدالەتـی ڕاسـتەقینە ئـەم سـەر زەمینـە دەگۆڕێت بـۆ جەهەنـەم. هیـچ شـتێک وەک ئـەم وشـەیە زەوی پڕنەکـردوە لـە ئافـات، عەدالـەت ئینسـان دەگێڕێتـەوە بـۆ وەحشـییەت. عەدالەتـە وادەکات ئیشـی ئینسـان لەم سـەر ئەسـتێرەیە ببێتە سـزادان... سـزادانێکی بێکۆتایی. سـزابدرێیت و سـزابدەیت، ئەوەیە عەدالەت. بەڵام ئینسـان دەبێت لە شـوێنێکدا بوەسـتێت و چیتـر بیـر لـە عەدالـەت نەکاتـەوە. مـن بـە ئێـوە دەڵێم، کوشـتنی ئـەم پیـاوە چ ئاسـوودەگییەک بـۆ سـەر ئـەم ئەسـتێرەیە دەهێنێت؟ هـا... بـۆ ئێـوە ئاسـوودەدەبن گـەر بیکـوژن؟ مردنـی ئـەم برینـی چ یەکێـک لـە ئێمـە سـاڕێژدەکات؟ مـردووی چ یەکێـک لـە ئێمـە زیندوودەکاتـەوە؟ ئـەوەی ئێـوە ناویدەنێـن عەدالـەت، ئـەوەی ئێـوە بـە نـاوی خـوداوە جێبەجێیدەکـەن، تەنیـا تینوێتی خۆتانـە بۆ تۆڵـە. مـن پێتـان دەڵێم گـەر دەتانەوێت ئاسـوودەبن بیر

لـە دوو شـت مەکەنـەوە، بیـر لـە عەدالـەت و تۆڵـە مەکەنـەوە. لێگەڕێـن ئـەو پیاوە بڕوات... پێی بڵێن : ئەوە دەرگاکە بە کراوەیی لە بەردەمتدایەو بڕۆ مـاڵاوا. مـن پێتـان دەڵێم گـەر بیکـوژن لەوانەیـە تـا مـردن بتلێنـەوە... لـە بیـر خۆتانـی بەرنـەوە.

سـەبری شـێخانی وەک ئەکتەرێـک لـە نـاکاو بازبداتـە سـەر سـەحنە هاتـە پێشـێ و بێئـەوەی سـەیری کـەس بکات گووتـی: مـن ئـەم پیـاوەم لـە دڵـی خۆمـدا کوشـتووم، لـە خەیاڵی خۆمـم دەرکـردوە. بەڵامـەوە گرنـگ نییـە زیندوە یـان مـردوو... گرنـگ ئەوەیـە لـە ڕۆحـی خۆمـدا کوشـتوومە. گـەر بیکـوژن لـە ڕۆحمـدا زیندوودەبێتـەوە، دەترسـم گـەر ئێـوەش بیکوژن لـە ڕۆحـی منـدا زینـدوو ببێتـەوە... لەبەرئـەوە وازی لێبهێنـن بـڕوات... وازی لێبهێنـن.

مەریوان بـە تووڕەیـی هەسـتاو گووتـی: خانـم تۆ دەتوانیـت وازی لێبهێنیت، بـەڵام مـن ئـەوە دەهەرێکە کوێرم و لـە تاریکیدام، بـە هـەر لایەکدا سـەیردەکەم هـەر تاریکییـە. پێنـج سـاڵە لـە تاریکییدا تەنیـا ئـەو کابرایـە دەبینـم. بەرلـەوەی کوێربـم حەزمدەکـرد دایکـم ببینـم، حەزمدەکرد بابـم ببینـم، پڕ بە دڵ ئیشـتیاقی خوشـکە چکۆلەکـەم هەبـوو، بـەڵام ئـەم جانـەوەرە هاتـە بەردەمـم و گووتـی: سـەیرمبکە... جـوان سـەیرمبکە، مـن دواهەمیـن شـتم لـەم دونیـای ڕۆشـنەدا دەیبینیت. سـێ ڕۆژ لـە سـەریەک وای پێگووتـم، ئینجـا کوێریکـردم. مـن شـەو ڕۆژ لـە گومـرگ کاردەکـەم، گوێدەنێـم بـە ئـەرزەوە، وەک سـەگ بـۆن بەبـارە قاچاغەکانـەوە دەکـەم، بـەڵام هەرچییـەک دەکـەم ئـەو پیاوە دێتـەوە بەرچـاوم... بەعـزێ شـەو لـە ترسـی ئـەو بـە کوێری ڕادەکەم و دەکەومـە کەند و کەندەڵانی قووڵـەوە، تـا ئێسـتا دووجـار بـە هـۆی ئـەوەوە دەسـتم شـکاوە، دووجـار... مـن هەقـم بـە عەدالەتـەوە نییـە، بابتۆپێت بەڵکو من تۆزێک پشـووبدەم، حەزدەکەم سـەربخەمەسـەر سـەرینەکەو دڵـم مورتـاح بێت ئـەم ناجسـنە نایەتـەوە خـەوم.

حەلیـم شـێواز بـە جۆرێکـی سـەیر دەسـتی خسـتبووە سـەر برینەکانـی خـۆی، دەسـتی چەپـی لـە پشـتەوە هێنابـوو و خسـتبوویە سـەرلای ڕاسـتی

و دەستی ڕاستیشی دابوو بەسەریدا، بە دەنگە گەرم و قووڵەکەی خۆی، دەنگی پیاوێکی خوێندەوار کە کارەسات لە خەڵکی دوورخستۆتەوە گووتی: ئەو زاڵمە هەر دێتەوە خەوت، ئەو نامەردە تازە واز لە کەسمان ناهێنێت، لە تۆوایە من نازانم خراپەکانی چیین. ڕۆژێکی ڕەبەق منیشی بەرامبەر ئاوێنەیەک دانا و گووتی: سەیری خۆت بکە... جوان سەیری خۆت بکە، ئەمڕۆ ئاخیرین ڕۆژتە خۆتی تێدا دەبینیت، ئیتر تا ڕۆژی حەشر چاوت بە دەموچاوی خۆت ناکەوێتەوە. تۆ لە من خۆشبەختتر و بەختەوەرتریت، تۆ کوێریت و خۆت نابینیت، من خۆم دەبینم. دوو ساڵی ڕێک نەمدەهێشت کەس ئاوێنە بهێنێتە ژوورەکەمەوە، بەڵام لە تۆ وایە کە ئینسان سەیری ئاوێنەی نەکرد خۆی نابینێت، من سەیری ئاوێنەشم نەدەکرد و خۆشم دەبینی، وەک تۆ کە کوێریت و هەموو شتێکیش دەبینیت. ئێوەڵاتان وایە تەنیا کوشتن سزایە... ئێوە بە هەڵەداچوون، جەلاد وای لە ئێوە کردوە وەک ئەو بیربکەنەوە، ئێوە ئێستا حاکمی دادگان نەوەک جەلاد، ئێوە باس لە عەدالەت دەکەن، من پێمگووتن من بڕوام بە عەدالەت نییە، بەڵام گەر مەسەلەکە عەدالەتیش بێت دەبێت وەک جەلاد بیرنەکەنەوە و بۆ شەوێک ببنە داوەرێکی عادیل... بەرەڵاییبکەن بابڕوات، ئەم پیاوە پیاوکوژێکە نەیتوانیوە هیچ شتێک بکوژێت... ویستی جوانی لە مندا بکوژێت، بەڵام من دەمەوێت پێیبڵێم: سەیرمکە... سەیرمکە... سامیری بابلی سەیرمکە، من لە تۆ دەبورم کەواتە هێشتا جوانم، سەیرمکە تۆ نەتتوانی جوانی من بکوژیت. تۆ مەریوانی کوکوختی، ویستی کوێرت بکا، پێی بڵێ: سەیرمکە من هێشتا دەبینم. تۆ بەڕێز ئەردەڵانی گەرمیانی، ویستی کچەکەت بکوژێت، بەڵام ئەوە کچەکەتە، ئەوە ڕۆحێتی لەگەڵماندا. تۆ باوکی سەرهەنگ قاسم: پێی بڵێ تۆ سەرهەنگت کوشت، بەڵام سەرهەنگ لە شوێنێکی جاویدایە لە دڵمدا. تۆ نەسرین غەفوور ویستی تۆ ببیتە ژنێکی بێئیش و بێشەرەف، ئەمڕۆ تۆ ئیشکەرترین ژن و بەشەرەفترین ژنی سەر ئەم عەردەیت. تۆ

خالق مەحمود ویستی تۆ لەگەڵ هیچ کچێکدا نەخەویت، تۆ بە فەنتازیاکانت، بە خەیاڵت لەگەڵ هەموو حۆریەکانی ئاودا دەخەویت... ئەم پیاوە نەیتوانی هیچمان لێبکات. ئێوە وادەزانن من دەڵێم چی؟ من دەڵێم هێشتا بڕێک جوانی لە ئێمەش و لەویشدا ماوە با ئەوە نەکوژین. شەش ساڵە تەنیا بیر لە جوانی دەکەمەوە. دەڵێم شتێک لە جوانی لە منیشدا ماوە با نەیکوژم... شتێک جوانی لە سامیری بابلیدا ماوە... ئەگەر شتێک لە جوانی تێدا نەمایە نەدەهات بۆ ئەم دادگایە، با ئەو جوانییە کەمەی ناو ڕۆحی نەکوژین... لێیپرسن بۆ گۆڕا، بۆ ئەم پیاوە لە ناکاو گۆڕا، بۆ شەوێک دەستی برد و یەکێک لە قوربانییەکانی خۆی ڕزگارکرد... بۆ؟ من پێتان دەڵێم. چونکە جوانییەکی شاردراوە لە دڵیدا بووە و نەیبینیوە، تەنیا شتێک وای لێکردوە بیبینێت... شتێک... شتێک.

من لەبەرەوە قسەکانم بۆ سامیر وەردەگێڕایە سەر عەرەبی. لەو کاتەدا بابلی بە ئەسپایی گووتی: مۆسیقا... مۆسیقا.

دەنگی هێند نزم بوو، هەستمکرد هیچ کەس گوێی لێ نییە.

نەسرین غەفوور کە تائەوکاتە هەر سەیریدەکرد بە پەشۆکانەوە گووتی: تەنیا شەرەف نەبێت، تەنیا شەرەف نەبێت. عینسان لە دەستی دەبورێت... لە قاچی دەبورێت، لە چاو دەبوریت، بەڵام عینسان لە شەرەف نابورێت. هەمووتان وەک برام وان و هەمووتان عەزیزمن... مامۆستا گیان بەساقەوبم، چی بۆ ئەو سەگە تەرجومەدەکەیت، هیچی بۆ تەرجومە مەکە. عینسان لەوانەیە بە کوێری لەدایک ببێت، لەدایک بێت و لووتی نەبێت، لەدایک بێت و لچ و لێوی قرتابن... ڕەب العالمین سەد هەزار نەوع دەردی لایە. عینسان تووشی حادیسەیەک دێت، ئیفلیجدەکەوێت، قاچێکی دەبڕنەوە، بەڵام مەگەر بە ئیشی فاسقێکی بێشەرەفی وەک ئەمە شەرەفی لەدەستبدا. کەس بە بێشەرەفی لە دایک نابێت، لەوانەیە عینسان بە کەڕی یان کوێری لە دایک بێت، بەڵام کەستان بیستووە عەیب نەبێت لە دامێنی دایکییەوە

بێشەرەف بێت.. کەستان بیستووە بە حادیسەیەکی عوتومبێل بێشەرەف بێت. ئەم سەگە بە خۆی و توتکەکانی حەوت شەو و حەوت ڕۆژ تەعادایان لێکردم ئینجا هەر دوودەستیان بڕیم، حەوت شەو حەوت ڕۆژ... ئێوەش هەموو برامن. بەڵام حەوت شەو حەوت ڕۆژ من ناوی خوامدان، هانام بۆ عەولیاو عەنبیا برد هەر وازیان نەهێنا... حەوت شەو حەوت ڕۆژ... ئێوەش وەک برام وان... ئێوەش کەسی منن... بە سەد نێرەکەر تەعەدایانکرد. هیچ شەریعەتێک لە زوڵمی وا خۆشنابێت.

نەسرین غەفوور دەیویست نەگری، بەڵام چاوانی پڕبووبوون لە ئاو. بۆئەوەی نەداتە پڕمەی گریان لە شوێنی خۆی دانیشتەوەو سەری داخست.

من فرمێسکەکانیم بینی تکانە ناو کۆشی. گوێم لە باوکی سەرهەنگ بوو گووتی: لا حەولە وەلا قوەتە ئیلا بیلا

خالق ئەو بێدەنگییە قووڵ و لە ناکاوەی بەفرسەت زانی و پرسی: خالق مەحمود قسەبکات؟

من بە دەنگێکی زۆر کز گووتم فەرموو، فەرموو چیت دەوێت بیڵێ.

دەستی بۆ حەلیم شێواز درێژکردو گووتی: ئەم کابرایە لە خۆیەوە دەڵێت من لەگەڵ حۆری و شتی وادا دەخەوم. خۆشی دەزانێت من ئەسڵەن ئەو شتەم هەر نییە.

سەیرێکی حەلیم شێوازی کرد و بەردەوامبوو:

تۆ ڕاستە دەموچاوت نییە، بەڵام خۆ دەتوانیت منداڵت ببێت. دەتوانیت ژنێک بهێنیت و دوای خۆت وەچەو وەچەزا بخەیتەوە، من چی؟ من دەڵێی ڕاوکەرێکی ماسیم کە ڕۆژ تا ئێوارە قولاپ هەڵدەداو هیچ ناگرێ، من وام مامۆستا گیان، تۆ خۆت منت بینی، خۆت بە چاوی خۆت منت بینی. ئینسان ئەو شتەی نەبێت هەموو ڕەنجی زایەیە. مەگەر هەر قولاپ لە ئاو گیربکات. تازە قولاپی من لە حەیاتی ماسی ناگرێت.. لە حەیاتی. من ئەم کابرایە چۆن عەفووبکەم... مامۆستا قابیلە خۆ تفێکی تێنەکردوم بڵێم

قەیناکا، شەپازلەیەکی لینەداوم بلێم قیروسیا، ئاخر ئینسان هەر دەست و چاو نییە، من ئەو ڕۆژە چووم بۆ ڕێکخراوی کەمئەندامەکان، مامۆستا لەوێش وەریاننەگرتم، وتیان بابە تۆ کەمئەندام نیت، برۆ بەڕێی خۆتەوە خوا بتداتێ. منیش شەڕوالەکەم بۆ بەڕیوەبەری ڕێکخراوەکە داکەندو گووتم: ئەگەر ئەوەم دەبوو، ئەگەر ئەوەم دەبوو حیزباب. ئێستا دەمزانی دەیکەم بە کوێتا.

بۆ ساتێک هەموو دامانە قاقای پێکەنین. ئەو بە غەمگینی سەیری هەموومانی کرد و گووتی: هەتا ئێوەش پێم پێدەکەنن. ئێوە هەمووتان دەتوانن بە شانازییەوە بلێن: سەیرکەن ئێمە لە پێناوی کوردا وامان لێهاتووە، بەلام من چی... من هەتا ناشتوانم وابلێم. ها... من لەو مەنتیقەیەی خۆمان کە ماسی دادەنێم، هەر کچ و ژنە و دێن بەلامدا دەڕۆن و عەباکەیان دەخەنە دەمیانەوە و قریو و هوڕ پێم پێدەکەنن. بەعزێ ژن و شت بۆئەوەی شعورم بڕوشێنن، بەلایەکی چاو سەیرمدەکەن و دەلێن: وای باوکە گیان، سەیری ئەو شتەزلە لە شەڕوالەکەیدا. وەلا ئینسان بکوژرێت باشترە لەوەی ئاوا ببێت بە مەخسەرە. مامۆستا هەموو دنیا عەفوویبکات، من عەفووی ناکەم.

سەیری دەرەوەم کرد، هەستمکرد لە مێژە دونیا تاریک بووە، هەمووان بەردەوامبوون لە باسکردنی ئازارەکانی خۆیاندا. هەندێجار دەچوومەدەرێ و هەوایەکم هەلدەمژی و دەگەڕامەوە، یەک دوو پشووی کورتمان وەرگرت، هەموو پێکەوە چامان خواردەوە. لە کاتی پشووەکاندا سامیری بابلی لە جێگای خۆی هەلنەستا، لە بێدەنگییەکی قوولدا نوقمبوو. لێم پرسی: سامیری بابلی بیر لە چی دەکەیتەوە؟. بە ئەسپایی گووتی: بیرناکەمەوە، چاوەڕواندەکەم. شەرمێکی قوولم لە چاویدا بینی، شەرمێک هەستمدەکرد هیچ لەم جیهانە ناگۆڕێت، هیچ لە ئازاری ئەم مرۆڤە بریندارانە ناگۆڕێت، کە هەندێجار دەکەونە شەڕی ئەوەی ئازاری کامیان لە ئازاری ئەوی

دییان گەورەترو کوشندەترە. لە قۆناغێکی دادگاکەدا هەموو قسەکان لە نێوان حەلیم شێواز و ئەردەلانی سۆفیدا بوو، کەریم خەزێن زووزوو هەڵدەستاو باسی تەورەکەی خۆی دەکرد، نەسرین غەفوور لە جێگایەکدا پەلاماری سامیری بابلی دا و لە جێگایەکی تردا پەلاماری حەلیم شێواز، هەردووجارەکە بەزەحمەت شتەکانم ئارامکردەوە. سەردار بابا کەریم تاکە کەسێکیان بوو کە بێلایەن دەینواند، چەندین جار دەیگووت: چی لێدەکەن ئارەزووی خۆتانە. گەر دەیکوژن هەر باشە، گەر ئازادیشیدەکەن هەر باشە. من دەبووایە نەهاتمایە. هەستدەکەم لە ئێوە سەلامەتتر دەرچووم.

ئێستا تا ئەندازەیەک شتەکان ڕۆشن بوون، هەریەک لە ئەمیری گوڵەباغ و باوکی سەرهەنگ و حەلیم شێواز و سەبری شێخانی دژی کوشتنی سامیری بابلی بوون، بەڵام مەریوانی کوکوختی، ئەردەلانی سۆفی، کەریم خەزێن، نەسرین غەفوور، خالق مەحمود دەیانویست ئەمشەو تا بەیانی هەموو شتێک تەواوبێت. کەبیرم لەوەدەکردەوە سامیری بابلی دەکوژرێت تووشی ترسێکی گەورە دەهاتم. سەرەتا وامدەزانی کە تەنیا کەریم خەزێن تەورێکی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، کە زانیم هەریەک لە ئەردەلانی سۆفی و خالق مەحمودیش دەمانچەیان پێیە، ترسێکی کوشندە دایگرتم. هەموو هیوام ئەوەبوو کە سەردار بابا کەریم بۆچوونی خۆی بگۆڕێت و ببێت بە نەیاری سزادانەکە تا بتوانم شتێک بکەم، تا هەوڵبدەم لە دوا ساتدا ژیانی سامیری بابلی ڕزگاربکەم.

لە ناکاو پەشیمانییەکی قووڵ پەڕیە ڕۆحمەوە، لەناکاو لە هەموو شتێک دوودڵ و پەشیمان بووم، لە خۆم، لە هەڵهاتنم لە شاری سۆزانییەکان، لە گەڕانەوەم، لە ئەسیرکردنی سامیری بابلی، لە دادگا، لە عەدالەت، لە هەموو شتێک. لە سەعات دەی شەو دا دەبایە دەستمانبکردبایە بە دەنگدان، بەڵام بەوەدا من لە قووڵایی دڵەوە لە دەرەنجامەکەی دەترسام، دەرگام بۆ سوڕێکی دی لە قسەکردن کردەوە، بە ئومێدی ئەوەی یەکێک بۆچوونی

خۆی بگۆڕێت. بەڵام وەک هەمیشە لە هەمان بازنەدا دەسوڕاینەوە، کاک قاسم و حەلیم شێواز دیسانەوە باسی ئەوەیان کرد کە مرۆڤ لە ڕێگای سزاوە دونیا بەرەو شەوێکی تاریکتر ڕادەکێشێت، ئەردەڵانی سۆفی باسی ئەوەی کرد کە سزای گوناهباران واجبێکی ئیلاهییە، مەریوانی کوکوختی باسی ئەوەی کردەوە کە تا سامیری بابلی نەمرێت ئەو ئاسوودە ناخەوێت. نەسرین غەفوور گووتی: دەست لە شەرەفی خۆی هەڵناگرێت. هەموو شتێک سوڕانەوەیەکی ڕەش بوو بەدەوری مردنێکی ترسناکدا کە لە تاریکییدا بە دوو چاوی خوێنینەوە سەیریدەکردین. ئەو منداڵە چکۆلانەیەی ئەردەڵانی سۆفی زوو زوو لە پەنجەرەکەدا دەردەکەوت و دڵی هەموومانی ڕادەچڵەکاند. ئەردەڵان زووزوو دەیگووت: ڕۆحی ئەو منداڵە مەعسومە داوای هەقی خۆی دەکات. لە یازدەی شەودا بە ناچاری ملمدا بۆ کۆکردنەوەی دەنگەکان، بە تایبەت دوای ئەوەی ئەردەڵانی سۆفی پێیگووتم: مامۆستا شەو دەڕوات و تۆ دەتەوێت هیچ حوکمێک بۆ ئەم پیاوە دەرنەکەین. من لە دوا هەوڵمدا ویستم سامیری بابلی قسەبکات، گووتم: ڕوکنێک لە ڕوکنەکانی دادپەروەری ئەوەیە کە گوێ لە گوناهبار بگرین، بەڵام سامیری بابلی وەک لە کورسیەکەی خۆیدا مردبێت هیچی نەگووت. منیش دڵنیابووم قسەکردنی سامیر هیچ مانایەکی نییە، پیاوێک بوو نەیدەویست داوای لێبوردن بکات، چونکە تاوانەکانی لەدەرەوەی توانای لێبوردنی مرۆڤدا بوون. لەبەرئەوە هەوڵەکانی من بێمایە مانەوە، سامیر وەک ئەوەی ئاگای لە ئێمە نەمابێت وەهابوو، پێدەچوو زۆر زووتر سەفەری خۆی لە زەمینی مەرگدا دەست پێکردبێت. من لەو ساتەدا سەیرم لێدەهات بۆ بابلی خۆی ئەم ناوانەی دا بەمن، بۆ ئەمانەی هەڵبژارد، هەستمدەکرد بە جۆرێک لە جۆرەکان دڵنیابوو لەم دادگایە دەرناچێت. لە ساتێکدا واهاتە بەرچاوم کە سامیری بابلی لەو ڕۆژەوەی کە لە سەحراکانی باشووردا منی دابوو بە شانیدا دەیزانی دەگاتە کوێ. وەک ئەوە بوو هەنگاو هەنگاو هەموو شتێکی بینیبێت. وەک

ئەوەبوو خۆی مردنی خۆی هەڵبژاردبێت.

ئەگەرچی من ئەوکات هەستێکی زۆر لاوازو کەمم بە کات هەبوو، بەڵام هەموو ساتەکانی ئەو ڕوداوەم لە بیربوو. لە سەعات یازدەو چارەکی ڕۆژی پازدەی شەشی ساڵی «هەزارو نۆسەد و نەوەدوسێ» دا، لە مەخزەنێکی خاڵیدا لە پیدەشتێکی چۆڵدا کە تەنیا ڕێگایەکی گڵ بە نێویدا گوزەریدەکرد. لە نزیک یەکێک لەدەروازەکانی ئۆقیانوسی هاوارەوە، پێنج کەس بڕیاریاندا «بۆ بەرقەراربوونی عەدالەت» سامیری بابلی بەر لە هەڵهاتنی خۆر بمرێت. چوارکەس سامیریان بەخشییەوە بە ژیان «تا شتێک ڕەحمەت لە زەویدا بمێنێت»، یەکێکیش وازی لەوە هێنا هیچ حوکمێک بەسەر ئەو ئەفسەرەدا بدات کە دەیگووت: هێندەی تاوان هەیە شایستەی ژیان نییە، هێندەش پەشیمانە شایستەی مەرگ نییە. من دەترسام، نەمدەویست ئەو شەوە دەمەوبەیان هیچ کەسێک بمرێت. ویستم بیانخەمەسەر ئەو خەیاڵەی ئەمشەو واز لە جێبەجێکردنی حوکمەکە بهێنن، سوێندم بۆ خواردن کە سامیری بابلی وەک پیاوێکی مەحکوم بە مەرگ لەلای من دیل دەبێت، تا جارێکی تر هەمووان بەسەر بیرکردنەوەی خۆیاندا دەچنەوە، تا قووڵترو ڕوونتر بیر لە بڕیاری خۆیان دەکەنەوە. بەڵام سامیری بابلی خۆی بۆیەکەمجار قسەیکردو گووتی: نا، جەلادەتی کۆتر، نا ئەی منداڵی نەجیب. من دەبێت ئەمشەو بمرم... ئەمشەو بەر لەوەی خۆری بەیان بکەوێت و کەڵەشێری سوبح بخوێنێت و غوباری شەو لەسەر گوڵەکان بتەکێت.

سەرسامانە سەیری چاویم کردو لێم پرسی: سامیری بابلی بۆدەتەوێت بمریت؟

داوای لێکردم لە شوێنێکی چۆڵدا دووقۆڵی دواقسەکانی خۆمان بکەین. من داوام لە هەموو هەیئەتەکە کرد کە چەند ساتێک کاتمان بدەنێ تا دواقسە لەگەڵ سامیری بابلیدا بکەم. کە ڕەزامەندی ئەوانم وەرگرت لە ژوورەکە هاتینەدەرێ، لەبەردەرگای ژوورەکەدا هەردووکمان ڕۆحی ئەو

کچە چکۆلانەیامان بینی لە ڕەشەباکاندا ڕادەکات. دەشتێکی بەرین بوو، پێویستی خۆم گووتم: سامیری بابلی ڕابکە... ڕابکە. شەو تاریکەو چاو چاو نابینێت... دەتوانیت دەربازبیت.

دیارە دەمزانی چ قسەیەکی بێمانادەکەم، من خۆم ئەو دادگایەم دامەزراندبوو، خۆم ڕێکمخستبوو، خۆم دروستمکردبوو، ئەو هەموو ماوە درێژە چاوەڕوانمکردبوو، هەفتەو مانگ بە سامیرم گووتبوو، تۆ دیلی منیت. ئێستاش دەمگووت: سامیری بابلی ڕابکە. سامیر گووتی: نا. جەلادەتی کۆتر ڕاناکەم. ئەگەر دەتەوێت پاکبیمەوە ئەمە تەنیا ڕێگایە پیا بڕۆم. لەم ڕێگایە زیاتر ڕێگای تر نییە. دوای ئەوە ئێستا من فلووتێکم هەیە، فلووتێکم هەیە دەتوانم لە مردندا لەگەڵمدا بێت.

وای گووت و لەژێر چاکەتەکەیەوە فلووتێکی سپی دەرهێنا. هەمان ئەو فلووتەی من بوو کە شەوی مردنم لە بیابانەکانی باشووردا لەدەستم چوو، هەمان ئەو فلووتە بوو کە لە منداڵییەوە لەگەڵمدابوو، ئەو فلووتەی لەگەڵ ئیسحاقی لێوزێڕین و سەرهەنگ قاسمدا زەویم پێوە تەیکردبوو. سامیری بابلی وەک منداڵێک فلووتەکەی نا بە سنگییەوە و گووتی: تۆ ئەم فلووتەت دا بە من، لە بیرتە تۆ ئەم فلووتەت لە ڕۆحمدا بەجێهێشت... ئەی منداڵی نەجیب، لەو شەوەدا لە سەحرا تەقەم لە تۆ کرد ئیتر ئەم ئامێرەم هەڵگرت، لەو ساتەدا تۆم فڕێدایە چاڵێکەوە ئەم فلووتەت لێکەوت و من هەڵمگرتەوە. دوای ئەوەی گەڕامەوە تۆ ڕزگاربکەم لە ئۆتومبیلەکەمدا بەجێم هێشت، ماوەیەکی درێژ لە ئۆتومبیلەکەمدا بوو، شەوێکیان لە لاڕێگایەکی تاریکدا وەستام و دەرمهێناو دەستمکرد بە مۆسیقا لێدان. ئەی منداڵی نەجیب، من هەستم پێکرد ئاوازم بۆ لێدەدا، ئاوازی سیحراوی. لێوم دەنا بەو فلووتەوەو ئاوازی سیحراوی و سەیر دەهاتنەدەرێ. دەمزانی ئەوە من نیم ئەو ئاوازانە لێدەدەم، من نیم... ئێستا ئەم فلووتە هی منە، تۆ لە ڕۆحی مندا جێتهێشت، تۆ بەخشیت بە من، جەلادەتی کۆتر ئێستا

دوو ڕۆژە دەتوانم ئاوازی سیحراوی لێبدەم، دوو ڕۆژە دەتوانم فوو بکەم بەم فلووتەدا و خۆم ئاواز بژەنم... ئەوە نیشانەی مردنە. ئەی منداڵی نەجیب تەنیا ئەم فلووتە دەتوانێت من پاکبکاتەوە، من لە بری تۆ دەمرم، لە بری ئەو مۆسیقارەی ناو تۆ دەمرم، ئەم دادگایەی ئەمشەو باجی ئەو گۆڕینەوەیەیە. من تۆم ڕزگارکردو تۆش فلووتێکی سیحراویت دا بە من، من تۆم ڕزگارکردو تۆش منت پاککردەوە. جەلادەت من ئەمشەو وەک نەقیب سامیری بابلی نامرم، وەک مۆسیقار سامیری بابلی دەمرم... گوێبگرە با مۆسیقات بۆ لێبدەم... گوێبگرە.

سامیری بابلی فلووتەکەی گرت بەلێوییەوەو ئاوازێکی لێدا کە لە ئاستی ئاوازی مامۆستا گەورەکانی مۆسیقادا بوو. بە خۆشییەوە سەیریکردم و گووتی: دەبینیت جەلادەتی کۆتر، دەبینیت. من ئێستا دەتوانم وەک مرۆڤێکی پاک کە شتێکی لە قەرزەکانی خۆی داوەتەوە بمرم. من ئەم فلووتە لەگەڵ خۆمدا دەبەم، گرنگ ئەوەیە بەم فلووتەوە بمنێژن.

بە حەسرەتێکەوە سەیری فلووتەکەم کردو گووتم: سامیری بابلی ئەو فلووتە بۆ تۆ. بەڵام سەختە بمریت...

فلووتەکەی نوساندەوە بە خۆیەوەو گووتی: نا سامیری بابلی، سەختە بژیم... سەختە بژیم. گوناهبارێک و مۆسیقارێک پێکەوە لە ناو یەک مرۆڤدا ناژین. چیتر گوناهبارێک و مرۆڤێکی پاک پێکەوە لە ناو مندا ناژین، دەبێت لە یەکدی جیاببنەوە، دەبێت بە مردن لە یەکدی جیاببنەوە.

سامیری بابلی وایگووت و بە خێراییەکی سەیر، وەک باڵندەیەک پەلەی بێت بەرەو مردن بفڕێت، وەک موسافیرێک بیەوێت بە خێرایی شارێک جێبهێڵێت هەستاو گەڕایەوە ژووری، نەیدەویست لەوەزیاتر قسەبکەین... چیتر نەیدەتوانی هاوسەنگی نێوان گوناه و بێگوناهی ڕاگرێت... لە یەکێک دەچوو لەسەر دیوارێکی باریک وەستابێت، دیوێکی دیوارەکە ئاگرستان و دیوێکی دیکەی گوڵستان بێت، پەلەی بێت زووتر خۆی بە ڕووکاری

گوڵستانەکەدا فڕێبدات، نەبا لە چاوتروکانێکدا بکەوێتە ئاگرستانەکەوە. لەوساتەوەی فەرمانی مردنی درابوو ئاسوودە بوو... ئێستا تێدەگەم ئەو دادگایە پلانێکی خۆی بوو بۆئەوەی بمرێت.

کە چووینەوە ژووری، بێویستی خۆم چاوم پڕبووبوو لە فرمێسک. دەمزانی دەبێت سامیری بابلی بمرێت، لە مردن بەولاوە ڕێگایەکی دیکەی نەبوو. دەبایە بمرێت... لە بەر ئێمە، لە بەر قوربانییەکان، لەبەر خۆی. دوا هیوای بابلی ئەوە بوو بە مردن ئازاد بێت. ئێستا مۆسیقارێکیشی لە خۆیدا دۆزیبووەوە، مەبەستی بوو بەر لەوەی خەیاڵ و خولیاکانی بەتاڵ ببنەوە لە پێستی ئەو مۆسیقارەدا ماڵاوایمان لێبکات. دەنگی ئەو مۆسیقایەی ساڵەهای ساڵ ڕاوی نابوو، ساڵەهای ساڵ لە شوێن و کاتی جیاوازدا دەرکەوتبوو، ئارامی لێ هەڵگرتبوو، تووشی غەم و هیستریای کردبوو، ئەو مۆسیقایە کەئێستا لە دوا ساتەکانی ژیانیدا بەتەواوەتی تێدەگەیشت هیچ نییە جگە لە ئاوازو سێبەری مۆسیقارێکی خەوتووی ناو ڕۆحی خۆی.

کە گەڕاینەوە ژووری هەموو تەماشای فرمێسکەکانی منیان دەکرد. من بەگریانەوە چوومە سەر کورسییەک و گووتم: سامیری بابلی ئامادەیە، هێند هەیە کەس بۆی نییە ئەو فلووتەی لێبستێنێ.

حەلیم شێواز بە قێزێکەوە سەیری هەموومانی کردو دەستی خستەوە سەر ڕوخساری و چووە دەرێ، بەرلەوەی بڕواتەدەرێ هاتە بەردەمم و ڕووی تێکردم و بە ڕقێکی ئەستوورەوە گووتی: هەمیشە جوانی ڕوکەش بەسەر جوانی قووڵدا، هەمیشە ڕاستی ڕوکەش بەسەر ڕاستی قووڵدا سەردەکەوێت... هەی گەمژە.

کەس تێنەگەیشت ئەو ڕستە ئاڵۆزو سەیرەی حەلیمی شێواز لەو ساتەدا مانای چی. من دەگریام، بەڵام دڵنیابووم حەلیم شێواز نازانێت ڕاستی چییە. مردنی سامیری بابلی سەرکەوتنێکی گەورەی جوانی بوو، بەڵام لەڕێگای مردنەوە.

دوای ئەو باوکی سەرهەنگ قاسمیش بە ئەفسوسێکی قووڵەوە هەستاو گووتییەوە: لاحەولە وەڵاقوەتە ئیلا بیلا. من دەڕۆم... کوڕم من ئەمشەو لێرە نامێنمەوە، دەچمەسەرجادەکەو سۆراغی سەیارەیەک دەکەم و دەگەڕێمەوە.

بۆ ماوەیەک هەمووومان بێدەنگ بووین، هەمووومان، هەمووومان.

لە دووری هەزارو پێنج سەد مەتر لە مەخزەنەکانەوە بێستانێکی گەورە هەبوو بەسەر شەقامە گشتییەکەدا دەیڕوانی، ئەو پێنج کەسەی کە دەیانویست سامیر بکوژن بڕیاریاندا بیبەن بۆ ناو ئەو درەختانە و ڕێکەوتن یەکی یەک گوللەی پێوەبنێن، نەسرین غەفوور لە بەر بێدەستی نەیدەتوانی، لەبەرئەوە سامیری بابلی خۆشبەختانە فیشەکێکی بۆ دەگەڕایەوە. سەعات یەکی شەو چاوی سامیری بابلیان بەستەوە، دەستیان بەستەوەو دایانە پێش خۆیان. لەو چاکەتە ڕەشەدا لە نەقیبێکی سوپا نەدەچوو، بەڵکو لە مامۆستایەکی قوتابخانە دەچوو یەکێک بە هەڵە گرتبێتی. پێنج قوربانی غەمگین، پێنج کەس کە هیچیان پیاوکوژ نەبوون، هەرگیز کەسیان نەکوشتبوو، هەرگیز ئازاری چۆلەکەیەکیان نەدابوو، بەڵام پێنج ڕۆحی بریندار کە ئازارێکی دوورودرێژ، برینێکی قووڵ ئەو توانایەی تیا دروستکردبوون ئەمشەو بتوانن مرۆڤێک بکوژن بەرپرسی هەموو ئازارەکانیان بوو. بەرلەوەی چاوی بیبەستنەوە من بۆ دواجار سەیری چاویم کردو بە فرمێسکەوە گووتم: پرتەقاڵی بابلی، هاوڕێم، لەو باوەڕەدایت کە دادگایەکی عادیلانەبوو، لەو باوەڕەدایت؟

دوو فرمێسکی زۆر گەورە لە چاویدابوو، دوو گەورەترین فرمێسکێک تا ئەو کاتە من لە ژیانمدا دیبێتم بە هێمنی گووتی: غەم مەخۆ، غەم بۆ من مەخۆ. دادگایەکی عادیلانەبوو. هیچ شتێک بە ئەندازەی مردنی من عادیلانە نییە.

بە جۆرێک دەستیان بەستەوە بتوانێت فلووتەکەی بخاتەسەر سنگی و بینووسێنێت بە خۆیەوە. بەدرێژایی ڕێگاکە لە نزیک سامیری بابلییەوە، دەڕۆیشتم، هەستمکرد بوونی من دڵنیایی زیاتری پێدەبەخشێت، لە ڕێگا

چەند جارێک پرسی: ئەی مندالّی نەجیب لەگەلّمدایت؟.من هەموو جارێک دەمگووت: پرتەقالّی بابلی من لەگەلّتدام، لەگەلّتدام. بەر لەوەی بگەینە ناو دارەکان لێیپرسیم: ئەی مندالّی نەجیب تۆ دالیا سیراجەدینت خۆشدەویست؟. من گووتم: پرتەقالّی بابلی خۆشمدەویست، تا مردنیش خۆشمدەوێت. گووتی: منیش خۆشمدەویست، بەلاّم بە ئەندازەی تۆ نا. گووتم: پرتەقالّی بابلی، دەزانیت دالیا سیراجەدین ماوە، دالیا سیراجەدین هێشتا دەژی. بە زەردەخەنەی پیاوێکی کوێرەوە گووتی: کە بینیت سلاّوی لێبکە.

من وامدەزانی تەنیا بۆئەوەی ترس و سامی ئەو چرکەیە لە دلّی خۆیدا برەوێنێتەوە باسی دالیا سیراجەدین دەکات، بەلاّم گووتی: جەلادەت دەزانی دالیا بە منی گووت: ئەوەی بتوانێت گوێ لە مۆسیقا بگرێت، دەتوانێت گوێ لە پێغەمبەرەکان نەگرێت. چونکە ئەوەی خودا دەیەوێت بە مرۆڤی بلّێت لە ناو مۆسیقاشدا هەیە. من کە لە ژێرەوە دەگریام گووتم: ڕاستدەکەیت، پرتەقالّی بابلی ڕاستدەکەیت، دالیا ئەو جۆرە قسانەی هەبوو.

لەوساتەدا هەستمکرد ئەو بۆن پرتەقالّەی لە سامیر دێت هێدی هێدی زیاتر و زیاتر دەبێت. بە دەنگێکی بەرز گووتی: دالیا سیراجەدین پێیگووتم کە هەموو مۆسیقارە ڕاستەقینەکان دەچن بۆ بەهەشت.

من کە ئەو بۆن پرتەقالّە مەستیدەکردم بە دەم هەنسکەوە گووتم: ئا مۆسیقارە ڕاستەقینەکان دەچن بۆ بەهەشت یان لەوانەیە بچن بۆ جێگایەک لە بەهەشت بچێت، یان لەوانەیە... یان لەوانەیە... یان لەوانەیە.

من لەبەر هەنسک بۆم تەواونەکرا. ئەو بۆی تەواوکردم و گووتی: یان لەوانەیە بەهەشت بچێت بۆ لای ئەوان.

پاش ئێستێکی کورت گووتی: جەلادەتی کۆتر تۆ دەلّێیت من دەچم بۆ جەهەنەم یان کوێ؟

بەگریانەوە گووتم: نازانم... نازانم... چۆن بزانم.

بەدەنگێکی بەرز پێکەنی و گووتی: ئەگەر شەیتانیش بکوژرێت تۆ هەر

بۆی دەگریت. بەڵام من دەزانم دەچم بۆ کوێ، جەلادەتی کۆتر، دەزانم دەچم بۆ کوێ. من دەبم بە دوو بەشەوە، بەشێکم دەچێت بۆ بنی دۆزەخ، بەشێکیشم دەچێت بۆ بەهەشت. تۆ بۆ ئەو نیوەیەم دەگری کە دەچێت بۆ بەهەشت، ئەوانیش ئەو نیوەیەم دەکوژن کە دەچێت بۆ جەهەنەم. بەڵام من خۆم کامەیانم، کام بەشەیانم، ها کامەیانم؟ نازانم. ئەی منداڵی نەجیب هێزی ژیان لەوەدایە ئەو دووبەشە هێند تێکەڵاوی یەکدەکات لە یەکدی جیانابنەوە، بەڵام هێزی خوداش لەوەدایە دەتوانێت ئەو دووبەشە لە یەکتر جیابکاتەوە. خودا دەتوانێت ئەوەبکات، تەنیا خودا دەتوانێت بەو جۆرە جوانی و ناشیرینی، چاکە و خراپە تێکەڵبکات و لەیەکیان جیابکاتەوە. من لە ژیانمدازۆر باوەڕم بە عەدالەتی ئیلاهی نەبووە، بەڵام خۆت دەزانی من عەرەبم، کێشەی عەرەبیش ئەوەیە هەتا شەیتانەکانیشمان باوەڕیان بە خودایە، ئەگەر لە ژیانیشدا باوەڕمان پێی نەبێت ئەوا لە مردندا باوەڕمان پێیەتی...

کەمێک بێدەنگ بوو و دواتر گووتی: هیچ کەس هەموو گیانی، هەموو ڕۆحی ناچێت بۆ جەهەنەم، هەمیشە بەشێکمان تێدایە بەر بەهەشت دەکەوێت. خودا هەرگیز نیوە جوانەکەمان ناسووتێنێت... چونکە خودا خۆی بەشدارە لە گەمەکەدا، ئیرادەی خەتاو خراپە هەرچییەک بێت دواجار لە خزمەتی ئیرادەی چاکەو جوانیدایە. جەلادەت جیهان وەک داشماڵێکی شەترەنج وەهایە کە لەسەرێکی داشماڵەکە خودا یاریدەکات و لەسەرەکەی تریشی شەیتان. ئێمەش هەمووومان داشە بچوکەکانین، داشەکان لە جەوهەردا وەکو یەکن، سەرباز یان قەڵا یاخود فیل لە بەرەی شەیتان یاریبکەن یاخود لە بەرەی خودا وەکو یەک وان. وەک چۆن لە شەترەنجدا هەموو یارییەکە تەنیا بە گەمەو جوڵەی هەر دوو گەمەچییەکە دروستدەبێت، لە ژیانیشدا خودا بەبێ شەیتان ئەو یەکانگیری و تێکەڵی و هاوسەنگییە سەیرەی بۆ دروستناکرێت، ئەی منداڵی نەجیب هەر کات خودا هەنگاوێک

دەچێتە پێشێ دەوەستێت تا شەیتان دەجولێت، تا شەیتان داشێکی خۆی نەجولێنێت خودا داشێکی خۆی ناباتە پێشێ، چونکە ئەوە ئەو دەستووره ئیلاهییەیە کە خۆی بۆ تەواوی ئەم ژیانەی داناوه. لەم گەمەیەدا یاساکان وەکو یەکن، هەردوو گەمەکەرەکە بەیەک جۆر کەرەستە یاریدەکەن، خودا بۆئەوەی هێزو زیرەکی و بەهێزی خۆی دەربخات لە جەنگی خۆیدا لەگەڵ شەیتاندا هەمان فرسەت و کەرەستەی بەخشیوه بە شەیتانیش. مرۆڤ نازانێت لەسەر داشماڵەکە سەر بە چ تیپێکە تیپی خودا یاخود شەیتان، ئێمە ئەو داشانەین کە ناتوانین سەربەرزبکەینەوه بزانین ئەوەی یاریمان پێدەکات خودایە یان شەیتان... هەرگیز نازانین.

من دەمگووت: پرتەقاڵی بابلی، دەشێت دونیای ئێمە داشماڵێکی شەترەنج بێت، دەشێت من و تۆ نەزانین ئایا لە بەرەی خودادایین یان شەیتان، بەڵام خودا و شەیتان لەسەر یەک ڕێسا یاری ناکەن... تۆ خۆت دەزانیت عەدالەت چەند گرنگە بۆ مانای ژیان و جوانی.

پرتەقاڵی بابلی دەیگووت: ئەی منداڵی نەجیب بەر لەوەی بمرم دوا ئامۆژگاریم بۆ تۆ ئەوەیە بزانە، هیچ شتێک لە دونیادا وەک خودا و شەیتان پێکەوە ئیشناکەن، شەیتان هیچ نییە جگە لە شەریکێکی گەمژە کە خودا دروستیکردوه بۆئەوەی گەمەی لەگەڵدا بکات و لێیبباتەوه. شەریکێک کە جار دوای جار لێیدەباتەوه و بەزۆر دەیهێنێتەوە سەر داشماڵەکە. ئەوە خودایە ملی شەیتان دەگرێتەوە بۆ ناو ئەم یارییە، بەڵام هەموو بردنەوەکانی خودا دواجار لەسەر حیسابی ژیان و ئازارو خوێنی ئێمەیە، لە بەرئەوە دەبێت قەبووڵیبکەین... ئەمشەو هەموومان لەسەر ئەو تەختی شەترەنجەین. مردنی ئێمە داش بەداشێکە خودا و ئەهریمەن لەگەڵ یەکدا دەیکەن.

من هیچم نەگووت، نەمدەزانی چی بڵێم، هەندێجار هەندێک بۆچوون لەوه قورسترن مرۆڤ بتوانێت هیچیان دەربارە بڵێت. پاش تۆزێک

چاوەڕوانـی گووتییـەوە: گـەر دالیـا سـیراجەدینت بینـی سـڵاوی لێبکـە.
زۆر بـە هێمنـی دەڕۆیشـت و قسـەیدەکرد، لـە کەسـێک نەدەچـوو بیبـەن بۆ مـەرگ، بۆن پرتەقاڵەکەی هەمـوو ئـەو ڕێگایـەی پڕکردبوو. کە گەیشـتینە نـاو باغـەکان دونیا بە جۆرێکـی سـەیر کش و مـات بـوو، هـەزاران ئەسـتێرە دەدرەوشـانەوە. لەسـەر بەردێکـی چکۆلانـە بـە ڕوکاری جادەکـەدا دایاننـا، چوار پیاوبوون هیچیان پیاوکوژ نەبوون، کەسیان مرۆڤێکیان نەکوشتبوو، جوتیارێـک، قوتابییەکـی زانسـتە دینییـەکان، ماسـیگرێک و کوێرێـک. خالـق مەحمـود یەکەمیـن کـەس بـوو کـە ویسـتی تەقـەی لێبـکات، دەمانچەکـی چکۆلانـەی پێبـوو، مـن دەسـتیم بینـی لـە تاریکیدا دەلەرزێـت، دەسـتیم بینـی دەیەوێـت بەرزبێتـەوەو نیشـانە لـە پرتەقاڵـی بابلـی بگرێتـەوەو ناتوانێـت، بـە زەحمـەت یەکەمیـن گوللـەی تەقاند، بـەڵام بـەر سـامیری بابلی نەکەوت. سامیر بەدەنگێکـی بـەرز گووتـی: جەلادەتـی کوتـر، مـن هێشـتا مـاوم. پێیـان بڵـێ مـن نەمـردووم. یەکەمیـن فیشـەک ئەردەلانـی سـۆفی پێوەینـا، مـن پشـتم تێکرد و گووتـم: هـاوار... هـاوار. گوێـم لـە خـوڕەی خوێنەکـەی بـوو، گوێـم لێبـوو بـە دەنگێکـی کز گووتـی: ئـەی منداڵـی نەجیب، ئێسـتا تـەواوە، ئێسـتا دەمـرم. مـن دەسـتم خسـتبووە سـەرچاوم و گوێـم لـە گریانـی سـەیری ئـەو منداڵـەش بـوو کە لـە نێو درەختەکانـدا ڕایدەکرد. بۆنـی ئـەو پرتەقاڵـەم دەکرد کە دەشـت و دەری پڕکردبـوو. دووهەمیـن فیشـەک کەریـم خەزێـن پێوەینـا، سـامیری بابلـی بە خیزەخیزێکـی سـامناکەوە گووتـی: مـردن ئاوەهایـە... مـردن ئاوەهایـە. ئـەوە دواهەمیـن وشـەی بـوو، لـە نـاو قوڵپـە قوڵپـی خوێنـدا، ویسـتی هەندێـک شـتی تـر بڵێـت، بـەڵام مـن تێنەگەیشـتم. دەگریـام و نەمدەتوانـی سـەیریبکەم. گوێـم لێبـوو مەریـوان گووتـی: نـا، مـن نـا، مـن نـا، مـن تەقـەی لێناکـەم، مـن نایبینـم، تـەواو مـرد، مـن تەقـە لـە مـردوو ناکـەم. گوێـم لێبـوو، کەریم خـەزێن دەیگووت: مـن دەسـتت دەگـرم، بابـە، مـن دەسـتت دەگـرم، هێشـتا نەمـردووە، هیـچ نییـە... مەترسـە. مەریـوان بەترسـێکەوە دەیگـووت: تـازە مـرد، مـرد، مـن تەقـە لـە

مـردوو ناکـەم. ئەردەلانـی سـۆفی لـە نزیـک سـامیری بابلییـەوە دەیگـووت: مـرد... وازی لێبهێنـە بـا تەقـەی لێنـەکات، یەکێکتـان بێن بـا تـا سـەر جادەکـە هەڵیگریـن... ڕەب العالمیـن ئـەم بـۆن پرتەقاڵـە چییـە لـەم کابرایـە دێت. بـا بیبەینـە پـاڵ جادەکـە، لێرەدا بۆگەنـدەکات و کـەس نایبینێت، خـودای گـەورە ئەوەیانـی بـە هـەق نییـە... بـا سبەی موسـڵمانێک بینێژێت.

مـن وەرگـەڕام و لەسـەر چـۆک دانیشـتم و دەگریـام. هەسـتمدەکرد زۆر قسـەم لەگـەڵ سـامیری بابلیـدا هەیـە هێشـتا نەمکـردون، گووتـم: بیبەنـە پـاڵ جادەکـە و فلووتەکـە بخەنـە سـەر سـنگی. فلووتەکەتـان بیرنەچێت.

بەهـەر چواریـان هەڵیانگـرت و لـە بەرزاییەکـە بردیانـە خـوارێ، نەسـرین غەفووریـش دەگریـا، دەهاتـە تەنیشـتی منـەوەو دەگریـا. مـن ویسـتم بۆ دواجـار سـەیریبکەم بـەڵام نەمتوانـی، نەمدەتوانـی سـامیری بابلـی بـە مردوویـی ببینـم ئـەو پیـاوەی کـە دەیگـووت: ژیانـی خـۆی لەگـەڵ ژیانـی منـدا گۆڕیوەتـەوە. فرمێسـکەکانم وشـککردەوەو هەسـتام، تاکە پرسـیارێک لـەو سـاتەدا لـە دڵمـدا بـوو ئەوەبـوو: ئاخـۆ ئێسـتا ڕۆحـی ئیسـحاقی لێوزێڕیـن و سـەرهەنگ قاسـم ئاسـوودەن؟ ئاخـۆ کوشـتنی سـامیری بابلـی زەمینـی جوانتـر کـردوە یاخـود نا؟

* * *

لـە سـەعات هەشـتی بەیانیـدا لاشـەکەی سـامیری بابلـی بـە فلووتێکـی سـپییەوە گەیشـتە بیمارسـتانی گـەورە. فلووتێـک هیـچ هێزێـک نەیدەتوانـی لەدەسـتی دەریبهێنێت. سـەعات نـۆ و دە دەقیقـە مفەوەزێکـی خەواڵـووی پۆلیـس گەیشـتە سـەر لاشـەکەو کەمێـک سـەیریکردو هەنـدێ تێبینـی بچوکـی کۆکـردەوەو ڕۆیشـت. سـەعات دەو پێنـج دەقیقـە هەندێـک دکتـۆر هاتـن و ویسـتیان فلووتەکـەی لەدەسـتبکەنەوەو نەیانتوانـی. سـەعات یـازدە و چارەک شـاناز سـەلیم بـە چـاوی پـڕ فرمێسـکەوە گەیشـتە سـەر لاشـەکەو بێئـەوەی

بە دەنگی بەرز بگری، بێئەوەی خۆی دەست لە مردووەکە بدات هەندێک نوسراوی تایبەتی ئیمزاکردو هەندێک تەلەفونی کردو چارەکێک لەگەڵ مفەوەزە خەواڵووەکەدا دانیشت و بە نیگایەکی تورەو ئاڵۆزەوە هاتەدەرێ. سەعات سێ و نیو مردووشۆرێک سامیری بابلی بە فلووتەکەی منەوە لەسەرتاتەشۆرێکی کۆن شت. نزیکی سەعات چوارو نیوی دوانیوەڕۆ ژمارەیەکی نەزانراو لە کەس و ناسیاوانی شاناز سەلیم و دراوسێکانی لەیەکێک لە مزگەوتەکانەوە سامیری بابلیان لە دارەمەیتێکدا برد بۆ گۆڕستان و بە فلووتەکەوە ناشتیان.

من سەعات چوارونیوی بەیانی لەگەڵ هەموو ئەوانی دیکەدا بە پاسێکی شڕ کە سەردار بابا کەریم لێیدەخوڕی گەیشتمەوە قەراغ شار، تا شەشی بەیانی لە دوو نەقلیاتی جیاوازدا ماڵاواییم لە هەموو ئەو هەیئەتە کردو یەکە یەکە دەستمکردە ملیان و ئومێدی ئاسوودەگیم بۆ خواستن. لە سەعات حەوتدا من لە گێلاسی سپی بیرم لەو شەوە دەکردەوەو دەکەوتمە چاوەڕوانییەکی درێژەوە. ئەوە سەرەتای چاوەڕوانیی ڕوداوێکی گەورەبوو، بەدرێژایی ڕۆژ لە ژوورەکەی خۆم لە گێلاسی سپیدا لە باڵکۆنەکەدا دەوەستام و سەیری باڵندە سپییەکانم دەکرد کە بە هەزارەها لە دەوری ئەو ئوتێلە سووتاوە کۆدەبوونەوە، شەوێک ڕابوردوو هیچ ڕوینەدا، ئەو شەوە شاروخی شاروخ بە جۆرێکی بێبڕانەوە تا دەمەو بەیان ئاوازی بۆ لێدام، بەیانی باڵدارەکان بەجۆرێکی سەیرترو ئاهەنگاویتر لە ئاسماندا دەفڕین، لە کۆمەڵێک باڵداریی دەریایی دەچوون بەسەر کەشتییەکی مەستدا بفڕن. ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ من چاوەڕوانمکرد، دەمەو ئێوارە چوومەدەرەوەو شتێکی کەمم خوارد، گەڕامەوەو خەوتم. لە سەعاتێکی نەزانراوی شەودا وەک چاوەڕوانمدەکرد شتەکان دەستیان پێکرد، بۆ یەکەمجار ڕەوڕەوەی ئەو ئامێرە زەبەلاحەی کە دەمێ بوو چاوەڕوانمدەکرد بجولێت یەکەم تەکانی ڕاستەقینەی خۆی خوارد. لەو شەوەدا چوار پیاوی نەناس، هاتنە

ژوورەکەمـەوە، هەڵیانسـتانم، چاویـان بەسـتمەوە، دەسـتیان بەسـتمەوە، بـە سـوار ماشـێنێک بردیانـم بـۆ جێگایەکـی نەزانـراو، دەزانـم لـە ماشـێنەکەدا لـە هـۆش خـۆم چـووم، دەزانـم لـە ژوورێکـی چکۆلانـەی تاریکدا بـە ئاگاهاتمـەوە. بۆچی لـە هـۆش خـۆم چـووم نازانـم، ئـەم جێگایـە کـوێ بـوو نازانـم، لـە دوور دەنگـی ڕادیۆیـەک دەهـات کـە گۆرانـی کـوردی پەخشـدەکردەوە. هەسـتمکرد لـە سـەرەوە دەنگـی ژن و منـداڵ دێـت، دەنگـی ماشـین دێـت، دەنگـی ڕاکەڕاکـە دێـت. وەک ئـەوە بـوو لـە ژێـر زەمینـی تاریکـی ماڵێکـدا دیلبـم، بـە هـاوار هاوارو دەنگەدەنگـی سـەرەوەدا پێدەچـوو ڕۆژبێـت، بـەڵام دەنگـەکان هێنـدە سـەیرو کـپ دەهاتنـە گوێـم وەک ئەوەبـوو لـە ژێـر ئاودابـم، یـان پێدەچـوو چەنـد قاتێـک لـە ژێـر زەویدابـم. لـە شـوێنی خـۆم هەسـتام و چـاوم نەیدەبینـی، ئەگەرچـی مـن مێژوویەکـی درێـژم لەگـەڵ ڕوانیـن و بینینـی نـاو تاریکیـدا هەبـوو، بـەڵام هیچـم نەدەبینـی، بەقـەد دیوارەکانـدا دەسـتم کوتـا بۆئـەوەی دەرگایـەک بدۆزمـەوە، بـەڵام دەرگام نەبینـی، لەسەریشـەوە هیـچ دەلاقەیەکـم چـاو نەکـەوت. دەسـتم بـە زەوی ژوورەکـەدا خشـاند و لـە سـوچێکدا قاپێکـی بەتاڵـم دییـەوە، زەوی ژێـر زەمینەکـە بـە جۆرێکـی ترسـناک شـێدارو سـارد بـوو. چەنـد جارێـک ئـەو قاپـە بەتاڵـەم هەڵـدا بـۆ سـەرەوە، دواجـار هەسـتمکرد بـەر دەلاقەیەکـی مەعدەنـی دەکەوێـت. بـە شـێوەیەکی نائاسـایی سـەرمام بـوو، هەڵدەلەرزیـم، برسـێتییەکی کوشـندە گینگڵـی پێدەدام، یـەک لەسـەر یـەک ئـەو قاپـەم هەڵـدەدا و بـەر ئـەو دەلاقـە مەعدەنییـە دەکـەوت، دەمویسـت یەکێـک بزانێـت کـە لێـرەم و هۆشـم هاتۆتـەوە خـۆم، لەوەدەترسـام یەکێـک بـە مـردووم تێگەیشـتبێت و منـی فڕێدابێتـە ئەوێـوە بـۆ ئـەوەی بۆگـەن بکـەم و دواجـار ئێسـقانەکانم بکاتـە تورەکەیەکـەوەو فڕێیبـدات... ئازارێکـی ترسـناک لـە پشـتی سـەرمدابوو، وەک ئـەوە بـوو یەکێـک بـە پارچـە ئاسـنێک یـان کوتەکێکـی گـەورە دابێتـی بـە پشـتی ملمـدا. بـەڵام هەمـوو شـتێکم لـە بیربـوو، هەمـوو ڕوداوەکانـم لـە بیربـوو، دەمزانـی دواجـار چـی ڕوویـداوە. وام هەسـتکرد کـە شـاناز سـەلیم

منی ڕفاندووە، بە دەنگێکی نوساو هاوارمکرد «خانمی شاناز سەلیم، من نە مردووم، لێرە دەرمبهێنە». بەڵام کەس گوێی لێ نەبوو. نازانم چەند ڕۆژی تر بێ نان و ئاو لەو ژێر زەمینەدا مامەوە. جگە لە دەنگی کاسێتێکی کوردی، دەنگی کۆمەڵێک ژن و منداڵ هیچی دی نەدەهات. من نەمدەتوانی کات بژمێرم، زوڵمەتی ڕەها کوێری کردبووم، لە هۆش خۆچوون و خەو بە جۆرێکی سەیر لەلام تێکەڵاوبوون. برسێتی خستبوومییە سەر وڕێنە... سەعات دوای سەعات پەیوەندیم بە دونیاوە دەپچڕا، بە جۆرێک کە بۆیەکەمجار دەلاقەکەیان کردەوە و بانگیانکردم «جەلادەتی کۆتر، ماویت، هێشتا زیندوویت». من توانام نەبوو وەڵامبدەمەوە.

دەلاقەیەکی چکۆلەبوو لە سەقفێکی ئێجگار بەرزدا، سەقفەکە بۆ من کە لە خوارەوە تەماشامدەکرد وەک ئەوەبوو مرۆڤ لە ژێرەوە سەیری دەمی بیرێک بکات.. بە ئەستەم چاوم بۆ هەڵدەهات، نازانم ئاخۆ توانیم قسەبکەم یان نا، بەڵام تەقەیەکم لە قاپەکەوە هێنا بۆ ئەوەی بزانن ماوم. بەڵام جارێکی تر سەری دەرگاکەیان داخستەوە. چەند سەعاتێک دواتر دەنگە دەنگێکی زۆر لەسەر دەلاقەکە دروستبوو، دوو پیاوی پۆشتە لەسەرەوەڕا سەریان شۆڕکردەوە، ئەگەرچی لەسەرەوە ڕۆژ بوو فانۆسێکی داگیرساویان پێبوو، یەکێکیان پەیژەیەکی ئاسنینی شۆڕکردەوە، کە درێژترین پەیژەیەک بوو تا ئەو کات من لە ژیانمدا دیبێتم. دوای چەند دەقیقەیەک هەردووکیان بە فانۆسێک و سێ کورسییەوە لە خوارەوە بوون. من نەمزانی چۆن دابەزیوون، پێدەچوو لە نێوان بینینی پەیژەکەو دابەزینی ئەواندا من بۆ ئیستێکی زۆر کورت لە هۆش خۆ چووبم. دوو پیاوی باڵابەرزبوون، هەردووکیان جلی شاڵی خاکیان لەبەردابوو، هەردووکیان برۆ ڕەش و سمێڵ ڕەش بوون، قژیان بە جۆرێکی سەیر هەڵدابووەوە بۆ سەرەوە، یەکی دوو قۆپچەی سەرەوەی کراسەکانیان ترازابوو و سنگێکی توکن و ئەسمەریان دەرخست بوو، هەردووکیان دەستەسڕێکی سپییان

خستبووه بەر پشێنەکەیان، بۆن عەترێکی بازاڕی کوشندەیان لێدەهات، بۆنێکی سەیر کە منی زیاتر برسیدەکرد، بالآیان بە قەد یەک بوو، وەک یەک دەستیان دەجولاند، بەلام یەکێکیان دەموچاوێکی خڕو جوانتری پێوەبوو، بەراورد بەوی دیکە کەپوویەکی چکۆلەترو ناسکتری هەبوو، دەنگیشیان زۆر جیاواز بوو، کوڕه دەموچاو خڕەکەیان دەنگێکی ناسکترو شاعیرانەی هەبوو، لە کاتێکدا دەموچاو درێژەکەیان دەنگی لە دەنگی قاچاغچییەک دەچوو من لە کەمپی ئاوارەکان بیینیبووم، دەنگێکی گڕ کە لە لووتێکی زل و منگنەوە دەهاتەدەرێ. هەر سێ کورسییەکەیان داناو منیشیان خستە سەر کورسییەک و فانۆسەکەیان خستە ناوەڕاستەوەو یەکێکیان گووتی: جەلادەتی کۆتر هیوادارم پشوویەکی باشت دابێت. من گووتم: برسیمە، ئەگەر وا بڕوات دەمرم. یەکێکیان گووتی: پێمگووتوون ئێستا خواردنت بۆ بانگدەکەن. چەند ڕۆژە لێرەیت؟. من بەدەنگی یەکێک کە تووشی دەردێکی پیس بووبێت لە سنگیدا گووتم: نازانم... نازانم چەند ڕۆژە لێرەم، لەم کونە سەگەدا کێ شەوڕۆژی بۆ لەیەک جیادەکرێتەوە.

کوڕه ناسکەکەیان گووتی: ئەمڕۆ پێنجەمین ڕۆژە، ببورە کارمان زۆربوو، هەردوولامان کارمان زۆربوو.

پرسیم: ئێوه کێن؟ بۆ منتان فڕێداوەتە ئێره. ئێره لە زیندان ناچێت، وانییە لە زیندان ناچێت... ئێوه سەر بە چ حیزبێکن... چین؟. دەمەوێت بزانم لای کێ گیراوم... هەقی ئەوەم هەیە بزانم..

لووت درێژەکەیان لەسەرلا لە گۆرانیبێژێکی میللی دەچوو لەوانەی لەو وەرزەدا بەتەپڵ و جووزەلەوە لەسەر تەلەفیزیۆن دەردەچوون، خاڵێکی شینیشی هەبوو لە سەر چەناگەی کە لە بەر ڕۆشنایی فانۆسەکەدا ڕەشباو دەینواند، گووتی: سەر بە چ حیزبێکین گرنگ نییە، بۆ تۆ هیچ ناگۆڕێت. هیچ ناگۆڕێت.

ئەوی تریان گووتی: تۆ کارت بەو حیکایەتە نەبێت. گرنگ ئەوەیە ئێمە

بزانین پەیوەندی تۆ بە دەزگا ئەمنییەکانی دەوڵەتەوە چی بووە؟

من بە دەنگێکی نوساوەوە کە بە ئاستەم دەهاتەدەرێ گووتم: من ڕۆژێک لە ڕۆژان کارم بەدەزگا ئەمنییەکانەوە نەبووە، من مۆسیقارم. ئێوە لێتان تێکچووە.

کوڕە ناسکەکەیان کە خوێندەوارتر دیاربوو گووتی: پەیوەندی تۆ بە سامیر زوهەیر سەعدانەوە چییە، تۆ ماوەیەکی زۆر لە بورجی ئاوارەکان پێکەوە لەگەڵ ئەو پیاوەدا دەژیایت. چ شتێک تۆی لەگەڵ ئەودا کۆکردەوە؟

ئەوە یەکەمجار بوو بزانم کەسانێک هەن بە گیلاسی سپی دەڵێن بورجی ئاوارەکان. من گووتم: من مۆسیقاربووم، لەگەڵ دوو هاوڕێمدا گیراین بە زیل بردیانین بۆ باشوور، لەوێ دوو هاوڕێکەمیان کوشت، ئەم ئەفسەرە منی بە برینداری ڕزگارکرد، لەماڵێکدا کە کچی کاولی و شتی تێدابوو منی شاردەوە، کە ڕاپەڕینەکە بوو، ئەم لەگەڵ شیعەکاندا بوو، کە هەموو شتێک تەواوبوو، ئەسپ و شتی هێناو گەڕاینەوە بۆ کوردستان... لەبەرئەوەی شوێنمان نەبوو ئەو ژوورەمان لای ئاوارەکان وەرگرت.

هەر ڕستەیەکم بە ئازارو ژانێکی گەورەوە بۆدەگووترا، کە قسەمدەکرد هەستمدەکرد گەرووم پارچەپارچەدەبێت. لووت درێژەکەیان گووتی: یەعنی تۆ دەڵێیت ئەو ماوەیەی کە سامیر سەعدان لێرەبوو هیچ پەیوەندییەکی بە دەزگا ئەمنییەکانی پایتەختەوە نەبوو، ئەوان بۆ گێرەشێوێنی نەیانناردبوو.

من گووتم: سامیری بابلی، لەساڵی ٨٩ دا بەشداری کۆدێتایەکی کردبوو، ئەوکات چل ئەفسەری گەورەی سوپا تیرباران کران، ئەو تەنیا کەسێک بوو دەرچوو. تەنیا کەسێک بوو... چەند وەختە دەوڵەت بەدوایدا دەگەڕێت.

لووت زلەکەیان دوای بیرکردنەوەیەکی کەمێک درێژ، پرسی: کەواتە بۆ کوشتت؟ لەسەرچی کوشتت؟

من گووتم: من نەمکوشتووە، ئێوە بە هەڵەدا چوون. سامیری بابلی بەر لەوەی لەدەوڵەت یاخی بێت دەستی لە ئازاردانی خەڵکێکی زۆردا هەبووە،

ئەوان دادگایان بۆ دانا، دادگایەکی عادیلانە.

گەنجەکە بە تورەیی و بێزارییەوە گووتی: چۆن خەڵک لە سنووری دەسەڵاتی ئێمەدا، بێئاگاداری ئێمە دادگا دادەنێن. چۆن؟

من پرسیم: ئێوە کێن تا دادگا بۆ سامیری بابلی دابنێن. ئێوە کێن، ئێوە هەقێکتان نییە کەس دادگاییبکەن، ئەوەتا ئێوەش وەک چۆن سامیری بابلی خەڵکی ئازاردەدا، من ئازاردەدەن؟.

هەردووکیان لە جێگای خۆیان هەستان و بێئەوەی هیچ بڵێن، فانۆسەکەیان هەڵگرت و ڕۆیشتن، بەڵام پەیژەکەیان لە دوای خۆیان ڕانەکێشایەوە و دەرگاکەشیان بە کراوەیی بەجێهێشت، دوای ماوەیەک کوڕێکی گەنج کە شەرواڵێک و کراسێکی ڕەشی لە بەردابوو سینییەک خواردنی بۆ هێنام، بوتڵێک ئاو و گووتی: ئاوەکە هەمووی مەخۆرەوە، خودا دەزانێت چەند ڕۆژی تر لێرە دەبیت.

ئێوارە دوو کەسی دیکە هاتن، یەکێک جلی سەربازی لە بەردابوو، یەکێکی دیش جلێکی خاکی، یەکێکیان زۆر درێژ بوو ئەوی دیکەشیان زۆر کورت. درێژەکەیان پیر بوو ئەوی دیکەیان گەنج. درێژەکەیان لەسەر کورسییەک بەرامبەرم دانیشت و گووتی: هیوادارم ئێستا پشوویەکی باشت دابێت.

من گووتم: بەڕێز من نەخۆشم گەر دەتانەوێت نەمرم بمگوێزنەوە بۆ جێگایەکی باشتر.

وەک ئەوەی لەو جێگایەوە دەست پێبکاتەوە کە دوو هاوڕێکەی تیاوەستابوون، گووتی: ئێستا ئێوە ڕاتان وایە ئێمە بۆمان نییە خەڵک بدەینە دادگا.

من بڕیارمدابوو لێیان نەترسم، گووتم: ئێوە کێن، بۆ هاوڕێکانی پێشووتان نایەنەوە خواری.

بچوکەکەیان بە پێکەنینەوە گووتی: ئێستا دەزانین سامیر سەعدان لە دوای دادگایەک کوژراوە، حەزدەکەین پێمان بڵێیت کێ کوشتی، واتە کێ فەرمانەکەی بەسەردا دا... تۆ بوویت یاخود یەکێکی تر.

من سەیرمکردو بێئەوەی بیربکەمەوە، گووتم: بەڕێز من بووم، بەڵێ من بووم، دەتەوێت چیم لێبکەیت؟

درێژەکەیان بە کەمێک تێفکرینەوە گووتی: خێزانەکەشی هەر ڕای وایە.

من لێم پرسینەوە: ئێوە کێن؟ سەر بە چ گروهێکی سیاسین؟

بێئەوەی وەڵاممبدەنەوە، بچوکەکەیان گووتی: جەلادەتی کۆتر، حەزدەکەم ڕاستییەکت پێبڵێم نە ئێمە و نە موحەقیقەکانی ئەولا، ئەوەمان بەلاوە گرنگ نییە سامیر سەعدان تۆ کوشتووتە یان نا. سامیر سەعدان لای ئێمە نرخی قوونە سیغارێکی نییە، ئەوەیان موشکیلەی ژنەکەیەتی، تۆ ژنەکەیت بینیوە، ها... شتێکی جوانە وانییە؟

هاوڕێکەی پێکەنینکی درێژ پێکەنی، وەک ئەوەی لە ئەشکەوتێکی قووڵدا بێت قاقاکانی شەپۆل دەنگیاندەدایەوە. کە تەماشای ڕوخساریت دەکرد، لەوە ئاڵۆزترو سەیرتربوو پێکەنینێکی وەها ژنانەی هەبێت. ئینجا گووتی: ژنێکی بە ویقارە. بەڕاستی بە ویقارە، حەیف شووی بەو عەرەبە کردوە. بچوکەکەشیان لەگەڵیدا دایە قاقای پێکەنین، پێکەنینی ئەویش لەگەڵ ڕوخساریدا نەدەگونجا، هەندێجار لە پێکەنینی دێوێک دەچوو تۆزێک باریکت کردبێتەوە. هەندێجاریش گڕدەبوو، وەک پێکەنینی ئەکتەرە کوردەکانی لێدەهات کاتێک لەسەر شانۆ دەوری پادشایەک یان ئاغای گوندێک دەبینن. گووتی: ژنێکی نەجیبە، تا بڵێی چاکە، بەفەزڵ و ئیحسانە.

درێژەکەیان لە منی پرسی: تۆ بینیوتە... بینیوتە؟ لە بەینی خۆماندا بێت چۆنە؟

من کە پیاوم دەبینی بەوجۆرە بێمانایە باسی ئافرەت دەکەن، ڕشانەوەم دەهاتی. بێئەوەی سەیریان بکەم گووتم: نازانم چۆنە، بەڵام دەزانم ئەو

منی بە گرتداوە.

بچوکەکەیان هەستاو کەمێک بەژوورەکەدا سوڕایەوەو گووتی: هۆ جەلادەتی کۆتر، مەسەلەکە وا بەقورسی مەگرە، تۆ میوانی ئێمەیت، بە شەرەفم تۆ میوانی ئێمەیت.

درێژەکەشیان هەستاو بێئەوەی سەیری من یان هاوڕێکەی بکات، وەک ئەوەی پڕۆڤەی پێکەنین بکات، بە کۆمەڵێک دەنگی جیاواز پێکەنی و دوایی بە هاوڕێکەی گووت: سبەینێ لە تەلەفزیۆن چاوپێکەوتنم هەیە، تۆ دەڵێیت کام پێکەنینەیان باشە. لەگەڵ مەسئولێکی ئەولادایە لەسەر ئەمنی قەومی.

هاوڕێکەی دووبارە پێکەنینەکانی پێ دووبارەکردەوەو گووتی: هیچیان بە کەڵک نایەن، بۆ سومعەی حیزب خراپە تۆ وا پێبکەنیت، محاوەلەبکە هیچ پێنەکەنیت، بە ویقارەوە دانیشەو قسەی خۆت بکە.

ئەو ماوەیە وەک ئەوەبوو منیان بیرچووبێتەوە، بە دووقۆڵی لەسەر کۆمەڵێک بابەت قسەیان کرد کە من لە هیچیان تێنەگەیشتم، قسەکانیان پڕبوو لە ناوی خەڵک و شوێن و دەزگای سەیرسەیر کە پێشتر نەمبیستبوون، لەسەر هەر کەسێک دەوەستان بە وردەکارییەکی بێوێنە قسەیان دەربارەی هاوڕێکان و پارەکان و شەریکە نهێنییەکانی دەکرد، دواتر کە لەو باسانە تەواودەبوون دەکەوتنە سەر باسی ژن و خوشک و کچەکانیان، پێکەوە بە جۆرێکی هیستریی پێدەکەنین، قسەکانیان دەچووە ناو وردەکاری زۆر بێشەرمانەوە. بچوکەکەیان زۆر وردتر باسی هەندێک چیرۆکی خۆی دەکرد، زۆرجار درێژەکەیان دەیکێشا بە شانیدا و دەیگووت: درۆمەکە، بە شەرەفم، من دەیناسم، تۆ هەر بە پیاو نازانێت، دەڵێت : تۆ پیاو نیت. بچوکەکە لە پێکەنیندا وەک مزراح دەخولایەوەو دەستی دەگرت بە زگییەوەو دەیگووت: من پیاو نیم... پیاو نیم؟ ئای باوکەڕۆ، تو شەرەفت وای بە من گووت.

من نازانم چەند سەعات بەردەوامبوون، لەساتێکدا هەستمدەکرد ئەمجۆرە سەربوردو پێکەنین و خۆ نیشاندانە شێوەیەکی تازەیە لە ئەشکەنجەدان کە پێدەچوو من یەکێک بم لەوانەی لەسەرەتاوە ئەو میتۆدەم لەسەر تاقیدەکەنەوە.

دواجار گەڕانەوە بۆ سەر من و گووتیان : جەلادەتی کۆتر، بە شەرەفم سامیر سەعدان نرخی سەرەسۆدەیەکی لای ئێمە نییە، عەرەبێکی باوەحیز تۆ کوشتووتە یان نەتکوشتووە موشکیلەی ئێمە نییە. هەزار سامیر سەعدان و سەلکە توریک لای ئێمە وەکو یەکن. ئێمە یەکشتمان لە تۆ دەوێت، پێمان بڵێ : نەخشەکان کوان... ها... نەخشەکان کوان. ئەگەر بە پیاوەتی دەماندەیتێ باشە، بە پارە دەیفرۆشیتەوە چەند دەڵێیت پارە دەتدەینێ، ئەگەر نا ئەوا بە شەق لەورگتی دەردەهێنین. بەلام دەبێت بیدەیت بە ئێمە، دەبێت بیدەیت بە ئێمە، نەیدەیت بە موحەقیقەکانی ئەولا... تێگەیشتی.

دیارە هەڕەشەکانی سەختتر و دزێوتر و پڕجنێوتربوون لەوەی من لێرەدا دەینوسمەوە، بەلام بۆ ساتێک ڕاوەستام و لە چاوتروکانێکی کورتدا لە زۆر شت تێگەیشتم. بە ئەسپایی گووتم: نەخشەی چی؟.

درێژەکەیان شەقێکی لە کورسییەکەم هەڵداو گووتی: تاقەتی تۆم نییە، درۆودەلەسەم بۆ مەکە، من لەوسەرەوە دێمەوە، سامیر سەعدان پێش مردن هەموو شتێکی بۆ ژنەکەی باسکردوە، کاغەزێکی بەدەست و خەتی خۆی نوسیوە، باسی ئەو نەخشانەی تیاکردوە کە تۆ تەنیا کەسیت کە شاردووتەوە، گوێبگرە ئەوە لەخەیاڵی خۆت دەرکە بە تەنیا بیفرۆشیتەوە. ئەو نەخشانە گرنگن... ئیتر نامەوێت گوێم لە یەک درۆ بێت، تاقاتم لە درۆ چووە، شەش مانگە بووم بە موحەقیق زەلامم نەبینی ڕاستی بڵێت، یەک کەسم نەبینی خۆی وەک پیاو بێتە پێشێ و ڕاستی بڵێت... هەمووتان هەر دەبێت بە شەق شتەکانتان لە ورگ بهێنینە دەرێ، بەڕاستی حەوسەڵەم نییە.

من دەمزانی ئیدی لێرەوە شتەکان دەچنە قۆناغێکی ترسناکتر. بەڵام بێئەوەی باکم هەبێت گووتم: نازانم باسی چی دەکەیت.

بچوکەکایان بە دەموچاوێکی زۆر مۆنەوە هاتە پێشێ و گووتی: دەبێت بزانیت، چاری ترَت نییە.

گووتم: بەڵێ چاری ترم هەیە.

بەسەرسامییەوە گووتی: چییە؟

گووتم: ئەوەیە بمرم و هیچتان پێ نەڵێم

هەر ئەو شەوە منیان گواستەوە بۆ جێگایەکی دی، نیوەشەوێکی تاریک منیان لەو چاڵە هێنایە دەرێ و بردیانم بۆ شوێنێکی نەزانراوی دیکە، کاتێک سەرکەوتم و سەرم هەڵبڕی تێگەیشتم من چەند ڕۆژە لە ماڵێکی چکۆلانەی دووردەستدا دیلم، شەوێکی ئێجگار جوان بوو، وام هەستکرد ئاسمان پڕە لە ئەستێرەی ڕەنگاوڕەنگ، نەمزانی دەمبەن بۆ کوێ، بەڵام دوای ئەوەی چاویان بەستمەوەو دوو سێ سەعات لە ئۆتومبێلێکدا ڕۆیشتین، لە جێگایەکی تر دایانگرتم و خستمیانە ژوورێکی تاریکی دیکەوە کە پەنجەرەکانی لەدەرەوە بە بلۆک هەڵچنرابوون. ژوورێکی چکۆلەبوو، تەوالێتێکی زۆر پیسی لەسەر بوو. لەو ژوورەدا دوو پیاوە سمێڵ ڕەشەکەی یەکەمین جار گەڕانەوەو یەکێکی تریان لەگەڵدابوو ناوی سەی سەیفە بوو. پاش کەمێک خۆیان ڕۆیشتن و منیان بۆ سەی سەیفە بەجێهێشت کە شارەزایەکی بێوێنەی ئەشکەنجەبوو. باسی ئازارەکانی خۆم ناکەم، باسی ئەو چەند ڕۆژە لە لێدان و برسێتی ناکەم، من کەسێک نیم شارەزای گێڕانەوەی حیکایەتی ئازارەکان بم، ئەگەر چیرۆکنوسیشبام تەنیا لە نوسینەوەی ساتە ئاساییەکانی ژیاندا دەستڕەنگین دەبووم. لەو ماڵە تازەیەدا سەروسەکووتی دوو پیاوە کورت و درێژەکە ونبوو و تەنیا موحەقیقە سمێڵ ڕەشەکان دەهاتنەلام و دەیاندووانم، لە نەخشەکان بەولاوە هیچی دیکەیان نەدەویست.

من بڕیارمدابوو تا بتوانم بەرگەبگرم، تا بتوانم ئەو نەخشانە نەدەم بە هیچ ڕۆحلەبەرێک. بەلام بە ئەندازەیەک لاوازبووبووم هێدی هێدی دەسەلاتم بەسەر لەش و بیرکردنەوەی خۆمدا وندەکرد. من ئاگادارنەبووم لەدەرەوە چ تۆڕێکی سەیری ململانێ و شەڕ لەدەوری من ڕوودەدات، بە شێوەیەکی زۆر نهێنی گوازرابوومەوە بۆ ئەو زیندانە تا هیچ کەسی دی دەستی نەگاتە من و دەستی نەگاتە نەخشەکان کە خەلکانێکی زۆر دەیانویست بیکەن بە بابەتی گەمەیەکی سیاسی و ئالوگۆڕی سەدان هەزاری لەسەر دەکرا. لە شەوێکی تاریکی دیکەدا دوای شەڕە تەقەیەکی کەم کۆمەلێک چەکدار خۆیان کرد بە زیندانەکەمداو بە نیوە مردوویی منیان ڕفاند، دیسانەوە لە جێبێکی بچوکدا منیان گواستەوە بۆ شوێنێکی دیکە. دوای چەند سەعاتێک من خۆم لە ژوورێکی دیکەدا بینییەوە، لە مالێکی چۆلدا، سەیر ئەوەبوو ئەمجارە پیاوە کورت و درێژەکە بە خۆیان و پێکەنینەکانیانەوە دەرکەوتنەوەو لە هەمان جێگاوە دەستیان پێکردەوە کە لەدوا دانیشتنندا کۆتاییمان پێهێنابوو. ئەوانیش پسپۆڕێکی تایبەتی ئەشکەنجەیان هەبوو، کوڕێکی گەنج بوو بە مەلا جەلالی تەور بانگیاندەکرد. مەلا جەلالی تەور چەند قاتێک لە سەی سەیفە دڕندەتربوو، کە تاقەتی نەبایە لێمبدا چیرۆکی ئەو کەسانەی بۆ دەگێڕامەوە کە بەدرێژایی ژیانی بە تەور کوشتوونی، هەندێجار بۆ قوربانییەکانیشی دەگریا، کە تەواودەبوو سەری ماچدەکردم و دەیگووت: بەقوربانت بم، بەخوا زۆر ئەزیەتمدایت. هەندێجاریش لە ناوەڕاستی لێدانەکەدا حەیزەرانەکەی دادەناو دەستی دەکرد بە گریان و دەیگووت: باوکەڕۆ من چەند عاتیفییم. دیارە زۆربەی وەخت بە جۆرێکی ئێجگار بێڕەحمانە لێیدەدام. هەندێجار لە مردن نزیک دەبوومەوە. هەندێجار دەستمدەکرد بە گریان، لە هۆش خۆم دەچووم ئەوسا وازی لێدەهێنام. چەند هەفتەیەک لەو مالەدا مامەوە، شەوێک دیسانەوە بووە هەراو زەنایەکی گەورە، کۆمەلێک چەکدار کە هەموویان سەروچاوی خۆیان

بەستبوو، هاتنە ژوورەکەم و منیان وەک پەڕۆ کۆنێک دا بە شانی خۆیاندا و ڕفاندیانم بۆ جێگایەکی دی، لەوێ دیسانەوە دوو پیاوە سمێڵ ڕەشەکە دەرکەوتنەوە، سەی سەیفە بە خۆی و دارەکەیەوە گەڕایەوە وێزەم... من هێدی هێدی لە شتەکان دەگەیشتم. دوو گروهی جیاواز منیان لە یەکتر دەڕفاند، هەر دووکیان مەبەستیان بوو من بە زیندوویی بگرن و ئەو نەخشانەیان بۆ خۆیان دەست بکەوێت. من لەو ماوەیەدا چەندەهاجار ڕفێندرام، دەیەها بەندیخانەی جیاوازم بینی، چەندەها جار ئەو موحەقیقانەم بینییەوە، لەسەفەرێکی درێژدا کە پێموابوو زۆر شارو شارۆچکەو گوندی گرتۆتەوە، لە زۆربەی جێگاکانی نیشتیماندا ئەشکەنجەدرام، زۆرجار لە ماشێنی داخراودا بە ڕێگای چەندین سەعاتیدا دەیانبردم بۆ شوێنی دوور. هەندێجار لە ژێر پەڕۆی چاوبەستەکەمەوە ناو دارستان و سەر چیاو دامێنی نزارانم دەبینی کە ماشێنەکان تەییاندەکردن. لەمسەری کوردستانەوە دەیانڕفاندم بۆ ئەوسەر و لەوسەرەوە دەیانهێنامەوە، لە هەندێک جێگادا گوێم لە خەڵکانێک دەبوو بە کرمانجی قسەیاندەکرد، هەندێجاریش حەیرانی خۆشناوەتیم دەبیست. لە سەردەمێکی زیندانییەکەمدا دڵنیابووم لە هەورامان دیلکراوم، چونکە هەمیشە لە دۆڵێکی نزیکدا گوێم لە سیاچەمانە بوو. لەو ماوەیەدا چەند موحەقیقێکی جیاوازم بینی، هەستمکرد گروپی ترو هێزی سیاسی تر هاتوونەتە ناو گەمەکەوە، من عینادییەکی کوشندەم نیشاندەدا، لەبەرئەوەی دەمزانی لەو ساتەدا کە نەخشەکانیان دەستدەکەوێت دەمکوژن. تەنیا شتێک لە ماوەی ئەو مانگ و ساڵانەدا هەستم پێدەکرد، خۆشەویستی ژیان بوو، لەو ماوە دووورودرێژەی زیندان و ئەشکەنجەدا کە پتر لە دوو ساڵی خایاند، دالیا سیراجەدین نەبێت هیچ شتێکم یاد نەبوو. کە دەبووورامەوە بەردەوام دالیا سیراجەدین بەئاگای دەهێنامەوە، لەو ماوەیەدا هەندێجار هەستمدەکرد لە جێگایەکی دوورەوە بانگمدەکات، من هەمیشە سەرم بەرزدەکردەوە، بەڵام نەمدەبینی. زۆر شەو وام هەستدەکرد

کە گوێم لە مۆسیقاکەی شاروخی شاروخە، بەڵام پێموایە تەنیا خەیاڵێک و وڕێنەیەکی عەقڵی بوو هیمەتی دەدامێ و لە مردندا زیندوویدەکردمەوە. بەجۆرێکی شێتانە حەزم لە ژیان بوو، بیری باڵکۆنەکەی گێلاسی سپیم دەکرد، حەزەکەم بە ئەندازەیەک بوو کۆمەکێکی گەورەی پێدەکردم نەمرم... بەڵام لای زیندانەوانەکانم خۆم واپیشاندەدا کە باکم بە مردن نییە. لەو ماوەیەدا قۆناغی زۆر ترسناکی برسێتیم چەشت. هەندێجار لە بەر لاوازی و کەمخوێنی دەبایە وازم لێبهێنن تا کەمێک دێمەوە سەر خۆم و بەرگەی ئەشکەنجە دەگرمەوە. لەو سەفەرە تاریکەدا دووجار پزیشکیان بۆ هێنام تا نەهێڵێت بمرم. من دەمزانی لە هەر جێگایەک بم زۆر نامێنمەوە و چەند ڕۆژێک نابات هێزێکی دیکە دەمڕفێنێت بۆ دەڤەرێکی دیکە. ئەو دوو ساڵە کە جگە لە برسێتی و لێدان هیچی تری تێدانەبوو وەک مەشق و ئامادەکردنێکی جەستەیی بوو بۆ لە دایکبوونی مرۆڤێکی دیکە، مرۆڤێک موسای بابەک ناوی نابوو جەلادەتی قەقنەس. من دڕندەیم لە هەموو گروپە سیاسییە جیاوازەکان بینی، ئەشکەنجەی بڕێکی زۆر لە جەلادەکانی نیشتیمانیشم تاقیکردەوە، وەک ئەوەبوو مێژووی ئەم مەملەکەتە بە هەموو دەستوخەتە جیاوازەکانی خۆی لەسەر لەشی من حکایەتی خۆی بنوسێت، لەشم سەرتاپا زام بوو. جار دوای جار موحەقیقەکان دڵڕەقترو نائومێدتر دەبوون، بەڵام جار دوای جار توانای بەرگری من لاوازتر دەبوو، هێدی هێدی ئەشکەنجەدەرەکانم شارەزاترو دڕتردەبوون، ئازاری کوشندەتریان دەدەدام، ئێشی وەهایان تیا دەوروژاندم لەسەروو توانای تاقەتی مرۆڤەوە بوو بەرگەی بگرێت. بەڵام من دواجار بە ئەندازەیەک عاشقی ژیان بووم کە دڵنیابووم نامرم. شەوێکیان تێگەیشتم ئەم گەمەیە گەر من کۆتایی بۆ دانەنێم لەوانەیە تا هەتا هەتایە بخایەنێت، دوای تێپەڕین لە پرۆڤەیەکی دووروودرێژ دەبایە جورئەتبکەم و یەکەمین قاچم بخەمە سەر زەمینی مردن تا کۆتایی بەم یارییە بهێنم کە پێدەچوو یارییەکی نەبڕاوەبێت. ئێستا دوای

ئەو سەفەره دوورودرێژه کاتی ئەوەبوو بچمە ناو مەرگەوەو ڕووبەڕوو سەیریبکەم. شەوێکیان دوای ئەشکەنجەدانێکی وەحشی ڕوخام و گووتم: نەخشەکان لای منن، چیتر ناتوانم بەرگەی لێدان بگرم، هیچ زیندانێک نییە دوو ساڵ بەرگەی ئەشکەنجەی بەردەوامی گرتبێت.

کەوامگووت دڵنیابووم دەمکوژن. من لەسەرەتاوه دەمزانی ئەو نەخشانە ناگەنە دەست خەڵک، ناگەنە بەرچاوی جیهان، دەمزانی ئەو نەخشانە دەبنە کالایەک هێزێک دەیفرۆشێتەوه بە هێزێک و حیزبێک دەیکاتە کەرەستەی فشار بۆ سەر ئەوی دی. من تاکە دەلیلی زیندوو و بێلایەن بووم لەسەر بوون و نەبوونی ئەو نەخشانە. دوای ئەو سەفەره دوورودرێژەش هەموو هێزەکانی کوردستان دەیانزانی چ مەخلوقێکی کەللەڕەق و سەروشکم، لەو دوو ساڵەدا زیندانی هەموو حیزبەکانی کوردستانم بینی، ئێستا هەموو دەیانزانی گەر ئازادمبکەن چیرۆکەکەی من، چیرۆکی پیاوێک دوو ساڵ هێزە جیاوازەکان لەدەستی یەکتر دەیرفێنن و لە هەموو کونج و کەلێنێکی ولاتدا ئەشکەنجەی دەدەن، چ ئابڕووچوونێکی بەدواوەیە. بەلام منیش دەمزانی جارێکی تر نایەمەوە دەرێ، دڵنیابووم بەرمنادەن، دەمزانی ڕۆژێک لە یەکێک لە زیندانەکاندا ڕۆحم دەردەچێت و فڕێمدەدەنە کەندەلانێکەوه یان لە بن بەردێکی دووردا دەمنێژن و لەگەڵ مردنی منیشدا ئەو نەخشانە بۆ هەتا هەتایە وندەبن. دواجار هیوایەکی کەمم هەبوو نەخشەکانیان بدەمێ و نەفەوتێت، بەڵکو ڕۆژێک لە ڕۆژان بکەوێتە دەست سیاسییەکی شەریف و بیخاتە بەردەستی جیهان، من دەمزانی دەمکوژن، بەلام لایەنیکەم دوای مردنی من دەبایە نەخشەکان ژیانێکی تریان هەبێت، دەبایە ڕێگایەکی تر بگرنە بەر بەڵکو ڕۆژێک لە ڕۆژان دەستێک بیانهێنێتەوه بۆ بەر ڕوناکی.

ئەوشەوەی کە بردمن بۆ سەر شوێنی نەخشەکان، دەمزانی شەوی مردنی منە، شەوی مردنی جەلادەتی کۆتره. چەند سەعاتێک بەر لەوەی بڕۆین زیندانەوانەکەم کاغەزێکی چکۆلانەی دامێ، ئەوە یەکەمجار بوو

دوای دوو ساڵ هەواڵێکی دەرەوەم بۆ بێت، بەدرێژایی ئەو دوو ساڵە لەو هەموو شارو شارۆچکەو گوندانە جگە لە موحەقیقەکان و ئەوانەی کە لێیاندەدام هیچ کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردم. نامەیەکی چکۆلەبوو، دەست و خەتێکی زۆر جوان لەسەری نوسیبوو «ماڵاوا جەلادەتی کۆتر، پێمگووتی سامیری بابلی بە تەنیا نامرێت. باوەڕت پێ نەکردم. ئەمشەو جەهەنەم بە چاوی خۆت دەبینیت».

لە خوارەوە بە ویقاری ئافرەتێکەوە کە شانازی بە تۆڵەی خۆیەوە دەکات، ناوی شاناز سەلیمم خوێندەوە. ئێستا ئاشکرابوو شاناز سەلیم ئاگاداری بەشێکی جەرەیانەکەیە، خەڵکانێکی هەیە بەردەوام شوێن و هەواڵی منی دەدەنێ، دیارە بەشێوەیەکی گشتی یارییەکە لە شاناز سەلیم گەورەتربوو، بەڵام دڵنیاشم شاناز دەستێکی گەورەی لە داڕشتنی سیناریۆی مردنی مندا هەبوو، چونکە بەر لە مردنم بینیم لە نزیک درەختێکەوە عەبایەکی دابوو بە شانیدا و تەوقەیەکی سپی بە قژیەوە بەستبوو و گوێی لە هاوارەکانی من دەگرت، لە نێو بڵێسەکاندا ڕووبەڕوو سەیری چاوی کردم و گوێی لێبوو کە دەڵێم: هاوار... هاوار.

ئەو ئێوارەیە کە منیان برد نەخشەکانیان بدەمێ، تاکە ئێوارەیەک بوو چاویان نەبەستمەوە، ئەوە یەکەمجار بوو دوای دوو ساڵ بە چاوی کراوەوە ڕوناکیم دەبینی، جیهانم دەبینی، ڕێگام دەبینی. بەدرێژایی ئەو دوو ساڵە گەر شتێکم بدیبایە لە ژێر چاوبەستەکەوە بوو. ئەگەرچی دەمزانی دەمرم بەڵام دڵم بە درەخت و ئاسمان و ئەستێرەکان خۆشبوو، سەیربوو تا دوا ئەندازە حەزمدەکرد لەزەت لە شتەکان ببینم.

ئێستا دوای دوو ساڵ زیندان بووبووم بە مەخلوقێکی لاواز کە تەنیا پێستەکەم مابووەوە، بەزەحمەت دەمتوانی بە پێوە بوەستم، کەنەفتەو ئامادە بۆ مەرگ دەگەڕامەوە بۆ شوێنی ئەو ئۆردوگا کۆنەی ئاوارەکان کە شەوێک لەبەرچاوی من و سامیری بابلی فڕی بۆ ئاسمان، نەمدەزانی

بەتەواوەتی چ مانگێکە، بەڵام زەن و سەلیقەی خۆم پێیدەگووتم لە نێوان کۆتایی ئاب و سەرەتای ئەیلولداین، هەوا بە جۆرێک خۆشبوو منی شەیدادەکرد. شوێن کەمپی ئاوارەکان وەک هەمیشە خاکێکی فەرامۆشکراو بوو کە بە پوش و درک و گیای کێوی داپۆشرابوو، پێنج کەس لەوێ چاوەڕوانی من و پاسەوانەکانیان دەکرد، هەر پێنجیان کڵاشیان لە پیابوو، دەمانچەیان پێ بوو، لە دوور دوو سێ ماشێنم بینی، هەستمکرد هێزێکی زۆر لەسەر قووتەو یاڵ و لووتکەکانی دەوروبەر دامەزراون. لەوێوە من پێشیانکەوتم بۆ بن ئەو بەردە گەورەیە، نیشانمدان کە لە کوێوە زەوییەکە هەڵدەکەنن، دووان لە پاسەوانەکان زەویەکەیان هەڵکەند و دووانی تر خۆڵەکەیان دوورخستەوە، دواجار ئەو سندوقەیان دەرهێنا کە بە چەرمێکی ڕەش داپۆشرابوو، یەکێکیان بە قەمە تەقەڵە پوکاوەکانی لێکردەوە، سندوقە ئەلەمنیۆمەکەی دەرهێنا، موشەمای سەر جانتای یەکەمی دڕی، موشەمای سەر جانتای دووەمی لێکردەوەو دوای کەمێک زەحمەت، هەموو نەخشەکانی وەک خۆی بە تازەیی گرت بەدەستیەوەو دایە دەست پیاوێکی لاجان سپی کە بە جووتێک کڵاشەوە لە نزیک منەوە وەستابوو. کە نەخشەکانیان دەستکەوت، پیاوەکان ڕۆیشتن و تەنیا پاسەوانەکان لەلای من مانەوە. پاش دە دەقیقە ئەو پیاوە لاجان سپییە لەگەڵ سێ کەسی دیکەدا گەڕایەوەو پێگووتن: لەسەر درەختەکە، دەزانن کام درەخت دەڵێم؟ مازوویەکی گەورەیە بە دیوی «سەرئاشان» دا دەڕوانێت. ها ساڵەکە لەویا شەریفی خلەچەوتە تەقەی لە کوڕەکەی کەرێم عوزێر کرد. ئالەویادا، وەکو پێمگووتن، دەوروبەری دارەکە پڕپووشە، نەختێک چیلکەو چەوێلیشی لێکۆبکەنەوە، شوێنەکە تادڵ حەزکات خۆشگرە، ئاسان دەسووتێت... دەی بەساقەتانبم، ئاگاتان لە خۆتان بێت، دوایی وەرنەوە بۆ ماڵی گوڵ وەزیر، دەزانن کێ دەڵێم، دراوسێی کابرای وەڕازی... دەی سا بەساقەی هیمەتتان بم. من لەوێ چاوەڕێتاندەکەم.

من تەواو تێنەگەیشتم دەیانەوێت چیم لێبکەن، بەڵام بە چوار کەس منیان دایە پێش خۆیان، من دەمزانی دەمکوژن، بەڵام جگە لە سەیرکردنی ئەستێرە بیرم لە هیچی تر نەدەکردەوە، ئەوە ئامۆژگارییەکی منە بۆ تۆ گەر ڕۆژێک کۆمەڵێک خەڵک تۆیان دایە پێش خۆیان بۆئەوەی بتکوژن، مەترسەو خۆت مەبووریێنەوە، چونکە ئەو شتانە هیچی سوودی نییە، ئەوانەی کە دەیانەوێت بتکوژن لەزەت لەوە دەبینن تۆ بترسیت، بەڵام تۆ هیچ مەکە، وابزانە دەچیت بۆ بازاڕ یان شوێنێکی تر، گەر شەوبوو خۆت بە تەماشاکردنی ئاسمانەوە سەرقاڵ بکە، ئاسمان هەمیشە جوانە، گەر هەور بێت و گەر سایەقە، گەر تەپوتۆزبێت و گەر ساماڵ، هەمیشە شتێکی تێدایە نەمری و قووڵی و بێسنووریت بیردەخاتەوە، گەر سەوزاییت لێوە نزیک بوو سەیری سەوزاییەکە بکە، گەر گوڵ بێت باشترە، بەڵام گەر گوڵ نەبوو ئەوا هەر درەختێک، گەڵایەکی سەوز بدۆزەرەوەو تەماشایبکە، گەر ئەوانەش نەبوو سەیری هەر شتێک بکە کە مرۆڤ دروستیکردوە، وەک ئەوەی سەیری دیوارێک یان شتێکی وەهابکەیت کە لێت دیارە، بیر لەو ڕۆژە بکەرەوە کە ئەو دیوارە دروستکراوە، وەستایەک هاتووە بە دڵ بەردەکانی داناوە ویستویێتی جوان دەرچێت، کرێکارێک بلۆکەکانی بۆ هەلگرتووە و لە کاتی پشووەکاندا نان و ماستاوێکی خواردوە، بیر لە کیسەی خواردنی کرێکارەکە بکەرەوە، بیر لەوە بکەرەوە کە بەیانی زوو هەستاوەو شتەکانی کۆکردۆتەوە، بیر لە بەفری ناو ماستاوەکەی بکەرەوە کە دەسوڕێتەوەو دەسوڕێتەوە تا نامێنێت، وەک ژیان خۆی کە لەو ساتەدا لە پارچە سەهۆڵێک دەچێت لە دەفرێکی ئاودا. گەر ئەوانەش نەبوون چاو لێکبنێ و بیر لە ڕۆژێکی خۆش بکەرەوە لە ژیانی خۆت، یان لە جێگایەکی دیاریکراو، وەک ئەوەی بیر لە پۆلی یەکەمی خوێندنت بکەیتەوە، هەوڵبدەیت دیوارەکان و تەختەڕەشەکەو پەنجەرەکانت بیربکەوێتەوە، لەوکاتەدا کە تۆ سەرقاڵی ئەو بیرکردنەوانەیت لە ناکاو شتەکان دەپچڕێت، وەک فلیمێک

لـە ناوەڕاسـتدا بوەسـتێت و پەردەکـە ڕەشـببێت، ئیتـر تۆ هیچـت بیرنامێنێت، دەمریـت بێئـەوەی بـە ترسـناکترین قۆناغـی مردنـدا ڕۆیشـتبیت کـە ترسـە لـە مـەرگ.

تکایە ئەم ئامۆژگاریانەم بە ئامۆژگاری یەکێک وەرمەگرن کە دانیشـتووەو چیرۆکێک دەنوسـێت، ئـەوە وانـەی ڕاسـتەقینەی منـە کـە ئەزموونێکـی درێژم لەگـەڵ ڕووبـەڕوو وەسـتاندا بەرابـەر مـردن هەیـە... مـردن هیـچ نییـە جگـە لـەو ترسـەی کـە پێـش مـەرگ هەراسـانتدەکات، گـەر ئـەو ترسـە ببڕیـت دڵنیابـە ئیدی مـەرگ بوونـی نییـە.

مـن ئـەو ڕۆژە دەمزانـی دەمـرم، بـە هێمنـی پێـش بکوژانـم کەوتـم و سـەیری ئەسـتێرەم دەکـرد. منیـان لـەو درەختـە نزیککردەوە، دار مازوویـەک بـوو بـە لاپاڵێکـی ڕووتـەوە، بەرابـەرم بـە سـەد مەتـر درەخـت و چڕسـتانێکی دیکـە دەسـتی پێدەکـرد، بـەڵام لـە نێـوان درەختەکـەی مـن و دارەکانـی دیکـەدا ڕێگایەکـی باریـک هەبـوو. کـە لەوانەیـە تەنیـا چـاوی مـن بیبینێتـی کـە چاوێـک بـوو هێشـتا هـەر تیژبـوو، هێشـتا لـە تاریکیـدا دەیتوانـی هەمـوو وردەکارییەکان ببینێـت. شـوێنی درەختەکـەی مـن ڕووتـەن و بەریـن بـوو، دیاربـوو هەمـوو ئـەو هاوینـە کـەس لـەو درەختـە تەنیایـە نزیـک نەبۆتـەوە، چـڕو زەبەندێکـی سـەیر لـە پـوش و پـەلاش لەدەوری درەختەکەبـوو، دووان لـە پاسـەوانەکان کۆمەڵێـک چیلکـەو چەوێڵـی تریـان کۆکـردەوە، دوو پاسـەوانەکەی دیـش منیـان بـردە بـەر درەختەکـە، درەختێکـی سـەوزو گـەورەبوو، ئێجگار گـەورەبوو، دوو پەلـی گـەورەی لـێ جیابووبـووەوە وەک ئـەوەی هـەر لەسـەرەتاوە بـۆ لـە خاچدانـی یەکێـک بـەو چەشـنە خـۆی کردبێتـەوە. یەکێکیـان لـە تورەکەیەکـی سـپی چەکوشـێک و هەندێـک شـتی دیکـەی دەرهێنـا کـە تائـەوکات مـن نەمدەزانـی ئـەو مێخانەیـە کـە منـی پـێ هەڵدەواسـرێم، دووانیـان سـەرکەوتنە سـەر درەختەکـەو دوو گوریسـیان ڕەهێڵکـردە خـوارەوە، سـەرەتا وامدەزانـی دەمخنکێنـن، دووانەکـەی دی لـە خـوارەوە گوریسـەکانیان لـە قۆڵـم هەڵکێشـا و

هەر چواریان پێکڕا بەرزیانکردمەوە بۆ سەرەوە، کە دەستم گەیشتە ئاستی دوو لقەکە لەویادا وەستان و لەسەرەوەڕا گوریسەکەیان لە چڵەبەرزەکانی تر بەست و من بە ئاسمانەوە مامەوە، تا ئەوکاتە بکوژەکانم هیچیان نەگووتبوو، لەویادا دووانەکەی سەرەوە دابەزین و یەکێکی بچوکیان بە پەلە سەرکەوتە سەرەوەو لە خوارەوە ئەو چەکوشە زەبەلاحەی بردەسەرێ و بەوانی دیکەی گووت: مێخەکانم بەنێ. یەکێک مێخەکانی دایە دەست و ئەو گووتی: یەکە... یەکە.

گوریسەکان منیان بەجۆرێک بەدرەختەکەوە چەسپکردبوو، ئەو پیاوەی سەرەوە زەحمەتێکی زۆری نەبوو، دەستم بەو لقەوە بنوسێنێت کە خۆی لەسەری وەستابوو، ئەو یەکەمین مێخی بەدەستە چەپمدا داکوتا. من ئازارێکی زۆرم هەبوو، بەڵام هاوارم نەکرد، هێند هەیە سەیری ئەستێرەکانم کردو بەدەنگێکی غەمگین گووتم: هاوار... هاوار. کە مێخەکەیان لەدەستی دووهەممدا ڕادا، من هەستمدەکرد خەریکم بێهۆش دەبم، لە نێوان ژیان و مردندا بیرم لە دالیا سیراجەدین کردەوە، بیرم لەو کچە دڵگەورەیە کردەوە کە منی لە مردن ڕزگارکرد، دەمزانی گەر بزانێت وام لێدەکەن هەموو شتێک دەکات بۆئەوەی ڕزگارمبکات، دەمزانی منی خۆشناوێت، بەڵام دەمزانی ئێستا لە هەر شوێنێکی دونیادا بێت فریشتەکانی پێیدەڵێن کە من دەمرم، دڵی پێی دەڵێت من دەمرم. لەوساتەدا خەفەتم لەوە دەخوارد کە دالیا سیراجەدین ڕۆژێک لە ڕۆژان دەزانێت کە بەوشێوەیە کوشتوویانم و دەڵێت: کوڕی پور بۆ وایان لێکردیت. من لەو کاتەدا هێزێکی گەورەم دایە خۆم بۆئەوەی بە هوشیارییەوە بچمە ناو مەرگەوە. لە ڕاستیدا مەرج نییە هەموو کەسێک بڕیاربدات کە دەبێت بە هوشیارییەوە بچێتە ناو مەرگەوە. بەڵام من تەکانێکم دایە خۆم و گووتم: هاوار... هاوار. هەستمکرد ئەو دوو وشەیە خەبەرمدەکەنەوەو تینم دەدەنێ. لەوکاتەدا بینیم دەست لە سەر سنگی چەپم دەدەن، هەستمکرد یەکێک بە هێزێکی ئەفسانەیی ئەو

مێخە بەناو گۆشت و خوێن و دەمارەکانی سنگمدا دەباتە ژووری، مێخێکی درێژ کە بەشی ئەوەدەکات لە سینە باریکەکەی منەوە دەرچێت و لە درەختەکەش بچەقێت. ئا لەویادا گوێم لە فلووتەکەی شاروخی شاروخ بووەوە، ئالەوساتەدا سەیرمکرد و شاناز سەلیمیشم لە ناو درەختەکاندا بینی لە تاریکیدا سەیرمدەکات. وەک چاوەڕوانمدەکرد نەبوورامەوە، وەک چاوەڕوانمدەکرد نەمردم، شتێک لە هۆشم تێدابوو، تەمێکی سپی لە بەرچاوم دەهات و دەچوو، ئازارێک کە پێشتر شتی وەها کوشندەم نەبینیبوو سەری پردەکردم لە هاوار، لەوساتەدا هیچ لە نالین و نەنالینی خۆم تێنەدەگەیشتم، بەلام گوێم لە فلووتەکە بوو نزیکدەبێتەوە، دلنیابووم شاروخی شاروخ لێمەوە نزیکە. ئاگادارنەبووم کە مێخی چوارهەمیان بە لای ڕاستمدا داکوتا، بەلام لەوساتەدا کە ئاگریان لە ژێر درەختەکەدا کردەوە و گڕیان لە پوش و پەلاشەکە بەردا تامن و ئەو درەختە پێکەوە بسووتێین لە ناو ئاگرەکەدا شاناز سەلیمم بینی بە زەردەخەنەی یەکێکەوە شەڕێکی گەورەی بردبێتەوە سەیرمدەکات. کە لە هۆش خۆم چووم تەماشای چاوە عەیارەکانی شاناز سەلیمم دەکرد، ئەو کیژەی بە لەزەتێکی گەورەوە سەیری مردنی منی دەکرد.

دواتر من شاروخی شاروخم بینی بە ناو ئاگرەکەدا دێت، ئەوم بینی مێخەکان لە دەستم دەردەهێنێت، مێخەکان لەسەر سنگم دەردەهێنێت، دەمخاتە سەر دەستی خۆی، بە ناو ئاگرەکەدا تێدەپەڕێت و دەڵێت: جەلادەتی کۆتر ئێستا کاتی ئەوەیە پێکەوە بچین بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان. ئیدی تەواو، ئیدی هەموو شتێک تەواو، تۆ لەگەڵ مندا دەڕۆیت بۆ ئەوێ، بۆ سەیرترین شاری دونیا... لەوێ ئۆقیانوسی جوانییەکان چاوەڕوانتدەکات.

## ماڵاوایی لەقەقنەس

چەند ساڵێک دواتر من و جەلادەتی کۆتر پێکەوە گەڕاینەوە بۆ ئەو نزارە و ئەو درەختە سووتاوەمان بینییەوە، ئەو لاپاڵە گەورەیەمان بینییەوە کە پێدەچوو دوای ئەو ئاگرە هیچی دیکەی تیا سەوز نەبووبێت. ئەو ڕۆژە جەلادەتی کۆتر شوێنی مێخە کوشندەکانی لەسەر درەختەکە نیشاندام، ئەو لقە سووتاوەی نیشاندام کە لەسەری سەرەوە هێشتا پارچە گوریسێک بە بەرزترین چلییەوە ڕەشەبا یاری پێدەکرد. شوێنی وەستانی شاناز سەلیمی نیشاندام لە ناو دارەکانی ئەوبەردا، شوێنی وەستانی بکوژەکانی، ئەو جێگایەی شاروخی شاروخ پیا ڕۆیشتبوو. هەموو شتێکی لە بیربوو، چاوی دەنوقاند و تەواوی وردەکارییەکانی ئەو شەوەی لەبەر دەگووتەوە.

لەڕاستیدا جەلادەتی کۆتر ئارەزووەیەکی نەبوو ئەو جێگایە نیشانی من بدات، بەڵام ئەو ئارەزووە زۆرەی من بۆ ئەوەی لە پاڵ ئەو درەختەدا وێنەیەکی فۆتۆگرافم هەبێت جەلادەتی نەرمکرد و لەگەڵمدا گەڕایەوە ئەو جێگایە. هەر بەو بۆنەیەوە شوێنی کامپی ئاوارەکان و جێگای شاردنەوەی نەخشەکانیشی نیشاندام. لە ژێر ئەو درەختەدا دووبارە حیکایەتی پەڕینەوەکەی خۆی و ئیسحاق و سەرهەنگی لەو زێ شوومە گێڕایەوە کە لەوەوبەر چەندین جاری دی بۆ هەموومانی گێڕابووەوە، گەڕانەوەی خۆی و دالیا سیراجەدینی بۆ شاری تەپوتۆزە زەردەکان دووبارەکردەوە، مەنەلۆگە درێژەکانی خۆی گووتەوە، سەفەری خۆی بە ئۆقیانوسی

هاوارەکاندا باسکرد، گەشتی نێو زیندانەکانی گێڕایەوە. من ویستم لەوێوە هێلێک یان نیشانەیەک بدۆزمەوە بمباتە سەر ڕێگایەک بەرەو شاری مۆسیقارە سپییەکان، بەڵام هیچ جۆرە ئاسەوارێکی وام نەبینی. بەڵام هەواو ڕوخساری ئەو شوێنە، دەنگی باڵندە غەمگینەکان، سروەی پڕ حەسرەتی با بە کۆ نیشانەیەکی ئاشکرابوون بۆ سروشتی ئەفسانەیی شوێنەکە. کاتێک لە بن ئەو دارەدا وەستام کە ئاسەواری ئەو ئاگرەم بینی کە جووتیاری گوندەکانی دەوروبەر دەیانگووت: گەورەترین ئاگربووە لە مێژووی ئەو هەرێمەدا. دەمزانی جەلادەتی کۆتر لەو خاڵەوە، لەو بن درەختەوە بەرەو شاری مۆسیقارە سپییەکان سەفەریکردوە. پێدانان لەو جێگایەدا بۆ من وەک پێخستنە سەر ئەو خاڵە بوو کە کۆلۆمبۆس لێوەی گەشتی خۆی دەست پێکردوە. من دەبایە ئەو شوێنە ببینم.

جەلادەتی کۆتر لەو خاڵەوە بەرەو زەمین و زەمانێکی دی چووبوو کە لەوانەیە بۆ خەیاڵ و تێگەیشتنی ئێمە سەخت و نائاسایی بێت. دەبایە جەلادەت بە نێو ئازارێکی وا گەورەو ئاگرێکی وا سامناکدا بڕوات و لەوسەر زیندوو ببێتەوە. جەلادەت لەو باڵدارانەبوو کە بە ناو مردندا دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە، من کە سەیری ژیانی دەکەم هەستدەکەم سێ جار بە نێو مردندا تێپەڕیوەو هەستاوەتەوە، جاری یەکەم ئەو کاتەی لەگەڵ تیپێکی مۆسیقای منداڵاندا تووشی ڕووداوێکی ترسناک دەبن و ئەم تەنیا کەسێکە دوای بێهۆشییەکی دوورودرێژ هەڵدەستێتەوە، جاری دووەم کە لە کوشتارە گەورەکانی باشووردا، لەو سەردەمەدا کە سەدان هەزار کورد لە باشوور تیرباران دەکرێن، ئەو یەکێکە لەو کەسە دەگمەنانەی بە ناو ئاگرەکەدا دەڕوات و لەوسەر بە زیندوویی دێتەوە دەرێ، جاری سێهەمیش ئەو جارەیە کە دەیگەیێنێتە شاری مۆسیقارە سپییەکان. ئەو شەوە شاروخی شاروخ بە برینەکانییەوە هەڵیدەگرێت و بەرەو ئەو شارە دەیبات. ئەوەی ئێستا جەلادەتی کۆتر لە بیرێتی ئەوەیە کە لە جێگایەکدا

دوو ئەسپی سپی چاوەڕوانیاندەکات، دوو ئەسپ کە بەرەو زەمینێکی ترو دونیایەکی تر دەیانبەن. بە ڕێگایەکی درێژدا کە تەنیا بە ناو مێرگ و سەوزایی و دەریاچەی سەیر سەیردا دەڕوات. زەوییەک زەمینی ڕاستی نییەو زەمینی خەیاڵیش نییە، سەر بە زەمین نییەو سەر بە غەیبیش نییە. شاروخی شاروخ بەدرێژایی ڕێگا ئەو ئاوازانەی بۆ لێدەدا کە ڕۆح بەبەری مردووەکاندا دەکەنەوە، کە زام چاکدەکەنەوە. لەو ڕێگایەدا بۆیەکەمجار جەلادەت دوای چەندین ساڵ پێیدەخستەوە سەر خاکی مۆسیقا، لەویادا دڵنیابوو پێی خستۆتە زەویەکی دییەوە کە جوگرافیایەکی تری هەیە. زامەکانی لەویادا هێدی هێدی وندەبوون، ئازارەکانی هێوردەبوونەوە، دەیتوانی ڕوناکی ڕۆژگارو سەردەمێکی دیکە ببینێت، بەدێژایی ڕێگا باڵندە سپییەکانی خۆی دەبینییەوە دووبارە بەسەر سەریدا دەفڕن، دوو ساڵ بوو باڵندەکانی خۆی نەبینیبوو، دوو ساڵ بوو تەنیا لە خەودا ئەو باڵدارە سپییانەی دەبینی کە پێشەنگی دەرکەوتنی ئەردێکی دیکە بوون... ئێستا بە هەزارەها بەسەر سەریدا دەفڕین. شاروخی شاروخی پێیدەگووت: جەلادەتی کۆتر ئەوە باڵندەکانی تۆن، ئەوە باڵندەکانی تۆن لە پێشمانەوە دەڕۆن بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان. جەلادەت ئێستا دەیتوانی لەسەر ئەسپەکەی دابەزێت و لەو کانییە سیحراوییانەدا ئاوێکی نوێ بخواتەوە، برینەکانی بشوات، چاوبنوقێنێت و لەزەت لە مۆسیقا ببینێت. شاروخی شاروخ وەک هەمیشە پتر لەوەی بەقسە بۆی بدوێت، بە مۆسیقا لەگەڵ جەلادەتدا دەدوا. دەڕۆیشتن و دەڕۆیشتن و ئاوازە جاویدان و پڕ ئەفسونەکەی شاروخ هەستی ونبوون و نوقمبوونێکی قووڵی لە ئەبەدییەتدا تیا دروستدەکرد. شەوێکیان هەر دووک لەسەر ئەسپەکانیان دەڕۆیشتن، دوای کۆمەڵێک ئاوازی سیحراوی جەلادەتی کۆتر لە شاروخی شاروخی پرسی: هاوڕێم ئەو شەوەی من تۆم لە شاری تەپوتۆزە زەردەکانی باشووردا بینی، تۆ دەتزانی من دەبینیت یان نا؟ چی تۆی لە شاری مۆسیقارە سپییەکانەوە

هێنیایەوە بۆ لای من؟. شاروخی شاروخ بە خەندەوە گووتی: جەلادەتی برام، من دەزانم تۆ ئێستا شوێنەکان و ئاراستەکان ناناسیتەوە، بەڵام ئەی دۆستی ئەزیزم، شاری مۆسیقاره سپییەکان بەشێکی تایبەتی هەموو شارەکان و شوێنەکانی دونیایە، وەک شاری سۆزانییە غەمگینەکان کە ئەویش دیوێکی تری هەموو شارەکان بوو، جەلادەت لە ناو هەموو شارێکدا چەندین شاری دیکە هەیە کە مرۆڤ لە ڕۆژە ئاساییەکاندا نایبینێت، ئەوانەی چاوێکی سادە و ڕۆحێکی سادەو خەیاڵێکی سادەیان هەیە نایبینن. من و تۆ لە بنەڕەتدا خەڵکی یەک شارین، هەردووکمان خەڵکی شاری مۆسیقاره سپییەکانین، ئەو شارەی کە شاری جوانییە مردووەکانە، ئەو جوانییە جاویدانەی چاوەڕوانی گەڕانەوە دەکەن. من لە هەر شارێکی دونیادا بم هەر لە شاری مۆسیقاره سپییەکانم، چونکە هیچ شارێک نییە لەسەر ئەم ئەستێرەیە پڕنەبێت لە جوانی کوژراو، هیچ شارێک نییە پڕ نەبێت لە ئاوازی کوژراو، لە شیعری کوژراو، لە تابلۆی خنکێنراو. هاووڵاتیانی ئەو شارە لە هەر کوێی زەمین بن یەکتری دەناسنەوە، چونکە شارێکە لەیەککاتدا لە هەموو جێگایەکە، هەر کەسەو لە ماڵی خۆی و شوێنی خۆیەوە دەتوانێت بیبینێت، گرنگ نییە تۆ خەڵکی چ کیشوەرێکیت گرنگ ئەوەیە کە گەر ویستت شاری مۆسیقاره سپییەکان ببینیت دەیبینیت، دەکرێت دوو مرۆڤ یەکێکیان لەمسەری زەمین بێت و ئەوی تریان لەوسەری زەمین، بەڵام لەهەمان کاتدا هەردووکیان لە شاری مۆسیقاره سپییەکاندا بن. شاری مۆسیقاره سپییەکان ئەو غونچانە لە نێویدا دەکرێنەوە کە بەر لە گەشانەوەیان لەسەر زەوی دەژاکێن، ئەو باغچانەی تێدایە کە لەسەر زەوی سەوز نەبوون، ئەو کتێبانەی تێدایە کە نەنوسراون یان نەخوێنراونەتەوە. ئەو نامانەی تیایە کە نەگەیشتوون بە خاوەنەکانیان. هەندێک کەس هەن هەر لەسەرەتاوە دەزانن کە ئەوان خەڵکی شاری مۆسیقاره سپییەکانن و هەندێکیش هەن نازانن. من کە لە بەرەکانی جەنگ هەستامەوە دەمزانی دەچم بۆ کوێ، ئەو کات منیش وەک

تۆ شاری مۆسیقارە سپییەکانم نەبینیبوو. بەلام جەلادەت دەبێت بزانیت ئەم شارە مۆسیقاری گەڕۆکی لەسەر هەموو ئەم ئەستێرەیە هەیە، من یەکێکم لەوانەی دەگەڕێم و نیشتەجێکانی ئەو شارە لە زەوی دەدۆزمەوە، ئەو کەسانە دەدۆزمەوە کە دەتوانن جوانی کوژراو لە دلی خۆیاندا هەلگرن و لەسەر زەوی زیندووییبکەنەوە.

جەلادەتی کۆتر لە هاوڕێکەی دەپرسی: شاروخی شاروخ ئەمشارە لە کەیەوە هەیە؟

شاروخی شاروخ بەسەر ئەسپەکەیەوە پێش دەکەوت و دەیگووت: ئەم شارە لەگەل لەدایکبوونی مرۆڤەوە لەسەر زەمین بوونی هەبووە، تا مرۆڤ پتر لە جوانییەکانی خۆی دووربکەویتەوە زیاتر لە شاری مۆسیقارە سپییەکانیش دووردەکەویتەوە... کەمتر دەیبینێت، کەمتر ئاماژەکانی دەناسێتەوە. تا زیاتریش لە جوانیدا نوقم بێت، زیاتریش لە دەرگاکانی ئەم شارە نزیک دەبێتەوە. ئەو شەوەی من بەرەو شاری مۆسیقارە سپییەکان بەڕێوەبووم، ئەوە تەنیا من نەبووم کە تۆم بینی، بەلکو تۆش منت بینی... تۆ کە ئیشتیاقێکی قوولت تێدایە بۆ یەککگرتنەوە لەگەل زەریای جوانییەکاندا، تۆ کە لە قوولایی ڕۆحتدا، لە قوولایی خەونەکانتدا ئیشتیاقێکی قوولت تێدایە بۆ دۆزینەوەی جوانییە ونبووەکانی خۆت. جەلادەت ئەوە تۆی ئەو مرۆڤانە دەدۆزیتەوە کە یارمەتیت بدەن بگەیتە شاری مۆسیقارەکان، تۆ بوویت منت دۆزییەوە، تۆ بوویت منت والێکرد بگەڕێمەوە بەدواتدا. ئەو مۆسیقارە مردووەی ناو تۆ بوو، منی بانگکرد، من بەدەنگ ئەو مۆسیقارە مردووەی ناو تۆوە هاتبووم... تۆ دەبێت بێیت بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان و ڕاسپاردەیەک وەرگریت و بیگەێنیتەوە دونیا... ئیتر ئەم ڕێگایە ڕێگای هەمیشەیی تۆ دەبێت، کە من تەنیا وەک دەلیل و یاریدەدەر لەگەلتدا دێم و دەچم. من دەلیلی تۆم جەلادەتی کۆتر... دەلیلی تۆم.

شاری مۆسیقارە سپییەکان شارێکە تا مرۆڤ نەچێتە ناوی

نازانێت چییە، شارێکی سپی بێسنووره کە مرۆڤ هەرگیز نازانێت لە چ دەروازەیەکەوە دەچێتە ژووری، لە نێو دەریایەکی بەریندایە لە گیای سەوز، مرۆڤ دەتوانێت ئەو شورا سپییە گەورەیە ببینێت کە لەهەر چوارلاوە ئابلۆقەیداوە، شورایەکی ناکۆتایە کە چەندە بە ناو شوێندا دەڕوات هێندەش بە ناو کاتدا تێدەپەڕێت، شورایەکی بێبڕانەوە کە هیچ بوونەوەرێک و مرۆڤێک و باڵندەیەک ناتوانێت بە چواردەوریدا بسوڕێتەوە، گەر یەکێک بتوانێت بە ئاقاری شوراکەدا بڕوات وەک ئەوەیە بە ئاقاری ئەبەدییەتدا بڕوات، گەر یەکێکیش بتوانێت هەموو ئەو شاره بگەڕێت وەک ئەوە وایە بە ناو خەون و جوانی و ئازاره کوژراوەکانی مرۆڤدا بەدرێژایی مێژوو بگەڕێت. هەر کەسێک بە سوار ئەو ئەسپە سپییانەوە بگاتە ئەو شاره سەرەتا دەبێت لە یەکێک لەو بەرزاییە بێشومارانەی دەوروبەرییەوە سەرکەوێت و لەسەرەوەڕا سەیری ڕووبەری ناکۆتای ئەو شارەبکات کە لە هەموو شارەکانی تری دونیا گەورەتره، شارێکە مرۆڤ دەتوانێت سەرەتاکەی ببینێت، دەتوانێت بەردەمەکەی ببینێت بەڵام هەرگیز ناتوانێت بزانێت لە کوێدا تەواودەبێت. زەریایەکی سپییە کە تا بەرەو ئەوسەری بڕۆی درێژتردەبێتەوە، نیگارەکانی کاڵتردەبنەوەو هێدی هێدی لە تەمێکی سپی سپیدا نوقمدەبن کە تەمی بێتوانایی ئینسانە لەسەر تێگەیشتن لە مانای هەموو جوانییەک و حاڵیبوون لە قووڵایی هەموو ئازارێک. جەلادەت لە یەکێک لەو بەرزاییانەوە بۆ یەکەمجار ئەو ئۆقیانوسە سپییەی بینی کە لەیەک کاتدا دەیان هەزار باڵداری سپی بە ئاسمانەکانیدا دەفڕین. شارێک وەک ئەوەی بە هێمنی هەڵمێکی ئەفسوناویی لێهەستێت، وەک ئەوەی سروەیەکی فێنک لەوێوە لەگەڵ خۆیدا مۆسیقایەکی قەشەنگ بە هەوادا بهێنێت وەهابوو. بینینی ئەو شاره بەسبوو مرۆڤ هەست بە سەرهەڵدانی جۆره خرۆشێکی گەوره لە ڕۆحی خۆیدا بکات، هەست بە گێژییەک بکات و پێیوابێت لەو ساتەوە کە خانووبەرەو شەقام و کوچەکانی ئەو شاره

دەبینێت ئیدی بە مەستی بەسەر زەمیندا دەڕوات.

چوونە ناو ئەو شارەوە وەک چوونە ناو بەهەشت وەهابوو، شارێک بوو هیچ فریشتەیەکی تیا نەبوو، مرۆڤ خۆی تەنیا فریشتەی ئەو شارەبوو. کە لەدەروازەکان چوون بەودیودا، جەلادەت جلە دڕاو و کۆنەکانی داکەندو دەستێک جلی سپی لەبەرکرد. ئێستا بەڕاستی لە باڵندەیەکی سپی دەچوو، لە چوونەناوەوەدا جەلادەتی کۆتر ئەو باڵەخانە سپییە قەشەنگانەی بینی کە لە هێمنی و ئارامییەکی قووڵدا نوقمبووبوون، سەرەتا لە ناو باغە سەوزەکاندا تیپێک ئەندازیاری بینی کە بە جلە سپییەکانیانەوە لە دروستکردنی کۆشکێکی تازە تێدەفکرین، کەمێک دوورتر لە باغێکدا ئەو فوارانەی بینی کە لەگەڵ هەڵقولانیاندا مۆسیقا دەهاتەدەرێ. شاروخی شاروخ گووتی: جەلادەتی کۆتر بەخێربێیت بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان. ئێرە شاری ئەو جوانییانەیە کە ژیان لەوە بچوکتربووە جێگایانبکاتەوەو مردنیش لەوە لاوازترە لە باوەشیان بگرێت. ئێستا مامۆستاکەمان چاوەڕوانتدەکات. دەبێت بڵێم ئەو منی نارد بە دوای تۆدا، ئەو منی ڕاسپارد بێم و تۆ بدۆزمەوە.

جەلادەت بێئەوەی هیچ بڵێت تەنیا سەیری ئەو هەورە جوانانەی دەکرد کە بە نزمی بەسەر سەریدا دەڕۆیشتن، سەیری ئەو کچە مۆسیقارانەی دەکرد کە لە هەوادا دەفڕین، سەیری ئەو پەپولانەی دەکرد کە لە دڵی پەیکەرێکی سپی دەهاتنەدەرێ و لە دەلاقەیەکی دیکەوە دەچوونەوە ژوورێ. سەیری ئەو کۆترانەی دەکرد کە بە جۆرێکی بازنەیی بەدەوری درەختێکدا دەسوڕانەوەو لە ناو گەڵاکانیدا وندەبوون و لەوسەر لە کەلێنێکی دییەوە دەهاتنەدەرێ. پاش کورتەڕێیەک چوونە بەردەم کۆشکێکی سپی، بە هێمنی بەسەر پلەکەیەکدا سەرکەوتن، هەموو شتێک بۆنی ئاسوودەیی و هێمنی و ئارامی لێدەهات، بێدەنگییەکی ئاسمانی کە بێدەنگی ئەو ڕۆحە جوانانەیە کە لە مۆسیقادا مەلەدەکەن هەموو شتێکی داپۆشیبوو. جەلادەتی کۆتر، پرسی: هاوڕێم ئەم مامۆستایە ناوی چییە.

شـاروخی شـاروخ جەلادەتـی بـردە ژووریکـەوەو لـە بـەر ئاوێنەیەکـدا ڕایگـرت، جلەکانـی بـۆ چاککـردو قـژی بـۆ داهێنـا و بـەدەم ئـەو شـتانەوە گووتـی: ئێسـتا دەیبینیت و خـۆی نـاوی خۆیـت پێدەڵێت، دەبێـت وریابیـت... دەبێـت زۆر وریابێـت و بـە ئارامـی گـوێ لـە قسـەی مامۆسـتاکەت بگرێـت. مـن تـا ئێرە دەلیلی تـۆ بـووم ئیشـی مـن ئەوەیە لە نێوان شـاری مۆسـیقارە سـپییەکان و مەملەکەتـی خۆتـدا بتهێنـم و بتبـەم، تـا ڕۆژێـک دەتوانیـت بـێ هیـچ کۆمەکێـک لـە نێـوان ئـەم جیهانانـەدا هاتوچۆبکەیـت. مـن یاریـدەدەری تـۆم، بـەلام لێرە لـە شـاری مۆسـیقارە سـپییەکاندا مامۆسـتا گـەورەکان خۆیان لەگـەڵ قەقنەسـەکاندا دەگەڕێـن، ئـەوە ئیشـی ئەوانـە، ئـەوان دەبـن بـە دەلیلـی تـۆ. مـن لێـرەوە تـا ڕۆژی گەڕانـەوەت چاوەڕێدەکـەم و فلووتەکـەم لێدەدەم، بـەلام لـە گەڕانەوەتدا منیش ڕاسـپاردەیەکی بچوکـم هەیـە کـە پێتـی دەسـپێرم. بیرت نەچێت مێخەکانیشت لای منن، مێخەکانی تـۆ، ئـەو مێخانـەی کـە دەبێت وەک شـاهیدێکی مـەرگ هەڵیانگرێـت.

جەلادەتـی کۆتـر هێشـتا لـە گوێگرتـن و سـەیرکردنی ئـەو دونیـا بێدەنگـە سەرسـام بـوو کـە جگـە لـەو جوانییـە قـووڵ و نهێنییـەی لـە هیچـی تـر حاڵـی نەدەبوو. پێکـەوە لەگـەڵ شـاروخی شـاروخدا چوونـە بـەر دەرگایەکـی سـپی، شـاروخ بـە هێمنـی لەدەرگایداو پـاش ئێسـتێک دەنگێـک لـەو دیـو دەرگاکـەوە گووتـی: بـا جەلادەتـی کۆتـر بێتـە ژووریَ.

لەویـادا شـاروخی شـاروخ ماچیکـردو گووتـی: هاوڕێـی خۆشەویسـتم، بـە زووتریـن کات یەکتـری دەبینینـەوە. وایگـووت و وەک ئەمیرێکـی بـە ویقـار ملـی بـە دڵۆپـە خوێنەکانـی خۆیـەوە دانەواند و گووتـی: تـا دیدار ئـەی دۆسـتی ئەزیـز. جەلادەتیش بـە هێمنییـەوە گووتـی تـا دیدار و بـە هێمنـی دەرگاکـەی کـردەوە.

ژوورێکی گـەورە بوو، پەنجـەرەکانی بەسەر باغێکی سەوزدا دەیانڕوانی. لـەوێ بـوو، بـە هەمـان نیگای غەمگینـەوە، بـە هەمـان ڕوانینـی سـەیرەوە بۆ

ئاسۆیەکی دوور... خۆی بوو، لەگەڵ دواهەمین ئێوارەو دواهەمین شەوی مردنیدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو، جگە لە زەردەخەنەیەکی غەمگین هیچ نیشانەیەکی دیکە لەسەر ڕوخساری نەبوو. ئیسحاقی لێوزێڕین بوو، ئەو مامۆستایەی دەبایە جەلادەت شەوێک لە شەوان لەگەڵیدا بمردبایە، بەلام ئێستا هەردووکیان لە جێگایەکی دیکەدا یەکتریان دەبینییەوە. لەسەر کورسییەکی سپی دانیشتبوو، کە جەلادەتی کۆتری بینی هەستاو گووتی: خۆشحالم کە دەتبینمەوە، من پەیمانم دایتێ کە یەکتر دەبینینەوە، دەمزانی چەند ساڵ بڕوات، چەند دیوار لە نێوانماندا بێت، چەند شارو چەند زەمین لە یەکترمان دووربخاتەوە ئێمە دووبارە یەکتر دەبینینەوە.

هەستاو باوەشی پیاکردو گووتی: جەلادەتی کۆتر هێشتا بۆنی ئەو ڕۆژە دێرینانەت لێدێت کە هێدی هێدی یادگارەکانیان لە خەیاڵی مندا کاڵدەبێتەوە.

جەلادەت باوەشی بە مامۆستاکەیدا کرد. چاوەڕوانی ئەوە نەبوو لە بەر دەرگاکانی ئەم شارەدا ئیسحاق بدۆزێتەوە. ئیسحاقی لێوزێڕین ئەو پیاوەی هەمیشە لە خەیاڵیدا زیندووبوو. هەرگیز لە ڕۆحیدا نەمردبوو. پاش ئێستێکی سەرسوڕمان لەسەر دوو کورسی بەرابەری یەک دانیشتن و جەلادەت گووتی: مامۆستام، من هەرگیز تۆم فەرامۆشنەکرد، هەرگیز، بۆ هەر جێگایەک چووبم، هەرچییەکم کردبێت، هەر ژیانێک ژیابێتم، تۆم یادنەکردوە. من لە شاری تەپوتۆزە زەردەکان تۆم لە خەیاڵدابوو، لەو ڕۆژانەدا کە سامناکترین جەنگ لەسەر زەوی دەستی پێکرد بە ناو تارمایی و ترس و تەنهاییدا دەسوڕامەوەو تۆم دەبینی، هەتا بەر لە نغرۆبوونی ئەو شارەش لە خەراباتی پرتەقاڵی سپیدا تۆو سەرهەنگ قاسمم بینی، من یادگارەکانی تۆم لەگەڵ خۆمدا برد بۆ کەمپی ئاوارەکان، یادگارەکانی تۆم لەگەڵ خۆمدا برد بۆ ئوتێلێکی سووتاو، مامۆستا من قووڵ شەرمەزاری تۆم، من شایستەی ئەوە نیم کە ڕووم بەرابەر تۆ هەڵبڕم و چاوم بەرابەر تۆ بەرزبکەمەوە، من هەموو ئەو زانست و زانیاری و جوانییانەم لە خۆمدا

کوشت کە تۆ فێرتکردم، من ئێستا هیچ نیم جگە لە مۆسیقارێکی ئیفلیج. شەرمدەکەم کە ڕەنجی تۆم بەبادا، بەڵام تەنیا شتێک لە ژیانمدا جورئەت و هێزی ئەوەم دەداتێ قسەبکەم ئەوەیە کە هەرگیز لەو کەسەم نەبوری کە ئێوەی کوشت... وەک هەر ڕۆحێک کە مۆسیقا فێری عەدالەتی کردبێت، دەرهەق بە گوناهە بێشومارەکانی لاواز نەبووم. ئەو خۆی دادی خۆی کرد و جەزای خۆی بینیی. بەڵام مامۆستا لەو ساتەوەی کە تۆ منت جێهێشت زیندەگیم تەلیسمێکی بێوێنەیە، ژیانم لەو وێنە ئاڵۆزە دەچێت کە نوختە لە دوای نوختە هێڵەکانی دەگەێنمەوە بە یەک و جار دوای جار سەیرتر دێتە بەرچاوم. ئازاری گەورەو دوورو درێژم بینی، دواجار من وەک دزە ڕووت و ڕوجاڵ و ڕیسواکان لە گەلییەکی دووردا لە خاچیاندام، مێخەکانم، مێخی سەر سینەو سەر دەستم لای ئەو مۆسیقارەیە کە یارمەتیدام بگەمە لای ئێوە، من ڕاستەوخۆ لە مردنەوە بەرەو لای تۆ هاتووم... بێئەوەی بزانم لە کوێم، بێئەوەی بزانم زیندووم یان مردووم، بێئەوەی بزانم من چیم یان دەبم بە چی.؟

جەلادەت وەک هەمیشە لەبەردەم ئیسحاقدا قوتابییەکی چکۆلانەبوو. ئیسحاقی لیۆزێرین بە هەمان زمانی سیحراوی خۆی کەوتە قسە، وەک ئەوەبوو لە قووڵایی ڕابوردووی جەلادەتەوە هاتبێتەدەرێ و بدوێت، وەک ئەوەبوو چەندین ساڵبێت لە جێگایەکی دیکەوە خەبەرداری هەموو ژیانی ئەم قوتابییە غەمگینە بێت کە ئێستا بە زامداری دەگەڕایەوە، گووتی: جەلادەت تۆ ئێستا زۆر شت دەزانیت، لە زۆر نهێنی تێگەیشتوویت. تۆ لە منداڵییەوە بۆ ئەوە لەدایکبوویت کە ڕۆژێک بگەیتە ئەم شارە. سەرتاپای ژیانی تۆ چیرۆکی سەفەری تۆیە بۆ گەیشتن بەم سەرزەمینە. ئەو ڕێگایەی تۆ پیایدا تێپەڕیویت، ئەو شەقامە پێچاوپێچەی کە تۆی بەرەو ئێرە هێنا، تەنیا ڕێگایەک بوو کە دەبایە بە هەموو لاڕێکانیدا تێپەڕیت تا دەگەیتەوە لای من. هەموو ئەو شوێنانەی تۆ بەناویدا گوزەرتکردوە، بەشێکی بچوکی

ئەم شارە بوون، دەروازەیەک و ڕێگایەک بوون تەریب بەم هەرێمە. تۆ کاتێک لە شاری سۆزانییەکاندا ونبوویت، لە بەشێکی بچوکی ئەم شارەدا ونبوویت، لە شوێنێکدا ونبوویت بێئەوەی مرۆڤێک یان ڕۆحلەبەرێک بزانێت ڕێگایەکی باریک بەم شارەوە دەیبەستێتەوە، شاری سۆزانییە نائومێدەکان، شاری مۆسیقارە کوژراوەکان، ئەو پارچە زەوییەی من و تۆ لەسەری کوژراین، ڕێگایەکە مرۆڤ گەر بیەوێت دەتوانێت لەوێوە بگاتە شاری مۆسیقارە سپییەکان. گرنگ نییە ئاخۆ سەرنشینانی ئەو شارە دەزانن یاخود نا. گرنگ ئەوەیە ئەو شارە چکۆلە تۆزاوییە شوێنی کۆبوونەوەی ئومێدو خەونە کوژراوەکانی مرۆڤ بوو، شوێنی هەڵهاتنی مرۆڤ بوو لە مردن، شوێنی ئەو مۆسیقارانە بوو کە لەویادا مۆسیقارەکانی ناو خۆیان دەکوشت، شوێنی ئەو کچانەبوو لەویادا پاکی خۆیان دەکوشت. شتێک جەلادەتی کۆتر کە تۆ هەرگیز لە شاری سۆزانییەکان نەتبینی ئەوەبوو کە دەستبەرداربوونی کچان لە پاکی خۆیان، کوشتنی کچان بۆ فریشتەکانی ناو خۆیان، وەک دەستبەرداربوونی تۆ وابوو لەو مۆسیقارەی ناو ڕۆحت. تۆ دەتتوانی فریشتەکانی دالیا سیراجەدین ببینیت، چونکە فریشتەکانی ناو دالیا هەمیشە زیندووبوون، وەک چۆن ئەو مۆسیقارە ڕاستەقینەیەی ناو تۆ هەرگیز نەمردووە، هەرگیز فریشتە پاکەکانی ناو دالیاش نەمردبوون، لەبەرئەوە تۆ دەتتوانی بیبینیت، ئەویش دەیتوانی تۆ ببینێت. جەلادەتی کۆتر، پێت سەیر نەبێت کە تۆ لەویادا شاروخی شاروخ دەناسیت، دەبایە لەویادا بیناسیت چونکە دەبایە شاروخی شاروخ لەوێوە بێت. وەک چۆن تۆش لەوێوە هاتی، وەک چۆن تۆ لە هەمان شارو هەمان زەمینی سەرابی و ئاوێنەییدا بۆ یەکەمجار پێت خستە سەر یەکەمین گوزەری ئۆقیانوسی هاوارەکانەوە. جەلادەتی کۆتر. ئۆقیانوسی هاوارەکانیش بەشێکە لەم شارە، بەشێکە لە شاری مۆسیقارە سپییەکان بەلام لەسەر زەوی، ئەوانەی لە ئۆقیانوسی هاوارەکاندا ئیشدەکەن هیچ نین

جگە لە بەشێک لە تۆڕێکی مەزن کە تەواوی خەون و ئومێدو جوانییە بەباچووەکانی مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو پێکەوە گرێدەداتەوە، تۆڕێک کە شاری مۆسیقارە سپییەکان بەشێکیتی، ئوتێلی گێلاسی سپی بەشێکیتی، باغچە چکۆلانەو ًغەمگینەکەی بەرابەر بە گێلاسی سپی بەشێکیتی، شاری زەردی سۆزانییەکان بەشێکیتی، ئۆقیانوسی هاوارەکان بەشێکیتی. بەلام چەند شاری واهەیە، چەند ڕێگای واهەیە مرۆڤ دەتوانێت لێوەی بەرەو شاری مۆسیقارە سپییەکان بکەوێتەڕێ؟ ئەوەیان هیچ مرۆڤێک نازانێت. وەک چۆن هیچ مرۆڤێکیش نازانێت شاری مۆسیقارە سپییەکان خۆی چەند گەورەیە.

جەلادەت کە بەسەرسامییەوە گوێیدەگرت، ئێستا لەبەر ڕۆشناییەکی تازەدا هەموو ژیانی خۆی دەبینی، دەیپرسی: ئەی نهێنی ئەو تابلۆیە چییە؟ نهێنی تابلۆی شاری مۆسیقارە سپییەکان؟

ئیسحاق دەیگووت: هەموو شتێکی زیندوو هاواردەکات، هەموو شتێکی زیندوو کە ژیانی تێدایەو دەیەوێت بژی دەبێت هاواربکات. هاوار ئەو سیفەتە سەیرەیە کە ژیان لە مردن جیادەکاتەوە، مرۆڤ لەوساتەوە کە لە هاوارکردن دەوەستێت، مردووە. ئەو تابلۆیانە هاواری ئەم شارەن، شارێک لە مێژە چۆتە شەڕێکی گەورەوە لەگەڵ مردندا. تابلۆی شاری مۆسیقارە سپییەکان بانگەوازی جوانییەکانە، نیشانەیەکە لەو نیشانانەی هەندێجار قەقنەسەکان دەیبەن تا ئەو تۆڕە گەورەیە بچنن کە بەسەر شوێن و زەماندا بازدەدات و هەموو پاسەوانەکانی جوانی بەیەکەوە گرێدەدات، عاشقە لێکدابڕاوو خۆشەویستییە کوژراوەکان پێکەوە گرێدەدات، ئەو تابلۆیە بەشێکە لە ڕێگایەکی ئاڵۆز، هەر قەقنەسێک لێرەوە دەگەڕێتەوە دەبێت ئەو تابلۆیانە بگەیێنێت، دەبێت شەوێک لە تاریکیدا لە دەرگای پاسەوانەکانی پاشەڕۆژ بدات و ئەو تابلۆیانە بەرێت. ئەم تابلۆیە دەبێت تەنیا دەستێکی عاشق دروستیبکات. دەستی مرۆڤێکی پڕ هیوا کە باوەڕی

بە یەککگرتنەوە هەیە، جەلادەت ئێرە تەنیا شاری جوانییە کوژراوەکان نییە، بەڵکو شاری ئەو مرۆڤانەشە کە باوەڕیان بە هیواکانی خۆیانە. سەیرکە ئەو تابلۆ چکۆلانەیەی تۆ کە دەستی کچێک لە «شەقامی خانمە عاشقەکان» دروستیکردوە، لە یەککاتدا تۆ و موسای بابەک و مستەفای شەونم و چەندانی دیکەش پێکەوە گرێدەداتەوە، گرێیەک لە سنورەکانی کات و بەربەستەکانی شوێن قایمترە. ئەو تابلۆیە بوو تۆی بە ئاگاهێنایەوە، بە تۆی گووت ئەمە ڕێگای خاکێکی ترە پیادەڕۆیت، ئەمە بۆنی سەرزەمینێکی ترە تۆ لێی نزیکدەبیتەوە، ئەمە ئەو تۆڕە مەزنەیە کە سەرتاپا ئێمە پێکەوە گرێدەدات.

جەلادەت و ئیسحاقی لێوزێڕین سەیری یەکیان دەکرد، پێدەچوو هەرگیز لە یەکدی جودا نەبووبێتنەوە، وەک ئەوەی بەدرێژایی ئەو چەند ساڵە ئیسحاق لە ناو جەلادەتی کوتردا ژیابێت، هەموو شتێکی لەسەر ژیانی جەلادەت و هەستەکانی دەزانی. وەک ئەوەی ئیسحاق و ئەم شارە هەمووی بەشێک بن لە نهێنی خۆی، لە قوولایی بێبنی خۆی کە جەلادەت لە جێگایەکی دیکەدا و بە جۆرێکی دی دەیدۆزینەوە... جەلادەت وەک یەکێکی مەست، وەک ڕۆحێک ئەو هەموو بۆنە بەهەشتییەی درەخت و گوڵەکانی دەوروبەر خوماریانکردبێت، دەیپرسی: مامۆستام، من دەمەوێت لە هەموو شتێک تێبگەم، دەزانم مرۆڤ هیچ کاتێک لە هەموو شتێک تێناگات، بەڵام مامۆستام ببورە کە من تا ئێستا هەر وەک قوتابییەک پرسیاردەکەم، ئەی مامۆستای ئەزیزم، قەقنەس... قەقنەس چییە، بۆ دەبێت من قەقنەس بم، بۆ؟

ئیسحاق بە هەمان نیگای پڕ نهێنییەوە دەیگووت: جەلادەت تۆ دەبێت لە هەموو شتێک تێبگەیت، تۆ تەنیا کەسیت کە دەبێت هەموو ئەم چیرۆکە بگێڕیتەوە، تۆ مەحکومی بەوەی ئەم چیرۆکە بگێڕیتەوە، یەکێک لە وەزیفەکانی تۆ ئەوەیە حەقیقەت بزانیت. قەقنەس کەسێکە لە نێوان مردن و

ژیاندا یاریدەکات، کەسێکە دەتوانێت بێت بۆ شاری مۆسیقاره سپییەکان و بگەڕێتەوە، ڕۆحێکە لە نێوان جوانییە کوژراوەکان و دونیادا هاتوچۆدەکات. قەقنەس هەیە تەنیا وەکو ڕۆحێکی وێڵگەرد دەگەڕێت و جوانی خەوتووی ناو مرۆڤەکان بەئاگا دێنێتەوە، ئەو جوانییانە زیندوودەکاتەوە کە شەڕو خراپەو ناشیرینی لە مرۆڤدا کوشتوونی، قەقنەسیش هەیە تەنیا کۆمەک بەوانی دیکە دەکات، ئەو چیرۆکە دادەڕێژێت و دەینوسێت کە ئەوانی تر پێویستیان پێیەتی، ئەو ڕێگایانە پێکولدەکات کە ئەوانی تر دەبێت پیایبڕۆن. جەلادەت وەزیفەی تۆیە بڕێک لە جوانییە کوژراوەکان، لە ئاوازە کوژراوەکان، لە کتێبە کوژراوەکان، لە تابلۆ کوژراوەکان بگێڕیتەوە بۆ جیهان. بەلام قەقنەس تەنیا مۆسیقا و شیعر ناباتەوە، ئەو باڵندەیە نییە کە تەنیا جوانی دەباتەوە، بەڵکو تۆ هاواری ئەو کوژراوانەش دەبەیتەوە کە لێرە چاوەڕوانتدەکەن، شاری مۆسیقاره کوژراوەکان تەنیا شاری جوانییە کوژراوەکان نییە، بەڵکو شاری هەموو حەقیقەتێکی کوژراوە، هەموو دەنگ و هاوارێکی کوژراو، هەموو پاکییەکی کوژراو. جەلادەتی کۆتر چەندەها ساڵ جارێک قەقنەسێک دێت بۆ ئەم شارە، ڕۆحێک پاسەوانەکانی جوانی پەروەردەیدەکەن، یەکێک لە نێوان هەزاران ڕۆحدا بۆئەوە لە دایکدەبێت کە مۆسیقا، شیعر، حەقیقەت ڕزگاربکات. خۆت دەزانیت کە زەوی پڕە لە پاسەوانی دڵسۆز بۆ مۆسیقا و تابلۆو جوانی، تۆ خۆت بەر لە دوو ساڵ بە ئۆقیانوسی هاوارەکاندا سەفەرتکرد، گەنجینە نهێنی و هەڵگیراوەکانی جوانیت لەو ولاتەدا بینی. جەلادەت بەلام هەندێک ئاواز هەیە زەوی پێویستی پێیەتی، هەندێک کتێب هەیە ئینسان لە گەشتی خۆیدا لەسەر زەوی ناتوانێت دەستبەرداری ببێت، حەقیقەت هەیە گەر ونبێت مانای ژیان دەکەوێتە مەترسییەوە. پاسەوانەکانی جوانی ناتوانن هەموو شتێک ڕزگاربکەن، من کە هاتم بۆ ئێرە هێشتا هەزارەها ئاواز لە دڵمدا بوو، تۆ کە مۆسیقات لە بیرخۆت بردەوە پڕبوویت لە مۆسیقایەکی نەمر،

سەیرکە جەلادەت ئەمشارە سپییە پڕە لە ئاواز کە هیچ کەس نەیتوانیوە ڕزگاریانبکات، پڕە لە شیعر کە هیچ کەس نەیتوانیوە دەستبەرێت و لە مەرگ دەریانبهێنێت. پڕە لە تابلۆ کە دەبێت هەندێکیان بگەڕێنەوە بۆ سەر زەوی. بەڵام جگە لەوانە، ئەم شارە پڕە لە قوربانی بێگوناه، جەلادەت مرۆڤ خۆی گەورەترین و پاکترین جوانی کوژراوە، ئیشی قەقنەس ئەوەیە هاواری ئەوانە، دواهەمین قسەیان، دواهەمین نامەیان بباتەوە بۆ جیهان. بەر لە چەند ساڵ خانمێک قەقنەس بوو، خانمێک بە شەوانی تاریک تابلۆی «شاری مۆسیقارە سپییەکان» ی دەبرد بۆ خاوەنەکانیان، یان تابلۆکانی دەخستە سەر ئەو ڕێگایەی دوای تێپەڕین بە گمۆکەیەکی ئاڵۆزدا دەگەیشتنە دەست ئەو کەسەی عاشقێتی. نامەی مرۆڤە کوژراوەکانی دەبرد، بەڵام جەلادەتی کۆتر لە مێژە لەم شارەوە پەیامنێرێک نەکەوتۆتە ڕێگا، بۆئەوەی لێرەوە، لەم سەر سنوورە ناسکانەی نێوان ژیان و لە ناوچوونەوە حەقیقەت بباتەوە. هیچ کات لە مێژووی ئەم هەرێمە گەورەیەدا کە ئێمە تیاژیاین بە ئەندازەی پازدە ساڵی ڕابوردوودا جوانی نەکوژراوە، من دەزانم ئەرکێکی چەندە سەختە، ئەرکێکی چەندە کوشندەیە مرۆڤ لە نێوان مردن و ژیاندا هاتوچۆبکات، تا لە ساتێکدا ئیتر وندەبێت و ڕێگاکان نادۆزێتەوە، بەڵام هەزاران مرڤ لێرە چاوەڕوانی تۆن هاوارەکانیان ببەیتەوە، نامەکانیان ببەیت بۆ هاوڕێکانیان، بۆ دۆستە نزیکەکانیان، دەیان مۆسیقار چاوەڕوانن تۆ ئاوازە کوژراوەکان بگێڕیتەوە بۆ جیهان، دەیان تابلۆی جاویدان چاوەڕوانتدەکەن، دەیان شیعر کە تۆ دەستنوسەکانیان دەبەیتەوە بۆ ئۆقیانوسی هاوار، بۆ شوێنێکی ئەمینَ لەسەر زەوی تا ڕۆژێک دێت هەموو مرۆڤایەتی، هەموو ڕۆحلەبەرە هوشیارو جوانناسەکان دەیبینن. لەم شارە سپییەدا، شارێک کە پاکییە جاویدان و هەمیشەییەکەی مرۆڤی هەڵگرتووە، ئەو کەسانە چاوەڕوانتدەکەن کە لە بەرچاوی تۆ لە بیابانەکاندا زیندەبەچاڵکران، ئەو سەربازانە چاوەڕوانتدەکەن کە بەر لەوەی

دوا نامەی خۆیان بنێرن بۆ ژنەکانیان کوژران... تۆ پەیامنێری هەموومانیت، تۆ جارێک لە بری هەموومان گەڕایتەوەو ئێستاش لە بری هەموومان دەڕۆیتەوە بۆ ژیان.

* * *

شتەکان لەسەرەتاوە تا کۆتایی لە خەون دەچوون، بەڵام من ڕام وایە هەموو ژیانێک لە خەون دەچێت. هیچ ژیانێک نییە لە خەون نەچێت، هێند هەیە دەبێت چاو لێکبنێین و بە وردی تەماشای ئەو ڕێگا سەیرەبکەین کە بڕیویتی. جەلادەتی کۆتر لە شاری مۆسیقارە سپییەکاندا لە کەسێک دەچوو لە ناو خەونێکی قووڵی خۆیدا ونبووبێت، دواتر بە ڕێگاوبانی ئەو ونبوونەدا بچێتە ناو خەونێکی ترەوە، لەویشدا دیسانەوە ونببێت و خۆی لە خەونێکی تردا بدۆزێتەوە کە ئەویش جارێکی دی ونیدەکات، بە جۆرێک دواجار نازانێت لە چ دەرگایەکەوە دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ حەقیقەت، چونکە هێندەی لە خەونێک دەچێتە دەرەوە خۆی لە خەونێکی تردا دەدۆزێتەوە. گەر ژیان خۆی خەون بێت، بێگومان تەواوی سەفەری مرۆڤ دەبێتە جۆلانێ لە ناو کۆمەڵێک خەوندا کە سەرەتا مرۆڤ لە هەر یەکێکیاندا پێیوایە حەقیقەتی دۆزیوەتەوە. ئیسحاقی لێوزێڕین ڕای وابوو کە سەفەری جەلادەت لە شاری مۆسیقارەکاندا شتێکە لەو جۆرەیە، واتە وەک ئەوەیە لە ناو کۆمەڵێک ژووردا ونبووبێت، کە لە سەر هەر دەرگایەکیان نوسرابێت حەقیقەت، وەلێ هەر کاتێ دەرگای ئەو ژوورە دەترازێنێت و دەچێتە ناوی دەبینێت جۆرێکە لە خەون. ئەگەر یەکێک لەو ژوورانە ژیان خۆی بێت، ئەوا شاری مۆسیقارە سپییەکان ژوورێکی ترە، ئەوا مردن ژوورێکی ترە، ئەوا دۆزەخ یان بەهەشت ژوورێکی ترن، بێئەوەی مرۆڤ هەرگیز بتوانێت دڵنیابێت لە کام یەک لەم ژوورانەدا لە ناو حەقیقەتدایە.

ئەو دەمەی ئیسحاقی لێوزێڕین جەلادەتی کۆتری برد بۆ بینینی شاری مۆسیقارە سپییەکان، جەلادەت لە کەسێک نەدەچوو تەنیا لە نێوان ژیان و مردندا ونبووبێت، بەڵکو لە باڵدارێک دەچوو لە نێوان حەقیقەت و خەیاڵدا قەتیس مابێت. شاری مۆسیقارە سپییەکان، شارێک بوو وەک خەون پڕ لە شەقامی ڕۆشن کە هەرگیز خۆر تێیدا ئاوا نەدەبوو، پڕ لە کوچەی تەسکیش کە شەویان کۆتایی نەدەهات، پڕ لە درەخت کە لە بەهارێکی جاویداندا نوقمبوون، پڕیش لە درەخت کە لە گێژەنی پایزێکی هەمیشەیی دەرنەدەچوون. هەندێجار جەلادەت گەردەلوولی گوڵی سپی دەبینی لە ئاسماندا و هەندێجاریش بەسەر شەقامێکدا تێدەپەڕی تا ناکۆتا بە هەوردا تێدەپەڕی. شەقامەکان هەموو ناوی سەیریان هەبوو کە ئیسحاقی لێوزێڕین دەیگووت: ئەم ناوانە ناوی منن، هەموو مرۆڤێک لێرە خۆی بە ویستی خۆی، شوێنەکان و شەقامەکان و باغچەکان ناودەنێت، هەتا ناوی «شاری مۆسیقارە سپییەکان» یش ناوێکە دەکرێت مرۆڤ دەستبەرداری بێت و ناوێکی دیکەی لێبنێت کە خۆی دەیەوێت، مرۆڤ لێرە ئازادە چۆن درەختەکان بانگدەکات و بە چ زمانێک قسەدەکات، ئازادە چ ناوێک بۆ خۆی و شتەکان هەڵدەبژێرێت.

پێکەوە دەکەوتنە ئەو گەشتەی دەرهەق بە حەقیقەت جەلادەتی قەقنەسی دەگەیاندە یەقین. لە شەقامی «فرمێسکی کەمانچە» دا جەلادەت دەیان کەمانچەژەنی غەمگینی بینی لە پەنجەرەی ماڵەکانیانەوە سەریان دەرهێنابوو کەمانیان دەژەند، دەیان مۆسیقاری بینی لە باڵکۆنەکانی خۆیاندا چووبوونە سەر مێزەکانیان و بە جلی سپییەوە خوماری ئاوازی خۆیان بوون، هەندێکیان وەک پەیکەر وەستابوون و مۆسیقایان لێدەدا، بە دەیان بەرابەر یەک لەسەر شۆستەکان بەدەم ئاوازەوە سەیری ئاسمانیان

دەکرد و دەڕۆیشتن، هەندێکیان دەیانتوانی بفڕن و بنیشنەوە، هیچ کەسێک سەیری ئەوی دیکەی نەدەکرد. هەر مۆسیقارەو شتێکی دەژەند جیاواز لەوی دیکە، هەر مۆسیقارەو لە جیهانێکدا مەلەیدەکرد لە جیهانی ئەوانی دی نەدەچوو. لەگەڵ ئەوەشدا جەلادەت دەیتوانی گوێی لە ئاوازەکانیان بێت، دەیتوانی دەنگی هەر ئامێرەو لەوی دی جیابکاتەوە، بەلام ئەوەی لای جەلادەت نهێنی بوو ئەو هارمۆنییەتە سەیرە بوو کە تەواوی ئاوازە جوداکان پێکەوە دروستیاندەکرد.

ئیسحاقی لێوزێڕین بە جەلادەتی دەگووت: بچیت بۆ هەر شوێنێک، بە هەر شەقامێکدا بڕۆیت، ئەوە تۆیت بڕیاردەدەیت چ ئاوازێک هەڵگریت و بیبەیتەوە بۆ زەوی.

جەلادەت گوێی دەگرت و لە کۆتایی شەقامەکەدا دەگریا، ئاوڕی لەو هەموو ئاوازە جاویدانە دەدایەوەو دەیزانی هیچ ڕۆحێک نییە ببێت بە هەڵگری ئەو هەموو جوانییە، لە کۆتایی یەکەم شەقامدا دەیزانی توانای مرۆڤ لەسەر تێگەیشتن و ڕزگارکردنی ئاوازە نەمرەکان هەمیشە و هەمیشە بچوکترە لە گەورەیی ئۆقیانوسی جوانییەکان. مرۆڤ هەرچییەک بکات ناتوانێت هەموو شتێک ڕزگاربکات. قسەکانی موسای بابەکی دەهاتەوە یاد دەربارەی ڕەشەبایەکی ترسناک کە هەڵدەکات و کارە مەزنەکانی مرۆڤ بەرەو مەرگ و لە یادچوونەوە دەفڕێنێت، دەیزانی ئێستا ئەو لەو ڕاوکەرە دەچێت کە یەکێک ناردبێتی بۆ دوور، بۆ جێگایەک کە دەستی هیچ زیندوویەک نایگاتێ تا لەوێوە جوانییەکان بهێنێتەوە، لە پیاوێک دەچێت لە ڕەشەباکاندا وەستاوەو دەست درێژ دەکات جوانییە ڕفێندراوەکان لە چنگی مردن دەربهێنێت، بەلام هێشتا لەم دوورییەش ناتوانێت هەموو شتێک بگرێتەوە. ئەو ئێستا نوێنەرێکی غەمگینی ئۆقیانوسی هاوارەکان بوو بۆ دەرەوەی سنوورە جوگرافییەکانی ژیان و خەون، ئێستا تێدەگەیشت بۆ لەسەرەتاوە هەمووان وەک پێغەمبەر سەیریاندەکرد، ئێستا تێدەگەیشت

کێ بوون ئەو مۆسیقارانەی دەهاتنە سەر ڕێگای سامیری بابلی و ئەو ڕۆحە دزێوو کوشندەیان پاکدەکردەوە، ئێستا تێدەگەیشت بۆ دەبایە دالیا سیراجەدین لەو شارەدا چاوەڕوانیبکات، بۆ دەبایە خۆشیبوێت، بۆ دەبایە موسای بابەک ئەو ژێرزەمینەی نیشانبدات، ئەو تابلۆ سپییەی پێشکەشبکات. ئەو ئێستا بەشێک لەو ئیشەی تەواودەکرد کە پاسەوانەکانی جوانی لەسەر زەوی نەیانتوانیبوو تەواویبکەن. ئێستا دەیزانی ئەو ژنە کێ بووە کە شەوێکی تاریک ناونیشانی کیومەرسی یەزدانی خورەمی بردووە بۆ موسای بابەک، ئەو ژنە کێ بووە هەمان تابلۆی بردووە بۆ مستەفای شەونم، دەیزانی ئەو تابلۆیە هیچ نییە جگە لە کۆدێکی نهێنی کە جوانپەرستەکان لە دوای خۆیان جێیدەهێڵن تا لە دەرفەت و ڕێکەوتە سەیرەکانی ژیاندا یەک ڕێگای ئەوی تر بدۆزنەوە، دەیزانی ئەو تابلۆیە هیچ نییە جگە لە دەلالەتێک جوانی جێیدەهێڵێت تا لە یەکدیمان نزیکبکاتەوە. ئێستا سەرتاپای ژیانی خۆی، سەرتاپای تەلیسمە سەختەکانی نێو ئەو تەمەنە کورتەی خۆی بە کراوەیی دەبینی.

لەگەڵ ئیسحاقی لێوزێڕیندا شەقامی «تیترواسکی بەیانیان» تەیدەکرد، شەقامی «جازی زیوین»، شەقامی «پیانۆی با»، شەقامی «شیعری ئەستێرەفرۆشەکان» شەقامی «شاعیرانی جەهەنەم» تادەگەیشتنە کوچەیەک بە ناوی کوچەی «فلووتی سپی». ئیسحاق دەیگووت: جەلادەت گەر تۆ قەقنەس نەبایتایەماڵی تۆش لێرەدا دەبوو، لە بەر پەنجەرەیەکدا دەیوەستان و دەیگووت: جەلادەت ئەمە ماڵی منە، ئەمە ئەو گۆشەیەیە کە من لێیدەوەستم و تا ناکۆتا، تا هەتا هەتایە مۆسیقایَ تیا لێدەدەم.

لەو کوچەیەدا سەدان عازیفی فلووتی دەبینییەوە، لەو کوچەیەدا مامۆستا سەرمەدی لە نێوان مۆسیقارەکاندا دەبینی، لەسەر کورسییەکی بچوک لە ژێر درەختێکی گەورەدا دانیشتبوو مۆسیقای لێدەدا، سەرهەنگ قاسمی دەبینی بەرابەر بە هەورێک وەستاوەو عەزفدەکات، ئەو مۆسیقارە

منداڵانەی بینییەوە کە چەندین ساڵ لەوەوبەر پێکەوە لە پاسێکدا مردبوون، فەهمی بەسریی دەبینییەوە بە خۆی و گەردنێکی بریندارەوە لەسەر مێزێک وەستاوەو باڵندەکان لەدەوری سەمادەکەن و عەزفدەکات. کەسیان جەلادەتی کۆتریان نەدەبینی، هەموو بە ئەندازەیەک نوقمی ئەو مۆسیقا ئاسمانییەی خۆیان بوون نەیاندەتوانی لێی جیاببنەوە. ئیسحاق دەیگووت: مرۆڤ لێرە بە مۆسیقا دەژی، هیچ کەسێک ئەوی دی ناناسێتەوە، جەلادەتی کۆتر هیچ کەسێک تۆ ناناسێتەوە. تۆ دەتوانیت تەنیا ئاوازەکان ڕزگاربکەیت، نەوەک مرۆڤەکان، ڕەنگە زۆر کەس لێرەوە بناڵێنێت و داوای فریادرەسێک بکات، بەلام مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو تەنیا توانیوێتی مۆسیقا و ئاواز و شیعر لە مەرگ ڕزگاربکات، هەرگیز مرۆڤ لەم شارەوە مرۆڤی بۆ ڕزگارناکرێت. هیچ کەس لە مانە جیهانیان یادنەچۆتەوە، بەلام هەموویان تەنیا لە ڕێگای مۆسیقاوە دەتوانن لەگەڵ دونیادا بدوێن.

جەلادەت لە گەشتێکی سەیردا، بە ناو دەیەها کوچەدا، سەدان ئاوازی گوێ لێدەبوو، سەدان میلۆدی سیحراوی لە ڕۆحی خۆیدا دەنوسییەوە، کوچە لە دوای کوچە دەگەڕا، شاعیرەکانی دەبینی لەسەر بەستەکان وەستاون و شیعر دەخوێننەوە، نیگارکێشەکانی دەبینی لە نێو شەپۆلی پەپولەدا وەستاون و نیگار دەکێشن، شارێکی ناکۆتا، هەزارەها کوچەی بێسنوور لە ناو یەکدا، هەزاران گوزەر کە مرۆڤ نەیدەزانی لە کوێوە دێن و دەچنەوە سەر کوێ، لە هەر کوچەیەکدا جۆرە مرۆڤێک و جۆرە ئازارێکی دەبینی، هەندێک لە شەقامەکان تا ناکۆتا درێژدەبوونەوە، هەندێکیان لە ناو سێبەری درەختە سەوزەکاندا خەوتبوون و هەندێکیان لە ناو بایەکی پاییزیدا نوقمبوون کە خەزانێکی ئەبەدی دروستکردبوو. هەندێک لە شەقامەکان هێند درێژبوون هیچ مرۆڤێک نەیدەتوانی تەواویانبکات. ئیسحاقی لێوزێڕین دەیگووت: جەلادەت هەندێک لەم شەقامانە لە ئەبەدییەتدا تەواودەبێت، زۆر مۆسیقار دێت و دواجار لە ناو ئەو تەمە دوورەدا وندەبێت کە هیچ مرۆڤێک دەستی

ناگاتن. چی لەوسەری ئەم شەقامەوە هەیە هیچ کەسێک نازانێت، هەر یەکێک لە ئێمە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەڕۆین و لەو تەمەدا وندەبین و هەرگیز ناگەڕێینەوە بۆ کوچەو گوزەری جارانی خۆمان.

ئیسحاق شەقامی ئەو کیژانەی نیشاندا کە بێوچان سەمادەکەن، شەقامی ئەو پیاوانەی بەردەوام هەموو ژیانیان یەک کتێب دەخوێننەوە. شەقامی ئەو تەمبوورژەنانەی لەسەر لکی درەختە بەرزەکان سەیری مانگ دەکەن و تەمبوور دەژەنن. شەقامی ئەو کچە عاشقانەی ئیشیان ئەوەبوو تەنیا تابلۆی شاری مۆسیقارە سپییەکان دروستبکەن، لەویادا ئیسحاقی لێوزێڕین سەلوا طحانی پیشاندا کە لە کراسێکی تەنکدا لە نێوان کۆمەڵێک شۆڕەبیدا، لە نابەین دوو فوارەی گەورەدا ستاندێکی گەورەی ڕەسمکردنی دانابوو و بە هێمنی و سەبرێکی گەورەوە ئەو تابلۆیەی دروستدەکرد، تابلۆی شاری مۆسیقارە سپییەکان، ئەو تابلۆ سیحراوییەی قەقنەسەکان بە زەویدا دابەشیاندەکرد. ئەو تابلۆیەی تەواو وەک هەمان ئەو تابلۆیە بوو کە ئەو لە شاری تەپوتۆزە زەردەکاندا بینیبووی. جەلادەت دەستی دەخستە سەر تابلۆکان و دەڕۆی، حەزیدەکرد لەگەڵ ئەو کچەدا قسەبکات، حەزیدەکرد باسی دکتۆر بابەکی بۆبکات، بەڵام ئەو جگە لە دەلیلەکەی خۆی نەیدەتوانی قسە لەگەڵ هیچ مەخلوقێکی دیکەدا بکات، لە غەواسێک دەچوو گەنجینەیەکی لە ژێر دەریادا دۆزیبێتەوە، لە هەموو جێگایەکدا دەستی بۆ بەنرخترین مرواری دەبرد و هەڵیدەگرت. ئاوڕیدەدایەوەو بۆ یەکەمجار پاسەوانێکی سپی بێدەنگی دەبینی لە پشتیانەوە هەموو ئەو تێکست و کتێب و تابلۆیانە هەڵدەگرێت کە ئەو دەستیانَ دەخاتەسەر و لە گالیسکێکی گەورەدا دەیانخاتە سەر یەک... هەر جوانییەک جەلادەت دەستی بخستایەتە سەر دەبوو بە موڵکی ئەو. ئێستا نەیدەزانی چەند وەختە بەڕێکاوەن، زەمەن لە شاری مۆسیقارە سپییەکان مانای نەبوو، شەو و ڕۆژ هیچ نەبوون جگە لە دیکۆرێکَ کە شەقامەکان خۆیان هەڵیاندەبژارد،

شـەقامێک هەبوو شـەوبوو، بەڵام شـەقامێکی دیکەی تەنیشـتی ڕۆژ. شـەقامێک هەبـوو هەتـاو و شـەقامێک هەبـوو پڕ لـە گـەڵای خـەزان، کوچەیـەک پڕبـوو لـە باڵندەو کوچەیـەک پڕبـوو لـە ماسـی سـپی کـە بـە هـەوادا دەفڕین. بـەڵام هەمـوو جێگاکان سـپی بوون، میعمـاری خانـووەکان مـەلەکوتی دەهێنایە پێش چـاوی مـرۆڤ.

لـە شـەقامێکدا گوێیـان لـە دەنگـی ئـەو گۆرانیبێژانـە بـوو کـە دەیانتوانـی مـرۆڤ بـە جۆرێک مەسـتبکەن نەتوانێت لـە شـوێنی خـۆی بڕوات. ئیسـحاق دەیگـووت: ئەمـە یەکێکە لە پڕ مەترسیترین کوچـەکان، چونکە گۆرانیبێژەکان دەتوانـن بـە جۆرێـک کۆتتبکـەن بـە ئاگا نەیەیتەوە. دەتوانن تا ئەبەد بتوەسـتێنن و ناچارتبکـەن گوێبگریـت. دەرچـوون لـە شـەقامی گۆرانیبێـژەکان وەک پەڕینـەوە وابـوو لـە دەریایەکـی ترسـناک. جـەلادەت لـە ئیسـحاقی دەپرسـی: مامۆسـتام، بـۆ کوێـم دەبەیت، بـۆ کـوێ؟. ئیسـحاقی لێوزێڕین گووتـی: بـەرەو شـەقامی «فریشـتەکانی لـم» بـەرەو ئـەوێ، ئـەوە دوا سـنووری ئـەم شـارەیە، مـن بتوانـم بیگەمـێ، دوا سـنوورێتی کـە تـۆ دەتوانیت بیگەیتـێ، لـەو بـەر ئـەو شـەقامەوە سـەردەمی دیکـەو خەڵکی دیکـەو قەقنەسـی دیکـە هـەن کـە مـن و تـۆ نایانبینیـن و نایانناسـین.

لـە شـەقامی «فریشـتەکانی لـم» دا، جـەلادەت هەمـوو ئـەو مرۆڤانـەی دۆزییـەوە کـە لـە شـەوە دوورو درێژەکانـی بیابانـدا مـردن. ئـەو کـوردە غەمگینانـەی بینییـەوە کـە لـە لمسـتانەکانی باشـووردا لـم خنکاندبوونـی. هەمووان لەسـەر درەخت و شۆسـتەو باڵکۆنی شـەقامێکی ناکۆتا دانیشـتبوون و نامەیـان دەنووسـی. هەزارەهـا مـرۆڤ کـە لـە درێژتریـن کوچـەی دونیـادا دانیشـتبوون، لـە باڵکۆنـە سپییەکانیانەوە وەسـتابوون و سـەیری ئەسـتێرەیان دەکرد. لەسـەر پەلی درەختە گەورەکان دانیشتبوون و وەک عاشقە دێرینەکان باسـی مردنـی خۆیـان دەخسـتە سـەر کاغەزێکی سـپی، هێندەی تەواودەبوون دەیاندایـە بـەر بـاو دووبـارە دەسـتیان دەدایـەوە قەڵـەم و بـە جۆرێکـی دی

و بە دارشتنێکی دی هەمان حیکایەتیان دەگێڕایەوە. سروەیەکی فێنک لە نادیارەوە دەهات و کاغەزەکانی دەفڕاندن، ئاسمانی ئەو کوچەیە پڕ بوو لەو نامانەی «با» لەگەڵ خۆیدا بەرەو شوێنێکی نادیار دەیبردن. ئەو نامانەی دەبایە قەقنەسێک بێت و لە هەوادا هەندێکیان بگرێتەوەو بیباتەوە بۆ جیهان. هەزارەها ڕۆحی غەمگین بوون لە ژێر سێبەری ماڵە سپییەکانی خۆیاندا، لەسەر مێزی سپی، لە سەر زەمینێکی سپی، لە نزیک ئاوێکەوە کە وەک چوری شیر سپی بوو، هاواری خۆیان دەنوسی، ناونیشانی ئازیزەکانیان دەخستە سەر پشتی کاغەزەکەو دەیاندایە بەر «با». شەقامێک بوو گەرم وەک ڕۆژێکی مردن لە بیاباندا، جەلادەت دەستی دەخستە سەر خشتە سپییەکان و هەستی بەو گڕەیە دەکرد کە لە ڕۆحی داروبەردی ئەو کوچەیەوە هەڵدەستی، گەرمایەک وەک گڕەی بیابان. بۆ یەکەمجار دەستی دەدا لە نێوچاوانی ئەو نامەنوسانەی کە هەستیان بە دەستی ئەو نەدەکرد، بەڵام ئەو هەستی بە تای شەوی مردنیان دەکرد، هەستیدەکرد ئێستاش دڵیان بە هەمان ترس لێدەدا.

دەوەستاو بە چواردەوری خۆیدا دەیڕوانی، ئەو مرۆڤانەی دەبینی لە پەنجەرەی ماڵەکانیانەوە سەر دەردەهێنن و نامەکانیان دەدەنە دەم باو دەگەڕێنەوە ژووری. ئەوانەی دەبینی لە ناو چیمەنە سەوزەکاندا پاڵکەوتوون و لە ئەبەدییەتی هاوارەکانی خۆیاندا ونبوون. هەندێکیانی دەبینی بەر لەوەی دووبارە دەستبکەنەوە بە نوسینی نامەیەکی نوێ، کەمێک بەدوای نامە کۆنەکانیاندا ڕادەکەن و دواتر بە هێمنی دەگەڕێنەوە سەر قەڵەم و کاغەزەکەیان.

ئیسحاق دەیگووت: ئیشی تۆیە ئەو نامانە بگەیێنیت، ئیشی تۆیە کە یەکەیەکە گوندو پێدەشتەکان تەیبکەیت و ئەم نامانە بدەیتە دەست خاوەنەکانیان.

هەزاران نامە کە هەر یەکەو ناونیشانی گوندێک و ئاوێک و شارێکیان

لەسەر بوو، جەلادەت نامەیەکی لە هەوادا دەگرتەوەو دەوەستاو دەیخوێندەوە، نامەیەک بوو لەسەر لم، لەسەر مردن، لەسەر خنکان لە ژێر ئەستێرەدا، لەسەر بێدەنگی. نامەیەک بوو بە ناوی پیاوکوژەکانەوە، بە کات و شوێنی مردنەوە، بە باسی دوورودرێژی تینوێتی و گەرماوە، بە وەسفی نیگای ئەفسەرە عەرەبەکانەوە، بە وەسفی ڕێگاکان و شارەکان و ئۆردوگاکانی مردنەوە، بە وەسفی سات دوای ساتی ڕۆحکێشان، وەسفی لم کە دەچێتە گەرووتەوە تا چیتر هەناسە نەدەیت، وەسفی فیشەک کە یەک لەدوای یەک لەدواوە بەر سەرت دەکەون، ئەو هەستەی لە نێوتدا دروستدەبێت ساتێک دەزانیت دەمریت و نازانیت سەیری ئەستێرەبکەیت یاخود تەماشای لوولەی تفەنگی پاسەوانەکان؟ نازانیت بیر لە مردنی خۆت بکەیتەوە یان لە مردنی منداڵەکەت؟ بیر لە تینوێتی بکەیتەوە یان لە هاواری ئەفسەرێک کە لە پشتەوەڕا بۆ مردن ڕیزتدەکات؟.

هیچ ئادەمیزادێک نەبوو بتوانێت هەموو ئەو نامانە بگەیێنێت.

جەلادەت نەیدەزانی دەستی لە چەند نامە داوە، بەدوای چەند نامەدا ڕایکردوە، چەند سەعات یان چەند ڕۆژ لەو کوچە درێژەدا سوڕاوەتەوە. جەلادەت بێئاگای خۆی بەو کوچە درێژەدا دەڕۆیشت، هەستیدەکرد کەوتۆتە ناو تەمێکی سپی و چڕەوە، لەوسەر لە ناو تەمەکەدا هەستیدەکرد ڕوخساری پیاوێکی قژلوول بە فلووتێکەوە دەبینێت، ڕوخساری ڕۆحێکی غەمگین کە لە نێو تەمێکی چڕدا تەماشایدەکات و دووردەکەوێتەوە، تارماییەک بوو لە سامیری بابلی دەچوو، پێدەچوو ئەو بێت و لە ناو قوربانییەکانی خۆیدا بە فلووتێکەوە ونبووبێت. وەک ڕۆحێک شەرمبکات بچێتە ئەو شەقامەوە، وەک دڵێک ڕووی نەیەت کەس تەماشاییبکات لەو تەمەدا خۆی بەتەواوەتی ئاشکرانەدەکرد. جەلادەت دەیویست دوایبکەوێت، دەیویست دڵنیابێت ئاخۆ ئەوەی بینیوێتی سامیری بابلییە یان یەکێکی

دیکەیە. بەڵام ئیسحاقی لێوزێڕین لە ئاست درەختێکی بەرزدا دەیوەستان و دەستی دەخستە سەرشانی و دەیگووت: جەلادەتی کۆتر لێرەوە دەبێت بگەڕێینەوە، ئەمە دوا سنووری ئێمەیە، ئەمە یەکەمین سەفەری تۆیە، گەلێک سەفەری ترت لە بەردەمدایە، چەندەها جاری تر دێیت بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان، ئێستا تۆ بەشی چەندەها مانگ کارت هەیە، لێرەوە تۆ دەگەڕێیتەوە بۆ دواوەو لە شاری مۆسیقارە سپییەکان دەردەچیت. دەگەڕێیتەوە بۆ نیشتیمانی خۆت.

جەلادەت وەک باڵدارێک لە خەونێکی تەماویدا ونبووبێت، وەردەگەڕا و بە هێمنی بە هەموو کوچە سەیرو پڕ ئەفسونەکانی شاری مۆسیقارە سپییەکاندا دەگەڕایەوە، لە گەڕانەوەدا جگە لە تەماشاکردنی ئەو باڵدارە سپیانەی بەردەوام بەسەر سەریدا دەفڕین سەیری هیچی تری نەدەکرد، تا زیاتر لە دەروازەی شار نزیک دەبووەوە کوچەکان کاڵترو کاڵتر دەبوونەوە، وەک ئەوە بوو لەگەڵ هەموو هەنگاوێکی ئەودا تەمێکی قورس و سپی شتەکان دابپۆشێت، وەک ئەوەی گەڕانەوەی ئەو ڕاکردن بێت لە تونێلێکی سپی خەیاڵی کە تونێلی مردنی خۆیەتی. لە جێگایەکدا دەوەستاو ئاوڕی دەدایەوە دڵنیابوو ئەو شارە جێگای مردنی خۆیەتی... ئەو شارە هیچ نییە جگە لە نیشتیمانی مردنی خۆی.

بە ناو کۆمەڵێک هەورو تەمی سپیدا دەگەڕانەوە بۆ ناو ئەو ژوورەی یەکەمین جار لەوێدا یەکدیان بینی، لەوێ ئیسحاق پاکەتێکی چکۆلانەی دەدایە دەست، باوەشی پیادەکردو دەیگووت: جەلادەت لە بیرت نەچێت، من چاوەڕوانتدەکەم.

جەلادەت دواتر جگە لە وێنەی ئیسحاق کە لە تەمێکی سپییدا وەستاوە و بە کاوەخۆ وندەبێت هیچی تری یادنەبوو.

کە دەرگاکەی دەکردەوە، شاروخی شاروخ چاوەڕوانیدەکرد، هەمان ئەو

ڕاوەستان و سەیرکردنەی هەبوو کە بەر لە خوداحافیزی بینیبووی، وەک ئەوەی بەدرێژایی ئەو سەفەرەی ئەو، شاروخ لە شوێنی خۆی نەجولابێت، بەڵام کە ئەوی دەبینی بە خەندەیەکەوە پڕبوو لە سۆزی فریشتە گەورەکان دەستی دەگرت و بەرەو دەرەوە ڕایدەکێشاو دەیگووت: هاوڕێم ئێستا تۆ دەتوانیت ژیان پڕبکەیت لە موعجیزە.

بێئەوەی بزانێت مەبەستی چییە، دەستی دەگرت و بە هەمان ڕێگادا دەگەڕانەوە، بەلای هەمان ئەو تاقمە ئەندازیارە سپییەدا تێدەپەڕین کە نەخشەی شەقامی دیکەیان دەکێشا. لە بەر دەرگاکان جەلادەت دەیتوانی پتر لە شورای دوورو درێژی ئەو شارە ڕابمێنێت، لەو نەخش و هەڵکۆڵینە نهێنیانە وردببێتەوە کە تەنیا بە تەماشاکردنی دوورودرێژ مرۆڤ دەیبینین. نەخشی سەردەمە هەرە دێرینەکان، زەخرەفەی ڕۆژە سادەو سەرەتاییەکانی لە دایکبوونی مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیە، شفرەی خێڵە بەراییەکان، نوسینی سەر لەوحە سۆمەرییەکان، نەخشی ئاسوریی، زەخرەفەی ئەکەدیی، ئەسپەکانی نەینەوا، شێرەکانی بابل. بۆئەوەی لە ناو وێنەو زەخرەفەکاندا نوقم نەبێت شاروخی شاروخ ڕایدەکێشاو دەیگووت: دەبێت بڕۆین. ئەسپە سپییەکان چاوەڕوانیاندەکردن، چەندەها ئەسپی سپی کە هەموو ئەو بارە قورسەیان لە پشت بوو کە جەلادەت لەگەڵ خۆیدا دەیهێنایەوە، ئەو ئەسپانەی مۆسیقاو کتێبی نهێنی و تابلۆو نامەیان بارکردبوو. جەلادەت ئێستا لە کاروانچییەک دەچوو کە لە پشتییەوە ڕیزێکی درێژ ئەسپ قەتارەیان دەبەست. شاروخی شاروخ لە دوای قافڵەکەوە دەڕۆیشت و جەلادەت لە پێشەوە، ئەمجارە وەک ئەوە بوو بەدەوری بازنەیەکی گەورەدا بسوڕێنەوە، بە ناو کۆمەڵێک پێدەشتی سەیردا، بە ناو زنجیرە چیای بەرزدا، بە ناو هەرێمی بەفر و کێڵگەی بورکانی و دۆڵی گەورە گەورەدا ڕۆیشتن کە پڕبوون لە تەم، لە غوبارێکی ئەزەلی کە لەسەرەتای لە دایکبوونی زەوییەوە تا ئەمڕۆ نەڕەویوەتەوە. بە ناو چەندەها جەنگەڵ و کێو و

خاکی ئەفسانەییدا دەگەڕانەوە بۆ دونیا، ئێوارەیەکی درەنگ دەگەیشتنە سەر ئاوی دەریاچەیەکی گەورە، دەریاچەیەک مانگ لە ناوەڕاستیدا مەلەیدەکرد، تیشک لە نێوان نەرمە شەپۆلەکانیدا بازنەی زێڕینی گەورە گەورەی دەخولقاند. جەلادەت وەک لە تەلیسمێک وردبیێتەوە لەو ئاوە پڕ لە تیشکەی دەڕوانی. شاروخی شاروخ لەسەر ئەو دەریاچەیە دەیوەستان، بەستەیەکی پێچراوەی دەدایە دەست و دەیگووت: جەلادەتی کۆتر، لێرەوە سنووری من تەواو دەبێت، لەم دەریاچەیە بەولاوە نایەم لەگەڵتدا، من لەم ڕۆخەدا دەمێنمەوە، هەر کاتێک گەڕایتەوە بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان من لێرەم، لە ناو ئەم دارانەدام، لە ڕۆخی ئەم دەریاچەیەدام، من بە شەو وەک ڕۆحێکی سەرگەردان بەسەر ئاوەکاندا دەڕۆم و چاوەڕێتدەکەم. تەنیا شتێک بە ناوی منەوە بیگێڕیتەوە بۆ دونیا ئەم زەرفە چکۆلەیەیە، لەم زەرفەدا مێخەکانی خۆت هەن، ئەو مێخانەی من لە دەست و سینەت دەرمهێنان، لەگەڵ هەندێک شت بۆ کچێک بە ناوی ڕەوشەنی مستەفا سەقزی. قوتابی مۆسیقایە، کۆمەڵێک مۆسیقای تایبەتی خۆم بۆ ناردووە. ئەو من دەناسێت پێبڵێ: ئەمە دیاری شاروخی شاروخە. ئەو خۆی من دەناسێت، ئەو دەتوانێت دواتر زۆر کۆمەکت پێبکات.

* * *

هەموو شتەکان خێراو کورت و کوتوپڕبوون، من چاوەڕوانی زیاترم دەکرد، دەمویست جەلادەت شەقامَ لەدوای شەقامَ بۆم باسبکات، دەمویست گوزەر بە گوزەر هەناسەو هەوای ئەو شارەم بۆ بگێڕێتەوە... هەر جارێک جەلادەتی کۆتر دەیویست باسی شاری مۆسیقارە سپییەکانم بۆ بکات، هەستمدەکرد ناتوانێت لەوە زیاتر فشار بۆ یادەوەرییەکانی خۆی بهێنێت، ڕستەکانی خێراو کورت بوون، یادەوەرییەکانی تەماوی بوون.

جـەلادەت نەیدەتوانـی هەندێک لـە وردەکارییـەکان بگێڕێتـەوە، دەیزانـی لـەو کوچـە سـپییانەدا ژیـاوە، دەیزانـی ئیسـحاق هەمـوو نهێنییەکی ئـەو شـارەی پێگووتـووە، بـەلام دەشیزانی ئەسـتەمە بتوانێت بەوردی باسـی هەموو شـتێک بکات. بەڕای جـەلادەت نهێنی قووڵـی ئـەو شـارە، وەک نهێنـی جوانـی شـتێکە وەسـف ناکرێـت. مـرۆڤ دەتوانێـت وێنەیەکـی لەسـەر دروسـتبکات، بـەلام ناتوانێـت دەسـتبخاتە سـەر دوا مانـاو دوا جەوهـەری.

لـەو ڕۆژە سـەیرانەدا کە مـن و ئـەو پێکـەوە بۆ نوسـینی ئـەم کتێبە بردمانە سـەر. جـەلادەت بەدرێژیـی باسـی کوچەکانـی دەکـرد، باسـی ڕوخسـاری کەمانچەژەنـەکان، ڕوخسـاری ئـەو کیـژە عاشـقانەی لـە شـەقامێکی دووردا بـەردەوام تابلـۆی «شـاری مۆسـیقارە سـپییەکان» دروسـتدەکەن، وەسـفی جلـەکان و نیگایانـی دەکـرد. بـەوردی باسـی ئـەو شـاعیرانەی بـۆ دەکـردم کـە تـا هەتاهەتایـە شـیعر دەنوسـن و دەیدەنـە دەم بـا، باسـی ئـەو شـەقامانەی بۆکـردم کـە ئاسـمانەکانیان پـڕە لـە ئاوازی بابـردوو، بـەلام دەیزانـی نهێنییەکی ون هەیـە ناتوانێت بیدرکێنێت، نهێنییـەک دەکەوێتـە دەرەوەی سـنووری زمـان. بەکورتـی لای جـەلادەت مـرۆڤ بۆئـەوەی لـە شـاری مۆسـیقارە سـپییەکان تێبـگات و دەسـت بخاتـە سـەر نهێنییـە قووڵەکـەی دەبێـت لـەوێ بـژی. بەدرێژایـی ئـەو ماوەیـە فشـاری گـەورەم دەخسـتە سـەر قووڵتـرو قووڵتـر بـە نـاو یادەوەرییەکانیـدا بچێتـە خـوارێ، بـەلام ئـەو دەیگـووت: نهێنـی هـەرە گـەورەی شـاری مۆسـیقارە سـپییەکان، لـە شـەقامەکان و کوچـەکان و گەڕەکە بەرینەکانیدا نییـە، بەڵکـو ئـەو نهێنییـە لـە مۆسـیقاکان و تابلـۆو نامەکاندایـە کـە لەوێـوە دەگەڕێنـەوە بـۆ جیهـان.

ئـەو ماوەیـە زۆر گوێـم لـە مۆسـیقاکانی جـەلادەت دەگـرت، زۆر تەماشـای هەندێک لـەو کتێبـە سـەیرانەم دەکـرد کە ئـەو لـەو شـارە دوورەوە دەیهێنانەوە، دەمزانـی تامـی جوانـی و جاویدانەگـی تەنیـا لـە یـەک تێکسـت یـان یـەک ئـاوازدا نییـە، مـرۆڤ دەبێـت قـووم لـە دوای قـووم بـە هێمنییەکـی گـەورەوە

بینۆشیێت تا شتێک لە ماناکەی تێدەگات. شەوێکیان جەلادەت پێیگوتم: عەلی شەرەفیار تۆ پیاوێکی نوسەریت، چیرۆکنوسێکی بەهرەمەندیشی، بەڵام من یەک شتت پێدەڵێم هەرگیز فەرامۆشی مەکە، هیچ جوانییەک نییە بتوانێت لە خۆیدا هەموو جوانییەکان کۆبکاتەوە، ئەوەی هەیە و نییە تۆڕێکی گەورەیە کە جوانییە جیاوازەکان بەیەکەوە گرێدەداتەوە، تۆڕێکی گەردونی کە هەموومان پێکەوە دەبەستێت. ئەوەی هەیە و نییە ئەو هەستە قوڵەیە بە یەکێتی کە لە نێو جوانییە جیاوازەکاندا هەیە.

من لێم پرسی: جەلادەت ئەی خودا، ئەی خودا ئەو جوانییە گەورەیە نییە کە هەموو جوانییەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە.

بە غەمگینی سەیریکردم و گووتی: لە هەموو سەفەرەکانمدا بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان زۆر بەدوای خوادا گەڕام، بەڵام ئەوم لە هیچ شوێنێک نەبینی. شاری مۆسیقارە سپییەکان جگە لە مرۆڤ کەسی تری لێ نییە.

بە تێفکرینەوە لێم پرسی: جەلادەت تۆ پێت وایە گەر خودا لە شاری مۆسیقارە سپییەکان نەبێت... مانای ئیدی خودا بوونی نییە؟

بێئەوەی بوەستێت بەو چاوە گەورەو سەرسامانەی خۆیەوە سەیریکردم و گووتی: دەبێت خودا کاری بە شاری مۆسیقارە سپییەکان چی بێت؟ خودا جوانییەکی نییە بکوژرێت، هیچ هێزێک نییە بتوانێت ئەو مۆسیقارەی ناو خودا بکوژێت. خودا ئێمەو مردنی بەرابەر یەک داناوەو سەیرماندەکات، لەوانەیە سەیریشمان نەکات. ئاغای شەرەفیار من بەرلەوەی بچم بۆ ئەو شارە کاتێک گوێم لە مۆزارت دەگرت، کاتێک گوێم لە فلووتە سیحراویەکەی ئیسحاقی لێوزێڕین دەگرت، کە کاسێتێکم دادەناو دەنگی مەلەکووتی گۆرانیبێژێکی وەک خالقیم دەبیست، هەستمدەکرد خودا خۆی ڕاستەوخۆ لەو جێگایانەوە ڕوخساری پڕ سیحریی خۆی بۆ ئێمە ئاشکرادەکات، ڕام وابوو خودا لە ڕێگای مرۆڤەوە زۆر لە ئەفسون و جوانی خۆی ئاشکرادەکات. بەڵام ئێستا دڵنیام ئەو جوانییانە تەنیا و تەنیا جوانی

مرۆڤن. ئەگەر ئەو هەموو جوانییانە دەستکردی خودان بۆ دەبێت بە سەفەرێکی وا تاریک و بە ئازارێکی وا ناکۆتادا بڕۆن تا خۆیان لە مردن بپارێزێن؟ بۆ هێند زەحمەتە جوانییە کوژراوەکان زیندووبکەینەوە، بۆ هێند سەختە جوانییەکان و تواناکان و پاکی خۆمان بپارێزین؟ گەر جوانییەکانی ئێمە بەشێک بانایە لە جوانییەکانی خودا، گەر حەقیقەتەکانی ئێمە بەشێک بانایە لە حەقیقەتی خودا بۆ هەردەم لە ترسی مردن و یادچوونەوەدا دەژین؟. هەر شتێک بەشێک بێت لە خودا، بەشێکیشە لە جاویدانەگی، بەڵام هەر شتێک بەشێک بێت لە مرۆڤ بەزەحمەت دەتوانێت شەڕ لەگەڵ مردندا بکات، هەموو شتێکی مرۆڤ دەبێت لە شەڕدا لەگەڵ مردندا فێری زیندوێتی و ژیان ببێت، لە کاتێکدا هیچ شتێکی ئیلاهی لە جەنگی مردندا قاڵ نەبووە. مرۆڤ لە یەک خاڵدا لە خوداکان قووڵتر دەڕوانێت، مرۆڤ شتێکی هەیە کە خودا نییەتی، ئەزموونێک دەناسێت کە خودا نایناسێت، ئەویش مردنە، خودا نامرێت و مرۆڤ دەمرێت. مردن وا لە مرۆڤ دەکات بوونەوەرێکی بەهێزتربێت لە هەموو بوونەوەرەکانی تر. عەلی شەرەفیار دەبێت خودا کاری بە شاری مۆسیقاره سپییەکان چی بێت، کە شاری هەڵهاتنی جوانییەکانی مرۆڤە لە مردن.

ئەگەرچی سەفەری جەلادەت بۆ شاری مۆسیقاره سپییەکان گەورەترین وێستگەی ژیانی بوو، بەڵام هەستدەکەم لە گێڕانەوەی چیرۆکی خۆیدا ترسێکی قووڵی لە باسکردنی ئەو شارە هەبوو، وەک باس لە بنی دەریایەکی دووربکات، ئاوها باسی شەقامەکانی دەکرد. ترسی قووڵی لەوەوە دەهات ئەو شارەی وەک هێمایەک بۆ تەنهایی و بێکەسی مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیە سەیردەکرد. کاتێک بۆ یەکەمجار لەو ئوتێلە سووتاوەدا ناسیم، لە مێژبوو لە هاتوچۆی ئەو شارەدا دەژیا، هێدی هێدی پێیوابوو گەیشتۆتە ئەو شوێنەی دەبێت تەواوی حیکایەتەکەی خۆی بۆ دونیا ئاشکرابکات. لە یەکێک لە سەفەرەکانیدا ئیسحاقی لێوزێڕین پێیگووتبوو کە دەبێت ئەم

چیرۆکە بگێڕێتەوە، چونکە ئەو تەنیا شاهیدی ڕاستەقینەی سەر سەردەم و جێگایەکە کە جگە لەو هیچ کەسی دی ئاوها لە ناو کارەسات و نهێنییەکانیدا نەژیاوە. من دەمزانی لەگەڵ خوێندنەوەی دوا لاپەڕەی ئەم کتێبەدا ئیدی دەڕوات و ناگەڕێتەوە. ئەو کاتەی من ناسیم بەدوای نوسەرێکی شایستەدا دەگەڕا لەگەڵیدا ئەم چیرۆکە بگێڕێتەوە. ئەوکات کە من شاروخی شاروخم لە فڕۆکەخانەی سخیپهۆڵ بینی، نەمدەزانی سەروکارم لەگەڵ یاریدەدەرێکی جەلادەتدایە کە لە جێگایەکی هێند دوورەوە سەر دەردەهێنێت و من بەرەو ئەو ئاڕاستەدەکات، لەسەرەتاوە شاروخی شاروخ کە خوێنەرێکی دێرینی کتێبەکانی من بوو، منی وەک تەنیا حیکایەتخوانی ڕاستەقینەی ئەو سەربوردە دەستنیشانکردبوو. بەوەدا من لە شوێنێکی دووردا دەژیام، دەبووایە بەجۆرێک ئاڕاستەمبکەن خۆم بە پێی خۆم دوای نهێنی ئەم مۆسیقارە بکەوم. سەرەتا ئەو برینە سەیرانەی سەر دەست و سینەی سەرنجی ڕاکێشام، سەیربوو لەلام مرۆڤێک بەو هەموو برینەوە زیندووبێت، بەڵام سەختی مەرجەکانی، دەستوەردانی بەردەوامی لەوەی من هیچ دەستێکی خەیاڵی لەم حیکایەتە وەرنەدەم توڕەیدەکردم. ئەو ئێوارەیەی کە بە هاوڕێکانی جەلادەتم گووت: لەوە بێتواناترم ئەم چیرۆکە بگێڕمەوە. دەمزانی ڕاست ناکەم، دەمزانی سیحرێک لەو گەنجەدا هەیە لەگەڵ خۆیدا دەمبات، هەر بەشێکی ژیانی وەک گرێیەک بوو لە تەلیسمێکی گەورەتر، دەیزانی چۆن دێڕ لە دوای دێڕ بمخاتە دوای حیکایەتەکەی خۆی، دەیزانی لە کوێدا جڵەوی حیکایەتەکان وەردەگرێت و لە کوێدا قەڵەمەکەی دادەنێت و من دەکات بە حیکایەتخوانی خۆی. هەندێجار وام هەستدەکرد لەزەتێکی زۆر لەوە دەبینێت ئازارمبدات. من ئەو ماوەیە وازم لە هەموو پرۆژەکانی خۆم هێنا، بەپێچەوانەی بەرنامەکانی خۆمەوە نەگەڕامەوە بۆ خۆرئاوا، سەرتاپا ژیانی خۆمم گۆڕی تا لە تەلیسمی ئەم قەقنەسە بگەم، کێشەی ژنەکەمم لە بیرکردو ژیانی منداڵەکانمم فەرامۆشکرد. زۆر شەو وەک شێت بە دەفتەرو

دەستنوسەکانمەوە بەسەر پێپلەکانەی ئەو ئوتێلە سووتاوەدا سەردەکەوتم و لە بەر باڵکۆنەکە رامدەکێشایە ژووریّ و پێمدەگووت: جەلادەت قسەبکە، چیرۆکی ژیانی خۆتم بۆ تەواوبکە، دوای ئەوەی بووی بە قوتابی ئیسحاقی لێوزێرین چی روویدا؟ جەلادەت کە فریشتە چکۆلەکانی دالیات بینی هەستت بەچی کرد؟ جەلادەت چۆن مۆسیقات لە یادچووەوە؟ چۆن لە شاری سۆزانییەکاندا لەگەڵ هیچ کچێکدا نەخەوتیت؟ چۆن؟ چۆن؟ چۆن؟. هەزارەها پرسیارم هەبوو. ئەو بەردەوام لە یەک خاڵدا دەیوەستاندم و بیریدەکردەوە، هەندێجار وامدەزانی دەیەوێت ئیشتیاقێکی کوشندەم تیا دروستبکات تا جێینەهێڵم، بەلام هەندێجار دڵنیابووم کە خۆی لە کاتی گێڕانەوەدا بیر دەکاتەوە، زۆر خاڵی تاریک هەبوون بۆ خۆشی رۆشن نەبوون. هەندێجار هەستمدەکرد وەک پیاوێکی وێڵ لە نێوان ژیان و مردندا لە هەردوو لاوە کۆمەڵێک کەلێنی قووڵ و سەیر لە یادەوەریدا دروستبووە، هەندێجار چەندین شەو لەسەریەک تەنیا یەک بەشی ئەم چیرۆکەی دەگێڕایەوە، جار دوای جار دووبارەیدەکردەوە، وەک شێتێک چاوی لێکدەناو هەندێک تێکستی ناو ئەم کتێبەی لەبەر دەگووتەوە، کە لە بەشێکەوە دەچووینە سەر بەشێکی دیکە، بە شێوەیەکی سەیر بەشەکانی پێشووی لەبەربوو، شەوانیش هەبوو ئامادەنەبوو ئەم چیرۆکە بگێڕێتەوە، وەک شێت دەچووە بەر باڵکۆنەکەو دەگریا. مانای شتەکان لای ئەو پێچەوانە دەکەوتنەوە، هەموو شتێک لای ئەو رابوردووبوو. دوای شاری مۆسیقاره سپییەکان سەرتاپای ژیانی بووبوو بە رابوردوو، هەتا منیش بەشێک بووم لە رابوردوو، پاشەڕۆژی خۆشی بەشێک بوو لە رابوردوو. جارێک بە غەمگینییەوە گووتی «عەلی شەرەفیار، من تەنیا مرۆڤێکم پاشەڕۆژم نییە». خۆی دەیزانی ئەو مۆسیقایانەی دەیژەنێت مۆسیقای رابوردوون، ئەو نامانەی دەیانگوێزێتەوە نامەی رابوردوون، ئەو گەشتانەی دەیانکات گەشتن بەرەو رابوردوو.

لـە دوای گەڕانـەوەی جـەلادەت لـە شـاری مۆسـیقارە سـپییەکان. دوای ماڵاواییکردنـی لـە شـاروخی شـاروخ لەسـەر ئـەو دەریاچەیـە، بـە خـۆی و کاروانـە گەورەکەیـەوە گەڕایـەوە بـەرەو شـار، تەنیا جێگایـەک لـە خەیاڵیدا بـوو ئـەو مەخزەنـە دوورو فەرامۆشکراوانەی مستەفای شـەونم بـوو. دوای چەنـد سـەعات ڕۆیشـتن دەمـەو بەیانییـەک کـە هێشـتا جیهـان بولێـڵ بـوو، گەیشـتەوە عەمبـارە کۆنـەکان، لەوێکانـەدا ئاسـەواری خەراباتێکـی گـەورەی بـە چاوی خـۆی بینـی، شـوێنەواری جەنگێکـی گـەورەی پێشـچاو کـەوت کـە بەشـی هـەرە زۆری خانووبـەرەو عەمبارو سـاڵۆنە گەورەکانـی ڕوخاندبـوو، سـەر دیوارەکان پڕبوون لـە شـوێن گوللـە، زۆر لـە سـەقفەکان بـە کاریگـەری زیاد لـە خومپارەیـەک هەڵتەکیبوون، دیاربـوو ڕۆژێـک لەو دەڤـەرەدا جەنگێکی ترسناک و خوێنـاوی ڕوویداوە. بـەڵام لـە زۆر جێگادا هێشـتا هەندێک سـەقف و ژێرخـان سـەلامەت مابوون، جەلادەتی کۆتـر بارەکانـی خـۆی لـە ئەسـپەکان داگـرت و لـە کونجێکـی گونجاوی یەکێک لـە عەمبارەکاندا خستنییە سـەر یەک و ئەسـپەکانی یەکەیەکـە ماچکردو بـە ئاڕاستـەی شـاری مۆسیقارە سـپییەکان ئازادیکـردن، لـەو سـاتەدا کـە ئەسـپەکان وەک بـا بـەرەو نادیـار غاریـان دەدا، جـەلادەت لـەو عەمبارەدا کـە پێشـتر مسـتەفای شـەونم دەرگای ئۆقیانوسـی هاوارەکانـی بـۆ خسـتبووە سـەر پشـت، بـە قـاچ دەگـەڕاو دەمـی ئـەو دەرگا ئاسـنینەی دەدۆزییـەوە، دەیویسـت دەرگاکـە بکاتـەوە، بـەڵام نەیدەتوانـی، دوای دوو سـاڵ زیاتـر لـە گیـران، دوای بەسـەربردنی کاتێکـی نادیـار لـە شـاری مۆسـیقارە سـپییەکان، ئێسـتا لـە چارەنوسـی ئـەو کلیلـە دڵنیانەبـوو کـە لەگەڵ هەمـوو شـتێکی دیکـەدا لـەو ژوورەی خۆیدا لـە گیلاسـی سـپی جێیهێشـتبوو. دوو سـاڵ بـوو ژوورەکـەی لـە گیلاسـی سـپی چـۆڵ بـوو، لـەو نێوەدا هێدی هێدی دەبایـە هەمـوو ماڵـەکان ئـەو ئوتێلـە چۆڵبکـەن تـا سـەر لـە نوێ لەسـەر خاشـاک و خۆڵەمێشـەکەی کۆشـکێکی نـوێ هەسـتێتە سـەرپێ. ئـەو کات کـە من لـە خۆرئاوا گەڕامـەوە، چەنـد مانگێکی کەمـی مابوو تـا بـە تەواوەتـی ئـەو

ئوتێلە چۆڵبکات، دەیویست بەرلەوەی ئەو ژوورەی خۆی پێ چۆڵبکەن هەموو ئەم چیرۆکە تەواوبکەین، تا دواجار لەوێوە بەرەو نادیار بکەویتەڕێ. هەمیشە ئەو ساتەی لەبیربوو کە دوای ماوەیەکی وەها درێژ گەڕایەوە بۆ گێلاسی سپێ بەربەیانێکی فێنک و سیحراوی بوو، هەموو ئاوارەکان خەوتبوون، بە پلیکانەکاندا سەرکەوت، هێشتا ئەو جلانەی لەبەردابوو کە لە شاری مۆسیقارە سپییەکان کردبوویە بەری، لە قاتی شەش ژوورێکی خاڵی و بێدەنگ چاوەڕوانیدەکرد، دیاربوو لە دوای گیرانی ئەو، جگە لە با ژوورەکەی میوانێکی دیکەی نەبووە. ڕێک لەسەر زەوییە ڕەقەکە، لە ناو بۆماوەی ڕەشەبای دوو ساڵدا پاڵکەوت، ئێستا ئەو ژوورە لەبەر دیدی ئەو یەکەمین و دواهەمین بەهەشتی دونیابوو. لەویادا خەوت و دوای دوو ڕۆژ خەبەری بووەوە، کە بە ئاگاهاتەوە تازە خۆری بەیانییەکی نوێ هەڵدەهات، چووە بەر باڵکۆنەکەو دەستی لە دەموچاوی خۆی دا، دەستی لەو ڕیشە درێژەی داکە دوو ساڵ پتربوو نەیتاشیبوو، دەستیدا لە برینەکانی، لە دڵی... لە هەر ساتێکی تری ژیانی زیاتر دڵنیابوو کە زیندووە. لە باڵکۆنەکەدا چاوی لێکناو بە هێمنی گووتی: من دەژیم... دەژیم... دەژیم.

هەمان ڕۆژ مستەفای شەونمی لە یەکێک لە چێشتخانەکاندا دۆزییەوە. مستەفا بە چاکەتێکی قاوەیی زۆر گەورەوە لەسەر مێزێکی گەورە دانیشتبوو، زۆر لەو کاتە قەڵەوتربوو کە بینیبووی، بەتەنیا لە قاپێکی گەورەدا تشریبی دەخوارد، وەک هەمیشە قژێکی درێژی هەبوو، سەرەتا جەلادەت لە تەنیشتییەوە دانیشت و هیچی نەگووت، ئەو وەک هەمیشە بە لەزەتێکی بێوێنەوە کولێرەی دەگووشییە ناو لەگەنێکی تایبەتی گەورەوەو بەدەست تێیدەنیشت، هەندێجار پەرداخێکی ئاوی دەکرد بەسەر تیکەکاندا، لە وچانەکاندا کەمێک چاوی لێکدەنا و سەری بەرزدەکردەوە تا زیاتر لە لەزەتی خواردنەکە تێبگات. جەلادەت بێئەوەی خۆی ئاشکرابکات، بە هێمنی لە تەنیشتییەوە گووتی: هەبوو... نەبوو... کوڕێک هەبوو ناوی جەلادەتی

کۆتر بوو، کۆمەڵێک باڵداری هەبوو، باڵندەکانی سپی سپی بوون. ڕۆژێک ئەهریمەنەکان جەلادەتی کۆتریان ڕفاندو ئیدی نەگەڕایەوە، ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆی، جەلادەت لەم زیندانەوە دەچوو بۆ ئەو زیندان، لای ئەم جەلادەوە دەچوو بۆ لای ئەو جەلاد، تا هەموو زیندانەکانی بینی، تا بوو بە هاوڕێی هەموو ئازارەکان. ڕۆژێک جەلادەکان بڕیاریاندا جەلادەت لە خاچ بدەن، جەلادەتیان بەدرەختێکدا هەڵواسی و کوشتیان، بەڵام جەلادەت نەمرد، هەستایەوەو بە سوار ئەسپێکی سپی سپی چوو بۆ شارێکی دوور کە ناوی شاری مۆسیقارە سپییەکان بوو. لەوێ هەموو ڕابوردووی خۆی بینییەوە... لەوێ بارێکی زۆر گەورەو ترسناکی هەڵگرت و هاتەوە بۆ ژیان، کە گەڕایەوە کەوتە گەڕان بە دوای هاوڕێیەکی دێرینی خۆیدا...

مستەفای شەونم چاوی نوقاندبوو و گوێیدەگرت. لەو ساتەدا بێئەوەی چاو بکاتەوە، قسەکانی لە جەلادەت وەرگرت و گووتی: هاوڕێیەکەی پیاوێکی قەڵەو بوو بە قژێکی درێژەوە، ناوی مستەفای شەونم بوو. مستەفای شەونم پیاوێکی زۆر خۆر بوو، ناویان نابوو مانگای چێشتخانەکان، هەر کەسێک بیویستایە بیبینێت دەبایە چێشتخانەکانی بەدوادا بگەڕێت، پیاوێک بوو لە دوای ڕۆیشتنی جەلادەتی کۆتر ئازاری زۆری چەشت، ئەشکەنجەی زۆر بینی، بەڵام هەرچییەکیان لێدەکرد هەر قەڵەو دەبوو تا ڕۆژێک لە ڕۆژان لە چێشتخانەیەکدا دانیشتبوو و تەشریبی دەخوارد، لە ناکاو دەنگێک لە تەنیشتییەوە گووتی: هەبوو... نەبوو...کوڕێک هەبوو ناوی جەلادەتی کۆتر بوو...

لەو ساتەدا مستەفای شەونم چاویکردەوەو باوەشی بە جەلادەتدا کردو پێکەوە دایانە قاقای پێکەنین. ئەوە یەکێک بوو لە خۆشترین ساتەکانی ژیانی هەردووکیان.

لەسەر ئەو مێزە بە درێژیی حیکایەتی خۆیانیان بۆ یەکتر گێڕایەوە. مستەفای شەونم دەیگووت: دوو ساڵە ئێمە چاوەڕێی تۆ دەکەین، دوو

ساڵە. من لە گەڕانەوەی تۆ نائومێد بووم، ئای چەندە منت تووشی بێئومێدی کرد.

ئینجا بە ئەسپایی پێیدەگووت: قەقنەس ئاغا من دەمزانی دەچیت بۆ شاری مۆسیقاره سپییەکان، بەڵام نەمدەزانی ئاوا درەنگ دەگەڕێیتەوە.

مستەفای شەونم باسی ئەوەی بۆ کرد لەدوای گیرانی ئەو، ئێوارەیەک دەچێت بۆ گێلاسی سپی، لەوێ ئاسایشەکان دەیگرن بە پارچەزەوی نەبێت بەهیچ شتێک لێی خۆشنابن، زیاد لە شەش فەدان لە باشترین زەوییەکانی خۆی پێشکەشدەکات تا ئازادیدەکەن، دوو فەدان زەوی زیاتر دەدات بۆئەوەی کلیلی ئۆقیانوسی هاوارەکان و تابلۆی «شاری مۆسیقاره سپییەکان» و هەندێک دەفتەری دڕاوی دەستبکەوێتەوە کە نازانێت سوودیان چییە. لەوە بترازێت هەموو کەلوپەلەکانی دیکە لای ئەوان دەمێنێتەوە. جەلادەت غەمگین لە فەوتانی ئەو فایلە گەورەیەی باسمی جەزائیری، دەستدەخاتە سەر دەستی مستەفای شەونم و پێیدەڵێت: نەوسنەکان خەڵکی دەست و دڵ سافن، من لەم دوو ساڵەدا شتی ئەوتۆم دۆڕاندووە زۆر لە زەوییەکانی تۆ گرنگترن. هەستە ئێستا دەبێت ڕاخەرێک پەیدابکەم، چونکە دوو ساڵ زیاترە تەنیا لەسەر ئەرزی ڕەق دەخەوم.

مستەفای شەونم باسی ڕۆژە سەختەکانی شەڕی ناوخۆی بۆدەکات کە یەکێک لە پێکدادانە خوێناوییەکانی دەکەوێتە ناو مەخزەنە کۆنەکانی ئەوەوە، باس لەوە دەکات یەکێک لە خومپارەکان سەری ئەو ژێرزەمینە نهێنییە هەڵدەتەکێنێت و گڕی تەقینەوەکەی دەرگای ناوەوەی سەردابە نهێنییەکە لە گڕێژەنە دەبات و بڕێک لە تابلۆکانی دەسووتێن. باس لەوە دەکات لە گەرمەی شەڕدا کەس نایپەرژێتە سەر ئەو سەردابەو لەگەڵ شکانی پەیتاپەیتای هێزەکاندا هەردوولا ئەو مەخزەنانە بە خاپووری چۆڵدەکەن، بێئەوەی کەسیان زەفەر بە نهێنی ئۆقیانوسی هاوارەکان بەرن.

ئەو ئێوارەیە پێکەوە دەچن بۆ ئەو مەخزەنە ڕوخاوانە، لەوێ مستەفای

شەونم بە چاوی خۆی ئەو بارە ئەفسانەییە دەبینێت کە جەلادەت لە شاری مۆسیقارە سپییەکانەوە هێناویتی. سەرسام سەیری تابلۆکان دەکات، بە حەپەسانێکەوە کە ڕوومەتەکانی وەک پشکۆ دادەگیرسێنێت دەستدەبات و دەستنوسی ئەو شیعرانە دەخوێنێتەوە کە بۆنی جیهانێکی تریان لێدێت. لەو شەوەدا مستەفای شەونم ڕووبەڕووی دەیان تابلۆ دەوەستێت کە هەموویان ناویان شاری مۆسیقارە سپییەکانە، هەر یەکەیان کچێکی عاشق لە شەقامی عاشقە غەمبارەکاندا دروستیکردوە. هەر یەکەیان ناونیشانێکی لەسەرە، هەر یەکەیان حیکایەتی خۆشەویستییەکی کوژراو دەگێڕنەوە، بەلام هەمووشیان نیگاری تەنیا پیاوێکن بە کەمانچەیەکەوە. مستەفای شەونم دەیزانی قەقنەس مانای چی، بەلام پێشتر لە ژیانیدا قەقنەسێکی نەبینیبوو، بەلام ئێستا کە دەستی لە جەلادەتی کۆتر دەدا دەیزانی دەست لە مەخلوقێک دەدات لە خۆڵەمێش، مرۆڤێکی سووتاو کە بە زیندوویی لە ئاگر هاتۆتەدەرێ. دەیزانی لە بەردەم سەدان ئاواز و تابلۆو کتێبدایە کە لە مەرگەوە گەڕاونەتەوە، ئەو شەوە جەلادەت بۆ یەکەمجار ئەو پاکەتەی ئیسحاقی لێوزێڕینی دەکردەوە کە دیاربوو تا ئەو کاتە وەک هەر شتێکی تر خستبوویە سەر باری ئەسپە سپییەکان، لەو پاکەتەدا فلووتێکی نوێی دەردەهێنا، بێئەوەی بیربکاتەوە، بێئەوەی هیچ شتێکی لەسەر ئەو ڕۆژانە لە بیربێت کە مۆسیقای لە بیرچووەوە، لێوی دەنا بە ئامێرەکەوەو دووبارە دوای چەندین ساڵ یەکەمین ئاوازی سیحراوی خۆی عەزفدەکرد، لەو شەوەدا جەلادەتی کۆتر بۆ دووەم جار وەک مۆسیقار لە دایکدەبووەوە، لەو شەوەدا وەک شێت فلووتی لێدەدا، وەک شێت ئەو پیاوە قەڵەوەی دوای خۆی دەخست و بەو کێڵگەو دەشت و باغاتە پەژمووردانەی دەوروبەردا بە دەم ئاوازەوە دەیسووڕانەوە. ئێستا دڵنیابوو کە جارێکی دیکە خۆی دۆزیوەتەوە، دڵنیابوو دەتوانێت ئەو مۆسیقارە لە ڕۆحی خۆیدا ببینێت کە چەندین ساڵ لەوەوبەر لە شارێکی پڕ تەپوتۆزی باشووردا مردبوو.

ژیانی جەلادەتی کۆتر لەو شەوەوە ئیقاعێکی خێراتر وەردەگرێت. لەگەڵ مستەفای شەونمدا تابلۆکان و نامەکان و کتێبەکان دەخەنە نێو ئەو پێشانگا نهێنییەوەو بە ڕیواقە سیحراوییەکانی ئۆقیانوسی هاواردا سەفەرێکی درێژ بەرەو لای موسای بابەک دەکەن. جارێکی دی دەچنەوە ناو ئەو شارە جەنجاڵە، دەرگای ئەو عیادە کۆنە دەدۆزنەوە، لە زەنگەکە دەدەن، موسای بابەک دەیکاتەوەو دوای لێدابڕانێکی درێژی دیکە باوەش بەو کوڕە سەرسامەی خۆیدا دەکاتەوە کە بۆنی شارێکی لێدێت دەکەوێتە ئەودیو ژیانەوە. ئێستا موسای بابەک دڵنیابوو ئەو پەیامنێرەی لە ئۆقیانوسی هاوارەکانەوە ناردویانە بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان بە سەلامەتی سەفەری ئەفسوناویی خۆی جێبەجێکردوە. دڵنیابوو ئەو مۆسیقارەی ناوی جەلادەتە سوڕێکی گەورەی ژیانی خۆی تەواوکردوە و بەدەوری ترسناکترین بازنەیەکی دونیادا سوڕاوەتەوەو گەڕاوەتەوە سەر ئەو خاڵەی لێوەی دەستیپێکردوە. موسای بابەک ئێستا خولیایەتی بڕوات و ئەو کتێب و تابلۆیانە ببینێت کە جەلادەت لە مردن ڕزگاریکردون. لە شەوێکی ڕەشدا پێکەوە سەمادەکەن، موسای بابەک کەمانچە کۆنەکەی دەردەهێنێت و ئاوازە غەمگینەکانی خۆی دووبارەدەکاتەوە، جەلادەت بە فلووتەکەی پێشیان دەکەوێت و وەک سێ مەست بە شەقامە تاریکەکانی شەوێکی ڕەشدا بەرەو ئەو دالانە نهێنی و تونێلە پڕ ئەستێرانە دەگەڕێنەوە، بای تۆزێکی زیوین بەسەر سەریاندا هەڵدەکات، مانگ لە سەقفە شوشەییەکانی ئەو ڕێگایەدا شەویان پڕدەکات لە گەردێکی زێڕین کە وەک بارینی پولەکە بەسەر دڵیاندا دەبارێت. گوڵاوی عەترێکی ئەبەدی لە ڕێگاکاندا بێهۆش دەیانخاتە دوای فریوی باغێکی خەیاڵی، ڕێگای وەها تەیدەکەن کە پڕە لە تاقی گەورە گەورە کە سەرتاپایان بە چرای زێڕین و گوڵدانی بلوورین گیراوە، بە ژێر کەوانەی زێڕ و تونێلی پەلکەزێڕینە و تاقی تەلادا گوزەردەکەن. لە هەر وێستگەیەک و پاسەوانێک دوایان دەکەوێت،

دەڕۆن و لە هەموو شوێنێک هەواڵی گەڕانەوەی قەقنەس بۆ پاسەوانەکان جێدەهێڵن، ئەو پاسەوانانەی کە لە هەر جێگایەک بن گوێیان لە دەنگی فلووتەکەی جەلادەتی کۆترە کە زەمین و زەمان دەبڕێت و دەرگایەکی تر لە ناو ڕۆحدا دەکاتەوە. جەلادەت هەندێجار ئاوڕدەداتەوەو ئەو پاسەوانانە دەبینێت کە پێکڕا وەک مەست لە دوایەوە دەڕۆن، هەندێکیان دەناسێت و هەندێکیان ناناسێت، سیمایان بە سیمای مرۆڤە تەنیاکانی سەر شەقامە سپییەکانی ئەو شارە دوورە دەچێت، کە تا ئەو کات هالاوی تەم و غوباری تیشک و پرشنگی ساتە سیحراوییەکانی لە هەناسەی ئەودا بوو. ئێستا ئەو لە پێشەوە دەڕۆیشت و ئەو لەشکرە لە کاهینانی جوانی لەدوایەوە بوون... مرۆڤی ئاسایی بوون، لە جلی ئاساییدا، لە شاری زۆر ئاساییەوە هاتبوونە خوارێ و بەم ڕیواقە درێژەی ناو ئۆقیانوسی هاوارەکاندا دەهاتن تا سەیری جوانی بکەن کاتێک لە مردن دەگەڕێتەوە، سەیری مرۆڤ بکەن کە لە خۆڵەمێشی سووتانی خۆی هەڵدەستێتەوە، گوێ لە مۆسیقا بگرن کە دوای کوژرانی مۆسیقارەکان زیندوودەبێتەوە.

دوای ڕێڕۆیشتنێکی درێژ بە نزیک چەندەها شارو بە ژێر چەندەها ئاوەدانیدا گەیشتنەوە ئەو مەخزەنە خاپوورانە، لەوێکانەدا هەمووان بۆ یەکەمجار سەیری ئەو بارە گەورەیەیان کرد کە پیاوێک لەسەر کۆمەڵێک ئەسپی سپی هێنابوویەوە بۆ دونیا، دەیەها پەرۆش و پاسەوان و شەیدای جوانی بوون، یەکە یەکە تابلۆکانیان دەردەهێنا و تەماشایاندەکرد، ئەو تابلۆیانەی لە بەر نیگای ئەوان جوانی بوو لە سافترین و بێگەردترین شێوەیدا. بەڕێز فیکەیان بۆ سیحریی ئەو نیگارانە لێدەدا کە هەر یەکەیان نهێنییەکی قووڵتری لە نهێنی تابلۆ ناودارەکانی دونیا تێدابوو، تابلۆی ئەو درەختانەی لە ئاسمانەوە کەوتوونەتە خوارێ و ئەستێرەیان لێدەبارێت، ئەو گوڵانەی گەشاونەتەوەو منداڵ لە ناو شەونمی سەر گەڵاکانیاندا خەوتووە، ئەو کتێبانەی لە کەشتییەک دەچن لە دەریایەکی تووڕەدا فریشتەی

ترساو دەپەڕێننەوە، ئەو مامۆستایەی لقێک زەیتونی بەدەستەوەیەوە سەیری گۆمێکی خوێنین دەکات و قوتابییەکانیشی لە دوایەوە تەماشای هەمان دیمەن دەکەن. دیمەنی شاعیرێک لە ساتی نوسینی قەسیدەیەکدا دەستی وەک چنگی تورەیی گیانداریکی کێویی لێهاتووە، پادشایەک لەسەر عەرشەکەی خەوتووەو یەک دڵۆپ خوێن لە چاوی هاتۆتەخوارێ، تابلۆی کۆمەڵێک باڵندەی بەردین، کە لە ژێر ئاسمانێکی بەردین و بەسەر زەوییەکی بەردیندا دەفڕن. دیمەنی هەورێک بەر ئاوێنەیەک کەوتووە خۆی خوێنی لێدێت و ئاوێنەکەشی شکاندوە. دوو باڵدار یەکدیان خواردووەو جگە لە ئێسکەکانیان تەنیا دەنووکیان بە ساغی ماوەتەوە، سێ فریشتە لە مەلەکوتەوە بۆ ڕزگارکردنی پاسارییەک دابەزیون.

ئەو تابلۆیانە دەهاتنەوە تا لەم ئۆقیانوسە گەورەیەدا بپارێزرێن، تا دەستی مرۆڤ بیانگاتێ، تا چاوی مرۆڤ لەزەت لە جوانییە قووڵەکانیان ببینێت، تا ڕۆژێک لە ڕۆژان بگەڕێنەوە بۆ ناو پێشانگاکان، بۆ مۆزەخانە گەورەکانی هونەر و لە ڕیواق و دالانە هێمنەکانی ئەو سالۆنانەدا بۆ هەتاهەتایە بژین.

شەوێک بوو لە شەوە هەر جوانەکان، موسای بابەک لە ناوەڕاستی هەموو پاسەوانەکاندا بە سەرە سپی و برۆ سپی و چاوە کزەکانییەوە دەوەستا، چاوی کزدەکردو دەیگووت: ئێمە کۆمەڵێک خەڵکین لە ڕۆژە سەختەکاندا دەستمانبرد و لە ناو ئاگرو خۆڵەمێشدا جوانیمان ڕزگارکرد، بەڵام تەنیا یەک کەس، یەک کەس لە ئێمە توانی شوراکانی مردن ببڕێت و بڕوات لە پشتەوە لە ناو زەریای تاریکیدا، لەو شارە دوورەی کە ئێمە تەنیا وەک سەرابێک ناویمان دەبیست جوانیمان بۆ بهێنێتەوە. من چەند ساڵ لەوەوبەر کە لە شەوێکی تاریکدا خانمێک ناوی کیومەرسی یەزدانی خوڕەمی بۆ هێنام، ئەو ناوەی منی لە پێچاوپێچێکدا ونده‌کرد تا دەیگەیاندمە سەر عەشقێکی کۆن و دەیخستمە سەر دەرککردن بە نهێنییەک

بە نادیارەوە گرێمدەدات. ئەوکات من هیچ... هیچ شتێکم نەدەزانی، هەتا ناوی ئۆقیانوسی هاوارەکانیشم نەبیستبوو، عاشقێکی جوانی بووم خەونم بەوەوە دەبینی ڕۆژێک مۆزەخانەیەکی هونەری بۆ خۆم دروستبکەم ناوم بخاتە مێژووەوە. شەوێکیان لەگەرمەی هەڵواسینی تابلۆیەکدا بووم، لە ناکاو دەرگای ئەو ئۆقیانوسە سەیرەم لەسەر کرایەوە، دەرگای ئەو ڕێگا دوورودرێژەی منی دەبەست بە هەمووتانەوە، ئێوەی شەیداکانی هونەر. ئەم ئۆقیانوسەی کە نە سنووری هەیەو نە کۆتایی، زەریایەکە کە شەپۆل دەدات و دەڕوات، شەپۆل دەدات و دەڕوات. بەرەو سنووری ئەودیو ژیان و ئەو دیو مەرگ. ئاە... ڕۆژگارێک من شاری مۆسیقارە سپییەکانم بە خورافەت دەزانی، بێئەوەی بزانم کە هەموومان لەسەر ڕێگای ئەو شارەدا وەستاوین، هەموومان پڕین لە جوانی کوژراو، پڕین لە هاواری کوژراو. ئێستا بۆ یەکەمجار من یەکێک دەبینم لەوێوە دەگەڕێتەوە، تۆ ئەی هاوڕێی ئازیزمان، ئەی ئەوەی کە لەبری هەموومان ڕۆیشتیت و لە بری هەموو سەرنشینەکانی ئەو شارە هاتوویتەتەوە چیرۆکی خۆتمان بۆ بگێڕەرەوە، حیکایەتی ئەو شارەمان بۆ بگێڕەرەوە کە لێوەی هاتوویت.

ئەو شەوە جەلادەت لە ناو پاسەوانەکاندا دانیشت و چیرۆکی خۆی گێڕایەوە، چیرۆکی سووتان و هەستانەوەکانی، چیرۆکی بینینی بۆ شوراکانی شارێکی سپی، پێشوازی ئیسحاقی لیوزێڕین، گەشتی دوورودرێژیی لە ناو شارێکدا کە هیچ مرۆڤێک، هیچ باڵدارێک ناتوانێت ئەمسەرەو سەری تەییکات. پاسەوانەکان بە شەوقەوە بۆ یەکەمجار گوێیان لەو قەقنەسە گرت کە دەیگووت: جار دوای جار دەبێت بڕۆم و هیوای کوژراو بهێنمەوە، حەقیقەتی یادکراو بهێنمەوە.

پاسەوانەکان سەرسامانە سەیریاندەکرد، هەندێکیان یەکەمین جار بوو لە ژیانیاندا قەقنەسێک ببینن، هەندێکیشیان پێشتر چەندەها قەقنەسیان کۆنکردبوو. جەلادەت فلووتی لێدەداو ئەوان بە مۆسیقاکەدا دەیانزانی ئەو

مۆسیقاری هەرێمێکی جاویدانە. دکتۆر بابەک وەک سەرەک خێڵێک تابلۆو کتێبەکانی بەسەر پاسەوانەکاندا دابەشدەکرد، هەر یەکەو دەبایە بەشێک لەو خەزنە گەورەیە بپارێزێن، ئەو گەنجینەیە موڵکی یەک شوێن، یەک جێگا، یەک مرۆڤ نەبوو، موڵکی تەواوی مرۆڤەکانی ئەم دونیایە بوو، دەبووایە هەموو پاسەوانەکان پێکرا هەڵیگرن و بیپارێزن. دەبایە لە یەک کاتدا لە زۆر شوێنی دونیادا دابەشبێت، وەک ئەوەی ئەو دابەشکردنە لە دەستوورێکی نهێنیدا نوسرابێت، کە لە مێژە شاری مۆسیقارەکان بەم ڕۆحە پەرۆشانەی جوانییەوە گرێدەدات. ئەوەی دەمایەوە تابلۆی شاری مۆسیقارە سپییەکان بوو کە قەقنەس خۆی دەبایە دابەشییکات، نامەکان بوو، نامەی ئەو ڕۆحە غەمگینانەی جەلادەت خۆی دەبایە دەرگا بە دەرگا بیانبات.

پاسەوانەکانی جوانی بەشی خۆیان دەبرد و دەڕۆیشتن، ئەوەی دەمایەوە جەلادەت و موسای بابەک و مستەفای شەونم بوو کە هەر سێکیان پێکەوە لەو سەردابە نهێنییە دەهاتنەدەرێ و لە ئێوارێیەکی درەنگدا بۆ پیاسەیەکی درێژ لە ماشێنەکەی مستەفای شەونمدا بەو شارە گەورەیەدا دەردەچوون، ئەو ئێوارەیە موسای بابەک شتەکانی وەها تەفسیردەکرد کە کیومەرسی یەزدانی خورەم و سەلوا طحان دوو کەسن لەو بازنە گەورەیەدا کە دەبایە تابلۆی مۆسیقارە سپییەکان بە ناویدا بسوڕایەتەوە تا دەگاتە دەست ئەو، ئەو سوڕە مەزن و بێبڕانەوەو ناکۆتایە کە لە ڕێگایەوە هونەر بێ گوێدانە بەربەستەکانی کات و شوێن ئادەمیزادەکان پێکەوە گرێدەداتەوە.

بەو شارەدا دەگەڕان و موسای بابەک بە جۆرێک سەرقاڵی تەفسیری نهێنییە گەورەکانی ژیانی خۆی بوو، هیچ شتێکی یادنەبوو... لەو ئێوارەیەدا زۆر درەنگ موسای بابەک لە پێشی ماشێنەکەدا نامەیەکی لە گیرفانی چاکەتە کۆنەکەی دەردەهێنا، چاوەکانی کزدەکردو بە دەنگێکی نوساو،

دەنگی ڕۆحێک لە مێژە ئامادەیە بۆ مردن، دەیگووت: جەلادەتی کۆتر، لە مێژە ئەم نامەیەی تۆم لایە، ئەمە نامەی تۆیە، یەکێکی خۆشەویست بۆ تۆی نوسیوە.

جەلادەت نامەکەی وەردەگرت و دەیکردەوە، بەر لەوەی حەرفی یەکەمی بخوێنێتەوە، سەیری ژێرەکەی دەکردو ناوی دالیا سیراجەدینی دەبینی کە بە خەتێکی ورد لە بن ناوەکەیەوە نوسیبووی «کچی پوری خۆت کە دونیات بە دوادا دەگەڕێت... تریفەی زستان».

* * *

دالیا سیراجەدین لە نامە درێژەکەیدا نوسیبوو «کوڕی پوری ئازیزم بیرتدەکەم، هێندە بیرتدەکەم، دەترسێم گەر بێم بۆلات ڕێگاکان لە ئیشتیاقدا بسووتێن» ئەمەیان ڕستەی خۆتە، بیرتە وەک شێت دەوەستایت و ئەو جۆرە قسانەت پێدەگووتم. کوڕی پور تۆ لە کوێیت، من هاتم، ڕۆژێکی باران هاتم و ئەو ئوتێلەم دۆزییەوە، ئەو ژوورەم دۆزییەوە، بەڵام ژوورێکی خاڵی بوو، پڕبوو لە سەرمای بەجێماوی زستان. هەموو شتێکی لێبوو تۆ نەبێت، تۆ کوڕە پورە درۆزنەکەم، من دوای تۆ لەگەڵ هەموو لێقەوماو بریندارەکاندا بە تونێلێکی درێژ و پڕ ئەستێرەدا ڕۆیشتم، خۆشحاڵم توانیم دەیان خەڵک لە مردن ڕزگاربکەم، لەو ڕێگایانەدا منداڵم هەڵگرت و پیرم لە مردن ڕزگارکرد. لەگەڵ دکتۆر بابەکدا چووم بۆ شارێکی گەورە گەورەو لەوێ کۆمەکم کرد، چەندین مانگ لەوێ ژیام، کوڕی پورم پێدەچێت باوەڕنەکەیت، من نەمردم... نەمردم. دەزانم تۆ باوەڕ بە من ناکەیت، بەڵام من چۆنت بۆ دەگێڕمەوە ئاوهابوو، دکتۆر بابەک عیادەیەکی هەبوو، من بێئیش بووم، شوێنێکم نەبوو ڕووی تێبکەم، تۆم نەبوویت، نەمدەزانی کوڕە پورە بێسەفەتەکەی خۆم چی لێهاتووە، ئاه... دەزانم ئێستا دەڵێیت من

بێسفەت نیم، دەزانم درۆدەکەیت، دەڵێیت هەموو شەوێک منت لە خەوتدا بینیوە، دەڵێیت تۆم لەسەر قادرمەکان دەبینی، تۆم لە باڵکونی ئەو ئوتێلە سووتاوەوە دەبینی. بەڵام دەزانم تۆ درۆ دەکەیت، تۆ درۆزنترین کورێکی لە دونیادا بژی، ئێستا هیچ کەسێکی تر لەسەر ئەم ئەستێرەیە لە تۆ درۆزنتر نییە. قەیناکا، با من خراپ بم، با ئەم کچە پورە بەدبەختەی خۆت خراپ بێت. ڕۆژێک بەدوای باسمی جەزائیریدا بەرەو شارەکانی باشوور کەوتمەوە ڕێ. ئێستاش دڵنیانیم ئاخۆ ماوە یا مردووە، دڵەکەی من باوەڕبکە نازانم ئاخۆ باسم لە دۆزەخە یان لە بەهەشت، لەسەر زەوییە یاخود لە ژێر زەویدایە، لە مەلەکووتی خودادایە یا لە ژێرزەمینە تاریک و نوتەکەکانی دەوڵەتدا، زۆرجار دڵنیادەبم لە مردنی، ئاسوودە واز لە هەموو شتێک دەهێنم و شەوان بە ئارامی لێی دەخەوم، هەندێجاریش لە ناکاو سێبەرەکەی لە ژیانمدا دەردەکەوێتەوە. نا جەلادەت دەزانم ئێستا پێم دەڵێی کچێکی بێبەزەیی و دڵڕەقیت کە حەزت بە مردنی خۆشەویستەکەی خۆتە... کورە پورە بێشەرمەکەی خۆم، کورە پورە بەدبەختەکەی خۆم، من بەزەیم بەودا دێتەوە، بەزەیم بە ئازارو چاوەڕوانی و تەنهاییەکەیدا دێتەوە، من دوای ئەو هەموو گەڕانە، جارێکی تریش، ساڵێکی ڕەبەقی دی شار بە شارو گوند بە گوندی باشووری بە دوادا گەڕام و نەمدۆزییەوە، بەڵام وەک جاران تارماییەکەی دەبینم... وای کورە پورە بێحەیاو بێشەرمەکەی خۆم، هەتا باسمیش وەک جاران نییە، هەموو شتێک دەگۆڕێت، هەتا تارماییەکانیش دەگۆڕێن، ئێستا سێبەرەکەی لە دوورەوە تەماشامدەکات و دەڕوات و قسەم لەگەڵدا ناکات. ئای جەلادەت تۆ چەندە خەفەتت دامێ، ها پێمبڵێ دۆسییەکەت بۆ هەڵگرتووم یان نا؟ خودایە چەندە بیرتدەکەم. دەزانم ئێستا دەپرسیت: دالیا پەرییە چکۆلانەکانت ماون؟ نا جەلادەت نا، ئەو فریشتانە دەمێکە وازیان لێهێناوم، ڕۆژێک ویستم سەرلە نوێ ئەو شارە بدۆزمەوە، بچمەوە بۆ پرتەقاڵی سپی، هەموو بیابان گەڕام،

سەرتاپای ڕێگاکانی خۆرئاوای فوراتم تەیکرد، لە هەموو گوندو شارۆچکەو هۆبەو دیارێکدا پرسیاری ئەو شارەم کرد، جگە لە حیکایەتێکی سەیر هیچی ترم نەبیست، حیکایەتی شارێک کە وەک کەشتییەکی گەورە بە ناو لمدا سەفەردەکات، هەندێجار دەردەکەوێت و هەندێجار وندەبێت. شارێک بەردەوام دەسووتێت، ڕەنگە جەلادەت ئێستا بەشێک لە ڕۆحی ئێمە لە ناو ئەو شارەدا بێت و بسووتێت... ئەو شەوەی کە فایلەکەم دا بە تۆ وامدەزانی دەمرم. لە هەموو دڵەوە ویستم بەڵگەی بێگوناهی و مردنی ئەو کوڕە بەستەزمانە لای تۆ بێت، دەمگووت خودایە گەر ڕۆژێک لە ڕۆژان چیرۆکی من و ئەوی گێڕایەوە با هەموو شتێکی لەلابێت، بۆ وا هەستدەکەم کە تۆ ڕزگارماندەکەیت، نازانم... بۆ؟...»

نامەیەکی سەیر بوو، لە پشت دێڕەکانەوە کاراکتەری ئەو کچەم دەبینییەوە کە لە یەککاتدا دەیتوانی زۆر شپرزەو زۆریش بە ویقار بێت. لە خواری خواری نامەکەدا ناوی بنکەی ڕێکخراوێکی بیانی هەبوو کە لە هەرێمە شاخاوی و گوندنشینەکانی کوردستان خەریکی لێدانی بیر و کردنەوەی قوتابخانەو پەیداکردنی پەین و ئامۆژگاریکردنی جووتیاران بوون. سەیربوو لەلام دالیا سیراجەدین ڕاستەوخۆ بەوجۆرە لە باشوورەوە فڕیبوو بۆ باکوور و لەو ڕێکخراوە خێرخوازەدا بوو بوو بە وەرگێڕی ئینگلیزی.

کە موسای بابەک ئەو نامەیە دەدات بە جەلادەت وەک شێتی لێدێت، وەک جانەوەرێکی لێدێت ساڵەهای ساڵ لە قەفەزدا بووبێت و لە ناکاو دەرگای قەفەزەکە کرابێتەوە. بە هەموو هێزی خۆی ڕادەکات، دەبێتە کڵپەیەک لە بێسەبری کە چیتر ناتوانێت ئارامبگرێت. دەرگای ماشێنەکە دەکاتەوە و بێمالاوایی بە هەموو چیاو پێدەشت و بەردەلانەکانی ئەو هەرێمەدا ڕوودەکاتە ئەو ناونیشانە، وەک جانەوەرێک غەریزەکانی پێشیبکەون بە دۆڵ و سەختەنەکاندا هەڵدەگەڕێت. هەموو شەو بە ڕێشێکی درێژو جەستەیەکی

لاوازو درێـژەوە وەک چەقڵێکـی تەنهـا بـە تاریکیـدا دەڕوات، جگـە لـە دالیـا سـیراجەدین ناتوانێت بیر لـە هیـچ شـتێک بکاتـەوە، گیاکان و هـەورەکان و ڕەشـەبای دوور پێکڕا نـاوی دالیـا دەدەنـەوە بـە گوێیـدا، شـەپۆلە شـێتەکانی هـەوا و تریفـەی مانگ و جریوەی ئەسـتێرەکان هەمـوو نـاوی دالیایان دەهێنـا. دوای دوو ڕۆژ ڕۆیشـتنی بێوچان نیوەڕۆیەکی پاییز دەگاتە ناونیشـانی ئـەو کەمپـە، لـە بەردەرکـی ڕێکخراوەکـەدا پاسـەوانەکان پێیدەڵێـن خاتوونـی دالیـا سیراجەدین لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتی پڕۆژەکاندا کە پیاوێکی ئوسـترالییە، لـە گەشـتێکی درێـژە و تـا هەفتەیـەک ناگەڕێتـەوە، جـەلادەت بێئـەوەی مانـدوو ببێت بە کێو و دارسـتانە چڕەکانی دەوری کەمپەکـەدا هەڵدەگەڕێت و لەوێوە لەسـەر درەختەکانـەوە فلووتـە سـیحراویەکەی خـۆی لێـدەدات، هەفتـە لـە دوای هەفتـە دەڕوات و دالیـا ناگەڕێتـەوە، پاییـز تـا دێـت توندتـرو هـەوا تابێـت سـاردتر و ئاسـمان تابێـت گرژتردەبێـت. هەمـوو شـەوێک جـەلادەت لەسـەر درەختێکـی بـەرز کـە دەکەوێتـە سـەر یاڵێـک بـە پشـتی ئـەو بنکـە تایبەتییـەوە کـە بیانییـەکان بـۆ کۆنترۆڵکردنـی ئیشـەکانی خۆیـان دروسـتیانکردوە، فلـووت لێـدەدات. دوای بیسـت و شـەش ڕۆژ لـە سـاتێکدا وەک دەروێشـێکی بێخـەو و مانـدوو دەیەوێـت بچێتـەوە ئـەو کونـج و بنبـەردەی بـۆ خـەوی شـەوانەی خـۆی خۆشـیکردوە، گوێـی لـە دەنگـی دالیـا دەبێـت لـە تاریکیـدا بانگیـدەکات «جەلادەتـی کۆتـر، تـۆ لـە کوێیـت، تـۆ لـە کوێیـت»... وەک دواهەمیـن شـەو کـە لـە شـاری تەپوتـۆزە سـپییەکان بانگیکـرد، وەک دواهەمیـن شـەو کـە لـە نـاو زرمـەو گرمـەی خومپـارەو موشـەکەکاندا بانگیکـرد کاتێـک دەیزانـی ئـەو دەنگـە دەنگـی دالیایـە، بـەڵام وایدەزانـی لـە دونیایەکـی تـرەوە دێـت، لـە ئاسـمانەوە دادەبەزێـت، لـە شـوێنێکی نادیـاری نـاو وجـودەوە بانگیـدەکات. لـەو سـاتەدا لـە نێـوان ئـەو دوو بانگـەدا، کـە هـەر دووکیـان یـەک بانـگ بـوون، یـەک هاواربـوون هەسـتیکرد ژیـان چ سـوڕێکی مـەزن و کوشـندەی خـواردووە، هەسـتیدەکرد ئـەوەی زەمـان بردویەتـی بـە یـادەوەری ناگەڕێتـەوە. لـە نـاو درەختەکانـدا

بە خۆی و فلووتەکەیەوە بەرەو لای ئەو دەنگە ڕایکرد، دەنگی کچێک لەسەراب، کچێک هەتا کە باوەشیشی پیاکرد، کاتێک دوای ئەو هەموو لێکدابڕانە بۆ یەکەمجار ئاوها لە نزیکەوە ماچیکرد هێشتا هەر سەراب بوو و هەر تەم بوو، هەر خەیاڵ بوو.

دالیا کە لە پەنجەرەکەی خۆیەوە گوێی لەدەنگی فلووتەکەی بوو، بێئەوەی بیربکاتەوە دڵنیابوو ئەوە مۆسیقای جەلادەتی کۆترە، هەمووی چەند سەعاتێک بوو گەڕابووەوە بۆ کەمپەکە، پانتۆڵێکی کاوبۆی کۆن و تیشێرتێکی بێجی و کاپەیەکی کچانەی شینی لەسەردا بوو. کە باوەشی بە جەلادەتدا کرد هەناسەی وەها توندبووبوو قسەی بۆ نەدەکرا، سەرکەوتن بەو یالە بەرزەدا، گوێگرتن لەو مۆسیقایە، دوودڵی و گومانی لە بینین و دۆزینەوەی جەلادەت بڕستیان لێبڕیبوو. لە ناو دارودرەختی ئەو کێوەدا، لە ناو کزەبای شەوێکی دڵڕەقدا لە ئامێزی جەلادەتدا وەک منداڵێکی چکۆلە دەستیکرد بەگریان، ئەو چەند ساڵە کەمێک پیری کردبوو، بەڵام جەلادەت لە ژێر شەوقی مانگەشەودا جوانتر دەیبینی. جەلادەت پێیدەگووت: من چەند هەفتەیە لێرەم، دەیان شەوە چاوەڕوانی تۆم. لەو ساتەوەی کە دکتۆر بابەک نامەکەی تۆی دامێ، وەک شێت ڕامکرد، دالیا ئەم هەموو ساڵە تۆ لە کوێیت، تۆ لە کوێیت، بۆ نەهاتی لەگەڵمدا، بۆ بەجێتهێشتم؟

دالیا دەگریا، وەک گریانە هیستیری و بێبڕانەوەکانی خۆی، ئەو گریانانەی ساڵۆنەکەی تیاتری پرتەقاڵی سپی بیر جەلادەت دەهێنایەوە. دوای ئەو هەموو ساڵە، ئازار و زیندان و سەختی جەلادەتیان فێری شتێک ویقارو سۆزی کوڕانە کردبوو، فرمێسکەکانی بۆ دالیا سڕی و لە نێوان فرمێسکەکاندا گوێی لەو چیرۆکە سەیرو دووروودرێژەی دالیا گرت کە تا قووڵتربیایەتەوە، دەنگی دالیاش ئارامترو سینەی هێمنترو فرمێسکەکانی کەمترو درەوشاوەتر دەبوون.

دالیا هەموو شتێکی لەسەر جەلادەت دەزانی، لەو کاتەوەی مستەفای شەونم جەلادەتی بە موسای بابەکەوە گرێدایەوە، لەو کاتەوە دالیا عەودالی جەلادەت بوو. ڕۆژێک دوای سەفەرێکی درێژ لە شارە خاپوورەکانی باشووردا بە کزەی زستانی بیابانەکانەوە لە لەشیدا خۆی دەکاتەوە بە عیادە چکۆلەکەی موسای بابەکدا، ئەو یەکەمین جار هەواڵی دەرکەوتنەوەی جەلادەتی دەداتێ، ناونیشانەکەی بۆ دەنوسی و لە ماشینێکی تایبەتی و بە شۆفێرێکی ناسیاودا دەینێرێت بۆ باکوور. کە دالیا دەگاتەوە ئەو شارە دێرینەی خۆی، شاری دڵدارییە کۆنەکان و شاری عەشقە منداڵەکانی جاران، هێشتا ئەو ترسە لە گیانیایەتی کە چەندەها ساڵ لەوەوبەر تورەیی براکانی لە دڵیدا سەوزیانکردبوو، ئەگەرچی دەیزانی برایەکی مردووەو برایەکی تری ئیفلیجی نێوجێگایە، بەڵام لە هەموو شتێکی ئەو شارە دەترسا، لە شەقامەکان، لە کوچە باریکەکان، لە درەختی نیوەگیانی سەر ڕێگاکان، لە دیواری بەرزی قوتابخانەکان، لە بۆنی چەک لەسەر سوچەکان، هاڵاوی باران لە هەوادا، بۆنی تەڕی کۆتر لە سەر درەختەکان. تەنیا بۆ دۆزینەوەی جەلادەت دێتە ئەو شارە، ڕاستەوخۆ ڕوودەکاتە ئەو ئوتێلە، دەچێتە ئەو باڵەخانە سووتاوە، ڕۆژێکی ساردی زستانە، بارانێکی خوڕ دەبارێت، دالیا وەک شێت دەگەڕێت و جەلادەتیش لە مێژە لە نێوان زیندانەکاندا هاتوچۆدەکات. لە قاتی شەش کەس نابینێتەوە، دراوسێکانی هەواڵی گیرانی جەلادەتی دەدەنێ، بەڵام باوەڕیان پێناکات. بەو ترسە قووڵەی خۆیەوە هەموو شار دەگەڕێت، لە زۆر کوچەو کۆڵاندا هەواڵی جەلادەت ناوێک دەپرسێت، بەڵام کەس نابینێت وەها ناوێکی بیستبێت. باران تەڕیدەکات و دەگەڕێت، گەشتێکی درێژ بە بازاڕو کوچەکاندا دەکات، گەڕانێکی شپرزە کە کەمێک ترسی دەڕەوێنێتەوە. بەردەوام باران دەبارێت و بارانیش منداڵی و گەنجی بە یادا دەهێنێتەوە، هیچ شتێک وەک ئەو بارانە کاریگەری لەسەر یادەوەرییەکانی نییە، تک تک باران بە قژیدا دێتەخوارێ، سەرتاپای

تـەڕدەكات، وەک شـێت وازناهێنێت، پیاوانـی بـازاڕ و گەنجانـی برسـی نـاو گوزەرە تەسکەکان سـەیریدەکەن و دەزانن هیچی لـە خانمـە بـە ویقارەکانی ئـەو شـارە ناچێت، کە بەپێی ئەندازەیەکی تایبەتی دەمیاندەکەنـەوە، دایدەخەن، هەنگاو دەنێن، سـەیری ئەملاولادەکـەن، هەتا لە زەردەخەنەشـدا بڕی هەڵبڕین و دانانی لێو قانونـی تایبەتـی خۆی هەیە. کچانی ئـەم شـارە خەڵکێکن ناهێڵن باران لێیـان بدات و ناشـهێڵن کراسـەکانیان هێند تەڕببێت سـتیانەکانیان لـە ژێرەوە دەربکەوێت، بـەڵام دالیا هیچی لـە خانمـە بـە حورمەتەکانی ئەو شـارە ناچێت، شـەرمناکات لـەوەی بپرسـێت کە لـەدوای کوڕێکە بـە نـاوی جـەلادەت ئیسماعیل، شـەرمناکات باران وەهـا تەڕیبکات مەمکدانە پەمەییەکـەی دیاربێت کـە حەیاچوونێکـە گاڵتـەی پێناکرێت... ڕۆژێـک تـا ئێوارێ بـە ژێـر بارانێکی بێکۆتایـی زسـتاندا بـە کوچەو بـازاڕی ئـەو شـارەدا وێڵ دەبێت و بێچـارە و بێدەرەنجـام دەسـوڕێتەوە، کـە دڵنیادەبێت لـەوەی وەک هەمیشـە ڕێبوارێکی مایەپووچە، هەمـان شـەو دەگەڕێتـەوە بۆ لای دکتۆر بابـەک، کـە تـا ئـەوکات هەواڵی گیرانـی مسـتەفای شـەونم و جەلادەتـی نەبیسـتووە.

دوای مانگێـک لـەو ڕۆژە شـەوێکی سـارد، پیاوێکـی قەڵـەو بـە پاڵتۆیەکـی درێژ و کڵێتەیەکی گەورەوە کە لـە کڵێتـەی سـەرۆکە کۆمۆنیسـتەکان دەچوو لـەدەرگا دەدات، ئـەو پیاوە مسـتەفای شـەونمە کە دوای حـەوت مانگ ژیـان لـە زینداندا بێ تۆمـەت و بێ دادگا هاتۆتـەدەرێ. ئەوشـەوەش کە بە قیافەتـی دیکتاتۆرێکی ڕۆح سـووکەوە لـە دەرگای عیادەکـەی موسـای بابـەک دەدات پێنجـەم شـەوی ئازادییەتـی. بـەڵام لای دالیـا سـیراجەدین شـەوی کرانـەوەی نهێنییەکانـە، کاتێـک مسـتەفای شـەونم چیرۆکـی مردنـی پرتەقاڵـی بابلـی دەگێڕێتـەوە، دالیـا دەسـتدەکاتە گریـان، هـەر ئـەو شـەوە تـا بەیانـی هەمـوو شـتێک لەسـەر ژیانـی ئـەو چەنـد سـاڵەی جـەلادەت دەزانێت. دڵنیادەبێت جـەلادەت ئێسـتا لـە زیندانێکـی دووردایـە کـە دەبێت یەکێـک دەریبهێنێت. ئیدی تێدەگات کـە ئـەو مەحکومـە تـا کۆتایی بـەدوای دیلەکانـدا بگەڕێت،

سـەردەخاتە سـەر سنگی موسـای بابەک و دەڵێت «دکتۆر ئەمە چ وڵاتێکە تاهەتاهەتایـە دەبێت ژنـان بـەدوای پیـاوە دیلەکانـدا بگەڕێـن». بـەڵام وەک هـەر قەدەرێکی دیکـەی ڕەش، دالیـا بەرابـەری دەوەسـتێت. چـۆن سـاڵانێکی درێـژ ژیانـی خـۆی بـۆ گـەڕان بـەدوای باسـمی جەزائیریـدا تەرخانـدەکات، بڕیاردەدات بە دوای جەلادەتیشدا بکەوێتـەڕێ. ئەو لە ناخی دڵیدا دەزانێت ئەمـە دووبارەبوونـەوەی حیکایەتەکانـە، ئـەو دووبارەوەبوونـە ترسـناکەیە کـە دالیـا بەدرێژایـی ژیانـی لێـی دەترسـێت، دووبارەبوونـەوەی ژیـان وەک دووبارەبوونەوەی بیابـان و لـم و سـەراب، وەک دووبارەبوونەوەی شـارەکان و کوچـەکان و درەختـەکان. ئـەو شـەوە موسـای بابـەک بێباک بە ژوورەکـەدا پیاسـەدەکات و پێیاندەڵێت: ئێوە هیچ نازانن، جەلادەتـی کۆتـر، لـە ڕێگادایـە بۆ شـوێنێکی دوور، بـۆ جێگایـەک کـە تەنیـا قەقنەسـەکان دەیگەنـێ.

چەنـد ڕۆژ دواتـر دالیـا لـە پاسـێکی گـەورەدا بـە نـاو خاڵـە بێکۆتاییەکانـی کۆنترۆڵدا، بە نـاو بنکـەی یـەک لـەدوای یـەکی پشـکنیندا، لـە نـاو دوکەڵـی تـرس و هاڵاویـی جەنگە بێوچانەکانـی ناوخـۆدا دەگاتـەوە کوردسـتان، شـەوی یەکەم دەچێت بۆ لای شـاناز سـەلیم، ئـەو خانمـەی مسـتەفای شـەونم بـە دوپشـکی ژەهـراوی ئـەم چیرۆکـە ناویدەبـات. شـاناز لـە ژوورێکدایـە پـڕە لـە وێنـەی پرتەقـاڵ، بـە غـروری ژنێکـی دەوڵەمەنـدەوە کـە لەنـاو بۆنـی پـارەو بۆنـی مردنـدا ونبـووە پێیدەڵێت: من دەزانـم تۆ کێیت. تۆ ئەو قەحبەیەیت، جەلادەت لـە تیاترۆخانەکانـدا جوزەلـەی بـۆ لێدەدایـت. چاکتـرە خـۆت ماندوونەکەیـت، درەنـگ یـان زوو جـەلادەت بـە مردنێـک دەمرێـت خراپتـر لـە مردنـی هـەر سـەگێک کە پێش مردنـی وا ڕیسـوادەبێت توانـای وەڕینیشـی نامێنێت.

دالیـا سەرسـام لـە کینـەو ڕقـی ئـەو ژنـە دێتـەدەرێ و دوای سـۆراغێکی درێژ یەکەمین هەواڵـی جەلادەتـی لـە بەرپرسـێکی حیزبییـەوە دەسـتدەکەوێت کە پەیمانـی دەداتـێ گـەر لەگەڵیدا بخەوێت جەلادەتـی نیشـاندەدات، دالیا کە سـوێندی خـواردوە تـا مـردن لەگـەڵ هیـچ پیاوێکدا نەخـەوێت، لەبری لەشـی

خۆی دواهەمین ملوانکەی زێڕینی خۆی دەداتێ و پێیدەڵێت «من بە کەڵکی تۆ نایەم، ئەم ملوانکە زێڕە وەرگرە، ئەمە بۆ تۆ باشترە، گەر بیفرۆشیتەوە پارەکەی بەشی ئەوەدەکات لەگەڵ دە ئافرەتی لە من گەنجترو جوانتردا بخەویت».

ئەو بەر پرسە شەوێک لە شەوان دالیا سیراجەدین دەبات بۆ گوندێکی زۆر دوور، لە ماڵێکی چکۆلانەدا، لە ژێرخانێکی تاریکدا کە شوێنی بەستنەوەی ئەسپ و گوێرەکەو ئەو شتانەیە لە درزێکەوە جەلادەتی نیشاندەدات کە لەسەر زەویەکی تەڕ دانیشتووەو لە پشتەوە بە کۆڵەکەیەکی گەورەوە بەستراوەتەوە. دالیا لەو درزەوە هاواردەکات جەلادەت... جەلادەت. ئەو بێهێزو نیوەگیان سەربەرزدەکاتەوەو نایبینێت.

* * *

دالیا ئەو شەوە لەناو ڕەشەبای پاییزو لە ژێر ئەستێرەی سەرمابردەڵەو لە نابەین گەڵای لەرزیودا حیکایەتی خۆی بۆ جەلادەت گێڕایەوە پێیگووت: جەلادەت ئەوە دواهەمین جارم نەبوو کە تۆم بینی، شەوێک من لەگەڵ ئەو پیاوەدا پلانمان دانا تۆ بڕفێنین و گەر پلانەکەمان سەریگرت مل بۆ هەموو داوایەکی بدەم. نەمدەویست تۆ بەوجۆرە ئازار بچێژیت، دواجار هەموو شتێکمان ڕێکخست، بەتەمای شەوێکی تاریک بووین دابێت و ئازادتبکەین، لەو پلان و تیفکرین و ڕامانانەدا بووین کە دەستەو تاقمێکی تر تۆیان ڕفاندو هەموو شتێکمان لێهەڵوەشا و هەرچی نەخشەیەکمان هەبوو پووچەڵ بووەوە. بەلام جەلادەت، کوڕی پورم هەر لە دوات بووم، کۆڵم نەدا. لەگەڵ هەموو مەراق و دەردێکدا هەر لە دووت دەگەڕام. دەمزانی من چەند بەدبەختم، بەلام لەگەڵ هەموو غەم و بەدبەختییەکیشدا خۆم بە خۆشبەخت دەزانی، لە ماوەیەکی کەمدا ئەم ئیشەم دەستکەوت کە دەمتوانی بە هۆیەوە

لە کوردستان بمێنمەوەو پێی بژیم و بەدوای تۆشدا بگەڕێم. بچووبامایەتە هەر گوندێکەوە یەکەمجار دەمپرسی ئاخۆ زیندانی تێدایە یان نا، یەکەمجار لە ژن و منداڵەکان سۆراغمدەکرد، چونکە دەمزانی ئەوان ڕاستیم پێدەڵێن، ئەی چۆن جەلادەت هەموو وایاندەزانی من شتێکی گرنگم، شتێکم دەبێت هەموو مرۆڤێک هەموو شتێکم پێبڵێت. لەو سەفەرە درێژانەدا دووبارە دیلەکانم بینییەوە، ناو زیندانەکانم بینییەوە، خوێن و برسێتی و ڕیسوایی مرۆڤەکانم بۆنکرد، بەرلەوەی جارێکی تر تۆ ببینم سەدان زیندانم بینی. ئازیزم بەردەوام بیانوویەکم دەدۆزییەوە خۆم بە بەندیخانەکاندا بکەم و سەیربکەم بزانم کێی تێدایە، بەخودا، چۆنت بۆ دەگێڕمەوە وابوو... جاتۆ هەر باوەڕمەکە، کەیفی خۆتە، تۆ کەی باوەڕت بە من کردوە. تادواجار شەوێک لە گوندێک، منداڵێک بەڕاکردن هات و بەدەنگێکی منداڵانە پێیگوتم «دالیا خان... دالیا خان، دیلێکی تازەیان هێناوە بۆ مەکتەبەکە، دیلێکی زۆر خەتەرە...زۆر زۆر... لە دێو خەتەرترە، نابێت کەس کەس بیبینێت».

کوڕی پوری ئەزیزم، واڕێکەوت باوکی ئەو منداڵە پاسەوانی تۆ بوو، لە پەنجەرەکەوە تۆی نیشاندام، لەسەر زەویەکەِ بەدەستی بەستراوە خەوتبوویت، من بانگم لێکردیت جەلادەت... جەلادەت. تۆ سەیرتکردم و منت نەبینی.

دالیا شاژنی ئەو کەمپەبوو، ئەو جەلادەتی کۆتری برد و لە ژوورێکی تایبەتیدا جێگای بۆ چاککرد، سەرمای دوورودرێژی شەوگار تەزاندبووی، بینینەوەی دالیا وەک جۆرە لە دایکبوونێکی تازە وابوو، بەڵام بە ئەندازەیەک لاوازو ماندووبوو بە فلووتەکەی دەستییەوە لە سەر تەختێکی درێژ خەوی لێکەوت. دالیا دەرگاکەی لێداخست و لەودیو پەنجەرەکەوە بە ئینگلیزییەکی ساف کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکی جەلادەت بۆ ئەو پیاوە بیانییانەی کەوەک بۆ تەماشای مۆمیایەکی کۆن هاتبن، لە دەلاقەیەکی چکۆلەوە سەیریاندەکرد. یەکەمجار بوو لە کوردستان بەسەرهاتی مرۆڤێک ببیستن

بۆنی ئەفسانەیەکی خۆرهەڵاتی دێرینی لێبێت. بەڕای ئەوان کوردستان بە سروشتە شاخاوییە سەخت و خەڵکە جووتیارو شارە غەمگینەکانییەوە، شتێکی تێدانەبوو سیحری سەربوردە کۆنەکانی خۆرهەڵاتی هەڵگرتبێت، مرۆڤ لە ناو ئەو هەموو شاخ و کێوەدا ئاسەوارێکی کاراکتەرە گەورەکانی ئەدەبیاتی کۆنی خۆرهەڵاتی نەدەبینییەوە، ڕوخساری ئەو ژنە جووتیارو پیاوە قاچاغچی و تفەنگ بەدەستانەی ئەمسەر بۆ ئەوسەری کوردستانیان پڕکردبوو، شتێک لە یادگاری سەندباد، عەلی بابا، قمر الزمان یان بدر البدوریان زیندوونەدەکردەوە، بەشی هەرە زۆری خەڵک لە مەلا نەسرەدین یان مەلای مەزبوور دەچوون لەوەرزێکدا نوکتەی بیرچووبێتەوە. بیانییەکان سەرسام لەو چیرۆکە عەجیبەی دالیا بۆی گێڕانەوە یەکەیەکە لەو پەنجەرە چکۆلەیەوە لە برینەکانی سەر دەست و سینەی ڕادەمان. ئەو شەوە دالیا لەگەڵ سباستیان میوولەردا لە ساڵۆنی نانخواردنی کامپەکە بەدرێژیی قسەیان لەحیکایەتی ئەم گەنجەکرد. «سباستیان میوولەر» کەبەر لەوەی لە ئیشەکەی دەربکرێت، مامۆستایەکی ناسراوی ئارکیۆلۆژیای زانکۆی هایدلبێرگ بوو، لەو ماوەیەدا یەکێک بوو لە دۆستە نزیکەکانی دالیا، لە شارۆچکەیەکی خۆرئاوای ڕاینەوە هاتبوو، لە هەمووان سەرسامتر گوێی لە چیرۆکی جەلادەتی کۆتر گرتبوو، ساڵانێک دواتر دالیا لە نامەیەکی سەیرو پڕ نهێنیدا بۆ موسای بابەک باسی ئەو تەفسیرە سەیرانەی سباستیان میوولەری نوسیبوو. شەوێک «هێر میوولەر» دوای ئەوەی چەندەهاجار چیرۆکی جەلادەتی کۆتر دەبیستێت بەدەم خواردنەوەی بوتڵێک شەرابی سوورەوە گووتبووی: مسز سیراجەدین، ساتێک سەبرم لێبکە... ساتێک سەبر بابیربکەمەوە. ئۆە مسز سیراجەدین، تۆ ئەم بوونەوەرەت چۆن لەو چیایە دەستەمۆکرد، ئەمە پەیوەندییەکی بەتینی بە خوداوەندەکانی سروشتەوە هەیە. حیکایەتی ئەم پیاوە، بە جۆرێکی سەیر لەگەڵ چیرۆکی هەندێک خوداوەندەکاندا تێکەڵدەبێت و یەکتری دەبڕێت. لەگەڵ

چیرۆکی خوداوەند «پان» دا، لەگەڵ «کریشنا» دا، لەگەڵ «شیفا» دا. مسز سیراجەدین کەسەیریدەکەم، شتێک لە کریشنای تیادەبینم بە خۆی و فلووتەکەیەوە، فلووت ئامێری خوداکان بووە، بە درێژایی مێژوو، فلووت ئامێری خەلیقەت بووە، وەک شیفا کە بە خۆی و فلووتێکەوە بەدەوری گەردوندا سەمادەکات و جیهان دروستدەکات. من پێتدەڵێم ئەوەی فلووتێکی سیحراوی بەدەستەوە بێت دەتوانێت جیهانێکی سیحراوی دروستبکات. لای میسرییە کۆنەکان دەنگی فلووت دەنگی ئیزیسی خوداوەندی دایک بووە. نەک هەر ئەوەش، مسز سیراجەدین، فلووت دیاری خوداکان بووە بۆ ئادەمیزاد، لای هیندییەکان فلووت دیاری کریشنایە بۆ ئینسان، من لەسەفەری خۆمدا بە هیندا سەرنجی ئەوەمدا کریشنا هەردەم بە فلووتێک و پەڕێکی تاوسەوە وێنادەکەن. کریشنا بەپێی تەفسیری زمانەوانی مانای «هێزی ڕاکێشانی خودایی»، فلووتەکەی کریشنا ڕەمزی ئەو هێزەی ڕاکێشانەیە، حیکایەتی کریشنا لەگەڵ کیژە شیردۆشەکاندا کە بە ئاوازی فلووتەکەی یەک لە دوای یەک ڕایاندەکێشێت و دەیانخاتە سەر سەما، سەمبولی ئەو توانایەی فلووتە کە ژیانی تێپەڕ بە ژیانی جاویدانەوە گرێدەدات.

سباستیان میوولەر قژێکی زەردی درێژی هەبوو، بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە لەگەڵ دالیادا کاریکردبوو ئارەزوویەکی عەجیبی هەبوو هەموو شتێک بە ئەفسانە دێرینەکانەوە گرێبداتەوە، سیاسەت و دین و ململانێ جیهانییەکان بە چیرۆکی خودا گریکییەکان تەفسیردەکرد. بەر لەوەی بێت بۆ کوردستان لە کەمبۆدیاو سریلانکا و بۆسنە کاریکردبوو. ئەو شەوە یەک لەدوای یەک جگەرەی دەکێشا بۆ کورتە پیاسە هەڵدەستا، لە ساڵۆنی بلیاردەکەوە تەپلەکە جگەرەکەی هەڵدەگرت و لە یەخچاڵەکە ئاوی دەردەهێناو میوەی دەشتەوەو چاویلکەکەی دەسڕی و لەبەر پەنجەرەکەدا درێژەی بەقسەکانی دەدا: مسز سیراجەدین، فلووت لای کریشنا سەمبولی دەست بەرداربوونی مرۆڤە لە خودی خۆی بۆئەوەی جێگا بۆ ئاوازی

مەزن و ئاسمانی بکاتەوە. ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕادها خێزانی کریشنا لێیدەپرسی «خۆشەویستم، تۆ بۆ ئەم فلووتەت لە من زیاتر خۆشدەوێت؟ حەزدەکەم ئەم نهێنییەم لە زاری خۆتەوە گوێ لێبێت». کریشنا دەڵێت «ئەم فلووتەم خۆشدەوێت، چونکە زۆر سیفاتی قەشەنگی هەیە، بیر لە خۆی ناکاتەوە، ناوەوەی خۆی خاڵیکردۆتەوە بۆ ئەوەی جێگای هەموو ئاوازێکی تیابێتەوە».

سباستیان میوولەر کەمێک دەوەستاو دەیگووت: هەستدەکەم، مستەر جەلادەتیش بەجۆرێک لە جۆرەکان وەک ئەو فلووتە وەهایە. کەسێکە خۆی لە هەموو شتێک خاڵیدەکاتەوە بۆئەوەی ببێتە ئەو فلووتە گەردونییە کە ئاوازی ئەوانی تر لە خۆیدا کۆدەکاتەوە.

«هێر میوولەر» سەیری دالیای دەکردو درێژەی بە خەیاڵەکانی دەدا و دەیگووت: مسز سیراجەدین، لەوانەیە ئەم کورە کۆپییەکی تازەی خوداوەند پان بێت، خودای مێگەل و ڕان، خودای شوانکارەکان و سروشت لای گریکەکان، کوڕی هێرمس، کە نیوەی لەشی لە شێوەی ئادەمیزادایەو نیوەکەی تری لە ڕوخساری بزنێکی کێویدایە. بەڵام پان مەخلوقێکی زۆر ناشیرینە، ئا، هاوڕێم مسز سیراجەدین، دیارە ئەم کوڕە لە شێوەدا ناچێتەوە سەر پان چونکە مۆدێلێکی تری ئەو مەخلوقە پڕ ئارەزووەیە، لە ڕاستیدا گەر بگەڕێیت زۆرو کەم لە نێوان هەر یەکێک لە ئێمەو و خوداوەندە گریکییەکاندا کۆمەڵێک سیفاتی هاوبەش هەیە. مسز سیراجەدین بیرت نەچێت، پان هەمیشە زۆرجار بە کاراکتەری شەیتان لە ئەفسانە گریکییەکاندا تێکەڵاودەکرێت، هێند ڕوخسارێکی ناشیرینی هەیە دایکی خۆی ڕەحمی ناچێتەسەر و لە خۆی دووردەخاتەوە. بەڵام «پان» کە خوداوەندێکە بە فلووتێکی حەوت لوولەوە کە هەر بە ناوی خوداوەند پانەوە بە «پان فلووت» دەناسرێت. هێندەی ڕەمزی سروشت و مردن و هەستانەوەیە، ڕەمزی خراپە نییە. فلووتەکەی پانیش بانگەوازێکی

خۆشەویستی و سەمبولێکی ناکامی عەشقە، خودی پان و ئەو پیاوانەش کەدەکەونە ژێر کەوانی ئەوەوە جۆرە خەڵکێکن ئافرەتان زۆر پێویستیان بە وەسف و دڵدانەوەکانیان هەیە. پان نێرێکە زۆر دڵی بە بینینی خانمان دەکرێتەوە، کە بەَ زمانی ئەفسانە گریکییەکان «نیمپی» ـان پێدەڵێن. ڕۆژێک پان دوای یەکێک لە نیمپییەکان دەکەوێت. کە لەترسی ئەو مەخلوقە شاخدارە، قاچ بزنە دەپارێتەوە ببێتە قامیش. ئاە، مسز سیراجەدین لە هیچ کتێبێکی دونیادا بە ئەندازەی کتێبەکەی ئۆڤید «میتامۆرفیۆس» دۆعای ئادەمی قەبووڵ نابێت، بەسە یەکێک دۆعابکات و خوداوەندێک لە خوداوەندە زۆرەکان دۆعاکەی بۆ بهێننە دی. هەڵبەت سیستمی فرە خودایی ئەگەرچی زیانی زۆرە، بەلام ئەو قازانجە گرنگەشی هەیە. هەر هێندەی ئەو نیمپییە بەدەم ڕاکردنەوە دەگاتە سەر ڕووبارێک بە ناوی «لادۆن»ـەوە دۆعاکەی قەبووڵ دەبێت و کاتێکی پانی پڕ شەهوەت پردەهێنێت باوەشی پیابکات، لەبری لەشولاری کچێکی جوان قامیشێکی بۆش و باریک لە ئامێزی خۆیدا دەبینێتەوە. پانی ناکام لە حەسرەتدا قامیشەکە کەرتدەکات و فلووتە بە نێوبانگەکەی خۆی لێ دروستدەکات، کە هێند فووی پیادەکات هاواری عەشق و ئارەزووی لێدێتەدەرێ. بیریشت نەچێت پان ئەو خوداوەندەیە کە هێندەی هاواردەکات شورای شاران لە بەردەم نەعرەتەیدا دەڕوخێت. بەلام لە مانە سەیرتر، خانمی سیراجەدین، ئەوەیە کە پان لەسەرێکەوە کوڕی هێرمسە کە خودای ڕێگاوبانە، بەڵێ مسز سیراجەدین، هێرمس باوکی پان یەکێکە لە کەسایەتییە قەشەنگەکانی میتۆلۆگیای گریکی، هێرمس خوداوەندی ئەوانەیە کە سەفەردەکەن، یان ئاوارەو گەڕیدەن، خوداوەندی بیرکردنەوەیە، خوداوەندی هونەری گۆڕان و قسەکردنە، هێرمس لە هەمانکاتدا کوڕی زیۆسە، خوداوەندی خوداوەندەکان، کە زیۆس لەڕێگای ئەوەوە لە خەوتن و خەوندا پەیامەکانی خۆی بۆ ئادەمیزادان دەنێرێت، لەبەرئەوە گەر بەوردی سەیربکەین ڕەگوڕیشەی پان و فلووتەکەی

دەچێتەوە سەر خاڵێکی گرنگ کە خاڵی بەریەککەوتنی مرۆڤە لەگەڵ خوداوەندا. بەڵێ مسز سیراجەدین... بەڵام ئەمە هەموو حیکایەتەکە نییە... بوەستە... بوەستە، ئێستا بۆت تەواودەکەم.

دەستی بەقژیدا دەهێنا، تەپڵەکی جگەرەکەی خاڵیدەکردەوەو دەیگووت: ئەمەیان زۆر عەجیبە، زۆر عەجیبە، لەسەرێکی ترەوە پان باوکی سیلینۆس یان سایلینۆسەکانە، کە جۆرە مەخلوقاتێکی تری سەیری گریکیین، نیوەیان ئەسپەو نیوەیان مرۆڤ، بەڵێ پان باوکی ئەو بوونەوەرە عەجیبەیە کە تێکەڵێکی سەیرە لە مرۆڤ و ئەسپ، کە دواتریش دەبێت بە مامۆستا «دیونیسیۆس». ئەگەر لەسەرێکەوە هێرمس سەمبولی خەون بێت، سیلینۆسیش مەخلوقێکە بەردەوام مەستەو پەیوەندییەکی زۆری بە واقیعەوە نییە، کە باس لەم «نیو ئەسپە» دەکەین دەبێت زۆر بیر لە حەقیقەت نەکەینەوە. مسز سیراجەدین، ڕۆژێک میدیاس سیلینۆس دەگرێت و دەیکاتە بەندی خۆی، بەڵام دیونیسیۆس کە هێشتا مەحەبەت و ڕێزی بۆ مامۆستا کۆنەکەی خۆی زۆرە، دەچێتە سەر ڕێگای میدیاس و لێی دەپرسێ «بەرابەر بە ئازادکردنی سیلینۆس داوای چیدەکات؟». ئەویش دەیەوێت ببێتە خاوەنی ئەو بەهرەیەی هەر شتێکی بەر چنگ کەوت ببێتە زێڕ. داوایەکی گەمژانەیە کە دەبێتە مایەی نەگبەتی و کارەسات بۆ میدیاس، چونکە نان و ئاوی لێ حەرامدەبێت و دەست لە هەر چییەک دەدات دەبێتە تەلا.

دالیا لەو نامەیەدا ڕای وابوو گەر لێبگەڕایە سباستیان میوولەر چەندەها تیۆرەی لاهوتی و میتۆلۆگی تری لەسەر جەلادەت دروستدەکرد، بەڵام لێتان ناشارمەوە، من دواجار بە تێگەیشتنی ئەو پیاوە ئەفسانەناسە سەرسام بووم، بە ئەندازەیەک لە یەکێک لەسەفەرە کورتەکانمدا بۆ ئەڵمانیا، ویستم بیدۆزمەوەو لەسەر تەواوی ئەو تەفسیرانە قسەی لەگەڵدابکەم. تەماشاکردنی جەلادەتی کۆتر وەک وەچەیەکی نوێی کریشنا و پان یەکێک بوو لە تەفسیرە سەیرەکان کە بەداخەوە زۆر درەنگ دوای

دواهەمین ماڵاواییم لە جەلادەت بیستم، کاتێک نامەیەکی دالیا سیراجەدینم لای موسای بابەک دۆزییەوە. بەڵام من هەرگیز سباستیان میوولەرم نەبینی و هەرگیزیش نایبینم چونکە ئەو لە یەکێک لە گەشتەکانی ئەفریقادا بە نەخۆشییەکی نەناسراوو کوشندەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەڵەمانیاو بەر لەوەی من بیگەمێ چوار مانگ پێشتر لە خەستەخانەیەکی شاری تریردا دەمرێت.

ئەوەی سەیرە سباستیان میوولەریش جەلادەت لە نزیکەوە ناناسێت. ئەو ماوە کەمەی جەلادەت لەو کەمپە دەمێنێتەوە، بەشی ئەوە نییە ببێت بە هاوڕێی کەس. جگە لە دالیا هیچ ئادەمیزادێکی تری بۆ گرنگ نییە. بەڕۆژ کەمپەکە چۆڵ دەبێت و خۆی بە تەنیا لە ناو سالۆن و دالان و بیرۆ گەورەکاندا دەمێنێتەوە، بەردەوام لە یەکێک لە پەنجەرەکاندا دەوەستێت و فلووت لێدەدات. دالیا بۆئەو هەمیشە سەرابێکی دوور دەستە، کچێکە لە هەر شوێنێک بێت بە جۆرێک لە جۆرەکان خەریکی کارکردن و گەڕان و عەودالییە بۆ بیرچوونەوەی ڕابوردوو. بەڵام بینینی دالیا تەنیا شتێکیشە هەستی زیندویتی تیا دروستدەکات، تەنیا ئەو کاتانە هەست بە قووڵایی ژیان دەکات کە لە تەنیشت دالیاوە دەوەستێت، بینینی ئەو بەهەنایەکی قووڵە بۆ مانەوە وەک میوانێکی هەمیشەیی لەسەر زەوی. چەند ڕۆژێک لەگەڵ تیپەکەیدا دەڕوات، کێڵگە قەشەنگەکان دەبینێت، سەیری ئیشە سەیرەکانی ئەو ڕێکخراوە دەکات، پێکەوە قسە لە ڕۆژگارە دوورەکان دەکەن، بەسەر یادەوەری و یادگارییە بچوکەکانی خۆیاندا دەچنەوە، دالیا داوای لێدەکات هەمیشە لەگەڵیدا بێت، پەیمانی دەداتێ کاری بۆ دەدۆزێتەوە، کۆمەکیدەکات، بەڵام ئەو دەزانێت ژیانێکی تر چاوەڕوانیدەکات، ئیشی دیکە چاوەڕوانیدەکات. کە دەگەڕێتەوە بۆ گێلاسی سپی، دالیا هەموو شتێکی بۆ دابیندەکات، ئەو سەر لەنوێ نوێن و بەرگی تازەی بۆ دەکڕێت، مێخەکانی بۆ زڕکەفتدەکات، ڕاخەری نوێی بۆ دەهێنێت. هەردووکیان دەیانەوێت هەمیشە لەیەکەوە نزیکبن، هەردووکیشیان دەزانن پەیوەندیان لەگەڵ یەکدا وەک

پەیوەندی مرۆڤێک وایە لەگەڵ خەیاڵەکانیدا، وەک پەیوەندی مۆسیقارێک وایە لەگەڵ مۆسیقاکەیدا. هەر یەکەیان بۆ ئەوی تر، نوێنەری هەموو شتە ئەستەم و دووردەستەکانە، نوێنەری ئەو ڕووەی ژیانە کە تا لێی نزیکبیت، دوورتر دەنوێنێت. جەلادەت بە دالیا دەڵێت: کچی پور، من نازانم تا چەندی دیکە لێرە دەمێنمەوە، درەنگ یان زوو ڕۆژێک دێت کە دەڕۆم و ئیدی ناگەڕێمەوە، بەڵام تا لێرەبم، تا ئەو کاتەی مەخلوقێکم دەبینرێم و دەکرێت ئادەمیزادەکانی تر قسەم لەگەڵدا بکەن، تۆ لێم دوورمەکەوە.

دالیا سوێندی بۆ دەخوات ئەمجارە تا زیندووبێت بەجێی ناهێڵێت، هەموو خەمێکی دەخوات. کە جەلادەت دەگەڕێتەوە بۆ شار، دەزانێت دەبێت دەستبکات بە سەفەرە درێژەکانی خۆی، دەبێت بەو ڕێگایەدا بڕوات کە بە یەک ئاراستە دەیبەستێتەوە بە قووڵایی ژیان و مردنیشەوە. لەو ڕۆژە سەرەتاییانەی ژیانی قەقنەسدا هەفتەی چەند جار دالیا دەبینێت، پێکەوە لە باڵکۆنەکەدا سەیری ئەستێرە دەکەن، سەیری ئەو شارە دەکەن کە وەک هەموو شارەکانی تری دونیا شوێنێکە بۆ ترس نەوەک جێگایەک بێت بۆ دڵنیایی. لە یەکێک لە ئێوارەکاندا جەلادەتی کۆتر یەکەمجار ڕەوشەنی مستەفا سەقزی دەبینێت، ڕەوشەن کچێکی قژ ڕەشە کە لە تیپێکی چکۆلانەدا کەمان لێدەدات. چیرۆکی ڕەوشەنیش یەکێکە لە سەربوردە سەیرەکانی ئەم چیرۆکە. ئەو لە ساڵانی هەشتادا کە تەمەنی هەشت ساڵە لە کەمپێکی پەناهەندە ئێرانییەکاندا دوای مردنی باوکی تەنهای تەنها دەمێنێتەوە، شاروخی شاروخ ئەوکات لەگەڵ باوکیدا لە سنووری ئوردونەوە پارچەی یەدەک بۆ ئوتومبێلە یابانییە تازەکان دەگوێزنەوە. شەوێک ناسیاوێکی دێرینی بابی کە کوردێکی بەدبەختی سەقزییە و هێشتا بە گەرمای پڕوکێنەری ئەو سەحرایە ڕانەهاتووە، لەسەر ڕێگا دەیانگرێت و کچێکی لاوازی هەشت ساڵانەیان دەداتێ کە پێیوایە گەر لەو گەرمایەدا بمێنێتەوە دەمرێت. کچێکی ترسنۆک و شەرمنە کە تا دەگەنەوە شار لە پشتی پیکابەکەیاندا لە ناو

کارتۆنی گەورە گەورەدا وەک پشیلەیەکی نەخۆش خۆی گرمۆڵەدەکات و هیچ ناڵێت. «مەهدی حەسەن شاروخ» باوکی شاروخی شاروخ، پیاوێکی هێند عاتیفییە، هێند کورد پەروەرە، دیمەنی ئەو کچەو ژیانی بەدەردێکی وەهایٔ دەبات، وەک کچێک لە کچەکانی خۆی هەڵیدەگرێتەوەو هەرچی سۆزێکی باوکانە کە دەیداتە منداڵەکانی خۆی دەیداتە ئەو بێچووە پشیلە چاوڕەشەش کە ساڵانێکی دواتر کەمانچەژانێکی وەهای لێدەردەچێت، مۆسیقارەکانی دیکەی ئەم شارە بە پەنجەیەکیدا ڕاناگەن. یەکەمجار کە دەیهێننەوە بۆ ماڵی خۆیان، منداڵێکی چکۆلەیە جگە لە ناوی خۆی «ڕەوشەنی مستەفا سەقزی» هیچی دیکە دەربارەی ڕابوردووی خۆی نازانێت. بەلام لەو ماڵەدا دەست و دڵی کراوەی کۆمەڵێک خوشک و باوکێکی بەڕەحم و دایکێکی دڵفراوان چاوەڕوانیدەکات. لە هەموویان بە ڕەحمتر شاروخە کە وەک خوشکێکی چکۆلانەی خۆی سەرەتاکانی مۆسیقای فێردەکات. ڕەوشەن هەستێکی مۆسیقی سەیرو گوێچکەیەکی هەستیاریی بۆ ئاوازەکان هەیە، بەردەوام لە سەر کورسییەکی بچکۆلە دادەنیشێت و لەگەڵ شاروخی برایدا گوێ لەو سەمفونیاو سۆناتانە دەگرێت کە شاروخ لەسەر زەبتێکی کۆن گوێیان لێدەگرێت. شاروخی برای پەیمانی دەداتێ، هەموو مۆسیقا خۆشەکانی دونیای بۆ پەیدابکات، هەرگیز نەهێڵێت لە شاکارەکانی ئاوازو مۆسیقای جوان دابپڕێت. کە شاروخ لە جەنگدا دەکوژرێت، ئەو حەسرەتەی لە دڵدایە کە ئیدی ناتوانێت ئاوازە بڵندەکان و نەغمە سیحراوییەکان بۆ ڕەوشەون ئامادەبکات، بەو حەسرەتەوە دەچێت بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان و هەر بەو حەسرەتەشەوە دەبێتە دەلیلی جەلادەتی کۆتر بەرەو سەر زەمینی جوانییە کوژراوەکان. کە شاروخ دەکوژرێت، ڕەوشەن تەمەنی یازدەساڵە، بەلام شەوێک تێناپەڕێت، بێئەوەی ئەو منداڵە خەون بە شاروخەوە ببینێت، ئەو ڕۆژەی جەلادەت لە نێوان کۆمەڵێک کوڕوکچی گەنجدا دەیبینێتەوە خەریکی فێربوونی مۆسیقایە،

سەرسام لەو دیاریی و ئاوازانەی لە جیهانێکی ترەوە بۆی هاتووە، بە جەلادەت دەڵێت: بەڕێز تۆ شێت بوویت، شاروخی شاروخ چەندین ساڵ لەمەوبەر لە جەنگدا کوژراوە.

جەلادەت پێیدەڵێت: هەرکەسێک ئاوازی نەمر لە دڵیدابێت، نامرێت. جوانی نامرێت تەنیا لە نێوان بوون و نەبووندا سەفەردەکات، لە نێوان بیستن و بێدەنگیدا، لە نێوان هەست و خامۆشیدا.

ڕەوشەنی مستەفاو هاوڕێکانی سەرسام لەو قسانە، بۆ یەکەمجار گوێ لە پارچەیەک فلووتی جەلادەت دەگرن کە جۆرێک دەیانسیحرێنێ شەو و ڕۆژ و ڕاست و چەپی خۆیان وندەکەن. لەو ساتەوەی ڕەوشەنی مستەفا سەقزی گوێی لە یەکەم ئاوازی جەلادەتی کۆتر دەبێت دەزانێت لە بەردەم کەسێکدایە پەیوەندییەکی نائاسایی و قووڵی بە سەرچاوە ئەزەلییەکانی جوانییەوە هەیە، جەلادەت مۆسیقاکەی لێدەدات و دەڕوات، ڕەوشەن لە ئێوارەیەکی کۆتایی پاییزدا لە نێو شەستە بارانێکی خوڕدا دوای دەکەوێت. لە ژێر باراندا دەیگرێت پێیدەڵێت «کێ ئەو مۆسیقایەی فێرکردویت؟ چۆن دەتوانم منیش فێری مۆسیقایەکی لەو چەشنە ببم؟». ئەوە سەرەتای لە دایکبوونی هاوڕێتی ڕەوشەنی مستەفا سەقزی و جەلادەتە، کە لە ڕۆژانی داهاتوودا لەگەڵ هاوڕێکانیدا «سێ کوڕ و کچێکی دیکەدا» بۆ یەکەمجار سەردانی ئەو کوڕە ئاوارەیە دەکەن کە لە قاتی شەشی ئوتێلێکی سووتاودا بە چیرۆکە سەیرەکانی، بەو جیهانە عەجیب و خەیاڵیانەی، بە مۆسیقا سیحراوییەکەی دەرگای سەرزەمینێکی تریان لێدەکاتەوە، کە پێش جەلادەت دڵنیابوون هەیە بەڵام دڵنیانەبوون مرۆڤ لە چ ڕێگایەکەوە بۆی دەڕوات.

بەر لەوەی شاروخی شاروخ من وەک نوسەر و گێڕەرەوەی ئەو کتێبە دەستنیشانبکات، ڕەوشەنی مستەفا سەقزی یەکێک لە هاوڕێ مۆسیقارەکانی خۆی بەو ئیشە ڕادەسپێرێت، یەکەم چیرۆک لەسەر ژیانی جەلادەت لە گۆڤارێکی ئەدەبی ئەو زەماندا بە ناونیشانی «نیوەشەوی

مۆسیقارێک» بڵاوبۆتەوە، کە قەڵەمێکی گەنج سکێچێکی زۆر سەرەتایی و خەیاڵی بۆ ژیانی کەسێک کێشاوە لە چیرۆکەکەدا ناوی «جەمال کلارنێت»ـە کە نیوەشەوان سیمرغێکی سپی هەڵیدەگرێت بۆ وڵاتێکی تر و لەوێ لە ناو کۆمەڵێک مۆسیقاردا فێری هونەرێکی باڵادەبێت و دواجار خۆی هێند بە ئاوازەکانی خۆی سەرسامدەبێت عەقڵی لەدەست دەدات و شەوێک لە باڵکۆنی شەشەمەوە لە ئوتێلێکدا ناوی ئوتێلی «بوکی ئاشتی» یە خۆی دەخاتە خوارێ. چیرۆکێکی بێمانایە، کە وەک ئەدەبیاتی ئەو دەمە پڕە لە هێمای نابەجێ و ڕەمزی تێکشکاو بۆ شەڕی ناوخۆو ئەو کێشە سیاسیانەی تێیدا جەمال کلارنێت وەک قوربانییەک نیشاندراوە.

بەمانایەکی تر، هەوڵی نوسینەوەی ژیانی جەلادەتی کۆتر سەرەتا بێ هیچ ڕاسپاردەیەکی دەرەکی، لەلایەن ڕەوشەنی سەقزییەوە دەست پێدەکات کە ئەو کات کیژێکی قەشەنگە بە نیگایەکی تەلیسماوی و ئارەزوویەکی بێوێنەوە بۆ ئەدەبیات و مۆسیقا. ژیانی جەلادەت چەشنێ ڕەوشەن سەرسامدەکات پێموایە گەر لەو دەمەدا عاشقی کوڕێکی شاعیر نەبایە، کە دواتریش شووی پێدەکات، لەوانەبوو شیفتەی جەلادەت ببێت کە بە پێکەنینەوە پێیدەڵێت: ها نەسیحەت بێت، خانمی سەقزی بۆ دڵداری، گەر مرۆڤ کەمێک هۆشی هەبێت، عاشق نابێت بە ڕێبواریی. منیش ڕێبوارێکی هەمیشەیی سەر ئەم عەردە بەرین و بێمەودایەم کە هەر کەسێک خۆشیبوێم تووشی ناکامی دەبێت. ها خانم بیرت نەچێت من ئاوارەیەکی گەردونیم.

ئاشکرایە چیرۆکی «نیوەشەوی مۆسیقارێک» خەونی ڕەوشەن بۆ گێڕانەوەی ژیانی جەلادەت ناهێنێتەدی، دوای چەندین هەوڵی دیکە دەگاتە ئەو بڕوایەی کە وڵاتی ئێمە چیرۆکنوسێکی تێدا نییە بتوانێت چیرۆکێکی وا فرە جیهان و فرە کاراکتەر بگێڕێتەوە. سەردەمێک جەلادەت شتێکی ئەوتۆ لە نیازو خواستی نهێنی ڕەوشەن و هاوڕێکانی نازانێت کە تیپێکی نهێنی دروستدەکەن بۆ سۆراغی چیرۆکنوسێک ئەو حیکایەتە دەربازبکات

و بیکاتە تێکستێکی نوێ و زیندوو. بۆ پێکەنین تیپەکەیان ناودەنێن «تیپی ڕەوشەن بۆ ڕزگارکردنی ژیانی جەلادەتی کۆتر لە مردن و بیرچوونەوە»، تیپێک دواتر لە کۆکردنەوەی هەندێک زانیاریدا لەسەر ژیانی جەلادەتی کۆتر کۆمەکی گەورە بە من دەکەن.

کاتێک ئیسحاقی لیۆزێڕین بە جەلادەت دەڵێت «دەبێت تۆ حیکایەتی ژیانی خۆت و هەموومان بگێڕیتەوە». جەلادەت دڵنیایە هیچ مرۆڤێک ناتوانێت ژیانی خۆی بەڕاستی بگێڕێتەوە، چونکە هەر یەکێک لە ئێمە پارچەیەکی گەورەی خۆی نابینێت، وەک چۆن مرۆڤ پشتەملی خۆی چاو ناکات، هەرواش ناتوانێت حوکمێکی ڕاستی لەسەر شێوەو ئاکارو کرداری خۆی هەبێت، ناشتوانێت شتگەلێکی زۆر لە ژیانی خۆیدا ببینێت. جەلادەت لە یەکێک لە گەشتەکانیدا بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان بە شاروخ دەڵێت «مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە کە نازانێت خۆی چییە و بۆ ئەوەی خۆی ببینێت دەبێت سەیری ئەوانی تر بکات». شاروخی شاروخ بەر لە کوژرانی لە جەنگدا ڕۆمانێک و دیوانێکی منی خوێندبووەوە، ئەو ساتەی لە بەرەکانی شەڕدا گوللەیەک دەیپێکێت، دیوانەکەی من کە بە ناونیشانی «گوناه و ئاهەنگ» بوو لە کۆڵەپشتەکەیدا بوو. ئەو بە جەلادەت دەڵێت: ئاغای قەقنەس من نوسەرێکت بۆ دەدۆزمەوە، کۆمەکت پێبکات، دواجار من یاریدەدەری تۆم، کاری من ئەوەیە ئەو شتانەت بۆ ئاسانبکەم کە لە توانای تۆدا نییە ئەنجامیان بدەیت.

من دوای دەرچوونی دیوانی یەکەمم تاڕادەیەک بووبووم بە نوسەرێک هەندێک خوێنەرم هەبوو، بەڵام وەک پێمگووتن هەر کتێبێکم دەنوسی زیاتر لە دونیا زویرو پتر گۆشەگیر دەبووم، بە جۆرێک منیش ئەو بۆچوونە تەقلیدییەم لا گەورەدەبوو کە دەڵێت کتێبەکان وەک دیوار وەهان مرۆڤ لەدەوری خۆی هەڵیاندەچنێت تا کاریگەری دەرەوە لەسەر ژیان و ڕۆحی خۆی کەمبکاتەوە.

یەکەمجار جەلادەت ناوی منی بە ڕەوشەنی مستەفا سەقزی گووت. پێدەچێت تا ئەو دەمە ناوی من لای ڕەوشەن و هاوڕێکانی مانایەکی ئەوتۆی نەبووبێت، پرسیارەکەی جەلادەت پرسیارێکی سادەیە دەربارەی ڕاوبۆچوونی ڕەوشەن و مۆسیقارەکانی هاوڕێی لەسەر بەرهەمەکانی «عەلی شەرەفیار». ڕەوشەن دواتر بە هیمەتێکی بێوێنەوە هەموو وتارو ڕۆمان و شیعرەکانی من دەخوێنێتەوە. کە دەگاتە دوا لاپەڕەی ڕۆمانی «سێوێک لەوسەری زەمین» کە ئەو کات دواهەمین کتێبێک بوو من چاپم کردبێت، بە چاوی پڕ ئەسرینەوە ڕادەکات بۆ ئوتێلی گێلاسی سپی و دەڵێت: خوای گەورە، لەم خودانەناسە زیاتر کەسی تر نییە ئەم چیرۆکەی تۆ بگێڕێتەوە. ئەمە ئادەمی نییە، حەیوانێکە خودا بۆ گێڕانەوەی حیکایەت دروستیکردوە.

لەڕاستیدا پێناسەکەی ڕەوشەنی مستەفای سەقزی بۆ من وەک حەیوانێکی حیکایەتخوان، لەگەڵ پێناسەی ڕاستەقینەی مندا بۆ مرۆڤ تەبا بوو، کە هەردەم پێناسەکەی ئەرستۆم بۆ مرۆڤ بە هەڵە دەزانی کە دەڵێت «مرۆڤ ئاژەڵێکی سیاسییە» و لە بری ئەوە دەمگووت «ئازیزان، مرۆڤ حەیوانێکی حیکایەتخوانە» دیارە ئەمە تەنیا بۆچوونی من نەبوو، بەڵکو بۆچوونی کۆمەڵێک زاناو دانای سەردەم بوون کە من بڕوام بە بیرو سەرنجیان هەبوو. من دەمگووت: هەزاران ساڵ بەر لەوەی مرۆڤ سیاسەت بکات، حیکایەتی گێڕاوەتەوە... بەر لەوەی شار دروستبکات، شارستانییەت دابمەزرێنێت، ئیمپراتۆریەت پێکەوەبنێت بوونەوەرێکی حیکایەتخوان بووە. کۆنترین ئیشێک دوای ڕاو مرۆڤ کردبێتی حیکایەتە. دینەکان لە حیکایەتەوە دروستبوون، فەلسەفەکان، شەریعەتەکان لە بنەڕەتدا هەموویان لە ناو حیکایەتەوە هاتوون... هەموو گەورەییەکانی مرۆڤ و دەستکەوتەکانی، هەموو بەدبەختی و دەردەکانیشی لەوەوە هاتوون کە مرۆڤ باوەڕ بە حیکایەتەکانی خۆی دەکات.

من زۆرجار زیادەڕەویمدەکرد و دەمگووت «هۆی کۆیلەیی ئێمەی کورد ئەوەیە ئێمە لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا توانای دروستکردنی حیکایەت لە دەستدەدەین، ئێمە چەندەها سەدەیە حیکایەتی خەڵکی تر بۆ خۆمان دەگێڕینەوە، هەر میللەتێک حیکایەتی قووڵ و ڕاستەقینەی خۆی نەبێت دواجار ماڵ و حاڵی پارچە پارچە دەبێت».

ئەو ڕۆژەی من تەلەفونم بۆ ڕەوشەنی مستەفا سەقزی کرد، هەموو چاوەڕوانیاندەکردم، هەموو بە جۆرێک لە جۆرەکان دەیانزانی لە گەڕانەوەی ئەمجارەمدا چ شتێک چاوەڕوانمدەکات. ئەو پلانەی کە بۆ گێڕانەوەی ئەم کتێبە دایاننابوو، پلانێکی سەرەتایی بوو، ڕایان وابوو ئەوەی من سەرسامدەکات و وام لێدەکات دوای ئەم چیرۆکە بکەوم، ئەوەیە ئەوان لەسەرەتاوە من لەگەڵ چیرۆکی مردنی شاروخی شاروخدا ڕووبەڕوودەکەنەوە، تەلیسمێک کە بە دڵنیاییەوە پاڵ بە منەوە دەنێت دوای نهێنییەکەی بکەوم، تا لە گرێبەندێکی پۆلیسی ئاڵۆزدا ڕاستییەکان بدۆزمەوە. بەڵام ئەوەی منی سەرسامکرد خودی جەلادەتی کۆتر بوو، من کەسێک نەبووم حەزم لە هیچ گرێچنییەکی پۆلیسی بێت. ئەوەی منی سەرسامدەکرد کاراکتەری مرۆڤ بوو، نەوەک تەلیسم و نهێنییەکانی دەوروبەریی، ئەوەی دواجار منی بەرەو جەلادەت ڕاکێشا. برینە سەیرەکانی بوو، فلووتە سیحراوییەکەی بوو، ئەو سەرسەختییەی بوو کە دواجار کتێبێک بنوسێت هەمووی حەقیقەت بێت، حەقیقەت و هیچی تر. ئەوەی منی وا لێکرد بە هەموو توانای خۆمەوە بچمە ئەم جەنگەوە ئەو شەڕە سەختەبوو کە لەسەرەتاوە من و ئەو لەگەڵ یەکدا ڕامانگەیاند، شەڕ لە نێوان چیرۆک و ژیاندا، جەنگ لە نێوان جوانی بەو شێوەیەی کە هەیەو جوانی بەو شێوەیەی کە دەبێت ببێت. من ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵ تێپەڕینی حیکایەت و ڕوونبوونەوەی ئارام و پڕ دەردی ڕاستییەکاندا بۆم دەرکەوت کە ئەو جوانییە ئەفسانەییەی من لە تێکست و چیرۆکدا بۆی دەگەڕام ئەو پێویستی پێی نەبوو، چونکە ئەو

خۆی لەوسەر دەریای جوانییە کوژراوەکانەوە دەهاتەوە، ئەو باڵدارێک بوو بەسەر ئەو ئاوەدا فڕیبوو. من ئێستا کەسێکم دڵنیام لەسەرەتاوە خۆم دەرگیری شەڕێکی دۆڕاو کرد، چونکە چەند لە گێڕانەوەی ژیانی ئەودا فەنتازیام بنواندایە، هەمووی دەبووە شێواندن و تێکدان لە ڕیتمی فەنتازیایەکی گەورەتر، فەنتازیای پیاوێک کە وەک مایکۆفسکی دەڵێت «هەورێک بوو لە پانتۆڵێکدا».

* * *

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٥ و سەرەتاکانی ١٩٩٦ دا، جەلادەت لە ناو تەپوتۆزی شەڕی ناوخۆدا گەشتە دووردرێژ و ئەفسوناوییەکانی خۆی بەتەواوی باشووری کوردستاندا دەست پێدەکات. هیچ کەس نازانێت جەلادەت چۆن و لە کوێ و لای کێ تابلۆی «شاری مۆسیقاره سپییەکان» جێدەهێڵێت، دابەشکردنی ئەو تابلۆیە بەشێک بوو لە نهێنییە گەورەکانی خۆی. من دڵنیام لە زۆر شوێنی ئەم وڵاتەی ئێمەدا، شەو و شەوگارێکی زۆر ئەو جۆرێک خۆی گۆڕیوە کەس نەیناسێتەوە، بە نهێنی سەریکردوە بە چەندەها کوچەو کوزەر و شەقامی تاریکی ئەم وڵاتەدا بۆئەوەی لە دەرگای جیاواز جیاواز بدات و ئەو تابلۆیە جێبهێڵێت. جەلادەت لەو شەوە سەیرانەدا وەک قەقنەسەکانی پێش خۆی دەموچاوی دەشارێتەوە، لەدەرگاکان دەدات، لە چەندین شارو شارۆچکەو گوندی ئەم دەڤەرەدا ئەو مرۆڤانە دەدۆزێتەوە کە لە پاشەڕۆژدا تۆڕێکی نهێنی و شاردراوەی دیکە پێکیانەوە دەبەستێت، کە تۆڕی هاواری جوانییە کوژراوەکانە. لەو شەوانەدا پاڵتۆیەکی ڕەشی درێژ لە بەردەکات، کاسکێتێکی ڕەشی قەترانی دەکاتە سەری، ملپێچێکی ئەستوور دەکاتە ملی و چاویلکەیەکی ڕەشیش دەکاتە چاوی و بە خۆی و ئەو تابلۆیەوە کە تەنیا تەماشاکردنێکی مرۆڤ بەرەو

دونیای جوانییە جاویدانەکان بانگدەکات دەکەویتەڕێ. تابلۆیەک بەسەر ئەو کەسانەدا دەبیەشێتەوە، کە هەر یەکێکیان مۆسیقارێکی کوژراو یان نیگارکێشێکی شەهید یان شاعیرێکی خنکاو لە ڕۆحیاندایە، ئەو مرۆڤانەی بەترسەوە دەرگا دەکەنەوەو بە ترسەوە دەپرسن: تۆ کێیت؟ بە ترسەوە دەپرسن: چیت دەوێت؟ بە ترسەوە ئەو تابلۆیە وەردەگرن.

ئەوانە ژمارەیەک خەڵکن پەرۆش و شیفتەی جوانیین. هەندێکیان لە تاریکیدا دوای جەلادەت دەکەون و ناتوانن بیگرن... ئەو پەیامهێنی زەمین و زەمانێکی ترە، نامەیەکی نهێنی پێیە، کە دوای تێپەڕینی ساڵان و مانگانێکی زۆر ژمارەیەکی کەم دەتوانن شفرەکانی بشکێنن و بگەنە سەر نهێنییە ڕاستەقینەکەی و ببن بە پاسەوان لە زەریای جوانییە کوژراوەکاندا. جەلادەتی کۆتر دواتر دەیگووت: وەک ئەوە بوو، شەتڵی گوڵێکی ناوازەو ریزپەڕ لە چەندین کێڵگەی جیاو گڵی جیاو کەشی جیادا بڕوێنم و ببینم چ ڕۆژێک یەکێک دێت و لەسەر نەخشەیەکی تایبەت ئەو گوڵە ناوازانە پێکەوە گرێدەداتەوە، کەی ڕێبوارێک دێت و ڕێکەوت دەیخاتە سەر ڕێگایەک بتوانێت لە یەک کاتدا تەفسیری ئەو گوڵانەو پەیوەندیان پێکەوە بدۆزێتەوە. هەر لەو وەرزەدا جەلادەت دەستیکرد بە دابەشکردنی نامەکان بە دونیادا. ئەوانەی منداڵەکانیان لە گۆڕە گەورەکاندا ونکردوە، ئەوانەی کەسوکاریان لە کوشتارە گەورەکاندا دۆڕاندووە، ئەوانەی لە ڕۆژگاری قڕان و سڕینەوەو لە ناوبردنی بە کۆمەڵی مرۆڤدا لەو دەڤەرانە مێردو ژن و منداڵیان تیاچوون، کوڕو کچیان نەگەڕاوەتەوە، باوک و برایان ونبووە، بوک و کوڕەزایان فەوتاوە، لەو وەرزەدا ئەو نامە سەیرانەیان بۆ دێت کە پیاوێک بە سوار ئەسپێکی سپی و پاڵتۆیەکی سپی درێژ و کاسکێتێکی ڕەشەوە دابەشیاندەکات. پۆستەچییەکی بێناوە، هەمیشە لە گەرمیانەوە دەست پێدەکات و دەڤەر لە دوای دەڤەرە و هەرێم لە دوای هەرێم تا دەگاتە سەر مەرزە ئاگراوییەکانی تورکیا لە هەموو جێگایەکدا دەردەکەوێت و لە هەموو

جێگایەکدا ئەو هاواره جاوید و بێبڕانەوەو ناکۆتایەی مرۆڤ دەگوازێتەوە کە هاواری ئازیزەکانیانە. خەڵکانی ئەو سەرزەمینە لەو نامانەدا دەستوخەتی دۆست و کەسەکانی خۆیان دەناسنەوە، هاوارەکانیان دەناسنەوە، وشە و ئازاری ئەوان ئەخوێننەوە. کوڕێکی گەنجە بەسوار ئەسپێکەوە دێت و لەدەرگا دەدات، بێئەوەی قسەبکات نامەکان دادەنێت و بێئەوەی هیچ بڵێت دەڕوات. پۆستەچییەکی بێدەنگ لە دونیایەکی ترەوە هاتووە، هیچ کەس وشەیەکی لێ نابیستێت، بە ئۆردوگا زۆرەملێکاندا دێت، بە ناو ئاگری شەڕی ناوخۆدا دەڕوات، دەگاتە سەر ئەو سنوورانەی هێشتا هێزەکانی دەوڵەت لە پشت تەپۆڵکە دەستکردەکانیانەوە بە تەماحێکی گەورەوە لە کوردستان دەڕوانن. نامەکان هەڵگری هاواری ئەوانەیە کە لە دوورەوە بانگ لە دۆستەکانیان دەکەن. هەر نامەیە و حیکایەتی مردنی مرۆڤێکە، چیرۆکی کوژران و زیندەبەچاڵبوونی یەکێکە، یاداشتی شەوێکی ترسناکی گریانە کە هیچ شاهیدێک لەسەر ئەم ئەستێرەیە نەیبینیوە. پۆستەچییەک دەیگوازێتەوە کە بە خۆی و ڕیشێکی درێژو نیگایەکی مردووەوە دێت و سڵاوناکات، دێت و وەک پەیامنێری مردووەکان، وەک یەکێک بۆ گەیاندنی حەقیقەت هاتبێت خۆی هیچ ناڵێت، حەقیقەتێکی کوشندەی پێیە کە ناکرێت هیچ مرۆڤێک وشەیەکی بخاتە سەر، حەقیقەت بەو چەشنەی لە ڕۆحی قوربانییەکانەوە دێتەدەرێ کاتێک بیر لە مردنی خۆیان دەکەنەوە.

ماوەیەکی درێژ لەو شارو شارۆچکانەدا کە مۆڵگەی خەڵکی لێقەوماوبوو، چیرۆکی ئەو نامانەی خەڵک لە شەهیدەکانیانەوە بۆیان دێت، لە کوڕە بێسەروشوێنەکانیانەوە پێیاندەگات، وێردی سەر هەموو زارێکە، قسەی ناو هەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکە. لە ماوەیەکی کەمدا وڵات پڕدەبێتەوە لە حەقیقەتی دۆزراوە، لە هاواری ئەو مرۆڤانەی لە تەپوتۆزی جەنگەکاندا خەریک بوو یاددەچوونەوە، کوچە و کوخت و کۆڵێتی شارەکان، حەوش و بەر هەیوانی غەمگینی ئەو خێزانانەی لە خۆڵەمێشی ئازارو فەرامۆشیدا

نوقمبوون، پردەبێتەوە لە یادگاری ئەو مرۆڤانەی لە دوورەوە هاواردەکەن. نامەکان تەنیا هاواری کۆمەڵێک قوربانی نین کە داوای تۆڵەدەکەن، داوادەکەن لە بیرنەچنەوەو فەرامۆش نەکرێن، بەڵکو بانگەوازی کەسانێکە لە دونیایەکی دییەوە هیواکانی خۆیانمان بۆ دەگێڕنەوە، جوانی خۆیانمان بۆ ئاشکرادەکەن، ئەو ڕستانەمان بۆ دەنێرن کە لەسەر زەوی دەرفەتیان نەبووە پێمان بڵێن. لەو نامانەدا ئەو ژیانە دەژین کە گەر نەمردبانایە زەویان پێ دەڕازاندەوە. ئەو جوانییانە دەژین گەر مەرگ نەبایە زەویان پێ جوان دەکرد. جەلادەت خۆی لەسەر ئەو نامانە دەیگووت: عەلی شەرەفیار، من زۆرجار بەرێگاکاندا دەرۆیشتم و ئەو نامانەم دەخوێندەوە، وەک چۆن ئاهەنگێکی مۆزارت مەستیدەکردم، ئەو نامانەش مەستیاندەکردم. نامەی گلەیی نەبوون، نامەی کۆمەڵێک ڕۆحلەبەر نەبوون کە دەیانەوێت بە ئازارەکانی خۆیان ئازارمانبدەن و بمانترسێن، بەڵکو هاواری جوانی بوون، کە وەک ناڵەی کەشتییەکی خنکاو وابوو کاتێک لە ژێر ئاودا دەڕوات و بانگ لە کەشتییەکی دیکەی سەر ئاو دەکات. وەک هاواری باڵندەیەک وابوو کە لە سەروو هەورەکانەوە دەفڕێت و بانگ لە باڵندەیەکی دی دەکات کە لە ژێر هەورەکاندا دەفڕێت، وەک هاواری گەڵایەک وابوو کە بای خەزان دەیبات بۆ گەڵایەکی دۆستی کە هێشتا بە لقە بەرزەکانەوە سەمادەکات.

جەلادەت لەو نێوەندەدا چەندەهاجار دەگەڕێتەوە بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان، چەندەهاجار لە قەراغ ئەو دەریاچە سیحراوییە شاروخی شاروخ دەبینێت، بیری دەکەوێتەوە ئەو دەریاچەیە هەمان ئەو دەریاچەیەی گەنجییە کە بەر لە ونبوونی لە باشووردا لەگەڵ ئیسحاق و سەرهەنگ قاسمدا مەلەی تێداکردبوو، لەو دەریاچەیەوە سەفەری دوورو درێژی ئەو بەرەو ئەو شارە خەیاڵییە دەستی پێکردبوو. ئەو ئاوە پاکە سەرەتای هەموو ئەو گەشتە بوو کە جەلادەتی بە زەمینی جاویدان دەگەیاند، لەسەفەرەکانیاندا لەگەڵ

شـاروخی شـاروخ پێکـەوە تـا بـەر شـورا ئەفسـانەییەکانی ئـەو شـارە سـپییە فلووتیـان لێدەدا، ئـاوازەکان پێکـەوە دەیبردن، هەمـان ئـەو سـاتە سـیحراویانە دەژیایـەوە کـە چەندیـن سـاڵ لەوەوبـەر لەگـەڵ ئیسـحاقدا ژیابـوو، لـەو ڕێگا دووررودرێژانـەدا هەسـتیدەکرد گەشـتە دوورودرێژەکانـی لەگـەڵ ئیسـحاقدا پرۆڤەکردنی ڕێگایـەک بووە بەرەو ئـەم شـارە دووردەسـتە. بەڵام جەلادەت چەند بـەو ڕێگایـەدا بڕۆیشـتبایە لـە بەرچاوی تەلیسماویتر دەبوو، چەند لـە جوانییەکانیدا نوقمبایە، هێزێکی گەورەتر و نادیارتر بەرەو شـوێنی دوورتر و قووڵتر ڕایدەکێشا. هەرگیز دووجار لـە یـەک ڕێگاوە نەیاندەتوانی بچنەوە بۆ شـاری مۆسیقا سپییەکان. شـاروخی شـاروخ دەیگووت: نهێنی گەورە ئەوەیە کە هەرگیز دووجـار بەیـەک شـێوە ناتوانیـن هەمـان ئـاواز دووبارەبکەینـەوە، جوانی بۆیە ئۆقیانوسـێکی بێسـنوورە چونکە هـەر مرۆڤـەو یەکجار دەتوانێت بـە یـەک ڕێگادا پیاتێبپەڕێت. ئـەو کتێبـەی یەکەمیـن خوێندنـەوە دەیناسـێت و کامەرانتـدەکات، لـە دووەم خوێندنـەوەدا کتێبێکـی دیکەیـەو بـە جۆرێکـی دی پێـی شـاد دەبێـت... ئـەو مۆسـیقایەی یەکەمجـار لەسـەری سـەمادەکەیت، لـە دووەمیـن عەزفدا مۆسـیقایەکی دیکەیـە. مـرۆڤ لەنـاو بچوکتریـن تابلـۆدا دەتوانێـت گەورەتریـن زەریـا بدۆزێتـەوە... گرنـگ ئـەوە نییـە چـۆن دەتوانێـت جوانی ببینێت، بەڵکو گرنگ ئەوەیـە چـۆن لێی دێتـە دەرەوە. چونکە ئەوانەی کـە لـە یەکـەم شـەپۆلدا دەخنکێـن، ئەوانـەن کـە گەورەیـی زەریاکـە نابینـن، بەنـدەرە دوورەکان نابینـن، چارۆکـەی کەشـتییە ئەفسـوناویەکانی تـر نابینـن کە لـە شـوێنێکی نهێنـی نـاو ئـاودا چاوەڕوانماندەکـەن.

ئیسـحاقی لێوزێڕینیـش لـە یەکێـک لـە شـەقامەکاندا پێیگـووت: جـەلادەت ئـەوەی مـن دەتوانـم لـەم ئۆقیانوسـە نیشـانی تـۆی بـدەم تەنیـا دڵۆپێکـە، ئەوەی پێغەمبـەرەکان لـەم شـارە وە بردوویانەتـەوە بـۆ ژیـان، مۆسـیقارە گـەورەکان بردوویانەتـەوە، شـاعیرەکان ڕزگاریانکـردوە، هیـچ نیـن جگـە لـە چەنـد دڵۆپێک لـە دەریـای خـەون و خەیـاڵ و خولیاکانـی مـرۆڤ. مـرۆڤ خـۆی تێپـەڕە، بـەلام

جوانییەکانی ئەبەدیین. ئەبەدییەت شاریکی گەورەیەو هەر یەکێک لە ئێمە کوچەیەکین لە کوچەکانی ئەو شارە، ئەوەی لەم شارەدا دەژی مرۆڤ خۆی نییە بەڵکو جەوهەری بوونێتی، جوانییەکانێتی، حەقیقەتە قووڵ و ناوازەکەیەتی کە لێرە لەسەر شۆستەکان پیاسەدەکات.

جەلادەت هەر کات فلووتی لێدەدا، هەر کات ئەو تابلۆیەی بەسەر ناونیشانەکانیدا دابەشدەکرد، هەرکات نامەیەکی دەگواستەوە هەستیدەکرد ئەو لە ئەبەدییەتەوە شتێکمان بۆ دەهێنێت. ئەو هەموو جەنگە کوشندەیەی ئەو بینی بووی، ئەو هەموو کوژراوانەی لەو سەردەمەدا مێژووی ئەم وڵاتەیان پڕکردبوو، ڕووبەڕە بێمەوداکانی خوێن، هەموویان مرۆڤیان وا لێکردبوو پتر بە ڕووە جاوید و تێنەپەڕەکەی خۆیەوە بگیرسێتەوە. ئیسحاقی لێوزێڕین لە کوچە تەماوییەکانی ئەو شارەدا سنگی خۆی بۆ دەکردەوەو برینەکانی شەوی مردنی خۆی نیشاندەداو دەیگووت «جەلادەتی کۆتر لە وڵاتێکدا کە دیوارەکانی نێوان مردن و ژیان دەڕوخێت، بەربەستەکان نامێنن و شوراکان هەرەسدەهێنن. نزیکی لە مەرگەوە دەبێت بە نزیکی لە ئەبەدییەتەوە... مردن ناتوانێت دیوە ئەبەدییەکەمان بکوژێت، جەنگەکان ناتوانن ڕووکارە جاویدەکانمان بکوژن، تۆ شاهیدی ئەو حەقیقەتە سادەیەیت کە دەبێت ساڵ دوای ساڵ و سەدە لەدوای سەدە مرۆڤ بەرگری لێبکات، ئەویش ئەوەیە کە ئینسان دەکوژرێت، بەڵام جوانییەکانی ئەبەدیین، تا مەرگ خێراترو توندتر بەسەر مرۆڤدا بڕوخێت، مرۆڤ خێراترو توندتر دەبێت چاو لە جوانییە پاک و ئەبەدییەکانی خۆی ببڕێت، تا مەرگ بێڕەحمانەتر شەپۆلەکانی بەرەو نێوجەرگەی شارە غەمگین و تۆزاوی و تێپەڕەکانمان باژۆبدات، دەبێت مرۆڤ زیاتر ئیلهام لە خەزێنە قووڵەکانی خۆی وەربگرێت. تا مۆسیقا زیاتر بکوژرێت، تا ئامێرەکان زیاتر بشکێن دەبێت ئێمە پتر لە ئەبەدییەتەوە گەنجینەی ئاوازە شاردراوەکانی خۆمان دەربهێنینەوە، دەبێت زیاتر شارە نغرۆکانی مۆسیقا لە ڕۆحماندا زیندووبکەینەوە، دەبێت خێراتر

بـەرەو ئـەو کوچانـە بکەوینـە ڕێ کـە مۆسـیقا لـەوێ جەوهـەری ئینسـان لـە بەرابـەر مەرگدا زینـدوو ڕادەگرێـت و بڵندیدەکاتـەوە».

* * *

ئەوکاتـەی مـن جەلادەتـم ناسـی دەیزانـی ڕۆژێـک دێـت ئیـدی ناگەڕێتـەوە، دڵنیابـوو جارێـک لـە جـارەکان ئـارەزووی نامێنێـت و دەسـتبەرداری هەمـوو ژانـە قورسـەکانی خـۆی دەبێـت و ماڵاواییمـان لێدەکات، دەیزانـی ڕۆژێـک لـەو دیـو شـوراکانی ئـەو شـارە گەورەیـەوە دەبێتـە ئـەو مۆسـیقارە غەمگینـەی لـە دوورەوە بیرمـان لێدەکاتـەوە. ئـەو گەشـتە گەورانـە لـە نێـوان دوو جیهانـدا بـە جۆرێکـی کوشـندە غەمیـان دەدایـە، سـەفەرەکانی تێپەڕیـن بـوون لـە نـاو ئازارەکانـی مرۆڤـدا، لـە گەشـتەکانیدا هـەزاران خێزانـی بینـی بۆنـی جـۆرە کارەسـاتێکیان لێهەڵدەسـتا کە سـاڵ و وەرزو ڕۆژگار ناناسێت، ئەو مرۆڤانەی بینـی لـە چاویانـەوە دوکەڵـی جەنگێـک دەهاتـەدەرێ کەبـە درێژایـی ڕۆژەکانـی تەمـەن بەردەوامـە. ئـەو کچانـەی بینـی لـە شـەوی تاریکدا مـرۆڤ دەیتوانـی دڵیـان لـە دوورەوە ببینێـت دەسـووتێت، بـە زەریـای دڵەشـکاوەکاندا تێپـەڕی، بەحـری ئـەو خانمـە بێکەسـانەی بینـی ئێـواران چاوەڕوانـی شـتێکیان دەکـرد کـە هەرگیـز ڕوونـادات، چـووە گونـدی ئەوتـۆوە تەنیـا منداڵانـی هەتیـوی تیـا دەژیـان، چـووە شـاری ئـەو ژنـە تەنیایانـەی لـە درزی دەرگاکانـەوە چاوەڕوانی ئەوەیـان دەکـرد نامەیەکیـان لـە ئەبەدییەتـەوە بـۆ بێـت. لـە هەنـدێ جێـگادا منـداڵان لـە تەپوتـۆزدا دوای دەکەوتـن و داوای نامـەی باوانیانیـان لێدەکـرد، کچانی ئەسـپ سـوار دوای دەکەوتن و داوای نامەیان لە خۆشـەویستەکانیانەوە لێدەکرد، پیـاوان وەک جانـەوەری برسـی دوای دەکەوتـن و داوای نامەیـان لـە منداڵەکانیانـەوە لێدەکـرد. دەیـان دەموچـاو لـە بەردەمیـدا دەگریـان، لـە هـەر جێگایەکـەوە بڕۆیشـتبایە، بـە هـەر شـارێکدا گـوزەری بکردبایـە، بـە هـەر

کوچەیەکدا تێبپەڕیبایە، ئەو دەموچاوانە لە باو باران و تەپوتۆزو هەتاودا دەردەکەوتن و بێئەوەی داوای هیچ بکەن دەگریان.

دوای هەموو سەفەرێک دەگەڕایەوە بۆ لای مستەفای شەونم، هەموو جارێک پێکەوە دەچوون بۆ لای ئەو پیرە سەرسپییەی لە خەڵوەتی خۆی دەهاتە دەرێ و پاسەوانەکانی کۆدەکردەوەو بە مارشێکی درێژ بە ڕێگا دووروردرێژەکانی ئۆقیانوسی هاواردا دەهاتنەسەر ئەو تابلۆ و کتێبانەی جەلادەت لە زەریای جوانییە کوژراوەکانەوە دەیهێنانەوە، ئەوەی لەو نێوەندەدا شوێنی سەرنج بوو ئەوەبوو جار دوای جار جەلادەت بێدەنگترو سپی تر دەبوو، جار دوای جاریش دەنگی زرینگەیەکی دوورترو ڕۆحانیترو قووڵتری لە خۆدەگرت.

کاتێک من ناسیم لە چڵەپۆپەی ناوبانگیدا بوو، شتێک لە بێباکی قووڵی تیا دروستبووبوو، سەرەتا بێباکییەکەیم وەک کەمتەرخەمی خەڵکانێک بینی کە ناوبانگ پرسیارو فزوڵیان تیادەکوژێت، بەڵام درەنگ تێگەیشتم ئەو بێباکییە، دەرەنجامی ئەو هەموو سەفەرە درێژ و عاجباتیانەیە کە ئەو بە ژیاندا کردویەتی. ئەوکات وەک مۆسیقارێک کۆنسێرتەکانی لەسەرتاسەری وڵاتدا دەنگیدابووەوە. جەلیلی باران دواتر بەدرێژیی باسی دەرکەوتنی ئەو تیپە چکۆلانەیەی بۆکردم کە پێشتر چەند جارێک بە حیکایەتی جەلادەتی کۆتر خۆی بیستبووم. ئەو ئێوارەیە کە بە خۆی فلووتەکەیەوە خۆی کرد بە لای محەمەدی فیردەوسی و مۆسیقارەکانی هاوڕێیدا، ئێوارەیەکی مێژوویی بوو. جەلیلی باران حیکایەتی ئەو سەردەمە سەیرەی بەمجۆرە بۆ گێڕامەوە و گووتی:

«عەلی شەرەفیار، ئێوارەیەکی سەیربوو، لەو ئێوارەیەوە ژیانی هەموومان گۆڕا، تا ئەو ئێوارەیە ئێمە کۆمەڵێک منداڵ بووین تەنیا گەمەمان بە ئامێرە مۆسیقییەکانمان دەکرد... لەو ئێوارەیەدا وەک تارماییەکی سپی لە پاڵتۆیەکی سپی درێژدا دەرکەوت و هەوای ئاوازێکی بۆ هێناین بە ئێمە نائاشنابوو.

ئێوارەیەکی سەیربوو تازە بە تازە هەستمان بە چنگە تیژەکانی بای زستان دەکرد. دوو ساڵ و نیو زیاتر بوو بێ سەرو شوێن بوو. ونبوونی کوتوپڕی خەفەتێکی زۆری دایە من و محەمەدی فیردەوسی، ئەو کات زۆر بە دوایدا گەڕاین و دواجار بیستمان لە زیندانی یەکێک لە حیزبەکاندا بە نەخۆشی مردووە. هاتنەوەی زۆر سەیرو ناوەخت بوو. من لێم پرسی: جەلادەت لە کوێ بوویت، ئەم هەموو ماوە درێژە، چیت بەسەرهات؟. بە نیگایەکی جوان و ئارامەوە پێیگووتم «جەلیلی باران، لە فڕین بووم، لە فڕین بەسەر دەریای جوانییە کوژراوەکاندا». ئەو ئێوارەیە لە ناوماندا دانیشت و بێ هیچ تەکلیفێک تکای لە محەمەدی فیردەوسی و لە ئێمەش کرد ناوی تیپەکەمان بنێین «کەشتی سپی». بێئەوەی هیچی دی بڵێت، بێئەوەی وەک جاران خۆی بە تیورەکانەوە سەرقاڵبکات. فلووتە سپییەکەی هەڵگرت و ئەو مۆسیقایەی بۆ لێداین کە ژیانی ئێمەی لە بنەوە گۆڕی. من پێشتر باوەڕم بە تواناو موعجیزەی مۆسیقا هەبوو، بەلام تا ئەو ساتە مۆسیقایەکی وەهام نەبیستبوو کە سەر لەبەری سەیرکردن و تەماشاکردنت بۆ دونیا بگۆڕێت. تا ئەو ساتە هەرچی مۆسیقایەکم لێدابوو، هەرچییەک فێربووبووم، هەرچییەک بیستبووم هیچ نەبوون جگە لە کەفێکی سپی کە شەپۆلی ئەو ئاوازانەی جەلادەت لەگەڵ خۆیدا بردی و نەگەڕانەوە. ئەو شەوە گەڕامەوە بۆ ماڵێ، وەک شێتم لێهاتبوو، وەک ئەو شەوەم لێهاتبوو کە لە ناوەڕاستی ئاهەنگێکدا هەستام و وازم لەو مۆسیقارە درۆزنانە هێنا کە ئیشیان تەنیا شێواندنی گەورەیی مۆسیقابوو، ئەو مۆسیقارە نزمانەی لە پشت لۆتی و گەمژەکانی وڵاتەوە پاندەبوونەوەو مۆسیقایەکیان لێدەدا جیاوازی نەبوو لەگەڵ دەنگی قوونی خۆیاندا. ئەو شەوە کاسێتەکانی خۆم شکاند، نۆتەکانی خۆم سووتاند، دوای بیستنی ئەو ئاوازە دەمویست بمرم... هەستمدەکرد گەر مرۆڤ بیەوێت تا هەتاهەتایە ئەو ئاوازە لە خوێنیدا بێت و جێینەهێڵێت دەبێت بمرێت، دەترسام سبەی بچمەوە بۆ بازاڕی ئاسنگەران

و لەناو هەراوهوریای تەنەکەچی و لوولەسازەکاندا هەموویم بیربچێتەوە... من بڕیارمدا ئەو شەوە بمرم بۆئەوەی تا هەتاهەتایە ئەو مۆسیقایەم لە یادنەچێتەوە. سەیربوو، وەک ئەوەی بزانێت لەچ حاڵێکدام، شەوێکی زۆر درەنگ لەدەرگای دام، شەوێکی ناوەخت کە کاتی میوان نەمابوو. زانیم خۆیەتی. تابلۆیەکی گەورەی پێبوو، لە شتێکەوە پێچرابووەوە و لەسەری نوسرابوو «شاری مۆسیقارە سپییەکان». ئەو شەوە نەیهێشت سەیری تابلۆکە بکەم، گووتی ئەوە ئەمانەتی منە لای تۆ، ئەوە شتێکی زۆر بە نرخە لە مامۆستایەکی زۆر بە نرخەوە بۆم ماوەتەوە کە لەو شارەوە هێناومە کە من و تۆ تێیدا یەکترمان ناسی. دەستی خستە سەر شانم و گووتی: لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم تابلۆیە ببێت بە موڵکی تۆ.

سەری پێ بەرزکردمەوەو زانی کە گریاوم. بە ئەسپایی گووتی: جەلیلی باران فلووتەکەت هەڵگرە و بابڕۆین. شەوێکی تۆفان بوو، باران دەباری و با شێتانە بە هەناوی ئەو شارە خەتووەدا هەڵیدەکرد. من بە تەمەن لەو گەورەتر بووم، بەڵام وەک منداڵێک دوای کەوتم، لەگەڵیدا چوومە ناو باران و ڕەشەباو تۆفانەکان. ئەو فلووتی لێدەدا و من بەدوایدا دەڕۆیشتم، نازانم لە چ ساتێکدا جورئەتمکرد و لێوم خستە سەر فلووتەکەم، دیارە نەمدەتوانی وەک ئەو ئەفسونسازبم، بەڵام ئەو شەوە هەستمکرد ئەو مۆسیقارە خەوتووەی ساڵەهای ساڵە لە ڕۆحمدا بۆی دەگەڕێم لە خەو هەڵدەستێت، ئەو مۆسیقارەی لە ناومدا مردووە ڕادەپەڕێت، هەستمدەکرد دڵ و دەست و ڕۆحم بۆ دەنگە جیاوازەکانی ناو گەردون دەکرێتەوە، هەستم بە با دەکرد تێکەڵ بە دەروونم دەبێت و دەبێت بە مۆسیقا، هەستم بە باران دەکرد دەدا بە فلووتەکەمدا و دەبێت بە مۆسیقا، هەستم بە شەو دەکرد لەگەڵ هەموو هەناسەیەکی مندا دەبێتە ئاواز. بروسکەم دەبینی لە ژێر پەنجەمدا دەبێتە مۆسیقا. عەلی شەرەفیار بەدرێژایی شەو بەدوایدا دەڕۆیشتم و نەمدەزانی بوکوێم دەبات، نەمدەپرسی بۆ کوێم دەبات، خۆیشی نەیدەزانی دەچێت بۆ

کوێ، زەوی هەمووی ماڵی ئێمە بوو، گەردون سەرتاپای سەحنەی من و ئەو بوو. لەو شەوەدا بۆ یەکەمجار من بووم بە مۆسیقار.

دوای ئەزموونی ئەو شەوە، وەک دەرویشێک دوای جەلادەتی کوتر کەوتم. ڕۆژی دوایی محەمەدی فیردەوسیم لە هەمان دۆخی ڕۆحی سەختدا بینییەوە، لەدوای ئەو مۆسیقایەوە چیتر باوەڕی بەوە نەبوو هونەر بەلەمێکی بەفر بێت کە تا ناوەڕاستی دەریا دەمانبات و لەوێ خۆی دەتوێتەوەو ئێمەش دەخنکێین. دوای ئەو مۆسیقایە دڵنیابوو مرۆڤ دەتوانێت بە هونەر ئەو دەریایە ببڕێت، دەیگووت: گەر خۆشمان بخنکێین، مۆسیقاکان و تابلۆکانمان لە دەریا دەپەڕنەوە.

لە ئێوارەی دواترەوە جەلادەت بوو بە مامۆستای هەموومان، لەو ژێر زەمینەدا ئەو مۆسیقاره خەوتووەی ناو ڕۆحی هەموومانی لە خەو هەستان. ئەو ئاوازە تەلیسماویانەی فێرکردین کە مەودای نێوان زەمین و ئاسمانیان کورتدەکردەوە، ئەو ئاوازانەی فڕین و مۆسیقایان دەکرد بە یەکێک و ئێستاو ئەبەدییەتیان دەدا لە یەک. مۆسیقارەکانی دیکەش وەک من دوای کەوتن و بڕوایان بە هونەر و موعجیزەکانی هێنا. پێکڕا ئەو تیپەمان دروستکرد کە ئێمە لە ڕێگای ئەوەوە بە موعجیزەکانی مۆسیقا گەیشتین و ئەو لە ڕێگای ئێمەوە ئاوازە نەمرەکانی زیندووکردەوە. سەرەتا تیپێکی چکۆلانە بووین، لە تەپوتۆزی شەڕی ناوخۆدا هەندێک کۆنسێرتی چکۆلەمان پێشکەشکرد، جەلادەت خۆی گروپەکەمانی دەبردبەڕێوە، کاریگەری کۆنسێرتەکانمان سەیرو سیحراوی بوو، مۆسیقاکانمان خەڵکی نابینای چاکدەکردەوە، باغی پەژمووردەی سەوزدەکردو خاکی وشکی دەخستەوە بەر. لەدوای چەند کۆنسێرتێک جەلادەت دەبوو بەو مۆسیقاره سیحراوییەی ناوبانگی لە هەموو ئەم وڵاتەدا دەبیسترا، جەلادەت لە سەرەتای هەموو ئاهەنگە مۆسیقییەکانماندا لەبەردەم ئامادەبووانـدا دەنوشتایەوە و ناوی مردوویەکی دەهێناو دەیگووت «بەڕێزان ئەوەی ئەمڕۆ ئێوە دەیبیستن

مۆسیقای ڕۆحی ئەو پیاوەیە کە من لە مەرگەوە بۆم هێناونەتەوە».
هەموو واماندەزانی کە ئەوەش جۆرە گەمەیەکی سیحراوی جەلادەتە کە ئاوازەکان بە ناوی هەندێک مۆسیقاری مردووەوە ناودەنێت. ئێمە لە شارە گەورەکان و لە شارۆچکەکان و لە گوندەکاندا مۆسیقامان لێدا، دەچووینە هەر شوێنێک سەدان خەڵک پێشوازیان لێدەکردین و سەدان بە گریانەوە مالاواییان لێدەکردین. سەردەمانێک وازمان لەوە هێنا هۆل بگرین و خەڵک کۆبکەینەوە، بەڵکو وەک گروپێک لە قەرەج بە خۆمان و ئامێرەکانمانەوە بەپێی کەوتینە گەشتێکی شێتانە بە ناو سروشت و ئاوەدانییەکانی وڵاتدا، لە هەموو ئەو سەفەرانەدا محەمەدی فیردەوسیمان لەگەڵدا بوو کە بە خۆی و فڵچەکانییەوە دەیویست مۆسیقاکانی ئێمە ڕەسمبکات، دەیویست نیگاری ناو ڕۆحمان بکێشێت. لەو سەفەرە دوورو درێژانەدا هێندەی لە ئاوەدانی دەچووین بەودیودا کومەڵێک ئەسپی سپی چاوەڕوانیاندەکردین کە ئێمەیان شارەو شارو هەرێمەو هەرێم هەڵدەگرت. لەو سەفەرەدا بە ناو دەیان گۆڕستاندا گوزەرمانکرد، هەموو بە چاوی خۆمان ئەو مۆسیقارانەمان بینییەوە کە لە گۆڕەکان هەڵدەستان و دوامانده‌کەوتن، ئەو مۆسیقارە مردووانەی سەدان ساڵ بوو لە ژێر خاکدا بوون هەڵدەستانەوەو لەگەڵماندا مارشیاندەکرد. لەگەڵماندا مۆسیقایان لێدەدا، ڕۆژێک ئاوڕمدایەوەو هەزاران مۆسیقاری مردووم بینی لە دوامانەوە دەڕۆن، هەزاران ئاوازی سەیرو سیحراویم بینی کە لە پشتی ئێمەوە تیپی ترو مۆسیقاری تر دەیانژەند... تا چاو بڕبکات مۆسیقار بوو، تا چاو بڕبکات دەریایەک بوو لە مۆسیقاری سپی سپی کە پێکڕا زیندووبووبوونەوەو وەک لەشکرێکی َگەورە بە زەویدا دەڕۆیشتین. من هەموویانم دەبینی. لە شارە گەورەکاندا لەگەڵماندا کۆراڵێکی گەورەیان دروستدەکرد، کاتێک لە گەرمەی سروود و گۆرانییەکانیدا ئەو هەزاران مۆسیقارە لەگەڵماندا ئاوازەکانیان دەگووتەوە دەنگمان دەگەیشتە دەریا دوورەکان، دەگەیشتە خۆر، دەگەیشتە ئەو کانگا دوورانەی جوانیان

لێوەدێت. جەلادەت دڵنیابوو من یەکێکم لەو کەسە دەگمەنانەی ئەو هەموو مۆسیقارە مردووە دەبینم کە لە پشتمانەوە زیندووبوونەتەوە، ئەو سوپا مەزنەی لەگەڵماندا ئاوازەکان دەژەنن و وادەکەن سەدای مۆسیقاکەمان وەک دەنگی ئەبەدییەت وەهابێت لەسەر زەوی.

ناوی تیپەکەمان «کەشتی سپی» بە هەموو زەمیندا بڵاوبووەوە، لە شەڕە گەورەکاندا بە ناو سەنگەرەکاندا مارشمانکرد، لە شارە چۆڵ و هۆڵ و غەمگینەکاندا کۆنسێرتی گەورەمان بۆ بێدەنگی و تاریکی و ڕەشەبای شەو سازکرد. وەرزێک بوو ئێمە بە مۆسیقا مێژووی مردنی ئەو هەرێمەمان دەگێڕایەوە. لەو شارە چۆڵ و هۆڵانەوە چووینە ناو هەرێمی ئەو تۆوە دڵنیابووم سەربەم ئەستێرەیە نین، خاکی ئەوتۆم بینی کە سەرەتای دەستپێکردنی کیشوەرێکی دیکە بوو لە ڕەنگ و نیگارو هارمۆنییەت. ڕۆژێک لە ڕۆژان محەمەدی فیردەوسیمان لەو خاکانەدا ونکردو نەماندۆزییەوە. پێموایە محەمەدی فیردەوسی بەدەم دروستکردنی نیگارەکانی خۆیەوە هێند دوور ڕۆی ئیدی چیتر لەو باغە جاویدان و قووڵ و ناکۆتایەدا نەیتوانی بگەڕێتەوە. دوای چەندین مانگ کە گەڕاینەوە ئێمە بە ناوبانگترین تیپی مۆسیقای ئەو هەرێمە بووین کە لە پشتمانەوە کۆراڵێکی گەورە ئاوازەکانی دەگووتەوە، ئامێری هەر یەکێکمان بکەوتایە سەر نەغمە دەنگی هەزار ئامێری نەبینراو لەگەڵیدا ئاوازیان دەژەند، هەزاران فلووت لە ڕێگای فلووتەکەی منەوە زیندوودەبوونەوە، هەزاران کەمانچە لەناو کەمانچەکانی ئێمەدا هاتبوونە زمان. لەو ماوەیەدا زۆرجار جەلادەت جێیدەهێشتین و من لەبری ئەو لە پێشی ئەو سوپا گەورەیەوە بەرەو نادیار دەڕۆیشتم. کە دوای ئەو وەرزە درێژە گەڕاینەوە جەلادەتی کۆتر پێیگووتم: جەلیلی باران ئێستا کاتی ئەوە هاتووە سەیری تابلۆی شاری مۆسیقارە سپییەکان بکەیت. لێرە بەدواوە ئەو تابلۆیەماڵی تۆیە. عەلی شەرەفیار کە من گەیشتمەوە ماڵ و سەیری تابلۆی ئەو شارەم کرد،

هەستمکرد هێزێکی تێدایە زۆر قووڵ من بەرەو خۆی ڕادەکێشێت».
من لەو ماوەیەدا کە لە وڵات بووم و سەرقاڵی ئامادەکردنی ئەم کتێبەبووم لە دوو کۆنسێرتی ئەو تیپە چکۆلانەیەدا ئامادەبووم. لە پشتەوە هەستم بەو شەپۆلە گەورەو بەهێزانەی مۆسیقا کرد کە وەک بایەک لە دوورەوە بێت، هەموو شتێکی لە ناخمدا دەجولاند، دەمزانی ئەو چەند ئامێرە بچکۆلەیەی دەستی ئەو مۆسیقارانە بە تەنیا ناتوانن شەپۆلی هێند گەورە دروستبکەن، لە کۆنسێرتی دووهەمدا لەسەر کورسییەکی چکۆلانە لە دوای دواوە دانیشتبووم، لە ناو سیحری ئەو مۆسیقایە نەمدەتوانی چاو هەڵبڕم، لە ناوەڕاستی کۆنسێرتەکەدا چاومکردەوەو بینیم هەموو ئامادەبووان وەک من بە جۆرێک لە ڕۆحی خۆیاندا قووڵ بوونەتەوە کەسیان ناتوانن چاو بەرزبکەنەوە، ساتێک بوو هەستم بە بایەکی بەهێزکرد، هەستم بە شنەیەکی سیحراوی کرد... لە زوڵمەتی هۆڵەکەدا وەک پیاوێکی مەست و خەواڵوو تەماشامکردو ئەو دەریا بەرین و بێسنوورەی مۆسیقارەکانم بینی کە لە پشتی سەحنەکەوە تا ئەوسەری دونیا درێژبووبووەوە، هەزاران مۆسیقاری سپیم بینی بە هەزاران کەمانچەو فلووت و چەلۆو سەنتوورەوە. سەرێکیان لە پشت جەلادەت و گروپەکەیەوە دەستی پێدەکرد و کۆتاییەکەشیان لە ناو هەورو تەمێکی گەردونی سپیدا ونبووبوو. ئەو ڕۆژە لە دوای کۆنسێرتەکە باوەشم بە جەلادەتی کۆتردا کردو گریام، ئەو لەگەڵمدا نەگریا، بە ئارامی باوەشی پیاکردمەوەو گووتی: من پێمگووتی، دەبێت حەقیقەت بنوسی، حەقیقەت و هیچی تر.
لە یەکێک لەو کۆنسێرتانەدا بوو کە جەلادەت شاناز سەلیمی لە ڕیزی پێشی پێشەوە بینی، ئەو ژنەی بە ترس و حیرەتێکی بێسنوورەوە سەیریدەکرد و وەک باوەڕ بە گوێچکەو چاوی خۆی نەکات، لەگەڵ هەموو کینەو ڕقی نێوچاویدا تا کۆتایی لە ناو کورسییەکەی خۆیدا بە پێچەوانەی هەموو جارەکانی ترەوە بە سەرسامی تەماشایدەکرد. کە من گەڕامەوە،

ماوەیەک بوو ڕەوشەنی مستەفا سەقزی و کچێکی دیکە ئەندامی تیپی مۆسیقای کەشتی سپی بوون. لە کۆنسێرتەکاندا لە تەنیشت جەلادەتی کۆترەوە دەوەستاو بە پێوە کەمانی لێدەدا. ئەو وێنەکانی منداڵی شاروخی شاروخی نیشاندام. ناسیمەوە، خۆی بوو هەر ئەو گەنجەبوو کە بۆ دواجار لە فرۆکەخانەی سخیپۆل هاتەڕێکام و ڕاسپاردەکانی خۆی دامێ، ئەوە دواهەمین دەرکەوتنی بوو. دوا ئەوە جەلادەت هەر سەفەرێکی کردبێت بە تەنیا بەرەو شاری مۆسیقارە سپییەکان کەوتۆتەڕێ. جەلادەت دەیگووت: هەموو قەقنەسێک دواهەمین دەرکەوتنی خۆی هەیە، ڕۆژێک دێت بە کوچەکانی ئەو شارە سپییەدا سەردەکەوێت و ئیدی ناگەڕێتەوە، ئەوە ئەو ساتە وەختانەیە کە ئارەزووی مرۆڤ بۆ جوانی تێکەڵ بە ئارەزووی دەبێت بۆ مردن. لە ناو هەموو بانگەوازێکدا بۆ جوانی ئارەزوویەکی قووڵی مردن هەیە و لە ناو هەموو ئارەزوویەکی مردنیشدا بانگەوازێکی گەورەی جوانی هەیە.

ئەو لەوەوبەر چەندین جار مردبوو، ئارەزوویەکی نەبوو دووبارە بەو ئەزموونە تاڵانەدا تێبپەڕێتەوە. دەیویست جارێک وەک باڵندەکان بمرێت، بڕوات و نەگەڕێتەوە. وەک چۆن باڵندەیەک دەفڕێت و لەبەرچاو وندەبێت، بفڕێت و کەس نەزانێت بە چ ئاڕاستەیەکدا فڕیوە. هەموو دەمانزانی ئەو ڕۆژەی کە دەڕوات و ناگەڕێتەوە زۆر نزیکە. تا دەهات سپی تر دەینواند، دەنگی خۆی دوورتر دەهاتە گوێم و مۆسیقاکەی ئاسمانیتر دەبوو. ئەو ماوە درێژەی پێکەوە بردمانە سەر، ئەو ڕۆژانەی پێکەوە بەسەر دەستنووسی ئەم کتێبەدا چووینەوە، وەک یادگاری هەرە گەورەی ژیانم دەمێننەوە. سەدەها سەعاتمان پێکەوە بردەسەر، زۆرجار بە جزمەیەکی درێژو پاڵتۆیەکی چەرمەوە دەهات بۆلای من و پێکەوە گوێمان لە مۆسیقای کلاسیک دەگرت. هەرجارێک ڕەشنوسێکی ئەم کتێبەم بدایەتێ بۆئەوەی بکەینە دوا داڕشتن، یان چەندەها بەشی لادەبرد، یان چەند بەشێکی نوێی

بۆ زیاددەکرد. هەندێجار دەمگووت: جەلادەت ئەم کتێبە هێند گەورەدەبێت، خوێنەری ولاتی ئێمە، کە بە هەواڵێکی شەش دێری هەناسەی سواردەبێت بۆی ناخوێنرێتەوە.

ئەو دەیگووت: عەلی شەرەفیار خوێندنەوەی کتێب شتێکی ئاسان نییە، هەندێک کتێب دەبێت سەدان ساڵ چاوەڕوانبکەن تا خوێنەرێکی ڕاستەقینە دەدۆزنەوە بیانخوێنێتەوە.

لەو ماوەیەدا من ڕۆژی زیاد لە هەشت سەعاتم لەو ئوتێلە سووتاوەدا دەبردەسەر کە هێدی هێدی هەموو ماڵە ئاوارەکان چۆڵیاندەکردو دەبووە خەراباتێکی بێدەنگ، سێ مانگ بەر لە دەستکردن بە پرۆژەی تازەکردنەوەی ئەو ئوتێلە، لە جەلادەت بەولاوە هیچ کەس لەو ئوتێلەدا نەدەژیا. ئەو ماوەیە وەک شێت دەبایە کاربکەین بۆ ئەوەی بەر لەوەی شوێنەکەمان پێچۆڵبکەن هەمووشتێک ئامادەبێت. بوون و نەبوونی لەم شارەدا بەو جێگایەوە گرێدرابوو، دەمزانی ئەو ڕۆژەی پۆلیسەکان شتەکانی فڕێدەدەنە دەرێ ئیدی دەڕوات و ناگەڕێتەوە.

بەر لە ڕۆیشتنی بە سێ مانگ بەجۆرێکی سەیر بەسەر هەموو شتێکدا دەچووەوە، بەلام دواجار بە زەحمەتێکی زۆر مافی زیادکردنی هەندێک ڕستە و بەشێکی کۆتایی بۆ بەجێهێشتم. هەستمدەکرد گێڕانەوەی بەردەوامی ئەو چیرۆکە ئازاری دەدات، ئەگەرچی تا ئەوکات لە ناو هەندێک بەش و دیمەنی ئەو ڕوداوانەدا دەژیا، بەلام دڵنیابوو هەموو شتێک تێپەڕیوەو کۆتایی هاتووە، گەیاندنی ئەو نامانەی بە گرنگترین ئیشی ژیانی خۆی دەزانی، هەموو ئێوارەیەک جێیدەهێشتم و بەربەیان دەگەڕایەوە، هەندێجار چەندین ڕۆژ وندەبوو و من تەنیا لەسەر دەستنوس و تێبینی ناو دەفتەرە شڕەکانی ئەو ئیشمدەکرد. کە ماندوودەبووین تکام تیادەکرد فلووتم بۆ لێبدات، بە تەنیا دەچووە پێشی ئەو باڵکۆنە بەرزەو فلووتە سیحراوییەکەی خۆی لێدەدا، ئێستاش دوای چەندین ساڵ کە بەلای

ئەو ئوتێلەدا دەڕۆم بەردەوام سەر بۆ باڵکۆنێکی چکۆلانە لە قاتی شەش بەرزدەکەمەوەو دەیبینم لەوێکانەدا وەک خودایەکی گریکی، وەک کریشنا لە باڵکۆنەکەدا وەستاوەو مۆسیقا لێدەدات. بەڵام دواجار کە بە داوەتی یەکێک لە سیاسەتمەدارەکان چوومە ئەو ئوتێلە بەرزەوە کە کرابوو بە یەکێک لە مۆدێرنترین سەنتەرەکانی میوانداری ئەو هەرێمە، هەستم بە هیچ نەکرد، شوێنێکی قەبزو ترسناک هاتەبەرچاوم کە مرۆڤ تێیدا دەخنکێت، من بەرابەر میوانەکەم دانیشتم و چاوم لێکناو گەڕامەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی جەلادەت لەم ئوتێلەدا لەگەڵ ئاوارە پاکەکاندا دەژیا گوێم لە دەنگی فلووتەکەی بوو لە دیوێکی تاریک و نادیاری ئەم ئوتێلەدا بەردەوامە، بەڵام دەنگێک هیچ کەسێک نەیدەبیست من نەبێت.

هەندێک ڕۆژ لە کاتی نوسیندا جەلیلی باران و ڕەوشەنی مستەفا سەقزی دەهاتن بۆلام، هەموو دەیانویست شتەکان بە ئیقاعێکی خاو بڕوات، ڕایان وابوو مانەوەی جەلادەت لەم شارو دەوروبەرەدا بە نوکی قەڵەمەکەی منەوە گرێدراوە. بەڵام دەمزانی ئەم چیرۆکەش وەک هەموو چیرۆکەکانی دیکەی دونیا دەبێت تەواو ببێت. بۆ من جۆرە هاوکێشەیەکی ئەستەم بوو، یەکەمجاربوو ڕێبکەوێت مانەوەی پاڵەوانەکەت لە ژیانی ڕاستیدا بە ژیان و مانەوەیە لە ناو چیرۆکێکدا گرێبدرێت. پێشتر من جۆرە حاڵەتێکی وەهام لە هەموو مێژووی چیرۆکدا نەبینیبوو. سەختبوو بۆ من کە دەمبینی کۆتایی ئەم چیرۆکە کۆتایی جەلادەتیشە لە نێوماندا، کۆتایی گەشتەکانێتی بەرەو ئەو شارە سپییە، کۆتایی سەفەرە ئەفسوناوییەکانێتی کە ئێستا وەک قەقنەسێکی شارەزا بە ڕێگاکانی عەدەمدا خۆی بێ هیچ کۆمەک و یاریدەدەرێک ئەنجامیدەدا. پیاوێک بوو تا دەهات سپی دەبوو، دەترسام لە کۆتاییدا وەک پەیکەرێکی گەچ لەو باڵکۆنەدا بوەستێت و ئیدی نەجوڵێتەوە. ئەوکات من لە هەموو کەسی دیکەی دونیا لێوەی نزیکتربووم. ئەو کاتە کەمەی لە ناو ئێمەدا مابووی لەوەدا سەرفیدەکرد مۆسیقا

سیحراوییەکانی خۆی، هونەرە خەیاڵییەکانی فێری مۆسیقارەکانی «کەشتی سپی» بکات تا دوای خۆی ئەو نەغمانە وەک باڵندە بە جیهاندا ئازادبکەن. دەیویست تا توانای هەیە نامەی کوژراوەکان دابەشبکات. شەوێکیان پێیگووتم: گەورەترین حەسرەتی ژیانم ئەو نەخشەیەیە، نەخشەی ئەو گۆڕە دەستەجەمعیانەی ڕۆژێک لە نێو دەستمدا بوو و نەمتوانی بیپارێزم.
ڕای وابوو، لەبەرئەوەی گەورەترین نهێنی دونیا لە بن دەستیدا بووەو نەیتوانیوە بیپارێزێت، سزای ئەو گوناهە، دەبێت بڕوات لە عەدەمەوە بەڵگەکان بهێنێتەوە. من هەموو جارێک دەستم دەخستە ناو دەستی و دەمگووت: جەلادەت، گوناهی تۆ نییە، تۆ ئامادەبوویت لە پێناویاندا بمریت، هەتا مردنیشت بۆئەوە بوو ئەو نەخشانە ڕزگاربکەیت.

هەندێک شەو دەچوو بۆ لای دالیا سیراجەدین لەو کەمپە، ئەو شەوانە منیش پشوویەکم وەردەگرت و دەچووم بۆ لای ڕەوشەنی مستەفا سەقزی کە لە باغەکەی ماڵی خۆیاندا بەرابەر «مەهدی شاروخ»ی پیر دادەنیشت و پرۆڤەیدەکرد. زۆر لەو شەوانە هاوڕێکانی پەیمانگای «ڕەوشەن» دەهاتن و دەبووە قەرەباڵغییەکی گەورە. من لەگەڵ «مەهدی شاروخ» دا دەستێک تاوڵەم دادەمەزراند و لە قەراغەوە گوێم لەو چیرۆکانە دەگرت کە ئەو گەنجانە دەیانگێڕایەوە. لەو چیرۆکانەوە تێگەیشتم جەلادەتی کۆتر چەند بەناوبانگە، ناوو شوهرەتی لە ناوبانگی سیاسی و گۆرانیبێژەکانی وڵات گەورەتر بوو، بێئەوەی خۆی بزانێت. هەموو ئەو ماوەیەی من لەگەڵیدا ژیام، هەستێکی قووڵی بە بێکەسی و ئاوارەیی هەبوو کە بۆ ساتێکیش لە ڕۆحیدا ئاوانەبوو. کە بەو شارەدا دەگەڕا هیچ کەسێکی نەدەناسی، لە هەموو جێگاکاندا میوان بوو، لە هەموو شوێنێکدا ڕێبوارو ڕاگوزەربوو.
هەر کات لای دالیا سیراجەدین دەگەڕایەوە دەیگووت: شتێک تەواو نییە، شتێک هەیە هێشتا تەواو نییە. دەیزانی هێشتا ئیشێکی زۆر گەورەی ماوە

ئەنجامیبدات، بەڵام نەیدەزانی ئەو ئیشە چییە.

ڕۆژێک لە دواهەمین ڕۆژەکانی کارکردنمان، من و جەلادەت سەرگەرمانە خەریکی چاککردنی هەندێک بەشی ئەم کتێبە بووین. هەر دووکمان بەسەر پەڕەو دەستنووسەکانماندا نوشتابووینەوە، لە ناکاو پیاوێکی باریکی ڕەنگ زەرد پەردەی ژوورەکەی لادا و بە پاڵتۆیەکی خۆڵەمێشی درێژەوە هاتە ژوورێ، پیاوێکی تۆزاوی ماندوو کە سەری خەریکبوو تەواو سپی دەبوو، دەستەکانی بە جۆرێکی سەیر سووتابوون و لێوی سەرەوەی بە کاریگەری برینێکی کۆن هەوی کردبوو، تامیسکی بێخەوی و مۆتەکەو ڕاچڵەکان دەم و لێویان وێرانکردبوو. هەر دووکمان سەرسامانە سەیرمانکردو ئەویش بەسەرسامی سەیریکردین. بە عەرەبییەکی بازاڕیی لێیپرسین: کامتان جەلادەتن؟ جەلادەت گووتی: من جەلادەتم. کەمێک چاوی لێکناو پاڵیدا بە دیوارێکەوەو گووتی: بەڕێز جەلادەت، سڵاوت لێبێت من «باسم ولید صبحی الجزائری»م. لە باشوورەوە بەپێ هاتووم و بەدوای تۆدا دەگەڕێم.

* * *

ئەو ماوەیەی جەلادەت لە زیندان بوو مستەفای شەونم زۆربەی کەلوپەلە گرنگەکانی ئەوی لە فەوتان ڕزگارکرد، بەڵام دۆسییەکەی باسمی جەزائیری بەجۆرێکی سەیر ونبوو. پاش گەڕانەوەی جەلادەت و سۆراغکردنی، ئاشکرابوو مستەفای شەونم هیچ شتێک دەربارەی چارەنوسی ئەو فایلە گەورەیە نازانێت کە لە وێستگەیەکی نادیاردا، لە هاتوچۆی نێوان حیزب و پۆلیس و ئاسایشدا فەوتابوو. دوای دەرکەوتنەوەی دالیا هەوڵەکانی جەلادەت بۆ پەیداکردنەوەی ئەو فایلە بێئەنجام مانەوە. پێدەچوو یەکێک ئەو دۆسییەی بردبێت و لەناو ئەرشیفێکی مەزندا کە تایبەتە بەو جۆرە دۆسیانە هەڵیگرتبێت. ڕۆژگاری دوای ڕاپەڕین، سەردەمێک بوو پڕبوو لە

چیرۆکی فایل و حیکایەتی ئەو دۆسیانەی خەڵک لە کونج و کەلەبەری دەزگاکاندا دەیاندۆزینەوە، لەو سەردەمەدا حیزبەکان گەنجینەی تایبەتیان بۆ ئەو فایلانە دروستکرد، هەندێک لە حیزبەکان چی دۆسییەکیان هەبوو «دۆسییەکانی خۆیانی لێدەرچێت» لە سەدان سندوقی گەورە گەورەدا سەفتەیانکرد و فرۆشتیان بە ئەمریکاییەکان، کە ئەو سەردەمە هەر پارچە کاغەزێک لە عێراقەوە بهاتبایە، لای ئەوان وەک دۆکۆمێنتێکی گرنگ سەیر دەکرا. مستەفای شەونم ڕای وابوو کە دۆسییەکەی باسمی جەزائیری یان بە هۆی کەمتەرخەمی پاسەوانەکانەوە فەوتاوە، یاخود ئێستا لە ڕیزی ئەو فایلە گەورانەدایە کە تەنیا خودا دەزانێت ئەمریکییەکان لە چ بنکەیەکی سەربازی، یاخود لە چ پێگەیەکی سی ئای ئەیدا هەڵیانگرتووە. بەڵام پێدەچێت ئەو فایلە ژیانێکی دی ژیابێت و نەکەوتبێتە بەر ئەو کڕین و فرۆشتنەی لەو سەردەمەدا لە بازاڕەکانی سیاسەتدا باوبوو.

باسمی جەزائیری دوای ساڵانێکی درێژ زیندانی و ئەشکەنجە، دوای ئەوەی چەندین جار لە ژێر ئەشکەنجەدا دەمرێت و زیندوودەبێتەوە، دواجار کە فەرمانی مردنی بەسەردا دەدەن لەبری ئەوەی وەک هەر زیندانییەکی دیکە تیربارانیبکەن یان شەرافەتمەندانە پەتێک بخەنە ملی و بیخنکێنن، دەینێرن بۆ بنکەی تاقیکردنەوەی چەکە بەکتیرییەکان تا لە تاقیگەکانی ئەو بنکەیەدا وەک مشک ئەزموونی لەسەر بکەن. لە دوای ڕاپەڕین خەڵک لە زیندانێکی پیسوپۆخڵدا، لە ژێرزەمینێکی تاریکدا نیوە مردوو دەیدۆزنەوە. لەدوای ڕاپەڕین ڕادەکات بۆ ناو هۆڕەکان و لە زۆنگاوەکانی باشووردا لەگەڵ هەندێک چەکداری شیعەدا مەفرەزەیەکی چکۆلە دروستدەکەن کە بە ڕۆژ خۆیان دەشارنەوەو بە شەو لە مەشحوفەکانیاندا بە ناو زۆنگاوەکاندا دەکەونە گەڕان، باسم بەر لە وشککردنەوەی هۆڕەکان سەیرترین ساڵانی تەمەنی خۆی لەناو قامیشەڵان و زەلستان و تەڕی و کۆڵێتی نهێنی ڕاوچییەکاندا دەباتەسەر. لەوێش بوونەوەرێکی غەریبە کە هاوڕێ

باشوورییەکانی بە «برنجی» بانگیدەکەن کە وشەیەکە ڕیشەکەی دەچێتەوە سەر وشەی «افرنجی» یان فەرەنگی خۆمان و بۆ کەسێک بەکاردێت کە لەسەرو هەندام و ڕەفتاریدا فەرەنگی بێت. هەموو شتێکیان لە ترسدایە، ژیان و هەناسەدان و خواردن و دەرکەوتنیان ملکەچی کۆمەڵێک ڕێساو دەستووری زۆر سەختە، کە پەیوەندی بەو گروپەوە دەکات پێیدەڵێن هەتا هەڵمی خواردنەکەش کە دروستیدەکەن و ئەوان پێیدەڵێن «هبان» نابێت زۆر بەرزبێتەوە. لەگەڵ شەش هەڵهاتووی دیکەدا ئیشیان تەنیا خۆپاراستن و خۆشاردنەوەیە. لەو زەلکاوانە دەژی و یادی ئەو چەند ساڵەی زیندانیش هەرگیز لە خەیاڵی دەرناچێت، سەفەری ئەیوبئاسای ئەو بە ناو زیندانەکاندا هێند درێژ و ترسناکە لە بیرناکرێت. لەو ماوەیەدا چەندەها بەندیخانەو بنکەی ئاسیش و دیلماڵی نهێنی بینیووە، زۆر خەڵکی جیاوازی ناسیوە، ژمارەیەک زۆر لەوانەی لەژێر ئەشکەنجەدا مردن یاخود تیربارانکران هاوڕێی بوون. هێند بە ناو کۆشکەکانی مردن و سەڵتەنەتەکانی مەرگ و قەسابخانە ئادەمییەکاندا سەفەردەکات، ئاشناییەکی تەواو لەگەڵ ئەوانەدا پەیدا دەکات کە هەندێکیان دوای مردنیش دەگەڕێنەوە تا لە خەودا جەلادەکانیان بخنکێنن. لەدوای ئازادبوون و خۆشاردنەوەی لە هۆڕەکاندا هەندێک بەیانی، لە ناو تەمی تەنکی سوبحاندا ئەو تارماییانە دەبینێت کە لە ناو قامیشەلانەکاندا بەدوای ئەودا وێڵن و لە دوورەوە هاتوون سۆراغی ئەو بکەن. هەر ئەو تارماییانەن کۆمەکی پێدەکەن بگەڕێتەوە بۆ لای دالیا سیراجەدین ئەو کچەی هەموو شەوێک لە زیندان، ژوانی لەگەڵدا دروستدەکات و بە خەیاڵ لە شوێنێکی دووردا دەیبینێت.

دوای وشککردنەوەی هۆڕەکان و وەرگێڕانی ڕەوتی ڕووبارەکان و خاپوورکردنی ئەو خاکە سیحراوییەی نیشتیمانی جوانترین جۆرە مراوی دونیایە، باسم لەگەڵ هاوڕێکانیدا هەڵدێنە شار و لە ناو پاشماوەی هەندێک باغ و لە خانووی تەنەکەی هەندێک لە جووتیارەکانی باشووردا کە

ماندوونەناس چاوەڕوانی دەرکەوتنی مەهدی دەکەن خۆی دەشارێتەوە، لەو سەردەمەدا کە عەشقی حوسەین کڵپەیکردووە باسم ناچارە خۆی وەک یەکێک لە کفنپۆشەکان نیشانبدات تا لەنێو سوپای حوسەیندا جێگای ببێتەوە. تارمابییەکان دوایدەکەون بۆ شارو لە باغ و بنکەو شوێنی نهێنی فیداکارانی ئیمامەتیشدا دەبنە هاوڕێی. ڕۆژێک لە ڕۆژان یەکێک لەو تارماییانە فایلێکی گەورەی بۆ دەهێنێت، دۆسییەکی سەنگین، لە زەرفێکی بۆردا بەشێوەیەکی پاک هەڵگیراوە. مۆرێکی ئاسایشی شارەکەی ئێمەی پێوەیەو لەسەرەوە بە خەتێکی ناشیرین، یەکێکی نیمچە خوێندەوار نوسیویتی «ئەغرازی جەلادات ئیسمعیل».

ئاشکرایە یەکێک لەوانەی بەدوای فایلی خۆیدا گەڕاوە، بەجۆرێک لە جۆرەکان ئەو فایلەی باسمی لە دۆڵابەکانی ئاسایشدا بەردەستکەوتووە و لەگەڵ خۆیدا بردویتی بۆ باشوورو لەو ڕێگایەوە باسمی جەزائیری یەکەمین سەرەداوی بەرەو ڕابوردووی خۆی دەست دەکەوێت. من تەواوی حیکایەتەکەم لەو نامەیەی دالیاوە پێگەیشت کە ساڵانێک دواتر لە هەلومەرجێکی سەیرو پڕ نهێنیدا بۆ دکتۆر موسای بابەکی نوسیبوو. بەڵام ئەو ڕۆژەی کە باسم جەزائیری حیکایەتەکەی بۆ ئێمە گێڕایەوە، شتێکی تەواو جیاوازبوو. باسم باسی لەوە دەکرد کە بەشێکی فایلی تایبەتی ئەو لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ئۆپۆزسیۆندا بڵاوبۆتەوە، بۆ سۆراغی ئەو فایلە پەیوەندی بەو باڵە تایبەتەی نەیارانی ڕژێمەوە کردووە و پێیان ڕاگەیاندووە کە دۆسییەکەیان لە ڕێگای هەوادارێکی خۆیانەوە لە ئاسایش دەستکەوتووە. دواتر جەلادەت دۆسییەکە لەوان وەردەگرێت و ئەو مۆرەی ئاسایش و ئەو ناوە سەیرەش دەخوێنێتەوە کە لە گۆشەیەکی سەرەوەی بەرگەکەدا بە خواروخێچی نوسراوە.

ئەو ڕۆژەی باسمی جەزائیری لە قاتی شەشەمی ئەو ئوتێلەدا دەرکەوت، ئاگاداری ئەو پەیوەندییە دووروودرێژەی نێوان جەلادەتی کۆترو

دالیا سیراجەدین نەبوو، کە تائەوکات کچێک بوو تەنیا لە خەون و خەیاڵ و فەنتازیاکانی خۆیدا بۆی دەگەڕا. جەلادەت وەک ڕێز لە سوڵتانێک بگرێت بەو چەشنە حورمەت و جوامێری بەرابەر باسم نواند، کە ساڵانی دووروودرێژی زیندان و مانەوەی زۆر لە ژێر خۆری باشووردا دالیا نەبێت هەموو شتێکیان لە یادەوەریدا سڕیبووەوە. لەگەڵ دەرکەوتنی باسمدا، جەلادەت هەستیکرد هەموو شتێک بەرەو کۆتایی دەڕوات، من بەوردی سەیری چاویم کردو ئەو تیشکە گەورەیەم تێدابینی کە بەدەگمەن لە چاوانیدا دەردەکەوت، تیشکێک بەڵگەی خۆشحاڵی یەکێک بوو، دڵنیابێت پەیامی خۆی بەجێهێناوە. لەو ساتەدا وەک یەکێک هاتە بەرچاوم کە هەرچۆنێک دەجوڵێتەوە موعجیزەکان دێنە ڕێگای. بە کەسێک دەچوو کە گەرداوێکی پێچەوانە باژۆدەدات و هەرچییەک شەڕو کارەساتەکان دروستیانکردوە ئەو سارێژیاندەکاتەوە. پێدەچوو لەسەرەتاوە بزانێت کە قەدەری ئەو ئەوەیە ڕێگایەک بێت دالیا سیراجەدین و باسمی جەزائیری بە نێویدا بڕۆن بۆئەوەی یەکدی بدۆزنەوە. ئەو ڕۆژە فرمێسکێکی هێمن و سەیرم لە چاویدا بینی، فرمێسکی مرۆڤێک مەحکومە جوانی و خۆشەویستی ڕزگاربکات. باسمی جەزائیری باوەڕی نەدەکرد کە دالیا سیراجەدین ئاوها نزیکە، بەجۆرێک سەرسام گوێیدەگرت، من دەترسام تووشی دەردێکی کوتوپڕببێت و بمرێت، بەڵام دواجار باوەشی پیاکردو گووتی: هاوڕێم بمبە بۆ لای دالیا، بەر لەوەی خۆر ئاوابێت، بمبە بۆ لای دالیا، من هەستدەکەم زۆربەی هەرە زۆری ڕووناکی ڕۆژمان بڕیوەو تەنیا شەومان بەدەستەوەماوە، بەر لەوەی تەواو تاریک ببێت دەمەوێت دالیا ببینم.

جەلادەت هەموو ژیانی چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد بەر لەوەی بڕوات و بەجێمان بهێڵێت دیارییەکی گەورە پێشکەش بە دالیا بکات. من دەمزانی ئەو

ئێوارەیە چیرۆکێکی گەورە کۆتایی پێدێت، زۆر تکام تیاکرد لەگەڵ خۆیدا بمبات تا ئەو ساتە ببینم کە تێیدا دالیا و باسمی جەزائیری باوەش بەیەکدا دەکەنەوە. بەڵام ئەو بێڕەحمانە سەیریکردم و گووتی: عەلی شەرەفیار، بینینی فلیمی خراپ و بێمانا عەقڵیان تێکداویت. شتەکان بەوجۆرە نین کە تۆ دەیهێنیتە پێش چاوی خۆت.

وەک ئەوەی بزانێت ئەو خۆشەویستییە گەورەیە، ئەو عەشقە پاک و بێسنوورە کە بەناو زیندان و کارەسات و تەپوتۆزی جەنگدا ڕۆیشتووە، هەمیشە خۆشەویستییەکی نهێنییەو بە نهێنیش دەمێنێتەوە، وەک ئەوەی بیەوێت دالیاو باسم لەو هەڕەشەو کارەساتە نادیارانەی دی بپارێزێت کە دەشێت لە هەموو جێگایەک و لە هەموو دەورو زەمانێکدا تووشیبین. نەیهێشت نە من، نە هیچ ڕۆحلەبەرێکی دی کۆتایی ئەو چیرۆکە ببینێت. پێیگووتم: بمبورە عەلی شەرەفیار، ئەم خۆشەویستییە شتێکی دیکەیە، ئەمەیان خۆشەویستی کچێک نییە بۆ پیاوێک، ئەمەیان لای من خۆشەویستی مرۆڤە بۆ مرۆڤ، ئەمە لەسەروو هەموو شتێکەوە، تۆ نازانیت چەند ئەهریمەن و جنۆکەو شتی ترسناکی تر هەن دەیانەوێت ئەوە بکوژن، تۆ نازانیت... دەبێت ئەم خۆشەویستییە لە شوێنێکی نهێنیدا هەڵگرین، لە جێگایەکی تردا کە هیچ کەس دەستی نەیگاتێ.

لەو ساتەدا هەستمکرد جەلادەت نهێنی زۆر قووڵتر دەزانێت لەوەی کە ئێمە دەیزانین. وەک ئەوەبوو بڕیاری دابێت، ئەو خۆشەویستییە وەک پارچەیەک مۆسیقای جاویدان، وەک تابلۆیەکی نەمر، بۆ هەتاهەتایە لە جێگایەکدا هەڵگرێت، دوور لە گەردی جەنگ و دوور لە دەردی زەمان. ئەو ڕۆژە لەگەڵ باسمی جەزائیریدا ڕۆیشتن و دواتر من باسمم نەبینییەوە. کاتێک چوونەدەرێ باسم لە بەردەرگاکە ئاوڕێکی دایەوەو من سەیری چاویم کرد، نەمدەزانی ئاخۆ باسم مرۆڤە یان تارماییەکە لە مەرگ گەڕاوەتەوە، جەلادەت خۆی زیندووە یان مردوو، دالیا بوونەوەرێکی

ڕاستەقینەیە لە گۆشت و خوێن یان تەنیا وەهمێکە لە وەهمەکانی ناو ژیانی ئێمە؟؟. بێئەوەی لە هیچ تێبگەم، قەڵەمەکەمم فڕێداو دەستمکرد بە گریان.

دوای ئەو ڕۆژە هیچ شتێکم لەسەر ئەو دوو عاشقە نەبیستەوە، ئەو ڕۆژە کەمانەی دیکەش کە من لەگەڵ جەلادەتدا بردمنەسەر ئامادە نەبوو بە هیچ جۆرێک لەسەر ئەو دوو دڵدارە بدوێت کە دەیگووت: لە جێگایەکی ئەمیندا، درێژە بە خۆشەویستییەکی نهێنی و جاویدان دەدەن. دوا شتێک لەسەر دالیا بینیبێتم ئەو نامەیەی بوو کە دوای جەنگی سێهەمی کەنداو لە عیادەکەی موسای بابەک خوێندمەوە، ئەو پیرەی پێدەچێت ژیانێکی جاویدان لەسەر ئەم ئەستێرەیە بژی و هەرگیز نەمرێت. نامەیەکی سەیربوو، لەو نامانە دەچوو کە جەلادەتی کۆتر لە شاری مۆسیقارە سپییەکانەوە دەیهێنان، بەیانییەک دکتۆر بابەک بێ مێژوو، بێ ناونیشان، لە بەردەم دەرگای عیادەکەی خۆیدا دەیدۆزێتەوە.

ڕۆژانێک دواتر بەدزی جەلادەتەوە بۆ سۆراغی ئەو دوو عاشقە چووم بۆ ئەو کەمپە دوورەی نێو چیاکان، لەوێ لەگەڵ هەموو ستافە ئینتەرناسیونالەکەدا قسەمکرد، کە تێکڕا حایر لە ونبوونی کتوپڕی دالیا خەیاڵیان لای ئەوەبوو هێزێکی سیاسی دالیای فڕاندبێت. لەو ئێوارەیەوە کە جەلادەت و باسم منیان جێهێشت، دالیا سیراجەدین بەجۆرێکی کوتوپڕ دیارنەمابوو. لە پشوویەکدا لە هاوکارەکانی جیابووبووەوەو ئیدی کەس نەیبینیبوو. ونبوونی دالیاو باسم یەکێکە لەو نهێنیانەی هەرگیز نەکرا پەردە لە ڕووی مەتەڵەکەیدا هەڵبڕم و تەلیسمەکەی بشکێنم. من ساڵ دوای ساڵ لە دوای ئاماژەو نیشانەیەک بمخاتە سەر ڕێگای حەقیقەت، کۆتایی ئەم کتێبەم دواخست، ماوەیەکی درێژ چاوەڕوان بووم کەسێک لە گۆشەیەکی ئەم دونیایەوە دەرکەوێت و هەواڵێکی ئەو دووانەی پێبێت، بەڵام چاوەڕوانییەکی بێهودەو ئومێدێکی ساختەبوو.

ئەو ڕۆژانەی دی جەلادەت تەنیا سەرقاڵی پێداچوونەوەی دەستنوسەکە بوو. بە جۆرێکی سەیر لە ژێر فشاری کاتدا بووین. تەنیا هەفتەیەکمان مابوو بۆئەوەی ئەو ژووورە چۆڵبکەین و کرێکارەکان دەستبکەن بە کاری تازەکردنەوەی ئەو ئوتێلە. من ئەو کات بە تەنیا لەو ئوتێلەدا خەریکی درێژەدان بووم بە نوسین و چاککردن. زۆر ئێواری ڕەوشەنی مستەفای سەقزی و هاوڕێکانی دەهاتن و لە بێدەنگی ئوتێلەکەدا ئاوازە سیحراوییەکانی خۆیان پرۆڤەدەکرد، ئەوان ماوەیەک بوو تەنیا لەو ئوتێلەدا پرۆڤەیاندەکرد. ئێوارەیەکیان درەنگ جەلادەتی کۆتر گەڕایەوەو پێکەوە دەستمانکردەوە بە خوێندنەوەی دوا ڕەشنوس. دوای دوو ڕۆژی ئیشکردنی بەردەوام ئەو دەستنوسە ئامادەبوو کە جەلادەت دەیویست بیبەم بۆ چاپخانە. دەبێت بڵێم کە ئەگەرچی ئەم کتێبەی لێرەدا دەیخوێننەوە هەمان ئەو دەستنوسە نییە، بەڵام جیاوازییەکی زۆر کەمی لەگەڵ ئەو دەستنوسەدا هەیە کە دواجار دەبایە بیکەم بە کتێبێک شایستەی ئەوە بێت ناوی عەلی شەرەفیاری لەسەر بێت. من چەند ساڵێک بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبەم وەستان بۆئەوەی بتوانم زۆر شتی دیکەی بۆ زیادبکەم، بۆئەوەی لە بەرابەر زۆر کێشەدا بگەمە یەقین، بۆئەوەی بەسەر ئەو غەمە قووڵ و تاڵەدا سەرکەوم کە کۆچی جەلادەتی کۆتر لە دڵمدا دروستیکرد، بەڵام تێپەڕینی ڕۆژان و مانگان و ساڵان هیچی لەو ئازارانە نەگۆڕی. ئەو هەموو ساڵە چاوەڕوانمکرد بۆئەوەی تەواوی ئەم چیرۆکە لە خەیاڵمدا لە وێنە ڕاستەقینەکانی جەلادەتی کۆتر و مستەفای شەونم و ڕەوشەنی مستەفای سەقزی و شاروخی شاروخ پاکبکەمەوە، بۆئەوەی خۆم لە دیمەنی ئەو مۆسیقارە مردووانە بەدوور بگرم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کۆنسێرتێکی تیپی کەشتی سپیدا لە دوای جەلادەتەوە بینیمن، بۆئەوەی خۆم لە ترسی ئەو ساتە پاکبکەمەوە کە کوڕێکی ماندوو خۆی کرد بە ژوورەکەماندا و هەواڵی جەلادەتی کۆتری پرسی. دەمویست دواجار ئەو هەستە قووڵە لە خۆمدا بکوژم کە من حەقیقەت دەگێڕمەوە

نەوەک ڕۆمان دەنوسم، بەڵام نەمتوانی، ئەوە حەسرەتێکی قووڵی لە دڵدا دروستکردم کە هەرگیز فەرامۆشی ناکەم. ئاخر بیرتان نەچێت دواجار من ڕۆماننوسبووم نەوەک خزمەتکاری حەقیقەت.

ئێوارەیەک من و جەلادەتی کۆتر چووین بۆ دوکانێکی کۆپی، دووجار هەموو ئەم کتێبە گەورەیەمان کۆپیکردەوە، بە خەتی خۆی لەسەر یەکێک لە کۆپییەکانی نوسی «مستەفای شەونم» و لەسەر ئەوی دیکەیانی نوسی «عەلی شەرەفیار» و نمونە نوسراوەکەشی هەڵگرت بۆ خۆی. هەر ئەو ئێوارەیە داوەتی منی کرد بۆ ئاهەنگێکی بچکۆلەی ماڵاوایی کە دەبایە لە بەشێکی ئەو باغەدا سازیبکەین کە دەکەوتە بەرابەر گێلاسی سپی، ئەو باغەی ڕۆژێک لە ڕۆژان شاروخی شاروخ لەوێوە مۆسیقایەکی نەمری لێدەدا.

ئاهەنگی ماڵاوایی ئێمە هەمان ئەو ڕۆژەبوو کە دەبایە ئوتێلەکەشمان چۆڵبکردایە. سەر لە بەیانی هەموو شتەکانی پێچابووەوە، بڕیاربوو نوێنەکانی بداتە کوڕێک کە لە تیپی «کەشتی سپی» سەنتوری لێدەدا، تەختی خەوتنەکەی کردبووە دیاری بۆ ڕەوشەنی مستەفای سەقزی، کارتۆنی جلەکانی و تەپڵەکەی بۆ مستەفای شەونم، مێخەکانیشی بۆ من. ئەو مێخە زڕکەفتانی خستمنە ناو سندوقی یادگارەکانم، جارێکی دیش جورئەتی ئەوەم نەکرد دەریانبهێنم و تەماشایانبکەم.

کە لەدەرگای ئەو ئوتێلە هاتەدەرێ چاوانی پڕبوون لە فرمێسک، دەیزانی جارێکی دی بەسەر ئەو پلیکانانەدا سەرناکەوێتەوە، کەپێشتر هەزاران جار پیایاندا سەرکەوتبوو، شتی خەڵکی گەیاندبووە قاتە بەرزەکان، کەلوپەلی ماڵانی لە سەرەوە تا خوارەوە داگرتبوو، توانجی شیرینی گرتبووە کچان، بەدوای تارماییە خەیاڵییەکانی دالیای سیراجەدیندا ڕایکردبوو. ئەو ڕۆژە لە بەر دەرگا خوداحافیزی لێکردین و تکای لێکردین تا ئێوارێ لێیگەڕێین تەنها بەو شارەدا پیاسەبکات. دواجار ئەوێ شاری منداڵی خۆی بوو، ئەو

ڕۆژە گەڕایەوە بۆ کوچەکانی جاران، گەڕایەوە بۆ ماڵە کۆنەکەی منداڵیان، بۆ دزینی نیگایەک لە حەوشە کۆنەکەی ماڵی مامۆستا سەرمەد تاهیر کە ئێستا پیاوێکی دەوڵەمەند بە حەوت کچی هەرزەکارو جوانەوە تیادەژیا، گەڕایەوە بۆ شوێنی دوکانە کۆنەکەی ئیسماعیلی کۆتر، لەدوورەوە سەیری جەودەتی برای کرد کە بەدیار تەرازوویەکی ژەنگاوی خوارەوە پیربووبوو. ئەو ڕێگا دێرینانەی قوتابخانەی تەیکردەوە کە لە کوچەکانیدا خۆی و سەرهەنگ قاسم بەڕێگاوە فلووتیان لێدابوو. دواجاریش دەگەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی لە شەوێکی هاویندا مستەفای شەونمی تیا ناسی، گەڕایەوە بۆ چێشتخانەکان، بۆ گوزەری ئاسنگەران و باغە چکۆلەکە... لە ئێوارەدا کە گەیشتە شوێنی ئاهەنگەکە پیاوێک بوو سپی سپی، کەدەستم لێدا گڕێکی نهێنی و ناوەکی سەیر لە لەشیدا دەسووتا، گڕی قەقنەسێک دەیزانی ئەمجارە دواهەمین جارێتی دەسوتێت و ئیدی لە خۆڵەمێشەکەی خۆیدا هەڵناستێتەوە.

ئێوارێ هەموومان لەو باغەدا یەکدیمان گرتەوە، تیپی مۆسیقای کەشتی سپی هەموو ئامێرەکانی خۆیان هێنابوو. جەلیلی باران بە پیکابێکی چکۆلە کۆمەڵێک کورسی گواستبووەوە بۆ ناو باغەکە. مێزێکی پڕ خواردنەوەو میوە لە ناوەڕاستدا بوو، سندوقێک کۆلای ئێرانی گەورە لە پشت مێزەکەوە دانرابوو. من بە خۆم و دەفتەری تێبینییەکانمەوە لە سەر پەڕ دانیشتم و شتەکانی دەوروبەری خۆمم تۆماردەکرد، کۆی ئەو وردەکارییە بێمانایەی ڕۆماننوسە بێبەهرەکان لاپەڕەی پێ ڕەشدەکەنەوە. یەکەمینجار خۆی قسەیکرد، بە بێدەنگی هاتە پێشێ، دەستنوسی ئەم کتێبە لە بندەستیدا بوو، بە سەرنجێکی غەمگین سەیری هەموومانی کردو گووتی: ئێوارەتان باش. ئێوارەتان باش. ئازیزان. هەمووتان دەزانن ئەمشەو دواهەمین شەوی منە، دواهەمین جارە لەگەڵتاندا دادەنیشم و مۆسیقا لێدەدەم، دواهەمین ئێوارەیە پێکەوە لە باغێکدا بگەڕێین. سەختە پێتان بڵێم دەچم بۆ کوێ... من خۆشم

نازانم ئاخۆ ئەمە ئەو کۆتاییەیە کە هەموو چیرۆکێکی ئەم دونیایە پێویستی پێیەتی یان نا؟ کۆتاییەکی ناچارو سەپێنراو کە دەبێت هەموومان پیا برۆین، زیندووەکان و مردووەکان، ئەوانەی پاڵەوانن و ئەوانەی قەرەقۆزی چکۆلەی ناو حیکایەتێکن.

دەستنوسەکەی بەرزکردەوەو گووتی:

هەموو شتێکی ژیانی من لێرەدایە، لەم کتێبەدایە، ئەو کتێبەی هەموو نهێنییە گەورەکانی منی تێدایە، هەموو رۆژە گرنگەکانی ژیانم، ئەو دەستنوسەی من لەگەڵ خۆمدا دەیبەم بۆ جێگایەک کە شوێنی شتە جاوید و نەمرەکانە، کۆپییەکی ئەم کتێبە دەچێت بۆ ئۆقیانوسی گەورەی هاوارەکان ئەو ئۆقیانوسەی تەنیا ئەوانە دەزانن چییە کە ئەم کتێبە دەخوێننەوە، کۆپییەکیشی دەگەڕێتەوە بۆ دونیا، بۆ ناو تەفسیرو تێگەیشتن و خولیاکانی ئێوە، دەچێت بۆ چاپخانە.

ئێستێکیکرد و هەناسەیەکی هەڵکێشاو گووتی:

وەزیفە گەورەکانی مرۆڤ هەرگیز تەواونابن، بەڵام من ئێستا لە ماسییەک دەچم لەقەراغ دەریایەکی گەورە، ماسییەک تەنیا ئێسکەکانی ماوەتەوە.

وچانێکی دووردورودرێژی گرت و سەیری هەمووومانی کردو بە خەفەتێکەوە درێژەیدا بە قسەکانی: ئازیزان، رۆژێک لە رۆژان وامدەزانی دەتوانم چی لە خەزێنەی جوانییە مردووەکاندایە بیهێنمەوە، چی لە گەنجینەی جوانییە کوژراوەکاندایە بیهێنمەوە بەڵام ئێستا سەیرمبکەن من تەنیا ئێسک و پروسکی ئینسانێکم، خۆڵەمێشێکم داناگیرسێتەوە. هەموو قەقنەسێک دواجار خۆڵەمێشێکی هەیە کە خامۆشبووەو بڵێسەناگرێتەوە. دەبێت برۆم. تا تینی رۆیشتنم تێدا ماوە دەبێت برۆم، گەر قەقنەسەکان درەنگ بسووتێن ئیدی هەڵناستنەوە.

دەوەستاو بە غەمێکەوە سەیری هەمووومانی دەکردو دەیگووت: دەزانم

ڕۆژی ئەوە نییە لەسەر توانای خۆم قسەبکەم، ڕۆژی ئەوە نییە لەسەر لاوازی خۆم بدوێم، ڕۆژی ئەوەیە پێکەوە دواهەمین مۆسیقا لێبدەین، دواهەمین گەشتی ماڵاوایی بکەین، شتێکتان پێشکەشبکەم کە بیرتان نەچێتەوە. هاوڕێیان لە ماڵاواییدا قسە مانای نییە، هاوڕێ خۆشەویستەکانم با مۆسیقا لێبدەین، با مۆسیقا لێبدەین.

دەستنوسەکەی داناو فلووتەکەی هەڵگرت و دەستیکرد بەو ئاوازە سیحراوییەی کە شاهیدی سەیرترین خوداحافیزی دونیا بوو، ئەو شەوە تا درەنگ مۆسیقای لێدا، تا درەنگ هەموو مۆسیقارەکانی کەشتی سپی لەگەڵیدا بە چاوێکی خەواڵوو مۆسیقایان ژەند. هەموومان مەستبووین. شەو درەنگ لەو باغەوە هەستاین و پێکڕا بە شەقامی دووروردرێژ و گەورەی ئەو شارەدا کەوتینەڕێ، بەدرێژایی ئەو شەقامە کە هەزاران ڕێبوارو سەدان ئوتومبێل پیایدا تێدەپەڕین، ئێمە لە ناو ئەو چراخانە درۆزنەدا چراخانی ڕۆحێکی جاویدانمان داگیرساندبوو، بەدەم ئەو مۆسیقا خەیاڵییەوە ڕۆیشتین و لە مەستیدا کەسمان نەدەبینی. من و مستەفای شەونم تاکە دوو کەسێک بووین ئامێری مۆسیقامان پێ نەبوو، بەڵام لە هەمووان مەستتربووین. زەحمەت بوو مرۆڤ بەرگەی ئەو هەموو جوانییە بگرێت. بەرەو پێدەشت و ڕێگا ئەفسوناوییەکانی دەرەوەی شار کەوتینە ڕێ، ڕێگایەکی درێژمان بە ناو شاخەکاندا بڕی، جۆرێک لە مەستی ژیاین کە مەستی ئەو بوونەوەرانەیە کە پێدەخەنە ئەودیو سنورە ڕێگا پێدراوەکانی ژیانەوە. مەستی لە یادچوونەوەی شوێن و زەمان، مەستی فڕین بە خاکێکدا کە سەر بە جوگرافیای ئاسایی ئەم دونیایە نییە. بەدەر لە حیسابی شەوو ڕۆژ دوای ئەو مۆسیقارانە کەوتین کە لەگەڵ خۆیاندا بردیانین، بەلای ئەو دەریاچە گەورەیەدا تێپەڕین کە ڕۆژێک لەڕۆژان لەوێدا شاروخی شاروخ ماڵاوایی لە قەقنەس دەکرد، پێمانخستە خاکی عەدەم و ئەفسانەوە، بە لەوەڕگا خورافییەکاندا تێپەڕین

و بـه کێڵگـه سـەوزەکانی ئاورنگدا گوزەرمانکـرد. قاچمـان لـه شـەونمی سوبحه غەمگینەکاندا نوقم بوو، بە سـەر چیمەنـی سارد و بەسـەر گیای تەلیسماویدا ڕابوردین، پۆلـه باڵداری سپیمان بینـی مەستانه بەسـەرماندا فڕین، کۆترمان بینی بە هـەزاران بەرەو ئاسۆکان دەڕۆیشتن و لـە بازنـەی گـەوره گـەورەدا بـەرەو لای ئێمـه دەگەڕانـەوە، تەمـی بەربەیـان و غوبـاری فێنکـی ئێـواری ئامێزیـان پیاکردیـن. بەسـەر گـردی سـەوزو تەپۆڵکـەی پڕ ڕێواس و نـزاری نێرگسـدا سـەرکەوتین، ڕۆیشـتین و ڕۆیشـتین تـا گەیشـتینه سـەر گردێکـی بەرز، جەلادەتـی کۆتـر لەویـادا وەسـتاو وەک سـەر لەشـکرێک شـوێنی دوژمـن نیشـانی سـوپاکەی بـدات، بـه دەسـته سـپییەکانی ئامـاژەی بـۆ شـارێکی گـەوره گەورەکـردو گووتـی «ئەوەتـا ئەوەتـا، ئـەوه شـاری مۆسـیقاره سـپییەکانه... ئەوەیـه».

مـن لەوێـوه بـۆ یەکەمجـار زەریایەکـی سـپی گـەورەم بینـی، شـارێکی بێسـنوور کـه تـا چـاوی ئادەمـی بڕبکات بـه نـاو تـەم و غوبارێکـی جاویدانـدا کشـابوو، شـارێک تەمێکـی سـەنگین و گـەورەو سـپی لەسـەری نیشـتبوو. لـه نەهەنگێکـی خەوتوویـی گـەوره دەچـوو کـه زەریـا بـه خـۆی نەگرێـت. جەلیلـی بـاران سـەیری کـردو گووتـی: خـودای گـەوره، هەمـوو شـارەکانی دونیـا بخەیتەسـەر یەک بـه ئەنـدازەی ئـەم شـاره گـەوره نابـن. ڕەوشـەنی مسـتەفا سـەقزیش گووتـی: هێنـد گەورەیـه هەتـا لـه خەونیشـدا جێگـای نابێتـەوە.

جەلادەت ئێمـەی تـا سـەر تخوبەکانـی ئـەو شـاره بـرد، تاسـەر ئـەو گرده ئەفسـانەییانەی بەسـەر ئـەو شـارەدا دەیانڕوانـی. ئـەوه گەورەترین دیاری بوو ئـەو لـه ماڵاواییدا پێشـکەش بـه ئێمـەی کـرد، دیارییـەک هیـچ یـەک لـه ئێمـه تـا مـردن بیرمـان ناچێتـەوە، نیگایەکـی شـاری مۆسـیقاره سـپییەکان لـه دوورەوە.

لەویـادا وەسـتاین و لـەو دیمەنەمـان ڕوانـی، مسـتەفای شـەونم سـەیری ئـەو هـەزاران باڵندەیـەی کـرد کـه بەسـەر ئـەو شـارەدا دەفڕیـن و وەک ئـەوەی ڕاسـتییەکی گـەوره بدۆزێتـەوە گووتـی: لـەو نیـگاره دەچێـت کـه ڕۆژێـک

لـە ڕۆژان هـاوڕێ قودسـی ویسـتی لەسـەر دیوارەکانـی ئـەو شـارەی ئێمـە دروسـتیبکات.

بەڵام جـەلادەت بە هێمنی پێیگووت: مستەفای هاوڕێم... هـەر یەکێک لـە ئێمـە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئـەم شـارەمان لـە خەونەکانماندا بینیوە.

ئەوە دواهەمین سـاتەکانی ماڵاوایی بوو، ئێمـە لـەوە زیاتر نەماندەتوانی بڕۆیـن، جـەلادەت دەیگـووت: ئـەوەی لێـرە زیاتـر بـڕوات بـە جۆرێـک لـە خەونەکانیـدا وندەبێـت جارێکـی دی بـە ئاگانایەتـەوە. یەکـە یەکـە باوەشـی پیاکردیـن، مۆسـیقارەکانی ماچکـرد، ئامێـرە مۆسـیقییەکانی ماچکـرد. کـە گەیشـتە ئاسـتی مسـتەفای شـەونم گووتـی: گـەر تۆ نەبوویتایـە مـن جگـە لـە ئاوارەیەکی ئەبەدی ئـەو ئوتێلـە هیچی تـر نەبووم. مستەفای شـەونم بـە دەم فرمێسـکەوە گووتـی: ئـاە، جـەلادەت زۆر بیرتدەکـەم، زۆر بیرتدەکـەم، زۆر لـە لەیلای نیلۆفـەر زیاتر. کـە گەیشـتە ئاسـتی جەلیلی باران وەسـتاو بـە ئەسپایی کلیلێکـی لـە گەردنـی خـۆی داکەنـد و کردیـە ملـی جەلیل و گووتـی: ئـەم کلیلـە ڕۆژێـک لـە ڕۆژان دەرگای ئۆقیانوسـێکی گـەورەت بۆ دەکاتـەوە. بەئەسـپایی ماچیکـردو گووتـی: ئـەوە ئیدی کلیلـی تۆیـە، کلیلـی تـۆ. هاتـە بەردەمـی مـن و هەناسـەیەکی هەڵکێشـاو گووتـی: دەزانـم ئـەم چیرۆکـە لای تـۆ هـەرگیز کۆتایی نایـەت. هـەرگیز.

تـا دەهـات دەنگـی دوورتـرو قووڵتـر دەبـووەوە، بەزەحمـەت دواهەمیـن ڕسـتەکانی خـۆی گـووت، جارێکـی دی لـە پاڵتـۆ سـپییەکەیدا وەک ئـەو نەورەسـانە هاتـە بەرچـاوم کـە لـە دەریـای باکـوور بینیبوومـن. یەکەیەکـە دەسـتێکی چکۆلـەی دا لـە دەسـتمان و پشـتی تێکردیـن و بـە تولەڕێیەکـی سـەوزدا ڕۆیشـت، ئێمـە لـە فێنکـی ئـەو ئێوارە غەمگینەدا هیچمـان نەبوو بڵێین، مەسـتانە سـەیری ئەومـان دەکـرد کـە بێئـەوەی ئاوڕبداتـەوە دەستنوسـێکی گـەورە و فلووتێکـی لـە بندەسـتدا بـوو و بـەرەو ئـەو شـارە سـپییە کـە نیـوەی لـە ژێـر خـۆرو نیـوەی لـە تەمـدا بـوو ماڵاوایی لێکردیـن. ئاخـۆ بـەرەو مـردن

دەچوو؟ بەرەو جاویدان دەچوو؟ بەرەو زەمینێکی دیکە دەچوو کە ئێمە هیچ لە ماهییەتەکەی نازانین؟ نازانم.

باڵندەکان بە هەموو ئەو ڕێگا ئەفسانەییەدا پێشمانکەوتنەوە. بە تەک ئەو دەریاچە سیحراوییەدا ڕابوردینەوە کە دەروازەی هەموو ئەم دونیایە بوو. بەدرێژایی ئەو ڕێگایە وەک مەستێک دەڕۆیشتین و کەسمان هیچمان لەگەڵ ئەوی دیدا نەگووت. لەدەروازەکانی شاردا بێئەوەی ماڵاوایی لە یەک بکەین جیابووینەوە. ئەوان دڵنیابوون کە چیرۆکی ڕاستەقینەی جەلادەت کۆتایی هاتووە، بەڵام من نا. کە گەیشتمەوە بەردەم ئەو ئوتێلە، کە چوومەوە بۆ ناو باغەکە، کە کورسییە جێماوەکانی نێو چیمەنەکەم بینی کە پێدەچوو چەند ڕۆژێک بێت لەوێدا کەوتبن، خولیایەکی ڕەش لەسەرمدا بوو کە جەلادەت جارێکی دی دێتەوەو لەم باغەدا مۆسیقایەکی جاویدانمان بۆ لێدەداتەوە، خولیایەک چوار ساڵ بێهودە دوای کەوتم و لەوسەر بە ناکامی هاتمەدەرێ.

* * *

من ئەو پەیمانەی خۆم نەهێنایەدی کە دەبایە ئەو کۆپییەی لە جەلادەتم وەرگرت ڕاستەوخۆ بیبەم بۆ چاپخانە. چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد جارێکی دی دەربکەوێتەوەو سەر لەنوێ ئەو فلووتە سیحراوییەی ئەو ببیستم. ئەو ڕۆژەی کە دەستنوسەکەم هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ ئەڵمانیا، دەمزانی پەیمانشکێنییەکی گەورەدەکەم. چوار ساڵی ڕەبەق ئەو دەستنوسەم لای خۆم هەڵگرت، بە درێژایی ئەو چوارساڵە ڕەوشەنی مستەفای سەقزی نامە و هەڕەشە و جنێوی بۆ دەناردم، بەڵام من هەمیشە چاوەڕوانی جەلادەتم دەکرد دەرکەوێتەوە، چاوەڕوانی سەرە داوی تر و چیرۆکی تر و خەڵکی ترم دەکرد تا زیاتر هەموو نهێنییەکان ڕۆشنبکەنەوە، چاوەڕوانی

دالیا سیراجەدینم دەکرد لە شوێنێکی ئەم دونیایەوە سەر هەڵبداتەوەو خۆی هەندێک بەشی تایبەتی ئەم کتێبە بنوسێت. هەر فرۆکەخانەیەک دەچووم چاوەڕوان بووم یەکێک بانگمبکات «مامۆستا... مامۆستا، بەڕێز، بەڵێ لەگەڵ تۆمە. تۆ مامۆستای نوسەر عەلی شەرەفیاریت، وا نییە.. تۆ ئەو نیت؟». لە هەموو وێستگەی شەمەندەفەرەکانی دونیادا، لە هەموو فرۆکەخانەکانی دونیادا بۆ شاروخی گەڕام و نەمدۆزییەوە. لەو نێوەندەدا دووجار بە نهێنی گەڕامەوە بۆ کوردستان، هەر دوو جارەکە مستەفای شەونمم لە چێشتخانەکاندا دۆزییەوە، جارێکیان چووین بۆ لای موسای بابەک، جگە لەو نامە سەیرەی دالیا سیراجەدین هیچ زانیارییەکی تازەیان نەبوو. سالان و مانگان ڕۆی و هیچ شتێکی دی ڕوویندەدا. من لە ئەڵمانیا ڕۆژێک چوومە سەر گۆڕی «سباستیان میوولەر». ئەو پیاوەی کە دەبایە بە زیندووی بیبینم. بێدەنگی ئەبەدی ئەو لای من وەک سمبولێکی گەورەی بێدەنگی ئەبەدی نهێنییەکان و کۆتایی سەردەمی ئەفسانەکان بوو. دەکرا ئەو پیاوە گەلەک سەرە داوی دیکەم بۆ ئاشکرابکات، گەلەک نیگای ترم بداتێ و دەروازەی ترم بۆ بکاتەوە، بەلام ئەو بێدەنگییە ترسناکەی دوای ڕۆیشتنی جەلادەتی کۆتر هەموو شتێکی داگرت، بێدەنگییەکی سەرتاسەریی بوو. ئەو لەو کەسانە بوو کە لە خۆیان زیاتر کەسی دی نییە تەفسیریانبکات. ئەو ڕۆژە چەپکێک گوڵی چکۆلەم خستە سەر گۆڕی سباستیان میوولەر و لەگەڕانەوەمدا لە دوکانێکی «هیندی» نزیک بانهۆفی دوسلدۆرف وێنەیەکی گەورەی کریشنام کڕی، هەر ئەو ڕۆژە لای فۆتۆگرافێک وێنەیەکی جەلادەتی کۆترم بە گەورەکردندا، بە هەمان شێوەو بە هەمان قەوارەی وێنەکەی کریشنا. وێنەیەکی گەورەبوو، لە یەکێک لە کۆنسێرتەکاندا گیرابوو، جەلادەت لەویادا فلووتەکەی بەدەستەوەیەو ئاوڕی داوەتەوەو سەیری کامێراکە دەکات، ڕیشێکی درێژ و نیگایەکی گەش و جووتێک چاوی

